# سُنَنُ الدَّارِمِيّ

## بە كوردی

لِلإمامِ عبدالله بن عبدالرحمن الدارمي

بەرگی یەکەم

وەرگێڕانی

زانا عیاعبابکر

حوکمی فەرمودەکان وەرگیراوە لە

الشيخ محمد صبحي بن حسن حلاق




پرۆژەی پیت

بۆ وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە

# سُنَن الدَّارِمِيّ

## بەکوردی

نووسینی: الإمام عبدالله بن عبدالرحمن الدَّارمي
وەرگێڕانی : زانا عیسا عبابکر
دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
خەتی بەرگ : نەوزاد کۆیی
چاپی یەکەم : ١٤٤١ز - ٢٠٢٠ك
٥٧٦ لاپەڕە
١٧ * ٢٤ سم
بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٣٢٦ ) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە





# سُنَنُ الدَّارِمِيّ

# بەکوردی

للإمام عبدالله بن عبدالرحمن الدَّارمي

- بەرگی یەکەم -

وەرگـێڕانــی

**زانــا عیســا عبابکر**

حوکمی فەرمودەکان وەرگیراوە لە: الشیخ محمد صبحي بن حسن حلّاق

## پێشەکی وەرگێڕ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

ستایشی بێ پایان بۆ خاوەنی ئەم شەریعەتە مەزنە کە پەروەردگاری جیهانیانە، صەڵات و سەلامیش تا ئەبەد وەک بارانی بەهار بڕژێ بەسەر گەورەترین و، جوانترین و، خۆشەویسترینی مەخلوقی خوا، کە موحەممەدی پێشەوای پێشینەو پاشینەیە، پاشان بڕژێ بەسەر شوێنکەوتوانی پێغەمبەری خواو شەریعەتەکەی تا ڕۆژی دوایی.

الله الله! دەبێ چ چێژو تامێک و زانستێک هەبێ لە پەرتوکێکدا کە خاوەنەکەی دەریایەکی بێ کەنار بێ، بە شێوەیەک زانایانی سەردەمی خۆی و زانایانی دواتریش سەرسامی پلەو پایەی ئەم زاتە بن! مەگەر بۆ پلەو پایەی ئەو زاتەو پەرتوکەکەی بەس نیە، هەندێک لە زانایان پێیان وا بووە ئەو زاتە لە هەندێک رووی زانستیەوە لە پێش ئیمامی بوخاریەوەیە! کەسێکی وەک ئیبنو حەجەریش دەفەرموێت: (سونەنی داریمی زۆر لە سونەنی ئیبنو ماجە چاکترە)!

## مەنهەجی تەرجەمە کردنی ئەم پەرتوکە

١)- لە تەرجەمە کردنی ئەم پەرتوکەدا خۆم پاراستووە لە تەرجەمەکردنی حەرفی، تاوەکو تام و بۆی مانا نەبێتە قوربانی لەفز، وە خۆم پاراستووە لە لادان و گۆڕینی وشە بەکارهاتوەکانی فەرموودەکان، واتە: هەر کاتێک وشەی بەکارهاتووی فەرموودەکە مانای تێری پێکا بێت لە هاوتا کوردیەکەی ئەوە وەک خۆی هاوتا کوردیەکەیم بەکارهێناوە، وە هەر کاتێک هەستم کردبێت وشە بەکارهاتوە کە لە هاوتا کوردیەکەی مانای تێر نابەخشێت ئەوە لامداوە بۆ وشەیەکی تری تێری کوردی بۆ پێکانی ماناو مەبەستی فەرموودەکە.

٢)- هەوڵمداوە فەرموودەکان شەرح بکەم، بێ ئەوەی لە تەرجەمەکە دەربچم، چونکە مەبەست لە فەرمودەکان بریتیە لە تێگەیشتن لە ماناو مەبەستی شەریعەت، ئەمەش زۆرجار پێویستی بە ڕستەو وشەی تری دەرەوەی فەرموودەکە دەبێت، جا بۆ ئەوەی ئەو کارە ئەنجام بدەین و ئەمانەتی زانستیش پارێزراو بێت، هەڵساوم ئەو ڕستەو وشانەی خۆم زیادم کردوون لە فەرموودەکەدا خستوومەتە ناو دوو کەوانە، تاوەکو بە ڕوونی دیار بێت ئەم وشەو ڕستانە هی لەفزی فەرموودەکە نین بەڵکو زیادکراوی خۆمە.

٣)- هەوڵمداوە لە ڕێگەی تێبینیەوە هەندێ فەرموودە زیاتر ڕوون بکەمەوە، یان ئەگەر بەریەک کەوتنێکی ڕووکەشی هەبێت لەگەڵ فەرموودەیەکی تر ئەوە هەوڵمداوە بەریەک کەوتنەکە لابدەم و فەرموودەکان کۆبکەمەوەو بیانگێڕمەوە سەر حەقیقەتی مانا دروستەکەیان کە بەریەککەوتنی تیا نیە.

٤)- ئەگەر گومانێک هەبووبێ هەوڵمداوە وەڵامی گومانەکە بدەمەوەو بە سەرنج، یان تێبینیەک هەڵیبوەشێنمەوە، تاوەکو خوێنەر دژە ڤایرۆسی گومان وەربگرێ لە شوێنی خۆیداو، بۆی ڕوون بکرێتەوەو بزانێت گومانەکە خۆی دەبەر حەقیقەت ناگرێت.

## سوپاسنامە:

له ژێر ڕۆشنایی فەرمایشتی: {مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ، لَمْ يَشْكُرِ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ} واجبە سوپاسی ئەو ستافە بکەم کە بوونە هۆی جوڵاندنی پێنوسەکەم و پەنجەو مەچەکیان قایم کردم، بۆ ئەوەی هەست بە ماندوبوون نەکەم.

بۆیە لێرەوە سوپاس و ستایشێکی زۆر تێکەڵ بە خۆشەویستیەکی ڕاستگۆیانە ئاراستەی ستافی (پیت) دەکەم، دوای فەزڵ و تەوفیقی پەروەردگار فەزڵی یەکەم و کۆتایی سەبەبیەت بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە، بەوەی هاوکاری ماددی و مەعنەوییان کردم و، زۆر بە جددی کاریان لەسەر پێداچونەوەو دیزاینکردن و چاپکردنی ئەم پەرتووکە نایابە کرد..

بۆیە لە خوای بەخشندە داواکارم ئەم کۆمەڵە گەنجە بخاتە ژێر چەتری ڕەحمەتی خۆی لە دونیادا، وە لە دوارۆژیشدا ڕەزامەندی خۆی بکات بە بەرگ و پۆشاک بۆیان و بیانکات بە دراوسێی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەهەشتە بەرزەکەدا.

چەندە گرنگە لە سەردەمی وازهێنان لە شەریعەت کۆمەڵێک هەبن ئاڵای سوننەت و فەرموودە لەناو خەڵکیدا هەڵبکەن و خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن و ڕێچکەی ئەبو هورەیرەو ئەنەس و هاوەڵەکانی دیکە تەواو بکەن، بۆ گەیاندنی پەیامی خۆشەویستی هەمووان پێغەمبەری کۆتا زەمان!

چەندە گرنگە لە سەردەمێکدا دونیا کۆبوبێتەوە بۆ دژایەتی کردنی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، کەچی ئەم کۆمەڵە گەنجە سوننەت وا لێبکەن بە ئاشکرا لە ماڵەکان لەبەر بکرێت و ببنە هۆکاری بەخششی دونیایی و دوارۆژی!

هەروەها زۆر سوپاسی -دکتۆر مامۆستا مەلا سامی- دەکەم، کە لە خزمەتی ئەودا فێری ئەو زانستانە بووم کە بتوانم بە هۆیەوە ئەم کتێبە تەرجەمە بکەم، داواکارم لە خوای پەروەردگار تەمەنی پڕ بەرەکەت و خەرمانی فراوانتر بکات.

هەروەها سوپاسی دایکم و باوکم و خێزانم و هاوڕێ و خۆشەویستانم دەکەم کە هاندەرو یارمەتیدەرم بوون بۆ ئەو کارە موبارەکە، ڕەحمەتی خوا بەسەر گشتیان ببارێت.

**زانـــا عیسـی عــبابکر**

٦/١٤٤١ جمادی الآخر/١١هـ - ٢٠٢٠/٢/٥م

شەوی چوارشەم لەسەر پێنجشەم، تورکیا، شاری کارابوک

## ژیاننامەی ئیمامی داریمی

ئیمـــامی داریمی یەکێکە لە زانــایانی هەرە گەورەی فەرمـوودەو شاخێکی باڵا بەرزی زانستەو چڵەپۆپەی گەورەیی و شکۆی لە مێژووی فەرمووودەدا بەدەست هێناوەو خۆرێکی هەڵاتووە بە ئاسمانی زانست و فەرموودەوە، هەرچی زانایانی پایەبەرزە بە تێکڕا سەرسامی پلەو پایەی ئەم کەڵە پیاوەی زانستی فەرموودەن.

**ناوی تەواوی ئیمامی داریمی:**

ناوی تەواوی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی فەزڵی کوڕی بەهڕامە، کونیەکەی ئەبو موحەممەدەو تەمیمیە، نیسبەتی (داریمی)ش دەگەڕێتەوە بۆ داریمی کوڕی مالیکی کوڕی حەنزەڵەی کوڕی زەیدی مەناتی کوڕی تەمیم.

**ساڵی لەدایکبونی:**

ئیمامی داریمی لە ساڵی (١٨١)ی کۆچی لە دایک بووە، لە هەمان ئەو ساڵەی کە ئیبنو موبارەک تیایدا کۆچی دوایی کردووە.

**گەڕانی بە دوای زانستدا:**

ئیمامی داریمی هەر لە منالیەوە خوای پەروەردگار شەیدایی زانستی خستۆتە دڵ و دەرونیەوە و، دەستی بە خوێندنی زانست کردووە لە خزمەت زانایان، هەر لە تەمەنی گەنجیەوە بارگەی پێچاوەتەوە بۆ گەڕان بەدوای زانستدا، بۆ ئەو مەبەستەش چۆتە میصر و شام و عێراق و مەککە و مەدینە و چەندەها شارو وڵاتی تر، تا وای لێهاتوە باڵای زانستەکەی لە باڵای زانستی خەڵکی سەردەمی خۆی بەرزتر بوو و ناوبانگی دەنگی دایەوە لە شارو وڵاتان و، خەڵک و زانایان و مامۆستاکانی بە تێکرا شاهێدی حیفز و وەرع و تۆکمەیی زانستیان بۆداوە.

**ژمارەی ئەو مامۆستایانەی ئیمامی داریمی فەرمودەی لێوە گێڕاونەتەوە:**

مامۆستاکانی ئیمامی داریمی ژماردنیان زۆر ئەستەمە لەبەر زۆری گەڕان و وەرگرتنی زانست لە لای زانایان لە هەموو لایێک، بۆ نمونە تەنها لەم پەرتوکەی ژێر دەستتاندا لە (١٩١) مامۆستا فەرموودەی گێڕاوەتەوە، جگە لەو زانا و مامۆستایانەی کە فەرموودەی لێ ڕیوایەت کردوون لە تەفسیرەکەیدا ـ کە بەداخەوە لەبەردەستمان نیە و نازانین چەند مامۆستای تیایە ـ

**ئەو کەسانەی فەرموودەیان لە ئیمامی داریمیەوە گێڕاوەتەوە:**

ئەو کەسانەی فەرموودەیان لە ئیمامی داریمیەوە گێڕاوەتەوە دەبن بە دوو بەش:

یەكەمیان: بریتین لە مامۆستاكانی و هاوتاكانی و خاوەنی صەحیحەكان و سونەنەكان و پەرتوكە بەناوبانگەكان.

١ـ موحەممەدی كوڕی بەشاری بەندار.

ئیمامی ذەهەبی فەرمویەتی: موحەممەدی كوڕی بەشار شانازی دەكرد بەوەی فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە ئیمامی داریمی.

٢ـ موحەممەدی كوڕی یەحیای هوزەلی.

٣ـ موحەممەدی كوڕی صەباحی بەززار.

٤ـ ئیمامی بوخاری.

٥ـ ئیمامی موسلیم.

٦ـ ئیمامی ترمیذی.

٧ـ ئیمامی ئەبو داود.

٨ـ ئیمامی نەسائی.

جگە لەمانەی باسمان كرد چەندین زانای بەناوبانگی خاوەنی كتێبی مەشهور فەرموودەیان لە ئیمامی داریمیەوە گێڕاوەتەوە، كە بریتین لەمانە:

٩ـ ئەبو زورعە، عوبەیدوڵڵای كوڕی عەبدول كەریمی رازی.

١٠ـ ئەبو حاتەم، موحەممەدی كوڕی ئیدریسی ڕازی.

١١ـ عەبدوڵڵای كوڕی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل.

١٢ـ بەقی كوڕی مەخلەد.

١٣ـ جەعفەری كوڕی موحەممەدی فریابی، خاوەنی كتێبی: «فضائل القرآن».

١٤ـ صالح بن موحەممەد.

دووەمیان: ئەوانەی فەرموودەیان لە ئیمامی داریمیەوە گێڕاوەتەوە جگە لە مامۆستاكانی و جگە لە خاوەنی پەرتوكە دیارەكان:

ئەوانەی فەرموودەیان لە ئیمامی داریمیەوە گێڕاوەتەوە جگە لە مامۆستاكانی و خاوەنی پەرتوكی صەحیح و سونەن و پەرتوكە مەشهورەكان، بریتین لە هەژدە زانای پایە بەرزی تر.

ستایشی زانایان بۆ ئیمامی داریمی:

ئیسحاقی كوڕی داودی سەمەرقەندی دەڵێت: چووم بۆ لای ئەحمەدی كوڕی حەنبەل و هەر مەدحی ئەبو مونزیرم دەكرد و بەشان و باڵمدا هەڵدەوت، جا ئیمامی ئەحمەد وتی: نایناسم، ماوەیەكی باشە

براکانمان لێمان ون بوون (واتە ئەگەر کەسێکی وەکو داریمیت ببینیایە کە لەلامان بوو مەدحی ئەبو مونزیرت نەدەکرد)، (جا وتی): تۆ تا چەند عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەناسیت (واتە تا چەند داریمی دەناسیت)؟ دەست بەو زانایە گەورەیەوە بگرە، دەست بەو زانایە گەورەیەوە بگرە، دەست بەو زانایە گەورەیەوە بگرە، کە عەبدوڵڵای کوڕی عبدول ڕەحمانە (کە داریمیە).

ئەبو حاتەمی ڕازی دەڵێت: لەلای یەحیای ئەکثەم باسی ئیمامی بوخاری و داریمی کرا، جا یەحیا وتی: پێتان وایە کامیان حافزترن لە زانستی فەرمودەدا؟ یەکێک وتی: بوخاری، جا یەحیا وتی: وسبە، لە نێوان بوخاری و داریمی جیاوازیەکی زۆر هەیە، ئێوە عەبدوڵڵا ناناسن، عەبدوڵڵا حافزترە لە زانستی فەرموودەدا.

تێبینی: بە نسبەت خودی شەخصی ئەگەرچی ئیمامی داریمی لە ڕووێک لە ڕووەکان چاکتر بێت لە ئیمامی بوخاری، ئەوە بێ گومان لە ڕووی دیکە ئیمامی بوخاری چاکتر و گەورەترە، بەڵام بە نسبەت کتێب هەرگیز کتێبی داریمی ناگات بە کتێبی صەحیحی بوخاری، ئەمەیان بابەتێکی ترە.

کوڕەکەی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: بە باوکمم وت: کێ حافزە لە زانستی فەرموودەدا؟ وتی: چەند گەنجێکی خەڵکی خۆراسان بوون کە لەلای ئێمە بوون دواتر پەرت بوون و ڕۆیشتن، منیش وتم: کێن ئەمانە؟ وتی: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمانی سەمەرقەندی (کە ئیمامی داریمیە)، وە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری و، عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدولکەریمی ڕازی و، حەسەنی کوڕی شەجاعی بەلخی، دەڵێ: منیش وتم: ئەی باوکە کامیان لە گشتیان حافزترە و زیاتر فەرمودەی لەبەرە؟ وتی: هەرچی داریمیە زانستەکەی لە گشتیان تۆکمەترە، هەرچی موحەممەدە لە گشتیان شارەزاترە، هەرچی ئەبو زورعەیە (واتە هەرچی عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدولکەریمی ڕازی)یە لە گشتیان سیاقی ڕێکترە، وە هەرچی کوڕی شوجاعە لە هەموان کۆکەرەوەترە بۆ بابەت و ئەبوابەکانی زانستی فەرموودە.

ڕەجائی کوڕی مورجا دەڵێت: ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی و، سولەیمانی شاذکونی و، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و، ئیبنول مەدینیم بینیون، دەڵێت: کەسم نەبینی فەرموودەی زیاتری لەبەر بێت لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمان زیاتر (واتە ئیمامی داریمی).

موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی شیرازی دەڵێت: داریمی لە چڵەپۆپەی ژیری و دینداریدا بوو، لەو کەسانە بوو کە نمونەی پێ دەهێنرایەوە لە حیلم و نەرمونیانی و زۆرزانی لە سەنەدی فەرموودەو زۆری لەبەر کردنی فەرموودەو عیبادەت و زوهدو دونیا نەویستی، داریمی ئەو کەسە بوو کە فەرموودە و ئەسەری دەرخست و بوژاندەوە لە سەمەرقەند و، درۆی دەرکرد لە فەرموودەدا و، ڕاڤەکەرێکی تەواوی قورئان بوو، هەروەها فەقیهێکی زانا بوو.

بندار دەڵێت: حافزان و لەبەرکارانی فەرموودە لە دونیا (چوار کەسن): ئەبو زورعەو، بوخاری و، داریمی و، موسلیم.

نوعەیمی کوڕی ناعیم دەڵێت: گوێم لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی نومەیر بوو دەیووت: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمان بەسەرماندا زاڵ بوو لە حیفز و لە وەرع.

عەبدولصەمەدی کوڕی سولەیمانی بەلخی دەڵێت: پرسیارم لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کرد دەربارەی یەحیای حەمانی (کە ئاخۆ فەرمودەکانی وەردەگیرێن)، ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش وتی: وازمان لە فەرموودەی یەحیا هێناوە لەبەر قسەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمان؛ چونکە ئەو ئیمـــام و پێشەنگە.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە وتویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمان ئیمامی خەڵکی سەردەمی خۆیەتی.

ئیمامی نەوەوی دەڵێت: داریمی یەکێکە لە حافزانی مسوڵمانان لە سەردەمی خۆیدا، کەمن ئەوانەی لێی نزیک دەکەونەوە لە فەزیلەت و لەبەرکردنی فەرموودەدا.

ئەبو زورعە وتویەتی: هیچ کەسێک نیە بۆم باس کرابێت، کە بینیومە حەتمەن لە خوار ئەوە بووە کە بۆم باس کراوە، تەنها عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمان نەبێت، ئەو لە سەرووی ئەوە بووە کە باس کراوە.

حافز صلاح الدینی صەفەدی وتویەتی: داریمی یەکێکە لە هەڵگرانی زانست، ئیجتیهاد دەکات و تەقلید ناکات، وە یەکێکە لەو کەسانەی زۆر بە دوای زانستدا دەگەڕێن و حافزی فەرموودەن، وەسفدار کراوە بە متمانەو دونیا نەویستی، نمونەی پێ هێنراوەتەوە لە دینداری و دونیا نەویستی و، سیفاتی جوانی زۆرە.

وەفات کردنی ئیمامی داریمی:

ئیسحاقی کوڕی ئەحمەد وتویەتی: ئێمە لای ئیمامی بوخاری بووین، نوسراوێکمان بۆ هات هەواڵی وەفات کردنی ئیمامی داریمی تیا بوو، دەڵێ: جا ئیمامی بوخاری سەری داخست و، دواتر سەری بەرز کردەوەو وتی: (إنا لله وإنا إليه راجعون)، فرمێسکیش بەسەر دوو کوڵمەکانی ڕوومەتی دەهاتنە خوارو لە خەفەتباریی ئەم شیعرەی وت:

إن عِشتَ تُفْجعُ بالأَحبَّةِ كلِّهم .... وبقاءُ نَفْسِك لا أبا لكَ أفجعُ

ئیسحاقی کوڕی ئەحمەد وتویەتی: قەت گوێمان لە ئیمامی بوخاری نەببوو شیعر بڵێ بەر لەو کاتە، تەنها ئەو شیعرانە نەبێت کە لە فەرمودەدا هاتبوون.

جا ئەم خۆرە مەزنەی ئاسمانی ئیسلام لە تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵی دا کۆچی دوایی کرد، لە ساڵی (٢٥٥)ی کۆچی لە ڕۆژی هەشتەمی (ذي الحجة) وەفاتی کردو لە ڕۆژی نۆیەمدا کە دەکاتە ڕۆژی عەرەفە نێژرا، کە ڕۆژی هەینی بوو.

ڕەحمەتی خوا لەو ئۆقیانوسە بێ كەنارە بێت، پەروەردگار جەزای بەخێری بێ ژماری بداتەوە لەسەر ئەو هەموو خزمەتەی كردویەتی.

**گەورەیی و پلەی سونەنی داریمی:**

بۆ سەلماندنی گەورەیی سونەنی داریمی كیفایەتە كە ئیمامی: ئیبنو صەڵاح و، نەوەوی و، صلاح الدینی عەلائی و ئیبنو حەجەر وتویانە ئەگەر سونەنی داریمی شەشەمین پەرتوك بوایە لەدوای صەحیحی بوخاری و صەحیحی موسلیم و سونەنی ئەبو داود و سونەنی ترمیذی و سونەنی نەسائی، ئەوە چاكتر بوو، واتە لە شوێنی سونەنی ئیبنو ماجە بووایە.

**ناوی پەرتوكەكەی داریمی:**

• زۆرێك لە زانایان ناوی ئەم پەرتوكەی ئیمامی داریمیان هێناوە بە (مسند الدارمي)، بەو مانایەی زۆرینەی فەرمودەكانی پچڕانیان تیا نیە تا ئیسنادەكانیان دەگاتەوە خاوەنی مەتنەكە، وەك ئیمامی بوخاریش ناوی لە صەحیحەكەی خۆی ناوە: (الجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله وسننه وأيامه)، جا ئەو زانایانەی ناویان لە پەرتوكەكەی ئیمامی داریمی ناوە (مسند الدارمي) بریتین لەمانە:

الإمام الذهبي، والقرطبي، وابن كثير، وابن حجر العسقلاني، والعلجوني، والزيلعي، وابن تيميه، والعلائي، والمنذري، وابن الصلاح، والمناوي، والخطيب البغدادي.

• هەندێكی تریش لە زانایان ناویان ناوە (صحيح الدارمي) وەك ئیمامی: ابن القيم.

• هەندێكی تریش لە زانایان ناویان ناوە: (سنن الدارمي) چونكە دابەشكردنی پەرتوكەكە بەپێی بابەتەكانی فقهیە، ئەم زانایانەش بریتین لەمانە: الكتاني، والحاج خليفه، وابن المديني، وابن أبي العاصم.

جا هەرچەندە كێشە لە ناودا نیە بەڵام ئەوەی ڕاستتر بێت ناوی (مسند الدارمي) زیاتر بەكارهاتوەو لە پێشەكی دەستخەتەكانی ئەم پەرتوكەدا بە (مسند) ناوی هاتوە، بۆیە دەكرێت ئیمامی داریمی خۆی ئەم ناوەی لێ نابێت بەو مانایەی زۆربەی هەرە زۆری فەرمودەكانی پەرتوكەكەی موسنەدن؛ واتە: موتتەصیڵن و سەنەدەكانیان پچڕانیان تیا نیە تاوەكو دەگەنەوە بە خاوەنی فەرموودەكە، هەر وەك چۆن ئیمامی بوخاری ناوی لە صەحیحەكەی ناوە بە (مسند) بەو مانایە. والله أعلم.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

پاش ستایشی شایستە بۆ خوای بەخشندە، صەڵات و سەلام بڕژێ بەسەر باشترین بەندەی خوا موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوایی....

لە خزمەت دا بوونی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بە هەر شێوازێک شەرەف و گەورەیی یەکەی زۆرە بۆ خزمەتکارەکە..

ئێمە وەک ستافی پیت، بە هاوکاری کۆمەڵێک مامۆستای قەدر گران و ئەهلی عیلم و خاوەن توانا و خاوەن عەزم، بڕیارماندا لە ماوەیەکی دیاری کراو بە پشتیوانی خوای پەروەردگار سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە وەربگێڕین بۆ زمانی شیرینی کوردی لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١)- نەبوونی ئاشنایەتی ئەم نەوەی نوێیە بە زمانی عەرەبی، کە ئەمەش دواجار دەبێتە بێ بەشبوونی نەوەی داهاتوو لە گەورەترین زانست کە میراتی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

٢)- هەژاری کتێبخانەی کوردی لە کتێبەکانی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لە کتێبەکانی فەرموودە، تا ئێستا جگە لە (سنن أبي داود)[1] هیچ کتابێکی دیکە وەرنەگێڕدراوە بە کاملی لە سەرەتای تا کۆتایی.

٣)- لە ڕاستیدا ئەم پرۆژەیە بە هیچ جۆرێک ئامانجی بازرگانی و قازانجی ماددیی لە نیەتدا نیە.

داوای تەوفیق و هاوکاری لە خوای پەروەردگار دەکەین، لە دووعای خێری خۆتان ئەم ستافە و کارەکەی لە بیر مەکەن.

ستافی پیت

٢٠٢٠/٢/٢

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

**بابەت: ئەو شتەی خەڵکی لەسەری بووە، لە نەزانی و گومڕایی پێش ناردنی پێغەمبەری خوا ﷺ**

**١ـ «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُؤَاخَذُ الرَّجُلُ بِمَا عَمِلَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ؟ قَالَ: مَنْ أَحْسَنَ فِي الْإِسْلَامِ لَمْ يُؤَاخَذْ بِمَا كَانَ عَمِلَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَمَنْ أَسَاءَ فِي الْإِسْلَامِ، أُخِذَ بِالأَوَّلِ وَالْآخِرِ»[١].**

واتە: لە عەبدوڵڵا (إبن مسعود) ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا مرۆڤ سزا دەدرێت بە هۆی ئەو کردەوە (خراپانەی) کە ئەنجامی داوە لە سەردەمی نەزانی (پێش هاتنی ئیسلام)؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێک چاکەکاری بکات لە (سەردەمی) ئیسلامدا (دوای مسوڵمان بوونی) ئەوە سزا نادرێت بە هۆی ئەو کردەوانەی کردویەتی لە سەردەمی نەزانیدا، وە هەر کەسێکیش خراپەکاری بکات پاش مسوڵمان بوونی (خراپەکاریەکەش بریتی بێت لە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام و کافربونەوە) ئەوە سزا دەدرێت لەسەر کردەوەی خراپی سەردەمی نەزانی و سەردەمی ئیسلامەتیش (چونکە حەقیقەتی ناسی بوو و پاساوی نەمابوو).

**٢ـ «عَنِ الْوَضِينِ ﷺ أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا أَهْلَ جَاهِلِيَّةٍ وَعِبَادَةِ أَوْثَانٍ، فَكُنَّا نَقْتُلُ الْأَوْلَادَ، وَكَانَتْ عِنْدِي بِنْتٌ لِي فَلَمَّا أَجَابَتْ، وَكَانَتْ مَسْرُورَةً بِدُعَائِي إِذَا دَعَوتُهَا، فَدَعَوتُهَا يَوْمًا، فَاتَّبَعَتْنِي فَمَرَرْتُ حَتَّى أَتَيْتُ بِئْرًا مِنْ أَهْلِي غَيْرَ بَعِيدٍ، فَأَخَذْتُ بِيَدِهَا فَرَدَّيْتُ بِهَا فِي الْبِئْرِ، وَكَانَ آخِرَ عَهْدِي بِهَا أَنْ تَقُولَ: يَا أَبَتَاهُ يَا أَبَتَاهُ فَبَكَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى وَكَفَ دَمْعُ عَيْنَيْهِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنْ جُلَسَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَحْزَنْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَهُ: كُفَّ فَإِنَّهُ يَسْأَلُ عَمَّا أَهَمَّهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ: أَعِدْ عَلَيَّ حَدِيثَكَ فَأَعَادَهُ، فَبَكَى حَتَّى وَكَفَ الدَّمْعُ مِنْ عَيْنَيْهِ عَلَى لِحْيَتِهِ، ثُمَّ قَالَ لَهُ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ وَضَعَ عَنِ الْجَاهِلِيَّةِ مَا عَمِلُوا، فَاسْتَأْنِفْ عَمَلَكَ»[٢].**

واتە: لە وەضین ﷺ گێڕدراوەتەوە (وتویەتی): پیاوێک هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە پێشتر خەڵکی سەردەمی نەزانی و بت پەرستی بووین، بۆیە منداڵانی خۆمانمان دەکوشت (یان لە ترسی برسیەتی، یان لەبەر عەیبە ئەگەر منداڵەکە کچ بووایە)، من کچێکی خۆم لابوو، کاتێک فامیدە بوو وەڵامی بانگ کردنی دەدایەوە (تازە قسان فێر ببوو) ـ هەموو کات دڵ خۆش دەبوو کە بانگم دەکرد ـ جا ڕۆژێک بانگم کرد، ئەویش بەدوامدا هات، منیش ڕۆیشتم تا چومە لای بیرێکی خۆمان کە دوور نەبوو

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ مرسل بسند حسن.

(نزيک بوو)، جا دەستم گرت و فڕێمدايە ناو بيرەكەو، كۆتا جار كە لەگەڵی بووم (ئەو كاتە بوو كە فڕێمدايە ناو بيرەكە) دەيوت: باوكاااا باوكاااا. پێغەمبەری خواش ﷺ گريا تاوەكو فرمێسک لە دوو چاوەكانی فوارەی كردو چۆڕايەوە، جا پياوێک لە دانيشتوانی مەجليسی پێغەمبەری خوا ﷺ (بە گلەيی و نارەزاييەوە) بە پياوەكەی ووت: پێغەمبەری خوات دڵ تەنگ و خەمبار كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: وازی لێ بێنە، بێ گومان ئەو پرسيار دەربارەی شتێكی گرنگی خۆی دەكات، دواتر بە پياوەكەی فەرموو: قسەو ڕوداوەكەت دووبارە بكەرەوە، ئەويش دووبارەی كردەوە، (پێغەمبەری خواش ﷺ)، گريا (دووبارە) تا فرمێسک لە دوو چاوەكانی بەسەر ڕيشی (موبارەكيدا) چۆڕايەوە، دواتر فەرمووی: بە دڵنيايی خوا گوناهباری هەڵگرتووە لەسەر كەسانی سەردەمی نەزانی دەربارەی ئەو كردەوە (خراپانەی) كردويانە، بۆيە لێرە بەولاوە دەست بە كردەوەی خۆت بكە (لە دوای مسوڵمانبونتەوە تاوانت لەسەر ئەژمار دەكرێت).

٣- «عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي مَوْلَايَ: أَنَّ أَهْلَهُ بَعَثُوا مَعَهُ بِقَدَحٍ فِيهِ زُبْدٌ وَلَبَنٌ إِلَى آلِهَتِهِمْ، قَالَ: فَمَنَعَنِي أَنْ آكُلَ الزُّبْدَ لِمَخَافَتِهَا، قَالَ: فَجَاءَ كَلْبٌ فَأَكَلَ الزُّبْدَ وَشَرِبَ اللَّبَنَ، ثُمَّ بَالَ عَلَى الصَّنَمِ وَهُوَ: إِسَافٌ، وَنَائِلَةُ، قَالَ هَارُونُ كَانَ الرَّجُلُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ إِذَا سَافَرَ، حَمَلَ مَعَهُ أَرْبَعَةَ أَحْجَارٍ ثَلَاثَةٌ لِقِدْرِهِ وَالرَّابِعُ يَعْبُدُهُ، وَيُرَبِّي كَلْبَهُ، وَيَقْتُلُ وَلَدَهُ»[1].

واتە: لە موجاهيد گێڕدراوەتەوە، وتويەتی: گەورەكەم (سائيبی كوڕی أبي سائيب) ﷺ بۆی گێڕامەوە: كە ماڵەوەيان جامێكيان پێ ناردبوو كە زبدە (كەرە)و شيری تيا بوو بۆ (ئەو بتانەی) كە كردبوويانن بە خوا، (سائيب) دەڵێ: ماڵەوەمان قەدەغەيان كردم كەوا زبدەكە بخۆم لەبەر ترسی بتەكان (نەوەک سزامان بدەن)، دەڵێ: جا سەگێک هاتوو زبدەكەی خواردو شيرەكەشی خواردەوەو، دواتر ميزی كرد بەسەر بتەكاندا، (ناوی بتەكانيش) ئيساف و نائيلە بوو.

هاروون (كە يەكێكە لە گێڕەوانی ئەم فەرموودەيە) دەڵێت: پياو لە سەردەمی نەزانی ئەگەر سەفەرێكی بكردايە چوار بەردی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت و دەيبردن، سيانيان بۆ (دانانی بن) مەنجەڵەكەی (وەک سێكوچكە بەكاری دەهێنا)، چوارەميانيشی دەپەرست، سەگەكەی خۆيشی ڕادەگرت و خزمەتی دەكردو (پەروەردەی دەكردو مەسرەفی لێ دەكرد)، منداڵەكەی خۆيشی دەكوشت!!!

٤- «عَنْ أَبِي الرَّجَاءِ ﷺ قَالَ: كُنَّا فِي الْجَاهِلِيَّةِ إِذَا أَصَبْنَا حَجَرًا حَسَنًا عَبَدْنَاهُ، وَإِنْ لَمْ نُصِبْ حَجَرًا، جَمَعْنَا كُثْبَةً مِنْ رَمْلٍ، ثُمَّ جِئْنَا بِالنَّاقَةِ الصَّفِيِّ فَتَفَاجُّ عَلَيْهَا، فَنَحْلُبُهَا عَلَى الْكُثْبَةِ حَتَّى نَرْوِيَهَا ثُمَّ نَعْبُدُ تِلْكَ الْكُثْبَةَ مَا أَقَمْنَا بِذَلِكَ الْمَكَانِ»[2]. قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: الصَّفِيُّ: الْكَثِيرَةُ الْأَلْبَانِ، فَتَفَاجُّ يَعْنِي: النَّاقَةَ إِذَا فَرَّجَتْ بَيْنَ رِجْلَيْهَا لِلْحَلْبِ، وَالْفَجُّ: الطَّرِيقُ الْوَاسِعُ، وَجَمْعُهُ: فِجَاجٌ .

واتە: لە باوكی ڕەجائەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە وتويەتی: (ئێمە لە زەمانی نەزانيدا (پێشی ئيسلام) ئەگەر گەيشتباين بە بەردێكی جوان دەمانپەرست، ئەگەر نەگەيشتباين بە هيچ بەردێكيش ئەوە هەندێک

---

(١) إسناده حسن.

(٢) موقوف بسند ضعيف.

لمان كۆدەكردەوە دەمان كرد بە گردۆڵەیەک و، دواتر وشترێکی مێی بەشیرمان دەهێناو قاچەکانی لێک دەکردەوە بەسەر گردۆڵە لمەکەو، دەمان دۆشی بەسەر گردۆڵەکەدا تاوەکو بە تەواوی (گردۆڵەکە) تەڕ دەبوو، دواتر ئەو گردۆڵەمان دەپەرست بە درێژایی ئەو کاتەی لەو شوێنە دەماینەوە. ئەبو موحەممەد ووتویەتی (الصفی) واتە: زۆر بە شیر (فتفاج)ش واتە: وشتری مێ کاتێک دوو قاچەکانی لێک دەکاتەوە بۆ دۆشین، وە (الفج) بە ڕێگای فراوانیش دەوترێت و، کۆیەکەی (فجاج)ە.

بابەت: سیفەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کتێبە ئاسمانیەکاندا پێش ڕەوانەکردنی

٥- «قَالَ كَعْبٌ رضي الله عنه نَجِدُهُ مَكْتُوبًا: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا فَظٌّ وَلَا غَلِيظٌ، وَلَا صَخَّابا بالأَسْوَاقِ، وَلَا يَجْزِي بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ، وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَغْفِرُ، وَأُمَّتُهُ الْحَمَّادُونَ يُكَبِّرُونَ اللَّهَ عَزَّوَجَلَّ عَلَى كُلِّ نَجْدٍ، وَيَحْمَدُونَهُ فِي كُلِّ مَنْزِلَةٍ، يَتَأَزَّرُونَ عَلَى أَنْصَافِهِمْ، وَيَتَوَضَّئُونَ عَلَى أَطْرَافِهِمْ، مُنَادِيهِمْ يُنَادِي فِي جَوِّ السَّمَاءِ، صَفُّهُمْ فِي الْقِتَالِ، وَصَفُّهُمْ فِي الصَّلَاةِ سَوَاءٌ، لَهُمْ بِاللَّيْلِ دَوِيٌّ كَدَوِيِّ النَّحْلِ مَوْلِدُهُ بِمَكَّةَ، وَمُهَاجَرُهُ بِطَيْبَةَ، وَمُلْكُهُ بِالشَّامِ»[١].

واتە: کەعب رضي الله عنه دەڵێ: بینیومانە (واتە: لە تەورات، دەربارەی وەسفی پێغەمبەری خوا ﷺ) نوسراوە: موحەممەد پێغەمبەری خوایە، نە خوڕەوشتی خراپە و نەتوند وتیژیشە، وە نە دەنگیشی بەرزدەکاتەوە لە بازاڕدا، وەڵامی خراپەش بە خراپە ناداتەوە، بەڵکو لێ خۆشبوو و لێ بوردەیە، وە گەل و ئوممەتەکەشی (سیفەتیان وایە) زۆر ستاییشی خوا دەکەن (یان زۆر سورەتی فاتیحە دەخوێنن، کە خۆی ستاییشە)، اللّٰه أكبر دەکەن (خوا بە گەورە دەگرن) لەسەر هەموو بەرزاییەکدا (کە پیایدا تێپەڕ دەبن)، وە ستاییش و (الحمد لله) دەکەن لەناو هەموو شیو و دۆڵێک و نزمایییەکدا (کاتێ پیایدا تێپەڕ دەبن)، شەرواڵیان تا ناوەڕاستی قاچیان هەڵدەکەن (واتە هەموو کات بۆ عیبادەت توند و تۆڵ و ئامادەن، وەک ئەو کەسەی کارێک ئەنجام دەدات بە چوستی و ئامادەباشی، چۆن خۆی تا چۆکەکانی هەڵدەکات)، وە دەست و پێ و دەم و چاویان دەشۆرن (واتە: دەستنوێژ دەشۆرن)، بانگبێژەکەیان بانگ دەکات (بۆ نوێژ) لە بەرزاییەوە، ڕیزەکانیان بۆ جەنگ و جیهادو هەروەها ڕیزەکانیان بۆ نوێژ وەکو یەکە (بۆ هەردووکیان تۆکمەن و ڕیز دەبەستن)، بە شەوانیش گیزەگیزیانە وەک گیزەگیزی هەنگ (واتە: شەونوێژو زیکرو یادی خوا دەکەن و بە جۆش و خرۆشەوە ورتە ورتی زیکرو قورئان و ئەورادیان دێت)، شوێنی لەدایکبونی (ئەو پێغەمبەرە) مەککەیەو، شوێنی هیجرەت بۆ کردنیشی تەیبەیە (واتە شاری مەدینەیە)، وە دەسەڵات و هێزو دین و پێغەمبەرایەتیەکەشی (زیاتر) لە شام کۆدەبێتەوە.

٦- «عَنِ ابْنِ سَلَامٍ رضي الله عنه، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِنَّا لَنَجِدُ صِفَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا، وَحِرْزًا لِلْأُمِّيِّينَ، أَنْتَ عَبْدِي وَرَسُولِي، سَمَّيْتُهُ الْمُتَوَكِّلَ، لَيْسَ بِفَظٍّ وَلَا غَلِيظٍ، وَلَا صَخَّابٍ بالأَسْوَاقِ، وَلَا يَجْزِي بِالسَّيِّئَةِ مِثْلَهَا، وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَتَجَاوَزُ، وَلَنْ أَقْبِضَهُ حَتَّى يُقِيمَ الْمِلَّةَ الْمُتَعَوِّجَةَ بِأَنْ يُشْهَدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، نَفْتَحُ بِهِ أَعْيُنًا عُمْيًا وَآذَانًا صُمًّا وَقُلُوباً غُلْفًا»[٢].

---

(١) ـ مرسل بسند صحيح.

(٢) موقوف بسند صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی سەلام ﷺ گێڕدراوەتەوە كە دەیوت: بە دڵنیایی ئێمە سیفەتی پێغەمبەری خوامان ﷺ دەبینی (واتە: سیفەتەكانی لەتەوڕات باس كراوەكە خوا فەرموویەتی): ئێمە تۆمان ڕەوانەكردووە بە شاهێدیدەر (بۆ پێغەمبەران و ئوممەتەكەت) و، بە موژدەدەر (بۆ باوەڕداران) و، بەترسێنەر (بۆكافر و ستەمكاران) و، بەپارێزەر بۆ عەرەبەكان (لەسزای دونیایی، بەوەی وەک گەلانی تری پێش ئیسلام سزای دونیایی نەیانگرێتەوە، وەک عاد و سەموودو قەومی فیرعەون ... هتد)، (وە پێی فەرمووە): تۆ بەندە و پێغەمبەری منی، ناوم ناوە پشت بە خوا بەستوو، نە خوڕەوشتی خراپە و، نە توندووتیژیشە و، نەدەنگیشی بەرزدەكاتەوە لە بازاڕ، وەڵامی خراپە بە خراپە ناداتەوە، بەڵكو لێ خۆشبوو و لێ بوردەیە چاوپۆشی دەكات، وە نایبەمەوەو نایمرێنم تاوەكو گەلی خوارو خێچ (گومڕا) ڕاست دەكاتەوە، تاوەكو شاهێدی دەدرێت كە هیچ خودایەكی بە هەق نیە جگە لە (اللَّه)، چاوانێكی كوێر (لەئاست هەق و ڕاستی) و گوێچكانێكی كەڕ (لەئاست بیستنی هەق) و دڵێكی داپۆشراو (بە كوفر و گومڕایی) بەو پێغەمبەرە دەكەینەوە و (ڕۆشنیان دەكەین).

٧ـ «عَنْ كَعْبٍ ﷺ فِي السَّطْرِ الْأَوَّلِ: «مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، عَبْدِي الْمُخْتَارُ، لَا فَظٌّ، وَلَا غَلِيظٌ وَلَا صَخَّاباً فِي الْأَسْوَاقِ، وَلَا يَجْزِي بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ، وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَغْفِرُ، مَوْلِدُهُ، بِمَكَّةَ، وَهِجْرَتُهُ بِطَيْبَةَ، وَمُلْكُهُ بِالشَّامِ» وَفِي السَّطْرِ الثَّانِي: «مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، أُمَّتُهُ الْحَمَّادُونَ يَحْمَدُونَ اللَّهَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ، يَحْمَدُونَ اللَّهَ فِي كُلِّ مَنْزِلَةٍ، وَيُكَبِّرُونَهُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ، رُعَاةُ الشَّمْسِ يُصَلُّونَ الصَّلَاةَ، إِذَا جَاءَ وَقْتُهَا، وَلَوْ كَانُوا عَلَى رَأْسِ كُنَاسَةٍ، وَيَأْتَزِرُونَ عَلَى أَوْسَاطِهِمْ، وَيُوَضِّئُونَ أَطْرَافَهُمْ، وَأَصْوَاتُهُمْ بِاللَّيْلِ فِي جَوِّ السَّمَاءِ كَأَصْوَاتِ النَّحْلِ»[١].

واتە: لە كەعب ﷺ گێڕدراوەتەوە (وتویەتی): لە بەشی یەكەم و دێڕی یەكەم (لە تەوڕاتدا نوسراوە): موحەممەد پێغەمبەری خوایە، بەندەی هەڵبژێردراوی منە، (قسەو كرداری) ناشیرین و قێزەوەن نیەو، دەنگ بەرزكەرەوەش نیە لە بازاڕدا و، بە خراپەش وەڵامی خراپە ناداتەوە، بەڵكو لێخۆشبووو لێبوردەیە، شوێنی لە دایكبوونی مەككەیەو، كۆچكردنیشی بۆ تەیبەیە (بۆ مەدینەیە)و، دەسەڵاتەكەشی (زیاتر) لە شامە.

لە بەشی دووەم و دێڕی دووەم نوسراوە: موحەممەد پێغەمبەری خوایە، گەلەكەی زۆر سوپاسگوزاری خوان، سوپاسی خوا دەكەن لە خۆشی و ناخۆشیدا، ستایشی خوا دەكەن لە هەموو شوێنێكدا، خوا بە گەورە دەگرن و (دەڵێن: اللَّه أكبر) لەسەر هەموو بەرزاییێكدا، چاودێری خۆر دەكەن (بۆ نوێژ كردن و) نوێژ دەكەن ئەگەر كاتی هات ئەگەرچی لەسەر خاشاكیش بن (ئەوە واناكات نوێژ واز لێ بێنن ئەگەرچی پیسی لەگەڵ نوێژیش ناگونجێ)، وە خۆیان تا ناوەڕاستی قاچیان هەڵدەكەن (واتە: هەموو كات چوست و چالاكن بۆ عیبادەت و كردەوەی چاک وەك ئەو كەسەی قاچەكانی تا ناوەڕاست هەڵدەكات تا چوست و چالاک بێت لە ئەنجامدانی كارەكەی)، وە بە ئاو (دەموچاو و دەست و قاچیان) دەشۆن (واتە: دەستنوێژ هەڵدەگرن)، وە دەنگیان بە شەوان لە ئاسماندا وەک هەنگ وایە (گیزە گیزیان دێت لەبەر قوڕئان خوێندن و زیكر و یادی خوا كردن).

---

(١) موقوف بسند ضعيف جدا.

٨ـ «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ سَأَلَ كَعْبَ الْأَحْبَارِ: كَيْفَ تَجِدُ نَعْتَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي التَّوْرَاةِ؟ فَقَالَ كَعْبٌ: «نَجِدُهُ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ يُولَدُ بِمَكَّةَ، وَيُهَاجِرُ إِلَى طَابَةَ، وَيَكُونُ مُلْكُهُ بِالشَّامِ وَلَيْسَ بِفَحَّاشٍ، وَلَا صَخَّابٍ فِي الْأَسْوَاقِ، وَلَا يُكَافِئُ بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ، وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَغْفِرُ، أُمَّتُهُ الْحَمَّادُونَ، يَحْمَدُونَ اللَّهَ فِي كُلِّ سَرَّاءَ، وَيُكَبِّرُونَ اللَّهَ عَلَى كُلِّ نَجْدٍ، يُوَضِّئُونَ أَطْرَافَهُمْ، وَيَأْتَزِرُونَ فِي أَوْسَاطِهِمْ، يُصَفُّونَ فِي صَلَاتِهِمْ كَمَا يُصَفُّونَ فِي قِتَالِهِمْ، دَوِيُّهُمْ فِي مَسَاجِدِهِمْ كَدَوِيِّ النَّحْلِ، يُسْتَمَعُ مُنَادِيهِمْ فِي جَوِّ السَّمَاءِ»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێردراوەتەوە كە پرسیاری لە (كەعب)ی ئەحبارِ كردوە، (ووتویەتی): چۆن وەسفی پێغەمبەری خوات ﷺ بینیوە لە تەوراتدا؟ كەعب وتی: بینیومانە (نوسراوە) موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵا لە دایک دەبێت لە شاری مەككە، وە كۆچ دەكات بۆ شاری طابە (كە شاری مەدینەیە)، دەسەڵاتەكەشی (زیاتر) لە شام كۆدەبێتەوە، (قسە و كرداریشی) ناشیرین و قێزەون نیە، وە دەنگ بەرزكەرەوەش نیە لە بازاڕدا، بە خراپەش وەڵامی خراپە ناداتەوە، بەڵكو لێ خۆشبوو و لێ بوردەیە، گەلەكەی زۆر سوپاس گوزاری خوان، سوپاسی خوا دەكەن لە هەموو خۆشیێكدا، خوا بە گەورە دەگرن و (دەڵێن: اللّٰه أكبر) لەسەر هەموو بەرزاییێكدا، بە ئاو (دەموچاو و دەست و قاچیان) دەشۆرن (واتە: دەستنوێژ دەشۆرن)، وە خۆیان تا ناوەڕاستی قاچیان هەڵدەكەن (واتە: هەموو كات چوست و چالاكن بۆ عیبادەت و كردەوەی چاک، وەک ئەو كەسەی قاچەكانی تا ناوەڕاست هەڵدەكات تا چوست و چالاک بێت لە ئەنجامدانی كارەكەی)، لە نوێژەكانیاندا ڕیز دەبەستن هەروەک چۆن ڕیز دەبەستن لە (جیهاد) كردنیاندا، گیزە گیزیان لە مزگەوتەكانیاندا وەک گیزە گیزی هەنگ وایە (لەبەر قورئان خوێندن و زیكر و یادی خوا كردن)، بانگی بانگبێژەكەیان (بۆ نوێژ و جیهاد) دەبیسترێت لە بەرزاییەوە (واتە: لەسەر شوێنی بڵندی وەک منارە و سەربان، یان بە بڵندگۆ) بانگ دەدەن.

٩ـ «عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ الْحَضْرَمِيِّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ إِلَيْكُمْ لَيْسَ بِوَهِنٍ، وَلَا كَسِلٍ، لِيُحْيِيَ قُلُوباً غُلْفًا، وَيَفْتَحَ أَعْيُنًا عُمْيًا، وَيُسْمِعَ آذَانًا صُمًّا، وَيُقِيمَ السُّنَّةَ الْعَوْجَاءَ، حَتَّى يُقَالَ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ»[2].

واتە: لە جوبەیری كوڕی نوفەیری حەضرەمی ﷺ گێردراوەتەوە، (وتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەدڵنیایی پێغەمبەرێكتان بۆ هاتوە كە لاواز نیە (لەوەرگرتنی وەحی) و كەمتەرخەمیش نیە (لەڕاگەیاندنی پەیامی خوا)، تاوەكو دڵێكی داپۆشراو (بە كوفر و شیرک و نەزانی) زیندوو بكاتەوە، وە تاوەكو چاوانێكی كوێر (لە ئاست ئیمان و ڕاستی) بكاتەوە و ڕۆشن ببنەوە، وە تاوەكو گوێچكانێک كە كەڕن (لە ئاست بیستنی هەق) وا لێبكات ببیستن، وە تاوەكو زمانانێكی خوار و خێچ (لە ئاست هەق) ڕاست بكاتەوە، تاوەكو دەوترێت: هیچ خوایەک نیە بەهەق تەنها (اللّٰه) نەبێت بەتاک و تەنها.

١٠ـ «عَنْ عَامِرٍ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ لَهُ إِلَيْهِ حَاجَةٌ، فَمَشَى مَعَهُ حَتَّى دَخَلَ قَالَ: فَإِحْدَى رِجْلَيْهِ فِي الْبَيْتِ وَالْأُخْرَى خَارِجَهُ كَأَنَّهُ يُنَاجِي، فَالْتَفَتَ فَقَالَ: أَتَدْرِي مَنْ كُنْتُ أُكَلِّمُ؟ إِنَّ هَذَا مَلَكٌ لَمْ أَرَهُ قَطُّ قَبْلَ يَوْمِي هَذَا، اسْتَأْذَنَ رَبَّهُ أَنْ يُسَلِّمَ عَلَيَّ، قَالَ: إِنَّا آتَيْنَاكَ أَوْ أَنْزَلْنَا الْقُرْآنَ فَصْلًا، وَالسَّكِينَةَ صَبْرًا، وَالْفُرْقَانَ وَصْلًا»[1].

واتە: لە عامر (واتە: لە پێشەوا شەعبی) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کارێکی لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ هەبوو، بۆیە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت تا پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ژوورەوە، پیاوەکە دەڵێت: (پێغەمبەری خوا) یەکێک لە قاچەکانی لە ژوورەوە بوو ئەوەیتریشیانی لە دەرەوە بوو، وەک ئەوەی لەبەرە خۆی قسە لەگەڵ کەسێک بکات قسەی دەکرد، (پیاوەکە دەڵێت) پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی دایەوەو فەرمووی: ئایا دەزانی قسەم لەگەڵ کێ دەکرد؟ (فەرمووی) ئەوە فریشتەیەک بوو هەرگیز نەمدیبوو پێشی ئێستا، مۆڵەتی لە خوا وەرگرتبوو کە بێت سەلامم لێ بکات، فەرمووی: ئێمە هاتوین بۆ لای تۆ یان قورئانمان دابەزاندووە بە جیاکەرەوە (لە نێوان هەق و ناهەق)و، لەسەرخۆییشمان دابەزاندووە بە ئارامی و، فورقانیشمان دابەزاندووە (کە دیسان مەبەستی قورئانە) بە لکێندراوی (لە نێوان ئایەتەکانی چیرۆکی پێغەمبەران و گەلەکانی پێشترو یاساکانی دین و ژین و...هتد).

١١ـ «عَنْ عَطِيَّةَ أَنَّهُ سَمِعَ رَبِيعَةَ الْجُرَشِيَّ رضي الله عنه يَقُولُ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ فَقِيلَ لَهُ: لِتَنَمْ عَيْنُكَ، وَلْتَسْمَعْ أُذُنُكَ، وَلِيَعْقِلْ قَلْبُكَ. قَالَ: فَنَامَتْ عَيْنِي، وَسَمِعَتْ أُذُنَايَ، وَعَقَلَ قَلْبِي قَالَ: فَقِيلَ لِي: سَيِّدٌ بَنَى دَاراً فَصَنَعَ مَأْدُبَةً، وَأَرْسَلَ دَاعِياً، فَمَنْ أَجَابَ الدَّاعِيَ دَخَلَ الدَّارَ، وَأَكَلَ مِنَ الْمَأْدُبَةِ، وَرَضِيَ عَنْهُ السَّيِّدُ، وَمَنْ لَمْ يُجِبِ الدَّاعِيَ لَمْ يَدْخُلِ الدَّارَ، وَلَمْ يَطْعَمْ مِنَ الْمَأْدُبَةِ، وَسَخِطَ عَلَيْهِ السَّيِّدُ، قَالَ: فَاللَّهُ السَّيِّدُ، وَمُحَمَّدٌ الدَّاعِي، وَالدَّارُ الإِسْلَامُ، وَالْمَأْدُبَةُ الْجَنَّةُ»[2].

واتە: لە عەتییەی کوڕی قەیس گێڕدراوەتەوە کە گوێی لە ڕەبیعەی کوڕی عەمرِی جورەشی رضي الله عنه بووە کە دەیوت: (فریشتە) هاتوون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺو پێی ووتراوە: (با چاوەکانت بخەون و گوێچکەکانت ببیستن و دڵیشت هەشیار بێت).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لەو کاتەی ئاوایان وت) چاوەکانم خەووتن و گوێچکەکانم گوێبیست بوون و دڵیشم هەشیار بوو و تێ دەگەیشت). پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: پێم وترا (واتە: فریشتەکان قسەیان بۆ دەکردم و منیش ئاگام لێ بوو بە خەوتویی) کە (نمونەیەکیان دەهێنایەوە) و دەیان وت: ((گەورە ماڵێکی دروست کردووە و خواردنێکی ئامادە کردووە و بانگ بێژێکی ناردووە (تا بۆ دەعوەتەکە خەڵک بانگ بکات)، جا هەر کەسێک وەڵامی بانگ بێژەکەی دابێتەوە ئەوە چۆتە ناو ماڵەکە و لە خواردنەکەشی خواردووە گەورەکەش لێی ڕازی بووە، هەر کەسێکیش وەڵامی بانگ

---

(١) ـ مرسل بسند صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

بێژەكەی نەدابێتەوە، ئەوە نەچۆتە ناو ماڵەكە و لە خواردنەكەشی نەخواردووە و گەورەكەش لێی زویر بووە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (لەو نمونەیە): (خوا گەورەكەیە و، موحەممەد بانگ بێژەكەیە و، خانووەكەش ئیسلامە و، خواردنەكەش بەهەشتە).

سەرنج: جا مسوڵمانان ئەوەش یەكێكە لە موعجیزەكانی پێغەمبەرە خۆشەویستەكەمان، بینیتان نمونەی فریشتەكانی چۆن گوێ لێ بوو بە خەوتوویی و، دواتر دڵی چەند بە جوانی لە نمونەكە تێگەیشت و چۆن لێكی دایەوە هەر بە خەوتوویی (بە دایك و باوكەوە بە قوربانت بین ئەی ئەو كەسەی هەموو كات دڵە پاكەكەت هۆشیار بووە).

١٢ـ «عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ إِلَى الْبَطْحَاءِ وَمَعَهُ ابْنُ مَسْعُودٍ فَأَقْعَدَهُ، وَخَطَّ عَلَيْهِ خَطًّا، ثُمَّ قَالَ: لاَ تَبْرَحَنَّ فَإِنَّهُ سَيَنْتَهِي إِلَيْكَ رِجَالٌ فَلاَ تُكَلِّمْهُمْ، فَإِنَّهُمْ لَنْ يُكَلِّمُوكَ، فَمَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَيْثُ أَرَادَ، ثُمَّ جَعَلُوا يَنْتَهُونَ إِلَى الْخَطِّ لاَ يُجَاوِزُونَهُ، ثُمَّ يَصْدُرُونَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ حَتَّى إِذَا كَانَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ جَاءَ إِلَيَّ فَتَوَسَّدَ فَخِذِي، وَكَانَ إِذَا نَامَ نَفَخَ فِي النَّوْمِ نَفْخاً، فَبَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَوَسِّدٌ فَخِذِي رَاقِدٌ إِذْ أَتَانِي رِجَالٌ كَأَنَّهُمُ الْجِمَالُ، عَلَيْهِمْ ثِيَابٌ بِيضٌ اللَّهُ أَعْلَمُ مَا بِهِمْ مِنَ الْجَمَالِ، حَتَّى قَعَدَ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ عِنْدَ رَأْسِهِ وَطَائِفَةٌ مِنْهُمْ عِنْدَ رِجْلَيْهِ، فَقَالُوا بَيْنَهُمْ: مَا رَأَيْنَا عَبْداً أُوتِيَ مِثْلَ مَا أُوتِيَ هَذَا النَّبِيُّ، إِنَّ عَيْنَيْهِ لَتَنَامَانِ وَإِنَّ قَلْبَهُ لَيَقْظَانُ، اضْرِبُوا لَهُ مَثَلاً: سَيِّدٌ بَنَى قَصْراً ثُمَّ جَعَلَ مَأْدُبَةً، فَدَعَا النَّاسَ إِلَى طَعَامِهِ وَشَرَابِهِ، ثُمَّ ارْتَفَعُوا وَاسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ، فَقَالَ لِي: أَتَدْرِي مَنْ هَؤُلاَءِ؟ قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: هُمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَقَالَ: هَلْ تَدْرِي مَا الْمَثَلُ الَّذِي ضَرَبُوهُ؟، قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: الرَّحْمَنُ بَنَى الْجَنَّةَ، فَدَعَا إِلَيْهَا عِبَادَهُ، فَمَنْ أَجَابَهُ دَخَلَ جَنَّتَهُ، وَمَنْ لَمْ يُجِبْهُ عَاقَبَهُ وَعَذَّبَهُ»[١].

واتە: لە باوكی عوسمانی نەهدیەوە گێردراوەتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ (جارێكیان) دەرچوو بۆ شوێنێكی چۆڵی بەردەڵێن (لە دەوروبەری شاری مەككە)و، عەبدوڵڵای كوڕی مەسعودیشی لەگەڵ بوو، (پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدوڵڵای كوڕی مەسعودی دانیشاندو، بازنەیەكی بە دەورەدا كێشاو، دواتر فەرمووی: (ئێرە بەجێ نەهێڵی، كەمێكیتر چەندین پیاو دەگەن بە تۆ و قسەیان لەگەڵ نەكەیت، ئەوانیش قسەت لەگەڵ ناكەن)، دەڵێت: جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت بۆ ئەو شوێنەی دەیویست، دواتر پیاوەكان هاتن تا لای بازنەكەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەورمدا كێشابووی و لە بازنەكە تێپەڕ نەبوونو نەگەیشتن بە من، دواتر چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، جا كاتێ كۆتایی شەو داهات پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە بۆ لام و سەری لەسەر ڕانم دانا و خەوت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو لە كاتی خەو هەناسەی قوڵی هەڵدەمژی و دەیدایەوە، جا لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ سەری بە ڕانم كردبوو و خەوتبوو، لەناكاو چەند پیاوێك هاتن بۆ لام كە زۆر جوان و باڵا بەرز بوون، جلی سپیان لەبەردابوو هەر خوا دەزانێ چەندە جوان بوون! هاتن تاوەكو هەندێكیان دانیشتن لای سەری پێغەمبەری خوا ﷺو، هەندێكی تریشیان لای قاچەكانی دانیشتن، لە نێوان خۆیاندا ووتیان:

---

(١) ـ إسناده حسن لذاته، صحيح لغيره.

نەمان بینیوە هیچ بەندەیەک چاکەی زۆری پێدرابێ وەک دراوە بەم پێغەمبەرە، وتیان: ئەم پێغەمبەرە، چاوەکانی دەخەون، دڵیشی بە خەبەرە، ئا دەی نمونەیەکی بۆ بێننەوە (تاوەکو بەکرداری بزانرێت چۆن گوێبیست دەبێت و لێشی تێ دەگات) ووتیان: گەورە کۆشکێکی دروست کردووە دواتر خوانێکی داناوە و، خەڵکی بۆ خواردن و خواردنەوەکە بانگهێشت کردووە)، دواتر پیاوەکان هەڵسان ڕۆیشتن، پێغەمبەری خواش ﷺ لەو کاتەدا خەبەری بوویەوەو فەرمووی: ئایا دەزانی ئەمانە کێ بوون؟ ووتم: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ئەمانە فریشتە بوون، هەروەها فەرمووی: ئەو نموونەیە چی بوو کە هێنایانەوە؟ ووتم: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: خوای میهرەبان بەهەشتی دروست کردوە، بەندەکانیشی بۆ بانگێشت کردوە، جا هەر کەسێک وەڵامی بانگێشت کردنەکە بداتەوە، دەچێتە بەهەشتەکەی خوا، وە ئەوەی وەڵامیشی نەداتەوە، ئەوە خوا سزای دەدات.

## بابەت: چۆنیەتی سەرەتای ژیان و کاروباری پێغەمبەری خوا ﷺ

١٣ـ «حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَمْرٍو السُّلَمِيُّ عَنْ عُتْبَةَ بْنِ عَبْدٍ السُّلَمِيِّ أَنَّهُ حَدَّثَهُمْ وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَهُ رَجُلٌ: كَيْفَ كَانَ أَوَّلُ شَأْنِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: كَانَتْ حَاضِنَتِي مِنْ بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ، فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَابْنٌ لَهَا فِي بَهْمٍ لَنَا، وَلَمْ نَأْخُذْ مَعَنَا زَاداً، فَقُلْتُ: يَا أَخِي اذْهَبْ فَأْتِنَا بِزَادٍ مِنْ عِنْدِ أُمِّنَا، فَانْطَلَقَ أَخِي وَمَكَثْتُ عِنْدَ الْبَهْمِ، فَأَقْبَلَ طَائِرَانِ أَبْيَضَانِ كَأَنَّهُمَا نَسْرَانِ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: أَهُوَ هُوَ؟ قَالَ الآخَرُ: نَعَمْ. فَأَقْبَلاَ يَبْتَدِرَانِي، فَأَخَذَانِي فَبَطَحَانِي لِلْقَفَا، فَشَقَّا بَطْنِي، ثُمَّ اسْتَخْرَجَا قَلْبِي فَشَقَّاهُ، فَأَخْرَجَا مِنْهُ عَلَقَتَيْنِ سوداوَيْنِ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: ائْتِنِي بِمَاءِ ثَلْجٍ فَغَسَلَ بِهِ جَوْفِي، ثُمَّ قَالَ: ائْتِنِي بِمَاءِ بَرَدٍ فَغَسَلَ بِهِ قَلْبِي، ثُمَّ قَالَ: ائْتِنِي بِالسَّكِينَةِ. فَذَرَّهُ فِي قَلْبِي، ثُمَّ قَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: حُصْهُ. فَحَاصَهُ وَخَتَمَ عَلَيْهِ بِخَاتَمِ النُّبُوَّةِ، ثُمَّ قَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: اجْعَلْهُ فِي كَفَّةٍ، وَاجْعَلْ أَلْفاً مِنْ أُمَّتِهِ فِي كَفَّةٍ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَإِذَا أَنَا أَنْظُرُ إِلَى الأَلْفِ فَوْقِي، أُشْفِقُ أَنْ يَخِرَّ عَلَيَّ بَعْضُهُمْ، فَقَالَ: لَوْ أَنَّ أُمَّتَهُ وُزِنَتْ بِهِ لَمَالَ بِهِمْ. ثُمَّ انْطَلَقَا وتركَانِي، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَفَرِقْتُ فَرَقاً شَدِيداً، ثُمَّ انْطَلَقْتُ إِلَى أُمِّي فَأَخْبَرْتُهَا بِالَّذِي لَقِيتُ، فَأَشْفَقَتْ أَنْ يَكُونَ قَدِ الْتُبِسَ بِي، فَقَالَتْ: أُعِيذُكَ بِاللَّهِ، فَرَحَّلَتْ بَعِيراً لَهَا فَجَعَلَتْنِي عَلَى الرَّحْلِ، وَرَكِبَتْ خَلْفِي حَتَّى بَلَغْنَا إِلَى أُمِّي فَقَالَتْ: أَدَّيْتُ أَمَانَتِي وَذِمَّتِي. وَحَدَّثْتُهَا بِالَّذِي لَقِيتُ، فَلَمْ يَرُعْهَا ذَلِكَ، وَقَالَتْ: إِنِّي رَأَيْتُ حِينَ خَرَجَ مِنِّي تَعْنِي نُوراً أَضَاءَتْ مِنْهُ قُصُورُ الشَّامِ»[1].

واتە: لە عوتبەی کوڕی عەبدی سولەمیەوە گێردراوەتەوە ـ کە یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کردوون کە پیاوێک بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتای کاروبارو ژیانت چۆن بوو؟ (مەبەستی دەستپێکی پێغەمبەراتییە) فەرمووی: چاودێرو پەروەردەکارم ئافرەتێک بوو لەنەوەی سەعدی کوڕی بەکر، (ڕۆژێکیان) من و کوڕێکی ئافرەتەکە چووین بۆلای بەرخەکانمان و، هیچ خۆراکێکیشمان لەگەڵ خۆمان نەبردبوو، (بۆیە) وتم براکەم برۆ خواردنێکمان بۆ بێنە لەلای دایکمان، براشم ڕۆیشت، منیش مامەوە لە لای بەرخەکان، جا دوو باڵداری سپی هاتن دەڵێی باز بوون، یەکێکیان بە ئەویتریانی ووت: ئەوە هەوە؟ ئەوەیتر وتی: بەڵێ، هەردووکیان ڕوویان تێ کردم و بەپەلە گرتمیان و،

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح لغيره.

خستمیانە سەر زەوی لەسەر پشت و، هەردووکیان سکیان شەق کردم دواتر دڵیان دەرهێنام و، شەقیان کرد و، دوو پارچە گۆشتی ڕەشیان تیادا دەرهێنا، یەکێکیان بە ئەوەیتریانی ووت: ئاوی بەفرم بۆ بێنە، ناو هەناوی پێ شۆردم، دواتر وتی: ئاوی تەزرەم بۆ بێنە، دڵی پێ شۆردم و، دواتر وتی: سەکینەت و دڵنیاییم بۆ بێنەو خستیە ناو دڵم، دواتر یەکێکیان بە هاوڕێکەی ووت: بیدوورەوە، ئەویش دووریەوە و، (نێوان شانەکانی) مۆر کرد بە مۆری پێغەمبەرایەتی، دواتر یەکێکیان بە هاوڕێیەکەی ووت: بیخەرە ناو لایەکی تەرازوو هەزار کەسیش لە ئوممەتەکەی بخەرە ناو لایەکەی تری تەرازووەکە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: وەک ئەوە وایە (ئێستا) لەبەرچاوم بێت سەیری هەزار کەسەکە دەکەم لەسەروی منەوە (کە بەهۆی قورسایی منەوە لا تەرازووەکەیان بەرزبوویەوە) دەترسام هەندێکیان بکەون بەسەرمدا، فریشتەکە وتی: ئەگەر هەموو ئوممەتەکەشی لەگەڵ بکێشرێت بەسەریاندا زاڵ دەبێت، دواتر ڕۆیشتن و جێیان هێشتم، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: زۆر ترسام چووم بۆ لای دایکم (حەلیمە) و پێم ڕاگەیاند ئەوەی بەسەرم هات، ئەویش ترسا لەوەی ئەو شتەی بەسەرم هات جارێکی تر تووشم ببێتەوە و وتی: پەنات دەدەم بە (الله)، جا سواری وشترێکی خۆی بوو، منی لەسەر کورتانەکەی سوار کرد و، خۆیشی لە دواوە سوار بوو تا گەیشتینە لای دایکم (ئامینە)، (حەلیمە) وتی: سپاردەکەم بەجێ گەیاند ئەوەی لەئەستۆم بوو، وە ئەوەی بەسەرمدا هاتبوو بۆ دایکمی باس کرد، (بەڵام) ئەوە دایکمی نەترساند و وتی: من بینیومە (لە خەودا) کاتێک شتێکم لێ دەرچوو (واتە: ڕووناکییەکم لێ دەرچوو) کۆشکەکانی شامی ڕووناک کردەوە.

١٤ـ «عَنْ أَبِي ذَرّ الْغِفَارِيِّ رضي الله عنه قَالَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَيْفَ عَلِمْتَ أَنَّكَ نَبِيٌّ حَتَّى اسْتَيْقَنْتَ؟ فَقَالَ: «يَا أبا ذَرّ أَتَانِي مَلَكَانِ وَأَنَا بِبَعْضِ بَطْحَاءِ مَكَّةَ، فَوَقَعَ أَحَدُهُمَا إِلَى الأَرْضِ وَكَانَ الآخَرُ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: أَهُوَ هُوَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَزِنْهُ بِرَجُلٍ. فَوُزِنْتُ بِهِ فَوَزَنْتُهُ، ثُمَّ قَالَ: زِنْهُ بِعَشَرَةٍ. فَوُزِنْتُ بِهِمْ فَرَجَحْتُهُمْ، ثُمَّ قَالَ: زِنْهُ بِمِائَةٍ فَوُزِنْتُ بِهِمْ فَرَجَحْتُهُمْ، ثُمَّ قَالَ: زِنْهُ بِأَلْفٍ فَوُزِنْتُ بِهِمْ فَرَجَحْتُهُمْ، كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِمْ يَنْتَثِرُونَ عَلَيَّ مِنْ خِفَّةِ الْمِيزَانِ، قَالَ فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: لَوْ وَزَنْتَهُ بِأُمَّتِهِ لَرَجَحَهَا»[1].

واتە: لە ئەبو ذەڕی غیفاریەوە رضي الله عنه گێردراوەتەوە: دەڵێت: ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن زانیت تۆ پێغەمبەری تاوەکو دڵنیا بووی؟ فەرمووی: ئەی ئەبو ذەڕ دوو فریشتە هاتن بۆ لام و، منیش لە چۆڵەوانییێکی مەککە بووم، یەکێکیان هاتە سەر زەوی و، ئەوەیتریشیان لە نێوان ئاسمان و زەویدا بوو، یەکێکیان بە هاوڕێکەی ووت: ئەوە هەوە؟ (ئەوەی تر) وتی: بەڵێ، وتی: بیکێشە بە کێشی پیاوێک، جا کێش کرام بە پیاوێک من بە سەنگتر دەرچووم لەو، دواتر وتی: بیکێشە بەکێشی دە پیاو، جا کێش کرام بەوان و لەوانیش بە سەنگتر دەرچووم، دواتر وتی: بیکێشە بە کێشی سەد پیاو، جا کێش کرام بەوان و لەوانیش بە سەنگتر دەرچووم، دواتر وتی: بیکێشە بە کێشی هەزار پیاو، جا کێش کرام بەوان و لەوانیش بە سەنگتر دەرچووم، وەک ئەوە وایە ئێستا سەیریان بکەم (ڕووداوەکەم لەبەر چاوە) کە

---

(١) ـ رجال إسناده موثوقون إلا أنه منقطع.

چۆن پیاوەکان دەڕژان بەسەرمدا لەبەر سوکی لای تەرازوەکەیان و (بڵند بوونیان)، فەرمووی: یەکێکیان بە هاوڕێیەکەی ووت: ئەگەر بیکێشی بە کێشی ئوممەت و گەلەکەشی هەر بە سەنگتر دەردەچێت.

١٥ـ «عَنْ أَبِي صَالِحٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُنَادِيهِمْ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا أَنَا رَحْمَةٌ مُهْدَاةٌ»[١].

واتە: لە ئەبو صاڵحەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی دەکردن دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە من تەنها ڕەحمەت و ڕێ نیشاندەرم.

## بابەت: ئەو شتانەی خوا ڕێزی پێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوە، لە بڕوا هێنانی درەخت و گیانلەبەران و جنۆکەو پەری

١٦ـ «عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ فَأَقْبَلَ أَعْرَابِيٌّ، فَلَمَّا دَنَا مِنْهُ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: إِلَى أَهْلِي، قَالَ: هَلْ لَكَ فِي خَيْرٍ؟ قَالَ: وَمَا هُوَ؟ قَالَ: «تَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، فَقَالَ: وَمَنْ يَشْهَدُ عَلَى مَا تَقُولُ؟ قَالَ: هَذِهِ السَّلَمَةُ، فَدَعَاهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهِيَ بِشَاطِئِ الْوَادِي، فَأَقْبَلَتْ تَخُدُّ الأَرْضَ خَدًّا حَتَّى قَامَتْ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَاسْتَشْهَدَهَا ثَلاَثاً فَشَهِدَتْ ثَلاَثاً أَنَّهُ كَمَا قَالَ، ثُمَّ رَجَعَتْ إِلَى مَنْبَتِهَا، وَرَجَعَ الأَعْرَابِيُّ إِلَى قَوْمِهِ، وَقَالَ: إِنِ اتَّبَعُونِي أَتَيْتُكَ بِهِمْ، وَإِلاَّ رَجَعْتُ فَكُنْتُ مَعَكَ»[٢].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە سەفەرێکدا، جا پیاوێکی دەشتەکی هات، کاتێک نزیک بوویەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: دەتەوێ بۆ کوێ بچی؟ کابراش وتی: بۆ لای خزم و کەسەکانم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا چاکترین شتت دەوێ؟ کابرا وتی: ئەو شتە چیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەیە شاهێدی بدەی کە هیچ پەرستراوێک نیە بە هەق جگە لە الله تاک و تەنیایە و بێ هاوبەشە، وە موحەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە، پیاوەکە وتی: کێ شاهێدی لەسەر ئەو بانگەشەیە دەدات کە وتت (بەڵگەی ڕاستی ئەو پەیامەت چیە)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم درەختە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی درەختەکەی کرد کە لە کەناری دۆڵەکەدا بوو، جا ڕاستەوخۆ درەختەکەش هات، بە شێوەیەک زەوی بەردەمی خۆی هەڵدەدڕی بە ڕەگەکانی، تا لەبەر دەمی پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا، پێغەمبەری خواش ﷺ سێ جار داوای شایەدی هێنانی لێ کرد، درەختەکەش سێ جار شایەدی هێنا وەک پێغەمبەری خوا ﷺ، دواتر گەڕایەوە شوێنی خۆی، پیاوە دەشتەکیەکەش ویستی بگەڕێتەوە بۆ ناو خزم و کەسەکانی و وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا) ئەگەر خزم و کەسەکانم دوام کەوتن و مسوڵمان بوون، ئەوە دەیان هێنم بۆ لای جەنابت، ئەگەر دواشم نەکەوتن ئەوە من دەگەڕێمەوەو لەگەڵ تۆ دەبم.

---

(١) ـ مرسل بسند صحيح.

(٢) ـ صحيح.

١٧ـ «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، وَكَانَ لاَ يَأْتِي الْبَرَازَ حَتَّى يَتَغَيَّبَ فَلاَ يُرَى، فَنَزَلْنَا بِفَلاَةٍ مِنَ الأَرْضِ لَيْسَ فِيهَا شَجَرٌ وَلاَ عَلَمٌ، فَقَالَ: يَا جَابِرُ اجْعَلْ فِي إِدَاوَتِكَ مَاءً ثُمَّ انْطَلِقْ بِنَا، قَالَ: فَانْطَلَقْنَا حَتَّى لاَ نُرَى، فَإِذَا هُوَ بِشَجَرَتَيْنِ بَيْنَهُمَا أَرْبَعُ أَذْرُعٍ، فَقَالَ: يَا جَابِرُ انْطَلِقْ إِلَى هَذِهِ الشَّجَرَةِ فَقُلْ: يَقُلْ لَكِ رَسُولُ اللَّهِ الْحَقِي بِصَاحِبَتِكِ حَتَّى أَجْلِسَ خَلْفَكُمَا، فَرَجَعَتْ إِلَيْهَا، فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَلْفَهُمَا ثُمَّ رَجَعَتَا إِلَى مَكَانِهِمَا، فَرَكِبْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَرَسُولُ اللَّهِ بَيْنَنَا كَأَنَّمَا عَلَيْنَا الطَّيْرُ تُظِلُّنَا، فَعَرَضَتْ لَهُ امْرَأَةٌ مَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ ابْنِي هَذَا يَأْخُذُهُ الشَّيْطَانُ كُلَّ يَوْمٍ ثَلاَثَ مِرَارٍ. قَالَ: فَتَنَاوَلَ الصَّبِيَّ فَجَعَلَهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ مُقَدَّمِ الرَّحْلِ، ثُمَّ قَالَ: اخْسَأْ عَدُوَّ اللَّهِ أَنَا رَسُولُ اللَّهِ، اخْسَأْ عَدُوَّ اللَّهِ أَنَا رَسُولُ اللَّهِ، ثَلاَثاً ثُمَّ دَفَعَهُ إِلَيْهَا، فَلَمَّا قَضَيْنَا سَفَرَنَا مَرَرْنَا بِذَلِكَ الْمَكَانِ فَعَرَضَتْ لَنَا الْمَرْأَةُ مَعَهَا صَبِيُّهَا، وَمَعَهَا كَبْشَانِ تَسُوقُهُمَا فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اقْبَلْ مِنِّي هَدِيَّتِي، فَوَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا عَادَ إِلَيْهِ بَعْدُ، فَقَالَ: خُذُوا مِنْهَا وَاحِداً وَرُدُّوا عَلَيْهَا الآخَرَ، قَالَ: ثُمَّ سِرْنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَنَا كَأَنَّمَا عَلَيْنَا الطَّيْرُ تُظِلُّنَا، فَإِذَا جَمَلٌ نَادٌّ حَتَّى إِذَا كَانَ بَيْنَ سِمَاطَيْنِ خَرَّ سَاجِداً، فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ عَلَيَّ النَّاسَ: مَنْ صَاحِبُ الْجَمَلِ؟ فَإِذَا فِتْيَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ قَالُوا: هُوَ لَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: فَمَا شَأْنُهُ؟ قَالُوا: اسْتَنَيْنَا عَلَيْهِ مُنْذُ عِشْرِينَ سَنَةً، وَكَانَتْ بِهِ شُحَيْمَةٌ فَأَرَدْنَا أَنْ نَنْحَرَهُ فَنُقَسِّمَهُ بَيْنَ غِلْمَانِنَا، فَانْفَلَتَ مِنَّا. قَالَ: بِيعُونِيهِ، قَالُوا: لاَ بَلْ هُوَ لَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: أَمَّا لِي فَأَحْسِنُوا إِلَيْهِ حَتَّى يَأْتِيَهُ أَجَلُهُ، قَالَ الْمُسْلِمُونَ عِنْدَ ذَلِكَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَحْنُ أَحَقُّ بِالسُّجُودِ لَكَ مِنَ الْبَهَائِمِ. قَالَ: لاَ يَنْبَغِي لِشَيْءٍ أَنْ يَسْجُدَ لِشَيْءٍ، وَلَوْ كَانَ ذَلِكَ كَانَ النِّسَاءُ لأَزْوَاجِهِنَّ»[١].

واتە: لە جابر ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووم بۆ سەفەرێک، جا پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو نەدەچوو بۆ سەر ئاو تاوەکو ئەوەندە دوور دەکەوتەوە لەبەر چاو ون دەبوو، جا لەسەفەرەکەماندا لە شوێنێکی چۆڵ مەنزڵمان دانا، کە نە درەخت و، نە شتێکی بەرزی لێ نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەی جابر ئاو بخەرە ناو مەتارەکەت و لەگەڵ خۆمان بیهێنە).

جابر ﷺ دەڵێ: ڕۆیشتین بەو ئەندازەیەی نەدەبینراین، لەوێ دوو درەختی لێ بوو کە نێوانیان چوار ئانیشک دەبوو کە دەکاتە نزیکەی (٢٥٦) سم (واتە بەو ئەندازەیە لێک دوور بوون)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی جابر بڕۆ بۆ لای ئەو درەختە و پێی بڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ (فەرمانت پێ دەکات) و پێت دەفەرموێت خۆت بلکێنە بە درەختە هاوڕێکەت، تاوەکو لە دواوەتان دابنیشم ـ بۆ دەست بە ئاو گەیاندن ـ جابر دەڵێ: منیش وام کرد، درەختەکەش چوو بۆ لای درەختەکەیتر، پێغەمبەری خواش ﷺ لە دواوەیانەوە دانیشت، دواتر هەردوو درەختەکە گەڕانەوە شوێنی خۆیان.

جابر دەڵێ: (دواتر) سواری وڵاغەکانمان بووین لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا لە نێوانماندا بوو (ئێمەش ئاوا هەڵسوکەوتمان لەگەڵ پێغەمبەری خوا دەکرد) وەک ئەوەی باڵندە لەسەر سەرمان نیشتبێت (واتە چۆن کەسێک باڵندە لەسەر سەری نیشتبێت چۆن خۆی لە جووڵە دەخات لە ترسی فڕینی باڵندەکە، ئێمەش بە شێوەیەکی زۆر جوان ڕێزی پێغەمبەری خوامان ﷺ دەگرت و زۆر ئاگامان لە هەڵس و کەوتمان بوو، لە ترسی ئەوەی نەوەک تووشی بێ ئەدەبی ببین لە بەرانبەر

---
(١) ـ إسناده ضعيف، والقصة صحيحة من طرق أخرى.

پێغەمبەری خوا ﷺ)، جا ئافرەتێک کە کوڕێکی بچکۆڵانەی خۆی لەگەڵ بوو تووشی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم کوڕەم هەموو ڕۆژێک سێ جار شەیتان دەیگرێت و تەندروستی تێک دەچێت (واتە: جنی کافری لە لەش دایە، کرداری ناڕەوای شێتان ئەنجام دەدات، لە هۆش خۆی دەچوو). جابر دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بەسەر وڵاغەکەیەوە منداڵەکەی وەرگرت و لە نێوان خۆی و پێشە کورتانەکەی دانا، دواتر (بە جنەکەی ناو لەشی منداڵەکەی) فەرموو: بڕۆ دوورکەرەوە ئەی دوژمنی خوا من پێغەمبەری خوام، بڕۆ دوورکەرەوە ئەی دوژمنی خوا من پێغەمبەری خوام، سێ جار (دووبارەی کردەوە)، دواتر منداڵەکەی دایەوە بە ئافرەتەکە.

جا دوای ئەوەی سەفەرەکەمان تەواو بوو و (گەڕاینەوە)، ڕۆیشتین بە هەمان شوێندا و، ئافرەتەکەمان تووش بوویەوە و، منداڵەکەشی لەگەڵ بوو، دوو (نێری)یشی بە پێشەخۆ دابوو، ئافرەتەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دیاریەکەمم لێ وەرگرە، سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق ڕەوانە کردووە کوڕەکەم لەو کاتەوە بەو لاوە حاڵەتەکەی بەسەر نەهاتۆتەوە ( و شەیتانەکەی) بۆی نەگەڕاوەتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (یەکێک لە نێریەکانی لێ وەربگرن و ئەوەیتریشیانی بدەنەوە).

جابر دەڵێ: دواتر ڕۆیشتین، پێغەمبەری خواش ﷺ لە نێوانماندا بوو، ئێمەش وەک ئەوەی باڵندە لەسەر سەرمان بێت ئاوابووین، لەناکاو وشترێکی هەڵاتوو هات تاوەکو گەیشتە نێوان دوو کۆمەڵە (کە لە دەورەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون)، (وشترەکە) کەوتە سەر ڕوو و کڕنووشی (بۆ پێغەمبەری خوا برد)، پێغەمبەری خواش ﷺ دانیشت و بە خەڵکەکەی فەرموو: کێ خاوەنی ئەم وشترەیە؟ کۆمەڵێک لە ئەنصارییەکانی مەدینە وتیان: ئەوە هی ئێمەیە ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەسەرهاتی ئەم وشترە چیە؟ ئەنصاریەکان وتیان: بیست ساڵە ئاودانی پێ دەکەین (هێزی نەماوە و) گۆشتی کەمیشی پێوەیە، بۆیە ویستمان سەری ببڕین و دابەشی بکەین بەسەر منداڵەکانمان، ئەویش ڕای کرد لە دەستمان.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا پێم دەفرۆشن؟ ووتیان: نەخێر، بەڵکو دەبێت بۆ جەنابت بێت بێ بەرانبەر، پێغەمبەری خواش فەرمووی: مادەم نایفرۆشن پێم، کەواتە (بێ بەرانبەر نامەوێت) بەڵام چاکەکار بن لەگەڵی تا خۆی دەمرێت، جا مسوڵمانان لەو کاتەی بینیان ئەو وشترە چۆن کڕنووشی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ برد، وتیان: ئێمە شایستەترین لە ئاژەڵ بەوەی کڕنووشت بۆ بەرین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆ مرۆڤ دروست نیە کڕنووش بۆ هیچ شتێک بەرێت، ئەگەر دروست بووایە ئەوە دەبوو ئافرەتان کڕنووشیان بۆ مێردەکانیان ببردایە.

**١٨ـ** «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: أَقْبَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى دَفَعْنَا إِلَى حَائِطٍ فِي بَنِي النَّجَّارِ، فَإِذَا فِيهِ جَمَلٌ لاَ يَدْخُلُ الْحَائِطَ أَحَدٌ إِلاَّ شَدَّ عَلَيْهِ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَأَتَاهُ فَدَعَاهُ، فَجَاءَ وَاضِعاً مِشْفَرَهُ فِي الأَرْضِ حَتَّى بَرَكَ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: هَاتُوا خِطَاماً، فَخَطَمَهُ وَدَفَعَهُ إِلَى صَاحِبِهِ، ثُمَّ الْتَفَتَ فَقَالَ: مَا بَيْنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ أَحَدٌ إِلاَّ يَعْلَمُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلاَّ عَاصِيَ الْجِنِّ وَالإِنْسِ»[1].

---

(١) ـ إسناده حسن.

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵڵا ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتین تاوەكو كەوتینە لای شوڕە و دیوارێک كە هی هۆزی بەنی نەججار بوو، كە وشترێكی چەموشی تیا بوو، هەر كەسێک بچوبایە ئەو دیوی دیوارەكە، وشترەكە كاردانەوەی توندی بەرانبەر دەنواند و ئازاری پێ دەگەیاند، جا ئەو بابەتەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ چوو بۆ لای وشترەكە و بانگی كرد، وشترەكەش هات، لێوەكانی لە زەوی دەخشاند، (هات هات) تاوەكو لەبەر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆكی دادا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: پەتێكم بۆ بێنن، بە پەتەكە لغاوی كرد و دای بە خاوەنەكەی، دواتر ئاوڕی دایەوە و فەرمووی: هەر شتێک لە ئاسمان و زەویدا هەبێت دەزانێت من پێغەمبەری خوام، تەنها جنۆكەو مرۆڤی بێ بڕوا نەبێت.

١٩- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ بِابْنٍ لَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ ابْنِي بِهِ جُنُونٌ، وَإِنَّهُ يَأْخُذُهُ عِنْدَ غَدَائِنَا وَعَشَائِنَا، فَيُخَبِّثُ عَلَيْنَا، فَمَسَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَدْرَهُ وَدَعَا، فَثَعَّ ثَعَّةً، وَخَرَجَ مِنْ جَوْفِهِ مِثْلُ الْجِرْوِ الأَسود فَسَعَى»[(١)].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێک كوڕێكی خۆی هێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ كوڕەكەم شێتە و، شێتیەكەش بەیانیان و ئێواران دەیگرێت و كاری خراپمان بەرانبەر دەكات (خواردنمان لێ پیس دەكات)، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی هێنا بە سینگی كوڕەكە و، دووعای بۆ كرد، كوڕەكەش ڕشانەوەیەكی هاتەوە و، لە نێو هەناویدا شتێكی وەک (گوجیلە سەگی ڕەش) هاتە دەرەوە و ڕای كرد.

٢٠- «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي لأَعْرِفُ حَجَراً بِمَكَّةَ كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُبْعَثَ، إِنِّي لأَعْرِفُهُ الآنَ»[(٢)].

واتە: لە جابری كوڕی سەمورەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من بەردێک دەناسم لە مەككە، هەموو جارێک سەلامی لێ دەكردم پێش ئەوەی ببم بە پێغەمبەر، ئێستاش دەیناسمەوە.

٢١- «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِمَكَّةَ، فَخَرَجْنَا مَعَهُ فِي بَعْضِ نَوَاحِيهَا، فَمَرَرْنَا بَيْنَ الْجِبَالِ وَالشَّجَرِ، فَلَمْ نَمُرَّ بِشَجَرَةٍ وَلاَ جَبَلٍ إِلاَّ قَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ»[(٣)].

واتە: لە عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەككە بووین، جا لەگەڵی دەرچووین بۆ هەندێ شوێنی مەككە، دەڕۆیشتین بە نێوان چیاكان و درەختەكان، جا بە لای هیچ درەخت و چیایێک تێپەڕ نەدەبووین تا (درەخت و چیاكان دەیان ووت): سەلامی خوات لەسەر بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ ضعيف.

٢٢- «عَنْ رَجُلٍ مِنْ مُزَيْنَةَ أَوْ جُهَيْنَةَ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْفَجْرَ فَإِذَا هُوَ بِقَرِيبٍ مِنْ مِائَةِ ذِئْبٍ قَدْ أَقْعَيْنَ، وُفُودُ الذِّئَابِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: تَرْضَخُوا لَهُمْ شَيْئاً مِنْ طَعَامِكُمْ وتأْمَنُونَ عَلَى مَا سِوَى ذَلِكَ، فَشَكَوْا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْحَاجَةَ قَالَ: فَآذِنُوهُنَّ، قَالَ: فَآذَنُوهُنَّ فَخَرَجْنَ وَلَهُنَّ عُوَاءٌ»[1].

واتە: لە پیاوێكی هۆزی موزەینە یان جوهەینە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی كرد، نزیكەی سەد گورگ هاتبوون و چیچكەیان كردبوو، بە نوێنەرایەتی گورگەكان (هاتبوون)، پێغەمبەری خواش ﷺ بە هاوەڵەكانی فەرموو: شتێكی كەم لە خۆراكی خۆتانیان پێ بدەن، دڵنیا و سەلامەت دەبن لە مەڕو ماڵاتەكانیترتان.

هاوەڵەكانیش شكایەتی حاڵی خۆیان لە كەمی خۆراك و زۆری پێویستی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: كەواتە بە گورگەكان بڵێن كە خۆمان زۆر پێویستمانە، پیاوەكە دەڵێ: ئەوانیش پێیان ڕاگەیاندن، گورگەكانیش ڕۆیشتن و دەیان لوراند.

٢٣- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: جَاءَ جِبْرِيلُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ جَالِسٌ حَزِينٌ، وَقَدْ تَخَضَّبَ بِالدَّمِ مِنْ فِعْلِ أَهْلِ مَكَّةَ مِنْ قُرَيْشٍ، فَقَالَ جِبْرِيلُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ تُحِبُّ أَنْ أُرِيَكَ آيَةً؟ قَالَ: «نَعم». فَنَظَرَ إِلَى شَجَرَةٍ مِنْ وَرَائِهِ فَقَالَ: ادْعُ بِهَا. فَدَعَا بِهَا فَجَاءَتْ فَقَامَتْ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: مُرْهَا فَلْتَرْجِعْ. فَأَمَرَهَا فَرَجَعَتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ :«حَسْبِي حَسْبِي»[2].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیك ﵁ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: جبریل هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە كاتێكدا دانیشتبوو زۆر دڵتەنگ بوو، خەڵتانی خوێن ببوو، بەهۆی كردەوە و توندو تیژەكانی قوڕەیشیەكانی مەككە، جبریل فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا حەز دەكەی موعجیزەیەكت پێ نیشان بدەم؟ پێغەمبەری خواش فەرمووی ﷺ: بەڵێ، جبریل سەیری درەختێكی كرد كە لە دوایەوە بوو، بە پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموو: بانگی ئەو درەختە بكە، پێغەمبەری خواش ﷺ بانگی كرد، درەختەكەش هات و لەبەر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا، جبریل فەرمووی: فەرمانی پێ بكە با بگەڕێتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی كرد و گەڕایەوە، جا پێغەمبەری خوا فەرمووی: بەسمە بەسمە.

٢٤- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَتَى رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَامِرٍ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَلاَ أُرِيكَ آيَةً؟ قَالَ: بَلَى. قَالَ: فَاذْهَبْ فَادْعُ تِلْكَ النَّخْلَةَ، فَدَعَاهَا فَجَاءَتْ تَنْقُزُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: قُلْ لَهَا تَرْجِعْ. قَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ارْجِعِي، فَرَجَعَتْ حَتَّى عَادَتْ إِلَى مَكَانِهَا، فَقَالَ: يَا بَنِي عَامِرٍ مَا رَأَيْتُ رَجُلاً كَالْيَوْمِ أَسْحَرَ مِنْهُ»[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێك لە هۆزی بەنی عامر هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا موعجیزەیەكت پێ

---

(١) ـ رجال إسناده ثقات إلا أنه منقطع.

(٢) ـ صحيح.

(٣)ـ صحيح.

نیشان بدەم؟ پیاوەکەش وتی: بەڵێ، پێغەمبەر خواش ﷺ فەرمووی: بڕۆ بانگی ئەو دار خورمایە بکە، پیاوەکەش بانگی کرد، دار خورماکە هات و لەبەر دەستی هەڵدەپەڕی، پیاوەکە بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: پێی بڵێ: بگەڕێتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ بە دار خورماکەی فەرموو: بگەڕێوە، ئەویش گەڕایەوە، تاوەکو چووە شوێنی خۆی، پیاوەکە وتی: ئەی بەنی عامر هەرگیز نەمدیبوو (وەک ئەمڕۆ) کەس هەبێ وەکو موحەممەد جادووگەر بێت.

## بابەت: ئەو ڕێزەی خوا لە پێغەمبەری ﷺ ناوە، لە هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجەکانی

٢٥- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: دَعَا النَّبِيُّ ﷺ بِلالاً، فَطَلَبَ بِلاَلٌ المَاءَ ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: لاَ وَاللهِ مَا وَجَدتُ المَاءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَهَل مِن شَنٍ؟ فَأَتَاهُ بِشَنٍ فَبَسَطَ كَفَّيهِ فِيهِ فَانبَعَثَت تَحتَ يَدَيهِ عَينٌ، قَالَ: فَكَانَ ابنُ مَسعُودٍ ﷺ يَشرَبُ وَغَيرُهُ يَتَوَضَّأُ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباس ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ بانگی بیلالی کرد و داوای ئاوی لە بیلال کرد، دواتر (بیلال) هاتەوە و وتی: نە بەخوا ئاوم دەست نەکەوت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا تەشتێک هەیە؟

ئەویش تەشتێکی بۆ هێنا و (پێغەمبەری خواش) ﷺدەستەکانی لەناو تەشتەکە کردنەوە و، کانیێک لە ژێر دەستەکانی هەڵقوڵا، (ئیبنو عەبباس) دەڵێت: ئیبنو مەسعود (لە ئاوەکەی) دەخواردەوە و، خەڵکی جگە لەویش دەستنوێژیان دەشۆرد.

٢٦- «عَن جَابِرُ بنُ عَبدِ اللهِ ﷺ: قال غَزَونَا، أو سَافَرنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَنَحنُ يَومَئِذٍ بِضعَةَ عَشَرَ وَمِائَتَانِ فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هَل فِي القَومِ مِن طَهُورٍ؟ فَجَاءَ رَجُلٌ يَسعَى، بِإِدَاوَةٍ فِيهَا شَيءٌ مِن مَاءٍ، لَيسَ فِي القَومِ مَاءٌ غَيرُهُ، فَصَبَّهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي قَدَحٍ، ثُمَّ تَوَضَّأَ فَأَحسَنَ الوُضُوءَ، ثُمَّ انصَرَفَ وَتَرَكَ القَدَحَ فَرَكِبَ النَّاسُ ذَلِكَ القَدَحَ وَقَالُوا: تَمَسَّحُوا تَمَسَّحُوا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: عَلَى رِسلِكُم، حِينَ سَمِعَهُم يَقُولُونَ ذَلِكَ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ كَفَّهُ فِي المَاءِ وَالقَدَحِ وَقَالَ: بِسمِ اللهِ، ثُمَّ قَالَ: أَسبِغُوا الطُّهُورَ، فَوَالَّذِي هُوَ ابتَلاَنِي بِبَصَرِي لَقَد رَأَيتُ العُيُونَ عُيُونَ المَاءِ تَخرُجُ مِن بَينِ أَصَابِعِهِ فَلَم يَرفَعهَا حَتَّى تَوَضَّئُوا أَجمَعُونَ»[٢].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: جیهادێکمان کرد، یان سەفەرێکمان کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێمەش ئەو ڕۆژە دووسەد و قسور بووین (دووسەد و دە کەس زیاتر بووین، بەڵام نەدەگەیشتینە دووسەد و بیست کەس)، کاتی نوێژ هات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا لە نێو ئەو خەڵکە هەندێک لە ئاو هەیە بۆ دەستنوێژ؟ پیاوێک هات بە ڕاکردن بە مەتارەیەکەوە کە کەمێک ئاوی تیابوو، لە نێو خەڵکەکەشدا ئاویتر جگە لەو ئاوە نەبوو، پێغەمبەری خواش ﷺ

---

(١)ـ رجاله ثقات.

(٢) ـ إسناده صحيح.

ئاوەكەی كردە ناو پەرداغێكەوە، دواتر دەستنوێژی شۆرد بە دەستنوێژێكی تێر و تەسەل، دواتر ڕۆیشت و پەرداغەكەی جێهێشت، خەڵكیش پڕژانە سەر پەرداغەكە و وتیان: تەنها خۆتان مەسح بكەن، تەنها خۆتان مەسح بكەن (بۆ دەستنوێژ، چونكە كەمە)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئارام بن، كاتێک گوێی لێ بوو ئاوایان وت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ (هاتوو) دەستی خستە ناو ئاو و پەرداغەكەو فەرمووی: بسم الله، دواتر فەرمووی: دەستنوێژ بە جوانی و تەواوی هەڵگرن، (جا جابر دەڵێت): سوێند بەو كەسەی تاقی كردوومەتەوە بە بینایيم (چونكە چاوی زۆر لاواز بووە كەمی بینیوە) بە دڵنیایی چەندین كانیم بینین، كانی ئاو دەردەچوون لە نێوان پەنجەكانی، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) دەستی هەڵنەگرت تا خەڵكەكە هەموویان دەستنوێژیان شۆرد بە تێكرا.

٢٧- «جَابِرَ بنَ عَبدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: أَصَابَنَا عَطَشٌ فَجَهَشنَا فَانتَهَينَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَوَضَعَ يَدَهُ فِي تَورٍ، فَجَعَلَ يَفُورُ كَأَنَّهُ عُيُونٌ مِن خَلَلِ أَصَابِعِهِ، وَقَالَ: اذكُرُوا اسمَ اللهِ، فَشَرِبنَا حَتَّى وَسِعَنَا وَكَفَانَا»[١].

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵڵا ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: تووشی تینوێتی بووین، بۆیە ڕامان كرد بۆ ئاو خواردنەوە (چونكە ئاوەكە زۆر كەم بوو بەشی نەدەكردین) تا گەیشتین بە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش دەستی خستە ناو كانیێک (كە ئاوەكەی زۆر كەم بوو)، وای لێهات بە خووڕ ئاو دەردەچوو لە نێوان پەنجەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ وەک ئەوەی چەندین كانی بن، فەرمووی: ناوی خوا بێنن (بسم الله) بكەن، (جابر)، دەڵێ: ئێمەش خواردمانەوە تا لێمان زیاد بوو پێویستیمان پێی نەما.

٢٨- «عَنْ جَابِرُ بنُ عَبدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: شَكَا أَصحَابُ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ العَطَشَ فَدَعَا بِعُسٍّ، فَصُبَّ فِيهِ مَاءٌ، وَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ فِيهِ، قَالَ: فَجَعَلتُ أَنظُرُ إِلَى المَاءِ يَنبُعُ عُيُونًا مِن بَينِ أَصَابِعِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَالنَّاسُ يَستَقُونَ حَتَّى استَقَى النَّاسُ كُلُّهُم»[٢].

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ شكاتی حاڵی خۆیان لە تینوێتی و بێ ئاوی لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، (پێغەمبەری خواش ﷺ) داوای تەشتێكی گەورەی كردو، هەندێ ئاوی تێكرا، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی خستە ناوی، جابر دەڵێ: من سەیری ئاوەكەم دەكرد لە شێوەی چەندین كانی هەڵدەقوڵا لە نێوان پەنجەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ و، خەڵكەكەش ئاویان دەخواردەوە، تاوەكو هەموو خەڵكەكە خواردیانەوە و تێر ئاو بوون.

٢٩- «عَن عَبدِ اللهِ ﷺ سَمِعَ، بِخَسفٍ فَقَالَ: كُنَّا أَصحَابَ مُحَمَّدٍ ﷺ نَعُدُّ الآيَاتِ بَرَكَةً، وَأَنتُم تَعُدُّونَهَا تَخوِيفًا إِنَّا بَينَمَا نَحنُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ لَيسَ مَعَنَا مَاءٌ، فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ: اطلُبُوا مَن مَعَهُ فَضلُ مَاءٍ، فَأُتِيَ بِمَاءٍ، فَصَبَّهُ فِي الإِنَاءِ، ثُمَّ وَضَعَ كَفَّهُ فِيهِ، فَجَعَلَ المَاءُ يَخرُجُ مِن بَينِ أَصَابِعِهِ، ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الطَّهُورِ المُبَارَكِ، وَالبَرَكَةِ مِنَ اللهِ تَعَالَى فَشَرِبنَا، قَالَ عَبدُ اللهِ كُنَّا نَسمَعُ تَسبِيحَ الطَّعَامِ وَهُوَ يُؤكَلُ»[٣].

---

(١)ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

٣() ـ صحيح.

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود ﷺ، گوێی لێ بوو كە ڕۆچوونی زەوی ڕوویداوە، وتی: ئێمەی هاوەڵانی موحەممەد ﷺ نیشانە و بەڵگە و موعجیزەكانمان بە بەرەكەت هەژمار دەكرد، كەچی ئێوە بە ترساندن هەژماری دەكەن، ئێمە كاتێک لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین ئاومان پێ نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: داوا لە كەسێک بكەن هەندێک ئاوی زیادی پێ بێت، هەندێک ئاو هێنرا، پێغەمبەری خواش ﷺ ئاوەكەی خستە ناو قاپێكەوە، دواتر دەستی خستە ناو قاپەكەوە و ئاو دەردەچوو لە نێوان پەنجەكانی، دواتر فەرمووی: وەرن بۆ ئاوێكی بە فەڕ و موبارەک، بەفەڕیەكە و بەرەكەتەكەش لە خواوەیە، عەبدوڵلا وتی: ئێمەش خواردمانەوە، عەبدوڵلای كوڕی مەسعود وتویەتی: ئێمە گوێمان لە تەسبیحاتی (سبحان الله)ی خواردن دەبوو لەو كاتەی دەخورا.

٣٠- «عَن عَبدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: زُلزِلَتِ الأَرضُ عَلَى عَهدِ عَبدِ اللهِ فَأُخبِرَ بِذَلِكَ، فَقَالَ: إِنَّا كُنَّا أَصحَابَ مُحَمَّدٍ ﷺ نَرَى الآيَاتِ بَرَكَاتٍ، وَأَنتُم تَرَونَهَا تَخوِيفًا» بَينَا نَحنُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي سَفَرٍ إِذ حَضَرَتِ الصَّلاَةُ وَلَيسَ مَعَنَا مَاءٌ إِلاَّ يَسِيرٌ، فَدَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ بِمَاءٍ فِي صَحفَةٍ، وَوَضَعَ كَفَّهُ فِيهِ فَجَعَلَ المَاءُ يَنبَجِسُ مِن بَينِ أَصَابِعِهِ، ثُمَّ نَادَى: حَيَّ عَلَى أَهلِ الوُضُوءِ، وَالبَرَكَةِ مِنَ اللهِ، قَالَ: فَأَقبَلَ النَّاسُ فَتَوَضَّئُوا، وَجَعَلتُ لاَ هَمَّ لِي إِلاَّ مَا أُدخِلُهُ بَطنِي لِقَولِهِ: وَالبَرَكَةِ مِنَ اللهِ» فحدَّثتُ بِهِ سالمَ بنَ أَبِي الجَعدِ فَقَالَ: كَانُوا خَمسَ عَشرَةَ مِائَةً»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: زەمین لەرزە ڕوویدا لە سەردەمی ئەوداو، ئەو هەواڵەی پێدرا، ئەویش وتی: ئێمەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ نیشانە و موعجیزەكانمان هەژمار دەكرد بە فەڕ و بەرەكەت، كەچی ئێوە بە ترساندن هەژماری دەكەن، لە كاتێكدا ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە سەفەرێكدا، كاتی نوێژ هات (كە نوێژی عەسر بوو)، ئێمەش ئاومان پێ نەبوو، كەمێک نەبێت، پێغەمبەری خواش داوای هەندێک ئاوی كرد لەناو سنیەكی گەورە و، دەستی خستە ناوی و، ئاو لە نێوان پەنجەكانی هەڵدەقوڵا، دواتر بانگی كرد و فەرمووی: ئەوانەی دەیانەوێ دەستنوێژ بشۆرن با بێن و بە فەڕ و بەرەكەتەكەش لە خواوەیە، خەڵكیش هاتن و دەستنوێژیان شۆرد، جا عەبدوڵلا دەڵێت: من بیرم لە هیچ نەدەكردەوە تەنها ئەوە نەبێت ئاوێكی زۆر بخەمە ناو سكمەوە، لەبەر قسەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرمووی: بەرەكەتەكە لە خواوەیە.

جا (ئەعمەش) كە یەكێكە لە گێڕەوانی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: بۆ (سالمی كوڕی ئەبول جەعد)م گێڕایەوە، ئەویش وتی: ژمارەیان (١٥٠٠) كەس بوون.

---

[1] ـ صحيح.

## بابەت: ئەو ڕێزەی خوا لە پێغەمبەری ﷺ ناوە، لە نوزانەوەی مینبەر (بەهۆی دڵتەنگی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ لێی دوورکەوتۆتەوە)

٣١- «عَنِ ابنِ عُمَرَ ﭬ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَخطُبُ إِلَى جِذعٍ فَلَمَّا اتَّخَذَ المِنبَرَ حَنَّ الجِذعُ حَتَّى أَتَاهُ فَمَسَحَهُ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﭬ گێڕدراوەتەوە (وتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار وتاری دەدا لەلای قەدی دار خورمایێک، جا کاتێک سەکۆو مینبەری دانا، قەدی دار خورماکە نوزایەوە و، بێ دەنگ نەبوو تا پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لای و دەستی پێدا هێنا (ئەو کات بێ دەنگ بوو).

٣٢- «عَن ابنُ بُرَيدَةَ ﭬ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا خَطَبَ قَامَ فَأَطَالَ القِيَامَ، فَكَانَ يَشُقُّ عَلَيهِ قِيَامُهُ، فَأُتِيَ بِجِذعِ نَخلَةٍ فَحُفِرَ لَهُ، وَأُقِيمَ إِلَى جَنبِهِ قَائِمًا لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا خَطَبَ فَطَالَ القِيَامُ عَلَيهِ، استَنَدَ إِلَيهِ، فَاتَّكَأَ عَلَيهِ، فَبَصُرَ بِهِ رَجُلٌ كَانَ وَرَدَ المَدِينَةَ فَرَآهُ قَائِمًا إِلَى جَنبِ ذَلِكَ الجِذعِ، فَقَالَ لِمَن يَلِيهِ مِنَ النَّاسِ: لَو أَعلَمُ أَنَّ مُحَمَّدًا يَحمَدُنِي فِي شَيءٍ يَرفُقُ بِهِ، لَصَنَعتُ لَهُ مَجلِسًا يَقُومُ عَلَيهِ، فَإِن شَاءَ جَلَسَ مَا شَاءَ، وَإِن شَاءَ قَامَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: ائتُونِي بِهِ، فَأَتَوهُ بِهِ فَأَمَرَهُ أَن يَصنَعَ لَهُ هَذِهِ المَرَاقِيَ الثَّلَاثَ أَوِ الأَربَعَ هِيَ الآنَ فِي مِنبَرِ المَدِينَةِ، فَوَجَدَ النَّبِيُّ ﷺ، فِي ذَلِكَ رَاحَةً فَلَمَّا فَارَقَ النَّبِيُّ ﷺ الجِذعَ وَعَمَدَ إِلَى هَذِهِ الَّتِي صُنِعَت لَهُ، جَزِعَ الجِذعُ، فَحَنَّ كَمَا تَحِنُّ النَّاقَةُ حِينَ فَارَقَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَزَعَمَ ابنُ بُرَيدَةَ، عَن أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حِينَ سَمِعَ حَنِينَ الجِذعِ رَجَعَ إِلَيهِ فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيهِ، وَقَالَ: اختَر أَن أَغرِسَكَ فِي المَكَانِ الَّذِي كُنتَ فِيهِ، فَتَكُونَ كَمَا كُنتَ، وَإِن شِئتَ أَن أَغرِسَكَ فِي الجَنَّةِ فَتَشرَبَ مِن أَنهَارِهَا وَعُيونِهَا فَيَحسُنَ نَبتُكَ، وَتُثمِرَ فَيَأكُلَ أَولِيَاءُ اللهِ مِن ثَمَرَتِكَ وَنَخلِكَ فَعَلتُفَزَعَمَ أَنَّهُ سَمِعَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَقُولُ لَهُ: نَعم قَد فَعَلتُ مَرَّتَينِ،فَسَأَلَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: اختَارَ أَن أَغرِسَهُ فِي الجَنَّةِ»[٢].

واتە: بوڕەیدە ﭬ وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەو کاتانەی کە وتاری دەدا زۆر بە پێوە دەوەستا، وەستانەکەش زۆر ئەستەم بوو لەسەری، بۆیە قەدێکی دار خورما هێنرا و بەشێکی بۆ هەڵکەنرا لە تەنیشت پێغەمبەری خوا ﷺ دانرا بە ستوونی، جا لەمە بەو لاوە هەر کاتێک وتاری دەدا وەستانەکەی درێژ ببایەوە، خۆی بە قەدی دار خورماکە دەگرتەوە و شانی لەسەر دەدایەوە، جا پیاوێک کە هاتبوو بۆ مەدینە حاڵی پێغەمبەر ﷺ بینی و، هەروەها بینیشی کە لە تەنیشت قەدی دار خورماکە وەستاوە، بۆیە بەو خەڵکانەی وت کە لێیەوە نزیک بوون: ئەگەر موحەممەد لەسەر شتێکی وا کە بۆ ئەو ئاسانکاری بێت و بزانم کارەکەم بە باش دادەنێت ئەوە دانیشتگایەکم (شتێک کە بتوانێت لەسەری دابنیشێت) بۆ دروست دەکرد تا لەسەری بوەستێت، جا ئەگەر ویستی لێ بوو دابنیشێت ئەوە بە ئارەزووی خۆیەتی، وە ئەگەر ویستیشی بوەستێت

---

(١) ـ صحيح.

(٢)ـ إسناده ضعيف.

با بوەستێ (بە شێوەیەکی ئاوا بۆی دروست دەکەم)، جا ئەو هەواڵە گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: پیاوەکەم بۆ بێنن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە پیاوەکە کرد پەیژەیەکی سێ پایە، یان چوار پایەی بۆ دروست بکات، باوکی (بورەیدە) دەڵێت: ئەو پەیژەیە هەوە کە ئێستا لە ناو مینبەری مەدینە دایە، جا پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ئەو پەیژە و مینبەرەوە حەسایەوە، کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە قەدی دار خورماکەی پێشوتری جیابوویەوە، چیتر نەدەچوو بۆ لای و، چوو بۆ لای ئەو مینبەرەی بۆی دروست کرابوو، قەدی دار خورماکە خەفەتبار بوو، بۆیە دەنوزایەوە وەک چۆن وشتر دەنوزێتەوە، لەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی جیا بوویەوە.

جا ئیبنو بەڕەیدە کە لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک گوێی لە نوزانەوەی قەدی دار خورماکە بوو گەڕایەوە بۆ لای و دەستی خستە سەرو فەرمووی: هەڵیبژێرە، یان ئەوەتا دەتچێنمەوە لەو شوێنەی لێی بووی، وەکو جارانت لێ دێتەوە (دەبیتەوە دارێکی تەڕ)، ئەگەریش بتەوێ دەتچێنمەوە لە بەهەشتدا و، لە ڕووبارو کانیەکانی دەخۆیتەوەو، جوان دەڕوێی و بەروبووم دەگریت و، پیاوانی خوا لە بەرو خورماکەت دەخۆن، جا ئەگەر دەڵێی وادەکەم.

جا ئیبنو بوڕەیدە وتویەتی: باوکی گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە کە بە قەدی دار خورماکەی فەرمووە: بەڵێ بە دڵنیایی وادەکەم (دوو جار وای فەرموو)، جا پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا (ئاخۆ دارەکە کامیانی هەڵبژارد)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوەی هەڵبژارد کە بیچێنم لە بەهەشتدا.

**٣٣- «عَن جَابِرِ بنِ عَبدِ اللهِ الأَنصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقُومُ إِلَى جِذعٍ قَبلَ أَن يُجعَلَ المِنبَرُ، فَلَمَّا جُعِلَ المِنبَرُ، حَنَّ ذَلِكَ الجِذعُ حَتَّى سَمِعنَا حَنِينَهُ فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ عَلَيهِ فَسَكَنَ»[1].**

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلای ئەنصاری ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ (لە کاتی وتاردان) لای قەدی دار خورمایەک دەوەستا پێش ئەوەی مینبەری بۆ دابنرێ، جا کاتێک مینبەری بۆ دانرا قەدە دار خورماکە نوزایەوە تاوەکو گوێبیستی نوزانەوەکەی بووین، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی خستە سەری و ئارام و بێ دەنگ بوویەوە.

**٣٤- «عَن جَابِرِ بنِ عَبدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخطُبُ إِلَى خَشَبَةٍ، فَلَمَّا صُنِعَ المِنبَرُ فَجَلَسَ عَلَيهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، حَنَّت حَنِينَ العِشَارِ حَتَّى وَضَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ عَلَيهَا فَسَكَنَت»[2].**

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ لە لای پارچە دارێک وتاری دەخوێندەوە، جا کاتێک مینبەر دروستکرا و پێغەمبەری خواش ﷺ لەسەر مینبەرەکە دانیشت پارچە دارەکە نوزایەوە، وەک نوزانەوەی ئەو وشترەی دە مانگ دوو گیان بێت (جا نوزانەوەکەی هەر بەردەوام بوو) تا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی خستە سەر، ئنجا بێ دەنگ و ئارام بوویەوە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

٣٥- «عَن جَابِرِ بنِ عَبدِ اللهِ ، قَالَ: حَنَّتِ الخَشَبَةُ حَنِينَ النَّاقَةِ الخَلُوجِ»[١].

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵلاوە  گێردراوەتەوە وتویەتی: پارچە دارەكە نوزایەوە وەک نوزانەوەی ئەو وشترەی بێچووەكەی لێ سەندرابێتەوە.

٣٦ـ «عَنِ الطُّفَيْلِ بْنِ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي إِلَى جِذْعٍ وَيَخْطُبُ إِلَيْهِ إِذْ كَانَ الْمَسْجِدُ عَرِيشًا، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: أَلَا نَجْعَلُ لَكَ عَرِيشًا تَقُومُ عَلَيْهِ يَرَاكَ النَّاسُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وتَسْمِعُ مِنْ خُطْبَتِكَ؟ قَالَ: «نَعم» فَصُنِعَ لَهُ الثَّلَاثُ دَرَجَاتٍ، هُنَّ اللَّوَاتِي عَلَى الْمِنْبَرِ، فَلَمَّا صُنِعَ الْمِنْبَرُ وَوُضِعَ فِي مَوْضِعِهِ الَّذِي وَضَعَهُ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فَلَمَّا جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُرِيدُ الْمِنْبَرَ مَرَّ عَلَيْهِ، فَلَمَّا جَاوَزَهُ، خَارَ الْجِذْعُ حَتَّى تَصَدَّعَ وَانْشَقَّ، فَرَجَعَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَمَسَحَهُ بِيَدِهِ حَتَّى سَكَنَ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الْمِنْبَرِ، قَالَ: فَكَانَ إِذَا صَلَّى، صَلَّى إِلَيْهِ فَلَمَّا هُدِمَ الْمَسْجِدُ أَخَذَ ذَلِكَ الْجِذْعَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ فَلَمْ يَزَلْ عِنْدَهُ حَتَّى بَلِيَ فأَكَلتْهُ الْأَرَضَةُ وَعَادَ رُفَاتًا»[٢].

واتە: لە طوفەیلی كوڕی ئوبەی كوڕی كەعب گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكی گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەكرد لەلای قەدی دار خورمایێک، وتاریشی هەر لەلای قەدی دار خورماكە دەخوێندەوە ئەو كاتەی مزگەوتەكە لە گەڵا و داری خورما دروست كرابوو، جا یەكێک لە هاوەڵانی گوتی: ئایا مینبەرێكت بۆ دروست نەكەین لەسەری بوەستی تا خەڵک بتبینن ڕۆژی هەینی و، گوێبیستی وتارەكەت بن؟

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵێ (بۆم دروست بكەن)، پیاوەكەش سێ پایەی بۆ دروست كرد ئەوەی وا (ئێستا) لەناو مینبەرەكەدایە، جا كاتێ ئەو مینبەرە دروست كراو دانرا، لەو شوێنەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دانا، (ئوبەی كوڕی كەعب) دەڵێت: جا كاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هات ویستی بچێتە سەر مینبەرەكە، بەلای قەدە دار خورماكەی (پێشووتر)دا تێپەڕی، جا كاتێ لێی ڕەت بوو دەنگێكی وەک دەنگی مانگای لێوە هات (لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ جێی هێشت و چیتر كاری پێ ناكات) تاوەكو پارچەو لەت بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ گەڕایەوە بۆ لای و دەستی بەسەردا هێنا، تاوەكو ئارام بوویەوەو بێ دەنگ بوو، دواتر گەڕایەوە سەر مینبەرەكەی.

طوفەیل دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار كە نوێژی دەكرد لەلای ئەو قەدی دار خورمایە دەیكرد، جا كاتێک مزگەوتەكە تێكدرا (ئوبەی كوڕی كەعب) قەدە دار خورماكەی بۆ خۆی بردەوە، جا هەر لە لای مابوویەوە تاوەكو ڕزی و، مۆرانە خواردی و لە بەین چوو.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢)ـ حسن.

**٣٧ـ «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ إِلَى لِزْقِ جِذْعٍ فَأَتَاهُ رَجُلٌ رُومِيٌّ فَقَالَ: أَصْنَعُ لَكَ مِنْبَرًا تَخْطُبُ عَلَيْهِ. فَصَنَعَ لَهُ مِنْبَرًا هَذَا الَّذِي تَرَوْنَ. قَالَ: فَلَمَّا قَامَ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ، حَنَّ الْجِذْعُ حَنِينَ النَّاقَةِ إِلَى وَلَدِهَا، فَنَزَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَضَمَّهُ إِلَيْهِ فَسَكَنَ، فَأُمِرَ بِهِ أَنْ يُحْفَرَ لَهُ وَيُدْفَنَ»[١].**

واتە: لە ئەبو سەعید ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار وتاری لە تەنیشت قەدە دار خورمایێک دەخوێندەوە، جا (جارێکیان) پیاوێکی ڕۆمی هات بۆ لای و وتی: مینبەرێکت بۆ دروست دەکەم، تاوەکو وتاری لەسەر بخوێنیتەوە، جا مینبەرێکی بۆ دروست کرد، ئەوەی وا ئێوە دەیبینن (ئەوە هەوە)، ئەبو سەعید دەڵێت: جا کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ وەستاو وتاری دەخوێندەوە، قەدە دار خورماکە نوزایەوە، وەک نوزانەوەی وشتری مێ بۆ بێچووەکەی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستەوخۆ لە مینبەر هاتە خوارەوەو چوو بۆ لای و لە باوەشی گرت، قەدە دار خورماکەش بێ دەنگ و ئارام بوویەوەو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی کرد چاڵێک لێ بدرێت و قەدە دار خورماکە بشاردرێتەوە (لە مزگەوت لەناو چاڵەکە).

**٣٨ـ «حَدَّثَنَا الصَّعْقُ، قَالَ سَمِعْتُ الْحَسَنَ، يَقُولُ: لَمَّا أَنْ قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ جَعَلَ يُسْنِدُ ظَهْرَهُ إِلَى خَشَبَةٍ، وَيُحَدِّثُ النَّاسَ، فَكَثُرُوا حَوْلَهُ، فَأَرَادَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُسْمِعَهُمْ، فَقَالَ: ابْنُوا لِي شَيْئًا أَرْتَفِعُ عَلَيْهِ»، قَالُوا: كَيْفَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ: «عَرِيشٌ كَعَرِيشِ مُوسَى فَلَمَّا أَنْ بَنَوْا لَهُ» قَالَ: الْحَسَنُ: حَنَّتْ وَاللَّهِ الْخَشَبَةُ، قَالَ: الْحَسَنُ: سُبْحَانَ اللَّهِ، هَلْ تُبْتَغَى قُلُوبُ قَوْمٍ سَمِعُوا؟ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: يَعْنِي هَذَا»[٢].**

واتە: صەعق گێڕاویەتیەوە کە گوێی لە حەسەن بووە کە گوتوویەتی: کاتێک پێغەمبەر ﷺ هات بۆ شاری مەدینە پشتی دەدایە پارچە دارێکەوە و قسەی بۆ خەڵکی دەکرد، خەڵکەکەش زۆر زیاد بوون، پێغەمبەریش ﷺ ویستی (هەمووان) گوێبیستی بن، بۆیە فەرمووی: شتێکم بۆ دروست بکەن تا بچمە سەری، وتیان: چۆن بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: با تەخت و مینبەرێک بێت وەک تەخت و مینبەری مووسا ﷺ، جا کاتێک مینبەرەکەیان بۆ دروست کرد، (حەسەن) دەڵێت: سوێند بە خوا پارچە دارەکەی پێشوو نوزایەوە.

حەسەن دەڵێ: پاک و بێ گەردی بۆ خوا، ئایا خەڵکانێک کە دڵەکانیان هەق دەبیستێت نایانەوێت؟

(باوکی محمد) ـ کە یەکێکە لە گێڕەرەوانی ئەم فەرموودەیە ـ دەڵێت: واتە مەبەستی (حەسەن) ئەو نوزانەوەیە، نوزانەوەی دارەکە (واتە ئەی مسوڵمانان ئایا ئێوە ناتانەوێت و لە پێشتر نین لە دارەکە تا بنوزێنەوە بۆ خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ و بینینی)؟.

**٣٩ـ «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَخْطُبُ إِلَى جِذْعٍ قَبْلَ أَنْ يَتَّخِذَ الْمِنْبَرَ، فَلَمَّا اتَّخَذَ الْمِنْبَرَ وتحَوَّلَ إِلَيْهِ، حَنَّ الْجِذْعُ فَاحْتَضَنَهُ، فَسَكَنَ، وَقَالَ: لَوْ لَمْ أَحْتَضِنْهُ، لَحَنَّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[٣].**

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢)ـ مرسل بسند صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەموو جار لە لای قەدی دار خورمایێک وتاری دەخوێندەوە، پێش ئەوەی مینبەر دابنێت، جا کاتێک مینبەری دانا و ڕووی کردە مینبەرەکە قەدی دار خورماکە نوزایەوە، (پێغەمبەر ﷺ) لە باوەشی گرت، ئنجا بێ دەنگ و ئارام بوویەوە.

عەبدوڵڵا گوتی: ئەگەر (پێغەمبەری خوا ﷺ) لە باوەشی نەگرتایە، ئەوە تا ڕۆژی دوایی (یان تا دارەکە مایە) هەر دەگریا و دەنوزایەوە!!.

٤٠- «عَنْ أَنَسٍ ﷺ بِمِثْلِهِ»[1].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە بە هەمان شێوەی فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس.

٤١- «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: حَنَّتِ الْخَشَبَةُ الَّتِي كَانَ يَقُومُ عِنْدَهَا، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَيْهَا وَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهَا، فَسَكَنَتْ»[2].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەو پارچە دارەی پێشتر (پێغەمبەری خوا ﷺ) لە لای دەوەستا (بۆ وتار خوێندنەوە) نوزایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ هەڵسا و چوو بۆ لای و دەستی خستە سەری، ئنجا بێ دەنگ و ئارام بوویەوە.

٤٢- «عن أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُومُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَيُسْنِدُ ظَهْرَهُ إِلَى جِذْعٍ فِي الْمَسْجِدِ فَيَخْطُبُ النَّاسَ، فَجَاءَهُ رُومِيٌّ، فَقَالَ: أَلَا أَصْنَعُ لَكَ شَيْئًا تَقْعُدُ عَلَيْهِ وَكَأَنَّكَ قَائِمٌ؟ فَصَنَعَ لَهُ مِنْبَرًا لَهُ دَرَجَتَانِ، وَيَقْعُدُ عَلَى الثَّالِثَةِ، فَلَمَّا قَعَدَ نَبِيُّ اللَّهُ ﷺ عَلَى ذَلِكَ الْمِنْبَرِ، خَارَ الْجِذْعُ كَخُوَارِ الثَّوْرِ حَتَّى ارْتَجَّ الْمَسْجِدُ حُزْنًا عَلَى رَسُولِ ﷺ، فَنَزَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْمِنْبَرِ، فَالْتَزَمَهُ وَهُوَ يَخُورُ، فَلَمَّا الْتَزَمَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، سَكَنَ، ثُمَّ قَالَ: أَمَا وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوْ لَمْ أَلْتَزِمْهُ، لَمَا زَالَ هَكَذَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ حُزْنًا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَدُفِنَ»[3].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەموو جار لە ڕۆژی هەینی لەسەر پێ دەوەستا و پشتی دەدایە قەدی دار خورمایێک ـ کە لە مزگەوت چەقێندرابوو ـ وتاری بۆ خەڵکی دەخوێندەوە، پیاوێکی (ڕۆمی)ش هاتە لای و وتی: ئایا شتێکت بۆ دروست نەکەم لەسەری دابنیشی و وەک ئەوەش وابێ کە وەستاوی (شێوازێکی لەو جۆرەی هەبێ)؟

جا مینبەرێکی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دروست کرد، کە دوو پایەی هەبوو، لەسەر سێیەمیان دادەنیشت (واتە سێ پایەی هەبوو بەڵام دوو پایەی یەکەمی جێ دەهێشت و لەسەر پایەی سێیەمیان

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

دادەنیشت)، جا کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەم مینبەرە دانیشت (بۆ یەکەم وتار خوێندنەوە) قەدی دار خورماکە دەنگی لێوەهات وەک دەنگی مانگا، تاوەکو دڵ تەنگی و دڵ ناسکی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو مزگەوتی داگرت (هاوەڵانیش هەموویان دڵیان پڕ بوو لە گریان)، پێغەمبەری خواش ﷺ هاتە خوارەوە لەسەر مینبەر و چوو بۆ لای قەدە دار خورماکە و، لای مایەوە و دەستی لەسەر دانا، لە کاتێکدا دار خورماکە وەک مانگا دەنگی لێوە دەهات، جا کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای و دەستی لەسەر دانا بێ دەنگ بوو، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە ئەگەر نەچومایە بۆ لای و دەستم لەسەر دانەنایا بە بەردەوامی ئەو دەنگەی لێوە دەهات تا ڕۆژی دوایی، لەبەر پێ ناخۆشی دوورکەوتنەوەی پێغەمبەر ﷺ لێی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە بخرێتە ژێر خاک.

## بابەت: ئەو ڕێزەی خوا لە پێغەمبەری ﷺ ناوە، لە بەرەکەت و زیادبونی خۆراکی

٤٣ـ «عَنْ عَبْدِ الْوَاحِدِ بْنِ أَيْمَنَ الْمَكِّيِّ عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قُلْتُ لِجَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: حَدِّثْنِي بِحَدِيثٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سَمِعْتَهُ مِنْهُ أَرْوِيهِ عَنْكَ، فَقَالَ جَابِرٌ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْخَنْدَقِ نَحْفُرُهُ فَلَبِثْنَا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ لَا نَطْعَمُ طَعَامًا، وَلَا نَقْدِرُ عَلَيْهِ، فَعَرَضَتْ فِي الْخَنْدَقِ كُدْيَةٌ فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذِهِ كُدْيَةٌ قَدْ عَرَضَتْ فِي الْخَنْدَقِ فَرَشَشْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ وَبَطْنُهُ مَعْصُوبٌ بِحَجَرٍ، فَأَخَذَ الْمِعْوَلَ أَوِ الْمِسْحَاةَ ثُمَّ سَمَّى ثَلَاثًا، ثُمَّ ضَرَبَ فَعَادَتْ كَثِيباً أَهْيَلَ، فَلَمَّا رَأَيْتُ ذَلِكَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ائْذَنْ لِي، قَالَ: فَأَذِنَ لِي، فَجِئْتُ امْرَأَتِي، فَقُلْتُ: ثَكِلَتْكِ أُمُّكِ، قَدْ رَأَيْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْئًا لَا صَبْرَ لِي عَلَيْهِ، فَهَلْ عِنْدَكِ مِنْ شَيْءٍ؟ فَقَالَتْ: عِنْدِي صَاعٌ مِنْ شَعِيرٍ، وَعَنَاقٌ قَالَ: فَطَحَنَّا الشَّعِيرَ، وَذَبَحْنَا الْعَنَاقَ، وَسَلَخْتُهَا، وَجَعَلْتُهَا، فِي الْبُرْمَةِ وَعَجَنْتُ الشَّعِيرَ قَالَ: ثُمَّ رَجَعْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَلَبِثْتُ سَاعَةً، ثُمَّ اسْتَأْذَنْتُهُ الثَّانِيَةَ فَأَذِنَ لِي، فَجِئْتُ، فَإِذَا الْعَجِينُ قَدْ أَمْكَنَ، فَأَمَرْتُهَا بِالْخَبْزِ وَجَعَلْتُ الْقِدْرَ عَلَى الْأَثَافِيِّ، قَالَ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ: إِنَّمَا هِيَ الْأَثَافِيُّ، وَلَكِنْ كَذَا قَالَ: ثُمَّ جِئْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: إِنَّ عِنْدَنَا طُعَيِّمًا لَنَا، فَإِنْ رَأَيْتَ أَنْ تَقُومَ مَعِي أَنْتَ وَرَجُلٌ أَوْ رَجُلَانِ مَعَكَ، فَقَالَ: وَكَمْ هُوَ؟ قُلْتُ: صَاعٌ مِنْ شَعِيرٍ، وَعَنَاقٌ، فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَى أَهْلِكَ وَقُلْ لَهَا لَا تَنْزِعِ الْقِدْرَ مِنَ الْأَثَافِيِّ، وَلَا تُخْرِجِ الْخُبْزَ مِنَ التَّنُّورِ حَتَّى آتِيَ، ثُمَّ قَالَ لِلنَّاسِ: قُومُوا إِلَى بَيْتِ جَابِرٍ، قَالَ: فَاسْتَحْيَيْتُ حَيَاءً لَا يَعْلَمُهُ إِلَّا اللَّهُ، فَقُلْتُ، لِامْرَأَتِي: ثَكِلَتْكِ أُمُّكِ قَدْ جَاءَكِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِأَصْحَابِهِ أَجْمَعِينَ، فَقَالَتْ: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ سَأَلَكَ: كَمِ الطَّعَامُ؟ فَقُلْتُ: نَعم، قَالَتْ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَدْ أَخْبَرْتَهُ بِمَا كَانَ عِنْدَنَا، قَالَ: فَذَهَبَ عَنِّي بَعْضُ مَا كُنْتُ أَجِدُ، وَقُلْتُ: لَقَدْ صَدَقْتِ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ فَدَخَلَ، ثُمَّ قَالَ لِأَصْحَابِهِ: لَا تَضَاغَطُوا، ثُمَّ بَرَّكَ عَلَى التَّنُّورِ وَعَلَى الْبُرْمَةِ، قَالَ: فَجَعَلْنَا نَأْخُذُ مِنَ التَّنُّورِ الْخُبْزَ، وَنَأْخُذُ اللَّحْمَ مِنَ الْبُرْمَةِ، فَنُثَرِّدُ وَنَغْرِفُ لَهُمْ، وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لِيَجْلِسْ عَلَى الصَّحْفَةِ سَبْعَةٌ أَوْ ثَمَانِيَةٌ، فَإِذَا أَكَلُوا كَشَفْنَا عَنِ التَّنُّورِ، وَكَشَفْنَا عَنِ الْبُرْمَةِ، فَإِذَا هُمَا أَمْلَأُ مِمَّا كَانَا، فَلَمْ نَزَلْ نَفْعَلُ ذَلِكَ كُلَّمَا فَتَحْنَا التَّنُّورَ وَكَشَفْنَا عَنِ الْبُرْمَةِ، وَجَدْنَاهُمَا أَمْلَأَ مَا كَانَا حَتَّى شَبِعَ الْمُسْلِمُونَ كُلُّهُمْ، وَبَقِيَ طَائِفَةٌ مِنَ الطَّعَامِ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ النَّاسَ قَدْ أَصَابَتْهُمْ مَخْمَصَةٌ،

فَكُلُوا وَأَطْعِمُوا، فَلَمْ نَزَلْ يَوْمَنَا نَأْكُلُ وَنُطْعِمُ، قَالَ: وَأَخْبَرَنِي أَنَّهُمْ كَانُوا ثَمَانِمِائَةٍ، أَوْ قَالَ: ثَلَاثَمِائَةٍ، قَالَ أَيْمَنُ: لَا أَدْرِي أَيُّهُمَا قال»[١].

واتە: لە عەبدولواحیدی کوڕی ئەیمەنی مەککی گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: بە جابری کوڕی عەبدوڵلام (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، وت: فەرموودەیەکم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ بگێڕەوە کە خۆت گوێت لە پێغەمبەر ﷺ بووبێ، تاوەکو منیش لە تۆوە بیگێڕمەوە بۆ خەڵکی، جابر وتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە کاتی شەڕی خەندەق و چاڵمان لێدەدا، سێ ڕۆژان هیچ خواردنێکمان نەخواردبوو (لەبەر نەبوونی)، وە توانای چاڵ هەڵکەندنیشمان نەمابوو، لە چاڵ هەڵکەندنەکەش گەیشتین بە تاشە بەردێکی زۆر گەورە و لووس (کە بیور و قازمە کاری تێ نەدەکرد)، منیش چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تاشە بەردێکی گەورە لە چاڵەکە دەرکەوتووە و (بۆتە بەربەست لە بەردەم هەڵکەنین و پێمان چارە ناکرێت)، جابر دەڵێت: تاشە بەردەکەمان ئاو ڕشێن کرد، پێغەمبەر ﷺوەستا و قازمە بوو یان بێڵ بوو گرتیە دەستی و سکی خۆشی بەستابوو بە بەردێک (لەبەر برسیەتی) دواتر سێ جار ناوی خوای هێنا (بسم الله)ی کرد، دواتر لە تاشە بەردەکەیداو، ڕاستەوخۆ بوو بە لم و لە شوێنی خۆی هەڵڕژا، جابر دەڵێت: کاتێ ئەو موعجیزەیەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بینی و بینیشم چەندە برسیەتی بەردی بەستاوە لە سکی خۆی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیزنم بدە (با بڕۆمەوە)، دەڵێت: ئەویش ئیزنی دام، منیش چومە لای خێزانەکەم و وتم: دایکت جەرگی بسووتێ و ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات (ئەمە وتەیەک بوو بە کاریان دەهێنا لە کاتی نارەحەتی و پەلەپەلدا، مەبەستیان جەرگ سووتان نەبوو)، شتێکم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بینیوە (مەبەستی برسیەتیەکەیە) ئارامیم لێ هەڵگیراوە، ئایا شتێکت لا هەیە (بۆ خواردن)؟ خێزانەکەم وتی: صاعێک جۆم لەلا هەیە (دوو کیلۆ و ٣٤٠ گرام، بە صاعی شافعیان) لەگەڵ جیسکێک (کاریلەیەک کە هێشتا تەمەنی نەبووە ساڵێک)، جابر دەڵێت: جیسکەکەمان سەربڕی (خێزانەکەی سەری بڕی) هەر خۆیشی کەوڵی کردو خستیە ناو مەنجەڵەوە، جۆیەکەشی کرد بە هەویر، جابر دەڵێت: دواتر گەڕامەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺو ماوەیەک لەوێ مامەوەو دواتر دووبارە داوام لێ کرد ئیزنم بدات تا بگەڕێمەوە ماڵەوە، ئەویش ئیزنی دام، منیش هاتمەوە ماڵەوەو بینیم هەویرەکە کامڵ بووە (بۆ نان دروست کردن)، فەرمانم بە خێزانەکەم کرد هەویرەکە بکات بە نان و، منیش مەنجەڵەکەم لەسەر بەردی ئاگردان دانا[٢]، جابر دەڵێت: دواتر هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێم وت: خواردنۆکەکمان هەیە (واتە خواردنێکی کەممان لە ماڵ هەیە)، جا ئەگەر بە باشی بزانی خۆت و پیاوێک، یان دوو پیاو لەگەڵم بفەرموونە ماڵەوە (بۆ نان خواردن)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خواردنەکە چەندە؟ جابر دەڵێت: وتم صاعێک جۆو جیسکێکە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بگەڕێوە بۆ لای خێزانەکەت و پێی بڵێ: مەنجەڵەکە لەسەر بەردە ئاگردانەکە لانەبات و، نانەکەش لە تەندوور دەرنەهێنێت تا من دەگەم، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٢) ـ جا باوکی عبد الرحمن کە دەکاتە مامۆستای ئیمامی داریمی فەرموویەتی بە بەردی ئاگردان دەوترێت (الْأَثَافِيُّ) نەوەک (الْأَثَاثِيُّ) کە لە فەرمودەکەدا هاتوە بەڵام گێڕەرەوەکەی ئەم فەرمودەیە وتویەتی الْأَثَاثِيُّ کە ئەوە هەڵەیە.

بە هەموو خەڵكەكەی فەرموو: هەمووتان هەڵسن بچن بۆ ماڵی جابر، جابر دەڵێت: ئەوەندەم شەرم كرد تەنها خوا دەزانێت شەرمەكەم چەندە زۆر بوو، بە خێزانەكەمم وت: دایكت جەرگی بسوتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەموو هاوەڵانیەوە هات بۆ لات، خێزانەكەشم وتی: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ كردی خواردنەكە چەندە؟ وتم: بەڵێ، خێزانەكەم وتی: دەی خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ بە هەموو شتێک زاناترن! خۆ تۆ پێت وتووە چەندمان خواردن هەیە، جابر دەڵێت: هەندێک لەو خەجاڵەتی و شەرمەم ڕۆیی و دامركا و وتم: ڕاست دەكەیت، پێغەمبەری خواش ﷺ گەیشت و هاتە ژوورەوە، دواتر بە هاوەڵەكانی فەرموو: پاڵەپەستۆ دروست مەكەن، دواتر دووعای بەرەكەتی لەسەر تەندوورەكە و مەنجەڵەكە كرد، جابر دەڵێت: هەر نانمان لە تەندوورەكە دەردەهێنا و، گۆشتیشمان لە مەنجەڵەكە هەڵدەگرت و دەمانكردە تەشریب ـ تێگوشە ـ (واتە: نانەكەمان پارچە پارچە دەكرد و گۆشت و مەرەگەمان تێ دەكرد)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: با حەوت یان هەشت كەس بە یەكەوە لەسەر یەک سنی (خوانچە، خوان) دابنیشن، جا كاتێک كۆمەڵێک نانیان خوارد سەیری تەندوورەكەمان كرد و، سەیری مەنجەڵەكەشمان كرد بینیمان هەردووكیان لە پێشان زیاتریان تیا مابوو، ئێمەش بە بەردەوامی هەر ئەو كارەمان دووبارە دەكردەوە (واتە هەر كۆمەڵ كۆمەڵ نانمان پێ دەدان)، هەر جارێک تەندوورەكەمان دەكردەوە و سەری مەنجەڵەكەمان لادەدا دەمان بینی پڕترە لە جاری پێشوو، تاوەكو هەموو مسوڵمانان تێر بوون، كۆمەڵێک خواردنیش مایەوە، جابر دەڵێت: پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرمووین: خەڵكی تووشی برسیەتی بووە بۆیە خۆتان لە خواردنەكە بخۆن و بیدەن بە خەڵكیش، جابر دەڵێت: ئێمەش ئەو ڕۆژە هەر دەمان خوارد و دەمانبەخشی بە خەڵک (هەر تەواو نەدەبوو).

جا عەبدولواحیدی كوڕی ئەیمەن دەڵێت: باوكم (ئەیمەن) پێی وتم: ژمارەیان (واتە: ژمارەی ئەو مسوڵمانانەی كە نانەكەیان خوارد) (٨٠٠) كەس بوون، یانیش (٣٠٠) كەس بوون، (ئەیمەن) وتی: نازانم جابر كام ژمارەی وت[١].

**٤٤ـ «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: أَمَرَ أَبُو طَلْحَةَ أُمَّ سُلَيْمٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَنْ تَجْعَلَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ طَعَامًا يَأْكُلُ مِنْهُ، قَالَ: ثُمَّ بَعَثَنِي أَبُو طَلْحَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: بَعَثَنِي إِلَيْكَ أَبُو طَلْحَةَ، فَقَالَ لِلْقَوْمِ: قُومُوا، فَانْطَلَقَ وَانْطَلَقَ الْقَوْمُ مَعَهُ، فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا صَنَعْتُ طَعَامًا لِنَفْسِكَ خَاصَّةً؟، فَقَالَ: لَا عَلَيْكَ انْطَلِقْ، قَالَ: فَانْطَلَقَ، وَانْطَلَقَ الْقَوْمُ، قَالَ: فَجِيءَ بِالطَّعَامِ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ وَسَمَّى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ، قَالَ: فَأَذِنَ لَهُمْ، فَقَالَ: كُلُوا بِاسْمِ اللَّهِ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا ثُمَّ قَامُوا، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ كَمَا صَنَعَ فِي الْمَرَّةِ الْأُولَى، وَسَمَّى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ، فَأَذِنَ لَهُمْ فَقَالَ: كُلُوا بِاسْمِ اللَّهِ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، ثُمَّ قَامُوا حَتَّى فَعَلَ ذَلِكَ بِثَمَانِينَ رَجُلًا، قَالَ: وَأَكَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَهْلُ الْبَيْتِ وتركوا سُؤْرًا»**[٢].

---

(١) ـ تێبینی: عــەمری كوڕی عەلی وتویەتی: (١٠٠٠) كەس بوون. بە هەر حــاڵ كام ژمــارە بووبێ هەر زۆرە و، موعجیزەیەكی موبارەكی پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەخات.

(٢) ـ صحيح.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو طەڵحە کە زڕ باوکی ئەنەسی کوڕی مالیکە فەرمانی بە دایکی سولەیم کرد (کە دایکی هەقی ئەنەسی کوڕی مالیکە) خواردنێک بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دروست بکات تا لێی بخوات، ئەنەس دەڵێت: دواتر ئەبو طەڵحە ناردمی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ (تا بانگی بکەم بۆ خواردن) و منیش چووم بۆ لای و وتم: ئەبو طەڵحە ڕەوانەی کردووم بۆ لای جەنابت (بۆ نان خواردن)، پێغەمبەری خواش بە خەڵکەکەی فەرموو ـ کە ژمارەیان هەشتا کەس بوو ـ هەڵسن بێ بڕۆین (بۆماڵی ئەبو طەڵحە، پێغەمبەری خوا ڕۆیشت (بۆ ماڵی ئەبو طەڵحە)و خەڵکەکەش هەموی لەگەڵی ڕۆیشتن، ئەبو طەڵحە (لەبەر کەمی خواردنەکەو زۆری خەڵکەکەو، لەترسی شەرمەزاری لە لای پێغەمبەری خوا ﷺو ئەو هەموو میوانە) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنمان تەنها بۆ جەنابت دروست کردبوو بە تایبەت (تەنها بەشی جەنابت دەکات)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەترسە هیچ شەرمەزارییێکت نایێتە سەر و بڕۆ خواردنەکە بێنە، ئەنەس دەڵێت: ئەبو طەڵحە ڕۆییشت و خەڵکەکەش لەگەڵی ڕۆیشت (بۆ ماڵەوە)، ئەنەس دەڵێت: خواردنەکە هێنراو پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی خستە سەر خوارنەکە ناوی خوای لەسەر هێنا (فەرمووی: بسم الله)، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو طەڵحەی فەرمووی: ئیزن بدە با دە کەس بێنە ژوورەوە (بۆ ژووری خواردن)، ئەنەس دەڵێت: ئەبو طەڵحەش ئیزنی پێدان، پێغەمبەری خوا ﷺ بە دە کەسەکەی فەرموو: بخۆن بە ناوی خوا، ئەوانیش وایان کرد و خواردیان تا تێر بوون، دواتر هەڵسان، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی خستەوە سەر خوارنەکە وەک جاری یەکەم و (بسم الله)ی کرد، دواتر فەرمووی: ئیزنی دە کەسیتر بدە، ئەبو طەڵحەش ئیزنیدان، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: بخۆن بە ناوی خواو (بسم الله) بکەن، ئەوانیش وایان کرد و خواردیان تا تێر بوون، دواتر هەڵسان، جا هەر ئاوایان کرد (دە کەس دە کەس) بانگیان دەکردن، تا هەر هەشتا کەس تەواو بوون، ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺو خانەوادەی ئەبو طەڵحەش خواردیان و پاشماوەش (لە خواردنەکە)، مایەوە.

٤٥ـ «عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ ﷺ أَنَّهُ طَبَخَ لِلنَّبِيِّ ﷺ قِدْرًا، فَقَالَ لَهُ: نَاوِلْنِي ذِرَاعَهَا، وَكَانَ يُعْجِبُهُ الذِّرَاعُ، فَنَاوَلَهُ الذِّرَاعَ، ثُمَّ قَالَ: نَاوِلْنِي الذِّرَاعَ، فَنَاوَلَهُ ذِرَاعًا، ثُمَّ قَالَ: نَاوِلْنِي الذِّرَاعَ، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، وَكَمْ لِلشَّاةِ مِنْ ذِرَاعٍ؟ فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، أَنْ لَوْ سَكَتَّ، لَأُعْطِيتُ أَذْرُعًا مَا دَعَوت بِهِ»[1].

واتە: لە ئەبو عوبەید ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە مەنجەڵێک چێشتی بۆ پێغەمبەر ﷺ لێنابوو، (پێغەمبەری خواش ﷺ)، پێی فەرموو: پیلێکی (بزنەکە)م بدەرێ چونکە زۆر حەزی لە پیلی حەیوان بوو، ئەویش پیلێکی پێدا، دواتر فەرمووی: پیلم بدەرێ، ئەویش پیلێکی تری پێدا، دواتر فەرمووی: پیلم بدەرێ، ئەبو عوبەید دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا مەگەر بزن چەند پیلی هەیە؟! (هەر دوو پیلی هەیە)؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر خۆت بێ دەنگ بکردایە و، هەر پێت بدامایە ئەوە پیلی زۆرت پێ دەدام هەر چەندی داوام بکردایە.

---

(١) ـ إسناده حسن.

٤٦ـ «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْمُشْرِكِينَ لِيُقَاتِلَهُمْ، فَقَالَ أَبِي عَبْدُ اللَّهِ: يَا جَابِرُ، لَا عَلَيْكَ أَنْ تَكُونَ، فِي نَظَّارِي أَهْلِ الْمَدِينَةِ حَتَّى تَعْلَمَ إِلَى مَا يَصِيرُ أَمْرُنَا، فَإِنِّي وَاللَّهِ لَوْلَا أَنِّي أَتْرُكُ بَنَاتٍ لِي بَعْدِي، لَأَحْبَبْتُ أَنْ تُقْتَلَ بَيْنَ يَدَيَّ، قَالَ: فَبَيْنَمَا أَنَا فِي النَّظَّارِينَ إِذْ جَاءَتْ عَمَّتِي بِأَبِي وَخَالِي لِتَدْفِنَهُمَا فِي مَقَابِرِنَا، فَلَحِقَ رَجُلٌ يُنَادِي، إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَرُدُّوا الْقَتْلَى فَتَدْفِنُوهَا فِي مَضَاجِعِهَا حَيْثُ قُتِلَتْ، فَرَدَدْنَاهُمَا، فَدَفَنَّاهُمَا فِي مَضْجَعِهِمَا حَيْثُ قُتِلَا: فَبَيْنَا أَنَا فِي خِلَافَةِ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﷺ إِذْ جَاءَنِي رَجُلٌ فَقَالَ: يَا جَابِرُ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، لَقَدْ أَثَارَ أَبَاكَ عُمَّالُ مُعَاوِيَةَ فَبَدَا فَخَرَجَ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ، فَانْطَلَقْتُ إِلَيْهِ فَوَجَدْتُهُ عَلَى النَّحْوِ الَّذِي دَفَنْتُهُ لَمْ يَتَغَيَّرْ إِلَّا مَا لَمْ يَدَعِ الْقَتِيلَ، قَالَ: فَوَارَيْتُهُ، وترَكَ أَبِي عَلَيْهِ دَيْنًا مِنَ التَّمْرِ، فَاشْتَدَّ عَلَيَّ بَعْضُ غُرَمَائِهِ فِي التَّقَاضِي، فَأَتَيْتُ رَسُولَ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبِي أُصِيبَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا، وَإِنَّهُ تَرَكَ عَلَيْهِ دَيْنًا مِنَ التَّمْرِ وَإِنَّهُ قَدِ اشْتَدَّ عَلَيَّ بَعْضُ غُرَمَائِهِ فِي الطَّلَبِ، فَأُحِبُّ أَنْ تُعِينَنِي عَلَيْهِ لَعَلَّهُ أَنْ يُنْظِرَنِي طَائِفَةً مِنْ تَمْرِهِ إِلَى هَذَا الصِّرَامِ الْمُقْبِلِ. قَالَ: نَعم آتِيكَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ قَرِيباً مِنْ وَسَطِ النَّهَارِ» قَالَ: فَجَاءَ وَمَعَهُ حَوَارِيُوهُ، قَالَ: فَجَلَسُوا فِي الظِّلِّ وَسَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَاسْتَأْذَنَ ثُمَّ دَخَلَ عَلَيْنَا، قَالَ: وَقَدْ قُلْتُ لِامْرَأَتِي: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَاءَنِيَّ الْيَوْمَ وَسَطَ النَّهَارِ، فَلَا يَرَيَنَّكِ وَلَا تُؤْذِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْتِي بشَيْءٍ وَلَا تُكَلِّمِيهِ فَفَرَشَتْ فِرَاشًا وَوِسَادَةً فَوَضَعَ رَأْسَهُ، فَنَامَ، فَقُلْتُ لِمَوْلًى لِي: اذْبَحْ هَذِهِ الْعَنَاقَ، وَهِيَ دَاجِنٌ سَمِينَةٌ، فَالْوَحَا، وَالْعَجَلَ، افْرُغْ مِنْهَا قَبْلَ أَنْ يَسْتَيْقِظَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا مَعَكَ، فَلَمْ نَزَلْ فِيهَا حَتَّى فَرَغْنَا مِنْهَا، وَهُوَ نَائِمٌ، فَقُلْتُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ يَسْتَيْقِظُ يَدْعُو بِطَهُورِهِ وَأَنَا أَخَافُ إِذَا فَرَغَ أَنْ يَقُومَ، فَلَا يَفْرُغْ مِنْ طُهُورِهِ حَتَّى يُوضَعَ الْعَنَاقُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَلَمَّا اسْتَيْقَظَ قَالَ: يَا جَابِرُ ائْتِنِي بِطَهُورٍ، قَالَ: نَعم، فَلَمْ يَفْرُغْ مِنْ وُضُوئِهِ حَتَّى وُضِعَتِ الْعَنَاقُ بَيْنَ يَدَيْهِ، قَالَ: فَنَظَرَ إِلَيَّ فَقَالَ: «كَأَنَّكَ قَدْ عَلِمْتَ حُبَّنَا اللَّحْمَ، ادْعُ أَبا بَكْرٍ» ثُمَّ دَعَا حَوَارِيِّيهِ، قَالَ: فَجِيءَ بِالطَّعَامِ فَوُضِعَ. قَالَ: فَوَضَعَ يَدَهُ، وَقَالَ: بِسْمِ اللَّهِ كُلُوا، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا وَفَضَلَ مِنْهَا لَحْمٌ كَثِيرٌ وَقَالَ: وَاللَّهِ إِنَّ مَجْلِسَ بَنِي سَلَمَةَ لَيَنْظُرُونَ إِلَيْهِمْ، هُوَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنْ أَعْيُنِهِمْ، مَا يَقْرَبُونَهُ مَخَافَةَ أَنْ يُؤْذُوهُ، ثُمَّ قَامَ، وَقَامَ أَصْحَابُهُ، فَخَرَجُوا بَيْنَ يَدَيْهِ وَكَانَ يَقُولُ: خَلُّوا ظَهْرِي لِلْمَلَائِكَةِ، قَالَ: فَاتَّبَعْتُهُمْ حَتَّى بَلَغْتُ أسكفَّةَ الْبَابِ، فَأَخْرَجَتِ امْرَأَتِي صَدْرَهَا وَكَانَتْ سَتِيرَةً فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، صَلِّ عَلَيَّ وَعَلَى زَوْجِي، قَالَ: صَلَّى اللَّهُ عَلَيْكِ وَعَلَى زَوْجِكِ، ثُمَّ قَالَ: ادْعُوا لِي فُلَانًا، لِلْغَرِيمِ الَّذِي اشْتَدَّ عَلَيَّ فِي الطَّلَبِ، فَقَالَ أَنْسِئْ جَابِرًا طَائِفَةً مِنْ دَيْنِكَ الَّذِي عَلَى أَبِيهِ إِلَى هَذَا الصِّرَامِ الْمُقْبِلِ، قَالَ: مَا أَنَا بِفَاعِلٍ قَالَ: وَاعْتَلَّ وَقَالَ: إِنَّمَا هُوَ مَالُ يَتَامَى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيْنَ جَابِرٌ؟»، قَالَ: قُلْتُ: أَنَا ذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: كِلْ لَهُ، فَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى سَوْفَ يُوَفِّيهِ» فَرَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَإِذَا الشَّمْسُ قَدْ دلَكَتْ، قَالَ: الصَّلَاةُ يَا أَبا بَكْرٍ، فَانْدَفَعُوا إِلَى الْمَسْجِدِ، فَقُلْتُ لِغَرِيمِي: قَرِّبْ أَوْعِيَتَكَ، فكِلْتُ لَهُ مِنَ الْعَجْوَةِ فَوَفَّاهُ اللَّهُ وَفَضَلَ لَنَا مِنَ التَّمْرِ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: فَجِئْتُ أَسْعَى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي مَسْجِدِهِ كَأَنِّي شَرَارَةٌ، فَوَجَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ صَلَّى، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي قَدْ كِلْتُ لِغَرِيمِي تَمْرَهُ فَوَفَّاهُ اللَّهُ وَفَضَلَ لَنَا مِنَ التَّمْرِ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيْنَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ؟، قَالَ: فَجَاءَ يُهَرْوِلُ، قَالَ: سَلْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ غَرِيمِهِ وتَمرِهِ»، قَالَ: مَا أَنَا بِسَائِلِهِ، قَدْ عَلِمْتُ أَنَّ اللَّهَ سَوْفَ يُوَفِّيهِ إِذْ أَخْبَرْتَ أَنَّ اللَّهَ سَوْفَ يُوَفِّيهِ فَرَدَّدَ عَلَيْهِ، وَرَدَّدَ عَلَيْهِ هَذِهِ الْكَلِمَةَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ: مَا أَنَا بِسَائِلِهِ، وَكَانَ لَا يُرَاجِعُ بَعْدَ الْمَرَّةِ الثَّالِثَةِ، فَقَالَ: مَا فَعَلَ غَرِيمُكَ وتَمرُكَ؟ قَالَ: قُلْتُ: وَفَّاهُ اللَّهُ وَفَضَلَ لَنَا مِنَ التَّمْرِ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: فَرَجَعْتُ

إِلَى امْرَأَتِي فَقُلْتُ: أَلَمْ أَكُنْ نَهَيْتُكِ أَنْ تُكَلِّمِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْتِي؟ فَقَالَتْ: تَظُنُّ أَنَّ اللَّهَ تَعَالَى يُورِدُ نَبِيَّهُ فِي بَيْتِي ثُمَّ يَخْرُجُ وَلَا أَسْأَلُهُ الصَّلَاةَ عَلَيَّ وَعَلَى زَوْجِي؟»[1].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو (بۆ شەڕی ئوحود) تاوەکو جەنگ لەگەڵ هاوبەش دانەران بکات، عەبدوڵڵای باوکم وتی: ئەی جابر تۆ مەیێ بۆ جەنگ و بمێنەوە لەناو ماڵ و منداڵم لە مەدینە و، چاوەڕوان بکە تا دەزانی ئێمە کارمان بە کوێ دەگات و، چیمان بەسەر دێت، سوێند بە خوا ئەگەر من لەدوای خۆم چەند کچێکم جێ نەهێشتبێ حەزم دەکرد (ئەی جابر) لەبەر دەمم بکوژرابای (لە پێناوی خوا)، جابر دەڵێت: جا لەو کاتەی من لەگەڵ ئەو کەسانە مامەوە کە بۆ چاودێری ماڵ و منداڵ نەچووبون بۆ جەنگ، لەناکاو پورم هات لەگەڵ تەرمی باوکم و خاڵم (کە شەهید بووبوون) تا لە گۆڕستانەکەمان بیان نێژین، جا پیاوێک گەیشت، بانگی دەکرد و، دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە کوژراوەکان بگێڕنەوە تاوەکو بنێژرێن لەو شوێنانەی کە تیایدا کوژراون، ئێمەش (باوکم و خاڵم)مان گێڕایەوە و شاردمانەوە لەو شوێنەی تێیدا کوژرا بوون، جا کە من لە سەردەمی خەلافەتی (موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) بووم (واتە: دوای ٣٧ ساڵ)، پیاوێک هات بۆ لام و وتی: ئەی جابری کوڕی عەبدوڵلا کرێکارەکانی موعاویە گۆڕی باوکتیان هەڵداوەتەوە و، بەشێک لە لاشەی دەرکەوتووە، جابر دەڵێت: منیش چووم بۆ لای گۆڕەکەی و بینیم هەر بەو شێوەیە ماوەتەوە کە ناشتم، هیچ نەگۆڕاوە، تەنها ئەوە نەبێ کە بە کوژراوی جێ هێشترابوو (واتە: تەنها دەتزانی مردووە، ئەگینا وەک زیندووی خەوتوو دەردەکەوت)، جابر دەڵێت: منیش ناشتم و ژێر خۆڵم کرد.

وە باوکم لە دوای خۆی هەندێک قەرزی خورمای لەسەر مابوو، جا هەندێک لە خاوەن قەرزەکان لەسەریان توند کردبووم کە قەرزەکەیان بدەمەوە، منیش هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکم لە فلان ڕۆژ کوژرا و، هەندێک قەرزی خورماشی لەسەر ماوە، هەندێک لە خاوەن قەرزەکانیش داواکاری دانەوەی قەرزەکەیان لەسەر توند کردووم، جا حەز دەکەم یارمەتیم بدەیت بۆ دانەوەی قەرزەکان بەڵکو هەندێک لە خورمام بۆ دابنرێت لە کاتی پێگەیشتنی بەروبومی ئەوجارەی کە دادێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: باشە، إن شاءالله لە ناوەڕاستی ڕۆژێ (واتە: لە کاتی نیوەڕۆ) دێم بۆ لات.

جابر دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هات و هاوەڵەکانیشی لەگەڵ بوو، دەڵێت: لە ژێر سێبەر دانیشتن و، پێغەمبەری خواش ﷺ سەلامی کرد و، داوای ئیزن و مۆڵەتی کرد، دواتر هاتە ژوورەوە بۆ لامان، جابر دەڵێت: بە خێزانەکەمم وتبوو: ئەمڕۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناوەڕاستی ڕۆژێ دێت بۆ لام با نەتبینێت و، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵەکەم ئازار نەدەیت و، قسەی لەگەڵ نەکەیت، خێزانەکەشم ڕایەخێکی ڕاخست و، بالیفێک (سەرینێکی) دانا و پێغەمبەری خواش ﷺ سەری خستە

---

(١) ـ صحيح.

سەری و خەوت، منیش بە خزمەتكارێكی خۆمم وت: ئەو جیسكە سەر ببڕە، ـ جیسكەكەش دابەستی و قەڵەو بوو ـ بە زوویی و بە پەلە كارەكە ئەنجام بدە، پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەو هەڵسێت، منیش لەگەڵت دەبم (یارمەتیت دەدەم)، جا بەردەوام خەریک بووین تا تەواو بووین لە بە ئەنجام گەیاندنی جیسكەكە، پێغەمبەری خواش ﷺ هەر خەوتووە، منیش وتم: بە دڵنیایی كاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەو هەڵسێت داوای ئاو دەكات بۆ دەستنوێژ، وە من دەترسم كاتێک لە دەستنوێژ بوویەوە هەڵسێ و بڕوا (خواردنەكە ئامادە نەبێت)، كەواتە نابێ لە دەستنوێژ ببێتەوە تاوەكو جیسكەكەی لەبەردەم دادەنرێت، جا كاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەو هەڵسا فەرمووی: ئەی جابر ئاوم بۆ بێنە بۆ دەستنوێژ، جابر دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژەكەی تەواو نەكرد، تاوەكو جیسكەكەی لەبەر دەم دانرا، جابر دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری كردم و فەرمووی: وەک بڵێی زانیوتە حەزمان لە گۆشتە، ئادەی بانگی ئەبو بەكر بكە، دواتریش پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی هاوەڵانی كرد، جابر دەڵێت: خواردنەكە هێنرا و دانرا، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی لەسەر خواردنەكە دانا و فەرمووی: ((بسم الله)) بە ناوی خوا بیخۆن، جا هەموویان خواردیان تا تێر بوون و گۆشتی زۆریش مایەوە، وە دەڵێت: سوێند بە خوا خانەوادەی بەنی سەلەمە سەیریان دەكردن (كە نانیان دەخوارد)، وە پێغەمبەری خوایان ﷺ لە چاوی خۆیان خۆشتر دەویست، (بەڵام) نزیكی نەكەوتنەوە لەترسی ئەوەی نەوەک ئەزیەتی بدەن، دواتر هەڵسا و هاوەڵەكانیشی هەڵسان و پێش پێغەمبەری خوا ﷺ چوونە دەرەوە، (چونكە) پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: دواوەم چۆڵ بكەن بۆ فریشتەكان، جابر دەڵێت: منیش لە دوایان دەڕۆیشتم تا گەیشتمە ناو دەرگاكە، خێزانیشم سەر و سینگی دەرهێنا (بۆ ماڵئاوایی كردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ و نەهاتە دەرەوە بە تەواوی)، چونكە زۆر خۆ داپۆشەر و بە حەیا و شەرم بوو، بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نزای ڕەحمەت بۆ من و مێردەكەم بكە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕەحمەتی خوا لە تۆ و لە مێردەكەشت بێت، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بانگی فڵانە كەسم بۆ بكەن ـ مەبەستی بانگ كردنی ئەو خاوەن قەرزە بوو كە زۆر داوای قەرزەكەی لێ دەكردم ـ پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: كەمێكیتر مۆڵەتی جابر بدە لە قەرزەكەت كە لەسەر باوكی بووە، تا ئەو كاتەی بەروبومی ئەو جارە پێ دەگات، كابرا وتی: واناكەم، هۆكارەكەشی باس كردو، وتی: ئەوە ماڵی هەتیوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: كوانێ جابر؟ جابر دەڵێت: منیش وتم: ئەوەتام ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆی بكێشە خوا (بەرەكەتی تێ دەخا) و تەواوی دەكات، پێغەمبەری خوا ﷺ سەری بەرز كردەوە بۆ ئاسمان و خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدابوو (واتە: كاتی نیوەڕۆ بوو) و فەرمووی: نوێژ ئەی ئەبو بەكر، جابر دەڵێت: هەموویان چوون بۆ مزگەوت، منیش بە خاوەن قەرزەكەمم وت: گۆشە و گوشەكانت نزیک بخەرەوە، منیش خورمای عەجوەم بۆ پێوانە كرد (پێم دا)، خواش پێوانەكەی تەواو كرد (بەرەكەتی تێكەوت)، هەوەندە و ئەوەندە خورمایەشمان بۆ مایەوە (واتە: خورمای زۆریش مایەوە)، وە چەند جۆر لە خورمام بۆ پێوانە كرد خوا پێوانەكەی تەواو كردو ئەوەندەو ئەوەندە خورمایەش مایەوە (لە ڕیوایەتی تردا هاتوە كە (١٣) ئەسوق مایەوە كە دەكاتە (١٠٤) تەنەكە خورما).

جابر دەڵێت: منیش بە پەلە چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت وەک تەلقە (لە خۆشیان)، پێغەمبەری خوام ﷺ بینی نوێژی دەکرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من خورمای خاوەن قەرزەکەمم پێوانە کرد بۆی و خوا پێوانەکەی بۆ تەواو کردم و ئەوەندە و ئەوەندە خورمایەش ماوەتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: کوانێ عومەری کوڕی خەتاب؟ جابر دەڵێت: عومەر بە پەلە هات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: عومەر پرسیار لە جابر بکە دەربارەی خاوەن قەرزەکەی و خورماکەی، عومەر وتی: پرسیاری لێ ناکەم من زانیم بە دڵنیایی خوا پێوانەکەی بۆ تەواو دەکات هەر ئەو کاتەی تۆ فەرمووت: جابر بۆی پێوانە بکە خوا پێوانەکەت بۆ تەواو دەکات، عومەر سێ جار ئاوای وت، هەموو جارەکان دەیوت: من پرسیاری لێ ناکەم، بەڵام پاش جاری سێیەم دووبارەی نەکردەوەو وتی: خاوەن قەرزەکەت و خورماکەت چیان لێ هات؟ جابر وتی: خوا تەواوی کردو ئەوەندەو ئەوەندەش لە خورما زیادی کردو مایەوە، جابر دەڵێت: منیش گەڕامەوە بۆ لای خێزانەکەم و وتم: ئەی من قەدەغەم نەکردی قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بکەی لە ماڵەکەم؟ خێزانیشم وتی: پێت وایە خوا پێغەمبەرەکەی بێنێتە ماڵەکەم و دواتر بڕوات و دەربچێت و داوای ڕەحمەتی خوای لێ نەکەم بۆ خۆم و مێردەکەم (چۆن شتی وا دەبێ)؟

## بابەت: ئەوەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشراوە، لە زێدە ڕێز و گەورەیی

**٤٧ـ «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: إِنَّ اللَّهَ فَضَّلَ مُحَمَّدًا ﷺ عَلَى الْأَنْبِيَاءِ عليهم السلام وَعَلَى أَهْلِ السَّمَاءِ، فَقَالُوا: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ بِمَ فَضَّلَهُ عَلَى أَهْلِ السَّمَاءِ؟ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ قَالَ لِأَهْلِ السَّمَاءِ: ﴿وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّىٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾﴾ الأنبياء، وَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى لِمُحَمَّدٍ ﷺ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ﴿٢﴾﴾ الفتح، قَالُوا: فَمَا فَضْلُهُ عَلَى الْأَنْبِيَاءِ عليهم السلام؟ قَالَ: قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ﴿٤﴾﴾ إبراهيم، وَقَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِمُحَمَّدٍ ﷺ: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ ﴿٢٨﴾﴾ سبأ، فَأَرْسَلَهُ إِلَى الْجِنِّ وَالْإِنْسِ»[1].**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خوای پەروەردگار موحەممەدی ﷺ هەڵبژاردوە بەسەر پێغەمبەران عليه السلام و بەسەر خەڵکی ئاسماندا (کە فریشتەکانن)، خەڵکی وتیان: ئەی ئیبنو عەبباس بە چی هەڵیبژاردوە بەسەر خەڵکی ئاسماندا؟ عەبدوڵڵا وتی: خوای پەروەردگار بە خەڵکی ئاسمانی فەرمووە: ﴿وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّىٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾﴾الأنبياء، واتە: [هەر کام لەوانە (واتە هەر کام لە فریشتەکان) بڵێت بێگومان منیش پەرستراوم جگە لە خوا، ئەوە بە ئاگری دۆزەخ تۆڵەی لێ دەسەنین، ئا بەو جۆرە تۆڵە لە ستەمکاران دەکەینەوە] دەربارەی پێغەمبەری خواش فەرموویەتی: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ﴿٢﴾﴾الفتح، واتە: [ئەی موحەممەد بێ گومان ئێمە سەرکەوتنێکی باشمان پێدای، تا خوا خۆش ببێت لە گوناهەکانی ڕابردوو و داهاتووت] سوڕەتی (فتح) ئایەتی (١ـ٢)،

---

(١) ـ إسناده صحيح.

خەڵكەكە وتیان: ئەی بە چی هەڵیبژاردووە بەسەر پێغەمبەراندا؟ عەبدوڵڵا وتی: خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡ ۝٤ ﴾إبراهيم، واتە: [هیچ پێغەمبەرێكمان ڕەوانە نەكردووە بە زمانی گەلەكەی خۆی نەبێت، بۆ ئەوەی ئایینەكەیان بۆ ڕوون بكاتەوە ـ واتە هەموو پێغەمبەران تەنها بۆ گەلەكەیان ڕەوانە كراون]، خوای پەروەردگار دەربارەی پێغەمبەری خواش (موحەممەد) فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ ۝٢٨ ﴾سبأ، واتە: [ئێمە تۆمان ڕەوانە نەكردووە مەگەر بۆ هەموو خەڵكی نەبێت ـ واتە بۆ هەموو خەڵكی بە تێكڕایی ڕەوانەمان كردووی]، جا عەبدوڵڵا وتی: خوای پەروەردگار موحەممەدی ﷺ ڕەوانە كردووە بۆ هەموو جنۆكەكان و ئادەمیزادەكان.

٤٨ـ «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: جَلَسَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ يَنْتَظِرُونَهُ فَخَرَجَ حَتَّى إِذَا دَنَا مِنْهُمْ، سَمِعَهُمْ يَتَذَاكَرُونَ، فَتَسَمَّعَ حَدِيثَهُمْ، فَإِذَا بَعْضُهُمْ يَقُولُ: عَجَباً إِنَّ اللَّهَ اتَّخَذَ مِنْ خَلْقِهِ خَلِيلًا فَإِبْرَاهِيمُ خَلِيلُهُ، وَقَالَ آخَرُ: مَاذَا بِأَعْجَبَ مِنْ: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ۝١٦٤ ﴾ النساء، وَقَالَ آخَرُ: فَعِيسَى كَلِمَةُ اللَّهِ وَرُوحُهُ، وَقَالَ آخَرُ: وَآدَمُ اصْطَفَاهُ اللَّهُ، فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ فَسَلَّمَ وَقَالَ: «قَدْ سَمِعْتُ كَلَامَكُمْ وَعَجَبَكُمْ، أَنَّ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلُ اللَّهِ، وَهُوَ كَذَلِكَ، وَمُوسَى نَجِيُّهُ، وَهُوَ كَذَلِكَ، وَعِيسَى رُوحُهُ وَكَلِمَتُهُ، وَهُوَ كَذَلِكَ، وَآدَمُ اصْطَفَاهُ اللَّهُ تَعَالَى، وَهُوَ كَذَلِكَ، أَلَا وَأَنَا حَبِيبُ اللَّهِ، وَلَا فَخْرَ، وَأَنَا حَامِلُ لِوَاءِ الْحَمْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَلَا فَخْرَ، وَأَنَا أَوَّلُ شَافِعٍ، وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا فَخْرَ، وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ يُحَرِّكُ بِحَلَقِ الْجَنَّةِ وَلَا فَخْرَ، فَيَفْتَحُ اللَّهُ فَيُدْخِلُنِيهَا وَمَعِي فُقَرَاءُ الْمُؤْمِنِينَ وَلَا فَخْرَ، وَأَنَا أَكْرَمُ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ عَلَى اللَّهِ، وَلَا فَخْرَ»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: كۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوون چاوەڕوانی (پێغەمبەر ﷺ)یان دەكرد، (لەماڵەوە) هاتە دەرەوە تاوەكو لێیان نزیك بوویەوە، گوێی لێیان بوو لەگەڵ یەكتری باسی دین و ئایەتەكانی قوڕئانیان دەكرد، پێغەمبەری خواش ﷺ گوێی بۆ قسەكانیان گرت، هەندێكیان دەیانووت: بەڕاستی سەیر و گەورەیە! خوای پەروەردگار لە نێوان دروستكراوەكانی دۆست و خۆشەویستێكی هەڵبژارد، ئیبراهیم دۆست و خۆشەویستەكەیەتی، یەكێكی تر دەیوت: چ سەیرتر و گەورەتر هەیە لەوەی ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ۝١٦٤ ﴾(النساء)، واتە: [خوا قسەی لەگەڵ مووسا كردوە بە قسەكردنی ڕاستەوخۆ]، یەكێكی تر دەیوت: ئەدی عیسا كە بە ئەمرێك و فەرمانێكی تایبەتی ڕۆحی وەبەر هێنا، یەكێكی تر دەیوت: (ئادەم)یش خوا هەڵیبژاردوە، جا پێغەمبەری خواش ﷺ چوو بۆ لایان و سەلامی لێ كردن و فەرمووی: گوێم لە قسەو باس و خواس و سەرسامبونەكەتان بوو، (دەربارەی ئەوەی دەتانووت) ئیبراهیم خۆشەویستی خوایە، ئەوە وایە، مووساش قسەی لەگەڵ خوا كردوە، ئەوەش وایە، عیساش ڕۆح و دروست كردنەكەی بە فەرمانێكی تایبەت و شێوازێكی جیاواز بووە، ئەوەش وایە، ئادەمیش خوا هەڵیبژاردووە، ئەوەش وایە، ئاگاداربن منیش (حەبیب)ی خوام (كە خۆشەویستیێكی گەورەترە لە خۆشەویستی (خەلیلایەتی) كە بۆ پێغەمبەر ئیبراهیم

---

[1] ـ ضعيف.

دانراوە) هیچ شانازیەک لەوە گەورەتر نیە، وە من هەڵگری ئاڵای (حەمد و سوپاسم) لە ڕۆژی دواییدا کە ئادەم و جگە لە ئادەمیش لە ژێری دان، هیچ گەورەییێکیش لەوە گەورەتر نیە، وە من یەکەم شەفاعەتکارم، وە یەکەم کەسیشم شەفاعەتەکەم وەردەگیرێ لە ڕۆژی دواییدا و هیچ گەورەییێک لەوە گەورەتر نیە، وە من یەکەم کەسم کە حەلقەی دەرگای بەهەشت دەهەژێنم و، خوا دەرگام بۆ دەکاتەوە و دەمخاتە ژوورەوە و هەژارانی بڕواداریشم لەگەڵن، هیچ گەورەییێک لەوە گەورەتر نیە، وە من ڕێزلێنراوترین کەسم (لە نێوان) پێشینەکان و پاشینەکاندا لە لایەن خواوەو، هیچ گەورەییێک لەوە گەورەتر نیە.

کەواتە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو پێغەمبەران گەورەترە.

٤٩ـ «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَنَا أَوَّلُهُمْ خُرُوجًا، وَأَنَا قَائِدُهُمْ إِذَا وَفَدُوا، وَأَنَا خَطِيبُهُمْ إِذَا أَنْصَتُوا، وَأَنَا مُسْتَشْفِعُهُمْ إِذَا حُبِسُوا، وَأَنَا مُبَشِّرُهُمْ إِذَا أَيِسُوا، الْكَرَامَةُ وَالْمَفَاتِيحُ يَوْمَئِذٍ بِيَدِي، وَأَنَا أَكْرَمُ وَلَدِ آدَمَ عَلَى رَبِّي، يَطُوفُ عَلَيَّ أَلْفُ خَادِمٍ كَأَنَّهُمْ بَيْضٌ مَكْنُونٌ، أَوْ لُؤْلُؤٌ مَنْثُورٌ»[1].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من یەکەم کەسم کە دێمە دەرەوە (لە گۆڕەکەم) کاتێک مرۆڤەکان زیندوو دەکرێنەوە، وە من پێشڕەویانم کاتێک بە کۆمەڵ دەچن (بۆ لای خوای پەروەردگار)، وە من وتەبێژیانم کاتێک ئەوان بێ دەنگ دەبن و (دەترسن قسە لەگەڵ پەروەردگار بکەن)، وە من تکاکاریانم ئەو کاتەی بۆ حیساب لەگەڵ کردن زۆر دوا دەخرێن، وە من موژدەدەری (ئیماندارانم) و دڵ خۆشکەریانم کاتێک (لەبەر ناخۆشی و ئەزیەت چێشتنیان لە قیامەت) بێ ئومێد دەبن، وە ڕێز لێنان و کلیلی چاکە و خێر لەو ڕۆژەدا لە دەستی منە، وە من بەڕێزترینی وەچەی ئادەمم (لە هەموو ڕووێکەوە) لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، هەزار خزمەتکار لە دەورەم هەڵدەسوڕێن (بۆ خزمەت کردنم لە ڕۆژی دواییدا) کە وەک هێلکەی نەعامە سپین یان وەک مەرجانی پەرشو بڵاون (لە جوانی و چوستی بۆ خزمەت کردن).

٥٠ـ «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَنَا قَائِدُ الْمُرْسَلِينَ وَلاَ فَخْرَ، وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ وَلاَ فَخْرَ، وَأَنَا أَوَّلُ شَافِعٍ وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ وَلاَ فَخْرَ»[2].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من سەرکردەی پێغەمبەرانم و هیچ شانازیش نیە (بەڵکو هەقیقەتە ڕوونی دەکەمەوە و، باس کردنی نیعمەتی خوایە لەسەرم و، شوکرانەبژێریە دەیکەم)، وە من کۆتایی پێغەمبەرانم و هیچ شانازیش نیە، وە من یەکەم تکاکار و یەکەم تکا قەبوڵ کراوم و هیچ شانازیش نیە.

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ إسناده حسن.

٥١ـ «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَنَا أَوَّلُ مَنْ يَأْخُذُ بِحَلْقَةِ بَابِ الْجَنَّةِ فَأُقَعْقِعُهَا» قَالَ أَنَسٌ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى يَدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يُحَرِّكُهَا، وَصَفَ لَنَا سُفْيَانُ كَذَا وَجَمَعَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ أَصَابِعَهُ وَحَرَّكَهَا، قَالَ: وَقَالَ لَهُ ثَابِتٌ: مَسَسْتَ يَدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِيَدِكَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ فَأَعْطِنِيهَا أُقَبِّلْهَا»[١].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیک ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من یەكەم كەسم كە حەڵقەی دەرگای بەهەشت دەگرم و پێی (لە دەرگای بەهەشت) دەدەم.

ئەنەس وتویەتی: دەستی پێغەمبەری خوام ﷺ لەبەر چاوە كە دەیجوڵاند (كاتێ دەیفەرموو: ئاوا لە دەرگای بەهەشت دەدەم).

جا (سوفیان)ی كوڕی عویەینە وەسفی جوڵانی دەستی پێغەمبەری خوای ﷺ ئاوا بۆ كردین، ئەبو عەبدوڵلا ـ كە یەكێكە لە گێڕەوانی ئەم فەرموودەیە ـ پەنجەكانی كۆدەكردەوە (وەک مستەكۆڵە)و دەیجوڵاند (واتە: لاسایی پێغەمبەری خوای ﷺ دەكردەوە كە چۆن فەرموویەتی حەڵقەی دەرگای بەهەشت دەجوڵێنم و پێی لە دەرگاكە دەدەم). جا ثابت بە ئەنەسی وت: بە دەستی خۆت دەستتدا لە دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ ئەنەس وتی: بەڵێ، (ثابت)یش وتی: كەواتە دەستتم بەرێ با ماچی بكەم (دەستی ئەنەسی ماچ كرد).

٥٢ـ «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَنَا أَوَّلُ شفيعٍ فِي الْجَنَّةِ»[٢].

واتە: لە ئەنەس ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من یەكەم تكاكارم (بۆ ئیمانداران بۆ چوونە بەهەشت و بەرزبونەوەی پلەیان) لە بەهەشتدا.

٥٣ـ «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنِّي لَأَوَّلُ النَّاسِ تَنْشَقُّ الْأَرْضُ عَنْ جُمْجُمَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا فَخْرَ، وَأُعْطَى لِوَاءَ الْحَمْدِ وَلَا فَخْرَ، وَأَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا فَخْرَ، وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا فَخْرَ، وَآتِي بَابَ الْجَنَّةِ فَآخُذُ بِحَلْقَتِهَا فَيَقُولُونَ: مَنْ هَذَا؟ فَأَقُولُ أَنَا، مُحَمَّدٌ، فَيَفْتَحُونَ لِي فَأَدْخُلُ فَأَجِدُ الْجَبَّارَ مُسْتَقْبِلِي، فَأَسْجُدُ لَهُ فَيَقُولُ: ارْفَعْ رَأْسَكَ يَا مُحَمَّدُ وتكَلَّمْ، يُسْمَعْ مِنْكَ، وَقُلْ، يُقْبَلْ مِنْكَ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَرْفَعُ رَأْسِي فأقولُ: أُمَّتِي أُمَّتِي يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: اذْهَبْ إِلَى أُمَّتِكَ فَمَنْ وَجَدْتَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ شَعِيرٍ مِنَ الْإِيمَانِ، فَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ. فَأَذْهَبُ، فَمَنْ وَجَدْتُ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ ذَلِكَ أَدْخَلْتُهُمُ الْجَنَّةَ. فَأَجِدُ الْجَبَّارَ مُسْتَقْبِلِي فَأَسْجُدُ لَهُ فَيَقُولُ: ارْفَعْ رَأْسَكَ يَا مُحَمَّدُ وتكَلَّمْ، يُسْمَعْ مِنْكَ. وَقُلْ يُقْبَلْ مِنْكَ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأَقُولُ: أُمَّتِي أُمَّتِي يَا رَبِّ فَيَقُولُ: اذْهَبْ إِلَى أُمَّتِكَ، فَمَنْ وَجَدْتَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنَ الْإِيمَانِ فَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ. فَأَذْهَبُ، فَمَنْ وَجَدْتُ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ ذَلِكَ أَدْخَلْتُهُمُ الْجَنَّةَ. وَفُرِغَ مِنْ حِسَابِ النَّاسِ وَأُدْخِلَ مَنْ بَقِيَ مِنْ أُمَّتِي فِي النَّارِ مَعَ أَهْلِ النَّارِ فَيَقُولُ أَهْلُ النَّارِ: مَا أَغْنَى عَنْكُمْ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُونَ بِهِ شَيْئًا. فَيَقُولُ الْجَبَّارُ: فَبِعِزَّتِي

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

لَأُعْتِقَنَّهُمْ مِنَ النَّارِ. فَيُرْسِلُ إِلَيْهِمْ، فَيَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ وَقَدِ امْتُحِشُوا، فَيُدْخَلُونَ فِي نَهَرِ الْحَيَاةِ، فَيَنْبُتُونَ فِيهِ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي غُثَاءِ السَّيْلِ وَيُكْتَبُ بَيْنَ أَعْيُنِهِمْ هَؤُلَاءِ عُتَقَاءُ اللَّهِ. فَيُذْهَبُ بِهِمْ فَيَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ، فَيَقُولُ لَهُمْ أَهْلُ الْجَنَّةِ: هَؤُلَاءِ الْجَهَنَّمِيُّونَ. فَيَقُولُ الْجَبَّارُ: بَلْ هَؤُلَاءِ عُتَقَاءُ الْجَبَّارِ»[1].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیک ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: من یەكەمی خەڵكیم كە زەوی شەق دەبێت بەسەر كەللەی سەرمدا و ( زیندوو دەبمەوە) لە ڕۆژی دواییدا و هیچ شانازیش نیە، وە ئاڵای حەمد و سوپاسیشم پێ دەدرێت، هیچ شانازییش نیە، وە من گەورەی هەموو خەڵكیم لە ڕۆژی دواییدا و هیچ شانازیش نیە، وە من یەكەم كەسم كە دەچم بۆ ناو بەهەشتەوە، هیچ شانازیش نیە، وە دێمە لای دەرگای بەهەشت و حەلقەكەی دەگرم، ئەوانیش (واتە: فریشتەكان)یش دەڵێن: ئەوە كێیە؟ منیش دەڵێم: من (موحەممەد)م، ئەوانیش دەرگام بۆ دەكەنەوە و دەچمە ژوورەوە، جا خوای زاڵ و باڵادەست خۆی پێم نیشان دەدات و منیش كڕنووشی بۆ دەبەم، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: سەرت بەرز بكەرەوە ئەی موحەممەد، قسە بكە گوێت بۆ دەگیرێت و، بڵێ: (ئەوەی دەتەوێ) قەبوڵ دەكرێت و، تكا بكە تكات وەردەگیرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: منیش سەرم بەرز دەكەمەوە و دەڵێم: ئوممەتەكەم ئوممەتەكەم ئەی پەروەردگارم، خوای پەروەردگاریش دەفەرمووێ: بڕۆ بۆ لای ئوممەتەكەت و هەر كەسێكت دەست كەوت لە دڵیدا بە قەد مسقاڵێک لە دنكی جۆ ئیمانی هەبوو بیخەرە بەهەشتەوە، (پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ): منیش دەچم و هەر كەسێكم دەست بكەوێ ئەو مسقاڵەی تیابێ دەیانبەمە بەهەشتەوە، (دووبارە) خوای زاڵ و باڵادەست خۆم پێ نیشان دەداتەوە و منیش كڕنووشی بۆ دەبەم، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: سەرت بەرز بكەرەوە ئەی موحەممەد، قسە بكە گوێت بۆ دەگیرێت و، بڵێ: (ئەوەی دەتەوێ) قەبوڵ دەكرێت و، تكا بكە تكات وەردەگیرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: منیش سەرم بەرز دەكەمەوە و دەڵێم: ئوممەتەكەم ئوممەتەكەم ئەی پەروەردگارم، خوای پەروەردگاریش دەفەرمووێ: بڕۆ بۆ لای ئوممەتەكەت و هەر كەسێكت دەست كەوت لە دڵیا بە قەد مسقاڵێک لە دەنكە خەرتەلە ئیمانی هەبوو بیبەرە بەهەشتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: منیش دەچم و هەر كەسێكم دەست بكەوێ ئەو مسقاڵەی تیابێ دەیانبەمە بەهەشتەوە، جا لێپیچینەوەی خەڵكی تەواو دەبێت و ئەوانەی دەمێننەوە لە ئوممەتەكەم (كە ئیمانیان زۆر زۆر كەمە) لەگەڵ خەڵكی ئاگر دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخ، خەڵكی ئاگر (كە كافرەكانن) دەڵێن: سوودی پێ نەگەیاندن ئەوەی كە ئێوە پێشتر (لە دونیا) خوداتان دەپەرست و هاوەڵ و شەریكتان بە هیچ شێوەیەک بۆ بڕیار نەدەدا.

خوای باڵادەستیش دەفەرمووێ: سوێند بە گەورەیی خۆم ئازادیان دەكەم لە ئاگر، بە دوایاندا دەنێرێت و دێنە دەرەوە لە ئاگر لەكاتێكدا زۆر سووتاون و ئێسكەكانیان دەركەوتووە، جا دەچنە ناو ڕووباری ژیانەوە و دەڕوێنەوە تیایدا چۆن تۆوی ڕووەک دەڕۆیتەوە لەناو قوڕ و لیتەی لافاو (زۆر بە خێرایی)، وە لە نێوان چاوەكانیان دەنوسرێت: ئەمانە ئازاد كراوانی خوان، جا دەبردێن و دەچنە

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

بەهەشتەوە، خەڵکی بەهەشتیش پێیان دەڵێن: ئەمانە جەهەننەمیەکانن، خوای زاڵ و بە دەسەڵاتیش دەفەرموێ: بەڵکو ئەمانە ئازاد کراوانی جەببارن.

٥٤ـ «عَنِ ابْنِ غَنْمٍ، قَالَ: نَزَلَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَشَقَّ بَطْنَهُ، ثُمَّ قَالَ جِبْرِيلُ: قَلْبٌ وَكِيعٌ فِيهِ أُذُنَانِ سَمِيعَتَانِ وَعَيْنَانِ بَصِيرَتَانِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ الْمُقَفِّي، الْحَاشِرُ، خُلُقُكَ قَيِّمٌ، وَلِسَانُكَ صَادِقٌ، وَنَفْسُكَ مُطْمَئِنَّةٌ»[1].

واتە: لە ئیبنو غەنمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: جبریل دابەزی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺو سکی لەت کرد، (سەیری ناو هەناوی کرد)، دواتر جبریل فەرمووی: دڵێکی تۆکمە و بەهێزە و دوو گوێچکەی بیسەری تیایە (واتە: دڵێکی گوێڕایەڵە)و، دوو چاوی بینەری تیایە ئەوە موحەممەدی ڕەوانەکراوی خودایە، کۆتایی پێغەمبەرانە، (حاشر)یشە (واتە: خەڵک لە بەردەمی ئەودا کۆدەکرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا)و، ڕەوشتیشت زۆر بەرزەو، زمانیشت ڕاستگۆیە و، نەفسیشت ئارام و لەسەرخۆیە.

٥٥ـ «عَنْ عَمْرِو بْنِ قَيْسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ أَدْرَكَ بِيَ الْأَجَلَ الْمَرْحُومَ وَاخْتَصَرَ لِيَ اخْتِصَارًا فَنَحْنُ الْآخِرُونَ، وَنَحْنُ السَّابِقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَإِنِّي قَائِلٌ قَوْلًا غَيْرَ فَخْرٍ: إِبْرَاهِيمُ خَلِيلُ اللَّهِ، وَمُوسَى صَفِيُّ اللَّهِ، وَأَنَا حَبِيبُ اللَّهِ، وَمَعِي لِوَاءُ الْحَمْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّوَجَلَّ وَعَدَنِي فِي أُمَّتِي وَأَجَارَهُمْ مِنْ ثَلَاثٍ: لَا يَعُمُّهُمْ بِسَنَةٍ، وَلَا يَسْتَأْصِلُهُمْ عَدُوٌّ، وَلَا يَجْمَعُهُمْ عَلَى ضَلَالَةٍ»[2].

واتە: لە عەمری کوڕی قەیس ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا بەهۆی منەوە بەزەیی خستۆتە کات و کردەوەی ئوممەتەکەم وتەکانیشی کورت کردومەتەوە (وتەی کورت و پڕ مانای پێ بەخشیوم)و، ئێمە کۆتا (گەلین لە دونیا)و، لەپێشی گەلانیشین لە دوا ڕۆژ (بۆ چوونە بەهەشت)، وە من قسەیەک دەکەم بە شانازیش وا ناڵێم: ئیبراهیم خەلیل و خۆشەویستی خوایە، مووساش هەڵبژێردراوی خوایە، منیش حەبیبی خوام (کە لە خەلیل خۆشەویست ترە)و، ئاڵای حەمد و سوپاس بە منە لە ڕۆژی دواییداو، خوا عَزَّوَجَلَّ بەڵێنی چاکی پێ داوم دەربارەی ئوممەتەکەم و، پاراستوونیشی لە سێ شت: قاتوقوڕی ناهێنێ بەسەریان بە گشتی، وە هیچ دوژمنێکیش ناتوانێت لە بن و بۆتکە هەڵیان بقەنێ و لەناویان بەرێت بە گشتی و یەکجارەکی، وە هەرگیزیش کۆیان ناکاتەوە لەسەر گومڕایی.

## بابەت: ئەو ڕێزەی خوا لە پێغەمبەری ﷺ ناوە، بە دابەزاندنی خواردن لە ئاسمانەوە

٥٦ـ «عَنْ سَلَمَةَ السَّكُونِيِّ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذْ قَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، هَلْ أُتِيتَ بِطَعَامٍ مِنَ السَّمَاءِ؟ قَالَ: نَعم أُتِيتُ بِطَعَامٍ» قَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ هَلْ كَانَ فِيهِ مِنْ فَضْلٍ؟ قَالَ: نَعم، قَالَ: فَمَا فُعِلَ بِهِ؟ قَالَ: رُفِعَ إِلَى السَّمَاءِ، وَقَدْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنِّي غَيْرُ لَابِثٍ فِيكُمْ إِلَّا قَلِيلًا، ثُمَّ تَلْبَثُونَ حَتَّى

---

(١) ـ مرسل بسند ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف منقطع.

تَقُولُوا: مَتَى مَتَى؟ ثُمَّ تَأْتُونِي أَفْنَادًا يُفْنِي بَعْضُكُمْ بَعْضًا، بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ مُوتَانٌ شَدِيدٌ، وَبَعْدَهُ سَنَوَاتُ الزَّلَازِلِ»[١].

واتە: لە سەلەمەی سەكونی ﷺ گێردراوەتەوە وتویەتی: لە كاتێكدا ئێمە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بووین كەسێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا هیچ خواردنێكت پێدراوە لە ئاسمانەوە؟ فەرمووی: بەڵێ خواردنم پێدراوە، كابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا زیادی كردو هیچی لێ مایەوە (دوای ئەوەی بەشی خۆت خوارد)؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، كابرا وتی: ئەی چی لێكرا (خواردنە زیادەكە چی لێ هات)؟ فەرمووی: بەرز كرایەوە بۆ ئاسمان، جا فەرمووی: وەحیم بۆ هاتوە كە نامێنمەوە لە ناوتان تەنها كەمێک نەبێت، دواتر ئێوە دەمێننەوە تا (وای لێ دێت) دەڵێن: كەی قیامەت دێت (لە ناڕەحەتی و بێزار بوونتان)، دواتر دەگەڕێنەوە بۆ لام بە پارچە پارچەیی (بە گروپی جیا جیا)، هەندێكتان هەندێكیترتان لەناو دەبات (لەسەر كاڵای دونیایی)، پێش ئەوەی ڕۆژی دوایی بێت (لە كۆتا زەماندا) نەخۆشی زۆرو مردنی زۆر ڕوودەدات و، لە پاشان ساڵانی بومەلەرزە دەست پێ دەكات (كە زەمین لەرزەی زۆری تیادا ڕوودەدات).

٥٧ـ «عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أُتِيَ بِقَصْعَةٍ مِنْ ثَرِيدٍ، فَوُضِعَتْ بَيْنَ يَدَيِ الْقَوْمِ، فَتَعَاقَبُوهَا إِلَى الظُّهْرِ مِنْ غُدْوَةٍ، يَقُومُ قَوْمٌ وَيَجْلِسُ آخَرُونَ». فَقَالَ رَجُلٌ لِسَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ: أَمَا كَانَتْ تُمَدُّ؟ فَقَالَ سَمُرَةُ: «مِنْ أَيِّ شَيْءٍ تَعْجَبُ؟ مَا كَانَتْ تُمَدُّ إِلَّا مِنْ هَاهُنَا»، وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى السَّمَاءِ»[٢].

واتە: لە سەمورەی كوڕی جوندوب ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سنیێک لە تەشریبی بۆ هات و لەبەر دەم خەڵكەكە دانرا، خەڵک لە بەیانیەوە تا نیوەڕۆ كۆمەڵ كۆمەڵ لەدوای یەک دەهاتن، كۆمەڵێک هەڵدەستان و كۆمەڵێكی تر دادەنیشتن و (لە خواردنەكەیان دەخوارد)، پیاوێكیش (بە سەرسوڕمانەوە) بە سەمورەی كوڕی جوندوبی وت: ئەوە چۆن ئەو خواردنە كاتی بۆ درێژ كرایەوە و (بەشی ئەو هەموو خەڵكەی كرد تا نیوەڕۆ، ئەو یارمەتیە چۆنە)؟! سەموڕەش وتی: لە چ شتێک سەرت سوڕدەمێنێ؟! كات و خواردن و یارمەتیەكە لە هیچ شوێنێک نیە تەنها لێرەوەیە، بە دەستیشی ئاماژەی بۆ ئاسمان دەكرد (واتە: ئەوە شتێكی ئیلاهیە).

## بابەت: دەربارەی جوانی پێغەمبەری خوا ﷺ

٥٨ـ «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي لَيْلَةٍ إِضْحِيَانٍ وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَيْهِ وَإِلَى الْقَمَرِ، قَالَ: فَلَهُوَ كَانَ أَحْسَنَ فِي عَيْنِي مِنَ الْقَمَرِ»[٣].

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ ضعيف.

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە شەوێکی زۆر ڕووناکی مانگەشەودا، جلێکی سوری لەبەردا بوو، منیش هەر سەیری ئەو و مانگم دەکرد، (جابر) دەڵێت: سوێند بە خوا لە چاوی من ئەو جوانتر بوو لە مانگەکە.

٥٩ـ «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَفْلَجَ الثَّنِيَّتَيْنِ، إِذَا تَكَلَّمَ رُئِيَ كَالنُّورِ يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ ثَنَايَاهُ»[١].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان دوو ددانەکانی پێشەوەی کەلێن هەبوو، جا کاتێک قسەی دەکرد شتێکی وەک ڕووناکی دەبینرا دەهاتە دەرەوە لە نێوان دوو ددانەکانی پێشەوەی.

٦٠ـ «قَالَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَنْجَدَ، وَلَا أَجْوَدَ، وَلَا أَشْجَعَ، وَلَا أَضْوَأَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٢].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، وتویەتی: کەسم نەبینیوە بەرزترو، سەخیترو، ئازاترو، پاک و خاوێن و گەشاوەتر بێت، لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

٦١ـ «عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ، قَالَ: قُلْتُ لِلرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، صِفِي لَنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّ لَوْ رَأَيْتَهُ، رَأَيْتَ الشَّمْسَ طَالِعَةً»[٣].

واتە: لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمماری کوڕی یاسرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە ڕوبەیعی کچی موعەوویذی کوڕی عەفرائم (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، وت: وەسفی پێغەمبەری خوامان ﷺ بۆ بکە، وتی: ئەی کوڕی خۆشەویستم[٤] ئەگەر بتبینیایە وا دابنێ خۆرت بینیوە بە هەڵاتوویی.

٦٢ـ «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَزْهَرَ اللَّوْنِ كَأَنَّ عَرَقَهُ اللُّؤْلُؤُ، إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ، وَمَا مَسَسْتُ حَرِيرَةً وَلَا دِيبَاجَةً أَلْيَنَ مِنْ كَفِّهِ، وَلَا شَمِمْتُ رَائِحَةً قَطُّ أَطْيَبُ مِنْ رَائِحَتِهِ: مِسْكَةً وَلَا غَيْرَهَا»[٥].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گێڕداوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی سوورو سپی بوو (وەک گوڵ) عەرەقیشی (ئارەقەکەی) وەک مرواری وابوو (ئەوەندە جوان بوو، کاتێک ئەو دڵۆپە ئارەقانە وەک مرواری سپی و ڕوون بەسەر ڕومەت و نێو چاوانی دەهاتە خوارەوە دەتوت دنکە

---

(١) ـ إسناده ضعيف جدا.

(٢) ـ رجاله ثقات.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ تێبینی: ڕستەی ( ئەی کوڕی خۆشەویستم) بە تەمەنەکان وەک ڕێز بەکاری دەهێنن بۆ جگە لە کوڕی خۆشیان، ئەوەش عادەتێکی زۆر جوانە..

(٥) ـ صحيح.

هەناره، وه بۆنیشی زۆر خۆش بوو وەک له فەرمووده‌ی تر هاتوه)، کاتێک دەڕۆیشت تۆزێک بەلای پێشەوەدا دەشکایەوە، وه هیچ جۆره حەریرێکم دەست لێ نەداوه نەرمتر بێت له دەستی پێغەمبەری خوا ﷺو، هەرگیز هیچ گوڵاوێکیشم بۆن نەکردووه بۆنی خۆشتر بێت له پێغەمبەری خوا ﷺ، جا بۆنەکه میسک بوبێت یان هەر بۆنێکی تر.

٦٣ـ «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: خَدَمْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَمَا قَالَ لِي: أُفٍّ قَطُّ، وَلَا قَالَ لِي لِشَيْءٍ صَنَعْتُهُ: لِمَ صَنَعْتَ كَذَا وَكَذَا، أَوْ هَلَّا صَنَعْتَ كَذَا وَكَذَا، وَقَالَ: لَا وَاللَّهِ، مَا مَسَسْتُ بِيَدِي دِيبَاجًا وَلَا حَرِيرًا أَلْيَنَ مِنْ يَدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَا وَجَدْتُ رِيحًا قَطُّ، أَوْ عَرْفًا كَانَ أَطْيَبَ مِنْ عَرْفِ، أَوْ رِيحِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[1].

واته: له ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گێردراوەتەوه، وتویەتی: خزمەتی پێغەمبەری خوام ﷺ کردووه (به درێژایی ده ساڵ) هەرگیز پێی نەوتووم: ئۆف (واته: هەرگیز وشەیەکی بێزاری بەرانبەرم دەرنەبڕیوه)و، هەرگیزیش لەسەر هیچ شتێک که ئەنجامم دابێت پێی نەوتووم: بۆ ئاواو ئاوات کردووه؟ یان بۆ ئاواو ئاوات نەکردووه؟

هەروەها وتویەتی: نەخێر سوێند به خوا به دەستەکانم دەستم نەداوه له هیچ دیباج[2]و، حەریرێک نەرمتر بێت له دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ، وه هیچ بۆن و گوڵاوێکم بۆن نەکردووه خۆشتر بێت له بۆنی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٦٤ـ «حَدَّثَنِي رَجُلٌ مِنْ بَنِي حُرَيْشٍ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مَعَ أَبِي حِينَ رَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَاعِزَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، فَلَمَّا أَخَذَتْهُ الْحِجَارَةُ، أُرْعِبْتُ، فَضَمَّنِي إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَسَالَ عَلَيَّ مِنْ عَرَقِ إِبْطِهِ مِثْلُ رِيحِ الْمِسْكِ»[3].

واته: پیاوێکی (بەنی حەریش) ﷺ وتویەتی: من لەگەڵ باوکم بووم ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماعیزی کوڕی مالیکی ﷺ ڕەجم کرد (لەسەر زینا کردن)، جا کاتێک بەردەکان ماعیزیان گرتەوه و بەری کەوت من ترسام، پێغەمبەری خواش ﷺ باوەشی تێکردم و هەندێک له ئارەقەی بن هەنگڵی چۆڕایەوه بەسەرمدا، که بۆنی وەک میسک وابوو.

٦٥ـ «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ قَالَ: سَأَلَهُ رَجُلٌ: أَرَأَيْتَ كَانَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِثْلَ السَّيْفِ؟ قَالَ: لَا، مِثْلَ الْقَمَرِ»[4].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ تێبینی: دیباج جۆرێکی باش و نەرمی حەریره، جا بۆیه باسی دیباجی کرد به تایبەتی و دواتر باسی حەریری کرد به گشتی، تاوەکو بڵێت به دڵنیایی هیچ جۆرێک له حەریر نیه جا دیباج بێت یان هەر جۆرێکی تر وەک دەستی موبارەکی ڕەسول الله ﷺ نەرم بێت، تا ماناکەی بپێکێت (والله أعلم).

(٣) ـ رجاله ثقات.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە بەڕڕائەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک پرسیاری لێکردوە: ئایا پێت وا نیە ڕووی پێغەمبەری خوا ﷺ وەک شمشێر وایە (لە ڕوانگەی جوانی و بریقەداری و درێژیەوە)؟ بەڕڕاء وتی: نەخێر، وەکو مانگ وایە (واتە: تەشبیهەکە بە مانگ جوانترە، چونکە ڕوو و دەموچاوی پێغەمبەری خوا ﷺ خڕ و ڕووناک بووە، هەر وەک چۆن مانگ خڕ و ڕووناکە).

٦٦ـ «عَنْ إِبْرَاهِيمَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعْرَفُ بِاللَّيْلِ بِرِيحِ الطِّيبِ»[١].

واتە: لە ئیبراهیم ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ دەناسرایەوە بە شەو بەهۆی بۆنی خۆشەوە[٢].

٦٧ـ «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَسْلُكْ طَرِيقًا - أَوْ لَا يَسْلُكُ طَرِيقًا - فَيَتْبَعُهُ أَحَدٌ إِلَّا عَرَفَ أَنَّهُ قَدْ سَلَكَهُ مِنْ طِيبِ عَرْفِهِ، أَوْ قَالَ: مِنْ رِيحِ عَرَقِهِ»[٣].

واتە: لە جابر ﷺ، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ بە هیچ ڕێگایێکدا نەدەڕۆیشت کەسێکیش لە دوای ئەو بەو ڕێگایەدا بڕۆیشتایە مەگەر هەر دەیزانی پێغەمبەر ﷺ پێیدا تێپەڕ بووە لەبەر خۆشی بۆنەکەی، یاخود لەبەر خۆشی بۆنی ئارەقەکەی.

## بابەت: ئەو ڕێزەی خوا لە پێغەمبەری ناوە ﷺ، لە وەقسەهاتنی مردوو

٦٨ـ «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ الْهَدِيَّةَ، وَلَا يَقْبَلُ الصَّدَقَةَ، فَأَهْدَتْ لَهُ امْرَأَةٌ مِنْ يَهُودِ خَيْبَرَ شَاةً مَصْلِيَّةً فَتَنَاوَلَ مِنْهَا، وتناوَلَ مِنْهَا بِشْرُ بْنُ الْبَرَاءِ، ثُمَّ رَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ يَدَهُ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَذِهِ تُخْبِرُنِي أَنَّهَا مَسْمُومَةٌ، فَمَاتَ بِشْرُ بْنُ الْبَرَاءِ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا النَّبِيُّ ﷺ: «مَا حَمَلَكِ عَلَى مَا صَنَعْتِ؟ فَقَالَتْ: إِنْ كُنْتَ نَبِيًّا لَمْ يَضُرَّكَ شَيْءٌ، وَإِنْ كُنْتَ مَلِكًا، أَرَحْتُ النَّاسَ مِنْكَ، فَقَالَ فِي مَرَضِهِ: مَا زِلْتُ أَجِدُ مِنَ الْأُكْلَةِ الَّتِي أَكَلْتُ بِخَيْبَرَ، فَهَذَا أَوَانُ انْقِطَاعِ أَبْهَرِي»[٤].

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (عادەتی وا بوو) دیاری وەردەگرت و دەیخوارد، بەڵام زەکات و خێری وەرنەدەگرت، (جوولەکەکانیش ئەمەیان دەزانی) بۆیە ئافرەتێکی جوولەکەی (خەیبەر) مەڕێکی سوورکراوەی کردە دیاری (کە ژەهراوی کرابوو)، پێغەمبەری خواش ﷺ تیکەیێکی لێ خوارد و (بیشری کوڕی بەڕڕاء)یش لێی خوارد، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی هەڵگرت و فەرمووی: ئەو مەڕە سوورکراوەیە پێم دەڵێت: کە ژەهراویە، جا (بیشری کوڕی

---

(١) ـ موقوف بسند حسن.

(٢) ـ (واتە: بە هۆی بۆنە خۆش و تایبەتیە سروشتیەکەی دەیانزانی ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆ لایان دێت، هەروەها دەیان زانی بەو شوێنەدا تێپەڕیوە ئەگەر نەشیان بینیبوایە).

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ صحيح.

بەڕڕاء) گیانی لە دەستدا (بە هۆی خواردنی گۆشتەكە)، پێغەمبەر ﷺ ناردی بەدوای ئافرەتەكە (جا كە هات لێی پرسی): چ شتێک وای كرد ئەو كارە بكەیت؟ ئافرەتەكەش وتی: ئەگەر پێغەمبەر بیت هیچ شتێک زیانت پێ ناگەیێنێت (واتە: ناتكوژێت و خوا دەتپارێزێت)، وە ئەگەر تەنها پاشایێک و دەسەڵاتدارێكیش بیت (ئەوە ئێستا بە ژەهرەكە دەمریت)و، خەڵكی دەحەسێنمەوە لە دەستی تۆ، ئنجا (دوای سێ ساڵ) لەكاتی نەخۆشی سەرەمەرگ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئێستاش هەست بە ئازاری خواردنەكە دەكەم كە لە خەیبەر خواردم، ئێستا كاتی پچڕانی دەماری پشتمە.

تێبینی: سەرەتا قسە و پاساوە پوچەكەی ئافرەتە جولەكەكە باتڵەو ڕاست نیە ئەوەی پێغەمبەر بێت نابێ تووشی كوشتن و ئازار ببێت، چونكە چەندین پێغەمبەر هەبووە ئازار دراوەو كوژراوە وەک (یەحیاو زەكەریاو ... هتد)، بەڵام لەو فەرموودەیە دوو موعجیزەی پێغەمبەرایەتی دەردەكەون كە ئەوان نیشانەی پێغەمبەرایەتین، دوو موعجیزەكانیش بریتین لەمانە:

یەكەم: گۆشتەكە بە برژاوی قسەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ كرد.

دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو كاتەی هەندێک لە گۆشتەكەی خوارد وەفاتی نەكرد، كەچی هاوەڵەكەی لەگەڵیدا بوو وەفاتی كرد، ئەوەش ئەو ئایەتە دەسەلمێنێت كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴿٦٧﴾ ﴾المائدة، واتە: خوا دەتپارێزێت لە خەڵكی (لە كوشتن، ئەو كاتەی دەیانەوێ بتكوژن). جا ئەو ئایەتە مەبەستی كوشتنە نەک ئازار نەخواردن، چونكە ئاشكرایە پێغەمبەری خوا ﷺ چەندین جار جەستەی بریندار بووە و ئازاری كێشاوە.

ئنجا ئەگەر پرسیار بكەین و بڵێین: ئەی چۆن لە كوشتن پارێزرا خۆ لەم فەرموودەیە دەفەرموی ئێستا كاتی پچڕانی دەماری پشتمە بە هۆی ژەهرەكە، كەواتە: ئایا بە ژەهرەكە وەفاتی نەكرد؟

لە وەڵامدا دەڵێین: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا بە ژەهرەكە وەفاتی نەكرد كە خواردی (موعجیزەكە هاتە جێ)، دواتر كە خۆی كاتی مردنی هات و جبریل فەرمووی دونیا هەڵدەبژێری، یان گەڕانەوە بۆ لای خوا و مردن؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: گەڕانەوە بۆ لای خوا هەڵدەبژێرم و، بڕیاری مردنی بۆ درا (قەدەری یەكەمی بۆ بڕیار درا). ئنجا لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر جار ئاواتی شەهیدبوونی دەخواست خوای پەروەردگار ئەو پلە گەورەیەی بە قسمەت كردو ئازاری ژەهرەكەی بۆ گەڕاندەوە و وەفاتی كرد.

كەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەجەلی خۆی وەفاتی كردووە نەک بە ژەهرەكە، بەڵام ئازاری ژەهرەكەش كاری خۆی كرد لەو كاتەی خوا ویستی لە كاتی ئەجەلی خۆی شەهیدی پێ ببەخشێت تاوەكو پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو گەورەییێكی پێ ببەخشرێت، ئەوەش ڕوونە كە یەكێک لە گەورەترین پلەش پلەی شەهیدیە.

٦٩ـ «كَانَ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يُحَدِّثُ أَنَّ يَهُودِيَّةً مِنْ أَهْلِ خَيْبَرَ سَمَّتْ شَاةً مَصْلِيَّةً ثُمَّ أَهْدَتْهَا إِلى النَّبِيِّ ﷺ فَأَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ الذِّرَاعَ فَأَكَلَ مِنْهَا وَأَكَلَ الرَّهْطُ مِنْ أَصْحَابِهِ مَعَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ: ارْفَعُوا أَيْدِيَكُمْ، وَأَرْسَلَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى الْيَهُودِيَّةِ فَدَعَاهَا، فَقَالَ لَهَا، أَسَمَمْتِ هَذِهِ الشَّاةَ؟ فَقَالَتْ: نَعم، وَمَنْ أَخْبَرَكَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ أَخْبَرَتْنِي هَذِهِ فِي يَدِي: لِلذِّرَاعِ، فقالتْ: نَعم، قَالَ: فَمَاذَا أَرَدْتِ إِلَى ذَلِكَ؟ قَالَتْ: قُلْتُ: إِنْ كَانَ نَبِيًّا لَمْ يَضُرَّهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ نَبِيًّا اسْتَرَحْنَا مِنْهُ فَعَفَا عَنْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَلَمْ يُعَاقِبْهَا، وتوُفِّيَ بَعْضُ أَصْحَابِهِ الَّذِينَ أَكَلُوا مِنَ الشَّاةِ، وَاحْتَجَمَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى كَاهِلِهِ مِنْ أَجْلِ الَّذِي أَكَلَ مِنَ الشَّاةِ حَجَمَهُ أَبُو هِنْدَ مَوْلَى بَنِي بَيَاضَةَ بِالْقَرْنِ وَالشَّفْرَةِ وَهُوَ مِنْ بَنِي ثُمَامَةَ، وَهُمْ حَيٌّ مِنَ الْأَنْصَارِ»[1].

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵلا (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێكی جوولەكەی خەڵكی خەیبەر ژەهری كردبووە ناو گۆشتی مەڕێكی سوورەوەكراو، دواتر كردی بە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پیلێكی حەیوانەكەی هەڵگرت و لێی خوارد، وە چەند كەسێكیش لەگەڵی لێیان خوارد، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: دەست هەڵگرن لە خواردن، جا پێغەمبەر ﷺ ناردی بەدوای ژنە جولەكەكە و بانگی كرد و پێی فەرموو: ئایا ژەهرت كردۆتە ناو گۆشتی ئەو مەڕە؟ ژنەكەش وتی: بەڵێ، كێ پێی وتی؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەو پارچە گۆشتەی ناو دەستەكانم هەواڵی پێ دام، ژنەكەش وتی: ڕاستە وایە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چیت مەبەست بوو بەو كارە؟ ژنەكە وتی: وتم: ئەگەر (موحەممەد) پێغەمبەر بێت زیانی پێ ناگات، خۆ ئەگەر پێغەمبەر نەبێت و (خۆی لە ئێمە كردبێتە پێغەمبەر) ئەوە (دەمرێت)و لەدەستی دەحەسێینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی خۆش بوو و سزای نەدا، جا هەندێك لەو هاوەڵانەی كە لە مەڕەكەیان خواردبوو وەفاتیان كرد، پێغەمبەر ﷺ حیجامە (كەڵەشاخ)ی لەسەر پشتی كرد (لە نێوان شانەكانی) لەبەر ئەو گۆشتە ژەهراویەی لە مەڕەكەی خواردبوو، باوكی هند كەڵەشاخەكەی بۆ كرد بە (بەكارهێنانی) قۆچ و مووس (جا ئەم پیاوە كە حیجامەكەی بۆ كرد) بەندەی هۆزی (بەیاضە) بوو، بەخۆشی لە هۆزی (ثومامە)یە كە هۆزێكی ئەنصاریەكانە لە مەدینە.

٧٠ـ «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: لَمَّا فُتِحَتْ خَيْبَرُ، أُهْدِيَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَاةٌ فِيهَا سُمٌّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اجْمَعُوا لِي مَنْ كَانَ هاهُنا مِنَ الْيَهُودِ، فَجُمِعُوا لَهُ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي سَائِلُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَهَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْهُ؟ قَالُوا: نَعم يَا أبا الْقَاسِمِ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَبُوكُمْ؟ قَالُوا: أَبُونَا فُلَانٌ، فَقَالَ لهم رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: كَذَبْتُمْ، بَلْ أَبُوكُمْ فُلَانٌ، قَالُوا: صَدَقْتَ وَبَرَرْتَ، فَقَالَ لَهُمْ: هَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ إِنْ سَأَلْتُكُمْ عَنْهُ؟ فَقَالُوا نَعم، وَإِنْ كَذَبْنَاكَ، عَرَفْتَ كَذِبَنَا كَمَا عرفْتَهُ فِي أَبِينَا، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَمَنْ أَهْلُ النَّارِ؟ فَقَالُوا: نَكُونُ فِيهَا يَسِيرًا، ثُمَّ تَخْلُفُونَنَا فِيهَا، فقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اخْسَؤُوا فِيهَا، وَاللَّهِ لَا نَخْلُفُكُمْ فِيهَا أَبَدًا» ثُمَّ قَالَ لَهُمْ: هَلْ أَنْتُمْ صَادِقِيَّ عَنْ شَيْءٍ إِنْ سَأَلْتُكُمْ عَنْهُ؟ قَالُوا: نَعم، قَالَ: هَلْ جَعَلْتُمْ فِي هَذِهِ الشَّاةِ سُمًّا؟ قَالُوا: نَعم، قَالَ: مَا حَمَلَكُمْ عَلَى ذَلِكَ؟ قَالُوا: أَرَدْنَا إِنْ كُنْتَ كَاذِباً أَنْ نَسْتَرِيحَ مِنْكَ، وَإِنْ كُنْتَ نَبِيًّا، لَمْ يَضُرَّكَ»[2].

---

(١) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: کاتێک خەیبەر ئازادکرا مەڕێکی سوورکراوە کرا بە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە ژەهری تیا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چەند جولەکە لێرە هەیە بۆم کۆ بکەنەوە، ئەوانیش بۆیان کۆ کردنەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە جولەکەکانی فەرموو: من پرسیاری شتێکتان لێ دەکەم جا ئایا ڕاستگۆ دەبن لەگەڵمدا؟ وتیان: بەڵێ ئەی ئەبو قاسم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: کێ باوکتانە؟ وتیان: فڵانە کەس، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموون: درۆتان کرد، بەڵکو باوکتان فڵانە کەسە، وتیان: ڕاستت فەرموو، پێغەمبەری خوا ﷺ (دووبارە) پێی فەرموون: ئایا ئێوە ڕاستگۆ دەبن لەگەڵم دەربارەی شتێک ئەگەر پرسیارتان لێ بکەم؟ وتیان: بەڵێ، وە ئەگەر درۆت لەگەڵ بکەین ئەوە تۆ دەزانی درۆمان لەگەڵ کردووی وەک چۆن زانیت درۆمان لەگەڵ کردی دەربارەی پرسیاری باوکمان، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: کێ خەڵکی ئاگرە؟ وتیان: ئێمە دەچینە ناو ئاگر ماوەیەکی کەم و، دواتر ئێوە دێنە شوێنی ئێمە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بێ دەنگ بن و دەمتان داخەن هەر لەناو ئاگر دەمێننەوە و، سوێند بە خوا هەرگیز ئێمە ناچینە شوێنی ئێوە بۆ ناو ئاگر، دواتر پێی فەرموون: ئایا ڕاستگۆ دەبن لەگەڵمدا ئەگەر پرسیاری شتێکتان لێ بکەم؟ وتیان: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: ئایا ژەهرتان کردۆتە ناو گۆشتی ئەو مەڕەوە؟ وتیان: بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چی وای کرد ئاوا بکەن؟ وتیان: ویستمان لە دەستت بحەسێینەوە ئەگەر درۆزن بیت و (پێغەمبەر نەبیت)، وە ئەگەر پێغەمبەریش بیت زیانت پێ ناگات.

## بابەت: دەربارەی سەخاوەت و بەخشندەیی پێغەمبەری خوا ﷺ

**٧١ـ** «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: مَا سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ شَيْئًا قَطُّ فَقَالَ: لَا. قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: قَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ: إِذَا لَمْ يَكُنْ عِنْدَهُ وَعَدَ»[١].

واتە: لە جابر ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەرگیز داوای شتێکی لێ نەکراوە وتبێتی: نەخێر، ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئیبنو عویەینە وتویەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شتەی نەبوایە (کە داوایان لێ دەکرد) ئەوە بەڵێنی پێ دەدان پێیان بدات کاتێ هاتە دەستی.

**٧٢ـ** «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَيِيًّا لَا يُسْأَلُ شَيْئًا إِلَّا أَعْطَاهُ»[٢].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعد ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە شەرم و حەیا بوو، داوای هەر شتێکی لێ کرابووایە مەحاڵە هەر دەیبەخشی.

**٧٣ـ** «عَنْ رَجُلٍ مِنَ الْعَرَبِ ﷺ قَالَ: زَحَمْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ وَفِي رِجْلَيَّ نَعْلٌ كَثِيفَةٌ، فَوَطِئْتُ بِهَا عَلَى رِجْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَنَفَحَنِي نَفْحَةً بِسَوْطٍ فِي يَدِهِ وَقَالَ: بِسْمِ اللَّهِ أَوْجَعْتَنِي، قَالَ: فَبِتُّ لِنَفْسِي لَائِمًا أَقُولُ: أَوْجَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فَبِتُّ بِلَيْلَةٍ كَمَا يَعْلَمُ اللَّهُ، فَلَمَّا أَصْبَحْنَا، إِذَا رَجُلٌ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

يَقُولُ: أَيْنَ فُلَانٌ؟ قَالَ: قُلْتُ: هَذَا وَاللَّهِ الَّذِي كَانَ مِنِّي بالأَمْسِ، قَالَ: فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا مُتَخَوِّفٌ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّكَ وَطِئْتَ بِنَعْلِكَ عَلَى رِجْلِي بالأَمْسِ فَأَوْجَعْتَنِي، فَنَفَحْتُكَ نَفْحَةً بِالسَّوْطِ، فَهَذِهِ ثَمَانُونَ نَعْجَةً، فَخُذْهَا بِهَا»[1].

واتە: لە پیاوێکی عەرەب ﷺ (کە هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە) گێردراوەتەوە، وتویەتی: ڕۆژی حونەین لە قەرەباڵغی و تەنگەبەری کەوتبوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺو، نەعلەیەکی ئەستورو (ڕەقیشم) لە پێ دابوو پێم خستە سەر قاچی پێغەمبەری خوا ﷺ بە نەعلەکەم، پێغەمبەری خواش ﷺ بە قامچیەکەی دەستی بە سوکی لێیدام (بۆ لادای نەعلەکەم لەسەر قاچی)و فەرمووی: بە ناوی خوا وا دەکەم، ئازارت پێ گەیاندم، پیاوەکە دەڵێت: شەوەکە شەوم کردەوە هەر لۆمەی خۆم دەکردو دەمووت: ئازارم بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیاندووە، دەڵێت: شەوێکم کردەوە هەر خوا دەزانێ چەندە ناخۆش بوو (هەر لۆمەی خۆم دەکرد)، جا کاتێک بەیانیمان کردەوە (بەیانی داهات)، لەناکاو پیاوێک هات وتی: کوانێ فلان؟ دەڵێ وتم: بەخوا ئەوە دەربارەی ئەو شتەیە کە دوێنێ لە من ڕوویدا، دەڵێت: چووم لە کاتێکدا زۆر دەترسام، (جا کە گەیشتم) پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: تۆ دوێنێ پێت لەسەر پێی من داناو ئازارت پێ گەیاندم، منیش لێدانێکی سوکم لێدای بە قامچی، ها ئەوە هەشتا مەڕە بیانبە بۆ خۆت (لە تۆڵەی لێدانی قامچیە سوکەکە)!!!.

٧٤- «عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ إِنَّ جِبْرِيلَ عليه السلام قَالَ: مَا فِي الْأَرْضِ أَهْلُ عَشَرَةِ أَبْيَاتٍ إِلَّا قَلَّبْتُهُمْ، فَمَا وَجَدْتُ أَحَدًا أَشَدَّ إِنْفَاقًا لِهَذَا الْمَالِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[2].

واتە: لە زوهری گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: جبریل عليه السلام، فەرموویەتی: ئەوەی لە سەر زەویدا هەیە ئەگەر لە ماڵیش بووبن چووم سەیرم کردووە و (بەناویاندا گەڕاوم)، کەسم نەبینیوە سەروەت و سامان زیاتر ببەخشێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

## بابەت: دەربارەی سادەیی و خاکیەتی پێغەمبەری خوا ﷺ

٧٥- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُكْثِرُ الذِّكْرَ وَيُقِلُّ اللَّغْوَ، وَيُطِيلُ الصَّلَاةَ، وَيُقْصِرُ الْخُطْبَةَ، وَلَا يَأْنَفُ وَلَا يَسْتَنْكِفُ أَنْ يَمْشِيَ مَعَ الْأَرْمَلَةِ، وَالْمِسْكِينِ فَيَقْضِيَ لَهُمَا حَاجَتَهُمَا»[3].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفا ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ زۆر یادی خوای دەکرد، کەم قسەی دونیایی دەکرد، نوێژیشی درێژ دەکردەوە، وتاریشی کورت دەکردەوە، پێشی ناخۆش نەبوو و خۆی بە زل و گەورە نەدەزانی لەوەی لەگەڵ بێوەژن و هەژاران بڕوات و پێویستیەکانیان بۆ جێبەجێ بکات (بەڵکو دەچوو بۆ یارمەتی دانیان).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ مرسل، ورجاله ثقات.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ

٧٦- «قَالَ الْعَبَّاسُ ﷺ، لَأَعْلَمَنَّ مَا بَقَاءُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِينَا؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، إِنِّي أَرَاهُمْ قَدْ آذَوْكَ وَآذَاكَ غُبَارُهُمْ، فَلَوِ اتَّخَذْتَ عَرِيشًا تُكَلِّمُهُمْ مِنْهُ؟ فَقَالَ: لَا أَزَالُ بَيْنَ أَظْهُرِهِمْ يَطَؤُونَ عقِبِي، وَيُنَازِعُونِي رِدَائِي حَتَّى يَكُونَ اللَّهُ هُوَ الَّذِي يُرِيحُنِي مِنْهُمْ، قَالَ: فَعَلِمْتُ أَنَّ بَقَاءَهُ فِينَا قَلِيلٌ»[١].

واتە: لە عەبباس ﷺ گێڕدراوەتەوە، (جارێكیان) وتی: سوێند بە خوا دەبێ بزانم پێغەمبەری خوا ﷺ چەند لەناوماندا دەمێنێتەوە؟ جا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینم خەڵكی ئازارت دەدەن و خوڵ و تۆزەكەشیان ئازارت دەدەن (لە مزگەوتدا)، جا ئەگەر كەپرێك و مینبەرێك دروست بكەیت تا لەوێ قسەیان بۆ بكەیت (لە كاتی وتاردان) ئەو كات دەپارێزرێی لە ئازار و تۆز و خوڵ؟ فەرمووی: بەردەوام لەناویان دەبم تاوەكو شوێنم بكەون و، كەوێ و جل و بەرگم ڕابكێشن، تاوەكو خوای پەروەردگار دەمحەسێنێتەوە لە دەستیان (واتە: تا دەمرم)، عەبباس وتی: جا زانیم مانەوەی لەناوماندا كەمی ماوە.

٧٧- «عَنْ دَاوُدَ بْنِ عَلِيٍّ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَلَا نَحْجُبُكَ؟ فَقَالَ: لَا دَعُوهُمْ يَطَؤُونَ عَقِبِي وَأَطَأُ أَعْقَابَهُمْ حَتَّى يُرِيحَنِي اللَّهُ مِنْهُمْ»[٢].

واتە: لە داودی كوڕی عەلی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا نەتپارێزین (لە ئازاردانی خەڵك و خوڵ و تۆز)؟ فەرمووی: نەخێر، لێیان گەڕێن با شوێنم بكەون و منیش شوێنیان بكەوم (بۆ هیدایەتدانیان) تاوەكو خوا دەمحەسێنێتەوە لێیان (تاوەكو وەفات دەكەم).

٧٨- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَرَضِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ وَنَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ عَاصِباً رَأْسَهُ بِخِرقَةٍ حَتَّى أَهْوَى نَحْوَ الْمِنْبَرِ فَاسْتَوَى عَلَيْهِ وَاتَّبَعْنَاهُ، قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنِّي لَأَنْظُرُ إِلَى الْحَوْضِ مِنْ مَقَامِي هَذَا، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ عَبْدًا عُرِضَتْ عَلَيْهِ الدُّنْيَا وَزِينَتُهَا، فَاخْتَارَ الْآخِرَةَ، قَالَ: فَلَمْ يَفْطِنْ لَهَا أَحَدٌ غَيْرُ أَبِي بَكْرٍ رِضْوَانُ اللَّهِ عَلَيْهِ فَذَرَفَتْ عَيْنَاهُ، فَبَكَى، ثُمَّ قَالَ: بَلْ نَفْدِيكَ بِآبَائِنَا وَأُمَّهَاتِنَا وَأَنْفُسِنَا وَأَمْوَالِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: ثُمَّ هَبَطَ فَمَا قَامَ عَلَيْهِ حَتَّى السَّاعَةِ»[٣].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ ناومان لە كاتی نەخۆشیەكەی كە تیایدا وەفاتی كرد ئێمەش لە مزگەوت بووین، پارچە پەڕۆكێكی لە سەری بەستابوو، (هات) تاوەكو چوو بۆ لای مینبەرەكە و لەسەری وەستا، ئێمەش شوێنی كەوتین، فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە من لەم شوێنە حەوزەكە دەبینم (واتە: لێرەوە حەوزی كەوسەر دەبینم)، دواتر فەرمووی: بەندەیەكی خوا دونیا و جوانیەكانی دونیای پێشكەش كراوە (ئەگەر

---

(١)ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٢) ـ إسناده معضل.

(٣) ـ صحيح.

هەڵی بژێرێت)، ئەویش دوارۆژ و گەڕانەوەی هەڵبژاردووە بۆ لای خوا، ئەبو سەعیدی خودری دەڵێ: کەس لەو وتەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەگەیشت جگە لە ئەبو بەکر، ڕاستەوخۆ چاوەکانی فرمێسکیان پێدا هاتە خوارەوەو گریا، دواتر وتی: بەڵکو ئێمە بە قوربانت بین (لە جێگەی تۆ بمرین) بە باوک و دایک و گیان و سەروەت و سامانمانەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەبو سەعیدی خودری دەڵێ: دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە خوارەوە لەسەر مینبەرەکە و، جارێکیتر نەگەڕایەوە سەری تاوەکو کاتی وەفاتی هات و (کۆچی دوایی کرد).

**٧٩ـ** «عَنْ أَبِي مُوَيْهِبَةَ ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي قَدْ أُمِرْتُ أَنْ أَسْتَغْفِرَ لِأَهْلِ الْبَقِيعِ فَانْطَلِقْ مَعِي، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ فَلَمَّا وَقَفَ عَلَيْهِمْ، قَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ يَا أَهْلَ الْمَقَابِرِ، لِيُهْنِكُمْ مَا أَصْبَحْتُمْ فِيهِ مِمَّا أَصْبَحَ فِيهِ النَّاسُ، لَوْ تَعْلَمُونَ مَا نَجَّاكُمُ اللَّهُ مِنْهُ أَقْبَلَتِ الْفِتَنُ كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ يَتْبَعُ آخِرُهَا أَوَّلَهَا: الْآخِرَةُ أَشَرُّ مِنَ الْأُولَى، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيَّ، فَقَالَ: يَا أَبا مُوَيْهِبَةَ إِنِّي قَدْ أُوتِيتُ بِمَفَاتِيحِ خَزَائِنِ الدُّنْيَا وَالْخُلْدِ فِيهَا، ثُمَّ الْجَنَّةُ، فَخُيِّرْتُ بَيْنَ ذَلِكَ وَبَيْنَ لِقَاءِ رَبِّي، قُلْتُ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، خُذْ مَفَاتِيحَ خَزَائِنِ الدُّنْيَا وَالْخُلْدَ فِيهَا، ثُمَّ الْجَنَّةَ قَالَ: لَا وَاللَّهِ يَا أَبا مُوَيْهِبَةَ، لَقَدِ اخْتَرْتُ لِقَاءَ رَبِّي، ثُمَّ اسْتَغْفَرَ لِأَهْلِ الْبَقِيعِ ثُمَّ انْصَرَفَ، فَبُدِئَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِوَجَعِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ»[١].

واتە: لە ئەبو موەیهیبەوە ﷺ کە بەندەیەکی ئازاد کراوی پێغەمبەری خوایە ﷺ، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: من فەرمانم پێ کراوە کە داوای لێ خۆشبوون بۆ مردووانی گۆڕستانی بەقیع بکەم، بۆیە لەگەڵم وەرە (با بچین)، منیش لەگەڵی ڕۆیشتم لە نیوە شەودا، جا کاتێک گەیشتە بەقیع وەستا لەلای گۆڕستانەکە فەرمووی: سەلامی خواتان لەسەر بێت ئەی خەڵکی گۆڕستان، پیرۆزتان بێت ئەوەی ئێوە تیایدان (چەند جیاوازە) لەوەی ئێستا خەڵک تیایدایە، ئەگەر دەزانن ئەوەی خوا ئێوەی لێ دەرباز کردووە (چەندە گرنگە کە نەگەیشتونەتە ئەو زەمانە خراپەی ئێستا)، ئاشووب وەک پەڵە شەوی تاریک هەڵیکردووە و ڕووی کردۆتە خەڵکی، فیتنەی دواتر لەدوای فیتنەی یەکەم دێت ڕاستەوخۆ، ئەوەی دواتر لەوەی یەکەم خراپترە، دواتر ڕووی کردە من و فەرمووی: ئەی ئەبو موەیهیبە من کلیلەکانی خەزێنەکانی دونیا و مانەوە لە دونیادا تا ڕۆژی دوایی و دواتریش چوونە بەهەشتم پێدرا، جا سەرپشک کرام لە نێوان ئەوە و لە نێوان (زوو) گەیشتن بە خوادا ـ واتە: مردن ـ ئەبو موەیهیبە دەڵێت وتم: بە باوک و دایکەوە بە قوربانتبم کلیلەکانی خەزێنەکانی دونیاو مانەوە تیایداو دواتریش چوونە بەهەشت هەڵبژێرە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر (ئاوا ناکەم) سوێند بە خوا ئەی ئەبو موەیهیبە من گەیشتن بە خوام هەڵبژاردووە، دواتر داوای لێ خۆشبوونی بۆ خەڵکی بەقیع کرد، دواتر ڕۆیشت، جا لەوە بەولاوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بەو ئازار کێشانە کرد کە تیایدا وەفاتی کرد.

---

(١) ـ إسناده حسن.

٨٠ـ «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١﴾النصر، دَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاطِمَةَ فَقَالَ: قَدْ نُعِيَتْ إِلَيَّ نَفْسِي، فَبَكَتْ، فَقَالَ: لَا تَبْكِي فَإِنَّكِ أَوَّلُ أَهْلِي لِحَاقًا بِي، فَضَحِكَتْ، فَرَآهَا بَعْضُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ فَقُلْنَ: يَا فَاطِمَةُ، رَأَيْنَاكِ بَكَيْتِ ثُمَّ ضَحِكْتِ؟ قَالَتْ: إِنَّهُ أَخْبَرَنِي أَنَّهُ قَدْ نُعِيَتْ إِلَيْهِ نَفْسُهُ فَبَكَيْتُ، فَقَالَ لِي: لَا تَبْكِي فَإِنَّكِ أَوَّلُ أَهْلِي لَاحِقٌ بِي، فَضَحِكْتُ»[١].

وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ وَجَاءَ أَهْلُ الْيَمَنِ هُمْ أَرَقُ أَفْئِدَةً، وَالإِيمَانُ يَمَانٍ، وَالْحِكْمَةُ يَمَانِيَةٌ.

واته: له عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: كاتێک ئایەتی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١﴾النصر، دابەزی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی فاتیمەی كچی كرد و فەرمووی: نەفسم پێم دەڵێ مردنت نزیک بۆتەوە، فاتیمە دەستی بە گریان كرد، فەرمووی: مەگری، تۆ یەكەمی خانەوادەی منی كە بە من دەگەیت، فاتیمە پێكەنی (زۆر دڵی خۆش بوو)، جا هەندێک لە خێزانەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ (كە یەكێكیان دایكمان عائیشە بوو) فاتیمەیان بینی (كە گریا و پێكەنی) بۆیە وتیان: ئەی فاتیمە ئێمە تۆمان بینی گریای دواتر پێكەنی (مەسەلە چی بوو)؟! فاتیمە وتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ) هەواڵی پێ دام كە مردن و ئەجەلی نزیک بۆتەوە منیش گریام، دواتر پێی فەرمووم: مەگری، تۆ یەكەمی خانەوادەی منی كە بە من دەگەی، منیش پێكەنیم.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو كاتەی سەرخستنی خوا (بۆ مسوڵمانان) هات و فەتحی مەككە كرا خەڵكی (یەمەن)یش دێن، كە دڵ نەرمترینن و، ئیمانی (بەهێز) هەر لە یەمەنە و، حیكمەت و شەرع زانیش هەر یەمەنییە[٢].

٨١ـ «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: رَجَعَ إِلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ مِنْ جَنَازَةٍ مِنَ الْبَقِيعِ فَوَجَدَنِي وَأَنَا أَجِدُ صُدَاعاً وَأَنَا أَقُولُ: وَارَأْسَاهُ، قَالَ: بَلْ أَنَا يَا عَائِشَةُ وَارَأْسَاهُ، قَالَ: وَمَا ضَرَّكِ لَوْ مُتِّ قَبْلِي فَغَسَّلْتُكِ وَكَفَّنْتُكِ، وَصَلَّيْتُ عَلَيْكِ وَدَفَنْتُكِ، فَقُلْتُ: لَكَأَنِّي بِكَ وَاللَّهِ لَوْ فَعَلْتَ ذَلِكَ لَرَجَعْتَ إِلَى بَيْتِي فَعَرَّسْتَ فِيهِ بِبَعْضِ نِسَائِكَ، قَالَتْ: فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ بُدِئَ فِي وَجَعِهِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ»[٣].

واته: له عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە وتویەتی: ڕۆژێكیان پێغەمبەر ﷺ لە ناشتنی جەنازەیەک لە (گۆڕستانی) بەقیع گەڕایەوە و، منی بینی لەكاتێكدا سەر ئێشەم لێ بوو و دەم وت: وای سەرم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵكو ئەی عائیشە من وای سەرم، (فەرمووی): چ زیانێكت پێ دەگات ئەگەر تۆ پێشی من بمریت و منیش تۆم شۆرد و كفنم كردی و نوێژم لەسەر كردی و شاردمیەوە؟ عائیشە دەڵێ: منیش وتم: وا دەزانم ئەگەر وات كرد دەگەڕێیتەوە ماڵەكەی من و لەگەڵ هەندێک لە خێزانەكانی ترت دەخەویت، دەفەرموێت: پێغەمبەری خواش ﷺ زەردەخەنەی كرد و پێكەنی، دواتر ئازارەكەی دەستی پێ كرد كە تیایدا وەفاتی كرد.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢)ـ واته: خەڵكی یەمەن زووترو زۆرتر سود لە بانگەوازی ئیسلام وەردەگرن و خۆیان لە پەیامەكە شارەزا دەكەن.

(٣) ـ حسن.

٨٢- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِي مَرَضِهِ: صُبُّوا عَلَيَّ سَبْعَ قِرَبٍ مِنْ سَبْعِ آبَارٍ شَتَّى حَتَّى أَخْرُجَ إِلَى النَّاسِ فَأَعْهَدَ إِلَيْهِمْ. قَالَتْ: فَأَقْعَدْنَاهُ فِي مِخْضَبٍ لِحَفْصَةَ فَصَبَبْنَا عَلَيْهِ الْمَاءَ صَبا أَوْ شَنَنَّا عَلَيْهِ شَنًّا - الشَّكُ مِنْ قِبَلِ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ - فَوَجَدَ رَاحَةً فَخَرَجَ فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَاسْتَغْفَرَ لِلشُّهَدَاءِ مِنْ أَصْحَابِ أُحُدٍ وَدَعَا لَهُمْ، ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ الأَنْصَارَ عَيْبَتِي الَّتِي أَوَيْتُ إِلَيْهَا، فَأَكْرِمُوا كَرِيمَهُمْ وتجَاوَزُوا عَنْ مُسِيئِهِمْ إِلاَّ فِي حَدّ، أَلاَ إِنَّ عَبْداً مِنْ عِبَادِ اللَّهِ قَدْ خُيِّرَ بَيْنَ الدُّنْيَا وَبَيْنَ مَا عِنْدَ اللَّهِ فَاخْتَارَ مَا عِنْدَ اللَّهِ، فَبَكَى أَبُو بَكْرٍ وَظَنَّ أَنَّهُ يَعْنِى نَفْسَهُ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: عَلَى رِسْلِكَ يَا أَبَا بَكْرٍ، سُدُّوا هَذِهِ الأَبْوَابَ الشَّوَارِعَ إِلَى الْمَسْجِدِ إِلاَّ بَابَ أَبِي بَكْرٍ، فَإِنِّي لاَ أَعْلَمُ امْرَأً أَفْضَلَ عِنْدِى يَداً فِي الصُّحْبَةِ مِنْ أَبِي بَكْرٍ»[١].

واتە: لە عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی نەخۆشیەکەی فەرمووی: حەوت کوندە ئاوم بەسەردا بڕێژن لە حەوت بیری جیا، تاوەکو بچمە دەرەوە بۆ لای خەڵکی و وەسیەتیان بۆ بکەم، خاتوو عائیشە دەڵێت: ئێمەش دامانیشاند لەناو تەشتێکی گەورە، کە هی حەفصە بوو و، ئاومان بەخوڕ بەسەریدا ڕشت ـ یان وتی: بە ڕشێنە و پچڕ پچڕ بە سەرماندا ڕشت (ئەو گومانە لە لای موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دروست بووە کە یەکێکە لە گێڕەوانی ئەم فەرموودەیەیە) جا پێغەمبەری خوا ﷺ تۆزێک هەستی بە حەسانەوە کرد و چووە دەرەوە و، سەرکەوتە سەر مینبەر و سوپاسی خوای کرد و وەسفی جوانی کرد و داوای لێخۆشبونی بۆ شەهیدانی ئوحود کرد و دوعای بۆ کردن، دواتر فەرمووی:

أما بعد، بە دڵنیایی ئەنصارییەکان ئەو پارێزەرەن بۆم کەپەنام بۆ بردووە، ڕێز لە بەرێزەکانیان بگرن و، چاوپۆشی لە خراپەکانیشیان بکەن، تەنها لە جێبەجێ کردنی حەددی (شەرعی) نەبێت، (چونکە ناکرێت چاوپۆشی بکرێت لە هیچ کەسێک)، ئاگاداربن بە دڵنیایی بەندەیەک لە بەندەکانی خوا سەرپشک کراوە لە نێوان (هەڵبژاردنی) دونیا و لە نێوان ئەوەی لەلای خوای پەروەردگار هەیە، ئەویش ئەوەی لای خوای پەروەردگاری هەڵبژاردووە، ڕاستەوخۆ ئەبو بەکر دەستی بە گریان کردو، زانی پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی خۆیەتی (ئەجەلی نزیک بووە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەسەرخۆبە ئەی ئەبو بەکر، ئادەی هەموو ئەو دەرگایانەی کۆڵان دابخەن کە بۆ مزگەوت دێن جگە لە دەرگای ئەبو بەکر (ئەو بهێڵنەوەو دایمەخەن)، چونکە من وانازانم کەسێک هەبێت بەڵام دەستی هاوەڵیەتی چاکتر و زیاتر بێت لە ئەبو بەکر.

٨٣- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أُوذِنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالصَّلاَةِ فِي مَرَضِهِ، فَقَالَ: مُرُوا أبا بَكْرٍ يُصَلِّى بِالنَّاسِ، ثُمَّ أُغْمِيَ عَلَيْهِ، فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْهُ قَالَ: هَلْ أَمَرْتُنَّ أبا بَكْرٍ يُصَلِّى بِالنَّاسِ، فَقُلْتُ: إِنَّ أبا بَكْرٍ رَجُلٌ رِقِيقٌ، فَلَوْ أَمَرْتَ عُمَرَ؟ فَقَالَ: أَنْتُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ، مُرُوا أَبا بَكْرٍ يُصَلِّى بِالنَّاسِ، فَرُبَّ قَائِلٍ مُتَمَنٍّ، وَيَأْبَى اللَّهُ وَالْمُؤْمِنُونَ»[٢].

---

(١) ـ صحيح لغيره.

(٢) ـ إسناده حسن.

واتە: لە دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێردراوەتەوە وتویەتی: بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاگەیەندرا کە کاتی نوێژە، لەو کاتەی کە نەخۆش بوو، ئەویش فەرمووی: فەرمان بە ئەبو بەکر بکەن با نوێژ بە خەڵکی بکات، دواتر لە هۆش خۆی چوو، جا کاتێک بە هۆش خۆی هاتەوە فەرمووی: ئایا فەرمانتان بە ئەبو بەکر کرد نوێژ بە خەڵکی بکات؟ عائیشە دەڵێت وتم: ئەبو بەکر پیاوێکی دڵ ناسکە (خۆی پێ ناگیرێ لەبەر گریان کاتێ دەبینێ تۆ حاڵت باش نیە و نوێژت پێ ناکرێت، وە (لەبەر گریان) خەڵک گوێیان لە قورئان خوێندنەکەی نابێت)، جا بۆ فەرمان بە عومەر ناکەیت (پێش نوێژیەکە بکات)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێوە (کە مەبەستی ئافرەتانە) وەک زولەیخای (یوسف)ن، ئادەی فەرمان بە ئەبو بەکر بکەن نوێژ بە خەڵکی بکات، ڕەنگە کەسێک تەماحی لە شوێنەکەی ئەو بکات (واتە: ڕەنگە کەسێک بیەوێ ببێتە خەلیفە لە شوێنی ئەو) و شتێک دروست بکات بۆ پاڵپشتی خۆی، خواو بڕواداران بە ئەبو بەکر نەبێت ڕازی نابن.

تێبینی: کە دەفەرموێ (ئێوە وەک ساحێبی (یوسف)ن) واتە: وەک زولەیخا وان، چونکە زولەیخا شتێکی درکاند کە مەبەستی نەبوو، بەڵکو مەبەستێکی شاراوەی هەبوو، ئەویش بریتی بوو لەو کاتەی کە زولەیخا ئافرەتەکانی بانگێشت کردبوو بە ناوی میوانی و مەبەستیشی میوانی کردنیان نەبوو، بەڵکو مەبەستی ئەوە بوو کە جوانی یوسف ببینن.

جا خاتوو (عائیشە)ش لێرەدا شتێکی دەرخست کەچی مەبەستی شتێکی تر بوو، ئەویش بریتی بوو لەوەی وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەکر دڵ ناسکە و خەڵک گوێیان لە قورئان خوێندنەکەی نابێت)، هەرچەندە قسەکەی ڕاست بوو، بەڵام مەبەستی ئەوە نەبوو، بەڵکو مەبەستی ئەوە بوو کەس شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ نەگرێتەوە و وەک ئەو خۆشەویست نەبێت لە دڵی خەڵکی (هێندە خۆشی دەویست و عاشقی بوو).

٨٤ـ «عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ، فَحُبِسَ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ وَلَيْلَتِهِ وَالْغَدَ حَتَّى دُفِنَ لَيْلَةَ الأَرْبِعَاءِ، وَقَالُوا: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَمُتْ وَلَكِنْ عُرِجَ بِرُوحِهِ كَمَا عُرِجَ بِرُوحِ مُوسَى، فَقَامَ عُمَرُ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَمُتْ، وَلَكِنْ عُرِجَ بِرُوحِهِ كَمَا عُرِجَ بِرُوحِ مُوسَى، وَاللَّهِ لاَ يَمُوت رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى يَقْطَعَ أَيْدِيَ أَقْوَامٍ وَأَلْسِنَتَهُمْ. فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يَتَكَلَّمُ حَتَّى أَزْبَدَ شِدْقَاهُ مِمَّا يُوعِدُ وَيَقُولُ، فَقَامَ الْعَبَّاسُ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَدْ مَاتَ وَإِنَّهُ لَبَشَرٌ، وَإِنَّهُ يَأْسُنُ كَمَا يَأْسُنُ الْبَشَرُ أَيْ قَوْمِ، فَادْفِنُوا صَاحِبَكُمْ فَإِنَّهُ أَكْرَمُ عَلَى اللَّهِ مِنْ أَنْ يُمِيتَهُ إِمَاتَتَيْنِ، أَيُمِيتُ أَحَدَكُمْ إِمَاتَةً وَيُمِيتُهُ إِمَاتَتَيْنِ وَهُوَ أَكْرَمُ عَلَى اللَّهِ مِنْ ذَلِكَ؟ أَيْ قَوْمِ فَادْفِنُوا صَاحِبَكُمْ، فَإِنْ يَكُ كَمَا تَقُولُونَ فَلَيْسَ بِعَزِيزٍ عَلَى اللَّهِ أَنْ يَبْحَثَ عَنْهُ التُّرَابَ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَاللَّهِ مَا مَاتَ حَتَّى تَرَكَ السَّبِيلَ نَهْجاً وَاضِحاً، فَأَحَلَّ الْحَلاَلَ وَحَرَّمَ الْحَرَامَ، وَنَكَحَ وَطَلَّقَ وَحَارَبَ وَسَالَمَ، مَا كَانَ رَاعِي غَنَمٍ يَتْبَعُ بِهَا صَاحِبُهَا رُءُوسَ الْجِبَالِ يَخْبِطُ عَلَيْهَا الْعِضَاهَ بِمِخْبَطِهِ وَيَمْدُرُ حَوْضَهَا بِيَدِهِ بِأَنْصَبَ وَلاَ أَدْأَبَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَانَ فِيكُمْ، أَيْ قَوْمِ فَادْفِنُوا صَاحِبَكُمْ. قَالَ: وَجَعَلَتْ أُمُّ أَيْمَنَ تَبْكِي فَقِيلَ لَهَا يَا أُمَّ أَيْمَنَ تَبْكِي عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتْ: إِنِّي وَاللَّهِ مَا أَبْكِي عَلَى

رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ لاَ أَكُونَ أَعْلَمُ أَنَّهُ قَدْ ذَهَبَ إِلَى مَا هُوَ خَيْرٌ لَهُ مِنَ الدُّنْيَا، وَلَكِنِّى أَبْكِى عَلَى خَبَرِ السَّمَاءِ انْقَطَعَ. قَالَ حَمَّادٌ: خَنَقَتِ الْعَبْرَةُ أَيُّوبَ حِينَ بَلَغَ هَا هُنَا»[١].

واتە: لە عیکریمەوە گێڕدراوەتەوە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دوو شەممە وەفاتی کرد، جا بە خاک نەسپێردراو نەشاردرایەوە ئەو ڕۆژە و شەوەکە و بەیانیەکەش، تا شەوی چوار شەممە بەخاک سپێردرا، (جا ئەو کاتەی وەفاتی کردو هەواڵەکەی بڵاو بوویەوە) هەندێک لە خەڵکی دەیانووت: بە دڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ نەمردووە، بەڵکو ڕۆحەکەی بەرز کراوەتەوە وەک چۆن ڕۆحی مووسا بەرزکرایەوە، عومەریش هەڵساو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەمردووە، بەڵکو ڕۆحەکەی بەرز کراوەتەوە، وەک چۆن ڕۆحی مووسا بەرز کرایەوە، سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ نامرێت، تاوەکو دەست و زمانی هەندێک کەس نەبڕێت، جا بە بەردەوامی عومەر هەر قسەی دەکرد، تا لێوەکانی کەفیان کرد، لەبەر هەڕەشە و زۆر قسە کردن، جا عەبباس هەڵسا و وتی: بە دڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ مردووە، بە دڵنیایی ئەویش مرۆڤێکە (دەمرێت)و گۆڕانکاری بەسەر دێت، وەک گۆڕانکاری بەسەر مرۆڤ دێت (واتە: لە زیندوو بۆ مردوو دەگۆڕێت)، ئەی خزمەکانم هاوڕێکەتان بشارنەوە و بە خاکی بسپێرن بە دڵنیایی ئەو لای خوا زۆر بەڕێزترە لەوەی دوو جار بیمرێنێت (ئازاری مەدەن بە تاخیر کردن)، ئایا خوا ئێوە دوو جار دەمرێنێت؟! لەگەڵ ئەوەی ئەو زۆر لای خوا لەوە بەڕێزترە؟! ئەی خزمەکانم هاوڕێکەتان بنێژن و بە خاکی بسپێرن، ئەگەر وەک ئێوە دەڵێن نەمردبێت ئەوە لای خوا قورس نیە خۆڵەکەی لەسەر لابەرێت (دوای ژێر خاک کردنیشی، کەواتە مەترسن و بینێژن)، بە دڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی نەکرد تاوەکو ڕێبازێکی ڕوونی جێهێشت، حەڵاڵ کراو و حەرام کراوەکانی ڕوون کردەوە و، ژنی هێناوەو، تەڵاقیشی داوەو، جەنگیشی کردووەو، ئاشتەواییشی کردووە (هەموو شتێکی بە پایان گەیاند).

هیچ شوانێکی مەڕو ماڵات نەبووە سەری چیاکان گەڕابێت و، بە گۆچانەکەی لە درەختەکانی دابێت (گەڵای درەختەکانی بۆ ئاژەڵەکان وەراندبێت) و حەوزی ئاژەڵەکانی سواقدابێت بە چاکی و دروستی و بە ڕێکی لە پێغەمبەری خوا (واتە: لە گشت شوانێک خەمخۆرتر بووە بۆ ژێر دەستەکانی)، ئەو لەناو ئێوەدا بوو (باش دەتان ناسی)، ئەی خزمەکانم هاوڕێکەتان بشارنەوە و بە خاکی بسپێرن،

عیکریمە دەڵێ: دایکی ئەیمەن دەستی بە گریان کرد، پێی وترا: ئەی دایکی ئەیمەن ئەوە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەگری؟ وتی: سوێند بەخوا من لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ ناگریم، لەبەر ئەوەی نەزانم ڕۆیشتووە بۆ شتێک کە چاکترە لە دونیا بۆ ئەو (واتە دەزانم ئەو شتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی چووە چاکترە لە دونیا، کە بریتیە لە دواڕۆژ) بەڵکو بۆ هەواڵی ئاسمان و وەحی دەگریم، تازە پچڕا (وەحی نەما).

حەمماد (کە یەکێک لە گێڕەوەکانی ئەم فەرموودەیە) دەڵێت: فرمێسک و گریان قورگی (ئەیوب)ی گرتبوو کاتێک گەیشت بەو شوێنە (لەو کاتەی فەرموودەکەی بۆ گێڕاینەوە).

---

(١) ـ مرسل، ورجاله ثقات.

٨٥ـ «عن مَكْحُولٌ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِذَا أَصَابَ أَحَدَكُمْ مُصِيبَةٌ فَلْيَذْكُرْ مُصِيبَتَهُ بِي، فَإِنَّهَا مِنْ أَعْظَمِ الْمَصَائِبِ»(١).

واتە: لە مەكحول گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كاتێک یەكێكتان بەڵایەكتان تووش بووبێ بە بەڵایەكەی خۆی مردنی من وەبیر خۆی بێنێتەوە، لەبەر ئەوەی لە گەورەترین بەڵایەكانە(٢).

٨٦ـ «عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا أَصَابَ أَحَدَكُمْ مُصِيبَةٌ فَلْيَذْكُرْ مُصَابَهُ بِي، فَإِنَّهَا مِنْ أَعْظَمِ الْمَصَائِبِ»(٣).

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كاتێک یەكێكتان بەڵایەكتان تووش بووبا، با بەبەڵایەكەی خۆی مردنی من وەبیرخۆی بێنێتەوە، لەبەر ئەوەی لە گەورەترین بەڵایەكانە.

٨٧ـ «عَنْ عَمْرَ بْنِ مُحَمَّدٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: مَا سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ يَذْكُرُ النَّبِيَّ قَطُّ إِلاَّ بَكَى»(٤).

واتە: لە عومەری كوڕی موحەممەد ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە وتویەتی: هەرگیز گوێم لێ نەبووە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر باسی پێغەمبەر ﷺ بكات و نەگریێ.

٨٨ـ «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّ فَاطِمَةَ قَالَتْ: يَا أَنَسُ كَيْفَ طَابَتْ أَنْفُسُكُمْ أَنْ تَحْثُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ التُّرَابَ؟ وَقَالَتْ: يَا أَبَتَاهُ مِنْ رَبِّهِ مَا أَدْنَاهُ، وَاأَبَتَاهُ جَنَّةُ الْفِرْدَوْسِ مَأْوَاهُ، وَاأَبَتَاهُ إِلَى جِبْرِيلَ نَنْعَاهُ، وَاأَبَتَاهُ أَجَابَ رَبا دَعَاهُ. قَالَ حَمَّادٌ: حِينَ حَدَّثَ ثَابِتٌ بَكَى، وَقَالَ ثَابِتٌ: حِينَ حَدَّثَ بِهِ أَنَسٌ بَكَى»(٥).

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیک رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە، (ئەو كاتەی پێغەمبەر ﷺ بە خاک سپێردراوە) فاتیمەی كچی پێغەمبەری خوا ﷺ وتویەتی: ئەی ئەنەس چۆن دڵتان هات خۆڵ بخەنە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ (چۆن دڵتان هات ژێر خاكی بخەن)؟! هەروەها دەیوت: ئەی باوكە لە خوا نزیک بوویتەوە، ئەی باوكە بەهەشتی فیردەوس جێگاتە، ئەی باوكە هەواڵی ماتەمینی بە جبریل ڕادەگەیەنین، ئەی باوكە وەڵامی خوات دایەوە كە بانگی كردی، حەمماد دەڵێ: كاتێ ثابت ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە گریا، (ثابت)یش وتویەتی: كاتێ ئەنەس گێڕایەوە، گریا.

---

(١) ـ مرسل، وإسناده صحيح.

(٢) ـ واتە: ئەگەر مسوڵمان ئاوای كرد، ئەو كات بەڵایەكەی خۆی زۆر لا سادە و ساكار دەبێت، چونكە مردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مسوڵمانان گەورەترین بەڵایە، چونكە پەیوەندی نێوان زەوی و ئاسمان پچڕاو، بەرەكەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و بینینی ڕووی موبارەكی ئیتر نەماو، خۆشەویسترین مرۆڤ لە دڵی مسوڵمانان وەفاتی فەرمووە.

(٣) ـ مرسل، وإسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ صحيح.

٨٩ـ «عَنْ أَنَسٍ ﷺ وَذَكَرَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُهُ يَوْمَ دَخَلَ الْمَدِينَةَ، فَمَا رَأَيْتُ يَوْماً قَطُّ كَانَ أَحْسَنَ وَلاَ أَضْوَأَ مِنْ يَوْمٍ دَخَلَ عَلَيْنَا فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَشَهِدْتُهُ يَوْمَ مَوتِهِ، فَمَا رَأَيْتُ يَوْماً كَانَ أَقْبَحَ وَلاَ أَظْلَمَ مِنْ يَوْمٍ مَاتَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»(١).

واتە: لە ئەنەس ﷺ گێڕدراوەتەوە، باسی پێغەمبەری خوای ﷺ كردو وتی: ئەو ڕۆژەم بینی كە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە شاری مەدینە، جا هەرگیز هیچ ڕۆژێكم نەبینی باشترو ڕووناكتر بێت لەو ڕۆژەی تیایدا هاتە لامان (بۆ مەدینە)، هەروەها ئەو ڕۆژەشم بینی كە تیایدا وەفاتی كرد، جا هیچ ڕۆژێكم نەبینی خراپترو تاریكتر بێت لەو ڕۆژەی پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا وەفاتی كرد.

٩٠ـ «قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَلاَمٍ ﷺ لِلنَّبِيِّ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَجِدُكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَائِماً عِنْدَ رَبِّكَ وَأَنْتَ مُحْمَارَّةٌ وَجْنَتَاكَ مُسْتَحْيٍ مِنْ رَبِّكَ مِمَّا أَحْدَثَتْ أُمَّتُكَ مِنْ بَعْدِكَ»(٢).

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی سەلام ﷺ بە پێغەمبەری ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە دەتبینین لە ڕۆژی دوایی وەستاوی لەلای پەروەردگارت لە كاتێكدا دوو كوڵمەكانت سور هەڵگەڕاون، لەبەر شەرم كردن لە پەروەردگارت، بە هۆی ئەو كردەوانەی ئوممەتەكەت لە دوای تۆ ئەنجامیان داوە (لە خراپە).

٩١ـ «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ إِنَّ هَذِهِ السُّورَةَ لَمَّا أُنْزِلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ﴿٢﴾﴾النصر، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيَخْرُجُنَّ مِنْهُ أَفْوَاجاً كَمَا دَخَلُوهُ أَفْوَاجاً»(٣).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتەوە كە كاتێک ئەم سورەتە: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ﴿٢﴾﴾النصر، دابەزی بۆ سەر پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: سوێند بە خوا چەندین كۆمەڵ و گروپ لە دینی خوا دەردەچن، هەروەک چۆن چەندین كۆمەڵ و گروپ هاتنە ناویەوە.

٩٢ـ «عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ قَالَ: دَخَلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الأَهْتَمِ عَلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ مَعَ الْعَامَّةِ فَلَمْ يُفْجَأْ عُمَرُ إِلاَّ وَهُوَ بَيْنَ يَدَيْهِ يَتَكَلَّمُ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ اللَّهَ خَلَقَ الْخَلْقَ غَنِيًّا عَنْ طَاعَتِهِمْ آمِناً لِمَعْصِيَتِهِمْ وَالنَّاسُ يَوْمَئِذٍ فِي الْمَنَازِلِ وَالرَّأْيِ مُخْتَلِفُونَ، فَالْعَرَبُ بِشَرِّ تِلْكَ الْمَنَازِلِ أَهْلُ الْحَجَرِ وَأَهْلُ الْوَبَرِ وَأَهْلُ الدَّبَرِ يُحْتَازُ دُونَهُمْ طَيِّبَاتُ الدُّنْيَا وَرَخَاءُ عَيْشِهَا، لاَ يَسْأَلُونَ اللَّهَ جَمَاعَةً، وَلاَ يَتْلُونَ لَهُ كِتَاباً، مَيِّتُهُمْ فِي النَّارِ وَحَيُّهُمْ أَعْمَى نَجِسٌ مَعَ مَا لاَ يُحْصَى مِنَ الْمَرْغُوبِ عَنْهُ وَالْمَزْهُودِ فِيهِ، فَلَمَّا أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَنْشُرَ عَلَيْهِمْ رَحْمَتَهُ بَعَثَ إِلَيْهِمْ رَسُولاً مِنْ أَنْفُسِهِمْ: ﴿عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢٨﴾﴾التوبة، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ، وَعَلَيْهِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، فَلَمْ يَمْنَعْهُمْ ذَلِكَ أَنْ جَرَحُوهُ فِي جِسْمِهِ وَلَقَّبُوهُ فِي اسْمِهِ، وَمَعَهُ كِتَابٌ مِنَ اللَّهِ نَاطِقٌ، لاَ يُقَدَّمُ إِلاَّ بِأَمْرِهِ،

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ موقوف، وإسناده ضعيف.

(٣)ـ رجاله ثقات.

وَلاَ يُرْحَلُ إلاَّ بِإِذْنِهِ، فَلَمَّا أُمِرَ بِالْعَزْمَةِ، وَحُمِلَ عَلَى الْجِهَادِ، انْبَسَطَ لأَمْرِ اللَّهِ لَوْثُهُ، فَأَفْلَجَ اللَّهُ حُجَّتَهُ، وَأَجَازَ كَلِمَتَهُ، وَأَظْهَرَ دَعْوتَهُ، وَفَارِقِ الدُّنْيَا تَقِيًّا نَقِيًّا، ثُمَّ قَامَ بَعْدَهُ أَبُو بَكْرٍ فَسَلَكَ سُنَّتَهُ وَأَخَذَ سَبِيلَهُ، وَارْتَدَّتِ الْعَرَبُ أَوْ مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ مِنْهُمْ، فَأَبَى أَنْ يَقْبَلَ مِنْهُمْ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إلاَّ الَّذِي كَانَ قَابِلاً، انْتَزَعَ السُّيُوفَ مِنْ أَغْمَادِهَا، وَأَوْقَدَ النِّيرَانَ فِي شُعُلِهَا، ثُمَّ رَكِبَ بِأَهْلِ الْحَقِّ أَهْلَ الْبَاطِلِ، فَلَمْ يَبْرَحْ يُقَطِّعُ أَوْصَالَهُمْ، وَيَسْقِي الأَرْضَ دِمَاءَهُمْ، حَتَّى أَدْخَلَهُمْ فِي الَّذِي خَرَجُوا مِنْهُ، وَقَرَّرَهُمْ بِالَّذِي نَفَرُوا عَنْهُ، وَقَدْ كَانَ أَصَابَ مِنْ مَالِ اللَّهِ بَكْراً يَرْتَوِي عَلَيْهِ وَحَبَشِيَّةً أَرْضَعَتْ وَلَداً لَهُ، فَرَأَى ذَلِكَ عِنْدَ موتهِ غُصَّةً فِي حَلْقِهِ فَأَدَّى ذَلِكَ إِلَى الْخَلِيفَةِ مِنْ بَعْدِهِ، وَفَارِق الدُّنْيَا تَقِيًّا نَقِيًّا عَلَى مِنْهَاجِ صَاحِبِهِ، ثُمَّ قَامَ بَعْدَهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَمَصَّرَ الأَمْصَارَ، وَخَلَطَ الشِّدَّةَ بِاللِّينِ، وَحَسَرَ عَنْ ذِرَاعَيْهِ وَشَمَّرَ عَنْ سَاقَيْهِ، وَأَعَدَّ لِلأُمُورِ أَقْرَانَهَا وَلِلْحَرْبِ آلَتَهَا، فَلَمَّا أَصَابَهُ قَيْنُ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ أَمَرَ ابْنَ عَبَّاسٍ يَسْأَلُ النَّاسَ هَلْ يُثْبِتُونَ قَاتِلَهُ؟ فَلَمَّا قِيلَ قَيْنُ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ اسْتَهَلَّ يَحْمَدُ رَبَّهُ أَنْ لاَ يَكُونَ أَصَابَهُ ذُو حَقٍ فِي الْفَيْءِ، فَيَحْتَجَّ عَلَيْهِ بِأَنَّهُ إِنَّمَا اسْتَحَلَّ دَمَهُ بِمَا اسْتَحَلَّ مِنْ حَقِّهِ، وَقَدْ كَانَ أَصَابَ مِنْ مَالِ اللَّهِ بِضْعَةً وَثَمَانِينَ أَلْفاً فَكَسَرَ لَهَا رِبَاعَهُ وَكَرِهَ بِهَا كَفَالَةَ أَوْلاَدِهِ، فَأَدَّاهَا إِلَى الْخَلِيفَةِ مِنْ بَعْدِهِ، وَفَارِق الدُّنْيَا تَقِيًّا نَقِيًّا عَلَى مِنْهَاجِ صَاحِبَيْهِ، ثُمَّ يَا عُمَرُ إِنَّكَ بُنَيُّ الدُّنْيَا وَلَدَتْكَ مُلُوكُهَا، وَأَلْقَمَتْكَ ثَدْيَيْهَا وَنَبَتَّ فِيهَا تَلْتَمِسُهَا مَظَانَّهَا، فَلَمَّا وُلِّيتَهَا أَلْقَيْتَهَا حَيْثُ أَلْقَاهَا اللَّهُ، هَجَرْتَهَا وَجَفَوتهَا، وَقَذَرْتَهَا إِلاَّ مَا تَزَوَّدْتَ مِنْهَا، فَالْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَلاَ بِكَ حَوْبَتَنَا وَكَشَفَ بِكَ كُرْبَتَنَا، فَامْضِ وَلاَ تَلْتَفِتْ، فَإِنَّهُ لاَ يَعِزُّ عَلَى الْحَقِّ شَيْءٌ، وَلاَ يَذِلُّ عَلَى الْبَاطِلِ شَيْءٌ، أَقُولُ قَوْلِي هَذَا وَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ لِي وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ، قَالَ أَبُو أَيُّوبَ: فَكَانَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ يَقُولُ فِي الشَّيْءِ قَالَ لِيَ ابْنُ الأَهْتَمِ: امْضِ وَلاَ تَلْتَفِتْ»[1].

واتە: لە خالیدی کوڕی مەعدان گێڕدراوەتەوە وتویەتی: عەبدوڵلای کوڕی ئەهتەم چوو بۆ لای عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەگەڵ کۆمەڵی خەڵکی، جا هیچ کاتی لەناکاو نەبوو بەسەر عومەر دابێ حەتمەن عەبدوڵلای کوڕی ئەهتەم لەبەر دەمی عومەر ئامادە بووەو قسەی کردوە، جا (جارێکیان کە چوو بۆ لای، دەستی بە قسەکردن کرد وەکو جاران و) سوپاسی خوای کردو وەصفی جوانی پەروەردگاری کرد، دواتر وتی: لە پاش حەمد و سەنای خوا، بە دڵنیایی خوای پەروەردگار بونەوەری دروست کردووە دەوڵەمەندەو پێویستی بە عیبادەت و پەرستشی ئەوان نیە و، ئەمینە (لەوەی هیچی لێ کەم نابێت) بە هۆی تاوانەکانیان، لەو ڕۆژەوەی (پەروەردگار مرۆڤی دروست کردووە) لە پلەو بۆچوون جیاوازن، جا عەرەب لەبەر خراپی ئەو پلەبەندیە ئەهلی بەرد و ڕەشماڵ بوون، خۆشی دونیاو ئاسانی ژیانیان گلدەدرایەوە بەبێ ئەوان (ئەوان بەشدار نەبوون و، وەک خەڵکی تر ژیانیان ئاسان نەبوو)، داوای یەکگرتوویی و یەک دەستیان لە خوا نەدەکرد و (نەیاندەویست)، وە هیچ پەرتوکێکی خوایان نەخوێندبوویەوە، مردووەکانیان بۆ ئاگر بوون و، زیندووەکانیان کوێر و پیس بوون (لە ڕووی بیروبڕواوە)، لەگەڵ سیفاتی زۆر و نەژمێردراوی نەویستراوی خراپ.

---

(١)ـ موقوف، وإسناده ضعيف.

جا كاتێ خوا ویستی ڕەحمەتی خۆی بەسەریاندا دابەزێنێت و بڵاوی بكاتەوە، پێغەمبەرێكی بۆ ناردن لە خۆیان، كە زۆر سەختە بەلایەوە تووش بوونتان بە بەڵاو ناخۆشی، زۆر بەتەنگیشتانەوەیە و پەرۆشە لەسەرتان، زۆر دڵسۆزی بڕوادارانە و میهرەبان و دڵۆڤانە بۆیان ـ صەڵات و سەلام و ڕەحمەت و بەرەكاتی خوای لەسەر بێت ـ جا ئەو گەورەیی و مەزنیەی پێغەمبەری خوا ڕێی لە عەرەبەكان نەگرت لەوەی ئازاری نەدەن و نازناوی خراپی بۆ دانەنێن (بەڵكو بە هەموو شێوەیەک ئازاریاندا و، ناتۆرەیان بۆ دروست كرد)، وە پەرتوكێكی هەق بێژی لەگەڵدا بوو (كە قورئانە)، بە فەرمانی پەرتوكەكە نەبووایە نەدەمایەوە و، بە مۆڵەتی ئەویش نەبووایە سەفەری نەدەكرد و نەدەجوڵایەوە (هەموو هەڵسوكەوتێكی بە پێی قورئان و وەحی بوو)، جا كاتێ فەرمانی پێكرا بە عەزیمەت و، جیهادی لەسەر واجب كرا، هێزەكەی بۆ فەرمانی خوا بڵاوكردەوە، جا خوای پەروەردگار حوججەت و بەڵگەی پێغەمبەرەكەی كرد بە بڕەڕو لەتكەر (بۆ باتڵ) و، بڕیارەكانی جێبەجێ كرد و، بانگەوازەكەی سەرخست و، جا لە دونیا جیابوویەوە و وەفاتی كرد بە تەقواو پاكیەوە، دواتر ئەبو بەكر شوێنی گرتەوەو، ڕێچكەكەی ئەوی گرتەبەرو، دەستی بە ڕێگەكەی ئەوەوە گرت، جا هەندێک لە عەرەبەكان لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە و دەستیان دایە دژایەتی كردن، جا ئەبو بەكر ڕەتی كردەوە لێیان قبوڵ بكات دوای پێغەمبەری خوا، تەنها ئەو كەسە نەبێت كە ڕازیە (بە ئیسلام)، جا شمشێرەكانی لە كالانەكان هێنایە دەرەوە و، بڵێسەی ئاگری كردەوەو، بەهۆی ئەهلی هەق بەڵای ڕژاند بەسەر ئەهلی باتڵدا و تەمێی كردن، جا بەردەوام جومگەكانی دەبڕین و زەوی ئاو دەدا بە خوێنیان، تاوەكو خستنیە ناو ئەو شتەی كە لێوەی دەرچوون (واتە: تاوەكو گەڕانەوە بۆ ئیسلام) و، دانی پێداهێنان بەو شتەی لێیان ڕاكردبوو (واتە: دانیان نایەوە بە ئیسلام)، جا لە سامانی خوا بەچكە وشترێكی بەركەوتبوو لێی دەخواردەوە، وە ئافرەتێكی حەبەشیشی بەركەوتبوو كە شیری دەدا بە منداڵێكی ئەو، جا لە كاتی مردنیدا پێی وابوو وەک پاروێک وایە و لە گەرووی گیر بووە، بۆیە تەسلیمی خەلیفە و جێنشینی دوای خۆی كرد و، دونیای جێهێشت و وەفاتی كرد بە تەقوا و پاكیەوە لەسەر بەرنامەی هاوڕێكەی (كە پێغەمبەری خوایە ﷺ).

دواتر عومەر دوای ئەو بوو بە جێنشین، شارەكانی ئاوەدان كردەوە و، توندی و نەرمونیانی تێكەڵ كردو، قۆڵەكانی هەڵماڵی و، قاچەكانی هەڵكرد (بۆ خزمەتی دین و مسوڵمانان) و، خەڵكی شایستەی ئامادە و پەروەردە كرد بۆ كاروبارەكان، وە كەلوپەل و چەكی ئامادە كرد بۆ جەنگ، جا كاتێ (ئەبو لوئلوئە)ی بەندەی موغیرەی كوڕی شوعبە لێیدا (بە خەنجەر)، عومەر فەرمانی بە ئیبنو عەبباس كرد كە پرسیار لە خەڵكی بكات و بڵێت: ئایا بە دڵنیایی بكوژەكەی عومەر دەناسن و دەزانن كێیە؟ كە وترا: بەندەی موغیرەی كوڕی شوعبەیە، (وتاریدا)و دەستی كرد بە سوپاس و ستاییشی خوا لەسەر ئەوەی خاوەن هەق و مافێک لێینەداوە لەسەر هەقی خۆی تاوەكو كوشتنەكەی بكاتە بەهانە و پاساو بۆ ماڵ و هەق خواردنەكەی، جا هەشتا و هەندەک هەزار لە سەروەت و سامانی خوای پێ بڕابوو كە ڕیباعەكەی (بڕیتیە لەو ددانەی كە دەكەوێتە دوای ددانی پێشەوە) پێ شكابوو، پێی ناخۆش بوو كەفالەتی منداڵەكانی بكرێ، بۆیە جێنیشینایەتی ئەدا كردو تەسلیمی جێنیشینی دوای خۆی كرد لە دونیا جیابۆوە، مرد بە تەقوا و پاكی لەسەر ڕێبازی هاوەڵەكەی.

دواتر ئەی عومەری کوڕی عەبدول عەزیز ئەی ڕۆڵەی دونیا، تۆ لە پادشاکانی دونیا لە دایک بوویت و، مەمکەکانی خستیە دەمتەوە (واتە لە کەسانی گەورە لە دایک بوویت و شیرت خواردووە) و، تیایدا ڕوایت و گەشەت کرد و لە تەرجیحاتەکانیانت وەردەگرت، جا کاتێ پشتت تێ کرد و فڕێتدا وەک چۆن خوا فڕێیداوە، لێی دوورکەوتیتەوە و دات بە زەویدا و بەپیست دانا تەنها ئەوە نەبێت کە چاک بوو و کردت بە توێشوو، جا سوپاس بۆ ئەو خوایەی پێویستی ئێمەی ڕوون کردەوە بە هۆی تۆوە، وە ناخۆشیەکانی ئێمەی بە هۆی تۆوە لادا، کەواتە بەرەو پێشەوە بەردەوامبەو ئاوڕ مەدەرەوە، چونکە هیچ شتێک گەورەتر نیە لە هەق، وە هیچ شتێک و کەسێک زەبون تر نیە باتڵ، ئەوە وتەی منە و داوای لێخۆشبون لە خوا دەکەم بۆ خۆم و بۆ بڕوادارانی پیاو و ئافرەت.

ئەیوب دەڵێ: جا هەموو جار عومەری کوڕی عەبدول عەزیز لە هەموو شتێکدا دەیوت: ئیبنو ئەهتەم پێی وتووم: بەردەوامبە و ئاوڕ نەدەیتەوە.

## بابەت: ئەو ڕێزەی پەروەردگار لە پێغەمبەری ﷺ ناوە پاش وەفات کردنی

٩٣- «عن أَوْسُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قُحِطَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ قَحْطاً شَدِيداً، فَشَكَوْا إِلَى عَائِشَةَ فَقَالَتْ: انْظُرُوا قَبْرَ النَّبِيِّ ﷺ فَاجْعَلُوا مِنْهُ كِوًى إِلَى السَّمَاءِ حَتَّى لاَ يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ السَّمَاءِ سَقْفٌ. قَالَ: فَفَعَلُوا فَمُطِرْنَا مَطَراً حَتَّى نَبَتَ الْعُشْبُ وَسَمِنَتِ الإِبِلُ حَتَّى تَفَتَّقَتْ مِنَ الشَّحْمِ فَسُمِّيَ عَامَ الْفَتْقِ»[1].

واتە: لە ئەوسی کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: (دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا) خەڵکی مەدینە قاتوقوڕیەکی بەهێز ڕووی تێ کردن، هاناو شکاتی حاڵی خۆیان برد بۆ لای دایکمان عائیشە، ئەویش فەرمووی: سەیری گۆڕی پێغەمبەر ﷺ بکەن و دەلاقەیێکی تیادا بکەنەوە بەرەو ئاسمان تاوەکو لە نێوان گۆڕەکەی و ئاسماندا سەقف نەبێت، ئەوس دەڵێت: ئەوانیش جێبەجێیان کرد، جا بارانێکی زۆرمان بۆ بارێندرا، تاوەکو گیا ڕواو وشتریش قەڵەو بوون و جەستەیان پڕو خڕ بوو لەبەر زۆری بەز، بۆیە ناونرا ساڵی پڕ بەرەکەت.

٩٤- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ قَالَ: لَمَّا كَانَ أَيَّامُ الْحَرَّةِ لَمْ يُؤَذَّنْ فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ ﷺ ثَلاَثاً وَلَمْ يُقَمْ، وَلَمْ يَبْرَحْ سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ الْمَسْجِدَ، وَكَانَ لاَ يَعْرِفُ وَقْتَ الصَّلاَةِ إِلاَّ بِهَمْهَمَةٍ يَسْمَعُهَا مِنْ قَبْرِ النَّبِيِّ ﷺ»[2].

واتە: لە سەعیدی کوڕی عەبدولعەزیز گێڕدراوەتەوە وتویەتی: لە ڕۆژەکانی حەڕڕەدا کە دەکاتە ساڵی شەست و سێ لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا ﷺ سێ ڕۆژ نە بانگ و نە قامەت نەدرا، سەعیدی کوڕی موسەییەبیش لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرنەچوو و کاتی نوێژیشی نەدەزانی تەنها بە دەنگە دەنگێک نەبێ کە گوێی لێ دەبوو لە قەبری پێغەمبەرەوە ﷺ دەهات (واتە: لە کاتی نوێژدا لە قەبری پێغەمبەری خوادا دەنگی بانگ دەهات).

---

(١) ـ موقوف، ورجاله ثقات.

(٢) ـ رجاله ثقات.

٩٥- «عَن نُبَيهِ بنِ وَهبٍ، أَنَّ كَعباً دَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، فَذَكَرُوا رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ كَعبٌ: مَا مِن يَومٍ يَطلُعُ إلاَّ نَزَلَ سَبعُونَ أَلفًا مِنَ المَلاَئِكَةِ، حَتَّى يَحُفُّوا بِقَبرِ النَّبِيِّ ﷺ يَضرِبُونَ بِأَجنِحَتِهِم، وَيُصَلُّونَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ حَتَّى إِذَا أَمسَوا، عَرَجُوا وَهَبَطَ مِثلُهُم فَصَنَعُوا مِثلَ ذَلِكَ حَتَّى إِذَا انشَقَّت عَنهُ الأَرضُ، خَرَجَ فِي سَبعِينَ أَلفًا مِنَ المَلاَئِكَةِ يَزِفُّونَهُ»[1].

واته: نوبەیهی کوڕی وەهب وتویەتی: کەعب چووە ژوورەوە بۆ لای دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، (خەڵکی تریش لەوێ بوون) باسی پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد، (کەعب)یش وتی: هیچ ڕۆژێک نیە کە هەڵبێ حەتمەن حەفتا هەزار فریشتە دادەبەزن، تاوەکو دەورە لە گۆڕی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەن و باڵەکانیان لێک دەدەن و صەڵاوات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن تا تەواو دەبن و (کۆتایی دێنن بە کارەکەیان) بەرز دەبنەوە بۆ ئاسمان و (کۆمەڵێکی تر) وەکو ئەوان دێنە خوارەوە بۆ سەر زەوی، ئەوانیش هەمان کار ئەنجام دەدەن، (جا بە بەردەوامی ئەو کارە دووبارە دەبێتەوە) تا ئەو کاتەی زەوی لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ شەق دەبێت و (لە گۆڕەکەی دێتە دەرەوە) لە نێوان حەفتا هەزار فریشتە دەردەکەوێت و (زیندوو دەبێتەوە)و ئەوانیش لێی نزیک دەکەونەوە.

## بابەت: دەربارەی شوێنکەوتنی سوننەت

٩٦- «عَن عِربَاضِ بنِ سَارِيَةَ ﷺ، قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ صَلاَةَ الفَجرِ، ثُمَّ وَعَظَنَا مَوعِظَةً بَلِيغَةً ذَرَفَت مِنهَا العُيُونُ، وَوَجِلَت مِنهَا القُلُوبُ فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَأَنَّهَا مَوعِظَةُ مُوَدِّعٍ؟ فَأَوصِنَا فَقَالَ: أُوصِيكُم بِتَقوَى اللهِ وَالسَّمعِ وَالطَّاعَةِ وَإِن كَانَ عَبدًا حَبَشِيًّا، فَإِنَّهُ مَن يَعِش مِنكُم بَعدِي، فَسَيَرَى اختِلاَفًا كَثِيرًا، فَعَلَيكُم بِسُنَّتِي وَسَنَّةِ الخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ المَهدِيِّينَ، عَضُّوا عَلَيهَا بِالنَّوَاجِذِ، وَإِيَّاكُم وَالمُحدَثَاتِ، فَإِنَّ كُلَّ مُحدَثَةٍ بِدعَةٌ»[2].

واته: عیرباضی کوڕی ساریی ﷺ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی بۆ کردین، دواتر ئامۆژگاری کردین بە ئامۆژگاریەکی پڕ ڕەوانبێژی و پوخت و ترساندنی زۆر، چاوەکان لەگەڵی پڕ فرمێسک بوون و، دڵەکانیش لەگەڵی ڕاچڵەکین، جا کەسێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم وتارە بە وتارو ئامۆژگاری کەسێک دەچێت کە بیەوێ وەفات بکات، کەواتە وەسیەتمان بۆ بکە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: وەسیەتتان دەکەم تەقوای خوا بکەن و پارێزکار بن و گوێڕایەڵی (کاربەدەستانی مسوڵمانی دادپەروەر) بکەن با هەر چەندە (ئەو کاربەدەستە) بەندەیەکی ڕەشی حەبەشی بێت (نەسەب و جوانی بەهای نیە)، بە دڵنیایی ئەگەر هەر یەکێک لە ئێوە دوای من بژیێت ئەوە دووبەرەکی و جیاوازی زۆر دەبینێت، کەواتە دەست بگرن بە ڕێبازی من و بە ڕێبازی جێنشینە سەر ڕاستەکان و ڕێنمویی کراوەکان (کە بریتین لە پێشەوایان ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان و عەلی)، توند دەست بەو ڕێبازەوە بگرن، هەروەها خۆتان بپارێزن لە شتێک کە لە ئایندا بنچینەی نەبێت، چونکە ئەو شتانەی لە ئایندا بنچینەیان نیە بیدعەن.

---

[1] ـ إسناده ضعيف ومنقطع.

[2] ـ حسن.




٩٧- «عَنِ الزُّهرِيِّ قَالَ: كَانَ مَنْ مَضَى مِنْ عُلَمَائِنَا يَقُولُونَ: الاِعتِصَامُ بِالسُّنَّةِ نَجَاةٌ، وَالعِلمُ يُقبَضُ قَبضًا سَرِيعًا، فَنَعشُ العِلمِ ثَبَاتُ الدِّينِ وَالدُّنيَا، وَفِي ذَهَابِ العِلمِ ذَهَابُ ذَلِكَ كُلِّهِ»(١).

واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە وتویەتی: ئەو زانایانەی پێش ئێمە ڕۆیشتون و (وەفاتیان كردووە) دەیان وت: دەست گرتن بە ڕێبازی پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕزگاربوونە، زانستی (شەرعی)ش نامێنێ زۆر بە خێرایی، كەواتە: دارەبازەی زانست بریتیە لە جێگیر بوونی دین و دونیا، هەروەها بە نەمانی زانستیش ئەمانە هیچیان نامێنن (نە دین و نە دونیاش جێگیر نابێت و ڕاستەڕێ نابێت).

٩٨- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ الدَّيلَمِيِّ، قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ أَوَّلَ ذَهَابِ الدِّينِ تَركُ السُّنَّةِ، يَذهَبُ الدِّينُ سُنَّةً سُنَّةً، كَمَا يَذهَبُ الحَبلُ قُوَّةً قُوَّةً»(٢).

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی دەیلەمی گێڕدراوەتەوە وتویەتی: پێمگەیشتووە یەكەم شت كە لە دین و ئاین تەرك دەكرێت و وازی لێدەهێنرێت: سوننەتە، دین سوننەت سوننەت لەناو دەچێت (واتە: هەر جارەو شتێك لە دین تەرك دەكرێت تا كۆتایی دێت) وەک چۆن گوریس و پەت تاڵ تاڵ كۆتایی دێت (ئەگەر دەریان بێنی یان بیان پچڕێنی).

٩٩- «عَن حَسَّانَ، قَالَ: مَا ابتَدَعَ قَومٌ بِدعَةً فِي دِينِهِم إِلاَّ نَزَعَ اللهُ مِن سُنَّتِهِم مِثلَهَا ثُمَّ لاَ يُعِيدُهَا إِلَيهِم إِلَى يَومِ القِيَامَةِ»(٣).

واتە: حەسسان وتویەتی: هەر كۆمەڵێك بیدعەیەك بخەنە ناو ئاینەكەیان حەتمەن خوا سوننەتێكیان لێ دەسەنێتەوە هاوشێوەی بیدعەكەو، سوننەتەكەشیان بۆ ناگێڕێتەوە تا ڕۆژی دوایی.

١٠٠- «عَن أَبِي قِلاَبَةَ، قَالَ: مَا ابتَدَعَ رَجُلٌ بِدعَةً إِلاَّ استَحَلَّ السَّيفَ»(٤).

واتە: باوكی قیلابە وتویەتی: هەر پیاوێك بیدعەیەك دابهێنێ حەتمەن شمشێری حەڵاڵ كردوە (واتە: ئیعلانی شەڕی كردوە لەگەڵ ئایندا و، خەریكی لەناوبردنی ئاینە).

١٠١- «عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ قَالَ: إِنَّ أَهْلَ الأَهْوَاءِ أَهْلُ الضَّلاَلَةِ وَلاَ أَرَى مَصِيرَهُمْ إِلاَّ النَّارَ، فَجَرِّبْهُمْ فَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْهُمْ يَنْتَحِلُ قَوْلاً أَوْ قَالَ حَدِيثاً فَيَتَنَاهَى بِهِ الأَمْرُ دُونَ السَّيْفِ، وَإِنَّ النِّفَاقَ كَانَ ضُرُوبًا، ثُمَّ تَلاَ: ﴿وَمِنْهُم مَّنْ عَـٰهَدَ ٱللَّهَ ﴿٧٥﴾﴾ التوبة، ﴿وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِى ٱلصَّدَقَـٰتِ ﴿٥٨﴾﴾التوبة، ﴿وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِىَّ ﴿٦١﴾﴾التوبة، فَاخْتَلَفَ قَوْلُهُمْ وَاجْتَمَعُوا فِي الشَّكِّ وَالتَّكْذِيبِ، وَإِنَّ هَؤُلاَءِ اخْتَلَفَ قَوْلُهُمْ وَاجْتَمَعُوا فِي

---

(١)ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

السَّيْفِ، وَلاَ أَرَى مَصِيرَهُمْ إِلاَّ النَّارَ، قَالَ حَمَّادٌ ثُمَّ قَالَ أَيُّوبُ عِنْدَ ذَا الْحَدِيثِ أَوْ عِنْدَ الأَوَّلِ: وَكَانَ وَاللَّهِ مِنَ الْفُقَهَاءِ ذَوِي الأَلْبَابِ. يَعْنِى أبا قِلاَبَةَ»[1].

واتە: باوکی قیلابە وتویەتی: ئەهلی هەواو نەفس (واتە: ئەهلی بیدعە) ئەهلی گومڕایین، پێشم وانیە سەرەنجامیان بۆ هیچ شتێک بێت تەنها بۆ ئاگر نەبێت (واتە: سەرەنجامیان تەنها بۆ دۆزەخە)، تاقیان بکەرەوە (دەبینی) کەسیان لەوان نیە بۆچوونێک بگرێتە بەر کارەکە کۆتایی بێت جگە لە بەکار هێنانی شمشێر (واتە: کارەکەیان دەبێتە دژایەتی کردنی ئیسلام و شمشێر بەرز کردنەوە، چونکە خاوەنی بیدعە خودی کارەکەی لەناوبردنی دینە)، هەروەها دووڕوویش زۆر جۆرە، دواتر ئەو ئایەتانەی خوێندەوە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: [وە لە ناپاکان و مونافیقان کەسانێک هەن کە پەیمانیان داوە بە خواو (وتویانە) سوێند بەخوا ئەگەر خوا لە بەهرەی خۆی پێمان ببەخشێ ئەوە بێ گومان خێرو چاکە دەکەین و بێ گومان لە چاکەکاران دەبین]، هەروەها دەفەرموێ: [وە هەندێ کەس لەوانە ڕەخنە و توانجت تێ دەگرن لە دابەش کردنی خێرەکاندا، خۆ ئەگەر لەو خێرو صەدەقەیان پێ بدەی ڕازی دەبن و، ئەگەر پێیان نەدرێ لەو صەدەقەیە ئەو کاتە ئەوان توڕە و زویر و ناڕازی دەبن]، هەروەها دەفەرموێ: [وە لەو ناپاکانەدا کەسانێک هەنە کە ئازاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن و دەڵێن: خۆش باوەڕ و گوێگرە بۆ هەموو شتێک، تۆش بڵێ: گوێگری چاکە و قازانجە بۆتان، (هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ) بڕوای هەیە بە خوا و باوەڕی بە ئیماندارانیش هەیە و میهرەبانیە بۆ ئەوانەی بڕوای هێناوە لە ئێوە، وە ئەوانەی ئازاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن سزایەکی ئازاربەخشیان بۆ هەیە]، (جا ئەو ناپاک و گومڕا و بیدعەچیانە) لە بۆچوون و مەزهەبی (بۆگەن) جیاوازیان هەیە (هەر یەکەیان مەزهەبێکی باتلی گرتووە)، (هەروەها) کۆبونەتەوە لەسەر گومان و بە درۆزانینی (حوکم و پایەکانی ئیسلام)، بە دڵنیایی ئەمانە بۆچوون و مەزهەبیان جیاوازە (بەڵام) کۆکن لەسەر شمشێر (واتە: هەمویان هەر خەریکی لەناوبردنی ئیسلامن)، وە پێم وانیە سەرەنجامیان بۆ هیچ شتێک بێت تەنها ئاگر نەبێت.

حەمماد وتویەتی: لە کاتی گێڕانەوەی ئەو وتانە یان لە سەرەتایەکەی (ئەو وتانەی باس کران) ئەییوب وتی: سوێند بەخوا ئەو یەکێکە لە زانایانی تێگەیشتووی عاقڵمەند، واتە: مەبەستی باوکی (قیلابە)یە (چونکە باش تێگەیشتووە لە ئەهلی بیدعە).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: دەربارەی خۆ پاراستن لە وەڵامدانەوەی ئەو شتەی لە قورئان و فەرموودەدا نیە

١٠٢- «عَنِ ابنِ مَسعُودٍ، وَحُذَيفَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، أَنَّهُمَا كَانَا جَالِسَينِ فَجَاءَ رَجُلٌ فَسَأَلَهُمَا عَن شَيءٍ فَقَالَ ابنُ مَسعُودٍ لِحُذَيفَةَ: لِأَيِّ شَيءٍ تَرَى يَسأَلُونِي عَن هَذَا؟ قَالَ: يَعلَمُونَهُ ثُمَّ يَترُكُونَهُ- فَأَقبَلَ إِلَيهِ ابنُ مَسعُودٍ فَقَالَ: مَا سَأَلتُمُونَا عَن شَيءٍ مِن كِتَابِ اللهِ تَعَالَى نَعلَمُهُ، أَخبَرنَاكُم بِهِ، أَو سُنَّةٍ مِن نَبِيِّ اللهِ ﷺ أَخبَرنَاكُم بِهِ، وَلاَ طَاقَةَ لَنَا بِمَا أَحدَثتُم»[١].

واتە: لە ئیبنو مەسعود و حوزەیفە (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە: (جارێکیان) هەردووکیان بەیەکەوە دانیشتبوون، پیاوێکیش هات پرسیاری لێ کرد دەربارەی شتێک (کە بیدعە بووە)، جا ئیبنو مەسعود بە حوزەیفەی وت: دەبێ بۆچی پرسیارم لێ بکەن دەربارەی ئەو شتە؟ ئەویش وتی: ئەوان وەڵامی پرسیارەکە دەزانن دواتر وێڵیان کردووە و کاری پێ ناکەن. ئیبنو مەسعودیش ڕووی تێکرد و وتی: دەربارەی هەر شتێک لە پەرتوکی خوا پرسیارتان لێ کردبین زانیبێتمان هەواڵمان پێداون دەربارەی، یان دەربارەی سوننەتێکی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیارتان لێکردبین هەواڵمان پێداون دەربارەی، تاقەتی ئەو شتانەشمان نیە کە داتان هێناوە (لە بیدعە و بیدعەکاری).

١٠٣- «عَنِ النَّزَّالِ بنِ سَبرَةَ قَالَ: مَا خَطَبَ عَبدُ اللهِ ﷺ خُطبَةً بِالكُوفَةِ إلاَّ شَهِدتُهَا، فَسَمِعتُهُ يَومًا، وَسُئِلَ عَن رَجُلٍ يُطَلِّقُ امرَأَتَهُ ثَمَانِيَةً وَأَشبَاهِ ذَلِكَ، قَالَ: هُوَ كَمَا قَالَ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ اللهَ أَنزَلَ كِتَابَهُ وَبَيَّنَ بَيَانَهُ، فَمَن أَتَى الأَمرَ مِن قِبَلِ وَجهِهِ فَقَد بُيِّنَ لَهُ، وَمَن خَالَفَ فَوَاللهِ مَا نُطِيقُ خِلاَفَكُم»[٢].

واتە: نەززالی کوڕی سەبرەتە وتویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ هیچ وتارێکی لە کوفە نەداوە من لەوێ نەبووبم (واتە: لە هەموو وتارەکانی دانیشتووم)، ڕۆژێک گوێم لێی بوو، پرسیاری لێ کرا دەربارەی پیاوێک کە خێزانەکەی تەڵاق بدات بە هەشت تەڵاق و هاوشێوەی ئەو جۆرە تەڵاقە (کە ئاخۆ حوکمی چیە) عەبدوڵڵا وتی: هەر بەو شێوەیەیە کە وتویەتی (واتە: تەڵاقی کەوتووە)، دواتر وتی: بە دڵنیایی خوا کتابەکەی خۆی دابەزاندوەو ڕوونی کردۆتەوە، جا هەر کەسێک شتێک جێبەجێ بکات لەسەر ڕێڕەوی خۆی (کە ئیسلام دیاری کردووە) ئەوە کارەکەی بۆ ڕوون کراوەتەوەو مەعلومە، هەر کەسێکیش پێچەوانەی (ڕێسا و یاساکانی ئیسلام) بجوڵێتەوە سوێند بەخوا ئێمە تاقەتی خیلافات و بیدعەکانی ئێوەمان نیە (تا خۆمانی پێوە سەرقاڵ بکەین).

١٠٤- «عَنِ النَّزَّالَ بنَ سَبرَةَ، قَالَ: شَهِدتُ عَبدَ اللهِ ﷺ، واتاهُ رَجُلٌ وَامرَأَةٌ فِي تَحرِيمٍ، فَقَالَ: إِنَّ اللهَ قَد بَيَّنَ، فَمَن أَتَى الأَمرَ مِن قِبَلِ وَجهِهِ فَقَد بُيِّنَ وَمَن خَالَفَ فَوَاللهِ مَا نُطِيقُ خِلاَفَكُم»[٣].

---

(١)ـ إسناده ضعيف.

(٢)ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

واتە: نەززالی کوڕی سەبرەتە: لەلای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ بووم، پیاوێک و ژنێکیش هاتن بۆ لای و دەربارەی حەرام بوونی ژن لەسەر پیاوەکەی (پرسیاریان لێ کرد)، ئەویش وتی: خوا ڕوونی کردۆتەوە (کە تەڵاق چۆنە و چەندە و لە چ کاتێک دروستە) جا هەر کەسێک وەک خۆی جێبەجێیان بکات (کە ئیسلام بۆی دیاری کردووە) ئەوە ڕوون کراوەتەوە، هەرکەسێکیش پێچەوانە بجوڵێتەوە و (بیدعەکاری بکات) ئەوە سوێند بەخوا ئێمە تاقەتی بیدعە و خیلافاتی نێوانی ئێوەمان نیە و (خۆمانی پێوە سەرقاڵ ناکەین).

١٠٥- «عَنِ ابنِ سِيرِينَ أَنَّهُ كَانَ لاَ يَقُولُ بِرَأْيِهِ إلاَّ شَيئًا سَمِعَهُ»[1].

واتە: ئیبنو سیرین (باسی خۆی کردوە)و وتویەتی: هیچ بۆچوونێکی لەخۆیەوە نەوتووە تەنها شتێک نەبێت کە گوێی لێ بووبێ (لە زانایان)و زانیبوبێتی.

١٠٦- «عَنِ الأَعمَشِ قَالَ: مَا سَمِعتُ إِبرَاهِيمَ يَقُولُ بِرَأيِهِ فِي شَيءٍ قَطُّ»[2].

واتە: ئەعمەش وتویەتی: قەت گوێم لە ئیبراهیم نەبووە بۆچوونێکی لەخۆیەوە وتبێت دەربارەی هەر شتێک.

١٠٧- «عَن قَتَادَةَ، قَالَ: مَا قُلتُ بِرَأيِي مُنذُ ثَلاَثِينَ سَنَةً، قَالَ أَبُو هِلاَلٍ مُنذُ أَربَعِينَ سَنَةً»[3].

واتە: قەتادە وتویەتی: بۆچوونی خۆم دەرنەبڕیوە سی ساڵ دەبێ. ئەبو هیلالیش (کە قوتابی قەتادەیە) وتوویەتی: (بەڵکو) چل ساڵ دەبوو.

١٠٨- «عَبدِ العَزِيزِ بنِ رُفَيعٍ، قَالَ: سُئِلَ عَطَاءٌ عَن شَيءٍ فقالَ: لاَ أَدرِي، قَالَ: قِيلَ لَهُ: أَلاَ تَقُولُ فِيهَا بِرَأْيِكَ؟ قَالَ: إِنِّي أَستَحيِي مِنَ اللهِ عَزَّوَجَلَّ أَن يُدَانَ فِي الأَرضِ بِرَأْيِي»[4].

واتە: عەبدولعەزیزی کوڕی ڕوفەیع وتویەتی: عەطاء پرسیاری لێکرا دەربارەی شتێک، ئەویش وتی: نازانم، پێی وترا: بۆ قسەی لەسەر ناکەی بە بۆچوونی خۆت؟ وتی: من شەرم دەکەم لە خوا کەوا دینداری لە زەویدا ئەنجام بدرێت لەسەر بۆچوونی من.

١٠٩- «عَنِ الشَّعبِيِّ، قالَ: جَاءَهُ رَجُلٌ يَسأَلُهُ عَن شَيءٍ فَقَالَ: كَانَ ابنُ مَسعُودٍ ﷺ يَقُولُ فِيهِ كَذَا وَكَذَا قَالَ أَخبِرنِي أَنتَ بِرَأيِكَ- فَقَالَ: أَلاَ تَعجَبُونَ مِن هَذَا؟ أَخبَرتُهُ عَنِ ابنِ مَسعُودٍ وَيَسأَلُنِي عَن رَأيِي، وَدِينِي عِندِي آثَرُ مِن ذَلِكَ وَاللهِ لإن أَتَغَنَّى بِغَنِيَّةٍ أَحَبُّ إِلَيَّ مِن أَن أُخبِرَكَ بِرَأْيِي»[5].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥)ـ إسناده ضعيف.

واتە: شەعبی وتویەتی: پیاوێک هاتوە بۆ لای و پرسیاری لێکردوە دەربارەی شتێک، ئەویش وتویەتی: ئیبنو مەسعود ﷺ دەربارەی ئەو شتە ئاوا و ئاوای وتووە، کابرا وتی: تۆ بۆچوونی خۆتم پێ بڵێ، شەعبیش وتی: ئایا سەرتان سوڕ نەماوە لەو کەسە؟! (عەجایب) من فەتوای ئیبنو مەسعودم پێ ڕاگەیاندووە، ئەویش پرسیارم لێ دەکات دەربارەی بۆچوونی خۆم، لە کاتێکدا دینی من شوێنکەوتووی ئەوەیە (واتە: شوێنکەوتوی ڕێچکەی پێغەمبەری خوا و هاوەڵانە)، سوێند بەخوا گۆرانی بڵێم پێم باشترو خۆشترە لەوەی بۆچوونی خۆمت پێ بڵێم.

١١٠- «عَنِ الشَّعبِيِّ، قَالَ: إِيَّاكُم وَالمُقَايَسَةَ، وَالَّذِي نَفسِي بِيَدِهِ لَئِن أَخَذتُم بِالمُقَايَسَةِ لَتُحِلُّنَّ الحَرَامَ وَلَتُحَرِّمُنَّ الحَلاَلَ، وَلَكِن مَا بَلَغَكُم عَمَّن حَفِظَ مِن أَصحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ فَاعمَلُوا بِهِ»[١].

واتە: شەعبی وتویەتی: خۆتان بپارێزن لە حوکمدان بە قیاس (واتە نەکەن قیاسی شتان لەسەر یەک بکەن بەعەقڵی خۆتان بەبێ ئەوەی شارەزاییتان لە قورئان و فەرموودە هەبێت)، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر دەستتان گرت بە قیاس کردن بە دڵنیایی حەڕام حەڵاڵ دەکەن و حەڵاڵیش حەڕام دەکەن، بەڵکو ئەوەی پێتان گەیشتووە لەو کەسانەی فەرموودەیان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر کردووە و گێڕاویانەتەوە کاری پێ بکەن.

١١١- «عَن عَلقَمَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عَبدِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّهُ طَلَّقَ امرَأَتَهُ البَارِحَةَ ثَمَانِيًا- قَالَ: بِكَلاَمٍ وَاحِدٍ؟ قَالَ: بِكَلاَمٍ وَاحِدٍ- قَالَ: فَيُرِيدُونَ أَن يُبِينُوا مِنكَ امرَأَتَكَ؟ قَالَ: نَعَم- قَالَ: وَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّهُ طَلَّقَ امرَأَتَهُ مِائَةَ طَلقَةٍ، قَالَ بِكَلاَمٍ وَاحِدٍ؟ قَالَ: بِكَلاَمٍ وَاحِدٍ- قَالَ: فَيُرِيدُونَ أَن يُبِينُوا مِنكَ امرَأَتَكَ؟ قَالَ: نَعم، فَقَالَ عَبدُ اللهِ: مَن طَلَّقَ كَمَا أَمَرَ اللهُ، فَقَد بَيَّنَ اللهُ الطَّلاَقَ، وَمَن لَبَّسَ عَلَى نَفسِهِ، وَكَّلنَا بِهِ لَبسَهُ وَاللهِ لاَ تُلَبِّسُونَ عَلَى أَنفُسِكُم وَنَتَحَمَّلُهُ نَحنُ، هُوَ كَمَا تَقُولُونَ»[٢].

واتە: عەلقەمە وتویەتی: پیاوێک هات بۆ لای عەبدوڵڵا ﷺ، وتی: کە دوێنێ شەو خێزانەکەی تەڵاقداوە بە هەشت تەڵاق، عەبدوڵڵا وتی: بە یەک قسە (بە یەک جار هەشت تەڵاقت فڕێداوە)؟ پیاوەکە وتی: (بەڵێ) بە یەک قسە و بە یەک جار، عەبدوڵڵا وتی: ئایا دەیانەوێ (واتە: خزمی تۆ و خزمی خێزانەکەت دەیانەوێت) خێزانەکەت لێت جیا ببێتەوە؟ کابرا وتی: بەڵێ.

عەلقەمە دەڵێ: جارێکی تریشیان پیاوێک هات بۆ لای عەبدوڵڵا وتی: کە خێزانەکەی تەڵاق داوە بە سەد تەڵاق، عەبدوڵڵا وتی: بە یەک قسە (بە یەک جار) تەڵاقتدا؟ وتی: (بەڵێ) بە یەک قسە، عەبدوڵڵا وتی: ئایا دەیانەوێ خێزانەکەت لێت جیا ببێتەوە؟ وتی: بەڵێ، عەبدوڵڵا وتی: هەر کەسێک تەڵاق بخوات وەک خوا باسی کردوە، ئەوە خوا ڕوونی کردۆتەوە (کە تەڵاق سێیە)، هەر کەسێکیش سەر لەخۆی بشێوێنێ (کرداری سەیر سەیر ئەنجام بدات) سەر لێ شێوانەکەی دەخەینە ئەستۆی خۆی،

---

(١)ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

سوێند بە خوا (ناهێڵین) سەر لە خۆتان بشێوێنن و ئنجا بیخەنە ئەستۆی ئێمە، حوكمی (تەڵاقەكەتان) ئاوایە كە وتووتانە (واتە: تەڵاقەكەتان كەوتووە).

**١١٢- «عَنِ القَاسِمِ قَالَ: لإن يَعِيشَ الرَّجُلُ جَاهِلاً بَعدَ أَن يَعلَمَ حَقَّ اللهِ عَلَيهِ خَيرٌ لَهُ مِن أَن يَقُولَ مَا لاَ يَعلَمُ»[١].**واتە: لە قاسمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پیاو بە نەزانی بژیێت پاش ئەوەی زانی هەقی خوا چیە لەسەری (واتە پاش ئەوەی ئیمانی هێناو فێری عیبادەتە واجبەكان بوو، واتە ئەگەر تەنها ئەوەندەی زانی و چیتری نەزانی) ئەوە باشترە لەوەی (ببێتە زاناو) قسە لەسەر شتێک بكات كە زانستی دەربارە نیە و (فەتوا بدات بەبێ زانست).

**١١٣- «عَن أَيُّوبَ، قَالَ: سَمِعتُ القَاسِمَ، سئل قَالَ: إِنَّا وَاللهِ مَا نَعلَمُ كُلَّ مَا تَسأَلُونَ عَنهُ، وَلَو عَلِمنَا مَا كَتَمنَاكُم، وَلاَ حَلَّ لَنَا أَن نَكتُمَكُم»[٢].**

واتە: ئەییوب وتویەتی: گوێم لە قاسم بوو پرسیاری لێ كرا، ئەویش وتی: سوێند بەخوا ئێمە هەموو ئەو شتانە نازانین كە ئێوە پرسیارمان لێ دەكەن دەربارەیان، ئەگەر بمانزانیایە نەمان دەشاردەوە (پێمان ڕادەگەیاندن)، (چونكە) حەڕام و قەدەغەیە بیشارینەوە.

**١١٤- «عَنِ ابنِ عَونٍ، قَالَ: سُئِلَ القَاسِمُ عَن شَيءٍ قَد سَمَّاهُ، فَقَالَ: مَا أُضطَرُّ إِلَى مَشُورَةٍ، وَمَا أَنَا مِن ذِي فِي شَيءٍ»[٣].**

واتە: ئیبنو عەون وتویەتی: قاسم پرسیاری لێ كراوە دەربارەی شتێک، قاسم ناوی شتەكەشی هێنا، قاسم وتی: ناچار نیم پرس بە كەسانی دیكە بكەم بۆ زانینی ئەو بابەتە (چونكە گرنگ نیە)و خۆشم هیچی لێ نازانم.

**١١٥- «عَن يَحيَى قَالَ: قُلتُ لِلقَاسِمِ: مَا أَشَدَّ عَلَيَّ أَن تُسأَلَ عَنِ الشَّيءِ لاَ يَكُونُ عِندَكَ، وَقَد كَانَ أَبُوكَ إِمَامًا، قَالَ: إِنَّ أَشَدَّ مِن ذَلِكَ عِندَ اللهِ وَعِندَ مَن عَقَلَ عَنِ اللهِ أَن أُفتِيَ بِغَيرِ عِلمٍ أَو أَروِيَ عَن غَيرِ ثِقَةٍ»[٤].**

واتە: یەحیا وتویەتی: بە قاسمم وت: قورسترین و ناخۆشترین شت لەسەر (دڵی من) بریتیە لەوەی تۆ پرسیارت دەربارەی شتێک لێ بكرێت و تۆش (وەڵامەكەت) لەلا نەبێت لە كاتێكدا باوكت زانا بووە؟! قاسم وتی: لەوە قورستر و ناخۆشتر لەلای خوا و لەلای ئەو كەسانەی خوایان (بە هەق) ناسیوە ئەوەیە فەتوا بدەم بەبێ زانست، یان (فەرموودە) بگێڕمەوە لە كەسێک كە جێگای متمانە نەبێ.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤)ـ إسناده ضعيف، ولكن الأثر صحيح.

١١٦- «عَنِ المُسَيَّبِ بنِ رَافِعٍ قَالَ: كَانُوا إِذَا نَزَلَت بِهِم قَضِيَّةٌ لَيسَ فِيهَا مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ أَثَرٌ، اجتَمَعُوا لَهَا وَأَجمَعُوا، فَالحَقُّ فِيمَا رَأَوا، فَالحَقُّ فِيمَا رَأَوا»[١].

واتە: موسەیيەبی كوڕی ڕافیع (كە زانایەكی گەورەیە، باسی كاری خۆیان دەكات دەربارەی فەتوادان) وتویەتی: هەموو جار ئەگەر بابەتێک ڕووی بدایەو (پرسیاریان لێ كرابایە دەربارەی) كە هیچ فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەسەر نەهاتبا، (زانایان) یەكتریان كۆدەكردەوە دواتر كۆک دەبوون لەسەر (حوكمەكەی)، بەڕاستی بۆچوونەكانیان هەق بوو، بەڕاستی بۆچوونەكانیان هەق بوو.

١١٧- «أَخبَرَنَا عَبدُ اللهِ، أَنبَأَنَا يَزِيدُ، عَنِ العَوَّامِ بِهَذَا»[٢].

واتە: عەووامیش هەمان ئەو وتەیەی ئاوا گێڕاوەتەوە.

١١٨- «أَنَّ وَهبَ بنَ عَمرٍو الجُمَحِيَّ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لاَ تَعجَلُوا بِالبلَيَةِ قَبلَ نُزُولِهَا، فَإِنَّكُم إِن لاَ تَعجَلُوهَا قَبلَ نُزُولِهَا، لاَ يَنفَكُّ المُسلِمُونَ وَفِيهِم إِذَا هِيَ نَزَلَت مَن إِذَا قَالَ وُفِّقَ وَسُدِّدَ، وَإِنَّكُم إِن تَعجَلُوهَا، تَختَلِف بِكُمِ الأَهوَاءُ، فَتَأخُذُوا هَكَذَا وَهَكَذَا وَأَشَارَ بَينَ يَدَيهِ وَعَن يَمِينِهِ وَعَن شِمَالِهِ»[٣].

واتە: وەهبی كوڕی عەمری جومەحی وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەلە مەكەن بۆ پرسیار كردن دەربارەی بابەتێک كە هێشتا ڕووی نەداوە، چونكە ئەگەر ئێوە پەلە نەكەن پێش ڕوودانی بابەتەكە ئەوە (زانایانی) مسوڵمان هەر دەمێنن، جا كاتێک ڕوویدا (زانای وا) هەیە خوا ڕێنموویی دەكات و ڕاستی دەپێكێت (لە فەتوادان دەربارەی)، (بەڵام) ئەگەر ئێوە پەلە بكەن پێش ئەوەی بابەتەكە ڕووبدات ئەوە هەواو نەفس جیاوازیتان دەخاتە نێوان، ئنجا ئاواو ئاوا ڕێگا دەگرن، ئاماژەی بۆ پێشەخۆی و لای ڕاستی و چەپی كرد (واتە: پەرتەوازە دەبن هەر یەكەتان بە لایێكدا ڕێ دەكات).

١١٩- «حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنِ الأَمرِ يَحدُثُ لَيسَ فِي كِتَابٍ وَلاَ سُنَّةٍ قَالَ: يَنظُرُ فِيهِ العَابِدُونَ مِنَ المُؤمِنِينَ»[٤].

واتە: ئەبو سەلەمە وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێكرا دەربارەی بابەتێک كە (ئەگەر) ڕوو بدات و حوكمەكەی لە قورئان و فەرموودەدا نەبێت (چی بكەن)، فەرمووی: خواپەرستان لە نێو ئیمانداران سەیری بابەتەكە دەكەن و (فەتوای بۆ دەدەن).

١٢٠- «عَنِ ابنِ عَونٍ قَالَ: قَالَ القَاسِمُ: إِنَّكُم لَتَسأَلُونَا عَن أَشيَاءَ مَا كُنَّا نَسأَلُ عَنهَا، وتَنَقِّرُونَ عَن أَشيَاءَ مَا كُنَّا نُنَقِّرُ عَنهَا، وتسأَلُونَ عَن أَشيَاءَ مَا أَدرِي مَا هِيَ، وَلَو عَلِمنَاهَا مَا حَلَّ لَنَا أَن نَكتُمَكُمُوهَا»[٥].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣)ـ مرسل، وأسناده ضعيف.

(٤)ـ مرسل، وإسناده صحيح.

(٥)ـ أثر إسناده صحيح.

واتە: لە ئیبنو عەون گێردراوەتەوە دەڵێ: قاسم وتویوتی: ئێوە پرسیار لە شتانێک دەکەن ئێمە پێشتر پرسیارمان دەربارەی کردوە، هەروەها دەچنە بنج و بنەوانی هەندێ شت و زۆر لێی قوڵ دەبنەوە ئێمە ئاوا لێی قوڵ نەدەبووینەوە، وە پرسیار دەربارەی هەندێ شت دەکەن ئێمە نازانین چیە، ئەگەر بمانزانیایە حەڵاڵ نەبوو لێتانی بشارینەوە (پێمان ڕادەگەیاندن).

**١٢١- «عَن عُمَرَ بنِ الأَشَجِّ: أَنَّ عُمَرَ بنَ الخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: إِنَّهُ سَيَأْتِي نَاسٌ يُجَادلَونَكُم بِشُبُهَاتِ القُرآنِ، فَخُذُوهُم بِالسُّنَنِ، فَإِنَّ أَصحَابَ السُّنَنِ أَعلَمُ بِكِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ»[١].**

واتە: عومەری کوڕی ئەشەج وتویەتی: بە دڵنیایی خەڵکانێک دێن و پەیدا دەبن مناقەشەتان لەگەڵ دەکەن بە گومان پەیا کردن دەربارەی قورئان (دەیانەوێ هەندێ ئایەت بۆ بۆچوونی نەشیاو بەکار بێنن) ئێوەش بە فەرموودە بیانگرن و (مناقەشەیان لەگەڵ بکەن)، چونکە ئەوانەی شارەزاییان لە فەرموودە هەیە زاناترن بە پەرتوکی خوا.

**١٢٢- «عَن عُروَةَ بنِ الزُّبَيرِ، قَالَ: مَا زَالَ أَمرُ بَنِي إِسرَائِيلَ مُعتَدلَ لَيسَ فِيهِ شَيءٌ حَتَّى نَشَأَ فِيهِمُ المُوَلَّدُونَ أَبنَاءُ سَبَايَا الأُمَمِ أَبنَاءُ النِّسَاءِ الَّتِي سَبَت بَنُو إِسرَائِيلَ مِن غَيرِهِم، فَقَالُوا فِيهِم بِالرَّأيِ فَأَضَلُّوهُم»[٢].**

واتە: عوروەی کوڕی زوبەیر وتویەتی: بە بەردەوامی کاروباری نەوەکانی ئیسرائیل ڕاست و ڕێک بوو هیچ شتێکی (خراپی تیا نەبوو) تاوەکو نەوەیەک لەدایک بوون کە منداڵی جاریەکانی گەلانی تر بوون، منداڵانی ئەو ئافرەتانەی بەنی ئیسرائیل بە جاریە دەستگیریان کردبوون لە غەیری خۆیان، جا ئەو منداڵانەی لەو ئافرەتانە لە دایک بوون بە بۆچوونی خۆیان قسەیان دەربارەی دینی بەنی ئیسرائیل دەکردو (فەتوایان دەدا بەبێ زانست)و بەنی ئیسرائیلیان گومڕا کرد.

## بابەت: خراپی فەتوادان (بەبێ زانست)

**١٢٣- «حَدَّثَنَا حَمَّادُ بنُ يَزِيدَ المِنقَرِيُّ، حَدَّثَنِي أَبِي، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ يَومًا إِلَى ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، فَسَأَلَهُ عَن شَيءٍ لاَ أَدرِي مَا هُوَ، فَقَالَ لَهُ: ابنُ عُمَرَ: لاَ تَسأَل عَمَّا لَم يَكُن، فَإِنِّي سَمِعتُ عُمَرَ بنَ الخَطَّابِ رِضوَانُ اللهِ عَلَيهِ يَلعَنُ مَن سَأَلَ عَمَّا لَم يَكُن»[٣].**

واتە: باوکی حەممادی کوڕی یەزید وتویەتی: ڕۆژێک پیاوێک هات بۆ لای ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، پرسیاری لێ کرد دەربارەی شتێک من نازانم چی بوو، ئیبنو عومەر پێی وت: پرسیار لە شتێک مەکە کە پەیدا نەبووە و ڕووینەداوە، چونکە من گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، بووە نەفرینی لە کەسێک کردووە کە پرسیار دەربارەی شتێک دەکات کە ڕووی نەداوە و نەبووە.

---

(١)ـ أثر إسناده ضعيف.

(٢) ـ أثر إسناده حسن.

(٣)ـ أثر إسناده حسن.




١٢٤- «أَنَّ زَيدَ بنَ ثَابِتٍ الأَنصَارِيَّ ﷺ، كَانَ يَقُولُ إِذَا سُئِلَ عَنِ الأَمرِ: أَكَانَ هَذَا؟ فَإِن قَالُوا: نَعم، قَد كَانَ، حَدَّثَ فِيهِ بِالَّذِي يَعلَمُ وَالَّذِي يَرَى، وَإِن قَالُوا: لَم يَكُن، قَالَ: فَذَرُوهُ حَتَّى يَكُونَ»[١].

واتە: زەیدی کوڕی سابیتی ئەنصاری ﷺ هەموو جار ئەگەر پرسیاری لێ بکرایە دەربارەی بابەتێک دەیوت: ئایا ئەو شتە ڕوویداوە و پەیدا بووە؟ ئەگەر بیان وتبایە بەڵێ ڕوویداوە، ئەوە قسەی لەسەر دەکرد و بەوەی دەیزانی و لێی حاڵی دەبوو، وە ئەگەر بیان وتایە ڕووی نەداوە، دەیوت: وازی لێ بێنن تا ڕوودەدات و پەیدا دەبێت.

١٢٥- «عَن عَامِرٍ قَالَ سُئِلَ عَمَّارُ بنُ يَاسِرٍ ﷺ، عَن مَسأَلَةٍ فَقَالَ: هَل كَانَ هَذَا بَعدُ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: دَعُونَا حَتَّى يَكُونَ، فَإِذَا كَانَ، تَجَشَّمنَاهَا لَكُم»[٢].

واتە: عامیر وتویەتی: عەمماری کوڕی یاسر ﷺ پرسیاری لێ کرا، دەربارەی بابەتێک، ئەویش وتی: ئایا ئەو شتە ڕوویداوە؟ وتیان: نەخێر، عەممار وتی: وازمان لێ بێنن تا ڕوو دەدات، جا کاتێک ڕوویدا لە ئەستۆی دەگرین بۆتان (هەر چەندە زەحمەت و ناخۆشیش بێت، هەر بۆتان چارەسەر دەکەین).

١٢٦- «عَن طَاوُسٍ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ، عَلَى المِنبَرِ: أُحَرِّجُ بِاللهِ عَلَى رَجُلٍ سَأَلَ عَمَّا لَم يَكُن، فَإِنَّ اللهَ قَد بَيَّنَ مَا هُوَ كَائِنٌ»[٣].

واتە: تاووس وتویەتی: عومەر ﷺ لەسەر مینبەر وتی: سوێند بەخوا سەغڵەتی لەسەر کەسێک دروست دەکەم کە پرسیار دەربارەی شتێک بکات کە ڕووی نەدابێت، (چونکە) خوای پەروەردگار بە دڵنیایی شتێکی ڕوون کردۆتەوە کە ڕووی دابێت و بوونی هەبووبێت (نەوەک شتێک کە ڕووی نەدابێت).

١٢٧ـ «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مَا رَأَيْتُ قَوْماً كَانُوا خَيْراً مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَا سَأَلُوهُ إِلاَّ عَنْ ثَلاَثَ عَشَرَةَ مَسْأَلَةً حَتَّى قُبِضَ، كُلُّهُنَّ فِي الْقُرْآنِ مِنْهُنَّ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ ﴿٢١٧﴾ ﴾البقرة، ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ﴿٢٢٢﴾ ﴾البقرة، قَالَ: مَا كَانُوا يَسْأَلُونَ إِلاَّ عَمَّا يَنْفَعُهُمْ»[٤].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: هیچ کۆمەڵێکم نەبینیوە چاکتر بن لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ نەکردووە تەنها لە سێزدە بابەت نەبێت، تاوەکو ئەو کاتەی وەفاتی کرد، هەموو بابەتەکانیش لە قورئان هاتوون، بەشێک لەوان (ئەم دوو ئایەتەیە): ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ ﴿٢١٧﴾ ﴾البقرة، و ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ﴿٢٢٢﴾ ﴾البقرة، واتە: [ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی مانگە حەڕام کراوەکان (کە شەڕو کوشتاریان تێدا دروست نیە] هەروەها ئەو ئایەتەی دەفەرموێ: [پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی سوڕی مانگانە

---

(١) ـ أثر من بلاغات الزهري الضعيفة.

(٢) ـ أثر رجاله ثقات، إلا أنه منقطع.

(٣) ـ أثر إسناده صحيح.

(٤)ـ إسناده ضعيف.

(ئاخۆ دروستە لە خێزانەكانیان نزیک بكەونەوە و سەرجێیی بكەن]، ئیبنو عەبباس وتی: (هاوەڵەكان بەو شێوەیە بوون) پرسیاریان نەدەكرد تەنها لە شتێک نەبێت كە سوودی بۆیان هەبێ.

١٢٨- «عَن عُمَيرِ بنِ إسحَاقَ، قَالَ: لَمَنْ أَدرَكتُ مِن أَصحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَكثَرُ مِمَّن سَبَقَنِي مِنهُم، فَمَا رَأَيتُ قَومًا أَيسَرَ سِيرَةً، وَلاَ أَقَلَّ تَشدِيدًا مِنهُم»[١].

واتە: عەمەیری كوڕی ئیسحاق وتویەتی: ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە پێیان گەیشتووم زیاترن لەوانەی پێش من كەوتوون و (وەفاتیان كردووە و من نەمبینیون)، هیچ كۆمەڵێكم نەبینیوە ژیانیان ساكارتر و كەمترین توندیان هەبووبێت لەوان (واتە: ئەو هاوەڵانەی پێیان گەیشتووم كەس نەبووە لەوان ساكارتر و میانڕەوتر بووبێت).

١٢٩- «أَخبَرَنِي رَجَاءُ بنُ أَبِي سَلَمَةَ، قَالَ سَمِعتُ عُبَادَةَ بنَ نُسَيّ الكِندِيَّ وَسُئِلَ عَنِ امرَأَةٍ مَاتَت مَعَ قَومٍ لَيسَ لَهَا وَلِيٌّ، فَقَالَ: أَدرَكتُ أَقوَامًا مَا كَانُوا يُشَدِّدُونَ تَشدِيدَكُم، وَلاَ يَسأَلُونَ مَسَائِلَكُم»[٢].

واتە: ڕەجائی كوڕی ئەبو سەلەمە وتویەتی: گوێم لە عوبادەی كوڕی نوسەیی كیندی بوو پرسیاری لێ كرا دەربارەی ئافرەتێک كە لەگەڵ كۆمەڵێكدا مردبێت و، هیچ سەرپەرشتیارێكیشی نەبێت؟ عوبادە وتی: بە كۆمەڵە خەڵكانێک گەیشتووم (واتە: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ) زەحمەتكار نەبوون وەک ئێوە، وە پرسیاری وەک پرسیاری ئێوەیان نەدەكرد (ئاوا خۆیان بە پرسیاری بێ سوود خەریک نەدەكرد).

١٣٠- «عَن هِشَامِ بنِ مُسلِمٍ القُرَشِيِّ، قَالَ: كُنتُ مَعَ ابنِ مُحَيرِيزٍ بِمَرجِ الدِّيبَاجِ فَرَأَيتُ مِنهُ خَلوَةً، فَسَأَلتُهُ عَن مَسأَلَةٍ فَقَالَ لِي: مَا تَصنَعُ بِالمَسَائِلِ؟ قُلتُ: لَولاَ المَسَائِلُ، لَذَهَبَ العِلمُ- قَالَ: لاَ تَقُل ذَهَبَ العِلمُ، إِنَّهُ لاَ يَذهَبُ العِلمُ مَا قُرِئَ القُرآنُ، وَلَكِن لَو قُلتَ يَذهَبُ الفِقهُ»[٣].

واتە: هیشامی كوڕی موسلیمی قوڕەشی وتویەتی: من لەگەڵ كوڕی موحەیریز بووم لە مەڕجی دیباج (كە دۆڵێكە)، بینیم (كوڕی موحەیریز) بە تەنهایە منیش پرسیاری بابەتێكم لێ كرد، ئەویش پێی وتم: چ كارت بەم پرسیارانەیە؟ منیش وتم: ئەگەر پرسیار كردن نەبێت زانست نامێنێت، ئەویش وتی: مەڵێ زانست نامێنێت، زانست لەناو ناچێ مادەم قوڕئان بخوێندرێت، بەڵكو ئەگەر بتگوتایە: فیقە نامێنێت (باشتر بوو).

١٣١- «أَنَّ عُمَرَ ﷺ، قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا لاَ نَدرِي، لَعَلَّنَا نَأمُرُكُم بِأَشيَاءَ لاَ تَحِلُّ لَكُم، وَلَعَلَّنَا نُحَرِّمُ عَلَيكُم أَشيَاءَ هِيَ لَكُم حَلاَلٌ، إِنَّ آخِرَ مَا نَزَلَ مِنَ القُرآنِ آيَةُ الرِّبَا، وَإِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَم يُبَيِّنهَا لَنَا حَتَّى مَاتَ، فَدَعُوا مَا يَرِيبُكُم إِلَى مَا لاَ يَرِيبُكُم»[٤].

---

١) ـ أثر إسناده حسن.

٢) ـ أثر إسناده صحيح.

٣)ـ أثر إسناده ضعيف.

٤)ـ إسناده ضعيف، لانقطاعه.

واتە: عومەر ﷺ وتویەتی: ئەی خەڵکینە ئێمە نازانین ڕەنگە فەرمانتان پێ بکەین بە شتانێک کە بۆتان حەڵاڵ نەبێت، ڕەنگە هەندێ شتیشتان لێ قەدەغە بکەین کە بۆتان حەڵاڵ بێت، بە دڵنیایی کۆتا ئایەتی (ئەحکام) کە لە قورئاندا دابەزی ئایەتی ڕیبا (سوو) بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ تا وەفاتی کرد بۆمانی ڕوون نەکردەوە، کەواتە: واز لەو شتانە بێنن کە گومانتان لێی هەیە بچن بەلای ئەو شتانەی کە گومانتان لێی نیە (بەم شێوەیە خۆتان و ئێمەش لە تاوان دەپارێزن).

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسانەی لە فەتوادان ترساون و ڕقیان لە زۆرلەخۆ کردن و بیدعە بووە

١٣٢- «حَدَّثَنَا ابنُ إدرِيسَ عَن عَمِّهِ، قَالَ: خَرَجتُ مِنْ عِنْدِ إبرَاهِيمَ، فَاستَقبَلَنِي حَمَّادٌ، فَحَمَّلَنِي ثَمَانِيَةَ أَبوَابٍ، مَسَائِلَ فَسَأَلتُهُ، فَأَجَابَنِي عَن أَربَعٍ وتَرَكَ أَربَعًا»[١].

واتە: مامی عەبدوڵڵای کوڕی ئیدریس وتویەتی: لەلای ئیبراهیمەوە هاتمە دەرەوە حەمادیش بەرەو ڕووم هات و تەکلیفی لێ کردم کە پرسیاری هەشت بابەت لە ئیبراهیم بکەم، منیش پرسیارەکانم لێ کرد، ئەویش وەڵامی چوار پرسیاری دامەوە و چواریشی واز لێ هێناو وەڵامی نەدایەوە.

١٣٣- «عَن زُبَيدٍ، قَالَ: مَا سَأَلتُ إبرَاهِيمَ عَن شَيءٍ إلاَّ عَرَفتُ الكَرَاهِيَةَ فِي وَجهِهِ»[٢].

واتە: زوبەید وتویەتی: پرسیارم لە ئیبراهیم نەکردووە دەربارەی هەر شتێک حەتمەن هەستم بە ناڕەحەتی کردووە لە ڕوخساریدا (واتە: کاتێک پرسیاری لێ دەکرا ڕەنگی تێک دەچوو، چونکە لە فەتوادان دەترسا).

١٣٤- «عَن عُمَرَ بنِ أَبِي زَائِدَةَ، قَالَ: مَا رَأَيتُ أَحَدًا أَكثَرَ أَن يَقُولَ إذَا سُئِلَ عَن شَيءٍ لاَ عِلمَ لِي بِهِ مِنَ الشَّعبِيِّ»[٣].

واتە: عومەری کوڕی ئەبو زائیدە وتویەتی: کەسم نەبینیوە کە کاتێک پرسیاری لێ بکرێت زۆر بڵێت: من زانیاریم دەربارەی نیە، لە شەعبی (واتە: شەعبی کاتێک پرسیاری لێ دەکرا زۆر دەیوت زانیاریم دەربارەی نیە، وە شەرمی بە نەزانینەکە نەبوو، بەڵکو لە فەتوادان دەترسا).

١٣٥- «عَنِ ابنِ عَونٍ، قَالَ سَمِعتُهُ يَذكُرُ قَالَ: كَانَ الشَّعبِيُّ إذَا جَاءَهُ شَيءٌ اتَّقَى وَكَانَ إبرَاهِيمُ يَقُولُ، وَيَقُولُ، وَيَقُولُ قَالَ أَبُو عَاصِمٍ: كَانَ الشَّعبِيُّ فِي هَذَا أَحسَنَ حَالاً عِندَ ابنِ عَونٍ مِن إبرَاهِيمَ»[٤].

---

(١) ـ أثر إسناده ضعيف.

(٢) ـ أثر إسناده صحيح.

(٣) ـ أثر إسناده صحيح.

(٤) ـ أثر إسناده صحيح.

واتە: ئیبنو عەون وتویەتی: کاتێک شەعبی شتێک و پرسیارێکی بۆ دەهات و ئاراستەی دەکرا خۆی دەپاراست (فەتوای نەدەدا)، (ئیبراهیم)یش هەر دەیوت و دەیوت و دەیوت (واتە: ئیبراهیم لەچاو شەعبی زۆر فەتوای دەدا).

ئەبو عاصیم وتویەتی: شەعبی دەربارەی ئەوە (واتە: دەربارەی ترسان لە فەتوادان) باشتر بووە لە ئیبراهیم بەلای ئیبنو عەونەوە.

١٣٦- «عَن جَعفَرِ بنِ إِيَاسٍ، قَالَ: قُلتُ لِسَعِيدِ بنِ جُبَيرٍ مَا لَكَ لاَ تَقُولُ فِي الطَّلَاقِ شَيئًا؟ قَالَ: مَا مِنهُ شَيءٌ إلاَّ قَد سَأَلتُ عَنهُ، وَلَكِنِّي أَكرَهُ أَن أُحِلَّ حَرَامًا، أَو أُحَرِّمَ حَلاَلاً»[١].

واتە: جەعفەری کوڕی ئیباس وتویەتی: بە سەعیدی کوڕی جوبەیرم وت: بۆچی دەربارەی تەڵاق هیچ قسەیەک ناکەی؟ وتی: هیچ شتێک نیە لە بابەتی تەڵاق حەتمەن پرسیارم دەربارەی کردووەو (زانیاریم دەربارەی هەمووی هەیە)، بەڵام پێم ناخۆشە حەرامێک حەڵاڵ بکەم یاخود حەڵاڵێک حەرام بکەم. (واتە: دەترسم فەتوای من ببێتە هۆی حەڵاڵ کردنی حەرام، یان حەرام کردنی حەڵاڵ و ئاگام لێی نەبێ).

١٣٧- «عَن عَطَاءِ بنِ السَّائِبِ، قَالَ: سَمِعتُ عَبدَ الرَّحمَنِ بنَ أَبِي لَيلَى، يَقُولُ: لَقَد أَدرَكتُ فِي هَذَا المَسجِدِ عِشرِينَ وَمِائَةً مِنَ الأَنصَارِ، وَمَا مِنهُم مِن أَحَدٍ يُحَدِّثُ بِحَدِيثٍ إلاَّ وَدَّ أَنَّ أَخَاهُ كَفَاهُ الحَدِيثَ، وَلاَ يُسأَلُ عَن فُتيَا إلاَّ وَدَّ أَنَّ أَخَاهُ كَفَاهُ الفُتيَا»[٢].

واتە: عەتائی کوڕی سائیب وتویەتی: گوێم لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا بوو دەیوت: بە دڵنیایی لەم مزگەوتەدا بە سەدو بیست (١٢٠) کەس گەیشتووم لە ئەنصارییەکان هیچ کەسێک نەبووە لەوان قسەیەک بکات حەتمەن حەزی دەکرد براکەی قسەکەی لەکۆڵ بکاتەوە، (وە هیچ کەس لەوان نەبوو) پرسیاری فەتوادانی لێ بکرێ حەتمەن حەزی دەکرد براکەی فەتواکەی لە کۆڵ بکاتەوە.

١٣٨- «عَن دَاوُدَ، قَالَ سَأَلتُ الشَّعبِيَّ، كَيفَ كُنتُم تَصنَعُونَ إِذَا سُئِلتُم؟ قَالَ: عَلَى الخَبِيرِ وَقَعتَ، كَانَ إِذَا سُئِلَ الرَّجُلُ، قَالَ لِصَاحِبِهِ: أَفتِهِم، فَلاَ يَزَالُ حَتَّى يَرجِعَ إِلَى الأَوَّلِ»[٣].

واتە: داوود وتویەتی: پرسیارم لە شەعبی کرد (وتم): ئێوە چۆن مامەڵەتان دەکرد ئەگەر پرسیارتان لێ بکرایە؟ وتی: هاتیتە لای کەسێکی شارەزا (بۆ وەرگرتنی وەڵامەکەت)، گەر پیاوێک پرسیاری لێ بکرایە بە هاوڕێکەی دەوت: تۆ فەتوایان بۆ بدە، ئا بەو شێوەیە (هەموویان داوایان لە هاوڕێکەیتریان دەکرد فەتواکە بدات) تا کارەکە دەگەڕایەوە سەر یەکەم کەس (کە پرسیارەکەی ئاراستە کرابوو، ئنجا بە ناچاری خۆی وەڵامی دەدایەوە).

---

(١) ـ أثر إسناده صحيح.

(٢) ـ أثر إسناده صحيح.

(٣)ـ أثر إسناده حسن.

**١٣٩- «عَنِ ابنِ المُنكَدِرِ، قَالَ: إِنَّ العَالِمَ يَدخُلُ فِيمَا بَينَ اللهِ وَبَينَ عِبَادِهِ، فَليَطلُب لِنَفسِهِ المَخرَجَ»[١].**

**واته: ئیبنو مونکەدیر وتویەتی: زاناو (کەسی موفتی کاتێ پرسیاری لێ دەکرێت) دەچێتە نێوان خواو بەندەکانی (واتە بڕیاری خوا بۆ بەندەکان دەدات) بۆیە با بەدوای دەرچەیەک بگەڕێت بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات (جا دەرچەکە یان دۆزینەوەی وەڵامەکەیە لە قورئان و فەرموودە، یان پرسیارکردنە لە کەسی شارەزاتر، یان وەڵام نەدانەوەیە بەوەی بڵێت نایزانم).**

**١٤٠- «عَن مِسعَرٍ قَالَ: أَخرَجَ إِلَيَّ مَعنُ بنُ عَبدِ الرَّحمَنِ كِتَابًا، فَحَلَفَ لِي بِاللهِ أَنَّهُ خَطُّ أَبِيهِ، فَإِذَا فِيهِ: قَالَ عَبدُ اللهِ: وَالَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ مَا رَأَيتُ أَحَدًا كَانَ أَشَدَّ عَلَى المُتَنَطِّعِينَ مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَمَا رَأَيتُ أَحَدًا كَانَ أَشَدَّ عَلَيهِم مِن أَبِي بَكرٍ ﷺ وَإِنِّي لأَرى عُمَرَ ﷺ كَانَ أَشَدَّ خَوفًا عَلَيهِم أَو لَهُم»[٢].**

**واته: میسعەر وتویەتی: مەعنی کوڕی عەبدوڕڕەحمان نوسراوێکی بۆ دەرهێنام و سوێندی خوارد بە خوا کە ئەوە دەستنوسی باوکیەتی، کە تیایدا نوسرابوو: سوێند بەو خوایەی کە هیچ خودایەک نیە جگە لەو، کەسم نەدیوە توندتر بێت لەسەر کەسانی زۆر بڵێ و (زۆر فەتوادەرو زۆر خۆ تێهەڵقورتێنەر) لە پێغەمبەری خوا ﷺ، هەروەها کەسیشم نەدیوە (لە پاش پێغەمبەری خوا ﷺ) توندتر بێت لەسەریان لە ئەبو بەکر، هەروەها بە دڵنیایی من بینیومە عومەر ترسی زۆری هەبووە لەسەریان، یان (ترسی زۆری هەبووە) لێیان.**

**١٤١- «عَن عُثمَانَ بنِ حَاضِرٍ الأَزدِيِّ، قَالَ: دَخَلتُ عَلَى ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، فَقُلتُ أَوصِنِي، فَقَالَ: نَعم، عَلَيكَ بِتَقوَى اللهِ، وَالاِستِقَامَةِ، اتَّبِع وَلاَ تَبتَدِع»[٣].**

**واته: عوسمانی کوڕی حاضری ئەزدی وتویەتی: چوومە ژوورەوە بۆ لای ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، وتم: ئامۆژگاریم بکە، وتی: باشە (کەواتە): دەست بگرە بە تەقوای خواو بەردەوامی، شوێنکەوتە بە (لە ئاین پەروەری)و داهێنەری شتی ناڕەوا مەبە (هەر لەخۆتەوە شت بۆ ئاین زیاد مەکە).**

**١٤٢- «عَنِ ابنِ سِيرِينَ، قَالَ: كَانُوا يَرَونَ أَنَّهُ عَلَى الطَّرِيقِ مَا كَانَ عَلَى الأَثَرِ»[٤].**

**واته: ئیبنو سیرین وتویەتی: ئەوان (واتە: زانایانی سەردەمی ئیبنو سیرین) پێیان وابووە کەسی مسوڵمان لەسەر ڕێگای ڕاستە مادەم لەسەر ڕێڕەوی پێشینە (چاکەکان)و فەرموودە بڕوات.**

**١٤٣- «عَنِ ابنِ سِيرِينَ قَالَ: مَا دَامَ عَلَى الأَثَرِ فَهُوَ عَلَى الطَّرِيقِ»[٥].**

---

(١) ـ أثر إسناده صحيح.

(٢) ـ أثر إسناده صحيح.

(٣) ـ أثر إسناده ضعيف.

(٤) ـ أثر إسناده صحيح.

(٥) ـ أثر إسناده صحيح.

واتە: ئیبنو سیرین وتویەتی: مادەم كەسی مسوڵمان لەسەر فەرموودەو شوێنكەوتەیی پێشینە چاكەكان بڕوات ئەوە لەسەر ڕێگا ڕاستە.

١٤٤- «قَالَ عَبدُ اللهِ بنُ مَسعُودٍ ﷺ تَعَلَّمُوا العِلمَ قَبلَ أَن يُقبَضَ، وَقَبضُهُ أَن يَذهَبَ أَهلُهُ، أَلاَ وَإِيَّاكُم وَالتَّنَطُّعَ، وَالتَّعَمُّقَ، وَالبِدَعَ، وَعَلَيكُم بِالعَتِيقِ»[1].

واتە: ئیبنو مەسعود وتویەتی: خۆتان فێری زانستی (شەرعی) بكەن پێش ئەوەی هەڵبگیرێ و نەمێنێ، نەمانیشی بەوەیە كە خەڵكی خاوەن زانست نەمێنن (و كۆچی دوایی بكەن)، ئاگاداربن خۆتان بپارێزن لە زێدەڕۆیی و ڕۆچوون و بیدعەكاری، وە دەست بگرن بە (دینداری) سەرەتاوە (واتە: دینداری پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەكانی).

١٤٥- «قَالَ ابنُ مَسعُودٍ ﷺ، عَلَيكُم بِالعِلمِ قَبلَ أَن يُقبَضَ، وَقَبضُهُ أَن يُذهَبَ بِأَصحَابِهِ، عَلَيكُم بِالعِلمِ، فَإِنَّ أَحَدَكُم لاَ يَدرِي مَتَى يُفتَقَرُ إِلَيهِ أَو يُفتَقَرُ إِلَى مَا عِندَهُ، إِنَّكُم سَتَجِدُونَ أَقوَامًا يَزعُمُونَ أَنَّهُم يَدعُونَكُم إِلَى كِتَابِ اللهِ وَقَد نَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِم فَعَلَيكُم بِالعِلمِ، وَإِيَّاكُم وَالتَّبَدُّعَ، وَإِيَّاكُم وَالتَّنَطُّعَ، وَإِيَّاكُم وَالتَّعَمُّقَ، وَعَلَيكُم بِالعَتِيقِ»[2].

واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ وتویەتی: دەست بگرن بە زانست پێش ئەوەی هەڵبگیرێ و نەمێنێ، نەمانیشی بە ڕۆیشتن و (مردنی) خاوەنەكانیەتی (كە بریتین لە زانایان)، وە دەست بە زانستەوە بگرن، چونكە كەسێك لە ئێوە نازانێت كەی پێویستی (بەو) زانستە دەبێت، یان كەی (خەڵك) پێویستیان بەو زانستەی لای ئەو دەبێت، بە دڵنیایی ئێوە بە خەڵكانێك دەگەن كە پێیان وایە ئێوە بۆ لای قورئان بانگ دەكەن (وەك قورئانیەكانی ئەم سەردەمە) لە كاتێكدا قورئانیان وازلێهێناوەو خستویانەتە دواوەی خۆیان و (پشت گوێیان خستووە)، كەواتە دەست بە زانستەوە بگرن و خۆتان بپارێزن لە بیدعەكاری، وە خۆتان بپارێزن لە زیادەڕەوی، وە خۆتان بپارێزن لە ڕۆچوون (لەو بابەتانەی پێویست نین)، وە دەست بگرن بە ڕێچكەو ڕێڕەوی سەرەتاوە (كە ڕێچكەی پێغەمبەری خوا ﷺو هاوەڵانە).

١٤٦- «عَن سُلَيمَانَ بنِ يَسَارٍ أَنَّ رَجُلاً يُقَالُ لَهُ صَبِيغٌ قَدِمَ المَدِينَةَ فَجَعَلَ يَسأَلُ عَن مُتَشَابِهِ القُرآنِ، فَأَرسَلَ إِلَيهِ عُمَرُ ﷺ وَقَد أَعَدَّ لَهُ عَرَاجِينَ النَّخلِ، فَقَالَ: مَن أَنتَ؟ قَالَ: أَنَا عَبدُ اللهِ صَبِيغٌ، فَأَخَذَ عُمَرُ عُرجُونًا مِن تِلكَ العَرَاجِينِ، فَضَرَبَهُ وَقَالَ: أَنَا عَبدُ اللهِ عُمَرُ، فَجَعَلَ لَهُ ضَربًا حَتَّى دَمِيَ رَأسُهُ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ المُؤمِنِينَ، حَسبُكَ، قَد ذَهَبَ الَّذِي كُنتُ أَجِدُ فِي رَأسِي»[3].

واتە: سولەیمانی كوڕی یەسار وتویەتی: پیاوێك كە پێیان دەوت: صەبیغ هات بۆ شاری مەدینە و پرسیاری دەربارەی موتەشابیهی قورئان دەكرد (واتە: دەربارەی ئەو ئایەتانەی بۆچوونی جیاواز هەیە

---

(١) ـ أثر رجاله ثقات إلا أنه منقطع.

(٢)ـ أثر إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٣) ـ أثر رجاله ثقات، إلا أنه منقطع.

لە تەفسیرەکەیدا پرسیاری دەکرد، پرسیارەکەشی بۆ فیتنە دروست کردن بوو)، ئیمامی عومەریش ناردی بەدوایداو چەند شوارکێکی دارخورمای بۆ ئامادە کرد، پێی وت: تۆ کێی؟ ئەویش وتی: من بەندەی خوا (صەبیغ)م، (ئیمامی) عومەریش شوارکێک لە شوارکەکانی هەڵگرت و لێیداو وتی: منیش بەندەی خوا عومەرم، جا (ئیمامی) عومەر بەردەوام بە شوارکەکە لێیدا تا سەری بە خوێن داهات، کابرا وتی: ئەی گەورەی ئیمانداران بەسە بە دڵنیایی ئەوەی لەسەر و (مێشکم) دابوو ڕۆیشت (چیتر ئەو کارە دووبارە ناکەمەوەو فیتنە دروست ناکەم).

١٤٧ـ «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَتْ: تَلاَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ مِنْهُ ءَايَـٰتٌ مُّحْكَمَـٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَـٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَـٰبِهَـٰتٌ ﴿٧﴾ ﴾آل عمران، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَاحْذَرُوهُمْ»[١].

واتە: دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەو ئایەتەی) خوێندەوە: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ مِنْهُ ءَايَـٰتٌ مُّحْكَمَـٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَـٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَـٰبِهَـٰتٌ ﴿٧﴾ ﴾آل عمران، واتە: [ئەو خوایەی قورئانی بۆ ناردویەتیە خوارەوە هەندێک ئایەتی ڕوون و ئاشکران، ئا ئەو ئایەتانە بنچینەی قورئانن، وە ئەوانیتریش هەندێ ئایەتن کە ماناکانیان بۆ مرۆڤ زۆر ڕۆشن نیە، جا ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشەو لادەرن دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کە مانایان زۆر ڕوون نیە، بۆ تێکدانی بیروباوەڕی مسوڵمانان]، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەو کەسانەتان بینی کە دوای ئەو بابەت و (ئایەتانە) دەکەون کە مەبەستەکەیان زۆر ڕۆشن نیە و مرۆڤ باش لێیان حاڵی نابێ ئەوە خۆتانیان لێ بپارێزن و وریایان بن.

١٤٨- «عَن شَقِيقٍ قَالَ: سُئِلَ عَبدُ اللهِ عَن شَيءٍ فَقَالَ: إِنِّي لأكرهُ أَن أُحِلَّ لَكَ شَيئًا حَرَّمَهُ اللهُ عَلَيكَ، أَو أُحَرِّمَ مَا أَحَلَّهُ اللهُ لَكَ»[٢].

واتە: شەقیق وتویەتی: پرسیاری شتێک لە عەبدوڵلا کرا، ئەویش وتی: (لەبەر ئەوەی شتەکە ڕوون نیە) من بە حەڕامی دەزانم شتێکت بۆ حەڵاڵ بکەم (بە فەتواکەم) کە خوا حەڕامی کردبێت، یان (شتێکت) لێ حەڕام بکەم (بە فەتواکەم) کە خوا بۆی حەڵاڵ کردبیت.

١٤٩- «عَن حُمَيدِ بنِ عَبدِ الرَّحمَنِ، قَالَ: لإن أَرُدَّهُ بِعِيِّهِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِن أَن أَتَكَلَّفَ لَهُ مَا لاَ أَعلَمُ»[٣].

واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان وتویەتی: (کاتێ کەسێک دێت و پرسیار دەکات دەربارەی بابەتێک کە زانیاریم دەربارەی نیە) پێم خۆشترە بە نەزانیەکەیەوە بیگەڕێنمەوە، نەوەک زۆر لەخۆم بکەم و (فەتوایێکی بۆ بدەم) کە زانستم دەربارەی نەبێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢)ـ أثر إسناده صحيح.

(٣) ـ أثر إسناده حسن.

١٥٠- «عَن نَافِعٍ مَولَى عَبدِ اللهِ، أَنَّ صَبِيغًا العِرَاقِيَّ جَعَلَ يَسأَلُ عَن أَشيَاءَ مِنَ القُرآنِ فِي أَجنَادِ المُسلِمِينَ حَتَّى قَدِمَ مِصرَ، فَبَعَثَ بِهِ عَمرُو بنُ العَاصِ ﷺ إِلَى عُمَرَ بنِ الخَطَّابِ ﷺ فَلَمَّا أَتَاهُ الرَّسُولُ بِالكِتَابِ فَقَرَأَهُ فَقَالَ: أَينَ الرَّجُلُ؟ فَقَالَ: فِي الرَّحلِ، قَالَ عُمَرُ: أَبصِر أَن يكونَ ذَهَبَ فَتُصِيبَكَ مِنِّي بِهِ العُقُوبَةُ المُوجِعَةُ، فَأَتَاهُ بِهِ، فَقَالَ عُمَرُ: تَسأَلُ مُحدَثَةً، فأرسلَ عُمَرُ إِلَى رَطَائِبَ مِن جَرِيدٍ، فَضَرَبَهُ بِهَا حَتَّى تَرَكَ ظَهرَهُ دَبِرَةً، ثُمَّ تَرَكَهُ حَتَّى بَرَأَ، ثُمَّ عَادَ لَهُ، ثُمَّ تَرَكَهُ حَتَّى بَرَأَ، فَدَعَا بِهِ لِيَعُودَ لَهُ، قَالَ: فقالَ صَبِيغٌ: إِن كُنتَ تُرِيدُ قَتلِي، فَاقتُلنِي قَتلاً جَمِيلاً، وَإِن كُنتَ تُرِيدُ أَن تُدَاوِيَنِي، فَقَد وَاللهِ بَرَأتُ، فَأَذِنَ لَهُ إِلَى أَرضِهِ، وَكَتَبَ إِلَى أَبِي مُوسَى الأَشعَرِيِّ ﷺ أَن لاَ يُجَالِسَهُ أَحَدٌ مِنَ المُسلِمِينَ، فَاشتَدَّ ذَلِكَ عَلَى الرَّجُلِ، فَكَتَبَ أَبُو مُوسَى إِلَى عُمَرَ: أَن قَد حَسُنَت تَوبَتُهُ، فَكَتَبَ عُمَرُ: أَنِ ائذَن لِلنَّاسِ بِمُجَالَسَتِهِ»[1].

واتە: نافیع وتویەتی: صەبیغی عێراقی دەستی کرد بە پرسیار کردن دەربارەی شتانێک لە قورئاندا (کە مانایان بۆ مرۆڤ زۆر ڕوون نەبوو) لەناو سەربازانی مسوڵمانان تا گەیشتە میصر، عەمری کوڕی عاصیش ﷺ (بە نێردراوێک) هەواڵەکەی بۆ عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ نارد، جا کاتێک هەواڵدەرەکە هات بۆ لای عومەر ﷺ بە نوسراوەکەوە، عومەریش نوسراوەکەی خوێندەوەو وتی: پیاوەکە لە کوێیە؟ نێردراوەکە وتی: لە ناو قافڵەکەدایە، عومەر وتی: بیدۆزەرەوە، ئەگەر بڕوات و (دەرباز ببێت) ئەوە تووشی سزایەکی بەئێش دەبیت بەهۆی ئەوەوە (سزات دەدەم)، جا (دۆزیەوەو) هێنای بۆ لای عومەر، عومەر وتی: ئەوە پرسیاری داهێنراو دەکەی؟! جا عومەر ناردی تا چەند شوارکە ڕوتابی تەڕی بۆ بێنن و بە شوارکەکان لێیدا تا پشتی برینی تێکەوت، دواتر وازی لێ هێنا تا چاک بوویەوە، دواتر گەڕایەوە بۆ لای و (لێیدایەوە) دواتر وازی لێ هێنا تا چاک بوویەوە، دواتر بانگی کرد بیهێنن تا دیسان لێیبداتەوە، صەبیغ وتی: ئەگەر دەتەوێ بمکوژی ئەوە بە شێوازێکی جوان بمکوژە (بە یەکجاری)، ئەگەر دەشتەوێ تیمارم بکەی ئەوە سوێند بە خوا من چاک بومەتەوە (پێویست بە تۆ ناکات)، عومەریش ڕێگای پێدا بگەڕێتەوە شوێن و مەملەکەتی خۆی و بۆ ئەبو مووسای ئەشعەریشی ﷺ نوسی با کەس لە مسوڵمانان لەگەڵی دانەنیشێ، ئەوەش زۆر سەخت بوو لەسەر پیاوەکە (صەبیغ)، ئەبو موساش بۆ (ئیمامی) عومەری نووسی: (صەبیغ) تەوبەیەکی جوانی کردوە، (ئیمامی) عومەریش بۆ ئەبو مووسای نووسی: (کەواتە) ڕێگا بدە بە مسوڵمانان کە لەگەڵی دابنیشن.

١٥١- «عن عَامِرٍ يَقُولُ: استَفتَى رَجُلٌ أُبَيَّ بنَ كَعبٍ ﷺ، فَقَالَ: يَا أَبا المُنذِرِ، مَا تَقُولُ فِي كَذَا وَكَذَا؟ قَالَ: يَا بُنَيَّ، أَكَانَ الَّذِي سَأَلتَنِي عَنهُ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: أَمَّا لاَ، فَأَجِّلنِي حَتَّى يَكُونَ، فَنُعَالِجَ أَنفُسَنَا حَتَّى نُخبِرَكَ»[2].

واتە: عامیر وتویەتی: پیاوێک داوای فەتوای لە ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ کردو وتی: ئەی ئەبو مونذیر (ئوبەی کوڕی کەعب) چی دەڵێی دەربارەی ئەم شتەو ئەم شتە؟ ئوبەی وتی: ئەی کوڕە بچکۆلەکەم ئایا ئەو شتەی پرسیارم دەربارە لێ دەکەیت ڕوویداوە؟ وتی: نەخێر، ئوبەی وتی: مادەم نەخێر (ڕووینەداوە)

---

(١) ـ أثر إسناده ضعيف.

(٢)ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

کەواتە مۆڵەتم بدە تا ڕوودەدات، تاوەکو خۆمان ماندوو بکەین (بۆ دۆزینەوەی وەڵامێکی ڕاست) تا پێت ڕابگەیەنین (بە ڕاست و دروستی).

**١٥٢- «عن مَسرُوقٍ قَالَ: كُنتُ أَمشِي مَعَ أُبَيِّ بنِ كَعبٍ ﷺ فَقَالَ فَتًى: مَا تَقُولُ يَا عَمَّاهُ كَذَا وَكَذَا؟ قَالَ: يَا ابنَ أَخِي، أَكَانَ هَذَا؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَأَعفِنَا حَتَّى يَكُونَ»[١].**

واتە: مەسروق وتویەتی: لەگەڵ ئوبەی کوڕی کەعب دەڕۆیشتم گەنجێک وتی: ئەی مامە چی دەڵێی دەربارەی ئەم شتەو ئەم شتە؟ ئوبەی وتی: ئەی ئامۆزا ئایا ئەو شتە ڕوویداوە (کە پرسیاری دەربارە دەکەیت)؟ وتی: نەخێر، ئوبەی وتی: وازمان لێ بێنە تا ڕوودەدات.

**١٥٣- «عَنِ الأَعمَشِ قَالَ: كَانَ إِبرَاهِيمُ إِذَا سُئِلَ عَن شَيءٍ لَم يُجِب فِيهِ إلاَّ جَوَابَ الَّذِي سُئِلَ عَنهُ»[٢].**

واتە: ئەعمەش وتویەتی: هەموو جار ئیبراهیم ئەگەر پرسیاری شتێکی لێ بکرایە وەڵامی هیچی تیادا نەدەدایەوە تەنها وەڵامی ئەو (ڕوانگە و لایەنە نەبێت) کە پرسیاری تیادا کراوە (واتە: لە چوارچێوەی پرسیارەکە دەرنەدەچوو نەوەک تووشی زۆر فەتوادان بێت).

**١٥٤- «عَن مُحَمَّدِ بنِ سِيرِينَ: أَنَّهُ كَانَه لاَ يُفتِي فِي الفَرجِ بِشَيءٍ فِيهِ اختِلاَفٌ»[٣].**

واتە: موحەممەدی کوڕی سیرین (باسی خۆی کردوە)، وتویەتی: فەتوای نەداوە دەربارەی هیچ (مەسەلەیەکی) حەیاو بابەتی تەڵاق و (ئەو جۆرە بابەتانە) کە ڕا جیایی تیادا بوبێت (چونکە ترساوە بە هۆی فەتواکەی ئافرەتێک حەڕام بکات لەسەر پیاوێک کە لێی حەڕام نەبێت، یان بە پێچەوانەوە بۆی حەڵاڵ بکات کە حەڵاڵ نەبێت).

**١٥٥- «حَدَّثَنَا الصَّلتُ بنُ رَاشِدٍ، قَالَ: سَأَلتُ طَاوُسًا عَن مَسأَلَةٍ فَقَالَ لِي: كَانَ هَذَا؟، قُلتُ: نَعم، قَالَ: اللهِ- قُلتُ اللهِ- ثُمَّ قَالَ: إِنَّ أَصحَابَنَا أَخبَرُونَا عَن مُعَاذِ بنِ جَبَلٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُ، أَنَّهُ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ لاَ تَعجَلُوا بِالبَلاَءِ قَبلَ نُزُولِهِ، فَيُذهَبُ بِكُم هَاهُنَا وَهَاهُنَا، فَإِنَّكُم إِن لَم تَعجَلُوا بِالبَلاَءِ قَبلَ نُزُولِهِ، لَم يَنفَكَّ المُسلِمُونَ أَن يَكُونَ فِيهِم مَن إِذَا سُئِلَ، سُدِّدَ، وَإِذَا قَالَ، وُفِّقَ»[٤].**

واتە: صەڵتی کوڕی ڕاشید دەڵێ: پرسیارم لە تاووس کرد دەربارەی بابەتێک، ئەویش پێی وتم: ڕوویداوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: خوا دەکەی بە شاهێد؟ وتم: خوا دەکەم بە شاهێد، دواتر وتی: زاناکانمان هەواڵیان پێداوین کە موعازی کوڕی جەبەل وتویەتی: ئەی خەڵکینە پەلە مەکەن بۆ ڕوودانی بەڵاو ئاشوب و (پرسیار کردن دەربارەی) پێش ئەوەی ڕووبدات، چونکە لێرەو لەوێ بەلاڕێتان دادەبەن (بە فەتوای

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

خراپی جۆراو جۆر)، جا ئەگەر ئێوە پەلە نەکەن بۆ بەڵا پێش ئەوەی ڕووبدات، ئەوە بە بەردەوامی مسوڵمانان کەسانێکیان تیادا هەیە ئەگەر پرسیاریان لێ بکرێت (دەربارەی ئەو بابەتانە) ئەوە ڕاستی دەپێکن، وە ئەگەر قسە بکەن مۆفەق دەبن و (خوا ڕاستیان دەخاتە سەر زمانیان).

**١٥٦-** «عن عمرو بن ميمون عن أبيه، عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، سَأَلْتُهُ عَن رَجُلٍ أَدرَكَهُ رَمَضَانَانِ، فَقَالَ: أَكَانَ أَو لَم يَكُن؟ قَالَ: لَم يَكُن بَعدُ، قَالَ: اترُك بلَيَّتَهُ حَتَّى تَنزِلَ، قَالَ: فَدلَسنَا لَهُ رَجُلاً، فَقَالَ: قَد كَانَ، فَقَالَ: يُطعِمُ عَنِ الأَوَّلِ مِنهُمَا ثَلاَثِينَ مِسكِينًا، لِكُلِّ يَومٍ مِسكِينٌ»[١].

واتە: باوکی عەمرِ وتویەتی: پرسیارم لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، کرد دەربارەی پیاوێک دوو ڕەمەزانی گەیشتۆتێ (واتە: گەیشتۆتە ڕەمەزانی دووەم هێشتا ڕەمەزانی یەکەمی نەگرتۆتەوە کە لێی فەوتاوە، ئایا چی دەکات)؟ ئەویش وتی: ئایا ڕوویداوە یان ڕووینەداوە؟ وتی: تا ئێستا ڕووینەداوە، ئیبنو عەبباس وتی: واز لە بەڵا بێنە تا ڕوودەدات.

جا وتی: (ماوەیەکی تر) پیاوێکمان نارد (تا هەمان پرسیاری لێ بکات و (پیاوەکە) وتی: ڕوویداوە (بابەتەکە ڕوویدابوو)، (ئنجا ئیبنو عەبباس فەتوای بۆداو) وتی: لەجیاتی ڕەمەزانی یەکەم لەو دوو ڕەمەزانانە (کە تاخیری کردووە و نەیگرتۆتەوە تا گەیشتووە بە ڕەمەزانی دووەم، جگە لەوەی دەبێ ڕۆژووەکان بگرێتەوە) دەبێ سی (٣٠) هەژار نان بدات، بۆ هەر ڕۆژێک هەژارێک.

**١٥٧-** «عَن عُبَيدِ بنِ جُرَيجٍ، قَالَ: كُنتُ أَجلِسُ بِمَكَّةَ إِلَى ابنِ عُمَرَ ﷺ، يَومًا، وَإِلَى ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا يَومًا، فَمَا يَقُولُ ابنُ عُمَرَ فِيمَا يُسأَلُ: لاَ عِلمَ لِي، أَكثَرُ مِمَّا يُفتِي بِهِ»[٢].

واتە: عوبەیدی کوڕی جوڕەیج وتویەتی: من لە مەککە ڕۆژێک لەلای ئیبنو عومەر دادەنیشتم، ڕۆژێکیش لەلای ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، دادەنیشتم، جا ئەوەی ئیبنو عومەر پرسیاری دەربارە لێ دەکراو دەیوت: نازانم زیاتر بوو لەوەی فەتوای بۆ دەدا.

**١٥٨-** «قَالَ عَبدُ اللهِ: تَعَلَّمُوا، فَإِنَّ أَحَدَكُم لاَ يَدرِي مَتَى يُختَلَفُ إِلَيهِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ وتویەتی: خۆتان فێر بکەن، چونکە کەسێک لە ئێوە نازانێت کەی (خەڵکی) جیاوازیەکەی دێنێتە لای (تا بۆیان یەکلایی بکاتەوە، کەواتە ڕۆژێک هەیە خەڵک کاریان بە زانستەکەی ئەو دەبێت).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢)ـ إساده حسن.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: فەتوادان و ئەو گرانی و سەغڵەتیانەی تیایەتی

**١٥٩- «عَن عُبَيدِ اللهِ بنِ أَبِي جَعفَرٍ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَجرَؤُكُم عَلَى الفُتيَا، أَجرَؤُكُم عَلَى النَّارِ»[١].**

واتە: عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبو جەعفەر ﵁ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بوێرترینتان بۆ فەتوادان بە بوێرترینتانە لەسەر ئاگر (واتە: ئەوەی زۆر فەتوا بدات ئەگەری زیاتری هەیە بچێتە ناو ئاگر).

**١٦٠- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما قَالَ: مَن أَحدَثَ رَأيًا لَيسَ فِي كِتَابِ اللهِ، وَلَم تَمضِ بِهِ سُنَّةٌ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، لَم يَدرِ عَلَى مَا هُوَ مِنهُ، إِذَا لَقِيَ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ»[٢].**

واتە: ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُما)، وتویەتی: هەرکەسێک بۆچوونێک دروست بکات کە لە پەرتوکی خوادا، نەبێ و هیچ سوننەتێکی پێغەمبەری خواشی ﷺ لەسەر نەهاتبێ، ئەوە نازانێت لەسەر چیە کاتێ دەگات بە خوای زاڵی پایەدار.

**١٦١- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، مَن أُفتِيَ بِفُتيَا من غَيرِ ثَبتٍ، فَإِنَّمَا إِثمُهُ عَلَى مِن أَفتَاهُ»[٣].**

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک فەتوایێکی پێ بدرێت بێ ئەوەی شارەزا بێت لە فەتوادان، ئەوە تاوانەکەی لە ئەستۆی ئەو کەسەیە کە فەتواکە دەدات.

**١٦٢- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ ﵁، قَالَ: مَن أَفتَى بِفُتيَا يُعَمَّى عنهَا، فَإِثمُهَا عَلَيهِ»[٤].**

واتە: ئیبنو عەبباس ﵁ وتویەتی: هەر کەسێک فەتوایێک بدات و بەرچاو ڕوون نەبێت و زانستی دەربارە نەبێت و بە کوێری بیدات، ئەوە تاوانەکەی لە ئەستۆی خۆیەتی (نەوەک لە ئەستۆی پرسیارکەرەکە).

**١٦٣- «حَدَّثَنَا مَيمُونُ بنُ مِهرَانَ، قَالَ: كَانَ أَبُو بَكرٍ ﵁، إِذَا وَرَدَ عَلَيهِ الخَصمُ نَظَرَ فِي كِتَابِ اللهِ، فَإِن وَجَدَ فِيهِ مَا يَقضِي بَينَهُم، قَضَى بِهِ، وَإِن لَم يَكُن فِي الكِتَابِ، وَعَلِمَ مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي ذَلِكَ الأَمرِ سُنَّةً، قَضَى بِهِ، فَإِن أَعيَاهُ، خَرَجَ فَسَأَلَ المُسلِمِينَ وَقَالَ: أَتَانِي كَذَا وَكَذَا، فَهَل عَلِمتُم أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَضَى فِي ذَلِكَ بِقَضَاءٍ؟ فَرُبَّمَا اجتَمَعَ إِلَيهِ النَّفَرُ كُلُّهُم يَذكُرُ مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ فِيهِ قَضَاءً فَيَقُولُ أَبُو بَكرٍ: الحَمدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِينَا مَن يَحفَظُ عَلَى نَبِيِّنَا ﷺ، فَإِن أَعيَاهُ أَن يَجِدَ فِيهِ سُنَّةً مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ، جَمَعَ رُءُوسَ النَّاسِ وَخِيَارَهُم فَاستَشَارَهُم، فَإِذَا اجتَمَعَ رَأيُهُم عَلَى أَمرٍ، قَضَى بِهِ»[٥].**

---

(١) ـ إسناده معضل.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣)ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥)ـ رجاله ثقات، غير أن الإسناد منقطع.

واتە: مەیمونی کوڕی میهران وتویەتی: ئەبو بەکر ﷺ، ئەگەر ناکۆکیەکی هاتبایەلا، ئەوە سەیری قورئانی دەکرد ئەگەر تیایدا شتێکی دەست کەوتایە (کە کێشەکەیان چارە بکات) ئەوە بڕیاری پێ دەدا، وە ئەگەر لە قورئاندا نەبووایە و بیزانیایە لەو بابەتە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، ئەوە بڕیاری پێ دەدا، ئەگەر (ئەوەشی) دەست نەکەوتایە، دەردەچوو و پرسیاری لە مسوڵمانان دەکردو دەیوت: ئەم بابەتە و ئەم بابەتەم هاتۆتەلا، جا ئایا هیچتان زانیوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دادوەری کردبێت و، دەربارەی ئەو شتە بڕیاری دابێت؟ جا جاری وا هەبوو چەندین کەس کۆدەبوونەوە لەلای و هەموویان یەک بڕیاریان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕایەوە، ئەبوبەکریش دەیوت: سوپاس بۆ ئەو خوایەی لەناو ئێمە کەسانێکی داناوە کە شت و کاروباری لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەبەر کردووەو لەیادی ماوە، جا ئەگەر نەیتوانیبێ شتێکی دەست بکەوێ لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کات سەرکردەو پیاو ماقوڵان و زانایانی کۆدەکردەوەو پرسی پێ دەکردن، جا ئەگەر لەسەر بڕیارێک کۆک بوونایە ئەوە بەو بڕیارە حوکمی دەکرد.

**١٦٤- «عَن أَبِي سُهَيلٍ، قَالَ: كَانَ عَلَى امرَأَتِي اعتِكَافُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ فِي المَسجِدِ الحَرَامِ، فَسَأَلتُ عُمَرَ بنَ عَبدِ العَزِيزِ، وَعِندَهُ ابنُ شِهَابٍ، قَالَ: قُلتُ عَلَيهَا صِيَامٌ- قَالَ ابنُ شِهَابٍ: لاَ يَكُونُ اعتِكَافٌ إلاَّ بِصِيَامٍ- فَقَالَ لَهُ عُمَرُ بنُ عَبدِ العَزِيزِ: أَعَنِ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَعَن أَبِي بَكرٍ؟ قَالَ: لاَ؟ قَالَ: فَعَن عُمَرَ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَعَن عُثمَانَ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ عُمَرُ: مَا أَرَى عَلَيهَا صِيَامًا فَخَرَجتُ فَوَجَدتُ طَاوُسًا وَعَطَاءَ بنَ أَبِي رَبَاحٍ، فَسَأَلتُهُمَا، فَقَالَ طَاوُسٌ: كَانَ ابنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، لاَ يَرَى عَلَيهَا صِيَامًا إلاَّ أَن تَجعَلَهُ عَلَى نَفسِهَا، قَالَ: وَقَالَ عَطَاءٌ: ذَلِكَ رَأيِي»[1].**

واتە: ئەبو سوهەیل وتویەتی: خێزانەکەم سێ ڕۆژ ئیعتیکافی لەسەر بوو (لەسەر خۆی کردبوو بە نەزر) لە مزگەوتی حەڕام لە مەککە، جا پرسیارم لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کرد، ئەو کات ئیبنو شیهابی لەلابوو: ئیبنو شیهاب وتی: من دەڵێم (خێزانەکەت) ڕۆژوی کەوتۆتە سەر، ئیبنو شیهاب وتی: چونکە ئیعتیکاف بەبێ ڕۆژوو نابێ، عومەری کوڕی عەبدول عەزیزیش وتی: ئایا ئەو فەتوایە لە پێغەمبەری خواوەیە ﷺ؟ وتی: نەخێر، وتی: کەواتە لە ئەبوبەکرەوەیە؟ وتی: نەخێر، وتی: کەواتە لە عومەرەوەیە؟ وتی: نەخێر، وتی: کەواتە لە عوسمانەوەیە؟ وتی: نەخێر.

عومەری کوڕی عەبدول عەزیز وتی: پێم وانیە ڕۆژووی لەسەر بێت، جا ئەبو سوهەیل دەڵێ: منیش ڕۆیشتم گەیشتم بە طاووس و عەطائی کوڕی ئەبی ڕەباح و پرسیارم لێ کردن، طاووس وتی: ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، پێی وانەبووە ڕۆژووی بکەوێتە سەر (بەهۆی ئیعتیکافەوە) تەنها لەو کاتە نەبێت کە خۆی ڕۆژووەکەش نەزر بکات لەسەر خۆی، ئەبو سوهەیل دەڵێ: عەطائیش وتی: ئەوە بۆچوونی منە (واتە: منیش بەو فەتوایەی ئیبنو عەبباس فەتوا دەدەم).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

١٦٥- «عَن أَبِي نَضرَةَ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ أَبُو سَلَمَةَ البَصرَةَ، أَتَيتُهُ أَنَا وَالحَسَنُ فَقَالَ لِلحَسَنِ: أَنتَ الحَسَنُ؟ مَا كَانَ أَحَدٌ بِالبَصرَةِ أَحَبَّ إِلَيَّ لِقَاءً مِنكَ، وَذَلِكَ أَنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ تُفتِي بِرَأيِكَ، فَلاَ تُفتِ بِرَأيِكَ إِلاَّ أَن تَكُونَ سُنَّةٌ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ أَو كِتَابٌ مُنزَلٌ»[١].

واتە: ئەبو نەضرە وتویەتی: کاتێک ئەبو سەلەمە هاتە بەصرە من و حەسەن چووین بۆ لای، بە حەسەنی وت: تۆ حەسەنی؟ کەس نیە لە بەصرەدا لە من زیاتر پێی خۆشتر بێت بە تۆ بگات، لەبەر ئەوەی من پێم گەیشتووە کە تۆ فەتوا دەدەی بە بۆچوونی خۆت، (ئامۆژگاریت دەکەم) نەکەی فەتوا بدەی بە بۆچوونی خۆت، تەنها ئەگەر فەرموودەیەک هەبوو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ یان (بابەتەکە) قورئانی بۆ دابەزی بێت (واتە: لە قورئاندا باس کرابێت).

١٦٦- «عَن جَابِرِ بنِ زَيدٍ، أَنَّ ابنَ عُمَرَ لَقِيَهُ فِي الطَّوَافِ فَقَالَ لَهُ: يَا أَبا الشَّعثَاءِ إِنَّكَ مِن فُقَهَاءِ البَصرَةِ فَلاَ تُفتِ إِلاَّ بِقُرآنٍ نَاطِقٍ، أَو سُنَّةٍ مَاضِيَةٍ، فَإِنَّكَ إِن فَعَلتَ غَيرَ ذَلِكَ، هَلَكتَ وَأَهلَكتَ»[٢].

واتە: جابری کوڕی زەید وتویەتی: ئیبنو عومەر لە تەوافدا پێی گەیشتووە و پێی وتووە: ئەی ئەبو شەعثاء (واتە: ئەی جابری کوڕی زەید) تۆ یەکێکی لە زانایانی شەریعەت لە بەصرە، نەکەی فەتوا بدەی تەنها بە قورئانی وتەی هەق، یان بە سوننەتی پێشینە نەبێت (کە سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ)، جا ئەگەر تۆ بە جگە لەوە جوڵایتەوە، ئەوە لەناو چووی و بوویتە لەناوبەریش (واتە: هەم خۆت لەناو دەچیت و، هەم خەڵکیش لەناو دەبەیت بە فەتواکانت).

١٦٧- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ مَسعُودٍ ﷺ، قَالَ: أَتَى عَلَينَا زَمَانٌ لَسنَا نَقضِي وَلَسنَا هُنَالِكَ، وَإِنَّ اللهَ قَد قَدَّرَ مِنَ الأَمرِ أَن قَد بَلَغنَا مَا تَرَونَ، فَمَن عَرَضَ لَهُ قَضَاءٌ بَعدَ اليَومِ، فَليَقضِ فِيهِ بِمَا فِي كِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ فَإِن جَاءَهُ مَا لَيسَ فِي كِتَابِ اللهِ، فَليَقضِ بِمَا قَضَى بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَإِن جَاءَهُ مَا لَيسَ فِي كِتَابِ اللهِ، وَلَم يَقضِ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَليَقضِ بِمَا قَضَى بِهِ الصَّالِحُونَ، وَلاَ يَقُل إِنِّي أَخَافُ، وَإِنِّي أُرَى، فَإِنَّ الحَرَامَ بَيِّنٌ، وَالحَلاَلَ بَيِّنٌ، وَبَينَ ذَلِكَ أُمُورٌ مُشتَبِهَةٌ، فَدَع مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لاَ يَرِيبُكَ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ وتویەتی: کاتێکی (زۆرمان) بەسەردا تێپەڕی بڕیارو فەتوامان نەداو لەوێ نەبووین و (خەڵک هێندە پێویستی بە ئێمە نەبوو و پرسیاری نەدەکرد، چونکە هاوەڵەکان زۆریان شتەکانیان دەزانی و لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فێربووبوون)، (بەڵام) خوای پەروەردگار قەدەری وابوو ئەوەمان گەیشتێ کە دەیبینن (واتە: گەیشتین بە زەمانێک کە جۆرەها خەڵک و بابەت دروست بووە و پرسیاری زۆر دەکرێت)، بۆیە هەر کەسێک دادوەرییەکی هات بۆلا لەمڕۆ بەدواوە، ئەوە با بڕیار بدات تیایدا بەو شتەی لە پەرتوکی خوا (لە قورئاندا) باس کراوە، جا ئەگەر شتێکو (بابەتێکی) هاتەلا کە لە پەرتوکی خوا نەبوو و باس نەکرابوو با بڕیار بدات بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری پێ داوە، جا ئەگەر

---

(١) ـ رجاله ثقات.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده حسن.

شتێک و (بابەتێکی) هاتەلا کە لە پەرتوکی خوا نەبوو و پێغەمبەری خواش ﷺ بڕیاری پێ نەدابوو، با بڕیار بەوە بدات کە صالیحەکان (ئەهلی ئیجماع و زانایانی لەخوا ترس) بڕیاری پێ دەدەن، با نەڵێت دەترسم (لەبڕیاردان)، چونکە بەدڵنیایی حەڕام ڕوونەو حەڵاڵیش ڕوونەو لەو نێوانەدا شتانێکی گوماناوی هەن، بۆیە واز لەوە بێنە کە گومانت لێی هەیە، ئەوە وەرگرە کە گومانت لێی نیە.

١٦٨- «عَن عُبَيدِ اللهِ بنِ أَبِي يَزِيدَ، قَالَ: كَانَ ابنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، إِذَا سُئِلَ عَنِ الأَمرِ فَكَانَ فِي القُرآنِ، أَخبَرَ بِهِ، وَإِن لَم يَكُن فِي القُرآنِ وَكَانَ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَخبَرَ بِهِ، فَإِن لَم يَكُن، فَعَن أَبِي بَكرٍ وَعُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا: فَإِن لَم يَكُن، قَالَ فِيهِ بِرَأيِهِ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو یەزید وتویەتی: هەموو جار ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، ئەگەر پرسیاری دەربارەی بابەتێک لێ بکرایەو لە قوڕئاندا هەبوایە ئەوەی دەوت و (فەتوای پێ دەدا)، ئەگەر لە قوڕئانیشدا نەبووایە، (بەڵام) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (بڕیارێک هەبوایە) ئەوە هەواڵی بەوە دەداو (فەتوای پێ دەدا)، جا ئەگەر (لە قوڕئان و فەرموودەدا) نەبووایە ئەوە (لە بڕیارەکانی) ئەبوبەکرو عومەر وەری دەگرت و (فەتوای پێ دەدا)، جا ئەگەر (لە هیچێک لەمانە نەبوایە) ئەوە بە بۆچوونی خۆی بڕیاری دەدا.

١٦٩- «عَن شُرَيحٍ، أَنَّ عُمَرَ بنَ الخَطَّابِ كَتَبَ إِلَيهِ: إِن جَاءَكَ شَيءٌ فِي كِتَابِ اللهِ، فَاقضِ بِهِ وَلاَ تَلفِتكَ عَنهُ الرِّجَالُ، فَإِن جَاءَكَ مَا لَيسَ فِي كِتَابِ اللهِ فَانظُر سُنَّةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَاقضِ بِهَا، فَإِن جَاءَكَ مَا لَيسَ فِي كِتَابِ اللهِ وَلَم يَكُن فِيهِ سُنَّةٌ مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَانظُر مَا اجتَمَعَ عَلَيهِ النَّاسُ فَخُذ بِهِ، فَإِن جَاءَكَ مَا لَيسَ فِي كِتَابِ اللهِ وَلَم يَكُن فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَلَم يَتَكَلَّم فِيهِ أَحَدٌ قَبلَكَ- فَاختَر أَيَّ الأَمرَينِ شِئتَ: إِن شِئتَ أَن تَجتَهِدَ برأيكَ ثُمَّ تَقَدَّمَ فَتَقَدَّم، وَإِن شِئتَ أَن تتأخَّرَ، فَتَأَخَّر، وَلاَ أَرَى التَّأَخُّرَ إلاَّ خَيراً لَكَ»[2].

واتە: شورەیح (کە قازی بووە)، وتویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب بۆی نوسیوە (واتە: بۆ شورەیحی نوسیوە): ئەگەر شتێک و (بابەتێکت) هات بۆلا کە لە قوڕئاندا هەبوو ئەوە بڕیار بەوە بدەو، نەکەی (بۆچوونی) خەڵکی سەرنجت ڕابکێشێت (کە لەگەڵ قوڕئان تێک نەکاتەوە)، جا ئەگەر شتێک و (بابەتێکت) هات بۆلا کە لە پەرتوکی خوا نەبوو، ئەوە سەیری فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەو بڕیاریان پێ بدە، جا ئەگەر شتێکت هات بۆلا کە لە پەرتوکی خواو سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ نەبوو، ئەوە سەیری ئەوە بکە کە خەڵکی (زانا) لەسەری کۆکن و ئەوە وەرگرە و (فەتوای پێ بدە)، جا ئەگەر شتێکت هات بۆلا کە نە لە پەرتوکی خواو نە لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بوونی نەبوو و، نە کەسیش پێش تۆ قسەی لەسەر کردبوو، ئەوە یەکێک لەو دوو بڕیارانە وەرگرە بە دڵی خۆت: ئەگەر حەزت کرد ئیجتیهاد بکەیت بە بۆچوونی خۆت وەڵام بدەیتەوە و دواتر کارەکە بە ئەنجام بگەیەنی ئەوە بە ئەنجامی بگەیەنە (فەتواکە بدە)، ئەگەر دەشتەوێ پاشەکشە بکەیت و (فەتوا نەدەی) ئەوە

---

(١)ـ إسناده صحيح.

(٢)ـ إسناده حسن.

پاشەکشە بکە و (فەتوا مەدە)، جا من پێم وانیە پاشەکشە کردن (لە فەتوادان) هیچی تیابێت جگە لە خێر و چاکە بۆت[١].

١٧٠- «عَن مُعَاذٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا بَعَثَهُ إِلَى اليَمَنِ قَالَ: أَرَأَيتَ إِن عَرَضَ لَكَ قَضَاءٌ كَيفَ تَقضِي؟ قَالَ: أَقضِي بِكِتَابِ اللهِ، قَالَ: فَإِن لَم يَكُن فِي كِتَابِ اللهِ؟ قَالَ: فَبِسُنَّةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: فَإِن لَم يَكُن فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ؟ قَالَ: أَجتَهِدُ رَأيِي وَلاَ آلُو قَالَ: فَضَرَبَ صَدرَهُ ثُمَّ قَالَ: الحَمدُ لِلَّهِ الَّذِي وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ اللهِ لِمَا يُرضِي رَسُولَ اللهِ»[٢].

واتە: موعاذ ﷺ وتویەتی: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ ناردوویەتی بۆ یەمەن پێی وتووە: ئایا پێت وایە ئەگەر (پرسیارێک یان بابەتێک)و دادوەرییەک هات بۆلات چۆن بڕیار دەدەیت؟ موعاذ وتی: بڕیار بە پەرتوکی خوا دەدەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی ئەگەر (بابەتەکە) لە پەرتوکی خوا نەبوو؟ موعاذ وتی: کەواتە بە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیار دەدەم، پێغەمبەری خوا فەرمووی: ئەی ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوو؟ موعاذ وتی: ئیجتیهاد دەکەم بە بۆچوونی خۆم و کەمتەرخەمی ناکەم و (بەوە بڕیار دەدەم)، موعاذ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سینگیداو فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تەوفیق و ڕێنمویی نێردراوی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد بۆ ئەو شتەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی دەکات و بەدڵیەتی.

١٧١- «أَنَّ عَبدَ اللهِ ﷺ، قَالَ: قَد أَتَى عَلَينَا زَمَانٌ وَمَا نُسأَلُ، وَمَا نَحنُ هُنَاكَ، وَإِنَّ اللهَ قَدَّرَ أَن بَلَغتُ مَا تَرَونَ فَإِذَا سُئِلتُم عَن شَيءٍ، فَانظُرُوا فِي كِتَابِ اللهِ، فَإِن لَم تَجِدُوهُ فِي كِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ فَفِي سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ، فَإِن لَم تَجِدُوهُ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ، فَمَا أَجمَعَ عَلَيهِ المُسلِمُونَ، فَإِن لَم يَكُن فِيمَا أَجمَعَ عَلَيهِ المُسلِمُونَ، فَاجتَهِد رَأيَكَ، وَلاَ تَقُل: إِنِّي أَخَافُ وَأَخشَى، فَإِنَّ الحَلاَلَ بَيِّنٌ، وَالحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَينَ ذَلِكَ أُمُورٌ مُشتَبِهَةٌ، فَدَع مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لاَ يَرِيبُكَ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ وتویەتی: کاتێکی (زۆرمان) بەسەردا تێپەڕی بڕیارو فەتوامان نەداو لەوێ نەبووین و (خەڵک هەێندە پێویستی بە ئێمە نەبوو و پرسیاری نەدەکرد، چونکە هاوەڵەکان زۆریان شتەکانیان دەزانی و لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فێربوبوون)، (بەڵام) خوا قەدەری وابوو گەیشتم بەوەی کە دەیبینن (واتە: گەیشتم بە زەمانێک کە جۆرەها خەڵک و بابەت دروست بووەو پرسیاری زۆر دەکرێت)، بۆیە ئەگەر پرسیارێکتان لێکرا دەربارەی شتێک سەیری پەرتوکی خوا بکەن و (بڕیار بەو بدەن)، جا ئەگەر دەستتان نەکەوت لە پەرتوکی خوا ئەوە سەیری سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن و (بڕیار بەو بدەن)، جا ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستتان

---

(١) واتە: فەتوا نەدان چاکترە، چونکە فەتوادان مەسئولیەتی گەورەیەو ڕەنگە مرۆڤ فێری فەتوادانی زۆر بێت و ترسی بشکێ لە فەتوادان و بکەوێتە هەڵەی زۆر).

(٢) ـ إسناده ضعيف، لانقطاعه.

(٣) ـ إسناده حسن.

نەكەوت كەواتە بڕیار بەوە بدەن كە كۆدەنگی مسوڵمانانی لەسەرە (واتە كۆدەنگی زانایانی ئیسلام)، جا ئەگەر (بابەتەكە) لەوانە نەبوو كە كۆدەنگی مسوڵمانانی لەسەر بێت، ئەوە بە بۆچوونی خۆت ئیجتیهاد بكە و مەڵێ دەترسم (ئەگەر ئەهلی ئیجتیهاد بووی)، چونكە بەدڵنیایی حەرام ڕوونەو حەڵاڵیش ڕوونەو لەو نێوانەدا شتانێكی گوماناوی هەن بۆیە واز لەوە بێنە كە گومانت لێی هەیەو، ئەوە وەرگرە كە گومانت لێی نیە.

١٧٢- «حَدَّثَنَا يَحيَى بنُ حَمَّادٍ، عَن أَبِي عَوَانَةَ، عَن سُلَيمَانَ، عَن عُمَارَةَ بنِ عُمَيرٍ، عَن عَبدِ الرَّحمَنِ بنِ يَزِيدَ، عَن عَبدِ اللهِ ﷺ نَحوَهُ»[١].

١٧٣- «أَخبَرَنَا عَبدُ اللهِ بنُ مُحَمَّدٍ، حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الأَعمَشِ، عَنِ القَاسِمِ بنِ عَبدِ الرَّحمَنِ، عَن أَبِيهِ، عَن عَبدِ اللهِ ﷺ بِنَحوِهِ»[٢].

واتە: لەم دوو ڕێگایەش هەمان فەرموودە لە عەبدوڵڵا ﷺ گێردراوەتەوە.

١٧٤- «حَدَّثَنَا الأَعمَشُ، قَالَ: قَالَ عَبدُ اللهِ ﷺ: أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُم سَتُحدِثُونَ وَيُحدَثُ لَكُم، فَإِذَا رَأَيتُم مُحدَثَةً، فَعَلَيكُم بالأَمرِ الأَوَّلِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ وتویەتی: ئەی خەڵكینە بە دڵنیایی ئێوە شتانێك لە ئاین زیاد دەكەن و بۆتان زیاد دەكرێ (واتە: تووشی داهێنان دەبن)، كەواتە ئەگەر بیدعەیەك و زیادكراوێكتان بینی ئەوە دەست بە سەرەتای ئیسلامەتیەوە بگرن (واتە: دەست بە ئیسلامەتی سەردەمی پێغەمبەری خواوە ﷺ بگرن و دوای ئەو بیدعەكاریە مەكەون).

١٧٥- «عَن مُحَمَّدٍ قَالَ: قَالَ عُمَرُ لِابنِ مَسعُودٍ ﷺ: أَلَم أُنبَّأْ أَو أُنبِئتُ أَنَّكَ تُفتِي وَلَستَ بِأَمِيرٍ؟ وَلِّ حَارَّهَا مَن تَوَلَّى قَارَّهَا»[٤].

واتە: موحەممەد وتویەتی: عومەر بە ئیبنو مەسعودی ﷺ وت: مەگەر پێم نەگەیشتووە كە تۆ فەتوا دەدەیت لە كاتێكدا حاكم و ئەمیر نیت (چونكە ئەمیر دەبێ زانا بێت و خۆی فەتوا بدات و فەتوا كاری ئەوە، تۆش ڕاستە زانای بەڵام ئەو ئەمیر و حاكمە نیت) گەرمی و توندی و خراپەی (فەتوادان) بدە بەو كەسەی كە خێرو ئاسانكاری و فێنكایەتی لەلایە (كە وەلی ئەمرو حاكم و ئەمیری دادپەروەر و زانایە).

سەرنجێك: لەم فەرموودەیە دەردەكەوێت كە ناكرێت هەر كەسێك بێت و لەخۆیەوە فەتوا بدات (تاوەكو وەك ئەم سەردەمەی ئێمە خەڵك سەری لێ نەشێوێت)، بۆیە دەبێ فەتوادانیش قانونی

---

(١)ـ إسناده صحيح.

(٢)ـ إسناده صحيح.

(٣)ـ إسناده صحيح.

(٤)ـ إسناده ضعيف.

هەبێت، قانونەکەش ئەوەیە دەبێت ئەو زانایەی فەتوا دەدات یان کاربەدەست و بەڕێوەبەری مسوڵمانان بێت لەو شوێنە، یان ئەگەر کاربەدەستیش نەبێت دەبێت کاربەدەست ئاگاداری فەتواکانی بێت تا کێشە دروست نەبێت، کەواتە: بێ ئاگاداری کاربەدەستی زاناو دادپەروەر فەتوادان دروست نیە، وەک لەم فەرموودەیە دەردەکەوێ.

١٧٦- «عَنِ ابنِ مَسعُودٍ ﷺ قَالَ: إِنَّ الَّذِي يُفتِي النَّاسَ فِي كُلِّ مَا يُستَفتَى لَمَجنُونٌ»[١]

واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ وتویەتی: ئەوەی فەتوا بۆ خەڵکی بدات لە هەموو ئەو شتانەی کە پرسیاری لێ دەکرێت ئەوە بە دڵنیایی شێتە.

١٧٧- «عَن حُذَيفَةَ ﷺ، قَالَ: إِنَّمَا يُفتِي النَّاسَ ثَلاَثَةٌ: رَجُلٌ إِمَامٌ أَو وَالٍ، وَرَجُلٌ يَعلَمُ نَاسِخَ القُرآنِ مِنَ المَنسُوخِ قَالُوا: يَا حُذَيفَةُ، مِن ذَاكَ؟ قَالَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ أَو أَحمَقُ مُتَكَلِّفٌ»[٢].

واتە: حوذەیفە ﷺ وتویەتی: تەنها سێ کەس فەتوا بۆ خەڵکی دەدەن: (یەکەمیان) پیاوێکی پێشەواو کاربەدەست (کە زاناو داناو دادپەروەر بێت)، (دووەمیان) کەسێک کە زانیاری هەبا بە ناسیخ و مەنسوخی قورئان هەبێت، وتیان: ئەی حوذەیفە ئەوە کێیە واتە: کێ ئەو زانستەی لەلایە؟ وتی: عومەری کوڕی خەتتاب، (سێیەمیان) کەسێکی گەوج و گێل و زۆر لەخۆکەرە.

سەرنج: لەو سێ کەسانە تەنها دوو کەسەکانی یەکەم بە هەق فەتوا دەدەن، ئەوەی سێیەمیان لە نەزانی فەتوا دەدات و کەسێکە هەم خۆی و هەم خەڵکی بە هیلاک دەبات.

(مەنسوخ) واتە: ئەو ئایەت و فەرموودانەن کە خوای پەروەردگار حوکم، یان خوێندنەوە، یان هەردووکیانی هەڵوەشاندۆتەوە، (ناسیخ) واتە: ئەو ئایەتانەی دواتر دابەزیون و بوونەتە هۆی سڕینەوەی حوکمی ئایەتێک، یان سڕینەوەی خوێندنەوەی ئایەتێک، یان سڕینەوەی حوکم و خوێندنەوەی ئایەتێک.

بۆ زانیاری زیاتر دەتوانن سوود لە سەرچاوەی تایبەت وەربگرن بۆ ئەو بابەتە، بەتایبەت زانستی ئوصولی فقه.

١٧٨- «قَالَ حُذَيفَةُ ﷺ: إِنَّمَا يُفتِي النَّاسَ أَحَدُ ثَلاَثَةٍ: رَجُلٌ عَلِمَ نَاسِخَ القُرآنِ مِن مَنسُوخِهِ، قَالُوا: وَمَن ذَاكَ؟ قَالَ: عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: وَأَمِيرٌ لاَ يَجِدُ بُدًّا، أَو أَحمَقُ مُتَكَلِّفٌ، ثُمَّ قَالَ مُحَمَّدٌ: فَلَستُ بِوَاحِدٍ مِن هَذَينِ، وَأَرجُو أَن لاَ أَكُونَ الثَّالِثَ»[٣].

واتە: حوذەیفە ﷺ وتویەتی: تەنها یەکێک لەو سێ کەسە فەتوا بۆ خەڵکی دەدەن (لەو سێ جۆرە دەرناچێ): (یەکەمیان): کەسێک کە زانیاری هەبێ بە ناسیخ و مەنسوخی قورئان، وتیان: ئەی حوذەیفە

---

(١)ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لانقطاعه.

(٣)ـ إسناده حسن.

ئەوە كێیە (واتە كێ ئەو زانستەی لەلایە)؟ وتی: عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ. (دووەمیان): پێشەواو كاربەدەستێک كە دەرچەی هەڵاتنی دەست ناكەوێت و (دەبێ هەر فەتوا بدات، لەبەر شارەزایی)، (سێیەمیان) كەسێكی گەوج و گێل و زۆرلەخۆكەرە.

دواتر موحەممەد (كە یەكێكە لەو كەسانەی ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە) وتی: من یەكێک لەو دووانە نیم (واتە: نە كاربەدەست و نە زانای ناسیخ و مەنسوخ نیم)، ئومێدیشم وایە سێیەمیشیان نەبم (كە فەتوادەرە گەوج و گێلەكەیە).

١٧٩- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ عَلِمَ مِنْكُمْ عِلْماً فَلْيَقُلْ بِهِ، وَمَنْ لَمْ يَعْلَمْ فَلْيَقُلْ لِمَا لاَ يَعْلَمُ اللَّهُ أَعْلَمُ، فَإِنَّ الْعَالِمَ إِذَا سُئِلَ عَمَّا لاَ يَعْلَمُ قَالَ اللَّهُ أَعْلَمُ، وَقَدْ قَالَ اللَّهُ لِرَسُولِهِ: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾ص»[1].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ وتویەتی: هەر كەسێک لە ئێوە زانستێک دەزانێت با ڕاییگەیەنێت، ئەوەی كە ناشیزانێ ئەوە با دەربارەی ئەو شتەی نایزانێت بڵێت: (الله أعلم) خوا دەیزانێ، چونكە زانا كاتێک پرسیاری لێ دەكرێت دەربارەی شتێک كە نایزانێ دەڵێت: (الله أعلم) خوا دەیزانێ، (ئەوەتا) بە دڵنیایی خوای پەروەردگار بە پێغەمبەرەكەی ﷺ فەرمووە: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾ص، واتە: [ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: من هیچ كرێ و پاداشتێک لەسەر گەیاندنی ئەم ئاینە لە ئێوە داوا ناكەم، وە من لەو كەسانەش نیم كە درۆ هەڵبەستم و زۆری لە خۆم بكەم]. (واتە: ئەم ئایەتە پێمان دەڵێت ئەگەر مرۆڤ شتێكی نەزانی نابێ قسەی لەسەر بكات و زۆر لەخۆی بكات، چونكە ئەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دروست نەبووە چۆن بۆ خەڵكیتر دروستە؟!).

١٨٠- «أَنَّ أبا مُوسَى ﷺ، قَالَ، فِي خُطبَتِهِ: مَن عَلِمَ عِلمًا، فَليُعَلِّمهُ النَّاسَ، وَإِيَّاهُ أَن يَقُولَ مَا لاَ عِلمَ لَهُ بِهِ فَيَمرِق مِنَ الدِّينِ وَيَكُونَ مِنَ المُتَكَلِّفِينَ»[2].

واتە: ئەبو مووسا ﷺ لە وتارێكیدا وتی: هەر كەسێک زانستێک دەزانێت با خەڵكی فێر بكات، نەكا قسە بكات دەربارەی شتێک كە زانستی دەربارە نیە، چونكە بەهۆیەوە لە دین دەردەچێت و (دەچێتە ڕیزی) ئەو كەسانەی كە زۆر لەخۆیان دەكەن.

١٨١- «قَالَ عَلِيٌّ ﷺ وَا بَردَهَا عَلَى الكَبِدِ إِذَا سُئِلتُ عَمَّا لاَ أَعلَمُ، أَن أَقُولَ: اللهُ أَعلَمُ»[3].

واتە: پێشەوا عەلی ﷺ وتویەتی: فێنكترین شت لەسەر جەرگم (واتە: لەسەر دڵ و نەفس و ناخم ئەوەیە) ئەگەر پرسیارێكم لێ بكرێت دەربارەی شتێک كە نایزانم بڵێم: (الله أعلم) خوا دەیزانێ. (واتە زۆر پێم خۆشە و لەسەر دڵم سوكە كە وەڵام نەدەمەوە و بڵێم نایزانم).

---

(١)ـ صحيح.

(٢)ـ رجاله ثقات، غير أنه منقطع.

(٣)ـ إسناده ضعيف.

١٨٢- «عَن عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: يَا بَردَهَا عَلَى الكَبِدِ أَن تَقُولَ لِمَا لاَ تَعلَمُ: اللهُ أَعلَمُ»[١]

واتە: لە پێشەوا عەلی ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: ئای چەندە فێنکە لەسەر جەرگ (لەسەر نەفس و ناخ) کە کاتێک پرسیارت لێ دەکرێت دەربارەی ئەوەی نایزانی بڵێیت: (الله أعلم) خوا دەیزانێ.

١٨٣- «عَن عَلِيِّ بنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: إِذَا سُئِلتُم عَمَّا لاَ تَعلَمُونَ، فَاهرُبُوا، قَالَ: وَكَيفَ الهَرَبُ يَا أَمِيرَ المُؤمِنِينَ؟ قَالَ: تَقُولُونَ: اللهُ أَعلَمُ»[٢].

واتە: پێشەوا عەلی ﷺ وتویەتی: ئەگەر پرسیارتان لێکرا دەربارەی ئەوەی نایزانن ئەوە ڕابکەن (واتە: نەکەن وەڵام بدەنەوە)، وتیان: ڕاکردن چۆنە ئەی گەورەی بڕواداران؟ وتی: بڵێن: (الله أعلم) خوا دەیزانێ.

١٨٤- «قَالَ عَلِيٌّ ﷺ ، وَا بَردَهَا عَلَى الكَبِدِ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ قَالُوا: وَمَا ذَلِكَ يَا أَمِيرَ المُؤمِنِينَ؟ قَالَ: أَن يُسأَلَ الرَّجُلُ عَمَّا لاَ يَعلَمُ فَيَقُولُ: اللهُ أَعلَمُ»[٣].

واتە: پێشەوا عەلی ﷺ سێ جار وتی: فێنکترین شتە لەسەر جەرگ (لەسەر نەفس و ناخ)، وتیان: ئەوە چیە (ئەو شتە) ئەی گەورەی بڕواداران؟ وتی: ئەوەیە پیاو پرسیاری لێ بکرێت دەربارەی ئەوەی کە نایزانێ، ئەویش بڵێت: (الله أعلم) خوا دەیزانێ. (واتە: من نایزانم وەڵام نادەمەوە).

١٨٥- «عَنِ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَهُ عَن مَسأَلَةٍ فَقَالَ: لاَ عِلمَ لِي بِهَا، فَلَمَّا أَدبَرَ الرَّجُلُ، قَالَ ابنُ عُمَرَ: نِعمَ مَا قَالَ ابنُ عُمَرَ، سُئِلَ عَمَّا لاَ يَعلَمُ فَقَالَ: لاَ عِلمَ لِي بِهِ»[٤].

واتە: ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، وتویەتی: پیاوێک پرسیاری لێ کردووە دەربارەی بابەتێک، ئەویش وتویەتی: زانستم دەربارەی نیە، جا کاتێک پیاوەکە ڕۆیشتووە ئیبنو عومەر (بەخۆی) وتووە: باشترین شتی وت ئیبنو عومەر، پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەوەی کە نایزانێ ئەویش وتی: زانستم دەربارەی نیە. (واتە: ئیبنو عومەر زۆر دڵی بە وەڵامەکەی خۆی خۆش بوو کە وتی: زانستم دەربارەی نیەو دەستخۆشی لە خۆی کرد).

١٨٦- «الشَّعبِيِّ قَالَ: لاَ أَدرِي نِصفُ العِلمِ»[٥].

واتە: شەعبی وتویەتی: (وتنی) نازانم نیوەی زانستە. (واتە: نیوەی زانست ئەوەیە کاتێک پرسیارێکت لێکرا دەربارەی شتانێک کە زانستت دەربارەی نیە بڵێیت: نازانم).

---

(١)ـ إسناده ضعيف.

(٢)ـ إسناده ضعيف.

(٣)ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

جا لەبەر ئەوە نیوەی زانست حیسابە، چونکە کابرا ئەگەر زانستی تەواوی هەبێت ئەوە دەزانێت وەڵام بداتەوە بە پێی زانستەکەی، ئەگەر کەسێکی نەزانیش بێت و زانستی نەبێت یان زۆر کەمی هەبێت ئەوە بەبێ زانست وەڵامی دەداتەوەو پێی عەیبە بە خەڵک بڵێت: نایزانم، جا ئەو کەسەی دەڵێت: نازانم، دیارە نیوەی زانستی هەیە بۆیە سیفاتی زانایانی وەرگرتووە کە دەتوانێ بڵێت: نازانم، کەواتە: نە نەزانەو نە زانای تەواوە لەو بابەتە بەڵکو نیوەی زانستی هەیە.

١٨٧- «عَن نَافِعٍ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى ابنَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، يَسأَلُهُ عَن شَيءٍ فَقَالَ: لاَ عِلمَ لِي، ثُمَّ التَفَتَ بَعدَ أَن قَفَّى الرَّجُلُ فَقَالَ: نِعمَ مَا قَالَ ابنُ عُمَرَ يسأَلَ عَمَّا لاَ يَعلَمُ، فَقَالَ: لاَ عِلمَ لِي، يَعنِي ابنُ عُمَرَ نَفسَهُ»[1].

واتە: نافیع وتویەتی: پیاوێک هات بۆ لای ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، پرسیاری لێ کرد دەربارەی شتێک، ئەویش وتی: زانستم دەربارەی نیە، دواتر (ئیبنو عومەر) ئاوڕی دایەوە پاش ئەوەی پیاوەکە پشتی هەڵکرد و ڕۆیشت وتی: باشترین شتی وت ئیبنو عومەر، پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەوەی کە نایزانێ ئەویش وتی: زانستم دەربارەی نیە، واتە: ئیبنو عومەر مەبەستی خۆی بوو. (واتە: خۆی دەستخۆشی لەخۆی دەکرد).

١٨٨- «عَن مُغِيرَةَ، قَالَ: كَانَ عَامِرٌ إِذَا سُئِلَ عَن شَيءٍ يَقُولُ: لاَ أَدرِي، فَإِن رُدُّوا عَلَيهِ، قَالَ: إِني حَلَفتُ لَكَ بِاللهِ إِن كَانَ لِي بِهِ عِلمٌ»[2].

واتە: موغیرە وتویەتی: هەموو جار ئەگەر عامیر پرسیاری لێ بکرایە دەربارەی شتێک (کە زانستی دەربارە نەبووایە) دەیوت: نازانم، جا ئەگەر (پرسیارەکەیان) بۆ دووبارە کردبایەوە (بۆ ئەوەی هەر وەڵامیان بداتەوە)، ئەوە دەیوت: (ئەگەر حەز دەکەن) سوێندتان بۆ بخۆم، ئەوە دەیخۆم کە ئەگەر زانیاریم هەبووایە دەربارەی پرسیارەکە (ئەوە وەڵامم دەدانەوە، سوێند بە خوا نایزانم).

١٨٩- «عَنِ ابنِ سِيرِينَ، قَالَ: مَا أُبَالِي سُئِلتُ عَمَّا أَعلَمُ أَو مَا لاَ أَعلَمُ، لِأَنِّي إِذَا سُئِلتُ عَمَّا أَعلَمُ، قُلتُ مَا أَعلَمُ، وَإِذَا سُئِلتُ عَمَّا لاَ أَعلَمُ، قُلتُ: لاَ أَعلَمُ»[3].

واتە: ئیبنو سیرین وتویەتی: باکم نەبووە لەوەی پرسیارم لێ کرابێت دەربارەی ئەوەی دەیزانم و ئەوەی کە نایزانم، چونکە من ئەگەر پرسیارم لێکرابێ دەربارەی ئەوەی کە دەیزانم، ئەوە ئەو شتەم وتووە کە دەیزانم، وە ئەگەر پرسیاریشم لێکرابێ دەربارەی ئەوەی کە نایزانم وتومە: نایزانم.

١٩٠- «عَنِ الأَعمَشِ، قَالَ: مَا سَمِعتُ إِبرَاهِيمَ يَقُولُ قَطُّ: حَلاَلٌ وَلاَ حَرَامٌ، إِنَّمَا كَانَ يَقُولُ: كَانُوا يتكرهونَ، وَكَانُوا يَستَحِبُّونَ»[4].

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: ئەعمەش وتویەتی: هەرگیز گوێم لە ئیبراهیم نەبووە بڵێت: (ئەم شتە) حەڵاڵە و (ئەم شتە) حەرامە، بەڵکو تەنها دەیوت: زانایان پێیان حەرام و ناپەسەندە (ئەگەر شتەکە حەرام و ناپەسەند بووایە)، (یان دەیوت) زانایان پێیان سوننەت و چاکە (ئەگەر شتەکە سوننەت و چاک بووایە).

واتە هەرگیز بەناوی خۆیەوە فەتوای نەدەدا، بەڵکو فەتوای زانایانی پێشەخۆی نەقڵ دەکرد بۆ خەڵکی، چونکە دەیزانی مەسئولیەتی فەتوا چەندە قورسە لە قیامەت.

## بابەت: گۆڕانی سەردەم (بەرەو خراپی) و باسی ئەو شتانەی تیایدا ڕودەدەن

١٩١- «قَالَ عَبدُ اللهِ ﷺ: كَيفَ أَنتُم إِذَا لَبِسَتكُم فِتنَةٌ يَهرَمُ فِيهَا الكَبِيرُ، وَيَربُو فِيهَا الصَّغِيرُ، وَيَتَّخِذُهَا النَّاسُ سُنَّةً، فَإِذَا غُيِّرَت قَالُوا: غُيِّرَتِ السُّنَّةُ، قَالُوا: وَمَتَى ذَلِكَ يَا أَبا عَبدِ الرَّحمَنِ؟ قَالَ: إِذَا كَثُرَت قُرَّاؤُكُم، وَقَلَّت فُقَهَاؤُكُم، وَكَثُرَت أُمَرَاؤُكُم، وَقَلَّت أُمَنَاؤُكُم، وَالتُمِسَتِ الدُّنيَا بِعَمَلِ الآخِرَةِ»[1].

واتە: عەبدوڵلا ﷺ وتویەتی: دەبێ حاڵتان چۆن بێت کاتێک فیتنەو (بیدعە) تێکەڵی و گومانتان بۆ دروست دەکات و سەرتان لێ دەشێوێنێت، کە گەورە لەناویدا پیر دەبێ و بچووکیش لە ناوی گەورە دەبێ و گەشە دەکات (واتە: خەڵک لەو جەوە پێ دەگات)، خەڵکی فیتنەو بیدعەکان دەکەن بە سوننەت و لەسەریان دەڕۆن، جا ئەگەر بیدعەیەک گۆڕا (خەڵک) دەڵێن: ئەوە سوننەت گۆڕاوە (واتە: بیدعەیان لەلا دەبێت بە سوننەت)؟!

وتیان: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان (ئەی عەبدوڵلا) ئەوە کەی ڕوودەدات؟ وتی: ئەو کاتەی قورئانخوێنتان زۆر بوو و، زانای شەرعیتان کەم بوو و، کاربەدەستتان زۆر بوون و، دەست پاک و ئەمیندارتان کەم بوو و، دونیا دەستەبەر دەکراو بەدەست دەهات بە هۆی کردەوەی دواڕۆژ (واتە: ئەو کاتەی خەڵک دینی بۆ بەدەست هێنانی دونیا بەکار هێنا).

١٩٢- «عَنْ عَبدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: كَيفَ أَنتُم إِذَا لَبِسَتكُم فِتنَةٌ يَهرَمُ فِيهَا الكَبِيرُ وَيَربُو فِيهَا الصَّغِيرُ، إِذَا تُرِكَ مِنهَا شَيءٌ قِيلَ: تُرِكَتِ السُّنَّةُ، قَالُوا: وَمَتَى ذَلِكَ؟ قَالَ: إِذَا ذَهَبَت عُلَمَاؤُكُم، وَكَثُرَت جُهَلَاؤُكُم، وَكَثُرَت قُرَّاؤُكُم، وَقَلَّت فُقَهَاؤُكُم، وَكَثُرَت أُمَرَاؤُكُم، وَقَلَّت أُمَنَاؤُكُم، وَالتُمِسَتِ الدُّنيَا بِعَمَلِ الآخِرَةِ، وتفُقِّهَ لِغَيرِ الدِّينِ»[2].

واتە: عەبدوڵلا ﷺ وتویەتی: دەبێ حاڵتان چۆن بێ کاتێک فیتنەو (بیدعە) تێکەڵی و گومانتان بۆ دروست دەکات و، سەرتان لێ دەشێوێنێت، کە گەورە لەناو ئەم کەشەدا پیر دەبێت و بچوکیش لەناویدا گەورە دەبێت گەشە دەکات، جا کاتێک شتێک لە بیدعە واز لێهێنرا دەڵێن: سوننەت واز لێهێنراوە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح لغيره.

وتیان: ئەوە کەی ڕوودەدات؟ وتی: ئەگەر زاناکانتان نەمان و، نەزانەکانتان زۆر بوون و، قورئانخوێنتان زۆر بوون و، زانای شەرعیتان کەم بوون و، کاربەدەستتان زۆر بوون و، دەست پاکتان کەم بوون و، دونیا دەست دەخراو بەدەست دەهات بە هۆی کردەوەی دوارۆژو، زانستی شەرعی و فیقە دەخوێنرا بۆ جگە لە دین (واتە: ئەو کاتەی شەرع بۆ موناقەشەو، خۆ هەڵکێشان و، ڕەخنەگرتن لە دین بخوێنرێت)[1].

١٩٣- «حَدَّثَنَا الأَوزَاعِيُّ، قَالَ: أُنبِئتُ أَنَّهُ كَانَ يُقَالُ: وَيلٌ لِلمُتَفَقِّهِينَ لِغَيرِ العِبَادَةِ وَالمُستَحِلِّينَ الحرماتِ بِالشُّبُهَاتِ»[2].

واتە: ئەوزاعی وتویەتی: پێم گەیشتووە کە وتراوە: سزایەکی سەخت بۆ ئەو کەسانەی خۆیان فێری زانستی شەرعی و فیقە دەکەن بۆ (مەبەستی) جگە لە عیبادەت و کارپێکردن (واتە: وەیل بۆ ئەوانەی بۆ ڕیابازی و مناقەشەو خۆهەڵکێشان خۆیان فێری زانستی شەرعی دەکەن)، وە سزای سەخت بۆ ئەوانەی کە شتە حەڕامکراوەکان حەڵاڵ دەکەن، بە بیانووی ئەوەی (دەڵێن): گومانی تیایە دیار نیە کە حەڕام بێت بە تەواوی (بۆیە حەڵاڵی دەکەن و دەستی بۆ دەبەن).

سەرنجێک: کەواتە ئەگەر شتێک گومانی تیابوو لە حەڕام بوونی مانای ئەوە نیە حەڵاڵ بێت.

١٩٤- «عَن عَبدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: لاَ يَأتِي عَلَيكُم عَامٌ إلاَّ وَهُوَ شَرٌّ مِنَ الَّذِي كَانَ قَبلَهُ- أَمَا إِنِّي لَستُ أَعنِي عَامًا أَخصَبَ مِن عَامٍ، وَلاَ أَمِيرًا خَيرًا مِن أَمِيرٍ، وَلَكِن عُلَمَاؤُكُم وَخِيَارُكُم وَفُقَهَاؤُكُم يَذهَبُونَ، ثُمَّ لاَ تَجِدُونَ مِنهُم خَلَفًا، وَيَجِيءُ قَومٌ يَقِيسُونَ الأُمُورَ بِرَأيِهِم»[3].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ وتویەتی: هیچ ساڵێکتان بەسەردانایێ حەتمەن خراپترە لە ساڵی پێش خۆی بزانن و ئاگاداربن من مەبەستم ئەوە نیە ساڵێک بە پیت تر بێ لە ساڵێکی ترو سەرکردەیەک چاکتر بێ لە سەرکردەیەکی دیکە، بەڵکو زاناکانتان و چاکەکانتان و زانا شەرعزانەکانتان دەڕۆن و وەفات دەکەن، دواتر جێگرەوەی ئەوانتان دەست ناکەوێت کۆمەڵە خەڵکانێک دێن بە بۆچوونی خۆیان شت قیاس دەکەن و (هەر دوو شتێک تۆزێک وێک بچن فەتوای لەسەر دەدەن بە حەڵاڵ یان حەڕام، لە بابەتەکە نازانن و فەتوای دەربارە دەردەکەن).

١٩٥- «عَنِ ابنِ سِيرِينَ قَالَ: أَوَّلُ مَن قَاسَ إِبلِيسُ، وَمَا عُبِدَتِ الشَّمسُ وَالقَمَرُ إلاَّ بِالمَقَايِيسِ»[4].

واتە: ئیبنو سیرین وتویەتی: یەکەم کەس کە قیاسی (بە نەزانی و هەڵە) کرد ئیبلیس بوو (کاتێ وتی: ئەو کەسەی لە ماددەو توخمێکی کاریگەر دروست کرابێ ئەو شایستەی ئەوەیە ببێتە جێنشینی خوا لەسەر زەوی، بۆیە کڕنووشی بۆ ئادەم نەبرد)، هەروەها خۆرو مانگیش نەپەرستران تەنها بە قیاس

---

(١) ـ سبحان الله وەک ئەوەی حاڵی ئەمڕۆی مسوڵمانانی لێ دیار بووبێ!

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣)ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

نەبێت (چونكە ئەو خەڵكانەی خۆرو مانگیان دەپەرست وتویانە ئەوەی سوودی زۆری هەبێت بۆمان ئەوە خوایە، كەواتە ڕۆژ و مانگ خوان و شایستەی پەرستنن).

١٩٦- «عَنِ الْحَسَنِ: أَنَّهُ تَلاَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾﴾ الأعراف، قَالَ: قَاسَ إِبْلِيسُ، وَهُوَ أَوَّلُ مَنْ قَاسَ»[١].

واتە: حەسەنی بەصری ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾﴾ الأعراف، (كە خوای پەروەردگار لەسەر زاری ئیبلیس دەفەرموێ): [(ئیبلیس وتی: من سوجدە بۆ ئادەم نابەم چونكە) تۆ منت لە ئاگر دروست كردووە و ئەویشت لە قوڕ دروست كردووە]، حەسەنی بەصری وتی: ئیبلیس قیاسی كردو ئەو یەكەم كەس بوو كە قیاسی (بە نەزانی) كرد.

١٩٧- «عَن مَسرُوقٍ أَنَّهُ قَالَ: إِنِّي أَخَافُ أَو أَخشَى أَن أَقِيسَ، فَتَزِلَّ قَدَمِي»[٢].

واتە: مەسڕوق وتویەتی: من دەترسم (بابەتی شەرعی) قیاس بكەم نەوەک پێم بخلیسكێ و (تووشی هەڵە ببم).

١٩٨- «عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: وَاللَّهِ لَئِنْ أَخَذْتُمْ بِالْمَقَايِيسِ لَتُحَرِّمُنَّ الْحَلاَلَ وَلَتُحِلُّنَّ الْحَرَامَ»[٣].

واتە: شەعبی وتویەتی: سوێند بەخوا ئەگەر دەست بگرن بە قیاس كردن (لە بابەتە شەرعیەكاندا، بە نەزانی) ئەو كات حەڵاڵ حەڕام دەكەن و حەڕامیش حەڵاڵ دەكەن. (واتە: ئەگەری زۆری هەیە تووشی هەڵە بین لە حەڵاڵ و حەڕامدا).

١٩٩- «عَن عَامِرٍ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَا أَبغَضَ إِلَيَّ أَرَأَيتَ، أَرَأَيتَ يَسأَلُ الرَّجُلُ صَاحِبَهُ فَيَقُولُ: أَرَأَيتَ وَكَانَ لاَ يُقَايِسُ»[٤].

واتە: عامیر وتویەتی: ئای چەندە ڕقم لەوەیە: (بوترێت) ئایا پێت وایە، ئایا پێت وایە، (كاتێک) پیاو پرسیار لە هاوڕێكەی دەكات و دەڵێت: ئایا پێت وایە (ئەو شتە حوكمی چیە) ئەویش (واتە: ئەوەی كە پرسیاری لێ دەكرێ) قیاس نەكات (واتە: كابرا پیاوێكی باشە و قیاس ناكات، كەچی دەیانەوێت تووشی هەڵەی بكەن و هەر فەتواكەی پێ بدەن).

٢٠٠- «عَنِ الزِّبرِقَانِ، قَالَ: نَهَانِي أَبُو وَائِلٍ أَن أُجَالِسَ أَصحَابَ أَرَأَيتَ»[٥].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: زیبریقان وتویەتی: ئەبو وائیل ڕێگری لێ کردووم لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیە دابنیشم کە (لە کاتی پرسیاری شەرعی بە کەسی موفتی دەڵێن): ئایا تۆ خۆت پێت وایە ئەو بابەتە چۆنە. (واتە: ئەوانەی داوا لە زانایان دەکەن بە بۆچوونی خۆیان قسە لەسەر شەرع بکەن).

٢٠١- «عَنِ الشَّعبِيِّ، قَالَ: لَو أَنَّ هَؤُلَاءِ كَانُوا عَلَى عَهدِ النَّبِيِّ ﷺ لَنَزَلَت عَامَّةُ القُرآنِ يَسأَلُونَكَ يَسأَلُونَكَ»[١].

واتە: شەعبی وتویەتی: ئەگەر ئەمانە (واتە: ئەو مسوڵمانانەی لە سەردەمەکەی من دەژین) لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ بوونایە ئەوە قورئان بە گشتی بە (یسألونک) دادەبەزی (تا وەڵامی پرسیارە زۆرەکانیان بداتەوە).

سەرنجێک: (یسألونک) کە لە قورئاندا باس دەکرێت واتە: ئەی موحەممەد پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی فڵان بابەت و وەڵامەکەشی ئا ئەوەیە، جا مەبەستی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە شەعبی دەیەوێت بڵێت: خەڵکی ئەم زەمانە ئەوەندە پرسیار دەکەن ئەگەر لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بوونایە، دەبێ قورئان هەمووی هەر وەڵامی ئەوانی دابایەوەو هەموو ئایەتەکان بە (یسألونک) دەستی پێ کردبا، ئەم وتەیەی تەنها بۆ ئەوە کردووە تا بڵێت: خەڵکی پرسیاری لە ڕاددەبەدەر دەکەن لەم سەردەمەدا.

٢٠٢- «عَن أَبِي حَمزَةَ قَالَ: قَالَ لِي إِبرَاهِيمُ: يَا أَبا حَمزَةَ، وَاللهِ لَقَد تَكَلَّمتُ، وَلَو وَجَدتُ بُدًّا مَا تَكَلَّمتُ، وَإِنَّ زَمَانًا أَكُونُ فِيهِ فَقِيهَ أَهلِ الكُوفَةِ زَمَانُ سُوءٍ»[٢].

واتە: ئەبو حەمزە وتویەتی: ئیبڕاهیم پێی وتم: ئەی ئەبو حەمزە سوێند بەخوا قسەم کردووە و (فەتوای شەرعیم داوە)، وە ئەگەر دەرچەیەک و (ڕێگایەکم) دەستکەوتایە بۆ ڕاکردن لە فەتوا ئەوە قسەم دەربارە نەدەکرد، ئەو سەردەمەی من کە تیایدا زانای شەرعی خەڵکی کوفەم، سەردەمێکی خراپە.

٢٠٣- «قَالَ عُمَرُ رضي الله عنه: إِيَّاي وَالمُكَايَلَةَ يَعنِي: فِي الكَلَامِ»[٣].

واتە: پێشەوا عومەر رضي الله عنه وتویەتی: لە قیاس کردن لە شەرعدا بەدوورم بگرن (لە ڕیوایەتی تر هاتوە، وتویەتی: خۆتان لە قیاس کردن بە دوور بگرن و نەکەن قیاس بکەن لە بابەتی شەرعیدا).

٢٠٤- «عَنِ الشَّعبِيِّ قَالَ: شَهِدتُ شُرَيحًا وَجَاءَهُ رَجُلٌ مِن مُرَادٍ، فَقَالَ: يَا أَبا أُمَيَّةَ، مَا دِيَةُ الأَصَابِعِ؟ قَالَ: عَشرٌ عَشرٌ، قَالَ: يَا سُبحَانَ اللهِ، أَسَوَاءٌ هَاتَانِ؟ جَمَعَ بَينَ الخِنصِرِ وَالإِبهَامِ- فَقَالَ شُرَيحٌ: يَا سُبحَانَ اللهِ، أَسَوَاءٌ أُذُنُكَ وَيَدُكَ؟ فَإِنَّ الأُذُنَ يُوَارِيهَا الشَّعرُ وَالكُمَّةُ وَالعِمَامَةُ فِيهَا نِصفُ الدِّيَةِ، وَفِي اليَدِ نِصفُ الدِّيَةِ- وَيحَكَ: إِنَّ السُّنَّةَ سَبَقَت قِيَاسَكُم فَاتَّبِع وَلَا تَبتَدِع، فَإِنَّكَ لَن تَضِلَّ مَا أَخَذتَ بالأَثَرِ- قَالَ أَبُو بَكرٍ: فَقَالَ لِي الشَّعبِيُّ: يَا هُذَلِيُّ، لَو أَنَّ أَحنَفَكُم قُتِلَ وَهَذَا الصَّبِيُّ فِي مَهدِهِ، أَكَانَ دِيَتُهُمَا سَوَاءً؟ قُلتُ: نعم قَالَ: فَأَينَ القِيَاسُ؟»[٤].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣)ـ إسناده ضعيف.

(٤)ـ إسناده ضعيف جداً.

واتە: شەعبی وتویەتی: لەلای شورەیح بووم، پیاوێکی عەشیرەتی موراد هاتە لای و وتی: ئەی ئەبو ئومەییە (ئەی شورەیح) خوێن و تۆڵەی پەنجەکان چەندە (ئەگەر کەسێک پەنجەی کەسێکی دیکە ببڕێت بە ناهەق)؟ وتی: دە وشتر، دە وشتر (واتە: بۆ هەر پەنجەیەک دە وشترە)، کابرا وتی: ئەی پاکی بۆ خوا ئایا ئەوانە وەکو یەکن، پەنجەی بچکۆڵەو پەنجەی گەورەی دەستی لە تەک یەکتری دانا؟! (واتە: پێی سەیر بوو پەنجەی گچکە و پەنجەی گەورەی دەست وەکو یەکتری تۆڵەکەیان دە وشتر بێت)، شورەیحیش وتی: ئەی پاکی بۆ خوا ئایا گوێچکەو دەستت وەکو یەکن؟! گوێچکە بە موو دەورەدراوەو کونی هەیەو چەترو داپۆشەریشی هەیە، تۆڵەکەشی نیوەی خوێنی مرۆڤێکە (واتە: تۆڵەکەی پەنجا وشترە ئەگەر بە ناهەق ببڕێ) دەستیش (بە هەمان شێوە) تۆڵەکەی نیوەی خوێنی مرۆڤێکە (کەچی گوێچکە و دەستیش چەندە جیاوازن)، هاوار بۆ تۆ سوننەت لە قیاسی (هەڵەی) ئێوە لە پێشترە، کەواتە: شوێن سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوەو بیدعە پەیدا مەکە، چونکە بە دڵنیایی هەرگیز گومڕاو سەرلێشێواو نابیت تا ئەو کاتەی دەستت بە سوننەتەوە گرتبێ.

ئەبوبەکری هوذەیلی وتویەتی: شەعبی پێی وتم: ئەی هوذەیلی ئەگەر ئەحنەفی ئێوە (واتە: ئەحنەفی کوڕی قەیسی هوذەیلی کە پیاوێکی گەورە و ناوداری عەشیرەتەکەیان بووە) بکوژرێ لەگەڵ ئەو منداڵە کە لەناو بێشکەدایە ئایا تۆڵەی خوێنیان وەکو یەکترییە؟ منیش وتم: بەڵێ، شەعبیش وتی: کەواتە: کوانێ قیاس؟ (واتە: ئەها بزانە دین بە قیاس نیە بە ئەمری خوا و پێغەمبەرە ﷺ).

٢٠٥- «قَالَ مُعَاذُ بنُ جَبَلٍ ﷺ، يُفتَحُ القُرآنُ عَلَى النَّاسِ حَتَّى يَقرَأَهُ المَرأَةُ وَالصَّبِيُّ وَالرَّجُلُ، فَيَقُولُ الرَّجُلُ: قَد قَرَأتُ القُرآنَ فَلَم أُتَّبَعُ، وَاللهِ لأقُومَنَّ بِهِ فِيهِم لَعَلِّي أُتَّبَعُ، فَيَقُومُ بِهِ فِيهِم فَلاَ يُتَّبَعُ، فَيَقُولُ: قَد قَرَأتُ القُرآنَ فَلَم أُتَّبَع، وَقَد قُمتُ بِهِ فِيهِم، فَلَم أُتَّبَع، لأَحتَظِرَنَّ فِي بَيتِي مَسجِدًا لَعَلِّي أُتَّبَعُ، فَيَحتَظِرُ فِي بَيتِهِ مَسجِدًا فَلاَ يُتَّبَعُ، فَيَقُولُ: قَد قَرَأتُ القُرآنَ فَلَم أُتَّبَع، وَقُمتُ بِهِ فِيهِم فَلَم أُتَّبَع، وَقَدِ احتظرتُ فِي بَيتِي مَسجِدًا، فَلَم أُتَّبَع، وَاللهِ لآتِيَنَّهُم: بِحَدِيثٍ لاَ يَجِدُونَهُ فِي كِتَابِ اللهِ، جَلَّ وَعَلاَ، وَلَم يَسمَعُوهُ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ لَعَلِّي أُتَّبَعُ قَالَ مُعَاذٌ: فَإِيَّاكُم وَمَا جَاءَ بِهِ فَإِنَّ مَا جَاءَ بِهِ ضَلاَلَةٌ»[1].

واتە: موعاذی کوڕی جەبەل ﷺ وتویەتی: قورئان دەکرێتەوە و (فێربوونی ئاسان دەبێت) تا وای لێدێت ژن و منداڵ و پیاو دەزانن بیخوێننەوە، جا پیاو (هەیە خۆی فێری قورئان کردووە بۆ ناو و دەنگ و بۆ خوای نیە و) دەڵێت: قورئانم خوێند (کەچی خەڵک) شوێنکەوتەم نەبوون، (کەواتە) سوێند بە خوا دەبێ لە ناو خەڵکیدا لە شەونوێژدا بیخوێنم بەڵکو شوێنکەوتەم بن، بۆیە قورئان لە ناو خەڵکیدا دەخوێنێ لە شەونوێژدا (کەچی هێشتا) خەڵکی شوێنی ناکەون، بۆیە دەڵێت: (کەواتە) سوێند بە خوا ماڵەکەم دەکەم بە مزگەوت و لێی دەرناچم و خۆم لە خەڵکی دەشارمەوە (تا بە وەلی و پیاوی خوام بزانن) بەڵکو شوێنم بکەون، بۆیە ماڵەوەی دەکاتە مزگەوت و خۆی لە خەڵکی دووردەخاتەوە (کەچی) شوێنی ناکەون، بۆیە دەڵێت: قورئانم خوێند شوێنم نەکەوتن و، شەونوێژم پێ کرد لە ناویاندا هەر

---

(١) ـ إسناده صحيح.

شوێنم نەکەوتن و، ماڵەوەم کردە مزگەوت هەر شوێنم نەکەوتن، سوێند بە خوا دەبێ قسە گەلێکیان بۆ بێنم کە نە لە پەرتوکی خوا بوونی هەبێت و، نە لە پێغەمبەری خواشیان ﷺ بیستبێت بەڵکو شوێنم بکەون، موعاذ وتی: خۆتان بپارێزن لەو جۆرە کەسە و ئەو شتەی هێناویەتی، چونکە بە دڵنیایی ئەوەی هێناویەتی گومڕاییە.

## بابەت: دەربارەی خراپی دەستگرتن بە بۆچوونی عەقڵ (بێ زانیاری لە قورئان و سوننەت)

٢٠٦- «حَدَّثَنَا مَالِكٌ هُوَ: ابنُ مِغوَلٍ، قَالَ: قَالَ لِيَ الشَّعبِيُّ مَا حَدَّثُوكَ هَؤُلَاءِ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ فَخُذ بِهِ، وَمَا قَالُوهُ بِرَأْيِهِم، فَأَلقِهِ فِي الحُشِّ»[١].

واتە: مالیکی کوڕی میغوەل وتویەتی: شەعبی پێی وتووم: ئەو شتەی ئەمانە بۆیان گێڕایەتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئەوە وەری بگرە، ئەوەشی کە بە بۆچوونی خۆیان دەیڵێن بیهاوێژە پاشەڕۆخانەوە (واتە: حیسابی بۆ مەکە و وەری مەگرە).

٢٠٧- «أَخبَرَنِي رَجَاءُ بنُ أَبِي سَلَمَةَ، قَالَ: سَمِعتُ عَبدَةَ بنَ أَبِي لُبَابَةَ، يَقُولُ: قَد رَضِيتُ مِن أَهلِ زَمَانِي هَؤُلَاءِ أَن لاَ يَسأَلُونِي وَلاَ أَسأَلُهُم، إِنَّمَا يَقُولُ أَحَدُهُم: أَرَأَيتَ، أَرَأَيتَ؟»[٢].

واتە: ڕەجائی کوڕی ئەبو سەلەمە وتویەتی: گوێم لە عەبدەتی کوڕی ئەبو لوبابە بوو دەیوت: بە دڵنیایی من ڕازیم لەو خەڵکەی زەمانی خۆم کە نە پرسیارم لێ بکەن و، نە پرسیاریشیان لێ بکەم، (چونکە پرسیارکردنیان شێواندوەو هەر) یەکێک لەوان دەڵێت: ئایا بۆچوونی تۆ چیە؟ ئایا بۆچوونی تۆ چیە؟ (واتە: داوا دەکەن بە عەقڵی خۆمان باسی دینیان بۆ بکەین نەک بە شەرع، کەواتە: حەز ناکەم پرسیارم لێ بکەن).

٢٠٨ـ «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: خَطَّ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْماً خَطًّا ثُمَّ قَالَ: هَذَا سَبِيلُ اللَّهِ، ثُمَّ خَطَّ خُطُوطاً عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ ثُمَّ قَالَ: هَذِهِ سُبُلٌ، عَلَى كُلِّ سَبِيلٍ مِنْهَا شَيْطَانٌ يَدْعُو إِلَيْهِ، ثُمَّ تَلاَ: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ﴿١٥٣﴾﴾الأنعام»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ وتویەتی: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ (لەسەر خۆڵەکە) خەتێک و هێڵێکی بۆ کێشاین، دواتر فەرمووی: ئەوە ڕێگای خوایە، دواتر چەندین خەت و هێلی لەلای ڕاستە و چەپەی هێڵەکە کێشا، دواتر فەرمووی: ئەمانە کۆمەڵە ڕێگاییێکن لەسەر هەموو ڕێگاییێک لەم ڕێگایانە شەیتانێک هەیە و بانگەوازی بۆ دەکات، دواتر ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ﴿١٥٣﴾﴾الأنعام، واتە: [بێ گومان ئەوە «واتە ئیسلام»

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده حسن.

ڕێگای ڕاستی منه كه ڕاست و دروسته، كەواته شوێنی بكەون و، شوێنی ڕێباز و ڕێچكەكانی تر مەكەون، چونكه دوورتان دەخەنەوە و لاتان دەدەن له ڕێگای خوا].

٢٠٩- «عَنْ مُجَاهِدٍ ، ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ﴾ الأنعام، قَالَ: الْبِدَعَ وَالشُّبُهَاتِ»[١].

واته: موجاهيد وتویەتی: كه خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ﴾ الأنعام، واته: [دوای ڕێچكەكان مەكەون] واته: شوێنی بيدعه و گومان مەكەون.

٢١٠- «أنبَأَنَا عَمرُو بنُ يَحيَى، قَالَ: سَمِعتُ أَبِي، يُحَدِّثُ، عَن أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا نَجلِسُ عَلَى بَابِ عَبدِ اللهِ بنِ مَسعُودٍ ، قَبلَ صَلاَةِ الغَدَاةِ، فَإِذَا خَرَجَ، مَشَينَا مَعَهُ إِلَى المَسجِدِ، فَجَاءَنَا أَبُو مُوسَى الأَشعَرِيُّ فَقَالَ: أَخَرَجَ إِلَيكُم أَبُو عَبدِ الرَّحمَنِ قُلنَا: لاَ، بَعدُ- فَجَلَسَ مَعَنَا حَتَّى خَرَجَ، فَلَمَّا خَرَجَ، قُمنَا إِلَيهِ جَمِيعًا، فَقَالَ لَهُ أَبُو مُوسَى: يَا أبا عَبدِ الرَّحمَنِ، إِنِّي رَأَيتُ فِي المَسجِدِ آنِفًا أَمرًا أَنكَرتُهُ وَلَم أَرَ وَالحَمدُ لِلَّهِ إِلاَّ خَيرًا، قَالَ: فَمَا هُوَ؟ فَقَالَ: إِن عِشتَ فَسَتَرَاهُ- قَالَ: رَأَيتُ فِي المَسجِدِ قَومًا حِلَقًا جُلُوسًا يَنتَظِرُونَ الصَّلاَةَ فِي كُلِّ حَلقَةٍ رَجُلٌ، وَفِي أَيدِيهِم حصًا، فَيَقُولُ: كَبِّرُوا مِائَةً، فَيُكَبِّرُونَ مِائَةً، فَيَقُولُ: هَلِّلُوا مِائَةً، فَيُهَلِّلُونَ مِائَةً، وَيَقُولُ: سَبِّحُوا مِائَةً، فَيُسَبِّحُونَ مِائَةً، قَالَ: فَمَاذَا قُلتَ لَهُم؟ قَالَ: مَا قُلتُ لَهُم شَيئًا انتِظَارَ رَأيِكَ أَوِ انتظارَ أَمرِكَ- قَالَ: أَفَلاَ أَمَرتَهُم أَن يَعُدُّوا سَيِّئَاتِهِم، وَضَمِنتَ لَهُم أَن لاَ يَضِيعَ مِن حَسَنَاتِهِم، ثُمَّ مَضَى وَمَضَينَا مَعَهُ حَتَّى أَتَى حَلقَةً مِن تِلكَ الحِلَقِ، فَوَقَفَ عَلَيهِم، فَقَالَ: مَا هَذَا الَّذِي أَرَاكُم تَصنَعُونَ؟ قَالُوا: يَا أبا عَبدِ الرَّحمَنِ حصًا نَعُدُّ بِهِ التَّكبِيرَ وَالتَّهلِيلَ وَالتَّسبِيحَ- قَالَ: فَعُدُّوا سَيِّئَاتِكُم، فَأَنَا ضَامِنٌ أَن لاَ يَضِيعَ مِن حَسَنَاتِكُم شَيءٌ وَيحَكُم يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، مَا أَسرَعَ هَلَكَتَكُم هَؤُلاَءِ صَحَابَةُ نَبِيِّكُم ﷺ مُتَوَافِرُونَ، وَهَذِهِ ثِيَابُهُ لَم تَبلَ، وَآنِيَتُهُ لَم تُكسَر، وَالَّذِي نَفسِي بِيَدِهِ، إِنَّكُم لَعَلَى مِلَّةٍ هِيَ أَهدَى مِن مِلَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺ أَو مُفتَتِحُو بَابِ ضَلاَلَةٍ، قَالُوا: وَاللهِ يَا أبا عَبدِ الرَّحمَنِ، مَا أَرَدنَا إِلاَّ الخَيرَ، قَالَ: وَكَم مِن مُرِيدٍ لِلخَيرِ لَن يُصِيبَهُ، إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ حَدَّثَنَا أَنَّ، قَومًا يَقرَءُونَ القُرآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُم، وَايمُ اللهِ مَا أَدرِي لَعَلَّ أَكثَرَهُم مِنكُم، ثُمَّ تَوَلَّى عَنهُم- فَقَالَ عَمرُو بنُ سَلَمَةَ: رَأَينَا عَامَّةَ أُولَئِكَ الحِلَقِ يُطَاعِنُونَا يَومَ النَّهرَوَانِ مَعَ الخَوَارِجِ»[٢].

واته: باوكی عەمری كوڕی يەحيا وتویەتی: ئێمه هەموو جار پێشی نوێژی بەيانی لەلای دەرگای عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود دادەنيشتين، جا هەر كات هاتبایه دەرەوە لەگەڵی دەڕۆيشتين بۆ مزگەوت، جا (شەوێكيان لەو شەوانە) ئەبو موسای ئەشعەری هاته لامان و وتی: ئايا باوكی عەبدوڕڕەحمان (واته: عەبدوڵڵا) هاتۆته دەرەوە بۆ لای ئێوە؟ وتمان: تا ئێستا نەخێر، نەهاتوه، ئەويش لەگەڵمان دانيشت تاوەكو هاته دەرەوە، جا كه هاته دەرەوە هەموومان هەڵساين بۆ لای ئەو و ئەبو مووسا پێی وت: ئەی باوكی عەبدوڕڕەحمان (ئەی عەبدوڵڵا) من پێش ئێستا له مزگەوتدا شتێكم بينی پێم ناخۆش بوو، سوپاس بۆ خوا هيچ شتێكيشم نەبينيوە تەنها چاكه نەبێت (واته: ئەو شتەی بينيم چاكەبوو بە شێوازێكی خراپ)، عەبدوڵڵاش وتی: شتەكه چييه؟ وتی: ئەگەر بمێنی (چەند ساتيتر

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

ژیانت بەردەوام بێت و بگەیتە مزگەوت خۆت) دەیبینی، عەبدوڵلا وتی: ئاخر چیت بینیوە؟ وتی: بینیم لە مزگەوتدا خەڵکانێک چەندین حەلقەیان بەستووە (بە شێوەی بازنەیی) دانیشتوون چاوەڕێی نوێژ دەکەن، لە هەموو حەڵقەیەکدا پیاوێکی تیایە (حەلقەکە بەڕێوە دەبات)و ئەوانی تریش وردە بەردیان لەدەستە، پیاوەکە پێیان دەڵێت: سەد (١٠٠) جار (اللّٰه أكبر) بکەن، ئەوانیش سەد جار (اللّٰه أكبر) دەکەن، دواتر دەڵێت: سەد جار (لا إله إلا الله) بکەن، ئەوانیش سەد جار (لا إله إلا الله) دەکەن، دواتر پێیان دەڵێت: سەد (سبحان الله) بکەن، عەبدوڵلا وتی: تۆ چیت پێ وتن؟ ئەبو مووسا وتی: هیچ شتێکم پێ نەوتن لەبەر چاوەڕوانی بۆچوون و فەرمانی تۆ، عەبدوڵلا وتی: بۆ فەرمانت پێ نەکردن کە تاوانەکانیان ئەژمار بکەن و (واتە: بیر لە تاوانەکانیان بکەنەوە) تۆش زەمانەتی ئەوەیان بکەیت کە کردەوە چاکەکانیان لێ نافەوتێنرێت و بەهەدەر ناڕوات؟! دواتر عەبدوڵلا ڕۆیشت (بۆ مزگەوت) ئێمەش لەگەڵی ڕۆیشتین تا گەیشتە حەلقەیەک لەو حەلقانە و لە بان سەریان وەستا و وتی: ئەوە چیە کە دەیبینم ئێوە دەیکەن؟ وتیان: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان (ئەی عەبدوڵلا) ئەوە وردە بەردن زیکری (اللّٰه أكبر) و (لا إله إلا الله) و (سبحان الله)ی پێ دەژمێرین، عەبدوڵلا وتی: تاوانەکانتان بژمێرن، من زامینم کە هیچ لە کردەوە چاکەکانتان نەفەوتێت، ماڵ کاولینە، ئەی ئوممەتی موحەممەد، چەند زوو خەریکە لە ناوچونتان بگاتێ و (شتی زەحمەت بخەنە سەر ئەستۆتان و دینی ئاسان وەزەحمەت بێخن)، ئەوەتا ئەوانە هاوەڵانی پێغەمبەرەکەتانن هەموویان ماون و زیندوون و، ئەوەش پۆشاکی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە هێشتا نەڕزیوەو، کوپ و پەرداغەکانیشی نەشکاون، (چەند زوو شتتان بۆ دین زیاد کرد)، سوێند بە خوا یان ئێوە لە سەر ڕێچکەیەکن کە هیدایەتی زیاترە لە ڕێچکەی پێغەمبەری خوا ﷺ یان ئێوە ئەو کەسانەن کە دەرگای گومرایی دەکەنەوە، ئەوانیش وتیان: سوێند بە خوا ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان (ئەی عەبدوڵلا)، مەبەستمان هیچ نەبوو جگە لە چاکە، عەبدوڵلاش وتی: زۆر چاکەخواز هەبووە نەیپێکاوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وتوین خەڵکانێک (دەردەکەون) قورئان دەخوێنن و لە گەرویان زیاتر تێپەر ناکات (واتە: ناگاتە دڵیان)، سوێند بە خوا من نازانم، لەوانەیە زۆربەیان لە ئێوەبن، دواتر عەبدوڵلا ڕۆیشت و وازی لێ هێنان.

جا عەمڕی کوڕی سەلەمە وتی: زۆربەی خەڵکەکانی ئەو حەلقانە لەگەڵ خەواریج بوون و شەریان لەگەڵ دەکردین و شمشێریان دژی ئێمە بەرز دەکردەوەو لێیان دەکوشتین ئەو ڕۆژەی شەڕی نەهرەوان بوو.

**٢١١- «عَن أَبِي عَبدِ الرَّحمَنِ، قَالَ: قَالَ عَبدُ اللهِ ﷺ: اتَّبِعُوا وَلاَ تَبتَدِعُوا، فَقَد كُفِيتُم»[١].**

واتە: باوکی عەبدوڕڕەحمان عەبدوڵلای کوڕی حەبیب، وتویەتی: عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ وتویەتی: شوێنکەوتەبن و، بیدعە و داهێنان مەکەن، ئەوە بەستانە.

**٢١٢- «عَن جَابِرِ بنِ عَبدِ اللهِ الأَنصَارِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَحَمِدَ اللهَ وَأَثنَى عَلَيهِ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ أَفضَلَ الهَديِ هَديُ مُحَمَّدٍ ﷺ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحدَثَاتُهَا، وَكُلُّ بِدعَةٍ ضَلاَلَةٌ»[٢].**

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢)ـ إسناده حسن.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و سوپاسی خوای کردو بەچاکە باسی کرد، دواتر وتی: بە دڵنیایی باشترین ڕێگا ڕێگای موحەممەدەو خراپترین کارەکانیش داهێنراوەکانە، هەموو داهێنراوێکیش (لە دیندا) گومڕاییە.

٢١٣- «عَن بِلَادِ بنِ عِصمَةَ، قَالَ: سَمِعتُ عَبدَ اللهِ بنَ مَسعُودٍ ﷺ يَقُولُ، وَكَانَ إِذَا كَانَ عَشِيَّةَ الخَمِيسِ لِيلةِ الجُمُعَةِ، قَامَ فَقَالَ: إِنَّ أَصدَقَ القَولِ قَولُ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ وَإِنَّ أَحسَنَ الهَديِ هَديُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَالشَّقِيُّ مَن شَقِيَ فِي بَطنِ أُمِّهِ، وَإِنَّ شَرَّ الرَّوَايَا رَوَايَا الكَذِبِ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحدَثَاتُهَا، وَكُلُّ مَا هُوَ آتٍ قَرِيبٌ»[١].

واتە: بیلادی کوڕی عیصمەت وتویەتی: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ بوو دەیوت: جا عادەتی بوو عیشایانی پێنج شەمی شەوی هەینی هەڵدەستاو (چەند ئامۆژگاریەکی دەکردو) دەیوت: بە دڵنیایی ڕاسترین وتە وتەی خوایە، باشترین ڕێگا ڕێگەی موحەممەدە ﷺ، بەدبەختیش ئەو کەسەیە کە بەدبەختی بۆ نوسراوە لە سکی دایکی، بە دڵنیایی خراپترین گێڕانەوە گێڕانەوەی درۆیە، خراپترین کارەکانیش داهێنراوەکانە (لە دیندا)، هەر شتێکیش بێ و (ڕووبدات) ئەوە نزیکە (واتە: مادەم وترابێ فڵان شت ڕوودەدات کەواتە حیساب بکە دەیگەیێ و بە نزیکی بزانەو خۆتی بۆ ئامادە بکە).

٢١٤- «عَنِ ابنِ سِيرِينَ، قَالَ: مَا أَخَذَ رَجُلٌ بِبِدعَةٍ فَرَاجَعَ سُنَّةً»[٢].

واتە: ئیبنو سیرین وتویەتی: هیچ کەسێک نیە بیدعەیەک ئەنجام بدات و بگەڕێتەوە بۆ سوننەت (واتە: هەر بیدعەیەک ئەنجامدرا سوننەتێک تیادەچێت و ناگەڕێتەوە).

٢١٥- «عَن ثَوبَانَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: إِنَّمَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي الأَئِمَّةَ المُضِلِّينَ»[٣].

واتە: ثەوبان ﷺ وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: من دەربارەی ئوممەتەکەم تەنها لە پێشەوایانی گومڕاکار دەترسم (واتە: تەنها لەو کەسانە دەترسم کە خەڵک وادەزانن پێشەوای ئایینی چاکن کەچی گومڕاکارن و خەڵکیش گومڕا دەکەن).

٢١٦- «عَن حَيَّةَ بِنتِ أَبِي حَيَّةَ، قَالَت: دَخَلَ عَلَينَا رَجُلٌ بِالظَّهِيرَةِ فَقُلتُ: يَا عَبدَ اللهِ مِن أَينَ أَقبَلتَ؟ قَالَ: أَقبَلتُ أَنَا وَصَاحِبٌ لِي فِي بُغَاءٍ لَنَا فَانطَلَقَ صَاحِبِي يَبغِي وَدَخَلتُ أَنَا أَستَظِلُّ بِالظِّلِّ وَأَشرَبُ مِنَ الشَّرَابِ فَقُمتُ إِلَى لُبَينَةٍ حَامِضَةٍ ورُبَّمَا قَالَت: فَقُمتُ إِلَى ضَيحَةٍ حَامِضَةٍ فَسَقَيتُهُ مِنهَا، فَشَرِبَ وَشَرِبتُ- قَالَت: وتَوَسَّمتُهُ فَقُلتُ: يَا عَبدَ اللهِ مَن أَنتَ؟ فَقَالَ: أَنَا أَبُو بَكرٍ قُلتُ: أَنتَ أَبُو بَكرٍ صَاحِبُ رَسُولِ اللهِ ﷺ الَّذِي سَمِعتُ بِهِ؟ قَالَ: نَعم قَالَت: فَذَكَرتُ غَزوَنَا خَثعَمًا، وَغَزوَةَ بَعضِنَا بَعضًا فِي الجَاهِلِيَّةِ، وَمَا جَاءَ اللهُ بِهِ مِنَ الأُلفَةِ وَأَطنَابِ الفَسَاطِيطِ وَشَبَّكَ ابنُ عَونٍ أَصَابِعَهُ، وَوَصَفَهُ لَنَا مُعَاذٌ، وَشَبَّكَ أَحمَدُفَقُلتُ: يَا عَبدَ اللهِ حَتَّى

---

(١)ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

مَتَى تَرَى أَمرَ النَّاسِ هَذَا؟ قَالَ: مَا استَقَامَتِ الأَئِمَّةُ، قُلتُ: مَا الأَئِمَّةُ؟ قَالَ: أَمَا رَأَيتَ السَّيِّدَ يَكُونُ فِي الحِوَاءِ فَيَتَّبِعُونَهُ وَيُطِيعُونَهُ؟ فَمَا استَقَامَ أُولَئِكَ»[١].

واتە: حەبیەتی کچی ئەبو حەبیەت وتویەتی: لە نیوەڕۆدا پیاوێک هاتە لامان، منیش وتم: ئەی بەندەی خوا لە کوێ هاتووی؟ وتی: من لەگەڵ هاوڕێیەکم هاتووم بۆ پێویستییەکمان، جا هاوڕێیەکەم ڕۆیشتووە بەدوای پێویستیەکەدا دەگەڕێ و، منیش بەدوای سێبەرێکدا دەگەڕێم تا بچمە ژێری و لە خواردنەوەیەکیش بخۆمەوە، (حەبیەت دەڵێ): منیش هەڵسام بۆ لای هەندێک لە دۆم پێداو، ئەویش خواردیەوە و، منیش خواردمەوە، (حەبیەت دەڵێ): منیش نیشانەی چاکەخوازی و چاکەکاریم لێی بەدی کرد، بۆیە وتم: ئەی بەندەی خوا تۆ کێی؟ وتی: من ئەبو بەکرم، وتم: تۆ ئەبو بەکری هاوڕێ و هاوەڵی پێغەمبەری خوای ﷺ کە گوێم لە ناوبانگی بووە؟ وتی: بەڵێ، (حەبیەت وتی): منیش باسی شەڕی هاوپەیمانی خۆمان و شەڕکردنی هەندێکمان لەگەڵ هەندێکیتر لەخۆمان کرد لە سەردەمی نەزانیدا، هەروەها باسی ئەو هۆگربوون و لێک نزیکبوونەوەو تۆکمە کردن و وابەستە بوونی نێوانمانم کرد کە خوا بۆی هێناوین کە (وەک پەتی ڕەشماڵ و، بەستەرە ماسولکە بە هێز و وابەستەیە) جا ئیبنو عەون پەنجەکانی لەیەکتری هەڵکێشا و موعاذیش بۆی وێنا کردووین (چۆن پەنجەکانی لەیەکتری هەڵکێشا) و (ئەحمەد)یش (بە هەمان شێوە)، جا حەبیەت دەڵێ: وتم: ئەی باوکی عەبدوڵلا پێت وایە تا کەی کاروباری خەڵکی ئاوا دەڕوا (لەسەر چاکە و یەکگرتوویی دەمێنێتەوە)؟ وتی: تا ئەو کاتەی کاربەدەستان سەر ڕاست بن، وتم: کام کاربەدەست؟ وتی: ئایا ئەو کاربەدەستە نابینی کە وەک سەرچاوەی ئاوە و خەڵک دوای دەکەون و گوێڕایەڵی دەکەن؟ تا ئەو کاتەی ئەوانە سەر ڕاست بن (کاروباری مسوڵمانان باش دەبێ).

٢١٧- «عَن أَبِي الدَّردَاءِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ أَخوَفُ مَا أَخَافُ عَلَيكُمُ الأَئِمَّةَ المُضِلِّينَ»[٢].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی ترسناکترین شت کە لێتان بترسم بریتیە لە پێشەوا گومڕاکارەکان.

٢١٨- «عَن قَيسِ بنِ أَبِي حَازِمٍ، قَالَ: دَخَلَ أَبُو بَكرٍ ﷺ عَلَى امرَأَةٍ مِن أَحمَسَ يُقَالُ لَهَا زَينَبُ، قَالَ: فَرَآهَا لاَ تَتَكَلَّمُ، فَقَالَ: مَا لَهَا لاَ تَتَكَلَّمُ؟ قَالُوا: نَوت حَجَّةً مُصمِتَةً- فَقَالَ لَهَا: تَكَلَّمِي، فَإِنَّ هَذَا لاَ يَحِلُّ، هَذَا مِن عَمَلِ الجَاهِلِيَّةِ، قَالَ: فَتَكَلَّمَت، فَقَالَت: مَن أَنتَ- قَالَ: أَنَا امرُؤٌ مِنَ المُهَاجِرِينَ- قَالَت: مِن أَيِّ المُهَاجِرِينَ؟ قَالَ: مِن قُرَيشٍ قَالَت: فَمِن أَيِّ قُرَيشٍ أَنتَ؟ قَالَ: إِنَّكِ لَسَئُولٌ، أَنَا أَبُو بَكرٍ قَالَت: مَا بَقَاؤُنَا عَلَى هَذَا الأَمرِ الصَّالِحِ الَّذِي جَاءَ اللهُ بِهِ بَعدَ الجَاهِلِيَّةِ؟ فَقَالَ: بَقَاؤُكُم عليهِ مَا استَقَامَت بِكُم أَئِمَّتُكُم قَالَت وَمَا الأَئِمَّةُ؟ قَالَ: أَمَا كَانَ لِقَومِكِ رُؤَسَاءُ وَأَشرَافٌ يَأمُرُونَهُم فَيُطِيعُونَهُم؟ قَالَت: بَلَى، قَالَ: فَهُم مِثلُ أُولَئِكَ عَلَى النَّاسِ»[٣].

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢)ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح لغيره.

(٣) ـ إسناده صحيح.




واتە: قەیسی كوڕی ئەبو حازیم وتویەتی: ئەبو بەكر ﷺ چووە لای ئافرەتێك لە عەشیرەتی ئەحمەس كە پێی دەوترا: زەینەب، قەیس وتی: ئەبو بەكر ﷺ ئافرەتەكەی بینی قسەی نەدەكرد، وتی: چی بەسەر هاتوە بۆ قسە ناكات؟ وتیان: نیەتی حەجێكی هێناوە بە بێ دەنگی (ئەنجامی بدات)، ئەبو بەكر پێی وت: قسە بكە ئەوە دروست نیە، ئەوە لە كاروكردەوەی سەردەمی نەزانییە، قەیس وتی: جا ئافرەتەكە قسەی كرد و وتی: تۆ كێی؟ وتی: من كەسێكم لە كۆچكەران، ئافرەتەكە وتی: كام كۆچكەران؟ وتی: قورەیشیەكان، ئافرەتەكە وتی: كەواتە تۆ لە كام قورەیشی؟ ئەبو بەكر وتی: تۆ زۆر قسە و پرسیار دەكەی، من ئەبو بەكرم، ئافرەتەكە وتی: مانەوەمان چەندە (تا كەی دەمێنینەوە) لەسەر ئەو بارە چاكەی كە خوا بۆی هێناوین پاشی سەردەمی نەزانی؟ وتی: مانەوەتان لەسەر ئەو بارە چاكە تا ئەو كاتەیە كە پێشەواكانتان لەگەڵتان سەر ڕاستبن، ئافرەتەكە وتی: كێن پێشەواكان؟ وتی: ئایا قەوم و عەشیرەتت سەركردەو گەورەیان نیە كە فەرمانیان پێ دەكەن و ئەوانیش گوێڕایەڵی دەكەن؟ ئافرەتەكە وتی: بەڵێ (سەركردەیان هەیە)، ئەبو بەكر وتی: ئەوان وەك پێشەوا وان لەسەر خەڵكی.

٢١٩- «عَن وَاصِلٍ، عَنِ امرَأَةٍ يُقَالُ لَهَا: عَائِذَةُ، قَالَت: رَأَيتُ ابنَ مَسعُودٍ ﷺ يُوصِي الرِّجَالَ وَالنِّسَاءَ وَيَقُولُ: مَن أَدرَكَ مِنكم مِنَ امرَأَةٍ أَو رَجُلٍ، فَالسَّمتَ الأَوَّلَ السَّمتُ الأَوَّلُ، فَإِنَّكُم عَلَى الفِطرَةِ، قَالَ عَبدُ اللهِ السَّمتُ: الطَّرِيقُ»[1].

واتە: واصیل وتویەتی: ئافرەتێك كە پێیان دەوت عائیذە، ئافرەتەكە وتی: ئیبنو مەسعودم ﷺ بینی ئامۆژگاری پیاو و ئافرەتانی دەكرد و دەیوت: هەر كەسێك لە ئێوەی ژن و پیاو گەیشتن (بە سەردەمی فیتنە و تەفرەقە و ئاشوب) ئەوە (دەست بگرن) بە ڕێبازی سەرەتا (كە ڕێبازی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئێمەیە)، ئێمە ئا ئەو كاتە بێگومان لەسەر فیترەتین، عەبدوڵلا وتی: (السمت): واتە ڕێگا و ڕێباز.

٢٢٠- «عَن زِيَادِ بنِ حُدَيرٍ، قَالَ: قَالَ لِي عُمَرُ ﷺ: هَل تَعرِفُ مَا يَهدِمُ الإِسلاَمَ؟ قَالَ: قُلتُ: لاَ، قَالَ: يَهدِمُهُ زَلَّةُ العَالِمِ، وَجِدَالُ المُنَافِقِ بِالكِتَابِ وَحُكمُ الأَئِمَّةِ المُضِلِّينَ»[2].

واتە: زیادی كوڕی حودەیر وتویەتی: پێشەوا عومەر ﷺ پێی وتم: ئایا دەزانی چ شتێك ئیسلام دەڕوخێنێ؟ دەڵێ وتم: نەخێر، وتی: پێ خلیسكان و لادانی زانا و، مناقەشەی دوو ڕوو بە قورئان و، بڕیاری پێشەوا گومڕاكەرەكان دەیڕوخێنێ.

٢٢١- «عَن مُحَمَّدِ بنِ عَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنهُما، قَالَ: لاَ تُجَالِسُوا أَصحَابَ الخُصُومَاتِ فَإِنَّهُم يَخُوضُونَ فِي آيَاتِ اللهِ»[3].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

واتە: موحەممەدی کوڕی عەلی (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، وتویەتی: لەگەڵ خەڵکانی بە کێشمە کێشم دامەنیشن، چونکە قسە لەسەر ئایەتەکانی خوا دەکەن و دەڕژێنە ناوی (بە ناڕەوا).

٢٢٢- «عَنِ الحَسَنِ قَالَ: سُنَّتُكُم وَاللهِ الَّذِي لاَ إِلَهَ إلاَّ هُوَ بَينَهُمَا: بَينَ الغَالِي وَالجَافِي، فَاصبِرُوا عَلَيهَا رَحِمَكُمُ اللهُ، فَإِنَّ أَهلَ السُّنَّةِ كَانُوا أَقَلَّ النَّاسِ فِيمَا مَضَى، وَهُم أَقَلُّ النَّاسِ فِيمَا بَقِيَ: الَّذِينَ لَم يَذهَبُوا مَعَ أَهلِ الإِترَافِ فِي إِترَافِهِم، وَلاَ مَعَ أَهلِ البِدَعِ فِي بِدَعِهِم، وَصَبَرُوا عَلَى سُنَّتِهِم حَتَّى لَقُوا رَبَّهُم فكذاكم إِن شَاءَ اللهُ فَكُونُوا»[١].

واتە: حەسەن وتویەتی: ڕێگای ئێوە سوێند بەو خوایەی کە هیچ خوایەکی بە هەق نیە جگە لەو، لە نێوان هەردووکیان دایە: لە نێوان زێدەڕۆیی و کەمتەرخەمی دایە، ئارامی لەسەر بگرن یاخوا ڕەحمتان پێ بکات، پێشتر ئەهلی سوننە ژمارەیان کەمترین بووە لە نێوان خەڵکیدا، هەروەها ئەوان کەمترینی خەڵکی دەبن لەوەی ماوە (لەمەودواش)، ئەوانە ئەو کەسانەن کە لەگەڵ خۆشگوزەرانەکاندا ڕێیان نەکرد لە خۆش ڕابواردن و گەمە و گاڵتەدا، هەروەها لەگەڵ ئەهلی بیدعەش ڕێیان نەکرد لە بیدعەکاریداو ئارامیان گرت لەسەر ڕێگاکەیان تا گەیشتن بە پەروەردگاریان، کەواتە ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێ ئێوەش وا بکەن.

٢٢٣- «عَن عَبدِ اللهِ ﷺ قَالَ: القَصدُ فِي السُّنَّةِ خَيرٌ مِنَ الإِجتِهَادِ فِي البِدعَةِ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای (کوڕی مەسعود) ﷺ وتویەتی: کورت کردنەوەی (عیبادەت) تەنها لە سوننەتدا باشترە لە خۆماندووکردن لە بیدعەدا (واتە: جێبەجێ کردنی سوننەت ئەگەر کەمیش بێ باشترە لە ئەنجامدانی عیبادەتی زۆر بە غەیری سوننەت).

## بابەت: شوێنکەوتنی زانایان

٢٢٤- «عَن إِبرَاهِيمَ قَالَ: لَقَد أَدرَكتُ أَقوَامًا لَو لَم يُجَاوِز أَحَدُهُم ظُفرًا، لَمَا جَاوَزتُهُ، كَفَى إِزرَاءً عَلَى قَومٍ أَن تُخَالَفَ أَفعَالُهُم»[٣].

واتە: لە ئیبراهیم گێردراوەتەوە، وتویەتی: گەیشتووم بە کۆمەڵە خەڵکانێک (کۆمەڵە زانایێک) ئەگەر یەکێک لەوان (لە دەستنوێژ شۆردندا) لە نینۆکێک تێنەپەڕیبێ (واتە: تەنها نینۆکێکی شۆردبێ و هیچیتری نەشۆردبا) منیش لەوە تێنەدەپەڕیم (چونکە ئەوەندە کردار و ڕەفتاریان یەک بوو ئاوا متمانەم پێیانە)، هێندە کەمایەتی و گوناهباری کافیە بۆ خەڵکانێک کە کردارەکانیان پێچەوانەبێت (لەگەڵ قسەکانیان).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

٢٢٥- «عَن عَطَاءٍ: ﴿أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ﴿٥٩﴾﴾النساء، قَالَ: أُولُو العِلْمِ وَالفِقهِ، وَطَاعَةُ الرَّسُولِ: اتِّبَاعُ الكِتَابِ وَالسُّنَّةِ»[1].

واتە: لە عەطائەوە گێردراوەتەوە، (دەربارەی ئایەتی): ﴿أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ﴿٥٩﴾﴾النساء، وتویەتی: (أُولِي الْأَمْرِ) واتە: خاوەن زانست و تێگەیشتن لە شەریعەت، گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ واتە: شوێنکەوتنی قورئان و فەرموودە.

٢٢٦- «حَدَّثَنَا إِبرَاهِيمُ بنُ أَدهَمَ، قَالَ: سَأَلتُ ابنَ شُبرُمَةَ عَن شَيءٍ وَكَانَت عِندِي مَسأَلَةٌ شَدِيدَةٌ، فَقُلتُ: رَحِمَكَ اللهُ، انظُر فِيهَا، قَالَ: إِذَا وَضَحَ لِيَ الطَّرِيقُ وَوَجَدتُ الأَثَرَ لَم أَحبَس»[2].

واتە: ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وتویەتی: پرسیارم کرد لە شوبرومە دەربارەی شتێک کە لەلای من بابەتێکی قورس و گران بوو، پێم وت: ڕەحمەتی خوات لێ بێ سەیری ئەو بابەتە بکە (بۆچوونی خۆتم دەربارەی پێ بڵێ)، وتی: ئەگەر بەرچاوم لێ ڕوون بێ و فەرموودەیەک یان شتێکی پێشینە چاکەکانم دەست بکەوێت ناوەستم (فەتوات بۆ دەدەم).

٢٢٧- «قَالَ ابنُ مَسعُودٍ ﷺ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ: تَعَلَّمُوا العِلمَ وَعَلِّمُوهُ النَّاسَ، تَعَلَّمُوا الفَرَائِضَ، وَعَلِّمُوهَا النَّاسَ، تَعَلَّمُوا القُرآنَ، وَعَلِّمُوهُ النَّاسَ، فَإِنِّي امرُؤٌ مَقبُوضٌ، وَالعِلمُ سَيَنقُصُ، وَتَظهَرُ الفِتَنُ، حَتَّى يَختَلِفَ اثنَانِ فِي فَرِيضَةٍ لاَ يَجِدَانِ أَحَدًا يَفصِلُ بَينَهُمَا»[3].

واتە: ئیبنو مەسعود ﷺ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وتووم: خۆتان فێری زانست بکەن و خەڵکیش فێر بکەن، خۆتان فێری میرات بکەن و خەڵکیش فێر بکەن، خۆتان فێری قورئان بکەن و، خەڵکیش فێر بکەن، چونکە من کەسێکم دەمرم، زانستیش کەم دەبێ و فیتنەو ئاشوبی زۆر سەرهەڵدەدەن تا وای لێ دێت دوو کەس ناکۆکیان دەبێ لە میراتدا کەسیان دەست ناکەوێت لێکیان جیابکاتەوە (بابەتەکەیان بۆ ڕوون بکاتەوەو میراتەکەیان بۆ دابەش بکات).

٢٢٨- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: أَرسَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مُعَاذَ بنَ جَبَلٍ وَأَبا مُوسَى رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا إِلَى اليَمَنِ، قَالَ: تَسَانَدَا، وَتَطَاوَعَا، ويسِّرا وَلاَ تُنَفِّرَا، فَقَدِمَا اليَمَنَ، فَخَطَبَ النَّاسَ مُعَاذٌ فَحَضَّهُم عَلَى الإِسلاَمِ، وَأَمَرَهُم بِالتَّفَقُّهِ فِي القرآنِ، وَقَالَ: إِذَا فَعَلتُم ذَلِكَ، فَاسأَلُونِي أُخبِركُم عَن أَهلِ الجَنَّةِ مِن أَهلِ النَّارِ، فَمَكَثُوا مَا شَاءَ اللهُ أَن يَمكُثُوا، فَقَالُوا لِمُعَاذٍ: قَد كُنتَ أَمَرتَنَا إِذَا نَحنُ تَفَقَّهنَا، وَقَرَأنَا أَن نَسأَلَكَ فَتُخبِرَنَا بِأَهلِ الجَنَّةِ مِن أَهلِ النَّارِ- فَقَالَ لَهُم مُعَاذٌ: إِذَا ذُكِرَ الرَّجُلُ بِخَيرٍ، فَهُوَ مِن أَهلِ الجَنَّةِ، وَإِذَا ذُكِرَ بِشَرٍّ فَهُوَ مِن أَهلِ النَّارِ»[4].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لانقطاعه.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ موعاذی کوڕی جەبەل و ئەبو مووسای (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، نارد بۆ یەمەن، فەرمووی: پشتی یەکتری بگرن و، یارمەتی یەکتری بدەن و، ئاسانکار بن و، دوورخەرەوە مەبن (خەڵکی مەڕەوێننەوە)، ئەوانیش چوونە یەمەن و موعاذیش وتاری بۆ خەڵکیدا و هانی دان لەسەر ئیسلام و، فەرمانی پێ کردن بە تێگەیشتن لە قورئان و، وتی: ئەگەر ویستتان و (هەوڵتاندا لە قورئان تێ بگەن) ئەوە پرسیارم لێ بکەن، منیش هەواڵتان پێ دەدەم دەربارەی خەڵکی بەهەشت و خەڵکی دۆزەخ، جا (خەڵکەکە) مانەوە ئەوەندەی خوا ئیزنی لەسەربوو کە بمێننەوە (هەر خەریکی تێگەیشتن و، خوێندنی قورئان بوون)، (دواتر) بە موعاذیان وت: بە دڵنیایی تۆ فەرمانت پێ کردین ئەگەر ئێمە تێگەیشتین (لە قورئان)و خوێندمانەوە پرسیارت لێ بکەین و، تۆش هەواڵمان پێ بدەی بە خەڵکی بەهەشت و خەڵکی دۆزەخ، موعاذیش پێی وتن: ئەگەر کەسێک باس کرا بە چاکە ئەوە لە خەڵکی بەهەشتە، ئەگەر باسیش کرا بە خراپە ئەوە لە خەڵکی ئاگرە.

٢٢٩- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ النَّاسِ أَكرَمُ؟ قَالَ: أَتقَاهُم، قَالُوا: لَيسَ عَن هَذَا نَسأَلُكَ- قَالَ: فَيُوسُفُ بنُ يَعقُوبَ نَبِيُّ اللهِ ابنُ نَبِيِّ اللهِ ابنِ خَلِيلِ اللهِ، قَالُوا: لَيسَ عَن هَذَا نَسأَلُكَ- قَالَ: فَعَن مَعَادِنِ العَرَبِ تَسأَلُونِي؟ خِيَارُهُم فِي الجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُم فِي الإِسلَامِ إِذَا فَقُهُوا»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام لە خەڵکی بەڕێزترینن؟ (پێغەمبەر) فەرمووی: پارێزکارترینیان، وتیان: دەربارەی ئەوە پرسیارت لێ ناکەین (مەبەستمان ئەوە نیە)، فەرمووی: کەواتە (بەڕێزترین کەس) یوسفی کوڕی یەعقوبی پێغەمبەری خوای کوڕی پێغەمبەری خوا کوڕی خۆشەویستی خوا (ئیبراهیم)ە، وتیان: دەربارەی ئەوەش پرسیارت لێ ناکەین (مەبەستمان ئەوە نیە)، فەرمووی: کەواتە دەربارەی ڕەچەڵەکی عەرەب پرسیارم لێ دەکەن؟ چاکترینیان لە سەردەمی نەزانیدا چاکترینیانە لە ئیسلامدا ئەگەر تێبگەن (لە ئیسلام و، ببن بە زانای شەرع زان).

سەرنج: لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵەکانی دوورخستەوە لە پرسیارکردن و دیاری کردنی کەسانێکی دیاریکراوی ناو هۆزو عەشیرەتەکان، تاوەکو مسوڵمانان دوور بکەونەوە لە خۆهەڵکێشان بەسەر یەکتری، بۆیە دەبینین لە هەموو حاڵەتەکان بەڕێزیەکەی گەڕاندەوە بۆ دینداری و تێگەیشتن لە دین نەک بۆ خێڵ و عەشیرەت و ڕەنگێکی دیاریکراو.

٢٣٠- «عَن مُعَاوِيَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَن يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيراً يُفَقِّههُ فِي الدِّينِ»[٢].

واتە: لە موعاویە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک خوا بیەوێ چاکە و خێری پێ ببەخشێت شارەزای دەکات لە ئاین.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

٢٣١- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَن يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيرًا، يُفَقِّههُ فِي الدِّينِ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خوا بیەوێ چاکەو خێری پێ ببەخشێت شارەزای دەکات و حاڵی دەکات لە ئاین.

٢٣٢- «عَن مُعَاوِيَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَن يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيرًا يُفَقِّههُ فِي الدِّينِ»[٢].

واتە: لە موعاویە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک خوا بیەوێ چاکەو خێری پێ ببەخشێت شارەزای دەکات و حاڵی دەکات لە ئاین.

٢٣٣- «عَن مُحَمَّدِ بنِ جُبَيرِ بنِ مُطعِمٍ عَن أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ شَهِدَ خُطبَةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي يَومِ عَرَفَةَ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ: أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي وَاللهِ لاَ أَدرِي لَعَلِّي لاَ أَلقَاكُم بَعدَ يَومِي هَذَا بِمَكَانِي هَذَا، فَرَحِمَ اللهُ مَن سَمِعَ مَقَالَتِي اليَومَ فَوَعَاهَا، فَرُبَّ حَامِلِ فِقهٍ وَلاَ فِقهَ لَهُ، وَرُبَّ حَامِلِ فِقهٍ إِلَى مَن هُوَ أَفقَهُ مِنهُ، وَاعلَمُوا أَنَّ أَموَالَكُم وَدِمَاءَكُم حَرَامٌ عَلَيكُم كَحُرمَةِ هَذَا اليَومِ فِي هَذَا الشَّهرِ فِي هَذَا البَلَد، وَاعلَمُوا أَنَّ القُلُوبَ لاَ تَغُلُّ عَلَى ثَلاَثٍ: إِخلاَصِ العَمَلِ لِلَّهِ، وَمُنَاصَحَةِ أُولِي الأَمرِ، وَعَلَى لُزُومِ جَمَاعَةِ المُسلِمِينَ، فَإِنَّ دَعوَتَهُم تُحِيطُ مِن وَرَائِهِم»[٣].

واتە: لە جوبەیری کوڕی موطعیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە ئامادە بووە لە وتاری پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی عەرەفە لە حەجی ماڵ ئاوایی، (پێغەمبەری خوا ﷺ لەم وتارەدا فەرموویەتی): ئەی خەڵکینە سوێند بە خوا من نازانم بەڵکو پێتان نەگەمەوە دوای ئەم ڕۆژەم لەم جێگایەم، کەواتە ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێ کە ئەمرۆ گوێی لە وتەی من دەبێت و لەبەری دەکات، چونکە ڕەنگە زۆر هەڵگری فیقە هەبن کە فیقهو تێگەشتنی نەبێت (کەواتە: فەرموودەکان لەبەر بکەن ئەگەر بەباشیش لێی تێنەگەن، چونکە فیقهی تیایە، ڕەنگە بە کەسێکی بگەیەنن کە لە فیقهەکە تێبگات)، هەروەها ڕەنگە زۆر هەڵگری فیقە هەبن بڕۆن (بۆ لای کەسانێک) کە لەوان تێگەیشتوترن لە شەریعەت (ئەو کات فەرموودەکە دەگاتە مەبەستی خۆی و زانایان حوکم و بڕیاری شەرعی لێ دەردێنن و سوودی زیاتری دەبێ، کەواتە: لەبەری بکەن).

هەروەها بزانن ماڵەکانتان و خوێنتان حەرامە لەسەر یەکتری، وەک حەرامی (تاوان کردن و سنور بەزاندن) لەم ڕۆژەدا، لەم مانگەدا، لەم شارەدا.

هەروەها بزانن بە دڵنیایی دڵەکان تووشی نەخۆشی و ڕق و ئیرەیی و لادان نابن لە سێ شتدا: لە ئیخلاصی کردەوە بۆ خوا و، ئامۆژگاری کردن و هاندانی کاربەدەستان بۆ کاری چاک و، دەست گرتن بە کۆمەڵی مسوڵمانان و یەک ڕیزی، (بەوەش بیان ناسنەوە) کە بانگەوازەکەیان (کە ئیسلامە) لە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ صحيح.

پشتیانەوە دەورەی داون (واتە: کۆمەڵی مسوڵمانان پشت قایمن بە بانگەوازە ڕاستەکە کە ئیسلامە، کەواتە لەگەڵ ئەوان بن).

٢٣٤- «عَن مُحَمَّدِ بنِ جُبَيرِ بنِ مُطعِمٍ، عَن أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالخَيفِ مِن مِنًى، فَقَالَ: نَضَّرَ اللهُ عَبدًا، سَمِعَ مَقَالَتِي فَوَعَاهَا، ثُمَّ أَدَّاهَا إِلَى مَن لَم يَسمَعهَا، فَرُبَّ حَامِلِ فِقهٍ لاَ فِقهَ لَهُ، وَرُبَّ حَامِلِ فِقهٍ إِلَى مَن هُوَ أَفقَهُ مِنهُ، ثَلاَثٌ لاَ يُغِلُّ عَلَيهِنَّ قَلبُ المُؤمِنِ: إِخلاَصُ العَمَلِ لِلَّهِ، وَطَاعَةُ ذَوِي الأَمرِ، وَلُزُومُ الجَمَاعَةِ فَإِنَّ دَعوَتَهُم تَكُونُ مِن وَرَائِهِم»[١].

واتە: لە جوبەیری کوڕی موطعیمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دۆڵەکەی مینا وەستا و فەرمووی: خوا ڕوخساری ئەو کەسە جوان و درەوشاوە بکات و کە گوێی لە قسەی من دەبێت و لەبەری دەکات، دواتر بیگەیەنێ بەو کەسەی کە گوێی لێ نەبووە، چونکە ڕەنگە زۆر هەڵگری فیقە هەبن کە فیقهو تێگەشتنی نەبێت (کەواتە فەرموودەکان لەبەر بکەن ئەگەر بەباشیش لێی تێ نەگەن)، هەروەها ڕەنگە زۆر هەڵگری فیقە هەبن بگەن بە کەسانێک کە لەوان تێگەیشتوترن (لە شەریعەت).

سێ شت هەن دڵی بڕوادار تووشی ڕق و نەخۆشی و لادان نابێت لەسەریان (شتەکانیش بریتین لە): ئیخلاصی کردەوە بۆ خوا و، گوێڕایەڵی کردنی کاربەدەستان لە کاری چاکە و، دەست گرتن بە کۆمەڵی مسوڵمانان و یەک ڕیزی، (بەوەش بیان ناسنەوە) کە بانگەوازەکەیان (کە ئیسلامە) لە پشتیانەوە دەورەی داون (واتە: کۆمەڵی مسوڵمانان پشت قایمن بە بانگەوازە ڕاستەکە کە ئیسلامە، کەواتە لەگەڵ ئەوان بن ڕێگای ئیسلامەتیتان لێ ون نابێت).

٢٣٥- «عَن عَبدِ الرَّحمَنِ بنِ أَبَانَ بنِ عُثمَانَ، عَن أَبِيهِ، قَالَ: خَرَجَ زَيدُ بنُ ثَابِتٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، مِن عِندِ مَروَانَ بنِ الحَكَمِ، بِنِصفِ النَّهَارِ، قَالَ: فَقُلتُ: مَا خَرَجَ هَذِهِ السَّاعَةَ مِن عِندِ مَروَانَ إِلاَّ وَقَد سَأَلَهُ عَن شَيءٍ، فَأَتَيتُهُ، فَسَأَلتُهُ، قَالَ: نَعم، سَأَلَنِي عَن حَدِيثٍ سَمِعتُهُ مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: نَضَّرَ اللهُ امرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا، فَحَفِظَهُ فَأَدَّاهُ إِلَى مَن هُوَ أَحفَظُ مِنهُ، فَرُبَّ حَامِلِ فِقهٍ لَيسَ بِفَقِيهٍ، وَرُبَّ حَامِلِ فِقهٍ إِلَى مَن هُوَ أَفقَهُ مِنهُ، لاَ يَعتَقِدُ قَلبُ مُسلِمٍ عَلَى ثَلاَثِ خِصَالٍ، إِلاَّ دَخَلَ الجَنَّةَ. -قَالَ: قُلتُ: مَا هُنَّ؟ قَالَ: إِخلاَصُ العَمَلِ، وَالنَّصِيحَةُ لِوُلاَةِ الأَمرِ، وَلُزُومُ الجَمَاعَةِ، فَإِنَّ دَعوَتَهُم تُحِيطُ مَن وَرَاءَهُم، وَمَن كَانَتِ الآخِرَةُ نِيَّتَهُ، جَعَلَ اللهُ غِنَاهُ فِي قَلبِهِ، وَجَمَعَ لَهُ شَملَهُ، وَأَتَتهُ الدُّنيَا وَهِيَ رَاغِمَةٌ، وَمَن كَانَتِ الدُّنيَا نِيَّتَهُ، فَرقَ اللهُ عَلَيهِ شَملَهُ، وَجَعَلَ فَقرَهُ بَينَ عَينَيهِ، وَلَم يَأتِهِ مِنَ الدُّنيَا إِلاَّ مَا قُدِّرَ لَهُ، قَالَ: وَسَأَلتُهُ عَن صَلاَةِ الوُسطَى، قَالَ هِيَ الظُّهرُ»[٢].

واتە: لە ئەبو عەبدورڕەحمانی کوڕی ئەبانی کوڕی عوسمانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زەیدی کوڕی ثابیت (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، لە لای مەڕوانی کوڕی حەکەم دەرچوو لە کاتی نیوەڕۆدا، دەڵێ: منیش (لە

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

دڵی خۆمدا) وتم: (زەید) دەرناچێ لەم کاتەدا لەلای مەڕوان حەتمەن (مەڕوان) پرسیارێکی دەربارەی شتێک لە (زەید) کردوە، (دەڵێ) منیش چووم بۆ لای (زەید) و پرسیارم لێ کرد، وتی: بەڵێ، پرسیاری لێ کردم دەربارەی فەرموودەیەک کە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستبوو کە فەرموویەتی: خوا ڕووی ئەو کەسە جوان و درەوشاوە بکات و (جوانی بەهەشتی پێ ببەخشێت و ڕووی بە بینینی گەشاوە بێت) کە گوێی لە وتەی من دەبێت و لەبەری دەکات، دواتر بیگەیەنێ بەو کەسەی کە لەبەر کردنەکەی زیاتر و تۆکمەترە و بیری ناچێتەوە، چونکە ڕەنگە زۆر هەڵگری فیقە هەبن کە فیقهو تێگەشتنی نەبێت (کەواتە فەرموودەکان لەبەر بکەن ئەگەر بەباشیش لێی تێ نەگەن)، هەروەها ڕەنگە زۆر هەڵگری فیقە هەبن بگەن بە کەسانێک کە لەوان فەقیهتر و تێگەیشتوترن (لە شەریعەت).

دڵی هەر مسوڵمانێک پتەو بێ لەسەر سێ سیفەت حەتمەن دەچێتە بەهەشت، عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: وتم: ئەو سیفاتانە چین؟ وتی: ئیخلاصی کردەوە (بۆ خوا) و، ئامۆژگاری کردن و یارمەتی دانی کاربەدەستان لەسەر کاری چاکەو، دەست گرتن بە کۆمەڵی مسوڵمانان و یەک ڕیزی، (بەوەش بیان ناسنەوە) کە بانگەوازەکەیان (کە ئیسلامە) لە پشتیانەوە دەورەی داون.

وە هەر کەسێک نیەتی دواڕۆژ بێت ئەوە خوا دەوڵەمەندی دەخاتە دڵیەوە، وە کارەکانی بۆ کۆدەکاتەوەو (ئاسانی دەکات)و، دونیا خۆی بە ملکەچی بۆی دێت، هەر کەسێکیش نیەتی دونیا بێت خوا کارەکانی لێ پەرش و بڵاودەکاتەوەو (زەحمەت دەبێت لەسەری)و هەژاری دەخاتە نێوان نێوچاوانیەوە، هیچیشی لە دونیای بۆ نایێ، تەنها ئەوە نەبێت کە بۆی دیاری کراوە.

عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: هەروەها پرسیارم لێ کرد (واتە: لە زەید) دەربارەی (صَلَاَة الوُسطَی) نوێژی ناوەڕاست (کە لە قورئاندا هاتوە ئایا کام نوێژەیە)؟ (زەید) وتی: نیوەڕۆیە.

٢٣٦- «عَن أَبِي الدَّردَاءِ ﷺ، قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: نَضَّرَ اللهُ امرءًا سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا، فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَهُ، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أَوعَى مِن سَامِعٍ، ثَلَاثٌ لاَ يُغِلُّ عَلَيهِنَّ قَلبُ امرِئٍ مُسلِمٍ: إِخلَاصُ العَمَلِ لِلَّهِ، وَالنَّصِيحَةُ لِكُلِّ مُسلِمٍ، وَلُزُومُ جَمَاعَةِ المُسلِمِينَ، فَإِنَّ دُعَاءَهُم مُحِيطٌ مِن وَرَائِهِم»[١].

واتە: لە ئەبو دەردائەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و فەرمووی: خوا ڕووی ئەو کەسە جوان و درەوشاوە بکات و (جوانی بەهەشتی پێ ببەخشێت و ڕووی پێ درەوشاوە بکات) کە گوێی لە فەرموودەی من دەبێت و دەیگەیەنێت بەو شێوەیەی گوێی لێ بووە، ڕەنگە زۆرێک لەوانەی (فەرموودەکەیان) پێ ڕادەگەیەنرێت تێگەیشتوتربن و لەبەرکردنی چاکتریان هەبێ.

سێ شت هەن دڵی مرۆڤی مسوڵمان تووشی ڕق و نەخۆشی و لادان نابێت لەسەریان (شتەکانیش بریتین لە): ئیخلاصی کردەوە بۆ خوا و، ئامۆژگاری کردنی هەموو مسوڵمانێک و، دەست گرتن بە کۆمەڵی مسوڵمانان و یەک ڕیزی، (بەوەش بیان ناسنەوە) کە بانگەوازەکەیان (کە ئیسلامە) لە پشتیانەوە

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

دەورەی داون (واتە کۆمەڵی مسوڵمانان پشت قایمن بە بانگەوازە ڕاستەکە کە ئیسلامە، کەواتە لەگەڵ ئەوان بن ڕێگای ئیسلامەتیتان لێ ون نابێت).

## بابەت: خۆپاراستن لە (گێڕانەوەی) فەرموودە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ و دڵنیایی تیایدا

٢٣٧- «عَن جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَن كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[١].

واتە: لە جابر ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک درۆ بکات بە دەمی منەوە بە ئەنقەست، ئەوە با شوێنێک بۆ خۆی ئامادە بکات لە ئاگر.

٢٣٨- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَن كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک درۆ بکات بە دەمی منەوە بە ئەنقەست، ئەوە با شوێنێک بۆ خۆی ئامادە بکات لە ئاگر.

٢٣٩- «عَنِ الزُّبَيرِ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: مَن حَدَّثَ عَنِّي كَذِبًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[٣].

واتە: لە زوبەیر ﷺ گێڕدراوەتەوە کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە دەیفەرموو: هەر کەسێک فەرموودەیەک بە ناوی منەوە بگێڕێتەوە بە درۆ، ئەوە با شوێنێک بۆ خۆی ئامادە بکات لە ئاگر.

٢٤٠- «عَن يَعلَى بنِ مُرَّةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَن كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[٤].

واتە: لە یەعلای کوڕی موڕرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک درۆ بکات بە دەمی منەوە بە ئەنقەست، ئەوە با شوێنێک بۆ خۆی ئامادە بکات لە ئاگر.

٢٤١- «أَنَّ أَنَسَ بنَ مَالِكٍ ﷺ، يَقُولُ: لَولاَ أَنِّي أَخشَى أَن أُخطِئَ لَحَدَّثتُكُم بِأَشيَاءَ سَمِعتُهَا مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ - أَو قَالَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ - وَذَاكَ أَنِّي سَمِعتُهُ ﷺ يَقُولُ: مَن كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[٥].

واتە: لە ئەنەس کوڕی مالیک ﷺ گێڕدراوەتەوە کە دەیوت: ئەگەر من نەترسم لەوەی هەڵە بکەم، ئەوە شتانێکم بۆ دەگێڕانەوە کە گوێم لێ بوون لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ـ یان پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ صحيح.

(٥) ـ صحيح.

فەرموویەتی ـ لەبەر ئەوەی من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک درۆ بکات بە دەمی منەوە بە ئەنقەست، ئەوە با شوێنێک بۆ خۆی ئامادە بکات لە ئاگر.

٢٤٢- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَن كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقعَدَهُ مِنَ النَّارِ»(١).

واتە: (لە ڕێگایێکی ترەوە هاتوە بە هەمان شێوە) لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک درۆ بکات بە دەمی منەوە بە ئەنقەست، ئەوە با شوێنی خۆی ئامادە بکات لە ئاگر.

٢٤٣- «عَن أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ عَلَى المِنبَرِ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِيَّاكُم وَكَثْرَةَ الحَدِيثِ عَنِّي، فَمَن قَالَ عَلَيَّ، فَلاَ يَقُل إلاَّ حَقًّا، أَو إلاَّ صِدقًا- وَمَن قَالَ عَلَيَّ مَا لَم أَقُل، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقعَدَهُ مِنَ النَّارِ»(٢).

واتە: لە ئەبو قەتادە ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لەسەر مینبەر دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە خۆتان بپارێزن لە زۆر گێڕانەوەی فەرموودە لە منەوە، جا ئەگەر کەسێک قسەی لەسەر من کرد و (فەرموودەیەکی منی گێڕایەوە) با ئەگەر ڕاست نەبێت نەیڵێ، وە هەر کەسێکیش قسە بکات بەناوی منەوە دەربارەی شتێک کە من نەم وتبێت و (باسم نەکردبێت) با شوێنی خۆی ئامادە بکات لە ئاگر.

٢٤٤- «عَن أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَن كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقعَدَهُ مِنَ النَّارِ»(٣).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک درۆ بکات بە دەمی منەوە بە ئەنقەست، ئەوە با شوێنی خۆی ئامادە بکات لە ئاگر.

## بابەت: دەربارەی نەمان و لەناوچوونی زانستی شەرعی

٢٤٥- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ عَمرٍو رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ اللهَ لاَ يَقبِضُ العِلمَ انتِزَاعًا يَنتَزِعُهُ مِنَ النَّاسِ، وَلَكِن: قَبضُ العِلمِ قَبضُ العُلَمَاءِ، فَإِذَا لَم يُبقِ عَالِمًا، اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالاً فَسُئِلُوا، فَأَفتَوا بِغَيرِ عِلمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا»(٤).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی خوا زانست ناباتەوەو هەڵی ناگرێتەوە و بە دەرهێنان تا دەریبێنێ لە (سینگی) خەڵکی، بەڵکو هەڵگرتنەوە و نەمانی زانست بە نەمان و مردنی زانایان دەبێت، تا وای لێدێت یەک زانا نامێنێ، خەڵکیش کەسانێکی زۆر نەزان دەکەن بە پێشەوای خۆیان و پرسیاریان لێ دەکەن (دەربارەی دین و ژین)، ئەوانیش فەتوایان بۆ دەدەن بەبێ زانست و، خۆیان و خەڵکەکەش گومڕا دەکەن.

٢٤٦- «عَن أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: خُذُوا العِلمَ قَبلَ أَن يَذهَبَ قَالُوا: وَكَيفَ يَذهَبُ العِلمُ يَا نَبِيَّ اللهِ، وَفِينَا كِتَابُ اللهِ؟ قَالَ: فَغَضِبَ، ثُمَّ قَالَ: ثَكِلَتكُم أُمَّهَاتُكُم أَوَلَم تَكُنِ التَّورَاةُ وَالإِنجِيلُ فِي بَنِي إِسرَائِيلَ، فَلَم يُغنِيَا عَنهُم شَيئًا؟ إِنَّ ذَهَابَ العِلمِ أَن يَذهَبَ حَمَلَتُهُ، إِنَّ ذَهَابَ العِلمِ أَن يَذهَبَ حَمَلَتُهُ»[1].

واتە: لە ئەبو ئومامە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: زانست وەربگرن و (خۆتان فێر بکەن) پێش ئەوەی بڕوا و نەمێنێ، وتیان: چۆن زانست دەڕوا و نامێنێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا پەرتوکی خوامان تیایە (قورئانمان لە دەستە)؟! (ئەبو ئومامە) دەڵێ: (پێغەمبەری خوا ﷺ) توڕە بوو، دواتر فەرمووی: دایکتان ڕۆڵە ڕۆتان بۆ بکەن، مەگەر تەورات و ئینجیل لەناو بەنی ئیسرائیلدا نەبوو کەچی هیچ سوودی پێ نەگەیاندن؟! ڕۆیشتن و لەناوچوونی زانست بە ڕۆیشتن و مردنی هەڵگرانیەتی، ڕۆیشتن و لەناوچوونی زانست بە ڕۆیشتن و مردنی هەڵگرانیەتی (کە زانایانن).

٢٤٧- «حَدَّثَنَا هِلاَلٌ هُوَ: ابنُ خَبَّابٍ، قَالَ: سَأَلتُ سَعِيدَ بنَ جُبَيرٍ قُلتُ: يَا أَبَا عَبدِ اللهِ ﷺ، مَا عَلاَمَةُ هَلاَكِ النَّاسِ؟ قَالَ: إِذَا هَلَكَ عُلَمَاؤُهُم»[2].

واتە: لە هیلالی کوڕی خەبباب گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە سەعیدی کوڕی جوبەیر کرد وتم: ئەی ئەبو عەبدوڵلا ﷺ نیشانەی لەناوچوونی خەڵکی چیە؟ وتی: کاتێک زاناکانیان لەناو دەچن.

٢٤٨- «عَن سَلمَانَ ﷺ، قَالَ: لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيرٍ مَا بَقِيَ الأَوَّلُ حَتَّى يَتَعَلَّمَ أَو يُعَلِّمَ الآخِرَ، فَإِذَا هَلَكَ الأَوَّلُ قَبلَ أَن يُعَلِّمَ أَو يَتَعَلَّمَ الآخِرُ، هَلَكَ النَّاسُ»[3].

واتە: لە سەلمان ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: خەڵک بە بەردەوامی لە باشیدان، تاوەکو پێشینە مابن و پاشینەکان خۆیان فێر بکەن، جا کاتێک پێشینەکان و (زانایە چاکەکان) مردن پێش ئەوەی پاشینەکان خۆیان لەلا فێر بکەن خەڵک لەناو دەچن.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

٢٤٩- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: هَل تَدرُونَ مَا ذَهَابُ العِلمِ؟ قُلنَا: لاَ قَالَ: ذَهَابُ العُلَمَاءِ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە وتویەتی: ئایا دەزانن ڕۆیشتن و لەناوچونی زانست چیە؟ وتمان: نەخێر، وتی: ڕۆیشتن و لەناوچونی زانایانە.

٢٥٠- «عَن أَبِي وَائِلٍ، قَالَ: قَالَ حُذَيفَةُ ﷺ: أَتَدرِي كَيفَ يُنقَصُ العِلمُ؟ قَالَ: قُلتُ: كَمَا يُنفَضُ الثَّوبُ، وَكَمَا يَقسُو الدِّرهَمُ- قَالَ: لاَ، وَإِنَّ ذَلِكَ لَمِنهُ، قَبضُ العِلمِ: قَبضُ العُلَمَاءِ»[٢].

واتە: لە ئەبو وائیل ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: حوذەیفە وتی: ئایا دەزانی چۆن زانست کەم دەبێت؟ دەڵێ وتم: وەک کەم بوونی (ڕەنگی) جل و بەرگ و هەروەها وەک ڕەق بوون و (کاڵبوونەوەو لوس بوونی) درهەم (بەهۆی زۆر بەکارهێنان و لێک خشانیان لەناو گیرفان)، دەڵێ (ئیبنو عەبباس) وتی: نەخێر، ئەوەی باست کرد ڕاستە بەو شێوەیە (بەڵام) نەمانی زانست بە نەمانی زانایانە.

٢٥١- «عَن أَبِي الدَّردَاءِ ﷺ قَالَ: مَا لِي أَرَى عُلَمَاءَكُم يَذهَبُونَ وَجُهَّالَكُم لاَ يَتَعَلَّمُونَ؟ تعلَّموا قَبلَ أَن يُرفَعَ العِلمُ، فَإِنَّ رَفعَ العِلمِ ذَهَابُ العُلَمَاءِ»[٣].

واتە: لە ئەبو دەرِدائەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: ئەوە چیە بۆ دەبینم زاناکانتان دەڕۆن و وەفات دەکەن و نەزانەکانیشتان خۆیان فێر ناکەن؟ خۆتان فێر بکەن پێش ئەوەی زانست هەڵبگیرێ، چونکە بە دڵنیایی هەڵگرتنەوەی زانست بە ڕۆیشتن و وەفات کردنی زانایانە.

٢٥٢- «عَن أَبِي الدَّردَاءِ ﷺ، قَالَ: النَّاسُ عَالِمٌ، وَمُتَعَلِّمٌ، وَلاَ خَيرَ، فِيمَا بَعدَ ذَلِكَ»[٤].

واتە: لە ئەبو دەرِدائەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: خەڵک (دوو جۆرن کە سوودیان هەبێت، کە بریتین لە) زاناو قوتابی زانست، لەوە بترازێ ئەوەیتر سوودی نیە.

٢٥٣- «عَن أَبِي الدَّردَاءِ ﷺ قَالَ: مُعَلِّمُ الخَيرِ، وَالمُتَعَلِّمُ فِي الأَجرِ سَوَاءٌ، وَلَيسَ لِسَائِرِ النَّاسِ بَعدُ خَيرٌ»[٥].

واتە: لە ئەبو دەرِدائەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: زاناو مامۆستای سوودبەخش و فێرخوازو قوتابی زانستی سوود بەخش، لە پاداشت وەکو یەکن، خەڵکی تریش (جگە لەو دوو جۆرە کەسە) هیچ سوودیان نیە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لانقطاعه

(٤) ـ إسناده ضعيف، لانقطاعه.

(٥) ـ رجاله ثقات، إلا أنه منقطع.

٢٥٤- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ مَسعُودٍ ﷺ، قَالَ: اغدُ عَالِمًا أَو مُتَعَلِّمًا أَو مُستَمِعًا، وَلاَ تَكُنِ الرَّابِعَ فَتَهلِكَ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: ببە بە زانا، یانیش فێرخواز (قوتابی)، یانیش گوێگری زانست، نەبیتە چوارەمیان، چونکە لەناودەچیت.

٢٥٥- «قَالَ سَلمَانُ ﷺ: لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيرٍ مَا بَقِيَ الأَوَّلُ حَتَّى يَتَعَلَّمَ الآخِرُ، فَإِذَا هَلَكَ الأَوَّلُ قَبلَ أَن يَتَعَلَّمَ الآخِرُ، هَلَكَ النَّاسُ»[٢].

واتە: لە سەلمان ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: خەڵک بە بەردەوامی حاڵیان باشە، تاوەکو پێشینە مابن بۆ ئەوەی پاشینەکان خۆیانیان لەلا فێر بکەن، جا کاتێک پێشینەکان مردن پێش ئەوەی پاشینەکان خۆیان لەلا فێر بکەن، ئەوە خەڵک لەناو دەچێ.

٢٥٦- «عَنِ الأَحنَفِ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ ﷺ تَفَقَّهُوا قَبلَ أَن تُسودوا»[٣].

واتە: لە ئەحنەف گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ وتی: خۆتان فێری فیقهو تێگەیشتن و (زانست) بکەن پێش ئەوەی ببن بە سەرکردەو گەورە (یان پێش ئەوەی تەمەنتان گەورە بێت و ببن بە خاوەن خێزان و گەورەی ماڵ، چونکە مرۆڤ لەو حاڵەتانە شەرم دەکات لەگەڵ قوتابی بچوک دابنیشێت و، خۆی فێری زانست بکات، وە لەبەر ئەوەی مەسئولیەت و مەشغوڵی زیاتر دروست دەبێ و کات کەم دەبێتەوە بۆ بەدەست هێنانی زانست).

٢٥٧- «عَن تَمِيمٍ الدَّارِيِّ ﷺ، قَالَ: تَطَاوَلَ النَّاسُ فِي البِنَاءِ فِي زَمَنِ عُمَرَ ﷺ فَقَالَ عُمَرُ: يَا مَعشَرَ العُرَيبِ، الأَرضَ الأَرضَ، إِنَّهُ لاَ إِسلاَمَ إِلاَّ بِجَمَاعَةٍ، وَلاَ جَمَاعَةَ إِلاَّ بِإِمَارَةٍ، وَلاَ إِمَارَةَ إِلاَّ بِطَاعَةٍ، فَمَن سودهُ قَومُهُ عَلَى الفِقهِ، كَانَ حَيَاةً لَهُ وَلَهُم، وَمَن سودهُ قَومُهُ عَلَى غَيرِ فِقهٍ، كَانَ هَلاَكًا لَهُ وَلَهُم»[٤].

واتە: لە تەمیمی داری ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: خەڵکی زێدەڕۆییان کرد لە بەرزکردنەوەی خانوودا لە سەردەمی عومەردا، عومەریش ﷺ وتی: ئەی کۆمەڵانی عەرەب (بەزەییتان بێتەوە) بە زەوی، بە زەوی، بە دڵنیایی ئیسلام بەبێ جەماعەت و کۆمەڵ نابێت، جەماعەتیش بەبێ دەوڵەت نابێت، دەوڵەتیش بەبێ گوێڕایەڵی نابێت، جا هەر کەسێک گەلەکەی بیکەن بە گەورە (لەسەر بنەمای شارەزاییەکەی لە) فیقهو تێگەیشتن لە ئاین، ئەوە ژیانی ڕاستەقینەیە بۆ ئەوو ئەمان (واتە: بۆ خۆی و گەلەکە)، وە هەر کەسێکیش گەلەکەی بیکەن بە گەورەو سەرکردە (لەسەر بنەمای) غەیری فیقهو تێگەیشتنی ئاین، ئەوە لەناوچوونە بۆ ئەوو ئەمان (بۆ خۆی و گەلەکە).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف منقطع.

## بابەت: کار کردن بە زانست و نیەت چاکی تیایدا

٢٥٨- «أَنَّ المُهَاصِرَ بنَ حَبِيبٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَالَ اللهُ تَعَالَى: إِنِّي لَستُ كُلَّ كَلَامِ الحَكِيمِ أَتَقَبَّلُ، وَلَكِنِّي أَتَقَبَّلُ هَمَّهُ وَهَوَاهُ، فَإِن كَانَ هَمُّهُ وَهَوَاهُ فِي طَاعَتِي، جَعَلتُ صَمتَهُ حَمدًا لِي وَوَقَارًا، وَإِن لَم يَتَكَلَّم»(١).

واتە: لە موهاصیری کوڕی حەبیبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی خوای بەرز لە (فەرموودەیەکی قودسی)، فەرموویەتی: من هەموو وتەیەکی کەسی دانا وەرناگرم، بەڵکو ویست و ئارەزووی وەردەگرم، جا ئەگەر ویست و ئارەزووی لە گوێڕایەڵی من بێت، ئەوە بێ دەنگیەکەی دەکەم بە سوپاس گوزاری و سەنگینی، هەر چەندە قسەش نەکات (هەر بۆی بە حەمد دادەنرێت).

٢٥٩- «عَن أَبِي الزَّاهِرِيَّةِ، يَرفَعُ الحَدِيثَ أَنَّ اللهَ قَالَ: أَبُثُّ العِلمَ فِي آخِرِ الزَّمَانِ حَتَّى يَعلَمَهُ الرَّجُلُ وَالمَرأَةُ، وَالعَبدُ وَالحُرُّ، وَالصَّغِيرُ وَالكَبِيرُ، فَإِذَا فَعَلتُ ذَلِكَ بِهِم، أَخَذتُهُم بِحَقِّي عَلَيهِم»(٢).

واتە: لە ئەبو زاهیریە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا دەفەرموێ: زانست بڵاو دەکەمەوە لە کۆتایی زەماندا تاوەکو وای لێ دێت پیاو و، ژن و، بەندە و، ئازاد و، بچوک و، گەورە، فێری دەبن، جا ئەگەر ئاوام لەگەڵ کردن ئەوە ئەوانم گرتووە بە هەقی خۆم لەسەریان (چونکە بیانوو بڕاوم کردوون).

٢٦٠- «عَنِ الحَسَنِ، قَالَ: مَن طَلَبَ شَيئًا مِن هَذَا العِلمِ فَأَرَادَ بِهِ مَا عِندَ اللهِ، يُدرِك إِن شَاءَ اللهُ، وَمَن أَرَادَ بِهِ الدُّنيَا، فَذَاكَ وَاللهِ حَظُّهُ مِنهُ»(٣).

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک داوای بەشێک لەو زانستە بکات و مەبەستی پێ پاداشتی لای خوا بێ (إن شاءالله) پێی دەگات، هەر کەسێکیش مەبەستی پێ دونیا بێت ئەوە سوێند بە خوا ئەوە بەشەکەیەتی (کە لە دونیا پێی دەگات).

٢٦١- «قَالَ ابنُ مَسعُودٍ ﷺ: لَا تَعَلَّمُوا العِلمَ لِثَلَاثٍ لِتُمَارُوا بِهِ السُّفَهَاءَ، وَتُجَادِلُوا بِهِ العُلَمَاءَ، وَلِتَصرِفُوا بِهِ وُجُوهَ النَّاسِ إِلَيكُم، وَابتَغُوا بِقَولِكُم مَا عِندَ اللهِ، فَإِنَّهُ يَدُومُ وَيَبقَى وَيَنفَدُ مَا سِوَاهُ»(٤).

واتە: لە ئیبنو مەسعود ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆتان فێری زانست مەکەن بۆ سێ شت: بۆ ئەوەی کێشمە کێشمی پێ بکەن لەگەڵ نەزاناندا و، بۆ ئەوەی مناقەشەی پێ بکەن لەگەڵ زاناياندا،

---

(١) ـ مرسل، وإسناده ضعيف.

(٢) مرسل، وأسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف جداً.

بۆ ئەوەی ڕووی خەڵکی بەلای خۆتانەوە وەچەرخێنن و ڕووتان تێ بکەن، (نەکەن مەبەستتان ئەوانە بێت، بەڵکو با) مەبەستتان بە قسەکانتان پاداشتی لای خوا بێت، چونکە هەر ئەو بەردەوام دەبێت و دەمێنێتەوە و جگە لەوە نامێنێت و لەناو دەچێت.

٢٦٢- «وَبِهَذَا الإِسنَادِ قَالَ: كُونُوا يَنَابِيعَ العِلمِ مَصَابِيحَ الهُدَى، أَحلاَسَ البُيُوتِ، سُرُجَ اللَّيلِ، جُدُدَ القُلُوبِ، خُلقَانَ الثِّيَابِ، تُعرَفُونَ فِي أَهلِ السَّمَاءِ، وَتَخفَونَ عَلَى أَهلِ الأَرضِ»(١).

واتە: هەر بەو سەنەد و ڕێگایەی پێشتر هاتوە (ئیبنو مەسعود لەگەڵ قسەکانی پێشتر) ئەوەندەشی وتووە: بن بە کانی و سەرچاوەی زانست و، چرای ڕێنمویی و، ڕایەخی ماڵ و (واتە: وەک ڕایەخ لە ماڵ بمێننەوە و زۆر دەرمەچن) و، بن بە چرای شەو و، (خاوەن) دڵی نوێ و بێ خەوش و، جل دڕاو، (ئەو کات) دەناسرێن لەلای خەڵکی ئاسمان (لەلای فریشتەکان) و، شاراوەش دەبن و ناناسرێن لەلای خەڵکی زەمین.

٢٦٣- «حَدَّثَنِي عَبدُ اللهِ بنُ عَبدِ الرَّحمَنِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَطلُبُ هَذَا العِلمَ أَحَدٌ لاَ يُرِيدُ بِهِ إِلاَّ الدُّنيَا، إِلاَّ حَرَّمَ اللهُ عَلَيهِ عَرفَ الجَنَّةِ يَومَ القِيَامَةِ»(٢).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێک نیە داوای ئەو زانستە (زانستی شەرعی) بکات و خۆی فێر بکات مەبەستی هیچ نەبێت جگە لە (بەدەست هێنانی) دونیا، ئەوە حەتمەن خوا بۆنی بەهەشتی لەسەر حەڕام دەکات لە ڕۆژی دواییدا و (ناچێتە بەهەشت).

٢٦٤- «عَن مَالِكِ بنِ مِغوَلٍ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لِلشَّعبِيِّ: أَفتِنِي أَيُّهَا العَالِمُ، فَقَالَ: العَالِمُ مَن يَخَافُ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ»(٣).

واتە: لە مالیکی کوڕی میغوەل گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک بە شەعبی وت: فەتوام بۆ بدە ئەی زانا: شەعبیش وتی: زانا ئەو کەسەیە کە لە خوای زاڵی پایەدار دەترسێ.

٢٦٥- «عَن عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: تَعَلَّمُوا العِلمَ، تُعرَفُوا بِهِ، وَاعمَلُوا بِهِ، تَكُونُوا مِن أَهلِهِ، فَإِنَّهُ سَيَأتِي بَعدَ هَذَا زَمَانٌ لاَ يَعرِفُ فِيهِ تِسعَةُ عُشَرَائِهِمُ المَعرُوفَ، وَلاَ يَنجُو مِنهُ إِلاَّ كُلُّ نُوَمَةٍ فَأُولَئِكَ أَئِمَّةُ الهُدَى وَمَصَابِيحُ العِلمِ، لَيسُوا بِالمَسَايِيحِ وَلاَ المَذَايِيعِ البُذرِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: نُوَمَةٌ: غَافِلٌ عَنِ الشَّرِّ، المَذَايِيعُ: كَثِيرُ الكَلاَمِ، وَالبُذرُ: النَّمَّامُونَ»(٤).

---

(١) ـ إسناده ضعيف جداً.

(٢) ـ مرسل، وإسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ رجاله ثقات، إلا أنه منقطع.

واتە: لە عەلی ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فێری زانست بن، پێی دەناسرێن، کاری پێ بکەن دەبن بە بەشێک لە ئەهلەکەی، چونکە بە دڵنیایی لە پاشی ئێستا زەمانێک دێت لە دە بەشی خەڵکی نۆ بەشیان چاکە و هەق ناناسن، کەسیشیان ڕزگاری نابێت جگە لە ئەو کەسەی کە لە شەڕ و خراپە بێ ئاگابێ، ئا ئەمانە پێشەوای ڕێنمویی و چرای زانستن، کە شەڕو خراپەو نەمیمی لە نێوانی خەڵکی نانێنەوە و، قسەی خراپ بڵاو ناکەنەوە کە گوێیان لێ دەبێت.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (نُوَمَةٌ): واتە: بێ ئاگا لە شەڕ و خراپە، (المَذَايِيعُ): واتە: زۆر بڵێ، (وَالبُذرُ): واتە: ئەو کەسەی قسە دێنێ و دەبات لە نێوان خەڵک.

٢٦٦- «قَالَ مُعَاذُ بنُ جَبَلٍ ﷺ، اعمَلُوا مَا شِئتُم بَعدَ أَن تَعلَمُوا، فَلَن يَأجُرَكُمُ اللهُ تَعَالَى بِالعِلمِ حَتَّى تَعمَلُوا»[١].

واتە: موعاذی کوڕی جەبەل ﷺ وتویەتی: چ کردەوەیەکی (چاکتان) دەوێت ئەنجامی بدەن، پاش ئەوەی فێری دەبن، چونکە خوای بەرز پاداشتتان ناداتەوە بەهۆی زانست تاوەکو کاری پێ دەکەن.

٢٦٧- «عَن سَعدٍ أَنَّهُ أَتَى ابنَ مُنَبِّهٍ فَسَأَلَهُ عَنِ الحَسَنِ وَقَالَ لَهُ: كَيفَ عَقلُهُ؟ فَأَخبَرَهُ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّا لَنَتَحَدَّثُ، أَو نَجِدُ فِي الكُتُبِ، أَنَّهُ مَا آتَى اللهُ سُبحَانَهُ عَبدًا عِلمًا فَعَمِلَ بِهِ عَلَى سَبِيلِ الهُدَى، فَيَسلُبَهُ عَقلَهُ حَتَّى يَقبِضَهُ اللهُ إِلَيهِ»[٢].

واتە: لە سەعد گێڕدراوەتەوە کە چۆتە لای ئیبنو مونەببیهو پرسیاری لێکردوە دەربارەی حەسەنی بەصری و پێی وتووە: بیرکردنەوەو فکرەی (حەسەن) چۆنە؟ ئەویش هەواڵی پێداوەو بۆی ڕوون کردۆتەوە، دواتر وتویەتی: بە دڵنیایی خوای پاک زانستێک نادات بە بەندەیەکی ئەویش کاری پێ کردبێت لەسەر ڕێگای ڕاست و دواتر عەقڵی لێ بسەنێتەوە، تا ئەو کاتەی دەیباتەوە لای خۆی (واتە: خوای کاربەجێ زانست و کردار نادات بە کەسێک و دواتریش عەقڵی لێ بسەنێتەوە، بەو واتایەی دژی بڕیارەکانی شەرع بڕیار بدات (خوا شتی وا ناکات) حەسەنی بەصریش لەو کەسانەیە).

سەرنج: ئەو پرسیارەی لێرەدا کراوە دەربارەی حەسەنی بەصری لەبەر ئەوەیە: نەیارانی حەسەنی بەصری هەندێک قسەیان بەناوی ئەوەوە بڵاو کردبۆوە کە بابەتی هەستیار بوون، جا لێرەدا سەعد بۆیە پرسیار دەکات تا ڕاستی ئەو قسانەی بۆ دەربکەوێت، جا ئیبنو مونەببیە بۆی ڕوون کردەوە کە حەسەن زانست و کردەوەی باشی هەیە، چۆن خوا عەقڵی لێ دەسەنێ و، پێچەوانەی شەرع بڕیار دەدات! (ئەو پڕوپاگەندانە ڕاست نین).

---

(١) ـ رجاله ثقات، إلا أنه منقطع.

(٢) ـ رجاله ثقات.

٢٦٨- «حَدَّثَنِي أَبُو كَبشَةَ السَّلُولِيُّ، قَالَ: سَمِعتُ أبا الدَّردَاءِ ﷺ، يَقُولُ: إِنَّ مِن أَشَرِّ النَّاسِ عِندَ اللهِ مَنزِلَةً يَومَ القِيَامَةِ، عَالِمٌ لاَ يَنتَفِعُ بِعلِمِهِ»[١].

واتە: لە ئەبو كەبشەی سەلولی وتویەتی: گوێم لە ئەبو دەرداء ﷺ بوو دەیوت: بە دڵنیایی خراپترینی خەڵكی لە ڕووی پلەو پایە لەلای خوا لە ڕۆژی دوایی زانایێكە سوود لە زانستەكەی وەرنەگرێت.

٢٦٩- «عَن مَالِكِ بنِ دِينَارٍ، قَالَ: قَالَ أَبُو الدَّردَاءِ ﷺ مَن يَزدَد عِلمًا، يَزدَد وَجَعًا»[٢].

واتە: لە مالیكی كوڕی دینار گێڕدراوەتەوە وتویەتی ئەبو دەرداء ﷺ وتویەتی: هەر كەسێك زانست زیاد بكات ئازار (بۆ خۆی) زیاد دەكات.

(چونكە ئەگەر كاری پێ نەكات تووشی ئاگری دۆزەخ دەبێت، ئەگەر كاریشی پێ بكات تووشی كرداری زۆر و، ماندوبوونی زۆر دەبێت و، پرسیاری زۆری لێ دەكرێت و، خەمی زیاتر دەخوات و، زیاتر بیر دەكاتەوە، ئەمانەش هەمووی ئازاری تیایە، بەڵام پلەو پایەكەشی هەر لەبەر ئەوەیە).

٢٧٠- «قالَ أَبُو الدَّردَاءِ ﷺ: مَا أَخَافُ عَلَى نَفسِي أَن يُقَالَ لِي: مَا عَلِمتَ، وَلَكِن أَخَافُ أَن يُقَالَ لِي: مَاذَا عَمِلتَ؟»[٣].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ وتویەتی: لە خۆم ناترسم پێم بوترێت: چی دەزانی؟ بەڵكو دەترسم پێم بوترێت: چیت ئەنجام داوە؟ (واتە: لێپێچینەوە زیاتر لەسەر كردەوەیە نەوەك زانست).

٢٧١- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: تَدَارُسُ العِلمِ سَاعَةً مِنَ اللَّيلِ، خَيرٌ مِن إِحيَائِهَا»[٤].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە وتویەتی: وتنەوەی زانست و زانیاری لە كاتێك لە كاتەكانی شەو، خێری زیاترە و چاكترە لە زیندوو كردنەوەی شەو بە شەونوێژ (واتە: زانست لە پەرستش گەورەترە).

سەرنج: چونكە شەونوێژ و عیبادەت تەنها سوودی بۆ خاوەنەكەی هەیە، بەڵام زانست سوودی بۆ هەموو خەڵكی هەیە.

٢٧٢- «قَالَ أَبُو هُرَيرَةَ ﷺ، إِنِّي لأَجزِيءِ اللَّيلَ ثَلاَثَةَ أَجزَاءٍ: فَثُلُثٌ أَنَامُ، وَثُلُثٌ أَقُومُ، وَثُلُثٌ أَتَذَكَّرُ أَحَادِيثَ رَسُولِ اللهِ ﷺ»[٥].

---

(١) ـ إسناده ضعيف جداً.

(٢) ـ إسناده ضعيف منقطع.

(٣) ـ إسناده ضعيف منقطع.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ وتویەتی: من شەو دەکەم بە سێ بەش: یەک لەسەر سێی دەخەوم، یەک لەسەر سێشی هەڵدەستمەوەو شەونوێژو عیبادەت دەکەم، یەک لەسەر سێشی دەوری فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەمەوە (موراجەعەیان دەکەمەوە، تاوەکو لە بیرم نەچنەوە).

٢٧٣- «عَن إبرَاهِيمَ، قَالَ: مَنِ ابتَغَى شَيئًا مِنَ العِلمِ يَبتَغِي بِهِ وَجهَ اللهِ سُبحَانَهُ، آتَاهُ اللهُ مِنهُ مَا يَكفِيهِ»(١).

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە وتویەتی: هەر کەسێک بیەوێ هەندێک لە زانست فێر ببێت مەبەستی بەو زانستە ڕەزامەندی خوا بێت، ئەوە خوا ئەوەندە زانستەی پێ دەبەخشێت کە بەشی دەکات (واتە: بە ئەندازەی چاکی نیەتەکەی خوا زانستی پێ دەبەخشێت، بە شێوەیەک زانستەکە بەشی نیەتەکەی بکات، بێ زیادو کەم).

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسانەی ترساون لە فەتوادان و گێڕانەوەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ترسی هەڵە کردن

٢٧٤- «حَدَّثَنَا عَاصِمٌ، قَالَ: سَأَلتُ الشَّعبِيَّ، عَن حَدِيثٍ فَحَدَّثَنِيهِ، فَقُلتُ: إِنَّهُ يُرفَعُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: لاَ عَلَى مَن دُونَ النَّبِيِّ ﷺ أَحَبُّ إِلَينَا فَإِن كَانَ فِيهِ زِيَادَةٌ أَو نُقصَانٌ، كَانَ عَلَى مَن دُونَ النَّبِيِّ ﷺ »(٢).

واتە: لە عاصم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە شەعبی کرد دەربارەی فەرموودەیەک کە بۆ منی گێڕابوویەوەو (نەیووت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی) وتم: ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕدرێتەوە (هی ئەوە، چونکە لە زانای ترەوە گوێم لێ بووە)! شەعبیش وتی: نەخێر (بە هی ئەوی دانانێم)، (ئێمە فەرموودەکە بگێڕینەوە) بۆ جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان خۆشترە، چونکە ئەگەر زیادەیەک یان نەقسێکی تیا بێت دەکەوێتە سەر غەیری پێغەمبەری خوا ﷺ.

(واتە: تا دڵنیا نەبین و نەزانین ئەو وتەیە هی پێغەمبەری خوایە ﷺ ئەوە بەناوی ئەوەوە باسی ناکەین نەوەک هەڵەمان کردبێت، کەواتە ئەگەر هەڵەی تیا بێت یان زیاد کرابێت یان کەم کرابێت دەکەوێتە سەر جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ).

٢٧٥- «عَن إبرَاهِيمَ، قَالَ نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ المُحَاقَلَةِ وَالمُزَابَنَةِ فَقِيلَ لَهُ: أَمَا تَحفَظُ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ حَدِيثًا غَيرَ هَذَا، قَالَ: بَلَى، وَلَكِن أَقُولُ قَالَ: عَبدُ اللهِ، قَالَ عَلقَمَةُ، أَحَبُّ إِلَيَّ»(٣).

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ حەرامی کردووە دانەوێڵە بفرۆشرێت پێش ئەوەی پێ بگات، هەروەها (حەرامی کردووە) شتێک بفرۆشرێت کە ئەندازەو کێشان و پێوانەی

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ مرسل، وإسناده صحيح.

دیار نیە چەندە (چونکە فێڵ و زەرەری تیا ڕوو دەدات)، جا بە ئیبراهیم وترا: ئایا فەرموودەیەکی ترت لەبەر نەکردووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ جگە لەو فەرموودەیە؟ وتی: بەڵێ (لەبەرم کردووە)، بەڵام (بۆ فەرموودەکانی تر) دەڵێم: عەبدوڵلا وتویەتی، (یان) عەلقەمە وتویەتی، ئەوە لام خۆشەویستتر و باشترە.

(واتە ناڵێم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، بەڵکو بۆ عەبدوڵلاو عەلقەمە دەیگێڕمەوە، چونکە زۆر دڵنیا نیم و دەترسم هەڵە بکەم و ببێتە درۆ بە دەمی پێغەمبەری خواوە ﷺ، بۆیە زۆر دڵنیا نەبم ناڵێم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی).

٢٧٦- «عَن إِسمَاعِيلَ بنِ عُبَيدِ اللهِ، قَالَ: كَانَ أَبُو الدَّردَاءِ ﷺ، إِذَا حَدَّثَ بِحَدِيثٍ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: هَذَا: أَو نَحوَهُ، أَو شِبهَهُ، أَو شَكلَهُ»[١].

واتە: لە ئیسماعیلی کوڕی عوبەیدوڵلا گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئەبو دەرداء ﷺ کە فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕایەوە دەیوت: ئاوای فەرمووە، یان وەکو ئەوەی فەرمووە، یان هاوشێوەی ئەوەی فەرمووە، یان بەو جۆرەی فەرمووە.

(واتە: لە ترسی ئەوەی وشەیەکی گۆڕی بێ و، هاوشێوەی وشەکەی بەکار هێنابێت، بۆیە دەترسا بڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای فەرمووە، چونکە ڕەنگە هەمان وشەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبووبێت، هەر چەندە ماناشیان یەک بووبێت، هەر وشە بەکار هاتوەکانی پاڵ نەدەدا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لێی دڵنیا نەبوایە، بەڵکو دەیوت: شتێکی ئاوای فەرموو).

٢٧٧- «عَن رَبِيعَةَ بنِ يَزِيدَ، قَالَ: كَانَ أَبُو الدَّردَاءِ ﷺ، إِذَا حَدَّثَ حَدِيثًا، قَالَ: اللهُمَّ إلاَّ هَكَذَا، أَو كَشَكلِهِ»[٢].

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی یەزید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئەبو دەرداء ﷺ کە فەرموودەیەکی دەگێڕایەوە دەیوت: ئەی خوایە، پێغەمبەری خوا وەکو ئەوەی فەرموو، یان هاوشێوەی ئەوەی فەرموو.

٢٧٨- «عَن عَمرِو بنِ مَيمُونٍ، قَالَ: كُنتُ لاَ تَفُوتُنِي عَشِيَّةُ خَمِيسٍ إلاَّ وَآتِي فِيهَا عَبدَ اللهِ بنَ مَسعُودٍ ﷺ، فَمَا سَمِعتُهُ يَقُولُ لِشَيءٍ، قَطُّ: قَالَ رَسُولُ اللهِ، حَتَّى كَانَت ذَاتَ عَشِيَّةٍ فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَالَ: فَاغرَورِقَت عَينَاهُ وَانتَفَخَت أَودَاجُهُ، فَأَنَا رَأَيتُهُ مَحلُولَةً أَزرَارُهُ، وَقَالَ: أَو مِثلُهُ، أَو نَحوُهُ، أَو شَبِيهٌ بِهِ»[٣].

واتە: لە عەمری کوڕی مەیمونەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەرگیز ئێوارانی ڕۆژی پێنج شەممەم لێ نەفەوتاوە حەتمەن تیایدا چووم بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ، هەرگیز گوێم لێی نەبوو بۆ شتێک بڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، تا (جارێکیان) ئێوارەیەک وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) ـ إسناده ضعيف منقطع.

(٢) ـ رجاله ثقات، إلا أنه منقطع.

(٣) ـ إسناده صحيح.

فەرموویەتی، عەمر دەڵێت (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود): چاوەکانی نغرۆ و نوقمی فرمێسک بوون و، دەمارەکانی ملی هەڵسان و، من بینیم دوگمەکانی قەمیسی کرابوونەوە و، وتی: وەکو ئەوە، یان هاو وێنەی ئەوە، یان هاوشێوەی ئەوەی فەرموو (واتە: دیسان نەیتوانی بڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی و بڕایەوە، بەڵکو لە ترسی هەڵە کردن لەو وشانەی لە فەرموودەکە بەکاری هێنا و بۆ عەمری باس کرد نەیتوانی پاڵی بدات بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ).

٢٧٩- «عَنِ الشَّعبِيِّ، وَابنِ سِيرِينَ، أَنَّ ابنَ مَسعُودٍ ﷺ، كَانَ إِذَا حَدَّثَ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي الأَيَّامِ تَرَبَّدَ وَجهُهُ وَقَالَ: هَكَذَا أَو نَحوَهُ، هَكَذَا أَو نَحوَهُ»[١].

واتە: لە شەعبی و ئیبنو سیرینەوە گێڕدراوەتەوە، (وتویانە): ئیبنو مەسعود ﷺ هەموو کات کە فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕایەوە دەموچاوی شین و مۆر دەبوویەوە و، دەیوت: بەو شێوەیە، یان وەک ئەوەی فەرمووە، بەو شێوەیە، یان وەک ئەوەی فەرمووە.

٢٨٠- «حَدَّثَنَا تَوبَةُ العَنبَرِيُّ، قَالَ: قَالَ لِي الشَّعبِيُّ: أَرَأَيتَ فُلَانًا الَّذِي يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ، قَالَ رَسُولُ اللهِ؟ قَعَدتُ مَعَ ابنِ عُمَرَ سَنَتَينِ أَو سَنَةً وَنِصفًا فَمَا سَمِعتُهُ يُحَدِّثُ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ شَيئًا إلاَّ هَذَا الحَدِيثَ»[٢].

واتە: لە تەوبەی عەنبەری گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: شەعبی پێی وتم: ئایا فلانت بینیوە ئەوەی هەر دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی؟! من لەگەڵ ئیبنو عومەر دوو ساڵان ـ یان ساڵ و نیوێک ـ دانیشتووم هەرگیز گوێم لێی نەبووە فەرموودە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بگێڕێتەوە (ئاوا بەبێ ترس و بە ڕاستەوخۆیی) تەنها ئەو فەرموودەیە نەبێت (کە باسی گۆشتی کەمتیار دەکات).

٢٨١- «عَنِ الشَّعبِيِّ قَالَ: جَالَستُ ابنَ عُمَرَ سَنَةً فَلَم أَسمَعهُ يَذكُرُ حَدِيثًا عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ »[٣].

واتە: لە شەعبی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ساڵێک لەگەڵ ئیبنو عومەر دانیشتووم هەرگیز گوێم لێ نەبووە باسی فەرموودەیەکی کردبێت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (بە ڕاستەوخۆیی).

سەرنج: لە فەرموودەکەی پێشتر وتویەتی دوو ساڵ، یان ساڵ و نیوێک، لەگەڵ ئیبنو عومەر دانیشتووم، لێرەشدا دەڵێت ساڵێک لەگەڵی دانیشتووم، ئەوانە دوو فەرموودەی جیاوازن لە دوو کاتی جیاواز وتراون، واتە: ماوە لە نێوان قسەکاندا هەیە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٢٨٢- «عَن ثَابِتِ بنِ قُطبَةَ الأَنصَارِيِّ، قَالَ: كَانَ عَبدُ اللهِ ﷺ، يُحَدِّثُنَا فِي الشَّهرِ بِالحَدِيثَينِ أَوِ الثَّلَاثَةِ»[١].

واتە: لە سابیتی کوڕی قوتبەی ئەنصاڕی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵلا ﷺ لە مانگێکدا دوو فەرموودە یان سێ فەرموودەی بۆ دەگێڕاینەوە.

٢٨٣- «عَن عَبدِ المَلِكِ بنِ عُبَيدٍ قَالَ مَرَّ بِنَا أَنَسُ بنُ مَالِكٍ ﷺ، فَقُلنَا: حَدِّثنَا بِبَعضِ مَا سَمِعتَ مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ؟ فَقَالَ: وَأَتَحَلَّلُ»[٢].

واتە: لە عەبدولمەلیکی کوڕی عوبەید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ بەلامان تێپەڕی، ئێمەش وتمان: هەندێک لەو فەرموودانەمان بۆ بگێڕەوە کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێت لێ بووە، ئەویش وتی: خۆم دەرباز دەکەم (واتە: ناوێرم فەرموودەکانی پێغەمبەری خواتان ﷺ بۆ بگێڕمەوە لە ترسی هەڵە کردن و تووشبوون بە ئاگر، بۆیە نەیڵێم چاکترە).

٢٨٤ـ «عَن مُحَمَّدٍ، قَالَ: كَانَ أَنَسٌ ﷺ قَلِيلَ الحَدِيثِ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ وَكَانَ إِذَا حَدَّثَ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: أَو كَمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ»[٣].

واتە: لە موحەممەدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ فەرموودە گێڕانەوەی کەم بوو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، وە هەر کاتێک فەرموودەی گێڕابایەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (دوای ئەوەی فەرموودەکەی دەگێڕایەوە) دەیوت: (أو کما قال رسول الله) واتە: یان وەک ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، (بۆیە وای دەوت نەوەک هەڵەی کردبێت و هەمان وشەی پێغەمبەری خوای ﷺ بەکار نەهێنابێ).

٢٨٥- «عَن مُحَمَّدٍ، قَالَ: كَانَ أَنَسٌ ﷺ إِذَا حَدَّثَ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ حَدِيثًا، قَالَ: أَو كَمَا قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ»[٤].

واتە: (بە سەنەدێکی تر) لە موحەممەدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ فەرموودە گێڕانەوەی کەم بوو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، وە هەر کاتێک فەرموودەی گێڕابایەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (دوای ئەوەی فەرموودەکەی دەگێڕایەوە) دەیوت: (أو کما قال رسول الله) واتە وەک ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی (بۆیە وای دەوت نەوەک هەڵەی کردبێت و هەمان وشەی پێغەمبەری خوای ﷺ بەکار نەهێنابێ).

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

٢٨٦- «حَدَّثَنِي السَّائِبُ بنُ يَزِيدَ، قَالَ: خَرَجتُ مَعَ سَعدٍ ﷺ إِلَى مَكَّةَ فَمَا سَمِعتُهُ يُحَدِّثُ حَدِيثًا عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ حَتَّى رَجَعنَا إِلَى المَدِينَةِ»[١].

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزید گێردراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ سەعد ﷺ دەرچووم بۆ مەککە، گوێم لێی نەبوو فەرموودەیەک بگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ تاوەکو گەڕاینەوە بۆ مەدینە.

٢٨٧- «عَن قَرَظَةَ بنِ كَعبٍ، أَنَّ عُمَرَ ﷺ، شَيَّعَ الأَنصَارَ حِينَ خَرَجُوا مِنَ المَدِينَةِ فَقَالَ: أَتَدرُونَ لِمَ شَيَّعتُكُم قُلنَا: لِحَقِّ الأَنصَارِ- قَالَ: إِنَّكُم تَأتُونَ قَومًا تَهتَزُّ أَلسِنَتُهُم بِالقُرآنِ اهتِزَازَ النَّخلِ، فَلاَ تَصُدُّوهُم بِالحَدِيثِ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَنَا شَرِيكُكُم قَالَ: فَمَا حَدَّثتُ بِشَيءٍ وَقَد سَمِعتُ كَمَا سَمِعَ أَصحَابِي»[٢].

واتە: لە قەرەظەی کوڕی کەعبەوە گێردراوەتەوە، پێشەوا عومەر ﷺ دوای ئەنصاریەکان (پشتیوانەکان) کەوت کاتێ دەرچوون لە مەدینە (تا دەرەوە لەگەڵیان دەرچوو)، وتی: ئایا دەزانن بۆچی لەگەڵتان دەرچووم و بەڕێم کردن؟ وتمان: لەبەر مافی پشتیوانان (چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی مافیان زۆرە لە ئیسلامدا)، عومەر وتی: ئێوە دەچنە لای خەڵکانێک زمانەکانیان (زۆربەی کات) دەجوڵا بۆ قورئان خوێندن وەک جوڵە جوڵی هەنگ، کەواتە پشتیان تێ مەکەن لە گێڕانەوەی فەرموودە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (فەرموودەکانی پێغەمبەری ﷺ خوایان بۆ بگێڕنەوە) منیش بەشدارو هاوەڵتانم لە پاداشت، قەرەظە دەڵێ: هیچ شتێک و (فەرموودەیەکم لە کوفە بۆ خەڵکی) باس نەکرد ئەگەرچی منیش گوێم لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ ببوو وەک هاوەڵەکانم.

٢٨٨- «عَن قَرَظَةَ بنِ كَعبٍ، قَالَ: بَعَثَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ ﷺ، رَهطًا مِنَ الأَنصَارِ إِلَى الكُوفَةِ، فَبَعَثَنِي مَعَهُم، فَجَعَلَ يَمشِي مَعَنَا حَتَّى أَتَى صِرَارَ وَصِرَارُ: مَاءٌ فِي طَرِيقِ المَدِينَةِ فَجَعَلَ يَنفُضُ التُّرَابَ عَن رِجلَيهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّكُم تَأتُونَ الكُوفَةَ، فَتَأتُونَ قَومًا لَهُم أَزِيزٌ بِالقُرآنِ فَيَأتُونَكُم فَيَقُولُونَ: قَدِمَ أَصحَابُ مُحَمَّدٍ قَدِمَ أَصحَابُ مُحَمَّدٍ فَيَأتُونَكُم فَيَسأَلُونَكُم عَنِ الحَدِيثِ، فَاعلَمُوا أَنَّ أَسبَغَ الوُضُوءِ ثَلاَثٌ، وَثِنتَانِ تُجزِيَانِ ثُمَّ قَالَ: إِنَّكُم تَأتُونَ الكُوفَةَ فَتَأتُونَ قَومًا لَهُم أَزِيزٌ بِالقُرآنِ فَيَقُولُونَ: قَدِمَ أَصحَابُ مُحَمَّدٍ قَدِمَ أَصحَابُ مُحَمَّدٍ فَيَأتُونَكُم فَيَسأَلُونَكُم عَنِ الحَدِيثِ- فَأَقِلُّوا الرِّوَايَةَ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَنَا شَرِيكُكُم فِيهِ قَالَ قَرَظَةُ: وَإِن كُنتُ لأَجلِسُ فِي القَومِ فَيَذكُرُونَ الحَدِيثَ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ وَإِنِّي لَمِن أَحفَظِهِم لَهُ فَإِذَا ذَكَرتُ وَصِيَّةَ عُمَرَ ﷺ سَكَتُّ، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: مَعنَاهُ عِندِي: الحَدِيثُ عَن أَيَّامِ رَسُولِ اللهِ ﷺ لَيسَ السُّنَنَ وَالفَرَائِضَ»[٣].

واتە: لە قەرەظەی کوڕی کەعبەوە گێردراوەتەوە، (ئیمامی) عومەر ﷺ کۆمەڵێک لە ئەنصاریەکان (پشتیوانەکان)ی نارد بۆ کوفە، منیشی لەگەڵیان نارد، (عومەر)یش هەر لەگەڵمان دەڕۆیشت تا گەیشتە (صیرار): کە ئاوێکە لەسەر ڕێگای مەدینە، (لەوێ) خۆڵی لە قاچەکانی داوەشاند، دواتر وتی: ئێوە دەچنە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ صحيح.

کوفە، دەچنە لای خەڵکانێک کە ورتە ورتیانە بە قوڕئان خوێندن، جا دێنە لاتان و دەڵێن: هاوەڵانی موحەممەد ﷺ هاتن، هاوەڵانی موحەممەد ﷺ هاتن (هێندە دڵیان پێتان خۆشە)، دێنە لاتان و پرسیارتان لێ دەکەن دەربارەی فەرموودە، کەواتە بزانن بە دڵنیایی دەستنوێژ گرتنی تەواو سێ جارە، دوو جاریش هەر دروستە و بەر دەکەوێ، دواتر (دووبارە) وتی: ئێوە دەچنە کوفە، دەچنە لای خەڵکانێک کە ورتە ورتیانە بە قوڕئان خوێندن، جا دێنە لاتان و دەڵێن: هاوەڵانی موحەممەد ﷺ هاتن، هاوەڵانی موحەممەد ﷺ هاتن، دێنە لاتان و پرسیارتان لێ دەکەن دەربارەی فەرموودە، جا فەرموودە کەم بگێڕنەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (تاوەکو هەڵە نەکەن)و منیش بەشدارو هاوەڵتانم لە پاداشتدا، قەرەظە دەڵێ: من لە نێو خەڵکەکە دانیشتبووم و ئەوانیش فەرموودەی پێغەمبەری خوایان ﷺ باس دەکردو دەیان گێڕایەوە، منیش یەکێک بووم لەوانەیان کە زۆرترین فەرموودەی پێغەمبەری خوامان ﷺ لەبەر بوو، جا کاتێک ئامۆژگاریەکەی عومەرم بیر دەکەوتەوە (کە وتی: فەرموودە کەم بگێڕنەوە) بێ دەنگ دەبووم.

باوکی موحەممەد (ئیمامی داریمی) دەڵێ: (قسەکەی کۆتایی قەرەظە) لەلای من واتای ئەوەیە: (خەڵکەکە) گێڕانەوەو قسەیان لەسەر کاروبارو ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، نەوەک باسی سوننەت و واجباتەکان (بۆیە قسەی نەکردوە، چونکە ئەو لە سوننەت و واجباتەکان زۆری دەزانی).

٢٨٩- «عَن عَلقَمَةَ، قَالَ: قَالَ: عَبدُ اللهِ ﷺ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، ثُمَّ ارتَعَدَ، ثُمَّ قَالَ: نَحوَ ذَلِكَ أَو فَوقَ ذَاكَ»[١].

واتە: لە عەلقەمە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵڵا ﷺ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی (فەرموودەکەی گێڕایەوە)، دواتر دەستی بە لەرزین کردو، زۆر ترسا، دواتر وتی: وەکو ئەوەی فەرمووە، یان لەوە زیاتری فەرموو (واتە: ئەوەندە ترساوە لەوەی هەڵە بکات لە گێڕانەوەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ).

٢٩٠- «عَن مُجَاهِدٍ، قَالَ: صَحِبتُ ابنَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، إِلَى المَدِينَةِ فَلَم أَسمَعهُ يُحَدِّثُ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ بِحَدِيثٍ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: كُنتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَأُتِيَ بِجُمَّارٍ، فَقَالَ: إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرًا مِثلَ الرَّجُلِ المُسلِمِ فَأَرَدتُ أَن أَقُولَ: هِيَ النَّخلَةُ، فَنَظَرتُ فَإِذَا أَنَا أَصغَرُ القَومِ، فَسَكَتُّ قَالَ عُمَرُ ﷺ وَدِدتُ أَنَّكَ قُلتَ، وَعَلَيَّ كَذَا»[٢].

واتە: لە موجاهید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هاوڕێیەتی ئیبنو عومەرم (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، کرد تا مەدینە، گوێم لێ نەبوو فەرموودە بگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ جگە لەوەی وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم (جوممار)ێکیان بۆ هێنا (کە بەشێکە لە داری خورماو، لە بەشی سەری سەرەوەیەتی و لەگەڵ هەنگوین دەخورێت)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە نێو درەختاندا درەختێک هەیە وەک

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

مرۆڤی مسوڵمان وایە، (ئیبنو عومەر دەڵێ) ویستم بڵێم: ئەو درەختە خورمایە، (بەڵام) سەیرم کرد من بچوکترین کەس بووم، بۆیە بێ دەنگ بووم، (دواتر کە بۆ عومەری باوکم گێڕایەوە) وتی: بریا بتوتایەو ئەوەشیان بهاتبایە سەر من (چونکە بەرهەم و شانازی کوڕ باوکیشی دەگرێتەوە).

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ: ئەگەر بتوتایە لام خۆشەویستتر بوو لەوەی ئەوەو ئەوەم هەبێت، واتە: لام لە شتە دونیاییەکان خۆشەویستتر بوو کە کوڕی من پرسیاری پێغەمبەری خوا ﷺ بزانێت.

**٢٩١-** «حَدَّثَنَا صَالِحٌ الدَّهَّانُ، قَالَ: مَا سَمِعتُ جَابِرَ بنَ زَيدٍ يَقُولُ قَطُّ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إعظَامًا وَاتِّقَاءً أَن يَكذِبَ عَلَيهِ»[١].

واتە: لە صاڵیحی دەههان گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەرگیز گوێم لە جابری کوڕی زەید نەبووە بڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، لەبەر گەورەیی و خۆ پاراستن لەوەی قسەکەی (بە هەڵە) ببێتە درۆ بە دەمی پێغەمبەری خوا ﷺ.

**٢٩٢-** «عَن عَبدِ اللهِ بنِ شَقِيقٍ، قَالَ: جَاءَ أَبُو هُرَيرَةَ ﷺ إِلَى كَعبٍ يَسأَلُ عَنهُ، وَكَعبٌ فِي القَومِ، فَقَالَ كَعبٌ: مَا تُرِيدُ مِنهُ؟ فَقَالَ: أَمَا إِنِّي لاَ أَعرِفُ لِأَحَدٍ مِن أَصحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَن يَكُونَ أَحفَظَ لِحَدِيثِهِ مِنِّي- فَقَالَ كَعبٌ: أَمَا إِنَّكَ لَن تَجِدَ طَالِبَ شَيءٍ إِلاَّ سَيَشبَعُ مِنهُ يَومًا مِنَ الدَّهرِ، إِلاَّ طَالِبَ عِلمٍ أَو طَالِبَ دُنيَا- فَقَالَ: أَنتَ كَعبٌ؟ قَالَ: نَعم، قَالَ: لِمِثلِ هَذَا جِئتُ»[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو هورەیرە ﷺ هات بۆ لای کەعب (لەناو کۆمەڵێکدا) و پرسیاری کەعبی کرد، کەعبیش لەناو خەڵکەکە بوو، کەعبیش پێی وت: چیت لێ دەوێ؟ (ئەبو هورەیرە) وتی: من کەس ناناسم لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموودەی ئەوی لە من زیاتر لەبەر بێت، کەعب وتی: بزانە تۆ کەسێکت دەست ناکەوێ بەدوای بەدەست هێنانی شتێکەوە بێت حەتمەن ڕۆژێک دێت لە تەمەنیدا لە بەدەست هێنانی شتەکە تێر دەبێت، تەنها (قوتابی و) داواکاری زانست و، داواکاری دونیا نەبێت (ئەم دووانە هەرگیز تێر نابن)، (کە کەعب ئەو قسەیەی کرد) ئەبو هورەیرە وتی: تۆ کەعبی؟ وتی: بەڵێ، ئەبو هورەیرە وتی: بۆ شتێکی ئاوا هاتووم (واتە: من داواکاری زانستم و، هاتووم خۆم لەلای تۆ فێری ئەو فەرموودانە بکەم کە لەلاتن).

**٢٩٣-** «عَن طَاوُسٍ، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ النَّاسِ أَعلَمُ؟ قَالَ: مَن جَمَعَ عِلمَ النَّاسِ إِلَى عِلمِهِ، وَكُلُّ طَالِبِ عِلمٍ غَرثَانٌ إِلَى عِلمٍ»[٣].

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لانقطاعه.

(٣) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە طاووس گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام لە خەڵکی زاناترینن؟ فەرمووی: هەر کەسێک زانستی خەڵکی لەگەڵ زانستی خۆی کۆ بکاتەوە (خۆی فێری ئەو زانستەش بکات کە لە لای خەڵکە)و، هەروەها هەموو داواکارو (قوتابی) زانستێک کە برسی بێت بۆ زانستێک (واتە: ئەم دووانە زاناترینی خەڵکن).

٢٩٤- «عَن مُعَاوِيَةَ بنِ قُرَّةَ، قَالَ: كُنتُ فِي حَلقَةٍ فِيهَا المَشيَخَةُ وَهُم يَتَرَاجَعُونَ فِيهِم عابدُ بنُ عَمرٍو، فَقَالَ شَابٌّ فِي نَاحِيَةِ القَومِ: أَفِيضُوا فِي ذِكرِ اللهِ بَارَكَ اللهُ فِيكُم، فَنَظَرَ القَومُ بَعضُهُم إِلَى بَعضٍ- فِي أَيِّ شَيءٍ رَآنَا؟ ثُمَّ قَالَ بَعضُهُم: مَن أَمَرَكَ بِهَذَا؟ فَمُر، لَئِن عُدتَ، لَنَفعَلَنَّ وَلَنَفعَلَنَّ»[1].

واتە: لە موعاویەی کوڕی قوڕڕەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من لە ناو حەلقە و مەجلیسێکدا بووم کە بە تەمەنی تیا بوون و بە نۆرە قسەیان دەکرد، عابیدی کوڕی عەمریشی تیا بوو، گەنجێکیش لە گۆشەیەکی ناو خەڵکەکە وتی: بپرژێنە سەر زیکرو یادی خوا، خوا بەرەکەتتان تێ بخات، خەڵکەکەش سەیری یەکتریان کرد (وتیان) مەگەر ئێمەی لەسەر چ شتێک بینیوە؟ دواتر هەندێکیان وتیان: ئەوە کێ فەرمانی بەوە پێ کردی؟ بڕۆ، ئەگەر بگەڕێیتەوە سوێند بە خوا ئاواو ئاوا دەکەین.

٢٩٥- «عَن عَونِ بنِ عَبدِ اللهِ، قَالَ: قَالَ عَبدُ اللهِ: نِعمَ المَجلِسُ مَجلِسٌ تُنشَرُ فِيهِ الحِكمَةُ وَتُرجَى فِيهِ الرَّحمَةُ»[2].

واتە: لە عەونی کوڕی عەبدوڵڵا گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵڵا وتی: باشترین مەجلیس مەجلیسێکە کە (فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ) و دانایی تیادا بڵاو بکرێتەوە و، ئومێدی ڕەحمەتی خوای تیا بێت.

## بابەت: دەربارەی ئەوانەی وتویانە زانست ترسان و خۆ پارێزییە بۆ خوا

٢٩٦- «عَن أَبِي الدَّردَاءِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَشَخَصَ بِبَصَرِهِ إِلَى السَّمَاءِ ثُمَّ قَالَ: هَذَا أَوَانُ يُختَلَسُ العِلمُ مِنَ النَّاسِ حَتَّى لاَ يَقدِرُوا مِنهُ عَلَى شَيءٍ فَقَالَ زِيَادُ بنُ لَبِيدٍ الأَنصَارِيُّ: يَا رَسُولَ اللهِ، وَكَيفَ يُختَلَسُ مِنَّا وَقَد قَرَأنَا القُرآنَ؟ فَوَاللهِ لَنَقرَأَنَّهُ، وَلَنُقرِئَنَّهُ نِسَاءَنَا وَأَبنَاءَنَا، فَقَالَ: ثَكِلَتكَ أُمُّكَ يَا زِيَادُ، إِن كُنتُ لأَعُدُّكَ مِن فُقَهَاءِ أَهلِ المَدِينَةِ، هَذِهِ التَّورَاةُ وَالإِنجِيلُ عِندَ اليَهُودِ وَالنَّصَارَى، فَمَاذَا يُغنِي عَنهُم؟ قَالَ جُبَيرٌ: فَلَقِيتُ عُبَادَةَ بنَ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنهُ قَالَ: قُلتُ أَلاَ تَسمَعُ مَا يَقُولُ أَخُوكَ أَبُو الدَّردَاءِ؟ فَأَخبَرتُهُ بِالَّذِي قَالَ، قَالَ: صَدَقَ أَبُو الدَّردَاءِ إِن شِئتَ لأَحَدِّثَنَّكَ بِأَوَّلِ عِلمٍ يُرفَعُ مِنَ النَّاسِ: الخُشُوعُ، يُوشِكُ أَن تَدخُلَ مَسجِدَ الجَمَاعَةِ فَلاَ تَرَى فِيهِ رَجُلاً خَاشِعًا»[3].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ رجاله ثقات، إلا أنه منقطع.

(٣) ـ حسن.

واتە: لە ئەبو دەردائەوە ﷛ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین سەیرێکی ئاسمانی کرد و فەرمووی: ئێستا کاتی ئەوەیە زانست لە خەڵکی بسەندرێتەوە، تاوەکو توانایان لەسەر هیچ شتێک نامێنێ، زیادی کوڕی لەبیدی ئەنصاریش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن لێمان دەسەندرێتەوە لە کاتێکدا قورئانمان خوێندۆتەوە؟ سوێند بە خوا دەیخوێنین و ئافرەت و منداڵەکانیشمان فێری خوێندنەوەی دەکەین، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات ئەی زیاد، من بە یەکێک لە زانایانی خەڵکی کوفەت دەزانم (چۆن قسەی وا دەکەی)، ئەوە تەورات و ئینجیلە لەلای جوولەکە و گاورەکان سوودی چی پێگەیاندن؟! جوبەیر وتی: منیش گەیشتم بە عوبادەی کوڕی صامیت، دەڵێ وتم: ئایا گوێت لە برات ئەبو دەرداء نیە چی دەڵێ؟ منیش پێم ڕاگەیاند ئەوەی وتی (واتە: ئەم فەرموودەیەم بۆ گێڕایەوە کە ئەبو دەرداء بۆی گێڕاینەوە)، (عوبادەش) وتی: ئەبو دەرداء ڕاست دەکات، ئەگەر دەتەوێ ئەوە بۆت دەگێڕمەوە یەکەم زانست (چیە) کە لە خەڵکی وەردەگیرێتەوە و دەسەندرێتەوە: (ئەویش) ملکەچیە، زەمان نزیک بووە بچیتە مزگەوت و پیاوێکی تیادا نەبینی ملکەچ بێ بۆ خوا.

۲۹۷- «حَدَّثَنَا مَكحُولٌ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَضلُ العَالِمِ عَلَى العَابِدِ، كَفَضلِي عَلَى أَدنَاكُم ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ﴿٢٨﴾﴾ فاطر، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ اللهَ وَمَلاَئِكَتَهُ، وَأَهلَ سَمَاوَاتِهِ وَأَرَضِيهِ، وَالنُّونَ فِي البَحرِ يُصَلُّونَ عَلَى الَّذِينَ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ الخَيرَ»[1].

واتە: لە مەکحول گێردراوەتەوە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێگەی زانا بەسەر خواپەرستێکی (بێ زانست)، وەک پێگەی منە بەسەر نزمترینتانەوە (واتە: من چەندە گەورەم بە بەراورد لەگەڵ یەکێک لە ئێوە، زانای چاکیش بەو ئەندازەیە گەورەترە لە کەسی خواپەرست کە زانا نیە)، دواتر ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ﴿٢٨﴾﴾فاطر واتە: [لە بەندەکانی خوا تەنها ئەوانە لە خوا دەترسن کە زانان (زانا بەو واتایەی ئەوانەی مەعریفەتی خوایان لەلایە بەلای کەمەوە)]، دواتر فەرمووی: خوا و، فریشتەکان و، خەڵکی ئاسمانەکان و، خەڵکی زەوی و، نەهەنگ لە دەریادا، (گشتیان) داوای ڕەحمەت و بەزەیی دەکەن بۆ ئەو کەسانەی خەڵکی فێری چاکە دەکەن.

۲۹۸- «عَنِ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: لاَ يَكُونُ الرَّجُلُ عَالِمًا حَتَّى لاَ يَحسُدَ مَن فَوقَهُ، وَلاَ يَحقِرَ مَن دُونَهُ، وَلاَ يَبتَغِيَ بِعِلمِهِ ثَمَنًا»[2].

واتە: لە ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: مرۆڤ نابێتە زانا تاوەکو (وای لێ دێ) ئێرەیی بۆ چاکە بە سەرەوەی خۆی نەبێت و، ئەو کەسەش بە کەم نەزانێت کە لە خوار خۆیەتی (واتە نەزانی لا چاک نەبێ)و، مەبەستیشی بە زانستەکەی پارە و پول نەبێت (ئا بەوە مرۆڤ دەبێتە زانا).

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

٢٩٩- «عَن مِسعَرٍ، قَالَ: سَمِعتُ عَبدَ الأَعلَى التَّيمِيَّ يَقُولُ: مَن أُوتِيَ مِنَ العِلمِ مَا لاَ يُبكِيهِ، لَخَلِيقٌ أَن لاَ يَكُونَ أُوتِيَ عِلمًا يَنفَعُهُ، لِأَنَّ اللهَ تَعَالَى نَعَتَ العُلَمَاءَ ثُمَّ قَرَأَ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ﴿١٠٧﴾﴾ الإسراء، إِلَى قَولِهِ: ﴿يَبۡكُونَ ﴿١٠٩﴾﴾ الإسراء»[1].

واتە: لە میسعەر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەبدولئەعلای تەمیمی بوو دەیوت: هەر کەسێک شتێک و بەشێک لە زانستی پێ بدرێت و (زانستەکە) نەیگریێنێ، ئەوە شایستەیە کە زانستێکی پێ نەدرێت کە سوودی پێ بگەیەنێت (واتە: زانستی بە سوودی پێ نەدراوە مادەم نەیگریێنێ و دەبێ پیرۆزی بێت ئەو زانستە بێ بەرەکەتە، چونکە زانستی بە سوود مرۆڤ دەگریێنێ و وای لێ دەکات بیرکاتەوە)، چونکە خوای بەرز وەسفی زانایان دەکات (بە گریان)، دواتر (ئەو ئایەتەی) خوێندەوە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ﴿١٠٧﴾﴾ الإسراء، ﴿يَبۡكُونَ ﴿١٠٩﴾﴾ الإسراء، واتە: [بە ڕاستی ئەوانەی کە زانیاریان پێ بەخشراوە لە پێش ئەم قورئانەدا، کاتێ قورئان بخوێندرێتەوە بەسەریاندا دەکەون بە ڕوودا بە کڕنووش بردن و، دەڵێن پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگارمان بەڕاستی هەمیشە بەڵێنی پەروەردگارمان بەدی دێت، وە دەکەون بە ڕوودا و دەگرین].

٣٠٠- «عَن أَبِي حَازِمٍ، قَالَ: لاَ تَكُونُ عَالِمًا حَتَّى يَكُونَ فِيكَ ثَلاَثُ خِصَالٍ: لاَ تَبغِي عَلَى مَن فَوقَكَ وَلاَ تَحقِرُ مَن دُونَكَ، وَلاَ تَأخُذُ عَلَى عِلمِكَ دُنيَا»[2].

واتە: لە ئەبو حازم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نابیتە زاناو (زانا نیت) تا سێ سیفەتت تێدا دێنەجێ: تاوەکو داوای سەرەوەی خۆت نەکەیت (لە زانستدا) و، ئەو کەسەش بە کەم نەزانی کە لە خوار تۆوەیەو (نەزان ترە)، دونیاش وەرنەگری لەسەر زانستەکەت.

٣٠١- «عَن أَبِي الدَّردَاءِ ﷺ، قَالَ: لاَ تَكُونُ عَالِمًا حَتَّى تَكُونَ مُتَعَلِّمًا، وَلاَ تَكُونُ بِالعِلمِ عَالِمًا حَتَّى تَكُونَ بِهِ عَامِلاً، وَكَفَى بِكَ إِثمًا أَن لاَ تَزَالَ مُخَاصِمًا، وَكَفَى بِكَ إِثمًا أَن لاَ تَزَالَ مُمَارِيًا، وَكَفَى بِكَ كَاذِباً أَن لاَ تَزَالَ مُحَدِّثًا فِي غَيرِ ذَاتِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ»[3].

واتە: لە ئەبو دەرداءەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نابیتە زانا تاوەکو نەبیتە قوتابی زانست، وە بە زانستیش نابیتە زانا تاوەکو کاری پێ نەکەیت، وە ئەوەندە تاوانەت بەسە کە بەردەوام کێشمەکێشم و شەڕە بەڵگە بکەی بۆ سەرکەوتن بەسەر کەسانی ترەوە، وە ئەوەندە تاوانەت بەسە کە بە بەردەوامی مناقەشە (بە زانست) بکەی، وە ئەوەندەت بەسە درۆزن بیت و (پێت بوترێت درۆزن) کە بەردەوام قسە بکەیت دەربارەی جگە لە زاتی خوا (واتە: هەر باسی خەڵک بکەیت و، زۆر پیای هەڵابڵێییت و، باسی خواش نەکەیت، چونکە گشت شتێکی مەخلوق ڕاست نیە، بەڵام قسەی خوا هەمووی هەق و ڕاستە).

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده حسن.

٣٠٢- «عَن عِمرَانَ المِنقَرِيِّ، قَالَ: قُلتُ لِلحَسَنِ يَومًا فِي شَيءٍ قَالَهُ: يَا أَبا سَعِيدٍ، لَيسَ هَكَذَا يَقُولُ الفُقَهَاءُ، فَقَالَ: وَيحَكَ وَرَأَيتَ أَنتَ فَقِيهًا قَطُّ، إِنَّمَا الفَقِيهُ الزَّاهِدُ فِي الدُّنيَا، الرَّاغِبُ فِي الآخِرَةِ، البَصِيرُ بِأَمرِ دِينِهِ، المُدَاوِمُ عَلَى عِبَادَةِ رَبِّهِ»[١].

واتە: لە عیمرانی مینقەری گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ڕۆژێکیان لەبەر شتێک کە حەسەن باسی کرد (واتە: لەبەر وەڵام دانەوەی پرسیارێک کە جیاواز بوو لەگەڵ فەتوای هەندێک لە زانایان): بە حەسەنم وت: ئەی باوکی سەعید (ئەی حەسەن) فوقەهایان و زانایانی شەرع ئاوا ناڵێن (دەربارەی وەڵامی ئەو پرسیارەی لێتکرا)! حەسەنیش وتی: هەی خوا عافوتکا مەگەر تۆ هەرگیز فەقیهێکت بینیوە؟ فەقیە ئەو کەسەیە کە لە دونیا بێ نیازەو، لە دونیا دوور دەکەوێتەوەو، چاوی لە دواڕۆژەو، بەرچاو ڕوونە بە کاروباری ئاینی خۆی و، بەردەوامە لەسەر پەرستشی پەروەردگاری.

٣٠٣- «عَن سَعدِ بنِ إِبرَاهِيمَ، قَالَ: قِيلَ لَهُ: مَن أَفقَهُ أَهلِ المَدِينَةِ؟ قَالَ: أَتقَاهُم لِرَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ»[٢].

واتە: لە سەعدی کوڕی ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێی وتراوە: کێ زاناترینی خەڵکی مەدینەیە؟ وتی: پارێزکارترینیان بۆ پەروەردگاری عَزَّ وَجَلَّ.

٣٠٤- «عَن مُجَاهِدٍ، قَالَ: إِنَّمَا الفَقِيهُ مَن يَخَافُ اللهَ تَعَالَى»[٣].

واتە: لە موجاهید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فەقیە و زانا ئەو کەسەیە کە لە خوای بەرز دەترسێ.

٣٠٥- «عَن عَلِيِّ بنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: إِنَّ الفَقِيهَ حَقَّ الفَقِيهِ، مَن لَم يُقَنِّطِ النَّاسَ مِن رَحمَةِ اللهِ، وَلَم يُرَخِّص لَهُم فِي مَعَاصِي اللهِ، وَلَم يُؤَمِّنهُم مِن عَذَابِ اللهِ، وَلَم يَدَعِ القُرآنَ رَغبَةً عنهُ إِلَى غَيرِهِ، إِنَّهُ لاَ خَيرَ فِي عِبَادَةٍ لاَ عِلمَ فِيهَا، وَلاَ عِلمٍ لاَ فَهمَ فِيهِ، وَلاَ قِرَاءَةٍ لاَ تَدَبُّرَ فِيهَا»[٤].

واتە: لە ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی طاڵیب ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە دڵنیایی فەقیهو زانا کە بەڕاستی فەقیهو زانا بێت ئەو کەسەیە کە خەڵکی لە ڕەحمەتی خوا بێ ئومێد نەکات و، ڕێگایان پێ نەدات لە سەرپێچی خوا و، بێ خەمیان نەکات لە سزای خوا و، پشت لە قورئان نەکات لەبەر شتی تر، بە دڵنیایی هیچ سوود و پاداشتێک نیە لە عیبادەت و پەرستشێک کە زانستی تیا نەبێت، وە (هیچ سوود و پاداشتێک نیە) لە زانستێک کە تێگەیشتنی تیا نەبێت، وە (هیچ سوود و پاداشتێک نیە) لە خوێندنی قورئاندا کە بیر کردنەوەی تیا نەبێت.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف منقطع.

٣٠٦- «عَن يَحيَى بنِ عَبَّادٍ، قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ: الفَقِيهُ حَقُّ الفَقِيهِ الَّذِي لاَ يُقَنِّطُ النَّاسَ مِن رَحمَةِ اللهِ، وَلاَ يُؤَمِّنُهُم مِن عَذَابِ اللهِ، وَلاَ يُرَخِّصُ لَهُم فِي مَعَاصِي اللهِ، إِنَّهُ لاَ خَيرَ فِي عِبَادَةٍ لاَ عِلمَ فِيهَا، وَلاَ خَيرَ فِي عِلمٍ لاَ فَهمَ فِيهِ، وَلاَ خَيرَ فِي قِرَاءَةٍ لاَ تَدَبُّرَ فِيهَا»[(١)].

واتە: لە یەحیای کوڕی عەبباد گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێشەوا عەلی وتویەتی: بە دڵنیایی فەقیهو زانا کە بەڕاستی فەقیهو زانا بێت ئەو کەسەیە کە خەڵکی لە ڕەحمەتی خوا بێ ئومێد نەکات و، ڕێگایان پێ نەدات لە سەرپێچی خوا و، بێ خەمیان نەکات لە سزای خوا و، بە دڵنیایی هیچ سوود و پاداشتێک نیە لە عیبادەت و پەرستشێک کە زانستی تیا نەبێت، وە (هیچ سوود و پاداشتێک نیە) لە زانستێک کە تێگەیشتنی تیا نەبێت، وە (هیچ سوود و پاداشتێک نیە) لە خوێندنی قورئاندا کە بیر کردنەوەی تیا نەبێت.

٣٠٧- «عَن كَعبٍ ﷺ، قَالَ: إِنِّي لاَجِدُ نَعتَ قَومٍ يَتَعَلَّمُونَ لِغَيرِ العَمَلِ، وَيَتَفَقَّهُونَ لِغَيرِ العِبَادَةِ، وَيَطلُبُونَ الدُّنيَا بِعَمَلِ الآخِرَةِ وَيَلبَسُونَ جُلُودَ الضَّأنِ وَقُلُوبُهُم أَمَرُّ مِنَ الصَّبِرِ، فَبِي يَغتَرُّونَ، أَو إِيَّايَ يُخَادِعُونَ؟ فَحَلَفتُ بِي لأَتِيحَنَّ لَهُم فِتنَةً تَترُكُ الحَلِيمَ فِيهَا حَيرَانَ»[(٢)].

واتە: لە کەعب ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من سیفەتی خەڵکانێک دەزانم (واتە سیفەتی بەنی ئیسرائیل ئاوایە) خۆیان فێر دەکەن بۆ جگە لە کار پێکردن، هەوڵی بەدەست هێنانی دونیا دەدەن لە ڕێگای کرداری دوارۆژو پێستی مەڕ دەپۆشن (فێڵاوین و، دڵەکانیان لە صەبیر تاڵترە (کە دەرمانێکی زۆر تاڵە)، (خوای پەروەردگار بەم کەسانە دەفەرموێ): بە من فریو دەخۆن، یان فێڵ لە من دەکەن؟ سوێندم بە خۆم خواردووە فیتنەیەکیان بۆ ئامادە بکەم کە کەسی عاقڵ و لەسەرەخۆ تیایدا سەرگەردان دەبێت.

٣٠٨- «عَن هَرِمِ بنِ حَيَّانَ، أَنَّهُ قَالَ: إِيَّاكُم وَالعَالِمَ الفَاسِقَ، فَبَلَغَ عُمَرَ بنَ الخَطَّابِ ﷺ فَكَتَبَ إِلَيهِ وَأَشفَقَ مِنهَ مَا العَالِمُ الفَاسِقُ؟ قَالَ: فَكَتَبَ إِلَيهِ هَرِمٌ: يَا أَمِيرَ المُؤمِنِينَ، وَاللهِ مَا أَرَدتُ بِهِ إلاَّ الخَيرَ: يَكُونُ إِمَامٌ يَتَكَلَّمُ بِالعِلمِ، وَيَعمَلُ بِالفِسقِ، فَيُشَبِّهُ عَلَى النَّاسِ فَيَضِلُّوا»[(٣)].

واتە: لە هەریمی کوڕی حەییانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆتان بپارێزن لە زانای فاسق، جا هەواڵی ئەو قسەیە گەیشتە عومەری کوڕی خەتتاب و ﷺ ترسا لەو وتەیەو بۆی نووسی: کێ زانای فاسقە؟ دەڵێ هەریمیش بۆی نووسی: ئەی گەورەی بڕواداران مەبەستم بەو وتەیە هیچ نەبوو جگە چاکە، پێشەوا هەیە قسە دەکات بە زانست و کار بە فیسق و خراپە دەکات و (قسەو کرداری یەک نیە)، بۆیە (دین) لە خەڵکی تێکەڵ دەکات و گومڕا دەبن (ئا ئەوە زانای فاسقە).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٣٠٩- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ مَسعُودٍ ﷺ قَالَ: مَن أَرَادَ أَن يُكرَمَ دِينُهُ، فَلاَ يَدخُل عَلَى السُّلطَانِ، وَلاَ يَخلُوَنَّ بِالنِّسوَانِ، وَلاَ يُخَاصِمَنَّ أَصحَابَ الأَهوَاءِ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر كەسێک دەیەوێ دینەكەی ڕێزی لێ بگیرێ، با نەچێتە لای كار بەدەست و، لەگەڵ ژنان بە تەنیا نەبێت و، مناقەشە لەگەڵ خەڵكی فكرە خراپ و گومڕادا نەكات.

سەرنج: چونكە لەلای كاربەدەست ڕەنگە خراپەو تاوان ئەنجام بدرێت و، نەتوانێ نارەزایی دەرببڕێت و دەبێ چەپڵەی ڕازی بوون لەگەڵ ئەوان لێ بدات، بە تەنیا بوون لەگەڵ ژنانیش فیتنەو ناوزڕانی زۆری تیایە، مناقەشە كردنیش لەگەڵ كەسانی فكرە خراپ و گومڕا زۆر كات مرۆڤ بەرەو كەناری لادان و گومڕایی پەلكێش دەكات.

٣١٠- «عَن يُونُسَ، قَالَ: كَتَبَ إِلَيَّ مَيمُونُ بنُ مِهرَانَ إِيَّاكَ وَالخُصُومَةَ وَالجِدَالَ فِي الدِّينِ، وَلاَ تُجَادِلَنَّ عَالِمًا، وَلاَ جَاهِلاً: أَمَّا العَالِمُ، فَإِنَّهُ يَخزُنُ عَنكَ عِلمَهُ وَلاَ يُبَالِي مَا صَنَعتَ، وَأَمَّا الجَاهِلُ، فَإِنَّهُ يُخَشِّنُ بِصَدرِكَ وَلاَ يُطِيعُكَ»[٢].

واتە: لە یونس گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: مەیمونی كوڕی میهران (نامەیەكی بۆ ناردبووم)و بۆی نوسی بووم: خۆت بپارێزە لە دووبەرەكی و مناقەشە لە دينداو، موناقەشەی هیچ زاناو نەزانێک مەكە، هەرچی زانایەكەیە لەبەر ئەوەی زانستەكەی هەڵدەگرێ و (چیتر زانیاریت پێت نادات) و، گوێ بەوە نادات كە تۆ دەیكەی (چونكە كاری بە مناقەشە نیە ئەو بە دوای ڕاستیەوەیە)، هەرچی كەسی نەزانیشە لەبەر ئەوەی بە موناقەشەكەی دڵ و سینگت ڕەق و تەنگ دەكات و گوێڕایەڵیشت ناكات.

٣١١- «عَن يَحيَى بنِ أَبِي كَثِيرٍ، قَالَ: قَالَ سُلَيمَانُ بنُ دَاوُدَ ﷺ لِابنِهِ: دَعِ المِرَاءَ فَإِنَّ نَفعَهُ قَلِيلٌ، وَهُوَ يُهَيِّجُ العَدَاوَةَ بَينَ الإِخوَانِ»[٣].

واتە: لە یەحیای كوڕی ئەبو كەثیر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر سولەیمانی كوڕی داوود ﷺ بە كوڕەكەی وت: واز لە مناقەشە بێنە چونكە سوودەكەی كەمەو، (ئاگری) دوژمنایەتی لە نێوان برایان و (مسوڵمانان) هەڵدەكات.

٣١٢- «عَن إِسمَاعِيلَ بنِ أَبِي حَكِيمٍ، قَالَ: سَمِعتُ عُمَرَ بنَ عَبدِ العَزِيزِ، يَقُولُ مَن جَعَلَ دِينَهُ غَرَضًا لِلخُصُومَاتِ، أَكثَرَ التَّنَقُّلَ»[٤].

---

(١) ـ إسناده ضعيف منقطع.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده معضل.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئیسماعیلی کوڕی ئەبو حەکیم گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عومەری کوڕی عبد العزیز بوو دەیوت: هەر کەسێک دینەکەی بکاتە کاڵایەک بۆ موناقەشات و دووبەرەکیەکان، ئەوە زۆر ڕاستە ڕێ نابێ و هەر دەمەو لەسەر پەتێکە.

٣١٣- «حَدَّثَنَا سَعِيدُ بنُ عَبدِ العَزِيزِ قَالَ: كَتَبَ عُمَرُ بنُ عَبدِ العَزِيزِ إِلَى أَهلِ المَدِينَةِ أَنَّهُ مَن تَعَبَّدَ بِغَيرِ عِلمٍ، كَانَ مَا يُفسِدُ أَكثَرَ مِمَّا يُصلِحُ، وَمَن عَدَّ كَلَامَهُ مِن عَمَلِهِ، قَلَّ كَلَامُهُ إلاَّ فِيمَا يَعنِيهِ، وَمَن جَعَلَ دِينَهُ غَرَضًا لِلخُصُومَاتِ، كَثُرَ تَنَقُّلُهُ»[1].

واتە: لە سەعیدی کوڕی عەبدولعەزیز گێردراوەتەوە، وتویەتی: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (نامەیەکی) بۆ خەڵکی مەدینە (ناردو) نووسی: بە دڵنیایی هەر کەسێک عیبادەت بکات بەبێ زانست (ئەوە) ئەو شتانەی خراپیان دەکات زیاترن لەوەی چاکیان دەکات (واتە: خراپیەکەی لە چاکیەکەی زیاترە)، وە هەر کەسێک قسەکانی لە کرداری خۆی هەژمار بکات و (بزانێ هەمووی تۆمار دەکرێت و ئەوەش بەشێکە لە کارەکانی کە پاداشت و سزای لەسەرە) ئەوە قسەکانی کەم دەکاتەوە، تەنها بۆ ئەو شتانە نەبێت کە پەیوەندی بەوەوە هەیەو قسەکانی سوودی (دونیا و دواڕۆژی) پێ دەگەیەنن، وە هەر کەسێکیش دینەکەی بکاتە کاڵایەک بۆ کێشەو مناقەشە ئەوە زۆر ڕاستە ڕێ نابێ و هەر دەمەو لەسەر پەتێکە.

٣١٤- «عَن عُمَرَ بنِ عَبدِ العَزِيزِ قَالَ: سَأَلَهُ رَجُلٌ عَن شَيءٍ مِنَ الأَهوَاءِ فَقَالَ: عَلَيكَ بِدِينِ الأَعرَابِيِّ، وَالغُلَامِ فِي الكُتَّابِ، وَالهَ عَمَّا سِوَى ذَلِكَ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: كَثُرَ تَنَقُّلُهُ، أَي: يَنتَقِلُ مِن رَأيٍ إِلَى رَأيٍ»[2].

واتە: لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک پرسیاری لێکردوە دەربارەی شتێکی گومڕایی، ئەویش وتی: دەست بگرە بە دینی دەشتەکی و منداڵانی فێرگە (واتە: ئەو منداڵانەی دەچنە فێرگە تا فێری نووسین و خوێندەواری بن)، واز لەوە بەولاوە بێنە.

ئەبو موحەممەد (ئیمامی داریمی) دەڵێ: (كَثُرَ تَنَقُّلُهُ) ـ کە لە فەرموودەکانی پێشتر باس کرا ـ واتە: لە بۆچوونێک بۆ بۆچوونێکی تر دەچێت.

سەرنج: لەم فەرموودەیە بۆیە پێشەوا عومەری کوڕی عبد العزیز بە کابرای وتووە: «دەست بگرە بە دینی منداڵ و دەشتەکیان» چونکە کابرا نەزان و بۆچوون لاواز بووە و بەرگەی ڕوونکردنەوە و تێگەیشتنی بابەتی قوڵی نەبووە، ئەو جۆرە کەسانەش ئەگەر گوێ بۆ بابەتی هەستیار بگرن لێی تێناگەن و گومڕا دەبن، بۆیە ئامۆژگاری کردووە خۆی لە بابەتی قوڵ نەدات.

---

(١) ـ رجاله ثقات، غير أنه منقطع.

(٢) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: دەربارەی دوورکەوتنەوە لە لادان و گومڕایی نەفسی و فکری

٣١٥- «عن الأوزاعي قال: قال عُمَرُ بنُ عَبدِ العَزِيزِ: إِذَا رَأَيتَ قَومًا يَتَنَاجَونَ بِأَمرٍ دُونَ عَامَّتِهِم، فَهُم عَلَى تَأسِيسِ الضَّلَالَةِ»[1].

واتە: لە ئەوزاعی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز وتویەتی: ئەگەر خەڵکانێکت بینی خەریک بوون کارێکیان بە نهێنی لە نێوان خۆیان ئەنجام دەدا و، لە خەڵکیان دەشاردەوە (پرسیان بە کەس نەکردو بەشداریان پێ نەدەکردن) ئەوە ئەوانە لەسەر دامەزراندنی گومڕاییێکن.

٣١٦- «عَنِ الأَوزَاعِيِّ قَالَ: قَالَ إِبلِيسُ لِأَولِيَائِهِ: مِن أَيِّ شَيءٍ تَأتُونَ بَنِي آدَمَ؟ فَقَالُوا: مِن كُلِّ شَيءٍ- قَالَ: فَهَل تَأتُونَهُم مِن قِبَلِ الِاستِغفَارِ؟ فَقَالُوا: هَيهَاتَ، ذَاكَ شَيءٌ قُرِنَ بِالتَّوحِيدِ- قَالَ: لَأَبُثَّنَّ فِيهِم شَيئًا لَا يَستَغفِرُونَ اللهَ مِنهُ، قَالَ: فَبَثَّ فِيهِمُ الأَهوَاءَ»[2].

واتە: لە ئەوزاعی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبلیس (شەیتان) بە داروودەستەکەی وت: لە چ شتێک و (ڕێگایەکەوە) بۆ نەوەکانی ئادەم دەچن؟ وتیان: لە هەموو شتێک و (ڕێگایەکەوە)، ئیبلیس وتی: ئایا لەڕووی ئیستیغفار و داوای لێخۆشبونەوە بۆیان دەچن؟ وتیان: ئەوە دوورە ئەوە شتێکە لەگەڵ یەکتاپەرستی دایە (خوا پەرستیە، خۆ خراپە نیە، کەی ئەوە کاری ئێمەیە!)، ئیبلیس وتی: شتێکیان لەناو بڵاودەکەمەوە کە داوای لێخۆشبونی لەسەر نەکەن (یان شتێکیان لەناو بڵاودەکەمەوە کە خوا لێیان خۆش نەبێت، هەندە شتێکی گەورە بێت)، ئەوزاعی دەڵێت: ئیبلیسیش بۆچوونی گومڕایی و ئارەزووی لە نێوان بڵاوکردنەوە (ئا ئەوە شتەکە بوو).

تێبینی: بۆیە شەیتان ناوی لەم ڕێگایە ناوە: (ڕێگەی ئیستیغفار)، چونکە کابرا کە بۆچوونی لادەر و خراپی وەرگرت و تووشی گێژاوی نەفس و شەیتان بوو بە عەقیدە، هەر داوای لێخۆشبوون ناکات و خۆی پێ لەسەر هەقە، کە ئیستیغفاریش نەکات و پێداگر بێت لەسەر باتڵ ئەوە خوای پەروەردگار لێی خۆش نابێت.

٣١٧- «عَن مُجَاهِدٍ قَالَ: مَا أَدرِي أَيُّ النِّعمَتَينِ عَلَيَّ أَعظَمُ: أَن هَدَانِي لِلإِسلَامِ، أَو عَافَانِي مِن هَذِهِ الأَهوَاءِ»[3].

واتە: لە موجاهید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نازانم کام لەم دوو نیعمەتانەی لەسەر منن گەورەترن: ئەوەی کە (خوا) هیدایەتی داوم بۆ ئیسلام، یان کە سەلامەتی کردووم لە ئارەزوو و بۆچوونی گومڕایی و شەهوەتی نەفسی.

---

(١) ـ إسناده منقطع.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

٣١٨- «عَن حَبَّةَ بنِ جُوَينٍ، قَالَ سَمِعتُ عَلِيًا أَو قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ: لَو أَنَّ رَجُلاً صَامَ الدَّهرَ كُلَّهُ، وَقَامَ الدَّهرَ كُلَّهُ، ثُمَّ قُتِلَ بَينَ الرُّكنِ وَالمَقَامِ، لَحَشَرَهُ اللهُ يَومَ القِيَامَةِ مَعَ مَن يُرَى أَنَّهُ كَانَ عَلَى هُدًى»[١].

واتە: لە حەببەتی كوڕی جوەین گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەلی ﷺ بووە دەیگوت: ئەگەر پیاوێک ساڵ هەمووی بە ڕۆژوو بێت و، ساڵ هەمووی شەوەكەی شەونوێژ بكات، دواتر لە نێوان ڕوكن و مەقام (كە دوو شوێنن لەناو مزگەوتی حەڕام، لەوێ) بكوژرێ، ئەوە خوا لە ڕۆژی دوایی حەشری دەكات لەگەڵ ئەو كەسەی ئەو پێی وایە لەسەر هیدایەتە و ڕێگای ئەوی پێ ڕاستە (واتە: لەگەڵ ئەو كەسە حەشر دەكرێت كە خۆشی دەوێت و ڕێگاكەی ئەوی هەڵبژاردووە، جا ئەگەر لەسەر ڕێگای پێغەمبەری خوا ﷺ و، هاوەڵان و، چاكەكاران و، زانایان بێت، ئەوە كردەوەكانی جێی خۆیان دەگرن و حەشری لەگەڵ ئەوانە، ئەگەر لەسەر ڕێگای كەسانی گومڕا بێت و خۆشی بووین، ئەوە حەشری لەگەڵ ئەوانە و، هیچ لەو عیبادەتە سوودی پێ ناگەیەنێ).

٣١٩- «عَن أَبِي صَادِقٍ، قَالَ: قَالَ سَلمَانُ ﷺ، لَو وَضَعَ رَجُلٌ رَأسَهُ عَلَى الحَجَرِ الأَسود، فَصَامَ النَّهَارَ، وَقَامَ اللَّيلَ، لَبَعَثَهُ اللهُ يَومَ القِيَامَةِ مَعَ هَوَاهُ»[٢].

واتە: لە ئەبو صادق گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سەلمان ﷺ وتویەتی: ئەگەر كەسێک سەری خۆی لەسەر بەردە ڕەشەكە دابنێت و، بە ڕۆژ ڕۆژوو بگرێ، بە شەویش شەونوێژ بكات، ئەوە خوا لە ڕۆژی دوایی زیندووی دەكاتەوە لەگەڵ ئارەزووەكەی (ئارەزووی چی كردبێت و، كێی خۆش ویستبێت لەگەڵ ئەو دەبێت).

٣٢٠- «عَن رَبِيعَةَ بنِ نَاجِذٍ، قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ كُونُوا فِي النَّاسِ كَالنَّحلَةِ فِي الطَّيرِ: إِنَّهُ لَيسَ مِنَ الطَّيرِ شَيءٌ إِلاَّ وَهُوَ يَستَضعِفُهَا، وَلَو يَعلَمُ الطَّيرُ مَا فِي أَجوَافِهَا مِنَ البَرَكَةِ، لَم يَفعَلُوا ذَلِكَ بِهَا، خَالِطُوا النَّاسَ بِأَلسِنَتِكُم وَأَجسَادِكُم، وَزَايِلُوهُم بِأَعمَالِكُم وَقُلُوبِكُم، فَإِنَّ لِلمَرءِ مَا اكتَسَبَ، وَهُوَ يَومَ القِيَامَةِ مَعَ مَن أَحَبَّ»[٣].

واتە: لە ڕەبیعەی كوڕی ناجیذ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەلی ﷺ وتویەتی: لە ناو خەڵكی بن هەروەكو چۆن هەنگ لەناو باڵندانە، هیچ باڵندەیەک نیە مەگەر ستەم لە هەنگ دەكات، ئەگەر باڵندە بیزانیایە ئەوەی هەیە لە ناو سكی هەنگ لە بەرەكەت، ئەوە ئاوای پێ نەدەكرد و ستەمی لێ نەدەكرد، لەگەڵ خەڵكی تێكەڵ بن بە زمان و جەستەتان و، (بەڵام) لێیان دوور بكەونەوە بە كردەوە و دڵەكانتان، چونكە مرۆڤ ئەوەی بۆ هەیە كە دەیكات، وە لە قیامەتیش لەگەڵ ئەو كەسەیە كە خۆشی دەوێت.

٣٢١- «عَنِ الزُّهرِيِّ، قَالَ: نِعمَ وَزِيرُ العِلمِ، الرَّأيُ الحَسَنُ»[٤].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ موقوف صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە زوهری گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: باشترین وەزیر بۆ زانست، بریتیە لە بۆچوونی چاک (بۆچوونی چاک ئەوەیە لەسەر قورئان و فەرموودە بێت، چونکە ڕەئی جوان لەلای زوهری واتە: ئەو بۆچوونەی بەڵگەی قورئان و فەرموودەی لەسەر بێت).

٣٢٢- «عَن مَسرُوقٍ قَالَ: كَفَى بِالمَرءِ عِلمًا أَن يَخشَى اللهَ، وَكَفَى بِالمَرءِ جَهلاً أَن يُعجَبَ بِعِلمِهِ»[١].

واتە: لە مەسڕوق گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەوەندە زانستە بەسە مرۆڤ لە خوا بترسێ، وە ئەوەندە نەزانیەش بەسە مرۆڤ بە زانستی خۆی سەرسام بێت.

٣٢٣- «وَقَالَ مَسرُوقٌ، المَرءُ حَقِيقٌ أَن يَكُونَ لَهُ مَجَالِسُ يَخلُو فِيهَا، فَيَذكُرُ ذُنُوبَهُ، فَيَستَغفِرُ اللهَ تَعَالَى مِنهَا»[٢].

واتە: مەسڕوق وتویەتی: هەق وایە مرۆڤ کاتێکی بۆ دانیشتن هەبێت تیایدا بە تەنیا بێت و، تاوانەکانی خۆی بیر بخاتەوە و، داوای لێخۆشبوونیان لە خوای بەرز لەسەر بکات.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسانەی ڕێگەیان داوە فەرموودە بە مانا بگێڕدرێتەوە ئەگەر ماناکە بپێکرێ و هەمان واتا بگەیەنێ

٣٢٤- «عَن وَاثِلَةَ بنِ الأَسقَعِ ﷺ قَالَ: إِذَا حَدَّثنَاكُم بِالحَدِيثِ عَلَى مَعنَاهُ فَحَسبُكُم»[٣].

واتە: لە واثیلەی کوڕی ئەسقەف ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر فەرموودەمان بۆ گێڕانەوە لەسەر ماناکەی (مانای فەرموودەکەمان بۆ گێڕانەوە) ئەوە بەستانە.

٣٢٥- «عَنِ ابنِ سِيرِينَ، أَنَّهُ كَانَ إِذَا حَدَّثَ، لَم يُقَدِّم وَلَم يُؤَخِّر، وَكَانَ الحَسَنُ إِذَا حَدَّثَ قَدَّمَ وَأَخَّرَ»[٤].

واتە: لە ئیبنو سیرین گێڕدراوەتەوە (دەربارەی خۆی) وتویەتی: ئەگەر فەرموودەی گێڕابایەوە پاش و پێشی نەدەکرد، حەسەنیش (واتە: حەسەنی بەصری) ئەگەر فەرموودەی گێڕابایەوە پاش و پێشی دەکرد (واتە: ئیبنو سیرین دەیەوێ بڵێ من هەردووکیانم پێ دروستن).

٣٢٦- «أَخبَرَنَا جَرِيرُ بنُ حَازِمٍ، قَالَ: كَانَ الحَسَنُ يُحَدِّثُ بِالحَدِيثِ الأَصلُ وَاحِدٌ وَالكَلَامُ مُختَلِفٌ»[٥].

---

(١) ـ موقوف صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە جەریری کوڕی حازم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار حەسەن حەدیسێکی دەگێڕایەوە (بە چەندین شێواز) ئەصلەکە یەک بوو (یەک مانایان هەبوو)و وشەکانیش جیاواز بوون.

٣٢٧- «حَدَّثَ عُبَيدُ بنُ عُمَيرٍ عَبدَ اللهِ بنَ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَثَلُ المُنَافِقِ مَثَلُ الشَّاةِ بَينَ الرَّبِضَينِ أَو بَينَ الغَنَمَينِ، فَقَالَ: ابنُ عُمَرَ لاَ، إِنَّمَا قَالَ: كَذَا وَكَذَا، قَالَ: وَكَانَ ابنُ عُمَرَ إِذَا سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ لَم يَزِد فِيهِ، وَلَم يُنقِص مِنهُ، وَلَم يُجَاوِزهُ، وَلَم يُقَصِّر عَنهُ»[١].

واتە: عوبەیدی کوڕی عومەیر فەرموودەی بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ گێڕایەوە و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نمونەی موونافیق (لە نێوان مسوڵمانان) وەک بزنێکە لە نێوان دوو کۆز وایە ـ یان (وەک بزنێک وایە) لە نێوان دوو مەڕ، ئیبنو عومەریش وتی: نەخێر (وانیە)، بەڵکو: ئاواو ئاوای فەرموو، (چونکە) ئیبنو عومەر ئەگەر گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووایە (کاتێ فەرموودەکەی دەگێڕایەوە) نە لێی زیاد دەکرد و نە لێی کەم دەکرد و نە لێی تێدەپەڕی و نە کەمتەرخەمی تیا دەکرد و نە کورتی دەکردەوە.

سەرنج: لەم فەرموودەیە دەردەکەوێ کە عوبەیدی کوڕی عومەیر فەرموودەی بە مانا گێڕاوەتەوە و لای دروست بووە، بەڵام عەبدوڵڵا پێی باش نەبووە فەرموودە بە مانا بگێڕدرێتەوە.

٣٢٨- «عَنِ ابنِ عَونٍ، قَالَ: كَانَ الشَّعبِيُّ، وَالنَّخَعِيُّ، وَالحَسَنُ يُحَدِّثُونَ بِالحَدِيثِ مَرَّةً هَكَذَا، وَمَرَّةً هَكَذَا، فَذَكَرتُ ذَلِكَ لِمُحَمَّدِ بنِ سِيرِينَ فَقَالَ: أَمَا إِنَّهُم لَو حَدَّثُوا بِهِ كَمَا سَمِعُوهُ، كَانَ خَيرًا لَهُم»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەون گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: شەعبی و نەخەعی و حەسەن فەرموودەیان دەگێڕایەوە جارەک بەو شێوەیە و، جارەک بەو شێوەیە (واتە: هەر جارەو بە شێوەیەک دەیانگێڕایەوە، بەڵام هەمووی یەک مانایان دەگەیاند)، بۆیە ئەوەم باسکرد بۆ موحەممەدی کوڕی سیرین، ئەویش وتی: ئەوان ئەگەر چۆنیان گوێ لێ بووە ئاوای بگێڕنەوە ئەوە بۆیان چاکترە (نەوەک هەر جارە و بە شێوەیەک، بەڵام ئەوەش دروستە).

٣٢٩- «عَن أَبِي مَعمَرٍ قَالَ: إِنِّي لَأَسمَعُ الحَدِيثَ لَحنًا فَأَلحَنُ اتِّبَاعًا لِمَا سَمِعتُ»[٣].

واتە: لە ئەبو مەعمەڕەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (جاری وا هەیە) من گوێم لە فەرموودە دەبێت (بۆم دەگێڕنەوە) بە هەڵە، منیش بە هەڵە دەیڵێمەوە تا شوێن ئەوە بکەوم کە گوێم لێ بووە (واتە حەز ناکەم فەرموودە بە مانا بگێڕمەوە هەر چەندە بە هەڵەش بۆم بگێڕنەوە، من هەر نایگۆڕم و وەک خۆی دەیڵێمەوە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی زانست و كەسی زانا

٣٣٠- «عَن إبرَاهِيمَ بنِ مَيسَرَةَ، قَالَ: رَأَى مُجَاهِدٌ طاوُوسًا فِي المَنَامِ كَأَنَّهُ فِي الكَعبَةِ يُصَلِّي مُتَقَنِّعًا، وَالنَّبِيُّ ﷺ عَلَى بَابِ الكَعبَةِ فَقَالَ لَهُ يَا عَبدَ اللهِ اكشِف قِنَاعَكَ وَأَظهِر قِرَاءَتَكَ، قَالَ: فَكَأَنَّهُ عَبَّرَهُ عَلَى العِلمِ، فَانبَسَطَ بَعدَ ذَلِكَ فِي الحَدِيثِ»[١].

واتە: لە ئیبراهیمی كوڕی مەیسەرە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: موجاهید طاووسی لە خەودا بینی وەك ئەوەی لە ناو كەعبە بێت نوێژی دەكرد بە ڕوخسار پێچرایی و پێغەمبەریش ﷺ لەناو دەرگای كەعبە بوو پێی فەرموو: ئەی عەبدوڵلا (ئەی طاووس) دەمامكەكەت لابەرە و خوێندنەوەكەشت ئاشكرا بكە، ئیبراهیم دەڵێ: (دوای ئەوەی خەوەكەم بۆ طاووس گێڕایەوە): وەك ئەوەی بڵێی (طاووس) خەونەكەی مانا كردبوو و لێكی دابوویەوە بە زانست، (بۆیە) لەپاش ئەو كاتە (گێڕانەوەی) فەرموودەی فراوان و زیاد كرد (چونكە پێی وابووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ كردووە چیتر خۆی نەشارێتەوە و زانستەكەی دەربخات و نەترسێت).

٣٣١- «عَن كَعبٍ قَالَ: الدُّنيَا مَلعُونَةٌ مَلعُونٌ مَا فِيهَا إلاَّ مُتَعَلِّمَ خَيرٍ أَو مُعَلِّمَهُ»[٢].

واتە: لە كەعبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دونیا دوورخراوەیە (لە ڕەحمەتی خوا) و ئەوەی لەناویشی دایە دوورخراوەیە (لە ڕووی نرخ و سوودەوە)، تەنها قوتابییەكی زانستی بە سوود نەبێ یان مامۆستاكەی.

٣٣٢- «عَن خَالِدِ بنِ مَعدَانَ، قَالَ: النَّاسُ عَالِمٌ وَمُتَعَلِّمٌ، وَمَا بَينَ ذَلِكَ هَمَجٌ لاَ خَيرَ فِيهِ»[٣].

واتە: لە خالیدی كوڕی مەعدانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خەڵك (دوو جۆرن) زاناو فێرخواز (قوتابی زانست)، هەرچی لەو نێوانەبێ (جگە لەم دووانە) نەفامە و هیچ سوودی تیا نیە.

٣٣٣- «عَنِ الحَسَنِ قَالَ: كَانُوا يَقُولُونَ: مَوتُ العَالِمِ ثُلمَةٌ فِي الإسلاَمِ لاَ يَسُدُّهَا شَيءٌ مَا اختَلَفَ اللَّيلُ وَالنَّهَارُ»[٤].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: مردنی زانا (دروست بوونی) كەلێنێكە لە ئیسلامدا هیچ شتێك پڕی ناكاتەوە تا شەو و ڕۆژ جیاوازیان هەبێت (واتە: هەرگیز و هەرگیز پڕ نابێتەوە).

---

(١) ـ مرسل، وإسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

٣٣٤- «عَن وَهبِ بنِ مُنَبِّهٍ، قَالَ: مَجلِسٌ يُتَنَازَعُ فِيهِ العِلمُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِن قَدرِهِ صَلاَةً، لَعَلَّ أَحَدَهُم يَسمَعُ الكَلِمَةَ فَيَنتَفِعُ بِهَا سَنَةً أَو مَا بَقِيَ مِن عُمُرِهِ»[1].

واتە: لە وەهبی کوڕی مونەببیە گێردراوەتەوە، وتویەتی: مەجلیسێک زانستی تێدا تاوتوێ بکرێت لام خۆشەویسترو خۆشترە لە (ئەنجامدانی) نوێژی (سوننەت) بە ئەندازەی مەجلیسەکە، (چونکە) ڕەنگە یەکێک (لە ئامادەبووانی مەجلیسەکە) گوێی لە وشەیەک بێت، ساڵێک یان تا ژیانی ماوە سوودی لێ وەربگرێ.

٣٣٥- «قَالَ سُفيَانُ: مَا أَعلَمُ عَمَلاً أَفضَلَ مِن طَلَبِ العِلمِ وَحِفظِهِ لِمَن أَرَادَ اللهُ تَعَالَى بِهِ خَيرًا»[2].

واتە: سوفیان وتویەتی: نەمزانیوە کردەوەیەک هەبێت چاکترو گەورەتر بێ لە داواکردن و گەڕان بە دوای زانست و لەبەر کردنی زانست، بۆ کەسێک کە خوا بیەوێ چاکەی لەگەڵ بکات.

٣٣٦- « قَالَ الحَسَنُ بنُ صَالِحٍ، إِنَّ النَّاسَ لَيَحتَاجُونَ إِلَى هَذَا العِلمِ فِي دِينِهِم، كَمَا يَحتَاجُونَ إِلَى الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ فِي دُنيَاهُم»[3].

واتە: حەسەنی کوڕی صالح وتویەتی: بە دڵنیایی خەڵک پێویستیان بەو زانستە هەیە بۆ دینەکەیان (واتە: زانستی فەرمووده)، هەر وەک چۆن پێویستیان بە خواردن و خواردنەوە هەیە بۆ دونیاکەیان.

٣٣٧- «قَالَ: أَبُو الدَّردَاءِ ﷺ، تَعَلَّمُوا قَبلَ أَن يُقبَضَ العِلمُ- فَإِنَّ قَبضَ العِلمِ قَبضُ العُلَمَاءِ، وَإِنَّ العَالِمَ وَالمُتَعَلِّمَ فِي الأَجرِ سَوَاءٌ»[4].

واتە: ئەبو دەرداء ﷺ وتویەتی: خۆتان فێر بکەن پێش ئەوەی زانست هەڵبگیرێ و نەمێنێ، چونکە بە دڵنیایی هەڵگرتنەوەو لەناوچوونی زانست بە لەناوچوونی زانایانە، وە بە دڵنیایی زانا و قوتابی زانست لە پاداشتدا وەکو یەکن.

٣٣٨- «عَنِ الضَّحَّاكِ، ﴿وَلَٰكِن كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمۡ تُعَلِّمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴿٧٩﴾﴾ آل عمران، قَالَ: حَقٌّ عَلَى كُلِّ مَن قَرَأَ القُرآنَ، أَن يَكُونَ فَقِيهًا»[5].

واتە: لە ضەحاک گێردراوەتەوە، دەربارەی ئەو ئایەتەی کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِن كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمۡ تُعَلِّمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴿٧٩﴾﴾ آل عمران، واتە: [بەڵکو (پێیان دەڵێت) خوا پەرست بن، چونکە ئێوە دەرسی کتێبی ئاسمانی دەڵێنەوە وە ئێوە خۆشتان دەخوێنن]، وتویەتی: هەق وایە هەموو ئەوانەی قورئان دەخوێنن زانای تێگەیشتوو بن (لە شەرعی خوا).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لانقطاعه.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

٣٣٩- «عَنِ الحَسَنِ، ﴿ لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ ﴿٦٣﴾ ﴾المائدة، قَالَ: الحُكَمَاءُ العُلَمَاءُ»[1].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو ئایەتەی کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ ﴿٦٣﴾ ﴾المائدة، واتە: [ئەوە بۆچی ڕێگریان نەکرد ڕەببانی و ئەحبارەکانیان، لە گوفتاری گوناهیان و حەرام خواردنیان (وەک بەرتیل)]، وتویەتی (ڕەببانی و ئەحبار) واتە: داناکان و زاناکان.

٣٤٠- «عَن سَعِيدِ بنِ جُبَيرٍ، قَالَ: ﴿كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ ﴿٧٩﴾ ﴾آل عمران، قَالَ: عُلَمَاءُ فُقَهَاءُ»[2].

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کە خوا دەفەرموێ: ﴿كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ ﴿٧٩﴾ ﴾آل عمران [ببنە ڕەببانی]، وتی واتە: (ببنە) زانای تێگەیشتوو.

٣٤١- «أَخبَرَنَا عُبَيدُ اللهِ بنُ سَعِيدٍ، قَالَ: سَمِعتُ سُفيَانَ بنَ عُيَينَةَ، يَقُولُ: يُرَادُ لِلعِلمِ الحِفظُ، وَالعَمَلُ، وَالِاستِمَاعُ، وَالإِنصَاتُ، وَالنَّشرُ»[3].

واتە: لە عوبەیدوڵڵای کوڕی سەعید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە سوفیانی کوڕی عویەینە بوو دەیوت: لە زانستدا لەبەر کردن و کار پێ کردن و گوێ ڕاگرتن و بێ دەنگ بوون و بڵاو کردنەوە مەبەستە.

٣٤٢- «عَن سُفيَانَ بنِ عُيَينَةَ قَالَ: أَجهَلُ النَّاسِ مَن تَرَكَ مَا يَعلَمُ، وَأَعلَمُ النَّاسِ مَن عَمِلَ بِمَا يَعلَمُ، وَأَفضَلُ النَّاسِ أَخشَعَهُم لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ»[4].

واتە: لە سوفیانی کوڕی عویەین گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نەزانترینی خەڵکی ئەو کەسەیە ئەو شتە واز لێ دەهێنێ و جێبەجێی ناکات لە کاتێکدا دەیزانێ و زانیاری پێی هەیە، وە زاناترینی خەڵکی ئەو کەسەیە کە کار بەو شتە دەکات کە دەیزانێ و زانیاری پێی هەیە، وە باشترین و گەورەترینی خەڵکی ئەو کەسەیە کە لە هەموویان زیاتر لە خوای زاڵی پایەدار دەترسێ.

٣٤٣- «عَنِ الحَسَنِ، قَالَ: مَنهُومَانِ لاَ يَشبَعَانِ: مَنهُومٌ فِي العِلمِ لاَ يَشبَعُ مِنهُ، وَمَنهُومٌ فِي الدُّنيَا لاَ يَشبَعُ مِنهَا، فَمَن تَكُنِ الآخِرَةُ هَمَّهُ، وَبَثَّهُ، وَسَدَمَهُ، يَكفِي اللهُ ضَيعَتَهُ، وَيَجعَلُ غِنَاهُ فِي قَلبِهِ، وَمَن تَكُنِ الدُّنيَا هَمَّهُ، وَبَثَّهُ، وَسَدَمَهُ، يُفشِي اللهُ عَلَيهِ ضَيعَتَهُ، وَيَجعَلُ فَقرَهُ بَينَ عَينَيهِ، ثُمَّ لاَ يُصبِحُ إِلاَّ فَقِيرًا، وَلاَ يُمسِي إِلاَّ فَقِيرًا»[5].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دوو برسی هەن تێر نابن: کەسی برسی لە زانستدا لێی تێر نابێ، وە کەسی چاو برسی لە بەدەست هێنانی دونیادا لێی تێر نابێ، جا هەر کەسێک خەمی دونیای بێ، (ئەوە) خوا کارەکەی وا لێ دەکات بەشی بکات و دەوڵەمەندی دەخاتە دڵیەوە، وە هەر

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ موقوف صحيح.

کەسێکیش دونیا هەمم و غەم و حەسرەتی بێت، (ئەوە) خوا کارەکەی لەسەر پەرش و بڵاودەکات و (باری کارەکانی نابات) و، هەژاری دەخاتە نێوان دوو چاوانیەوە (دەخاتە تەوێڵ و نەوچاوانیەوە)و، دواتر (ئەو جۆرە کەسە) بەیانی ناکاتەوە تەنها بە هەژاری نەبێت و، ئێوارە ناکاتەوە تەنها بە هەژاری نەبێت (بەردەوام هەژارە، جا هەژاریەکە ماددی بێت یان مەعنەویی).

٣٤٤- «قَالَ عَبدُ اللهِ ﷺ، مَنهُومَانِ لاَ يَشبَعَانِ: صَاحِبُ العِلمِ، وَصَاحِبُ الدُّنيَا، وَلاَ يَستَوِيَانِ- أَمَّا صَاحِبُ العِلمِ، فَيَزدَادُ رِضًا لِلرَّحمَنِ، وَأَمَّا صَاحِبُ الدُّنيَا، فَيَتَمَادَى فِي الطُّغيَانِ، ثُمَّ قَرَأَ عَبدُ اللهِ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ٦ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ٧ ﴾العلق، قَالَ: وَقَالَ الآخَرُ: ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ ٢٨ ﴾ فاطر»[1].

واتە: عەبدوڵلا ﷺ وتویەتی: دوو برسی هەن تێر نابن: خاوەنی زانست و، خاوەنی دونیا، وەکو یەکیش نین، هەرچی خاوەنی زانستە ڕەزامەندی خوا بۆ خۆی زیاد دەکات، وە هەرچی خاوەنی دونیایە لە ستەم و تاوان ڕۆ دەچێ، دواتر عەبدوڵلا (ئەو ئایەتەی) خوێندەوە (کە خوا دەفەرموێ): ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ٦ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ٧ ﴾العلق واتە: [بەڕاستی مرۆڤ یاخی دەبێ، کە خۆی ببینێ وا دەوڵەمەند بووە] (ئەوە باسی خاوەن و هاوڕێی دونیایە)، وە ئایەتێکی تری خوێندەوە (کە خوا دەفەرموێ): ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ ٢٨ ﴾فاطر، واتە: [بەڕاستی لەناو بەندەکانی خودا تەنها زانایان (وەک پێویست) لە خودا دەترسن] (ئەوەش باسی خاوەنی زانستە).

٣٤٥- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ ٢٨ ﴾فاطر، قَالَ: مَن خَشِيَ اللهَ فَهُوَ عَالِمٌ»[2].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو ئایەتەی): ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ ٢٨ ﴾فاطر، واتە: [بەڕاستی لەناو بەندەکانی خوادا تەنها زانایان (وەک پێویست) لە خودا دەترسن] وتویەتی: هەر کەسێک لە خوا بترسێ ئەوە زانایە.

٣٤٦- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: مَنهُومَانِ لاَ يَشبَعَانِ: طَالِبُ عِلمٍ، وَطَالِبُ دُنيَا»[3].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دوو برسی هەن تێر نابن: (یەکەمیان): داواکار و قوتابی زانست و، (دووەمیشیان): داواکاری دونیا.

٣٤٧- «حَدَّثَنَا رَبِيعَةُ بنُ يَزِيدَ، قَالَ: سَمِعتُ وَاثِلَةَ بنَ الأَسقَعِ ﷺ يقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَن طَلَبَ العِلمَ فَأَدرَكَهُ، كَانَ لَهُ كِفلاَنِ مِنَ الأَجرِ، فَإِن لَم يُدرِكهُ، كَانَ لَهُ كِفلٌ مِنَ الأَجرِ»[4].

---

(١) ـ إسناده منقطع.

(٢) ـ إسناده ضعيف مضطرب.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف جداً.

واتە: لە ڕەبیعەی کوڕی یەزید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە واثیلەی کوڕی ئەسقەف ﷺ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەدوای زانستدا بگەڕێ و پێی بگات، ئەوە دوو بەش لە پاداشتی بۆ هەیە، وە ئەگەر پێشی نەگات ئەوە بەشێک لە پاداشتی بۆ هەیە (کە هەقی ماندوبوونەکەیە).

٣٤٨- «عَن عَبَّاسٍ العَمِّيِّ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ دَاوُدَ النَّبِيَّ عليه السلام كَانَ يَقُولُ فِي دُعَائِهِ: سُبحَانَكَ اللهُمَّ، أَنتَ رَبِّي تَعَالَيتَ فَوقَ عَرشِكَ، وَجَعَلتَ خَشيَتَكَ عَلَى مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرضِ، فَأَقرَبُ خَلقِكَ مِنكَ مَنزِلَةً أَشَدُّهُم لَكَ خَشيَةً وَمَا عِلمُ مَن لَم يَخشَكَ؟ وَمَا حِكمَةُ مَن لَم يُطِع أَمرَكَ؟»[1].

واتە: لە عەبباسی عەممیی، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێم گەیشتووە کە داوودی پێغەمبەر عليه السلام هەموو جار لە دوعاو پاڕانەوەکەی دەیوت: پاک و بێگەردی بۆ تۆ خوایە، تۆ خوای منی لە عەرشەکەت بەرزتری، وە ترسی خۆت لەسەر ئەوانە داناوە کە لە ئاسمانەکان و زەویدان، کەواتە: نزیکترین کەس لێتەوە لە ڕووی پلەو پایەوە ئەوەیە کە لە هەموویان زیاتر ترسی لێت هەیە، وە زانستی چی هەیە ئەوەی لێت نەترسێ؟! وە دانایی چی هەیە ئەوەی گوێڕایەڵی فەرمانت نەکا؟!

٣٤٩- « قَالَ عَبدُ اللهِ بنُ مَسعُودٍ رضي الله عنه، اغدُ عَالِمًا، أَو مُتَعَلِّمًا، وَلاَ خَيرَ فِيمَا سِوَاهُمَا»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود رضي الله عنه وتویەتی: ببە بە زانا یان فێرخواز (قوتابی زانست)، سوود و خێریش لە جگە لەم دووانەدا نیە.

٣٥٠- «عَن أَبِي أُمَامَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: سَتَكُونُ فِتَنٌ يُصبِحُ الرَّجُلُ فِيهَا مُؤمِنًا، وَيُمسِي كَافِرًا، إِلاَّ مَن أَحيَاهُ اللهُ بِالعِلمِ»[3].

واتە: لە ئەبو ئومامە رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: لەمەودوا فیتنە و ئاشوبی (زۆر و گەورە و خەتەر) پەیادەبن، مرۆڤ بەیانی دەکاتەوە بە بڕواداری ئێوارە دەکاتەوە بە بێ بڕوایی (واتە: ئاوا زوو خەڵکی لە دین وەردەگەڕێن) تەنها کەسانێک نەبن کە خوا زیندووی کردوون بە زانست (خاوەنی زانست هەرگیز وەرناگەڕێ، خوا بە زانستەکەی دەیپارێزێت).

٣٥١- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ مَسعُودٍ رضي الله عنه، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: اغدُ عَالِمًا أَو مُتَعَلِّمًا، وَلاَ تَغدُ فِيمَا بَينَ ذَلِكَ، فَإِنَّ مَا بَينَ ذَلِكَ جَاهِلٌ، وَإِنَّ المَلاَئِكَةَ تَبسُطُ أَجنِحَتَهَا لِلرَّجُلِ، غَدَا يَبتَغِي العِلمَ مِنَ الرِّضَا بِمَا يَصنَعُ»[4].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده منقطع.

(٣) ـ ضعيف جداً.

(٤) ـ رجاله ثقات، إلا أنه منقطع.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ گێڕدراوەتەوە، هەموو جار دەیوت: ببە بە زانا یان فێرخواز (قوتابی زانست)، نەبیتە کەسێک لەو نێوانە (واتە: نەبیتە جگە لەو دووانە)، چونکە جگە لەم دووانە ئەوەی لەو نێوانەیە نەزانە، وە بە دڵنیایی فریشتەکان باڵەکانیان ڕادەخەن بۆ کەسێک کە خەریکی گەڕانە بۆ زانست، لەبەر ڕەزامەندی ئەو کارەی مرۆڤەکە دەیکات (کە بەدەست هێنانی زانستە).

٣٥٢- «عَنِ الحَسَنِ، قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَن رَجُلَينِ كَانَا فِي بَنِي إِسرَائِيلَ أَحَدُهُمَا كَانَ عَالِمًا يُصَلِّي المَكتُوبَةَ، ثُمَّ يَجلِسُ فَيُعَلِّمُ النَّاسَ الخَيرَ، وَالآخَرُ يَصُومُ النَّهَارَ وَيَقُومُ اللَّيلَ أَيُّهُمَا أَفضَلُ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: فَضلُ هَذَا العَالِمِ الَّذِي يُصَلِّي المَكتُوبَةَ ثُمَّ يَجلِسُ فَيُعَلِّمُ النَّاسَ الخَيرَ، عَلَى العَابِدِ الَّذِي يَصُومُ النَّهَارَ، وَيَقُومُ اللَّيلَ، كَفَضلِي عَلَى أَدنَاكُم رَجُلاً»[١].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی دوو پیاو کە لەناو بەنی ئیسرائیل بوون، یەکێکیان زانا بوو نوێژی واجبی دەکرد و، دواتر دادەنیشت و خەڵکی فێری چاکەو زانست دەکرد، ئەوەی تریشیان بە ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبوو، بە شەویش شەونوێژی دەکرد، ئایا کامیان باشترە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: گەورەیی ئەو زانایەی نوێژی واجبی دەکردو دواتر دادەنیشت و خەڵکی فێری چاکەو زانست دەکرد لەسەر ئەو خوا پەرستەی کە بە ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبوو و بە شەویش شەونوێژی دەکرد، وەکو گەورەیی من وایە بەسەر نزمترین کەستان.

٣٥٣- «عَنِ ابنِ سِيرِينَ، قَالَ: دَخَلتُ المَسجِدَ فَإِذَا الأَسود بنُ سُرَيعٍ يَقُصُّ، وَحُمَيدُ بنُ عَبدِ الرَّحمَنِ يَذكُرُ العِلمَ فِي نَاحِيَةِ المَسجِدِ، فَمَيَّلتُ إِلَى أَيِّهِمَا أَجلِسُ، فَنَعَستُ فَأَتَانِي آتٍ فَقَالَ: مَيَّلتَ إِلَى أَيِّهِمَا تَجلِسُ؟ إِن شِئتَ أَرَيتُكَ مَكَانَ جِبرَائِيلَ عَلَيهِ السَّلاَمُ مِن حُمَيدِ بنِ عَبدِ الرَّحمَنِ»[٢].

واتە: لە ئیبنو سیرین گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چومە ناو مزگەوت و (بینیم) ئەسوەدی کوڕی سورەیع چیرۆکی دەگێڕایەوە (بۆ خەڵکی)، وە حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانیش باسی زانستی دەکرد (بۆ خەڵکی) لە لایێکی مزگەوتەکە، منیش دوو دڵ بووم کە لای کامیان دابنیشم، جا وەنەوزێکم هاتێ و خەو بردمیەوە و (لە خەوەکەمدا) یەکێک هات بۆ لام و وتی: دوو دڵ بووی لەوەی لای کامیان دابنیشی؟ ئەگەر حەز دەکەیت شوێنی جیبریلت پێ نیشان دەدەم لەلای حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان (واتە: جیبریل لەناو مەجلیسە زانستیەکەیەو برۆ بۆ لای ئەوان و ئەو مەجلیس هەڵبژێرە).

٣٥٤- «عَن كَثِيرِ بنِ قَيسٍ، قَالَ: كُنتُ جَالِسًا مَعَ أَبِي الدَّردَاءِ ﷺ فِي مَسجِدِ دِمَشقَ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا أَبا الدَّردَاءِ إِنِّي أَتَيتُكَ مِنَ المَدِينَةِ مَدِينَةِ الرَّسُولِ ﷺ لِحَدِيثٍ بَلَغَنِي عَنكَ أَنَّكَ تُحَدِّثُهُ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: فَمَا جَاءَ بِكَ تِجَارَةٌ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: وَلاَ جَاءَ بِكَ غَيرُهُ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَن سَلَكَ طَرِيقًا يَلتَمِسُ بِهِ عِلمًا، سَهَّلَ اللهُ بِهِ طَرِيقًا مِن طُرِق الجَنَّةِ، وَإِنَّ المَلاَئِكَةَ لَتَضَعُ أَجنِحَتَهَا رِضًا لِطَالِبِ

---

(١) ـ رجاله ثقات، إلا أنه منقطع.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

العِلمِ، وَإِنَّ طَالِبَ العِلمِ، لَيَستَغفِرُ لَهُ مَن فِي السَّمَاءِ وَالأَرضِ حَتَّى الحِيتَانُ فِي المَاءِ، وَإِنَّ فَضلَ العَالِمِ عَلَى العَابِدِ كَفَضلِ القَمَرِ عَلَى سَائِرِ النُّجُومِ إِنَّ العُلَمَاءَ هُم وَرَثَةُ الأَنبِيَاءِ، إِنَّ الأَنبِيَاءَ لَم يُوَرِّثُوا دِينَارًا، وَلاَ دِرهَمًا، وَإِنَّمَا وَرَّثُوا العِلمَ، فَمَن أَخَذَ بِهِ أَخَذَ بِحَظِّهِ أَو بِحَظٍّ وَافِرٍ»[١].

واتە: لە كەثیری كوڕی قەیس گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من لەگەڵ ئەبو دەرداء ﷺ دانیشتبووم لە مزگەوتی دیمەشق، پیاوێک هات بۆ لای و وتی: ئەی ئەبو دەرداء من هاتووم بۆ لات لە مەدینەوە مەدینەی پێغەمبەری خوا بۆ فەرموودەیەک پێم گەیشتووە لە تۆوە كە دەیگێڕیتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، ئەبو دەرداء (بە پیاوەكەی) وت: بازرگانییێک تۆی هێناوە؟ وتی: نەخێر، وتی: ئایا هیچ شتی تر جگە لە فەرموودە تۆی نەهێناوە؟ وتی: نەخێر، ئەبو دەرداء وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: هەر كەسێک ڕێگایێک بگرێتەبەر تیادا بە دوای زانستدا بگەڕێت خوا بەهۆیەوە ڕێگایێک لە ڕێگاكانی بەهەشتی بۆ ئاسان دەكات، وە فریشتەكان باڵەكانیان بۆ قوتابی زانست ڕادەخەن لەبەر ڕەزامەندی (بۆ ئەو كارە)، وە بە دڵنیایی قوتابی زانست ئەوەی لە ئاسمان و زەویدا هەیە داوای لێخۆشبوونی بۆ دەكەن هەتا ماسیش لەناو ئاودا (داوای لێخۆشبوونی بۆ دەكات)، هەروەها گەورەیی زانا بەسەر خواپەرست وەک گەورەیی مانگە بەسەر ئەستێرەكانی تر، بە دڵنیایی زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، پێغەمبەران دینار و دیرهەمیان جێ نەهێشتووە بە میرات لە دوای خۆیان، بەڵكو تەنها زانستیان جێ هێشتووە، جا هەر كەسێک دەستی پێوە بگرێت و زانست وەرگرێت ئەوە پشكی خۆی وەرگرتووە یان پشكی زۆری وەرگرتووە.

٣٥٥- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: مُعَلِّمُ الخَيرِ يَستَغفِرُ لَهُ كُلُّ شَيءٍ حَتَّى الحُوتُ فِي البَحرِ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو شتێک داوای لێخۆشبوون بۆ زانا و مامۆستای چاكەخواز دەكەن، هەتا ماسی (نەهەنگ)یش لەناو دەریادا (داوای لێخۆشبوونی بۆ دەكات).

٣٥٦- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا مِن رَجُلٍ يَسلُكُ طَرِيقًا يَطلُبُ فِيهِ عِلمًا، إِلاَّ سَهَّلَ اللهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الجَنَّةِ، وَمَن أَبطَأَ بِهِ عَمَلُهُ، لَم يُسرِع بِهِ نَسَبُهُ»[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک ڕێگایێک بگرێتەبەر تیایدا بەدوای زانستدا بگەڕێ حەتمەن خوای پەروەردگار بە هۆیەوە ڕێگایێكی بۆ بەهەشت بۆ ئاسان دەكات، وە هەر كەسێكیش كردەوەكانی دوای خستبێت نەسەب و ڕەچەڵەكەكەی پێشی ناخات (چونكە كردار پێوەرە).

٣٥٧- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: مَا سَلَكَ رَجُلٌ طَرِيقًا يَبتَغِي فِيهِ العِلمَ إِلاَّ سَهَّلَ اللهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الجَنَّةِ، وَمَن يُبطِئ بِهِ عَمَلُهُ، لَم يُسرِع بِهِ نَسَبُهُ»[٤].

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ موقوف حسن.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ ڕێگایێک نیە مرۆڤ بیگرێتەبەر تیایدا بەدوای زانستدا بگەڕێ حەتمەن خوای پەروەردگار بە هۆیەوە ڕێگایێکی بۆ بەهەشت بۆ ئاسان دەکات، وە هەر کەسێکیش کردەوەکانی دوای خستبێت نەسەب و ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخات (گرنگ کردەوەیە نەک ڕەچەڵەک).

٣٥٨- «عَن مَطَرٍ: ﴿وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ١٧﴾القمر، قَالَ: هَل مِن طَالِبِ خَيرٍ فَيُعَانَ عَلَيهِ؟»[١].

واتە: لە مەطەڕ گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ١٧﴾القمر، واتە: [سوێند بە خوا ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە بۆ ئامۆژگاری لێ وەرگرتن، جا ئایا پەند وەرگرێک هەیە؟]، مەطەڕ گوتوویەتی: ئایا قوتابی و داواکاری خێرو چاکە هەیە تا لەسەر زانست یارمەتی بدرێت؟

٣٥٩- «عن ضمرةَ، قَالَ: طالبُ عِلمٍ»[٢].

واتە: لە ضەمرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (مەطەڕ لە فەرموودەکەی پێشتر باس کرا نەی وتووە طالب خیر)، بەڵکو وتی: طالب علم، قوتابی زانست.

٣٦٠- «عَن عَامِرِ بنِ إبرَاهِيمَ، قَالَ: كَانَ أَبُو الدَّردَاءِ ﷺ، إذَا رَأَى طَلَبَةَ العِلمِ، قَالَ: مَرحَباً بِطَلَبَةِ العِلمِ، وَكَانَ يَقُولُ: إنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أوصَى بِكُم»[٣].

واتە: لە عامیری کوڕی ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئەبو دەرداء ﷺ کە قوتابیانی دەبینی دەیوت: مەرحەبا لە قوتابی زانست (دڵ فراوانم بە قوتابیان بەخێر بێن، سڵاوتان لێ بێت)، وە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتی بە ئێوە کردووە (واتە: وەسیەتی بۆ کردووین یارمەتیتان بدەین و فێرتان بکەین و لە خزمەتتاندا بین).

٣٦١- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ عَمرٍو رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ مَرَّ بِمَجلِسَينِ فِي مَسجِدِهِ فَقَالَ: كِلاَهُمَا عَلَى خَيرٍ، وَأَحَدُهُمَا أَفضَلُ مِن صَاحِبِهِ أَمَّا هَؤُلاَءِ فَيَدعُونَ اللهَ وَيَرغَبُونَ إلَيهِ، فَإِن شَاءَ أَعطَاهُم، وَإِن شَاءَ مَنَعَهُم، وَأَمَّا هَؤُلاَءِ فَيَتَعَلَّمُونَ الفِقهَ والعلمَ وَيُعَلِّمُونَ الجَاهِلَ، فَهُم أَفضَلُ، وَإِنَّمَا بُعِثتُ مُعَلِّمًا، قَالَ: ثُمَّ جَلَسَ فِيهِم»[٤].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، (وتویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدا بە لای دوو مەجلیسدا تێپەڕی و فەرمووی: هەردووکیان لەسەر خێرن (باسی چاکەیان

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ رجاله ثقات، إلا أنه معضل.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

تیا دەکرێت، (بەڵام) یەکێکیان (لە دوو مەجلیسەکە) باشترە لەوەی تریان، هەرچی ئەمانەنە (واتە مەجلیسی یەکەم) داواو نزا لە خوا دەکەن و چاویان لە ڕەحمەتی ئەوە (داواکاریەکانیان پێ ببەخشێت)، جا ئەگەر خوا حەزی کرد پێیان دەبەخشێت و ئەگەر حەزیشی کرد (پێیان نەبەخشێت) ئەوە پێیان نابەخشێت، وە هەرچی ئەمانەنە (مەجلیسی دووەم) خۆیان فێری فیقە و شەریعەت و زانست دەکەن و نەزان فێر دەکەن، ئەمانە باشترن (لە مەجلیسی یەکەم)، وە بە دڵنیایی من ڕەوانە کراوم بە مامۆستا (تا خەڵکی فێر بکەم)، عەبدوڵلا دەڵێت: دواتر (پێغەمبەری خوا ﷺ) لەناویان دانیشت (واتە: لەناو مەجلیسە زانستیەکە دانیشت کە مەجلیسی دووەم بوو).

٣٦٢- «عَن مُطَرِّفِ بنِ عَبدِ اللهِ بنِ الشِّخِّيرِ، أَنَّهُ قَالَ لِابنِهِ: يَا بُنَيَّ، إِنَّ العِلمَ خَيرٌ مِنَ العَمَلِ»[١].

واتە: لە موطەڕریفی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی شیخخیر گێڕدراوەتەوە کە بە کوڕەکەی وتووە: ئەی ڕۆڵە بە دڵنیایی زانست باشترە لە کردەوە (واتە: زانست باشترە لە عیبادەت، یان باشترە لە کردەوەیەکی بێ زانست).

٣٦٣- «أَخبَرَنَا شُرَحبِيلُ بنُ شَرِيكٍ، أَنَّهُ: سَمِعَ أبا عَبدِ الرَّحمَنِ الحُبلَيَّ يَقُولُ: لَيسَ هَدِيَّةٌ أَفضَلَ مِن كَلِمَةِ حِكمَةٍ تُهدِيهَا لِأَخِيكَ»[٢].

واتە: لە شوڕەحبیلی کوڕی شەریک گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە ئەبو عەبدوڕڕەحمانی حوبولی بووە کە دەیوت: هیچ خەڵات و دیاریەک نیە باشترو گەورەتر بێت لە وشەیێکی حیکمەت و زانست کە بیکەیتە دیاری بۆ براکەت.

٣٦٤- «عَنِ الزُّهرِيِّ قَالَ: فَضلُ العَالِمِ عَلَى المُجتَهِدِ مِائَةُ دَرَجَةٍ، مَا بَينَ الدَّرَجَتَينِ خَمسُ مِائَةِ سَنَةٍ حُضرُ الفَرَسِ المُضَمَّرِ السَّرِيعِ»[٣].

واتە: لە زوهری گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گەورەیی زانا بەسەر کەسی ماندوو (لە عیبادەت کردندا) سەد پلەیە، لە نێوان هەر پلەیێکیش پێنج سەد ساڵە، بە ڕۆیشتن و بازدانی ئەسپێکی تێری قەڵەوی خێرا.

٣٦٥- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا: ﴿يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖ ۝١١﴾ المجادلَة، قَالَ: يَرفَعُ اللهُ الَّذِينَ أُوتُوا العِلمَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا بِدَرَجَاتٍ»[٤].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، (دەربارەی ئەو ئایەتەی): ﴿يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖ ۝١١﴾المجادلَة واتە: [خوا پلەی ئەو کەسانە بەرزدەکاتەوە لە ئێوە

---

(١) ـ إسناده ضعيف منقطع.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ موقوف ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

كە بڕوایان هێناوە، وە ئەوانەی كە زانستیان پێ بەخشراوە بە چەند پلەیەك (پلەیان بەرز دەكاتەوە)]، وتویەتی: خوا ئەو كەسانە بەرزدەكاتەوە كە زانستیان پێدراوە بەسەر ئەو كەسانەی كە بڕواداران بە پلەی زۆر و زەوەند.

٣٦٦- «عَنِ الحَسَنِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَن جَاءَهُ الْمَوتُ وَهُوَ يَطلُبُ العِلمَ لِيُحيِيَ بِهِ الإِسلَامَ، فَبَينَهُ وَبَينَ النَّبِيِّينَ دَرَجَةٌ وَاحِدَةٌ فِي الجَنَّةِ»[١].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك مردنی بۆ هات لە كاتێكدا بە دوای زانستدا دەگەڕا تاوەكو ئیسلامی پێ زیندوو بكاتەوەو ببوژێنێتەوە، ئەوە لە نێوان ئەوو لە نێوان پێغەمبەراندا لە بەهەشتدا یەك پلە هەیە (واتە: تەنها بە یەك پلە جیاوازیان هەیە).

٣٦٧- «عَن عَمرِو بنِ مَيمُونٍ، قَالَ: ذَهَبَ عُمَرُ بِثُلُثَيِ العِلمِ قَالَ: فَذَكَرتُ لِإِبرَاهِيمَ، فَقَالَ: ذَهَبَ عُمَرُ بِتِسعَةِ أَعشَارِ العِلمِ»[٢].

واتە: لە عەمری كوڕی مەیمون گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (ئیمامی) عومەر دوو لەسەر سێی زانستی لەگەڵ خۆی برد (كاتێ وەفاتی كرد)، دەڵێ: منیش ئەو وتەیەم لەلای ئیبرهیم باس كرد، ئەویش وتی: (نەك هەر ئەوەندە بەڵكو) عومەر نۆ لەسەر دەی زانستی لەگەڵ خۆی برد.

٣٦٨- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: مَا اجتَمَعَ قَومٌ فِي بَيتٍ مِن بُيُوتِ اللهِ يَتَذَاكَرُونَ كِتَابَ اللهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَينَهُم، إِلاَّ أَظَلَّتهُمُ المَلَائِكَةُ بِأَجنِحَتِهَا حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيرِهِ، وَمَن سَلَكَ طَرِيقًا يَبتَغِي بِهِ العِلمَ، سَهَّلَ اللهُ طَرِيقَهُ إِلَى الجَنَّةِ، وَمَن أَبطَأَ بِهِ عَمَلُهُ، لَم يُسرِع بِهِ نَسَبُهُ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ كۆمەڵە خەڵكێك نیە كۆببنەوە لەماڵێك لە ماڵەكانی خوا باسی قورئان بكەن و، لە نێوان خۆیاندا بیخوێنن و، یەكتری فێر بكەن، حەتمەن فریشتەكان دایان دەپۆشن بە باڵەكانیان تاوەكو ڕۆدەچن لە بابەتێكی تر (واتە: تا ئەو كاتەی بابەتی جگە لە زانست دێتە گۆڕێ)، وە هەر كەسێك ڕێگاییەك بگرێ تیایدا بەدوای زانستدا بگەڕێ خوا ڕێگای بۆ بەهەشت بۆ ئاسان دەكات، وە هەر كەسێكیش كردەوەكانی دوای خستبێت نەسەب و ڕەچەڵەكەكەی پێشی ناخات.

٣٦٩- «عَن زِرٍّ قَالَ: غَدَوتُ عَلَى صَفوَانَ بنِ عَسَّالٍ المُرَادِيِّ، وَأَنَا أُرِيدُ أَن أَسأَلَهُ عَنِ المَسحِ عَلَى الخُفَّينِ، فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكَ؟ قُلتُ: ابتِغَاءُ العِلمِ، قَالَ: أَلاَ أُبَشِّرُكَ؟ قُلتُ: بَلَى- فَقَالَ: رَفَعَ الحَدِيثَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَقَالَ: إِنَّ المَلَائِكَةَ لَتَضَعُ أَجنِحَتَهَا لِطَالِبِ العِلمِ، رِضًا بِمَا يَطلُبُ»[٤].

---

(١) ـ إسناده ضعيف جداً.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده حسن.

واتە: لە زیڕڕەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بەیانیم کردەوە لەلای صەفوانی کوڕی عەسسالی موڕادی و، من مەبەستم وابوو کە پرسیاری لێ بکەم دەربارەی مەسح کردن لەسەر خوف، ئەویش وتی: چی تۆی هێناوە؟ وتم: ویستنی زانست، وتی: ئایا موژدەت پێ نەدەم؟ وتم: با، زیڕ وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی فریشتەکان باڵەکانیان ڕادەخەن بۆ قوتابی زانست لەبەر ڕەزامەندی ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێت و داوای دەکات.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی بەدوای زانستدا دەگەڕێ بەبێ نیەت، زانستەکە دەیگێڕێتەوە بۆ نیەتەکە و (فێری نیەتی دەکات)

٣٧٠- «حَدَّثَنَا يَحيَى بنُ يَمَانٍ، قَالَ: سَمِعتُ سُفيَانَ مُنذُ أَربَعِينَ سَنَةً قَالَ: مَا كَانَ طَلَبُ الحَدِيثِ أَفضَلَ مِنهُ اليَومَ، قَالُوا لِسُفيَانَ إِنَّهُم يَطلُبُونَهُ بِغَيرِ نِيَّةٍ؟ قَالَ: طَلَبُهُم إِيَّاهُ نِيَّةٌ»[1].

واتە: لە یەحیای کوڕی یەمان گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێش چل ساڵ گوێم لە سوفیان بوو وتی: (هەرگیز) خۆ فێر کردنی فەرموودە و بەدوادا گەڕان باشتر نەبووە لە ئێستا (ئێستا لە هەموو کاتێک زیاتر خزمەتی فەرموودە دەکرێت)، بە سوفیانیان وت: ئەوان بەدوایدا دەگەڕێن و خۆیانی فێر دەکەن بەبێ نیەت؟! (سوفیان) وتی: بە دواداگەڕانەکەیان بۆ فەرموودە خودی خۆی نیەتە (یان خودی بەدوادا گەڕانەکەیان نیەتیان بۆ دروست دەکات).

٣٧١- «عَن مُجَاهِدٍ، قَالَ: طَلَبنَا هَذَا العِلمَ وَمَا لَنَا فِيهِ كَبِيرُ نِيَّةٍ، ثُمَّ رَزَقَ اللهُ بَعدُ فِيهِ النِّيَّةَ»[2].

واتە: موجاهید وتویەتی: خۆمان فێری ئەو زانستە (واتە: زانستی فەرموودە) دەکرد و بەدوایدا دەگەڕاین لە کاتێکدا نیەتی گەورەمان نەبوو، دواتر خوا نیەتی پێ بەخشین.

٣٧٢- «عَنِ الحَسَنِ قَالَ: لَقَد طَلَبَ أَقوَامٌ العِلمَ مَا أَرَادُوا بِهِ اللهَ تَعَالَى، وَلاَ مَا عِندَهُ، قَالَ: فَمَا زَالَ بِهِمُ العِلمُ حَتَّى أَرَادُوا بِهِ اللهَ وَمَا عِندَهُ»[3].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە دڵنیایی خەڵکانێک بەدوای زانستدا گەڕاون مەبەستیان بەو زانستە (ڕەزامەندی) خواو ئەو شتە نەبووە کە لەلای خوا هەیە (کە پاداشتەکەیەتی)، وتی: بە بەردەوامی زانست هەر لەگەڵیان بووە تاوەکو مەبەستیان بۆتە خوا و ئەوەی لەلای ئەو هەیە (لە پاداشتی چاک).

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: دەربارەی سەرزەنشتی ئەو كەسانەی بەدوای زانستدا دەگەڕێن بۆ جگە لە (ڕەزامەندی) خوا

٣٧٣- «قَالَ أَبُو مُسلِمٍ الخَولَانِيُّ: العُلَمَاءُ ثَلَاثَةٌ، فَرَجُلٌ عَاشَ فِي عِلمِهِ، وَعَاشَ مَعَهُ النَّاسُ فِيهِ، وَرَجُلٌ عَاشَ فِي عِلمِهِ، وَلَم يَعِش مَعَهُ فِيهِ أَحَدٌ، وَرَجُلٌ عَاشَ النَّاسُ فِي عِلمِهِ، وَكَانَ وَبالاً عَلَيهِ»[١].

واتە: ئەبو موسلیمی خەولانی وتویەتی: زانایان سیانن (سێ جۆرە كەسن): (یەكەمیان): پیاوێكە كە لە ناو زانستەكەی ژیابێ (كاری پێ كردبێ) و خەڵكیش لەگەڵ ئەو لەناو زانستەكەی ژیابن (سوودیان لێ وەرگرتبێ و كاریان پێ كردبێ)، (دووەمیان): پیاوێكە كە لە ناو زانستەكەی ژیابێ (كاری پێ كردبێ)، بەڵام كەس لەگەڵ ئەو لە ناو زانستەكەی نەژیابێ (بۆ خەڵكی باس نەكردبێ و فێری نەكردبن)، (سێیەمیان): پیاوێكە خەڵک لەناو زانستەكەی ژیابێ (كاریان پێ كردبێ)، (بەڵام خۆی تیایدا نەژیابێ و كاری پێ نەكردبێ) ئەوەیان زانستەكەی بەڵایە بەسەریەوە.

٣٧٤- «عَن عَطَاءٍ، قَالَ: قَالَ مُوسَى عليه السلام، يَا رَبِّ أَيُّ عِبَادِكَ أَحكَمُ؟ قَالَ: الَّذِي يَحكُمُ لِلنَّاسِ كَمَا يَحكُمُ لِنَفسِهِ، قَالَ: يَا رَبِّ، أَيُّ عِبَادِكَ أَغنَى؟ قَالَ: أَرضَاهُم بِمَا قَسَمتُ لَهُ قَالَ: يَا رَبِّ، أَيُّ عِبَادِكَ أَخشَى لَكَ؟ قَالَ: أَعلَمُهُم بِي»[٢].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: مووسا عليه السلام، وتویەتی: ئەی خودایە كام لە بەندەكانت (دادگەرترینن) لە دادوەری؟ فەرمووی: ئەوەی بڕیار بۆ خەڵكی دەدات، هەر وەک چۆن بڕیارِ بۆ خۆی دەدات، مووسا عليه السلام، وتی: ئەی خودایە كام لە بەندەكانت دەوڵەمەندترین و زەنگینترینن؟ فەرمووی: ئەوەی لە هەمویان زیاتر ڕازی بێ بەو بەشەی بۆم داناوە، موسا وتی: كام لە بەندەكانت زیاتر لێت دەترسن؟ فەرمووی: زاناترینیان بە من (ئەوەی لە هەموویان زیاتر من دەناسێت).

٣٧٥- «عَن سُفيَانَ قَالَ: كَانَ يُقَالُ: العُلَمَاءُ ثَلَاثَةٌ: عَالِمٌ بِاللهِ يَخشَى اللهَ لَيسَ بِعَالِمٍ بِأَمرِ اللهِ، وَعَالِمٌ بِاللهِ عَالِمٌ بِأَمرِ اللهِ يَخشَى اللهَ، فَذَاكَ العَالِمُ الكَامِلُ، وَعَالِمٌ بِأَمرِ اللهِ لَيسَ بِعَالِمٍ بِاللهِ لاَ يَخشَى اللهَ، فَذَلِكَ العَالِمُ الفَاجِرُ»[٣].

واتە: لە سوفیانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وەک وتراوە زانایان سیانن (سێ جۆرە كەسن): (یەكەمیان): زانایێكە زانست و مەعریفەتی بە خوا هەیە و، لە خوا دەترسێ و زانا نیە بە شەریعەتی خوا (باش لە شەرع نازانێ)، (دووەمیان): زانایێكە زانست و مەعریفەتی بە خوا هەیەو، زانایە بە شەریعەتی خواو لێی دەترسێ، ئەوەیان زانای تەواوە، (سێیەمیان): زانایێكە زانست و مەعریفەتی بە شەریعەتی خوا هەیە، بەڵام زانا نیە بە مەعریفەتی خوا و لێی ناترسێ، ئەوەیان زانای خراپە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده منقطع.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٣٧٦- «عَنِ الحَسَنِ، قَالَ: العِلمُ عِلمَانِ: فَعِلمٌ فِي القَلبِ فَذَلِكَ العِلمُ النَّافِعُ، وَعِلمٌ عَلَى اللِّسَانِ فَذَلِكَ حُجَّةُ اللهِ عَلَى ابنِ آدَمَ»[1].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زانست دوو زانستن: زانستێک کە لە دڵە، ئەوەیان زانستی بەسوودە، وە زانستێک کە (تەنها) لەسەر زمانە، ئەوەیان بەڵگەیە لەسەر مرۆڤ (دەبێتە بەڵا بەسەریەوە لە ڕۆژی دوایی).

٣٧٧- «عَنِ الحَسَنِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثلَ ذَلِكَ»[2].

واتە: لە حەسەنەوە هەمان وتە گێڕدراوەتەوە، بەڵام لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (بەڵام مرسله).

٣٧٨- «عَن عَبدِ اللهِ رضي الله عنه، قَالَ: تَعَلَّمُوا، تَعَلَّمُوا، فَإِذَا عَلِمتُم، فَاعمَلُوا»[3].

واتە: لە عەبدوڵڵا رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆتان فێر بکەن، خۆتان فێر بکەن، جا کاتێک فێر بوون کاری پێ بکەن.

٣٧٩- «عَن عَبدِ اللهِ رضي الله عنه قَالَ: مَن طَلَبَ العِلمَ لِأَربَعٍ، دَخَلَ النَّارَ أَو نَحوَ هَذِهِ الكَلِمَةِ: لِيُبَاهِيَ بِهِ العُلَمَاءَ، أَو لِيُمَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ، أَو لِيَصرِفَ بِهِ وُجُوهَ النَّاسِ إِلَيهِ، أَو لِيَأخُذَ بِهِ مِنَ الأُمَرَاءِ»[4].

واتە: لە عەبدوڵڵا رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک بەدوای زانستدا بگەڕێ بۆ چوار شت، ئەوە دەچێتە ئاگرەوە ـ یان وشەیەکی تری وت لەم شێوەیە: (چوار شتەکانیش ئەمانەن): تا شانازی بە زانستەکەیەوە بکات لەلای زانایان، یان تا موناقەشەو کێشمە کێشمی پێ بکات لەگەڵ نەزانناندا، یان بۆ ئەوەی ڕووی خەڵکی پێ بۆ لای خۆی وەچەرخێنێ و سەرنجیان ڕابکێشێ و ڕووی تێ بکەن، یان بۆ ئەوەی سەروەت و سامان و دونیای پێ بەدەست بێنێ لەلای کاربەدەستان.

٣٨٠- «عَن هِشَامٍ صَاحِبِ الدَّستَوَائِيِّ، قَالَ قَرَأتُ فِي كِتَابٍ بَلَغَنِي أَنَّهُ مِن كَلَامِ عِيسَى عليه السلام: تَعمَلُونَ لِلدُّنيَا، وَأَنتُم تُرزَقُونَ فِيهَا بِغَيرِ عَمَلٍ، وَلاَ تَعمَلُونَ لِلآخِرَةِ، وَأَنتُم لاَ تُرزَقُونَ فِيهَا، إلاَّ بِالعَمَلِ، ويلكم عُلَمَاءَ السَّوءِ: الأَجرَ تَأخُذُونَ، وَالعَمَلَ تُضَيِّعُونَ، يُوشِكُ رَبُّ العَمَلِ أَن يَطلُبَ عَمَلَهُ، وَتوشكُونَ أَن تَخرُجُوا مِنَ الدُّنيَا العَرِيضَةِ إِلَى ظُلمَةِ القَبرِ وَضِيقِهِ اللهُ ينهاكم عَنِ الخَطَايَا كَمَا أَمَرَكُم بِالصَّلَاةِ وَالصِّيَامِ، كَيفَ يَكُونُ مِن أَهلِ العِلمِ مَن سَخِطَ رِزقَهُ وَاحتَقَرَ مَنزِلَتَهُ، وَقَد عَلِمَ أَنَّ ذَلِكَ مِن عِلمِ اللهِ وَقُدرَتِهِ؟ كَيفَ يَكُونُ مِن أَهلِ العِلمِ مَنِ اتَّهَمَ اللهَ فِيمَا قَضَى لَهُ، فَلَيسَ يَرضَى شَيئًا أَصَابَهُ؟ كَيفَ يَكُونُ مِن أَهلِ العِلمِ مَن دُنيَاهُ آثَرُ عِندَهُ مِن آخِرَتِهِ، وَهُوَ فِي الدُّنيَا أَفضَلُ رَغبَةً؟ كَيفَ يَكُونُ مِن أَهلِ العِلمِ مَن مَصِيرُهُ إِلَى آخِرَتِهِ، وَهُوَ

---

(١) ـ موقوف صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ موقوف ضعيف.

مُقبِلٌ عَلَى دُنيَاهُ، وَمَا يَضُرُّهُ أَشهَى إِلَيهِ أَو قَالَ أَحَبُّ إِلَيهِ مِمَّا يَنفَعُهُ؟ كَيفَ يَكُونُ مِن أَهلِ العِلمِ مَن يَطلُبُ الكَلاَمَ لِيُخبِرَ بِهِ، وَلاَ يَطلُبُهُ لِيَعمَلَ بِهِ؟»[١].

واتە: لە هیشامی صاحیبی دەستەوائیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە پەرتوکێکدا خوێندومەتەوە پێمگەیشتووە کە قسەی پێغەمبەر عیسایە ﷺ، (فەرموویەتی): کار بۆ دونیا دەکەن لە کاتێکدا ڕۆزی دەدرێن تیایدا بە بێ کار کردن (خوا ڕزقی قەدەری خۆتان هەر بۆ دەنێرێت)، بەڵام کار بۆ دوارۆژ ناکەن لە کاتێکدا ئێوە ڕۆزی نادرێن تیایدا تەنها بە کردەوە نەبێ، هاوار بۆ ئێوە ئەی زانایانی خراپ: پاداشت و سەروەت و سامان وەردەگرن (بە هۆی زانستەکەتان لەلای کاربەدەستان) و کردەوەش دەفەوتێنن و نایکەن، نزیکە خاوەنی کردەوە (کە خوایە) داوای کارەکانی بکات و موحاسەبەتان بکات (لەسەر ئەو کردەوانەی کە داوای لێ کردبوون)، وە نزیکە کە دەربچن لە دونیایێکی پان و پۆڕ بۆ تاریکایی گۆڕو تەنگەبەریەکەی، خوا تاوانی لێ قەدەغە کردوون، هەر وەک چۆن فەرمانی پێ کردوون بە نوێژو ڕۆژوو، چۆن لە خاوەنی زانست حیسابە کەسێک کە بە ڕزق و ڕۆزیەکەی ڕازی نەبێت و پلەکەی خۆی پێ کەم بێت؟! لە کاتێکدا بە دڵنیایی دەزانێ ئەوە لە زانستی خوا و دەسەڵاتی ئەو دایە؟! چۆن لە خاوەنی زانست حیسابە کەسێک تۆمەت بۆ خوا دروست بکات لەسەر ئەو شتەی بۆی داناوە، کە بە هیچ شتێک ڕازی نابێت کە تووشی دەبێت؟! چۆن لە خاوەنی زانست حیسابە کەسێک کە دونیای هەڵبژێرێ بەسەر دوارۆژی و حەزی زیاتر لە دونیا بێ؟! چۆن لە خاوەنی زانست حیسابە کەسێک کە دەرەنجامی بۆ دوارۆژە لە کاتێکدا ڕووی لە دونیا کردووە و ئەو شتەی زیانی پێ دەگەیەنێ لای خۆشترە ـ یان وتی لای خۆشەویسترە ـ لەو شتەی سوودی پێ دەگەیەنێ؟! چۆن لە خاوەنی زانست حیسابە کەسێک بەدوای قسەو گوفتارەوە بێت (بەدوای زانستەوە بێت) تا هەواڵی پێ بدات و (لە مەجلیسان باسی بکات) و لەدوای زانستەکە نەبێت بۆ ئەوەی کاری پێ بکات؟!

٣٨١- «عَن حَبِيبِ بنِ عُبَيدٍ، قَالَ: كَانَ يُقَالُ: تَعَلَّمُوا العِلمَ وَانتَفِعُوا بِهِ، وَلاَ تَعَلَّمُوهُ لِتَتَجَمَّلُوا بِهِ، فَإِنَّهُ يُوشِكُ إِن طَالَ بِكُم عُمُرٌ، أَن يَتَجَمَّلَ ذُو العِلمِ بِعِلمِهِ، كَمَا يَتَجَمَّلُ ذُو البِزَّةِ بِبِزَّتِهِ»[٢].

واتە: لە حەبیبی کوڕی عوبەید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دەوترا: خۆتان فێری زانست بکەن و سوودی لێ وەربگرن، خۆتانی فێر مەکەن تا خۆتانی پێ برازێننەوە (کە تەنها بۆ ڕووکەشتان بێت)، چونکە نزیکە ئەگەر تەمەنتان درێژ بێت (دەبینن) خاوەن زانست خۆی پێ دەڕازێنێتەوە، وەک چۆن خاوەنی پۆشاک خۆی بە پۆشاکەکەی دەڕازێنێتەوە (واتە: سەردەمێک دێت خەڵک خۆی فێری زانست دەکات تەنها بۆ فیز و شانازی و ڕووکەش، بۆ سوود وەرگرتن و کار پێ کردن خۆیان فێر ناکەن).

---

(١) ـ إسناده معضل.

(٢) ـ إسناده صحيح.

٣٨٢- «عَنِ الأَحوَصِ بنِ حَكِيمٍ، عَن أَبِيهِ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الشَّرِّ فَقَالَ: لاَ تَسأَلُونِي عَنِ الشَّرِّ، وَاسأَلُونِي عَنِ الخَيرِ، يَقُولُهَا ثَلاَثًا ثُمَّ قَالَ: أَلاَ إِنَّ شَرَّ الشَّرِّ، شِرَارُ العُلَمَاءِ، وَإِنَّ خَيرَ الخَيرِ، خِيَارُ العُلَمَاءِ»[١].

واتە: لە ئەحوەصی كوڕی حەكیم گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ كرد دەربارەی خراپە (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: پرسیارم لێ مەكەن دەربارەی خراپە، (بەڵكو) پرسیارم لێ بكەن دەربارەی چاكە، سێ جار وای فەرموو، دواتر فەرمووی: بزانن و ئاگادار بن خراپترین خراپە زانایانی خراپن و، چاكترینی چاكەش زانایانی چاكن.

٣٨٣- «عَن عِيسَى، قَالَ: سَمِعتُ الشَّعبِيَّ، يَقُولُ: إِنَّمَا كَانَ يَطلُبُ هَذَا العِلمَ مَنِ اجتَمَعَت فِيهِ خَصلَتَانِ: العَقلُ وَالنُّسُكُ، فَإِن كَانَ نَاسِكًا، وَلَم يَكُن عَاقِلاً، قَالَ: هَذَا أَمرٌ لاَ يَنَالُهُ إِلاَّ العُقَلاَءُ فَلَم يَطلُبهُ وَإِن كَانَ عَاقِلاً، وَلَم يَكُن نَاسِكًا قَالَ: هَذَا أَمرٌ لاَ يَنَالُهُ إِلاَّ النُّسَّاكُ، فَلَم يَطلُبهُ- فَقَالَ: الشَّعبِيُّ وَلَقَد رَهِبتُ أَن يَكُونَ يَطلُبُهُ اليَومَ مَن لَيسَت فِيهِ وَاحِدَةٌ مِنهُمَا: لاَ عَقلٌ وَلاَ نُسُكٌ»[٢].

واتە: لە عیسا گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە شەعبی بوو دەیوت: تەنها كەسێک داوای ئەو زانستە (زانستی فەرموودە) دەكات و بەدوایدا دەگەڕێت و خۆی فێر دەكات كە دوو سیفەتی تیابن: (یەكەمیان) عەقڵ و ژیری، (دووەمیان) خوا پەرستی، جا ئەگەر كەسێک خوا پەرست بێت و ژیر نەبێت ئەوە دەڵێت: خۆ فێر كردنی فەرموودە كارێكە كەس پێی ناگات تەنها عاقڵمەند نەبێت، بۆیە بەدوایدا ناگەڕێ و خۆی فێر ناكات، وە ئەگەر هاتوو عاقڵمەند بێت و عیبادەتكارو خوا پەرست نەبێت دەڵێت: ئەوە كارێكە كەس پێی ناگات تەنها خوا پەرست نەبێت، بۆیە بەدوایدا ناگەڕێ و خۆی فێر ناكات، شەعبی وتی: بە دڵنیایی من دەترسم ئەمڕۆ (واتە: لەم سەردەمە) كەسانێک بەدوایدا بگەڕێن و خۆیان فێر بكەن كە هیچ یەک لەو دوو سیفەتانەی تیا نەبێ: نە عەقڵ و نە عیبادەت.

٣٨٤- «أَخبَرَنَا أَبُو عَاصِمٍ، قَالَ: زَعَمَ لِي سُفيَانُ، قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ لاَ يَطلُبُ العِلمَ حَتَّى يَتَعَبَّدَ قَبلَ ذَلِكَ أَربَعِينَ سَنَةً»[٣].

واتە: لە ئەبو عاصم گێڕدراوەتەوە وتویەتی: سوفیان پێی وتوم كە پێی وایە: پیاو ناتوانێ زانست بە دەست بێنێ تاوەكو چل ساڵ پێش ئەوە عیبادەت نەكات.

٣٨٥- «عَن مَكحُولٍ، قَالَ: مَن طَلَبَ العِلمَ لِيُمَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ وَلِيُبَاهِيَ بِهِ العُلَمَاءَ، أَو لِيَصرِفَ بِهِ وُجُوهَ النَّاسِ إِلَيهِ، فَهُوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ»[٤].

---

(١) ـ مرسل، ضعيف الإسناد.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ رجاله ثقات.

واتە: لە مەكحولە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر كەسێک بەدوای زانستدا بگەڕێ تاوەكو مناقەشەی پێ لەگەڵ نەزانان بكات، یان خۆی پێ هەڵبكێشێ لەلای زانایان، یان تاوەكو ڕووی خەڵكی بۆ لای خۆی وەچەرخێنێ و پێی سەرسام بن و ڕووی تێ بكەن، ئەوە بۆ ئاگری دۆزەخە.

٣٨٦- «عَن مَكحُولٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَن طَلَبَ العِلمَ لِيُبَاهِيَ بِهِ العُلَمَاءَ، أَو لِيُمَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ، أَو يُرِيدُ أَن يُقبِلَ بِوُجُوهِ النَّاسِ إِلَيهِ، أَدخَلَهُ اللهُ جَهَنَّمَ»[١].

واتە: لە مەكحولە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک بەدوای زانستدا بگەڕێ تاوەكو خۆی پێ هەڵبكێشێ لەلای زانایان، یان تاوەكو مناقەشەی پێ بكات لەگەڵ نەزانان، یان بیەوێ ڕووی خەڵكی بۆ لای خۆی وەچەرخێنێ و پێی سەرسام بن و روی تێ بكەن، ئەوە خوا دەیخاتە ئاگری دۆزەخەوە.

٣٨٧- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: إِنَّمَا يُحفَظُ حَدِيثُ الرَّجُلِ عَلَى قَدرِ نِيَّتِهِ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قسەی مرۆڤ و (ئامۆژگاریەكانی) لەبەر دەكرێن و (كاریان پێ دەكرێت) بە ئەندازەی نیەتی مرۆڤەكە (واتە مرۆڤ چەندە نیەتی باش بێت ئەوەندە خەڵک زیاتر سوود لە قسەكانی دەكات و قسەكانی دەمێنێتەوە، وەک وتراوە: قسەی دڵ بۆ دڵە و قسەی سەر زمانیش لە گوێ تێپەڕ ناكات).

٣٨٨- «عَنِ القَاسِمِ، قَالَ: قَالَ لِي عَبدُ اللهِ ﷺ إِنِّي لَأَحسَبُ الرَّجُلَ يَنسَى العِلمَ كَانَ يَعلَمُهُ لِلخَطِيئَةِ كَانَ يَعمَلُهَا»[٣].

واتە: لە قاسم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵلا ﷺ پێی وتم: من پێم وایە مرۆڤ زانستێكی بیر دەچێتەوە كە زانیویەتی لەبەر تاوانێک كە ئەنجامی دەدات.

٣٨٩- «عَن شَهرِ بنِ حَوشَبٍ، قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ لُقمَانَ الحَكِيمَ كَانَ يَقُولُ لِابنِهِ: يَا بُنَيَّ، لاَ تَعَلَّمِ العِلمَ لِتُبَاهِيَ بِهِ العُلَمَاءَ، أَو لِتُمَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ، أَو تُرَائِيَ بِهِ فِي المَجَالِسِ، وَلاَ تَترُكِ العِلمَ زُهدًا فِيهِ، وَرَغبَةً فِي الجَهَالَةِ يَا بُنَيَّ اختَرِ المَجَالِسَ عَلَى عَينِكَ، وَإِذَا رَأَيتَ قَومًا يَذكُرُونَ اللهَ، فَاجلِس مَعَهُم، فَإِنَّكَ إِن تَكُن عَالِمًا، يَنفَعكَ عِلمُكَ، وَإِن تَكُن جَاهِلاً، يُعَلِّمُوكَ، وَلَعَلَّ اللهَ أَن يَطَّلِعَ عَلَيهِم بِرَحمَتِهِ، فَيُصِيبَكَ بِهَا مَعَهُم، وَإِذَا رَأَيتَ قَومًا، لاَ يَذكُرُونَ اللهَ، فَلاَ تَجلِس مَعَهُم، فَإِنَّكَ إِن تَكُن عَالِمًا، لاَ يَنفَعكَ عِلمُكَ، وَإِن تَكُن جَاهِلاً، زَادُوكَ غَيًّا، وَلَعَلَّ اللهَ أَن يَطَّلِعَ عَلَيهِم بِعَذَابٍ فَيُصِيبَكَ مَعَهُم»[٤].

---

(١) ـ رجاله ثقات، غير أنه مرسل.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ موقوف ضعيف.

واتە: لە شەهری كوڕی حەوشەبە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێم گەیشتووە كە لوقمانی حەكیم هەموو جار بە كوڕەكەی دەوت: ئەی كوڕە شیرینەكەم خۆت فێری زانست مەكە تا خۆتی پێ هەڵكێشی لەلای زانایان، یان بۆ ئەوەی مناقەشەی پێ بكەیت لەگەڵ نەزانان، یان مەبەستت پێی ڕووپامایی بێت لە كۆڕو دانیشتگایاندا، وازیش لە زانست مەهێنە بەناوی زوهد و عیبادەت و دووركەوتنەوە لە دونیاو ویستنی نەزانی، ئەی كوڕە شیرینەكەم كۆڕو دانیشتنەكان بەسەر چاوت هەڵبژێرە (واتە: لە چاوت خۆشترت بوێن)، وە ئەگەر بینیت خەڵكانێک باسی خوا و زیكر و یادی ئەو دەكەن ئەوە لەگەڵیان دابنیشە، چونكە ئەگەر زانابیت و (لەو مەجلیسانە دابنیشی) زانستەكەت سوودت پێ دەگەیەنێ (تۆش دوو قسەی چاكی تیا دەكەی)، ئەگەر نەزانیش بیت ئەوە فێرت دەكەن، وە ڕەنگە خوا بە ڕەحمەتی خۆی لایان لێ بكاتەوەو ڕەحمەتی خۆی بەسەریاندا برێژێ، تۆش لەگەڵ ئەوان بەرت دەكەوێت، وە ئەگەر بینیت خەڵكانێک یادی خوا ناكەن لەگەڵیان دامەنیشە، چونكە ئەگەر زانا بیت زانستەكەت سوودت پێ ناگەیەنێ، ئەگەر نەزانیش بیت ئەوە نەزانیەكەت زیاد دەكەن، وە ڕەنگە خوا بە سزایەک لایان لێ بكاتەوە و تۆش لەگەڵ ئەوان بەرت دەكەوێت.

٣٩٠- «عَن كَثِيرِ بنِ مُرَّةَ، قَالَ: لاَ تُحَدِّثِ البَاطِلَ الحُكَمَاءَ فَيَمقُتُوكَ، وَلاَ تُحَدِّثِ الحِكمَةَ لِلسُّفَهَاءِ، فَيُكَذِّبُوكَ، وَلاَ تَمنَعِ العِلمَ أَهلَهُ، فَتَأثَمَ، وَلاَ تَضَعهُ فِي غَيرِ أَهلِهِ فَتُجَهَّلَ- إِنَّ عَلَيكَ فِي عِلمِكَ حَقًّا، كَمَا أَنَّ عَلَيكَ فِي مَالِكَ حَقًّا»[١].

واتە: لە كەثیری كوڕی موڕڕەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قسەی ناهەق لەگەڵ دانایان مەكە، چونكە ڕقیان لێت دەبێتەوە، حیكمەتیش باس مەكە بۆ نەزانان چونكە بە درۆت دەخەنەوە (چونكە ئەوان لە حیكمەت نازانن)، زانستیش قەدەغە مەكە لەو كەسانەی كە ئەهلن بۆ زانست (بەڵكو فێریان بكە، مادەم شایستەن)، چونكە (ئەگەر وا نەكەی) تاوانبار دەبی، وە (زانست) دامەنێ و (باسی مەكە) بۆ جگە لە ئەهلی زانست (بۆ ناشایستەكان باسی مەكە)، بە دڵنیایی ماف و (زەكاتێک) لە زانستەكەتدا هەیە هەر وەک چۆن لە ماڵەكەتدا ماف و (زەكاتت) لەسەرە (زەكاتیش دەبێ تەنها بە ئەهلی خۆی بدرێت).

٣٩١- «حَدَّثَنِي مُعَاوِيَةُ، أَنَّ أَبا فَروَةَ، حَدَّثَهُ: أَنَّ عِيسَى ابنَ مَريَمَ عليه السلام كَانَ يَقُولُ: لاَ تَمنَعِ العِلمَ مِن أَهلِهِ، فَتَأثَمَ، وَلاَ تَنشُرهُ عِندَ غَيرِ أَهلِهِ فَتُجَهَّلَ، وَكُن طَبِيباً رَفِيقًا، يَضَعُ دَوَاءَهُ حَيثُ يَعلَمُ أَنَّهُ يَنفَعُ»[٢].

واتە: لە موعاویە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو فەڕوە بۆی گێڕاوەتەوە: كە عیسای كوڕی مەڕیەم عليه السلام هەموو جار دەیوت: زانست قەدەغە مەكە لە ئەهلی خۆی (لەو قوتابیەی زانستی دەوێت)، چونكە تاوانبار دەبیت، وە بڵاویشی مەكەرەوە لای جگە لە ئەهلی خۆی، چونكە بە نەزان دادەنرێیت، وە ببە بە پزیشكێكی نەرمونیان و بە سۆز كە دەرمان لەو شوێنە بەكار دەهێنێت كە دەزانێت سوودی دەبێت.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

٣٩٢- «عَن مُطَرِّفٍ، قَالَ: لاَ تُطعِم طَعَامَكَ مَن لاَ يَشتَهِيهِ»[١].

واتە: لە موطەڕڕیفەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: خۆراكی خۆت دەرخواردی كەسێک مەدە كە حەزی لێی نیە (واتە: زانست مەدە بە كەسێک كە قەدری نازانێت و ئەهلی ئەوە نیە).

٣٩٣- «عَن دَاوُدَ بنِ شَابُورَ، سَمِعَ شَهرَ بنَ حَوشَبٍ، يَقُولُ: قَالَ لُقمَانُ لِابنِهِ: يَا بُنَيَّ لاَ تَعَلَّمِ العِلمَ لِتُبَاهِيَ بِهِ العُلَمَاءَ، وتُمَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ، وَتُرَائِيَ بِهِ فِي المَجَالِسِ، وَلاَ تَترُكِ العِلمَ زَهَادَةً فِيهِ، وَرَغبَةً فِي الجَهَالَةِ، وَإِذَا رَأَيتَ قَومًا لا يَذكُرُونَ اللهَ، فَاجلِس مَعَهُم، إن تَكُ عَالِمًا، يَنفَعكَ عِلمُكَ، وَإِن تَكُ جَاهِلاً، عَلَّمُوكَ، وَلَعَلَّ اللهَ أَن يَطَّلِعَ عَلَيهِم بِرَحمَتِهِ، فَيُصِيبَكَ بِهَا مَعَهُم، وَإِذَا رَأَيتَ قَومًا لاَ يَذكُرُونَ اللهَ فَلاَ تَجلِس مَعَهُم، إن تَكُ عَالِمًا لَم يَنفَعكَ عِلمُكَ، وَإِن تَكُ جَاهِلاً، زَادُوكَ غَيًّا أَو عِيًّا وَلَعَلَّ اللهَ أَن يَطَّلِعَ عَلَيهِم بِسَخَطٍ فَيُصِيبَكَ بِهِ مَعَهُم»[٢].

واتە: لە داوودی كوڕی شابوڕەوە گێردراوەتەوە، كە گوێی لە شەهری كوڕی حەوشەب بووە وتویەتی: لوقمانی حەكیم بە كوڕەكەی وتووە: ئەی ڕۆڵە گیان خۆت فێری زانست مەكە تا خۆتی پێ هەڵكێشی لەلای زانایان، یان بۆ ئەوەی مناقەشەی پێ بكەی لەگەڵ نەزانان، یان مەبەستت پێی ڕووپامایی بێت لە كۆڕەكاندا، وازیش لە زانست مەهێنە بەناوی زوهدو دووركەوتنەوە لە دونیاو ویستنی نەزانی، ئەی كوڕە شیرینەكەم كۆڕو دانیشتنەكان بەسەر چاوت هەڵبژێرە (لە چاوت خۆشترت بوێن)، وە ئەگەر بینیت خەڵكانێک باسی خواو زیكرو یادی ئەو دەكەن لەگەڵیان دابنیشە، چونكە ئەگەر زانابیت و (لەو مەجلیسانە دابنیشی) زانستەكەت سوودت پێ دەگەیەنێ، ئەگەر نەزانیش بیت ئەوە فێرت دەكەن، وە ڕەنگە خوا بە ڕەحمەتی خۆی لایان لێ بكاتەوە و بەسەریاندا بڕێژێ، تۆش لەگەڵ ئەوان بەرت دەكەوێت، وە ئەگەر بینیت خەڵكانێک یادی خوا ناكەن لەگەڵیان دامەنیشە، چونكە ئەگەر زانا بیت زانستەكەت سوودت پێ ناگەیەنێ، ئەگەر نەزانیش بیت ئەوە نەزانیەكەت زیاد دەكەن، وە ڕەنگە خوا بە سزایێک لایان لێ بكاتەوەو تۆش لەگەڵ ئەوان بەرت دەكەوێت.

٣٩٤- «عَن عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: يَا حَمَلَةَ العِلمِ اعمَلُوا بِهِ، فَإِنَّمَا العَالِمُ مَن عَمِلَ بِمَا عَلِمَ وَوَافَقَ عِلمُهُ عَمَلَهُ، وَسَيَكُونُ أَقوَامٌ يَحمِلُونَ العِلمَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُم، يُخَالِفُ عَمَلُهُم عِلمَهُم، وَتُخَالِفُ سَرِيرَتُهُم عَلاَنِيَتَهُم، يَجلِسُونَ حِلَقًا فَيُبَاهِي بَعضُهُم بَعضًا، حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ لَيَغضَبُ عَلَى جَلِيسِهِ أَن يَجلِسَ إِلَى غَيرِهِ وَيَدَعَهُ، أُولَئِكَ لاَ تَصعَدُ أَعمَالُهُم فِي مَجَالِسِهِم، تِلكَ إِلَى اللهِ تَعَالَى»[٣].

واتە: لە عەلی ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەی هەڵگرانی زانست كاری پێ بكەن (كار بە زانستەكەتان بكەن)، چونكە زانا تەنها ئەو كەسەیە كە كار بەو شتە دەكات كە دەیزانێ و زانستەكەی لەگەڵ كردەوەكانی

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ موقوف ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف جداً.

یەک دەگرێتەوە، وە لە داهاتوودا خەڵکانێک دەرئەکەون زانست هەڵدەگرن و (دەبنە خاوەنی زانست بەڵام) لە گەروویان زیاتر ناچێتە خوارەوە کردەوەکانیان پێچەوانەی زانستەکەیانە، وە شتە پەنهانەکانیان پێچەوانەی شتە ئاشکراکانیانە، بە شێوەی بازنەیی دادەنیشن هەندێکیان شانازی بەسەر هەندێکی تریانەوە دەکەن هەتا پیاو هەیە تووڕە دەبێ و زویر دەبێت لە دانیشتوەکانی مەجلیسی ئەو کاتێ دابنیشن لای کەسانی تری جگە لەو و، وازیان لێ دەهێنێت (خۆیان لێ دەگرێت، چونکە لای خەڵکی تر دانیشتوون)، ئا ئەمانە کردەوەکانیان لە کۆڕو مەجلیسەکانیان بەرز نابنەوە بۆ لای خوا (واتە: قبوڵ ناکرێن).

٣٩٥- «عَن مَسرُوقٍ، قَالَ: كَفَى بِالمَرءِ عِلمًا أَن يَخشَى اللهَ، وَكَفَى بِالمَرءِ جَهلاً، أَن يُعجَبَ بِعِلمِهِ»[١].

واتە: لە مەسرووق گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەوەندە زانستە بەسە بۆ مرۆڤ کە لە خوا بترسێ، وە ئەوەندە نەزانیەش بەسە بۆ مرۆڤ کە بە زانستەکەی سەرسام بێت.

٣٩٦- «عَن مُعَاوِيَةَ بنِ قُرَّةَ، قَالَ: لَو أَنَّ أَدنَى هَذِهِ الأُمَّةِ عِلمًا أَخَذَت أُمَّةٌ مِنَ الأُمَمِ بِعِلمِهِ، لَرَشَدَت تِلكَ الأُمَّةُ»[٢].

واتە: لە موعاویەی کوڕی قوڕڕە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر کەمترین کەسی ئەم ئوممەتە لە ڕووی زانستەوە ئوممەتێکی تر زانستی لێ وەربگرن و دەست بە زانستی ئەوەوە بگرن ئەوە ئەو ئوممەتە ڕێنموویی وەردەگرن و، ڕاست و هۆشیار دەبنەوە (چونکە ئاینی ئیسلام ئەوەندە ئاینێکی بە هێزو پڕ حیکمەتە، بە چەند ئایەت و فەرموودەیەک دەکرێ هەموو ژیان ڕێک بخرێت، بۆیە کەم زانترینی ئەم ئوممەتە زۆری لەلایە).

٣٩٧- «عَنِ الحَسَنِ، قَالَ: إِن كَانَ الرَّجُلُ لَيُصِيبُ البَابَ مِنَ العِلمِ فَيَعمَلُ بِهِ، فَيَكُونُ خَيرًا لَهُ مِنَ الدُّنيَا وَمَا فِيهَا، لَو كَانَت لَهُ، فَجَعَلَهَا فِي الآخِرَةِ»[٣].

واتە: لە حەسەن گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر کەسێک بابەتێک لە زانستی بەر بکەوێت و (بیزانێت)و کاری پێ بکات، ئەوە باشترە بۆی لە دونیا و ئەوەی تیایەتی، ئەگەر دونیاکەشی هەبێت با بۆ دواڕۆژی دابنێ (با بیکاتە توێشووی دواڕۆژی و بە چاکە بەکاری بهێنێت).

٣٩٨- «قَالَ: قَالَ الحَسَنُ: كَانَ الرَّجُلُ إِذَا طَلَبَ العِلمَ لَم يَلبَث أَن يُرَى ذَلِكَ فِي بَصَرِهِ، وَتَخَشُّعِهِ، وَلِسَانِهِ، وَيَدِهِ، وَصَلاَتِهِ، وَزُهدِهِ»[٤].

واتە: لە حەسەن گێردراوەتەوە، وتویەتی: مرۆڤ ئەگەر بە دوای زانستدا بگەڕێ و زانست بەدەست بێنێت هەندەی پێ ناچێت زانستەکەی دەبینرێت لە چاوەکانی و لە ترس و ملکەچیەکەی و لە زمانی و

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

لە دەستی و لە نوێژی و لە زوهد و دونیا نەویستیەکەی (واتە: لە هەموو جەستە و کرداری ڕەنگ دەداتەوە، ئەمە لە کاتێک دایە ئەگەر زانستەکە بۆ خوا بخوێنێت).

٣٩٩- «قَالَ مُحَمَّدٌ: انظُرُوا عَمَّن تَأخُذُونَ هَذَا الحَدِيثَ، فَإِنَّمَا هُوَ دِينُكُم»[١].

واتە: موحەممەد (واتە: ئیبنو سیرین) وتویەتی: سەیرکەن بزانن ئەم فەرموودانە لە کێ وەردەگرن، چونکە ئەم فەرموودانە ئاینتانن (واتە لە کەسانی باش فەرمووده وەربگرن، چونکە ئەوە وەرگرتنی دینە).

٤٠٠- «عَنْ بِشرِ بنِ الحَكَمِ، قَالَ: سَمِعتُ سُفيَانَ، يَقُولُ: مَا ازدَادَ عَبدٌ عِلمًا، فَازدَادَ فِي الدُّنيَا رَغبَةً، إلاَّ ازدَادَ مِنَ اللهِ بُعدًا»[٢].

واتە: لە بیشری کوڕی حەکەم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە سوفیان بوو دەیوت: هیچ بەندەیەک نیە زانستی زیاد بکات و حەزو (خۆشەویستی) بۆ دونیاش زیاد بکات، حەتمەن (بە هۆی ئەوەوە) دووری لە خواوە زیاد دەکات (چونکە ناکرێ مرۆڤ چەندە زاستی زۆر بێت ئەوەندە دونیاویستی زیاد ببێت، بەڵکو دیارە زانستی بێ کرداری لەلایە، زانستی بێ کرداریش مرۆڤ زیاترو زۆرتر لە خوا دوور دەخاتەوە).

٤٠١- «عَن حَسَّانَ، قَالَ: مَا ازدَادَ عَبدٌ بِاللهِ عِلمًا، إلاَّ ازدَادَ النَّاسُ مِنهُ قُرباً مِن رَحمَةِ اللهِ»[٣].

واتە: لە حەسسان گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ بەندەیەک نیە زانست و (مەعریفەتی) بە خوا زیاد بکات، حەتمەن خەڵک نزیکیان لەو کەسە زیاد دەکەن (زیاتر لێی نزیک دەبنەوە)، لەبەر ڕەحمەت و بەزەیی خوای پەروەردگار (واتە خوای پەروەردگار بە ڕەحمەتی خۆی خەڵکی لێ نزیک دەکاتەوە و خۆشیان دەوێت).

٤٠٢- «وَقَالَ فِي حَدِيثٍ آخَرَ: مَا ازدَادَ عَبدٌ عِلمًا: إلاَّ ازدَادَ قَصدًا، وَلاَ قَلَّدَ اللهُ عَبدًا قِلاَدَةً خَيرًا مِن سَكِينَةٍ»[٤].

واتە: (بە هەمان سەنەد هاتوە حەسسان) لە وتەیەکی تردا وتویەتی: هیچ بەندەیەک نیە زانستی زیاد بکات، حەتمەن نیەتی زیاد دەکات و، هیچ ملوانکەیەکیش نیە خوا لە ملی بەندەیەکی بکات باشتر بێت لە ئارامی و لەسەرەخۆیی.

٤٠٣- «عَن عَمِيرَةَ يَقُولُ: إِنَّ رَجُلاً قَالَ لِابنِهِ: اذهَب فَاطلُبِ العِلمَ، فَخَرَجَ فَغَابَ عَنهُ مَا غَابَ، ثُمَّ جَاءَ، فَحَدَّثَهُ بِأَحَادِيثَ، فَقَالَ لَهُ أَبُوهُ: يَا بُنَيَّ اذهَب فَاطلُبِ العِلمَ، فَغَابَ عَنهُ أَيضًا زَمَانًا- ثُمَّ جَاءَ بِقَرَاطِيسَ فِيهَا من كُتُبٌ فَقَرَأَهَا عَلَيهِ، فَقَالَ لَهُ: هَذَا سَوَادٌ فِي بَيَاضٍ، فَاذهَب فاطلبِ العِلمَ، فَخَرَجَ فَغَابَ عَنهُ مَا غَابَ، ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ لِأَبِيهِ: سَلنِي عَمَّا بَدَا لَكَ، فَقَالَ لَهُ أَبُوهُ: أَرَأَيتَ لَو أَنَّكَ مَرَرتَ بِرَجُلٍ يَمدَحُكَ،

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

وَمَرَرتَ بِآخَرَ يَعِيبُكَ؟ قَالَ: إِذًا لَم آلَمِ الَّذِي يَعِيبُنِي، وَلَم أَحمَدِ الَّذِي يَمدَحُنِي- فَقَالَ: أَرَأَيتَ لَو مَرَرت بِصَفِيحَةٍ؟ قَالَ أَبُو شُرَيحٍ: لاَ أَدرِي أَمِن ذَهَبٍ أَو وَرِق- فَقَالَ: إِذًا لَم أُهَيِّجهَا وَلَم أَقرَبهَا- فقالَ: اذهَب فَقَد عَلِمتَ»[1].

واتە: لە عەمیرە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک بە کوڕەکەی وت: بڕۆ بەدوای زانستدا بگەڕێ، ئەویش ڕۆیشت و لێی ون بوو هەر چەندی هەبێت (ماوەیەک لێی دوور کەوتەوە)، دواتر گەڕایەوە، هەندێک قسەی دەکردن (باسی ئەو شتانەی دەکرد کە فێری بووە)، باوکی پێی وت: ئەی کوڕە شیرینەکەم بڕۆ بە دوای زانستدا بگەڕێ، ئەویش دووبارە ماوەیەک لێی ون بوو، دواتر گەڕایەوە بە چەندین پەڕاوەوە کە چەندین پەرتوکی تیا (نوسرابوو) بەسەر باوکیدا خوێندیەوە، باوکیشی وتی: ئەوە ڕەشایەتیێکە لەناو سپیایەتی (واتە: ئەوە تەنها نوسینە لەسەر پەڕی سپی، زانستی ڕاستی ئەوە نیە)، بڕۆ بەدوای زانستدا بگەڕێ، ئەویش دەرچوو لێی ون بوو هەر چەندی هەبێت، دواتر گەڕایەوە و بە باوکی وت: پرسیارم لێ بکە ئەوەی ئاشکرایە بۆت (ئەوەی دەتەوێ لێم بپرسی)، باوکیشی پێی وت: بۆچوونت چۆن دەبێت ئەگەر تۆ بەلای پیاوێکدا تێپەڕبووی کە مەدحت دەکات و بەلای یەکێکی تریشدا تێپەڕبووی کە ڕەخنەت لێ دەگرێت و قسەت پێ دەڵێت؟ کوڕەکە وتی: لۆمەو زەمی ئەوە ناکەم کە ڕەخنەم لێ دەگرێت و عەیبدارم دەکات، وە مەدحی ئەوەش ناکەم کە مەدحم دەکات و بەشان و باڵم هەڵا دەڵێ، باوکیشی وتی: ئەی چی دەکەیت ئەگەر بەلای پارچەیەکدا تێپەڕی؟ ئەبو شورەیح دەڵێ: نازانم ئایا وتی (پارچەکە) لە زێڕ بێت یان لە زیو (واتە: وتی ئەگەر بەلای پارچە زێڕێک یان زیوێکدا تێپەڕی چی دەکەی؟)، کوڕەکەش وتی: نایجوڵێنم و دەستی لێ نادەم و لێی نزیک نابمەوە، باوکی وتی: بڕۆ (تەواو) تۆ فێری زانست بوویت (گەیشتووی بە چڵەپۆپەی زانست).

٤٠٤- «عَنِ السَّكَنِ بنِ عُمَيرٍ، قَالَ: سَمِعتُ وَهبَ بنَ مُنَبِّهٍ، يَقُولُ: يَا بُنَيَّ عَلَيكَ بِالحِكمَةِ، فَإِنَّ الخَيرَ فِي الحِكمَةِ كُلَّهُ: وَتُشَرِّفُ الصَّغِيرَ عَلَى الكَبِيرِ، وَالعَبدَ عَلَى الحُرِّ، وَتُزِيدُ السَّيِّدَ سُؤدُدًا، وَتُجلِسُ الفَقِيرَ مَجَالِسَ المُلُوكِ[2].

واتە: لە سەکەنی کوڕی عومەیر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە وەهبی کوڕی مونەببیە بوو دەیوت: ئەی کوڕی شیرینم دەست بە داناییەوە بگرە، چونکە سوود و چاکە هەمووی لە دانایی دایە: ئەها (حیکمەت و دانایی) گەورایەتی دەبەخشێ بە کەسی بچوک بەسەر کەسی گەورەو، وە گەورایەتی بە کۆیلە دەبەخشێ بەسەر کەسی ئازاد و، گەورایەتی کەسی گەورەش زیاد دەکات و، هەژاریش دادەنیشێنێ و بەشداری پێ دەکات لە مەجلیسی پاشاکان (چونکە هەژارەکە دانایە، پاشاکان سوودی لێ وەردەگرن و پێویستیان پێیەتی، بۆیە لە مەجلیسی خۆیان دایدەنیشێنن).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

٤٠٥- «عَن أَبِي الدَّردَاءِ ﷺ قَالَ: وَمَا نَحنُ لَولاَ كَلِمَاتُ العُلَمَاءِ؟»[١].

واتە: لە ئەبو دەرِدائەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە چین ئەگەر وتەی زانایان نەبێت؟! (واتە: ئێمە بە وتە و زانست و حیکمەتی زانایان بەهامان پەیدا کردووە و دین و ژینمان ڕێک خستووە، ئەگەر ئەوان نەبن ئێمە هیچ نین).

## بابەت: دەربارەی دوورکەوتنەوە لە خەڵکی خاوەن هەواو نەفس و بیدعە و، دوورکەوتنەوە لە موناقەشات و شەڕە قسە

٤٠٦ «قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: لاَ تُجَالِسُوا أَهلَ الأَهوَاءِ وَلاَ تُجَادلَوهُم، فَإِنِّي لاَ آمَنُ أَن يَغمِسُوكُم فِي ضَلاَلَتِهِم، أَو يَلبِسُوا عَلَيكُم مَا كُنتُم تَعرِفُونَ»[٢].

واتە: ئەبو قیلابە وتویەتی: لەگەڵ خەڵکی خاوەن هەواو نەفس و بیدعە دامەنیشن و مناقەشەیان لەگەڵ مەکەن، چونکە من ئەمین نیم (دەترسم) نوقمتان بکەن لەناو گومڕاییەکەیان، یان ئەوەتان لێ بشێوێنن کە ئێوە دەیزانن، (واتە: نەوەک سەرتان لێ بشێوێ و گومانتان لەوە دروست بێت کە لەسەرین).

٤٠٧- «عَن أَيُّوبَ، قَالَ: رَآنِي سَعِيدُ بنُ جُبَيرٍ، جَلَستُ إِلَى طَلقِ بنِ حَبِيبٍ فَقَالَ لِي: أَلَم أَرَكَ جَلَستَ إِلَى طَلقِ بنِ حَبِيبٍ؟ لاَ تُجَالِسَنَّهُ»[٣].

واتە: لە ئەییوبەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: سەعیدی کوڕی جوبەیر منی بینی کە دانیشتبووم لەلای طەلقی کوڕی حەبیب، جا (سەعید) وتی: ئەوە بۆچی تۆم بینی لەلای طەلقی کوڕی حەبیب دانیشتبووی؟! لەگەڵی دانەنیشی.

سەرنج: (طەلقی کوڕی حەبیب) خوا پەرست و دونیا نەویستێکی گەورە بووە، یەکێک بووە لە زانایە کرداریەکان، دەنگی زۆر خۆش بووە لە قورئان خوێندن، لەگەڵ دایک و باوکی زۆر زۆر چاک بووە، هەموو زانایان متمانەیان پێ هەبووە، زۆربەی فەرموودەناسان فەرموودەیان لێ گێڕاوەتەوە جگە لە ئیمامی بوخاری، ئەو پیاوە هیچ عەیبێکی نەبووە جگە لەوەی هەندێک قسەی لەسەر هەیە کە بیرۆکەی مورجیئەی هەبووبێت (لەبەر ئەوە سەعید وتویەتی لەلای دامەنیشە باش نیە).

٤٠٨- «عَنِ ابنِ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّ فُلاَنًا يَقرَأُ عَلَيكَ السَّلاَمَ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّهُ قَد أَحدَثَ، فَإِن كَانَ قَد أَحدَثَ، فَلاَ تَقرَأ عَلَيهِ السَّلاَمَ»[٤].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئیبنو عومەر ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پیاوێک هاتۆتە لای و وتویەتی: فڵانە کەس سەلامی لێ دەکردی، ئیبنو عومەریش پێی وت: پێم گەیشتووە کە (ئەو فڵانە کەسەی باسی دەکەی) بیدعەی پەیدا کردوە، جا ئەگەر بیدعەی پەیدا کردبێ ئەوە سەلامی لێ مەکە (واتە: سەلامی منی لێ مەکە تا گومان نەبا من بە بیدعەکەی ڕازیم).

٤٠٩- «حَدَّثَنَا الأَعمَشُ، قَالَ: كَانَ إبرَاهِيمُ لاَ يَرَى غِيبَةً لِلمُبتَدِعِ»[١].

واتە: لە ئەعمەش گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبراهیم پێی وانەبووە (باس کردنی) بیدعەکاران (بە خراپە) غەیبەت بێت (چونکە ئەگەر باسی بیدعە و خراپەکەیان نەکەیت چۆن بزانرێت ئەوە خەریکی بیدعەیە و چۆن خەڵک خۆی لێ بپارێزێت؟).

٤١٠- «عَنِ الشَّعبِيِّ، قَالَ: إِنَّمَا سُمِّيَ الهَوَى لِأَنَّهُ يَهوِي بِصَاحِبِهِ»[٢].

واتە: لە شەعبی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ناو لە (هَوَی) نراوە هەوا تەنها لەبەر ئەوەی خاوەنەکەی دەخاتە ناو ئاگری دۆزەخ (چونکە (هَوَی): بە واتای خستنەناو دێت، بێ گومان هەوا و نەفسیش مرۆڤ دەخاتە ئاگرەوە).

٤١١- «كَانَ مُسلِمُ بنُ يَسَارٍ يَقُولُ: إِيَّاكُم وَالمِرَاءَ، فَإِنَّهَا سَاعَةُ جَهلِ العَالِمِ، وَبِهَا يَبتَغِي الشَّيطَانُ زَلَّتَهُ»[٣].

واتە: موسلیمی کوڕی یەسار هەموو جار دەیوت: خۆتان بپارێزن لە موناقەشە و شەڕە قسە، چونکە ئەوە ساتی نەزانی کەسی زانایە (واتە کەسی زانا لەو ساتەدا نەزانە) و شەیتان بەو مناقەشەیە دەیەوێ پێی بخلیسکێنێت و تووشی هەڵەی بکات.

٤١٢- «عَن أَسمَاءِ بنِ عُبَيدٍ، قَالَ: دَخَلَ رَجُلاَنِ مِن أَصحَابِ الأَهوَاءِ عَلَى ابنِ سِيرِينَ فَقَالاَ: يَا أَبَا بَكرٍ نُحَدِّثُكَ بِحَدِيثٍ؟ قَالَ: لاَ، قَالاَ: فَنَقرَأُ عَلَيكَ آيَةً مِن كِتَابِ اللهِ؟ قَالَ: لاَ، لِتَقُومَانِ عَنِّي أَو لأَقومَنَّ، قَالَ: فَخَرَجَا، فَقَالَ: بَعضُ القَومِ- يَا أَبَا بَكرٍ، وَمَا كَانَ عَلَيكَ أَن يَقرَآ عَلَيكَ آيَةً مِن كِتَابِ اللهِ تَعَالَى؟ قَالَ: إِنِّي خَشِيتُ أَن يَقرَآ عَلَيَّ آيَةً فَيُحَرِّفَانِهَا، فَيَقِرُّ ذَلِكَ فِي قَلبِي»[٤].

واتە: لە ئەسمائی کوڕی عوبەید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دوو پیاوی خاوەن ئارەزوو و بیدعە (کە خاوەن بیرۆکەی گومڕایی بوون) چوونە لای ئیبنو سیرین و وتیان: ئەی باوکی بەکر (ئەی ئیبنو سیرین) فەرموودەیەکت بۆ بگێڕینەوە؟ (ئیبنو سیرین) وتی: نەخێر (بۆم مەگێڕنەوە)، وتیان: کەواتە ئایەتێکت بۆ بخوێنینەوە لە پەرتوکی خوا (لە قورئان)؟ وتی: نەخێر، یان ئەوەتا ئێوە هەڵدەستن و وازم لێ دەهێنن یان من هەڵدەستم،

---

(١) ـ رجاله ثقات.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(ئەسماء) دەڵێت: دوو پیاوەكە (هەڵسان) و دەرچوون، هەندێک لە خەڵكەكە (كە لەوێ بوون) وتیان: ئەی باوكی بەكر چ زەرەرێكت دەكرد ئەگەر ئایەتێكیان بەسەردا خوێندبایەوە؟ وتی: من ترسام ئایەتێكم بەسەردا بخوێننەوەو (ماناكەی) بگۆڕن و ئەوەش لە دڵمدا بچەسپێ و (تووشی گومرایی ببم بە هۆیەوە).

٤١٣- «عَن سَلاَمِ بنِ أَبِي مُطِيعٍ، أَنَّ رَجُلاً مِن أَهلِ الأَهوَاءِ، قَالَ: لِأَيُّوبَ، يَا أَبا بَكرٍ، أَسأَلُكَ عَن كَلِمَةٍ؟ قَالَ: فَوَلَّى، وَهُوَ يُشِيرُ بِأُصبُعِهِ وَلاَ نِصفَ كَلِمَةٍ وَأَشَارَ لَنَا سَعِيدٌ بِخِنصِرِهِ اليُمنَى[1].

واتە: لە سەلامی كوڕی ئەبو موطیعەوە گێڕدراوەتەوە، (وتویەتی): پیاوێک لە خاوەن هەوا و نەفس و بیدعە بە ئەییوبی وت: ئەی باوكی بەكر پرسیارت لێ بكەم دەربارەی وشەیەک؟ (سەلام) دەڵێ: (ئەییوب) ڕۆیشت و پشتی تێكرد و ئاماژەی بۆ پیاوەكە دەكرد بە پەنجەی و (مەبەستی بە ئاماژەكە ئەوەبوو بڵێت) نەخێر پرسیاری نیو وشەش مەكە.

ئیمامی داریمی دەڵێ: سەعید ئاماژەی بۆ كردین بە پەنجەی بچوكی دەستی ڕاستی (تاوەكو لاسایی ئەییوب بكاتەوە لە ئاماژەكەیدا).

٤١٤- «عَن كُلثُومِ بنِ جَبرٍ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ سَعِيدَ بنَ جُبَيرٍ، عَن شَيءٍ فَلَم يُجِبهُ، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ أَزِيشَان»[2].

واتە: لە كولثومی كوڕی جەبرەوە گێڕدراوەتەوە، (وتویەتی): پیاوێک پرسیاری لە سەعیدی كوڕی جوبەیر كرد دەربارەی شتێک، ئەویش وەڵامی نەدایەوە، پێی وترا (بۆ وەڵامت نەدایەوە)؟ وتی: (أزیشان) واتە ئەوە لەوانە (واتە لە بیدعەكارانە بۆیە وەڵامم نەدایەوە).

سەرنج: (أزیشان) وشەیەكی فارسیە بە واتای (ئەوە لەوانە) دێت.

٤١٥- «عَن مُحَمَّدِ بنِ عَلِيٍّ، قَالَ: لاَ تُجَالِسُوا أَصحَابَ الخُصُومَاتِ، فَإِنَّهُمُ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِ اللهِ»[3].

واتە: لە موحەممەدی كوڕی عەلیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ خەڵكانی خاوەن موناقەشەكەرو شەڕە قسەكەر دامەنیشن، چونكە ئەوان (بە ناهەق) ڕۆدەچن لە ئایەتەكانی خوا (زێدەڕۆیی دەكەن).

٤١٦- «عَنِ الحَسَنِ وَابنِ سِيرِينَ: أَنَّهُمَا قَالاَ: لاَ تُجَالِسُوا أَصحَابَ الأَهوَاءِ، وَلاَ تُجَادلُوهُم، وَلاَ تَسمَعُوا مِنهُم»[4].

واتە: لە حەسەن و ئیبنو سیرینەوە گێڕدراوەتەوە، هەردووكیان وتویانە: لەگەڵ خەڵكانی خاوەن هەوا و نەفس و بیدعە دامەنیشن و مناقەشەیان لەگەڵ مەكەن و گوێیان بۆ مەگرن.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

**٤١٧- «عَنِ الشَّعبِيِّ قَالَ: إِنَّمَا سُمُّوا أَصحَابَ الأَهوَاءِ، لِأَنَّهُم يَهوُنَ فِي النَّارِ»[١].**

**واتە: لە شەعبی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خاوەن هەوا و نەفس بۆیە ناویان لێنراوە (أصحاب الأهواء) چونكە دەچنە ناو ئاگرەوە.**

## بابەت: یەكسانی لە زانستدا
## (واتە: یەكسانی كردن لە نێوان قوتابیانی زانست و جیاوازی نەخستنە نێوانیان)

**٤١٨- «عَنِ ابنِ مَيسَرَةَ، قَالَ مَا رَأَيتُ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ، الشَّرِيفُ، وَالوَضِيعُ، عِندَهُ سَوَاءٌ، غَيرَ طَاوُسٍ، وَهُوَ يَحلِفُ عَلَيهِ»[٢].**

**واتە: لە ئیبنو مەیسەر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: كەسم نەبینیوە لە خەڵكی كە كەسی خانەدان و كەسی نزمی لەلا وەک یەک بێت جگە لە طاووس، (ئیبنو مەیسەرە) سوێندی لەسەر ئەوە دەخوارد.**

**٤١٩- «عَنِ الزُّهرِيِّ، قَالَ: كُنَّا نَكرَهُ كِتَابَةَ العِلمِ، حَتَّى أَكرَهَنَا عَلَيهِ السُّلطَانُ، فَكَرِهنَا أَن نَمنَعَهُ أَحَدًا»[٣].**

**واتە: لە زوهری گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە نوسینەوەی زانستمان پێ ناخۆش بوو (ڕێگامان نەدەدا بۆ قوتابیەكان) تا ئەو كاتەی خەلیفە (عومەری كوڕی عەبدول عەزیز و هیشامی كوڕی عەبدولمەلیک) ڕەخنەیان لێ گرتین و (فەرمانیان پێ كردین كە زانست بۆ هەندێک لە منداڵەكانیان بنوسینەوە، بۆیە لەوە بەولاوە) پێمان خۆش نەبوو كەس قەدەغە بكەین لە نوسینەوی زانست (واتە: هیچێک لە قوتابیەكانمان قەدەغە نەدەكرد، تا نەبێتە جیاوازی لە نێوان منداڵانی خەلیفە و منداڵانی خەڵكی ئاسایی).**

**٤٢٠- «حَدَّثَنَا ابنُ عَونٍ، قَالَ: كَلَّمُوا مُحَمَّدًا، فِي رَجُلٍ يَعنِي: يُحَدِّثُهُ فَقَالَ: لَو كَانَ رَجُلاً مِنَ الزِّنجِ، لَكَانَ عِندِي وَعَبدُ اللهِ بنُ مُحَمَّدٍ فِي هَذَا سَوَاءٌ»[٤].**

**واتە: لە ئیبنو عەون گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قسەیان لەگەڵ موحەممەد (واتە: ئیبنو سیرین) كرد دەربارەی پیاوێک تەكلیفیان لێ كرد تاوەكو فەرموودەی بۆ بگێڕێتەوە (فێری زانستی بكات و بە قوتابی خۆی وەری بگرێت)، موحەممەدیش وتی: ئەگەر پیاوێكی زینجی سوودانی بێت بۆ لام ئەوە لەلای من لەگەڵ عەبدوڵڵای كوڕی موحەممەد (كە كوڕی خۆمە) وەک یەكن (واتە: هەر كەسێک بێت من جیاوازی ناكەم ئامادەم فێری بكەم و فەرموودەی بۆ بگێڕمەوە، پێویست بە واستەكاری تەكلیفی كەسانی تر ناكات).**

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

٤٢١- «عَنِ الصَّلتِ بنِ رَاشِدٍ، قَالَ: سَأَلَ سَلمُ بنُ قُتَيبَةَ طاوسًا، عَن مَسأَلَةٍ فَلَم يُجِبهُ، فَقِيلَ لَهُ: هَذَا سَلمُ بنُ قُتَيبَةَ قَالَ: ذَلِكَ أَهوَنُ لَهُ عَلَيَّ»[1].

واتە: لە صەلتی كوڕی ڕاشید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سەلمی كوڕی قوتەیبە پرسیاری لە طاووس كرد دەربارەی بابەتێک، ئەویش وەڵامی نەدایەوە، جا پێی وترا: ئەوە سەلمی كوڕی قوتەیبەیە (موحافیزی خۆراسانە، چۆن دەكرێ وەڵامی نەدرێتەوە)! (طاووس) وتی: ئەو كارە بەرانبەر ئەو ئاساییتر و ئاسانترە لەلام.

## بابەت: ڕێز گرتنی زانایان

٤٢٢- «حَدَّثَنِي حَبِيبُ بنُ صَالِحٍ، قَالَ: مَا خِفتُ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ، مَخَافَتِي خَالِدَ بنَ مَعدَانَ»[2].

واتە: لە حەبیبی كوڕی صاڵح گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە هیچ كەسێک لە خەڵكی نەترساوم، وەک ترسانم لە خالیدی كوڕی مەعدان (چونكە زانایێكی گەورە بوو).

سەرنج: مەبەستی بە لێ ترسانەكە ڕێز بووە، واتە: لەبەر زێدە ڕێز لێی ترساوە، لێ ترسان بەو مانایەی ترساوە بێ ئەدەبیەک لە خزمەتی بكات، یان بە شێوەیەكی نەشیاو ببینێ.

٤٢٣- «عَن مُغِيرَةَ، قَالَ: كُنَّا نَهَابُ إِبرَاهِيمَ هَيبَةَ الأَمِيرِ»[3].

واتە: لە موغیرە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لە ئیبراهیم دەترساین (كە زانایێكی گەورە بوو) وەک ترسان لە سەركردەو كاربەدەست.

٤٢٤- «عَن أَيُّوبَ، قَالَ: حَدَّثَ سَعِيدُ بنُ جُبَيرٍ، يَومًا بِحَدِيثٍ، فَقُمتُ إِلَيهِ فَاستَعَدتُهُ، فَقَالَ: مَا كُلَّ سَاعَةٍ أَحلُبُ فَأُشرَبُ»[4].

واتە: لە ئەییوب گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ڕۆژێكیان سەعیدی كوڕی جوبەیر فەرموودەیەكی گێڕایەوە، (ئەییوب) دەڵێ: منیش هەڵسام چووم بۆ لای و داوام لێ كرد فەرموودەكەم بۆ دووبارە بكاتەوە، ئەویش وتی: هەموو كات شیر نادۆشم تا بخۆمەوە (واتە: هەموو كات هی ئەوە نیە شت دووبارە بكەمەوە، دیارە لەبەر هۆكارێک نەگونجاوە بۆی دووبارە بكاتەوە یاخود وەک پەند وەرگرتنێک كە جارێكی تر گرنگی تەواوی پێ بدات).

سەرنج: لەم فەرموودەیە دەردەكەوێت كە چەندە ڕێزیان لە زانایان گرتووە، ئەییوب نەچووە لە دوورەوە بڵێت: ئادەی بێ زەحمەت فەرموودەكەم بۆ دووبارە بكەرەوە، بەڵكو هەڵساوە و چووە بۆ لای و لەسەر چۆک بۆی دانیشتووە و داوای لێكردوە لە نزیكەوە).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

٤٢٥- «عَن عَطَاءٍ ﷺ، أَنَّ أبا عَبدِ الرَّحمَنِ كَرِهَ الحَدِيثَ فِي الطَّرِيقِ»[١].

واتە: لە عەطاء ﷺ گێردراوەتەوە، (وتویەتی): ئەبو عەبدوڕڕەحمان (کە زانایێکە) پێی باش نەبووە لە ڕێگا لە کاتی ڕۆیشتن قسە بکات (هێندە بە ڕێز و سەنگین بوون).

٤٢٦- «عَن حَبِيبِ بنِ أَبِي ثَابِتٍ، قَالَ: كُنَّا عِندَ سَعِيدِ بنِ جُبَيرٍ، فَحَدَّثَ بِحَدِيثٍ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: مَن حَدَّثَكَ هَذَا أَو مِمَّن سَمِعتَ هَذَا؟ فَغَضِبَ وَمَنَعَنَا حَدِيثَهُ حَتَّى قَامَ»[٢].

واتە: لە حەبیبی کوڕی ئەبو ثابیت گێردراوەتەوە، وتویەتی: لەلای سەعیدی کوڕی جوبەیر بووین باسی فەرموودەیەکی کرد، پیاوێکیش (بە شێوازێکی ناڕەزایی) پێی وت: کێ ئەوەی بۆ گێڕاویتەوە یان ئەوەت لە کێ گوێ لێ بووە؟ (سەعید)یش توڕە بوو و فەرموودەی بۆ نەگێڕاینەوە تا کابرا هەڵسا (چونکە بە شێوازێکی نەشیاو پرسیارەکەی لێکرد، بە شێوەیەک بۆنی بەدرۆخستنەوەی لێ دێت و ڕەنگە دەنگیشی بەرز کردبێتەوە، وە بۆیە وەڵامی نەداوەتەوە تا خەڵک لەلای نەبێتە شتێکی ئاسایی و بە شێوازی سوک مامەڵە لەگەڵ زانایان نەکەن، والله أعلم).

٤٢٧- «عَن أَبِي سَلَمَةَ، قَالَ: لَو رَفَقتُ بِابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا، لأَصَبتُ مِنهُ عِلمًا كَثِيرًا»[٣].

واتە: لە ئەبو سەلەم گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر هاوڕێیەتی ئیبنو عەبباسم (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، بکردایە ئەوە زانستی زۆرم لەوەوە پێ دەگەیشت و بەدەستم دەهێنا. (واتە: نەیتوانیوە زۆر لەگەڵ ئیبنو عەبباس بمێنێتەوە چونکە ئیبنو عەبباس قەدەغەی کرد لەوەی چیتر فەرموودەی بۆ بگێڕێتەوە، لەبەر زۆر کێشمە کێشم کردن لەگەڵی، ئەوەش لەگەڵ زانست ناگونجێ و ئیبنو عەبباس ویستویەتی پلەی زانایان بپارێزێت بۆیە چیتر زانستی پێ نەوتووە).

٤٢٨- «عَن أُمِّ عَبدِ اللهِ بِنتِ خَالِدٍ، قَالَت: مَا رَأَيتُ أَحَدًا أَكرَمَ لِلعِلمِ مِن أَبِي»[٤].

واتە: لە ئوممو عەبدوڵڵای کچی خالید گێردراوەتەوە، وتویەتی: هیچ کەسێکم نەدیوە ڕێزی زانست بگرێت وەک باوکم.

## بابەت: دەربارەی کەسانی جێی متمانە

٤٢٩- «عَن سُلَيمَانَ بنِ مُوسَى، قَالَ: قُلتُ لِطَاوُسٍ: إِنَّ فُلَانًا حَدَّثَنِي بِكَذَا وَكَذَا: قَالَ إِن كَانَ صَاحِبُكَ مَلِيًّا، فَخُذ عَنهُ»[٥].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده حسن.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی مووسا گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە طاووسم وت: فڵانە کەس ئەوە و ئەوەی بۆ گێڕاومەتەوە، ئەویش وتی: ئەگەر هاوەڵەکەت (ئەوەی فەرموودەکانی بۆ گێڕاویتەوە) تەواو متمانەیە ئەوە (فەرموودەی) لێ وەرگرە.

٤٣٠- «قَالَ سَعدُ بنُ إِبرَاهِيمَ، لاَ يُحَدِّثُ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ، إلاَّ الثِّقَاتُ»[١].

واتە: سەعدی کوڕی ئیبراهیم، وتویەتی: نابێ کەس فەرموودە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بگێڕێتەوە تەنها ئەو کەسانە نەبن کە جێگای متمانەن.

٤٣١- «عَنِ ابنِ سِيرِينَ، قَالَ: كَانُوا لاَ يَسأَلُونَ عَنِ الإِسنَادِ، ثُمَّ سَأَلُوا بَعدُ لِيَعرِفُوا مَن كَانَ صَاحِبَ سُنَّةٍ أَخَذُوا عَنهُ، وَمَن لَم يَكُن صَاحِبَ سُنَّةٍ، لَم يَأخُذُوا عَنهُ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: مَا أَظُنُّهُ سَمِعَهُ مِن عَاصِمٍ»[٢].

واتە: لە ئیبنو سیرین گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێشتر (واتە: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا) پرسیاریان نەدەکرد دەربارەی سەنەدەکان (سەنەدی فەرموودە)، دواتر (کە فیتنەو درۆ سەری هەڵدا) پرسیاریان دەکرد تا بزانن کێ ئەهلی سوننەیە تا فەرموودەی لێ وەربگرن، وە تا بزانن کێ ئەهلی سوننە نیە تا فەرموودەی لێ وەرنەگرن.

ئەبو موحەممەد (ئیمامی داریمی) وتویەتی: پێم وانیە (جەریر کە یەکێک لە گێڕەرەوانی ئەم فەرموودەیەیە) گوێی لە عاصم بووبێت (کە ئەویش یەکێکە لە گێڕەرەوانی ئەم فەرموودەیە پێشی ئیبنو سیرینە، واتە: ئەو سەنەدە پچڕانی تیایە).

٤٣٢- «قَالَ: مُحَمَّدُ بنُ سِيرِينَ، مَا حَدَّثتَنِي، فَلاَ تُحَدِّثنِي عَن رَجُلَينِ، فَإِنَّهُمَا لاَ يُبَالِيَانِ، عَمَّن أَخَذَا حَدِيثَهُمَا قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ عَبدُ اللهِ: لاَ أَظُنُّهُ سَمِعَهُ»[٣].

واتە: موحەممەدی کوڕی سیرین وتویەتی: ئەوەی بۆم دەگێڕیتەوە بۆم مەگێڕەوە لە دوو کەس، چونکە ئەم دوو کەسانە گوێ پێ نادەن لە کێ فەرموودەکانیان وەردەگرن (هەر کەسێک هەبێ لێی وەردەگرن، جێگای متمانەبێ یان نا).

ئەبو موحەممەد (ئیمامی داریمی) وتویەتی: پێم وانیە (لێرەشدا جەریر) گوێی لە عاصم بووبێت، (واتە: ئەوەش پچڕانی تیایە).

٤٣٣- «قَالَ إِبرَاهِيمُ، إِذَا حَدَّثتَنِي، فَحَدِّثنِي عَن أَبِي زُرعَةَ، فَإِنَّهُ حَدَّثَنِي بِحَدِيثٍ ثُمَّ سَأَلتُهُ بَعدَ ذَلِكَ بِسَنَةٍ فَمَا خَرَمَ مِنهَا حَرفًا»[٤].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

واتە: ئیبراهیم وتویەتی: ئەگەر (فەرموودەت) بۆ گێرامەوە ئەوە بۆم بگێڕەوە لە ئەبو زەرعەوە، چونکە (جێگای متمانەیەو لەبەر کردنی زۆر بەهێزە) جارێکیان فەرموودەیەکی بۆ گێرامەوە، دواتر پاش ساڵێک پرسیارم دەربارەی لێ کردەوە (بۆی دووبارە کردمەوە) یەک پیتیشی نەپەڕاند (وەک خۆی وتیەوە).

٤٣٤- «عَن مُحَمَّدٍ، قَالَ: إِنَّ هَذَا العِلمَ، دِينٌ، فَلْيَنظُرِ الرَّجُلُ، عَمَّن يَأخُذُ دِينَهُ»[١].

واتە: لە موحەممەدەوە (واتە: لە ئیبنو سیرین)ەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە دڵنیایی ئەو زانستە (زانستی فەرموودە) دینە، جا با پیاو سەیر بکات بزانێ دینی خۆی لە کێ وەردەگرێ (دەبێ لە کەسی متمانە پێکراو وەری بگرێ).

٤٣٥- «عَن إِبرَاهِيمَ، قَالَ: كَانُوا إِذَا أَتَوا الرَّجُلَ لِيَأخُذُوا عَنهُ، نَظَرُوا إِلَى صَلَاتِهِ، وَإِلَى سَمتِهِ، وَإِلَى هَيئَتِهِ»[٢].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زانایان ئەگەر بچوونایە بۆ لای پیاوێک تا (فەرموودەی) لێ وەربگرن، سەیری نوێژەکەی و مەزهەبەکەی و شکل و شێوەکەیان دەکرد.

٤٣٦- «عَن إِبرَاهِيمَ، قَالَ: كَانُوا إِذَا أَتَوا الرَّجُلَ يَأخُذُونَ عَنهُ العِلمَ، نَظَرُوا إِلَى صَلَاتِهِ، وَإِلَى سَمتِهِ، وَإِلَى هَيئَتِهِ، ثُمَّ يَأخُذُونَ عَنهُ»[٣].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زانایان ئەگەر چووبان بۆ لای پیاوێک تا زانستی لێ وەربگرن، سەیری نوێژەکەی و مەزهەبەکەی و شکل و شێوەکەیان دەکرد، دواتر لێیان وەردەگرت.

٤٣٧- «عَنِ الحَسَنِ، نَحوَ حَدِيثِ إِبرَاهِيمَ»[٤].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە وەک فەرموودەکەی ئیبراهیمی وتووە.

٤٣٨- «عَن أَبِي العَالِيَةِ، قَالَ: كُنَّا نَأتِي الرَّجُلَ، لِنَأخُذَ عَنهُ، فَنَنظُرُ إِذَا صَلَّى، فَإِن أَحسَنَهَا، جَلَسنَا إِلَيهِ، وَقُلنَا: هُوَ لِغَيرِهَا أَحسَنُ وَإِن أَسَاءَهَا، قُمنَا عَنهُ، وَقُلنَا: هُوَ لِغَيرِهَا أَسوأُ قَالَ أَبُو مَعمَرٍ: لَفظُهُ نَحوُ هَذَا»[٥].

واتە: لە ئەبو عالیە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە دەچووین بۆ لای پیاوێک تاوەکو (زانست و فەرموودەی) لێ وەربگرین، بۆیە سەیرمان دەکرد کاتێ نوێژی دەکرد، ئەگەر بە جوانی بیکردایە لەلای دادەنیشتین (بۆ وەرگرتنی زانست) و دەمان وت: کردەوەکانی تری باشتریشە، وە ئەگەر بە خراپیش بیکردایە ئەوە لەلای هەڵدەستاین و دەڕۆیشتین (زانستمان لێ وەرنەدەگرت) و دەمان وت: کردەوەکانی تری جگە لە

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده حسن.

نوێژی خراپتریشه، ئەبو مەعمەر وتویەتی: وشەکانی که بەکاری هێنا نزیک بوو لەوەی که وتم: (واتە: هەمان مانام پێکاوه، ئەگەرچی هەمان وشەی ئەوم بەکارنەهێناوه له گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە).

**٤٣٩-** «عَن مُحَمَّدٍ إِنَّ هَذَا العِلمَ دِينٌ، فَانظُرُوا عَمَّن تَأخُذُونَ دِينَكُم»[١].

واتە: له موحەممەد (ئیبنو سیرین)ەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە دڵنیایی ئەو زانستە (زانستی فەرموودە) دینه، جا سەیر بکەن بزانن دینی خۆتان له کێ وەردەگرن.

**٤٤٠-** «عَن سُلَيمَانَ بنِ مُوسَى، قَالَ: قُلتُ لِطَاوُسٍ إِنَّ فُلَانًا حَدَّثَنِي بِكَذَا وَكَذَا، قَالَ: فَإِن كَانَ صَاحِبُكَ، مَلِيًّا، فَخُذ عَنهُ»[٢].

واتە: له سولەیمانی کوڕی مووسا گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: به طاووسم وت: فڵان کەس ئەوە و ئەوەی بۆ گێڕاومەتەوە، ئەویش وتی: ئەگەر هاوڕێکەت (ئەوەی فەرموودەکانی بۆ گێڕاویتەوە) تەواو جێی متمانەیە ئەوە (فەرموودەی) لێ وەرگرە.

**٤٤١-** «عَن طَاوُسٍ، قَالَ: جَاءَ بُشَيرُ بنُ كَعبٍ إِلَى ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فَجَعَلَ يُحَدِّثُهُ، فَقَالَ: ابنُ عَبَّاسٍ أَعِد عَلَيَّ الحَدِيثَ الأَوَّلَ قَالَ لَهُ بُشَيرٌ: مَا أَدرِي عَرَفتَ حَدِيثِي كُلَّهُ، وَأَنكَرتَ هَذَا، أَو عَرَفتَ هَذَا، وَأَنكَرتَ حَدِيثِي كُلَّهُ؟ فَقَالَ ابنُ عَبَّاسٍ إِنَّا كُنَّا نُحَدِّثُ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ إِذ لَم يَكُن يُكذَبُ عَلَيهِ، فَلَمَّا رَكِبَ النَّاسُ الصَّعبَ وَالذَّلُولَ، تَرَكنَا الحَدِيثَ عَنهُ»[٣].

واتە: له طاووس گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بوشەیری کوڕی کەعب هات بۆ لای ئیبنو عەبباس و هەر حەدیسی بۆ ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) دەگێڕایەوە، ئیبنو عەبباسیش وتی: فەرموودەی یەکەمم بۆ دووبارە بکەوە، بوشەیر پێی وت: نازانم ئایا گشت فەرموودەکانم دەزانیت و تەنها ڕات لەمەیان نیە و (لات غەریبە، بۆیە پێم دووبارە دەکەیتەوە)، یان تەنها ئەوەیان دەزانیت و ڕات له هیچێک له فەرموودەکانی تری من نیە؟ ئیبنو عەبباس وتی: ئێمە فەرموودەمان دەگێڕایەوە له پێغەمبەری خواوە لەو کاتەی درۆی بە دەمەوە نەدەکرا، بەڵام کاتێک خەڵکی سواری وشتری چەموش و دەستەمۆ بوون (واتە: کاتێک خەڵکی هەموو ڕێگایێکیان گرتەبەر بە باش و خراپ) وازمان هێنا له گێڕانەوەی فەرموودە له پێغەمبەری خواوە ﷺ (واتە: ناهەق نیم کە لێکۆڵینەوەت لەگەڵ دەکەم، چونکە خەڵک خراپ بووە، ڕەنگە درۆ بە دەمی پێغەمبەرەوە ﷺ بکرێ).

**٤٤٢-** «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كُنَّا نَحفَظُ الحَدِيثَ، وَالحَدِيثُ يُحفَظُ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ، حَتَّى رَكِبتُمُ الصَّعبَةَ وَالذَّلُولَ»[٤].

---

(١) ـ أثر صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە فەرموودەمان لەبەر دەکرد، فەرموودەش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەبەر دەکرا، تا ئەو کاتەی سواری وشتری چەموش و دەستەمۆ بوون (واتە: تا ئەو کاتەی هەموو ڕێگاێکتان گرتەبەر بە باش و خراپ، ئەو کات وازمان لە گێڕانەوەی فەرموودە هێنا).

٤٤٣- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ عَمرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا، قَالَ: يُوشِكُ أَن يَظهَرَ شَيَاطِينُ قَد أَوثَقَهَا سُلَيمَانُ عليه السلام، يُفَقِّهُونَ النَّاسَ فِي الدِّينِ»(١).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: نزیکە شەیتانانێک دەربکەون کە پێغەمبەر سولەیمان عليه السلام، بەستبوونیەوە، بێن و خەڵکی فێری تێگەیشتن بکەن لە دیندا (واتە: خەڵکانێک دەرئەکەون فێڵاوی و درۆزن و بیدعەچین لە چەشنی شەیتانن، بەڵکو لە شەیتان خراپترن، سولەیمان توانی شەیتانەکان ببەستێتەوە، بەڵام ئەمانە ناشبەسترێنەوە).

٤٤٤- «عَن مُحَمَّدٍ، قَالَ: انظُرُوا عَمَّن تَأخُذُونَ هَذَا الحَدِيثَ فَإِنَّهُ دِينُكُم»(٢).

واتە: لە موحەممەد (واتە: لە ئیبنو سیرین)ەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: جوان سەیر بکەن بزانن ئەم فەرموودانە لە کێ وەردەگرن، چونکە ئاینتانە.

## بابەت: خۆپاراستن لە ڕوون کردنەوەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەست گرتن بە وتەی جگە لە پێغەمبەری خوا لە کاتێکدا وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەبێ

٤٤٥- «حَدَّثَنَا مُعتَمِرٌ، عَن أَبِيهِ، قَالَ: لِيُتَّقَى، مِن تَفسِيرِ حَدِيثِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، كَمَا يُتَّقَى مِن تَفسِيرِ القُرآنِ»(٣).

واتە: لە موعتەمیرە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە، وتویەتی: دەبێ خۆ بپارێزرێ لە تەفسیر کردن و ڕوون کردنەوەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ، وەک چۆن خۆ دەپارێزرێ لە تەفسیر کردن و ڕوون کردنەوەی قوڕئان (چونکە جیاوازیان نیە هەردووکیان دینن، هەڵە کردن لە هەر یەکێکیان دین دەشێوێنێ).

٤٤٦- «حَدَّثَنَا مُعتَمِرٌ، عَن أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ ابنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، أَمَا تَخَافُونَ أَن تُعَذَّبُوا، أَو يُخسَفَ بِكُم، أَن تَقُولُوا: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَقَالَ فُلَانٌ؟»(٤).

واتە: لە موعتەمیرە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، وتویەتی: ئایا ناترسن سزا بدرێن، یان لە زەوی ڕۆبچوێنرێن (خوا لە زەویتان بباتە خوارەوە)

---

(١) موقوف ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

كاتێک دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ (ئاوای) فەرمووە و فڵانیش (ئاوای) فەرمووە؟ (واتە: چۆن دەكرێت بۆچوونی خەڵكی لەسەر بابەتێک باس بكەن لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی لەسەر كردووە و بڕاندوویەتیەوە؟!).

٤٤٧- «عَنِ الأَوزَاعِيِّ، قَالَ: كَتَبَ عُمَرُ بنُ عَبدِ العَزِيزِ رَحِمَهُ اللهُ تَعَالَى أَنَّهُ لاَ رَأيَ لِأَحَدٍ فِي كِتَابِ اللهِ، وَإِنَّمَا رَأيُ الأَئِمَّةِ فِيمَا لَم يَنزِل فِيهِ كِتَابٌ، وَلَم تَمضِ بِهِ سُنَّةٌ مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَلاَ رَأيَ لِأَحَدٍ فِي سُنَّةٍ سَنَّهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ»[1].

واتە: لە ئەوزاعی گێردراوەتەوە، وتویەتی: عومەری كوڕی عەبدولعەزیز (بۆ زانایانی) نوسی: بە دڵنیایی نابێ كەس بۆچوونی هەبێ و بۆچوون دەربكات لە پەرتوكی خوا (واتە: نابێ ئەو شتانەی قوڕئان باسی كردوون كەس بچێ بە جۆرێكی تر بڕیاریان لەسەر بدات)، بەڵكو بۆچوونی زانایان و پێشەوایان تەنها لەو شتانە قەبوڵە و كاری پێدەكرێت كە ئایەتی بۆ دانەبەزی بێ و، هیچ فەرموودەیەكی پێغەمبەری خواشی ﷺ دەربارە نەهاتبێت، وە هیچ كەس نابێ بۆچوونی هەبێت و بۆچوون دەربكات لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: نابێ ئەو شتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ باسی كردوون كەس بچێ بە جۆرێكی تر بڕیاریان لەسەر بدات، چونكە بڕیاری كەس ناخوات و كاری پێ ناكرێت تا بڕیاری پێغەمبەری خوا هەبێت).

٤٤٨- «عَن عُبَيدِ اللهِ بنِ عُمَرَ، أَنَّ عُمَرَ بنَ عَبدِ العَزِيزِ رَحِمَهُ اللهُ، خَطَبَ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللهَ لَم يَبعَث بَعدَ نَبِيِّكُم نَبِيًّا، وَلَم يُنزِل بَعدَ هَذَا الكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَيهِ كِتَابًا، فَمَا أَحَلَّ اللهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ فَهُوَ حَلاَلٌ إِلَى يَومِ القِيَامَةِ، وَمَا حَرَّمَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ فَهُوَ حَرَامٌ إِلَى يَومِ القِيَامَةِ، أَلاَ وَإِنِّي لَستُ بِقَاضٍ، وَلَكِنِّي مُنَفِّذٌ، وَلَستُ بِمُبتَدِعٍ، وَلَكِنِّي مُتَّبِعٌ، وَلَستُ بِخَيرٍ مِنكُم، غَيرَ أَنِّي أَثقَلُكُم حِملاً، أَلاَ وَإِنَّهُ لَيسَ لِأَحَدٍ مِن خَلقِ اللهِ أَن يُطَاعَ فِي مَعصِيَةِ اللهِ، أَلاَ هَل أَسمَعتُ؟؟»[2].

واتە: لە عوبەیدوڵڵای كوڕی عومەر گێردراوەتەوە، وتویەتی: عومەری كوڕی عەبدولعەزیز (رَحِمَهُ اللهُ)، وتاریدا و وتی: ئەی خەڵكینە خوا هیچ پێغەمبەرێكی لە پاش پێغەمبەرەكەتان (موحەممەد ﷺ)، نەناردووە، وە هیچ پەرتوكێكی نەناردووە لەپاش ئەو پەرتوكەی كە ناردوویەتیە خوارەوە بۆ سەری، جا ئەوەی خوا حەڵاڵی كردوە لەسەر زاری پێغەمبەرەكەی ئەوە حەڵاڵە تا ڕۆژی دوایی، وە ئەوەی حەڕامی كردوە لەسەر زاری پێغەمبەرەكەی ئەوە حەڕامە تا ڕۆژی دوایی، ئاگادار بن من بڕیاردەر نیم (حوكم دەرناكەم) بەڵكو جێبەجێكارم، وە بیدعەكار نیم، بەڵكو شوێنكەوتەم (شوێنی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەكەوم) و باشترینی ئێوەش نیم، بەڵام من بارم لە هەمووتان قورسترە (واتە: خەلیفایەتیم تەكلیفە)، ئاگادار بن هیچ لە دروستكراوانی خوا گوێڕایەڵی ناكرێن لە سەرپێچی خودادا، ئایا گوێبیستم كردن؟ (ئایا پەیامەكەم گەیشت)؟.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

٤٤٩- «عَن هِشَامِ بنِ حُجَيرٍ، قَالَ: كَانَ طاوسٌ يُصَلِّي رَكعَتَينِ بَعدَ العَصرِ، فَقَالَ لَهُ ابنُ عَبَّاسٍ: رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا اترُكهُمَا، قَالَ: إِنَّمَا نُهِيَ عَنهَا أَن تُتَّخَذَ سُلَّمًا، قَالَ: ابنُ عَبَّاسٍ فَإِنَّهُ قَد نُهِيَ عَن صَلَاةٍ بَعدَ العَصرِ، فَلَا أَدرِي أَتُعَذَّبُ عَلَيهَا أَم تُؤجَرُ، لِأَنَّ اللهَ يَقُولُ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾الأحزاب، قَالَ: سُفيَانُ تُتَّخَذَ سُلَّمًا، يَقُولُ: يُصَلِّي بَعدَ العَصرِ إِلَى اللَّيلِ»[١].

واته: له هیشامی كوڕی حوجه‌یر گێڕدراوه‌ته‌وه، وتویه‌تی: هه‌موو جار طاووس دوو ڕه‌كعه‌ت نوێژی سوننه‌تی له‌دوای نوێژی عه‌سر ده‌كرد، ئیبنو عه‌بباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، پێی وت: واز له‌و دوو ڕه‌كعه‌ته بێنه و (چیتر مه‌یانكه)، (طاووسیش) وتی: كه نه‌هی لێ كراوه ته‌نها له‌به‌ر ئه‌وه‌یه نه‌وه‌ك بكرێته په‌یژه و (مرۆڤ زێده‌ڕۆیی تیا بكات و، یه‌ك له‌دوای یه‌ك نوێژ بكات و، وه‌ك په‌یژه‌ی لێ بكات و هه‌ر به‌رده‌وام بێت سوننه‌ت دوای سوننه‌ت تاوه‌كو ده‌گاته كاتی ڕۆژ ئاوابوون، له‌و كاتیش تووشی حه‌ڕام ده‌بێت و ده‌كه‌وێته ناو كاتی ڕۆژئاوابوون، چونكه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ حه‌ڕامی كردوه نوێژ له كاتی ڕۆژ ئاوا بووندا ئه‌نجام بدرێت)، ئیبنو عه‌بباسیش وتی: به دڵنیایی نه‌هی له نوێژ كردن كراوه له دوای عه‌سر، جا ناشزانم تۆ له‌سه‌ر ئه‌نجامدانی سزا ده‌درێی یان پاداشت ده‌درێیته‌وه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خوا ده‌فه‌رمووێ: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾الأحزاب، واته: [بۆ هیچ پیاوێكی ئیماندار یان ژنێكی ئیماندار نیه كاتێك كه خواو پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی بڕیاری شتێك بده‌ن ئه‌وان سه‌رپشك بن (له ئه‌نجامدانی ئه‌و كاره، چونكه) ئه‌وه‌ی سه‌رپێچی بكات له فه‌رمانی خواو پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی ﷺ ئه‌وه ئیتر به ئاشكرا گومڕا و سه‌رلێشێواوه].

سوفیان وتویه‌تی: (تُتَّخَذَ سُلَّمًا) واته: نوێژ بكات پاشی عه‌سر تا شه‌و (واته: تا ئێواره).

٤٥٠- «عَن جَابِرٍ رضي الله عنه أَنَّ عُمَرَ بنَ الخَطَّابِ رضي الله عنه أَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ بِنُسخَةٍ مِنَ التَّورَاةِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذِهِ نُسخَةٌ مِنَ التَّورَاةِ، فَسَكَتَ، فَجَعَلَ يَقرَأُ وَوَجهُ رَسُولِ اللهِ يَتَغَيَّرُ، فَقَالَ: أَبُو بَكرٍ رَحمَةُ اللهِ عَلَيهِ ثَكِلَتكَ الثَّوَاكِلُ، مَا تَرَى بِوَجهِ رَسُولِ اللهِ ﷺ ؟ فَنَظَرَ عُمَرُ إِلَى وَجهِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: أَعُوذُ بِاللهِ مِن غَضَبِ اللهِ وَغَضَبِ رَسُولِهِ رَضِينَا بِاللهِ رَباً وَبالإِسلَامِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا- فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ رَضِينَا بِاللهِ رَباً وَبالإِسلَامِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا- فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: وَالَّذِي نَفسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَو بَدَا لَكُم مُوسَى فَاتَّبَعتُمُوهُ وَتَرَكتُمُونِي، لَضَلَلتُم عَن سَوَاءِ السَّبِيلِ، وَلَو كَانَ حَيًّا وَأَدرَكَ نُبُوَّتِي، لَاتَّبَعَنِي»[٢].

واته: له جابر رضي الله عنه گێڕدراوه‌ته‌وه، وتویه‌تی: عومه‌ری كوڕی خه‌تتاب رضي الله عنه چوو بۆ لای پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ به نوسخه‌یه‌ك له ته‌وڕاته‌وه‌و وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئه‌وه نوسخه‌یه‌كی ته‌وڕاته،

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

پێغەمبەری خواش ﷺ بێ دەنگ بوو (بێ دەنگ بوونی توڕیی) عومەریش دەستی پێ کرد دەیخوێندەوە و ڕووی پێغەمبەری خواش ﷺ دەگۆڕا (لەبەر توڕەیی)، ئەبو بەکر (لەوێ بوو) وتی: (ئەی عومەر) ئەوانەی دەلاوێنەوە لاوانەت بۆ بکەن (ڕۆلە ڕۆت بۆ بکەن) نابینی چ لە ڕووخساری پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە (ڕووی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنە)؟ عومەریش سەیری ڕووی پێغەمبەری خوای ﷺ کردو وتی: پەنا دەگرم بەخوا لە توڕەبوونی خواو توڕەبوونی پێغەمبەرەکەی ﷺ، ڕازی بووین بەوەی "الله" خوامان بێت و "ئیسلام" دینمان بێت و "موحەممەد" پێغەمبەرمان بێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ڕازی بووین بەوەی "الله" خوامان بێت و "ئیسلام" دینمان بێت و "موحەممەد" پێغەمبەر بێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەگەر مووسا لێتان دەرکەوێ ئەوە دوای دەکەون و وازم لێ دەهێنن، ئەو کاتیش گومڕا دەبن لە ڕێگای ڕاست، وە ئەگەر هاتوو (مووسا) زیندوو بووایە و گەیشتبێ بە (زەمانی) پێغەمبەرایەتیەکەم ئەوە دوام دەکەوت و دەبووە شوێنکەوتەی من (کەواتە: ئێوە چۆن واز لە قورئان دەهێنن و دەچنە لای تەوراتێک کە دەسکاری کراوە؟!).

٤٥١- «عَن أَبِي رَبَاحٍ قَالَ: رَأَى سَعِيدُ بنُ المُسَيَّبِ رَجُلاً يُصَلِّي بَعدَ العَصرِ الرَّكعَتَينِ يُكَبِّرُ، فَقَالَ لَهُ يَا أبا مُحَمَّدٍ: أَيُعَذِّبُنِي اللهُ عَلَى الصَّلاَةِ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِن يُعَذِّبُكَ اللهُ بِخِلاَفِ السُّنَّةِ»[1].

واتە: لە ئەبو ڕەباحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سەعیدی کوڕی موسەییب پیاوێکی بینی لە پاشی نوێژی عەسر زۆر نوێژی سوننەتی دەکرد، دوو ڕەکعەت، دوو ڕەکعەت، وە وتی: ئەی باوکی موحەممەد (ئەی سەعیدی کوڕی موسەییب) ئایا خودا سزام دەدات لەسەر نوێژ کردن؟ سەعید وتی: نەخێر (سزات نادات لەسەر نوێژ کردن) بەڵام خودا سزات دەدات لەسەر سەرپێچی کردنی سوننەت (واتە: نوێژ کردن خۆی خراپ نیە، بەڵام حەڕام کراوە لەپاشی عەسر، کەواتە: سزایەکە لەبەر نوێژ کردن نیە، لەبەر سەرپێچی کردنی فەرمانی پێغەمبەری خوایە ﷺ بە ئەنجامدانی نوێژ لەو کاتەدا).

## بابەت: زوو سزادانی کەسێک کە فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوای ﷺ پێ بگات و بە گەورەی نەزانێت و ڕێزی لێ نەگرێت

٤٥٢- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: بَينَمَا رَجُلٌ يَتَبَختَرُ فِي بُردَينِ، خَسَفَ اللهُ بِهِ الأَرضَ، فَهُوَ يَتَجَلجَلُ فِيهَا إِلَى يَومِ القِيَامَةِ فَقَالَ لَهُ فَتًى قَد سَمَّاهُ وَهُوَ فِي حُلَّةٍ لَهُ: يَا أبا هُرَيرَةَ، أَهَكَذَا كَانَ يَمشِي ذَلِكَ الفَتَى الَّذِي خُسِفَ بِهِ؟ ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدِهِ، فَعَثَرَ عَثرَةً كَادَ يَتَكَسَّرُ مِنهَا، فَقَالَ أَبُو هُرَيرَةَ: لِلمَنخَرَينِ، وَلِلفَمِ، ﴿ إِنَّا كَفَيۡنَٰكَ ٱلۡمُسۡتَهۡزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾ الحجر»[2].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: لە کاتێکدا پیاوێک (لە بەنی ئیسرائیل) دوو پارچە جلی (گرانبەهای) لەبەردابوو بە فیزەوە ڕێی دەکرد،

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ صحيح.

خوا لە زەوی بردە خوارەوە و، جا بەردەوام لە زەوی دەچێتە خوارەوە تا ڕۆژی دوایی، جا گەنجێک کە جلێکی نوێ و جوانی لەبەردا بوو ئەبو هوڕەیرە ناوەکەشی هێنا (بە فیزەوە) بە ئەبو هوڕەیرەی وت: ئەی ئەبو هوڕەیرە ئایا ئەو گەنجەی ڕۆچێنرا (ڕۆ چوو) لە زەویدا بەو شێوەیە دەڕۆیشت؟ دواتر نمایشی بە دەستی کرد (لاسایی گەنجەکەی دەکردەوە بە گاڵتە پێ کردن)، لە ناکاو سەدمەیەکی کرد نزیک بوو بە هۆیەوە شوێنێکی بشکێ (ئازارێکی یەکجار زۆری پێ گەیشت)، ئەبو هوڕەیرە وتی: دەی کونە لوت و دەمی بگرێتەوە (واتە: دەی بەسەر لوت و دەمیدا بکەوێ و دەم و لوتی بشکێ)، (خوا ڕاستی فەرمووە): ﴿إِنَّا كَفَيْنَاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ ﴿٩٥﴾﴾الحجر، واتە: [بەڕاستی ئێمە گاڵتەچیانمان لە کۆڵ کردیتەوە].

٤٥٣- «عَن خِرَاشِ بنِ جُبَيرٍ، قَالَ: رَأَيتُ فِي المَسجِدِ فَتًى يَخذِفُ فَقَالَ لَهُ شَيخٌ، لاَ تَخذِف، فَإِنِّي سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى عَنِ الخَذفِ فَغَفَلَ الفَتَى، وَظَنَّ أَنَّ الشَّيخَ لاَ يَفطِنُ لَهُ، فَخَذَفَ، فَقَالَ لَهُ الشَّيخُ، أُحَدِّثُكَ أَنِّي سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَنهَى عَنِ الخَذفِ ثُمَّ تَخذِفُ؟ وَاللهِ لاَ أَشهَدُ لَكَ جَنَازَةً، وَلاَ أَعُودُكَ فِي مَرَضٍ، وَلاَ أُكَلِّمُكَ أَبَدًا فَقُلتُ لِصَاحِبٍ لِي يُقَالُ لَهُ مُهَاجِرٌ: انطَلِق إِلَى خِرَاشٍ فَاسأَلهُ، فَأَتَاهُ، فَسَأَلَهُ عَنهُ فَحَدَّثَهُ »[١].

واتە: لە خیراشی کوڕی جوبەیر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گەنجێکم بینی لە مزگەوت وردە بەردی بە پەنجەکانی دەهاویشت، کەسێکی بەتەمەنیش پێی وت: ئاوا وردە بەرد مەهاوێژە، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە نەهی کردوە لە هاویشتنی وردە بەرد (بەو شێوەیە)، (تۆزێکی پێچوو) گەنجەکە گومانی برد کە بە تەمەنەکە ئاگای لێ نیە بۆیە (دووبارە) هاویشتی، کەسە بە تەمەنەکە پێی وت: ئەوە بۆت دەگێڕمەوە کە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە نەهی دەکات لە هاویشتنی وردە بەرد، دواتر هەر دەیهاوێژی؟! سوێند بە خوا (ئەگەر بمری) ئامادەی جەنازەکەت نابم و سەردانت ناکەم لە نەخۆشیدا و هەرگیز قسەشت لەگەڵ ناکەم (چونکە بە سوک سەیری فەرموودەی پێغەمبەری خوا دەکەی).

(ڕاویەکە دەڵێ): بە هاوڕێیەکم وت کە ناوی موهاجیر بوو: بڕۆ بۆ لای خیڕاش و پرسیاری ئەو فەرموودەی لێ بکە، (ئەویش) پرسیاری لێ کرد و (خیڕاش)یش بۆی گێڕایەوە.

٤٥٤- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الخَذفِ، وَقَالَ: إِنَّهَا لاَ تَصطَادُ صَيدًا، وَلاَ تَنكَأُ، عَدُوًّا، وَلَكِنَّهَا تَكسِرُ السِّنَّ وَتَفقَأُ العَينَ فَرَفَعَ رَجُلٌ بَينَهُ وَبَينَ سَعِيدٍ قَرَابَةٌ شَيئًا مِنَ الأَرضِ فَقَالَ: هَذِهِ؟ وَمَا تَكُونُ هَذِهِ؟ فَقَالَ سَعِيدٌ: أَلاَ أُرَانِي أُحَدِّثُكَ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ، ثُمَّ تَهَاوَنُ بِهِ، لاَ أُكَلِّمُكَ أَبَدًا»[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە وردە بەرد و شت هاویشتن بە پەنجەکان و فەرموویەتی: ئەوە ئەو بەرد هاویشتنە هیچ نێچیرێک

---

(١) ـ إسناده ضعيف، إلا أن الحديث صحيح لغيره.

(٢) ـ صحيح.

ڕاو ناکات و هیچ دوژمنێک ناکوژێت و نابڕێت، بەڵکو ددان دەشکێنێ و چاو دەڕژێنێ، جا پیاوێکیش هەڵسا کە خزمایەتی لە نێوان خۆی و سەعید هەبوو، شتێکی لە زەوی هەڵگرتەوەو (هاویشتی) و وتی: ئەوە؟ جا ئەوە چیە؟! سەعیدیش وتی: ئایا نامبینی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆت دەگێڕمەوە کەچی دواتر گاڵتەی پێ دەکەیت و (بە پوچی دەزانی)؟! هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم.

سەرنج: دروستە قسە لەگەڵ کەسێک بپچڕێنرێ کە بیدعەکارە، بەڵام بە میزاج نا وەکو ئەمڕۆ هەموو شتێک بکرێ بە بیدعە و، بکرێتە بەهانەی پچڕاندنی پەیوەندی (ئەمە لێرەدا جێگای نابێتەوە)، بەڵام لەم فەرموودەدا بیدعەکە زۆر ڕوونە، ئەم پیاوە گاڵتەی بە بڕیاری پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە، ئەوەش یەکێکە لە گەورەترین بیدعەکان و گوناهە گەورەکان.

٤٥٥- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ بُرَيدَةَ، قَالَ: رَأَى عَبدُ اللهِ بنُ مُغَفَّلٍ ﷺ رَجُلاً مِن أَصحَابِهِ يَخذِفُ، فَقَالَ: لاَ تَخذِف، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَنهَى عَنِ الخَذفِ أَو كَانَ يَكرَهُ الخَذفَ، وَقَالَ: إِنَّهُ لاَ يُنكَأُ بِهِ عَدُوٌّ، وَلاَ يُصَادُ بِهِ صَيدٌ، وَلَكِنَّهُ قَد يَفقَأُ العَينَ، وَيَكسِرُ السِّنَّ ثُمَّ رَآهُ بَعدَ ذَلِكَ يَخذِفُ، فَقَالَ لَهُ: أَلَم أُخبِركَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَنهَى عنهُ، ثُمَّ أَرَاكَ تَخذِفُ، وَاللهِ لاَ أُكَلِّمُكَ أَبَدًا»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ بینی پیاوێک لە هاوڕێکانی شت دەهاوێژێ بە پەنجەکانی، عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل وتی: شت مەهاوێژە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە شت هاویشتن ـ یان (وتی:) شت هاویشتنی پێ خراپ بووە و ـ فەرموویەتی: ئەو شت هاویشتنە هیچ دوژمنێکی پێ لەناوناچێ و هیچ نێچیرێکی پێ ڕاو ناکرێت، بەڵکو ددان دەشکێنێ، دواتر عەبدوڵڵا بینی (هەمان کەسەکە) شتی دەهاویشت، عەبدوڵڵاش پێی وت: ئایا پێم ڕانەگەیاندی کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێ کردوە، کەچی دواتر دەتبینم شت دەهاوێژی (بە پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ)؟! سوێند بە خوا هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم.

٤٥٦- «عَن قَتَادَةَ، قَالَ: حَدَّثَ ابنُ سِيرِينَ، رَجُلاً بِحَدِيثٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ رَجُلٌ: قَالَ فُلاَنٌ: كَذَا وَكَذَا- فَقَالَ ابنُ سِيرِينَ، أُحَدِّثُكَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، وَتَقُولُ: قَالَ فُلاَنٌ وَفُلاَنٌ: كَذَا وَكَذَا، لاَ أُكَلِّمُكَ أَبَدًا»[2].

واتە: لە قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو سیرین فەرموودەیەکی لە پێغەمبەر ﷺ بۆ پیاوێک گێڕایەوە، پیاوێکیش وتی: (دەنا دەربارەی ئەو مەسەلە) فڵان وتویەتی: ئاواو ئاوا، ئیبنو سیرینیش وتی: فەرموودەی پێغەمبەرت ﷺ بۆ دەگێڕمەوەو تۆش دەڵێی: فڵان و فڵان ئاواو ئاوای وتووە، هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم.

---

(١) ـ صحيح.

(٢)ـ أثر صحيح لغيره.

**٤٥٧- «عَنِ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا استَأذَنَت أَحَدَكُمُ امرَأَتُهُ إِلَى المَسجِدِ، فَلاَ يَمنَعهَا، فَقَالَ فُلاَنُ بنُ عَبدِ اللهِ: إِذًا وَاللهِ أَمنَعُهَا، فَأَقبَلَ عَلَيهِ ابنِ عُمَرَ فَشَتَمَهُ شتمةً لَم أَرَهُ شتمها أَحَدًا قَبلَهُ، ثُمَّ قَالَ: أُحَدِّثُكَ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ وَتَقُولُ: إِذًا وَاللهِ أَمنَعُهَا»[١].**

واتە: لە ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خێزانی یەکێک لە ئێوە داوای مۆڵەت و ئیزنی لێ کردن کە بچێت بۆ مزگەوت ئەوە ڕێگری لێ مەکەن، جا بیلالی کوڕی عەبدوڵلا وتی: سوێند بەخوا من ڕێگری لێ دەکەم (ناهێڵم خێزانم بچێتە مزگەوت)، ئیبنو عومەریش ڕووی تێکرد و قسەیەکی خراپی پێ وت، هەرگیز نەمبینی بوو پێشتر ئەو قسەیە بە کەسێک بڵێت، دواتر وتی: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموودەت بۆ دەگێڕمەوە و تۆش دەڵێی: کەواتە سوێند بە خوا ڕێگری لێ دەکەم؟!

**٤٥٨- «عَن أَبِي المُخَارِقِ، قَالَ: ذَكَرَ عُبَادَةُ بنُ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَن دِرهَمَينِ بِدِرهَمٍ، فَقَالَ فُلاَنٌ: مَا أَرَى بِهَذَا بَأسًا: يَدًا بِيَدٍ فَقَالَ عُبَادَةُ: أَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ، وَتَقُولُ: لاَ أَرَى بِهِ بَأسًا، وَاللهِ لاَ يُظِلُّنِي وَإِيَّاكَ سَقفٌ أَبَدًا »[٢].**

واتە: لە ئەبو موخاریقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ باسی ئەوەی کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە (گۆڕینەوەو وەرگرتنی) دوو درهەم بە درهەمێک، پیاوێکیش وتی: من هیچ کێشەیەک لەوەیا نابینم (ئەگەر) دەست بە دەست بێت، عوبادە وتی: من دەڵێم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی و تۆش دەڵێی: من هیچ کێشەیەک لەوەیا نابینم؟! سوێند بەخوا هەرگیز بانێک و سەقفێک سێبەر لە من و تۆ ناکات (واتە هەرگیز من و تۆ لەیەک شوێن کۆنابینەوە، نایێم بۆ شوێنێک تۆی لێ بێت).

**٤٥٩- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ تَطرِقُوا النِّسَاءَ لَيلاً قَالَ وَأَقبَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَافِلاً، فانسلَ رَجُلاَنِ إِلَى أَهلَيهِمَا، فَكِلاَهُمَا وَجَدَ مَعَ امرَأَتِهِ رَجُلاً»[٣].**

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاوەتەوە فەرموویەتی: مەچوونەوە لای خێزانەکانتان بە شەو (کە لە سەفەر دەگەڕێنەوە)، پێغەمبەری خواش ﷺ (شەوێکیان لەگەڵ هاوەڵانی) گەڕایەوە (نزیک شارو نەچوونەماڵەوە) دوو پیاو بە پەلەو بە پەنهانی بە شەو چوونەوە ماڵەکانیان و هەردووکیان پیاویان بینی لەگەڵ خێزانەکانیان.

سەرنج: لێرەدا حیکمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەکەوێ کە بریتیە لە پاراستنی مسوڵمانان لە تاوان، یان تاوانی گەورەتر، یان پاراستنیان لە هەڵە، چونکە جاری وا هەیە کە پیاوەکە دەگەڕێتەوە ڕەنگە برای

---

(١) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح لغيره.

(٢) ـ إسناده ضعيف جداً.

(٣) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح لغيره.

ژنەکە، یان باوکی هاتبێتە میوانداری و پیاوەکە بە بێگانە تێی بگات و بە پەلە بیکوژێت، یان ڕەنگە پیاوێک دەست درێژی کردبێتە سەر خێزانەکەی و لەو حاڵەتە بەشێک لە کارەکە ببینێت و ژنەکەشی بکوژێت کە تاوانی نیە، یان ڕەنگە کچێکی خۆی لەگەڵ کوڕێک ببینێ قسە بکەن یان کاری نەشیاو بکەن ئەویش بیان کوژێت کە هیچیان کوشتنیان لەسەر نیە لە ڕووی شەرعی (ئەگەر خاوەن هاوسەر نەبن)، کەواتە پەنا بەخوا کەس گومانی ئەوە نەبێت پێغەمبەری خوا ﷺ بیەوێ مۆڵەت بە ئافرەتان بدات کاری خراپ ئەنجام بدەن، جا هەرچەندە فەرموودەکە گشتیە بۆ هەموو مسوڵمانان، بەڵام دەکرێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕێگەی وەحیەوە زانیبێتی خێزانەکانی ئەم دوو پیاوە تووشی هەڵەیەکی ئاوا بوون بۆیە ویستویەتی ئەم دوو پیاوە نەچنەوە ماڵەوە تا هیچ لایێک حەیایان نەچێت و تووشی لێک ترازان و کوشتن و هەڵەی گەورەتر نەبن و بەڵکو دووبارەی نەکەنەوە و خوا لێیان خۆش ببێت و کارەکە بشاردرێتەوە و فیتنەی گەورەتری لێ دروست نەبێت، بەڵام دوو پیاوەکە بە قسەی پێغەمبەری خوایان ﷺ نەکرد، بۆیە هەموو خەڵکی زانیان خێزانەکانی ئەم دووانە پیاوی بێگانە چۆتە لایان، ئەوەش بە زیانێکی گەورەتر گەڕایەوە بۆ دوو پیاوەکە، کەواتە: گومان نیە هەر کەسێك سەرپێچی فەرمانی ڕەسول الله ﷺ بکات حەتمەن زیان دەکات.

**٤٦٠-** «عَن سَعِيدِ بنِ المُسَيَّبِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا قَدِمَ مِن سَفَرٍ نَزَلَ المُعَرَّسَ، ثُمَّ قَالَ: لاَ تَطرقوا النِّسَاءَ لَيلاً، فَخَرَجَ رَجُلاَنِ مِمَّن سَمِعَ مَقَالَتَهُ، فطَرقا أهلهما، فَوَجَدَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنهُمَا مَعَ امرَأَتِهِ رَجُلاً»[١].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییب گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لە سەفەرێک گەڕابایەوە ئەوە لە موعەڕڕەس (کە شوێنێکە لە دەرەوەی مەدینە) دەمایەوەو لەوێ دەگیرسایەوە، دواتر فەرمووی: مەگەڕێنەوە لای خێزانەکانتان بە شەو، دوو پیاو دەرچوون (لە شوێنەکە) لەو کەسانەی گوێیان لە فەرمایشتەکەی بوو، چوونەوە بۆ لای ماڵەکانیان و هەردووکیان پیاویان بینی لەگەڵ خێزانەکانیان.

**٤٦١-** «حَدَّثَنَا عَبدُ الرَّحمَنِ بنُ حَرمَلَةَ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى سَعِيدِ بنِ المُسَيَّبِ يُوَدِّعُهُ بِحَجٍّ أَو عُمرَةٍ فَقَالَ لَهُ: لاَ تَبرَح حَتَّى تُصَلِّيَ، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: لاَ يَخرُجُ بَعدَ النِّدَاءِ مِنَ المَسجِدِ إلاَّ، مُنَافِقٌ، إلاَّ رَجُلٌ أَخرَجَتهُ حاجةٌ، وَهُوَ يُرِيدُ الرَّجعَةَ إِلَى المَسجِدِ، فَقَالَ: إِنَّ أَصحَابِي بِالحَرَّةِ قَالَ: فَخَرَجَ، قَالَ: فَلَم يَزَل سَعِيدٌ يَولَعُ بِذِكرِهِ، حَتَّى أُخبِرَ أَنَّهُ وَقَعَ مِن رَاحِلَتِهِ فَانكَسَرَت فَخِذُهُ»[٢].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمان کوڕی حەرمەلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هات بۆ لای سەعیدی کوڕی موسەییب و ماڵ ئاوایی لێ دەکرد بۆ چوونە حەج یان عومرە، سەعید پێی وت: مەڕۆ تا نوێژ دەکەیت (ئەوە کاتی نوێژە)، چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: کەس لە مزگەوت دەرناچێت پاشی بانگ جگە لە کەسی دوو ڕوو (مونافیق)، یان پیاوێک کە کارێکی پێویست بیباتە

---

(١) ـ مرسل، وإسناده حسن.

(٢) ـ إسناده حسن.

دەرەوەو ئەویش بیەوێ (زوو كارەكەی بكات و) بگەڕێتەوە بۆ مزگەوت، پیاوەكە وتی: هاوڕێكانم لە حەڕڕەن (حەڕڕە شوێنێكە، واتە بەڕێ كەوتوون بۆ سەفەرو دەبێ بیانگەمێ، ئەو بەهانەیەی هێنایەوە)، دەڵێ: كابرا دەرچوو و ڕۆیشت (لە مزگەوت دەرچوو پێش ئەوەی نوێژ بكات)، عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: سەعید بە بەردەوامی پرسیاری حاڵی كابرای دەكرد (چونكە چاوەڕێی دەكرد بەڵایێكی بەسەر بێت، لەبەر سەرپێچی كردنی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ)، تاوەكو (سەعید) هەواڵی پێ گەیشت كە (كابرا) لە وڵاغەكەی كەوتۆتە خوارو ڕانی شكاوە.

## بابەت: دەربارەی ئەوانەی پێیان خراپ بووە كە خەڵک بێزار بكرێ

٤٦٢- «عَن عَبدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: لاَ تُمِلُّوا النَّاسَ»[١].

واتە: لە عەبدوڵلا ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خەڵک بێزار و بێ تاقەت مەكەن.

٤٦٣- «عَن عَبدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: إِنَّ لِلقُلُوبِ لَنَشَاطًا وَإِقبالاً، وَإِنَّ لَهَا تَولِيَةً وَإِدبَارًا، فَحَدِّثُوا النَّاسَ مَا أَقبَلُوا عَلَيكُم»[٢].

واتە: لە عەبدوڵلا ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە دڵنیایی دڵەكان چالاكی و وەرگرتنیان هەیە، هەروەها پشت تێ كردن و پشت هەڵكردنیشیان هەیە، كەواتە قسە بۆ خەڵكی بكەن ئەو كاتەی ڕووتان تێ دەكەن و توانای وەرگرتنیان هەیە.

٤٦٤- «حَدَّثَنَا أَبُو هِلاَلٍ، قَالَ: سَمِعتُ الحَسَنَ يَقُولُ: كَانَ يُقَالُ: حَدِّثِ القَومَ مَا أَقبَلُوا عَلَيكَ بِوُجُوهِهِم، فَإِذَا التَفَتُوا، فَاعلَم أَنَّ لَهُم حَاجَاتٍ»[٣].

واتە: لە ئەبو هیلالەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە حەسەن بوو دەیوت: وتراوە قسە بۆ خەڵكی بكە تا ئەو كاتەی ڕووت تێ دەكەن بە ڕوخساریان، جا ئەگەر ئاوڕیان دایەوە (بۆ ئەملاولا) ئەوە بزانە بە دڵنیایی كاریان هەیە (نایانەوێ زیاتر گوێ بگرن و دابنیشن).

## بابەت: دەربارەی ئەوانەی بۆچوونیان لەگەڵ ئەوە نەبووە فەرموودە بنوسرێتەوە

٤٦٥- «عَن أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لاَ تَكتُبُوا عَنِّي شَيئًا إِلاَّ القُرآنَ، فَمَن كَتَبَ عَنِّي شَيئًا غَيرَ القُرآنِ، فَليَمحُهُ»[٤].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث حسن لغيره.

(٣) ـ موقوف بسند حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێک لە منەوە مەنوسنەوە جگە لە قوڕئان، هەر کەسێک شتێکی جگە لە قورئانی لە منەوە نوسیوەتەوە بێ بیسڕێتەوە.

٤٦٦- «عَن أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ ﷺ، أَنَّهُم استَأذَنُوا النَّبِيَّ ﷺ فِي أَن يَكتُبُوا عنهُ، فَلَم يَأذَن لَهُم»[١].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەوان داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە دەربارەی ئەوەی فەرموودەی ئەو بنوسنەوە، (پێغەمبەری خواش ﷺ) ڕێگەی پێ نەداون.

٤٦٧- «عَنِ الشَّعبِيِّ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: يَا شِبَاكُ، أَرُدُّ عَلَيكَ، يَعنِي: الحَدِيثَ؟ مَا أَرَدتُ أَن يُرَدَّ عَلَيَّ حَدِيثٌ قَطُّ»[٢].

واتە: لە شەعبی گێڕدراوەتەوە، هەموو جار دەیوت: ئەی شیباک (شیباک ناوی هاوەڵێکی شەعبیە) ئایا بۆت دووبارە بکەمەوە واتە: فەرموودە؟! (بۆچی فەرموودەت بۆ دووبارە بکەمەوە؟!)، هەرگیز نەمویستووە فەرموودەیەکم بەسەردا دووبارە بکرێتەوە.

٤٦٨- «أَخبَرَنَا مُحَمَّدُ بنُ أَحمَدَ بنِ أَبِي خَلَفٍ، قَالَ: سَمِعتُ عَبدَ الرَّحمَنِ بنَ مَهدِيٍّ، يَقُولُ: سَمِعتُ مَالِكَ بنَ أَنَسٍ، يَقُولُ: جَاءَ الزُّهرِيُّ بِحَدِيثٍ فَلَقِيتُهُ فِي بَعضِ الطَّرِيقِ، فَأَخَذتُ بِلِجَامِهِ، فَقُلتُ: يَا أَبا بَكرٍ أَعِد عَلَيَّ الحَدِيثَ الَّذِي حَدَّثتَنَا بِهِ، قَالَ: وَتَستَعِيدُ الحَدِيثَ؟ قَالَ: قُلتُ: وَمَا كُنتَ تَستَعِيدُ الحَدِيثَ؟ قَالَ: لاَ- قُلتُ: وَلاَ تَكتُبُ؟ قَالَ: لا»[٣].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئەبو خەلەفەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەهدی بوو دەیوت: گوێم لە مالیکی کوڕی ئەنەس بوو دەیوت: (جارێکیان) زوهری فەرموودەیەکی گێڕایەوە (ئەو کات نەمتوانی لەبەری بکەم)، منیش پێی گەیشتم لە یەکێک لە ڕێگاکان و یەخەم گرت و وتم: ئەی باوکی بەکر (ئەی زوهری) ئەو فەرموودەیەم بۆ دووبارە بکەرەوە کە بۆت گێڕاینەوە، وتی: داوای دووبارەکردنەوەی فەرموودە دەکەیت؟! دەڵێ وتم: بۆ تۆ داوای دووبارە کردنەوەی فەرموودە ناکەیت؟ وتی: نەخێر، وتم: ناشی نوسیەوە؟ وتی: نەخێر (واتە: یەک جار گوێی بۆ دەگرێت و لەبەری دەکات، دەبێ هەر ئاواش بێت، تاوەکو ئەو کەسانەی فەرموودە دەگێڕنەوە بەهێزترین لەبەر کردنیان هەبێت).

٤٦٩- «عَنِ الأَوزَاعِيِّ، قَالَ: كَانَ قَتَادَةُ يَكرَهُ الكِتَابَةَ، فَإِذَا سَمِعَ وَقعَ الكِتَابِ، أَنكَرَهُ وَالتَمَسَهُ بِيَدِهِ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ أثر إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە ئەوزاعی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قەتادە نوسینەوەی پێ ناخۆش بووە، جا ئەگەر گوێی لە دەنگی خشەی نوسین بووایە ڕێگری لێ دەکرد و بە دەستی خۆی نوسراوەکەی وەردەگرت (لە کەسەکەی دەسەند).

تێبینی: قەتادە دواتر لەو بۆچوونەی پاشگەز بۆتەوە، والله أعلم.

٤٧٠- «أَخبَرَنَا أَبُو المُغِيرَةِ، قَالَ: كَانَ الأَوزَاعِيُّ يَكرَهُهُ»(١).

واتە: لە ئەبو موغیرە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەوزاعی نوسینەوەی پێ ناخۆش بووە.

٤٧١- «عَن مَنصُورٍ، أَنَّ إِبرَاهِيمَ كَانَ يَكرَهُ الكِتَابَ، يَعنِي العِلمَ»(٢).

واتە: لە مەنصورڕ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبراهیم پەرتوکی پێی ناخۆش بووە، واتە (پەرتوکی) زانست (چونکە باشترین زانست ئەوەیە کە لە دەمی زانایان وەردەگیرێ و ڕاستەوخۆ لەبەر دەکرێ، ئاوا فێرخواز گرنگی زیاتری پێ دەدات، چونکە دەزانێ بۆی دووبارە نابێتەوە).

٤٧٢- «عَنِ ابنِ سِيرِينَ، قَالَ: لَو كُنتُ مُتَّخِذًا كِتَابًا، لَاتَّخَذتُ رَسَائِلَ النَّبِيِّ ﷺ »(٣).

واتە: لە ئیبنو سیرین گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر کتێبم نوسیبوایەوە ئەوە نامەکانی پێغەمبەرم ﷺ وەردەگرتن و دەم کردن بە کتێب و نوسراو.

٤٧٣- «عَنِ ابنِ عَونٍ، قَالَ: رَأَيتُ حَمَّادًا يَكتُبُ عِندَ إِبرَاهِيمَ، فَقَالَ لَهُ إِبرَاهِيمُ أَلَم أَنهَكَ؟ قَالَ: إِنَّمَا هِيَ أَطرَافٌ»(٤).

واتە: لە ئیبنو عەون گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: حەممادم بینی لەلای ئیبراهیم نوسینی دەکرد، ئیبراهیم پێی وت: مەگەر ڕێگریم لێ نەکردی (لە نوسینەوە)؟ حەمماد وتی: ئەوە تەنها سەرە دێڕی فەرموودەکانە (بۆ بیرکەوتنەوە دەینوسم).

٤٧٤- «عَن إِبرَاهِيمَ قَالَ: قَالَ لِي عَبِيدَةُ لاَ تُخَلِّدَنَّ بِي كِتَابًا»(٥).

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبیدە پێی وتووم: بەهۆی منەوە پەرتوکێک هەتا هەتایێ مەهێڵەوە (واتە: وام لێ مەکە شت بنوسم و پەرتوکەکە وەک قورئان هەتا هەتایێ بمێنێتەوە، ئەوەم پێ خۆش نیە).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

٤٧٥- «عَن هِشَامٍ، قَالَ: مَا كَتَبتُ عَن مُحَمَّدٍ، إلاَّ حَدِيثَ الأَعمَاقِ، فَلَمَّا حَفِظتُهُ، مَحَوتُهُ»[١].

واتە: لە هیشام گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ فەرموودەیەکم لە موحەممەدەوە (کە یەکێک بووە لە ڕاویەکان)، نەنوسیوەتەوە جگە لە فەرموودەی ئەعماق (کە فەرموودەیەکی درێژە باسی شەڕی نێوان سوپای ڕۆم و سوپای ئیسلام دەکات لە دابق لە کۆتا زەمان)، دوای ئەوەی لەبەرم کرد سڕیمەوە.

٤٧٦- «أَخبَرَنَا مَروَانُ بنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: سَمِعتُ سَعِيدَ بنَ عَبدِ العَزِيزِ، يَقُولُ: مَا كَتَبتُ حَدِيثًا قَطُّ»[٢].

واتە: لە مەڕوانی کوڕی موحەممەد گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە سەعیدی کوڕی عەبدولعەزیز بوو دەیوت: هەرگیز یەک فەرموودەشم نەنوسیوەتەوە.

٤٧٧- «عَن إبرَاهِيمَ قَالَ: مَا كَتَبتُ شَيئًا قَطُّ»[٣].

واتە: لە ئیبڕاهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەرگیز هیچ شتێکم نەنوسیوەتەوە (تەنها لەبەرم کردووە).

٤٧٨- «عَن إبرَاهِيمَ، قَالَ: سَأَلتُ عَبِيدَةَ قِطعَةَ جِلدٍ أَكتُبُ فِيهِ، فَقَالَ يَا إبرَاهِيمُ لاَ تُخَلِّدَنَّ عَنِّي كِتَابًا»[٤].

واتە: لە ئیبڕاهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: داوام لە عەبیدە کرد پارچە پێستێکم پێ بدات تا تیایدا بنوسم، وتی: ئەی ئیبڕاهیم هیچ پەرتوکێک لە منەوە هەتا هەتایی مەهێڵەوە (واتە: پەرتوکێک مەنوسەوە زانستەکەی هی من بێت و هەتا هەتایی بە ناوی منەوە بمێنێتەوە).

٤٧٩- «أَخبَرَنَا عَبدُ اللهِ، حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ، حَدَّثَنَا شُعبَةُ، عَنِ الحَكَمِ، عَن إبرَاهِيمَ عَن عَبِيدَةَ مِثلَهُ»[٥].

واتە: لە ڕێگایێکی ترەوە هەمان وتە گێڕدراوەتەوە.

٤٨٠- «عَن إبرَاهِيمَ أَنَّهُ كَانَ يَكرَهُ أَن يُكتَبَ الحَدِيثُ فِي الكَرَارِيسِ وَيَقُولُ: يُشَبَّهُ بِالمَصَاحِفِ»[٦].

واتە: لە ئیبڕاهیم گێڕدراوەتەوە کە پێی ناخۆش بووە فەرموودە لە نامیلکەو پەرتوک و پەڕاو بنوسرێتەوەو دەیوت: بە قورئان دەچوێنرێ (وەکو قورئانی لێ دێ، بەڵام ئەگەر لە شێوەی قورئان نەبووایە پێی ئاسایی بووە).

٤٨١- «قَالَ يَحيَى: وَجَدتُ فِي كِتَابِي عَن زِيَادٍ الكَاتِبِ، عَن أَبِي مَعشَرٍ: فَاكتُب كَيفَ شِئتَ»[٧].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

(٦) ـ إسناده حسن.

(٧) ـ إسناده صحيح.

واتە: یەحیا وتویەتی: لە کتێبی خۆمدا هەیە لە زیادی کاتیبەوە گێڕدراوەتەوە ئەویش لە ئەبو مەعشەرەوە گێڕاویەتیەوە وتویەتی: بنوسە هەر چۆنێک پێت خۆشە (واتە: نوسینەوەی پێ ئاسایی بووە).

٤٨٢- «عَن نُعمَانَ بنِ قَيسٍ، أَنَّ عَبِيدَةَ، دَعَا بِكُتُبِهِ، فَمَحَاهَا عِندَ المَوتِ، وَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ أَن يَلِيَهَا قَومٌ، فَلاَ يَضَعُونَهَا مَوَاضِعَهَا»[١].

واتە: لە نوعمانی کوڕی قەیسەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبیدە داوای کتێبەکانی خۆی کرد و هەمووی سڕیەوە لە کاتی مردن و وتی: من دەترسم دوای ئەم پەرتوکانە خەڵکانێک بێن وەک پێویست حیسابی بۆ نەکەن و لە مەڕتەبەی خۆی دانەنێن.

٤٨٣- «عَن مُجَاهِدٍ، أَنَّهُ كَرِهَ أَن يُكتَبَ العِلمُ فِي الكَرَارِيسِ»[٢].

واتە: لە موجاهید گێڕدراوەتەوە، کە پێی ناخۆش بووە زانست بنوسرێتەوە لە نامیلکەو پەرتوکدا.

٤٨٤- «عَنِ الأَوزَاعِيِّ، قَالَ: مَا زَالَ هَذَا العِلمُ عَزِيزًا، يَتَلَقَّاهُ الرِّجَالُ، حَتَّى وَقَعَ فِي الصُّحُفِ، فَحَمَلَهُ أَو دَخَلَ فِيهِ غَيرُ أَهلِهِ»[٣].

واتە: لە ئەوزاعی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە بەردەوامی ئەم زانستە گەورەیە کە پیاوان لە یەکتری وەری دەگرن، تا ئەو کاتەی دەکەوێتە ناو پەرتوک، ئەو کات کەسانی ناشایستە هەڵی دەگرن یان دەکەونە ناوی.

٤٨٥- «عَن يُونُسَ، قَالَ: كَانَ الحَسَنُ يَكتُبُ وَيُكتِبُ وَكَانَ ابنُ سِيرِينَ لاَ يَكتُبُ وَلاَ يُكتِبُ»[٤].

واتە: لە یونس گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: حەسەن[٥] دەینوسی و ڕێگاشی دەدا بنوسرێتەوە، ئیبنو سیرینیش نەیدەنووسی و ڕێگاشی نەدەدا بنوسرێتەوە.

٤٨٦- «عَن إِبرَاهِيمَ التَّيمِيِّ، قَالَ: بَلَغَ ابنَ مَسعُودٍ ﷺ، أَنَّ عِندَ نَاسٍ كِتَاباً يُعجَبُونَ بِهِ، فَلَم يَزَل بِهِم حَتَّى أَتَوهُ بِهِ، فَمَحَاهُ ثُمَّ قَالَ: إِنَّمَا هَلَكَ أَهلُ الكِتَابِ قَبلَكُم، أَنَّهُم أَقبَلُوا عَلَى كُتُبِ عُلَمَائِهِم، وَتَرَكُوا كِتَابَ رَبِّهِم»[٦].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو مەسعود ﷺ پێی گەیشت کە پەرتوکێک لەلای هەندێ خەڵک هەیە پێی سەرسامن، ئەویش بەردەوام بەدوایانەوە بوو و تاقیبی دەکردن تاوەکو بۆیان هێناو

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ الحسن البصري.

(٦) ـ إسناده صحيح.

سڕیەوە، دواتر وتی: ئەهلی كیتاب پێش ئێوە لەناوچوون تەنها لەبەر ئەوەی ڕوویان كردە پەرتوكی زانایان و وازیان هێنا لە پەرتووكی پەروەردگاریان.

٤٨٧- «عَن مُحَمَّدٍ، قَالَ: قُلتُ لِعَبِيدَةَ أَكتُبُ مَا أَسمَعُ مِنكَ، قَالَ: لاَ، قُلتُ: فَإِن وَجَدتُ كِتَاباً أَقرَؤُهُ، قَالَ: لاَ»[١].

واتە: لە موحەممەد گێردراوەتەوە، وتویەتی: بە عەبیدەم وت: ئایا ئەوەی لە تۆم گوێ لێ دەبێت بینوسمەوە؟ وتی: نەخێر، وتم: ئەگەر كتابێكم دەست كەوت بیخوێنمەوە؟ وتی: نەخێر (چونكە ویستویەتی جارێ خۆی لە قورئان و فەرموودە شارەزا بكات).

٤٨٨- «عَن أَبِي نَضرَةَ، قَالَ: قُلتُ لِأَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ ﷺ: أَلاَ تُكتِبُنَا، فَإِنَّا لاَ نَحفَظُ؟ فَقَالَ: لاَ، إِنَّا لَن نُكتِبَكُم، وَلَن نَجعَلَهُ قُرآنًا، وَلَكِنِ احفَظُوا عَنَّا، كَمَا حَفِظنَا نَحنُ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ»[٢].

واتە: لە ئەبو نەضرە گێردراوەتەوە، وتویەتی: بە ئەبو سەعیدی خودریم ﷺ وت: ئایا بۆمان نانوسیەوە؟ چونكە ئێمە لەبەری ناكەین، وتی: نەخێر، ئێمە بۆتان نانوسین و نایكەینە قورئان، بەڵكو لە ئێمەوە لەبەری بكەن وەک چۆن ئێمە لەبەرمان كرد لە پێغەمبەری خواوە ﷺ.

٤٨٩- «عَنِ الأَوزَاعِيِّ، قَالَ: سَمِعتُ أَبا كَثِيرٍ، يَقُولُ: سَمِعتُ أَبا هُرَيرَةَ ﷺ، يَقُولُ: إِنَّ أَبا هُرَيرَةَ لاَ يَكتُبُ وَلاَ يُكتِبُ»[٣].

واتە: لە ئەوزاعی گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو كەثیر بوو دەیوت: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیوت: ئەبو هورەیرە نە دەینوسی و نە ڕێگاشی دەدا لەوەوە بنوسرێتەوە.

٤٩٠- «عَن أَبِي بُردَةَ أَنَّهُ كَانَ يَكتُبُ حَدِيثَ أَبِيهِ، فَرَآهُ أَبُو مُوسَى، فَمَحَاهُ»[٤].

واتە: لە ئەبو بوردە گێردراوەتەوە كە هەموو جار فەرموودەكانی باوكی دەنوسیەوە، ئەبو مووساش بینی و سڕیەوە.

٤٩١- «حَدَّثَنِي قُرَيشُ بنُ أَنَسٍ، قَالَ: قَالَ لِي: ابنُ عَونٍ، وَاللهِ مَا كَتَبتُ حَدِيثًا قَطُّ، قَالَ: وقال ابنُ سِيرِينَ لاَ وَاللهِ مَا كَتَبتُ حَدِيثًا قَطُّ»[٥].

واتە: لە قورەیشی كوڕی ئەنەس گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو عەون پێی وتووم: سوێند بە خوا هەرگیز فەرموودەیەكم نەنوسیوەتەوە، ئیبنو سیرینیش وتویەتی: نەخێر سوێند بە خوا هیچ فەرموودەیەكم نەنوسیوەتەوە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ أثر إسناده صحيح.




٤٩٢- «عن زيدِ بنِ ثابتٍ ﷺ أَرَادِنِي مروانُ بنُ الحَكَمِ، وَهُوَ أَمِيرٌ عَلَى المَدِينَةِ، أن أُكتِبَهُ شَيئًا، قَالَ: فَلَم أَفعَل، قَالَ: فَجَعَلَ سِترًا بَينَ مَجلِسِهِ وَبَينَ بَقِيَّةِ دَارِهِ، قَالَ: فَكَانَ أَصحَابُهُ يَدخُلُونَ عَلَيهِ، وَيَتَحَدَّثُونَ فِي ذَلِكَ المَوضِعِ، فَأَقبَلَ مَروَانُ عَلَى أَصحَابِهِ، فَقَالَ: مَا أُرَانَا إلاَّ قَد خُنَّاهُ، ثُمَّ أَقبَلَ عَلَيَّ قَالَ: قُلتُ وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: مَا أُرَانَا إلاَّ قَد خُنَّاكَ، قَالَ: قُلتُ: وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: إِنَّا أَمَرناَ رَجُلاً يَقعُدُ خَلفَ هَذَا السِّترِ فَيَكتُبَ مَا تُفتِي هَؤُلاَءِ وَمَا تَقُولُ»[1].

واتە: لە زەیدی کوڕی ثابیت ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: مەڕوانی کوڕی حەکەم منی دەویست لە کاتێکدا ئەمیری مەدینە بوو تا شتێکی بۆ بنوسم، (زەید) وتی: نەمکرد، وتی: پەردەیەکی لە نێوان مەجلیسەکەی و بەشەکەیتری ماڵەکەی دانا، دەڵێ: هاوڕێ و داروودەستەکەی دەهاتنە لای و لەو شوێنە قسەیان لەگەڵ یەکتری دەکرد، جا مەڕوان ڕووی کردە هاوڕێ و داروودەستەکەی و وتی: نەمان توانی حەتمەن لەبەر ئەوەبوو خیانەتمان لێ کرد، دواتر ڕووی کردە من، دەڵێ منیش وتم: خیانەتەکە چی بوو؟ وتی: نەمانتوانی حەتمەن لەبەر ئەوەبوو خیانەتمان لێ کردی، دەڵێ منیش ووتم: خیانەتەکە چی بوو؟ وتی: ئێمە فەرمانمان بە پیاوێک کرد کە لە دواوەی ئەم پەردەیە دابنیشێت و ئەو قسە و فەتوایانە بنوسێتەوە کە بۆ ئەو خەڵکە دەیدەیت.

٤٩٣- «عَن مَنصُورٍ قَالَ: قُلتُ لِإبرَاهِيمَ: إِنَّ سَالِمًا أَتَمُّ مِنكَ حَدِيثًا؟ قَالَ: إِنَّ سَالِمًا كَانَ يَكتُبُ»[2].

واتە: لە مەنصورِ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە ئیبراهیمم وت: (بۆچی) سالم فەرموودەی لە تۆ چاکترە؟ وتی: ئاخر سالم دەنوسێتەوە (من ناینوسمەوە).

٤٩٤- «عَن عَمرِو بنِ قَيسٍ، قَالَ: وَفَدتُ مَعَ أَبِي إِلَى يَزِيدَ بنِ مُعَاوِيَةَ بِحُوَّارِينَ حِينَ تُوُفِّيَ مُعَاوِيَةُ ﷺ، نُعَزِّيهِ وَنُهَنِّيهِ بِالخِلاَفَةِ، فَإِذَا رَجُلٌ فِي مَسجِدِهَا يَقُولُ: أَلاَ إِنَّ مِن أَشرَاطِ السَّاعَةِ أَن يُرفَعَ الأَشرَارُ، وَيُوضَعَ الأَخيَارُ- أَلاَ إِنَّ «مِن أَشرَاطِ السَّاعَةِ، أَن يَظهَرَ القَولُ وَيُخزَنَ العَمَلُ، أَلاَ إِنَّ مِن أَشرَاطِ السَّاعَةِ، أَن تُتلَى المَثنَاةُ فَلاَ يُوجَدُ مَن يُغَيِّرُهَا، قِيلَ لَهُ: وَمَا المَثنَاةُ؟ قَالَ: مَا استُكتِبَ مِن كِتَابٍ غَيرِ القُرآنِ، فَعَلَيكُم بِالقُرآنِ فَبِهِ هُدِيتُم، وَبِهِ تُجزَونَ، وَعَنهُ تُسأَلُونَ فَلَم أَدرِ مَنِ الرَّجُلُ، فَحَدَّثتُ هَذَا الحَدِيثِ بَعدَ ذَلِكَ بِحِمصَ، فَقَالَ لِي رَجُلٌ مِنَ القَومِ: أَوَ مَا تَعرِفُهُ؟ قُلتُ: لاَ- قَالَ: ذَلِكَ عَبدُ اللهِ بنُ عَمرٍو رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا»[3].

واتە: لە عەمری کوڕی قەیس گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە وەفد لەگەڵ باوکم چووم بۆ لای یەزیدی کوڕی موعاویە ﷺ لە حووارەین (کە گوندێکی شاری حەلەبە) ئەو کاتەی موعاویە کۆچی دوایی کردبوو تا تەعزیەباری بە هۆی مردنی باوکی و پیرۆزبایی خەلیفایەتی لێ بکەین، (بینیمان) پیاوێک لە مزگەوتی حووارەیندا بوو دەیوت: ئاگاداربن، لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە خراپەکارەکان

---

(١) ـ أثر إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

بەرز بكرێنەوە و چاكەكارانیش نزم بكرێنەوە، ئاگاداربن لە نیشانەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە قسەو وتە زۆر دەبێ و كردەوەش كەم دەبێت و، ئاگاداربن لە نیشانەكانی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەوەیە (المَثنَاةُ) بخوێندرێتەوە و كەسێكیش دەست ناكەوێت بیگۆڕێ، وترا: (المَثنَاةُ) چیە؟ وتی: هەر شتێكە كە دەنوسرێتەوە لە كتێب و پەرتوك جگە لە قورئان، دەست بە قورئانەوە بگرن، هەر تەنها بەو ڕێنموییتان وەرگرت و، هەر تەنها بەویش پاداشت دەدرێنەوە.

(عەمری كوڕی قەیس) دەڵێ: نەمزانی ئەو پیاوە كێ بوو، منیش لە پاشان ئەو فەرموودەیەم گێڕایەوە لە حیمص و پیاوێك لە خەڵكەكە پێی وتم: ئایا نەتناسی (پیاوەكەی ئەو فەرموودەیەی باس كرد كێ بوو)؟ وتم: نەخێر، وتی: ئەوە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرٍ بوو (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا).

٤٩٥- «عَن مُرَّةَ الهَمدَانِيِّ، قَالَ: جَاءَ أَبُو قُرَّةَ الكِندِيُّ بِكِتَابٍ مِنَ الشَّامِ، فَحَمَلَهُ فَدَفَعَهُ إِلَى عَبدِ اللهِ بنِ مَسعُودٍ ﷺ، فَنَظَرَ فِيهِ فَدَعَا بِطَستٍ، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ فَمَرَسَهُ فِيهِ، وَقَالَ: إِنَّمَا هَلَكَ مَن كَانَ قَبلَكُم بِاتِّبَاعِهِمُ الكُتُبَ وَتَركِهِم كِتَابَهُم، قَالَ: حُصَينٌ فَقَالَ مُرَّةُ: أَمَا إِنَّهُ لَو كَانَ مِنَ القُرآنِ أَوِ السُّنَّةِ لَم يَمحُهُ، وَلَكِن كَانَ مِن كُتُبِ أَهلِ الكِتَابِ»[1].

واتە: لە موڕڕەی هەمدانی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو قوڕڕەی كیندی نوسراوێكی لە شام هێنا، هەڵیگرت و دای بە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود ﷺ، عەبدوڵڵاش سەیری كرد و داوای تەشتێكی كرد، دواتر داوای ئاوی كرد و نوسراوەكەی لەناو ئاوەكەدا هەڵپشاوت و وتی: ئەوانەی پێش ئێوە لەناوچوون بەهۆی شوێنكەوتنیان بۆ پەرتوكەكان و وازهێنانیان لە پەرتوكەكەیان (كە خودا بۆی ناردبوون)، حوصەین وتی: موڕڕە وتی: ئەگەر نوسراوەكە لە قورئان یان فەرموودە بووایە ئەوە عەبدوڵڵا نەیدەسڕیەوە، بەڵام نوسراوەكە بەشێك بوو لە پەرتوك و نوسراوی ئەهلی كیتاب.

٤٩٦- «عَن يَحيَى بنِ جَعدَةَ، قَالَ أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِكَتِفٍ فِيهِ كِتَابٌ، فَقَالَ: كَفَى بِقَومٍ ضَلاَلاً، أَن يَرغَبُوا عَمَّا جَاءَ بِهِ نَبِيُّهُم، إِلَى مَا جَاءَ بِهِ نَبِيٌّ غَيرُ نَبِيِّهِم، أَو كِتَابٌ غَيرُ كِتَابِهِم، فَأَنزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾العنكبوت»[2].

واتە: لە یەحیای كوڕی جەعدەتە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێسكی پیلێك هێنرا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ كە نوسراوێكی تیا بوو، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەوەندە گومڕاییە بەسە بۆ خەڵكانێك كە پشت بكەنە ئەوەی پێغەمبەرەكەیان هێناویەتی لە پێناوی شتێك كە پێغەمبەرێكی جگە لە پێغەمبەرەكەیان هێناویەتی، یان (ڕوو بكەنە) پەرتوكێك جگە لە پەرتوكەكەیان (كە خودا بۆی ناردوون)، خوا عَزَّ وَجَلَّ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾العنكبوت، واتە: [ئایا بۆ ئەوان بەس نیە كە ئێمە قورئانمان ناردۆتە

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ مرسل، وإسناده صحيح.

خوارەوە بۆ سەر تۆ، دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا، بەڕاستی لەو قورئانەدا بەزەیی و پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ بڕواداران].

٤٩٧- «عَنِ الأَشعَثِ، عَن أَبِيهِ، وَكَانَ مِن أَصحَابِ عَبدِ اللهِ قَالَ: رَأَيتُ مَعَ رَجُلٍ صَحِيفَةً، فِيهَا سُبحَانَ اللهِ، وَالحَمدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكبَرُ، فَقُلتُ لَهُ: أَنسِخنِيهَا، فَكَأَنَّهُ بَخِلَ بِهَا، ثُمَّ وَعَدَنِي أَن يُعطِيَنِيهَا، فَأَتَيتُ عَبدَ اللهِ ﷺ فَإِذَا هِيَ بَينَ يَدَيهِ فَقَالَ: إِنَّ مَا فِي هَذَا الكِتَابِ بِدعَةٌ، وَفِتنَةٌ، وَضَلاَلَةٌ، وَإِنَّمَا أَهلَكَ مَن كَانَ قَبلَكُم هَذَا، وَأَشبَاهُ هَذَا، إِنَّهُم كَتَبُوهَا، فَاستَلَذَّتهَا أَلسِنَتُهُم، وَأُشرِبَتهَا قُلُوبُهُم، فَأَعزِمُ عَلَى كُلِّ امرِئٍ يَعلَمُ مكانَ كِتَابٍ، إِلاَّ دلَ عَلَيهِ، وَأُقسِمُ بِاللهِ، قَالَ: شُعبَةُ فَأَقسَمَ بِاللهِ؟ قَالَ: أَحسَبُهُ أَقسَمَ لَو أَنَّهَا ذُكِرَت لَهُ بِدِيرِ لهندِ نُرَاهُ يَعنِي مَكَانًا بِالكُوفَةِ بَعِيدًا- لأَتيتهُ وَلَو مَشيًا»[١].

واتە: لە ئەشعەثەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە ـ کە یەکێک بوو لە هاوەڵانی عەبدوڵلا ـ وتویەتی: پەڕاوێکم لەلای پیاوێک بینی (سُبحَانَ اللهِ، وَالحَمدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكبَرُ)ی تیا بوو، منیش پێم وت: نوسخەیەکم بۆ بنوسەرەوە، وەک بڵێی ڕەزیلی پێ بکات (دەیویست پێم نەدات)، دواتر بەڵێنی پێ دام پەڕاوەکەم پێ بدات، منیش چوومە لای عەبدوڵلا ﷺ، بینیم پەڕاوەکە لەبەر دەستی ئەو دایە، عەبدوڵلا وتی: ئەوەی لەناو ئەو نوسراوەدا هەیە بیدعە و فیتنە و گومڕاییە، ئەوەی ئەو کەسانەی پێش ئێوەی لەناو برد تەنها ئەوە و هاوشێوەی ئەوە بوو، ئەوان نوسیانەوە و زمانیان چێژی لێ وەرگرت و دڵەکانیان ئاوێتەی بوو، (بۆیە) پێداگری دەکەم لەسەر هەموو کەسێک کە شوێنی نوسراوێک بزانێت دەبێ هەر نیشانی بدات، وە سوێند بە خوا دەخۆم، ـ شوعبە وتی: سوێندی بە خوا خوارد؟ وتی: وابزانم سوێندی خوارد ـ (وتی سوێند بە خوا) ئەگەر پەڕاوێکی ئاوا باس بکرێت لە (دیری هند) ـ واتە شوێنێکی دووری کوفە ـ ئەوە بۆی دەچم ئەگەر بە پیادەش بێت.

٤٩٨- «عَن أَبِي مُوسَى ﷺ، أَنَّ بَنِي إِسرَائِيلَ كَتَبُوا كِتَابًا، فَتَبِعُوهُ، وَتَرَكُوا التَّورَاةَ»[٢].

واتە: لە ئەبو مووسا ﷺ گێڕدراوەتەوە، (وتویەتی): بەنی ئیسرائیل پەرتوکێکیان نوسیبوو شوێنی کەوتن و وازیان لە تەوڕات هێنا.

٤٩٩- «عَن عَفَّاقٍ المُحَارِبِيِّ، عَن أَبِيهِ، قَالَ: سَمِعتُ ابنَ مَسعُودٍ ﷺ، يَقُولُ: إِنَّ نَاسًا يَسمَعُونَ كَلاَمِي، ثُمَّ يَنطَلِقُونَ فَيَكتُبُونَهُ، وَإِنِّي لاَ أُحِلُّ لِأَحَدٍ أَن يَكتُبَ إِلاَّ كِتَابَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ»[٣].

واتە: لە عیفاقی موحاریبی گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: گوێم لە ئیبنو مەسعود ﷺ بوو دەیوت: خەڵکانێک گوێ بۆ قسەکانم دەگرن، دواتر دەڕۆن و دەینوسنەوە، من بە حەڵاڵی نازانم هیچ شتێک بنوسرێتەوە جگە لە کتێبی خوای زاڵی پایەدار.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده حسن.

٥٠٠- «عَنِ ابنِ شُبرُمَةَ، قَالَ: سَمِعتُ الشَّعبِيَّ، يَقُولُ: مَا كَتَبتُ سوداءَ فِي بَيضَاءَ، وَلاَ استَعَدتُ حَدِيثًا مِن إنسَانٍ»[١].

واتە: لە شوبرومەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە شەعبی بوو دەیوت: هەرگیز ڕەشم لەناو سپی نەنوسیوەتەوە (واتە: نوسینم لەناو کاغەز و پێستەو تێنوس نەکردووە)، هەروەها داوای دووبارە کردنەوەی هیچ فەرموودەیەکم نەکردووە لە هیچ مرۆڤێک.

### بابەت: دەربارەی ئەوانەی ڕێگەیان داوە بە نوسینەوەی زانست

٥٠١- «عَن وَهبِ بنِ مُنَبِّهٍ، عَن أَخِيهِ، سَمِعَ أَباهُرَيرَةَ ﷺ، يَقُولُ: لَيسَ أَحَدٌ مِن أَصحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَكثَرَ حَدِيثًا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِنِّي، إلاَّ مَا كَانَ مِن عَبدِ اللهِ بنِ عَمرٍو فَإِنَّهُ كَانَ يَكتُبُ وَلاَ أَكتُبُ»[٢].

واتە: لە وەهبی کوڕی مونەببیهەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە براکەی گێڕاویەتیەوە کە گوێی لە ئەبو هوڕەیرە ﷺ بوو دەیوت: هیچ یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ نیە فەرموودەی زیاتری لە پێغەمبەر ﷺ گێڕابێتەوەو (زیاتری لەبەر بێت) لە من (من لە هەموویان زیاترم لەبەرە و گێڕاومەتەوە)، تەنها ئەو فەرموودانە نەبێت کە عەبدوڵلای کوڕی عەمرٍ لەلایەتی، چونکە ئەو دەینوسیەوە من نەمدەنوسیەوە.

٥٠٢- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ عَمرٍو رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: كُنتُ أَكتُبُ كُلَّ شَيءٍ أَسمَعُهُ مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ أُرِيدُ حِفظَهُ، فَنَهَتنِي قُرَيشٌ، وَقَالُوا: تكتُبُ كُلَّ شَيءٍ سَمِعتَهُ مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَرَسُولُ اللهِ ﷺ بَشَرٌ يَتَكَلَّمُ فِي الغَضَبِ وَالرِّضَا؟ فَأَمسَكتُ عَنِ الكِتَابِ، فَذَكَرتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ، فَأَومَأَ بِإِصبَعِهِ إِلَى فِيهِ، وَقَالَ: اكتُب فَوَالَّذِي نَفسِي بِيَدِهِ، مَا خَرَجَ مِنهُ إلاَّ حَقٌّ»[٣].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من هەموو جار هەموو شتێکم دەنوسیەوە کە گوێم لێ دەبوو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ مەبەستم بوو لەبەری بکەم، قوڕەیشیەکان (واتە: هاوەڵە قوڕەیشیەکان) نەهیان لێ کردم و وتیان: (چۆن) هەموو شتێک دەنوسیتەوە کە گوێت لێ دەبێت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ مرۆڤێکە قسە دەکات لە کاتی توڕەیی و ڕازیبووندا؟ (دەڵێ) منیش وازم هێنا لە نوسینەوە، جا ئەوەم باس کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەر ﷺ) بە پەنجەی ئاماژەی بۆ دەمی کرد و فەرمووی: بینوسەوە (بەردەوامبە لە کارەکەت) سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە (ئەم دەمە) هیچ شتێکی لێ دەرناچێ جگە لە هەق و ڕاستی.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

٥٠٣- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ عَمرِو رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، أَنَّهُ أَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أُرِيدُ أَن أَروِيَ مِن حَدِيثِكَ، فَأَرَدتُ أَن أَستَعِينَ بِكِتَابِ يَدِي مَعَ قَلبِي، إِن رَأَيتَ ذَلِكَ، فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ إِن كَانَ قَالَهُ حَدِيثِي، ثُمَّ استَعِن بِيَدِكَ مَعَ قَلبِكَ»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، كە چووە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دەمەوێ فەرموودەكانت بگێڕمەوە، بۆیە ویستم پشت ببەستم بە پەرتوكی دەستم و دڵم (واتە لەم پەرتوكە فەرموودەكانت بنوسمەوە و دواتر بە دڵ لەبەری بكەم)، ئەگەر ئیزنت لەسەر بێت و پێت باش بێت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەوەی دەیڵێیت هی من بێت ئەوە (سەرەتا) تێبگە و حاڵی بە لە فەرموودەكەم دواتر پشت ببەستە بە دەستت و دڵت (واتە: بەڵێ كارێكی باشە پشت بە نوسین و لەبەر كردنەوە ببەستی، بەڵام سەرەتا لە فەرموودەكە تێبگە).

٥٠٤- «عَن أَبِي قَبِيلٍ، قَالَ: سَمِعتُ عَبدَ اللهِ بنَ عَمرِو رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: بَينَمَا نَحنُ حَولَ رَسُولِ اللهِ ﷺ نَكتُبُ، إِذ سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَيُّ المَدِينَتَينِ تُفتَحُ أَوَّلاً: قُسطَنطِينِيَّةُ أَو رُومِيَّةُ؟ فَقَالَ: النَّبِيُّ ﷺ لاَ بَل مَدِينَةُ هِرقلَ أَوَّلاً»[2].

واتە: لە ئەبو قەبیل گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، بوو وتی: لە كاتێكدا ئێمە لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ بووین (فەرموودەكانی ئەومان) دەنوسیەوە، لەناكاو پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری كرد (فەرمووی): كام لە دوو شارەكان سەرەتا فەتح دەكرێن و (ئازاد دەكرێن لە لایەن مسوڵمانان): قوستەنتینییە یا رومییە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر، بەڵكو سەرەتا شارەكەی هیرەقڵ ئازاد دەكرێت (لێرەدا دەردەكەوێت كە پێغەمبەری خوا ﷺ زانیویەتی ئەوان لە فكری خۆیان وادەزانن سەرەتا ئەستەنبۆڵ (قوستەنتینییە) ڕزگار دەكرێت، بۆیە بێ ئەوەی ئەوان وەڵام بدەنەوە، فەرمووی: نەخێر، بەڵكو ڕومیەی شاری هیرەقل سەرەتا ئازاد دەكرێت).

٥٠٥- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ دِينَارٍ، قَالَ: كَتَبَ عُمَرُ بنُ عَبدِ العَزِيزِ رَحِمَهُ اللهُ إِلَى أَبِي بَكرِ بنِ مُحَمَّدِ بنِ عَمرِو بنِ حَزمٍ أَن اكتُب إِلَيَّ بِمَا ثَبَتَ عِندَكَ مِنَ الحَدِيثِ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَبِحَدِيثِ عَمرَةَ، فَإِنِّي قَد خَشِيتُ دُرُوسَ العِلمِ وَذَهَابَهُ»[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی دینار گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەری كوڕی عەبدولعەزیز بۆ ئەبو بەكری كوڕی موحەممەدی كوڕی عەمرِی كوڕی حەزمی نووسی: بۆم بنوسەوە هەرچی بەلای تۆوە ڕاستە لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرموودەی عەمرِش بنوسە، چونكە من دەترسم لە ڕۆیشتن و فەوتان و نەمانی دەرس و زانستی فەرموودە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٥٠٦- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ دِينَارٍ، قَالَ: كَتَبَ عُمَرُ بنُ عَبدِ العَزِيزِ، إِلَى أَهلِ المَدِينَةِ أَن انظُرُوا حَدِيثَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَاكتُبُوهُ فَإِنِّي قَد خِفتُ دُرُوسَ العِلمِ وَذَهَابَ أَهلِهِ»(١).

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی دینارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەری كوڕی عەبدولعەزیز بۆ خەڵكی مەدینەی نووسی: سەیری فەرموودەی پێغەمبەری خوا بكەن و (لێكۆڵینەوەی بۆ بكەن) و بینوسنەوە، چونكە من دەترسم لە ڕۆیشتن و فەوتان و نەمانی دەرس و زانستی فەرموودە و ئەوانەی زانستەكەیان لەلایە.

٥٠٧- «عَن أَبِي المَلِيحِ، قَالَ: يَعِيبُونَ عَلَينَا الكِتَابَ، وَقَد قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَـٰبٍ ﴿٥٢﴾﴾ طه»(٢).

واتە: لە ئەبو مەلیحە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ڕەخنەمان لێ دەگرن لەسەر نوسینەوە، لە كاتێكدا خوای پەروەردگار (لەسەر زاری مووسا) فەرموویەتی: [زانیاری ئەوە لای پەروەردگارمە لە پەڕاوێكدا].

٥٠٨- «حَدَّثَنَا سَوَادَةُ بنُ حَيَّانَ، قَالَ: سَمِعتُ مُعَاوِيَةَ بنَ قُرَّةَ أَبا إِيَاسٍ، يَقُولُ: كَانَ يُقَالُ: مَن لَم يَكتُب عِلمَهُ، لَم يُعَدَّ عِلمُهُ عِلمًا»(٣).

واتە: لە سەوادەتی كوڕی حەییانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە موعاویەی كوڕی قوڕڕەت (باوكی ئیاس) بوو هەموو جار دەیوت: هەر كەسێك زانستەكەی نەنوسێتەوە، زانستەكەی بە زانست دانانرێت.

٥٠٩- «حَدَّثَنِي ثُمَامَةُ بنُ عَبدِ اللهِ بنِ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ أَنَسًا ﷺ، كَانَ يَقُولُ لِبَنِيهِ: يَا بَنِيَّ قَيِّدُوا هَذَا العِلمَ»(٤).

واتە: لە ثومامەی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی ئەنەس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، (وتویەتی): ئەنەس ﷺ هەموو جار بە كوڕەكانی دەوت: ئەی كوڕە شیرینەكانم ئەو زانستە ببەستنەوە (واتە: بە نوسین بیبەستنەوە مەهێڵن لێتان بفەوتێت بە لەبیرچوونەوە).

٥١٠- «عَن سَلمٍ العَلَوِيِّ، قَالَ: رَأَيتُ أَبَانَ يَكتُبُ عِندَ أَنَسٍ ﷺ فِي سَبُّورَةٍ»(٥).

واتە: لە سەلمی عەلەوی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبانم بینی فەرموودەی دەنوسی لەلای ئەنەس ﷺ لە سەببوڕەییێكدا.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده حسن.

(٥) ـ إسناده حسن.

٥١١- «عَنِ الحَسَنِ بنِ جَابِرٍ، أَنَّهُ: سَأَلَ أَبا أُمَامَةَ البَاهِلِيَّ ﷺ، عَن كِتَابِ العِلمِ، فَقَالَ: لاَ بَأسَ بِذَلِكَ»[١].

واته: له حەسەنی کوڕی جابر گێڕدراوەتەوە، که پرسیاری له ئەبو ئومامەی باهیلی ﷺ کردووه دەربارەی نوسینەوەی زانست، ئەویش وتویەتی: هیچی تیا نیه (با بنوسرێتەوە).

٥١٢- «عَن بَشِيرِ بنِ نَهِيكٍ، قَالَ: كُنتُ أَكتُبُ مَا أَسمَعُ مِن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، فَلَمَّا أَرَدتُ أَن أُفَارِقَهُ، أَتَيتُهُ بِكِتَابِهِ فَقَرَأتُهُ عَلَيهِ، وَقُلتُ لَهُ: هَذَا سَمِعتُ مِنكَ؟ قَالَ: نَعم»[٢].

واته: له بەشیری کوڕی نەهیک گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من هەموو جار ئەو فەرموودانەم دەنوسی که له ئەبو هورەیرەم ﷺ گوێ لێ دەبوو، دواتر که دەمویست لێی جیا ببمەوە و (مەجلیسەکەی جێ بهێڵم) نوسراوەکەم بۆ دەبردو بەسەرمدا دەخوێندەوەو پێم دەوت: ئەوەم گوێ لێ بوو له تۆ (ئایا تەواوە هەڵەم نەکردووە)؟ دەیوت: بەڵێ (تەواوە).

٥١٣- «عَن سَعِيدِ بنِ جُبَيرٍ، قَالَ: كُنتُ أَسمَعُ مِن ابنِ عُمَرَ، وَابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، الحَدِيثَ بِاللَّيلِ، فَأَكتُبُهُ فِي وَاسِطَةِ الرَّحلِ»[٣].

واته: له سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من گوێم بۆ ئیبنو عومەرو ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، دەگرت بۆ فەرمووده به شەو دەمنوسیەوە له پارچەی کورتانەکە.

٥١٤- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ عَمرٍو رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: مَا يُرَغِّبُنِي فِي الحَيَاةِ إِلاَّ الصَّادِقَةُ وَالوَهطُ- فَأَمَّا الصَّادِقَةُ، فَصَحِيفَةٌ كَتَبتُهَا مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ -وَأَمَّا الوَهطُ: فَأَرضٌ تَصَدَّقَ بِهَا عَمرُو بنُ العَاصِ ﷺ كَانَ يَقُومُ عَلَيهَا»[٤].

واته: له عەبدوڵلای کوڕی عەمر (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ شتێک وام لێ ناکات حەزم له دونیا بێت جگه له (الصَّادِقَةُ) و (الوَهطُ).

جا هەرچی «صادیقەیە» بریتیە له پەڕاوێک که نوسیومەتەوە له پێغەمبەری خواوە ﷺ، وە هەرچی «وەهط»یشە بریتیە له زەوییەک (که زیاتر له یەک ملیۆن دار مێوی تیا بوو) که عەمری کوڕی عاص ﷺ (واته: باوکم) کردبوویە خێر و، (له پاش وەفاتی باوکی) عەبدوڵلا بەڕێوەی دەبرد.

٥١٥- «عَن عَبدِ المَلِكِ بنِ عَبدِ اللهِ بنِ أَبِي سُفيَانَ، عَن عَمِّهِ عَمرِو بنِ أَبِي سُفيَانَ، أَنَّهُ: سَمِعَ عُمَرَ بنَ الخَطَّابِ ﷺ، يَقُولُ: قَيِّدُوا العِلمَ بِالكِتَابِ»[٥].

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە عەبدول مەلیكی كوڕی عەبدوڵلای كوڕی ئەبو سوفیان گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە مامیەوە عەمری كوڕی ئەبو سوفیانەوە گێڕاویەتیەوە: كە گوێی لە عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ بوو دەیوت: زانست ببەستنەوە (ڕایگرن) بە نوسین.

٥١٦- «عَنِ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا أَنَّهُ قَالَ: قَيِّدُوا هَذَا العِلمَ بِالكِتَابِ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەو زانستە (واتە: زانستی فەرموودە) ببەستنەوە و ڕایگرن بە نوسین.

٥١٧- «حَدَّثَنَا عُثمَانُ بنُ حَكِيمٍ، قَالَ: سَمِعتُ سَعِيدَ بنَ جُبَيرٍ، يَقُولُ: كُنتُ أَسِيرُ مَعَ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، فِي طَرِيقِ مَكَّةَ لَيلاً، وَكَانَ يُحَدِّثُنِي بِالحَدِيثِ فَأَكتُبُهُ فِي وَاسِطَةِ الرَّحلِ، حَتَّى أُصبِحَ فَأَكتُبَهُ»[٢].

واتە: لە عوسمانی كوڕی حەكیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە سەعیدی كوڕی جوبەیر بوو دەیوت: من لەگەڵ ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، دەڕۆیشتم لە ڕێگای مەككە بە شەو، ئەویش فەرموودەی بۆ دەگێڕامەوە، منیش لە كورتانەكە دەمنوسی تا ڕۆژ دادەهات و دەبوویەوە ئەو كات (لە شتێكی تر) دەمنوسیەوە.

٥١٨- «عَن سَعِيدِ بنِ جُبَيرٍ، قَالَ: كُنتُ أَكتُبُ عِندَ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، فِي صَحِيفَةٍ، وَأَكتُبُ فِي نَعلَيَّ»[٣].

واتە: لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من لەلای ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، دەمنوسی لە پەڕاوێک، هەروەها دەمنوسی لە نەعلەكانم (چونكە هیچی تری دەست نەكەوتوەو ترساوە زانستەكەشی لێ بفەوتێت، بە دڵنیایی نەعلەكانیشی لەپێ نەكردۆتەوە).

٥١٩- «عَن سَعِيدِ بنِ جُبَيرٍ، قَالَ: كُنتُ أَجلِسُ إِلَى ابنِ عَبَّاسٍ، فَأَكتُبُ فِي الصَّحِيفَةِ، حَتَّى تَمتَلِئَ، ثُمَّ أَقلِبُ نَعلَيَّ، فَأَكتُبُ فِي ظُهُورِهِمَا»[٤].

واتە: لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من لەلای ئیبنو عەبباس دادەنیشتم دەمنوسی لە پەڕاوێک تا پڕدەبوویەوە (جێگا نەدەما) دواتر نەعلەكانم وەردەگێڕا و لە پشتیانەوە دەمنوسی.

٥٢٠- «عَن عُبَيدٍ المُكتِبِ، قَالَ: رَأَيتُهُم يَكتُبُونَ التَّفسِيرَ عِندَ مُجَاهِدٍ»[٥].

واتە: لە عوبەیدی موكتیبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خەڵكم دەبینی تەفسیریان دەنوسیەوە لەلای موجاهید.

---

(١) ـ رجاله ثقات، وهو منقطع، ولكن الأثر صحيح لغيره.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ رجاله ثقات.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح.

سەرنج: لە بابەتی پێشتر وتمان موجاهید ڕێگای نەداوە زانست بنوسرێتەوە، بەڵام دواتر پەشیمان بۆتەوەو بۆچوونی گۆڕاوە، بۆیە لێرەدا ڕێگای داوە.

**٥٢١-** «عَن عَبدِ اللهِ بنِ حَنَشٍ، قَالَ: رَأَيتُهُم يَكتُبُونَ عِندَ البَرَاءِ بِأَطرَافِ القَصَبِ عَلَى أَكُفِّهِم»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی حەنەش گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خەڵکم بینی (فەرموودەیان) لەلای بەڕاء دەنوسیەوە بە نوکە قامیش لەسەر دەستیان.

**٥٢٢-** «عَن هَارُونَ بنِ عَنتَرَةَ، عَن أَبِيهِ، حَدَّثَنِي ابنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا بِحَدِيثٍ فَقُلتُ: أَكتُبُهُ عَنكَ؟ قَالَ: فَرَخَّصَ لِي وَلَم يَكَد»[٢].

واتە: لە هاڕوونی کوڕی عەنتەڕ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، فەرموودەیەکی بۆ گێڕامەوە، منیش وتم: لە تۆوە بینوسمەوە؟ دەڵێ: ڕێگای پێ دام و ڕێگری نەکرد.

**٥٢٣-** «عَن رَجَاءِ بنِ حَيوَةَ، قَالَ: كَتَبَ هِشَامُ بنُ عَبدِ المَلِكِ إِلَى عَامِلِهِ، أَن يَسأَلَنِي عَن حَدِيثٍ؟ قَالَ: رَجَاءٌ، فَكُنتُ قَد نَسِيتُهُ، لَولاَ أَنَّهُ كَانَ عِندِي مَكتُوبًا»[٣].

واتە: لە ڕەجائی کوڕی حەیوەتە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیشامی کوڕی عەبدولمەلیک بۆ بەردەستەکەی نوسی بوو (داوای لێ کردبوو) کە پرسیارم لێ بکات دەربارەی فەرموودەیەک، منیش فەرموودەکەم لە یاد کردبوو، ئەگەر لەلام نوسرابووایە ئەوە لە یادم نەدەکردو وەڵامم دەدایەوە.

**٥٢٤-** «أَخبَرَنَا هِشَامُ بنُ الغَازِ، قَالَ: كَانَ يُسأَلُ عَطَاءُ بنُ أَبِي رَبَاحٍ، وَيُكتَبُ مَا يُجِيبُ فِيهِ، بَينَ يَدَيهِ»[٤].

واتە: لە هیشامی کوڕی غاز گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەطائی کوڕی ئەبو ڕەباح پرسیاری لێدەکراو ئەوەی وەڵامی دەدایەوە دەنووسرایەوە لەبەر دەستی خۆی لەلای خۆی (واتە: ڕێگەی دەدا لەلای ئەو زانست بنوسرێتەوە و نکوڵی نەدەکرد).

**٥٢٥-** «عَن سُلَيمَانَ بنِ مُوسَى، أَنَّهُ: رَأَى نَافِعًا مَولَى ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، يُملِي عِلمَهُ، وَيُكتَبُ بَينَ يَدَيهِ»[٥].

واتە: لە سەلمانی کوڕی مووسا گێڕدراوەتەوە، کە نافیعی خزمەتکاری ئیبنو عومەری (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، بینیوە زانستەکەی پێشکەش دەکرد و بڵاوی دەکردەوەو، دەشنووسرایەو لەبەر دەمی خۆی.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

٥٢٦- «حَدَّثَنَا المُبَارَكُ بنُ سَعِيدٍ، قَالَ: كَانَ سُفيَانُ يَكتُبُ الحَدِيثَ بِاللَّيلِ فِي الحَائِطِ، فَإِذَا أَصبَحَ نَسَخَهُ، ثُمَّ حَكَّهُ»[١].

واتە: لە موبارەکی کوڕی سەعیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سوفیان هەموو جار بە شەو فەرموودەی لەسەر دیوار دەنوسی، جا کاتێک ڕۆژ دادەهات نەسخی دەکرد (لە شتێکدا دەینوسیەوە و هەڵی دەگرت)، دواتر دیوارەکەی دەڕنی و دەیسڕیەوە.

٥٢٧- «حَدَّثَنِي عَونُ بنُ عَبدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قُلتُ: لِعُمَرَ بنِ عَبدِ العَزِيزِ حَدَّثَنِي فُلَانٌ رَجُلٌ مِن أَصحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَعَرَفَهُ عُمَرُ، قُلتُ: حَدَّثَنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الحَيَاءَ، وَالعَفَافَ، وَالعِيَّ، عِيَّ اللِّسَانِ، لاَ عِيَّ القَلبِ، وَالفِقهَ مِنَ الإِيمَانِ، وَهُنَّ مِمَّا يَزِدنَ فِي الآخِرَةِ، وَيُنقِصنَ مِنَ الدُّنيَا، وَمَا يَزِدنَ فِي الآخِرَةِ أَكثَرُ، وَإِنَّ البَذَاءَ، وَالجَفَاءَ، وَالشُّحَّ، مِنَ النِّفَاقِ، وَهُنَّ مِمَّا يَزِدنَ فِي الدُّنيَا، وَيُنقِصنَ فِي الآخِرَةِ، وَمَا يُنقِصنَ فِي الآخِرَةِ أَكثَرُ»[٢].

واتە: لە عەونی کوڕی عەبدوڵڵاوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزم وت: فڵان کەس کە پیاوێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ (فەرموودەیەکی) بۆ گێڕامەوە، عومەریش کابرای ناسی، وتم: بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی حەیاو شەرم و، پاکی لە کردارو گوفتاردا و کۆڵەواری زمان نەوەک کۆڵەواری دڵ، هەروەها تێگەیشتن (ئا ئەمانە هەموویان) لە ئیمانەوەن، ئەو شتانە لە زادو زەخیرەی دواڕۆژ زیاد دەکەن و لە دونیا کەم دەکەنەوە، (بەڵام) ئەوەی زیادی دەکەن لە دواڕۆژ زۆر زیاترە (لەوەی کەمی دەکەن لە دونیا)، هەروەها بە دڵنیایی زمان شڕی و ڕژدی و ڕەزیلی لە نیفاقەوەن و، ئەمانە لەو شتانەن کە لە (کاڵای) دونیا زیاد دەکەن و لە (زەخیرەی) دواڕۆژ کەم دەکەن، (بەڵام) ئەوەی لە دواڕۆژ کەمی دەکەن زۆر زیاترە (لەوەی لە دونیا زیادی دەکەن).

٥٢٨- «حَدَّثَنِي سُلَيمَانُ بنُ المُغِيرَةِ، قَالَ: قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: خَرَجَ عَلَينَا عُمَرُ بنُ عَبدِ العَزِيزِ لِصَلاَةِ الظُّهرِ، وَمَعَهُ قِرطَاسٌ، ثُمَّ خَرَجَ عَلَينَا لِصَلاَةِ العَصرِ وَهُوَ مَعَهُ، فَقُلتُ لَهُ: يَا أَمِيرَ المُؤمِنِينَ، مَا هَذَا الكِتَابُ؟ قَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَدَّثَنِي بِهِ عَونُ بنُ عبدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، فَأَعجَبَنِي فَكَتَبتُهُ، فَإِذَا فِيهِ هَذَا الحَدِيثُ»[٣].

واتە: لە سولەیمانی کوڕی موغیرە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو قیلابە وتویەتی: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (لە ماڵەوە) دەرچوو هات بۆ لامان بۆ ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆ، پەڕاوێکیشی پێبوو، دواتر (کاتی عەسر لە ماڵەوە) دەرچوو هات بۆ لامان بۆ ئەنجامدانی نوێژی عەسر، پەڕاوەکەشی هەر پێ بوو، منیش پێم وت: ئەی گەورەی بڕواداران ئەم نوسراوە چیە؟ وتی: ئەوە فەرموودەیەکە عەونی

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

كوڕی عەبدوڵلا (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، بۆی گێڕاوەمەتەوە، منیش پێمخۆش بوو نوسیمەوە، جا ئەوە ئەو فەرموودەیەی تیایە.

٥٢٩- «عَن شُرَحبِيلَ أَبِي سَعدٍ، قَالَ: دَعَا الحَسَنُ ﷺ، بَنِيهِ، وَبَنِي أَخِيهِ، فَقَالَ: يَا بَنِيَّ، وَبَنِي أَخِي إِنَّكُم صِغَارُ قَومٍ، يُوشِكُ أَن تَكُونُوا كِبَارَ آخَرِينَ، فَتَعَلَّمُوا العِلمَ، فَمَن لَم يَستَطِع مِنكُم أَن يَروِيَهُ أَو قَالَ: يَحفَظَهُ فَليَكتُبهُ، وَليَضَعهُ فِي بَيتِهِ»[١].

واتە: لە شورەحبیلی باوکی سەعد گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: حەسەن ﷺ بانگی کوڕەکانی خۆی و کوڕەکانی برای کردو، وتی: ئەی کوڕەکانم و کوڕەکانی برام ئێوە بچوکی نێو خەڵکین، نزیکە ببنە گەورەی خەڵكانیتر، کەواتە: خۆتان فێری زانست بکەن، جا هەر یەکێک لە ئێوە نەیتوانی (فەرموودە) بگێڕێتەوە ـ یان وتی: نەیتوانی لەبەری بکات ـ با بینوسێتەوەو لە ماڵەکەی دایبنێت (تا زانستەکە بمێنێت و ببەخشرێت بە خەڵکانی دواوە).

### بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی ڕێگاییێکی باش یان خراپ دادەهێنێت

٥٣٠- «عَن جَرِيرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَن سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً عُمِلَ بِهَا بَعدَهُ، كَانَ لَهُ مِثلُ أَجرِ مَن عَمِلَ بِهَا، مِن غَيرِ أَن يُنقَصَ مِن أَجرِهِ شَيءٌ، وَمَن سَنَّ سُنَّةً سَيِّئَةً، كَانَ عَلَيهِ مِثلُ وِزرِ مَن يَعمَلُ بِهَا، مِن غَيرِ أَن يُنقَصَ مِن أَوزَارِهِم شَيءٌ»[٢].

واتە: لە جەریر ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ڕێگاییێکی چاک دابهێنێت، کە کاری پێ بکرێت دوای خۆی، ئەوە (پاداشتی) بۆ هەیە بە وێنەی پاداشتی ئەو کەسەی کاری پێ دەکات، بێ ئەوەی هیچ شتێک لە پاداشتی (ئەو کەسەی کاری پێکردوە) کەم بکات، وە هەر کەسێک ڕێگاییێکی خراپ دابهێنێت، ئەوە (سزای) لەسەرە بە وێنەی سزای ئەو کەسەی کاری پێ دەکات، بێ ئەوەی هیچ شتێک لە سزای (ئەو کەسانەی کاری پێ دەکەن) کەم بکات.

٥٣١- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَن دَعَا إِلَى هُدًى، كَانَ لَهُ مِنَ الأَجرِ مِثلُ أُجُورِ مَنِ اتَّبَعَهُ، لاَ يَنقُصُ ذَلِكَ مِن أُجُورِهِم شَيئًا، وَمَن دَعَا إِلَى ضَلاَلَةٍ، كَانَ عَلَيهِ مِنَ الإِثمِ، مِثلُ آثَامِ مَن تَبِعَهُ لاَ يَنقُصُ ذَلِكَ مِن آثَامِهِم شَيئًا»[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بانگەواز بکات بۆ ڕێنموییێک (بۆ شتێکی چاک)، ئەوە پاداشتی بۆ هەیە بە وێنەی پاداشتی ئەو کەسانەی دوای دەکەون (دێنە سەر ڕێنموییەکەی)و ئەوەش هیچ لە پاداشتی ئەوان کەم ناکاتەوە، وە هەر کەسێک بانگەواز بکات بۆ گومڕاییێک (بۆ شتێکی خراپ)، ئەوە تاوانی لەسەرە بە وێنەی تاوانی

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ صحيح.

ئەو کەسانەی دوای دەکەون و (دێنە سەر گومڕاییەکەی و کاری پێ دەکەن) ئەوەش هیچ لە تاوانی ئەوان کەم ناکاتەوە.

**٥٣٢-** «عَن جَرِيرِ بنِ عَبدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَحَثَّ النَّاسَ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَأَبطَئُوا حَتَّى بَانَ فِي وَجهِهِ الغَضَبُ، ثُمَّ إِنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنصَارِ جَاءَ بِصُرَّةٍ، فَتَتَابَعَ النَّاسُ حَتَّى رُئِيَ فِي وَجهِهِ السُّرُورُ، فَقَالَ: مَن سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً، كَانَ لَهُ أَجرُهُ، وَمِثلُ أَجرِ مَن عَمِلَ بِهَا، مِن غَيرِ أَن يُنقَصَ مِن أُجُورِهِم شَيءٌ، وَمَن سَنَّ سُنَّةً سَيِّئَةً، كَانَ عَلَيهِ وِزرُهُ، وَمِثلُ وِزرِ مَن عَمِلَ بِهَا، مِن غَيرِ أَن يُنقَصَ مِن أَوزَارِهِم شَيءٌ»[١].

واتە: لە جەریری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و، خەڵکی هاندا بۆ صەدەقەو خێر کردن، خەڵکیش خاوو خلیچکیان کردو (خێری باشیان نەهێنا) تاوەکو توڕەیی لە ڕووی (پێغەمبەری خوا ﷺ) دەرکەوت، دواتر پیاوێکی ئەنصاری هات و تورەگەیەکی هێنا (گونیەیێکی هێنا) خەڵکیش چاویان لێ کردو یەک لەدوای یەک هاتن و (خێریان هێنا و خستیانە ناو تورەگەکەو شتەکان زۆر بوون) تاوەکو دڵ خۆشی بینراو هەستی پێکرا لە ڕوخساری پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: هەر کەسێک ڕێگایێکی چاک دابهێنێت، ئەوە پاداشتی خۆی بۆ خۆیەتی، هەروەها هاووێنەو هەمان پاداشتی ئەو کەسانەشی بۆ هەیە کە کاری پێ دەکەن، بێ ئەوەی هیچ شتێک لە پاداشتی (ئەو کەسانەی کاری پێ دەکەن) کەم بکات، وە هەر کەسێک ڕێگایێکی خراپ دابهێنێت، ئەوە سزای خۆی لەسەرە، هەروەها هاووێنە و هەمان سزای ئەو کەسانەشی لەسەرە کە کاری پێدەکەن، بێ ئەوەی هیچ شتێک لە سزای (ئەو کەسانەی کاری پێ دەکەن) کەم بکات.

**٥٣٣-** «حَدَّثَنِي حَسَّانُ بنُ عَطِيَّةَ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَنَا أَعظَمُكُم أَجرًا يَومَ القِيَامَةِ، لِأَنَّ لِي أَجرِي، وَمِثلَ أَجرِ مَنِ اتَّبَعَنِي»[٢].

واتە: لە حەسسانی کوڕی عەطییە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من پاداشتم لە هەمووتان زیاتر و گەورەترە، چونکە پاداشتی خۆم بۆ خۆمە و هەروەها پاداشتی ئەو کەسانەشم بۆ هەیە کە شوێنم دەکەون.

**٥٣٤-** «عَن أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَن دَعَا إِلَى أَمرٍ وَلَو دَعَا رَجُلٌ رَجُلاً، كَانَ يَومَ القِيَامَةِ مَوقُوفًا بِهِ، لاَزِمًا بِغَارِبِهِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الصافات»[٣].

واتە: لە ئەنەس ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بانگەواز بکات بۆ شتێک و کارێک، هەتا ئەگەر پیاوێک بانگی پیاوێک بکات (بۆ شتێک یان کردارێک) ئەوە لە ڕۆژی دوایی ڕادەگیرێ و لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت بە هۆیەوە، (کردارەکەی کابرای بانگ کراو)

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ مرسل، وإسناده صحيح.

(٣) إسناده ضعيف.

لەسەر پشتیەتی و لێی جیانابێتەوە (لە پاداشت و سزاکە بەشدارە)، دواتر ئەو ئایەتەی خوێندەوە: [ئادەی بیان وەستێنن و ڕایانگرن، بێ گومان ئەمانە لێپرسراون].

٥٣٥- «عَنِ الشَّعبِيِّ، أَنَّ ابنَ مَسعُودٍ ﷺ، قَالَ: أَربَعٌ يُعطَاهَا الرَّجُلُ بَعدَ مَوتِهِ، ثُلُثُ مَالِهِ إِذَا كَانَ فِيهِ قَبلَ ذَلِكَ لِلَّهِ مُطِيعًا، وَالوَلَدُ الصَّالِحُ يَدعُو لَهُ مِن بَعدِ مَوتِهِ، وَالسُّنَّةُ الحَسَنَةُ يَسُنُّهَا الرَّجُلُ، فَيُعمَلُ بِهَا بَعدَ مَوتِهِ، وَالمِائَةُ إِذَا شَفَعُوا لِلرَّجُلِ شُفِّعُوا فِيهِ»(١).

واتە: لە شەعبی گێڕدراوەتەوە کە ئیبنو مەسعود ﷺ وتویەتی: چوار شت هەن بە مرۆڤ دەدرێن و خێرەکەی پێی دەگاتەوە دوای مردنیشی، سێیەکی ماڵەکەی (ئەگەر بیکات بە خێرو وەسیەت دوای خۆی) ئەگەر تیایدا گوێڕایەڵی خوای کردبێ (واتە: وەسیەتەکەی شەرعی بێت و ناشەرعی نەبێت، ئەوە خێری وەسیەتەکەی پێ دەگات کە بۆی جێبەجێ دەکرێت)، هەروەها منداڵێکی چاک دوای مردنی دوعا و نزای بۆ بکات، هەروەها ڕێگایێکی چاک کە کەسێک دایبهێنێت و کاری پێ بکرێت دوای مردنی، هەروەها سەد کەس ئەگەر شەفاعەت و تکا بۆ کەسێک بکەن شەفاعەتەکەیان بۆی وەردەگیرێ.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسانەی ناوبانگ و ناسراویان پێ ناخۆش بووە

٥٣٦- «عَنِ الأَعمَشِ، قَالَ: جَهَدنَا بِإِبرَاهِيمَ أَن نُجلِسَهُ إِلَى سَارِيَةٍ، فَأَبَى»(٢).

واتە: لە ئەعمەش گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەوڵماندا لەگەڵ ئیبراهیم بۆ ئەوەی داینیشێنین لای دینگەیەک (هەموو جار لەوێ دەرس بڵێتەوەو پشتی پێوە بدات) ڕازی نەبوو (چونکە حەزی نەکردوە ئەو دینگەیە ناوی ئەوی بکەوێتە سەرو بڵێن ئەمە دینگەی ئیبراهیمە.

٥٣٧- «عَن إِبرَاهِيمَ، أَنَّهُ: كَانَ يَكرَهُ أَن يَستَنِدَ إِلَى السَّارِيَةِ»(٣).

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، کە پێی ناخۆش بووە پشت بداتە دینگە (تا جیاواز نەبێ لە خەڵک و قوتابیەکانی و شێوازێکی فیزو گەورایەتی پێوە دیار نەبێ).

٥٣٨- «عَن مُغِيرَةَ، قَالَ: كَانَ إِبرَاهِيمُ، لاَ يَبتَدِئُ الحَدِيثَ حَتَّى يُسأَلَ»(٤).

واتە: لە موغیرە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (هەرگیز) ئیبراهیم دەستی بە قسە نەدەکرد تا پرسیاری لێ دەکرا.

٥٣٩- «عَن خَيثَمَةَ، قَالَ: كَانَ الحَارِثُ بنُ قَيسٍ الجُعفِيُّ، وَكَانَ مِن أَصحَابِ عَبدِ اللهِ وَكَانُوا مُعجَبِينَ بِهِ فَكَانَ، يَجلِسُ إِلَيهِ الرَّجُلُ وَالرَّجُلاَنِ، فَيُحَدِّثُهُمَا، فَإِذَا كَثُرُوا، قَامَ وَتَرَكَهُم»(٥).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە خەیثەمە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: حاریثی کوڕی قەیسی جوعفی کە یەکێک بوو لە هاوەڵانی عەبدوڵڵا (خەڵک) زۆر پێی سەرسام بوون، جا هەموو جار پیاوێک، یان دوو پیاو لەلای دادەنیشتن ئەویش قسەی بۆ دەکردن (زانست و فەرموودەی فێر دەکردن)، جا ئەگەر (خەڵکەکە) زیاد بوونایە (لە مەجلیسەکەی) ئەو هەڵدەستاو وازی لێ دەهێنان و دەڕۆیشت (لە ترسی ئەوەی بەناوبانگ ببێت و تووشی فیزو خۆ بەگەورە زانین ببێ).

٥٤٠- «عَنْ إِبْرَاهِيم عَن عَلقَمَةَ، قَالَ: قِيلَ لَهُ حِينَ مَاتَ عَبدُ اللهِ ﷺ، لَو قَعَدتَ فَعَلَّمتَ النَّاسَ السُّنَّةَ؟ فَقَالَ: أَتُرِيدُونَ أَن يُوطَأَ عَقِبِي»[١].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە عەلقەمەی گێڕاوەتەوە (باسی عەلقەمەی کردووە) وتویەتی: ئەو کاتەی عەبدوڵڵا ﷺ وەفاتی کرد بە عەلقەمە وترا دەبۆ دانانیشی (لە شوێنی عەبدوڵڵا جێگای ئەو ناگریتەوە) تا خەڵکی فێری فەرموودە بکەیت؟ وتی: ئایا دەتانەوێت شوێن پێم هەڵبگیرێ و (خەڵک شوێنم بکەون و تووشی ناوبانگم بکەن)؟!

٥٤١- «عَن سُلَيمِ بنِ حَنظَلَةَ، قَالَ: أَتَينَا أُبَيَّ بنَ كَعبٍ لِنَتَحَدَّثَ إِلَيهِ، فَلَمَّا قَامَ قُمنَا، وَنَحنُ نَمشِي خَلفَهُ، فَرَهَقَنَا عُمَرُ ﷺ، فَتَبِعَهُ، فَضَرَبَهُ عُمَرُ بِالدِّرَّةِ- قَالَ: فَاتَّقَاهُ بِذِرَاعَيهِ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ المُؤمِنِينَ: مَا نَصنَعُ؟ قَالَ: أَوَ مَا تَرَى؟ فِتنَةٌ لِلمَتبُوعِ، مَذَلَّةٌ لِلتَّابِعِ؟»[٢].

واتە: لە سولەیمی کوڕی حەنظەلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چووین بۆ لای ئوبەی کوڕی کەعب تاوەکو لەلای ئەو گفتوگۆ بکەین (دەربارەی زانست و فەرموودە)، جا کە ئوبەی هەڵساو ڕۆیشت ئێمەش هەڵساین و لەدواوەی دەڕۆیشتین، (ئیمامی) عومەریش ﷺ شوێنمانکەوت و بەدوای (ئوبەی) دا ڕۆیشت، (جا کە پێی گەیشت) عومەر لە ئوبەیدا بە گۆچان، سولەیم دەڵێ: ئوبەی گۆچانەکەی گەڕاندەوە بە ئانیشکەکانی و وتی: ئەی گەورەی بڕواداران ئەوە چی دەکەیت (بۆ دەتەوێ لێم بدەیت)؟ عومەر وتی: مەگەر نابینی (ئەو کارەی ئێوە) فیتنەیە بۆ ئەو کەسانەی خەڵک شوێنیان کەوتوون (وەک تۆ)و زەلیلیشە بۆ ئەو کەسانەی شوێن خەڵکی دەکەون (وەک ئەو خەڵکەی دوات کەوتوون)؟

تێبینی: ئەوەی ڕاستتر بێ ئیمامی عومەر لێی نەداوە تەنها گۆچانەکەی لێ بەرز کردۆتەوە (ئوبەی)ش ئانیشکەکانی بەرزکردۆتەوە لە ترسی ئەوەی لێی بدات، وەک لە ڕیوایەتی تر هاتوە.

٥٤٢- «عَن إِبرَاهِيمَ، قَالَ: كَانُوا يَكرَهُونَ، أَن تُوطَأَ أَعقَابُهُم»[٣].

واتە: لە ئیبراهیم گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێیان ناخۆش بووە کە خەڵکی لە دواوەیان بڕۆن و شوێنیان بکەون لە دواوە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٥٤٣- «عَن بِسطَامِ بنِ مُسلِمٍ، قَالَ: كَانَ مُحَمَّدُ بنُ سِيرِينَ، إِذَا مَشَى مَعَهُ الرَّجُلُ، قَامَ، فَقَالَ: أَلَكَ حَاجَةٌ، فَإِن كَانَت لَهُ حَاجَةٌ، قَضَاهَا، وَإِن عَادَ يَمشِي مَعَهُ، قَامَ فَقَالَ: أَلَكَ حَاجَةٌ»[١].

واتە: لە بیسطامی کوڕی موسلیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئەگەر پیاوێک لەگەڵ موحەممەدی کوڕی سیرین بڕۆیشتایە لە ڕێگا، موحەممەدی کوڕی سیرین دەوەستا و دەیوت: ئایا پێویستیێکت هەیە (کارێکت هەیە)؟ جا ئەگەر کارێک و پێویستیێکی هەبووایە بۆی جێبەجێ دەکرد، جا ئەگەر (کابرا دووبارە) گەڕابایەوە و دوای کەوتبایەوە، (ئیبنو سیرین) دەوەستا و دەیوت: ئایا پێویستیێکت هەیە؟ (چونکە پێی ناخۆش بووە وەک کەسانی کاربەدەست و بەفیز خەڵک دوای بکەوێت تا بڵێن: شوێنکەوتەی هەیە).

٥٤٤- «عَن إِبرَاهِيمَ، قَالَ: إِيَّاكُم أَن تُوطَأَ أَعقَابُكُم»[٢].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆتان بپارێزن لەوەی بخرێنە پێشەوە و خەڵک لە دواتانەوە بڕۆن.

٥٤٥- «عَن عَاصِمِ بنِ ضَمرَةَ، أَنَّهُ رَأَى أُنَاسًا يَتبَعُونَ سَعِيدَ بنَ جُبَيرٍ، قَالَ: فَأُرَاهُ قَالَ: نَهَاهُم وَقَالَ: إِنَّ صَنِيعَكُم هَذَا، أَو مَشيَكُم هَذَا مَذَلَّةٌ لِلتَّابِعِ، وَفِتنَةٌ لِلمَتبُوعِ»[٣].

واتە: لە عاصمی کوڕی ضەمرە گێڕدراوەتەوە، خەڵکانێکی بینیوە دوای سەعیدی کوڕی جوبەیر کەوتبوون، (مەخلەد کە ڕاوێکە لەم فەرموودەیە) وتویەتی: پێم وابێ (ئەوەی بۆی گێڕامەوە) وتی: سەعیدی کوڕی جوبەیر نەهی لە خەڵکە کە کرد کە دوای کەوتبوون و وتی: ئەو کارەی ئێوە و ئەو ڕۆیشتنەتان زەلیلیە بۆ شوێنکەوتووەکە و فیتنەیە بۆ شوێنکەوتەکان.

٥٤٦- «عَنِ ابنِ عَونٍ، قَالَ: شَاوَرتُ مُحَمَّدًا فِي بِنَاءٍ أَرَدتُ أَن أَبنِيَهُ فِي الكَلاَءِ قَالَ: فَأَشَارَ عَلَيَّ وَقَالَ: إِذَا أَرَدتَ أَسَاسَ البِنَاءِ فَآذِنِّي حَتَّى أَجِيءَ مَعَكَ، قَالَ: فَأَتَيتُهُ، قَالَ: فَبَينَمَا نَحنُ نَمشِي، إِذ جَاءَ رَجُلٌ فَمَشَى مَعَهُ، فَقَامَ، فَقَالَ: أَلَكَ حَاجَةٌ؟ قَالَ: لاَ- قَالَ: إِمَّا لاَ- فَاذهَب، ثُمَّ أَقبَلَ عَلَيَّ، فَقَالَ: أَنتَ أَيضًا فَاذهَب، قَالَ: فَذَهَبتُ حَتَّى خَالَفتُ الطَّرِيقَ »[٤].

واتە: لە ئیبنو عەونەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرس و ڕام بە موحەممەد کرد دەربارەی بینایێک کە ویستم دروستی بکەم لە کەلاء (کە بازاڕێک بوو لە بەصرە)، ئەویش ڕێگای پێ دام و وتی: ئەگەر ویستت بناغەی بینایەکە دروست بکەیت بانگم بکە تاوەکو لەگەڵت بێم (بۆ یارمەتی دان)، دەڵێ: (کە کاتێ ویستم بناغەکە دروست بکەم) چووم بۆ لای، دەڵێ: لەکاتێکدا ئێمە دەڕۆیشتین (لە ڕێگا)،

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

لەناکاو پیاوێک هات و لەگەڵی بەڕێدا ڕۆیشت ئەویش وەستا و وتی: ئایا پێویستیێک و کارێکت هەیە؟ (کابرا) وتی: نەخێر، موحەممەد وتی: ئەگەر نەخێر کەواتە بڕۆ، دواتر ڕووی کردە من و وتی: تۆش بڕۆ، ئیبنو عەون دەڵێ منیش ڕۆیشتم تا لە ڕێگاکە جیابوومەوە (واتە: بەو شێوەیە خۆیان دوور گرتووە لەوەی تووشی خۆ بە زلزانی و فیز بن و خەڵک لە دوایان بڕوات).

٥٤٧- «عَن نُسَيرٍ، أَنَّ الرَّبِيعَ، كَانَ إِذَا أَتَوهُ يَقُولُ: أَعُوذُ بِاللهِ مِن شَرِّكُم يَعنِي أَصحَابَهُ»[١].

واتە: لە نوسەیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر خەڵک بهاتنایە لای ڕەبیع دەیوت: پەنا بەخوا دەگرم لە شەڕو فیتنەو خراپەی ئێوە، واتە: خراپەی هاوەڵەکانی (مەبەستی بە شەڕ و خراپە ئەوەیە نەوەک ئەو خەڵک و هاوەڵانەی بۆی ببن بە مایەی تووشبوونی دۆزەخ بەهۆی هەڵسوکەوت و لە پشت ڕۆیشتن و مەدح کردنیان بۆی).

٥٤٨- «عَن عَبدِ الرَّحمَنِ بنِ بِشرٍ، قَالَ: كُنَّا عِندَ خَبَّابِ بنِ الأَرَتِّ ﷺ، فَاجتَمَعَ إِلَيهِ أَصحَابُهُ وَهُوَ سَاكِتٌ فَقِيلَ لَهُ: أَلاَ تُحَدِّثُ أَصحَابَكَ؟ قَالَ: أَخَافُ أَن أَقُولَ لَهُم مَا لاَ أَفعَلُ»[٢].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی بیشرِ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە لای خەبابی کوڕی ئەڕەت ﷺ بووین، هاوەڵەکانیشی لە لای کۆبوونەوە، ئەویش بێ دەنگ بوو، جا پێی وترا: بۆ قسە لەگەڵ هاوەڵەکانت ناکەی؟ وتی: دەترسم قسەیەکیان پێ بڵێم کە جێبەجێی نەکەم.

٥٤٩- «عَن صَالِحٍ، قَالَ: سَمِعتُ الشَّعبِيَّ، قَالَ: وَدِدتُ أَنِّي نَجَوتُ مِن عَمَلِي كَفَافًا لاَ لِي وَلاَ عَلَيَّ»[٣].

واتە: لە صالیحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە شەعبی بوو وتی: حەز دەکەم و ئاواتم وایە لە زانستەکەم دەربازم بێت بە مایەی خۆم، نە پاداشت بدرێمەوە بە هۆیەوە، نە قەرزار ببمەوە لەسەری، (واتە: لەبەر ئەوەی زۆر ترساوە لەوەی زانستەکەی ببێتە وەبال و نەگبەتی و سزا و شکاتکار بەسەریەوە، بۆیە وتویەتی قەیناکە پاداشتەکەیشم ناوێ بەس با لە دژم نەوەستێتەوەو تووشی ئاگرم نەکا).

٥٥٠- «عَنِ الحَسَنِ، أَنَّ ابنَ مَسعُودٍ ﷺ، كَانَ يَمشِي وَنَاسٌ يَطَئُونَ عَقِبَهُ، فَقَالَ: لاَ تَطَئُوا عَقِبِي، فَوَاللهِ لَو تَعلَمُونَ مَا أُغلِقُ عَلَيهِ بَابِي، مَا تَبِعَنِي رَجُلٌ مِنكُم»[٤].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئیبنو مەسعود ﷺ کە دەڕۆیشت بە ڕێگادا خەڵکانێک لە دواوەی دەڕۆیشتن، ئەویش دەیوت: شوێنم مەکەون، سوێند بە خوا ئەگەر بتانزانیایە ئەو شتانەی من دەرگاکەمی لەسەر دادەخەم (واتە: لەو هەموو تاوانانەی هەمە) ئەوە هیچ پیاوێک لە ئێوە دوام نەدەکەوت.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ رجاله ثقات، إلا أنه منقطع.

٥٥١- «عَن سَعِيدِ بنِ جُبَيرٍ، قَالَ: فِتنَةٌ لِلمَتبُوعِ، مَذَلَّةٌ لِلتَّابِعِ»[1].

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (خەڵكانیک لە دوای کەسێک بڕۆن) فیتنەیە بۆ شوێنکەوتەو زەلیلیە بۆ شوێنکەوتووەکە.

٥٥٢- «حَدَّثَنَا سُفيَانُ، عَن أُمِّيٍّ، قَالَ: مَشَوا خَلفَ عَلِيٍّ ﷺ، فَقَالَ: عَنِّي خَفقَ نِعَالِكُم، فَإِنَّهَا مُفسِدَةٌ لِقُلُوبِ نَوكَى الرِّجَالِ»[2].

واتە: سوفیان گێڕاویەتیەوە لە دایکی کە وتویەتی: لە دوای پێشەوا عەلی ﷺ ڕۆیشتوون، ئەویش وتویەتی: دەنگەدەنگی نەعلە و پێڵاوەکانتان لە من دووربخەنەوە، چونکە تێکدەرە بۆ دڵی پیاوانی گێل و نەفام (واتە: ئەو شوێنکەوتن و هاشەهاش و خشەخشی نەعلەو پێڵاوەکانتان وا دەکات کەسی نەزان و گێل من بە گەورەتر لە ئەندازەی خۆی بزانێ، یان بە هەڵە حاڵی ببێ و کارێک و بیرۆکەیەکی بۆ دروست ببێت کە زیانی گەورەی بۆ خۆی دەبێت).

٥٥٣- «عَن يَزِيدَ بنِ حَازِمٍ، قَالَ: سَمِعتُ الحَسَنَ، يَقُولُ: إِنَّ خَفقَ النِّعَالِ خَلفَ الرِّجَالِ، قَلَّ مَا يُلَبِّثُ الحَمقَى»[3].

واتە: لە یەزیدی کوڕی حازمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە حەسەن بوو، دەیوت: خشەخشی نەعلە و پێڵاو لە دواوەی پیاوانەوە، زۆر کەمە گێل و نەزانان بهێڵێتەوە (بەڵکو حەتمەن تووشی فیتنە دەبن بە هۆیەوە، بەوەی ئەو کەسە زۆر لە حەجمی خۆی بە گەورە دەگرن کە شوێنی کەوتوون).

٥٥٤- «عَن طَاوُسٍ، قَالَ: كَانَ إِذَا جَلَسَ إِلَيهِ الرَّجُلُ أَوِ الرَّجُلاَنِ، قَامَ فَتَنَحَّى»[4].

واتە: لە تاوسەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئەگەر پیاوێک، یان دوو پیاو لەلای دانیشتبان هەڵدەستا و دەڕۆیشت.

٥٥٥- «عَن أَبِي بَرزَةَ الأَسلَمِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ تَزُولُ قَدَمَا عَبدٍ يَومَ القِيَامَةِ، حَتَّى يُسأَلَ عَن عُمُرِهِ فِيمَا أَفنَاهُ، وَعَن عِلمِهِ مَا فَعَلَ بِهِ، وَعَن مَالِهِ مِن أَينَ اكتَسَبَهُ، وَفِيمَا أَنفَقَهُ، وَعَن جِسمِهِ، فِيمَا أَبلاَهُ»[5].

واتە: لە ئەبو بەرزەی ئەسلەمی ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو قاچەکانی هیچ بەندەیەک ناجوڵێن لە ڕۆژی قیامەت، تاوەکو پرسیاری لێ نەکرێت دەربارەی تەمەنی

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده حسن.

کە لەچی بەڕێ کردوە، وە دەربارەی زانستەکەی چی پێ ئەنجام داوە، وە دەربارەی ماڵ و سامانەکەی، کە لە کوێ و لە چ ڕێگایێکەوە بەدەستی هێناوەو لەچی خەرج کردوە، وە دەربارەی جەستەو توانای کە لە چی ڕزاندەوەو بێ هێزی کرد.

**٥٥٦-** «عَن مُعَاذِ بنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: لاَ يَدَعُ اللهُ العِبَادَ يَومَ القِيَامَةِ، يَومَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ العَالَمِينَ، حَتَّى يَسأَلَهُم عَن أَربَعٍ، عَمَّا أَفنَوا فِيهِ أَعمَارَهُم، وَعَمَّا أَبلَوا فِيهِ أَجسَادَهُم، وَعَمَّا كَسَبُوا، وفِيما أَنفَقُوا، وَعَمَّا عَمِلُوا، فِيمَا عَلِمُوا»[1].

واتە: لە موعاذی کوڕی جەبەل ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خوا واز لە بەندەکان ناهێنێت و (بەڕێیان ناکات) لە ڕۆژی دوایی ئەو ڕۆژەی خەڵک لەبەر دەستی خوای پەروەردگار دەوەستێ (بۆ لێپێچینەوە) تاوەکو پرسیاریان لێ نەکات دەربارەی چوار شت: دەربارەی ئەو شتەی تەمەنی خۆیان تێیدا سەرف کرد، وە دەربارەی ئەو شتەی جەستە و هێزی خۆیان تیایدا لاواز کرد، وە دەربارەی ئەوەی بە دەستیان هێناوە و ئەوەی سەرفیان کردوە، وە دەربارەی ئەوەی جێبەجێیان کردووە لەو شتانەی کە زانیویانە و زانستیان پێ هەبووە.

**٥٥٧-** «عَن مُعَاذِ بنِ جَبَلٍ ﷺ، قَالَ: لاَ تَزُولُ قَدَمَا عَبدٍ يَومَ القِيَامَةِ، حَتَّى يُسأَلَ عَن أَربَعٍ: عَن عُمُرِهِ فِيمَا أَفنَاهُ، وَعَن جَسَدِهِ فِيمَا أَبلاَهُ، وَعَن مَالِهِ مِن أَينَ اكتَسَبَهُ، وَفِيمَا وَضَعَهُ، وَعَن عِلمِهِ مَاذَا عَمِلَ فِيهِ»[2].

واتە: لە موعاذی کوڕی جەبەل ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دوو پێی هیچ بەندەیەک ناجوڵێن تاوەکو پرسیاری لێ نەکرێت دەربارەی چوار شت: دەربارەی تەمەنی کە لەچی سەرف کرد، وە دەربارەی جەستە و توانای کە لە چی ڕزاندەوە و بێ هێزی کرد، وە دەربارەی ماڵ و سامانەکەی کە لە کوێ و لە چ ڕێگایێکەوە بەدەستی هێناوەو لە چ شتێک دایناوە و سەرفی کردوە، وە دەربارەی زانستەکەی کە چ کارێکی پێ ئەنجام داوە.

**٥٥٨-** «عَن لَيثٍ، قَالَ: قَالَ لِي طَاوُسٌ، مَا تَعَلَّمتَ، فَتَعَلَّم لِنَفسِكَ، فَإِنَّ النَّاسَ قَد ذَهَبَت مِنهُمُ الأَمَانَةُ»[3].

واتە: لە لەیث گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: طاووس پێی وتم: فێری زانست ببە تەنها بۆ خودی خۆت (نەک بۆ سوود گەیاندن بە خەڵکی)، چونکە ئەمانەت (واتە: کار کردن بە زانست) لای خەڵکی نەماوە (بۆیە تۆ وەک ئەوان مەبە، بۆیە خۆت فێر بکە و کاری پێ بکە و هەقت بەسەریانەوە نەبێ).

**٥٥٩-** «عَنِ الحَسَنِ ﷺ، قَالَ: أَدرَكتُ النَّاسَ، وَالنَّاسِكُ إِذَا نَسَكَ، لَم يُعرَف مِن قِبَلِ مَنطِقِهِ، وَلَكِن يُعرَفُ مِن قِبَلِ عَمَلِهِ، فَذَلِكَ العِلمُ النَّافِعُ»[4].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ موقوف وإسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە حەسەن ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: لە خەڵکی گەیشتووم، کەسی عیبادەتکار و خوا پەرست کاتێ عیبادەت دەکات ناناسرێ لە ڕوانگەی قسە و گوفتاری، بەڵکو دەناسرێ لە ڕوانگەی کرداری، ئا ئەوە زانستی بە سوودە (واتە: خودی کردارەکە دەیسەلمێنێ ئەو زانستەی کە هەیەتی دەربارەی ئەو کارانە سوود بەخشە، چونکە بۆتە کردار، بۆیە مرۆڤ بە کردار تێی دەگەی کە ئاخۆ زانستی بە سوودی لەلایە یان بێ سوود، چونکە کەسێک با زۆریش بزانێ کە نەیکردە کردار زانستەکەی بێ سوودە).

## بابەت: ڕاگەیاندن و فێرکردنی فەرموودە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

٥٦٠- «عَن أَبِي كَبشَةَ قَالَ: سَمِعتُ عَبدَ اللهِ بنَ عَمرِو رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا قَالَ: سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: بَلِّغُوا عَنِّي وَلَو آيَةً، وَحَدِّثُوا عَن بَنِي إِسرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ، وَمَن كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَليَتَبَوَّأْ مَقعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[١].

واتە: لە ئەبو کەبشەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، بوو وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: لە منەوە بیگەیەنن هەرچەندە ئایەتێکیش بێت، وە لە بەنی ئیسرائیلەوە شت بگێڕنەوە هیچ گوناهی تیا نیە (بە مەرجێک پێچەوانەی قورئان و فەرموودە نەبێت)، وە هەر کەسێکیش درۆ بە دەمی منەوە بکات بە ئەنقەست، ئەوە بێ شوێنی خۆی ئامادە بکات لە ئاگری دۆزەخ.

٥٦١- «عَن أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، أَن لاَ يَغلِبُونَا عَلَى ثَلاَثٍ: أَن نَأمُرَ بِالمَعرُوفِ، وَنَنهَى عَنِ المُنكَرِ، وَنُعَلِّمَ النَّاسَ السُّنَنَ»[٢].

واتە: لە ئەبو ذەڕ ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووین کە خەڵک بەسەرماندا زاڵ نەبن لە سێ شت: لەوەی فەرمان بە چاکە بکەین و، نەهی و ڕێگری لە خراپە بکەین و، خەڵکی فێری فەرموودە بکەین.

٥٦٢- «حَدَّثَنِي سُلَيمُ بنُ عَامِرٍ، قَالَ: كَانَ أَبُو أُمَامَةَ ﷺ، إِذَا قَعَدنَا إِلَيهِ، يَجِيئُنَا مِنَ الحَدِيثِ بِأَمرٍ عَظِيمٍ، وَيَقُولُ لَنَا: اسمَعُوا وَاعقِلُوا، وَبَلِّغُوا عَنَّا مَا تَسمَعُونَ، قَالَ سُلَيمٌ: بِمَنزِلَةِ الَّذِي يُشهِدُ عَلَى مَا عَلِمَ»[٣].

واتە: لە سولەیمی کوڕی عەمرِ گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەر کات لەلای ئەبو ئومامە ﷺ دانیشتباین فەرموودەی بۆ دەهێنایەنەوەو (باسی دەکرد) بە فەرمان کردنێکی گەورە (فەرمانی دەکرد) و دەیووت: گوێ بگرن و تێبگەن و لە ئێمەوە ڕایبگەیەنن ئەوەی گوێتان لێ دەبێت، سولەیم وتویەتی: (بە شێوەیەک ڕایدەگەیاندو فەرمانی دەکرد) وەک ئەو کەسەی شاهێدی بدات لەسەر ئەو شتەی زانیویەتی

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(چۆن ناكرێ شایەدیەكەی بشارێتەوە، ئاواش فەرمانی دەكرد فەرمووده نەشاردرێتەوەو ڕابگەیەنرێت، خۆیشی ئاوا جێبەجێی دەكرد و ڕایدەگەیاند).

٥٦٣- «حَدَّثَنِي أَبُو كَثِيرٍ، حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: أَتَيتُ أَبا ذَرٍّ ﷺ، وَهُوَ جَالِسٌ عِندَ الجَمرَةِ الوُسطَى، وَقَدِ اجتَمَعَ النَّاسُ عَلَيهِ يَستَفتُونَهُ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَوَقَفَ عَلَيهِ ثُمَّ قَالَ: أَلَم تُنهَ عَنِ الفُتيَا؟ فَرَفَعَ رَأسَهُ إِلَيهِ فَقَالَ: أَرقِيبٌ أَنتَ عَلَيَّ؟ لَو وَضَعتُمُ الصَّمصَامَةَ عَلَى هَذِهِ وَأَشَارَ إِلَى قَفَاهُ ثُمَّ ظَنَنتُ أَنِّي أُنفِذُ، كَلِمَةً سَمِعتُهَا مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ قَبلَ أَن تُجِيزُوا عَلَيَّ، لأَنفَذتُهَا»[١].

واتە: ئەبو كەثیر لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: چووم بۆ لای ئەبو ذەڕ ﷺ لە كاتێكدا ئەو دانیشتبوو لەلای شوێنی ناوەنجی شەیتان ڕەجم كردن (الجَمرَةِ الوُسطَى) خەڵكیش لەسەر سەری كۆببونەوە پرسیاریان لێ دەكردو ئەویش وەڵامی دەدانەوە، پیاوێك هات و لەسەر سەری وەستا دواتر وتی: ئایا فەتوادان نەهی لێ نەكراوە؟ ئەویش سەری بۆ لای پیاوەكە بەرز كردەوە (سەیری كرد) و وتی: مەگەر تۆ چاودێری بەسەرمەوە؟ ئەگەر شمشێرێكی بڕەڕو تیژ دابنێن لەسەر ئێرە ئاماژەی كرد بۆ پشتی، دواتر بزانم من دەتوانم وشەیەك جێبەجێ بكەم كە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گوێم لێ بووە پێش ئەوەی لەسەرم جێبەجێ بكەن و (شمشێرەكەم لێ بدەن) ئەوە وشەكە دەردەبڕم و جێبەجێی دەكەم (واتە: نەخێر فەتوادان نەهی لێ نەكراوە بۆ ئەهلی خۆی، بەڵكو واجبیشە).

٥٦٤- «عَن أَبِي العَالِيَةِ، قَالَ: سَأَلتُ ابنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، عَن شَيءٍ فَقَالَ: يَا أَبا العَالِيَةِ، أَتُرِيدُ أَن تَكُونَ مُفتِيًا؟ فَقُلتُ: لاَ، وَلَكِن لاَ آمَنُ أَن تَذهَبُوا وَنَبقَى، فَقَالَ: صَدَقَ أَبُو العَالِيَةِ»[٢].

واتە: لە ئەبو عالیەوە گێڕدراوەتەوە وتویەتی: پرسیارم لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، كرد دەربارەی شتێك، وتی: ئەی ئەبو عالیە ئایا دەتەوێ ببیت بە موفتی و فەتوادەر؟ منیش وتم: نەخێر، بەڵام من ئەرخەیان نیم و دەترسم ئێوە بڕۆن و (وەفات بكەن) و ئێمەش بمێنینەوە (ئەو كات پێمان خۆش بێت، یان نا، تووشی فەتوادان دەبین، بۆیە پرسیار دەكەم)، (ئیبنو عەبباسیش) وتی: ڕاستە ئەبو عالیە.

٥٦٥- «عَن إِبرَاهِيمَ، قَالَ: كَانَ عَبِيدَةُ، يَأتِي عَبدَ اللهِ ﷺ، كُلَّ خَمِيسٍ، فَيَسأَلُهُ عَن أَشيَاءَ غَابَ عَنهَا، فَكَانَ عَامَّةُ مَا يُحفَظُ عَن عَبدِ اللهِ مِمَّا يَسأَلُهُ عَبِيدَةُ عَنهُ»[٣].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبیدە هەموو پێنج شەممەیەك دەهات بۆ لای عەبدوڵلا ﷺ و پرسیاری لێ دەكرد دەربارەی شتانێك كە نەیدەزانی، بۆیە هەموو ئەوەی لەبەر كراوە و وەرگیراوە لە عەبدوڵلا بریتیە لەو شتانەی عەبیدە پرسیاری دەربارە كردوون (واتە: پرسیار كردنە زۆرەكەی عەبیدە بۆتە هۆی ئەوەی زانستی عەبدوڵلا بكات بە ئێمە و عەبدوڵلا قسەی لەسەر بكات و فەرموودەكان باس بكات).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

**٥٦٦- «عَن سَعِيدِ بنِ يَزِيدَ، قَالَ: سَمِعتُ عِكرِمَةَ، يَقُولُ: مَا لَكُم لاَ تَسأَلُونِي أَفلَستُم؟»[١].**

واتە: لە سەعیدی کوڕی یەزیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عیکریمە بوو دەیوت: ئەوە بۆ پرسیارم لێ ناکەن، موفلیس بوون و هیچتان پێ نیە؟! (بە ڕەخنەوە وای دەووت).

**٥٦٧- «عَنِ ابنِ شِهَابٍ، قَالَ: العِلمُ خَزَائِنُ وَتَفتَحُهَا المَسأَلَةُ»[٢].**

واتە: لە ئیبنو شیهاب گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زانست خەزێنەیە و پرسیار کردنیش (کلیلە و) دەیکاتەوە.

**٥٦٨- «قَالَ إِبرَاهِيمُ، مَن رِق وَجهُهُ، رِق عِلمُهُ»[٣].**

واتە: ئیبراهیم وتویەتی: هەر کەسێک ڕوو تەنک بێت (واتە: خۆی بدزێتەوەو شەرم بکات ڕووی خۆی دەرخات و پرسیار بکات) ئەوە زانستەکەشی تەنک و کەم دەبێت (زیاد ناکات، چونکە زیاد بوونی زانست بە پرسیار کردن و شەرم نەکردنە).

**٥٦٩- «عَنِ الشَّعبِيِّ، قَالَ: مَن رِق وَجهُهُ، رِق عِلمُهُ»[٤].**

واتە: لە شەعبیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک ڕوو تەنک بێت (واتە: خۆی بدزێتەوە و شەرم بکات ڕووی خۆی دەرخات و پرسیار بکات) ئەوە زانستەکەشی تەنک و کەم دەبێت.

**٥٧٠- «عَن حَفصِ بنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا، قَالَ: قَالَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ ﷺ، مَن رِق وَجهُهُ رِق عِلمُهُ»[٥].**

واتە: لە حەفصی کوڕی عومەر (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ وتویەتی: هەر کەسێک ڕوو تەنک بێ (واتە: خۆی بدزێتەوە و شەرم بکات ڕووی خۆی دەرخات و پرسیار بکات) ئەوە زانستەکەشی تەنک و کەم دەبێت.

**٥٧١- «عَن مُجَاهِدٍ قَالَ: لاَ يَتَعَلَّمُ مَنِ استَحيَى وَاستَكبَرَ»[٦].**

واتە: لە موجاهید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەسێک کە شەرم بکات یان خۆی بە گەورە بزانێ فێری زانست نابێ (چونکە ئەوەی شەرم دەکات پرسیار ناکات بۆیە فێر نابێت، ئەوەشی کە خۆی بە گەورە دەزانێت پێی عەیبە لەگەڵ منداڵ و بچوکان دابنیشێت و دەرس بخوێنێت یان لەلای کەسی لەخۆی بچوکتر بخوێنێت یاخود هەر ئەصڵەن پرسیار ناکات لەبەر تەکەببوڕ، کەواتە فێر نابێت).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف جدا.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

(٦) ـ إسناده ضعيف.

٥٧٢- «عَن هِشَامِ بنِ عُروَةَ، عَن أَبِيهِ، أَنَّهُ كَانَ يَجمَعُ بَنِيهِ فَيَقُولُ: يَا بَنِيَّ تَعَلَّمُوا، فَإِن تَكُونُوا صِغَارَ قَومٍ، فَعَسَى أَن تَكُونُوا كِبَارَ آخَرِينَ، وَمَا أَقبَحَ عَلَى شَيخٍ يُسأَلُ لَيسَ عِندَهُ عِلمٌ»[١].

واتە: هیشامی كوڕی عورِوە لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی (باوكم): هەموو جار كوڕەكانی كۆدەكردەوەو دەیوت: ئەی كوڕە شیرینەكانم خۆتان فێر بكەن، ئەگەر بچوكی نێو خەڵكیش بن ڕەنگە ببن بە گەورەی خەڵكانیتر، وە چەندە ناشیرین و ناڕێكە لەسەر كەسێكی بە تەمەن و گەورەی ناو كۆمەڵە خەڵكێك كە پرسیاری لێ بكرێت و زانستی لەلا نەبێ (كەواتە: ئێوە دەبنە گەورەی كۆمەڵە خەڵكانی داهاتوو نابێ زانستتان لەلا نەبێت).

٥٧٣- «عَن عِكرِمَةَ، قَالَ: كَانَ ابنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، يَضَعُ فِي رِجلَيَّ الكَبلَ، وَيُعَلِّمُنِي القُرآنَ وَالسُّنَنَ»[٢].

واتە: لە عیكریمە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، زنجیری لە دوو قاچەكان دەكردم و فێری قوڕئان و فەرموودەی دەكردم.

٥٧٤- «حَدَّثَنَا يَحيَى بنُ الضُّرَيسِ، قَالَ: سَمِعتُ سُفيَانَ، يَقُولُ: مَن تَرَأَّسَ سَرِيعًا، أَضَرَّ بِكَثِيرٍ مِنَ العِلمِ، وَمَن لَم يَتَرَأَّس، طَلَبَ وَطَلَبَ حَتَّى يَبلُغَ»[٣].

واتە: لە یەحیای كوڕی ضورەیس گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە سوفیان بوو دەیوت: هەر كەسێك بە خێرایی ببێتە سەركردەو گەورە زیانێكی زۆر لە زانست دەدات (ناتوانێت زانستی زۆر بەدەست بهێنێت)، وە هەر كەسێك نەبێتە سەركردە و گەورە هەر بەدوای زانستدا دەگەڕێ و دەگەڕێ تاوەكو پێ دەگات.

٥٧٥- «عَن سَلمَانَ ﷺ، قَالَهُ: عِلمٌ لاَ يُقَالُ بِهِ، كَكَنزٍ لاَ يُنفَقُ مِنهُ»[٤].

واتە: لە سەلمان ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زانستێك نەوترێتەوە و (بۆ خەڵكی باس نەكرێت) وەك پارەو سامانێك وایە كە خەزن بكرێت و لێی نەبەخشرێت (واتە: چۆن واجبە پارە و سامانێك كە زۆر بوو دەبێ زەكات و خێری لێ دەربكرێت، ئاواش زانست دەبێ ببەخشرێت و نابێ هەر خەزن بكرێت و كەس سوودی لێ نەبینێت).

٥٧٦- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَثَلُ عِلمٍ لاَ يُنتَفَعُ بِهِ، كَمَثَلِ كَنزٍ لاَ يُنفَقُ مِنهُ فِي سَبِيلِ اللهِ»[٥].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نمونەی زانستێک کە سوودی لێ وەرنەگیرێ (خەڵک سوودی لێ نەبینێ) وەک نمونەی ماڵێکی زۆر و (خەزن کراو) وایە کە لێی نەبەخشرێ لە پێناوی خوا (واتە: چۆن ئەم کەنزە هیچ سوودی نیە نە بۆ دوارۆژی خۆی و، نە بۆ دین و نە بۆ مسوڵمانان، زانستێکیش کە نەبەخشرێت ئاوایە).

٥٧٧- «عَن مُوسَى بنِ يَسَارٍ، عَمِّهِ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ سَلمَانَ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَبِي الدَّردَاءِ ﷺ، أَنَّ العِلمَ كَاليَنَابِيعِ، يَغشَاهُنَّ النَّاسُ، فَيَختَلِجُهُ هَذَا وَهَذَا، فَيَنفَعُ اللهُ بِهِ غَيرَ وَاحِدٍ، وَإِنَّ حِكمَةً لاَ يُتَكَلَّمُ بِهَا، كَجَسَدٍ لاَ رُوحَ فِيهِ، وَإِنَّ عِلمًا لاَ يُخرَجُ، كَكَنزٍ لاَ يُنفَقُ مِنهُ، وَإِنَّمَا مَثَلُ العَالِمِ، كَمَثَلِ رَجُلٍ حَمَلَ سِرَاجًا فِي طَرِيقٍ مُظلِمٍ يَستَضِيءُ بِهِ مَن مَرَّ بِهِ، وَكُلٌّ يَدعُو لَهُ بِالخَيرِ»[١].

واتە: لە مووسای کوڕی یەسارەوە کە مامی ئیبنو ئیسحاقە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێم گەیشتووە کە سەلمان ﷺ بۆ ئەبو دەرداﺋﻰ ﷺ نوسیوە: بە دڵنیایی زانست وەکو کانیاوانە، خەڵک بۆی دەچن و ڕووی تێدەکەن ئەوە و ئەوە لێی دەبات (واتە هەر یەکەی دێت و هەندێکی لێ دەبات)، خوای پەروەردگار زیاتر لە کەسێک (واتە خەڵکانێکی زۆر) سوود بەخش دەکات لێی، وە حیکمەت و داناییێک کە باس نەکرێت (بۆ خەڵکی و بشاردرێتەوە) وەک جەستەیێک وایە کە ڕۆحی تیا نەبێت، وە هەر زانستێکیش کە لێی دەرنەکرێت و (خەڵکی لێ فێر نەکرێت) وەک کەنزێک و سامانێکی کەڵەکەبوو وایە کە لێی نەبەخشرێ، وە نمونەی زانا وەک نمونەی پیاوێکە کە چراێکی هەڵگرتبێت لە ڕێگایێکی تاریکدا بەهۆیەوە ڕێگاکە ڕووناک دەبێتەوە بۆ ئەو کەسانەی پێیدا تێپەڕدەبن و هەموویان دووعای خێری بۆ دەکەن.

٥٧٨- «عَن إِبرَاهِيمَ، قَالَ: يَتبَعُ الرَّجُلَ بَعدَ مَوتِهِ ثَلاَثُ خِلاَلٍ: صَدَقَةٌ تَجرِي بَعدَهُ، وَصَلاَةُ وَلَدِهِ عَلَيهِ، وَعِلمٌ أَفشَاهُ يُعمَلُ بِهِ بَعدَهُ»[٢].

واتە: لە ئیبراهیم گێردراوەتەوە، وتویەتی: سێ ڕێگا و شت شوێنی مرۆڤ دەکەون و (سوودی پێ دەگەیەنن) دوای مردنی: خێرێک کە بمێنێتەوە و بەردەوام بێت لە پاشی خۆی، وە نزا کردنی منداڵەکەی بۆی، وە زانستێک کە بڵاوی کردبێتەوە و کاری پێ بکرێت دوای خۆی.

٥٧٩- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا مَاتَ الإِنسَانُ، انقَطَعَ عَمَلُهُ إِلاَّ مِن ثَلاَثٍ: عِلمٍ يُنتَفَعُ بِهِ، أَو صَدَقَةٍ تَجرِي لَهُ، أَو وَلَدٍ صَالِحٍ يَدعُو لَهُ»[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کاتەی مرۆڤ دەمرێت کارەکانی دەپچڕێن تەنها لە سێ شت نەبێ (هەر بە کاری خۆی ئەژمار دەکرێت و خێرەکەی

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ موقوف صحيح.

(٣) ـ صحيح.

بەردەوام پێ دەگات، كە بریتین لەمانە): زانستێک كە خۆی جێی هێشتبێت و سوودی لێ وەربگیرێت، یان خێر و صەدەقەیەک كە بەردەوام بێت بۆی، یان منداڵێكی چاک كە دووعای بۆ بكات.

٥٨٠- «عَن أَبِي مُوسَى ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: حِينَ قَدِمَ البَصرَةَ، بَعَثَنِي إِلَيكُم عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ ﷺ، أُعَلِّمُكُم كِتَابَ رَبِّكُم وَسُنَّتَكُم، وَأُنَظِّفُ طُرِقَكُم»[1].

واتە: لە ئەبو مووساوە ﷺ گێردراوەتەوە، كە كاتێک چۆتە بەصرە وتویەتی: عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ ناردومی بۆ لای ئێوە، فێری پەرتوكی پەروەردگارتان و سوننەتتان دەكەم، ڕێگاكانتان پاک دەكەمەوە (لە نەزانی و خراپەكاری).

سەرنج: لێرەدا دەردەكەوێت كە ئیمامی عومەر ﷺ ڕێگر نەبووە لە گێڕانەوەو نوسینەوەی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ (وەک لە فەرموودەیتردا دەردەكەوێ)، بەڵكو ڕێگر بووە لە نوسینەوەی ژیان و تایبەتمەندی پێغەمبەری خوا ﷺ كە پەیوەندی بە واجبات و سوننەتەوە نیە، نەوەک خەڵک بە هەڵە حاڵی ببێت، ئەگەرنا ڕێگەی لەو فەرموودانە نەگرتووە كە باسی فەڕز و سوننەتیان تیایە وەک لێرە دەردەكەوێت.

٥٨١- «عَن سَخبَرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَن طَلَبَ العِلمَ، كَانَ كَفَّارَةً لِمَا مَضَى»[2].

واتە: لە سەخبەڕەت ﷺ گێڕدراوەتەوە، كە گوایە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک بەدوای زانستدا بگەڕێ ئەوە كەفارەت و ڕەشكەرەوەیەتی بۆ كردەوەكانی پێشووی (هەموو خراپەكانی پێشووی دەسڕێتەوە).

تێبینی: ئەم فەرموودەیە هەڵبەستراوە و پێغەمبەری خوا نەیفەرمووە.

## بابەت: سەفەر كردن و گەڕان بەدوای زانستدا و ئارامگرتن لەسەر ماندوبوون و ئەو سەغڵەتیانەی تێیدایە

٥٨٢- «عَن أَبِي قِلَابَةَ، قَالَ: لَقَد أَقَمتُ بِالمَدِينَةِ ثَلَاثًا مَا لِي حَاجَةٌ، إِلَّا وَقَد فَرَغتُ مِنهَا، إِلَّا أَنَّ رَجُلًا كَانُوا يَتَوَقَّعُونَهُ، كَانَ يَروِي حَدِيثًا، فَأَقَمتُ حَتَّى قَدِمَ فَسَأَلتُهُ»[3].

واتە: لە ئەبو قیلابەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سێ ڕۆژان لە مەدینە مامەوە هیچ كارێک و پێویستییێكم نەبوو هەمووم جێبەجێ كردبوو (هیچ كارم نەمابوو)، تەنها ئەوە نەبێ پیاوێک كە فەرموودەیەكی (لەلابوو) دەیگێڕایەوە، (خەڵكی) چاوەڕێیان دەكرد، منیش مامەوە تا (كابرا) هات و پرسیاری فەرموودەكەم لێ كرد (فەرموودەكەم لێ وەرگرت).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ موضوع.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٥٨٣- «عَنِ عبد الرحمن بن يزيد بنِ جَابِرٍ، قَالَ: سَمِعتُ بُسرَ بنَ عُبَيدِ اللهِ، يَقُولُ: إن كُنتُ لأركَبُ إلَى المِصرِ مِنَ الأَمصَارِ فِي الحَدِيثِ الوَاحِدِ، لِأَسمَعَهُ»(١).

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی یەزیدی كوڕی جابرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عوبەیدەڵڵا بوو دەیوت: بە دڵنیایی سواری وڵاغەكەم دەبم و دەچم بۆ شارێک لە شارەكان لە پێناوی یەک فەرموودە تا گوێبیستی ببم و وەری بگرم.

٥٨٤- «عَن أَبِي العَالِيَةِ قَالَ: إن كُنَّا نَسمَعُ الرِّوَايَةَ بِالبَصرَةِ عَن أَصحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَلَم نَرضَ، حَتَّى رَكِبنَا إِلَى المَدِينَةِ، فَسَمِعنَاهَا»(٢).

واتە: لە ئەبو عالیە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە گوێمان لە گێڕانەوەیەک دەبوو لە بەصرە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە ﷺ (دەیان وت فلان هاوەڵ كە لە مەدینەیە ئەو فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاوەتەوە)، (ئێمە بەوەندە) ڕازی نەدەبووین تاوەكو سواری وڵاغەكانمان دەبووین و دەچووینە مەدینە و گوێمان لە گێڕانەوەكە دەبوو لە دەمی خۆیان (لە دەمی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ).

٥٨٥- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ عَبدِ الرَّحمَنِ التُّستَرِيِّ، قَالَ: قَالَ دَاوُدُ النَّبِيُّ عليه السلام: قُل لِصَاحِبِ العِلمِ يَتَّخِذ عَصًا مِن حَدِيدٍ، وَنَعلَينِ مِن حَدِيدٍ، وَيَطلُبِ العِلمَ حَتَّى تَنكَسِرَ العَصَا، وَتَنخَرِق النَّعلَانِ»(٣).

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبدوڕڕەحمانی توستەری گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: داوودی پێغەمبەر عليه السلام فەرموویەتی: بە خاوەنی زانست بڵێ: (ئەوانەی حەزیان لە زانستە و بەدوایدا دەگەڕێن) بێ گۆچانێک لە ئاسن و، دوو تاكە نەعلە لە ئاسن دروست بكات و، بەدوای زانستدا بگەڕێ تاوەكو گۆچانەكە دەشكێ و نەعلەكانیش شەق دەبن و دەدڕێن (واتە: زانست زۆری دەوێت و دەبێ هەرگیز واز لە زانست نەهێنێ و، شار بە شار و وڵات بە وڵات بەدوایدا بگەڕێ).

٥٨٦- «قَالَ ابنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، طَلَبتُ العِلمَ، فَلَم أَجِدهُ أَكثَرَ مِنهُ فِي الأَنصَارِ، فَكُنتُ آتِي الرَّجُلَ، فَأَسأَلُ عَنهُ، فَيُقَالُ لِي: نَائِمٌ، فَأَتَوَسَّدُ رِدَائِي، ثُمَّ أَضطَجِعُ حَتَّى يَخرُجَ إِلَى الظُّهرِ، فَيَقُولُ: مَتَى كُنتَ هَاهُنَا يَا ابنَ عَمِّ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟ فَأَقُولُ: مُنذُ طَوِيلٍ، فَيَقُولُ: بِئسَ مَا صَنَعتَ هَلاَ أَعلَمتَنِي؟ فَأَقُولُ: أَرَدتُ أَن تَخرُجَ إِلَيَّ، وَقَد قَضَيتَ حَاجَتَكَ»(٤).

واتە: ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، وتویەتی: بە دوای زانستدا گەڕام زۆربەیم دەست نەكەوت لە ناو ئەنصارییەكان نەبێت (زۆربەی لەناو ئەنصارییەكاندا هەبوو)، منیش دەچووم بۆ لای پیاوێک (لەوان)و پرسیارم دەربارەی دەكرد (دەمووت كوا فلان؟) پێم دەوترا: خەوتووە، منیش جوببەو

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده مظلم.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

عەباكەمم دەخستە ژێر سەرم و پاڵ دەكەوتم تاوەكو (كابرا) بۆ نوێژی نیوەڕۆ دەردەچوو (منی دەبینی)و دەیووت: لە كەیەوە لێرەی ئەی كوڕە مامی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ منیش دەمووت: لەمێژە، دەیووت: خراپت كردووە بۆچی ئاگادارت ناكردمەوە؟ منیش دەمووت: ویستم بێیتە دەرەوە بۆ لام لە كاتێكدا كارو پێویستیەكانت تەواو كردوەو (سەلیقەی زانست بەخشینت هەیە).

**٥٨٧- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: وُجِدَ أَكثَرُ حَدِيثِ رَسُولِ اللهِ ﷺ عِندَ هَذَا الحَيِّ مِنَ الأَنصَارِ وَاللهِ إِن كُنتُ لَآتِي الرَّجُلَ مِنهُم فَيُقَالُ: هُوَ نَائِمٌ، فَلَو شِئتُ أَن يُوقَظَ لِي، فَأَدَعُهُ حَتَّى يَخرُجَ لِأَستَطِيبَ بِذَلِكَ حَدِيثَهُ»[١].**

**واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زۆربەی فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو گوندەی ئەنصارِیەكان دەست دەكەوێت، سوێند بە خوا ئەگەر بچمە لای پیاوێک لەوان و بوترێت: ئەو خەوتووە، ئەگەر بمەوێ بۆشم خەبەر بكەنەوە ئەوە وازی لێ دەهێنم (تا بە ئیسرِحاتی خۆی خەبەری دەبێتەوە) تاوەكو بەو كارە قسەكانی جوان و رێک و رەوان بكەم (چونكە ئەگەر لەخەوی بكەن رەنگە بێتە دەرەوەو زوو بە پەشۆكاوی فەرموودەكە بگێڕێتەوەو گرنگیدان بە فەرموودەكە نەمێنێ و، رێزیش بۆ كابرا دانانرێت ئاوا بێزار بكرێت، بەڵكو دەبێ فەرموودەو فەرموودە گێڕەرەوان رێزیان لێ بگیرێت).**

**٥٨٨- «عَن أَبِي سَلَمَةَ، قَالَ: لَو رَفَقتُ بِابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، لَأَصَبْتُ مِنهُ عِلْمَاً كَثِيراً»[٢].**

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر هاورێیەتی ئیبنو عەبباسم (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، بكردایە ئەوە زانستێكی زۆرم لەوەوە پێ دەگەیشت و فێری دەبووم (بەڵام سەبرم نەگرت و لێم فەوتا).

**٥٨٩- «عَنِ الزُّهرِيِّ، قَالَ: كُنتُ آتِي بَابَ عُروَةَ، فَأَجلِسُ بِالبَابِ، وَلَو شِئتُ أَن أَدخُلَ، لَدَخَلتُ، وَلَكِن إِجلَالاً لَهُ»[٣].**

واتە: لە زوهری گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من هەموو جار دەهاتمە بەر دەرگای ماڵی عوڕوە و لەناو دەرگاكە دادەنیشتم (تا كە هات زانستی لێ وەربگرم)، خۆ ئەگەر مەبەستم بووایە بچمە ژوورەوە، دەچوومە ژوورەوە (چونكە رێگایان دابووم)، بەڵام (نەدەچووم) لەبەر رێز و گەورەیی عوڕوە.

**٥٩٠- غير موجود[٤].**

**٥٩١- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قُلتُ لِرَجُلٍ مِنَ الأَنصَارِ يَا فُلَانُ هَلُمَّ فَلنَسأَل أَصحَابَ النَّبِيِّ ﷺ، فَإِنَّهُمُ اليَومَ كَثِيرٌ، فَقَالَ: واعجباً لَكَ يَا ابنَ عَبَّاسٍ، أَتَرَى النَّاسَ يَحتَاجُونَ إِلَيكَ، وَفِي النَّاسِ مِن أَصحَابِ النَّبِيِّ ﷺ مَن تَرَى؟ فَتَرَكَ ذَلِكَ، وَأَقبَلتُ عَلَى المَسأَلَةِ، فَإِن كَانَ لَيَبلُغُنِي الحَدِيثُ**

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ سقط في الترقيم.

عَنِ الرَّجُلِ فَآتِيهِ، وَهُوَ قَائِلٌ، فَأَتَوَسَّدُ رِدَائِي عَلَى بَابِهِ، فَتَسفِي الرِّيحُ عَلَى وَجهِي التُّرَابَ، فَيَخرُجُ، فَيَرَانِي، فَيَقُولُ: يَا ابنَ عَمِّ رَسُولِ اللهِ مَا جَاءَ بِكَ؟ أَلاَ أَرسَلتَ إِلَيَّ فَآتِيَكَ؟ فَأَقُولُ: لاَ، أَنَا أَحَقُّ أَن آتِيَكَ، فَأَسأَلُهُ عَنِ الحَدِيثِ قَالَ: فَبَقِيَ الرَّجُلُ حَتَّى رَآنِي، وَقَدِ اجتَمَعَ النَّاسُ عَلَيَّ، فَقَالَ: كَانَ هَذَا الفَتَى أَعقَلَ مِنِّي»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: كاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی كرد، بە پیاوێكی ئەنصاریم وت: ئەی فلان وەرە با پرسیاران لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بكەین ئەوان ئەمڕۆ زۆرن، وتی: ئای چەندە سەیری ئیبنو عەبباس، پێت وایە خەڵكی پێویستیان بە تۆ دەبێت لە كاتێكدا ئەو (هەموو) هاوەڵانەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە دەیان بینی بوونیان هەیە لەناو خەڵكیدا؟! (بۆیە ئەو) وازی هێنا (نەهات لەگەڵم)، منیش دەستم كرد بە پرسیار كردن، جا ئەگەر فەرموودەیەكم پێ گەیشتبێ لە پیاوێكەوە (بیان وتبایە فەرموودەیەكی لەلایە) ئەوە دەچوومە لای لە كاتێكدا لە قەیلولەدا بووە (خەوتووە)، منیش جوببەكەم كردۆتە سەرین و خستومەتە ژێر سەرم لەناو دەرگای ماڵەكەیدا و، باو بۆران خۆڵی خستومەتە سەر ڕوخسارم، كابراش هاتۆتە دەرەوە و منی بینیوە و وتویەتی: ئەی كوڕە مامی پێغەمبەری خوا ﷺ چ شتێک تۆی هێناوە؟ بۆ نەتنارد بە دوامدا خۆم دەهاتم؟! منیش دەمووت: نەخێر، من دەبێ بێمە لات، جا پرسیارم لێكردوە دەربارەی فەرمووده، جا كابرای (كە سەرەتا پێم وت وەرە با بچین فەرمووده كۆبكەینەوەو لەگەڵم نەهات) هەر مابوو تا ئەو كاتەی منی بینی خەڵک لەسەر سەرم كۆدەبوونەوەو (پێویستیان بە من بوو)، كابرا وتی: ئەو گەنجە لە من ژیرتر بوو.

٥٩٢- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ بُرَيدَةَ، أَنَّ رَجُلاً مَن أَصحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، رَحَلَ إِلَى فَضَالَةَ بنِ عُبَيدٍ ﷺ وَهُوَ بِمِصرَ، فَقَدِمَ عَلَيهِ وَهُوَ يَمُدُّ لِنَاقَةٍ لَهُ، فَقَالَ: مَرحَبًا، قَالَ: أَمَا إِنِّي لَم آتِكَ زَائِرًا، وَلَكِن سَمِعتُ أَنَا وَأَنتَ حَدِيثًا مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ، رَجَوتُ أَن يَكُونَ عِندَكَ مِنهُ عِلمٌ- قَالَ: كَذَا وَكَذَا»[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی بوڕەیدە گێردراوەتەوە، كە پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ سەفەری كردووە بۆ لای فەضاڵەی كوڕی عوبەید ﷺ كە لە میسر بوو، چوو بۆ لای و فەضاڵەش وشترێكی خۆی (بەدەستەوە بوو) و ڕایدەكێشا و وتی: مەرحەبا (سڵاوت لێ بێ)، پیاوەكە وتی: من نەهاتووم بۆ لای تۆ بۆ سەردان، بەڵكو من و تۆ فەرموودەمان گوێ لێ بووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئومێدم وایە زانستێكت دەربارەی هەیە، فەضاڵەش وتی: ئاواو ئاوا (واتە: فەرموودەی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ كابرا گێڕایەوە).

## بابەت: پاراستنی زانست

٥٩٣- «عَنِ الحَسَنِ ﷺ، أَنَّهُ دَخَلَ السُّوقَ، فَسَاوَمَ رَجُلاً بِثَوبٍ، فَقَالَ: هُوَ لَكَ بِكَذَا وَكَذَا، وَاللهِ لَو كَانَ غَيرَكَ مَا أَعطَيتُهُ فَقَالَ: فَعَلتُمُوهَا؟ فَمَا رُئِيَ بَعدَهَا مُشتَرِيًا مِنَ السُّوقِ، وَلاَ بَائِعًا حَتَّى لَحِقَ بِاللهِ عَزَّ وَجَلَّ»[٣].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە حەسەن ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە چۆتە بازاڕو مامەڵەی لەگەڵ پیاوێک کرد لەسەر پۆشاکێک، کابراش وتی: با بۆ تۆ بێت بەوەندە و بەوەندە، سوێند بە خوا ئەگەر کەسێکی جگە لە تۆ بێ پێم نەدەدا (بەوەندە)، حەسەنیش وتی: ئاواتان کردوە (ئەوە جیاوازی دەکەن)؟! جا لەپاشی ئەو جارە، نە بە کڕیار و، نە بە فرۆشیار لە بازاڕ نەبینرا تا گەیشتەوە خوای زاڵی پایەدار (وەفاتی کرد).

٥٩٤- «عَن إِبرَاهِيمَ، أَنَّهُ كَانَ لاَ يَشتَرِي مِمَّن يَعرِفُهُ»[١].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، کە شتی نەکریوە لە کەسێک کە ناسیبێتی (هەر لە نەناسراوی کڕیوە).

٥٩٥- «عَن عُبَيدِ بنِ الحَسَنِ، قَالَ: قَسَمَ مُصعَبُ بنُ الزُّبَيرِ، مَالاً فِي قُرَّاءِ أَهلِ الكُوفَةِ، حِينَ دَخَلَ شَهرُ رَمَضَانَ، فَبَعَثَ إِلَى عَبدِ الرَّحمَنِ بنِ مَعقِلٍ بِأَلفَي دِرهَمٍ، فَقَالَ لَهُ: استَعِن بِهَا فِي شَهرِكَ هَذَا فَرَدَّهَا عَبدُ الرَّحمَنِ بنُ مَعقِلٍ، وَقَالَ: لَم نَقرَأِ القُرآنَ لِهَذَا»[٢].

واتە: لە عوبەیدی کوڕی حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: موصعەبی کوڕی زوبەیر پارەی لە نێوان قوڕئانخوێنەکانی کوفە دابەش کرد کاتێ ڕەمەزان دەهات، دوو هەزار درهەمیشی نارد بۆ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەعقیل و وتی: خۆتی پێ بەڕێوە ببە لەو مانگەتداو بۆ خۆتی بکە مەسرەف، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی مەعقیلیش پارەکەی بۆ گەڕاندەوەو وتی: قوڕئانمان نەخوێندووە بۆ ئەوە (بۆ پارەو پول).

٥٩٦- «حَدَّثَنِي عُبَيدُ اللهِ بنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ عُمَرَ بنَ الخَطَّابِ ﷺ تَعَالَى، قَالَ: لِعَبدِ اللهِ بنِ سَلاَمٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُ: مَن أَربَابُ العِلمِ؟ قَالَ الَّذِينَ يَعمَلُونَ بِمَا يَعلَمُونَ، قَالَ: فَمَا يَنفِي العِلمَ مِن صُدوور الرِّجَالِ، قَالَ: الطَّمَعُ»[٣].

واتە: لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بە عەبدوڵڵای کوڕی سەلامی وت: کێ خاوەنی زانستە (کێ زانان)؟ وتی: ئەوانەی کار دەکەن بەوەی دەیزانن، عومەر وتی: چ شتێک زانست ناهێڵێت لە دڵی مرۆڤ؟ وتی: تەماحی.

٥٩٧- «عَن عَطَاءٍ ﷺ، قَالَ: مَا أَوَى شَيءٌ إِلَى شَيءٍ، أَزيَنَ مِن حِلمٍ إِلَى عِلمٍ»[٤].

واتە: لە عەطائەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ شتێک نیە لەگەڵ شتێکیتری بخەیت جوانتر بێ لە کۆکردنەوەو وەگەڵخستنی هێدی و مەندیەوە لەگەڵ زانست.

٥٩٨- «عَن عَامِرٍ الشَّعبِيِّ، قَالَ: زَينُ العِلمِ حِلمُ أَهلِهِ»[٥].

---

(١) ـ إسناده ضعيف جداً.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واته: له عامری شەعبی گێردراوەتەوە، وتویەتی: جوانی زانست بە هێدی و مەندی خاوەنەکەیەتی (واته: خاوەنی زانست بە هێدی و مەندیەوە جوانه).

٥٩٩- «عَن طَاوُسٍ، قَالَ: مَا حُمِلَ العِلمُ فِي مِثلِ جِرَابِ حِلمٍ»[١].

واته: له طاووس گێردراوەتەوە، وتویەتی: زانست هەڵنەگیراوە (بە جوانی و تۆکمەیی) وەک ئەو کەسەی بە هێدی و مەندیەوە تاقی کردۆتەوە (واته: ئەو کەسانەی هێدی و مەندن زانست جوانتر هەڵدەگرن و نیشانی دەدەن).

٦٠٠- «عَنِ الشَّعبِيِّ، قَالَ: زَينُ العِلمِ حِلمُ أَهلِهِ»[٢].

واته: له شەعبیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: جوانی زانست بە هێدی و مەندی خاوەنەکەیەتی (واته: خاوەنی زانست بە هێدی و مەندیەوە جوانه).

٦٠١- «عَن وَهبِ بنِ مُنَبِّهٍ قَالَ: إِنَّ الحِكمَةَ تَسكُنُ القَلبَ الوَادِعَ السَّاكِنَ»[٣].

واته: له وەهبی کوڕی مونەببیهەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: بە دڵنیایی دانایی له دڵێکی ئارام جێگیر دەبێت و دەچەسپێ.

٦٠٢- «أَخبَرَنَا مُحَمَّدُ بنُ أَحمَدَ، قَالَ: سَمِعتُ سُفيَانَ، يَقُولُ: قَالَ عُبَيدُ اللهِ، شِنتُمُ العِلمَ، وَأَذهَبتُم نُورَهُ، وَلَو أَدرَكَنِي وَإِيَّاكُم عُمَرُ ﷺ لأَوجَعَنَا»[٤].

واته: له موحەممەدی کوڕی ئەحمەد گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم له سوفیان بوو دەیوت: عوبەیدوڵلا وتی: زانستتان لەکەدارو عەیبدار کردووە و ڕووناکی و گەشاوەییەکەتان نەهێشتتووە، ئەگەر هاتوو عومەر ﷺ بە من و ئێوە گەیشتبێ (له سەردەمی ئێمەبا) ئەوە ئازاری پێ دەگەیاندین و (باش لێی دەداین و تەمێی دەکردین).

٦٠٣- «عَن أُمَيٍّ المُرَادِيِّ، قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ تَعَلَّمُوا العِلمَ، فَإِذَا عَلِمتُمُوهُ، فَاكظِمُوا عليهِ، وَلاَ تَشُوبُوهُ بِضَحِكٍ، وَلاَ بِلَعِبٍ فَتَمُجَّهُ القُلُوبُ»[٥].

واته: له ئومەییی موڕادی گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێشەوا عەلی ﷺ وتی: خۆتان فێری زانست بکەن، جا ئەگەر فێری بوون دەستی پێوە بگرن قەتیسی بکەن و تێکەڵی مەکەن بە قریتە قریت و پێکەنینی

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الأثر صحيح لغيره.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

نەشیاو گەمە و گاڵتە، نەوەک دڵەکان دەیخەنە دەرەوەو قەبوڵی ناکەن (زانستەکە خۆی ڕاناگرێت و نامێنێتەوە لە دڵەکانتان و خەڵکیش ناچێتە دڵیەوە و لێتانی وەرناگرێت).

**٦٠٤- «عَن عَلِيِّ بنِ حُسَينٍ ﷺ قَالَ: مَن ضَحِكَ ضَحكَةً، مَجَّ مَجَّةً مِنَ العِلمِ»[١].**

واتە: لە عەلی کوڕی حوسەین ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک یەک پێکەنین پێبکەنێت ئەوە دڵی بەشێک لە زانست فڕێ دەداتە دەرەوە (واتە: بە ئەندازەی گەمەو گاڵتەو شتی پوچ زانست لە دڵ دەچێتە دەرەوە).

سەرنج: لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە کەسی زانا هەرگیز نابێ پێبکەنێ، چونکە ئەوان پێغەمبەریان بینیوە هەموو کات زەردەخەنەی لەسەر لێوە پیرۆزەکانی بووە، بەڵکو مەبەستی پێکەنینی نەشیاوی گێلانەیە کە لە شکۆی مرۆڤ دێنێتە خوارەوە.

**٦٠٥- «عَن سُفيَانَ، أَنَّ عُمَرَ ﷺ قَالَ لِكَعبٍ: مَن أَربَابُ العِلمِ؟ قَالَ: الَّذِينَ يَعمَلُونَ بِمَا يَعلَمُونَ قَالَ: فَمَا أَخرَجَ العِلمَ مِن قُلُوبِ العُلَمَاءِ؟ قَالَ: الطَّمَعُ»[٢].**

واتە: لە سوفیان گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بە کەعبی وت: کێ خاوەنی زانستە وتی: ئەوانەی کار دەکەن بەوەی دەیزانن، (عومەر ﷺ) وتی: چ شتێک زانست ناهێڵێت لە دڵی مرۆڤ؟ وتی: تەماحی.

**٦٠٦- «عَن أَبِي إِيَاسٍ، قَالَ: كُنتُ نَازِلاً عَلَى عَمرِو بنِ النُّعمَانِ، فَأَتَاهُ رَسُولُ مُصعَبِ بنِ الزُّبَيرِ، حِينَ حَضَرَهُ رَمَضَانُ، بِأَلفَي دِرهَمٍ، فَقَالَ: إِنَّ الأَمِيرَ يُقرِئُكَ السَّلاَمَ، وَقَالَ: إِنَّا لَم نَدَع قَارِئًا شَرِيفًا، إلاَّ وَقَد وَصَلَ إِلَيهِ مِنَّا مَعرُوفٌ، فَاستَعِن بِهَذَينِ عَلَى نَفَقَةِ شَهرِكَ هَذَا فَقَالَ: أَقرِئِ الأَمِيرَ السَّلاَمَ، وَقُل لَهُ: إِنَّا وَاللهِ مَا قَرَأنَا القُرآنَ نُرِيدُ بِهِ الدُّنيَا، وَدِرهَمَهَا»[٣].**

واتە: لە ئەبو ئیاس گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەلای عەمری کوڕی نوعمانەوە لامدا و مامەوە، کاتێک ڕەمەزان هات نێردراوی موصعەبی کوڕی زوبەیر هات بۆ لای بە دوو سەد درهەمەوەو وتی: ئەمیر (واتە: موصعەبی کوڕی زوبەیر) سەلامی لێ دەکردی و وتی: ئێمە قوڕئانخوێنی گەورەو بەڕێز وێڵ ناکەین حەتمەن دەبێ چاکەیەک و شتێکی باشی لە ئێمەوە پێ بگات، بۆیە ئەو دوو سەد درهەمە بکە بە مەسرەفی ئەو مانگەت، (عەمر)یش وتی: سەلام لە ئەمیر بکە و پێی بڵێ: سوێند بە خوا قوڕئانمان نەخوێندووە مەبەستمان پێی دونیا و درهەمی دونیا بێت (نامەوێت و بۆی بگەڕێنەوە).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده معضل.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: سوننەت دادوەرە بەسەر قورئان (یان ڕوونکەرەوەیە بۆ قورئان)

٦٠٧- «عَنِ المِقدَامِ بنِ مَعدِ يكَرِبَ الكِندِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ حَرَّمَ أَشيَاءَ يَومَ خَيبَرَ الحِمَارَ وَغَيرَهُ- ثُمَّ قَالَ: لَيُوشِكُ الرَّجلِ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِهِ، يُحَدِّثُ بِحَدِيثِي فَيَقُولُ: بَينَنَا وَبَينَكُم كِتَابُ اللهِ، مَا وَجَدنَا فِيهِ مِن حَلَالٍ، استَحلَلنَاهُ، وَمَا وَجَدنَا فِيهِ مِن حَرَامٍ، حَرَّمنَاهُ، أَلاَ وَإِنَّ مَا حَرَّمَ رَسُولُ اللهِ، فهُوَ مِثلُ مَا حَرَّمَ اللهُ تَعَالَى»[١].

واتە: لە میقدادی کوڕی مەعدی یەکەریبی کیندی ﷺ گێڕاوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ شتانێکی حەڕام کرد لە ڕۆژی خەیبەردا کە بریتی بوو لە (خواردنی گۆشتی) کەر و شتانێکی تریش (وەک حەڕام کردنی خواردنی گۆشتی ئەو گیاندارانەی کەڵبەی بەهێزیان هەیە، یان ئەو باڵندانەی چڕنووکی بەهێزیان هەیە)، دواتر (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: نزیکە پیاوی وا پەیا ببێت لەسەر لا ڕانێک و لاتەنیشتێک پاڵ بکەوێت (بە تێر و تەمەڵی)و فەرموودەی من باس بکات و بڵێت: لە نێوان ئێمە و ئێوە کتێبی خوا هەیە (تەنها دەبێ ئەو کاری پێ بکرێت)، ئەوەی بینیمان تیایدا لە حەڵاڵ ئەوە بە حەڵاڵی دەزانین، وە ئەوەی بینیمان تیایدا لە حەڕام ئەوە بە حەڕامی دەزانین (واتە: هیچ کارمان بە فەرموودە نیە!).

دواتر (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئاگادار بن ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ حەڕامی کردوە وەک ئەوە وایە کە خوا حەڕامی کردوە (هیچ جیاوازی نیە، هەردووکی فەرمانی خوا و وەحیە).

٦٠٨- «عَن يَحيَى بنِ أَبِي كَثِيرٍ، قَالَ: السُّنَّةُ قَاضِيَةٌ عَلَى القُرآنِ، وَلَيسَ القُرآنُ بِقَاضٍ عَلَى السُّنَّةِ»[٢].

واتە: لە یەحیای کوڕی ئیبنو کەثیر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سوننەت دادوەرە بەسەر قورئاندا، بەڵام قورئان دادوەر نیە بەسەر سوننەت (چونکە سوننەت ڕوونکەرەوە و درێژەپێدەری قورئانە، بە دڵنیاییەوە ئەو دەبێتە یەکلایی کەرەوە و دادوەر لە مەسەلەکاندا).

٦٠٩- «عَن حَسَّانَ، قَالَ: كَانَ جِبرِيلُ يَنزِلُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِالسُّنَّةِ، كَمَا يَنزِلُ عَلَيهِ بِالقُرآنِ»[٣].

واتە: لە حەسسان گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: جیبریل بە سوننەتەوە دادەبەزی بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ (فەرموودەی بۆ دەهێنا)، هەر وەک چۆن بە قورئانەوە دادەبەزی بۆ سەری و (قورئانی بۆ دەهێنا).

٦١٠- «عَن مَكحُولٍ قَالَ: السُّنَّةُ سُنَّتَانِ: سُنَّةٌ الأَخذُ بِهَا فَرِيضَةٌ، وَتَركُهَا كُفرٌ، وَسُنَّةٌ الأَخذُ بِهَا فَضِيلَةٌ، وَتَركُهَا إِلَى غَيرِ حَرَجٍ»[٤].

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە مەکحول گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سوننەت دوو جۆرە سوننەتە: سوننەتێک دەست پێوەگرتنی واجبە و واز لێهێنانی کوفرە (وەک شێوازی ئەو نوێژەی ئێستامان کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وەرگیراوە، جا هەر کەسێک واز لەو شێوازە بێنێت و نوێژێکی جیاواز دابهێنێت ئەوە کافر دەبێت)، سوننەتێکیش دەست پێوەگرتنی خێرە و واز لێهێنانی گوناهی تیا نیە (وەک سیواک و نوێژە سوننەتەکان و ڕۆژووە سوننەتەکان و ...هتد).

٦١١- «عَن سَعِيدِ بنِ جُبَيرٍ أَنَّهُ حَدَّثَ يَومًا بِحَدِيثٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ رَجُلٌ: فِي كِتَابِ اللهِ مَا يُخَالِفُ هَذَا، قَالَ: لاَ أُرَانِي أُحَدِّثُكَ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ وَتُعَرِّضُ فِيهِ بِكِتَابِ اللهِ، كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَعلَمَ بِكِتَابِ اللهِ تَعَالَى مِنكَ»[١].

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیر گێڕدراوەتەوە، کە ڕۆژێک فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕایەوە، پیاوێکیش وتی: لە کتێبی خوا شتێک هەیە پێچەوانەی ئەوەیە (پێچەوانەی ئەو فەرموودەیەیە)، (سەعید) وتی: مەگەر نابینی فەرموودەت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ دەگێڕمەوە کەچی تۆش ڕووبەڕووی دەکەیتەوە بە کتێبی خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ زاناترە لە کتێبی خوا لە تۆ (کەواتە: تۆ لە قوڕئان تێنەگەیشتووی وادەزانی بەریەک کەوتن لە نێوانیاندا هەیە).

## بابەت: لێکدانەوەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ (بە شێوازێکی دروست)

٦١٢- «عَنِ ابنِ مَسعُودٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: إِذَا حُدِّثتُم بِالحَدِيثِ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَظُنُّوا بِهِ الَّذِي هُوَ أَهيَأُ، وَالَّذِي هُوَ أَهدَى، وَالَّذِي هُوَ أَتقَى»[٢].

واتە: لە ئیبنو مەسعود ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر فەرموودەیەکتان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ گێڕدرایەوە ئەوە دڵنیابن کە ئەو فەرموودەیە چاکترین شتە و ڕێنموییترین شتەو پارێزکارترین شتە.

٦١٣- «عَن عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: إِذَا حُدِّثتُم عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَظُنُّوا بِهِ الَّذِي هُوَ أَهدَى، وَالَّذِي هُوَ أَتقَى، وَالَّذِي هُوَ أَهيَأُ»[٣].

واتە: لە عەلی ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر فەرموودەیەکتان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ گێڕدرایەوە ئەوە دڵنیابن کە ئەو فەرموودەیە ڕێنموییترین شتە و پارێزکارترین شتە و چاکترین شتە.

٦١٤- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ إِذَا حَدَّثَ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا، فَليَتَبَوَّأْ مَقعَدَهُ مِنَ النَّارِ»[٤].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ رجاله ثقات، غير أنه منقطع.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێردراوەتەوە، هەموو جار ئەگەر فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕابایەوە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک درۆ بکات بە دەمی منەوە بە ئەنقەست، ئەوە با شوێنێک بۆ خۆی ئامادە بکات لە ئاگر.

٦١٥- «فكانَ ابنُ عبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما إذا حَدَّثَ، قَالَ: إِذَا سَمِعتُمُونِي أُحدِّثُ عَن رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَلَم تَجِدُوهُ فِي كِتَابِ اللهِ أو حَسَنًا عِندَ النَّاسِ، فَاعلَمُوا أَنِّي قد كَذَبتُ عَلَيهِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، هەموو جار ئەگەر فەرموودەی گێڕابایەوە دەیوت: ئەگەر گوێتان لە من بوو فەرموودەم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕایەوەو دەستتان نەکەوت لە پەرتوکی خوا (فەرموودەکە لەگەڵ پەرتوکی خوا تێکی نەکردەوە) یان لەلای خەڵک (شتێکی) چاک نەبوو، ئەوە بزانن من درۆم بە دەمی کردوە (واتە: هەرگیز فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ قورئان و فیترەت دژ نابێت).

٦١٦ـ «عَن عِكرِمَةَ، قَالَ: إِنَّ أَزهَدَ النَّاسِ فِي عَالِمٍ أَهلُهُ»[٢].

واتە: لە عیکریمە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە هەموو کەس دوورە پەرێزتر لە کەسی زانا خانەوادەکەیەتی (ئەوان قەدری زانست زۆر نازانن).

سەرنج: هۆکاری ئەو قسەی عیکریمە لەوە سەرچاوەی گرت، چونکە ڕۆژێکیان عیکریمە کورەکەی خۆی لەگەڵ بوو کەسێکیش لێی پرسی ئایا کورەکەت زانستی تۆی چەند لەبەرە؟ عیکریمەش ئەو قسەی کرد..

٦١٧- غير موجود[٣].

## بابەت: دەورکردنەوەی زانست

٦١٨- «عَن أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ ﷺ، قَالَ: تَذَاكَرُوا الحَدِيثَ، فَإِنَّ الحَدِيثَ يُهَيِّجُ الحَدِيثَ»[٤].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فەرموودە دەور بکەنەوە، چونکە فەرموودە فەرموودە دەجوڵێنێت و (بیرتان دەکەوێتەوە و دەیچەسپێنێت).

٦١٩- «عَن أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ ﷺ، قَالَ تَذَاكَرُوا الحَدِيثَ، فَإِنَّ الحَدِيثَ يُهَيِّجُ الحَدِيثَ»[٥].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فەرموودە دەور بکەنەوە، چونکە فەرموودە فەرموودە دەجوڵێنێت و (بیرتان دەکەوێتەوە و دەیچەسپێنێت).

---

(١) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ سقط في الترقيم.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

**٦٢٠- «عَن أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ ﷺ، قَالَ: تَذَاكَرُوا الحَدِيثَ، فَإِنَّ الحَدِيثَ يُهَيِّجُ الحَدِيثَ»[١].**

**واتە: لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: فەرموودە دەور بكەنەوە، چونكە فەرموودە فەرموودە دەجولێنێت و (بیرتان دەكەوێتەوە و دەیچەسپێنێت).**

**٦٢١- «أَخبَرَنَا أَبُو مَعمَرٍ، عَن أَبِي مُعَاوِيَةَ، عَنِ الأَعمَشِ، عَن أَبِي بِشرٍ، عَن أَبِي نَضرَةَ، عَن أَبِي سَعِيدٍ»[٢].**

**واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان وتە هاتوە.**

**٦٢٢- «وَابنِ عُلَيَّةَ، عَنِ الجُرَيرِيِّ، عَن أَبِي نَضرَةَ، عَن أَبِي سَعِيدٍ»[٣].**

**واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان وتە هاتوە.**

**٦٢٣- «أَخبَرَنَا أَبُو مَسلَمَةَ، يَعنِي عَن أَبِي نَضرَةَ، عَن أَبِي سَعِيدٍ وَفِيهِ كَلَامٌ أَكثَرُ مِن هَذَا»[٤].**

**واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان وتە هاتوە.**

**٦٢٤- «عَن عَمرٍو، قَالَ: قَالَ لِي طَاوُسٌ اذهَب بِنَا نُجَالِسِ النَّاسَ»[٥].**

**واتە: لە عەمرِ گێردراوەتەوە، وتویەتی: طاووس پێی وتم: وەرە لەگەڵمان لەگەڵ خەڵكی دابنیشین.**

**٦٢٥- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: تَذَاكَرُوا هَذَا الحَدِيثَ، لاَ يَنفَلِت مِنكُم، فَإِنَّهُ لَيسَ مِثلَ القُرآنِ مَجمُوعٌ مَحفُوظٌ، وَإِنَّكُم إِن لَم تَذَاكَرُوا هَذَا الحَدِيثَ يَنفَلِت مِنكُم، وَلاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُم حَدَّثتُ أَمسِ فَلاَ أُحَدِّثُ اليَومَ، بَل حَدِّث أَمسِ، وَلتُحَدِّثِ اليَومَ، وَلتُحَدِّث غَدًا»[٦].**

**واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەم فەرموودانە دەور بكەنەوە با لە دەستتان دەرنەچێ (با لەبیرتان نەچێتەوە)، چونكە وەكو قورئان نیە كۆكرابێتەوەو پارێزراو بێت، وە ئێوە ئەگەر ئەم فەرموودانە دەور نەكەنەوە لە دەستتان دەردەچێت (لە بیرتان دەچێتەوە)، با هیچ كەسێک لە ئێوە نەڵێت: دوێنێ فەرموودەم گێرایەوەو (دەورم كردەوە) ئەمڕۆ نایگێڕمەوەو دەوری ناكەمەوە، بەڵكو ڕۆژی پێشتریش باسیان بكە و (بیان گێڕەرەوە)و ئەمڕۆش باسیان بكەو (بیان گێڕەرەوە)و بەیانیش باسی بكەو (دەوری بكەوەو هەر بەردەوامبە).**

---

(١) ـ رجاله ثقات.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده حسن.

(٦) ـ رجاله ثقات.

٦٢٦- «حَدَّثَنِي سَعِيدُ بنُ جُبَيرٍ، قَالَ: قَالَ ابنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، رُدُّوا الحَدِيثَ وَاستَذكِرُوهُ فَإِنَّهُ إِن لَم تَذكُرُوهُ، ذَهَبَ، وَلاَ يَقُولَنَّ رَجُلٌ لِحَدِيثٍ قَد حَدَّثَهُ: قَد حَدَّثتُهُ مَرَّةً، فَإِنَّهُ مَن كَانَ سَمِعَهُ يَزدَادُ بِهِ عِلمًا، وَيَسمَعُ مَن لَم يَسمَع»[١].

واتە: لە سەعیدی كوڕی جوبەیر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، وتویەتی: فەرموودە دووبارە بكەنەوەو بیرخۆتانی بێننەوە و دەوری بكەنەوە، چونكە ئەگەر دەوری نەكەنەوەو بیرخۆتانی نەهێننەوە دەڕوات و (بیرتان دەچێتەوە)، با هیچ پیاوێكیش دەربارەی فەرموودەیێک كە گێڕاویەتیەوەو (بۆ خەڵكی باسی كردوە) نەڵێت جارێک گێڕاومەتەوەو (دووبارەی ناكەمەوەو چیتر بۆ خەڵكی باس ناكەم، نەخێر بێ هەر بیگێڕێتەوە)، چونكە ئەوەی گوێی لێ بووە زانستەكەی بە هۆی دووبارە گوێبیست بوونەوەی زیاد دەكات و (بیری ناچێتەوە)، ئەوەی گوێشی لێ نەبووە گوێبیست دەبێت.

٦٢٧- «عَن عَبدِ الرَّحمَنِ بنِ أَبِي لَيلَى، قَالَ: تَذَاكَرُوا، فَإِنَّ إِحيَاءَ الحَدِيثِ مُذَاكَرَتُهُ»[٢].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەبو لەیلا گێڕدراوەتەوە، كە وتویەتی: دەور بكەنەوەو بیرخۆتانی بخەنەوە، چونكە زیندوو ڕاگرتنی فەرموودە دەوركردنەوەیەتی.

٦٢٨- «عَن عَلقَمَةَ، قَالَ: تَذَاكَرُوا الحَدِيثَ، فَإِنَّ ذِكرَهُ حَيَاتُهُ»[٣].

واتە: عەلقەمە وتویەتی: دەور بكەنەوەو بیرخۆتانی بخەنەوە، چونكە دەوركردنەوەی فەرموودە زیندوو ڕاگرتنیەتی.

٦٢٩- «عَن زِيَادِ بنِ سَعدٍ، قَالَ: كَانَ ابنُ شِهَابٍ، يُحَدِّثُ الأَعرَابَ»[٤].

واتە: لە زیادی كوڕی سەعد گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئیبنو شیهاب فەرموودەی بۆ عەڕەبە دەشتەكیەكان دەگێڕایەوە (هەرچەندە دەشتەكیەكان كەم كردارو نەزان بوون و لە دوای زانست نەبوون، بەڵام بۆیە بۆی دەگێڕانەوە تا خۆی بیری نەچێتەوەو ئەوانیش سوودێكی لێ ببینن و كار بە چەند فەرموودەیەک بكەن).

٦٣٠- «عَنِ الأَعمَشِ، قَالَ: كَانَ إِسمَاعِيلُ بنُ رَجَاءٍ، يَجمَعُ صِبيَانَ الكُتَّابِ، يُحَدِّثُهُم، يَتَحَفَّظُ بِذَلِكَ»[٥].

واتە: لە ئەعمەش گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیسماعیلی كوڕی ڕەجاء هەموو جار منداڵانی سەنتەری قوڕئانی كۆ دەكردەوە فەرموودەی بۆ دەگێڕانەوە، بەو كارەی فەرموودەكانی خۆی ڕادەگرت و (لەبەری

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

دەكردو لەبیری نەدەكرد، جگە لەوەی منداڵەكانیش زۆر بە جوانی لەبەریان دەكرد، چونكە لەبەركردنی منداڵ زۆر بەهێزە).

٦٣١- «عَن إبرَاهِيمَ، قَالَ: حَدِّث حَدِيثَكَ، مَن يَشتَهِيهِ، وَمَن لاَ يَشتَهِيهِ، فَإِنَّهُ يَصِيرُ عِندَكَ كَأَنَّهُ إِمَامٌ تَقرَؤُهُ»[١].

واتە: لە ئیبراهیمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: فەرموودەكانت (كە لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاوتەتەوە) بیگێڕەوە بۆ ئەو كەسەی كە حەزی لێیەتی و بۆ ئەو كەسەش كە حەزی لێ نیە، چونكە لەلای تۆ (فەرموودەكان) وەک پەرتوكێكی لێ دێت كە بیخوێنیتەوە (ئاوا لەبەركردنەكەت دەمێنێتەوە و بەهێز دەبێت، وەک پەرتوكی لێ دێت و نافەوتێت).

٦٣٢- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: إِذَا سَمِعتُم مِنَّا حَدِيثًا، فَتَذَاكَرُوهُ بَينَكُم»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر لە ئێمەوە گوێتان لە فەرموودەیەک بوو ئەوە لە نێوان خۆتاندا دەوری بكەنەوە.

٦٣٣- «أَخبَرَنَا يُونُسُ، قَالَ: كُنَّا نَأتِي الحَسَنَ فَإِذَا خَرَجنَا مِن عِندِهِ، تَذَاكَرنَا بَينَنَا»[٣].

واتە: لە یونس گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار دەچووینە لای حەسەن (زانست و فەرموودەمان لێ وەردەگرت)، جا كە لەلای دەردەچووین لە نێوان خۆماندا دەورمان دەكردەوە.

٦٣٤- «عَنِ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُم أَن يَروِيَ حَدِيثًا، فَليُرَدِّدهُ ثَلاَثًا»[٤].

واتە: لە ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر یەكێكتان ویستی فەرموودەیەک بگێڕێتەوە ئەوە با سێ جار دووبارەی بكاتەوە (سێ جار بۆ خەڵكەكە بیگێڕێتەوە تا لە لایان بچەسپێت).

٦٣٥- «عَن عَبدِ الرَّحمَنِ بنِ أَبِي لَيلَى، قَالَ: إِحيَاءُ الحَدِيثِ مُذَاكَرَتُهُ، فَقَالَ لَهُ عَبدُ اللهِ بنُ شَدَّادٍ: يَرحَمُكَ اللهُ كَم مِن حَدِيثٍ أَحيَيتَهُ فِي صَدرِي، كَانَ قَد مَاتَ »[٥].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەبو لەیلا گێردراوەتەوە، وتویەتی: زیندووكردنەوەی فەرموودە دەوركردنەوەو گێڕانەوەیەتی، جا عەبدوڵلای كوڕی شەددادیش پێی وت: ڕەحمەتی خوات لێ بێت فەرموودەی زۆرت لە سینگی من زیندووكردەوە كە مردبوون و فەوتا بوون.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

٦٣٦- «حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ فُضَيلٍ، عَن أَبِيهِ، قَالَ: كَانَ الحَارِثُ بنُ يَزِيدَ العُكلِيُّ، وَابنُ شُبرُمَةَ، وَالقَعقَاعُ بنُ يَزِيدَ، وَمُغِيرَةُ، إِذَا صَلَّوا العِشَاءَ الآخِرَةَ، جَلَسُوا فِي الفِقهِ، فَلَم يُفَرِق بَينَهُم إِلاَّ أَذَانُ الصُّبحِ»[1].

واتە: موحەممەدی كوڕی فوزەیل لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: هەموو جار حاریثی كوڕی یەزیدی عوكلی و ئیبنو شوبرومو و قەعقاعی كوڕی یەزیدو موغیرە كاتێ نوێژی عیشایان دەكرد دادەنیشتن بۆ فیقە، هیچ شتێک بڵاوەی پێ نەدەكردن و لێكی جیانەدەكردنەوە تەنها بانگی بەیانی نەبێت (واتە: تا بانگی بەیانی هەر خەریكی زانستی فیقە و دەوركردنەوە بوون و لێک جیا نەدەبونەوە بۆ نوێژی بەیانی نەبێت).

٦٣٧- «عَن عَطَاءٍ، وَطَاوُسٍ، وَمُجَاهِدٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: عَنِ اثنَينِ مِنهُم لاَ بَأسَ بِالسَّمَرِ فِي الفِقهِ»[2].

واتە: لە عەطاء و طاووس و موجاهید (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، كە دوو لەمان (لەو سێ زانایانە وتویانە) دانیشتنی شەوانەو قسەكردن تیایدا دەربارەی فیقە هیچی تیا نیە و (دروستە).

٦٣٨- «عَن مُجَاهِدٍ، قَالَ: لاَ بَأسَ بِالسَّمَرِ فِي الفِقهِ»[3].

واتە: لە موجاهید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دانیشتنی شەوانە و قسەكردن تیایدا دەربارەی فیقە هیچی تیا نیە و (دروستە، چونكە بۆ زانستە).

٦٣٩- «عَنِ ابنِ جُرَيجٍ، قَالَ: قَالَ ابنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، تَدَارُسُ العِلمِ سَاعَةً مِنَ اللَّيلِ، خَيرٌ مِن إِحيَائِهَا»[4].

واتە: لە ئیبنو جورەیج گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، وتویەتی: دەرس وتنەوەی زانست لە بەشێكی شەودا، چاكترە و پاداشتی زیاترە لە زیندوو كردنەوەی (بە شەونوێژ).

٦٤٠- «عَن عَطَاءٍ، قَالَ: كُنَّا نَأتِي جَابِرَ بنَ عَبدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، فَإِذَا خَرَجنَا مِن عِندِهِ تَذَاكَرنَا، فَكَانَ أَبُو الزُّبَيرِ أَحفَظَنَا لِحَدِيثِهِ»[5].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە دەچووینە لای جابری كوڕی عەبدوڵڵا (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، جا كە دەردەچووین لە لای ئەو دەورمان دەكردەوەو بۆ یەكتری باسمان دەكرد، ئەبو زوبێریش لە هەمووومان زیاتر فەرموودەكانی ئەوی لەبەر بوو.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

٦٤١- «أَخبَرَنَا مَروَانُ بنُ مُحَمَّدٍ، قَالَ: سَمِعتُ اللَّيثَ بنَ سَعدٍ، يَقُولُ: تذكرَ ابنُ شِهَابٍ لَيلَةً بَعدَ العِشَاءِ حَدِيثًا وَهُوَ جَالِسٌ مُتَوَضِّئًا قَالَ: فَمَا زَالَ ذَلِكَ مَجلِسَهُ حَتَّى أَصبَحَ قَالَ مَروَانُ جَعَلَ يَتَذَاكَرُ الحَدِيثَ»[١].

واتە: لە مەڕوانی كوڕی موحەممەد گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە لەیثی كوڕی سەعد بوو دەیوت: ئیبنو شیهاب فەرموودەیەكی دەور دەكردەوە لە كاتێكدا دانیشتبوو بە دەستنوێژەوە، (لەیث) دەڵێ: بە بەردەوامی ئەو شوێنە دانیشتگەكەی بوو (هەر لەو شوێنە دانیشتبوو) تا بەیانی، مەڕوان وتویەتی: هەر فەرموودەكەی دەور دەكردەوە (واتە: یەک شەوی تەواو لە شوێنی خۆی نەجوڵاوەو، یەک فەرموودەی دەور كردۆتەوە تا لە یادی نەكات).

٦٤٢- «عَنِ الزُّهرِيِّ، قَالَ: كُنتُ إِذَا لَقِيتُ عُبَيدَ اللهِ بنَ عَبدِ اللهِ، فَكَأَنَّمَا أَفجُرُ بِهِ بَحرًا»[٢].

واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من هەر كات بە عوبەیدوڵڵای كوڕی عەبدوڵڵا دەگەم وەک ئەوە وایە دەریایێک بتەقێنمەوە (ئاوا زانست فواڕەی دەكرد، بە ئەندازەی دەریا زانستی پێ بوو، بۆیە كە پێی دەگەیشتم لێم دەردەهێنا و دەتەقایەوە).

٦٤٣- «عَن عُثمَانَ بنِ عَبدِ اللهِ، قَالَ: كَانَ الحَارِثُ العُكلِيُّ وَأَصحَابُهُ، يَتَجَالَسُونَ بِاللَّيلِ، وَيَذكُرُونَ الفِقهَ»[٣].

واتە: لە عوسمانی كوڕی عەبدوڵڵا گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار حارثی عوكلی و هاوەڵەكانی لەگەڵ یەكتری دادەنیشتن بە شەوان و فیقهیان دەور دەكردەوەو بۆ یەكتریان باس دەكرد.

٦٤٤- «عَن عَبدِ اللهِ ﷺ، قَالَ: تَذَاكَرُوا هَذَا الحَدِيثَ، فَإِنَّ حَيَاتَهُ مُذَاكَرَتُهُ»[٤].

واتە: لە عەبدوڵڵاوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەو فەرموودانە دەور بكەنەوە، چونكە زیندوێتی فەرموودە بە دەوركردنەوەیەتی.

٦٤٥- «عَن عَونٍ، قَالَ: قَالَ عَبدُ اللهِ ﷺ، لِأَصحَابِهِ حِينَ قَدِمُوا عَلَيهِ: هَل تَجَالَسُونَ؟ قَالُوا: لَيسَ نُترُكُ ذاكَ- قَالَ: فَهَل تَزَاوَرُونَ؟ قَالُوا: نَعم يَا أَبا عَبدِ الرَّحمَنِ، إِنَّ الرَّجُلَ مِنَّا لَيَفقِدُ أَخَاهُ، فَيَمشِي فِي طَلَبِهِ إِلَى أَقصَى الكُوفَةِ، حَتَّى يَلقَاهُ قَالَ: فَإِنَّكُم لَن تَزَالُوا بِخَيرٍ مَا فَعَلتُم ذَلِكَ»[٥].

واتە: لە عەون گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەبدوڵڵا ﷺ بە هاوەڵەكانی وت كاتێ هاتنە لای: ئایا لەگەڵ یەكتری دادەنیشن (بۆ دەور كردنەوە)؟ وتیان: وازمان لەوە نەهێناوە (بەڵێ ئێستاش هەر دادەنیشین)، وتی: ئایا سەردانی یەكتری دەكەن (بۆ دەور كردنەوە)؟ وتیان: بەڵێ ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان (ئەی

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لعنعنة ابن إسحاق.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

عەبدوڵڵا) پیاوێک لە تیمە براکەی (هاوڕێکەی) بزر دەبێت و بەدوایدا دەگەڕێت تا ئەوسەری کوفە تا پێی دەگات و دەیدۆزێتەوە بەدوایدا دەچێت، عەبدوڵڵا وتی: ئێوە بە بەردەوامی هەر چاک دەبن تا ئاوا بکەن.

٦٤٦- «عَنِ الزُّهرِيِّ، قَالَ: آفَةُ العِلمِ، النِّسيَانُ، وَتَركُ المُذَاكَرَةِ»[١].

واتە: لە زوهری گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئافەتی زانست و لەناوچونی لەبیرچوونەوەو وازهێنانە لە دەورکردنەوە.

٦٤٧- «قَالَ عَبدُ اللهِ ﷺ، آفَةُ الحَدِيثِ النِّسيَانُ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵا وتویەتی: ئافەتی زانست و لەناوچونی لەبیرچوونەوەیەتی.

٦٤٨- «قَالَ عَبدُ اللهِ ﷺ: إنَّ لِكُلِّ شَيءٍ آفَةً، وَآفَةُ العِلمِ النِّسيَانُ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ وتویەتی: بە دڵنیایی بۆ هەر شتێک ئافەت و لەناوچونێک هەیە، ئافەتی زانست و لەناوچونیشی لەبیرچوونەوەیەتی.

٦٤٩- «عَنِ الأَعمَشِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ آفَةُ العِلمِ النِّسيَانُ، وَإِضَاعَتُهُ، أَن تُحَدِّثَ بِهِ غَيرَ أَهلِهِ»[٤].

واتە: لە ئەعمەش گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافەتی زانست و لەناوچونی لەبیرچوونەوەیە، بە فیڕۆدانیشی ئەوەیە کە باسی بکەیت بۆ کەسانێک کە ئەهل و شایستە نەبن.

٦٥٠- «عَنِ الحَسَنِ، قَالَ: غَائِلَةُ العِلمِ، النِّسيَانُ»[٥].

واتە: لە حەسەن گێردراوەتەوە، وتویەتی: لەناوچونی زانست لەیادچونیەتی.

٦٥١- «عَنِ ابنِ بُرَيدَةَ، قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ ﷺ تَذَاكَرُوا هَذَا الحَدِيثَ، وَتَزَاوَرُوا، فَإِنَّكُم إِن لاَ تَفعَلُوا، يَدرُس»[٦].

واتە: لە ئیبنو بورەیدە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێشەوا عەلی ﷺ وتویەتی: ئەو فەرموودانە دەور بکەنەوە و سەردانی یەکتری بکەن (بۆ دەور کردنەوە)، جا ئەگەر واتان نەکرد ئەوە دەڕوات و شوێنەواری دەسڕێتەوە.

٦٥٢- «قَالَ الزُّهرِيُّ: كُنتُ أَحسَبُ بِأَنِّي أَصَبتُ مِنَ العِلمِ فَجَالَستُ عُبَيدَ اللهِ، فَكَأَنِّي كُنتُ فِي شِعبٍ مِنَ الشِّعَابِ»[٧].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف لانقطاعه.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده معضل.

(٥) ـ إسناده ضعيف، لكن الأثر صحيح لغيره.

(٦) ـ إسناده صحيح.

(٧) ـ إسناده صحيح.

واتە: زوهری وتویەتی: پێم وابوو من زانستێكی (زۆرم) پێ گەیشتووە و دەیزانم، (بەڵام) كە لەگەڵ عوبەیدوڵڵا دانیشتم وەک ئەوە وابوو كە لە دۆڵێک بم لە دۆڵەكان (واتە خۆم هاتە بەر چاو وەک ئەوەی هەر لە زانست و زانایان دوور بم و لە دۆڵێک لە دۆڵەكان ژیابم، زانستی عوبەیدوڵڵا ئەوەندە زۆر بوو لەگەڵ هی من بەراورد نەدەكرا).

## بابەت: ڕاجیایی فوقەها و شەرع زانان

٦٥٣- «عَن حُمَيدٍ، قَالَ: قُلتَ لِعُمَرَ بنِ عَبدِ العَزِيزِ: لَو جَمَعتَ النَّاسَ عَلَى شَيءٍ؟ فَقَالَ: مَا يَسُرُّنِي أَنَّهُم لَم يَختَلِفُوا قَالَ: ثُمَّ كَتَبَ إِلَى الآفَاقِ وَإِلَى الأَمصَارِ: لِيَقضِ كُلُّ قَومٍ، بِمَا اجتَمَعَ عَلَيهِ فُقَهَاؤُهُم»[1].

واتە: لە حومەیدە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە عومەری كوڕی عبدولعەزیزم وت: بۆ خەڵكی لەسەر یەک شت كۆناكەیتەوە؟ (عومەری كوڕی عەبدول عەزیز)یش وتی: پێم خۆش نیە كە (فوقەهایان) ڕا جیا نەبن (بەڵكو وا باشە بۆچوون جیاواز بن)، (حومەید) دەڵێ: دواتر بۆ ئەوپەڕی (دەوڵەتی ئیسلامی) و شارەكانی نووسی: هەر قەومێک بێ دادوەری بكات بەوەی فوقەها و زاناكانیان لەسەری كۆكن.

٦٥٤- «عَن عَونِ بنِ عَبدِ اللهِ، قَالَ: مَا أُحِبُّ أَنَّ أَصحَابَ النَّبِيِّ ﷺ لَم يَختَلِفُوا، فَإِنَّهُم لَوِ اجتَمَعُوا عَلَى شَيءٍ، فَتَرَكَهُ رَجُلٌ، تَرَكَ السُّنَّةَ، وَلَوِ اختَلَفُوا فَأَخَذَ رَجُلٌ بِقَولِ أَحَدٍ، أَخَذَ بِالسُّنَّةِ»[2].

واتە: لە عەونی كوڕی عەبدوڵڵا گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێم خۆش نیە كە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بۆچوونیان جیاواز نەبێت (پێم خۆشە بۆچوونیان جیاواز بێت)، چونكە ئەگەر ئەوان لەسەر شتێک (بابەتێک) كۆک بن و كەسێكیش وازی لێ بهێنێت و (بە پێی بۆچوونەكەی ئەوان شتەكە ئەنجام نەدات) ئەوە دەكا وازی لە سوننەت و ڕێگای ڕاست هێناوە، (بەڵام) ئەگەر (هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ) بۆچوونیان جیاواز بێت (لەسەر بابەتەكان) و كەسێكیش بۆچوونی كەسێک (لە هاوەڵەكان) وەربگرێت و (كار بە بۆچوونی ئەو بكات) ئەوە دەستی گرتووە بە سوننەت و ڕێگای ڕاست (كەواتە جیاوازی بۆچوونی هاوەڵان بۆ خەڵكی ڕەحمەتە).

٦٥٥- «عَن طَاوُسٍ، قَالَ: رُبَّمَا رَأَى ابنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا، الرَّأيَ ثُمَّ تَرَكَهُ»[3].

واتە: لە طاووس گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەندێ جار ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، بۆچوونێكی دەبوو دواتر وازی لێ دەهێنا (لێی پەشیمان دەبوویەوە و بۆچوونێكی تری بۆ دروست دەبوو، چونكە بەڵگەی تری جیاوازی دەست دەكەوت).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.




٦٥٦- «عَن مَروَانَ بنِ الحَكَمِ، قَالَ: قَالَ لِي عُثمَانُ بنُ عَفَّانَ، إنَّ عُمَرَ ﷺ قَالَ لِي: إنِّي قَد رَأَيتُ فِي الجَدِّ رَأيًا، فَإِن رَأَيتُم أَن تَتَّبِعُوهُ فَاتَّبِعُوهُ، قَالَ: عُثمَانُ: إن نَتَّبِع رَأيَكَ، فَإِنَّهُ رَشَدٌ، وَإِن نَتَّبِع رَأيَ الشَّيخِ قَبلَكَ، فَنِعمَ ذُو الرَّأيِ كَانَ قَالَ: وَكَانَ أَبُو بَكرٍ يَجعَلُهُ أَبًا»[١].

واتە: لە مەڕوانی كوڕی حەكەمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عوسمانی كوڕی عەففان پێی وتم: عومەر ﷺ پێی وتوم: من دەربارەی (میراتی) باپیر بۆچوونێكم هەیە، جا ئەگەر پێتان باش بوو شوێنكەوتەی بن ئەوە شوێنكەوتەی بن، عوسمان وتی: ئەگەر شوێن بۆچوونی تۆ بكەوین ئەوە بە دڵنیایی ڕێنموییە، هەروەها ئەگەر شوێن بۆچوونی زانای پێش تۆ بكەوین (كە ئیمامی ئەبو بەكرە) ئەوە چاكترین كەسی خاوەن بۆچوون بوو، وتی: ئەبو بەكر باپیری بە باوك دادەنا (واتە: وەك باوك حیسابی دەكرد لە بابەتی میراتی باپیر لەگەڵ چەند براێك).

## بابەت: دەربارەی عەرز كردنی فەرموودەو خوێندنەوەی لەلای خاوەنی فەرموودەكە (تاوەكو ڕێگا بدات قوتابیەكە بیگێڕێتەوە)

٦٥٧- « حَدَّثَنَا عَاصِمٌ الأَحوَلُ، قَالَ: عَرَضتُ عَلَى الشَّعبِيِّ أَحَادِيثَ الفِقهِ، فَأَجَازَهَا لِي»[٢].

واتە: لە عاصمی ئەحوەل گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فەرموودەكانی فقهم بۆ شەعبی عەرز كردو خوێندەوە، ئەویش مۆڵەتی گێڕانەوەی فەرموودەكانی پێدام.

٦٥٨- «حَدَّثَنَا سُفيَانُ بنُ عُيَينَةَ، قَالَ: قُلتُ لِعَمرِو بنِ دِينَارٍ، أَسَمِعتَ جَابِرَ بنَ عَبدِ اللهِ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِرَجُلٍ مَرَّ فِي المَسجِدِ، بِسِهَامٍ أَمسِك بِنِصَالِهَا، قَالَ: نَعم»[٣].

واتە: لە سوفیانی كوڕی عویەینە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە عەمری كوڕی دینارم وت: ئایا گوێت لە جابری كوڕی عەبدوڵڵا بوو كە دەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی بە پیاوێك كە بەلای مزگەوتدا تێپەڕیوە بە كۆمەڵە تیرێكەوە: سەرە تیژەكانیان بگرە (با بەر مسوڵمانان نەكەوێ و كەسێ زامداربێ، یان با نەترسن)، (عەمری كوڕی دینار) وتی: بەڵێ.

٦٥٩- «حدثنا سفيان، قال قلت لعبد الرحمن بن القاسم أسمعتَ أباك يحدث عن عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُقَبِّلُهَا وَهُوَ صَائِمٌ؟ قَالَ: نَعم »[٤].

واتە: لە سوفیان گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی قاسمم وت: ئایا گوێت لە باوكت بووە لە دایكمان عائیشەی گێڕاوەتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی كردووە لە كاتێكدا پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕۆژوو بووە؟ عەبدوڕڕەحمانی كوڕی قاسم وتی: بەڵێ.

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

٦٦٠- «حَدَّثَنَا شُعبَةُ، قَالَ: كَتَبَ إِلَيَّ مَنصُورٌ بِحَدِيثٍ فَلَقِيتُهُ فَقُلتُ: أُحَدِّثُ بِهِ عَنكَ؟ قَالَ: أَوَ لَيسَ إِذَا كَتَبتُ إِلَيكَ فَقَد حَدَّثتُكَ؟»[١].

واتە: لە شوعبە گێردراوەتەوە، وتویەتی: مەنصور فەرموودەیەكی بۆ نوسیم و بۆی ڕەوانە كردم، منیش پێی گەیشتم و وتم: فەرموودەكە لەتۆوە بگێڕمەوە (ڕێگا دەدەیت)؟ وتی: ئایا ئەگەر بۆم نوسی مەگەر ناكا بۆم گێڕاویتەتەوە؟ (واتە: بەڵێ بیگێڕەرەوە هەر بۆ ئەوەش بۆم نوسی، ئیجازە هەیە).

٦٦١- «أَصحَابَ قَالَ: وَسَأَلتُ أَيُّوبَ السَّختِيَانِيَّ فَقَالَ مِثلَ ذَلِكَ»[٢].

واتە: شوعبە وتویەتی: پرسیارم لە ئەییوبی سەختیانی كرد (دەربارەی ئەوەی ئایا نوسینی فەرموودەی شێخ بۆ قوتابیەكەی دەبێتە گێڕانەوە و ڕێگا پێدان بۆی؟) هەمان قسەی (مەنصور)ی كرد.

٦٦٢- «عن معمر عنِ الزُّهرِيِّ، قَالَ: عَرَضتُ عَلَيهِ كِتَاباً فَقُلتُ: أَروِيهِ عَنكَ؟ قَالَ: وَمَن حَدَّثَكَ بِهِ غَيرِي»[٣].

واتە: لە مەعمەڕ گێردراوەتەوە، ئەویش لە زوهریەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: نوسراوێكم بۆ زوهری خوێندەوەو وتم: لە تۆوە بیگێڕمەوە؟ وتی: مەگەر كێ بۆی گێڕاویتەتەوە جگە لە من (بەڵێ بیگێڕەرەوە، ئەوەتا بە خوێندنەوەكەت ڕازیم و خۆم گێڕاومەتەوە).

٦٦٣- «حَدَّثَنَا هِشَامُ بنُ عُروَةَ، عَن أَبِيهِ، قَالَ: عَرضُ الكِتَابِ وَالحَدِيثُ سَوَاءٌ»[٤].

واتە: لە هیشامی كوڕی عوروە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: خوێندنەوەی فەرموودە (لەلایەن قوتابی) لەسەر كتێب (بەسەر شێخەكەیدا) وەک گێڕانەوەیەتی بە زار (لەلایەن شێخەكەیەوە). (هیچ جیاوازی نیە، لە هەردووكیدا بۆ قوتابی دروستە بەناوی شێخەكەیەوە بیگێڕێتەوە).

٦٦٤- «عَن جَعفَرِ بنِ مُحَمَّدٍ، عَن أَبِيهِ، قَالَ: عَرضُ الكِتَابِ وَالحَدِيثُ سَوَاءٌ»[٥].

واتە: لە جەعفەری كوڕی موحەممەد گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: خوێندنەوەی فەرموودە (لە لایەن قوتابی) بەشێوەی نووسراو (بەسەر شێخەكەیدا) وەک گێڕانەوەیەتی بە زار.

٦٦٥- «زَيدُ بنُ أَسلَمَ، يَرَى عَرضَ الكِتَابِ وَالحَدِيثَ سَوَاءً وَكَانَ ابنُ أَبِي ذِئبٍ يَرَى ذَلِكَ»[٦].

واتە: زەیدی كوڕی ئەسلەم پێی وابووە: خوێندنەوەی فەرموودە (لەلایەن قوتابی) بەشێوەی نوسراو (بەسەر شێخەكەیدا) وەک گێڕانەوەیەتی بە زار. هەروەها «ئیبنو ئەبو ذیئب»یش ئەو بۆچوونەی هەبووە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

(٦) ـ إسناده ضعيف.

٦٦٦- «عَن مَالِكِ بنِ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا، أَنَّهُ كَانَ يَرَى العَرضَ وَالحَدِيثَ سَوَاءً»[١].

واتە: لە مالیکی کوڕی ئەنەس (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە کە پێی وابووە خوێندنەوەی فەرموودە (لە لایەن قوتابی) بەشێوەی نووسراو (بەسەر شێخەکەیدا) وەک گێڕانەوەیەتی بە زار.

## بابەت: پیاوی زانا فەتوا بە شتێک دەدات، دواتر فەرموودەیەکی لە پێغەمبەر ﷺ پێدەگات و دەگەڕێتەوە بۆ فەرموودەکە

٦٦٧- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَقَامَهُ عَن يَمِينِهِ، فَأَخَذَ بِهِ»[٢].

واتە: لە ئبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ لە لای ڕاستەی خۆی وەستاندویەتی و ڕایکێشاوە (لەو کاتەی ئیبنو عەبباس بچوک بوو بۆ شەونوێژ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسایەوە و لەلای دەستە چەپی پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕایکێشایە لای دەستە ڕاستی).

٦٦٨- غير موجود[٣].

٦٦٩- «المُغِيرَةِ بنِ شُعبَةَ، قَالَ: نَشَدَ عُمَرُ ﷺ النَّاسَ أَسَمِعَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ أَحَدٌ مِنكُم فِي الجَنِينِ؟ فَقَامَ المُغِيرَةُ بنُ شُعبَةَ فَقَالَ: قَضَى فِيهِ عَبدًا أَو أَمَةً فَنَشَدَ النَّاسَ أَيضًا فَقَامَ المَقضِيُّ لَهُ فَقَالَ: قَضَى النَّبِيُّ ﷺ لِي بِهِ عَبدًا أَو أَمَةً، فَنَشَدَ النَّاسَ أَيضًا، فَقَامَ المَقضِيُّ عَلَيهِ فَقَالَ: قَضَى النَّبِيُّ ﷺ عَلَيَّ غُرَّةً عَبدًا أَو أَمَةً فَقُلتُ: أَتَقضِي عَلَيَّ فِيهِ فِيمَا لاَ أَكَلَ، وَلاَ شَرِبَ، وَلاَ استَهَلَّ، وَلاَ نَطَقَ، إِن تُطِلَّهُ، فَهُوَ أَحَقُّ مَا يُطَلُّ، فَهَوَى النَّبِيُّ ﷺ إِلَيهِ بِشَيءٍ مَعَهُ، فَقَالَ أَشِعرٌ، فَقَالَ عُمَرُ لَولاَ مَا بَلَغَنِي مِن قَضَاءِ النَّبِيِّ ﷺ لَجَعَلتُهُ دِيَةً بَينَ دِيَتَينِ»[٤].

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (ئیمامی) عومەر ﷺ خەڵکی بانگ کرد و پرسیاری لێ کردن کە ئایا کەس لە ئێوە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە (حوکم بدات) دەربارەی منداڵی ناو سک (ئەگەر کەسێک بوبێتە هۆی مردن و لەبار چوونی، ئایا حوکمی چی داوە، غەڕامەکەی چیە)؟ موغیرەی کوڕی شوعبەش هەڵسا و وتی: حوکمی داوە بە (پێدانی) بەندەیەک نێر بێت یان مێ (بە خاوەن منداڵەکە، لە تۆڵەی فەوتاندنی)، (ئیمامی عومەریش) دیسان داوای لە خەڵکی کردەوە، (ئەم جارەیان) ئەو کەسە هەڵسا کە حوکمەکەی بۆ درابوو وتی: پێغەمبەر ﷺ حوکمی بۆ داوم بە بەندەیەک نێر بێت، یان مێ، (ئیمامی عومەریش) دیسان داوای لە خەڵکی کردەوە، (ئەم جارەیان) ئەو کەسەش هەڵسا کە حوکمەکەی لەسەر درابوو، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ حوکمی لەسەردام بە تۆڵەیەک کە بەندەیەکی نێر بێت یان مێ منیش پێم وت: ئایا حوکمم لەسەر دەدەی بە (بەندەیەکی نێر بێت یان

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ سقط في الترقيم.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

مێ) لەسەر منداڵێک کە نە خواردویەتی و نە خواردویەتیەوەو نە دەنگیشی لێوە هاتوەو نە قسەشی کردوە، ئەگەر لایێک بەسەر لایێک لاسەنگ بکەیت و لایێک بەهەدەر بدەیت ئەوە منداڵەکە هەق وایە لاسەنگ بکرێت و هەقی بە فیڕۆ بدرێت، پێغەمبەری خواش ﷺ شتێکی لەلابوو بۆی بەرز کردەوەو (توڕەبوو)و فەرمووی: ئەوە (وەک) شیعر (قسان لەسەر یەک دەهێنیت و بەرگری پێ لە ناهەقی دەکەیت)؟!، عومەر ﷜ وتی: ئەگەر حوکم و بڕیاری پێغەمبەری خوام ﷺ پێ نەگەیشتایە ئەوە تۆڵەیەکم بۆ دادەنا لە نێوان ئەو دوو تۆڵەیە بێت.

سەرنج: بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بە کابرای فەرموو: ئەوە وەک شیعر دەڵێی؟! چونکە قسەکانی لەسەر یەک هێنا و کۆتاییەکانی ڕازاندەوە و وتی: (أَتَقضِي عَلَيَّ فِيهِ فِيمَا لاَ أَكَلَ) (وَلاَ شَرِبَ، وَلاَ استَهَلَّ) (وَلاَ نَطَقَ، إن تُطِلَّهُ، فَهُوَ أَحَقُّ مَا يُطَلُّ)، ئەو جۆرە ڕەوانبێژیەش زەم کراوە، چونکە بۆ جوانکردنی وتە و حوکمێکی ناڕەوا بەکاری هێناوە.

٦٧٠- «عَن أَيُّوبَ، قَالَ: إذَا أَردتَ أَن تَعرِفَ خَطأَ مُعَلِّمِكَ، فَجَالِس غَيرَهُ»[١].

واتە: لە ئەیوب گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر دەتەوێ هەڵەی مامۆستاکەت بزانی ئەوە لەگەڵ کەسی جگە لەو دابنیشە (لەلای مامۆستای تر بخوێنە و گوێ بگرە).

٦٧١- «حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، قَالَ: تَذَاكَرنَا بِمَكَّةَ، الرَّجُلَ يَمُوتُ، فَقُلتُ: عِدَّتُهَا مِن يَومِ يَأتِيهَا الخَبَرُ لِقَولِ الحَسَنِ، وَقَتَادَةَ، وَأَصحَابِنَا، قَالَ: فَلَقِيَنِي طَلقُ بنُ حَبِيبٍ العَنَزِيُّ فَقَالَ: إنَّكَ عَلَيَّ كَرِيمٌ، وَإنَّكَ مِن أَهلِ بلدِ العَينُ إليهِم سَرِيعَةٌ، وَإنِّي لَستُ آمَنُ عَلَيكَ، قَالَ: وَإنَّكَ قُلتَ قَولاً، هَاهُنَا خِلاَفَ قَولِ أَهلِ البَلَدِ، وَلَستُ آمَنُ، فَقُلتُ: وَفِي ذَا اختِلاَفٌ قَالَ: نَعم عِدَّتُهَا مِن يَومِ يَمُوتُ، فَلَقِيتُ سَعِيدَ بنَ جُبَيرٍ فَسَأَلتُهُ فَقَالَ: عِدَّتُهَا مِن يَومِ تُوُفِّيَ، وسأَلتُ مُجاهِدًا، فَقَالَ: عِدَّتها مِن يومِ تُوُفِّيَ، وَسَأَلتُ عَطَاءَ بنَ أَبِي رَبَاحٍ، فَقَالَ: مِن يَومِ تُوُفِّيَ، وَسَأَلتُ أَبا قِلاَبَةَ فَقَالَ: مِن يَومِ تُوُفِّيَ، وسأَلتُ مُحَمَّدَ بنَ سِيرِينَ، فقالَ: مِن يومِ تُوُفِّيَ، قَالَ: وحدَّثني نافعٌ أَنَّ ابنَ عُمرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما، قَالَ: مِن يومِ تُوُفِّيَ، وَسَمِعتُ عِكرِمَةَ، يقولُ: مِن يومِ تُوُفِّيَ، قَالَ: وقالَ جابرُ بنُ زيدٍ، مِن يومِ تُوُفِّيَ، قَالَ: وكانَ ابنُ عبَّاسٍ، يقولُ: مِن يومِ تُوُفِّيَ، قَالَ حمَّادٌ، وسمعتُ ليثًا، يُحَدِّثُ عَنِ الحَكَمِ، أَنَّ عبدَ اللهِ بنَ مسعودٍ، قَالَ: مِن يومِ تُوُفِّيَ، قَالَ: وَقَالَ عليٌّ: مِن يومِ يأتيها الخبرُ، قَالَ عبدُ اللهِ بنُ عبدِ الرَّحمنِ، أقولُ: مِن يومِ تُوُفِّيَ»[٢].

واتە: لە ئەیوب گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە مەککە دەورمان دەکردەوە (باسی بابەتی شەرعیمان دەکرد، باسی ئەوەمان کرد کە) پیاوێک دەمرێت (ئایا تەعزیەکەی لەکەیەوە دەست پێ دەکات)، من وتم: ماوەکەی لەو ڕۆژەوە دەست پێ دەکات کە هەواڵی مردنەکەی تیادا بە خزم و کەسەکانی دەگات، لەبەر قسەی حەسەن و قەتادە و هاوەڵەکانمان (چونکە ئەوان بۆچوونیان ئاوا بوو)، دەڵێ: طەڵقی کوڕی حەبیبی عەنزی پێم گەیشت و وتی: تۆ لەلام بەڕێزی و خەڵکی شارێکیشی کە هەواڵ تیایدا زوو

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

تەشەنە دەكات و شوێنی دەكەون، منیش لە تۆ دڵنیا نیم (كە تووشی كێشە نەبی)، وتی: تۆ قسەیەكت كردووە كە پێچەوانەی خەڵكی ئەو شارەیە منیش دڵنیا نیم (كە تووشی كێشە نەبی)، (ئەیوب دەڵێ) منیش وتم: بۆ ئەو شتە ڕا جیایی تیایە؟ وتی: بەڵێ، ماوەكەی لەو ڕۆژەی دەمرێت (دەست پێ دەكات)، چونكە گەیشتم بە سەعیدی كوڕی جوبەیرو پرسیارم لێكردو وتی: ماوەكەی لە ڕۆژی مردنیەتی، وە پرسیارم لە موجاهید كردووە وتویەتی: ماوەكەی لە ڕۆژی مردنیەتی، وە پرسیارم لە عەطائی كوڕی ڕەباح كرد، وتی: لە ڕۆژی مردنیەوە، وە پرسیارم لە ئەبو قیلابە كرد وتی: لە ڕۆژی مردنیەوە، وە پرسیارم لە موحەممەدی كوڕی سیرین كرد وتی: لە ڕۆژی مردنیەوە، وە نافیع بۆی گێڕامەوە كە ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، وتویەتی: لە ڕۆژی مردنیەوە، وە گوێم لە عیكریمە بوو دەیوت: لە ڕۆژی مردنیەوە، وتی: جابری كوڕی زەیدیش وتویەتی: لە ڕۆژی مردنیەوە، وتی: ئیبنو عەبباسیش دەیوت: لە ڕۆژی مردنیەوە، حەمماد وتی: گوێم لە لەیث بوو دەربارەی حەكەم قسەی دەكرد و دەیوت: ئیبنو مەسعود وتویەتی: لە ڕۆژی مردنیەوە، وتی: عەلیش وتویەتی: لە ڕۆژی مردنیەوە، عەبدوڵڵای كوڕی عەبدوڕڕەحمانیش وتی من دەڵێم: لە ڕۆژی مردنیەوە.

## بابەت: پیاوی (زانا) فەتوا بە شتێک دەدات، دواتر بۆچوونێكی تری دەبێت

**٦٧٢- «عَنِ الحَكَمِ بنِ مَسعُودٍ، قَالَ: أَتَينَا عُمَرَ، فِي الْمُشَرَّكَةِ فَلَم يُشَرِّك، ثُمَّ أَتَينَاهُ العَامَ الْمُقبِلَ فَشَرَّكَ، فَقُلنَا لَهُ، فَقَالَ: تِلكَ عَلَى مَا قَضَينَاهُ، وَهَذِهِ عَلَى مَا قَضَينَا»[1].**

واتە: لە حەكەمی كوڕی مەسعودەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چووینە لای (ئیمامی) عومەر دەربارەی مەسەلەی موشەڕڕەكە (كە بابەتێكی میراتە، نمونەكەشی ئەوەیە كە ئافرەتێک وەفات دەكات و مێرد و دایک و دوو برای یان زیاتر تەنها لە دایک و برایێک یان زیاتر لە دایک و باوک لەدوای ئافرەتەكە جێ دەمێنن)، (جا ئیمامی عومەر) فەتوای شەریكایەتی بۆ نەداین (بەوەی كە بڵێت دەبێ دوو براكانی لە دایک لەگەڵ براكانی لە دایک و باوک شەریک بن لە سێیەكی ماڵەكە، بەڵكو وتی: دوو براكانی لە دایک سێیەكی ماڵەكەیان بۆ هەیە، بەڵام براكانی لە دایک و باوک هیچیان بۆ نیە و مێردەكەش نیوەی بۆ هەیە و دایكیشی شەش یەكی بۆ هەیە)، دواتر لە ساڵی داهاتوودا چووین بۆ لای و بڕیاری شەریكایەتیدا (بەوەی كە برای تەنها لە دایک لەگەڵ برای لە دایک و باوک بەشدارن لە سێیەكی ماڵەكە نەوەک تەنها براكانی لە دایک)، ئێمەش پێمان وت (باشە بۆ پار ساڵ ئەو فەتوایەت نەدا كەچی ئەم ساڵ ئەو فەتوایەت دا!)، (ئیمامی عومەر) وتی: ئەوەی پێشویان لەسەر دادوەریێكمان بوو، ئەوەی ئەو جارەش لەسەر دادوەریێكی ترمانە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

## بابەت: بە گەورەگرتن و ڕێزلێنانی زانست

٦٧٣- «قَالَ ابنُ مُنَبِّهٍ، كَانَ أَهلُ العِلمِ فِيمَا مَضَى، يَضَنُّونَ بِعِلمِهِم عَن أَهلِ الدُّنيَا، فَيَرغَبُ أَهلُ الدُّنيَا فِي عِلمِهِم، فَيَبذُلُونَ لَهُم دُنيَاهُم وَإِنَّ أَهلَ العِلمِ اليَومَ بَذَلُوا عِلمَهُم لِأَهلِ الدُّنيَا، فَزَهِدَ أَهلُ الدُّنيَا فِي عِلمِهِم، فَضَنُّوا عَلَيهِم بِدُنيَاهُم»[1].

واتە: ئیبنو مونەببیە وتویەتی: خاوەن زانستەكانی پێشوو ڕەزیلیان بە زانستەكەیان دەكرد بەرانبەر ئەهلی دونیا، بۆیە ئەهلی دونیا حەزیان بە زانستەكەیان دەكرد و دونیا و سەروەت و سامانەكەیان سەرف دەكرد بۆ زانایان (تا بەشكو هەندێک لە زانستەكەیان بۆ باس بكەن)، خاوەن زانستی ئەمڕۆش زانستەكەیان خستۆتە بەر دەستی ئەهلی دونیا، ئەهلی دونیاش خۆی دوور خستۆتەوە لە زانستەكەیان و (نایانەوێت) و ڕەزیلی دەكەن بە دونیایەكەیان بەرانبەر بە زانایان و (پارە بە زانست نادەن).

٦٧٤- «حَدَّثَنَا الضَّحَّاكُ بنُ مُوسَى، قَالَ: مَرَّ سُلَيمَانُ بنُ عَبدِ المَلِكِ بِالمَدِينَةِ وَهُوَ يُرِيدُ مَكَّةَ، فَأَقَامَ بِهَا أَيَّامًا، فَقَالَ: هَل بِالمَدِينَةِ أَحَدٌ أَدرَكَ أَحَدًا، مِن أَصحَابِ النَّبِيِّ ﷺ ؟ فَقَالُوا لَهُ: أَبُو حَازِمٍ- فَأَرسَلَ إِلَيهِ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيهِ، قَالَ لَهُ: يَا أَبَا حَازِمٍ مَا هَذَا الجَفَاءُ؟ قَالَ: أَبُو حَازِمٍ يَا أَمِيرَ المُؤمِنِينَ، وَأَيُّ جَفَاءٍ رَأَيتَ مِنِّي؟ قَالَ: أَتَانِي وُجُوهُ أَهلِ المَدِينَةِ وَلَم تَأتِنِي، قَالَ: يَا أَمِيرَ المُؤمِنِينَ، أُعِيذُكَ بِاللهِ أَن تَقُولَ مَا لَم يَكُن، مَا عَرَفتَنِي قَبلَ هَذَا اليَومِ، وَلاَ أَنَا رَأَيتُكَ، قَالَ: فَالتَفَتَ سُلَيمَانُ إِلَى مُحَمَّدِ بنِ شِهَابٍ الزُّهرِيِّ، فَقَالَ: أَصَابَ الشَّيخُ وَأَخطَأتُ، قَالَ: سُلَيمَانُ يَا أَبَا حَازِمٍ مَا لَنَا نَكرَهُ المَوتَ؟ قَالَ: لِأَنَّكُم أَخرَبتُمُ الآخِرَةَ، وَعَمَّرتُمُ الدُّنيَا، فَكَرِهتُم أَن تُنتقَلُوا مِنَ العُمرَانِ إِلَى الخَرَابِ، قَالَ: أَصَبتَ يَا أَبَا حَازِمٍ، فَكَيفَ القُدُومُ غَدًا عَلَى اللهِ؟ قَالَ: أَمَّا المُحسِنُ، فَكَالغَائِبِ يَقدُمُ عَلَى أَهلِهِ، وَأَمَّا المُسِيءُ، فَكَالآبِقِ يَقدُمُ عَلَى مَولاَهُ، فَبَكَى سُلَيمَانُ وَقَالَ: لَيتَ شِعرِي مَا لَنَا عِندَ اللهِ؟ قَالَ: اعرِض عَمَلَكَ عَلَى كِتَابِ اللهِ، قَالَ: وَأَيُّ مَكَانٍ أَجِدُهُ؟ قَالَ: ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ ﴿١٤﴾﴾ الانفطار، قَالَ سُلَيمَانُ: فَأَينَ رَحمَةُ اللهِ يَا أَبَا حَازِمٍ؟ قَالَ: أَبُو حَازِمٍ رَحمَةَ اللهِ قَرِيبٌ مِنَ المُحسِنِينَ، قَالَ لَهُ سُلَيمَانُ: يَا أَبَا حَازِمٍ، فَأَيُّ عِبَادِ اللهِ أَكرَمُ؟ قَالَ: أُولُو المُرُوءَةِ وَالنُّهَى، قَالَ لَهُ سُلَيمَانُ: يَا أَبَا حَازِمٍ، فَأَيُّ الأَعمَالِ أَفضَلُ؟ قَالَ أَبُو حَازِمٍ: أَدَاءُ الفَرَائِضِ مَعَ اجتِنَابِ المَحَارِمِ، قَالَ سُلَيمَانُ: فَأَيُّ الدُّعَاءِ أَسمَعُ؟ قَالَ أَبُو حَازِمٍ: دُعَاءُ المُحسَنِ إِلَيهِ لِلمُحسِنِ، قَالَ: فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفضَلُ؟ قَالَ: لِلسَّائِلِ البَائِسِ، وَجُهدُ المُقِلِّ لَيسَ فِيهَا مَنٌّ وَلاَ أَذًى، قَالَ: فَأَيُّ القَولِ أَعدَلُ؟ قَالَ: قَولُ الحَقِّ عِندَ مَن تَخَافُهُ أَو تَرجُوهُ، قَالَ: فَأَيُّ المُؤمِنِينَ أَكيَسُ؟ قَالَ: رَجُلٌ عَمِلَ بِطَاعَةِ اللهِ وَدلَ النَّاسَ عَلَيهَا، قَالَ: فَأَيُّ المُؤمِنِينَ أَحمَقُ؟ قَالَ: رَجُلٌ انحَطَّ فِي هَوَى أَخِيهِ وَهُوَ ظَالِمٌ، فَبَاعَ آخِرَتَهُ بِدُنيَا غَيرِهِ، قَالَ لَهُ سُلَيمَانُ: أَصَبتَ، فَمَا تَقُولُ فِيمَا نَحنُ فِيهِ؟ قَالَ: يَا أَمِيرَ المُؤمِنِينَ، أَوَ تُعفِينِي؟ قَالَ لَهُ سُلَيمَانُ: لاَ، وَلَكِن نَصِيحَةٌ تُلقِيهَا إِلَيَّ، قَالَ: يَا أَمِيرَ المُؤمِنِينَ، إِنَّ آبَاءَكَ قَهَرُوا النَّاسَ بِالسَّيفِ، وَأَخَذُوا هَذَا المُلكَ عَنوَةً عَلَى غَيرِ مَشوَرَةٍ مِنَ المُسلِمِينَ، وَلاَ رِضًا لَهُم حَتَّى قَتَلُوا مِنهُم مَقتَلَةً عَظِيمَةً، فَقَدِ ارتَحَلُوا عَنهَا، فَلَو شعرتَ مَا قَالُوهُ، وَمَا

---

(١) ـ ضعیف لانقطاعه.

قِيلَ لَهُم؟ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِن جُلَسَائِهِ: بِئسَ مَا قُلتَ يَا أبا حَازِمٍ، قَالَ أَبُو حَازِمٍ: كَذَبتَ، إِنَّ اللهَ أَخَذَ مِيثَاقَ العُلَمَاءِ لَيُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ يَكتُمُونَهُ، قَالَ لَهُ سُلَيمَانُ: فَكَيفَ لَنَا أَن نُصلِحَ؟ قَالَ: تَدَعُونَ الصَّلَفَ، وَتَمَسَّكُونَ بِالمُرُوءَةِ وَتَقسِمُونَ بِالسَّوِيَّةِ، قَالَ لَهُ سُلَيمَانُ: كَيفَ لَنَا بِالمَأخَذِ بِهِ؟ قَالَ أَبُو حَازِمٍ: تَأخُذُهُ مِن حِلِّهِ، وَتَضَعُهُ فِي أَهلِهِ، قَالَ لَهُ سُلَيمَانُ: هَل لَكَ يَا أبا حَازِمٍ أَن تَصحَبَنَا، فَتُصِيبَ مِنَّا وَنُصِيبَ مِنكَ؟ قَالَ: أَعُوذُ بِاللهِ، قَالَ لَهُ سُلَيمَانُ: وَلِمَ ذَاكَ؟ قَالَ: أَخشَى أَن أَركَنَ إِلَيكُم شَيئًا قَلِيلاً، فَيُذِيقَنِي اللهُ ضِعفَ الحَيَاةِ، وَضِعفَ المَمَاتِ، قَالَ لَهُ سُلَيمَانُ: ارفَع إِلَينَا حَوَائِجَكَ؟ قَالَ: تُنجِينِي مِنَ النَّارِ، وَتُدخِلُنِي الجَنَّةَ، قَالَ سُلَيمَانُ: لَيسَ ذَاكَ إِلَيَّ، قَالَ أَبُو حَازِمٍ: فَمَا لِي إِلَيكَ حَاجَةٌ غَيرُهَا، قَالَ: فَادعُ لِي، قَالَ أَبُو حَازِمٍ: اللهُمَّ إِن كَانَ سُلَيمَانُ وَلِيَّكَ، فَيَسِّرهُ لِخَيرِ الدُّنيَا وَالآخِرَةِ، وَإِن كَانَ عَدُوَّكَ، فَخُذ بِنَاصِيَتِهِ إِلَى مَا تُحِبُّ وَتَرضَى، قَالَ لَهُ سُلَيمَانُ: قَطُّ، قَالَ أَبُو حازم: قَد أَوجَزتُ وَأَكثَرتُ إِن كُنتَ مِن أَهلِهِ، وَإِن لَم تَكُن مِن أَهلِهِ فَمَا يَنفَعُنِي أَن أَرمِيَ عَن قَوسٍ لَيسَ لَهَا وَتَرٌ؟ قَالَ لَهُ سُلَيمَانُ: أَوصِنِي- قَالَ: سَأُوصِيكَ وَأُوجِزُ: عَظِّم رَبَّكَ وَنَزِّههُ، أَن يَرَاكَ حَيثُ نَهَاكَ، أَو يَفقِدَكَ حَيثُ أَمَرَكَ فَلَمَّا خَرَجَ مِن عِندِهِ، بَعَثَ إِلَيهِ بِمِائَةِ دِينَارٍ، وَكَتَبَ إِلَيهِ: أَن أَنفِقهَا وَلَكَ عِندِي مِثلُهَا كَثِيرٌ قَالَ: فَرَدَّهَا عَلَيهِ وَكَتَبَ إِلَيهِ: يَا أَمِيرَ المُؤمِنِينَ، أُعِيذُكَ بِاللهِ أَن يَكُونَ سُؤَالُكَ إِيَّايَ هَزلاً، أَو رَدِّي عَلَيكَ بَذلاً، وَمَا أَرضَاهَا لَكَ، فَكَيفَ أَرضَاهَا لِنَفسِي؟ وَكَتَبَ إِلَيهِ: إِنَّ مُوسَى بنَ عِمرانَ: لَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَديَنَ، وَجَدَ عَلَيهَا رِعَاءً يَسقُونَ، وَوَجَدَ مِن دُونِهِم جَارِيَتَينِ تَذُودَانِ، فَسَأَلَهُمَا، فَقَالَتَا: ﴿لَا نَسْقِى حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّى لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَىَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾﴾ القصص، وَذَلِكَ أَنَّهُ كَانَ جَائِعًا خَائِفًا لاَ يَأمَنُ، فَسَأَلَ رَبَّهُ، وَلَم يَسأَلِ النَّاسَ، فَلَم يَفطِنِ الرِّعَاءُ، وَفَطِنَتِ الجَارِيَتَانِ، فَلَمَّا رَجَعَتَا إِلَى أَبِيهِمَا، أَخبَرَتَاهُ بِالقِصَّةِ، وَبِقَولِهِ، فَقَالَ أَبُوهُمَا: وَهُوَ شُعيبٌ هَذَا رَجُلٌ جَائِعٌ، فَقَالَ لِإِحدَاهُمَا: اذهَبِي فَادعِيهِ، فَلَمَّا أَتَتهُ، عَظَّمَتهُ، وَغَطَّت وَجهَهَا، وَقَالَت: ﴿إِنَّ أَبِى يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا ﴿٢٥﴾﴾ القصص، فَشَقَّ عَلَى مُوسَى حِينَ ذَكَرَت: أَجرَ مَا سَقَيتَ لَنَا، وَلَم يَجِد بُدًّا مِن أَن يَتبَعَهَا، إِنَّهُ كَانَ بينَ الجِبَالِ جَائِعًا مُستوحِشًا، فَلَمَّا تَبِعَهَا، هَبَّتِ الرِّيحُ فَجَعَلَت تُصفِقُ ثِيَابَهَا عَلَى ظَهرِهَا، فَتَصِفُ لَهُ عَجِيزَتَهَا، وَكَانَت ذَاتَ عَجُزٍ، وَجَعَلَ مُوسَى عَلَيهِ السَّلَامُ يُعرِضُ مَرَّةً، وَيَغُضُّ أُخرَى، فَلَمَّا عِيلَ صَبرُهُ، نَادَاهَا: يَا أَمَةَ اللهِ، كُونِي خَلفِي، وَأَرِينِي السَّمتَ بِقَولِكِ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَى شُعيبٍ، إِذ هُوَ بِالعَشَاءِ مُهَيَّأً، فَقَالَ لَهُ شُعيبٌ: اجلِس يَا شَابُّ فَتَعَشَّ فَقَالَ لَهُ مُوسَى عَلَيهِ السَّلَامُ: أَعُوذُ بِاللهِ، فَقَالَ لَهُ شُعيبٌ: لِمَ؟ أَمَا أَنتَ جَائِعٌ؟ قَالَ: بَلَى، وَلَكِنِّي أَخَافُ أَن يَكُونَ هَذَا عِوَضًا لِمَا سَقَيتُ لَهُمَا، وَأَنَا مِن أَهلِ بَيتٍ لاَ نَبِيعُ شَيئًا مِن دِينِنَا بِمِلءِ الأَرضِ ذَهَباً فَقَالَ لَهُ شُعيبٌ: لاَ، يَا شَابُّ، وَلَكِنَّهَا عَادَتِي، وَعَادَةُ آبَائِي، نَقرِي الضَّيفَ، وَنُطعِمُ الطَّعَامَ، فَجَلَسَ مُوسَى عَلَيهِ السَّلَامُ، فَأَكَلَ فَإِن كَانَت هَذِهِ المِائَةُ دِينَارٍ عِوَضًا لِمَا حَدَّثتُ، فَالمَيتَةُ، وَالدَّمُ، وَلَحمُ الخِنزِيرِ، فِي حَالِ الِاضطِرَارِ أَحَلُّ مِن هَذِهِ، وَإِن كَانَ لِحَقٍّ فِي بَيتِ المَالِ، فَلِي فِيهَا نُظَرَاءُ، فَإِن سَاوَيتَ بَينَنَا، وَإِلاَّ فَلَيسَ لِي فِيهَا حَاجَةٌ»[١].

واتە: لە ضەحاکی کوڕی مووسا گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیک بە مەدینەدا ڕۆیشت و مەبەستی چوونە مەککە بوو (دەچوو بۆ مەککە)، چەند ڕۆژێک تیایدا مایەوە و وتی: کەس

---

(١) ـ إسناده مسلسل بالمجاهيل.

لە مەدینە هەیە بە یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتبێت؟ پێیان وت: ئەبو حازم (هەیە)، ئەویش ناردی بە دوایدا، جا كاتێك چووە لای، (سولەیمان) وتی: ئەی ئەبو حازم ئەو دوورەپەرێزیە چیە؟ ئەبو حازم وتی: ئەی گەورەی بڕواداران چ دوورەپەرێزیەكت لە من بینیوە؟ وتی: پیاو ماقول و كەسە دیارەكانی مەدینە هاتن بۆ لام و تۆ نەهاتی، (ئەبو حازم) وتی: ئەی گەورەی بڕواداران پەنا بەخوا دەگرم (كە پێم وابێت) تۆ قسەیەك بكەیت وانەبێت، (بەڵام) تۆ منت نەناسیوە تا ئەمڕۆ و منیش تۆم هەرگیز نەبینیوە (بۆیە كە نەتناسم و نەمزانیبێ هاتووی چۆن بێم بۆ لات).

ضەححاك دەڵێ: سولەیمان ئاوڕی دایەوە بۆ لای موحەممەدی كوڕی شیهابی زوهری و وتی: شێخ ڕاست دەكات و من هەڵە بووم، سولەیمان وتی: بۆچی ئێمە ڕقمان لە مردنە؟ (ئەبو حازم) وتی: ئێوە قیامەتتان كاول كردووە و دونیاتان نۆژەن و ئاوەدان كردۆتەوە، بۆیە پێتان ناخۆشە لە ئاوەدانی و خۆش گوزەرانیەوە بچن بۆ كاولگە، (سولەیمان) وتی: ڕاست دەكەیت ئەی ئەبو حازم، (سولەیمان) وتی: بەیانی چوونە لای خوا (كە دەمرین و دواڕۆژمان دێت)؟ (ئەبو حازم) وتی: ئەوەی كە چاكەكارە وەك كەسێك وایە كە لە ماڵ و منداڵی دووركەوتبێتەوە و بێتەوە لایان (ئاوا حەزی لە دیداری خوایە)، ئەوەی كە خراپەكاریشە وەك بەندەیەكی هەڵاتوو وایە لە دەست گەورەكەی و دواتر بگەڕێتەوە لای (ئاوا دەترسێ و گەورەكەشی لێی تورەیە).

سولەیمان گریا و وتی: بریا بمزانیایە لەلای خوای پەروەردگار چیمان هەیە (لە كردەوە)؟ ئەبو حازم وتی: كردەوەكانت نیشانی پەرتوكی خوا بدە، (سولەیمان) وتی: لە چ شوێنێكی (قورئان) دەیدۆزمەوە؟ (ئەبو حازم) وتی: (لەو ئایەتەی): [بێگومان چاكەكاران لە ناز و نیعمەت دان، وە بێ گومان بەدكاران و خراپەكاران لە دۆزەخ دان].

سولەیمان وتی: ڕەحمەتی خوا لە كوێیە ئەی ئەبو حازم؟ ئەبو حازم وتی: ڕەحمەتی خوا لە چاكەكارانەوە نزیكە، سولەیمان پێی وت: كام لە بەندەكانی خوا بەڕێزترینن؟ وتی: ئەوانەی خاوەن پیاوەتی و ژیرین، سولەیمان پێی وت: ئەی ئەبو حازم كام لە كردەوە چاكترینە؟ ئەبو حازم وتی: جێبەجێ كردنی واجبەكان و دووركەوتنەوە لە حەرام كراوەكان، سولەیمان وتی: كام دوعا گیرایە و قبول دەبێت؟ ئەبو حازم وتی: دوعای چاكە لەگەڵ كراو بۆ چاكەكار، (سولەیمان) وتی: كام صەدەقە چاكترینە؟ وتی: (صەدەقە كردن) بە فەقیرێكی زۆر موحتاج، هەروەها (صەدەقە كردنی) فەقیرێك لەو ماڵە كەمەی هەیەتی، (سولەیمان) وتی: كام قسەو وتە دادوەرترینە؟ وتی: قسە و وتەی هەق لەلای كەسێك لە لێی بترسیت یان مەصڵەحەتت لەلای هەبێت، (سولەیمان) وتی: كام لە بڕواداران ژیرترینن؟ وتی: پیاوێك كە كار بكات بە گوێڕایەڵی خوا و، خەڵكیش ڕێنمویی بكات بۆی، سولەیمان وتی: كام لە بڕواداران بێ عەقڵ ترینە؟ وتی: پیاوێك كە كەوتۆتە ژێر هەواو نەفسی براكەی لە كاتێكدا ستەمكارە، بەمەش دواڕۆژەكەی دەفرۆشێ بۆ دونیای كەسانیتر، (سولەیمان) وتی: ڕاستت كرد پێكات، ئەی چی دەڵێی دەربارەی ئەوەی ئێمە تیایداین؟ (ئەبو حازم) وتی: ئەی گەورەی بڕواداران وازم لێ دەهێنی (وەڵامی ئەوە نەدەمەوە)؟ سولەیمان پێی وت: نەخێر، بەڵكو نەصیحەتێكە بۆمی باس دەكەی، (ئەبو

حازم) وتی: ئەی گەورەی بڕواداران باب و باپیرانی تۆ بە شمشێر خۆیان بەسەر خەڵکی زاڵ کردو ئەو مولک و دەسەڵاتەیان بە هێز وەرگرت بەبێ ڕاوێژ کردن بە مسوڵمانان و بەبێ ڕەزامەندی ئەوان بەو ئەندازەیەی کوشتارێکی زۆریان لێ کردن، بۆیە ئەوانیش (واتە: خەڵکەکە) وازیان هێنا لە دەسەڵات، ئەگەر هەستت پێ کردبێ چیان وتووە و چیان پێ وتراوە (واتە: ئەگەر ئاگات لە قسەو باسان بی دەزانی چی ڕوویداوە)؟ جا پیاوێک لە دانیشتوەکان و دارودەستەی سولەیمان بە ئەبو حازمی وت: خراپت وت ئەی ئەبو حازم، ئەبو حازمیش وتی: درۆت کرد، خوا بەڵێنی لە زانایان وەرگرتووە کە شت بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوەو نەیشارنەوە، سولەیمان بە ئەبو حازمی وت: ئێمە چۆن دەتوانین خۆمان چاک بکەین (ڕێگە چارە چیە)؟ وتی: واز لە شتی پوچ بێنن و دەست بە پیاوەتیەوە بگرن و سەروەت و سامان بە یەکسانی دابەش بکەن، سولەیمان پێی وت: چۆن و لە کوێوە وەری بگرین؟ وتی: لە حەڵاڵەوە وەری بگرە و لە ئەهلی خۆی سەرفی بکە، سولەیمان پێی وت: ئەی ئەبو حازم ئایا لەگەڵمان دەبی تا سوودمان لێ ببینی (لە سەروەت و سامان) و ئێمەش سوودت لێ ببینین (لە زانستەکەت)؟ وتی: پەنا دەگرم بەخوا، سولەیمان پێی وت: بۆچی؟ وتی: دەترسم تۆزێک بۆ لای ئێوە لار ببمەوەو بە هۆیەوە خوا سزای دونیاو دوارۆژم پێ بچێژێت، سولەیمان پێی وت: پێویستیەکانت بۆ لای ئێمە بەرز بکەرەوە (چ پێویستیێکت هەیە پێمان بڵێ)، (ئەبو حازم) وتی: لە ئاگر ڕزگارم دەکەیت و دەمخەیتە بەهەشتەوە؟ سولەیمان وتی: ئەوە لەلای من نیە (بەدەست من نیە)، ئەبو حازم وتی: دەنا هیچ پێویستیێکم جگە لەوە لەلای تۆ نیە، (سولەیمان) وتی: کەواتە دووعام بۆ بکە، ئەبو حازم وتی: ئەی پەروەردگارە ئەگەر سولەیمان وەلی و خۆشەویستی تۆیە ئەوە خێر و چاکەی دونیا و دوارۆژی بۆ ئاسان بکەی، ئەگەر دوژمنی تۆشە ئەوە نەوچەوان و جلەوی بگری بۆ ئەو شتەی کە پێت خۆشە و پێی ڕازی و (بیخەرە سەر هیدایەت)، سولەیمان وتی: بەسسە، ئەبو حازم وتی: کورتم کردەوەو زۆریشم وت (واتە: هەرچەندە بە کورتی دەرم بڕی، بەڵام قسەکانم مانای زۆری گەیاند) ئەگەر شایستەی وەرگرتنی ئەو قسانە بیت، ئەگەر شایستەش نەبی ئەوە سوودم پێ ناگەیەنێ دنیایێک قسەت بۆ بکەم، سولەیمان پێی وت: ئامۆژگاریم بکە، وتی: ئامۆژگاریت دەکەم و کورتی دەکەمەوە: خوات بە گەورە بگرەو نەکەی لەوەی کە بتبینێت لە شوێنێک کە نەهی لێ کردووی یان نەتبینێت لە شوێنێک کە فەرمانی پێ کردووی (واتە: لە شوێنێک ئامادە مەبە کە تاوانی تیایە و لەو شوێنانەش هەردەم ئامادەبە کە فرمانی خوای تیایە و واجبە تیایدا ئامادەبی).

جا کاتێک (ئەبو حازم) لەلای ڕۆیشت، (سولەیمان) سەد دیناری بۆ ناردو بۆی نووسی: سەرفی بکە، بۆ تۆ هەیە لەلای من زۆری ئاوا (واتە: هەرکاتێک پێویستت بێت زۆری ئاوات پێ دەبەخشم)، دەڵێ (ئەبو حازمیش) پارەکەی بۆ گێڕایەوە و بۆی نووسی: ئەی گەورەی بڕواداران پەنات دەگرم بە خوا لەوەی کە پرسیار کردنەکەی تۆ لە من گاڵتە بووبێ یان وەڵامی من بۆ پاداشت بوبێ، بۆ تۆ پێی ڕازی نابم (کە پرسیارەکانت بۆ گاڵتە بووبن) چۆن بۆ خۆم پێی ڕازی دەبم (کە وەڵامەکانم بۆ پاداشت بوبێت)؟! وە بۆی نووسی: موسای کوڕی عیمران (پێغەمبەر مووسا ﷺ) کاتێک چووە سەر ئاوی مەدیەن چەندین شوانی بینین (ئاژەڵەکانیان) ئاو دەدان، وە لە نزیکیان دوو ئافرەتی بینی ڕێگریان دەکرد لە ئاژەڵەکانیان

لەوەی بێنە سەر ئاوەکە، پێغەمبەر موساش پرسیاری لێ کردن (بۆ ئاژەڵەکانتان ئاو نادەن؟)، وتیان: [ئێمە ئاژەڵەکانمان ئاو نادەین هەتا شوانەکان ئاژەڵەکانیان لەسەر ئاوەکە نەگەڕێننەوە، وە باوکمان پیرێکی گەورە و بە تەمەنە * ئنجا موسا مەڕەکانی بۆ ئاودان لەپاشان موسا چوو بۆ ژێر سێبەرێک و وتی: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من هەژارم و پێویستم بە خێر و ڕۆزییێک هەیە بۆم بنێری]، لەبەر ئەوەی برسی بوو دەترسا و (لە خۆی) ئەمین نەبوو (چونکە لە دەست فیرعەون ڕای کردبوو)، داوای لە خوا کرد و داوای لە خەڵک نەکرد، شوانەکان هەستیان پێ نەکرد (کە برسی و ترساوە)، دوو کچەکان هەستیان پێ کرد، جا کاتێک دوو کچەکان گەڕانەوە بۆ لای باوکیان ڕوداوەکەو قسەکەیان پێ ڕاگەیاند، باوکیشیان کە پێغەمبەر شوعەیب بوو وتی: (ئەوەی باسی دەکەن) پیاوێکە برسیەتی، بە یەکێک لە کچەکانی وت: بڕۆ بانگی بکە، جا کاتێک کچەکە هات بۆ لای زانی پیاوێکی گەورەیەو ڕوخساری خۆی پێچا (شەرمی لێ کردو بەشەرمەوە) وتی: [باوکم بانگت دەکات تا پاداشتی ئەوەت بداتەوە کە یارمەتی ئێمەتداو ئاژەڵەکانت بۆ ئاو داین]، جا لەلای مووسا زۆر ناخۆش بوو کاتێ وتی: پاداشتی ئەوەی ئاژەڵەکانت بۆ ئاو داین، بەڵام هیچ چارەیەکی نەبوو لەوەی دەبێ هەر دوای بکەوێ، چونکە ئەو لە نێوان چیاکانە بە برسیەتی و هەڵاتوویی، جا کاتێک دوای کچەکە کەوت با هەڵی کرد و جلەکانی کچەکەی بە پشتیەوە نوساند و دواوەی ئاشکرابوو، بەخۆشی ئافرەتێکی بەرچاو بوو، پێغەمبەر موساش جارێک ڕووی لێ وەردەگێڕا و جارێک چاوەکانی نزم دەکردەوە (بۆ زەویەکە)، جا کاتێک سەبری نەما و (بێزار بوو) بانگی کچەکەی کرد و وتی: ئەی بەندەی خوا تۆ لە پشتمەوە بڕۆ و ڕێگاکەم نیشان بدە بە قسە (بە قسە بڵێ بڕۆ لای ڕاست یان چەپ)، جا کاتێک چووە لای شوعەیب لە کاتێکدا شوعەیب لەلای خواردنێکی ئامادەکراو بوو، شوعەیب پێی وت: دانیشە ئەی گەنج نان بخۆ، موسا پێی وت: پەنا دەگرم بەخوا، شوعەیب پێی وت: بۆچی؟ مەگەر تۆ برسی نی؟ مووسا ﷺ وتی: بەڵێ، بەڵام دەترسم ئەو نانە پاداشتی ئاودانەکە بێت بۆ دوو کچەکان، من لە خانەوادەیەکم هیچ لە دین و ئاینمان نافرۆشین بە هەموو لە دونیا، شوعەیب پێی وت: نەخێر ئەی گەنج، بەڵکو نەریتی خۆم و باپیرانم وایە ڕێز لە میوان دەگرین و خواردن دەبەخشین، ئنجا مووسا ﷺ دانیشت و خواردی.

جا (ئەی سولەیمان) ئەگەر ئەو سەد دینارە پاداشتە بۆ ئەو قسانەی کردم، ئەوە مردارەبوو خوێن و گۆشتی بەراز لە حاڵەتی ناچاریدا حەڵاڵترە لەو سەد دینارە، ئەگەر هەقی خۆشمە لە بەیتول مالدا (لە خەزێنەی دەوڵەت) ئەوە کەسی وەکو من زۆرە، جا ئەگەر یەکسانی لە نێوانمان دەکەیت و (هەر کەسەو سەد دیناری پێ دەبەخشی ئەوە باشەو پارەکە وەردەگرم) ئەگەرنا ئەوە من هیچ پێویستیم پێی نیە.

٦٧٥- « أنبأنا زَيدٌ العَمِّيُّ، عَن بَعضِ الفُقَهَاءِ، أَنَّهُ قَالَ: يَا صَاحِبَ العِلمِ اعمَل بِعِلمِكَ، وَأَعطِ فَضلَ مَالِكَ، وَاحبِسِ الفَضلَ مِن قَولِكَ، إلاَّ بِشَيءٍ مِنَ الحَدِيثِ يَنفَعُكَ عِندَ رَبِّكَ- يَا صَاحِبَ العِلمِ إِنَّ الَّذِي عَلِمتَ ثُمَّ لَم تَعمَل بِهِ قَاطِعٌ حُجَّتَكَ، وَمَعذِرَتَكَ عِندِ رَبِّكَ إِذَا لَقِيتَهُ، يَا صَاحِبَ العِلمِ، إِنَّ الَّذِي أُمِرتَ بِهِ مِن طَاعَةِ اللهِ، لَيَشغَلُكَ عَمَّا نُهِيتَ عَنهُ مِن مَعصِيَةِ اللهِ- يَا صَاحِبَ العِلمِ، لاَ تَكُونَنَّ قَوِيًّا فِي عَمَلِ غَيرِكَ، ضَعِيفًا فِي عَمَلِ نَفسِكَ- يَا صَاحِبَ العِلمِ، لاَ يَشغَلَنَّكَ الَّذِي لِغَيرِكَ عَنِ الَّذِي لَكَ- يَا صَاحِبَ العِلمِ، عَظِّمِ العُلَمَاءَ،

وَزَاحِمهُم وَاستَمِع مِنهُم، وَدَع مُنَازَعَتَهُم، يَا صَاحِبَ العِلمِ، عظِّم العُلَمَاءَ لِعِلمِهِم، وَصَغِّرِ الجُهَّالَ لِجَهلِهِم، وَلاَ تُبَاعِدهُم، وَقَرِّبهُم وَعَلِّمهُم- يَا صَاحِبَ العِلمِ، لاَ تُحَدِّث بِحَدِيثٍ فِي مَجلِسٍ، حَتَّى تَفهَمَهُ، وَلاَ تُجِبِ امرأً فِي قَولِهِ حَتَّى تَعلَمَ مَا قَالَ لَكَ، يَا صَاحِبَ العِلمِ، لاَ تَغتَرَّ بِاللهِ، وَلاَ تَغتَرَّ بِالنَّاسِ، فَإِنَّ الغِرَّةَ بِاللهِ تَركُ أَمرِهِ، وَالغِرَّةَ بِالنَّاسِ اتِّبَاعُ أَهوَائِهِم، وَاحذَر مِنَ اللهِ، مَا حَذَّرَكَ مِن نَفسِهِ، وَاحذَر مِنَ النَّاسِ فِتنَتَهُم- يَا صَاحِبَ العِلمِ، إِنَّهُ لاَ يَكمُلُ ضَوءُ النَّهَارِ إِلاَّ بِالشَّمسِ، كَذَلِكَ لاَ تَكمُلُ الحِكمَةُ إِلاَّ بِطَاعَةِ اللهِ، يَا صَاحِبَ العِلمِ، إِنَّهُ لاَ يَصلُحُ الزَّرعُ، إِلاَّ بِالمَاءِ وَالتُّرَابِ، كَذَلِكَ لاَ يَصلُحُ الإِيمَانُ، إِلاَّ بِالعِلمِ وَالعَمَلِ، يَا صَاحِبَ العِلمِ، كُلُّ مُسَافِرٍ مُتَزَوِّدٌ، وَسَيَجِدُ إِذَا احتَاجَ إِلَى زَادٍ، مَا تَزَوَّدَ، وَكَذَلِكَ سَيَجِدُ كُلُّ عَامِلٍ إِذَا مَا احتَاجَ إِلَى عَمَلِهِ فِي الآخِرَةِ، مَا عَمِلَ فِي الدُّنيا، يَا صَاحِبَ العِلمِ، إِذَا أَرَادَ اللهُ أَن يَحُضَّكَ عَلَى عِبَادَتِهِ، فَاعلَم أَنَّهُ إِنَّمَا أَرَادَ أَن يُبَيِّنَ لَكَ كَرَامَتَكَ عَلَيهِ، فَلاَ تَحَوَّلَنَّ إِلَى غَيرِهِ، فَتَرجِعَ مِن كَرَامَتِهِ إِلَى هَوَانِهِ- يَا صَاحِبَ العِلمِ، إِنَّكَ إِن تَنقُلِ الحِجَارَةَ وَالحَدِيدَ، أَهوَنُ عَلَيكَ مِن أَن تُحَدِّثَ مَن لاَ يَعقِلُ حَدِيثَكَ، وَمَثَلُ الَّذِي يُحَدِّثُ مَن لاَ يَعقِلُ حَدِيثَهُ، كَمَثَلِ الَّذِي يُنَادِي المَيِّتَ، وَيَضَعُ المَائِدَةَ لِأَهلِ القُبُورِ»[١].

واتە: لە زەیدی عەممیەوە گێردراوەتەوە کە لە هەندێک لە فەقیهەکانی وەرگرتووە، وتویەتی: ئەی خاوەنی زانست کار بە زانستەکەت بکە و ماڵە زیادەکەت ببەخشە و قسەی زیادیشت ڕاگرە و مەیکە تەنها قسەیەک نەبێت کە سوودت پێ دەگەیەنێ لەلای پەروەردگارت.

ئەی خاوەنی زانست ئەوەی زانیوتە دواتر کارت پێ نەکردووە ئەوە بزانە حوججەت و بەڵگە و عوزرت پچڕاوە لەلای خوا کاتیک پێی دەگەی.

ئەی خاوەنی زانست ئەوەی فەرمانت پێ کراوە لە فەرمانبەری و گوێڕایەڵی خوا ئەوە سەرقاڵت دەکات لەوەی لێت قەدەغە کراوە لە سەرپێچی خوا.

ئەی خاوەنی زانست بەهێز مەبە لە کردەوەی خەڵکی و لاواز بیت لە کردەوەی خۆت.

ئەی خاوەنی زانست با سەرقاڵت نەکات ئەوەی هی تۆ نیە لەوەی هی تۆیە.

ئەی خاوەنی زانست زانایان بە گەورە بگرە و ڕێزیان بگرە و لێیان نزیکبەرەوە و گوێیان بۆ بگرە و واز لە مناقەشەکردنیان بهێنە.

ئەی خاوەنی زانست زانایان بە گەورە بگرە و ڕێزیان بگرە لەبەر زانستەکەیان، نەزانانیش بە کەم بگرە لەبەر نەفامیەکەیان و لێیان دوور مەکەرەوە و لێیان نزیک بەرەوە و فێریان بکە.

ئەی خاوەنی زانست هیچ قسەیەک لە مەجلیسێکدا مەکە تا لێی تێنەگەی و وەڵامی قسەی هیچ کەسێک مەدەرەوە تا نەزانی چی پێ وتی.

---

(١) ـ إسناده مظلم.

ئەی خاوەنی زانست (بە ڕەحمی) خوا مەخەڵەتێ و بە (ستاییشی) خەڵكیش مەخەڵەتی، چونكە خەڵەتان بە خوا بریتیە لە واز هێنانی فەرمانەكانی، وە خەڵەتان بە خەڵكی شوێنكەوتنی هەوا و نەفسە، لەخوا بترسە بەو ئەندازەی دەتترسێنێ لە خۆی و لە خەڵكیش بترسە لە فیتنەیان.

ئەی خاوەنی زانست بە دڵنیایی ڕووناكی ڕۆژ تەواو نابێ تەنها بە (تیشكی) خۆر نەبێ، ئا بەو شێوەیەش حیكمەت و داناییش تەواو و كامل نابێ تەنها بە گوێڕایەڵی خوا نەبێ.

ئەی خاوەنی زانست بە دڵنیایی دەغڵ ودان چاك نابێت تەنها بە ئاوو خۆڵ نەبێت، ئا بەو شێوەیەش ئیمان چاك نابێت تەنها بە زانست و كردار نەبێت.

ئەی خاوەنی زانست هەموو موسافیرێك زاد و زەخیرە ئامادە دەكات و لەلایەتی و لەبەر دەستیەتی ئەوەی خەزنی كردووە لە زاد و توێشوو ئەگەر پێویستی بە زاد و توێشوو بوو، ئا بەو شێوەیەش هەموو كەسێك ئەو كاتەی پێویستی بە كردەوەكانی دەبێت لە دواڕۆژ بریتیە لەو كارانەی كە لە دونیا ئەنجامی داوە.

ئەی خاوەنی زانست ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوو لەسەر پەرستشی خۆی هانت بدات، ئەوە بزانە تەنها مەبەستی ئەوەیە ڕێزی تۆ لەلای خۆی بۆ تۆ ڕوون بكاتەوە، نەكەی ڕوو وەربگێڕی بۆ شتێكیتر، نەوەك لە كەرامەتی خوا دەگەڕێیتەوە بۆ ڕیسواییەكەی.

ئەی خاوەنی زانست بە دڵنیایی تۆ ئەگەر بەرد و ئاسن بگوازیتەوە ئاسانترە لەسەرت لەوەی قسە بۆ كەسێك بكەیت كە لە قسەت تێ نەگات، وە نموونەی ئەو كەسەی قسە بۆ كەسێك دەكات كە لە قسەكانی حاڵی نەبێت وەك ئەو كەسە وایە كە بانگی مردوو دەكات و خوان بۆ خەڵكی گۆڕستان دادەنێت.

## نامەی عەببادی كوڕی عەببادی خوواصی شامی

٦٧٦- «عَن عَبَّادِ بنِ عَبَّادٍ الخَوَّاصِ الشَّامِيِّ أَبِي عُتبَةَ، قَالَ: أَمَّا بَعدُ، اعقِلُوا، وَالعَقلُ نِعمَةٌ، فَرُبَّ ذِي عَقلٍ، قَد شُغِلَ قَلبُهُ، بِالتَّعَمُّقِ فِيمَا هُوَ عَلَيهِ ضَرَر، عَنِ الِانتِفَاعِ بِمَا يَحتَاجُ إِلَيهِ حَتَّى صَارَ عَن ذَلِكَ سَاهِيًا، وَمِن فَضلِ عَقلِ المَرءِ، تَركُ النَّظَرِ فِيمَا لاَ نَظَرَ فِيهِ، حَتَّى لاَ يَكُونَ فَضلُ عَقلِهِ، وَبالاً عَلَيهِ فِي تَركِ مُنَافَسَةِ مَن هُوَ دُونَهُ فِي الأَعمَالِ الصَّالِحَةِ، أَو رَجُلٍ شُغِلَ قَلبُهُ بِبِدعَةٍ، قَلَّدَ فِيهَا دِينَهُ، رِجَالاً دُونَ أَصحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ «أَوِ اكتَفَى بِرَأيِهِ فِيمَا لاَ يَرَى الهُدَى إِلاَّ فِيهَا، وَلاَ يَرَى الضَّلاَلَةَ إِلاَّ بِتَركِهَا، يَزعُمُ أَنَّهُ أَخَذَهَا مِنَ القُرآنِ، وَهُوَ يَدعُو إِلَى فِرَاقِ القُرآنِ أَفَمَا كَانَ لِلقُرآنِ حَمَلَةٌ قَبلَهُ، وَقَبلَ أَصحَابِهِ يَعمَلُونَ بِمُحكَمِهِ، وَيُؤمِنُونَ بِمُتَشَابِهِهِ؟ وَكَانُوا مِنهُ عَلَى مَنَارٍ لِوَضَحِ الطَّرِيقِ، وَكَانَ القُرآنُ إِمَامَ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِمَامًا لِأَصحَابِهِ، وكَانَ أَصحَابُهُ أَئِمَّةً، لِمَن بَعدَهُم رِجَالٌ مَعرُوفُونَ مَنسُوبُونَ فِي البُلدَانِ، مُتَّفِقُونَ فِي الرَّدِّ عَلَى أَصحَابِ الأَهوَاءِ، مَعَ مَا كَانَ بَينَهُم مِنَ الِاختِلاَفِ، وَتَسَكَّعَ أَصحَابُ الأَهوَاءِ بِرَأيِهِم فِي سُبُلٍ مُختَلِفَةٍ جَائِرَةٍ عَنِ القَصدِ، مُفَارِقَةٍ لِلصِّرَاطِ المُستَقِيمِ، فَتَوَّهَت بِهِم أَدِلاَّؤُهُم فِي مَهَامِهَ مُضِلَّةٍ، فَأَمعَنُوا فِيهَا

مُتَعَسِّفِينَ فِي تِيهِهِم» كُلَّمَا أَحدَثَ لَهُمُ الشَّيطَانُ بِدعَةً فِي ضَلاَلَتِهِم، انتَقَلُوا مِنهَا إِلَى غَيرِهَا، لِأَنَّهُم لَم يَطلُبُوا أَثَرَ السَّابِقِينَ، وَلَم يَقتَدُوا بِالمُهَاجِرِينَ وَقَد ذُكِرَ عَن عُمَرَ أَنَّهُ قَالَ لِزِيَادٍ: هَل تَدرِي مَا يَهدِمُ الإِسلاَمَ؟ زَلَّةُ عَالِمٍ، وَجِدَالُ مُنَافِقٍ بِالقُرآنِ، وَأَئِمَّةٌ مُضِلُّونَ، اتَّقُوا اللهَ وَمَا حَدَثَ فِي قُرَّائِكُم، وَأَهلِ مَسَاجِدِكُم، مِنَ الغِيبَةِ، وَالنَّمِيمَةِ، وَالمَشيِ بَينَ النَّاسِ بِوَجهَينِ، وَلِسَانَينِ، وَقَد ذُكِرَ أَنَّ مَن كَانَ ذَا وَجهَينِ فِي الدُّنيَا، كَانَ ذَا وَجهَينِ فِي النَّارِ، يَلقَاكَ صَاحِبُ الغِيبَةِ، فَيَغتَابُ عِندَكَ مَن يَرَى أَنَّكَ تُحِبُّ غِيبَتَهُ، وَيُخَالِفُكَ إِلَى صَاحِبِكَ، فَيَأتِيهِ عَنكَ بِمِثلِهِ، فَإِذَا هُوَ قَد أَصَابَ عِندَ كُلٍّ وَاحِدٍ مِنكُمَا حَاجَتَهُ، وَخَفِيَ عَلَى كُلِّ وَاحِدٍ مِنكُمَا مَا أُتِيَ بِهِ عِندَ صَاحِبِهِ، حُضُورُهُ عِندَ مَن حَضَرَهُ حُضُورُ الإِخوَانِ، وَغَيبَتُهُ عَن مِن غَابَ عَنهُ غَيبَةُ الأَعدَاءِ، مَن حَضَرَ مِنهُم كَانَت لَهُ الأَثَرَةُ، وَمَن غَابَ مِنهُم لَم تَكُن لَهُ حُرمَةٌ، يَفتِنُ مَن حَضَرَهُ بِالتَّزكِيَةِ، وَيَغتَابُ مَن غَابَ عَنهُ بِالغِيبَةِ، فَيَا لَعِبَادَ اللهِ أَمَا فِي القَومِ مَن رَشِيدٍ، وَلاَ مُصلِحٍ بِهِ يَقمَعُ هَذَا عَن مَكِيدَتِهِ، وَيَرُدُّهُ عَن عِرضِ أَخِيهِ المُسلِمِ؟ بَل عَرَفَ هَوَاهُم فِيمَا مَشَى بِهِ إِلَيهِم، فَاستَمكَنَ مِنهُم وَأَمكَنُوهُ مِن حَاجَتِهِ، فَأَكَلَ بِدِينِهِ مَعَ أَديَانِهِم، فَاللهَ اللهَ، ذُبُّوا عَن حُرَمِ أَعيانكم، وَكُفُّوا أَلسِنَتَكُم عَنهُم، إِلاَّ مِن خَيرٍ، وَنَاصِحُوا اللهَ فِي أُمَّتِكُم إِذ كُنتُم حَمَلَةَ الكِتَابِ وَالسُّنَّةِ، فَإِنَّ الكِتَابَ لاَ يُنطَقَ حَتَّى يَنطِقُ بِهِ، وَإِنَّ السُّنَّةَ لاَ تَعمَلُ حَتَّى يُعمَلَ بِهَا، فَمَتَى يَتَعَلَّمُ الجَاهِلُ إِذَا سَكَتَ العَالِمُ، فَلَم يُنكِر مَا ظَهَرَ، وَلَم يَأمُر بِمَا تُرِكَ؟ وَقَد أَخَذَ اللهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكتُمُونَهُ «اتَّقُوا اللهَ فَإِنَّكُم فِي زَمَانٍ رق فِيهِ الوَرَعُ، وَقَلَّ فِيهِ الخُشُوعُ، وَحَمَلَ العِلمَ مُفسِدُوهُ، فَأَحَبُّوا أَن يُعرَفُوا بِحَملِهِ، وَكَرِهُوا أَن يُعرَفُوا بِإِضَاعَتِهِ، فَنَطَقُوا فِيهِ بِالهَوَى، لَمَّا أَدخَلُوا فِيهِ مِنَ الخَطَإِ، وَحَرَّفُوا الكَلِمَ عَمَّا تَرَكُوا مِنَ الحَقِّ إِلَى مَا عَمِلُوا بِهِ مِن بَاطِلٍ، فَذُنُوبُهُم ذُنُوبٌ لاَ يُستَغفَرُ مِنهَا، وَتَقصِيرُهُم تَقصِيرٌ لاَ يُعتَرَفُ بِهِ، كَيفَ يَهتَدِي المُستَدلَ المُستَرشِدُ إِذَا كَانَ الدَّلِيلُ حَائِرًا؟ أَحَبُّوا الدُّنيَا، وَكَرِهُوا مَنزِلَةَ أَهلِهَا، فَشَارَكُوهُم فِي العَيشِ، وَزَايَلُوهُم بِالقَولِ، وَدَافَعُوا بِالقَولِ عَن أَنفُسِهُم أَن يُنسَبُوا إِلَى عَمَلِهِم، فَلَم يَتَبَرَّءُوا مِمَّا انتَفَوا مِنهُ، وَلَم يَدخُلُوا فِيمَا نَسَبُوا إِلَيهِ أَنفُسِهِم، لِأَنَّ العَامِلَ بِالحَقِّ مُتَكَلِّمٌ وَإِن سَكَتَ- وَقَد ذُكِرَ أَنَّ اللهَ تَعَالَى يَقُولُ: إِنِّي لَستُ كُلَّ كَلاَمِ الحَكِيمِ أَتَقَبَّلُ، وَلَكِنِّي أَنظُرُ إِلَى هَمِّهِ وَهَوَاهُ، فَإِن كَانَ هَمُّهُ وَهَوَاهُ لِي، جَعَلتُ صَمتَهُ حَمدًا وَوَقَارًا، وَإِن لَم يَتَكَلَّم» وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ ثُمَّ لَمۡ يَحۡمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢا ﴿٥﴾ ﴾الجمعة، كتباً وَقَالَ: ﴿ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ ﴿٦٣﴾ ﴾البقرة، قَالَ: العَمَلُ بِمَا فِيهِ، وَلاَ تَكتَفُوا مِنَ السُّنَّةِ، بِانتِحَالِهَا بِالقَولِ دُونَ العَمَلِ بِهَا، فَإِنَّ انتِحَالَ السُّنَّةِ دُونَ العَمَلِ بِهَا، كَذِبٌ بِالقَولِ مَعَ إِضَاعَةِ العَلِمِ، وَلاَ تَعِيبُوا بِالبِدَعِ تَزَيُّنًا بِعَيبِهَا، فَإِنَّ فَسَادَ أَهلِ البِدَعِ، لَيسَ بِزَائِدٍ فِي صَلاَحِكُم، وَلاَ تَعِيبُوهَا بَغيًا عَلَى أَهلِهَا، فَإِنَّ البَغيَ مِن فَسَادِ أَنفُسِكُم، وَلَيسَ يَنبَغِي لِلطَّبِيبِ أَن يُدَاوِيَ المَرضَى بِمَا يُبَرِّئُهُم وَيُمرِضُهُ، فَإِنَّهُ إِذَا مَرِضَ، اشتَغَلَ بِمَرَضِهِ عَن مُدَاوَاتِهِم، وَلَكِن يَنبَغِي أَن يَلتَمِسَ لِنَفسِهِ الصِّحَّةَ، لِيَقوَى بِهِ عَلَى عِلاَجِ المَرضَى فَلَيَكُن أَمرُكُم فِيمَا تُنكِرُونَ عَلَى إِخوَانِكُم نَظَرًا مِنكُم لِأَنفُسِكُم وَنَصِيحَةً مِنكُم لِرَبِّكُم، وَشَفَقَةً مِنكُم عَلَى إِخوَانِكُم، وَأَن تَكُونُوا مَعَ ذَلِكَ بِعُيُوبِ أَنفُسِكُم، أَعنَى مِنكُم بِعُيُوبِ غَيرِكُم، وَأَن يَستَفطِمَ بَعضُكُم بَعضًا النَّصِيحَةَ، وَأَن يَحظَى عِندَكُم مَن بَذَلَهَا لَكُم وَقَبِلَهَا مِنكُم، وَقَد قَالَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنهُ رَحِمَ اللهُ مَن أَهدَى إِلَيَّ عُيُوبِي، تُحِبُّونَ أَن تَقُولُوا فَيُحتَمَلَ لَكُم، وَإِن قِيلَ مِثلُ الَّذِي قُلتُم، غَضِبتُم «تَجِدُونَ عَلَى النَّاسِ فِيمَا تُنكِرُونَ مِن أُمُورِهِم، وَتَأتُونَ مِثلَ ذَلِكَ أَفَلاَ تُحِبُّونَ أَن يؤخذَ عَلَيكُم؟ اتَّهِمُوا رَأيَكُم وَرَأيَ أَهلِ زَمَانِكُم، وَتَثَبَّتُوا قَبلَ أَن تَكَلَّمُوا،

وَتَعَلَّمُوا قَبلَ أَن تَعمَلُوا، فَإِنَّهُ يَأتِي زَمَانٌ يَشتَبِهُ فِيهِ الحَقُّ وَالبَاطِلُ، وَيَكُونُ المَعرُوفُ فِيهِ مُنكَرًا، وَالمُنكَرُ فِيهِ مَعرُوفًا، فَكَم مِن مُقترِبٍ إِلَى اللهِ بِمَا يُبَاعِدُهُ، وَمُتَحَبِّبٍ إِلَيهِ بِمَا يبغضهُ عَلَيهِ، قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا ﴿٨﴾ ﴾فاطر، الآيَةَ، فَعَلَيكُم بِالوُقُوفِ عِندَ الشُّبُهَاتِ، حَتَّى يَبرُزَ لَكُم وَاضِحُ الحَقِّ بِالبَيِّنَةِ فَإِنَّ الدَّاخِلَ فِيما لاَ يَعلَمُ بِغَيرِ عِلمٍ آثِمٌ، وَمَن نَظَرَ لِلَّهِ، نَظَرَ اللهُ لَهُ» عَلَيكُم بِالقُرآنِ فَأْتَمُّوا بِهِ، وَأُمُّوا بِهِ، وَعَلَيكُم بِطلَبِ أَثَرِ المَاضِينَ فِيهِ، وَلَو أَنَّ الأَحبَارَ وَالرُّهبَانَ لَم يَتَّقُوا زَوَالَ مَرَاتِبِهِم، وَفَسَادَ مَنزِلَتِهِم، بِإِقَامَةِ الكِتَابِ بِأَعمَالِهِم، وَتِبيَانِهِ مَا حَرَّفُوهُ وَلاَ كَتَمُوهُ، وَلَكِنَّهُم لَمَّا خَالَفُوا الكِتَابَ بِأعمالهم، التَمَسُوا أَن يَخدَعُوا قَومَهُم عَمَّا صَنَعُوا، مَخَافَةَ أَن يفسدواَ مَنَازِلُهُم، وَأَن يَتَبَيَّنَ لِلنَّاسِ فَسَادُهُم، فَحَرَّفُوا الكِتَابَ بِالتَّفسِيرِ، وَمَا لَم يَستَطِيعُوا تَحرِيفَهُ، كَتَمُوهُ، فَسَكَتُوا عن صَنِيعِ أَنفُسِهِم إِبقَاءً عَلَى مَنَازِلِهِم، وَسَكَتُوا عَمَّا صَنَعَ قَومُهُم مُصَانَعَةً لَهُم، وَقَد أَخَذَ اللهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الكِتَابَ، لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكتُمُونَهُ، بَل مَالَئُوا عَلَيهِ، وَرَفَّقُوا لَهُم فِيهِ»[1].

واتە: عەبادی کوڕی عەببادی خوواصی شامی ئەبو عوتەیبە وتویەتی: ئەمما بەعد، عەقڵ بەکاربێنن عەقڵ نیعمەتە، هەندێ خاوەن عەقڵ هەیە دڵی سەرقاڵ کراوە بە قوڵبوونەوە لە شتێک کە زەرەری هەیە بۆی و، دووری دەخاتەوە لە شتێک کە پێویستیەتی تا وای لێ دێت لێی بێ ئاگا دەبێت، وە لە چاکی عەقڵی مرۆڤ ئەوەیە بیرکردنەوە وازلێبهێنێت لە شتانێک کە بیرکردنەوە و عەقڵ دەرکی پێ ناکەن، تاوەکو چاکی عەقڵەکەی نەبێتە بەڵا بەسەریەوە بە وازهێنانی منافەسە کردنی کەسانی خوارەخۆی لە کردەوەی چاک (واتە: کاتێ مرۆڤ فکر و ئەندێشەی سەرقاڵ دەکات بە شتانێک کە عەقڵ دەرکی پێ ناکات، هەم پێی ناگات و هەم لە منافەسەی چاکیش دادەبڕێت و خەڵکانی خوارەوەی خۆشی پێشی دەکەونەوە)، یان کەسێک کە دڵی خۆی سەرقاڵ کردوە بە بیدعە و داهێنراوێک، تیایدا تەقلیدی کەسانێک دەکات جگە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، یاخود تەنها بۆچوونی خۆی وەردەگرێ لە شتانێک کە پێی وایە هیچ بۆچوونێکی ڕاست و ڕێنموییکار نیە جگە لە بۆچوونەکەی خۆی و پێشی وایە گومراییش تەنها واز هێنانە لەو بۆچوونەی، پێی وایە کە ئەو بۆچوونەی لە قورئان وەرگرتووە، لەکاتێکدا بانگەشە بۆ جیابونەوە دەکات لە قورئان (بە هۆی بۆچوونە چەوتەکانی)، ئایا مەگەر قورئان پێشی ئەوو هاو وێنەکانی هەڵگرانی نەبووە کە کاریان بە ئایەتە ڕوونەکان کردبێت کە تێی گەیشتوون و بڕوایان بە ئایەتە ناڕوونەکان هەبووبێت؟! (مەگەر کەس لە قورئان حاڵی نەبووەو نەیانخوێندۆتەوە؟!)، کەچی ئەوان لە شارەزایی و تێگەیشتن لە قورئاندا لەسەر ڕووناکی ناوەڕاستی ڕێگا بوون، وە قورئان پێشەوای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ پێشەوای هاوەڵەکان بوو و، هاوەڵەکانیش پێشەوای پاشینەکان بوون، پیاوانێک بوون ناسراو بوون لە شارەکان، گشتیان کۆک بوون لەسەر بەرپەرچ دانەوەی کەسانی خاوەن هەوا و نەفس و گومڕا سەرەڕای ئەو جیاوازیەی لە نێوانیشیاندا هەبوو، وە خاوەنی هەوا و نەفس و گومڕایی بە هۆی بۆچوونەکانیان ڕۆچوون لە ڕێچکە جیاوازە لادەرەکان لە ڕێگای وەسەتیەت و جیاواز لە ڕێگای ڕاست، ڕێ نیشاندەرەکانیشیان سەریان لێ شێواندن لە بیابانێکی وشکی

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

گومڕاییداو دوورکەوتنەوە تیایدا بە ڕۆچوون لە سەرلێشێواویەکەیان، هەر جارێک شەیتان بیدعەیەکی نوێیان بۆ دروست دەکات، ئەوان لە بیدعەکە بۆ بیدعەیەکی تر دەچن، چونکە بەدوای شوێن پێی پێشینەکان ناگەڕێن و گەرەکیان نیە و شوێن کۆچکەکەکان (موهاجیرەکان) ناکەون.

لە عومەرەوە باس کراوە کە بە زیادی وتووە: ئایا دەزانی چ شتێک ئیسلام دەڕوخێنێت؟ خلیسکانی کەسی زاناو، کێشمەکێشم و مناقەشەی کەسی مونافیق بە قورئان و، پێشەوایانی گومڕاکار (دەیڕوخێنن)، لەخوا بترسن و پارێزکاربن لەوەی ڕوودەدات لە قورئانخوێنەکانتان و خەڵکی مزگەوتەکان لە غەیبەت و نەمیمەت و چوونە لای خەڵکی بە دوو ڕوو بە دوو زمان (بە نیفاقی عەمەلیەوە)، وە وتراوە ئەوەی دوو ڕووی هەبێت لە دونیا ئەوە دوو ڕووی هەیە لەناو دۆزەخدا، کەسی غەیبەتکار کە پێت دەگات غەیبەتی ئەو کەسە دەکات کە تۆ حەز لە غەیبەتکردنی دەکەیت، وە لای تۆ دەڕوات و دەچێتە لای هاورێکەت و عەیبەکانی تۆ بەهەمان شێوە بۆ ئەو دەبات (غەیبەتی تۆش لای ئەو دەکات)، ئا بەو شێوەیە کارەکەی خۆی لای هەردووکتان جێبەجێ دەکات (کە غەیبەت کردن و ناشیرن کردنی هەردووکتانە)، وە ئەوەش لە هەردووکتان دەشارێتەوە کە لای هاورێکەی تر کردویەتی، ئامادەبوونی لای ئەو کەسەی (ئەو دەمەی) لەلایەتی و ئامادەبوونی برایانەیە، غەیبەتەکەشی بۆ ئەو کەسەی ئامادە نیە غەیبەتی دوژمنانەیە، هەر کامێک لەوان ئامادە بێت مەدح و سەنا و گەورەییەکە بۆ ئەو دەبێت (هەر فەزڵی ئامادەبوەکە دەدات)، هەر کامێکیش لەوان غائیب بێت و لەلای نەبێت، ئەوە هیچ سنورێک و بەربەستێک و حورمەتێکی بۆ نیە (لە هیچ شتێکی سڵ ناکاتەوەو ناسڵەمێتەوە)، جا ئەو کەسە تووشی فیتنە دەکات بە مەدح کردن و تەزکیە کردنی، وە غەیبەتی ئەو کەسەش دەکات کە لێی ونە و لەوێ نیە، جا ئەی بەندەکانی خوا ئایا لە نێو ئەم خەڵکەدا ژیرێک و چاکەخوازێک نیە ئەم تەڵەکەبازیە کۆتایی پێ بهێنێت لە نەفسی ئەو کەسەدا و (ڕێگەی هیدایەتی بۆ ڕوون بکاتەوە)و لە حورمەتی برای مسوڵمانی بیگەڕێنێتەوە و(لێنەگەڕێت چیتر حورمەتی لەکەدار بکات)؟ بەڵام ئەو هەواو نەفسی ئەوان شارەزایەو خوێندوویەتیەوە لەوەی بۆیان دەبات (دەزانێ ئەو جۆرە غەیبەتەیان پێ خۆشە) و هەوڵی داوە خۆی قایم بکات و ئەوانیش ئەویان جێگیر کردوە لە کارەکەی، جا دینی خۆی و دینی ئەوانیش دەخوات و لەناوی دەبات.

لە خوا بترسن، لەخوا بترسن، دووربکەونەوە لە حورمەتی کەسانی دیاریکراوی نێو خۆتان و، زمانتان بگرن بەرانبەریان و، باسیان مەکەن تەنها بەچاکە نەبێت، وە ئامۆژگاریکاری خوا بن بۆ ئوممەتەکەتان، لەکاتێکدا ئێوە هەڵگرانی قورئان و سوننەتن، چونکە قورئان قسە ناکات تاوەکو قسەی پێ نەکرێت (واتە: دەبێت ئێوە جێبەجێکاری قورئان بن ئنجا دەکەوێتە مەیدان)، وە سوننەت و فەرموودەکانی پێغەمبەری خواش کار ناکەن تاوەکو کاریان پێ نەکرێت، جا کەی کەسی نەزان فێردەبێت لەکاتێکدا زانا بێ دەنگ بێت و ئینکاری نەکات لەوەی ڕودەدات و فەرمان نەکات بە جیبەجێ کردنی ئەوەی وازی لێهێندراوە؟! لە کاتێکدا خوا بەڵێنی لەو کەسانە وەرگرتووە کە پەرتوکی خۆی پێداون (کە زانایانن) بەوەی پەرتوکەکەی ڕوون بکەنەوە بۆ خەڵکی و نەیشارنەوە.

بترسن و پارێزکار بن لە سەردەمێکدا کە وەرەع و دینداری چاک تیایدا کەم دەبێت و، ترسی خوا تیایدا کەم دەبێت و، هەڵگرانی زانست ئەوانەن کە تێکی دەدەن (واتە: تێکدەری زانستەکەن) و، حەز دەکەن بناسرێن بە هەڵگرتنی زانست و، پێیان ناخۆشە بناسرێن بە تێکدەری زاست و بەفیڕۆدانی، جا قسە دەربارەی زانست دەکەن بە ئارەزووی خۆیان لەبەر ئەوەی بە هەڵە چوونەتە ناویەوە، وە زانست و وتە و قورئان و فەرموودە بە ئاراستەیەکی تردا دەبەن لەو شتانەی وازیان لێ هێناوە لە هەق و بۆ ئەو ئاراستەیەی دەبەن کە خۆیان کاری پێدەکەن لە باتڵ و ناهەقی و (کردەوە ناشەرعیەکانیان دەشەرعێنن)، جا تاوانەکەیان تاوانێکە تەوبەی لەسەر ناکرێت (ئەو کارەی خۆیان لا دەبێتە هەق و تەوبەی لێ ناکەن و فریوی خۆیان دەخۆن)، وە کەمتەرخەمیەکەیان کەمتەرخەمیێکە کە دانیپێدا نانرێت و ئیعتیرافی پێ ناکەن (بەڵکو بە هەقی موتڵەقی دەزانن)، چۆن ڕێنمویی ئەو کەسە دەکرێت کە بەدوای دەلیل و ڕێگەی ڕاستدا دەگەڕێت کاتێ دەلیلەکە خۆی سەرلێشێوێنەر بێت؟!

دونیایان خۆش دەوێت و پلەی خەڵکی دونیاشیان پێ خۆش نیە، بۆیە بەشدارن لەگەڵیاندا لە ژیان و جیاوازن لەگەڵیان لە قسەدا، وە بە قسە بەرگری لەخۆیان دەکەن لەوەی پاڵ بدرێن بۆ لای کردەوەکانیان (کردەوە دزێوەکانی خۆیان بە قسان دەشارنەوە)، جا خۆیان بەری ناکەن لەو شتەی خۆیانی لێ دوور دەخەنەوە (لە کردەوەی خراپ)، وە ناچن بە گژ ئەو شتەی خۆیانی دەدەنە پاڵ (کە کردەوەی چاکە)، چونکە کەسی کارکەر بە هەق قسەکەرە بە هەق هەرچەندە بێ دەنگیش بێت (چونکە کردەوەکەی خۆی بانگەوازە)، وە باسکراوە کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: من گشت قسەیەکی کەسی حەکیم و دانا وەرناگرم، بەڵکو سەیری نیەت و خواست و ویستی دەکەم، جا ئەگەر خواست و ویستی بۆ من بوو ئەوە بێ دەنگیەکەی دەکەم بە ستایش و ڕێزو ویقارڕ هەرچەندە قسەش نەکات.

وە خوا فەرموویەتی: واتە: ئەوانەی تەوراتیان هەڵگرتووەو زانستەکەیان لەلایەو﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا ﴿٥﴾ ﴾الجمعة، کاری پێ ناکەن، ﴿كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا ﴿٥﴾ ﴾الجمعة وەک نمونەی گوێدرێژ وان کە کتێبی هەڵگرتبێ (سوودی لێ نابینێت، تەنها سەنگ و قورسایەتیە لەسەر پشتی).

وە فەرموویەتی: ﴿ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَـٰكُم بِقُوَّةٍ ﴿٦٣﴾ ﴾البقرة، وەریبگرن ئەوەی پێمان داون بەهێز، واتە: بە کردەوەکردنی ئەوەی تیایەتی، وە واز مەهێنن لە فەرموودەدا بە وەرگرتنی بە قسە بەبێ کار پێ کردنی، چونکە وەرگرتنی سوننەت و فەرموودە بەبێ کردەوە درۆیە بە گوفتار لەگەڵ بەفیڕۆدانی زانست، وە خۆتان عەیبدار مەکەن بە بیدعە و داهێنراوەکان و خۆتانی پێ بڕازێننەوە بە عەیبەکانی (بە حیسابی خۆتان)، چونکە فەساد و خراپیەکانی ئەهلی بیدعە زیاتر نیە لە چاکیەکانی ئێوە (خۆتان پێ کەم نەبێت)، وە ئەهلی بیدعە لەکەدار و عەیبدار مەکەن لەبەر حەسادەت و ئیرەییتان بەوانەوە، چونکە حەسادەت بەشێکە لە خراپی خۆتان و بۆ دکتۆر نیە دەرمان و چارەسەری نەخۆش بکات بە شتێک کە چاکی بکاتەوە و نەخۆشیشی بکات، چونکە ئەگەر دکتۆر نەخۆش کەوت ئەوە سەرقاڵی نەخۆشیەکەی

دەبێت واز لە چارەسەر کردنی نەخۆشەکان دەهێنێت، بەڵکو پێویستە بەدوای ساغی و سەلامەتی خۆیدا بگەڕێت تاوەکو بەهێز بێت بۆ چارەسەر کردنی نەخۆشەکان.

بۆیە با کارەکەتان لەوەی نەهی دەکەن لە براکانتان تێفکرین و ڕەچاوکردنی ئێوە بێت بۆخۆتان و ئامۆژگاری ئێوە بێت لە پێناو پەروەردگارتان و، دڵنەرمیتان بێت بۆ براکانتان، وە لەگەڵ ئەوەشدا چاودێری عەیب و هەڵەکانی خۆتان زیاتر بکەن لە چاودێری کردنی عەیب و هەڵەی کەسانی جگە لە خۆتان، وە هەندێکتان ئامۆژگاری بە هەندێکتان بچێژن (ئامۆژگاری خوان و خۆش وەک خواردن)، وە با نزیک بێت لێتان ئەو کەسەی پێتان دەبەخشێت و لێتانی وەردەگرێت.

وە عومەری کوڕی خەتتاب وتویەتی: ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێت کە عەیب و هەڵەکانم بە دیاری بۆ دەهێنێت، پێتان خۆشە قسە بکەن و لێتان وەربگیرێت، وە ئەگەر هەمان ئەو قسەیەی دەیکەن پێتان بوترێت ئەوە تووڕە دەبن.

توندن لەسەر خەڵکی لەو شتانەی لە کاروباری ئەوان پێتان ناخۆشە و ئینکاری لێ دەکەن، وە خۆشتان هەمان شت دەکەن، جا ئایا پێتان خۆش نیە ئێوەش عەیبتان لێ بگیرێت؟!

بۆچوونی خۆتان و بۆچوونی خەڵکی سەردەمی خۆتان بە تۆمەت بزانن (زوو قەناعەت مەکەن) و، دڵنیا ببنەوە و لێکۆڵینەوە بکەن پێش ئەوەی قسە بکەن و، خۆتان فێر بکەن پێش ئەوەی کردەوە بکەن، چونکە سەردەمێک دێت هەق و باتڵ تیایدا تێکەڵ دەبێت و، چاکە تیایدا دەبێتە خراپە و، خراپەش تیایدا دەبێتە چاکە، ئا چەندە زۆرن ئەو کەسانەی خۆیان نزیک دەکەنەوە لە خوا (بە حیسابی خۆیان) بە کردەوەیەک کە دووریان دەخاتەوە، وە چەندە زۆرن ئەو کەسانەی خۆیان خۆشەویست دەکەن لەلای خوا (بە حیسابی خۆیان) بە شتێک کە بەهۆیەوە لێیان تووڕە دەبێت، خوا فەرموویەتی: ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنٗاۖ ﴿٨﴾ ﴾فاطر.

دەست بگرن بە هەڵوێستەکردن لە شتە گوماناویەکان تاوەکو ڕوونکەرەوەی هەقتان بۆ دەردەکەوێت بە بەڵگەی ڕوون، چونکە ئەو کەسەی دەچێتە ناو شتێک و بابەتێک کە لێی نازانێت و بەبێ زانست قسەی لەسەر دەکات تاوانبارە، وە هەر کەسێکیش بۆ خوا سەیری شتەکان بکات ئەوە خوا ڕوونی و بینایی پێ دەدات.

دەست بگرن بە قورئان و شوێنی بکەون و ئیمامەتی پێ بکەن، وە دەست بگرن بە شوێن پێی پێشینەکان لە قورئاندا، وە ئەگەر هاتوو ئەحبار و ڕوهبانەکان (واتە زاناکانی جولەکە و دیان) نەترسابوان لە نەمانی پلەکانی خۆیان و تێکچون و نەمانی مەنزیلەت و پۆستی خۆیان بە جێبەجێ کردنی کتێبی خوا بە کردەوەکانیان و ڕوونکردنەوەکانی ئەوە نەیان دەگۆڕی و نەیاندەشاردەوە، بەڵام کاتێ پێچەوانەی کتێبی خوایان کرد بە کردەوەکانیان، کەوتنە دوای فریودانی گەلەکەیان لەوەی خۆیان ئەنجامیان دەدا (واتە: کردەوەکانی خۆیان دەشەرعاند) لەترسی لەناوچونی پلە و پایەی خۆیان و ڕوونبونەوەی خراپەکاریەکانیان، بۆیە کتێبی خوایان گۆڕی بە لێکدانەوە و تەفسیری (خۆیان)، وە ئەوەیشی کە نەیانتوانی بیگۆڕن شاردیانەوە،

جا بێ دەنگ بوون بەرانبەر كردەوەی خۆیان تا بمێننەوە لە پلەو پایەی خۆیان، وە بێ دەنگ بوون بەرانبەر ئەو كردەوانەی قەومەكەی دەیان كرد بۆ ڕازی بونی ئەوان، لەكاتێكدا خوای پەروەردگار پەیمانی وەرگرتووە لەو كەسانەی پەرتوكی خوایان پێ بەخشراوە (زانان لە دینی خوا) بەوەی ڕوونی بكەنەوە بۆ خەڵكی و نەیشارنەوە، بەڵكو پارمەتیان دان و بۆیان شكاندنەوە و بۆیان شل كردن لە كتێبی خوا (واتە: خەڵكیان لە هەندێک حوكمی خوا عەفو دەكرد و لەدویان دەدان، ئەمەش سیفاتی زانایانی ڕەببانی نیە).

## بابەت: واجبیەتی دەستنوێژ و نوێژ

٦٧٧- «عَن أَنَسِ بنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا نُهِينَا أَن نَبتَدِئَ النَّبِيَّ ﷺ، كَانَ يُعجِبُنَا أَن يَقدُمَ البَدَوِيُّ وَالأَعرَابِيُّ العَاقِلُ، فَيَسأَلَ النَّبِيَّ ﷺ، وَنَحنُ عِندَهُ، فَبَينَا نَحنُ كَذَلِكَ إذ جَاءَ أَعرَابِيٌّ، فَجَثَا بَينَ يَدَي رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّ رَسُولَكَ أَتَانَا فَزَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزعُمُ أَنَّ اللهَ أَرسَلَكَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ صَدَقَ، قَالَ: فَبِالَّذِي رَفَعَ السَّمَاءَ، وَبَسَطَ الأَرضَ، وَنَصَبَ الجِبَالَ، اللهُ أَرسَلَكَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: نَعم قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَكَ زَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزعُمُ أَنَّ عَلَينَا خَمسَ صَلَوَاتٍ فِي اليَومِ وَاللَّيلَةِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: صَدَقَ قَالَ: فَبِالَّذِي أَرسَلَكَ، اللهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: نَعم قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَكَ زَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزعُمُ أَنَّ عَلَينَا صَومَ شَهرٍ فِي السَّنَةِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: صَدَقَ قَالَ: فَبِالَّذِي أَرسَلَكَ، اللهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعم قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَكَ زَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزعُمُ أَنَّ عَلَينَا فِي أَموَالِنَا الزَّكَاةَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: صَدَقَ قَالَ: فَبِالَّذِي أَرسَلَكَ، اللهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: نَعم قَالَ: فَإِنَّ رَسُولَكَ زَعَمَ لَنَا أَنَّكَ تَزعُمُ أَنَّ عَلَينَا الحَجَّ إِلَى البَيتِ مَنِ استَطَاعَ إِلَيهِ سَبِيلاً؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: صَدَقَ قَالَ: فَبِالَّذِي أَرسَلَكَ اللهُ أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: نَعم قَالَ: فَوَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ لاَ أَدَعُ مِنهُنَّ شَيئًا، وَلاَ أُجَاوِزُهُنَّ، قَالَ: ثُمَّ وَثَبَ الأَعرَابِيُّ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِن صَدَقَ الأَعرَابِيُّ دَخَلَ الجَنَّةَ»[1].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێک نەهیمان لێ کرا کە (زۆر) پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ بکەین (تەنها بۆ شتێک نەبێ کە زۆر پێویست بێت، ئیتر کەم پرسیارمان دەکرد)، حەزمان دەکرد عەرەبێکی دەشتەکی ژیر بێت و پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ بکات و ئێمەش لەلای بین (چونکە ئەوان شەرمیان نەدەکرد پرسیاری خۆیان دەکرد، ئێمەش گوێمان بۆ وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگرت و سوودمان وەردەگرت)، لە کاتێکدا ئێمە بەو شێوەیە بووین (لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بووین بەو شێوەیەی حەزمان دەکرد) لەناکاو عەرەبێکی دەشتەکی هات و لە سەر چۆک دانیشت لە بەر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی موحەممەد نێردراوەکەت هاتە لامان و پێی وتین کە تۆ بانگەشەی ئەوە دەکەی کە خوا بە پێغەمبەر ﷺ ڕەوانەی کردووی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕاست دەکات، (پیاوەکە) وتی: سوێند بەوەی ئاسمانی بەرز کردووە و، زەوی ڕاخستووە و، چیاکانی چەقاندووە، ئایا خوا تۆی ڕەوانە کردووە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ. (پیاوەکە) وتی: نێردراوەکەت بە ئێمەی وتووە کە تۆ وتوتە پێنج نوێژمان لەسەر واجبە لە شەو و ڕۆژێک؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕاست دەکات، (پیاوەکە) وتی: سوێند بەوەی تۆی ڕەوانە کردووە خوا فەرمانی بەمە پێ کردووی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ. (پیاوەکە) وتی: نێردراوەکەت بە ئێمەی وتووە کە تۆ وتوتە لە ساڵێک مانگێک ڕۆژومان لەسەر واجبە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕاست دەکات، (پیاوەکە) وتی: سوێند بەوەی تۆی ڕەوانە کردووە خوا فەرمانی بەمە پێ کردووی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ. (پیاوەکە) وتی: نێردراوەکەت بە ئێمەی وتووە کە تۆ وتوتە زەکاتمان لەسەر واجبە لە ماڵ و سەروەت و سامانمان؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕاست دەکات، (پیاوەکە) وتی: سوێند بەوەی تۆی ڕەوانە کردووە خوا فەرمانی

---

(١) ـ إسناده صحيح.

بەمە پێ كردووی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ. (پیاوەكە) وتی: نێردراوەكەت بە ئێمەی وتووە كە تۆ وتوتە حەجی ماڵی خوامان لەسەر واجبە بۆ كەسێك كە توانای ئەو ڕێگایەی هەبێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕاست دەكات، (پیاوەكە) وتی: سوێند بەوەی تۆی ڕەوانە كردووە خوا فەرمانی بەمە پێ كردووی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ. (پیاوەكە) وتی: سوێند بەوەی تۆی بە هەق ڕەوانە كردووە هیچ شتێك لەو واجباتانە واز لێناهێنم و لەوەش زیاتر ئەنجام نادەم. (ئەنەس) دەڵێ: دواتر عەرەبە دەشتەكیەكە هەڵسا و ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر عەرەبە دەشتەكیەكە ڕاست بكات (ئەو واجباتانە هیچ نەفەوتێنێ) ئەوە دەچێتە بەهەشت.

٦٧٨- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: جَاءَ أعرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيكَ يَا غُلَامَ بَنِي عَبدِ المُطَّلِبِ فَقَالَ: وَعَلَيكَ قَالَ: إِنِّي رَجُلٌ مِن أَخوَالِكَ مِن بَنِي سَعدِ بنِ بَكرٍ، وَأَنَا رَسُولُ قَومِي إِلَيكَ وَوَافِدُهُم، وَإِنِّي سَائِلُكَ فَمُشَدِّدٌ مَسأَلَتِي عَلَيكَ، وَمُنَاشِدُكَ فَمُشَدِّدٌ مُنَاشَدَتِي إِيَّاكَ قَالَ: خُذ عَنكَ يَا أَخَا بَنِي سَعدٍ قَالَ: مَن خَلَقَكَ، وَخَلَقَ مَن قَبلَكَ، وَمَن هُوَ خَالِقُ مَن بَعدَكَ؟ قَالَ: اللهُ قَالَ: فَنَشَدتُكَ بِذَلِكَ، أَهُوَ أَرسَلَكَ؟ قَالَ: نَعم قَالَ: مَن خَلَقَ السَّمَاوَاتِ السَّبعَ وَالأَرَضِينَ السَّبعَ، وَأَجرَى بَينَهُنَّ الرِّزقَ؟ قَالَ: اللهُ قَالَ: فَنَشَدتُكَ بِذَلِكَ، أَهُوَ أَرسَلَكَ؟ قَالَ: نَعم قَالَ: إِنَّا وَجَدنَا فِي كِتَابِكَ، وَأَمَرَتنَا رُسُلُكَ أَن نُصَلِّيَ فِي اليَومِ وَاللَّيلَةِ خَمسَ صَلَوَاتٍ لِمَوَاقِيتِهَا، فَنَشَدتُكَ بِذَلِكَ، أَهُوَ أَمَرَكَ؟ قَالَ: نَعم قَالَ: فَإِنَّا وَجَدنَا فِي كِتَابِكَ، وَأَمَرَتنَا رُسُلُكَ أَن نَأخُذَ مِن حَوَاشِي أَموَالِنَا، فَنَرُدَّهَا عَلَى فُقَرَائِنَا، فَنَشَدتُكَ بِذَلِكَ، أَهُوَ أَمَرَكَ بِذَلِكَ؟ قَالَ: نَعم ثُمَّ قَالَ: أَمَا الخَامِسَةُ، فَلَستُ بِسَائِلِكَ عَنهَا، وَلاَ إِربَ لِي فِيهَا ثُمَّ قَالَ: أَمَّا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالحَقِّ، لأَعمَلَنَّ بِهَا وَمَن أَطَاعَنِي مِن قَومِي، ثُمَّ رَجَعَ فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَت نَوَاجِذُهُ، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفسِي بِيَدِهِ، لَئِن صَدَقَ، لَيَدخُلَنَّ الجَنَّةَ»[1].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێكی عەرەبی دەشتەكی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: سەلامی خوات لێ بێت ئەی گەنجی هۆزی عەبدولموتەڵیب، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەسەر تۆش، (پیاوەكە) وتی: من پیاوێكم لە خاڵەكانت لە هۆزی سەعدی كوڕی بەكر، وە من نێردراو و وەفدی قەومەكەمم بۆ لای تۆ، وە پرسیارت لێ دەكەم و پرسیارەكانیشم بەرانبەرت توندن، وە سوێندت پێ دەدەم سوێند دانەكەشم پێت توند و بەهێزە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: با وابێت دەست پێ بكە ئەی برای بەنی سەعد، پیاوەكە وتی: كێ تۆی دروست كردووە و ئەوانەی پێش تۆی دروست كردووە و دروستكەری ئەوانەی دوای تۆشە؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: الله، (پیاوەكە) وتی: سوێندت دەدەم بەوە ئایا ئەو تۆی ڕەوانە كردووە؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، (پیاوەكە) وتی: كێ حەوت ئاسمانەكان و حەوت (چینەكانی) زەوی دروست كردووە و لەو نێوانەش ڕزق و ڕۆزی دەدات؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: الله، (پیاوەكە) وتی: سوێندت دەدەم بەوە ئایا ئەو تۆی ڕەوانە كردووە؟ (پێغەمبەری خوا) فەرمووی: بەڵێ، (پیاوەكە) وتی: ئێمە زانیومانە لە پەرتوكەكەی تۆ (كە بۆت ڕەوانە كراوە) هەروەها نێردراوەكانیشت فەرمانیان پێ كردووین كە پێنج نوێژ ئەنجام بدەین

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

لە شەو و ڕۆژێکدا لە کاتی خۆیان، جا سوێندت دەدەم بەوە (بە الله) ئایا ئەو فەرمانی پێ کردووی؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، (پیاوەکە) وتی: ئێمە زانیومانە لە پەرتوکەکەی تۆ (کە بۆت ڕەوانە کراوە) هەروەها نێردراوەکانیشت فەرمانیان پێ کردووین کە لە زیادەی ماڵەکانمان بەشێک دەربکەین و بیدەین بە هەژارەکانمان، جا سوێندت دەدەم بەوە (بە الله) ئایا ئەو فەرمانی بەمە پێ کردووی؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، دواتر (پیاوەکە) وتی: هەرچی پرسیاری پێنجەمیشە لێت ناپرسم و هیچ کارم پێی نیە، دواتر وتی: سوێند بەوەی تۆی بە هەق ڕەوانە کردووە کاریان پێ دەکەم (بەم واجباتانە) وە هەرکەسێکیش گوێڕایەڵیم بکات لە قەومەکەم (دەبێ ئەویش کاری پێ بکات)، دواتر گەڕایەوە (بۆ ناو قەومەکەی)، پێغەمبەر ﷺ پێکەنی هەتا ددانەکانی دواوەی دەرکەوتن، دواتر فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر (ئەو پیاوە) ڕاست بکات (کار بەو واجباتانە بکات) ئەوە بە دڵنیایی دەچێتە بەهەشت.

٦٧٩- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: بَعَثَ بَنُو سَعدِ بنِ بَكرٍ ضِمَامَ بنَ ثَعلَبَةَ ﷺ إِلَى رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَدِمَ عَلَيهِ، فَأَنَاخَ بَعِيرَهُ عَلَى بَابِ المَسجِدِ، ثُمَّ عَقَلَهُ، ثُمَّ دَخَلَ المَسجِدَ وَرَسُولُ اللهِ ﷺ جَالِسٌ فِي أَصحَابِهِ، وَكَانَ ضِمَامٌ رَجُلاً جَلدًا، أَشعَرَ، ذَا غَدِيرَتَينِ، حَتَّى وَقَفَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: أَيُّكُمُ ابنُ عَبدِ المُطَّلِبِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَنَا ابنُ عَبدِ المُطَّلِبِ، قَالَ: مُحَمَّدٌ؟ قَالَ: نَعم قَالَ: يَا ابنَ عَبدِ المُطَّلِبِ، إِنِّي سَائِلُكَ وَمُغَلِّظٌ فِي المَسأَلَةِ، فَلاَ تَجِدَنَّ عَلَيَّ فِي نَفسِكَ، قَالَ: لاَ أَجِدُ فِي نَفسِي، فَسَل عَمَّا بَدَا لَكَ قَالَ: إِنِّي أَنشُدُكَ بِاللهِ إِلَهِكَ وَإِلَهِ مَن كَانَ قَبلَكَ، وَإِلَهِ مَن هُوَ كَائِنٌ بَعدَكَ، اللهُ بَعَثَكَ إِلَينَا رَسُولاً؟ قَالَ: اللهُمَّ نَعم، قَالَ: فَأَنشُدُكَ بِاللهِ إِلَهِكَ وَإِلَهِ مَن كَانَ قَبلَكَ، وَإِلَهِ مَن كَائِنٌ بَعدَكَ، اللهُ أَمَرَكَ أَن نَعبُدَهُ وَحدَهُ لاَ نُشرِكُ بِهِ شَيئًا، وَأَن نَخلَعَ هَذِهِ الأَندَادَ الَّتِي كَانَت آبَاؤُنَا تَعبُدُهَا مِن دُونِهِ؟ قَالَ: اللهُمَّ نَعم قَالَ: فَأَنشُدُكَ بِاللهِ إِلَهِكَ وَإِلَهِ مَن كَانَ قَبلَكَ، وَإِلَهِ مَن هُوَ كَائِنٌ بَعدَكَ، اللهُ أَمَرَكَ أَن نُصَلِّيَ هَذِهِ الصَّلَوَاتِ الخَمسَ؟ قَالَ: اللهُمَّ نَعم، قَالَ: ثُمَّ جَعَلَ يَذكُرُ فَرَائِضَ الإِسلاَمِ فَرِيضَةً فَرِيضَةً الزَّكَاةَ، وَالصِّيَامَ، وَالحَجَّ، وَشَرَائِعَ الإِسلاَمِ كُلَّهَا، وَيُنَاشِدُهُ عِندَ كُلِّ فَرِيضَةٍ، كَمَا نَاشَدَهُ فِي الَّتِي قَبلَهَا حَتَّى إِذَا فَرَغَ، قَالَ: فَإِنِّي أَشهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبدُهُ وَرَسُولُهُ، وَسَأُؤَدِّي هَذِهِ الفَرِيضَةَ، وَأَجتَنِبُ مَا نَهَيتَنِي عَنهُ، ثُمَّ قَالَ: لاَ أَزِيدُ وَلاَ أَنقِصُ، ثُمَّ انصَرَفَ إِلَى بَعِيرِهِ، فَقَالَ رَسُولِ اللهِ ﷺ حِينَ وَلَّى: إِن يَصدُق ذُو العَقِيصَتَينِ، يَدخُلِ الجَنَّةَ، فَأَتَى إِلَى بَعِيرِهِ فَأَطلَقَ عِقَالَهُ، ثُمَّ خَرَجَ حَتَّى قَدِمَ عَلَى قَومِهِ فَاجتَمَعُوا إِلَيهِ، فَكَانَ أَوَّلَ مَا تَكَلَّمَ أَن قَالَ: بِئسَتِ اللاَتُ وَالعُزَّى، قَالُوا: مَه يَا ضِمَامُ، اتَّقِ البَرَصَ، وَاتَّقِ الجُنُونَ، وَاتَّقِ الجُذَامَ، قَالَ: وَيلَكُم، إِنَّهُمَا وَاللهِ لاَ تَضُرَّانِ وَلاَ تَنفَعَانِ، إِنَّ اللهَ قَد بَعَثَ رَسُولاً، وَأَنزَلَ عَلَيهِ كِتَاباً استَنقَذَكُم بِهِ مِمَّا كُنتُم فِيهِ، وَإِنِّي أَشهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبدُهُ وَرَسُولُهُ، وَقَد جِئتُكُم مِن عِندِهِ بِمَا أَمَرَكُم بِهِ، وَنَهَاكُم عنهُ، قَالَ: فَوَاللهِ مَا أَمسَى مِن ذَلِكَ اليَومِ، وَفِي حَاضِرِهِ رَجُلٌ وَلاَ امرَأَةٌ، إِلاَّ مُسلِمًا، قَالَ: يَقُولُ ابنُ عَبَّاسٍ: فَمَا سَمِعنَا بِوَافِدِ قَومٍ كَانَ أَفضَلَ مِن ضِمَامِ بنِ ثَعلَبَةَ»[1].

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هۆزی سەعدی کوڕی بەکر ضەمامەی کوڕی ثەعلەبەیان ﷺ نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و هاتە لای و وشترەکەی یەخ کرد لە نزیک دەرگای مزگەوت و دواتر بەستایەوە و چووە ناو مزگەوت، پێغەمبەری خواش ﷺ لەناو هاوەڵەکانی دانیشتبوو، ضەمامەش پیاوێکی بەهێزو بە موو بوو دوو بسکی هەبوون (دوو کەزی هەبوون)، (هات) تاوەکو لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ وەستاو وتی: کامتان کوڕی عەبدولموتەڵیبە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: من کوڕی عەبدولموتەڵیبم، (ضەمامە) وتی: موحەممەدی؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، (ضەمامە) وتی: ئەی کوڕی عەبدولموتەڵیب من پرسیارت لێ دەکەم لە پرسیار کردنیش ڕشد و ڕەق و توندم هیچی منت لەبەر دڵ نەبێ، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: لەبەر دڵم نابێ و پرسیار بکە ئەوەی دەتەوێ، (ضەمامە) وتی: من سوێندت دەدەم بە (الله) کە خوای تۆ و خوای ئەو کەسانەی پێش تۆیە و خوای ئەو کەسانەشە کە لە دوای تۆ دێن (ئایا) خوا (الله) تۆی بە پێغەمبەر ڕەوانە کردووە بۆ لای ئێمە؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەی خوایە (شاهێدی دەدەم بە تۆ) بەڵێ ئەو ڕەوانەی کردووم، (ئیبنو عەبباس) دەفەرموێ: دواتر (ضەمامە) دەستی پێ کرد باسی فەڕزەکانی ئیسلامی کرد فەڕز بە فەڕز: زەکات و ڕۆژوو حەج و واجباتەکانی ئیسلام بە تێکڕایی، وە پێغەمبەری خوای ﷺ سوێنددا لە هەموو فەرزێک (کە باسی دەکرد)، وەک چۆن سوێندیدا لەوەی پێشوو تا لێبوویەوە و (پرسیارەکانی تەواو بوو)، (دواتر) وتی: من شاهێدی دەدەم کە هیچ خوایێک بە هەق نیە جگە لە الله، وە شاهێدیش دەدەم کە موحەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە، وە ئەو واجباتانەش ئەنجام دەدەم و دوور دەکەومەوە لەوەی لێت قەدەغە کردووم، دواتر وتی: نە زیاتر ئەنجام دەدەم و نە کەمیشیان دەکەمەوە، دواتر چوو بۆ لای وشترەکەی، جا کاتێ ڕۆیشت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ڕاست بکات خاوەن دوو بسکەکە ئەوە دەچێتە بەهەشت.

ضەمامەش چووە لای وشترەکەی و پەتەکەی کردەوە و ڕۆیشت، تا چووە لای قەومەکەی و لەلای کۆبونەوە، جا یەکەم قسەوتی: لات و عوززا خراپترین شتن، (قەومەکەی) وتیان: وسبە، ئەی ضەمامە لە بەڵەک بوون و شێت بوون و گوڕی بوون بترسە، (ضەمامە) وتی: هاوار بۆ ئێوە سوێند بە (الله) ئەو دووانە (لات و عوززا) نە زیان دەگەیەنن و نە سوودیش دەبەخشن، خوای پەروەردگار پێغەمبەرێکی ڕەوانە کردووە و پەرتوکێکی بۆ ناردۆتە خوارەوە کە ڕزگارتان دەکات لەو شتە (ناڕەوایانەی) پێشتر ئێوە لەسەری بوون، وە من شاهێدی دەدەم کە هیچ خوایێک نیە بە هەق جگە لە الله، وە شاهێدیش دەدەم کە موحەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە، وە من لەلای ئەوەوە هاتووم بە شتانێکەوە کە فەرمانتان پێ دەکات ئەنجامی بدەن و (بە شتانێکیشەوە) کە لێی قەدەغە کردوون.

(ئیبنو عەبباس) دەڵێ: سوێند بەخوا ئێوارەیان نەکردەوە (ئێوارەیان بەسەر دانەهات) لەو ڕۆژەدا هەرچی پیاو و ژنێکە کە لەلای ئامادەبوون مسوڵمانی بوون (واتە: ئەوانەی لەلای بوون هەموویان بوونە مسوڵمان پێش ئەوەی ئێوارە دابێت و هەموو ئێوارەیان کردەوە بە مسوڵمانی).

ئیبنو عەبباس دەیوت: گوێمان لێ نەبووە (نەمان زانیوە) هیچ وەفد و نێردراوی قەومێک باشتر بوبێت لە ضەمامەی کوڕی ثەعلەبە.

## بابەت: ئەو فەرموودانەی دەربارەی دەستنوێژ هاتوون

٦٨٠- «عَن أَبِي مَالِكٍ الأَشعَرِيِّ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللهُ ﷺ قَالَ: الطُّهُورُ شَطرُ الإِيمَانِ، وَالحَمدُ لِلَّهِ يَـمْلأُ المِيزَانَ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَاللهُ أَكبَرُ يَـمْلأَنِ مَا بَينَ السَّمَاءِ، وَالأَرضِ، وَالصَّلاَةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرهَانٌ، وَالوُضُوءُ ضِيَاءٌ، وَالقُرآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَو عَلَيكَ- وَكُلُّ النَّاسِ يَغدُو: فَبَائِعٌ نَفسَهُ، فَمُعتِقُهَا، أَو مُوبِقُهَا»[١].

واتە: لە ئەبو مالیکی ئەشعەری ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پاک و خاوێنی بەشێکی ئیمانە، (الحمد لله)ش تەرازووی کردەوە پڕ دەکات، (لا إله إلا الله) و (اللّٰه أكبر)یش نێوان ئاسمان و زەوی پڕ دەکەن، نوێژیش ڕووناکیە (بۆ ناخ و ڕۆحی مرۆڤ)، صەدەقەش بەڵگەیە (بۆ مرۆڤ لە ڕۆژی دوایی)، دەستنوێژیش ڕووناکیە (بۆ جەستەو ڕوخسار و ڕوکەشی مرۆڤ)، قورئانیش یان بەڵگەیە بۆت یان (بەڵگەیە) لەسەرت، وە هەموو خەڵکی بەیانی دەکەنەوە: (هەر یەکێکیان) یان خۆی دەفرۆشێت (بە خوا) و خۆی ئازاد دەکات (لە دۆزەخ)، یانیش خۆی دەفرۆشێت (بە نەفس و شەیتان) و خۆی بە هیلاک دەدات.

٦٨١- « عَن رَجُلٍ مِن بَنِي سُلَيمٍ قَالَ: عَقَدَهُنَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي يَدِي أَو قَالَ عَقَدَهُنَّ فِي يَدِهِ وَيَدُهُ فِي يَدِي: سُبحَانَ اللهِ نِصفُ المِيزَانَ، وَالحَمدُ لِلَّهِ يَـمْلأُ الميزانَ، وَاللهُ أَكبَرُ يَـمْلأُ مَا بَينَ السَّمَاءِ وَالأَرضِ، وَالوُضُوءُ نِصفُ الإِيمَانِ، وَالصَّومُ نِصفُ الصَّبرِ»[٢].

واتە: لە پیاوێکی بەنی سولەیم گیرِدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی ژماردم لە دوو دەستەکانم یانیش وتی بۆی ژماردم لە دەستی خۆی، دەستیشی لەناو دەستی من بوو (ئاوا ژماردی و فەرمووی): (سبحان الله) نیوەی تەرازووە (نیوەی پر دەکات)، (الحمد لله)ش (گشت) تەرازوو پڕ دەکات، (اللّٰه أكبر)یش نێوان ئاسمان و زەوی پڕ دەکات، دەستنوێژیش نیوەی ئیمانە، ڕۆژووش نیوەی صەبر و ئارام گرتنە.

٦٨٢- «عَن ثَوبَانَ ﷺ مَولَى رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: استَقِيمُوا وَلَن تُحصُوا، وَاعلَمُوا أَنَّ خَيرَ أَعمَالِكُمُ الصَّلاَةُ وَقَالَ الآخَرُ إِنَّ مِن خَيرِ أَعمَالِكُمُ الصَّلاَةَ وَلَن يُحَافِظَ عَلَى الوُضُوءِ إِلاَّ مُؤمِنٌ»[٣].

واتە: لە ثەوبان ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوامیتان هەبێت (لەسەر عیبادەت و چاکە) ناشگەنە ئەوپەڕی ئیستیقامە بشزانن چاکترین کردەوەی ئێوە نوێژە. یەکێکی تر (کە ئەو فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، کە ئەعمەشە) وتویەتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:) بە دڵنیایی یەکێک لە چاکترین کردەوەکانتان نوێژە، وە کەس پارێزگاری لە دەستنوێژ ناکات بەبەردەوامی جگە لە کەسی بڕوادار.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٦٨٣- « عَن ثَوبَانَ ﷺ، مَولَى رَسُولِ اللهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: سَدِّدُوا، وَقَارِبُوا، وَخَيرُ أَعمَالِكُمُ الصَّلاَةُ، وَلاَ يُحَافِظُ عَلَى الوُضُوءِ إلاَّ مُؤمِنٌ»[١].

واتە: لە ثەوبان ﷺ خزمەتكاری پێغەمبەری خواوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دوای ڕاستی و صەوابدا بگەڕێن و مامناوەندی بن لە عیبادەت و كاروباری ئیسلامەتیدا (نە كەمتەرخەم بن و نە زیادەڕەوی بكەن، بەڵكو وەسەتیەت بگرن)، وە چاكترین كردەوەی ئێوە نوێژە، كەسیش پارێزگاری لە دەستنوێژ ناكات بەبەردەوامی جگە لە بڕوادار.

**بابەت: دەربارەی ئەو ئایەتەی خوا دەفەرموێ:**
**﴿إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ ۝٦﴾ المائدة.**
**واتە: ئەگەر نیازتان وابوو بۆ نوێژ هەڵسن ئەوە دەستنوێژ بشۆرن.**

٦٨٤- «عَن عِكرِمَةَ، أَنَّ سَعدًا ﷺ، كَانَ يُصَلِّي الصَّلَوَاتِ كُلَّهَا بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ» وأَنَّ عليًّا ﷺ كَانَ يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلاَةٍ وَتَلاَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ ۝٦﴾ المائدة)»[٢].

واتە: لە عیكریمە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: سەعد هەموو نوێژەكانی بە یەک دەستنوێژ ئەنجام دەدا، عەلی ﷺ بۆ هەموو نوێژێک دەستنوێژی دەشۆرد و ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ ۝٦﴾ المائدة، واتە: [ئەگەر نیازتان وابوو بۆ نوێژ هەڵسن ئەوە دەستنوێژ بشۆرن].

٦٨٥- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ عَبدِ اللهِ بنِ عُمَرَ، قَالَ: قُلتُ: أَرَأَيتَ تَوَضُّأَ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا لِكُلِّ صَلاَةٍ طَاهِرًا أَو غَيرَ طَاهِرٍ، عَمَّ ذَلِكَ؟ قَالَ: حَدَّثَتهُ أَسمَاءُ بِنتُ زَيدِ بنِ الخَطَّابِ، أَنَّ عَبدَ اللهِ بنَ حَنظَلَةَ بنِ أَبِي عَامِرٍ، حَدَّثَهَا: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ بِالوُضُوءِ لِكُلِّ صَلاَةٍ، طَاهِرًا أَو غَيرَ طَاهِرٍ، فَلَمَّا شَقَّ ذَلِكَ عَلَيهِ، أَمَرَ بِالسِّوَاكِ لِكُلِّ صَلاَةٍ وَكَانَ ابنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، يَرَى أَنَّ بِهِ عَلَى ذَلِكَ قُوَّةً، فَكَانَ لاَ يَدَعُ الوُضُوءَ لِكُلِّ صَلاَةٍ»[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عومەر گێردراوەتەوە، كە (موحەممەدی كوڕی حەببان) وتویەتی: (بە عەبدوڵڵای كوڕی ئیبنو عومەر)م وت: ئایا دەستنوێژی ئیبنو عومەرت (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، بینیوە كە چۆن بۆ هەموو نوێژێک هەڵی دەگرێت دەستنوێژی مابێ یان نەمابێ، ئایا گشتگیری كردوە، (ئەوە چۆنە)؟ عەبدوڵڵای كوڕی ئیبنو عومەر وتی: ئەسمائی كچی زەیدی كوڕی خەتتاب بۆی گێرامەوە كە عەبدوڵڵای كوڕی حەنظەڵەی كوڕی عامر بۆی گێڕاوەتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی كرد بە

---

(١) ـ إسناده حسن، ولكن الحديث صحيح.

(٢) ـ رجاله ثقات، لكنه منقطع.

(٣) ـ صحيح.

دەستنوێژ بۆ هەموو نوێژێک دەستنوێژ مابێت یان نەمابێت، جا کاتێک ئەو کارە قورس و گران بوو لەسەر (عەبدوڵڵای کوڕی حەنظەڵە) فەرمانی کرد بە سیواک کردن بۆ هەموو نوێژێک، جا ئیبنو عومەر پێی وابوو خۆی توانای ئەوەی هەیە و (وەک عەبدوڵڵای کوڕی حەنظەڵە نیە) بۆیە واز لە دەستنوێژ شوشتن ناهێنێت بۆ هیچ نوێژێک.

٦٨٦- «عَنِ ابنِ بُرَيدَةَ، عَن أَبِيهِ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلاَةٍ، حَتَّى كَانَ يَومُ فَتحِ مَكَّةَ، صَلَّى الصَّلَوَاتِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيهِ- فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: رَأَيتُكَ صَنَعتَ شَيئًا لَم تَكُن تَصنَعُهُ؟ قَالَ: إِنِّي عَمدًا صَنَعتُ يَا عُمَرُ» قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: فَدلَ فِعلُ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّ مَعنَى قَولِ اللهِ تَعَالَى: ﴿إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ ﴿٦﴾﴾ المائدة، الآيَةَ لِكُلِّ مُحدِثٍ، لَيسَ لِلطَّاهِرِ ومنهُ قولُ النَّبيِّ ﷺ: لاَ وُضُوءَ إلاَّ مِن حَدَثٍ وَاللهُ أَعلَمُ»[١].

واتە: لە باوکی بورەیدەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی دەشۆرد بۆ هەموو نوێژێک، تاوەکو ڕۆژی ئازاد کردنی مەککە هات (ئەو ڕۆژە) هەموو نوێژەکانی بە یەک دەستنوێژ ئەنجامدان و، مەسحی لەسەر دوو خوفەکانی کرد، (پێشەوا) عومەریش پێی وت: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) ببینم، شتێکت ئەنجامدا کە پێشتر ئەنجامت نەداوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: من بە ئەنقەست وام کرد ئەی عومەر.

جا ئەبو موحەممەد (ئیمامی داریمی) وتویەتی: کرداری پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵگەیە کە مانای وتەی خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ ﴿٦﴾﴾ المائدة، واتە: [ئەگەر نیازتان وابوو بۆ نوێژ هەڵسن ئەوە دەستنوێژ بشۆرن]، بۆ هەموو بێ دەستنوێژێکە، نەک بۆ کەسی بەدەستنوێژ، فەرموودەی پێغەمبەری خواش ﷺ لەو بابەتەیە کە دەفەرموێت: دەستنوێژ شۆردن (واجب نیە) تەنها بۆ دەستنوێژ شکان نەبێت.

## بابەت: دەربارەی چوون بۆ پێویستی (سەر ئاو)

٦٨٧- «المُغِيرَةِ بنِ شُعبَةَ ﷺ، قَالَ: كُنتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي بَعضِ أَسفَارِهِ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا ذَهَبَ إِلَى الحَاجَةِ أَبعَدَ»[٢].

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە هەندێک لە سەفەرەکان، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار ئەگەر بڕۆیشتایە بۆ پێویستی (سەر ئاو) ئەوە دوور دەکەوتەوە.

٦٨٨- «عَنِ المُغِيرَةِ بنِ شُعبَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا تَبَرَّزَ تَبَاعَدَ، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: هُوَ الأَدَبُ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار ئەگەر بڕۆیشتایە (سەر ئاو) ئەوە دوور دەکەوتەوە.

باوکی موحەممەد (واتە ئیمامی داریمی) وتویەتی: ئەوە ئەدەبە.

**٦٨٩- غیر موجود**[١].

## بابەت: دەربارەی خۆ داپۆشین لە کاتی پێویستی (سەر ئاو)

**٦٩٠-** «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَنِ اكتَحَلَ فَليُوتِر، مَن فَعَلَ فَقَد أَحسَنَ، وَمَن لاَ، فَلاَ حَرَجَ، مَنِ استَجمَرَ، فَليُوتِر، مَن فَعَلَ، فَقَد أَحسَنَ، وَمَن لاَ فَلاَ حَرَجَ، مَن أَكَلَ فَليَتَخَلَّل، فَمَا تَخَلَّلَ، فَليَلفِظ، وَمَا لاَكَ بِلِسَانِهِ، فَليَبتَلِع من فعل ذلك فقد أحسن ومن لا فلا حرج مَن أَتَى الغَائِطَ، فَليَستَتِر، فَإِن لَم يَجِد إِلاَّ كَثِيبَ رَملٍ، فَليَستَدبِرهُ، فَإِنَّ الشَّيَاطِينَ يَتَلاَعَبُونَ بِمَقَاعِدِ بَنِي آدَمَ، مَن فَعَلَ، فَقَد أَحسَنَ، وَمَن لاَ، فَلاَ حَرَجَ»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک ویستی چاوی کڵ ڕێژ بکات و (کل بکاتە چاوی) با بە تاک ئەنجامی بدات، جا هەر کەسێک ئەنجامیدا ئەوە بە دڵنیایی چاکی کردوە، هەر کەسێکیش ئەنجامی نەدا هیچ گوناهو تاوانێکی لەسەر نیە، وە هەر کەسێکیش خۆی پاک کردەوە بە بەرد (یان هاوشێوەی بەرد) با بە تاک بیکات، جا هەر کەسێک ئەنجامیدا ئەوە بە دڵنیایی چاکی کردوە، هەر کەسێکیش ئەنجامی نەدا هیچ گوناە و تاوانێکی لەسەر نیە، هەر کەسێک خواردنی خوارد با خواردنە زیادەکەی لە نێوان ددانەکانی دەربێنێ، جا ئەوەی دەری هێنا (بە پەنجەکانی یان بە داری ددان یان هەر شتێکیتر) با فڕێی بدات، وە ئەوەی هەڵیکەند لە نێوان ددانەکانی بە زمانی با قوتی بدات، جا هەر کەسێک ئەنجامیدا ئەوە بە دڵنیایی چاکی کردوە، هەر کەسێکیش ئەنجامی نەدا هیچ گوناهو تاوانێکی لەسەر نیە، هەر کەسێک چوو بۆ سەر ئاو با خۆی داپۆشێت، جا ئەگەر هیچ شتێکی دەست نەکەوت تەنها گردۆڵە لمێک نەبێت با بچێتە پشتیەوە، چونکە شەیتانەکان یاری دەکەن بە دانیشتگای بەنی ئادەم (بە دروست کردنی وەسوەسە و پیسی، چونکە شوێنێکە یادی خوای تیادا ناکرێ)، جا هەر کەسێک ئەنجامیدا ئەوە بە دڵنیایی چاکی کردوە، هەر کەسێکیش ئەنجامی نەدا هیچ گوناە و تاوانێکی لەسەر نیە.

**٦٩١-** «عَن عَبدِ اللهِ بنِ جَعفَرٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ أَحَبُّ مَا استَتَرَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ لِحَاجَةٍ، هَدَفٌ أَو حَائِشُ نَخلٍ»[٣].

---

(١) ـ سقط في الترقيم.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو شت زیاتر حەزی دەکرد خۆی داپۆشێت لە کاتی پێویستی (سەر ئاو) بە گرد و بەرزاییەکان و کۆمەڵەی دارخورما.

## بابەت: دەربارەی نەهی کردن لە ڕوکردنە قیبلە بۆ دانانی میز یان پیسایی (بۆ سەر ئاو کردن)

٦٩٢- «عَن سَهلِ بنِ حُنَيفٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: أَنتَ رَسُولِي إِلَى أَهلِ مَكَّةَ فَقُل: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقرَأُ عَلَيكُمُ السَّلاَمَ، وَيَأمُرُكُم إِذَا خَرَجتُم، فَلاَ تَستَقبِلُوا القِبلَةَ، وَلاَ تَستَدبِرُوهَا»[١].

واتە: لە سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: تۆ نێردراوی منی بۆ خەڵکی مەککە و بڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامتان لێ دەکات، وە فەرمانتان پێ دەکات ئەگەر دەرچوون (بۆ سەر ئاو) ڕوتان مەکەنە قیبلە و پشتیشی تێ مەکەن.

٦٩٣- «عَن أَبِي أَيُّوبَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا أَتَيتُمُ الغَائِطَ، فَلاَ تَستَقبِلُوا القِبلَةَ بِغَائِطٍ، وَلاَ بَولٍ، وَلاَ تَستَدبِرُوهَا» قَالَ: ثُمَّ قَالَ أَبُو أَيُّوبَ: فَقَدِمنَا الشَّامَ، فَوَجَدنَا مَرَاحِيضَ قَد بُنِيَت عِندَ القِبلَةِ فَنَنحَرِفُ وَنَستَغفِرُ اللهَ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: وَهَذَا أَصَحُّ مِن حَدِيثِ عَبدِ الكَرِيمِ وَعَبدُ الكَرِيمِ شِبهُ المَترُوكِ»[٢].

واتە: لە ئەبو ئەییوب ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر چوونە سەر ئاو ڕوتان مەکەنە قیبلە لە کاتی پیسایی یان میز کردن، وە پشتیشی تێ مەکەن.

دواتر ئەبو ئەییوب وتی: چووینە شام و بینیمان شوێنی دەست بە ئاو گەیاندن دروست کراون ڕووەو قیبلە، ئێمەش خۆمان لار کردەوە و داوای لێبوردنمان لە خوا کرد (نەوەک تووشی تاوان بووبین).

ئەبو موحەممەد (ئیمامی داریمی) وتویەتی: ئەم فەرموودەیە بەهێزترە لە هی عەبدولکەریم (کە لە پێشتر باس کرا)، عەبدولکەریم وەک مەتروک وایە فەرموودەکانی (وەرناگیرێن).

## بابەت: ڕەوشتێکی تری سەرئاو

٦٩٤- «عَن أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لاَ يَرفَعُ ثَوبَهُ، حَتَّى يَدنُوَ مِنَ الأَرضِ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: هُوَ أَدَبٌ، وَهُوَ أَشبَهُ مِن حَدِيثِ المُغِيرَةِ»[٣].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیک گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەرگیز جلەکانی بەرز نەدەکردەوە (لە کاتی دەست بە ئاو گەیاندن) تا نزیک دەبوویەوە لە زەوی (بۆ دانیشتن).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح لغيره.

ئەبو موحەممەد (ئیمامی داریمی) وتویەتی: ئەوە ئەدەبە، وە ئەو فەرموودەیە لە فەرموودەکەی موغیرەوە نزیکە.

## بابەت: ڕێگادان لەوەی ڕوبکرێتە قیبلە (لە ناو بینا و مورافیقدا)

٦٩٥- «عَنِ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: رَقِيتُ عَلَى ظَهرِ بَيتِنَا فَرَأَيتُ النَّبِيَّ ﷺ عَلَى ظَهرِ بَيتِنَا فَرَأَيتُ النَّبِيَّ ﷺ جَالِسًا عَلَى لَبِنَتَينِ، مُستَقبِلَ بَيتِ المَقدِسِ»[1].

واتە: لە ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سەرکەوتم بۆ سەر بانی ماڵەکەمان (سەربانی ماڵی حەفصەی خوشکی بووە نەک هی خۆیان، وەک لە فەرموودەیتر هاتوە، بەڵام بۆیە دەڵێت ماڵەکەمان چونکە هاتوو چۆی زۆر بووە بۆ ئەوێ وەک ماڵی خۆیانی لێ هاتوە)، پێغەمبەر ﷺم بینی لەسەر بانی ماڵەکەمانەوە، بینیم پێغەمبەر ﷺ لەسەر دوو خشت دانیشتبوو ڕووی کردبووە بەیتول مەقدیس (کەواتە: پشتی کەوتبووە قیبلە).

تێبینی: ئیبنو عومەر پێغەمبەری خوای ﷺ لەناو بینایێکدا بینیوە کە بە خشت دەورە درابوو، نەوەک لەسەر دوو خشت دانیشتبێت لە چۆڵەوانی، بەڵام ڕەنگە خشتەکان لە دوو لاوە دەورەیان دابێت، وەک لە ڕیوایەتیتردا هاتوە هەمان ئەو فەرموودەیە لە ئیبنو عومەرەوە وتویەتی لەناو بینایێک بینیم، چونکە ئیبنو عومەر بەخۆشی پێی وایە دروست نیە لە چۆڵەوانی پشت بکرێتە قیبلە، جا ئەگەر پێغەمبەری خوای ﷺ لە چۆڵەوانی بینیبێ پشتی کردۆتە قیبلە ئەو کات بە دروستی دەزانی، کەچی بە دروستی نازانێت، دیارە لەناو بینا بینیویەتی، وەک لە ڕیوایەتی ئیبنو خوزەیمەشدا هاتوە.

## بابەت: دەربارەی میز کردن بە پێوە

٦٩٦- «عَن حُذَيفَةَ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى سُبَاطَةِ قَومٍ، فَبَالَ وَهُوَ قَائِمٌ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: لاَ أَعلَمُ فِيهِ كَرَاهِيَةً »[2].

واتە: لە حوذەیفە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ سەر گوفەکی (شوێن، پاشماوە و خاشاکی)، خەڵکانێکەوە و میزی کرد لە کاتێکدا وەستاو بوو (بە وەستاوی میزی کرد).

ئەبو موحەممەد (ئیمامی داریمی) وتویەتی: هیچ کەڕاهەتێکی تێدا نابینم (دروستە میز بە پێوە بکرێت).

تێبینی: پێغەمبەری خوا ﷺ کە میزی بە پێوە کردووە لەو شوێنە لەبەر ئەوەی چۆکی موبارەکی بریندار بووە، وەک لە فەرموودەیەکی تر بە ڕوونی باس کراوە، هەروەها شوێنەکەش شوێنی دانیشتن نەبووە لەبەر خاشاک، هەروەها پڕوشکیش نەدەگەڕایەوە، ئەگەرنا هەر بە دانیشتن ئەنجامی داوە.

---

(١) ـ صحیح.

(٢) ـ صحیح.

## بابەت:(کەسی مسوڵمان) چی دەڵێت کاتێ دەچێتە سەرئاو

٦٩٧- «عَن أَنَسِ بنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا دَخَلَ الخَلَاءَ، قَالَ: اللهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الخُبثِ وَالخَبَائِثِ»[1].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر چووبێ بۆ سەر ئاو (دەست بە ئاو گەیاندن) دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە شەیتانی نێر و مێ (هەم لە کوفر و هەرچی کردەوەی ناڕەوایە).

## بابەت: خۆ پاككردنەوە

٦٩٨- «عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُا، قَالَت: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا ذَهَبَ أَحَدُكُم إِلَى الغَائِطِ، فَليَذهَب مَعَهُ بِثَلَاثَةِ أَحجَارٍ يَستَطِيبُ بِهِنَّ، فَإِنَّهَا تُجزِئُ عَنهُ»[2].

واتە: لە دایكمان عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنهُا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر كەسێكتان چوو بۆ سەر ئاو (بۆ دەست بە ئاو گەیاندن) ئەوە با سێ بەردان لەگەڵ خۆی ببات خۆی پێ پاك بكاتەوە، ئەوەش بەبەر خۆپاككردنەوە دەكەوێت.

٦٩٩- «عَن عُمَارَةَ بنِ خُزَيمَةَ بنِ ثَابِتٍ الأَنصَارِيِّ، عَن أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنهُما، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ثَلَاثَةُ أَحجَارٍ لَيسَ فِيهِنَّ رَجِيعٌ يَعنِي: لِلاستِطَابَةِ »[3].

واتە: لە عومارەی كوڕی خوزەیمەی كوڕی ثابیتی ئەنصاری گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُما)، گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (دەبێ بۆ خۆ پاككردنەوە) سێ بەرد بن، نابێ تەڵس و سەرجین بێت (واتە: نابێ پیسایی وشكی وشتر و مانگا و ئاژەڵیتر بێت، چونكە ئەمانە خۆیان پیسن چۆن پیسی لادەبەن!).

## بابەت: نەهی كردن لە خۆ پاككردنەوە بە ئێسقان و تەڵس

٧٠٠- «عَن سَهلِ بنِ حُنَيفٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: أَنتَ رَسُولِي إِلَى أَهلِ مَكَّةَ فَقُل: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقرَأُ عَلَيكُمُ السَّلَامَ، وَيَأمُرُكُم أَن لَا تَستَنجُوا بِعَظمٍ»[4].

واتە: لە سەهلی كوڕی حونەیف ﷺ گێڕدراوەتەوە، كە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: تۆ نێردراوی منی بۆ لای خەڵكی مەككە و بڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامتان لێ دەكات و فەرمانتان پێ دەكات كە خۆیان پاك نەكەنەوە بە ئێسقان و بە قشپڵ و تەڵس.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح لغيره.

## بابەت: نەهی كردن لە خۆ پاككردنەوە بە دەستی ڕاست

٧٠١- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَن أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنهُما، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لاَ يَمَسَّ أَحَدُكُم ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَلاَ يَتَمَسَّح بِيَمِينِهِ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو قەتادە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُما)، گێڕاویەتیەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با هیچ كەسێک دەست لە عەوڕەتی خۆی نەدات بە دەستی ڕاستی و با خۆشی پاک نەكاتەوە بە دەستی ڕاستی.

## بابەت: خۆ پاككردنەوە بە بەرد

٧٠٢- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا أَنَا لَكُم مِثلُ الوَالِدِ لِلوَلَدِ أُعَلِّمُكُم، فَلاَ تَستَقبِلُوا القِبلَةَ، وَلاَ تَستَدبِرُوهَا، وَإِذَا استَطَبتَ، فَلاَ تَستَطِب، بِيَمِينِكَ، وَكَانَ يَأمُرُنَا بِثَلاَثَةِ أَحجَارٍ، وَيَنهَى عَنِ الرَّوثِ وَالرِّمَّةِ فَقَالَ زَكَرِيَّا: يَعنِي العِظَامَ البَالِيَةَ »[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من بۆ ئێوە وەک باوک وام بۆ منداڵەكەی (ئاوا خەمخۆرم بۆتان) فێرتان دەكەم، ڕوو مەكەنە قیبلە و پشتیشی تێ مەكەن (لە كاتی دەست بە ئاو گەیاندن)، وە ئەگەر خۆتان پاككردەوە خۆتان پاک مەكەنەوە بە دەستی ڕاستە. وە (بۆ خۆ پاككردنەوە) فەرمانی پێ دەكردین بە سێ بەرد و نەهی لێ دەكردین لە (بەكار هێنانی) تەڵس و ئێسقانی ڕزیو، زەكەریا وتویەتی: (الرِّمَّةِ) واتە ئێسقانی ڕزیو.

## بابەت: خۆ پاككردنەوە بە ئاو

٧٠٣- «عَن أَنَسِ بنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا ذَهَبَ لِحَاجَتِهِ، أَتَيتُهُ أَنَا وَغُلاَمٌ بِعَنَزَةٍ، وَإِدَاوَةٍ فَيَتَوَضَّأُ»[٣].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیک ﷺ گێڕدراوەتەوە، كە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بچووبایە بۆ سەر ئاو (دەست بە ئاو گەیاندن) من و منداڵێک دەچوین بۆ لای بە ڕمێكی دار و مەتارەیەكەوە (خۆی پێ پاک دەكردەوە) و دەستنوێژی هەڵدەگرت.

٧٠٤- «عَن أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنَ الخَلاَءِ، جَاءَ الغُلاَمُ بِإِدَاوَةٍ مِن مَاءٍ، كَانَ يَستَنجِي بِهِ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لە (سەر ئاو) دەرچووبێ و (بگەڕابایەوە)، منداڵێک بە مەتارەیەکی ئاوەوە دەهات هەموو جار خۆی پێ پاک دەکردەوە.

٧٠٥- «عَنِ الْمُسَيَّبِ بنِ نَجَبَةَ، قَالَ: حَدَّثَتنِي عَمَّتِي، وَكَانَت تَحتَ حُذَيفَةَ ﷺ: أَنَّ حُذَيفَةَ، كَانَ يَستَنجِي بِالمَاءِ»[١].

واتە: لە موسەییەبی کوڕی نەجەب گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پلکم بۆی گێڕامەوە کە لە ژێر نیکاحی حوذەیفە ﷺ بوو (خێزانی حوذەیفە بوو) دەیوت: هەموو جار حوذەیفە خۆی پاک دەکردەوە بە ئاو.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی دەستی بە خۆڵ دەسڕێتەوە پاش خۆ پاککردنەوە

٧٠٦- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ائتِنِي بِوَضُوءٍ ثُمَّ دَخَلَ غَيضَةً، فَأَتَيتُهُ بِمَاءٍ فَاستَنجَى، ثُمَّ مَسَحَ يَدَهُ بِالتُّرَابِ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَيهِ »[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاوم بۆ بێنە، دواتر چووە ناو چەمێک، منیش بە ئاوەوە چووم بۆ لای و خۆی پاککردەوە، دواتر دەستی بە خۆڵ سڕیەوە، دواتریش دەستەکانی شۆرد.

٧٠٧- «أَخبَرَنَا مُحَمَّدُ بنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا أَبَانُ بنُ عَبدِ اللهِ، حَدَّثَنِي إِبرَاهِيمُ بنُ جَرِيرِ بنِ عَبدِ اللهِ، عَن أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثلَهُ»[٣].

واتە: فەرموودەکەی پێشتر لەم ڕێگایەشەوە گێڕدراوەتەوە بە هەمان شێوە.

## بابەت: دەربارەی ئەو دوعایەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو کاتێک لەسەر ئاو دەهاتە دەرەوە

٧٠٨- «عَن يُوسُفَ بنِ أَبِي بُردَةَ، عَن أَبِيهِ، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، حَدَّثَتهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنَ الخَلَاءِ قَالَ غُفرَانَكَ»[٤].

واتە: لە یوسفی کوڕی ئەبو بوڕدە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە (دایکە) عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەموو جار ئەگەر هاتبایە دەرەوە لە سەر ئاو (دەست بە ئاو گەیاندن) دەیفەرموو: خوایە داوای لێخۆشبونت لێ دەکەم.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ رجاله ثقات، غير أنه منقطع.

(٤) ـ حسن.

## بابەت: دەربارەی سیواک

٧٠٩- «عَن أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: أَكثَرتُ عَلَيكُم فِي السِّوَاكِ»[١].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زۆر قسەم بۆ کردوون دەربارەی سیواک و (هانم داون، بۆیە بەکاری بهێنن و فەرامۆشی مەکەن).

٧١٠- «عَن أَنَسِ بنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَكثَرتُ عَلَيكُم فِي السِّوَاكِ»[٢].

واتە: لە ڕێگایێکی تریشەوە هاتوە لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زۆر قسەم بۆ کردوون دەربارەی سیواک و (هانم داون، بۆیە بەکاری بهێنن و فەرامۆشی مەکەن).

٧١١- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَولاَ أَن أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي، لأَمَرتُهُم بِهِ عِندَ كُلِّ صَلاَةٍ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: يَعنِي: السِّوَاكَ»[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: ئەگەر گران و زەحمەت نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم ئەوە فەرمانم پێ دەکردن و (دەمکرد بە واجب) کە سیواک بکەن لەگەڵ هەموو نوێژێکدا.

## بابەت: سیواک ئامرازی دەم پاککردنەوەیە

٧١٢- «عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، قَالَت: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ السِّوَاكُ مَطهَرَةٌ لِلفَمِ، مَرضَاةٌ لِلرَّبِّ»[٤].

واتە: لە دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سیواک ئامرازی دەم پاککردنەوە و هۆکاری ڕەزامەندی پەروەردگارە.

## بابەت: سیواک کردن لە کاتی هەڵسانەوە بۆ شەونوێژ

٧١٣- «عَن حُذَيفَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا قَامَ إِلَى التَّهَجُّدِ، يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ»[٥].

واتە: لە حوذەیفە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ کە هەڵدەستا بۆ شەونوێژ سیواکی لە دەمی دەخشاندن (سیواکی دەکرد).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٥) ـ صحيح.

## بابەت: هیچ نوێژێک وەرناگیرێت بەبێ دەستنوێژ

٧١٤- «عَن أَبِي المَلِيحِ، عَن أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَا يَقبَلُ اللهُ صَلَاةً بِغَيرِ طُهُورٍ، وَلَا صَدَقَةً مِن غُلُولٍ»[١].

واتە: لە باوكی مەلیح ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێراویەتیەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا هیچ نوێژێک وەرناگرێت بەبێ دەستنوێژ، هەروەها هیچ صەدەقە و خێرێكیش وەرناگرێت كە بە خیانەت پەیدا كرابێ.

ڕوون كردنەوە (غُل، غُلُولٍ):ماڵێكە دزرا بێ لە دەستكەوتی جەنگی.

## بابەت: كلیلی نوێژ دەستنوێژە

٧١٥- «عَن عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مِفتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ، وَتَحرِيمُهَا التَّكبِيرُ، وَتَحلِيلُهَا التَّسلِيمُ»[٢].

واتە: لە پێشەوا عەلی ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كلیكی نوێژ دەستنوێژە، وە دەست پێ كردنی نوێژ و حەڕام بون لە مامەڵەی دونیایی (اللّٰه أكبر)ە.

(واتە: بە وتنی (اللّٰه أكبر)ی سەرەتای نوێژ مرۆڤ دەچێتە ناو نوێژو قسەو خواردن و خواردنەوەو ئاوڕدانەوەو هەموو شتێكی كە نەگونجێ لەگەڵ نوێژ لێی حەڕام دەبێت بۆیە دەوترێ: (اللّٰه أكبر)ی حەڕام بوون ـ تكبيرة الإحرام ـ)، وە حەڵاڵ بوونەوەشی بریتیە لە سەلام دانەوە (واتە: حەڵاڵ بوونەوەی شتە دونیاییەكان و دەرچوون لە نوێژ بە سەلامدانەوە دەبێت).

## بابەت: ئایا چەند ئاو بەسە بۆ دەستنوێژ؟

٧١٦- «عَن سَفِينَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَوَضَّأُ بِالمُدِّ، وَيَغتَسِلُ بِالصَّاعِ»[٣].

واتە: لە سەفینەت ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ موددێک لە ئاو (كە جۆرە پێوانەیەكە) دەستنوێژی دەشۆرد (كە دەكاتە نزیكەی ١٨ لیتر)، وە بە صاعێک لە ئاو (كە جۆرە پێوانەیێكی ترە) خۆی دەشۆرد (كە دەكاتە نزیكەی ٧٢ لیتر).

٧١٧- «أَخبَرَنِي عَبدُ اللهِ بنُ عَبدِ اللهِ بنِ جَبرٍ، قَالَ: سَمِعتُ أَنَسًا ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ بِالمَكُّوكِ، وَيَغتَسِلُ بِخَمسِ مَكَاكِيكَ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.




واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەبڕ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەنەس ﷺ بوو دەیووت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی دەشۆرد بە مەککوکێک (کە جۆرە گۆزەیێکە وەک مود نزیکەی ١٨ لیتر دەگرێت)، وە خۆشی دەشۆرد بە پێنج مەککوک.

## بابەت: دەستنوێژ شۆردن لە تەشتدا

٧١٨- «عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنتِ مُعَوِّذِ بنِ عَفرَاءَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَت: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَأتِينَا فِي مَنزِلِنَا، فَآخُذُ مِيضَأَةً لَنَا تَكُونُ مُدًّا، وَثُلُثَ مُدٍّ، أَو رُبُعَ مُدٍّ، فَأَسكُبُ عَلَيهِ، فَيَتَوَضَّأُ ثَلاَثًا ثَلاَثًا»[١].

واتە: لە ڕوبەییعی کچی موعەوویذەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتە لامان لە ماڵەکەمان و، تەشتێکی ئێمەی دەبرد کە موددێک و سێیەکی موددێک یان چاریەکی موددێک دەبوو (کە دەکاتە نزیکەی ٢٤ لیتر یان ٢٢ لیتر و نیو دەبوو)، ئاوی دەکردە ناو و دەشتنوێژی دەشۆرد سێ جار سێ جار.

## بابەت: (بسم الله) کردن لە دەستنوێژدا

٧١٩- «حَدَّثَنِي رُبَيحُ بنُ عَبدِ الرَّحمَنِ بنِ أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيُّ ﷺ، عَن أَبِيهِ، عَن جَدِّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ وُضُوءَ لِمَن لَم يَذكُرِ اسمَ اللهِ عَلَيهِ»[٢].

واتە: لە ڕوبەیحی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕدراوەتەوە ئەویش لە باوکیەوە و ئەویش لە باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەستنوێژ بۆ کەسێک نیە کە ناوی خوای لەسەر نەهێنێ.

تێبینی: زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەسەر مانای ئەم فەرموودەیە، هەندێکیان دەفەرموون: مەبەستی ئەوەیە دەستنوێژ هەر بەرناکەوێ و دروست نابێت بەبێ (بسم الله) کردن و دەڵێن: (بسم الله) کردن واجبە، هەندێکیتر دەفەرموون مەبەستی ئەوەیە پاداشتی کامڵ و تەواوی دەستنوێژ بەبێ (بسم الله) بەدەست نایێ و (بسم الله) کردن سوننەتە، هەندێکیتر دەفەرموون ئەم فەرموودە باسی (بسم الله) ناکات، بەڵکو باسی نیەت دەکات و دەفەرموێت دەستنوێژ بەبێ ناوی خوا (واتە: بەبێ نیەتی عیبادەت بۆ خوا) دروست نابێ، والله أعلم.

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ صحيح لغيره.

## بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی دەستەكانی دەخاتە ناو قاپ و تەشتی ئاو پێش ئەوەی بیانشۆرێت

**٧٢٠- «عن أَوسِ بنِ أَبِي أَوسٍ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللهِ ﷺ تَوَضَّأَ فَاستَوكَفَ ثَلاَثًا، فَقُلتُ أَنَا لَهُ: أَيُّ شَيءٍ استَوكَفَ ثَلاَثًا؟ قَالَ: غَسَلَ يَدَيهِ ثَلاَثًا»[١].**

واتە: لە ئەوسی كوڕی ئەوس ﷺ گێڕدراوەتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺی بینیوە دەستنوێژی شۆردووە، (جا پێشتر) سێ جار دەستەكانی خستە ناو تەشتەكەوە، جا (كوڕی عەمڕی كوڕی ئەوس) وتی (بە باپیرمم وت، واتە بە ئەوسم وت): چی لە دەستی كرد سێ جار؟ وتی: دەستەكانی سێ جار شۆردن.

تێبینی: دەست خستنە ناو ئاوی دەستنوێژ دروستە، ئەگەر مرۆڤ دەستی پیس نەبێت و لە خەو هەڵنەستابێ، ئەم فەرموودەیەش لەو حاڵەتەیە، بەڵام ئەگەر دەستی پیس بوو، یان لە خەو هەڵسابوو دروست نیە.

## بابەت: دەستنوێژ شۆردن سێ جار

**٧٢١- «عَن حُمرَانَ بنِ أَبَانَ، مَولَى عُثمَانَ بنِ عَفَّانَ ﷺ: أَنَّ عُثمَانَ تَوَضَّأَ فَمَضمَضَ، وَاستَنشَقَ، وَغَسَلَ وَجهَهُ ثَلاَثًا، وَيَدَيهِ ثَلاَثًا، وَمَسَحَ بِرَأسِهِ، وَغَسَلَ رِجلَيهِ ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: رَأَيتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ تَوَضَّأَ كَمَا تَوَضَّأتُ، ثُمَّ قَالَ: مَن تَوَضَّأَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ صَلَّى رَكعَتَينِ، لاَ يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفسَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِهِ»[٢].**

واتە: لە حومڕانی كوڕی ئەبانەوە كە خزمەتكاری عوسمانی كوڕی عەففانە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عوسمان دەستنوێژی شۆرد (بەم شێوەیە): ئاوی لە دەم و لوتی وەركرد و ڕوخساری سێ جار شۆرد و دوو دەست و باسكەكانی (تا ئانیشک) سێ جار شۆرد و، سەری مەسح كرد و پێیەكانی سێ جار شۆرد، دواتر وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەستنوێژی شۆرد وەک چۆن من شۆردم، دواتر (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: هەر كەسێک دەستنوێژ بشۆرێ وەک ئەم دەستنوێژەی من، دواتر دوو ڕەكعەت نوێژ بكات (واتە: سوننەتی دەستنوێژ ئەنجام بدات) و تیایدا مەشغوڵی نەفسی خۆی نەبێ و قسە لەگەڵ نەفسی خۆی نەكات و خەیاڵی پووچ نەیباتەوە (واتە: بە ئاگاییەوە نوێژەكە ئەنجام بدات) ئەوە لە هەموو تاوانی پێشووی دەبوردرێت.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەستنوێژ شوشتن دوو جار دوو جار

٧٢٢- «عَن عَمرِو بنِ يَحيَى المَازِنِيِّ، عَن أَبِيهِ، أَنَّ عَبدَ اللهِ بنَ زَيدٍ ﷺ، دَعَا بِتَورٍ مِن مَاءٍ، فَأَكفَأَه عَلَى يَدَيهِ، فَغَسَلَهُمَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، وَغَسَلَ وَجهَهُ ثَلاَثًا، وَيَدَيهِ إِلَى المِرفَقَينِ، مَرَّتَينِ مَرَّتَينِ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ»[١].

واتە: لە عەمری کوڕی یەحیای مازینیەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە و وتویەتی: عەبدوڵلای کوڕی زەید ﷺ داوای تەشتێک ئاوی کرد و (هەندێکی) ڕشتە سەر دەستەکانی و هەردوو دەستەکانی سێ جار شۆرد و، ڕوخساری سێ جار شۆرد و، دەستەکانی تا ئانیشکی دوو جار دوو جار شۆرد و، دواتر وتی: بەو شێوەیە پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە دەستنوێژی شۆردووە.

٧٢٣- «أَخبَرَنَا يَحيَى، حَدَّثَنَا عَبدُ العَزِيزِ بنُ أَبِي سَلَمَةَ، عَن عمرِو بنِ يَحيَى، عَن أَبِيهِ، عَن عبدِ اللهِ بنِ زَيدٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحوًا مِنهُ »[٢].

واتە: لەو ڕێگایەشەوە هاوشێوەی فەرموودەی پێشتر گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: شوشتنی دەستنوێژ یەک جار یەک جار

٧٢٤- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: أَلاَ أُنَبِّئُكُم أَو أَلاَ أُخبِرُكُم بِوُضُوءِ رَسُولِ اللهِ ﷺ؟ فَتَوَضَّأَ مَرَّةً مَرَّةً، أَو قَالَ: مَرَّةً مَرَّةً»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئایا هەواڵتان پێ نەدەم بە دەستنوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ جا دەستنوێژی شۆرد یەک جار یەک جار (واتە: هەموو ئەندامەکانی دەستنوێژی یەک جار یەک جار شۆرد، وتی ئەوە دەستنوێژی پێغەمبەری خوایە ﷺ).

٧٢٥- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَوَضَّأَ مَرَّةً مَرَّةً، وجَمَعَ بَينَ المَضمَضَةِ وَالِاستِنشَاقِ»[٤].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی شۆردووە یەک جار یەک جار و، ئاوی لە دەم و لوتیشی کرد بە یەکەوە (واتە: بە یەک گۆمە ئاو ئاوی لە دەم و لوتی وەردەکرد).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

## بابەت: ئەو فەرموودانەی دەربارەی جوان دەستنوێژ شۆردن هاتوون

٧٢٦- «عَن أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: أَلاَ أَدلَكُم عَلَى مَا يُكَفِّرُ اللهُ بِهِ الخَطَايَا، وَيَزِيدُ بِهِ فِي الحَسَنَاتِ؟ قَالُوا: بَلَى قَالَ: إِسبَاغُ الوُضُوءِ عَلَى المكرُوهَاتِ، وَكَثرَةُ الخُطَا إِلَى المَسَاجِدِ، وَانتِظَارُ الصَّلاَةِ بَعدَ الصَّلاَةِ»[1].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودری  گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ئایا شتێکتان پێ نەڵێم کە خوا بەهۆیەوە تاوانەکان دەسڕێتەوە و چاکەکانیشی پێ زیاد دەکات؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (پێمان بڵێ:)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەستنوێژ شۆردن لە حاڵەتی ناخۆش (لە کاتی سەرما و نەخۆشی) و، زۆر هەنگاو هاویشتن بۆ مزگەوت و، چاوەڕێ کردنی نوێژ پاشی نوێژ (واتە: هەر نوێژێکی کرد چاوەڕێی نوێژێکی تر بکات و بۆ نوێژ پەرۆش بێت).

٧٢٧- «عَن أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَذَكَرَ بِنَحوِهِ»[2].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە ئەبو سەعیدی خودری  گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە هەمان فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە.

٧٢٨- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أُمِرنَا بِإِسبَاغِ الوُضُوءِ»[3].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: فەرمانمان پێ کراوە بە جوان دەستوێژ شۆردن.

## بابەت: دەربارەی ئاو لە دەم وەرکردن

٧٢٩- «حَدَّثَنِي عَبدُ خَيرٍ، قَالَ: دَخَلَ عَلِيٌّ  الرَّحَبَةِ بَعدَمَا صَلَّى الفَجرَ قَالَ: فَجَلَسَ فِي الرَّحَبَةِ ثُمَّ قَالَ لِغُلاَمٍ لَهُ: ائتِنِي بِطَهُورٍ قَالَ: فَأَتَاهُ الغُلاَمُ بِإِنَاءٍ فِيهِ مَاءٌ وَطَستٍ قَالَ عَبدُ خَيرٍ: وَنَحنُ جُلُوسٌ نَنظُرُ إِلَيهِ فَأَدخَلَ يَدَهُ اليُمنَى فَمَلأَ فَمَهُ، فَمَضمَضَ وَاستَنشَقَ، وَنَثَرَ بِيَدِهِ اليُسرَى، فَعَلَ هَذَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قَالَ: مَن سَرَّهُ أَن يَنظُرَ إِلَى طُهُورِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَهَذَا طُهُورُهُ»[4].

واتە: لە عەبدوخەیر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێشەوا عەلی  چووە ناو رەحەبەوە (کە شوێنێکە لە کوفە) پاش ئەوەی نوێژی بەیانی کرد، دەڵێ: لە ناو ڕەحەبە دانیشت، دواتر بە خزمەتکارێکی خۆی وت: ئاوم بۆ بێنە، خزمەتکارەکەش قاپێکی بۆ هێنا کە هەندێک ئاوی تیا بوو لەگەڵ تەشتێک، (عەبدوخەیر)

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

وتویەتی: ئێمەش دانیشتبووین سەیرمان دەکرد، ئەویش دەستی خستە ناو ئاوەکە و چەنگی پڕ کرد و (گۆمە ئاوێکی هەڵگرت) و خستیە ناو دەم و لوتی، دواتر ئاوەکەی لە لوتی دەرکرد بە دەستی چەپی، سێ جار ئاوای کرد، دواتر وتی: کێ پێی خۆشە سەیری چۆنیەتی شۆردنی دەم و لوتی پێغەمبەری خوا ﷺ بکات ئا ئەوە شۆردنیەتی.

٧٣٠- «أَخبَرَنَا أَبُو نُعَيمٍ، حَدَّثَنَا حَسَنُ بنُ عُقبَةَ المُرَادِيُّ، أَخبَرَنِي عَبدُ خَيرٍ، بِإِسنَادِهِ نَحوَهُ »[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمودە لە عەبدوخەیر گێردراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی ئاو لە دەم وەرکردن و خۆ پاککردنەوە

٧٣١- «عَن أبا هُرَيرَةَ ﷺ، يَقُولُ: سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنِ استَنشَقَ، فَليَستَنثِر، وَمَن استَجمَرَ، فَليُوتِر»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک ئاوی لە لوتی وەرکرد با بیخاتە دەرەوە و بیرێژێتەوە، وە هەرکەسێکیش خۆی بە بەرد پاک کردەوە بێ بە تاک ئەنجامی بدات.

## بابەتِ دەربارەی تێکوەردانی ڕیش (لە کاتی دەستنوێژدا)

٧٣٢- «عَن شَقِيقِ بنِ سَلَمَةَ، قَالَ: رَأَيتُ عُثمَانَ ﷺ، يَتَوَضَّأُ فَخَلَّلَ لِحيَتَهُ، وَقَالَ: هَكَذَا رَأَيتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ تَوَضَّأَ»[٣].

واتە: لە شەقیقی کوڕی سەلەمە گێردراوەتەوە، وتویەتی: عوسمانم ﷺ بینی دەستنوێژی شۆرد، ڕیشیشی تێکوەردا (لە کاتی ڕوخسار شوشتندا) و وتی: بەو شێوەیە پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە دەستنوێژی شۆردووە.

## بابەت: دەربارەی تێکوەردانی پەنجەکان

٧٣٣- «عَن عَاصِمِ بنِ لَقِيطِ بنِ صَبِرَةَ، عَن أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا تَوَضَّأتَ فَأَسبِغ وُضُوءَكَ، وَخَلِّل بَينَ أَصَابِعِكَ»[٤].

واتە: عاصمی کوڕی لەقیتی کوڕی صەبیرە گێردراوەتەوە ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر کات دەستنوێژت شۆرد دەستنوێژەکەت بە جوانی بشۆرە و نێوان پەنجەکانیشت تێکوەربدە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ حسن.

(٤) ـ صحيح.

### بابەت: سزای سەخت لە نێو ئاگر بۆ ئەوانەی پاژنە پێیان تەڕ ناکەن

**٧٣٤-** «عَن عَبدِ اللهِ بنِ عَمرٍو رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَيلٌ لِلأعقَابِ مِنَ النَّارِ، أَسبِغُوا الوُضُوءَ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هاوار و حەسرەت و ماڵ وێرانی و سزا لەنا و ئاگردا (بۆ ئەو کەسانە هەیە کە) پاژنەی پێیەکانیان بە جوانی تەڕ ناکەن (لە دەستنوێژدا)، دەستنوێژ بە جوانی و تەواوی بشۆرن.

**٧٣٥-** «عَن مُحَمَّدِ بنِ زِيَادٍ، قَالَ: سَمِعتُ أبا هُرَيرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ يَمُرُّ بِنَا وَالنَّاسُ يَتَوَضَّئُونَ مِنَ المِطهَرَةِ، وَيَقُولُ: أَسبِغُوا الوُضُوءَ قَالَ أَبُو القَاسِمِ ﷺ: وَيلٌ لِلعَقِبِ مِنَ النَّارِ»[٢].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی زیاد گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو کاتێ بەلاماندا تێپەڕ بوو لە کاتێکدا خەڵک دەستنوێژیان دەشۆرد لە دەستشۆرەکەدا وتی: دەستنوێژ جوان و تەواو بشۆرن، ئەبو قاسم (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرموویەتی: سزای سەخت لەنا و ئاگردا (بۆ ئەو کەسانە هەیە کە) پاژنەی پێیەکانیان بە جوانی تەڕ ناکەن (لە دەستنوێژدا).

### بابەت: دەربارەی مەسح کردنی سەر و دوو گوێچکەکان

**٧٣٦-** «عَن شَقِيقِ بنِ سَلَمَةَ، قَالَ: رَأَيتُ عُثمَانَ ﷺ، تَوَضَّأَ، فَمَسَحَ بِرَأسِهِ وَأُذُنَيهِ ظَاهِرِهِمَا، وَبَاطِنِهِمَا، ثُمَّ قَالَ: رَأَيتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَنَعَ كَمَا صَنَعتُ، أَو كَالَّذِي صَنَعتُ»[٣].

واتە: لە شەقیقی کوڕی سەلەمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: عوسمانم ﷺ بینی دەستنوێژی شۆرد، (لە دەستنوێژ شۆردنەکەیدا) سەر و دەرەوە و ناوەوەی دوو گوێچکەکانی مەسح کرد، دواتر وتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە (دەستنوێژی) ئەنجام داوە وەک ئەوەی من ئەنجاممدا.

### بابەت: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوێکی نوێی هەڵدەگرت بۆ (مەسح کردنی) سەری

**٧٣٧-** «عَن عَبدِ اللهِ بنِ زَيدِ بنِ عَاصِمٍ المَازِنِيِّ قَالَ: رَأَيتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ بِالجُحفَةِ، فَمَضمَضَ، وَاستَنشَقَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجهَهُ ثَلَاثًا، ثُمَّ غَسَلَ يَدَيهِ ثَلَاثًا، ثُمَّ مَسَحَ رَأسَهُ، وَغَسَلَ رِجلَيهِ حَتَّى أَنقَاهُمَا، ثُمَّ مَسَحَ رَأسَهُ بِمَاءٍ غَيرِ فَضلِ يَدَيهِ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصمی مازینی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی دەستنوێژی شۆرد لە جوحفە (کە گوندێکە لە سەر ڕێگای مەدینە)، ئاوی لە دەم و لوتی وەرکرد، دواتر ڕوخساری سێ جار شۆرد، دواتر باسکەکانی سێ جار شۆرد، دواتر سەری مەسح کرد، دواتریش پێیەکانی شۆردن تا پاک بونەوە (جا کە سەری مەسح کرد) بە ئاوێکی جگە لە ئاوی زیادەی باسکەکانی مەسحی کرد (واتە بە ئاوێکی نوێ مەسحی کرد، نەوەک بەو ئاوەی بە دەست و پەنجەکانیەوە ماوەتەوە لە پاشماوەی ئاوی باسک شۆردن، بەڵکو دووبارە دەستی تەڕ کرد و مەسحی سەری پێ ئەنجامدا).

## بابەت: مەسح کردن لەسەر مەندیل (کە تەواوی سەری داپۆشیبێت)

٧٣٨- «عَن جَعفَرِ بنِ عَمرِو بنِ أُمَيَّةَ الضَّمرِيِّ، عَن أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللهِ ﷺ مَسَحَ عَلَى الخُفَّينِ وَالعِمَامَةِ قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ: تَأخُذُ بِهِ؟ قَالَ: إِي وَاللهِ»[١].

واتە: لە جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمری گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە مەسحی کردووە لەسەر دوو خوفەکان و مەندیل، جا بە ئەبو موحەممەد وترا: کاری پێ دەکەی؟ وتی: ئەرێ واللە.

تێبینی: ئەو جۆرە مەندیلەی مەسحی لەسەر دروستە بریتیە لەو مەندیلەی کە هەموو سەر دادەپۆشێت و لە ژێر چەناگە قەیم دەکرێت، بەڵام ئەوەمان بیر نەچێت کە دەبێت بەشێک لە سەر هەر مەسح بکرێت و خاوەنەکەی دەبێت پەنجەکانی بباتە ژێر مەندیلەکە تا بەشێکی سەری تەڕ ببێت، دواتر ئەگەر ویستی بۆ جیبەجێ کردنی سوننەت هەموو سەری مەسح بکات کە لەبەر مەندیلەکە ناتوانێت، ئەوە بۆی دروستە مەسحەکە لەسەر مەندیلەکە ئەنجام بدات و بەبەر سوننەتەکە دەکەوێت، کەواتە: دروست نیە تەنها مەندیلەکە مەسح بکات بێ ئەوەی بەشێک لە سەری مەسح بکات.

## بابەت: دەربارەی ڕشاندن و پرژاندنی ئاو بەسەر عەوڕەت پاشی دەستنوێژ (بۆ دروست نەبوونی وەسوەسە)

٧٣٩- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَوَضَّأَ مَرَّةً مَرَّةً، وَنَضَحَ فَرجَهُ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی شۆردووە یەک جار یەک جار و عەوڕەتیشی ڕشاندووە بە ئاو.

تێبینی: پرژاندنی ئاو بەسەر عەوڕەت وا دەکات کە مرۆڤ تووشی وەسوەسە نەبێت، چونکە جاری وا هەیە خەیاڵی بۆ دێت کە شتێکی لێ دەرچوو ڕەنگە لە کاتی دەستنوێژ چەند دڵۆپە ئاوێک بەر ئەو شوێنە کەوتبێت و وابزانێت ڕاستە و شتێکی لێ دەرچووە، لەو کاتەدا تووشی زەحمەتی و وەسوەسە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

دەبێت و دووبارە جلەکانی دەگۆڕێت و دەستنوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر خۆی چەند دڵۆپە ئاوێک بخاتە ئەو شوێنە ئەو کاتە ئەگەر خەیاڵیشی بۆ بێت کاریگەری نابیت و دەڵێت ئەوە ئەو ئاوەیە کە خۆم پرژاندومە و تووشی وەسوەسە نابێت، والله أعلم.

## بابەت: دەربارەی (بەکارهێنانی) خاولی دوای دەستوێژ

٧٤٠- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: سَأَلتُ مَيمُونَةَ خَالَتِي عَن غُسلِ النَّبِيِّ ﷺ مِنَ الجَنَابَةِ، فَقَالَت: كَانَ يُؤتَى بالإنَاءِ، فَيُفرِغُ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ، فَيَغسِلُ فَرجَهُ، وَمَا أَصَابَهُ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ يَغسِلُ رَأسَهُ وَسَائِرَ جَسَدِهِ، ثُمَّ يَتَحَوَّلُ فَيَغسِلُ رِجلَيهِ، ثُمَّ يُؤتَى بِالمِندِيلِ فَيَضَعُهُ بَينَ يَدَيهِ فَيَنفُضُ أَصَابِعَهُ وَلاَ يَمَسُّهُ»[1].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە مەیمونەی خارەتم (خوشکی دایکم) کرد دەربارەی خۆ شۆردنی پێغەمبەر ﷺ لە جەنابەت، ئەویش وتی: تەشتێکی بۆ دەهێنرا، (پێغەمبەری خواش ﷺ ئاوی) بە دەستی ڕاستی (لە تەشتەکە) دەردەهێنا و دەیڕشتە سەر دەستی چەپەی و، عەورەت و ئەو شوێنەی ئاوەکەی بەر دەکەوت دەیشۆرد، دواتر دەستنوێژی دەشۆرد وەک دەستنوێژی بۆ نوێژ، دواتر سەر و هەموو جەستەی دەشۆرد، دواتر پێیەکانی دەشۆرد، دواتر شوێنی خۆی دەگۆڕی و پێیەکانی دەشۆرد، دواتر خاولی بۆ دەهێنرا و لە پێشەخۆی دایدەنا و پەنجەکانی ڕادەوەشاند (دایدەوەشاند و ئاوەکەی لێ دەتکاند) و دەستی لە خاولیەکە نەدەدا (بە خاولی وشکی نەدەکردەوە).

## بابەت: دەربارەی مەسح کردن لەسەر خوف

٧٤١- «عَن عُروَةَ بنِ المُغِيرَةِ، عَن أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كُنتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ ذَاتَ لَيلَةٍ فِي سَفَرٍ، فَقَالَ: أَمَعَكَ مَاءٌ؟ فَقُلتُ: نَعم، فَنَزَلَ عَن رَاحِلَتِهِ، فَمَشَى حَتَّى تَوَارَى عَنِّي فِي سَوَادِ اللَّيلِ، ثُمَّ جَاءَ فَأَفرَغتُ عَلَيهِ مِنَ الإدَاوَةِ، فَغَسَلَ يَدَيهِ وَوَجهَهُ، وَعَلَيهِ جُبَّةٌ مِن صُوفٍ، فَلَم يَستَطِع أَن يُخرِجَ ذِرَاعَيهِ مِنهَا حَتَّى أَخرَجَهُمَا مِن أَسفَلِ الجُبَّةِ، فَغَسَلَ ذِرَاعَيهِ، وَمَسَحَ بِرَأسِهِ، ثُمَّ أَهوَيتُ لِأَنزِعَ خُفَّيهِ، فَقَالَ: دَعهُمَا، فَإِنِّي أَدخَلتُهُمَا طَاهِرَتَينِ فَمَسَحَ عَلَيهِمَا»[2].

واتە: لە عوروەی کوڕی موغیرەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم شەوێکیان لە سەفەرێکدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئاوت پێیە؟ منیش وتم: بەڵێ، جا لەسەر وڵاغەکەی هاتە خوارەوە و ڕۆیشت تاوەکو لێم بزر بوو لە تاریکی شەودا، دواتر هات و (ویستی دەستنوێژ بشۆرێ) منیش ئاوم بۆ پێدا کرد لە مەتارەیەکەوە،

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

دوو دەستەكان و ڕوخساری شۆرد، جا جوببەیەكی سوفی لەبەر بوو نەیتوانی ئانیشكەكانی تێدا بێنێتە دەرەوە تا لە خوار جوببەكەوە دەریهێنا و باسكەكانی شۆردن و سەری مەسح كرد، دواتر خۆم شۆڕ كردەوە تا خوفەكانی لە پێیەكانی دابكەنم (تا پێیەكانی بشوات)، فەرمووی: وازیان لێ بێنە من لە پێم كردوون بە پاكی و بە دەستنوێژەوە، ئنجا مەسحی لەسەر هەردووكیان كرد.

## بابەت: كات دانان بۆ مەسح كردنی خوف

٧٤٢- «عَن عَلِيٍّ بنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: جَعَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ لِلمُسَافِرِ، وَيَومًا وَلَيلَةً لِلمُقِيمِ يَعنِي: المَسحَ عَلَى الخُفَّينِ »[١].

واتە: لە عەلی كوڕی ئەبو طالیب ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ و شەوی داناوە بۆ كەسی موسافیر و یەك ڕۆژ و شەویشی داناوە بۆ كەسی نیشتەجێ (كە لە شوێنی خۆیەتی و لە سەفەردا نیە).

تێبینی: سەرەتای كاتەكە لەدوای دەستنوێژ شكان دەست پێ دەكات دوای لەبەر كردنی خوفەكە، نەوەك لە سەرەتای لەبەر كردنی خوفەكە، چونكە تا دەستنوێژی دەشكێ لەسەر حیسابی شۆردنە نەك مەسح.

## بابەت: مەسح كردن لەسەر كەوش و نەعلەكان

٧٤٣- «عَن عَبدِ خَيرٍ، قَالَ: رَأَيتُ عَلِيًّا ﷺ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى النَّعلَينِ فَوَسَّعَ، ثُمَّ قَالَ: لَولاَ أَنِّي رَأَيتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَعَلَ كَمَا رَأَيتُمُونِي فَعَلتُ، لَرَأَيتُ أَنَّ بَاطِنَ القَدَمَينِ أَحَقُّ بِالمَسحِ مِن ظَاهِرِهِمَا قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: هَذَا الحَدِيثُ مَنسُوخٌ بِقَولِهِ تَعَالَى: ﴿وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ ۝٦﴾ المائدة)»[٢].

واتە: لە عەبدوخەیر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بینیم عەلی ﷺ دەستنوێژی هەڵگرت و مەسحی لەسەر دوو كەوش و نەعلەكانی كرد بە فراوانی (زیادی مەسح كرد)، دواتر وتی: ئەگەر من پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیایە ئاوای كرد وەك منتان بینی ئەنجاممدا، ئەوە بۆچوونم وادەبوو كە بنی پێیەكان (بنی پێڵاوەكان) بۆ مەسح شایستەترە لە ڕووكەش و پشتی دوو پێڵاوەكان.

ئەبو موحەممەد (ئیمامی داریمی) وتویەتی: ئەم فەرموودەیە مەنسوخە و حوكمەكەی هەڵوەشاوەتەوە بەو ئایەتەی: [وە دەستی تەڕ بێنن بە سەرتاندا وە پێیەكانتان بشۆرن تا گۆزینگ].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: وتەی پاشی دەستنوێژ (دوعای پاشی دەستنوێژ)

٧٤٤- «عَن عُقبَةَ بنِ عَامِرٍ ﷺ، أَنَّهُ خَرَجَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي غَزوَةِ تَبُوك، فَجَلَسَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَومًا يُحَدِّثُ أَصحَابَهُ فَقَالَ: مَن قَامَ إِذَا استَقَلَّتِ الشَّمسُ، فَتَوَضَّأَ فَأَحسَنَ الوُضُوءَ، ثُمَّ صَلَّى رَكعَتَينِ، خَرَجَ مِن ذُنُوبِهِ، كَيَومِ وَلَدَتهُ أُمُّهُ فَقَالَ عُقبَةُ: فَقُلتُ: الحَمدُ لِلَّهِ الَّذِي رَزَقَنِي أَن أَسمَعَ هَذَا مِن رَسُولِ اللهِ ﷺ - فَقَالَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ ﷺ، وَكَانَ تُجَاهِي جَالِسًا: أَتَعجَبُ مِن هَذَا؟ فَقَد قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَعجَبَ مِن هَذَا قَبلَ أَن تَأتِيَ، فَقُلتُ: وَمَا ذَلِكَ بِأَبِي أَنتَ وَأُمِّي؟ فَقَالَ عُمَرُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَن تَوَضَّأَ فَأَحسَنَ الوُضُوءَ، ثُمَّ رَفَعَ بَصَرَهُ إِلَى السَّمَاءِ أَو قَالَ نَظَرَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: أَشهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ- وَأَشهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبدُهُ وَرَسُولُهُ، فُتِحَت لَهُ ثَمَانِيَةُ أَبوَابِ الجَنَّةِ يَدخُلُ مِن أَيِّهِنَّ شَاءَ»[١].

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ گێردراوەتەوە، کە دەرچووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ جەنگی تەبوک، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان قسەی بۆ هاوەڵەکانی دەکرد و فەرمووی: هەر کەسێک هەڵسێت لەو کاتەی ڕۆژ بەرز دەبێتەوە (تا کاتی چێشتەنگا و) و دەستنوێژ بشۆرێت بە جوانی و تەواوی، دواتر دوو ڕەکعەت نوێژ بکات، ئەوە لە تاوانەکانی خۆی دەردەچێت (تاوانەکانی دەسڕێنەوە و پاک دەبێتەوە) وەک ئەو ڕۆژەی دایکی ئەوی بووە، عوقبە وتی: وتم: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بە نسیبی کردم کە گوێم لەو فەرموودەیە بێت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، عومەری کوڕی خەتتابیش ﷺ کە لە بەرانبەرم دانیشتبوو وتی: ئایا بەوە سەرسامی؟ بە دڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوە سەیرتری فەرموو پێش ئەوەی تۆ بێی، منیش وتم: ئەوە چ شتێکە بە دایک و باوکەوە بە قوربانت بم؟ عومەر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێک دەستنوێژ بشۆرێت بە جوانی و ڕێکی و تەواوی، دواتر سەری بۆ ئاسمان بەرز بکاتەوە ـ یان وتی چاوی لە ئاسمان بێت (سەیری ئاسمانی بکات) و ـ بڵێت: شاهێدی دەدەم کە هیچ خوایێک بە هەق نیە جگە لە (الله) کە تاکە و هاوبەشی نیە، وە شاهێدی دەدەم کە موحەممەد بەندە و نێردراویەتی، ئەوە هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێنەوە دەچێتە ژوورەوە لە هەر یەکێکیان کە حەز بکات.

## بابەت: گەورەیی دەستنوێژ

٧٤٥- «عَن عَاصِمِ بنِ سُفيَانَ، أَنَّهُم غَزَوا غَزوَةَ السَّلاَسِلِ، فَرَجَعُوا إِلَى مُعَاوِيَةَ ﷺ، وَعِندَهُ أَبُو أَيُّوبَ وَعُقبَةُ بنُ عَامِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، فَقَالَ أَبُو أَيُّوبَ سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَن تَوَضَّأَ كَمَا أُمِرَ، وَصَلَّى كَمَا أُمِرَ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِن عَمَلٍ أَكَذَاكَ يَا عُقبَةُ؟ قَالَ: نَعم»[٢].

واتە: لە عاصمی کوڕی سوفیانەوە گێردراوەتەوە، کە جەنگی سەلاسیلیان کردووە و گەڕاونەتەوە بۆ لای موعاویە ﷺ، کە ئەبو ئەیوب و عوقبەی کوڕی عامیریشی لەلا بوو، ئەبو ئەیوب وتی: گوێم لە پێغەمبەری

---

(١) ـ إسناده فيه جهالة، ولكن الحديث صحح.

(٢) ـ حسن.

خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر كەسێک دەستنوێژ بشۆرێ وەک چۆن فەرمانی پێ كراوە، وە نوێژ ئەنجام بدات وەک چۆن فەرمانی پێ كراوە، ئەوە لێی دەبوردرێ لەوەی ئەنجامی داوە لە كردەوەی (خراپ)، جا (وتی) ئاوابوو ئەی عوقبە، (پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای فەرموو وانیە)؟ عوقبە وتی: بەڵێ.

٧٤٦- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إذَا تَوَضَّأَ العَبدُ المُسلِمُ أَوِ المُؤمِنُ فَغَسَلَ وَجهَهُ، خَرَجَت مِن وَجهِهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ نَظَرَ إِلَيهَا بِعَينِهِ مَعَ المَاءِ، أَو مَعَ آخِرِ قَطرِ المَاءِ، فَإِذَا غَسَلَ يَدَيهِ، خَرَجَت مِن يَدَيهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ بَطَشَتهَا يَدَاهُ مَعَ المَاءِ، أَو مَعَ آخِرِ قَطرِ المَاءِ حَتَّى يَخرُجَ نَقِيًّا مِنَ الذُّنُوبِ»[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێردراوەتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بەندەی مسوڵمان یان بڕوادار دەستنوێژ بشۆرێت كە ڕوخساری دەشۆرێت، لە ڕوخساریدا هەموو تاوانێک كە بە چاوەكانی سەیری كردووە و (ئەنجامی داوە) دەردەچێت لەگەڵ ئاوەكە یان لەگەڵ كۆتا دڵۆپی ئاوەكە، جا كە دەست و باسكەكانی شۆرد ئەوە هەموو تاوانێک كە بە دەستەكانی ئەنجامی داوە دەردەچێت لەگەڵ ئاوەكە، یان لەگەڵ كۆتا دڵۆپی ئاوەكە، (تا بەو شێوەیە...) تاوەكو بە پاكی دەردەچێت لە تاوانەكانی.

٧٤٧- «عَن أَبِي عُثمَانَ، قَالَ: كُنتُ مَعَ سَلمَانَ ﷺ تَحتَ شَجَرَةٍ، فَأَخَذَ مِنهَا غُصنًا يَابِسًا فَهَزَّهُ حَتَّى تَحَاتَّ وَرَقُهُ- قَالَ: أَمَا تَسأَلُنِي: لِمَ أَفعَلُ هَذَا؟ قُلتُ لَهُ: لِمَ فَعَلتَهُ؟ قَالَ: هَكَذَا فَعَلَ بِي رَسُولُ اللهِ ﷺ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ المُسلِمَ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحسَنَ الوُضُوءَ، وَصَلَّى الخَمسَ تَحَاتَّت ذُنُوبُهُ كَمَا تَحَاتُّ هَذَا الوَرَقِ ثُمَّ قَالَ: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِ ﴿١١٤﴾ ﴾هود، إِلَى قَولِهِ: ﴿ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾ هود)»[2].

واتە: لە ئەبو عوسمانەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ سەلمان ﷺ بووم لە ژێر درەختێک، سەلمانیش لقێكی وشكی گرت و لێی كردەوە و ڕایوەشاند (هەژاندی) تا گەڵاكانی وەرین و كەوتنە خوارەوە، وتی: ئایا لێم ناپرسی بۆ وام كرد؟ پێم وت: بۆ وات كرد؟ وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای لەگەڵ كردم، دواتر فەرمووی: مسوڵمان كاتێک دەستنوێژ دەشۆرێت بە دەستنوێژێكی جوان و ڕێک و پێنج نوێژەكان ئەنجام دەدات، ئەوە تاوانەكانی دەوەرن وەک چۆن ئەم گەڵایانە وەرین، دواتر (ئەم ئایەتەی) فەرمووی: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾ واتە: [وە نوێژ ئەنجام بدەن لەم سەر و ئەوسەری ڕۆژدا و لە بەشێک لەشەودا، چونكە بەدڵنیایی كردەوە چاكەكان كردەوە خراپەكان لادەبەن].

## بابەت: دەستنوێژ شۆردن بۆ هەموو نوێژێک

٧٤٨- «عَن أَنَسِ بنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ، وَكَانَ أَحَدُنَا يَكفِيهِ الوُضُوءُ مَا لَم يُحدِث»[3].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث حسن لغيره.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (زۆربەی کات) دەستنوێژی دەشۆرد بۆ هەموو نوێژێک، هەر یەک لە ئێمەش (لە ئوممەتەکەی) یەک دەستنوێژی بەسە (بۆ هەموو نوێژەکان) مادەم دەستنوێژی نەشکابێ.

## بابەت: دەستنوێژ (پێویست و واجب) نیە تەنها بۆ بێ دەستنوێژی نەبێ

٧٤٩- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُم فِي صَلاَتِهِ حَرَكَةً فِي دُبُرِه، فَأَشكَلَ عَلَيهِ أَحدَثَ أَو لَم يُحدِث، فَلاَ يَنصَرِفَنَّ حَتَّى يَسمَعَ صَوتًا، أَو يَجِدَ رِيحًا»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان هەستی بە جوڵەیەک کرد لە دواوەی لەناو نوێژدا و گومانی بۆ دروست بوو کە ئایا دەستنوێژی شکاوە، یان نەشکاوە، ئەوە بێ واز نەهێنێت (لە نوێژەکەی) تاوەکو گوێی لە دەنگێک دەبێت یان هەست بە بۆنێک دەکات.

## بابەت: دەستنوێژ شۆردن لەبەر خەوتن

٧٥٠- «عَن مُعَاوِيَةَ بنِ أَبِي سُفيَانَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِنَّمَا العَينَانِ وِكَاءُ السَّهِ، فَإِذَا نَامَتِ العَينُ، استَطلَقَ الوِكَاءُ قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ عَبدِ اللهِ: تَقُولُ بِهِ؟ قَالَ: لاَ، إِذَا نَامَ قَائِمًا لَيسَ عَلَيهِ الوُضُوءُ»[٢].

واتە: لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﷺ گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی دوو چاوەکان پەتی دواوەن (واتە: چاوەکان وەک پەت وان و دواوەی مرۆڤ دادەخەن و ناهێڵن هەوای لێ دەربچێت، وەک چۆن پەت سەری گونیە و گوش و تورەگە دادەخات)، جا ئەگەر چاو خەوت پەتەکە واڵا دەبێت (کەواتە دەستنوێژ بشۆرنەوە).

جا بە ئەبو موحەممەد (ئیمامی داریمی) وترا: بۆچوونت وایە خەو دەستنوێژ بشکێنی (لە هەموو حاڵەتێکدا)؟ وتی: نەخێر، ئەگەر بە دانیشتویی خەوت دەستنوێژی لەسەر نیە (چونکە ژێرەوەی قایم دەبێت و ترسی ئەوەی نیە بای لێ دەربچێت، کەواتە مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ حاڵەتەکانی جگە لە دانیشتنە).

## بابەت: دەربارەی مەزی (عاشقاء)

٧٥١- «عَن سَهلِ بنِ حُنَيفٍ ﷺ، قَالَ: كُنتُ أَلقَى مِنَ المَذيِ شِدَّةً، فَكُنتُ أُكثِرُ الغُسلَ مِنهُ، فَذَكَرتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ وَسَأَلتُهُ عنهُ فَقَالَ: إِنَّمَا يُجزِئُكَ مِن ذَلِكَ الوُضُوءُ قَالَ: قُلتُ: فَكَيفَ بِمَا يُصِيبُ ثَوبِي مِنهُ؟ قَالَ: خُذ كَفًّا مِن مَاءٍ فَانضَحهُ حَيثُ تَرَى أَنَّهُ أَصَابَهُ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث حسن.

(٣) ـ حسن.

واتە: لە سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زەحمەتی زۆرم تووش دەبوو بەهۆی مەزییەوە، خۆم زۆر جار دەشۆرد لەبەر مەزی، منیش ئەوەم باس کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ و پرسیارم دەربارەی لێ کرد، ئەویش فەرمووی: بەتەنها دەستنوێژت بەسە بۆ ئەوە (تەنها دەستنوێژ بشۆرە)، دەڵێ وتم: ئەی چی لەوە بکەم کە بەر جلەکەم کەوتووە؟ فەرمووی: گۆمە ئاوێک هەڵگرە و ئەو شوێنە بپرژێنە کە پێت وایە (مەزیەکە) بەری کەوتووە.

تێبینی: مەزی بریتییە لەو ئاوەی کە لە کاتی جوڵانی شەهوەتدا دێتە دەرەوە، ڕەنگی ڕوونە و ئاوێکی لینجە، حوکمەکەشی لای جمهوری زانایان (زۆربەی زانایان) ئەوەیە کە ئاوێکی پیسە و وەک میز مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت و دەبێ بشۆردرێت، تەنها ڕشاندنی بەس نیە، بەڵگەشیان فەرموودەی دیکەیە کە فرمان بە شۆردن دەکات.

## بابەت: دەستنوێژ شۆردن لەبەر دەست لە عەوڕەت دان

٧٥٢- «عَن بُسرَةَ بِنتِ صَفوَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُا، أَنَّهَا سَمِعَت رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: يَتَوَضَّأُ الرَّجُلُ مِن مَسِّ الذَّكَرِ»[1].

واتە: لە بوسرەی کچی صەفوان (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا)، گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: مرۆڤ دەبێ دەستنوێژ بشۆرێت لەبەر دەست لە عەوڕەت دان.

٧٥٣- «عَن بُسرَةَ بِنتِ صَفوَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُا، أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: مَن مَسَّ فَرجَهُ، فَليَتَوَضَّأْ فَقَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: هَذَا أَوثَقُ فِي مَسِّ الفَرجِ، وَقَالَ: الوُضُوءُ أَثبَتُ»[2].

واتە: لە بوسرەی کچی صەفوان (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا)، گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: هەر کەسێک دەست لە عەوڕەتی بدات با دەستنوێژ بشۆرێت.

ئەبو مەحەممەد (ئیمامی داریمی) وتویەتی: ئەم فەرموودەیە (کە واجبی کرد دەستنوێژ بشۆردرێت ئەگەر دەست بەر عەوڕەت کەوت) جێگای متمانەترە لە فەرموودەی مەسسی فەرج (کە تیایدا هاتوە کە دەستنوێژ شوشتنەوەی پێویست نیە)، وە وتویەتی: دەستنویژ شۆردنەوە فەرموودەکەی سابیت و جێگیرترە.

## بابەت: دەستنوێژ شۆردن بەهۆی (خواردنی خۆراکێک) کە ئاگر کاری تێ کردبێت (کوڵاو یان برژاو بێت)

٧٥٤- «خَارِجَةَ بنَ زَيدٍ الأَنصَارِيَّ، أَخبَرَهُ: أَنَّ أَبَاهُ زَيدَ بنَ ثَابِتٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الوُضُوءُ مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ: تَأخُذُ بِهِ؟ قَالَ: لا»[3].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە زەیدی کوڕی سابیت ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەستنوێژ هەیە و (پێویستە) لە شتێک کە بە ئاگر کوڵا بێت.

جا بە ئەبو مەحەممەد (ئیمامی داریمی) وترا: وەری دەگری و کاری پێ دەکەی؟ وتی: نەخێر.

## بابەت: ڕێگادان بەوەی دەستنوێژ نەشۆردرێتەوە
## (لە خواردنی شتێک کە ئاگر کاری تێ کردووە)

٧٥٥- «عَنِ عَمرَو بنَ أُمَيَّةَ ﷺ، أَخبَرَهُ: أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللهِ ﷺ يَحتَزُّ مِن كَتِفِ شَاةٍ فِي يَدِهِ، ثُمَّ دُعِيَ إِلَى الصَّلاَةِ فَأَلقَى السِّكِّينَ الَّتِي كَانَ يَحتَزُّ بِهَا، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى وَلَم يَتَوَضَّأ»[١].

واتە: لە عەمری کوڕی ئومەییە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە (گۆشتی) پیلی مەڕێکی لەناو دەستی دابوو و (بە چەقۆیێک) لێی دەکردەوە و (دەیخوارد)، دواتر بانگ کرا بۆ نوێژ، ئەویش چەقۆکەی فڕێدا کە (گۆشتەکەی) پێ دەبڕی، دواتر هەڵسا نوێژی کرد و دەستنوێژیشی نەشۆرد (هەر چەندە گۆشتی کوڵاویشی خواردبوو).

## بابەت: دەستنوێژ شۆردن بە ئاوی دەریا

٧٥٦- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، قَالَ: أَتَى رِجَالٌ مِن بَنِي مُدلَجٍ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا أَصحَابُ هَذَا البَحرِ نُعَالِجُ الصَّيدَ عَلَى رَمَثٍ فَنَعزُبُ فِيهِ اللَّيلَةَ، وَاللَّيلَتَينِ، وَالثَّلاَثَ، وَالأَربَعَ، وَنَحمِلُ مَعَنَا مِنَ العَذبِ لِشِفَاهِنَا، فَإِن نَحنُ تَوَضَّأنَا بِهِ، خَشِينَا عَلَى أَنفُسِنَا، وَإِن نَحنُ آثَرنَا بِأَنفُسِنَا وَتَوَضَّأنَا مِنَ البَحرِ، وَجَدنَا فِي أَنفُسِنَا مِن ذَلِكَ، فَخَشِينَا أَن لاَ يَكُونَ طَهُورًا فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ تَوَضَّئُوا مِنهُ فَإِنَّهُ الطَّاهِرُ مَاؤُهُ، الحَلاَلُ مَيتَتُهُ»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چەند پیاوێک لە بەنی مودلیج هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتیان: ئێمەی نیشتەجێی لای ئەو دەریایە بەبەردەوامی (پیشەمان ئەوەیە) لەسەر چەند پارچە دارێکی لکێندراودا ڕاو دەکەین (لەناو دەریادا)، جا شەوێک و دوو شەو و سێ شەو و چوار شەو دوور دەکەوینەوە (لە ماڵەکانمان و لەناو ئەو دەریایە دەمێنینەوە)، وە هەندێک لە ئاوی شیرین لەگەڵ خۆمان دەبەین بۆ خواردنەوە، جا ئەگەر ئێمە دەستنوێژی پێ هەڵگرین لە ژیانی خۆمان دەترسین (ڕەنگە لەبەر بێ ئاوی بمرین، ئاوی دەریاش سوێرە ناخورێتەوە)، جا ئەگەر ژیانی خۆشمان هەڵبژێرین (ئاوە شیرینەکە بۆ دەستنوێژ بەکار نەهێنین) و دەستنوێژ بە ئاوی دەریا بشۆرین دڵمان پێی چاک نیە دەترسین پاک نەبێت (بۆ دەستنوێژ نەشێت)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەستنوێژی پێ بشۆرن، چونکە دەریا ئاوەکەی پاکە، مردارەبووەکەی حەڵاڵە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ رجاله ثقات، والحديث صحيح.

٧٥٧- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، يَقُولُ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّا نَركَبُ البَحرَ وَمَعَنَا القَلِيلُ مِنَ المَاءِ فَإِن تَوَضَّأنَا بِهِ عَطِشنَا، أَفَنَتَوَضَّأُ مِن مَاءِ البَحرِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ، الحِلُّ مَيتَتُهُ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و وتی: ئێمە سواری (بەلەم) دەبین لەناو دەریا و ئاوی کەممان لەگەڵە، جا ئەگەر دەستنوێژی پێ بشۆرین تینومان دەبێت (مەترسی لەسەر ژیانمان دروست دەبێت)، جا ئایا بە ئاوی دەریا دەستنوێژ بشۆرین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەریا ئاوەکەی پاکە، مردارەبوەکەی حەڵاڵە.

## بابەت: دەستنوێژ شۆردن بە ئاوی وەستاو

٧٥٨- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ يَبُولُ أَحَدُكُم فِي المَاءِ الدَّائِمِ، ثُمَّ يَغتَسِلُ مِنهُ»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: کەس میز نەکاتە ناو ئاوێکی وەستا و و، دواتریش خۆی پێ بشۆرێ.

## بابەت: ئەندازەی ئەو ئاوەی پیس نابێت

٧٥٩- «عَن عُبَيدِ اللهِ بنِ عَبدِ اللهِ بنِ عُمَرَ، عَن أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَهُوَ يُسأَلُ عَنِ المَاءِ يَكُونُ بِالفَلاَةِ مِنَ الأَرضِ وَمَا يَنُوبُهُ مِنَ الدَّوَابِّ وَالسِّبَاعِ؟ فَقَالَ: إِذَا بَلَغَ المَاءُ قُلَّتَينِ لَم يُنَجِّسهُ شَيءٌ»[٣].

واتە: لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە کاتێکدا پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئاوێک کە لە بیابان و چۆڵەوانیە و ئاژەڵ و درندە بە بەردەوام دەچنە سەری (جا ئایا پاکە)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئاو گەیشتە دوو قوللە (واتە گەیشتە ١٩٢ لیتر) ئەوە هیچ شتێک پیسی ناکات (بە مەرجێک تام و بۆن و ڕەنگی نەگۆڕابێت).

٧٦٠- «عَنِ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ عَنِ المَاءِ وَمَا يَنُوبُهُ مِنَ الدَّوَابِّ وَالسِّبَاعِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا كَانَ المَاءُ قُلَّتَينِ لَم يَحمِلِ الخَبَثَ»[٤].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئاو و چوونەسەری ئاژەڵ و درەندەکان بە بەردەوامی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئاو دوو قولله بوو (واتە: ١٩٢ لیتر بوو) ئەوە پیسی وەخۆی هەڵناگرێ (پیس نابێ، بە مەرجێک تام و بۆن و ڕەنگی نەگۆڕابێت).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: دەستنوێژ شۆردن بە ئاوی بەكارهاتوو

٧٦١- «عَن مُحَمَّدِ بنِ المُنكَدِرِ، قَالَ: سَمِعتُ جَابِرًا ﷺ، يَقُولُ: جَاءَنِي النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُنِي وَأَنَا مَرِيضٌ لاَ أَعقِلُ، فَتَوَضَّأَ وَصَبَّ مِن وَضُوئِهِ عَلَيَّ، فَعَقَلتُ»[١].

واتە: لە موحەممەدی كوڕی مونكەدیرەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە جابر بوو ﷺ دەیوت: پێغەمبەر ﷺ هاتە لام و سەردانی كردم لە كاتێكدا نەخۆش بووم هۆشم لە خۆم نەبوو، دەستنوێژی شۆرد و هەندێك لە ئاوی دەستنوێژەكەی ڕشت بە سەرمدا و بە ئاگا هاتمەوە (واتە: ئەگەر ئاوی بەكارهاتوو پاك نەبوایە و بۆ دەستنوێژ نەگونجابووایە ئەوە نەیدەڕشت بەسەر جابردا).

## بابەت: دەستنوێژ شۆردن بە پاشماوەی ئاوی دەستنوێژی ئافرەت

٧٦٢- «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: قَامَتِ امرَأَةٌ مِن نِسَاءِ النَّبِيِّ ﷺ فَاغتَسَلَت فِي جَفنَةٍ مِن جَنَابَةٍ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى فَضلِهَا يَستَحِمُ، فَقَالَت: إِنِّي قَدِ اغتَسَلتُ فِيهِ قَبلَكَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّهُ لَيسَ عَلَى المَاءِ جَنَابَةٌ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: خێزانێكی پێغەمبەر ﷺ هەڵسا و خۆی لە تەشتێكدا شۆرد لەبەر جەنابەت، پێغەمبەر ﷺیش هەڵسا بۆ لای پاشماوەی ئاوەكەی و خۆی پێ شۆرد، خێزانەكەی وتی: من پێش تۆ خۆم لەو تەشتە شۆرد (چۆن تۆش خۆتی تێدا دەشۆری)؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خۆ ئاو جەنابەتی لەسەر نیە (ئاوەكە پاكە).

٧٦٣- «أَخبَرَنَا عَبدُ اللهِ، عَن سُفيَانَ، عَن سِمَاكِ بنِ حَربٍ، عَن عِكرِمَةَ، عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحوَه »[٣].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە بە هەمان شێوە.

## بابەت: ئەگەر پشیلە دەمی بنێتە ناو قاپێكی شلەمەنیەوە و (لێی بخواتەوە ئایا حوكمەكەی چۆنە؟)

٧٦٤- «عَن كَبشَةَ بِنتِ كَعبِ بنِ مَالِكٍ، وَكَانَت تَحتَ ابنِ أَبِي قَتَادَةَ، أَنَّ أَبا قَتَادَةَ ﷺ، دَخَلَ عَلَيهَا فَسَكَبَت لَهُ وَضُوءًا، فَجَاءَت هِرَّةٌ تَشرَبُ مِنهُ، فَأَصغَى لَهَا أَبُو قَتَادَةَ الإِنَاءَ حَتَّى شَرِبَت- قَالَت كَبشَةُ فَرَآنِي أَنظُرُ، فَقَالَ: أَتَعجَبِينَ يَا بِنتَ أَخِي؟ قُلتُ: نَعم قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: إِنَّهَا لَيسَت بِنَجَسٍ، إِنَّمَا هِيَ مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيكُم وَالطَّوَّافَاتِ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح بشواهده.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە کەبشەی کچی کەعبی کوڕی مالیک گێڕدراوەتەوە کە لە ژێر نیکاحی ئەبو قەتادە ﷺ بووە (خێزانی بووە)، وتویەتی: ئەبو قەتادە هاتوە بۆ لای و ئەویش هەندێک ئاوی بۆ ڕشتە ناو قاپێکەوە و پشیلەیەکیش هات و لە ئاوەکەی خواردەوە، ئەبو قەتادەش قاپەکەی بۆ لار کردەوە تا خواردیەوە، کەبشە دەڵێت: ئەبو قەتادە منی بینی (بە سەرسوڕمانەوە) سەیری دەکردم، بۆیە وتی: ئەی کچی برام پێت سەیرە؟ وتم: بەڵێ، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پشیلە پیس نیە، بەڵکو لەوانەن کە زۆر بەسەرتاندا دەسوڕێنەوە و هاتووچۆتان دەکەن.

## بابەت: دەربارەی سەگ کە دەمی بخاتە ناو قاپێکەوە

**٧٦٥-** «عَن عَبدِ اللهِ بنِ مُغَفَّلٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِذَا وَلَغَ الكَلبُ فِي الإِنَاءِ، فَاغسِلُوهُ سَبعَ مِرَارٍ، وَالثَّامِنَةَ عَفِّرُوهُ فِي التُّرَابِ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سەگ دەمی خستە ناو قاپێکەوە ئەوە قاپەکە حەوت جار بشۆرن بە ئاو، جاری هەشتەمیش لەناو خۆڵی وەربدەن (بە خۆڵ بیشۆرن).

## بابەت: ئەو مشکەی دەکەوێتە ناو ڕوون (ئایا پیسی دەکات یان نا؟)

**٧٦٦-** «عَن مَيمُونَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُا، أَنَّ فَأرَةً وَقَعَت فِي سَمنٍ فَمَاتَت، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَلقُوهَا وَمَا حَولَهَا وَكُلُوهُ»[٢].

واتە: لە مەیمونە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا)، گێڕدراوەتەوە کە مشکێک کەوتبووە ناو ڕوون و مردبوو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: مشکەکە و ئەو ڕوونەی لە دەوراو پشتیەتی بێننە دەرەوە و فڕێی بدەن و ئەوەی تری بخۆن (پیس نیە، چونکە هیچ پیسی بەر نەکەوتووە).

تێبنی: ئەمە لە حەڵەتێکدایە کە ڕوونەکە پەیت بێت، نەوەک زەیت.

## بابەت: پێویستی خۆ پاراستن لە میز

**٧٦٧-** «عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِقَبرَينِ فَقَالَ: إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ فِي قُبُورِهِمَا، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ: كَانَ أَحَدُهُمَا يَمشِي بِالنَّمِيمَةِ، وَكَانَ الآخَرُ لاَ يَستَنزِهُ عَنِ البَولِ أَو مِنَ البَولِ قَالَ: ثُمَّ أَخَذَ جَرِيدَةً رَطبَةً فَكَسَرَهَا، فَغَرَزَ عِندَ رَأسِ كُلِّ قَبرٍ مِنهُمَا قِطعَةً، ثُمَّ قَالَ: عَسَى أَن يُخَفَّفَ عنهما حَتَّى تَيبَسَا»[٣].

---

(١) ـ صحیح.

(٢) ـ صحیح.

(٣) ـ صحیح.

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی و فەرمووی: خاوەنی ئەم دوو گۆڕە سزا دەدرێن لە گۆڕەکانیان، سزاش نادرێن لەسەر شتانێکی زەحمەت (زۆر ئاسان بوو ئەگەر بیانویستایە خۆیان بپارێزن، کارێکی گەورە و زەحمەت نەبوو، کەچی تاوانەکەشیان گەورەیە)، یەکێکیان قسەی دەهێناو دەیبرد (نەمیمی دەکرد)، ئەوەی تریشیان خۆی لە میز نەدەپاراست (پڕوشکە میزی خۆی بەردەکەوتەوە)، (ئیبنو عەبباس) دەڵێ: دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ لقە گەڵایێکی تەڕ و سەوزی دار خورمای هەڵگرت و لە ناوەڕاستیەوە شکاندیەوە و (کردی بە دوو لەتەوە) و لەلای سەرەوەی گۆڕی هەردووکیان لەتێکی چەقاند، دواتر فەرمووی: بەشکو سزایان لەسەر سوک ببێت تا ئەو دوو پارچە دارە وشک دەبن.

## بابەت: حوکمی میز کردن لە مزگەوت

٧٦٨- «عَن أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَ أَعرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَلَمَّا قَامَ، بَالَ فِي نَاحِيَةِ المَسجِدِ قَالَ: فَصَاحَ بِهِ أَصحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَكَفَّهُم عنهُ ثُمَّ دَعَا بِدلَوٍ مِن مَاءٍ فَصَبَّهُ عَلَى بَولِهِ»[١].

واتە: لە ئەنەس ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: عەرەبێکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، جا کاتێک هەڵسا (چوو) میزی لە لایێکی مزگەوت کرد، هاوەڵانی پێغەمبەری خواش ﷺ بەسەریاندا هاوار کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی کرد وازی لێ بهێنن، دواتر (کە کابرا تەواو بوو لە میز کردن) پێغەمبەری خوا ﷺ داوای دۆلکە ئاوێکی کرد و ڕشتیە سەر میزەکەی.

## بابەت: حوکمی میزی منداڵێکی کوڕ کە (شیرە خۆرە) خواردن نەخوات

٧٦٩- «عَن عُبَيدِ اللهِ بنِ عَبدِ اللهِ بنِ عُتبَةَ، عَن أُمِّ قَيسٍ بِنتِ مِحصَنٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُا، أَنَّهَا أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ بِابنٍ لَهَا لَم يَبلُغ أَن يَأكُلَ الطَّعَامَ فَأَجلَسَهُ فِي حِجرِهِ فَبَالَ عَلَيهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ وَلَم يَغسِلهُ»[٢].

واتە: لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە ئوممی قەیسی کچی میحصەن (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێردراوەتەوە، کە چۆتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بە کوڕە بچکۆڵەکەیەوە کە نەگەیشتبوە ئەو تەمەنەی خواردن بخوات (تەنها شیری دەخوارد)، پێغەمبەری خواش ﷺ منداڵەکەی لەناو کۆشی خۆی دانیشاند، منداڵەکەش میزی بەسەر کۆشی (پێغەمبەری خوا ﷺ) داکرد، (پێغەمبەر ﷺ) داوای ئاوی کرد و کۆشی خۆی پێ ڕشاند و نەیشۆڕی (تەنها ئاوەکەی بەسەر پرژاند، چونکە پیسیەکە زۆر خەفیفە و تەنها بە ڕشاندن پاک دەبێتەوە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: زەوی هەندێکی هەندێکی تری پاک دەکاتەوە

٧٧٠- «عَن أُمِّ وَلَدٍ لِإبرَاهِيمَ بنِ عَبدِ الرَّحمَنِ بنِ عَوفٍ، أَنَّهَا سَأَلَت أُمَّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُا، فَقَالَت: إِنِّي امرَأَةٌ أُطِيلُ ذَيلِي فَأَمشِي فِي المَكَانِ القَذِرِ؟ قَالَت أُمُّ سَلَمَةَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يُطَهِّرُهُ مَا بَعدَهُ»[1].

واتە: لە حومەید گێڕدراوەتەوە کە پرسیاری لە ئوممو سەلەمە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا)، کردووە و وتویەتی: من ئافرەتێکم دامێنی کراسم درێژ دەکەم و (جاری وا هەیە) بەناو شوێنێکی پیسدا دەڕۆم (حوکمەکەی چیە)؟ ئوممو سەلەمە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شوێنی پاشی پیسیەکە پاکی دەکاتەوە (واتە: دوای ئەوەی بە شوێنێکی پیسدا تێپەڕ دەبێ بە شوێنێکی پاکیشدا تێپەڕ دەبێ، ئەو شوێنە پاکە دامێنی کراسەکە پاک دەکاتەوە).

## بابەت: تەیەممom

٧٧١- «عَن عِمرَانَ بنِ حُصَينٍ ﷺ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، ثُمَّ نَزَلَ فَدَعَا بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ نُودِيَ بِالصَّلاَةِ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَلَمَّا انفَتَلَ مِن صَلاَتِهِ إِذَا هُوَ بِرَجُلٍ مُعتَزِلٍ لَم يُصَلِّ فِي القَومِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا مَنَعَكَ يَا فُلاَنُ أَن تُصَلِّيَ فِي القَومِ؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَصَابَتنِي الجَنَابَةُ، وَلاَ مَاءَ فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَيكَ بِالصَّعِيدِ فَإِنَّهُ يَكفِيكَ»[2].

واتە: لە عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە سەفەرێکدا، دواتر لە شوێنێک دابەزی و داوای ئاوی کرد و دەستنوێژی شۆرد، دواتر بانگدرا بۆ نوێژ و نوێژی بە خەڵکی کرد، جا کاتێک لە نوێژەکەی بوویەوە پیاوێکی دوورە پەرێزی بینی (لەولاوە وەستابوو) نوێژی لەگەڵ خەڵکەکە نەکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەی فڵان چ شتێک قەدەغەی کردی کە نوێژ لەگەڵ خەڵکەکە بکەیت؟ ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی جەنابەت و لەش گرانی بووم و ئاویش نیە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خۆڵ بەکاربهێنە بەستە (بەبەر غوسل و دەستنوێژ دەکەوێ).

٧٧٢- «عَن أَبِي سَعِيدٍ الخُدرِيِّ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ رَجُلاَنِ فِي سَفَرٍ، فَحَضَرَتهُمَا الصَّلاَةُ، وَلَيسَ مَعَهُمَا مَاءٌ، فَتَيَمَّمَا صَعِيدًا طَيِّبًا، فَصَلَّيَا، ثُمَّ وَجَدَا المَاءَ بَعدُ فِي الوَقتِ، فَأَعَادَ أَحَدُهُمَا الصَّلاَةَ بِوُضُوءٍ، وَلَم يُعِدِ الآخَرُ ثُمَّ أَتَيَا رَسُولَ اللهِ ﷺ فَذَكَرَا ذَلِكَ، فَقَالَ لِلَّذِي لَم يُعِد: أَصَبتَ السُّنَّةَ وَأَجزَأَتكَ صَلاَتُكَ وَقَالَ لِلَّذِي تَوَضَّأَ وَأَعَادَ لَكَ الأَجرُ مَرَّتَينِ»[3].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دوو پیاو دەرچوون بۆ سەفەرێک، کاتی نوێژیان بەسەر داهات و هیچ ئاوێکیشیان پێ نەبوو، بۆیە تەیەممومیان بە خۆڵێکی پاک کرد و نوێژیان

---

(١) ـ إسناده فيه جهالة، ولكنه صحي بشواهده.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

کرد، دواتر ئاویان دەست کەوت لە هەمان کاتی ئەو نوێژە، بۆیە یەکێکیان نوێژەکەی خۆی دووبارە کردەوە بە دەستنوێژ و (ئاوەکەی بەکار هێنا)، (بەڵام) ئەوەی دووەمیان نوێژەکەی دووبارەی نەکردەوە، دواتر (کە لە سەفەرەکەیان گەڕانەوە) هەردووکیان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەیان بۆ باس کرد (کە ئەنجامیان داوە)، پێغەمبەری خواش ﷺ بەو کەسەی فەرموو کە نوێژەکەی خۆی دووبارە نەکردبوویەوە (فەرمووی): سوننەتت پێکاوە و نوێژەکەت بەرکەوتووە، وە بەو کەسەشی فەرموو کە دەستنوێژی شۆردبوویەوە و نوێژەکەشی دووبارە کردبوویەوە (فەرمووی): دوو پاداشتت بۆ هەیە.

## بابەت: ئەنجامدانی تەیموم بە یەک جار

٧٧٣- «عَن عَمَّارِ بنِ يَاسِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي التَّيَمُّمِ: ضَربَةٌ لِلوَجهِ وَالكَفَّينِ»[١].

واتە: لە عەمماری کوڕی یاسر ﷺ گێردراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی تەیموم دەیفەرموو: یەک لێدانە (لە خۆڵەکە بە هەردوو دەستەکان) بۆ ڕوخسار و دوو باسکەکان.

٧٧٤- «عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، أَنَّهَا استَعَارَت قِلَادَةً مِن أَسمَاءَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، فَهَلَكَت، فَأَرسَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ نَاسًا مِن أَصحَابِهِ فِي طَلَبِهَا فَأَدرَكَتهُمُ الصَّلَاةُ، فَصَلُّوا مِن غَيرِ وُضُوءٍ فَلَمَّا أَتَوا النَّبِيَّ ﷺ شَكَوا ذَلِكَ إِلَيهِ، فَنَزَلَت آيَةُ التَّيَمُّمِ، فَقَالَ أُسَيدُ بنُ حُضَيرٍ: جَزَاكِ اللهُ خَيرًا، فَوَاللهِ مَا نَزَلَ بِكِ أَمرٌ قَطُّ، إلاَّ جَعَلَ اللهُ لَكِ مِنهُ مَخرَجًا، وَجَعَلَ لِلمُسلِمِينَ فِيهِ بَرَكَةً»[٢].

واتە: لە دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنهَا)، گێردراوەتەوە، کە ملوانکەیەکی لە ئەسماء بە ئەمانەت وەرگرتبوو (کە دواتر بۆی بگەڕێنێتەوە)، ملوانکەکەش ون بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ خەڵکانێکی نارد بۆ دۆزینەوەی (ئەوانیش بەدوایدا دەگەڕان) و کاتی نوێژیان بەسەر داهات (دەستنوێژیشیان نەبوو)، بۆیە نوێژیان بەبێ دەستنوێژ ئەنجامدا، جا کاتێک هاتنەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ شکایەتی حاڵی خۆیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، بەو هۆیەوە ئایەتی تەیموم دابەزی، جا ئوسەیدی کوڕی حوضەیر وتی: (ئەی عائیشە) خوا پاداشتی بەخێرت بداتەوە، سوێند بە خوا هەرگیز هیچ شتێکت بەسەر نەهاتوە حەتمەن خوا دەرچەیەکی بۆ واڵا کردووی و، کردویەتیە بەرەکەت و ئاسانکاری بۆ مسوڵمانان.

## بابەت: دەربارەی خۆشۆردن لە جەنابەت

٧٧٥- «عَن مَيمُونَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، قَالَت: وَضَعتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ مَاءً، فَأَفرَغَ عَلَى يَدَيهِ، فَجَعَلَ يَغسِلُ بِهَا فَرجَهُ فَلَمَّا فَرَغَ، مَسَحَهَا بالأرضِ أو بِحَائِطٍ شَكَّ سُلَيمَانُ ثُمَّ تَمَضمَضَ وَاستَنشَقَ، فَغَسَلَ وَجهَهُ وَذِرَاعَيهِ، وَصَبَّ عَلَى رَأسِهِ وَجَسَدِهِ، فَلَمَّا فَرَغَ تَنَحَّى، فَغَسَلَ رِجلَيهِ، فَأَعطَيتُهُ مِلحَفَةً، فَأَبَى، وَجَعَلَ يَنفُضُ بِيَدِهِ، قَالَت: فَسَتَرتُهُ حَتَّى اغتَسَلَ قَالَ سُلَيمَانُ فَذَكَرَ سَالِمٌ أَنَّ غُسلَ النَّبِيِّ ﷺ هَذَا كَانَ مِن الجَنَابَةِ »[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە مەیمونە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەندێک ئاوم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دانا، ئەویش (هەندێک لە ئاوەکەی دەرهێنا و) بەسەر دەستەکانیدا ڕشت و عەورەتی خۆی پێ دەشۆرد، جا کە تەواو بوو دەستی بە زەویەکە دادەهێنا یان بە دیوارەکە (ئەو گومانە لەلای سولەیمان دروست بووە کە یەکێکە لە گێڕەرەوانی ئەم فەرموودەیە)، دواتر ئاوی لە دەم و لوتیەوە وەردەکرد و ڕوخسار و قۆڵەکانیشی دەشۆرد و ئاوی بەسەر سەر و جەستەی دادەکرد، جا کە تەواو دەبوو خۆی نەوی دەکرد و قاچەکانی دەشۆرد، منیش خاولییەکم پێ دەدا وەری نەدەگرت و بە دەستەکانی ئاوی لەخۆی دەکردەوە، مەیمونە وتویەتی: منیش پەنام بۆ دروست کرد تا خۆی شۆرد.

سولەیمان وتویەتی: سالم باسی کردووە کە ئەو خۆ شۆردنەی پێغەمبەر ﷺ هی جەنابەت بووە.

**٧٧٦- «عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُا، قَالَت: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَبدَأُ فَيَغسِلُ يَدَيهِ، ثُمَّ يَتَوَضَأُ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ، ثُمَّ يُدخِلُ كَفَّهُ فِي المَاءِ، فَيُخَلِّلُ بِهَا أُصُولَ شَعرِهِ، حَتَّى إِذَا خُيِّلَ إِلَيهِ أَنَّهُ قَدِ استَبرَأَ البَشَرَةَ، غَرَفَ بِيَدِهِ ثَلَاثَ غَرَفَاتٍ فَصَبَّهَا عَلَى رَأسِهِ، ثُمَّ اغتَسَلَ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: هَذَا أَحَبُّ إِلَيَّ مِن حَدِيثِ سَالِمِ بنِ أَبِي الجَعدِ»[1].**

واتە: لە دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (کە غوسلی) دەست پێ دەکرد دەستەکانی دەشۆرد، دواتر دەستنوێژی دەشۆرد وەک دەستنوێژی نوێژ، دواتر دەستی دەخستە ناو ئاوەکە و ناوەوەی موەکانی سەری پێ هەڵدەپشاوت تا ئەو کاتەی گومانی دەبرد کە تەڕایەتی گەیشتۆتە گشت پێستی سەری (ئنجا) سێ گۆمە ئاوی بە دەستی هەڵدەگرت و دەیڕشتە سەر سەری، دواتر (هەموو جەستەی) دەشۆرد.

ئەبو موحەممەد (ئیمامی داریمی) وتویەتی: ئەو فەرموودە لای من چاکتر و خۆشەویست ترە لە فەرموودەکەی سالمی کوڕی ئەبو جەعد.

## بابەت: ژن و پیاو (ژن و مێرد) لە یەک تەشت خۆیان دەشۆرن

**٧٧٧- «عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُا، قَالَت: كُنتُ أَغتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللهِ ﷺ مِن إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنَ الجَنَابَةِ»[2].**

واتە: لە دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار من و پێغەمبەری خوا ﷺ خۆمان دەشۆرد بە هۆی جەنابەت لەناو یەک تەشت.

**٧٧٨- «عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُا، قَالَت: كُنتُ أَغتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللهِ ﷺ مِن إِنَاءٍ وَاحِدٍ، وَهُوَ الفَرقِ»[3].**

واتە: لە دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار من و پێغەمبەری خوا ﷺ خۆمان دەشۆرد لەناو یەک تەشت کە یەک فەرەق بوو (کە دەکاتە سێ صاع، واتە: نزیکەی ٢١٦ لیتر).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی بە ئەندازەی موێک جێ بهێڵێت و نەیشۆرێت لە جەنابەتدا

٧٧٩- «عَن عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَن تَرَكَ مَوضِعَ شَعرَةٍ مِن جَنَابَةٍ لَم يُصِبهَا المَاءُ، فُعِلَ بِهَا كَذَا وَكَذَا مِنَ النَّارِ قَالَ عَلِيٌّ: فَمِن ثَمَّ عَادَيتُ رَأسِي، وَكَانَ يَجُزُّ شَعرَهُ»[١].

واتە: لە عەلی ﷺ گێڕدراوەتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک تاڵە موێک (یان بە ئەندازەی تاڵە موێک) جێ بهێڵێت لە جەنابەتدا ئاوی بەر نەكەوێت، ئەوە بە هۆی ئەو تاڵە مووەوە ئاوا و ئاوای پێ دەكرێت لە ئاگردا (سزای زۆری تووش دەبێت)، ئیمامی عەلی وتویەتی: لە پاش ئەو كاتەوە بەربەرەكانێم لەگەڵ سەر و قژم دەكرد، مووەكانیشی دەتاشی (لە ترسی ئەم فەرموودەیە).

## بابەت: حوكمی كەسی بریندار كە تووشی جەنابەت دەبێ

٧٨٠- «عن عَطَاءَ بنَ أَبِي رَبَاحٍ، قَالَ: إِنَّهُ سَمِعَ ابنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا يُخبِرُ أَنَّ رَجُلاً أَصَابَهُ جُرحٌ فِي عَهدِ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ أَصَابَهُ احتِلاَمٌ، فَأُمِرَ بالإغتِسَالِ، فَمَاتَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: قَتَلُوهُ، قَتَلَهُمُ اللهُ، أَلَم يَكُن شِفَاءَ العِيِّ السُّؤَالُ؟ قَالَ عَطَاءٌ: بَلَغَنِي أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ بَعدَ ذَلِكَ فَقَالَ لَو غَسَلَ جَسَدَهُ، وَتَرَكَ رَأسَهُ حَيثُ أَصَابَهُ الجُرحُ»[٢].

واتە: لە عەطائی كوڕی ئەبو ڕەباح گێڕدراوەتەوە وتویەتی: كە گوێی لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، بووە كە هەواڵی پێ داوە كە پیاوێک تووشی برینێک بوو (لە سەری) لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، دواتر لەش گرانی (جەنابەتی) تووش بوو و فەرمانی پێكرا بە خۆشۆردن و (ئەویش خۆی شۆرد) و وەفاتی كرد، ئەو هەواڵە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: كوشتیان هەی خوا بیانكوژێ، مەگەر شیفا و سارێژی نەزانی پرسیار كردن نیە؟ عەطاء وتویەتی: پێم گەیشتووە كە پاش ئەوە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ كراوە ئەویش فەرموویەتی: ئەگەر جەستەی بشۆردایە و وازی لەو شوێنەی سەری بهێنایە كە بریندار بووە و (ئەو شوێنەی نەشۆردایە ئەوە غوسلەكەی دەهاتەجێ).

## بابەت: دەربارەی حوكمی ئەو كەسەی دەچێتە لای ئافرەتەكانی بە یەک غوسل

٧٨١- «عَن أَنَسٍ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ طَافَ عَلَى نِسَائِهِ فِي يَومٍ وَاحِدٍ»[٣].

واتە: لە ئەنەس ﷺ گێڕدراوەتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەک ڕۆژدا چۆتە لای گشت خێزانەكانی.

٧٨٢- «عَن أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ طَافَ عَلَى نِسَائِهِ فِي لَيلَةٍ وَاحِدَةٍ جُمَعَ»[٤].

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ إسناده منقطع، ولكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئەنەس ﷺ گێردراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەک شەودا چۆتە لای خێزانەکانی گشتیان.

### بابەت: ئەو شتەی سوننەتە و باش وایە خۆی پێ داپۆشرێ (لە کاتی خۆشۆردن)

٧٨٣- «عَن عَبدِ اللهِ بنِ جَعفَرٍ ﷺ، قَالَ: أَردَفَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ ذَاتَ يَومٍ خَلفَهُ فَأَسَرَّ إِلَيَّ حَدِيثًا لاَ أُحَدِّثُ بِهِ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ وَكَانَ أَحَبُّ مَا استَتَرَ النَّبِيُّ ﷺ لِحَاجَتِهِ هَدَفٌ أَو حَائِشُ نَخلٍ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان منی خستە دواوەی خۆی و بە پەنهانی قسەیەکی بۆ کردم بە هیچ کەس لە خەڵکی ناڵێم، وە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو شت زیاتر حەزی دەکرد خۆی پێ داپۆشێت بۆ پێویستیەکانی (وەک سەر ئاو و خۆشۆردن) بریتی بوو لە گردۆڵە و بەرزاییێک یان کۆمەڵە دارخورماییێک.

### بابەت: کەسی جەنابەتدار ئەگەر بیەوێ بخەوێ (دەبێ چی بکات)

٧٨٤- «عَنِ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: سَأَلَ عُمَرُ ﷺ، رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: تُصِيبُنِي الجَنَابَةُ مِنَ اللَّيلِ؟ فَأَمَرَهُ أَن يَغسِلَ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأَ، ثُمَّ يَرقُدَ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردو وتی: جەنابەتم تووش دەبێت لە شەودا (چی بکەم)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێ کرد کە عەوڕەتی بشۆرێ و دەستنوێژ بگرێ و دواتر پاڵکەوێ و بخەوێ.

٧٨٥- «عَن عَبدِ الرَّحمَنِ بنِ الأَسود، عَن أَبِيهِ، قَالَ: سَأَلتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا، كَيفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَصنَعُ إِذَا أَرَادَ أَن يَنَامَ وَهُوَ جُنُبٌ؟ فَقَالَت: كَانَ يَتَوَضَّأُ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ يَنَامُ»[٣].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەسوەدەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێراویەتیەوە، وتویەتی: پرسیارم لە عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنهَا)، کرد کە ئاخۆ پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەکرد ئەگەر بیویستایە بخەوێت لە کاتێکدا جەنابەتی لەسەر بوبێت؟ (دایکمان) عائیشە وتی: دەستنوێژی دەشۆرد وەک دەستنوێژی بۆ نوێژ، دواتر دەخەوت.

### بابەت: ئاو لەبەر ئاوە (واتە: لەبەر هاتنی ئاوی منداڵ بوون (لەبەر مەنی) خۆشۆردن واجب دەبێ).

٧٨٦- «عَن أَبِي أَيُّوبَ الأَنصَارِيِّ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: المَاءُ مِنَ المَاءِ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ليس بذاك، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاڕی ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئاو (واتە: خۆشۆردن) واجب دەبێ بە هۆی بینین و دەرچوونی ئاو (واتە: مەنی، تۆو).

٧٨٧- «عَن سَهلِ بنِ سَعدِ السَّاعِدِيِّ ﷺ، وَكَانَ قَد أَدرَكَ النَّبِيَّ ﷺ وَسَمِعَ مِنهُ، وَهُوَ ابنُ خَمسَ عَشرَةَ سَنَةً حِينَ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قَالَ: حَدَّثَنِي أُبَيُّ بنُ كَعبٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُ أَنَّ الفُتيَا الَّتِي كَانُوا يُفتَونَ بِهَا فِي قَولِهِ: المَاءُ مِنَ المَاءِ رُخصَةٌ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ رَخَّصَ فِيهَا فِي أَوَّلِ الإِسلَامِ، ثُمَّ أَمَرَ بالإِغتِسَالِ بَعدُ»[١].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ گێڕدراوەتەوە کە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتووە و گوێی لێ بووە، ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە تەمەنی پازدە ساڵان بووە، وتویەتی: ئوبەی کوڕی کەعب بۆی باس کردووم کە ئەوان ئەو فتوایەی فەتوایان پێ داوە دەربارەی قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: ئاو بە ئاو واجب دەبێت (واتە: خۆشۆردن بە هۆی بینین و دەرچونی مەنی واجب دەبێت) ئەوە ڕوخسەتێک و ڕێپێدانێک بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای پێدا لەسەرەتای ئیسلامەتیدا، (بەڵام) دواتر فەرمانی کرد بە خۆشۆردن (ئەگەرچی مەنیش دەرنەچێت و نەبینرێت، کەواتە: خۆشۆردن بە کەمترین جوتبوون واجب دەبێت).

٧٨٨- «عَن سَهلِ بنِ سَعدٍ ﷺ، قال: حَدَّثَنِي أُبَيٌّ ﷺ، أَنَّ الفُتيَا الَّتِي كَانُوا يُفتَونَ بِهَا المَاءُ مِنَ المَاءِ كَانَت رُخصَةً رَخَّصَهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي أَوَّلِ الإِسلَامِ أَوِ الزَّمَانِ ثُمَّ اغتَسَلَ بَعدُ»[٢].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ بۆی باس کردووم کە ئەوان ئەو فتوایەی فەتوایان پێ داوە دەربارەی قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: ئاو بە ئاو واجب دەبێت (واتە خۆشۆردن بە هۆی بینین و دەرچونی مەنی واجب دەبێت) ئەوە ڕوخسەتێک و ڕێپێدانێک بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای پێدا لەسەرەتای ئیسلامەتیدا، دواتر خۆی دەشۆرد و (تەنها بە جووت بوون حوکمەکەی پێشتر هەڵوەشایەوە).

## بابەت: دەربارەی حوکمی بەیەک گەیشتنی ئەندامی زاوزێی پیاو و ئافرەت (جووت بوون)

٧٨٩- «عَن أَبِي هُرَيرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا جَلَسَ بَينَ شُعَبِهَا الأَربَعِ ثُمَّ جَهَدَهَا، فَقَد وَجَبَ الغُسلُ»[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاو لەنێوان چوار پەلی ئافرەت دانیشت و ماندووی کرد (جووت بوو لەگەڵی) ئەوە خۆشۆردن واجب دەبێ.

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی حوكمی ئافرەت كە شتانێک دەبینێ لە خەودا وەک چۆن پیاو دەیبینێ (واتە: حوكمی ئافرەت كە تووشی جەنابەت دەبێت لە خەودا وەک پیاو)

٧٩٠- «عَن عَطَاءٍ الخُرَاسَانِيِّ قَالَ: سَمِعتُ سَعِيدَ بنَ المُسَيِّبِ، يَقُولُ: سَأَلَت خَالَتِي خَولَةُ بِنتُ حَكِيمٍ السُلَمِيَّةُ رَضِيَ اللهُ عَنهُا، رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنِ المَرأَةِ تَحتَلِمُ فَأَمَرَهَا أَن تَغتَسِلَ»(١).

واتە: لە عەطائی خوراسانی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە سەعیدی كوڕی موسەیيب بوو دەیوت: خارەتم (خوشكی دایكم) خەولەی كچی حەكیمی سولەمی (رَضِيَ اللهُ عَنهُا)، پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد دەربارەی ئافرەت كە لەش گران دەبێت و جەنابەتی تووش دەبێت لە خەودا (ئاخۆ حوكمی چیە)؟، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ كرد خۆی بشۆرێ.

٧٩١- «عَن عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُا، زَوجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا أَخبَرَتهُ أَنَّ أُمَّ سُلَيمٍ، أُمَّ بَنِي أَبِي طَلحَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُا، دَخَلَت عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَت: يَا رَسُولَ اللهَ إِنَّ اللهِ لاَ يَستَحيِي مِنَ الحَقِّ، أَرَأَيتَ المَرأَةَ تَرَى فِي النَّومِ مَا يَرَى الرَّجُلُ، أَتَغتَسِلُ؟ قَالَ: نَعم فَقَالَت عَائِشَةُ: فَقُلتُ: أُفٍّ لَكِ، أَتَرَى المَرأَةُ ذَلِكَ؟ فَالتَفَتَ إِلَيهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: تَرِبَت يَمِينُكِ، فَمِن أَينَ يَكُونُ الشَّبَهُ»(٢).

واتە: لە دایكمان عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنهُا)، خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە كە ئوممو سولەیم بۆی گێڕاوەتەوە كە ئوممو بەنی ئەبو تەڵحە (رَضِيَ اللهُ عَنهُا)، هاتە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خوا شەرم ناكات لە هەق و ڕاستی و شەرعدا، پێت وایە ئافرەت كە شتانێک لە خەودا دەبینێت وەک ئەوەی پیاو دەیبینێت ئایا خۆی بشۆرێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، عائیشەش وتی: ئۆف لەتۆ بۆ مەگەر ئافرەت شتی وا دەبینێ و (مەنی هەیە)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ ئاوڕی بۆ لای عائیشە دایەوە و وتی: دەستی ڕاستت بەخۆڵدا بچێت ئەی وێكچوون لە كوێوە دێت (واتە: كاتێک ئاوی پیاو زاڵ دەبێت بەسەر ئاوی ئافرەت ئەوە منداڵەكە هاوشێوەی بنەماڵەی پیاوەكە دەردەچێ، ئەگەر ئاوی ئافرەتەكەش زاڵ بێت ئەوە منداڵەكە هاوشێوەی بنەماڵەی ئافرەتەكە دەردەچێت، لەوەوە دیارە ئافرەتیش مەنی هەیە).

٧٩٢- «عَن أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: دَخَلَت عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ أُمُّ سُلَيمٍ وَعِندَهُ أُمُّ سَلَمَةَ، فَقَالَت: المَرأَةُ تَرَى فِي مَنَامِهَا مَا يَرَى الرَّجُلُ؟ فَقَالَت أُمُّ سَلَمَةَ: تَرِبَت يَدَاكِ يَا أُمَّ سُلَيمٍ فَضَحتِ النِّسَاءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ مُنتَصِرًا لِأُمِّ سُلَيمٍ: بَل أَنتِ تَرِبَت يَدَاكِ، إِنَّ خَيرَكُنَّ الَّتِي تَسأَلُ عَمَّا يَعنِيهَا، إِذَا رَأَتِ المَاءَ فَلتَغتَسِل قَالَت أُمُّ سَلَمَةَ، وَلِلنِّسَاءِ مَاءٌ؟ قَالَ: نَعم فَأَنَّى يُشبِهُهُنَّ الوَلَدُ؟ إِنَّمَا هُنَّ شَقَائِقُ الرِّجَالِ»(٣).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە ئەنەس ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەممو سولەیم هاتە ژوورەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئوممو سەلەمەشی لەلا بوو، ئوممو سولەیم وتی: (حوكمی) ئافرەت چیە كە شتێک دەبینێت لە خەویدا وەک چۆن پیاو دەیبینن؟ ئوممو سەلەمەش وتی: دەستەكانت بەخۆڵا بچن ئەی ئوممو سولەیم ئافرەتانت ڕیسوا كرد، پێغەمبەر ﷺ بۆ سەرخستنی ئوممی سولەیم فەرمووی: بەڵكو تۆ دەستەكانت بەخۆڵا بچن، باشترینتان لە ئافرەتان ئەوەیە كە پرسیار دەكات لە شتێک كە پەیوەستە پێیانەوە، ئەگەر ئافرەتەكە ئاوی بینی (مەنی بینی) با خۆی بشۆرێت، ئوممو سەلەمە وتی: ئافرەتانیش ئاویان هەیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەی چۆن منداڵ لەوان دەچێ؟ ئافرەتان وەک پیاوانن (یان لەتكی پیاوانن).

## بابەت: حوكمی كەسێک تەڕایەتی دەبینێت و هیچ ئیحتیلام بونێكیشی لە یاد نیە

٧٩٣ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الرَّجُلِ يَسْتَيْقِظُ فَيَرَى بَلَلاً، وَلَمْ يَذْكُرِ احْتِلاَمًا. قَالَ: لِيَغْتَسِلْ، فَإِنْ رَأَى احْتِلاَمًا، وَلَمْ يَرَ بَلَلاً، فَلاَ غُسْلَ عَلَيْهِ»[١].

واتە: لە دایكمان عائیشەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێراوەتەوە دەربارەی پیاوێک (كەسێک) كە تەڕایەتی دەبینێت و هەستی پێ دەكات و هیچ ئیحتیلام بونێكیشی لە یاد نیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێ خۆی بشۆرێ (خۆشۆردنی لەسەرە)، وە ئەگەر ئیحتیلام بونی بینی و تەڕایەتی نەبینی ئەوە خۆشۆردنی لەسەر نیە.

## بابەت: ئەگەر كەسێک لە ئێوە لە خەو هەڵسا (دەبێ چی بكات)

٧٩٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ، فَلاَ يَغْمِسْ يَدَهُ فِي الْوَضُوءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلاَثًا»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەكێک لە ئێوە لە خەوەكەی هەڵسا با دەستی نەخاتە ناو ئاوەوە تاوەكو سێ جار دەیانشۆرێ.

## بابەت: حوكمی كەسێک كە لە (سەر ئاو) دەربچێت و ڕاستەوخۆ نان بخوات

٧٩٥ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَدَخَلَ الْغَائِطَ، ثُمَّ خَرَجَ فَأُتِيَ بِطَعَامٍ، فَقِيلَ: أَلاَ تَتَوَضَّأُ؟ فَقَالَ: أُصَلِّي فَأَتَوَضَّأُ؟»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لەلای پێغەمبەر ﷺ بووین چووە سەر ئاو و دواتر دەرچوو و خواردنێكیان بۆ هێنا و پێی وترا: ئایا دەستنوێژ ناشۆری (بۆ خواردن)؟ (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: بۆ مەگەر نوێژ دەكەم تا دەستنوێژ بشۆرم؟!

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئافرەتی زەیسانی

٧٩٦ - «عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَعْدِ بْنِ زُرَارَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: اسْتُحِيضَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ جَحْشٍ، وَهِيَ تَحْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ سَبْعَ سِنِينَ، فَشَكَتْ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ هَذِهِ لَيْسَتْ بِالْحَيْضَةِ، وَإِنَّمَا هُوَ عِرق فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ، فَدَعِي الصَّلَاةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ، فَاغْتَسِلِي ثُمَّ صَلِّي قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلَاةٍ، ثُمَّ تُصَلِّي، وَكَانَتْ تَقْعُدُ فِي مِرْكَنٍ لِأُخْتِهَا زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ حَتَّى إِنَّ حُمْرَةَ الدَّمِ لَتَعْلُو الْمَاءَ»[١].

واتە: لە عوروەی کوڕی زوبێر و عەمرەی کچی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەعدی کوڕی زوڕارەوە گێردراوەکەوە کە عائیشەی (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، خێزانی پێغەمبەر ﷺ وتویەتی: ئوممو حەبیبەی کچی جەحش کە خێزانی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفە حەوت ساڵان زەیسانی بوو و شکایەتی حاڵی خۆی لای پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەوە حەیز و سوڕی مانگانە نیە، (بەڵکو) تەنها دەمارێکە (ئەم خوێنەی لێ دەردەچێ، ئەم خوێنە لە جێ ی ڕەحم دەرناچێ تا حەیز و سوڕی مانگانە بێت)، بۆیە ئەگەر خوێنی حەیز و سوڕی مانگانە هات (کە خۆت دەزانی پێشتر جەدوەلەکەت چۆن بووە) ئەوە لەو کاتەدا واز لە نوێژ بهێنە، وە ئەگەر حەیزەکەش نەما و ڕۆیشت خۆت بشۆرە و دواتر نوێژ بکە (هەر چەندە با خوێنیش ببینی).

عائیشە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، دەڵێت: ئوممو حەبیبەی کچی جەحش هەموو جار خۆی دەشۆرد بۆ گشت نوێژێک دواتر نوێژی دەکرد، وە هەموو جار لەناو تەشتێک دادەنیشت کە هی خوشکی بوو، هی زەینەبی کچی جەحش بوو هەتا سۆرایەتی خوێن سەر ئاوەکە دەکەوت.

## بابەت: دەربارەی نزیک بونەوەی ڕۆژووەوان لە هاوسەرەکەی

٧٩٧- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ»[٢].

واتە: لە دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەستەگەمەی دەکرد (لەگەڵ خێزانەکانی) لە کاتێکدا بە ڕۆژوو بوو.

٧٩٨- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ»[٣].

واتە: لە ڕێگایێکی تریشەوە گێردراوەتەوە لە دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەگەمەی دەکرد (لەگەڵ خێزانەکانی) لە کاتێکدا بە ڕۆژوو بوو.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: ئافرەتی حەیزدار بەرماڵ دەداتەوە

٧٩٩- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا: نَاوِلِينِي الْخُمْرَةَ قَالَتْ: إِنِّي حَائِضٌ. قَالَ: إِنَّهَا لَيْسَتْ فِي يَدِكِ»[١].

واتە: لە حەزرەتی عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا)، گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ (لەناو مزگەوت بووە و) پێی فەرمووە: بەرماڵم بدەرێ، عائیشە وتی: من حەیزدارم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خۆ حەیزەکە لە دەستت نیە (واتە: تەنها دەستت درێژ بکە بۆ ناو مزگەوت و بەرماڵەکەم پێ بدە).

## بابەت: دەربارەی (حوکمی) خوێنی حەیز کە بەر جل و بەرگ دەکەوێت

٨٠٠- «عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْمُنْذِرِ، عَنْ جَدَّتِهَا أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: سَمِعْتُ امْرَأَةً وَهِيَ تَسْأَلُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: كَيْفَ تصْنعُ بِثوْبها إذَا طَهُرَتْ مَنْ مَحِيضِهَا؟ قَالَ: إِنْ رَأَيْتِ فِيهِ دمًا فَحُكِّيهِ، ثُمَّ اقْرُصِيهِ، ثُمَّ انْضَحِي فِي سَائِرِ ثَوْبِكِ، ثُمَّ صَلِّي فِيهِ»[٢].

واتە: لە ئەسمائی کچی ئەبو بەکر (رَضِي اللَّهُ عَنهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئافرەتێک بوو پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد (دەیووت): کە چی بکات لە جلەکانی ئەگەر لە سوڕی مانگانەکەی پاک بوویەوە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر خوێنت پێوە بینی خوێنەکە بڕنە و لەگەڵ ئاو هەڵی پشێوە، دواتر هەموو جلەکەت بە ئاو بشۆرە، دواتر نوێژ بکە.

## بابەت: دەربارەی خۆشۆردنی ئافرەتی زەیسانی (ئەو ئافرەتەی کە خوێنچرکەی هەیە)

٨٠١- «عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: سَأَلَتِ امْرَأَةٌ مِنَ الْأَنْصَارِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْحَيْضِ؟ قَالَ: خُذِي مَاءَكِ وَسِدْرَكِ، وَاغْتَسِلِي وَأَنْقِي، ثُمَّ صُبِّي عَلَى رَأْسِكِ حَتَّى تَبْلُغِي شُؤُونَ الرَّأْسِ، ثُمَّ خُذِي فِرْصَةً مُمَسَّكَةً. قَالَتْ: كَيْفَ أَصْنَعُ بِهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَسَكَتَ. قَالَتْ: فَكَيْفَ أَصْنَعُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَسَكَتَ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ: خُذِي فِرْصَةً مُمَسَّكَةً فَتَتَبَّعِي بِهَا آثَارَ الدَّمِ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْمَعُ، فَمَا أَنْكَرَ عَلَيْهَا»[٣].

واتە: لە دایکمان عائیشەی (رَضِي اللَّهُ عَنهَا)، دایکی بڕوادارانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێکی ئەنصاڕی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی سوڕی مانگانە (حەیز)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاو و سیدر بێنە (سیدر جۆرە گیایێک بوو لە جێگای صابون بەکار دەهات، ئێستا صابون لە شوێنی ئەوە)، دواتر خۆت بشۆرە و خۆت پاک بکەرەوە و ئا و بەسەر سەرت دابکە تا (ئاوەکە بە جوانی) دەگاتە بنچینەو ناوەوەی پێست و مووەکانی سەرت و (خۆت جوان بشۆرە)، دواتر پارچە پەمۆیێک (پارچە لۆکەیەک) یان پارچە سوفێکی بە میسک (گوڵاو) بێنە و بەکاری بهێنە، ئافرەتەکە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

وتی: چی لە پارچە پەمۆکە بکەم (چۆن بەکاری بهێنم)؟ پێغەمبەری خواش ﷺ (لەبەر شەرم کردن) بێ دەنگ بوو (هیچی نەفەرموو)، ئافرەتەکە (دووبارە) وتی: چی لێ بکەم (چۆن بەکاری بهێنم) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ بێ دەنگ بوو هیچی نەفەرموو، عائیشەش (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، وتی: پارچە پەمۆیێکی بە میسک بێنە و لە شوێنی خوێنەکە دایبنێ و (بە شتێک بیبەستە، تا بۆنی ناخۆشی نەمێنێ)، پێغەمبەری خواش ﷺ گوێی لێ بوو و ئینکاری نەکرد و قسەی نەکرد (واتە: شێوازەکەی عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، ڕاست و ڕێک بوو و ئەوەش مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو).

٨٠٢- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ أَبِي حُبَيْشٍ، إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ فَلاَ أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلاَةَ؟ قَالَ: لاَ إِنَّمَا ذَلِكِ عِرقِ، فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ، فَدَعِي الصَّلاَةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ، فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ، وَصَلِّي»[1].

واتە: لە دایکمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش هات بۆ لای پێغەمبەری خوا و ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئافرەتێکم تووشی خوێنی سوڕی مانگانە دەبم و پاک نابمەوە (جا نازانم ئەو هەموو خوێنە هی حەیزە یان نا) جا ئایا واز لە نوێژ بێنم (لەو هەموو ماوەیە)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر، ئەوە تەنها دەمارێکە (خوێنی لێوەدێ و هەمووی خوێنی حەیز نیە، چونکە خوێنی حەیز لە قوڵایی ڕەحم دەردەچێت)، بۆیە ئەگەر سوڕی مانگانەت هات و (لەو کات و ماوەیەی عادەتی خۆتە) ئەوە واز لە نوێژ بهێنە، وە ئەگەریش حەیزەکەت ڕۆیشت و نەما ئەوە خوێن لە خۆت بشۆرە و نوێژ بکە (هەر چەندە خوێنت هەر بەردەوام بێت، ئەوە حەیز نیە و، نابێ واز لە نوێژ کردن بهێنی).

٨٠٣ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ ابْنَةَ جَحْشٍ اسْتُحِيضَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْغُسْلِ لِكُلِّ صَلاَةٍ، فَإِنْ كَانَتْ لَتَدْخُلُ الْمِرْكَنَ وَإِنَّهُ لَمَمْلُوءٌ مَاءً، فَتَنْغَمِسُ فِيهِ، ثُمَّ تَخْرُجُ مِنْهُ، وَإِنَّ الدَّمَ فَوْقَهُ لَغَالِبُهُ فَتُصَلِّي»[2].

واتە: لە دایکمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کچی جەحش تووشی (ئیستیحاضە) خوێنچرکە بوو، لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێ کرد بە خۆشۆردن بۆ هەموو نوێژێک، جا ئەگەر خوێنچرکەکەی بهاتایە دەچووە ناو تەشتێکەوە کە پڕ بوو لە ئاو، خۆی تیادا نوقم دەکرد دواتر دەهاتە دەرەوە، خوێنیش سەر ئاوەکە دەکەوت (ئەوەندە زۆر بوو)، دواتر نوێژی دەکرد.

٨٠٤- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: إِنَّمَا هِيَ فُلاَنَةُ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ أَمَرَهَا بِالْغُسْلِ لِكُلِّ صَلاَةٍ، فَلَمَّا شَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهَا، أَمَرَهَا أَنْ تَجْمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِغُسْلٍ وَاحِدٍ، وَبَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِغُسْلٍ وَاحِدٍ، وَتَغْتَسِلَ لِلْفَجْرِ» قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: النَّاسُ يَقُولُونَ: سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلٍ قَالَ يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ: سُهَيْلَةُ بِنْتُ سَهْلٍ»[3].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ شاذ.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە دایكمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فڵانە ئافرەت بوو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ كرد بە خۆشۆردن بۆ هەموو نوێژێک، جا كاتێک لەسەری زەحمەت و ناڕەحەت بوو فەرمانی پێ كرد كە نیوەڕۆ و عەسر كۆ بكاتەوە بە یەک خۆشۆردن و مەغریب و عیشاش كۆبكاتەوە بە یەک خۆشۆردن (واتە تاوەكو كۆتایی نیوەڕۆ خۆی نەشۆرێ تا عەسر نزیک دەبێتەوە جا كە عەسر نزیک دەبوویەوە خۆی دەشۆرد و نوێژی نیوەڕۆی ئەنجام دەدا، ئنجا چاوەڕێی نوێژی عەسری دەكرد و ڕاستەوخۆ ئەنجامی دەدا، مەغریب و عیشایەكەش هەر بەم شێوەیە)، وە جارێكیش خۆی بشۆرێ بۆ نوێژ بەیانی.

ئەبو موحەممەد (ئیمامی داریمی) وتویەتی: خەڵک دەڵێن: (ئەو ئافرەتە) سەهلەی كچی سوهەیل بووە، یەزیدی كوڕی هاڕوونیش وتویەتی: سوهەیلەی كچی سەهل بووە.

٨٠٥- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنَهَا، أَنَّ امْرَأَةً اسْتُحِيضَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأُمِرَتْ قَالَ: قُلْتُ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ: النَّبِيُّ ﷺ أَمَرَهَا؟ قَالَ: لاَ أُحَدِّثُكَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ شَيْئًا قَالَ: فَأُمِرَتْ أَنْ تُؤَخِّرَ الظُّهْرَ، وَتُعَجِّلَ الْعَصْرَ، وَتَغْتَسِلَ لَهُمَا غُسْلاً، وَتُؤَخِّرَ الْمَغْرِبَ، وَتُعَجِّلَ الْعِشَاءَ، وَتَغْتَسِلَ لَهُمَا غُسْلاً، وَتَغْتَسِلَ لِلصُّبْحِ غُسْلاً»[1].

واتە: شوعبە وتویەتی: پرسیارم لە عەبدوڕڕەحمانی كوڕی قاسم كرد دەربارەی ئافرەتی موستەحازە (كە خوێنچركەی نەخۆشی هەیە)، ئەویش بۆی گێڕامەوە لە باوكیەوە، ئەویش لە عائیشەی (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕاوەتەوە كە ئافرەتێک تووشی خوێنچركەی نەخۆشی بوو لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ و فەرمانی پێ كرا، (شوعبە) دەڵێ: بە عەبدوڕڕەحمانم ووت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ كرد؟ وتی: من هیچ شتێكت بۆ ناگێڕمەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (چونكە بە ڕاشكاوی پێم نەگەیشتووە فەرمانی لەلایەن كێوە پێ كراوە تاوەكو بڵێم پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرمانی پێ كردووە)، وتی: (تەنها ئەوەندە دەزانم) ئافرەتەكە فەرمانی پێ كراوە كە نوێژی نیوەڕۆ تاخیر بكات (تا نزیكی عەسر) و نوێژی عەسریش زوو بكات و بۆ هەردووكیان یەک غوسل بكات، هەروەها نوێژی مەغریبیش تاخیر بكات (تا نزیكی عیشا) و نوێژی عیشاش زوو بكات و بۆ هەردووكیان یەک غوسل بكات، وە غوسلێكیش بۆ نوێژی بەیانی بكات (بەڵام دەبێ غوسڵەكان بەر لە ئەنجامدانی نوێژەكان بكات).

٨٠٦- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: اسْتُحِيضَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ جَحْشٍ سَبْعَ سِنِينَ، وَهِيَ تَحْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، فَاشْتَكَتْ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهَا لَيْسَتْ بِحِيضَةٍ، إِنَّمَا هُوَ عِرقٍ، فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلاَةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ، فَاغْتَسِلِي وَصَلِّي قَالَتْ عَائِشَةُ: فَكَانَتْ تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلاَةٍ، ثُمَّ تُصَلِّي، قَالَتْ: وَكَانَتْ تَقْعُدُ فِي مِرْكَنٍ لِأُخْتِهَا زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ حَتَّى إِنَّ حُمْرَةَ الدَّمِ لَتَعْلُو الْمَاءَ»[2].

واتە: لە دایكمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئوممو حەبیبەی كچی جەحش حەوت ساڵان تووشی خوێنچركەی ببوو لە كاتێكدا لە ژێر نیكاحی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف بوو (خێزانی ئەو

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

بوو)، بۆیە شكاتی حاڵی خۆی لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەوە حەیز و سوڕی مانگانە نیە، (بەڵكو) تەنها دەمارێكە (خوێنچركە دەكات)، جا كاتێك سوڕی مانگانەت هات ئەوە واز لە نوێژ بێنە، وە ئەگەر سوڕی مانگانەكەت نەما ئەوە خۆت بشۆرە و نوێژ بكە.

عائیشە وتویەتی: هەموو جار بۆ گشت نوێژێك خۆی دەشۆرد، دواتر نوێژی دەكرد، وە وتویەتی: هەموو جار لەناو تەشتێك دادەنیشت كە هی زەینەبی كچی جەحشی خوشكی بوو (خوێنەكەی ئەوەندە زۆر بوو ئاوەكەی سوور دەكرد) تاوەكو سوورایی خوێنەكە سەر ئاوەكە دەكەوت.

٨٠٧- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ، أَفَأَتْرُكُ الصَّلاَةَ؟ قَالَ: لاَ، إِنَّمَا ذَلِكِ عِرق، وَلَيْسَتْ بِالْحِيضَةِ، فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ، فَاتْرُكِي الصَّلاَةَ، فَإِذَا ذَهَبَ قَدْرُهَا، فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَتَوَضَّئِي وَصَلِّي قَالَ هِشَامٌ: فَكَانَ أَبِي يَقُولُ: تَغْتَسِلُ غُسْلَ الْأَوَّلِ ثُمَّ مَا يَكُونُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَإِنَّهَا تَطَّهَّرُ وَتُصَلِّي»[١].

واتە: لە دایكمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فاتیمەی كچی ئەبو حوبەیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئافرەتێكم خوێنچركە دەگرم جا واز لە نوێژ بێنم (لەو ماوەیە)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە تەنها دەمارێكە (خوینچركە دەكات) و حەیز و سوڕی مانگانە نیە، جا هەر كات حەیز و سوڕی مانگانەت هات ئەوە واز لە نوێژ بهێنە، وە هەركاتێكیش ئەندازە و ماوەی حەیزەكەت ڕۆیشت و تیپەڕی ئەوە خوێن لەخۆت بشۆرە و دەستنوێژ بشۆرە (بۆ هەموو نوێژێك) و نوێژ بكە.

هیشام وتویەتی: باوكم دەیوت: (ئافرەتی موستەحازە) جاری یەكەم خۆی دەشۆرێ (كە حەیزەكەی كۆتایی دێت) دواتر بۆ جارەكانیتر دەستنوێژ دەشۆرێت (بۆ گشت نوێژێك) و نوێژ دەكات.

٨٠٨- «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ امْرَأَةً كَانَتْ تُهَرَاقُ الدَّمَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَاسْتَفْتَتْ أُمُّ سَلَمَةَ لَهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لِتَنْظُرْ عَدَدَ اللَّيَالِي وَالْأَيَّامِ الَّتِي كَانَتْ تَحِيضُهُنَّ قَبْلَ أَنْ يَكُونَ بِهَا الَّذِي كَانَ، وَقَدْرَهُنَّ مِنَ الشَّهْرِ، فَتَتْرُكِ الصَّلاَةَ لِذَلِكَ، فَإِذَا خَلَفَتْ ذَلِكَ، وَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ، فَلْتَغْتَسِلْ، وَلْتَسْتَثْفِرْ بِثَوْبٍ، ثُمَّ تُصَلِّي»[٢].

واتە: لە ئوممو سەلەمە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێك خوێنی لێ دەتكا لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ، ئوممو سەلەمەش پرسیاری بۆ لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: با سەیری ژمارەی ئەو شەو و ڕۆژانە بكات و بیریان لێ بكاتەوە (بزانێ چەند شەو و ڕۆژ بوون) كە تیایاندا تووشی حەیز دەبوو پێش ئەوەی ئەو شتەی بەسەر بێت كە بەسەری هاتوە، وە با بیر لە ئەندازەكەیان بكاتەوە لە مانگێكدا، جا با نوێژ واز لێ بێنێت لەبەر حەیزەكەی (لەو ماوەیەدا كە عادەتی پێشویەتی)، وە ئەگەر حەیزەكە نەما و كاتی نوێژ هات با خۆی بشۆرێ و پۆشاكێك لەخۆی بپێچێ دواتر نوێژ بكات.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده فيه جهالة، لكن الحديث صحيح.

٨٠٩- «عَنْ عَائِشَةَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِي اللهُ عَنْهَن، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ غَلَبَنِي الدَّمُ؟ قَالَ: اغْتَسِلِي وَصَلِّي»[١].

واتە: لە دایكمان عائیشە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئوممو حەبیبە (رَضِي اللهُ عَنْهُن)، وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خوێن بەسەرمدا زاڵ بووە (خوێن زۆر دەبینم چی بكەم)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خۆت بشۆرە و نوێژ بكە.

٨١٠- «عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَعْدِ بْنِ زُرَارَةَ، أَنَّهَا: سَمِعَتْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ تَقُولُ: جَاءَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتُ جَحْشٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَكَانَتْ اسْتُحِيضَتْ سَبْعَ سِنِينَ، فَاشْتَكَتْ ذَلِكَ إِلَيْهِ، وَاسْتَفْتَتْهُ فِيهِ، فَقَالَ لَهَا: إِنَّ هَذَا لَيْسَ بِالْحَيْضَةِ، إِنَّمَا هَذَا عِرق، فَاغْتَسِلِي، ثُمَّ صَلِّي قَالَتْ عَائِشَةُ: وَكَانَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلاَةٍ، وَتُصَلِّي، وَكَانَتْ تَجْلِسُ فِي الْمِرْكَنِ فَتَعْلُو حُمْرَةُ الدَّمِ الْمَاءَ، ثُمَّ تُصَلِّي»[٢].

واتە: لە عەمرەتی كچی سەعدی كوڕی زوراڕەوە گێردراوەتەوە كە گوێی لە عائیشەی (رَضِي اللَّهُ عَنهَا)، خێزانی پێغەمبەر ﷺ بوو دەیوت: ئوممو حەبیبەی كچی جەحش هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، لە كاتێكد حەوت ساڵان تووشی خوێنچركە بوو، بۆیە شكاتی ئەو حاڵەی لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ كرد و پرسیاری دەربارە لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەوە (هەمووی) حەیز و سوڕی مانگانە نیە، (بەڵكو) ئەوە تەنها دەمارێكە خوێنچركە دەكات، بۆیە خۆت بشۆرە دواتر نوێژ بكە.

عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا)، وتویەتی: ئوممو حەبیبە هەموو جار خۆی دەشۆرد بۆ هەموو نوێژێك و نوێژی دەكرد، وە هەموو جار لەناو تەشتێك دادەنیشت (كە خۆی دەشۆرد) سورایی خوێنەكە سەر ئاوەكە دەكەوت (خوێنەكە ئەوەندە زۆر بوو) دواتر نوێژی دەكرد.

٨١١ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ جَحْشٍ رَضِي اللَّهُ عَنهَا كَانَتْ اسْتُحِيضَتْ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَمَرَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، بِالْغُسْلِ لِكُلِّ صَلاَةٍ. فَإِنْ كَانَتْ لَتَنْغَمِسُ فِي الْمِرْكَنِ، وَإِنَّهُ لَمَمْلُوءٌ مَاءً، ثُمَّ تَخْرُجُ مِنْهُ. وَإِنَّ الدَّمَ لَعَالِيهِ فَتُصَلِّي»[٣].

واتە: لە دایكمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئوممو حەبیبەی كچی جەحش (رَضِي اللَّهُ عَنهَا)، لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی خوێنچركە بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێ كرد بە خۆشۆردن بۆ گشت نوێژێك.

جا خۆی نوقمی تەشتەكە دەكرد، كە پڕ بوو لە ئاو، دواتر دەردەچوو و دەهاتە دەرەوە، خوێنەكەش سەر ئاوەكە دەكەوت و نوێژی دەكرد.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

٨١٢ - «عَنِ الْقَاسِمِ، أَنَّهَا كَانَتْ بَادِيَةَ بِنْتَ غَيْلاَنَ الثَّقَفِيَّةَ»[١].

واتە: لە قاسمەوە گێڕدراوەتەوە وتویەتی: ئافرەتەكە بادیەی كچی غەیلانی ثەقەفی بووە.

٨١٣ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: إِنَّمَا هِيَ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو اسْتُحَاضَتْ، وَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ «أَمَرَهَا بِالْغُسْلِ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ، فَلَمَّا جَهَدَهَا ذَلِكَ، أَمَرَ أَنْ تَجْمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِي غُسْلٍ وَاحِدٍ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فِي غُسْلٍ وَاحِدٍ، وَتَغْتَسِلَ لِلصُّبْحِ»[٢].

واتە: لە حەزرەتی عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتەكە سەهلەی كچی سوهەیلی كوڕی عەمڕ بوو، تووشی خوێنچركە بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێ كرد بە خۆشۆردن بۆ گشت نوێژێك، جا كاتێك ئەو كارە ماندوو و بێ تاقەتی كرد فەرمانی پێ كرد كە كاتی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر كۆ بكاتەوە بە یەك خۆشۆردن (واتە: فەرمانی پێ كرد نوێژی نیوەڕۆ ئەنجام نەدات تا كۆتایی كاتی نیوەڕۆ تا نزیك عەسر، دواتر خۆی بشۆرێ و نوێژی نیوەڕۆ ئەنجام بدات و كەمێك بوەستێ تا نوێژی عەسریش دەبێت ئنجا زوو نوێژی عەسریش ئەنجام بدات)، وە فەرمانی پێ كرد كاتی نوێژی مەغریب و عیشاش كۆ بكاتەوە بە یەك خۆشۆردن، وە خۆی بشۆرێ بۆ نوێژی بەیانیش. (بەمەش دوو خۆشۆردنی لەسەر كەم دەبێتەوە).

٨١٤ - «عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: إِنَّمَا جَاءَ اخْتِلاَفُهُمْ أَنَّهُنَّ ثَلاَثَتَهُنَّ عِنْدَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: هِيَ أُمُّ حبيبةَ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: هِيَ بَادِيَةٌ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: هِيَ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلٍ»[٣].

واتە: لە سەعدی كوڕی ئیبراهیمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ڕاجیاییەكەیان (لەسەر ناوی ئەو ئافرەتە) لەوەوە هاتوە هەرسێكیان لەلای عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف بوون (هەرسێكیان خێزانی ئەو بوون)، (بۆیە) هەندێك وتویانە: ئوممو حەبیبە بووە، هەندێكی تر وتویانە: بادیە بووە، هەندێكی تر وتویانە: سەهلەی كچی سوهەیل بووە.

٨١٥ - «أَخْبَرَنَا يَحْيَى، أَنَّ الْقَعْقَاعَ بْنَ حَكِيمٍ، أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ سَأَلَ سَعِيدًا، عَنِ الْمُسْتَحَاضَةِ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي، مَا بَقِيَ أَحَدٌ أَعْلَمُ بِهَذَا مِنِّي: إِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ، فَلْتَدَعِ الصَّلاَةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَلْتَغْتَسِلْ، وَلْتُصَلِّ»[٤].

واتە: قەعقاعی كوڕی حەكیم پرسیاری لە سەعید كردووە دەربارەی ئافرەتی موستەحازە (ئەو ئافرەتەی خوێنچركەی هەیە)، سەعیدیش وتویەتی: ئەی كوڕی برام كەس نەماوە لەو شتە شارەزاتر بێت لە من، ئەگەر هەر كات حەیز و سوڕی مانگانە هات با واز لە نوێژ بهێنێت، وە ئەگەر هەر كات حەیز و سوڕی مانگانە ڕۆیشت و نەما با خۆی بشۆرێ و نوێژ بكات. (هەر چەندە خوێنیشی بەردەوام بێت، هەر دەبێت نوێژەكانی ئەنجام بدات، چونكە ئەو خوێنە حەیز نیە و كاتی حەیز نەماوە، خۆی ئەندازەو ڕۆژەكانی دەزانێت).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

٨١٦ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، فِي الْمُسْتَحَاضَةِ تَدَعُ الصَّلاَةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا، ثُمَّ تَغْتَسِلُ ثُمَّ تَحْتَشِي وَتَسْتَثْفِرُ، ثُمَّ تُصَلِّي. فَقَالَ الرَّجُلُ: وَإِنْ كَانَتْ تَسِيلُ؟ قَالَ: وَإِنْ كَانَتْ تَسِيلُ مِثْلَ هَذَا الْمَثْعَبِ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی موستەحازە، وتویەتی: واز لە نوێژ دەهێنێ ڕۆژانی حەیز و سوڕی مانگانەکەی، دواتر خۆی دەشۆرێ، دواتر لۆکە یان پارچە قوماشێکی بۆندار لە شوێنی حەیزەکەی دادەنێ (تا خوێنی لێ نەتکێ)، دواتر خۆی بە پۆشاکێک دەپێچێ، دواتر نوێژ دەکات، پیاوێکیش وتی: ئەگەر هاتوو خوێنەکەش بڕوا و جۆگەلە بکات (هەر دەبێ نوێژەکەی بکات)؟ (ئیبنو عەبباس) وتی: (بەڵێ) ئەگەرچی خوێنەکە وەک ڕێڕەو و جۆگەلە و سولاوکە بڕوا.

٨١٧ - «عَنْ عَمَّارِ بْنِ أَبِي عَمَّارٍ، قَالَ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، مِنْ أَشَدِّ النَّاسِ قَوْلاً فِي الْمُسْتَحَاضَةِ، ثُمَّ رَخَّصَ بَعْدُ: أَتَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: أَدْخُلُ الْكَعْبَةَ وَأَنَا حَائِضٌ؟. قَالَ: نَعم وَإِنْ كُنْتِ تَثُجِّينَهُ ثَجًّا، اسْتَذْخِلِي، ثُمَّ اسْتَثْفِرِي، ثُمَّ ادْخُلِي»[٢].

واتە: لە عەممارى کوڕی ئەبو عەممارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، لە توندترین فەتوادەرەکان بوو دەربارەی ئافرەتی موستەحازە (چونکە دەیووت دەبێ بۆ هەموو نوێژێک خۆی بشۆرێ)، دواتر ڕوخسەتیدا (بەوەی کاتی دوو نوێژان کۆ بکاتەوە و یەک جار بۆ هەردووکیان خۆی بشۆرێ، دانینا بەو ئاسانکاریە)، ئافرەتێک هاتە لای و وتی: ئایا بچم بۆ کەعبە لە کاتێکدا لە حەیز و سوڕی مانگانە دام؟ ئیبنو عەبباس وتی: بەڵێ، ئەگەرچی بە لێشاو خوێن ببینی (دروستە بڕۆ)، (بەڵام پێشتر ئەم کارانە ئەنجام بدە): لۆکە، یان پارچە پەڕۆکێک بخەرە شوێنی حەیزەکەت، دواتر خۆت بە پۆشاکێک بپێچە، دواتر بڕۆ ژوورەوە (بۆ ناو کەعبە).

٨١٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: سَأَلْتُهَا عَنِ الْمُسْتَحَاضَةِ، قَالَتْ: تَنْتَظِرُ أَقْرَاءَهَا الَّتِي كَانَتْ تَتْرُكُ فِيهَا الصَّلاَةَ قَبْلَ ذَلِكَ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ طُهْرِهَا الَّذِي كَانَتْ تَطْهُرُ فِيهِ، اغْتَسَلَتْ، ثُمَّ تَوَضَّأَتْ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ وَصَلَّتْ»[٣].

واتە: لە قەمیرەوە گێڕدراوەتەوە ئەویش لە دایکمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا)، گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: کە پرسیاری کردووە لە دایکمان عائیشە دەربارەی ئافرەتی موستەحازە (ئەو ئافرەتەی ماوەیەکی زۆر خوێنچرکەی هەیە)، دایکمان عائیشەش وتویەتی: (ئافرەتی موستەحازە) چاوەڕێی سوڕی مانگانەکەی دەکات کە تیایدا وازی لە نوێژ دەهێنا پێش ئەوەی خوێنچرکەی ئیستیحازەی بەسەر بێت (لەو ماوەیە نوێژەکانی ئەنجام نادات، چونکە کاتی حەیز و سوڕی مانگانەیە)، جا ئەگەر ڕۆژی پاکیەتیەکەی هات (سوڕی مانگانەکەی تیادا نامێنێت) خۆی دەشۆرێت، دواتر بۆ هەموو نوێژێک دەستنوێژ دەشۆرێت و نوێژ دەکات.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

٨١٩ - «أَخْبَرَنَا مُوسَى بْنُ خَالِدٍ، عَنْ مُعْتَمِرٍ، عَنْ إِسْمَاعِيلَ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ حَيِّهِ، عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ، مِثْلَ مَا قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا»(١).

واتە: لە ئەبو جەعفەرەوە گێڕدراوەتەوە: وەک ئەوەی عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا).

٨٢٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا فِي الْمُسْتَحَاضَةِ: تَنْتَظِرُ أَيَّامَهَا الَّتِي كَانَتْ تَتْرُكُ الصَّلاَةَ فِيهَا، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ طُهْرِهَا الَّذِي كَانَتْ تَطْهُرُ فِيهِ، اغْتَسَلَتْ ثُمَّ تَوَضَّأَتْ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ وَصَلَّتْ»(٢).

واتە: لە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی موستەحازە وتویەتی: چاوەڕێی ئەو ڕۆژانەی دەکات کە تیایدا وازی لە نوێژ دەهێنا (لەو ماوەیە نوێژەکانی ئەنجام نادات، چونکە کاتی حەیز و سوڕی مانگانەیە)، جا ئەگەر ڕۆژی پاکیەتیەکەی هات کە تیایدا لە خوێنی حەیز پاک دەبێتەوە خۆی دەشۆرێت، دواتر بۆ هەموو نوێژێک دەستنوێژ دەشۆرێت و نوێژ دەکات.

٨٢١ - «عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْمُسْتَحَاضَةُ تَدَعُ الصَّلاَةَ أَيَّامَ حَيْضِهَا فِي كُلِّ شَهْرٍ، فَإِذَا كَانَ عِنْدَ انْقِضَائِهَا، اغْتَسَلَتْ، وَصَلَّتْ، وَصَامَتْ، وَتَوَضَّأَتْ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ»(٣).

واتە: لە عەدی کوڕی سابیت گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ئافرەتی موستەحازە (کە خوێنچرکەی درێژخایەنی هەیە) واز لە نوێژ کردن دەهێنێ لە ڕۆژانی حەیزەکەی لە هەموو مانگێکدا، جا کاتێک گەیشتە کاتی نەمانی حەیزەکەی و پاک بوویەوە خۆی دەشۆرێت و نوێژ دەکات و ڕۆژوو دەگرێت و، بۆ هەموو نوێژێک دەستنوێژ دەشۆرێت.

٨٢٢ - «عَنِ الْحَسَنِ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ الَّتِي تَعْرِفُ أَيَّامَ حَيْضَتِهَا إِذَا طُلِّقَتْ فَيَطُولُ بِهَا الدَّمُ، فَإِنَّهَا تَعْتَدُّ قَدْرَ أَقْرَائِهَا ثَلاَثَ حِيَضٍ، وَفِي الصَّلاَةِ إِذَا جَاءَ وَقْتُ الْحَيْضِ فِي كُلِّ شَهْرٍ، أَمْسَكَتْ عَنِ الصَّلاَةِ»(٤).

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو ئافرەتە موستەحازەی کە ڕۆژانی حەیزەکەی دەزانێت ئەگەر تەڵاق درا و خوێن بینینی درێژ بوویەوە، ئەوە عیددە دەبینێ بە ئەندازەی سێ حەیزی خۆی، دەربارەی نوێژیش ئەگەر کاتی حەیز و سوڕی مانگانە هات لە هەموو مانگێکدا ئەوە واز لە نوێژ دەهێنێت.

٨٢٣ - «حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قُلْتُ لِقَتَادَةَ: امْرَأَةٌ كَانَ حَيْضُهَا مَعْلُومًا، فَزَادَتْ عَلَيْهِ خَمْسَةَ أَيَّامٍ، أَوْ أَرْبَعَةَ أَيَّامٍ، أَوْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، قَالَ: تُصَلِّي، قُلْتُ: يَوْمَيْنِ؟ قَالَ: ذَلِكَ مِنْ حَيْضِهَا، وَسَأَلْتُ ابْنَ سِيرِينَ قَالَ: النِّسَاءُ أَعْلَمُ بِذَلِكَ»(٥).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: موعتەمەڕ لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە وتویەتی: بە قەتادەم وت: ئافرەتێک کە (ڕۆژانی) حەیز و سوڕی مانگانەکەی دیار و ئاشکرایە و دەیزانێ، (بەڵام خوێن بینینەکەی) پێنج ڕۆژ یان چوار ڕۆژ یان سێ ڕۆژ زیاد دەبێت (چی دەکات لەو حاڵەتە ئایا نوێژ دەکات)؟ قەتادە وتی: نوێژ دەکات، وتم: (ئەی) دوو ڕۆژ؟ قەتادە وتی: ئەوە لەگەڵ حەیزەکەی حیسابە (واتە: دوو ڕۆژ ئەگەر لە حەیزەکەشی زیاتر بوو هەر نوێژ ناکات و بە سوڕی مانگانە حیسابە، بەڵام ئەگەر ماوەکە لەوە زیاتر درێژ بوویەوە و گەیشتە سێ ڕۆژ و زیاتر ئەوە سوڕی مانگانە نیە و دەبێ نوێژ بکات).

وە باوکی موعتەمەڕ دەڵێ: پرسیارم لە ئیبنو سیرین کرد وتی: ئافرەتان زاناترن بەو کارە (واتە ئەوان دەزانن هەر خوێنی حەیزە یان نا).

٨٢٤ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي الْمَرْأَةِ تَرَى الدَّمَ أَيَّامَ طُهْرِهَا قَالَ: أَرَى أَنْ تَغْتَسِلَ وَتُصَلِّيَ»[١].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو ئافرەتەی خوێن دەبینێ لە ڕۆژانی پاکیەتی (کە ڕۆژانی حەیزی تێپەڕاندووە)؟ وتویەتی: پێم وایە دەبێ خۆی بشۆرێ و نوێژ بکات.

٨٢٥ - «عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ، قَالَ: سُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنِ الْمَرْأَةِ تُسْتَحَاضُ؟ قَالَ: تَنْتَظِرُ قَدْرَ مَا كَانَتْ تَحِيضُ، فَلْتُحَرِّمِ الصَّلَاةَ، ثُمَّ لِتَغْتَسِلْ وَلْتُصَلِّ حَتَّى إِذَا كَانَ أَوَانُهَا الَّذِي تَحِيضُ فِيهِ، فَلْتُحَرِّمِ الصَّلَاةَ ثُمَّ لِتَغْتَسِلْ، فَإِنَّمَا ذَاكَ مِنَ الشَّيْطَانِ يُرِيدُ أَنْ يُكْفِرَ إِحْدَاهُنَّ»[٢].

واتە: لە شەهری کوڕی حەوشەبە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیار لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، کرا دەربارەی ئافرەت کە تووشی ئیستیحازە دەبێ؟ وتی: چاوەڕێ دەکات بە ئەندازەی پێشتر کە تووشی حەیز دەبوو، با نوێژ حەرام بکات (نوێژ نەکات لەو ماوەیەدا)، دواتر (کە ئەندازەی حەیزەکەی تەواو بوو) با خۆی بشۆرێ و نوێژ ئەنجام بدات تا دەگاتەوە ئەو کاتەی تیایدا تووشی حەیز دەبێت با (دووبارە ئەوکات) نوێژ حەرام بکات (لە خۆی و با نوێژ نەکات)، (کەواتە: جگە لە کاتی حەیز و ئەندازەکەی ناکرێت ئافرەت واز لە نوێژ بهێنێت بە بەهانەی درێژ بوونەوەی حەیز، چونکە) ئەوە لە شەیتانەوەیە، دەیەوێ یەکێک لە ئافرەتان کافر بکات (بە نەکردنی نوێژ و بەهانەیان بۆ دەدۆزێتەوە).

٨٢٦ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ أَبِي جَعْفَرٍ، أَنَّهُ: قَالَ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ: تَدَعُ الصَّلَاةَ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا، ثُمَّ تَغْتَسِلُ وَتَحْتَشِي كُرْسُفًا، وَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ»[٣].

واتە: لە (ئەبو جەعفەرەوە) موحەممەدی کوڕی عەلی گێڕدراوەتەوە کە دەربارەی ئافرەتی موستەحازە وتویەتی: واز لە نوێژ دەهێنێت ڕۆژانی سوڕی مانگانەی، دواتر خۆی دەشۆرێت و پارچە لۆکەیەک لە شوێنی حەیزەکەی دادەنێت و دەستنوێژ بۆ گشت نوێژێک دەشۆرێت.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٨٢٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: الْمُسْتَحَاضَةُ تَجْلِسُ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا. ثُمَّ تَغْتَسِلُ غُسْلاً وَاحِدًا، وَتَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلاَةٍ»[(١)].

واتە: لە دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە کە خوێنچڕکەی هەیە ڕۆژانی حەیزەکەی دادەنیشێت (نوێژ ناکات)، دواتر (کە پاک بوویەوە) یەک غوسل دەکات و دەستنوێژ دەشۆرێت بۆ هەموو نوێژێک.

٨٢٨ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ، قَالَ: اسْتُحِيضَتْ امرأَةٌ مِنْ آلِ أَنَسٍ ﷺ فَأَمَرُونِي، فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَقَالَ: أَمَّا مَا رَأَتِ الدَّمَ الْبَحْرَانِيَّ، فَلاَ تُصَلِّي، فَإِذَا رَأَتِ الطُّهْرَ وَلَوْ سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، فَلْتَغْتَسِلْ وَلْتُصَلِّ»[(٢)].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی سیرین گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێک لە خانەوادەی ئەنەس ﷺ تووشی خوێنچڕکە بوو، ئەوانیش فەرمانیان بە من کرد (تا پرسیاریان بۆ بکەم)، منیش پرسیارم لە ئیبنو عەبباس کرد، ئەویش وتی: ئەگەر خوێنی یەکجار زۆر دەبینێ ئەوە نوێژ ناکات، جا ئەگەر پاک بوویەوە ئەگەرچی کاتێکی زۆر کەمیش بێت لە ڕۆژدا ئەوە دەبێ خۆی بشۆرێ و نوێژ بکات.

٨٢٩ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ، قَالَ: كَانَتْ أُمُّ وَلَدٍ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ اسْتُحِيضَتْ فَأَمَرُونِي أَنْ أَسْتَفْتِيَ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: إِذَا رَأَتِ الدَّمَ الْبَحْرَانِيَّ، فَلاَ تُصَلِّي، فَإِذَا رَأَتِ الطُّهْرَ، فَلْتَغْتَسِلْ وَلْتُصَلِّ»[(٣)].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی سیرین گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خێزانێکی ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ تووشی خوێنچڕکە بوو، ئەوانیش فەرمانیان بە من کرد تا پرسیاریان بۆ لە ئیبنو عەبباس بکەم، منیش پرسیارم لە ئیبنو عەبباس کرد، ئەویش وتی: ئەگەر خوێنی یەکجار زۆر دەبینێ ئەوە نوێژ ناکات، جا ئەگەر پاک بوویەوە ئەگەرچی کاتێکی زۆر کەمیش بێت لە ڕۆژدا ئەوە دەبێ خۆی بشۆرێ و نوێژ بکات.

٨٣٠ - «عَنِ الضَّحَّاكِ، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْهُ فَقَالَتْ: إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ، فَقَالَ: إِذَا رَأَيْتِ دَمًا عَبِيطًا، فَأَمْسِكِي أَيَّامَ أَقْرَائِكِ»[(٤)].

واتە: لە ضەححاک گێڕدراوەتەوە کە ئافرەتێک پرسیاری لێ کردووە و وتویەتی: من ئافرەتێکم تووشی خوێنچڕکە دەبم (چی بکەم)؟ وتی: ئەگەر خوێنی سور و گەش و زۆرت بینی (پاشی ئەندازەی حەیزەکەت) ئەوە واز لە نوێژ بهێنە ڕۆژانی سوری مانگانەتە (واتە: ئەوەش بە سوری مانگانەت ئەژمار دەکرێت و نوێژت لەسەر نیە، چونکە ئەوە حەیزەکەتە تۆزێک درێژ بۆتەوە).

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

٨٣١ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: الْمُسْتَحَاضَةُ تَجْلِسُ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا، ثُمَّ تَغْتَسِلُ لِلظُّهْرِ، وَالْعَصْرِ غُسْلاً وَاحِدًا، وَتُؤَخِّرُ الْمَغْرِبَ، وَتُعَجِّلُ الْعِشَاءَ، وَذَلِكَ فِي وَقْتِ الْعِشَاءِ، وَلِلْفَجْرِ غُسْلاً وَاحِدًا، وَلاَ تَصُومُ، وَلاَ يَأْتِيهَا زَوْجُهَا، وَلاَ تَمَسُّ الْمُصْحَفَ»[١].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە (کە خوێنچڕکەی هەیە) دادەنیشێت لە ڕۆژانی سوڕی مانگانەیدا و (نوێژ ناکات)، دواتر (کە ئەندازەی سوڕی مانگانەی تێپەڕی و هەر خوێنی بینی) ئەوە بۆ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر یەک غوسل دەکات، هەروەها نوێژی مەغریبیش تاخیر دەکات (تا نزیکی عیشا، ئنجا خۆی دەشۆرێت و نوێژەکە ئەنجام دەدات) و نوێژی عیشاش زوو ئەنجام دەدات لە کاتی عیشادا، وە بۆ نوێژی بەیانیش غوسلێک دەکات، بە ڕۆژوش نابێت و هاوسەرەکەشی سەرجێیی لەگەڵ ناکات و دەستیش لە قوڕئان نادات.

٨٣٢ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يَقُولُ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ: « تَغْتَسِلُ غُسْلاً وَاحِدًا لِلظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَغُسْلاً لِلْمَغْرِبِ، وَالْعِشَاءِ، وَكَانَ يَقُولُ: تُؤَخِّرُ الظُّهْرَ، وَتُعَجِّلُ الْعَصْرَ، وَتُؤَخِّرُ الْمَغْرِبَ، وَتُعَجِّلُ الْعِشَاءَ»[٢].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، دەربارەی ئافرەتی موستەحازە دەیووت: خۆی دەشۆرێ بە یەک غوسل بۆ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر، وە غوسلێکیش دەکات بۆ مەغریب و عیشا، وە دەیوت: نیوەڕۆ تاخیر دەکات (تا نزیکی عەسر) و عەسریش زوو دەکات (کاتێ کاتەکەی هات)، وە مەغریبیش تاخیر دەکات (تا نزیکی عیشا) و عیشاش زوو دەکات (کە کاتەکەی هات).

٨٣٣ - «عَنْ مُجَاهِدٍ، فِي الْمُسْتَحَاضَةِ إِذَا خَلَفَتْ قُرُوءَهَا، فَإِذَا كَانَ عِنْدَ الْعَصْرِ، تَوَضَّأَتْ وُضُوءًا سَابِغًا، ثُمَّ لِتَأْخُذْ ثَوْبًا، فَلْتَسْتَثْفِرْ بِهِ، ثُمَّ لِتُصَلِّ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ لِتَفْعَلْ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ لِتُصَلِّ الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا، ثُمَّ لِتَفْعَلْ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ لِتُصَلِّ الصُّبْحَ»[٣].

واتە: لە موجاهید گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی موستەحازە (کە خوێنچڕکەی هەیە) ئەگەر حەیزەکەی جێ هێشت و (کاتی حەیزی تەواو کرد و هەر خوێنیشی بینی)، ئەوە هەر کات نوێژی عەسر هات دەستنوێژێک دەشۆرێ دەستنوێژێکی تەواو، دواتر با پۆشاکێک بهێنێ و خۆی پێ بپێچێ، دواتر با نوێژی نیوەڕۆ و عەسر بەیەکەوە ئەنجام بدات (واتە: با هەر یەکەیان لە کاتی خۆی ئەنجام بدات بەڵام با لەیەکتریان نزیک بکاتەوە، بەوەی نوێژی نیوەڕۆ تاخیر بکات و عەسریش زوو بکات)، دواتر با نوێژی مەغریب و عیشاش بەیەکەوە ئەنجام بدات، دواتر با وەک پێشەوە ڕەفتار بکات (وەک نیوەڕۆ و عەسرەکە)، دواتر با نوێژی بەیانیش ئەنجام بدات (دوای خۆشۆردن).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٨٣٤ - «عَنْ عَطَاءٍ، وَسَعِيدٍ، وَعِكْرِمَةَ، قَالُوا: فِي الْمُسْتَحَاضَةِ: تَغْتَسِلُ كُلَّ يَوْمٍ لِصَلَاةِ الْأُولَى وَالْعَصْرِ، فَتُصَلِّيهِمَا، وَتَغْتَسِلُ لِلْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ فَتُصَلِّيهِمَا، وَتَغْتَسِلُ لِصَلَاةِ الْغَدَاةِ»[١].

واتە: لە عەطاء و سەعید و عیكریمە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی موستەحازە وتویانە: هەموو ڕۆژێک خۆی دەشۆرێ بۆ نوێژی یەكەم و عەسر (واتە: نیوەڕۆ و عەسر)، با هەردوو نوێژەكان ئەنجام بدەن (لە كاتێكی نزیكی یەكتری)، وە خۆی دەشۆرێ بۆ مەغریب و عیشا و هەردوو نوێژەكە ئەنجام دەدات (لە كاتێكی نزیكی یەكتری)، وە خۆی دەشۆرێ بۆ نوێژی بەیانیش.

٨٣٥ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادٍ، قَالَ الْمُسْتَحَاضَةُ تَغْتَسِلُ، ثُمَّ تَجْمَعُ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، فَإِنْ رَأَتْ شَيْئًا اغْتَسَلَتْ وَجَمَعَتْ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ»[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی شەدداد گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە خۆی دەشۆرێ، دواتر نوێژی نیوەڕۆ و عەسر كۆ دەكاتەوە (بە تاخیر كردنی نیوەڕۆ و زوو ئەنجامدانی عەسر، هەر یەكەیان لە كاتی خۆی)، جا ئەگەر شتێكی بینی (خوێنی بینی) خۆی دەشۆرێت (دووبارە)، وە نوێژی مەغریب و عیشاش كۆ دەكاتەوە.

## بابەت: ئەوانەی وتویانە ئافرەتی موستەحازە خۆی دەشۆرێ لە نیوەڕۆ بۆ نیوەڕۆ (واتە: ڕۆژانە یەک جار خۆی دەشۆرێ) و سەر جێیی دەكات و بە ڕۆژوش دەبێت

٨٣٦ - «عَنْ سُمَيٍّ، قَالَ: سَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ الْمُسَيِّبِ، عَنِ الْمُسْتَحَاضَةِ، فَقَالَ: تَجْلِسُ أَيَّامَ أَقْرَائِهَا، وَتَغْتَسِلُ مِنَ الظُّهْرِ إِلَى الظُّهْرِ، وَتَسْتَذْفِرُ بِثَوْبٍ، وَيَأْتِيهَا زَوْجُهَا، وَتَصُومُ، فَقُلْتُ: عَمَّنْ هَذَا؟ فَأَخَذَ الْحَصَا»[٣].

واتە: لە سومەییە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە سەعیدی كوڕی موسەییب كرد دەربارەی ئافرەتی موستەحازە، ئەویش وتی: لە ڕۆژانی حەیزی دادەنیشێت (هیچ ناكات نە نوێژ و نە ڕۆژوو و نە سەرجێیی)، وە (لە ڕۆژانی دوای سوڕی مانگانەی) خۆی دەشۆرێت لە نیوەڕۆ بۆ نیوەڕۆ (واتە: ڕۆژانە یەک جار خۆی دەشۆرێت لە كاتی نیوەڕۆ و تا نیوەڕۆی ڕۆژێكیتر خۆی ناشۆرێتەوە) و ناو ڕانی خۆی بە جلێک دەبەستێت و دەچێتە لای هاوسەرەكەی (سەر جێیی بۆ دروستە) و بە ڕۆژوش دەبێت، (سومەیی دەڵێ:) منیش وتم: ئەوەت لە كێ وەرگرتووە؟ سەعیدیش هەندێ وردە بەردی هەڵگرت (واتە: ئەوە دەڵێی گومانت لێم هەیە! یان واتای ئەوەیە لە خەڵكانی زۆرم وەرگرتووە وەک ئەم چەنگە زیخە ژمارەیان زۆرە، یانیش ئەوەیە بڵێت لە خەڵكانی زۆرم وەرگرتووە بەهۆی گەڕانم لەم زەویە بەدوای فەرموودەدا، والله أعلم).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٨٣٧ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، قَالَ: تَغْتَسِلُ مِنْ ظُهْرٍ إِلَى ظُهْرٍ، وَتَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلاَةٍ، فَإِنْ غَلَبَهَا الدَّمُ اسْتَثْفَرَتْ وَكَانَ الْحَسَنُ يَقُولُ ذَلِكَ»[١].

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەییبە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (ئافرەتی موستەحازە) خۆی دەشۆرێ لە نیوەڕۆ بۆ نیوەڕۆ (واتە: تەنها یەک جار لە كاتی نیوەڕۆ خۆی دەشۆرێ) و دەستنوێژ بۆ گشت نوێژێک دەشۆرێ، جا ئەگەر خوێن بەسەریدا زاڵ بوو (خوێنی زۆری بینی) ئەوە ناو ڕانی دەپێچێت (تا خوێنەكە نەپرژێت)، وە حەسەنیش ئاوای دەوت (هەمان بۆچوونی هەبوو).

٨٣٨ - «يَحْيَى، أَنَّ سُمَيًّا، مَوْلَى أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّ الْقَعْقَاعَ بْنَ حَكِيمٍ، وَزَيْدَ بْنَ أَسْلَمَ، أَرْسَلاَهُ إِلَى سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ يَسْأَلُهُ كَيْفَ تَغْتَسِلُ الْمُسْتَحَاضَةُ. فَقَالَ سَعِيدٌ: تَغْتَسِلُ مِنَ الظُّهْرِ إِلَى مِثْلِهَا مِنَ الْغَدِ لِصَلاَةِ الظُّهْرِ، فَإِنْ غَلَبَهَا الدَّمُ اسْتَثْفَرَتْ، وَتَوَضَّأَتْ لِكُلِّ صَلاَةٍ، وَصَلَّتْ»[٢].

واتە: لە یەحیا گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سومەیی بەندەی ئەبو بەكری كوڕی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی هیشام هەواڵی پێ داوە كە قەعقاعی كوڕی حەكیم و زەیدی كوڕی ئەسلەم ئەویان ناردووە بۆ لای سەعیدی كوڕی موسەییب تا پرسیاری لێ بكات كە ئاخۆ ئافرەتی موستەحازە چۆن خۆی دەشۆرێ، سەعید وتی: خۆی دەشۆرێ لە نیوەڕۆدا تا هەمان كات لە ڕۆژی دواتر بۆ نوێژی نیوەڕۆ، جا ئەگەر خوێن بەسەریدا زاڵ بوو (زۆر خوێنی دەبینی) نێوان ڕانەكانی دەبەستێت و بۆ گشت نوێژێک دەستنوێژ دەشۆرێت و نوێژ دەكات.

٨٣٩ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي الْمُسْتَحَاضَةِ، تَغْتَسِلُ مِنْ صَلاَةِ الظُّهْرِ إِلَى صَلاَةِ الظُّهْرِ مِنَ الْغَدِ»[٣].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی موستەحازە وتویەتی: خۆی دەشۆرێ لە نوێژی نیوەڕۆ بۆ نوێژی نیوەڕۆ لە ڕۆژی دواتر (واتە: ڕۆژانە یەک جار خۆی دەشۆرێ، ئەویش لە كاتی نوێژی نیوەڕۆ).

٨٤٠ - «عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: الْمُسْتَحَاضَةُ تَدَعُ الصَّلاَةَ أَيَّامَ حَيْضِهَا مِنَ الشَّهْرِ، ثُمَّ تَغْتَسِلُ مِنَ الظُّهْرِ إِلَى الظُّهْرِ، وَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ، وَتَصُومُ وَتُصَلِّي، وَيَأْتِيهَا زَوْجُهَا»[٤].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە واز لە نوێژ دەهێنێت لە ڕۆژانی حەیزی لە مانگدا، دواتر خۆی دەشۆرێت لە نیوەڕۆ بۆ نیوەڕۆ، وە دەستنوێژ دەشۆرێت بۆ گشت نوێژیک و بە ڕۆژوو دەبێت و نوێژ دەكات و هاوسەرەكەی سەرجێیی لەگەڵ دەكات (واتە: هەموو ئەو شتانەی بۆ دروستە).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

٨٤١ - «عَنِ الْحَسَنِ، وَعَطَاءٍ، مِثْلَ ذَلِكَ»[١].

واتە: لە حەسەن و عەتائەوە هەمان شت گێڕدراوەتەوە.

٨٤٢ - «عَنْ قَمِيرَ، امْرَأَةِ مَسْرُوقٍ أَنَّ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ: تَغْتَسِلُ كُلَّ يَوْمٍ مَرَّةً»[٢].

واتە: لە قەمیری خێزانی مەسروق گێڕدراوەتەوە کە عائیشە (رَضِي اللهُ عَنْهَ)، دەربارەی ئافرەتی موستەحازە وتویەتی: خۆی دەشۆرێت هەموو ڕۆژێک یەک جار.

٨٤٣ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: الْمُسْتَحَاضَةُ تَغْتَسِلُ مِنْ ظُهْرٍ إِلَى ظُهْرٍ قَالَ مَرْوَانُ: وَهُوَ قَوْلُ الْأَوْزَاعِيِّ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، کە وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە خۆی دەشۆرێ لە نیوەڕۆوە بۆ نیوەڕۆ (واتە: یەک جار خۆی لە کاتی نیوەڕۆ دەشۆرێ)، مەڕوان وتویەتی: ئەوە بۆچوونی ئەوزاعیشە.

٨٤٤ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، قَالَ: الْمُسْتَحَاضَةُ تَغْتَسِلُ كُلَّ يَوْمٍ عِنْدَ صَلَاةِ الْأُولَى»[٤].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییب گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە خۆی دەشۆرێ هەموو ڕۆژێک لە کاتی نوێژی یەکەم (واتە کاتی نیوەڕۆ).

## بابەت: ئەوانەی وتویانە: ئافرەتی موستەحازە پیاوەکەی سەرجێیی لەگەڵ دەکات (واتە: سەرجێیی بۆ دروستە)

٨٤٥ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا فِي الْمُسْتَحَاضَةِ لَمْ يَرَ بَأْسًا أَنْ يَأْتِيَهَا زَوْجُهَا»[٥].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی موستەحازە کە پێی وانەبووە هیچی تیابێت کە هاوسەرەکەی بچێتە لای بۆ سەرجێیی کردن.

٨٤٦- «عَنْ سَالِمٍ الْأَفْطَسِ، قَالَ: سُئِلَ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ، أَتُجَامَعُ الْمُسْتَحَاضَةُ؟ فَقَالَ: الصَّلَاةُ أَعْظَمُ مِنَ الْجِمَاعِ»[٦].

---

١() ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ موقوف صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

(٦) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە سالیمی ئەفتەس گێردراوەتەوە، وتویەتی: سەعیدی كوڕی جوبەیر پرسیاری لێكرا كە ئایا سەرجێیی لەگەڵ ئافرەتی موستەحازەدا دەكرێت (ئایا دروستە)؟ ئەویش وتی: نوێژ لە سەرجێیی و جیماع گەورەترە (واتە: مادەم نوێژ بكات و لێی حەڕام نەبێت، ئەوە جیماعیشی بۆ دروستە و لێی حەڕام نیە).

٨٤٧ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، قَالَ: يَأْتِيهَا زَوْجُهَا»[١].

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەییب گێردراوەتەوە، وتویەتی: (ئافرەتی موستەحازە) هاوسەرەكەی دەچێتە لای (سەرجێیی بۆ دروستە).

٨٤٨ - «عَنِ الْحَسَنِ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ قَالَ: يَغْشَاهَا زَوْجُهَا»[٢].

واتە: لە حەسەن گێردراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی موستەحازە وتویەتی: هاوسەری لەگەڵی تێكەڵ دەبێت (واتە: جیماعیان بۆ دروستە).

٨٤٩ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ: يَغْشَاهَا زَوْجُهَا وَإِنْ قَطَرَ الدَّمُ عَلَى الْحَصِيرِ»[٣].

واتە: لە سەعیدی كوڕی جوبەیر گێردراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی موستەحازە وتویەتی: هاوسەرەكەی لەگەڵی تێكەڵ دەبێت (جیماعیان بۆ دروستە) ئەگەرچی خوێن بڕژێتە سەر ڕایەخیش (واتە: هەر چەندە خوێنەكەی زۆر بێت هەر دروستە جیماع بكەن، چونكە ئەوە خوێنی حەیز نیە).

٨٥٠ - «عَنْ حُمَيْدٍ، قَالَ: قِيلَ لِبَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، إِنَّ الْحَجَّاجَ بْنَ يُوسُفَ يَقُولُ: إِنَّ الْمُسْتَحَاضَةَ لاَ يَغْشَاهَا زَوْجُهَا. قَالَ: بَكْرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْمُزَنِيُّ الصَّلاَةُ أَعْظَمُ حُرْمَةً، يَغْشَاهَا زَوْجُهَا»[٤].

واتە: لە حومەید گێردراوەتەوە، وتویەتی: بە بەكری كوڕی عەبدوڵڵا وترا: حەججاجی كوڕی یوسف دەڵێت: ئافرەتی موستەحازە پیاوەكەی ناچێتە لای (جیماعیان بۆ دروست نیە)، بەكری كوڕی عەبدوڵڵای موزەنی وتی: نوێژ حەڕامیەتی گەورەترە (كەچی لەسەریشی حەڕام نیە) هاوسەرەكەی دەچێتە لای و (جیماعیان بۆ دروستە).

٨٥١ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: يَأْتِيهَا زَوْجُهَا»[٥].

واتە: لە حەسەن گێردراوەتەوە، وتویەتی: (ئافرەتی موستەحازە) هاوسەرەكەی دەچێتە لای.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده منقطع.

(٥) ـ إسناده صحيح.

٨٥٢ - «عَطَاءٍ قَالَ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ: يُجَامِعُهَا زَوْجُهَا، تَدَعُ الصَّلاَةَ أَيَّامَ حَيْضِهَا، فَإِذَا حَلَّتْ لَهَا الصَّلاَةُ، فَلْيَطَأْهَا»[١].

واتە: عەطاء دەربارەی ئافرەتی موستەحازە وتویەتی: هاوسەرەکەی لەگەڵی کۆدەبێتەوە، واز لە نوێژ دەهێنێ لە ڕۆژانی سوری مانگانەکەی، وە ئەگەر نوێژی بۆ حەڵاڵ بوویەوە با هاوسەرەکەی سەر جێیی لەگەڵ بکات.

٨٥٣ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: الْمُسْتَحَاضَةُ يُجَامِعُهَا زَوْجُهَا»[٢].

واتە: لە ئیمامی عەلی ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە هاوسەرەکەی لەگەڵی جووت دەبێت (جیماعیان بۆ دروستە).

٨٥٤ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَالْحَسَنِ، وَعَطَاءٍ، قَالُوا فِي الْمُسْتَحَاضَةِ: تَغْتَسِلُ وَتُصَلِّي، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَيَغْشَاهَا زَوْجُهَا»[٣].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییب و حەسەن و عەطانەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی موستەحازە وتویانە: خۆی دەشۆرێت و نوێژ دەکات و ڕەمەزان بە ڕۆژوو دەبێت و پیاوەکەی دەچێتە لای.

## بابەت: ئەوانەی وتویانە هاوسەری ئافرەتی موستەحازە نابێ سەرجێیی لەگەڵ بکات

٨٥٥ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: كَانَ يَقُولُ: الْمُسْتَحَاضَةُ لاَ يَغْشَاهَا زَوْجُهَا قَالَ أَبُو النُّعْمَانِ: قَالَ لِي يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ الْقَطَّانُ: لاَ أَعْلَمُ أَحَدًا قَالَ هَذَا عَنِ الْحَسَنِ»[٤].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە هاوسەرەکەی جیماعی لەگەڵ ناکات، ئەبو نوعمان وتویەتی: یەحیای کوڕی سەعیدی قەططان پێی وتووم: نەمزانیوە کەس ئەو قسەیە لە حەسەنەوە بگێڕێتەوە، (لەبەر ئەوەی لە ڕوایەتەکانی دیکەی حەسەن ڕەئی جیاوازە و پێی وایە دروستە سەرجێیی کردن).

٨٥٦ - «عَنْ خَالِدٍ، قَالَ: كَانَ مُحَمَّدٌ يَكْرَهُ أَنْ يَغْشَى الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ وَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ»[٥].

واتە: لە خالید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: موحەممەد پێی باش نەبووە (بە کارێکی خراپی دەزانی) پیاو جووت ببێت لەگەڵ خێزانەکەی لەکاتێکدا کە موستەحازەیە (خوێنچڕکەی هەیە).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

٨٥٧ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: الْمُسْتَحَاضَةُ لاَ يَأْتِيهَا زَوْجُهَا، وَلاَ تَصُومُ، وَلاَ تَمَسُّ الْمُصْحَفَ»[1].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە هاوسەرەکەی ناچێتە لای (لەگەڵی جووت نابێت) و بە ڕۆژوو نابێت و دەست لە قورئانیش نادات.

٨٥٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: الْمُسْتَحَاضَةُ لاَ يَأْتِيهَا زَوْجُهَا»[2].

واتە: لە دایکمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە هاوسەرەکەی ناچیتە لای (لەگەڵی جووت نابێت).

٨٥٩ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: كَانَ يُقَالُ: الْمُسْتَحَاضَةُ لاَ تُجَامَعُ، وَلاَ تَصُومُ، وَلاَ تَمَسُّ الْمُصْحَفَ، إِنَّمَا رُخِّصَ لَهَا فِي الصَّلاَةِ قَالَ يَزِيد: يُجَامِعُهَا زَوْجُهَا، وَيَحِلُّ لَهَا مَا يَحِلُّ لِلطَّاهِرِ»[3].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە جیماعی لەگەڵ ناکرێت و بە ڕۆژوو نابێت و دەست لە قورئان نادات، تەنها لە نوێژدا ڕێگای پێ دراوە (تەنها نوێژ دەکات)، یەزید وتویەتی: هاوسەرەکەی لەگەڵی جووت دەبێت و بۆی حەڵاڵە هەموو ئەو شتانەی کە بۆ کەسێکی پاک حەڵاڵە. (ئەم دوو زانا بەڕێزە ڕاجیاوازن لەم بارەوە)

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی زۆرترین ماوەی حەیز (سوڕی مانگانە)

٨٦٠ - «عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: تُمْسِكُ الْمَرْأَةُ عَنِ الصَّلاَةِ فِي حَيْضِهَا سَبْعًا، فَإِنْ طَهُرَتْ، فَذَاكَ، وَإِلاَ أَمْسَكَتْ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْعَشْرِ، فَإِنْ طَهُرَتْ، فَذَاكَ، وَإِلاَ اغْتَسَلَتْ وَصَلَّتْ، وَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ»[4].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەت واز لە نوێژ دەهێنێت لە ماوەی سوڕی مانگانەکەی کە حەوت ڕۆژە، جا ئەگەر خاوێن بوویەوە ئەوە تەواو، ئەگەرنا (خاوێن نەبوویەوە) ئەوە هەر واز لە نوێژ دەهێنێت لەو ماوەیەو تا دەگاتە دە ڕۆژ، جا ئەگەر خاوێن بوویەوە ئەوە تەواو، ئەگەرنا (هەر خاوێن نەبوویەوە) ئەوە خۆی دەشۆرێت و نوێژ دەکات، ئەوە خوێنچڕکەی هەیە (چیتر بە حەیز حیساب ناکرێت، کەواتە: زۆرترین ماوەی حەیز لەلای حەسەن دە ڕۆژە).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

٨٦١ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: الْحَيْضُ عَشْرٌ، فَمَا زَادَ فَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ»[١].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (زۆرترین ماوەی) سوڕی مانگانە دە ڕۆژە، ئەوەی زیاد بوو لەو دە ڕۆژە ئەوە موستەحازەیە (خوێنچڕکەی نەخۆشیە).

٨٦٢ - «وَقَالَ عَطَاءٌ، الْحَيْضُ خَمْسَةَ عَشَرَ»[٢].

واتە: عەطاء وتویەتی: سوڕی مانگانە پازدە (١٥) ڕۆژە.

٨٦٣ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: الْحَيْضُ عَشَرَةٌ، فَمَا زَادَ فَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ»[٣].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سوڕی مانگانە دە ڕۆژە، ئەوەی زیاد بوو لەو دە ڕۆژە ئەوە موستەحازەیە (خوێنچڕکەیە).

٨٦٤ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: الْحَيْضُ إِلَى ثَلاَثَ عَشْرَةَ، فَمَا زَادَ فَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ»[٤].

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سوڕی مانگانە سێزدە ڕۆژە، ئەوەی زیاد بوو لەو سێزدە ڕۆژە ئەوە موستەحازەیە (خوێنچڕکەیە).

٨٦٥ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: الْحَيْضُ عَشْرَةُ أَيَّامٍ، ثُمَّ هِيَ مُسْتَحَاضَةٌ»[٥].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سوڕی مانگانە دە ڕۆژە، دواتر موستەحازەیە (خوێنچڕکەی نەخۆشیە).

٨٦٦ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: الْحَيْضُ إِلَى ثَلاَثَةَ عَشَرَ يَوْمًا، فَمَا سِوَى ذَلِكَ فَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ»[٦].

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (زۆرترین ماوەی) سوڕی مانگانە تا سێزدە ڕۆژە، جا جگە لەو ماوەیە موستەحازەیە (خوێنچڕکەیە).

٨٦٧ - «عَنِ الْحَسَنِ ﷺ، قَالَ: إِذَا رَأَتِ الدَّمَ فَإِنَّهَا تُمْسِكُ عَنِ الصَّلاَةِ، تَعُدُّ أَيَّامَ حَيْضِهَا يَوْمًا أَوْ يَوْمَيْنِ، ثُمَّ هِيَ بَعْدَ ذَلِكَ مُسْتَحَاضَةٌ»[٧].

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف جداً.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) إسناده ضعيف جداً.

(٦) ـ إسناده صحيح.

(٧) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە حەسەن ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەت ئەگەر خوێنی بینی (پاشی ماوەی سوڕی مانگانەکەی) ئەوە واز لە نوێژ دەهێنێ ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژەکانی سوڕی مانگانە ئەژماری دەکات، دواتر خوێنەکە (ئەگەر هەر بەردەوام بوو) ئەوە موستەحازەیە (دەبێ نوێژەکانی بکات).

٨٦٨ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: الْمُسْتَحَاضَةُ تَنْتَظِرُ ثَلَاثًا، أَرْبَعًا، خَمْسًا، سِتًّا، سَبْعًا، ثَمَانِيًا، تِسْعًا، عَشْرًا»[١].

واتە: لە ئەنەس ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە سێ ڕۆژ یان چوار ڕۆژ یان پێنج ڕۆژ یان شەش ڕۆژ یان حەوت ڕۆژ یان هەشت ڕۆژ یان نۆ ڕۆژ یان دە ڕۆژ چاوەڕێ دەکات (تا ئەو دە ڕۆژەش هەر دەکرێ سوڕی مانگانەکەی بێت و درێژ بووبێتەوە).

٨٦٩ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: بَلَغَنَا أَنَّ الْمُسْتَحَاضَةَ تَنْتَظِرُ أَعْلَى أَقْرَائِهَا بِيَوْمٍ»[٢].

واتە: لە عەطائەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێمان گەیشتووە کە ئافرەتی موستەحازە ئەوپەڕی چاوەڕێ بکات یەک ڕۆژی زیاترە بەسەر ماوەی سوڕی مانگانەکەی.

٨٧٠ - «أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، يَقُولُ: مَا زَادَ عَلَى الْعَشْرَةِ فَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ»[٣].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گێردراوەتەوە، کە دەیوت: ئەو (خوێنەی) زیاتر بوو لە دە ڕۆژ ئەوە (خوینی) موستەحازەیە.

٨٧١ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: أَقْصَى الْحَيْضِ خَمْسَ عَشْرَةَ»[٤].

واتە: لە عەطائەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەوپەڕی (ماوەی) سوڕی مانگانە پازدە (١٥) ڕۆژە.

## بابەت: دەربارەی کەمترین ماوەی سوڕی مانگانە

٨٧٢ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: أَدْنَى الْحَيْضِ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ» سُئِلَ عَبْدُ اللَّهِ الدَّارِمِيُّ: تَأْخُذُ بِهَذَا؟ قَالَ: نَعم إِذَا كَانَ عَادَتَهَا، وَسَأَلْتُهُ أَيْضًا عَنْ هَذَا؟ قَالَ: أَقَلُّ الْحَيْضِ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَأَكْثَرُهُ خَمْسَ عَشْرَةَ»[٥].

واتە: لە ئەنەس ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: کەمترینی (ماوەی) سوڕی مانگانە سێ ڕۆژە.

پرسیار لە عەبدوڵلای داریمی کرا (وترا): ئەوە وەردەگری (کار بەو وتەیە دەکەی)؟ وتی: بەڵێ ئەگەر عادەتی ئافرەتەکە ئاوا بوو (واتە: ئەگەر بە عادەتی خۆی سێ ڕۆژان دەکەوتە سوڕی مانگانە)،

---

(١) ـ إسناده ضعيف جداً.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

وە هەروەها پرسیارم دەربارەی ئەوە كردووە (واتە: دەربارەی كەمترین ماوەی سوڕی مانگانە)، وتی: كەمترینی سوڕی مانگانە شەو و ڕۆژێكە و زۆرترینیشی پازدە (١٥) ڕۆژە.

٨٧٣ - «عَنِ الْحَسَنِ ﵀، قَالَ: أَدْنَى الْحَيْضِ ثَلاَثٌ»[١].

واتە: لە حەسەن ﵀ گێردراوەتەوە، وتویەتی: كەمترینی (ماوەی) سوڕی مانگانە سێ ڕۆژە.

٨٧٤ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: أَدْنَى الْحَيْضِ يَوْمٌ»[٢].

واتە: لە عەطائەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: كەمترینی (ماوەی) سوڕی مانگانە یەک ڕۆژە.

٨٧٥ - «عَنِ الْحَسَنِ ﵀، قَالَ: إِذَا رَأَتِ الدَّمَ قَبْلَ حَيْضِهَا يَوْمًا، أَوْ يَوْمَيْنِ فَهُوَ مِنَ الْحَيْضِ»[٣].

واتە: لە حەسەن ﵀ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر (ئافرەت) خوێنی بینی پێشی كاتی سوڕی مانگانەی بە ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ (پێشتر) ئەوە بە سوڕی مانگانە ئەژمار دەكرێت.

## بابەت: دەربارەی كچ (كە تازە تووشی سوڕی مانگانە دەبێت) و خوێنی بەردەوام دەبێت

٨٧٦ - «عن قيس بن سعيد وعنْ عَطَاءٍ، أَنَّهُمَا: قَالاَ فِي الْبِكْرِ إِذَا نَفِسَتْ فَاسْتُحِيضَتْ قَالاَ: تُمْسِكُ عَنِ الصَّلاَةِ، مِثْلَ مَا تُمْسِكُ الْمَرْأَةُ مِنْ نِسَائِهَا»[٤].

واتە: لە قەیسی كوڕی سەعید و عەطائەوە گێردراوەتەوە، هەردووكیان دەربارەی كچ كاتێ تووشی سوڕی مانگانە دەبێت و خوێنەكەی بەردەوام دەبێت، وتویانە: واز لە نوێژ دەهێنێ وەک ئەو ماوەیەی ئافرەتێک لە ئافرەتانی هاو تەمەنی خۆی وازی لێ دەهێنن (واتە: ئەو كچەی كە یەكەم جار دەكەوێتە سوڕی مانگانە نازانێت ماوەكەی چەندە، بۆیە با خۆی تەقلیدی ئافرەتێكی هاوشێوەی خۆی بكات لە تەمەندا و بە ئەندازەی ماوەكەی ئەو واز لە نوێژ بهێنێت، خوێنەكەی دوای ئەو ماوەیەش بە موستەحازە ئەژمار دەكرێت).

٨٧٧ - «قَالَ سُفْيَانُ: إِذَا كَانَتِ الْمَرْأَةُ أَوَّلَ مَا تَحِيضُ، تَجْلِسُ فِي الْحَيْضِ مِنْ نَحْوِ نِسَائِهَا، سُئِلَ عَبْدُ اللَّهِ عَنْ هَذَا، فَقَالَ: هُوَ أَشْبَهُ الْأَشْيَاءِ»[٥].

واتە: سوفیان وتویەتی: ئەگەر ئافرەت یەكەم جاری بوو سوڕی مانگانەی دەبینی، لە سوڕی مانگانە دادەنیشێت هاوشێوەی ئافرەتانی وەک خۆی، پرسیار لە عەبدوڵڵا كرا دەربارەی ئەوە، وتی: ئەوە نزیكترین شتە (واتە: تەواوە با خۆی تەقلیدی ئافرەتانی هاو تەمەنی خۆی بكات).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئافرەتی بە تەمەن کە خوێن ببینێ

٨٧٨ - « عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْكَبِيرَةِ تَرَى الدَّمَ؟ قَالَ: لاَ نَرَاهُ حَيْضًا»[١].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی بە تەمەن کە خوێن ببینێ؟ وتویەتی: بە حەیزی دانانێین.

٨٧٩ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي امْرَأَةٍ تَرَكَهَا الْحَيْضُ ثَلاَثِينَ سَنَةً، ثُمَّ رَأَتِ الدَّمَ فَأَمَرَ فِيهَا بِشَأْنِ الْمُسْتَحَاضَةِ»[٢].

واتە: عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتێک کە سی ساڵە وازی لە سوڕی مانگانە هێناوە (سی ساڵە سوڕی مانگانەی نەماوە) دواتر خوێنی بینیوە، عەطاء فەرمانی پێ کردووە بە جێبەجێ کردنی کرداری ئافرەتی موستەحازە (واتە: خوێنەکە بە سوڕی مانگانە دانانرێت و، دەبێ نوێژەکانی بکات و وەک ئافرەتی موستەحازە خۆی بشۆرێت و، دەستنوێژ بۆ هەموو نوێژێک بشۆرێتەوە).

٨٨٠ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْكَبِيرَةِ تَرَى الدَّمَ؟ قَالَ: هِيَ بِمَنْزِلَةِ الْمُسْتَحَاضَةِ، تَفْعَلُ كَمَا تَفْعَلُ الْمُسْتَحَاضَةُ»[٣].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی بە تەمەن کە خوێن ببینێ وتویەتی: ئەوە وەک ئافرەتی موستەحازە وایە، ئەوە ئەنجام دەدات کە ئافرەتی موستەحازە ئەنجامی دەدات.

٨٨١ - «عَنْ عَطَاءٍ، وَالْحَكَمِ بْنِ عُتَيْبَةَ، فِي الَّتِي قَعَدَتْ مِنَ الْمَحِيضِ إِذَا رَأَتِ الدَّمَ، تَوَضَّأَتْ وَصَلَّتْ، وَلاَ تَغْتَسِلُ، سُئِلَ عَبْدُ اللَّهِ عَنِ الْكَبِيرَةِ، قَالَ: تَوَضَّأُ وَتُصَلِّي، وَإِذَا طُلِّقَتْ تَعْتَدُّ بالأَشْهُرِ»[٤].

واتە: لە عەطاء و حەکەمی کوڕی عوتەیبەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو ئافرەتەی وازی لە سوڕی مانگانە هێناوە (سوڕی مانگانەی نەماوە لەبەر تەمەن زۆری) ئەگەر (دوایی) خوێنی بینی، دەستنوێژ دەشۆرێت و نوێژ دەکات، (بەڵام) خۆی ناشۆرێت.

پرسیار لە عەبدوڵلا کرا دەربارەی ئافرەتی بەتەمەن، وتی: دەستنوێژ دەشۆرێت و نوێژ دەکات، ئەگەر تەڵاقیش درا ئەوە بە مانگ عیددە دەبینێت.

## بابەت: دەربارەی کەمترینی (ماوەی) پاکیەتی

٨٨٢ - «قَالَ سُفْيَانُ، الطُّهْرُ خَمْسُ عَشْرَةَ»[٥].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: سوفیان وتویەتی: (کەمترین ماوەی) پاکیەتی پانزە ڕۆژە.

٨٨٣ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: إِذَا حَاضَتِ الْمَرْأَةُ فِي شَهْرٍ، أَوْ فِي أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثَلاَثَ حِيَضٍ، قَالَ: فَإِذَا شَهِدَ لَهَا الشُّهُودُ الْعُدُولُ مِنَ النِّسَاءِ، أَنَّهَا رَأَتْ مَا يُحَرِّمُ عَلَيْهَا الصَّلاَةَ مِنْ طُمُوثِ النِّسَاءِ الَّذِي هُوَ الطَّمْثُ الْمَعْرُوفُ، فَقَدْ خَلاَ أَجَلُهَا، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: سَمِعْتُ يَزِيدَ بْنَ هَارُونَ يَقُولُ: أَسْتَحِبُّ الطُّهْرَ خَمْسَ عَشْرَةَ»[١].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ئافرەت تووشی سوڕی مانگانە بوو لە مانگێکدا یان لە چل شەودا سێ جار (واتە: لەو ماوەیەدا سێ حەیزی بینی)، ئیبراهیم وتویەتی: ئەگەر چەند شاهێدی دەرێکی ئافرەت شاهێدیان بۆدا کە ئەو خوێنەی بینیوە کە نوێژی پێ حەرام دەبێت لە خوێنی ئافرەتان کە خوێنێکی ناسراوە (هی سوڕی مانگانەیە) ئەوە ماوەی عیددەکەی تەواو بووە، (ئەگەر طەڵاقدراو بێت دەتوانێ مێرد بکاتەوە، چونکە عیددەی خۆی تەواو کردوە، کە بریتیە لە سێ حەیز).

٨٨٤ - «عَنْ عَامِرٍ، قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى عَلِيٍّ ﷺ تُخَاصِمُ زَوْجَهَا طَلَّقَهَا، فَقَالَتْ: قَدْ حِضْتُ فِي شَهْرٍ ثَلاَثَ حِيَضٍ، فَقَالَ: عَلِيٌّ لِشُرَيْحٍ اقْضِ بَيْنَهُمَا قَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ وَأَنْتَ هَاهُنَا؟ قَالَ: اقْضِ بَيْنَهُمَا. قَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ وَأَنْتَ هَاهُنَا؟ قَالَ: اقْضِ بَيْنَهُمَا فَقَالَ إِنْ جَاءَتْ مِنْ بِطَانَةِ أَهْلِهَا مِمَّنْ يُرْضَى دِينُهُ وَأَمَانَتُهُ تَزْعُمُ أَنَّهَا حَاضَتْ ثَلاَثَ حِيَضٍ تَطْهُرُ عِنْدَ كُلِّ قُرْءٍ وَتُصَلِّي، جَازَ لَهَا وَإِلاَّ فَلاَ، فَقَالَ عَلِيٌّ: قَالُونْ، وَقَالُونْ بِلِسَانِ الرُّومِ: أَحْسَنْتَ»[٢].

واتە: لە عامیر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێک هات بۆ لای (ئیمامی) عەلی ﷺ کێشەی لەگەڵ هاوسەرەکەی هەبوو کە تەڵاقی دابوو، ئافرەتەکە وتی: لە مانگێکدا سێ حەیز و سوڕی مانگانەم بینیوە، ئیمامی عەلی بە شورەیحی وت: دادوەری لە نێوانیاندا بکە، (شورەیح) وتی: ئەی گەورەی بڕواداران (چۆن دەبێت) لە کاتێکدا تۆ لێرەی؟ (ئیمامی) عەلی وتی: دادوەری لە نێوانیاندا بکە، (شورەیح) وتی: ئەی گەورەی بڕواداران (چۆن دەبێت) لە کاتێکدا تۆ لێرەی؟ (ئیمامی) عەلی وتی: دادوەری لە نێوانیاندا بکە، (شورەیح) وتی: ئەگەر کەسێکی نزیکی هات کە دین و ئەمانەتی جێی ڕەزامەندی بێت شاهێدیدا و وتی ئەو ئافرەتە سێ سوڕی مانگانەی بینیوە لە گشت حەیزەکان پاک بۆتەوە و نوێژی کردوە، ئەوە دروستەو تەواوەو (قسەکەی وەردەگیرێ)، ئەگەرنا (کەس شاهێدی بۆ نەدا) ئەوە دروست نیە و (قسەکەی وەرناگیرێت)، (ئیمامی) عەلی (کە گوێی لەو دادوەریەی شورەیح بوو) وتی: قالون، قالون بە زمانی ڕۆم واتە: باشت کرد (ئافەرین).

٨٨٥ - « عَنْ عِكْرِمَةَ: ﴿وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ ﴿٢٢٨﴾﴾ البقرة، قَالَ: الْحَيْضُ قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ: أَتَقُولُ بِهَذَا؟ قَالَ: لاَ، وَسُئِلَ عَبْدُ اللَّهِ عَنْ حَدِيثِ شُرَيْحٍ: تَقُولُ بِهِ. قَالَ: لاَ. وَقَالَ: ثَلاَثُ حِيَضٍ فِي الشَّهْرِ كَيْفَ يَكُونُ؟»[٣].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە عیکریمە گێڕدراوەتەوە، (دەربارەی ئەو ئایەتە:): ﴿وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ ﴿٢٢٨﴾﴾البقرة، واتە: [وە حەڵاڵ نیە بۆیان ئەوەی خوا لە منداڵدانیاندا دروستی کردووە بیشارنەوە]. وتویەتی (مەبەست): سوڕی مانگانەیە.

بە ئەبو موحەممەد وترا: تۆ ئەو قسەیە دەکەی (ئەو بۆچوونەت پێ ڕاستە)؟ وتی: نەخێر، وە پرسیار لە عەبدوڵڵا کرا دەربارەی فەرموودەکەی شورەیح (وترا): تۆش ئەو قسەیە دەکەی (بۆچوونت ئاوایە)؟ وتی: نەخێر، وتی: سێ حەیز لە یەک مانگدا چۆن دەبێت؟

## بابەت: پاکیەتی چۆنە (چۆن دەناسرێتەوە)

٨٨٦ - «عَنْ عَمْرَةَ، قَالَتْ: كَانَتْ عَائِشَةُ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، تَنْهَى النِّسَاءَ أَنْ يَنْظُرْنَ لَيْلاً فِي الْمَحِيضِ، وَتَقُولُ: إِنَّهُ قَدْ يَكُونُ الصُّفْرَةَ وَالْكُدْرَةَ»[1].

واتە: لە عەمرەتە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، نەهی لە ئافرەتان دەکرد کە بە شەو سەیری شوێنی حەیز بکەن و دەیوت: جاری وا هەیە زەردایەتی و لێڵایەتیە (واتە: ڕەنگە ئەگەر بە شەو سەیری بکەن وابزانن پاک بوونەتەوەو دەست بە نوێژ کردن بکەن، لە کاتێکدا ڕەنگە پاک نەبووبنەوە بە تەواوی، بەڵکو زەردایەتی و لێڵایەتی هەر مابێ، بەڵام چونکە بە شەو سەیریان کردووە بۆیە نەیانبینیوە).

٨٨٧ - «عَنْ مَوْلاَةِ عَمْرَةَ، قَالَتْ: كَانَتْ عَمْرَةُ تَأْمُرُ النِّسَاءَ أَنْ لاَ يَغْتَسِلْنَ حَتَّى تَخْرُجَ الْقُطْنَةُ بَيْضَاءَ»[2].

واتە: لە بەندەی عەمرەتەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەمرەت هەموو جار فەرمانی بە ئافرەتان دەکرد کە خۆیان (لە سوڕی مانگانە) نەشۆرن تاوەکو پارچە لۆکەکە بە سپیەتی دێتە دەرەوە، (واتە: تا پارچە لۆکەکەی هەڵیان گرتووە خوێنی پێوە بێت دروست نیە خۆیان بشۆرن بە ناوی تەواو بوونی سوڕی مانگانە).

٨٨٨ - «قَالَ سُفْيَانُ الْكُدْرَةُ وَالصُّفْرَةُ فِي أَيَّامِ الْحَيْضِ حَيْضٌ، وَكُلُّ شَيْءٍ رَأَتْهُ بَعْدَ أَيَّامِ الْحَيْضِ مِنْ دَمٍ أَوْ كُدْرَةٍ أَوْ صُفْرَةٍ، فَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ سُئِلَ عَبْدُ اللَّهِ تَأْخُذُ بِقَوْلِ سُفْيَانَ؟ قَالَ: نَعم»[3].

واتە: سوفیان وتویەتی: لێڵی و زەردی لە ڕۆژانی سوڕی مانگانەدا بە سوڕی مانگانە ئەژمار دەکرێت، وە هەموو شتێک کە بینیویەتی پاش ڕۆژانی سوڕی مانگانە لە خوێن، یان لێڵی، یان زەردی ئەوە موستەحازەیە (خوێنچڕکە) یە، پرسیار لە عەبدوڵڵا کرا (وترا): قسەی سوفیان وەردەگری؟ وتی: بەڵێ.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

٨٨٩ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، عَنْ صَاحِبَتِهِ فَاطِمَةَ بِنْتِ مُحَمَّدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، وَكَانَتْ فِي حِجْرِ عَمْرَةَ، قَالَتْ: أَرْسَلَتِ امْرَأَةٌ مِنْ قُرَيْشٍ إِلَى عَمْرَةَ بِكُرْسُفَةِ قُطْنٍ فِيهَا كَالصُّفْرَةِ تَسْأَلُهَا: هَلْ تَرَى إِذَا لَمْ تَرَ الْمَرْأَةُ مِنَ الْحِيضَةِ إِلاَّ هَذَا أَنْ قَدْ طَهُرَتْ؟ فَقَالَتْ: لاَ، حَتَّى تَرَى الْبَيَاضَ خَالِصًا»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو بەكر گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە خێزانەكەی فاتیمەی كچی موحەممەدەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕاویەتیەوە كە لە ماڵی عەمرەت گەورە بووە وتویەتی: ئافرەتێكی قوڕەیش ڕەوانەی كردووە بۆ لای عەمرەت بە پارچە لۆكەیەكەوە، وەک بڵێی زەردیەكی پێوەبوو، تا پرسیاری لێ بكات: ئایا پێت وایە كە ئەگەر ئافرەت هیچ شتێكی نەبینی جگە لەوە (جگە لەو زەردیە) ئەوە پاک بوبێتەوە؟ (عەمرەت) وتی: نەخێر، تا تەنها سپیایی نەبینێت (پاک نەبۆتەوە).

٨٩٠ - «عَنْ أَسْمَاءَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا،قَالَتْ: كُنَّا نَكُونُ فِي حِجْرِهَا فَكَانَتْ إِحْدَانَا تَحِيضُ ثُمَّ تَطْهُرُ فَتَغْتَسِلُ وَتُصَلِّي، ثُمَّ تَنْكُسُهَا الصُّفْرَةُ الْيَسِيرَةُ، فَتَأْمُرُنَا أَنْ نَعْتَزِلَ الصَّلاَةَ حَتَّى لاَ نَرَى إِلاَّ الْبَيَاضَ خَالِصًا»[٢].

واتە: لە ئەسماء (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لە ماڵی عەمرەت بووین جا یەكێک لە ئێمە تووشی حەیز دەبوو دواتر پاک دەبوویەوە و خۆی دەشۆرد و نوێژی دەكرد، دواتر زەردایەتیەكی كەم دەگەڕایەوە، عەمرەتیش فەرمانی پێ دەكردین كە لە نوێژ دوور بكەوینەوە تاوەكو هیچ شتێک نەبینین جگە لە سپیایی تەواو.

٨٩١ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: الْكُدْرَةُ وَالصُّفْرَةُ، فِي أَيَّامِ الْحَيْضِ، بِمَنْزِلَةِ الْحَيْضِ»[٣].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لێڵی و زەردی لە ڕۆژانی سوڕی مانگانەدا بە سوڕی مانگانە حیسابە.

٨٩٢ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا قَالَتْ: إِذَا رَأَتِ الدَّمَ، فَلْتُمْسِكْ عَنِ الصَّلاَةِ حَتَّى تَرَى الطُّهْرَ أَبْيَضَ كَالْقَصَّةِ، ثُمَّ تَغْتَسِلُ وَتُصَلِّي»[٤].

واتە: لە عائیشە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە كە وتویەتی: ئەگەر (ئافرەت) خوێنی بینی، با نوێژ نەكات تاوەكو پاكیەتی دەبینێت بە سپیەتی پارچە قوماشێكی سپی، دواتر خۆی دەشۆرێ و نوێژ دەكات.

٨٩٣ - «كَانَ الْحَسَنُ لاَ يَعُدُّ الصُّفْرَةَ وَالْكُدْرَةَ، وَلاَ مِثْلَ غُسَالَةِ اللَّحْمِ شَيْئًا»[٥].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده حسن.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: حەسەن زەردایەتی و لێڵایەتی و ئەوەی وەک شۆراوەی گۆشتە بە هیچی ئەژمار نەدەکرد (واتە: لەلای ئەو ئەو شتانە بە خوێنی حەیز حیساب نەبوون).

٨٩٤ - «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ، قَالَتْ: كُنَّا لاَ نَعُدُّ الصُّفْرَةَ وَالْكُدْرَةَ شَيْئًا»[١].

واتە: لە ئوممو عەطییەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە زەردایەتی و لێڵایەتیمان بە هیچ ئەژمار نەدەکرد.

## بابەت: (حوکمی) لێڵایەتی ئەگەر لەدوای سوڕی مانگانە دەرکەوت

٨٩٥ - «عَنِ الْحَسَنِ فِي الْمَرْأَةِ تَرَى الدَّمَ فِي أَيَّامِ طُهْرِهَا. قَالَ: أَرَى أَنْ تَغْتَسِلَ وَتُصَلِّيَ»[٢].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەت کە خوێن ببینێت لە ڕۆژانی پاکیەتیدا، وتویەتی: من پێم وایە کە خۆی دەشۆرێت و نوێژ دەکات.

٨٩٦ - «وَقَالَ ابْنُ سِيرِينَ: لَمْ يَكُونُوا يَرَوْنَ بِالْكُدْرَةِ وَالصُّفْرَةِ بَأْسًا»[٣].

واتە: ئیبنو سیرین وتویەتی: (ئەوان) پێیان وا نەبووە لێڵایەتی و زەردایەتی هیچی تیا بێت.

٨٩٧ - «عَنْ مُحَمَّدِ ابْنِ الْحَنَفِيَّةِ، فِي الْمَرْأَةِ تَرَى الصُّفْرَةَ بَعْدَ الطُّهْرِ؟ قَالَ: تِلْكَ التَّرِيَّةُ، تَغْسِلُهُ وَتَوَضَّأُ وَتُصَلِّي»[٤].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی حەنەفییە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو ئافرەتەی زەردایەتی دەبینێت پاشی پاکیەتی؟ وتویەتی: ئەوە «تەرییە»یە (واتە: ڕەنگێکی زۆر ئاجوغی نێوان زەردایەتی و لێڵایەتیە، یان خودی زەردایەتی و لێڵایەتیە)، خۆی دەشۆرێ و دەستنوێژ دەشۆرێ و نوێژ دەکات.

٨٩٨ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: لَيْسَ فِي التَّرِيَّةِ شَيْءٌ بَعْدَ الْغُسْلِ إِلاَّ الطُّهُورُ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: التَّرِيَّةُ: الصُّفْرَةُ وَالْكُدْرَةُ»[٥].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: تەرییە (کە ڕەنگێکی زۆر ئاجوغی نێوان زەردایەتی و لێڵایەتیە) هیچ شتێک نیە لە دوای خۆشۆردن تەنها پاکیەتی نەبێت (واتە: بە پاکیەتی حیسابە)، عەبدوڵڵا وتویەتی: «تەرییە» زەردایەتی و لێڵایەتیە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح.

٨٩٩ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: إِذَا رَأَتِ الْمَرْأَةُ التَّرِيَّةَ بَعْدَ الْغُسْلِ بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ، فَإِنَّهَا تَطَهَّرُ وَتُصَلِّي»[(١)].

واتە: لە پێشەوا عەلی ﷺ گێردراوەتەوە کە وتویەتی: ئەگەر ئافرەت تەرییەی بینی (واتە: ئەگەر زەردایەتی و لێڵایەتی بینی) پاشی خۆشۆردن بە ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ ئەوە ئافرەتەکە پاک دەبێتەوە و نوێژ دەکات (کەواتە: ئەو زەرداتی و لێڵایەتیە حیسابی بۆ ناکرێت، بە پاکیەتی حیسابە).

٩٠٠ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: لَيْسَ فِي التَّرِيَّةِ بَعْدَ الْغُسْلِ إِلاَّ الطُّهُورُ»[(٢)].

واتە: لە عەطائەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: تەرییە (زەردایەتی و لێڵایەتی) پاشی خۆشۆردن هیچ نیە، جگە لە پاکیەتی.

٩٠١ - «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، وَكَانَتْ قَدْ بَايَعَتِ النَّبِيَّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: كُنَّا لاَ نَعْتَدُّ بِالْكُدْرَةِ وَالصُّفْرَةِ بَعْدَ الْغُسْلِ شَيْئًا»[(٣)].

واتە: لە ئوممو عەطییە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، کە یەکێک لەو کەسانە بووە بەیعەتی بە پێغەمبەر ﷺ داوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە لێڵایەتی و زەردایەتیمان لە پاشی خۆشۆردن بە هیچ ئەژمار نەدەکرد.

٩٠٢ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: إِذَا رَأَتِ الْحَائِضُ دَمًا عَبِيطًا، بَعْدَ الْغُسْلِ، بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ، فَإِنَّهَا تُمْسِكُ عَنِ الصَّلاَةِ يَوْمًا ثُمَّ هِيَ بَعْدَ ذَلِكَ مُسْتَحَاضَةٌ»[(٤)].

واتە: لە حەسەن ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر هەر کات ئافرەتی حەیزدار خوێنی سورو گەش و زۆری بینی پاشی خۆشۆردن (لە خوێنی حەیز) بە ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ ئەوە یەک ڕۆژ واز لە نوێژ دەهێنێ، دواتر خوێنەکە پاش ئەو ماوەیە (پاش ئەو ڕۆژە) بەموستەحازە حیسابە (واتە: دەبێ خۆی بۆ بشۆرێ و، دەستنوێژ بۆ هەموو نوێژێک بشۆرێ و، نوێژەکەی بکات).

٩٠٣ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: إِذَا تَطَهَّرَتِ الْمَرْأَةُ مِنَ الْمَحِيضِ، ثُمَّ رَأَتْ بَعْدَ الطُّهْرِ مَا يَرِيبُهَا، فَإِنَّمَا هِيَ رَكْضَةٌ مِنَ الشَّيْطَانِ فِي الرَّحِمِ. فَإِذَا رَأَتْ مِثْلَ الرُّعَافِ، أَوْ قَطْرَةِ الدَّمِ، أَوْ غُسَالَةِ اللَّحْمِ، تَوَضَّأَتْ وُضُوءَهَا لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ تُصَلِّي فَإِنْ كَانَ الدَمُ عَبِيطًا الَّذِي لاَ خَفَاءَ بِهِ، فَلْتَدَعِ الصَّلاَةَ».

قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ، سَمِعْتُ يَزِيدَ بْنَ هَارُونَ يَقُولُ: إِذَا كَانَ أَيَّامُ الْمَرْأَةِ سَبْعَةً، فَرَأَتِ الطُّهْرَ بَيَاضًا، فَتَزَوَّجَتْ ثُمَّ رَأَتِ الدَّمَ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْعَشْرِ، فَالنِّكَاحُ جَائِزٌ صَحِيحٌ، فَإِنْ رَأَتِ الطُّهْرَ دُونَ السَّبْعِ فَتَزَوَّجَتْ، ثُمَّ رَأَتِ الدَّمَ، فَلاَ يَجُوزُ، وَهُوَ حَيْضٌ وسُئلَ عَبْدُ اللَّهِ: تَقُولُ بِهِ؟ قَالَ: نَعم»[(٥)].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده حسن.

واتە: لە (ئیمامی) عەلی ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ئافرەت لە سوڕی مانگانە پاک بوویەوە، دواتر پاشی پاک بوونەوە شتێکی بینی (خوێنێکی بینی) کە گومانی بۆ دروست دەکرد، ئەوە (هیچ نیە) تەنها لەقەیەکی شەیتانە لە ڕەحمی دراوە، جا ئەگەر (خوێنی بینی) وەک خوێن بەربونی لوت وابوو، یان وەک دڵۆپە خوێن وابوو، یان وەک سۆرایی گۆشت وابوو ئەوە (لەو حاڵەتانە) دەستنوێژ دەشۆرێ، وەک دەستنوێژ شۆردنی بۆ نوێژ (بە تەواوی)، دواتر نوێژ دەکات، جا ئەگەر خوێنەکە سورو گەش و زۆر بوو هیچ ناڕوونیەکی تیا نەبوو (بە تەواوی بە خوێنی حەیز دەچوو) ئەوە با واز لە نوێژ بهێنێ.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: گوێم لە یەزیدی کوڕی هاڕوون بوو دەیوت: ئەگەر ڕۆژانی (سوڕی مانگانەی) ئافرەتێک حەوت ڕۆژ بێت و بە سپیەتی و (ڕوونی) پاکیەتی خۆی بینی و (ڕاستەوخۆ) شوی کرد، دواتر خوێنی بینی لە نێوان حەوت بۆ دە ڕۆژ (واتە: لە ڕۆژانی هەشت و نۆ و دە خوێنی بینیەوە (دووبارە پاش شوکردنەکەی)، ئەوە شووکردنەکەی دروست و تەواوە، خۆ ئەگەر پاکیەتی بینی پێشی حەوت ڕۆژ (خۆشی عادەتی وا بوو حەوت ڕۆژی تەواو دەکرد لە سوڕی مانگانەیدا) و (ڕاستەوخۆ) شووی کرد، دواتر خوێنی بینی، ئەوە (شوو کردنەکەی) دروست نیە و ئەوە حەیز و سوڕی مانگانەیە.

وە پرسیار لە عەبدوڵڵا کرا وترا: (تۆش) ئەو قسەیە دەکەیت (هەمان فەتوا دەدەی)؟ وتی: بەڵێ.

٩٠٤ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، فِي الْمَرْأَةِ يَكُونُ حَيْضُهَا سِتَّةَ أَيَّامٍ، أَوْ سَبْعَةَ أَيَّامٍ، ثُمَّ تَرَى كُدْرَةً، أَوْ صُفْرَةً، أَوْ تَرَى الْقَطْرَةَ، أَوِ الْقَطْرَتَيْنِ مِنَ الدَّمِ، أَنَّ ذَلِكَ بَاطِلٌ وَلاَ يَضُرُّهَا شَيْءٌ»[١].

واتە: لە (ئیمامی) عەلی ﷺ گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتێک کە سوڕی مانگانەکەی شەش ڕۆژ بێت، یان حەوت ڕۆژ بێت، دواتر لێڵایەتی، یان زەردایەتی، یان دڵۆپێک یان دوو دڵۆپ خوێن ببینێ ئەوە کار ناکا و هیچ زیانی پێ ناگەیەنێ.

٩٠٥ - «عَنْ عَبْدِ الْكَرِيمِ، قَالَ: سَأَلْتُ عَطَاءً، عَنْ الْمَرْأَةِ تَغْتَسِلُ مِنَ الْحَيْضِ، ثُمَّ تَرَى الصُّفْرَةَ قَالَ: تَوَضَّأُ وَتَنْضَحُ»[٢].

واتە: لە عەبدولکەریم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە عەطاء کرد دەربارەی ئافرەت کە خۆی دەشۆرێ لە سوڕی مانگانە و دواتر زەردایەتی دەبینێ، وتی: دەستنوێژ دەشۆرێ و (شوێنی زەردایەتیەکە) ئاو ڕشێن دەکات.

٩٠٦ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْمُسْتَحَاضَةِ، قَالَ: تَدَعُ الصَّلاَةَ فِي قُرُوئِهَا ذَلِكَ يَوْمًا أَوْ يَوْمَيْنِ، ثُمَّ تَغْتَسِلُ، فَإِذَا كَانَ عِنْدَ الْأُولَى نَظَرَتْ، فَإِنْ كَانَتْ تَرِيَّةً، تَوَضَّأَتْ وَصَلَّتْ، وَإِنْ كَانَ دَمًا، أَخَّرَتِ الظُّهْرَ وَعَجَّلَتِ الْعَصْرَ، ثُمَّ صَلَّتْهُمَا بِغُسْلٍ وَاحِدٍ، فَإِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ نَظَرَتْ، فَإِنْ كَانَتْ تَرِيَّةً، تَوَضَّأَتْ وَصَلَّتْ، وَإِنْ كَانَ دَمًا، أَخَّرَتِ

---

(١)ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده حسن.

الْمَغْرِبَ وَعَجَّلَتِ الْعِشَاءَ، ثُمَّ صَلَّتْهُمَا بِغُسْلٍ وَاحِدٍ، فَإِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ، نَظَرَتْ، فَإِنْ كَانَتْ تَرِيَّةً، تَوَضَّأَتْ وَصَلَّتْ، وَإِنْ كَانَ دَمًا، اغْتَسَلَتْ وَصَلَّتِ الْغَدَاةَ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: الْأَقْرَاءُ عِنْدِي: الْحَيْضُ»[1].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی موستەحازە، وتویەتی: واز لە نوێژ دەهێنێت لە سوڕی مانگانەكەی بە ڕۆژێک یان دووان (پاش تەواو كردنی ماوەی سوڕی مانگانەی كە عادەتیەتی)، دواتر خۆی دەشۆرێ (هەر چەندە خوێنی دیكەش ببینێ)، جا ئەگەر لە كاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو سەیر دەكات، ئەگەر زەردی و لێڵی بوو ئەوە دەستنوێژ دەشۆرێت و نوێژەكە دەكات، ئەگەر خوێنیش بوو ئەوە نوێژی نیوەڕۆ تاخیر دەكات (تا نزیكی عەسر ئنجا نوێژی نیوەڕۆ دەكات) و نوێژی عەسریش زوو دەكات و هەردوو نوێژەكە بە یەک خۆشۆردن ئەنجام دەدات (واتە: دەبێ لە پێشدا یەک جار خۆی بشۆرێ بۆ ئەنجام دانی ئەو دوو نوێژە)، جا ئەگەر خۆر ئاوا بوو (كاتی نوێژی مەغریب بوو) ئەوە سەیر دەكات ئەگەر زەردی و لێڵی بوو ئەوە دەستنوێژ دەشۆرێت و نوێژەكە دەكات، ئەگەر خوێنیش بوو ئەوە نوێژی مەغریب تاخیر دەكات (تا نزیكی عیشا ئنجا نوێژی مەغریب دەكات) و نوێژی عیشاش زوو دەكات و، هەردوو نوێژەكە بە یەک خۆشۆردن ئەنجام دەدات (واتە: دەبێ لە پێشدا یەک جار خۆی بشۆرێ بۆ ئەنجام دانی ئەو دوو نوێژە)، جا ئەگەر كاتی نوێژی بەیانی داهات سەیر دەكات ئەگەر زەردی و لێڵی بوو ئەوە دەستنوێژ دەشۆرێت و نوێژەكە دەكات، ئەگەر خوێنیش بوو ئەوە خۆی دەشۆرێت و نوێژی بەیانی دەكات، (كەواتە: خۆشۆردنەكە) لە هەموو شەو و ڕۆژێكدا سێ جارە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (الْأَقْرَاء) لەلای من (لەو فەرموودەیەدا بە واتای): سوڕی مانگانەیە.

٩٠٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، اعْتَكَفَ، وَاعْتَكَفَ مَعَهُ بَعْضُ نِسَائِهِ وَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ تَرَى الدَّمَ، فَرُبَّمَا وَضَعَتِ الطَّسْتَ تَحْتَهَا مِنَ الدَّمِ، وَزَعَمَ أَنَّ عَائِشَةَ رَأَتْ مَاءَ الْعُصْفُرِ، فَقَالَتْ: كَانَ هَذَا شَيْئًا كَانَتْ فُلاَنَةُ تَجِدُهُ»[2].

واتە: لە دایكمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، كە پێغەمبەر ﷺ ئیعتیكافی كردوە (لە مزگەوتدا ماوەتەوە بە نیەتی پەرستش) و یەكێک لە خێزانەكانیشی لەگەڵی ئیعتیكافی كردووە لە كاتێكدا ئیستیحازە بوو (خوێنچڕكەی هەبوو) خوێنی دەبینی، بۆیە هەندێ جار تەشتی لە ژێر خۆیەوە دادەنا لەبەر (زۆری) خوێن، وە (عیكریمە) وتویەتی دایكمان عائیشە ئاوی گوڵە ڕەنگی چاو پێكەوت (كە گوڵێكی نارنجیە) وتی: ئەوە شتێک و ڕەنگێكە كە فڵانە ئافرەت (خوێنی) ئاوای دەبینی (واتە: خوێنەكەی ئاوا نارنجی بوو وەک ئاوی ئەم گوڵە).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

٩٠٨ - «عَنِ الْحَجَّاجِ، قَالَ: سَأَلْتُ عَطَاءً، عَنِ الْمَرْأَةِ تَطْهُرُ مِنَ الْمَحِيضِ، ثُمَّ تَرَى الصُّفْرَةَ، قَالَ: تَوَضَّأُ»[١].

واتە: لە حەجاج گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە عەطاء كرد دەربارەی ئەو ئافرەتەی كە پاك دەبێتەوە لە سوڕی مانگانەدا، دواتر زەردایەتی دەبینێ (حوكمەكەی چۆنە)؟ وتی: دەستنوێژ دەشۆرێ (واتە: نوێژی لەسەرە).

٩٠٩ - «قال أبو محمد: قرأت على زيد بن يحيى عَنْ مَالِكٍ هُوَ ابْنُ أَنَسٍ، قَالَ: سَأَلْتُهُ عَنِ الْمَرْأَةِ كَانَ حَيْضُهَا سَبْعَةَ أَيَّامٍ فَزَادَتْ حَيْضَتُهَا. قَالَ: تَسْتَظْهِرُ بِثَلاَثَةِ أَيَّامٍ»[٢].

واتە: ئەبو موحەممەد وتویەتی: لەلای زەیدی كوڕی یەحیا خوێندومە لە مالیكەوە گێڕاویەتیەوە وتی: پرسیارم لێ كرد دەربارەی ئەو ئافرەتەی سوڕی مانگانەكەی (بە عادەتی خۆی) حەوت ڕۆژەو حەیزەكەی زیاد دەبێت (حوكمی ئەو ڕۆژە زیادانە چیە)؟ وتی: پاك دەبێتەوە بە سێ ڕۆژان (واتە: سێ ڕۆژیتریشی بۆ بە حەیز ئەژمار دەكرێت و، لە پاشان ئەگەر خوێن هات بە حەیز حیساب نیەو، دەبێ نوێژەكانی بكات، بەڵكو بە موستەحازە حیسابە).

## بابەت: (حوكمی) ئەو ئافرەتەی كە پاك دەبێتەوە، یان تووشی سوڕی مانگانە دەبێت لە كاتی نوێژدا

٩١٠ - «عَنِ الْحَسَنِ ﷺ، قَالَ: إِذَا طَهُرَتِ الْمَرْأَةُ فِي وَقْتِ صَلاَةٍ فَلَمْ تَغْتَسِلْ، وَهِيَ قَادِرَةٌ عَلَى أَنْ تَغْتَسِلَ، قَضَتْ تِلْكَ الصَّلاَةَ»[٣].

واتە: لە حەسەن ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ئافرەت پاك بوویەوە لە كاتی نوێژێكداو خۆی نەشۆرد لە كاتێكدا دەیتوانی خۆی بشۆرێ، ئەوە ئەو نوێژە قەزا دەكاتەوەو دەیگێڕێتەوە (چونكە كەوتۆتە سەر شانی، تاوانباریش دەبێ).

٩١١ - «عَنِ الْحَسَنِ ﷺ، قَالَ: إِذَا صَلَّتِ الْمَرْأَةُ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ حَاضَتْ، فَلاَ تَقْضِي إِذَا طَهُرَتْ»[٤].

واتە: لە حەسەن ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ئافرەت دوو ڕەكعەت نوێژی كردو تووشی سوڕی مانگانە بوو ئەوە ئەو نوێژە قەزا ناكاتەوەو نایگێڕێتەوە كاتێ پاك بوویەوە.

٩١٢ - «أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عِيسَى، حَدَّثَنَا الْمَعْمَرِيُّ أَبُو سُفْيَانَ مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ ...»[٥].

واتە: لە قەتادەش گێڕدراوەتەوە (بە هەمان شێواز).

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

٩١٣ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْمَرْأَةِ تَطْهُرُ عِنْدَ الظُّهْرِ فَتُؤَخِّرُ غُسْلَهَا حَتَّى يَدْخُلَ وَقْتُ الْعَصْرِ قَالاَ: تَقْضِي الظُّهْرَ»(١).

واتە: لە عەطائیش گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو ئافرەتەی کە پاک دەبێتەوە لەکاتی نیوەڕۆدا و خۆشۆردنەکەی تاخیر دەکات تا دەچێتە ناو کاتی عەسر، هەردووکیان (قەتادەو عەطاء) وتویانە: نوێژی نیوەڕۆ قەزادەکاتەوەو دەیگێڕێتەوە (چونکە کەوتۆتە سەر شانی).

٩١٤ - «أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عِيسَى، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، أَنبأَنَا يُونُسُ، عَنِ الْحَسَنِ»(٢).

٩١٥ - «وَمُغِيرَةُ، عَنْ عَامِرٍ»(٣).

٩١٦ـ « عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي الْمَرْأَةِ تُفَرِّطُ فِي الصَّلاَةِ حَتَّى يُدْرِكَهَا الْحَيْضُ، قَالُوا: تُعِيدُ تِلْكَ الصَّلاَةَ»(٤).

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو ئافرەتەی کەمتەرخەمی دەکات (لە کردنی نوێژەکەیدا) تاوەکو سوڕی مانگانەی پێ دەگات و (ئەو کات ناتوانێت نوێژەکەی بکات)، وتویانە: ئەو نوێژە قەزا دەکاتەوە و دەیگێڕێتەوە.

تێبینی: کەواتە: دەبێت ئەو ڕۆژەی کە دەزانێت تووشی سوڕی مانگانە دەبێت، زوو نوێژەکانی لە کاتی خۆیدا ئەنجام بدات، تاوەکو تووشی تاوانباری کەمتەرخەمی و دووبارەکردنەوە نەبێت، والله أعلم.

٩١٧ - «عَنْ حماد بن أبي سليمان وعَنِ الْحَسَنِ، فِي امْرَأَةٍ حَضَرَتِ الصَّلاَةُ، فَفَرَّطَتْ حَتَّى حَاضَتْ، قَالاَ: تَقْضِي تِلْكَ الصَّلاَةَ إِذَا اغْتَسَلَتْ»(٥).

واتە: لە حەممادی کوڕی ئەبو سولەیمان و حەسەن گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتێک کە نوێژ بێت و کەمتەرخەمی بکات تا تووشی سوڕی مانگانە دەبێت، وتویانە: کاتێک خۆی شۆرد ئەو نوێژە قەزا دەکاتەوە.

٩١٨ - «عَنِ الْحَسَنِ، وَقَتَادَةَ، قَالاَ: إِذَا ضَيَّعَتِ الْمَرْأَةُ الصَّلاَةَ حَتَّى تَحِيضَ، فَعَلَيْهَا الْقَضَاءُ إِذَا طَهُرَتْ»(٦).

واتە: لە حەسەن و قەتادە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: ئەگەر ئافرەت نوێژی فەوتاندو (ئەنجامی نەدا) تا تووشی سوڕی مانگانە بوو، ئەوە قەزا کردنەوەی لەسەرە کاتێ پاک دەبێتەوە.

---

(١)ـ إسناده صحيح لغيره.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

(٦) ـ إسناده صحيح.

**٩١٩ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: إِذَا فَرَّطَتْ ثُمَّ حَاضَتْ، قَضَتْ»[١].**

واتە: لە شەعبی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر (ئافرەت) کەمتەرخەمی کرد (لە کردنی نوێژدا و زوو ئەنجامی نەدا) دواتر تووشی سوڕی مانگانە بوو ئەوە قەزای دەکاتەوە.

**٩٢٠ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: إِذَا حَاضَتِ الْمَرْأَةُ فِي وَقْتِ الصَّلاَةِ، فَلَيْسَ عَلَيْهَا الْقَضَاءُ»[٢].**

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ئافرەت لە کاتی نوێژێکدا تووشی حەیز بوو ئەوە قەزا کردنەوەی نوێژەکەی لەسەر نیە.

**٩٢١ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: إِذَا طَهُرَتْ قَبْلَ الْمَغْرِبِ، صَلَّتِ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ، وَإِذَا طَهُرَتْ قَبْلَ الْفَجْرِ، صَلَّتِ الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ»[٣].**

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر (ئافرەت) پاک بوویەوە (لە سوڕی مانگانە) پێشی مەغریب، ئەوە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر دەکات (واتە: واجبە هەر دوو نوێژ ئەنجام بدات، چونکە نوێژەکانی ڕۆژیی کەوتۆتە سەر کە قەسرو جەمعیان لە نێواندا هەیە)، وە ئەگەر پاک بوویەوە پێشی نوێژی بەیانی ئەوە نوێژی مەغریب و عیشاش دەکات (چونکە نوێژەکانی شەوی کەوتۆتە سەر).

**٩٢٢ - «أَخْبَرَنَا حَجَّاجٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ مِثْلَهُ»[٤].**

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییبیش گێڕدراوەتەوە بە هەمان شێوە.

**٩٢٣ - «أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ عَنْ مِقْسَمٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا مِثْلَهُ»[٥].**

واتە: لە ئیبنو عەبباسیش (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە بە هەمان شێوە.

**٩٢٤ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي الْحَائِضِ تُصَلِّي الصَّلاَةَ الَّتِي طَهُرَتْ فِي وَقْتِهَا»[٦].**

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی حەیزدار وتویەتی: ئەو نوێژە ئەنجام دەدات کە لە کاتەکەیدا پاک بۆتەوە (لە سوڕی مانگانە).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

(٦) ـ إسناده صحيح.

٩٢٥ - «عَنْ عَطَاءٍ، وَطَاوُسٍ، وَمُجَاهِدٍ، قَالُوا: إِذَا طَهُرَتِ الْحَائِضُ قَبْلَ الْفَجْرِ، صَلَّتِ الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ، وَإِذَا طَهُرَتْ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ، صَلَّتِ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ»[١].

واتە: لە عەطاءو طاووس و موجاهید گێردراوەتەوە، وتویانە: ئەگەر ئافرەتی حەیزدار پاک بوویەوە پێشی نوێژی بەیانی ئەوە نوێژی مەغریب و عیشا دەکات، وە ئەگەر پاک بوویەوە پێشی خۆر ئاوابوون ئەوە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر دەکات.

٩٢٦ - «عَنِ الْحَكَمِ، فِي الْحَائِضِ إِذَا رَأَتِ الطُّهْرَ آخِرَ النَّهَارِ، صَلَّتِ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ، وَإِذَا طَهُرَتْ آخِرَ اللَّيْلِ صَلَّتِ الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ»[٢].

واتە: لە حەکەم گێردراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی حەیزدار وتویەتی: ئەگەر پاکیەتی بینی (پاک بوویەوە) لە کۆتایی ڕۆژدا ئەوە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر دەکات، وە ئەگەر پاک بوویەوە لە کۆتایی شەودا ئەوە مەغریب و عیشا دەکات.

٩٢٧ - «أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ لَيْثٍ، عَنْ طَاوُسٍ، مِثْلَه»[٣].

واتە: لە طاووس گێردراوەتەوە بە هەمان شێوە.

٩٢٨ - «عَنْ مُغِيرَةَ، قَالَ كَانَ إِبْرَاهِيمُ، يَقُولُ: إِذَا طَهُرَتْ عِنْدَ الْعَصْرِ، صَلَّتِ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ»[٤].

واتە: لە موغیرە گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئیبراهیم دەیوت: ئەگەر (ئافرەت) پاک بوویەوە لە کاتی عەسر ئەوە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر دەکات.

٩٢٩ - «قَالَ شُعْبَةُ، سَأَلْتُ حَمَّادًا، قَالَ: إِذَا طَهُرَتْ فِي وَقْتِ صَلاَةٍ، صَلَّتْ»[٥].

واتە: شوعبە وتویەتی: پرسیارم لە حەمماد کرد (دەربارەی ئەو بابەتە) وتی: ئەگەر لە کاتی هەر نوێژێکدا پاک بوویەوە ئەوە ئەو نوێژە دەکات.

٩٣٠ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: إِذَا طَهُرَتْ فِي وَقْتِ صَلاَةٍ، صَلَّتْ تِلْكَ الصَّلاَةَ وَلاَ تُصَلِّي غَيْرَهَا»[٦].

واتە: لە ئەنەس ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر (ئافرەت) پاکبوویەوە لەکاتی نوێژێکدا، ئەوە ئەو نوێژە دەکات و هیچ نوێژێکی تر ناکات.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

(٦) ـ إسناده صحيح.

٩٣١ - «عَنْ مَالِكٍ، قَالَ: سَأَلْتُهُ عَنِ الْمَرْأَةِ تَطْهُرُ بَعْدَ الْعَصْرِ، قَالَ: تُصَلِّي الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ. قُلْتُ: فَإِنْ كَانَ طُهْرُهَا قَرِيباً مِنْ مَغِيبِ الشَّمْسِ، قَالَ تُصَلِّي الْعَصْرَ وَلاَ تُصَلِّي الظُّهْرَ، وَلَوْ أَنَّهَا لَمْ تَطْهُرْ حَتَّى تَغِيبَ الشَّمْسُ، لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا شَيْءٌ سُئِلَ عَبْدُ اللَّهِ تَأْخُذُ بِهِ؟ قَالَ: لاَ»[١].

واتە: لە مالیک گێڕدراوەتەوە، (زەیدی کوڕی یەحیا) وتویەتی: پرسیارم لێکرد دەربارەی ئەو ئافرەتەی کە پاکدەبێتەوە (لە سوڕی مانگانە) لە پاشی عەسر (کە ئاخۆ حوکمەکەی چۆنە)؟ وتی: نوێژی نیوەڕۆ و عەسر دەکات، وتم: ئەی ئەگەر پاک بونەوەکەی نزیک بوو لە خۆر ئاوابوون؟ وتی: نوێژی عەسر دەکات و نوێژی نیوەڕۆ ناکات، وە ئەگەر پاک نەبوویەوە تا خۆر ئاوابوو هیچ شتێکی لەسەر نیە (هیچ نوێژێکی ڕۆژێ ناکات).

پرسیار لە عەبدوڵڵا کرا (وترا): کار بەوە دەکەی؟ وتی: نەخێر.

## بابەت: ئەگەر ئافرەت ڕۆژانی حەیزی لەگەڵ ڕۆژانی ئیستیحازە لێ تێکەڵ بوو

٩٣٢ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَتَبَتْ إِلَيْهِ امْرَأَةٌ: إِنِّي قَدِ اسْتُحِضْتُ مُنْذُ كَذَا وَكَذَا. فَبَلَغَنِي أَنَّ عَلِيًّا رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: تَغْتَسِلُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَا نَجِدُ لَهَا غَيْرَ مَا قَالَ عَلِيٌّ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێک بۆی نوسی: من تووشی حەیز بووم لەوەتەی ئەو کاتە و ئەو کاتە (لە ڕیوایەتی تردا هاتوە وتویەتی لەوەتەی دوو ساڵ بەر لە ئێستا هەر خوێن دەبینم)، جا پێم گەیشتووە کە ئیمامی عەلی وتویەتی: خۆی دەشۆرێ بۆ هەموو نوێژێک، جا ئیبنو عەبباس وتی: هیچمان بۆ ئەوە نیە جگە لەوەی عەلی وتویەتی (واتە: بەڵێ دەبێ بۆ هەموو نوێژێک خۆت بشۆری و نوێژ بکەیت، چونکە ئەوە خوێنی حەیز نیە خوێنی ئیستیحازەیە).

٩٣٣ - «حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ، أَوْ عِكْرِمَةُ، قَالَ كَانَتْ زَيْنَبُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، تَعْتَكِفُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَهِيَ تُرِيقُ الدَّمَ، فَأَمَرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ»[٣].

واتە: ئەبو سەلەمە یان عیکریمە وتویەتی: زەینەب (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا)، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئعتیکافی کردووە لەکاتێکدا خوێنی دەڕشت (ئەوەندە خوێنی زۆری دەبینی لێی دەڕژا)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد کە خۆی بشۆرێ بۆ هەموو نوێژێک.

٩٣٤ - «عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، أَنَّ عَلِيًّا، وَابْنَ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، كَانَا يَقُولاَنِ: الْمُسْتَحَاضَةُ تَغْتَسِلُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ»[٤].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده منقطع.

(٤)ـ إسناده منقطع.

واتە: لە یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر گێڕدراوەتەوە، ئیمامی عەلی و ئیبنو مەسعود (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، دەیانووت: (ئافرەتی) موستەحازە خۆی دەشۆرێ بۆ هەموو نوێژێک.

٩٣٥ - «حَدَّثَنَا الْأَوْزَاعِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ عَطَاءَ بْنَ أَبِي رَبَاحٍ، يَقُولُ: تَغْتَسِلُ بَيْنَ كُلِّ صَلاَتَيْنِ غُسْلاً وَاحِدًا، وَلِلْفَجْرِ غُسْلاً وَاحِدًا قَالَ الْأَوْزَاعِيُّ: وَكَانَ الزُّهْرِيُّ، وَمَكْحُولٌ يَقُولاَنِ: تَغْتَسِلُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ»[1].

واتە: لە ئەوزاعی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەطائی کوڕی ئەبو ڕەباح بوو دەیوت: (ئافرەتی موستەحازە) خۆی یەک جار دەشۆرێ لە نێوان هەر دوو نوێژێکدا و بۆ نوێژی بەیانیش غوسلێک دەکات، ئەوزاعی وتویەتی: زوهری و مەکحول دەیانووت: خۆی دەشۆرێ بۆ گشت نوێژێک.

٩٣٦ - «عن أبي سلمة أَنَّ أُمَّ حَبِيبَةَ قَالَ وَهْبٌ: أُمُّ حَبِيبَةَ بِنْتَ جَحْشٍ كَانَتْ تُهَرَاقُ الدَّمَ، وَإِنَّهَا سَأَلَتِ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ ذَاكَ، فَأَمَرَهَا أَنْ تَغْتَسِلَ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ وَتُصَلِّيَ»[2].

واتە: لە ئەبو سەلەمە گێڕدراوەتەوە وتویەتی: ئوممو حەبیبە ـ وەهب وتویەتی ئوممو حەبیبەی کچی جەحش بووە ـ خوێنی دەڕشت (خوێنی زۆری دەبینی)و پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی ئەوە (کە ئاخۆ چی بکات)، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمانی پێ کرد کە خۆی بشۆرێ بۆ گشت نوێژێک و نوێژ بکات.

٩٣٧ - «حَدَّثَنَا أَبُو بِشْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ، يَقُولُ كَتَبَتِ امْرَأَةٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، وَابْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، إِنِّي أُسْتَحَاضُ فَلاَ أَطْهُرُ، وَإِنِّي أُذَكِّرُكُمَا اللهُ إِلاَ أَفْتَيْتُمَانِي، وَإِنِّي سَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالُوا: كَانَ عَلِيٌّ يَقُولُ: تَغْتَسِلُ لِكُلِّ صَلاَةٍ، فَقَرَأْتُ. وَكَتَبْتُ الْجَوَابَ بِيَدِي مَا أَجِدُ لَهَا إِلاَّ مَا قَالَ عَلِيٌّ فَقِيلَ إِنَّ الْكُوفَةَ أَرْضٌ بَارِدَةٌ. فَقَالَ: لَوْ شَاءَ اللهُ لاَبْتَلاَهَا بِأَشَدَّ مِنْ ذَلِكَ»[3].

واتە: لە ئەبو بیشر گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە سەعیدی کوڕی جوبەیر بوو دەیوت: ئافرەتێک بۆ ئیبنو عەبباس و ئیبنو زوبەیری (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، نوسی: من دەکەومە حەیزو پاک نابمەوە و، وە من خواتان دەهێنمەوە یاد (دەتانترسێنم بە خوا) ئەگەر فەتوام بۆ نەدەن و (وەڵامم نەدەنەوە)، منیش پرسیارم دەربارەی ئەوە کرد، وتیان: عەلی دەیوت: خۆی دەشۆرێ بۆ هەموو نوێژێک، منیش خوێندمەوەو وەڵامەکەم بە دەستەکانم نوسیەوەو (نوسیم): هیچم نیە (بۆ وتن) بۆ ئەو ئافرەتە جگە لەوەی کە عەلی وتویەتی، جا (بە ئیبنو عەبباس) وترا: کوفە شوێنێکی ساردە (ئەم ئافرەتە چۆن بۆ هەموو نوێژێک خۆی بشۆرێ!)، (ئیبنو عەبباس) وتی: ئەگەر خوا مەیلی لێ بێت بە شتی سەختتر تاقی دەکاتەوە.

٩٣٨ - «عنْ مُجاهِدٍ، قَالَ: قِيلَ لِابْنِ عبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، إنَّ أرْضها أرْضٌ باردةٌ، فقالَ: تُؤخِّرُ الظُّهْرَ وتعجِّلُ العصْرَ، وتغْتسلُ غُسْلاً، وتؤخِّرُ المغْربَ، وتعجِّلُ العشاءَ، وتغْتسلُ غُسْلاً، وتغْتسلُ لِلفجْرِ غُسْلاً»[4].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە موجاهید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، وترا: زەوی و شوێنی ئافرەتەکە ساردە (چی بکات)؟ وتی: نیوەڕۆ تاخیر دەکات و عەسر زوو دەکات و یەک جار خۆی دەشۆریت، وە مەغریب تاخیر دەکات و عیشاش زوو دەکات و یەک جار خۆی دەشۆرێت، وە بۆ نوێژی بەیانیش جارێک خۆی دەشۆرێت.

٩٣٩ - «عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ ابْنَةَ جَحْشٍ كَانَتْ تَحْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَكَانَتْ تُسْتَحَاضُ، فَكَانَتْ تَخْرُجُ مِنْ مِرْكَنِهَا وَإِنَّهُ لَعَالِيهِ الدَّمُ فَتُصَلِّي»[١].

واتە: لە زەینەبی کچی ئومم و سەلەمە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە کە کچی جەحش لە ژێر نیکاحی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف بوو (خێزانی ئەو بوو) و تووشی (خوێنی) ئیستیحازە دەبوو، جا کە لە تەشتەکەی دەهاتە دەرەوە (لە کاتی خۆ شۆردن) خوێنەکە دەهاتە سەرەوەی ئاوەکە (خوێنەکەی ئەوەندە زۆر بووە)، وە نوێژی دەکرد.

٩٤٠ - «حَدَّثَنَا الْأَوْزَاعِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ، وَيَحْيَى بْنَ أَبِي كَثِيرٍ، يَقُولَانِ: تُفْرِدُ لِكُلِّ صَلَاةٍ اغْتِسَالَةً قَالَ الْأَوْزَاعِيُّ: وَبَلَغَنِي عَنْ مَكْحُولٍ مِثْلُ ذَلِكَ»[٢].

واتە: لە ئەوزاعی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە زوهری و یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر بوو دەیانووت: (دەبێت ئافرەتی موستەحازە) بۆ هەر نوێژێک خۆشۆردنێکی بە جیا بکات، ئەوزاعی وتویەتی: هەروەها لە مەکحولەوە بە هەمان شێوەی ئەوەم پێگەیشتووە.

٩٤١ - «أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، كَانَ يَقُولُ: لِكُلِّ صَلَاتَيْنِ اغْتِسَالَةٌ، وَتُفْرِدُ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ اغْتِسَالَةً»[٣].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، کە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، هەموو جار دەیوت: بۆ هەر دوو نوێژێک یەک خۆشۆردن هەیە، بۆ نوێژی بەیانیش بە جیا خۆشۆردنێک ئەنجام دەدات.

٩٤٢ - «عَنْ حَمَّادٍ الْكُوفِيِّ، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ إِبْرَاهِيمَ، فَقَالَتْ: إِنِّي أُسْتَحَاضُ؟ فَقَالَ: عَلَيْكِ بِالْمَاءِ فَانْضَحِيهِ، فَإِنَّهُ يَقْطَعُ الدَّمَ عَنْكِ»[٤].

واتە: لە حەممادی کوفی گێڕدراوەتەوە، کە ئافرەتێک پرسیاری لە ئیبراهیم کردو وتی: من تووشی ئیستیحازە دەبم (حوکمم چیە)؟ وتی: ئاو بەکاربهێنە و پێی بڕشێنە، چونکە ئاو خوێنت لەسەر ڕادەگرێت.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

٩٤٣ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي الْمُطَلَّقَةِ الَّتِي ارْتِيبَ بِهَا تَرَبَّصُ سَنَةً، فَإِنْ حَاضَتْ، وَإِلاَّ تَرَبَّصَتْ بَعْدَ انْقِضَاءِ السَّنَةِ ثَلاَثَةَ أَشْهُرٍ، فَإِنْ حَاضَتْ وَإِلاَّ فَقَدِ انْقَضَتْ عِدَّتُهَا»[١].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو ئافرەتە تەڵاقدراوەی كە گومانی لە (مان و نەمانی حەیزەكەی هەیە بە هۆی بە تەمەنی و تاخیر بوونی حەیزەكەی) دەبێ ساڵێک چاوەڕێ بكات، ئەگەر سوڕی مانگانەی بینی (باشە)، ئەگەرنا دەبێ پاش تەواو بوونی ساڵێک سێ مانگان چاوەڕێ بكات، جا ئەگەر سوڕی مانگانەی بینی (ئەوە باشە) ئەگەرنا ئەوە عیددەكەی تەواو بووە.

٩٤٤ - «أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، قَالَ: سُئِلَ مَالِكٌ، عَنْ عِدَّةِ الْمُسْتَحَاضَةِ إِذَا طُلِّقَتْ فَحَدَّثَنَا مَالِكٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: أَنَّهُ قَالَ عِدَّتُهَا سَنَةٌ، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: هُوَ قَوْلُ مَالِكٍ»[٢].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی مەسلەمە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیار لە مالیک كرا دەربارەی عیددەی ئافرەتی موستەحازە ئەگەر طەڵاق درابێت، جا مالیک بۆی گێڕاینەوە لە ئیبنو شیهاب، ئەویش لە سەعیدی كوڕی موسەییبەوە گێڕاویەتیەوە كە وتویەتی: عیددەكەی ساڵێک، ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەوە بۆچوونی مالیكە.

٩٤٥ - «حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، قَالَ: سُئِلَ جَابِرُ بْنُ زَيْدٍ عَنِ الْمَرْأَةِ تُطَلَّقُ وَهِيَ شَابَّةٌ فَتَرْتَفِعُ حِيضَتُهَا مِنْ غَيْرِ كِبَرٍ؟ قَالَ: مِنْ غَيْرِ حَيْضٍ تَحَيَّضُ؟ وَقَالَ طَاوُسٌ ثَلاَثَةَ أَشْهُرٍ»[٣].

واتە: لە عەمری كوڕی دینار گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیار لە جابری كوڕی زەید كرا دەربارەی ئەو ئافرەتەی كە تەڵاق دەدرێت لە كاتێكدا گەنجەو سوڕی مانگانەكەی نامێنێت (لەدەستی دەدات) بێ ئەوەی تەمەنی گەورە بێت؟ وتی: بەبێ سوڕی مانگانە حوكمی حەیزی بۆ دەدرێت، طاووسیش وتویەتی: (عیددەكەی) سێ مانگە.

٩٤٦ - «عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: إِذَا طَلَّقَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ فَحَاضَتْ حَيْضَةً أَوْ حَيْضَتَيْنِ، ثُمَّ ارْتَفَعَتْ حَيْضَتُهَا إِنْ كَانَ ذَلِكَ مِنْ كِبَرٍ، اعْتَدَّتْ ثَلاَثَةَ أَشْهُرٍ، وَإِنْ كَانَتْ شَابَّةً وَارْتَابَتْ، اعْتَدَّتْ سَنَةً بَعْدَ الرِّيبَةِ»[٤].

واتە: لە زوهری گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر پیاو ئافرەتەكەی تەڵاقداو حەیزێک یان دوو حەیزی بینی، دواتر حەیزەكەی نەما (لەدەستیدا) ئەگەر لەبەر بەتەمەنی بوو ئەوە سێ مانگ عیددە دەبینێ، ئەگەر گەنجیش بوو عادەتی تێكچوو ئەوە ساڵێک عیددە دەبینێ پاش تێكەڵی و گومان پەیدابوونەكە.

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

٩٤٧ - «عَنْ عِكْرِمَةَ، قَالَ: الْمُسْتَحَاضَةُ وَالَّتِي لاَ يَسْتَقِيمُ لَهَا حَيْضٌ، فَتَحِيضُ فِي شَهْرٍ مَرَّةً وَفِي الشَّهْرِ مَرَّتَيْنِ عِدَّتُهَا ثَلاَثَةُ أَشْهُرٍ»[١].

واتە: لە عیكریمە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازەو ئەو ئافرەتەی كە سوڕی مانگانەی جێگیر نابێت و مانگ هەیە جارێک سوڕی مانگانە دەبینێت، مانگیش هەیە دوو جار دەیبینێ، ئەوە عیددەكەی سێ مانگە.

٩٤٨ - «عَنْ حَمَّادٍ، قَالَ: تَعْتَدُّ بالأقرَاءِ»[٢].

واتە: لە حەممادە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عیددە دەبینێ بە سێ پاک بوونەوە.

٩٤٩ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، قَالَ: عِدَّةُ الْمُسْتَحَاضَةِ سَنَةٌ»[٣].

واتە: لە سەعیدی كوڕی موسەییب گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عیددەی ئافرەتی موستەحازە ساڵێكە.

٩٥٠ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: الْمُسْتَحَاضَةُ تَعْتَدُّ بالأقرَاءِ»[٤].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە عیددە دەبینێ بە سێ پاک بوونەوە.

٩٥١ - «عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: بالأقرَاءِ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: أَهْلُ الْحِجَازِ يَقُولُونَ: الْأَقْرَاءُ: الْأَطْهَارُ. وَقَالَ أَهْلُ الْعِرَاقِ: هُوَ الْحَيْضُ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَأَنَا أَقُولُ: هُوَ الْحَيْضُ»[٥].

واتە: لە زوهری گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە (أقراء)ە، ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەهلی حیجاز دەڵێن: (الْأَقْرَاء): واتا پاک بوونەوە، ئەهلی عێراقیش دەڵێن: حەیزە، عەبدوڵلا وتویەتی: منیش دەڵێم حەیزە.

٩٥٢ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: الْمُسْتَحَاضَةُ تَعْتَدُّ بالأقرَاءِ»[٦].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی موستەحازە عیددە دەبینێ بە سێ قورء.

٩٥٣ - «عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ، قَالَ: سَأَلْتُ الزُّهْرِيَّ، عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ شَابَّةٌ تَحِيضُ، فَانْقَطَعَ عَنْهَا الْمَحِيضُ حِينَ طَلَّقَهَا فَلَمْ تَرَ دَمًا كَمْ تَعْتَدُّ؟ قَالَ: ثَلاَثَةَ أَشْهُرٍ»[٧].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ أثر صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح.

(٦) ـ إسناده صحيح.

(٧) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە ئەوزاعی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە زوهری کرد دەربارەی پیاوێک کە ئافرەتەکەی تەڵاق دابێت لە کاتێکدا (ئافرەتەکە) گەنجە و سوڕی مانگانەی خۆی دەبینی، لەناکاو سوڕی مانگانەکەی پچراو (نەما) ئەو کاتەی تەڵاقیدا، بۆیە هیچ خوێنێک نابینێ جا ئایا چەند عیددە دەبینێ؟ وتی: سێ مانگ.

٩٥٤ - «عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ قَالَ: وَسَأَلْتُ الزُّهْرِيَّ، عَنْ رَجُلٍ طلَّقَ امْرَأَتَهُ فَحَاضَتْ حَيْضَتَيْنِ، ثُمَّ ارْتَفَعَتْ حَيْضَتُهَا، كَمْ تَرَبَّصُ؟ قَالَ: عِدَّتُهَا سَنَةٌ»[١].

واتە: ئەوزاعی وتویەتی: پرسیارم لە زوهری کرد دەربارەی پیاوێک کە ئافرەتەکەی تەڵاق داوە، ئافرەتەکەش دوو سوڕی مانگانەی بینیوە، دواتر سوڕی مانگانەکەی نەماوە (لە دەستی داوە) چەند چاوەڕێ دەکات (بۆ عیددە)؟ وتی: عیددەکەی ساڵێکە.

٩٥٥ـ «قَالَ: وَسَأَلْتُ الزُّهْرِيَّ، عَنْ رَجُلٍ طلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ تَحِيضُ، تَمْكُثُ ثَلاَثَةَ أَشْهُرٍ، ثُمَّ تَحِيضُ حَيْضَةً، ثُمَّ يَتَأَخَّرُ عَنْهَا الْحَيْضُ، ثُمَّ تَمْكُثُ السَّبْعَةَ الْأَشْهُرَ وَالثَّمَانِيَةَ، ثُمَّ تَحِيضُ أُخْرَى تَسْتَعْجِلُ إِلَيْهَا مَرَّةً وَتَسْتَأْخِرُ أُخْرَى، كَيْفَ تَعْتَدُّ؟ قَالَ: إِذا اخْتَلَفَتْ حَيْضَتُهَا عَنْ أَقْرَائِهَا فَعِدَّتُهَا سَنَةٌ»[٢].

واتە: ئەوزاعی وتویەتی: پرسیارم لە زوهری کرد دەربارەی پیاوێک کە خێزانەکەی طەڵاقداوە لە کاتێکدا (ئافرەتەکە هێشتا گەنجە) و حەیز دەبینێ، سێ مانگ دەمێنێتەوە ئنجا حەیزێک دەبینێ، دواتر حەیزی تاخیر دەبێ (بە شێوەیەک) دواتر حەوت هەشت مانگ دەمێنێتەوە ئنجا حەیزێکیتر دەبینێ، حەیزێکیان زوو تووشی دەبێت ئەوەیتریشیان تاخیر، جا چۆن عیددە دەبینێ؟ (زوهری) وتی: ئەگەر حەیزەکەی جیاواز بوو لەگەڵ سوڕی مانگانەی عادەتی پێشتری خۆی، ئەوە عیددەکەی ساڵێکە.

٩٥٦ - «عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ قُلتُ: وَكَيْفَ إِنْ كَانَ طَلَّقَ وَهِيَ تَحِيضُ فِي كُلِّ سَنَةٍ مَرَّةً كَمْ تَعْتَدُّ؟ قَالَ: إِنْ كَانَتْ تَحِيضُ أَقْرَاؤُهَا مَعْلُومَةٌ هِيَ أَقْرَاؤُهَا، فَإِنَّا نَرَى أَنْ تَعْتَدَّ أَقْرَاءَهَا»[٣].

واتە: (ئەوزاعی دەڵێ) وتم: ئەی چۆنە ئەگەر تەڵاقی دابێت لە کاتێکدا ئافرەتەکە لە ساڵێکدا یەک جار دەکەوێتە سوڕی مانگانە چەند عیددە دەبینێت؟ (زوهری) وتی: ئەگەر ئافرەتەکە قورئەکانی خۆی بە زانراوی دەبینی (دیار بوو عادەتی خۆی چەندە لە سوڕی مانگانەکانی) ئەوە قوڕئەکانی ئەوەیە، ئێمە پێمان وایە کە بە گوێرەی قوڕئەکانی خۆی عیددە ببینێ (کەواتە مادەم عادەتی وایە ساڵ جارێک تووشی سوڕی مانگانە دەبێ ئەوە دەبا بوەستێ تا سێ جار تووشی سوڕی مانگانە دەبێت، ئەوە عیددەکەیەتی، ئنجا دەتوانێ شوو بکاتەوە).

٩٥٧- «عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ، قَالَ: سَأَلْتُ الزُّهْرِيَّ، عَنِ الرَّجُلِ يَبْتَاعُ الْجَارِيَةَ لَمْ تَبْلُغِ الْمَحِيضَ، وَلاَ تَحْمِلُ مِثْلُهَا، بِكَمْ يَسْتَبْرِئُهَا؟ قَالَ: بِثَلاَثَةِ أَشْهُرٍ»[٤].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢)ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئەوزاعی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە زوهری کرد دەربارەی ئەو پیاوەی جاریەیەک دەکڕێت کە تەمەنی نەگەیشتۆتە ئەوەی سوڕی مانگانە ببینێ و هاوچەشنی ئەو جاریەیەش دوو گیان نابن (چونکە بچوکە) جا ماوەی چەند چاوەڕێ دەکات (بۆ ئیستبرائی ڕەحم، تاوەکو ڕوون ببێتەوە ڕەحمی هیچی تیا نیە) وتی: بە سێ مانگ.

٩٥٨ - «وَقَالَ يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ: بِخَمْسَةٍ وَأَرْبَعِينَ يَوْمًا»[١].

واتە: هەروەها یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر وتویەتی: بە چل و پێنج ڕۆژ دەردەکەوێ.

٩٥٩ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ فِي الْمُسْتَحَاضَةِ: تَغْتَسِلُ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ وَتُصَلِّي»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، کە هەموو جار دەربارەی ئافرەتی موستەحازە دەیووت: خۆی دەشۆرێ لە کاتی هەموو نوێژێکداو نوێژ دەکات.

٩٦٠- غير موجود[٣].

٩٦١ - «وَقَالَ حَمَّادٌ: لَوْ أَنَّ مُسْتَحَاضَةً جَهِلَتْ فَتَرَكَتِ الصَّلَاةَ أَشْهُرًا فَإِنَّهَا تَقْضِي تِلْكَ الصَّلَوَاتِ؟ قِيلَ لَهُ: وَكَيْفَ تَقْضِيهَا؟ قَالَ: تَقْضِيهَا فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ إِنِ اسْتَطَاعَتْ قِيلَ لِعبْدِ اللَّهِ: تَقُولُ بِهِ؟ قَالَ: إِيْ وَاللَّهِ »[٤].

واتە: حەممادیش وتویەتی: ئەگەر ئافرەتێکی موستەحازە نەیزانی (خوێنەکەی ئیستیحازەیە وایزانی خوێنی حەیزە) و یەک مانگ وازی لە نوێژ هێنا، ئەوە ئەو نوێژانە قەزا دەکاتەوە، پێی وترا: چۆن قەزایان دەکاتەوە؟ وتی: لە یەک ڕۆژدا قەزایان دەکاتەوە ئەگەر توانی، بە عەبدوڵڵا وترا: تۆش ئاوا دەڵێی؟ وتی: ئەرێ والله.

## بابەت: دەربارەی (حوکمی) ئافرەتی دوو گیان ئەگەر خوێنی بینی

٩٦٢ - «حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، قَالَ: سَأَلْتُ الزُّهْرِيَّ، عَنِ الْحَامِلِ تَرَى الدَّمَ، فَقَالَ: تَدَعُ الصَّلَاةَ»[٥].

واتە: لە مالیکی کوڕی ئەنەس گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە زوهری کرد دەربارەی ئافرەتی دوو گیان کە خوێن ببینێ، وتی: واز لە نوێژ دەهێنێ (مادەم خوێنەکە هی حەیزە).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ سقط في الترقيم.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

٩٦٣ - «عَنْ عُثْمَانَ بْنِ الأَسود، قَالَ: سَأَلْتُ مُجَاهِدًا، عَنْ امْرَأَتِي رَأَتْ دَمًا وَأَنَا أُرَاهَا حَامِلاً؟ قَالَ: ذَلِكَ غَيْضُ الأَرْحَامِ: ﴿ ٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ ﴾ الرعد، فَمَا غَاضَتْ مِنْ شَيْءٍ، زَادَتْ مِثْلَهُ فِي الْحَمْلِ»[1].

واتە: لە عوسمانی کوڕی ئەسوەد گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە موجاهید کرد دەربارەی ئافرەتەکەم کە خوێن دەبینێ لەکاتێکدا من دەیبینم دوو گیانە، وتی: ئەوە کەمبونەوەی ڕەحمە، وەک خوا دەفەرموێ: [خوا چاک دەزانێت بەوەی هەموو مێیینەیەک چی لە سکیدا هەڵگرتووە، هەروەها دەزانێت بەوەش کە دەپوکێتەوەو کەم دەکات و لەبار دەچێت و بەوەش کە زیاد دەکات و گەورە دەبێت]، جا هەر شتێک کەم بکات هاو وێنەکەی لە ڕەحم زیاد دەکات (واتە: ئەو خوێنەی ئافرەتی دوو گیان دەیبینێ ئەوە خوێنی ڕەحمە لە بەشی منداڵەکەیە دێتە دەرەوەو، لە خوێنەکە کەم دەکات و دواتر ئەو ئەندازەیە دروست دەبێتەوە لە ڕەحمدا).

٩٦٤ - «عَنْ عِكْرِمَةَ، فِي هَذِهِ الآيَةِ: ﴿ ٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ ﴾ الرعد، قَالَ: ذَلِكَ الْحَيْضُ عَلَى الْحَبَلِ، لاَ تَحِيضُ يَوْمًا فِي الْحَبَلِ إِلاَّ زَادَتْهُ طَاهِرًا فِي حَبَلِهَا»[2].

واتە: لە عیکریمە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو ئایەتەی: ﴿ ٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ ﴾الرعد، [خوا چاک دەزانێت بەوەی هەموو مێینەیەک چی لە سکیدا هەڵگرتووە، هەروەها دەزانێت بەوەش کە دەپوکێتەوەو کەم دەکات و لەبار دەچێت و بەوەش کە زیاد دەکات و گەورە دەبێت، هەموو شتێک لای ئەو زاتە بە ئەندازە و پێوانەیە] وتویەتی: ئەوە سوڕی مانگانەیە لەسەر دوو گیانی (لە حاڵەتی دوو گیانیدا)، (ئافرەت) هیچ ڕۆژێک نیە تووشی حەیز ببێت لە حاڵەتی دوو گیانیدا حەتمەن پاکیەتی زیاد دەکات لە حەملەکەیدا.

٩٦٥ - «عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، قَالَ: أَمْرٌ لاَ يُخْتَلَفُ فِيهِ عِنْدَنَا عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، الْمَرْأَةُ الْحُبْلَى إِذَا رَأَتِ الدَّمَ أَنَّهَا لاَ تُصَلِّي حَتَّى تَطْهُرَ»[3].

واتە: لە یەحیای کوڕی سەعید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (ئەوە) بابەتێکە ڕا جیایی تیا نیە لەلای ئێمە کە لە عائیشەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە (وتویەتی): ئافرەتی دوو گیان ئەگەر خوێنی بینی ئەوە نوێژ ناکات تا پاک دەبێتەوە.

تێبینی: هەر لە دایکمان عائیشەوەش (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە لە فەرموودەی تر کە وتویەتی: ئافرەتی دوو گیان خوێنیش ببینێ دەبێ نوێژەکانی بکات.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

٩٦٦ - «عَنْ عِكْرِمَةَ، ﴿وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ ۝٨﴾ الرعد، قَالَ: هُوَ الْحَيْضُ عَلَى الْحَبَلِ: ﴿وَمَا تَزْدَادُ ۝٨﴾ الرعد، قَالَ: فَلَهَا بِكُلِّ يَوْمٍ حَاضَتْ فِي حَمْلِهَا يَوْمًا تَزْدَادُ فِي طُهْرِهَا حَتَّى تَسْتَكْمِلَ تِسْعَةَ أَشْهُرٍ طَاهِرًا»[١].

واتە: لە عیكریمە گێڕدراوەتەوە (دەربارەی ئەو ئایەتەی:) ﴿وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ ۝٨﴾ الرعد، [هەروەها دەزانێت بەوەش كە دەپوكێتەوە و كەم دەكات] وتویەتی: ئەوە حەیزە لەسەر دوو گیانی، (وە كە دەفەرموێت): [هەروەها زانایە بەوەش كە زیاد دەكات]، وتویەتی: بە گشت ڕۆژێک كە تووشی حەیز دەبێت لە حاڵەتی دوو گیانیەكەی ڕۆژێكی بۆ هەیە كە پاكیەكەی تیادا زیاد دەكات، تاوەكو نۆ مانگی پاكیەتی تەواو دەكات.

٩٦٧ - «عَنْ مُجَاهِدٍ، ﴿وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ ۝٨﴾ الرعد، قَالَ: إِذَا حَاضَتِ الْمَرْأَةُ وَهِيَ حَامِلٌ، قَالَ: يَكُونُ ذَلِكَ نُقْصَانًا مِنَ الْوَلَدِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى تِسْعَةِ أَشْهُرٍ، كَانَ تَمَامًا لِمَا نَقَصَ مِنْ وَلَدِهَا»[٢].

واتە: لە موجاهید گێڕدراوەتەوە، (دەربارەی ئەو ئایەتە): ﴿وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ ۝٨﴾ الرعد، [هەروەها دەزانێت بەوەش كە دەپوكێتەوەو كەم دەكات] وتویەتی: ئەوە لەو كاتەیە كە ئافرەت تووشی حەیز دەبێت لە كاتێكدا كە دوو گیانە، (هەروەها) وتویەتی: ئەوە دەبێتە كەم بوونەوە لە منداڵەكە، جا ئەگەر حەملەكە زیاتری خایاند لە نۆ مانگ ئەوە تەواو كردن و پڕ كردنەوەی ئەو نەقسەیە كە لە منداڵەكەی دروست بووە.

٩٦٨ - «عَنْ بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُزَنِيِّ، أَنَّهُ قَالَ: امْرَأَتِي تَحِيضُ وَهِيَ حُبْلَى»[٣].

واتە: لە بەكری كوڕی عەبدوڵلای موزەنی گێڕدراوەتەوە، كە وتویەتی: ئافرەتەكەم سوڕی مانگانە دەبینێ لە كاتێكدا كە دوو گیانە.

٩٦٩ - «قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: سمعْتُ سُلَيْمَانَ بْنَ حرْبٍ، يقولُ: امْرأتِي تحيضُ وهيَ حُبْلى»[٤].

واتە: ئەبو موحەممەد وتویەتی: گوێم لە سولەیمانی كوڕی حەڕب بوو دەیوت: ئافرەتەكەم سوڕی مانگانە دەبینێ لە كاتێكدا كە دوو گیانە.

٩٧٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا قَالَتْ: إِذَا رَأَتِ الْحُبْلَى الدَّمَ، فَلْتُمْسِكْ عَنِ الصَّلَاةِ فَإِنَّهُ حَيْضٌ»[٥].

واتە: لە دایكمان عائیشە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە كە وتویەتی: ئەگەر ئافرەتی دوو گیان خوێنی بینی با واز لە نوێژ بهێنێت، چونكە ئەوە حەیز و سوڕی مانگانەیە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

٩٧١ - «أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْلَمَةَ، حَدَّثَنَا مَالِكٌ، أَنَّهُ بَلَغَهُ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا مِثْلُ ذَلِكَ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە دایکمان عائیشەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

٩٧٢- «عَنِ الشَّعْبِيِّ، فِي الْحَامِلِ تَرَى الدَّمَ: إِنْ كَانَ عَبِيطًا، اغْتَسَلَتْ وَصَلَّتْ، وَإِنْ كَانَتْ تَرِيَّةً، تَوَضَّأَتْ وَصَلَّتْ»[٢].

واتە: لە شەعبی گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی دوو گیان کە خوێن ببینێ (وتویەتی): ئەگەر خوێنەکە ساف و گەش بوو (خوێنی تەواو بوو) ئەوە خۆی دەشۆرێ و نوێژ دەکات، ئەگەریش سپی یان زەرد، یان لێڵ بوو ئەوە دەستنوێژ دەشۆرێ و نوێژ دەکات.

٩٧٣ - «أَخْبَرَنَا أَبُو الْمُغِيرَةِ، عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ مِثْلَه»[٣].

واتە: ئەبو موغیرە لە ئەوزاعیەوە هەمان شتی گێڕاوەتەوە.

٩٧٤ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: إِنْ كَانَتْ تَرَاهُ كَمَا كَانَتْ تَرَاهُ قَبْلَ ذَلِكَ فِي أَقْرَائِهَا، تَرَكَتِ الصَّلَاةَ، وَإِنْ كَانَ إِنَّمَا هُوَ فِي الْيَوْمِ والْيَوْمَيْنِ، لَمْ تَدَعِ الصَّلَاةَ»[٤].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ئافرەتەکە خوێنی دەبینی (ماوەیەکی زۆر) وەک (ماوەی) ئەو خوێنەی پێشتر لە سوڕی مانگانەکەیدا (دەیبینی) ئەوە واز لە نوێژ دەهێنێ، ئەگەریش خوێن بینینەکەی تەنها لە یەک دوو ڕۆژدا بوو ئەوە واز لە نوێژ ناهێنێت.

٩٧٥ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، فِي الْحَامِلِ تَرَى الدَّمَ، قَالَتْ: لَا يَمْنَعُهَا ذَلِكَ مِنْ صَلَاةٍ»[٥].

واتە: لە دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی دوو گیان کە خوێن ببینێ وتویەتی: ئەوە ڕێگری لێ ناکات لە نوێژ (واتە: هەر دەبێ نوێژەکانی ئەنجام بدات).

٩٧٦ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، فِي الْحَامِلِ تَرَى الدَّمَ، قَالَتْ: تَغْتَسِلُ وَتُصَلِّي قَالَ يَزِيدُ: لَا تَغْتَسِلُ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَقُولُ بِقَوْلِ يَزِيدَ»[٦].

واتە: لە دایکمان عائیشە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی دوو گیان کە خوێن ببینێ وتویەتی: خۆی دەشۆرێ و نوێژ دەکات، یەزید وتویەتی: خۆی ناشۆرێ، عەبدوڵلا وتویەتی: من بە قسەی یەزید دەکەم (بۆچوونی ئەوم هەیە).

---

(١) ـ إسناده معضل.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ رجاله ثقات.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

(٦) ـ إسناده ضعيف.

٩٧٧ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي الْحَامِلِ تَرَى الدَّمَ، قَالَ: هِيَ بِمَنْزِلَةِ الْمُسْتَحَاضَةِ، غَيْرَ أَنَّهَا لاَ تَدَعُ الصَّلاَةَ»[١].

واتە: لە حەسەن گێردراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی دوو گیان کە خوێن ببینێ، وتویەتی: وەک ئافرەتی موستەحازە وایە، تەنها ئەوە نەبێت ئافرەتی موستەحازە واز لە نوێژ ناهێنێت.

٩٧٨ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي الْحَامِلِ تَرَى الدَّمَ، قَالَ: تَغْسِلُ عَنْهَا الدَّمَ، وَتَتَوَضَّأُ، وَتُصَلِّي»[٢].

واتە: لە ئیبراهیم گێردراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی دوو گیان کە خوێن ببینێ وتویەتی: خوێن لەخۆی دەشۆرێ و دەستنوێژ دەشۆرێ و نوێژ دەکات.

٩٧٩ - «عَنْ عَطَاءٍ، وَالْحَكَمِ، قَالاَ: إِذَا رَأَتِ الْحَامِلُ الدَّمَ، تَوَضَّأَتْ وَصَلَّتْ»[٣].

واتە: لە عەطاء و حەکەم گێردراوەتەوە، وتویانە: ئەگەر ئافرەتی دوو گیان خوێنی بینی، دەستنوێژ دەشۆرێ و نوێژ دەکات.

٩٨٠ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْحَامِلِ تَرَى الدَّمَ، قَالَ: تَوَضَّأُ وَتُصَلِّي»[٤].

واتە: لە عەطائەوە گێردراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی دوو گیان کە خوێن ببینێ وتویەتی: دەستنوێژ دەشۆرێ و نوێژ دەکات.

٩٨١ - «عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: هِيَ بِمَنْزِلَةِ الْمُسْتَحَاضَةِ»[٥].

واتە: لە حەسەن گێردراوەتەوە، وتویەتی: وەک ئافرەتی موستەحازە وایە.

٩٨٢ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: لاَ يَكُونُ حَيْضٌ عَلَى حَمْلٍ»[٦].

واتە: لە ئیبراهیم گێردراوەتەوە، وتویەتی: هیچ حەیزێک بوونی نیە لەسەر دوو گیانی (واتە: بە بۆچوونی ئیبراهیم نابێ ئەو خوێنە حەیز بێت و، دەبێت ئافرەتەکە نوێژەکانی بکات).

٩٨٣ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي الْحَامِلِ تَرَى الدَّمَ، قَالَ: هِيَ بِمَنْزِلَةِ الْمُسْتَحَاضَةِ»[٧].

واتە: لە حەسەن گێردراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی دوو گیان کە خوێن ببینێ وتویەتی: وەک ئافرەتی موستەحازە وایە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.
(٢) ـ إسناده صحيح.
(٣) ـ إسناده ضعيف.
(٤) ـ إسناده صحيح.
(٥) ـ أثر صحيح.
(٦) ـ إسناده صحيح.
(٧) ـ إسناده صحيح.

٩٨٤ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، إِذَا رَأَتِ الْحَامِلُ الدَّمَ لَمْ تَدَعِ الصَّلاَةَ»[١].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە (وتویەتی): ئەگەر ئافرەتی دوو گیان خوێنی بینی واز لە نوێژ ناهێنێت.

٩٨٥ - «عَنْ عَطَاءٍ، وَالْحَكَمِ بْنِ عُتَيْبَةَ، أَنَّهُمَا: قَالاَ فِي الْحُبْلَى وَالَّتِي قَعَدَتْ عَنِ الْمَحِيضِ: إِذَا رَأَتَا الدَّمَ تَوَضَّأَتَا وَصَلَّتَا وَلاَ تَغْتَسِلاَنِ»[٢].

واتە: لە عەطاء و حەكەمی كوڕی عوتەیبی گێڕدراوەتەوە هەردووكیان دەربارەی ئافرەتی دوو گیان و ئەو ئافرەتەی لە سوڕی مانگانە بۆتەوە (سوڕی مانگانەی نەماوە بە هیچ شێوەیەک) وتویانە: ئەگەر خوێنیان بینی دەستنوێژ دەشۆرن و نوێژ دەكەن، خۆشیان ناشۆرن.

٩٨٦ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: تَغْتَسِلاَنِ وَتُصَلِّيَانِ»[٣].

واتە: لە عەطاوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆیان دەشۆرن و نوێژ دەكەن.

٩٨٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: إِنَّ الْحُبْلَى لاَ تَحِيضُ، فَإِذَا رَأَتِ الدَّمَ، فَلْتَغْتَسِلْ، وَلْتُصَلِّي»[٤].

واتە: لە دایكمان عائیشە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە وتویەتی: ئافرەتی دوو گیان سوڕی مانگانە نابینێ، جا ئەگەر خوێنی بینی با خۆی بشۆرێ و نوێژ بكات (خوێنەكە هی حەیز نیە).

٩٨٨ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي الْمَرْأَةِ إِذَا رَأَتِ الدَّمَ، وَهِيَ تَمَخَّضُ؟ قَالَ: هُوَ حَيْضٌ تَتْرُكُ الصَّلاَةَ»[٥].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەت ئەگەر خوێنی بینی لە كاتێكدا كە خەریكە حەملەكەی دابنێ و (ژان گرتویەتی)، وتویەتی: ئەوە (خوێنی) حەیزە واز لە نوێژ دەهێنێت.

٩٨٩ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي الْمَرْأَةِ الْحَامِلِ: إِذَا ضَرَبَهَا الطَّلْقُ، وَرَأَتِ الدَّمَ عَلَى الْوَلَدِ، فَلْتُمْسِكْ عَنِ الصَّلاَةِ»[٦].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی دوو گیان (وتویەتی): ئەگەر ژانی منداڵ بوون گرتی و خوێنی لەسەر منداڵەكە بینی با واز لە نوێژ بهێنێ.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده حسن.

(٥) ـ إسناده حسن.

(٦) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: کات و ماوەی خوێنی منداڵ بوون و ئەوەی دەربارەی وتراوە

٩٩٠ - «عَنْ قَتَادَةَ، فِي النُّفَسَاءِ كَطُهْرِ امْرَأَةٍ مِنْ نِسَائِهَا»[١].

واتە: لە قەتادە گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو ئافرەتەی خوێنی منداڵ بوونی بینیوە (وتویەتی): (ماوەی پاک بوونەوەکەی) وەک (ماوەی) پاک بوونەوەی ئافرەتێکی هاو چەشنی خۆیەتی لە خزم و کەسەکانی.

٩٩١ - «عَنِ الْحَسَنِ، فِي النُّفَسَاءِ: تُمْسِكُ عَنِ الصَّلاَةِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، فَإِنْ رَأَتِ الطُّهْرَ فَذَاكَ، وَإِنْ لَمْ تَرَ الطُّهْرَ، أَمْسَكَتْ عَنِ الصَّلاَةِ أَيَّامًا خَمْسًا، سِتًّا، فَإِنْ طَهُرَتْ، فَذَاكَ، وَإِلاَّ أَمْسَكَتْ عَنِ الصَّلاَةِ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْخَمْسِينَ، فَإِنْ طَهُرَتْ، فَذَاكَ، وَإِلاَّ، فَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ»[٢].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو ئافرەتەی خوێنی منداڵ بوونی بینیوە (وتویەتی): چل ڕۆژ واز لە نوێژ دەهێنێت، جا ئەگەر (لە پاش ئەو ماوەیە) خاوێن بوونەوەی بینی ئەوە باشە، ئەگەریش خاوێن بوونەوەی نەبینی ئەوە واز لە نوێژ دەهێنێ پێنج شەش ڕۆژیتر، جا ئەگەر (لەپاشان) خاوێن بوویەوە ئەوە باشە، ئەگەریش خاوێن نەبوویەوە ئەوە واز لە نوێژ دەهێنێ لە نێوان ئەو ماوەیە تا پەنجا (واتە: لە چل ڕۆژ تا پەنجا ڕۆژ هەر بە نیفاس حیسابە)، جا ئەگەر (لە پاش ئەو ماوەیە) خاوێن بوویەوە ئەوە باشە، ئەگەریش خاوێن نەبوویەوە ئەوە موستەحازەیە (دەبێت خۆی بشۆرێ و دەستنوێژ بۆ گشت نوێژێک بشۆرێ و نوێژەکانی بکات).

٩٩٢ - «عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ، أَنَّهُ كَانَ لاَ يَقْرَبُ النُّفَسَاءَ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، وَقَالَ الْحَسَنُ: النُّفَسَاءُ خَمْسَةٌ وَأَرْبَعُونَ إِلَى خَمْسِينَ، فَمَا زَادَ فَهِيَ مُسْتَحَاضَةٌ»[٣].

واتە: لە عوسمانی کوڕی ئەبو عاص گێڕدراوەتەوە کە نزیکی ئەو ئافرەتە نەدەکەوتەوە (سەر جێیی نەدەکرد) کە خوێنی منداڵ بوون دەبینێ تا چل ڕۆژ، حەسەنیش وتویەتی: خوێنی منداڵ بوون چل و پێنج بۆ پەنجا ڕۆژە، ئەوەی زیاتر بوو (لەو ماوەیە) ئەوە موستەحازەیە (خوێنچڕکەیە).

٩٩٣ - «عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ، قَالَ: وَقْتُ النُّفَسَاءِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، فَإِنْ طَهُرَتْ، وَإِلاَّ، فَلاَ تُجَاوِزْهُ حَتَّى تُصَلِّيَ»[٤].

واتە: لە عوسمانی کوڕی ئەبو عاص گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ماوەی خوێنی منداڵ بوون چل ڕۆژە، ئەگەر (ئافرەتەکە) پاک بوویەوە (ئەوە باشە)، ئەگەرنا نابێ لەو ماوەیە تێبپەڕێت تا نوێژ دەکات.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده منقطع.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

٩٩٤ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: إِنْ كَانَ لِلنُّفَسَاءِ عَادَةٌ، وَإِلاَ جَلَسَتْ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً»[١].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ئەو ئافرەتەی كە لە خوێنی منداڵ بووندایە عادەتی خۆی هەبێت (بەوەی پێشتر منداڵی بوبێت و بزانێت تا چ ماوەیەك خوێن دەبینێت، ئەوە بە عادەتی خۆی كار دەكات)، ئەگەرنا چل شەو دادەنیشێت (نوێژ ناكات).

٩٩٥ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: النِّفَاسُ حَيْضٌ»[٢].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خوێنی منداڵ بوون حەیزە (واتە: وەك حەیز مامەڵەی لەگەڵ دەكرێت).

٩٩٦ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: تَنْتَظِرُ النُّفَسَاءُ أَرْبَعِينَ يَوْمًا أَوْ نَحْوَهَا»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەو ئافرەتانەی خوێنی منداڵ بوون دەبینن چل ڕۆژ چاوەڕێ دەكەن یان نزیكی ئەو ئەندازەیە.

٩٩٧ - «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: كَانَتِ النُّفَسَاءُ تَجْلِسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، أَوْ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، فَكَانَتْ إِحْدَانَا تَطْلِي الْوَرْسَ عَلَى وَجْهِهَا مِنَ الْكَلَفِ»[٤].

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەو ئافرەتەی خوێنی منداڵ بوونی دەبینی لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ چل ڕۆژ یان چل شەو دادەنیشت،

٩٩٨ - «عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، أَنَّ امْرَأَةً لِعَائِذِ بْنِ عَمْرٍو، نُفِسَتْ فَجَاءَتْ بَعْدَمَا مَضَتْ عِشْرُونَ لَيْلَةً، فَدَخَلَتْ فِي لِحَافِهِ، فَقَالَ: مَنْ هَذِهِ؟ قَالَتْ: أَنَا فُلاَنَةُ، إِنِّي قَدْ طَهُرْتُ فَرَكَضَهَا بِرِجْلِهِ، فَقَالَ: لاَ تُغَرِّينِي عَنْ دِينِي حَتَّى تَمْضِيَ أَرْبَعُونَ لَيْلَةً»[٥].

واتە: لە موعاویەی كوڕی قوڕڕەتەوە گێڕدراوەتەوە كە یەكێك لە خێزانەكانی عائیذی كوڕی عەمر كەوتە خوێنی منداڵبوون و هات بۆ لای عائیذی مێردی، پاش تێپەڕبونی بیست شەو و هاتە ژێر جێگەو پێخەفی مێردەكەی، عائیذیش وتی: ئەوە كێیە؟ ئافرەتەكە وتی: منم فڵانە ئافرەتەم، من پاك بوومەتەوە (لە خوێنی منداڵبوون)، جا عائیذی مێردی لەقەیەكی لێدا بە قاچی (بۆ دوورخستنەوە) و وتی: لە خشتەم نەبەی لە ئاینەكەم و (تووشی سەرجێیی و تاوانم نەكەیت) تاوەكو چل شەو تێپەڕ دەبێت.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده حسن.

(٥) ـ إسناده ضعيف جداً.

٩٩٩ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: النُّفَسَاءُ تَجْلِسُ نَحْوًا مِنْ أَرْبَعِينَ يَوْمًا»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەو ئافرەتەی خوێنی منداڵ بوونی بینیوە نزیكەی چل ڕۆژ دادەنیشێ.

١٠٠٠ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: النُّفَسَاءُ تَنْتَظِرُ نَحْوًا مِنْ أَرْبَعِينَ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەو ئافرەتەی خوێنی منداڵ بوونی بینیوە نزیكەی چل ڕۆژ چاوەڕێ دەكات.

١٠٠١ - «حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ الْحَسَنَ، قَالَ: فِي النُّفَسَاءِ الَّتِي تَرَى الدَّمَ: تَرَبَّصُ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، ثُمَّ تُصَلِّي، قَالَ: وقالَ الشَّعْبِيُّ، شَهْرَيْنِ ثُمَّ هِيَ بِمَنْزِلَةِ الْمُسْتَحَاضَةِ»[٣].

واتە: لە حەسەن گێردراوەتەوە كە دەربارەی ئەو ئافرەتەی منداڵی بووەو، خوێن دەبینێ وتویەتی: چل شەو چاوەڕێ دەكات، دواتر نوێژ دەكات، وتویەتی: شەعبیش وتویەتی: دوو مانگ چاوەڕێ دەكات، دواتر (دوای ئەو ماوەیە) وەک موستەحازە حیسابە.

١٠٠٢- «عَنْ مَكْحُولٍ، قَالَ: الْمَرْأَةُ تَنْتَظِرُ مِنَ الْغُلَامِ ثَلَاثِينَ يَوْمًا، وَمِنَ الْجَارِيَةِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا يَعْنِي: النُّفَسَاءَ، قَالَ مَرْوَانُ: هُوَ قَوْلُ سَعِيدِ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ وقالَ الْأَوْزَاعِيُّ: هُمَا سَوَاءٌ»[٤].

واتە: لە مەكحولە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەت لە لە دایک بوونی منداڵی كوڕ سی (٣٠) ڕۆژ چاوەڕێ دەكات، لە منداڵی كچیش چل (٤٠) ڕۆژ، واتا (مەبەستی ماوەی): نیفاسە.

مەڕوان وتویەتی: ئەوە قسەی سەعیدی كوڕی عەبدولعەزیزیشە، ئەوزاعیش وتویەتی: كوڕو كچ هەردووكیان وەک یەكن (جیاوازیان نیە).

١٠٠٣- «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: إِذَا رَأَتِ الدَّمَ عِنْدَ الطَّلْقِ يَوْمًا أَوْ يَوْمَيْنِ، فَهُوَ مِنَ النِّفَاسِ»[٥].

واتە: لە حەسەن گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ئافرەت خوێنی بینی لە كاتی ژانی مناڵ بووندا ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ، ئەوە بەشێكە لە خوێنی نیفاس (مناڵ بوون).

١٠٠٤ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْحَامِلِ تَرَى الدَّمَ وَهِيَ تَطْلُقُ؟ قَالَ: تَصْنَعُ مَا تَصْنَعُ الْمُسْتَحَاضَةُ»[٦].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

(٦) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی دوو گیان کە خوێن ببینێ لە کاتێکدا ژانی منداڵ بوون گرتویەتی؟ وتویەتی: ئەوە ئەنجام دەدات کە ئافرەتی موستەحازە ئەنجامی دەدات (حوکمەکەی وەک ئەو وایە).

بابەت: (حوکمی) ئافرەت کە جەنابەتدار بێت، دواتر تووشی سوڕی مانگانە ببێت

١٠٠٥ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي الْمَرْأَةِ تُجْنِبُ، ثُمَّ تَحِيضُ، قَالَ: تَغْتَسِلُ»[١].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەت کە تووشی جەنابەت ببێت دواتر تووشی سوڕی مانگانە ببێت، وتویەتی: خۆی دەشۆرێت (واتە: با تووشی حەیزیش بووبێت دەبێت هەر خۆی بشۆرێت بۆ جەنابەتەکە، جا دواتر کە پاک بوویەوە ئەو کات خۆی دەشۆرێتەوە بۆ سوڕی مانگانە).

١٠٠٦ - «أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ هِشَامٍ، عَنِ الْحَسَنِ مِثْلَهُ»[٢].

واتە: لە حەسەنەوە هەمان شت گێڕدراوەتەوە.

١٠٠٧ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: الْحَيْضُ أَكْبَرُ»[٣].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: حەیز گەورەترە (واتە: پێویست ناکات جارێک بۆ جەنابەت و دواتریش بۆ سوڕی مانگانە خۆی بشۆرێت، چونکە حەیز لە جەنابەت گەورەترە و لەخۆی دەگرێت، کەواتە کە لە سوڕی مانگانە پاک بوویەوە خۆی دەشۆرێت و هەردووکیانی لەسەر لادەچێت).

١٠٠٨ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي رَجُلٍ غَشِيَ امْرَأَتَهُ فَحَاضَتْ فَقَالَ: تَغْتَسِلُ أَحَبُّ إِلَيَّ»[٤].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە دەربارەی پیاوێک کە چوبێتە لای خێزانەکەی (سەر جێیی لەگەڵ کردبێت) و (دواتر) ئافرەتەکە تووشی حەیز بووبێت، وتویەتی: خۆی دەشۆرێت، ئەوەم پێ چاکترە (کەواتە: جارێک خۆی بۆ جەنابەت دەشۆرێت جارێکیش بۆ سوڕی مانگانە).

١٠٠٩ - «عَنْ عَطَاءٍ، وَالنَّخَعِيِّ، قَالاَ: لِتَغْتَسِلْ مِنَ الْجَنَابَةِ»[٥].

واتە: لە عەطاء و نەخەعیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: با خۆی بشۆرێت لە جەنابەت.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ أثر صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) - إسناده ضعيف.

١٠١٠ - «حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ، عَنْ حَمَّادٍ، عَنْ عَامِرٍ الْأَحْوَلِ، عَنِ الْحَسَنِ، مِثْلَ ذَلِكَ»[١].

واتە: لە حەسەنەوە گێردراوەتەوە، هاوشێوەی ئەوەی پێشتر.

١٠١١ - «قَالَ إِبْرَاهِيمُ: تَغْتَسِلُ»[٢].

واتە: ئیبراهیم وتویەتی: خۆی دەشۆرێت.

١٠١٢ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ تَغْتَسِلُ»[٣].

واتە: لە شەعبیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: خۆی دەشۆرێت.

## بابەت: (دەربارەی ئەوەی ئایا چاکە یان چاک نیە) ئافرەتی حەیزدار دەستنوێژ بشۆرێت لە کاتی نوێژەکاندا

١٠١٣ - «حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، قَالَ: سَمِعْتُ الْحَكَمَ بْنَ عُتَيْبَةَ، يَقُولُ: كَانَ يُعْجِبُهُمْ فِي الْمَرْأَةِ الْحَائِضِ أَنْ تَتَوَضَّأَ وُضُوءَهَا لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ تُسَبِّحَ اللَّهَ وَتُكَبِّرَهُ فِي وَقْتِ الصَّلاَةِ»[٤].

واتە: لە یەحیای کوڕی ئەییوب گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە حەکەمی کوڕی عوتەیبە بوو دەیوت: (مامۆستاکانم) دەربارەی ئافرەتی حەیزدار پێیان باش بوو کە دەستنوێژ بشۆرێت وەک دەستنوێژ شۆردنی بۆ نوێژ، دواتر (سبحان الله) و (اللّٰه أكبر) بکات لە کاتی نوێژدا.

١٠١٤ - «عَنْ سُلَيْمَانَ التَّيْمِيِّ، قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي قِلاَبَةَ: الْحَائِضُ تَتَوَضَّأُ عِنْدَ وَقْتِ كُلِّ صَلاَةٍ، وَتَذْكُرُ اللَّهَ؟ فَقَالَ: مَا وَجَدْتُ لِهَذَا أَصْلاً»[٥].

واتە: لە سولەیمانی تەیمیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: بە ئەبو قیلابەم وت: (ئایا) ئافرەتی حەیزدار دەستنوێژ دەشۆرێت لە کاتی هەموو نوێژێکداو زیکرو یادی خوا دەکات؟ (ئەبو قیلابە) وتی: هیچ بنچینە و بەڵگەیەکم بۆ ئەوە دەست نەکەوتووە.

١٠١٥ - «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّهُ كَانَ يَأْمُرُ الْمَرْأَةَ الْحَائِضَ عِنْدَ أَوَانِ الصَّلاَةِ، أَنْ تَوَضَّأَ وَتَجْلِسَ بِفِنَاءِ مَسْجِدِهَا فَتَذْكُرَ اللَّهَ وَتُسَبِّحَ»[٦].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) - إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

(٦) - إسناده ضعيف.

**واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیەوە گێڕدراوەتەوە کە فەرمانی بە ئافرەتی حەیزدار کردوە لە کاتی نوێژدا دەستنوێژ بشۆرێت و لە حەوشەی مزگەوتەکەیدا (شوێنی نوێژ کردنیدا) دابنیشێت و یادی خوا بکات و تەسبیحات بکات.**

**١٠١٦ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْمَرْأَةِ الْحَائِضِ: أَتَقْرَأُ؟ قَالَ: لاَ، إِلاَّ طَرَفَ الآيَةِ وَلَكِنْ تَوَضَّأُ عِنْدَ وَقْتِ كُلِّ صَلاَةٍ، ثُمَّ تَسْتَقْبِلُ الْقِبْلَةَ، وَتُسَبِّحُ، وَتُكَبِّرُ، وَتَدْعُو اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ»[1].**

**واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی حەیزدار کە ئاخۆ (قورئان) بخوێنێت؟ وتویەتی: نەخێر، تەنها بەشێکی ئایەت نەبێت (دەکرێت بەشێک لە ئایەت بخوێنێت)، بەڵکو دەستنوێژ دەشۆرێت لە کاتی هەموو نوێژێکدا، دواتر ڕوو دەکاتە قیبلە و (سبحان اللّٰه) و (اللّٰه أكبر) و دووعا و نزا دەکات.**

**١٠١٧ - «حَدَّثَنَا مَكْحُولٌ، قَالَ: تُؤْمَرُ الْحَائِضُ تَتَوَضَّأُ عِنْدَ مَوَاقِيتِ الصَّلاَةِ، وَتَسْتَقْبِلُ الْقِبْلَةَ وَتَذْكُرُ اللَّهَ تَعَالَى»[2].**

**واتە: لە مەکحول گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فەرمان بە ئافرەتی حەیزدار دەکرێت دەستنوێژ بشۆرێت لە کاتەکانی نوێژدا، هەروەها ڕوو بکاتە قیبلەو یادی خوای بە رز بکات.**

بابەت: دەربارەی ئافرەتی حەیزدار کە ڕۆژوو دەگێڕێتەوەو نوێژ ناگێڕێتەوە

**١٠١٨ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: إِذَا سَمِعَ الْحَائِضُ وَالْجُنُبُ السَّجْدَةَ يَغْتَسِلُ الْجُنُبُ وَيَسْجُدُ، وَلاَ تَقْضِي الْحَائِضُ، لِأَنَّهَا لاَ تُصَلِّي»[3].**

**واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ئافرەتی حەیزارو کەسی جەنابەتدار گوێیان لە (ئایەتی) سەجدە بوو ئەوە جەنابەتدارەکە خۆی دەشۆرێت و کڕنووش دەبات، (بەڵام) ئافرەتی حەیزدار (خۆی ناشۆرێت و کڕنووش نابات و دواتریش کە پاک بوویەوە) کڕنووشەکە ناگێڕێتەوە، چونکە ئەو نوێژ ناکات (مادەم نوێژ نەگێڕێتەوە کڕنووشیش ناگێڕێتەوە).**

**١٠١٩ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي الْحَائِضِ تَسْمَعُ السَّجْدَةَ، قَالَ: لاَ تَقْضِي»[4].**

**واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، دەربارەی (حوکمی) ئافرەتی حەیزدار کە گوێی لە (ئایەتی) سەجدە بێت، وتویەتی: نایگێڕێتەوە.**

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

١٠٢٠ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: لَيْسَ عَلَيْهَا شَيْءٌ»[١].

واته: له ئیبراهیم گێردراوەتەوە، وتویەتی: هیچی لەسەر نیە (نە گێڕانەوەی نوێژ و نە گێڕانەوەی سەجدە).

١٠٢١ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُنَّا نَحِيضُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ فَمَا يَأْمُرُ امْرَأَةً مِنَّا بِرَدِّ الصَّلاَةِ»[٢].

واته: له دایكمان عائیشه (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە تووشی حەیز دەبووین له لای پێغەمبەری خوا ﷺو فەرمانی بە هیچ ئافرەتێک لە ئێمە نەدەكرد بە گێڕانەوەی نوێژ.

١٠٢٢ - «عَنْ مُعَاذَةَ، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، أَتَقْضِي إِحْدَانَا صَلاَةَ أَيَّامِ حَيْضِهَا؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ قَدْ كَانَتْ إِحْدَانَا تَحِيضُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺفَلاَ تُؤْمَرُ بِقَضَاءٍ»[٣].

واته: له موعازەتەوە گێڕدراوەتەوە، كە ئافرەتێک پرسیاری لە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) كرد كە ئاخۆ هەر یەكێک لە ئێمە نوێژی ڕۆژانی سوڕی مانگانەی دەگێڕێتەوە؟ عائیشەش وتی: مەگەر تۆ (خەواریجی) حەروریەی؟ (شوێنێكە لە نزیک كوفە، جا بەشێک لە خەواریجەكانی ئەو شوێنە پێیان وابوو ئافرەت دەبێت نوێژەكانی قەزا بكاتەوە، بۆیە دایكە عائیشە ئاوای فەرموو)، (دواتر دایكە عائیشە وتی): بە دڵنیایی كە یەكێک لە ئێمە تووشی حەیز دەبوو لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ فەرمانی پێنەدەكرا بە قەزا كردنەوە.

١٠٢٣ - «عَنْ مُعَاذَةَ، قَالَ: أَبُو النُّعْمَانِ، كَأَنَّ حَمَّادًا، فَرِقَ حَدِيثَ أَيُّوبَ فَجَاءَ بِهَذَا»[٤].

بەم ڕێگایەش ئەم فەرموودەیە گێڕدراوەتەوە.

١٠٢٤ - «عَنْ عَامِرٍ، قَالَ: إِذَا سَمِعَتِ الْحَائِضُ السَّجْدَةَ، فَلاَ تَسْجُدْ»[٥].

واته: له عامیرِ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ئافرەتی حەیزدار گوێی لە (ئایەتی) سەجدە بوو ئەوە سەجدە نابات.

١٠٢٥ - «عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، قَالَ: لاَ تَسْجُدُ الْمَرْأَةُ الْحَائِضُ إِذَا سَمِعَتِ السَّجْدَةَ»[٦].

واته: له ئەبو قیلابەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی حەیزدار سوجدە نابات ئەگەر گوێی لە (ئایەتی) سەجدە بوو.

---

(١) - رجاله ثقات.

(٢) - إسناده ضعيف.

(٣) - صحيح.

(٤) - صحيح.

(٥) - إسناده ضعيف.

(٦) - إسناده صحيح.

١٠٢٦ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، أَنَّهُ كَانَ يَكْرَهُ لِلْحَائِضِ أَنْ تَسْجُدَ إِذَا سَمِعَتِ السَّجْدَةَ»[١].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە کە پێی باش نەبووە بۆ ئافرەتی حەیزدار کە سوجدە ببات ئەگەر گوێی لە (ئایەتی) سەجدە بوو.

١٠٢٧ - «عَنْ أَبِي غَالِبٍ عَجْلاَنَ، قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، عَنِ النُّفَسَاءِ وَالْحَائِضِ: هَلْ تَقْضِيَانِ الصَّلاَةَ إِذَا تَطَهَّرْنَ؟ قَالَ: هُوَ ذَا: أَزْوَاجُ النَّبِيِّ ﷺفَلَوْ فَعَلْنَ ذَلِكَ أَمَرْنَا نِسَاءَنَا بِذَلِكَ»[٢].

واتە: لە ئەبو غالیب عەجلان گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، کرد دەربارەی ئەو ئافرەتەی خوێنی مناڵ بوون دەبینێ لەگەڵ ئافرەتی حەیزدار کە ئاخۆ نوێژ دەگێڕنەوە و قەزای دەکەنەوە کە پاک بوونەوە؟ وتی: ئەوەتا خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئاوایان بکردایە (ئێمەش) فەرمانمان بە خێزانەکانمان بەوە دەکرد، (بەڵام ئەوان شتی وایان نەکردووە).

١٠٢٨ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: أَتَتِ امْرَأَةٌ إِلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُا، فَقَالَتْ: أَقْضِي مَا تَرَكْتُ مِنْ صَلاَتِي فِي الْحَيْضِ عِنْدَ الطُّهْرِ؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، كَانَتْ إِحْدَانَا تَحِيضُ وَتَطْهُرُ فَلاَ يَأْمُرُنَا بِالْقَضَاءِ»[٣].

واتە: لە عەبدورڕەحمانی کوڕی قاسم گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: ئافرەتێک هات بۆ لای عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) و، وتی: ئایا ئەو نوێژانەی کە نەمکردوون لە کاتی سوڕی مانگانەدا بیانگێڕنەوە لە کاتی پاک بوونەوەدا؟ عائیشەش وتی: ئایا تۆ (خەواریجی) حەروریەی؟! ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، یەکێک لە ئێمە تووشی سوڕی مانگانە دەبوو و پاک دەبوویەوە فەرمانی پێ نەدەکرد بە گێڕانەوەی نوێژ.

١٠٢٩ - «عَنْ كَثِيرٍ أَبِي إِسْمَاعِيلَ، قَالَ: قُلْتُ لِفَاطِمَةَ يَعْنِي بِنْتَ عَلِيّ، أَتَقْضِينَ صَلاَةَ أَيَّامِ حَيْضِكِ؟ قَالَتْ: لاَ»[٤].

واتە: لە کەثیری کوڕی ئیسماعیل گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە فاتیمەی کچی عەلیمان وت: ئایا نوێژی ڕۆژانی سوڕی مانگانەت دەگێڕیتەوە؟ وتی: نەخێر.

١٠٣٠ - «عَنْ يَزِيدَ الرِّشْكِ، قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاذَةَ عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، سَأَلَتْهَا امْرَأَةٌ: أَتَقْضِي الْحَائِضُ الصَّلاَةَ؟ قَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ: قَدْ حِضْنَ نِسَاءُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺفَأَمَرَهُنَّ يَجْزِينَ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: مَعْنَاهُ: أَنَّهُنَّ لاَ يَقْضِينَ»[٥].

---

(١) - إسناده ضعيف.

(٢) إسناده ضعيف.

(٣) - إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە یەزیدی ڕەشكەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە موعازە بووە لە دایكمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێراوەتەوە (وتویەتی): ئافرەتێک پرسیاری لێ كرد كە ئاخۆ ئافرەتی حەیزدار نوێژ دەگێڕێتەوە؟ عائیشە وتی: ئایا تۆ (خەواریجی) حەڕوریەی؟! ئافرەتەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ تووشی حەیز دەبوون و فەرمانی پێدەكردن كە تەواوە كارەكەیان و بەریان كەوتووە، عەبدوڵلا وتویەتی: واتەكەی ئەوەیە: ئەوان (نوێژەكان) ناگێڕنەوە.

## بابەت: ئافرەتی حەیزدار زیكرو یادی خوا دەكات و قوڕئان ناخوێنێتەوە

١٠٣١ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: الْحَائِضُ وَالْجُنُبُ يَذْكُرَانِ اللَّهَ وَيُسَمِّيَانِ»[١].

واتە: لە ئیبڕاهیم گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی حەیزدار و كەسی جەنابەتدار زیكرو یادی خوا دەكەن و (بسم الله)ش دەكەن (بەڵام «بسم الله»كە دەبێت بە نیەتی زیكر بێت، نەوەک بە نیەتی خوێندنی «بسم الله»ی قوڕئان).

١٠٣٢ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، وَسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، أَنَّهُمَا: قَالاَ لاَ يَقْرَأْ الْجُنُبُ وَالْحَائِضُ آيَةً تَامَّةً، يَقْرَآنِ الْحَرْفَ»[٢].

واتە: لە ئیبڕاهیم و سەعیدی كوڕی جوبەیر گێردراوەتەوە كە هەردووكیان وتویانە: كەسی جەنابەتدار و ئافرەتی حەیزدار ئایەتێكی تەواو ناخوێنێت (دروست نیە)، (بەڵكو) بەشێک دەخوێنن.

١٠٣٣ - «عَنْ عَامِرٍ: الْجُنُبُ وَالْحَائِضُ لاَ يَقْرَآنِ الْقُرْآنَ»[٣].

واتە: لە عامیرەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: كەسی جەنابەتدار و ئافرەتی حەیزدار قوڕئان ناخوێنن.

١٠٣٤ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: كَانَ عُمَرُ ﷺ، يَكْرَهُ أَوْ يَنْهَى أَنْ يَقْرَأَ الْجُنُبُ، قَالَ شُعْبَةُ: وَجَدْتُ فِي الْكِتَابِ: وَالْحَائِضُ»[٤].

واتە: لە ئیبڕاهیم گێردراوەتەوە وتویەتی: (ئیمامی) عومەر ﷺ پێی كارێكی خراپ بووە یان ڕێگری كردوە لەوەی كەسی جەنابەتدار قوڕئان بخوێنێت، شوعبە وتویەتی: لە نوسراوەكەدا بینیومە (نوسراوە) ئافرەتی حەیزداریش (واتە: ئیمامی عومەر بۆ هەم بۆ كەسی جەنابەتدار و هەم بۆ ئافرەتی حەیزدار ڕێگری كردوە قوڕئان بخوێنن).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

١٠٣٥ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: أَرْبَعَةٌ لاَ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ: عِنْدَ الْخَلاَءِ، وَفِي الْحَمَّامِ، وَالْجُنُبُ وَالْحَائِضُ، إِلاَّ الآيَةَ وَنَحْوَهَا لِلْجُنُبِ وَالْحَائِضِ»[1].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چوار جۆرە کەس هەن قورئان ناخوێنن: ئەو کەسەی لە سەر ئاوە و، ئەو کەسەی لە حەمامە و، ئەو کەسەر جەنابەتدارە و، ئەو ئافرەتەی حەیزدارە، تەنها ئایەتێک یان ئەندازەکەی نەبێت بۆ کەسی جەنابەتدار و حەیزدار (بۆ ئەم دووانە ئەو ئەندازەیە دروستە).

١٠٣٦ - «عن عطاء وحماد و إِبْرَاهِيمَ، وَسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالُوا: الْحَائِضُ وَالْجُنُبُ يَسْتَفْتِحُونَ الآيَةَ وَلاَ يُتِمُّونَ آخِرَهَا»[2].

واتە: لە عەطاء و حەمماد و ئیبراهیم و سەعیدی کوڕی جوبەیر گێڕدراوەتەوە، وتویانە: ئافرەتی حەیزدار و کەسی جەنابەتدار دەست بە خوێندنەوەی ئایەتێک دەکەن و کۆتاییەکەی تەواو ناکەن (دەبێ تەنها بەشێکی بخوێنن).

١٠٣٧ - «عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ، فِي الْحَائِضِ قَالَ: لاَ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ»[3].

واتە: لە ئەبو عالیە گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی حەیزدار وتویەتی: قورئان ناخوێنێت (دروست نیە بخوێنێت).

١٠٣٨ - «عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، كَانَتْ تَرْقِي أَسْمَاءَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، وَهِيَ عَارِكٌ»[4].

واتە: لە ئیبنو ئەبی مولەیکەوە گێڕدراوەتەوە کە دایکمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، دووعا و نوشتەی بۆ ئەسماء (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، دەکرد لە کاتێکدا حەیزدار بوو.

١٠٣٩ - «حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، قَالَ: الْجُنُبُ يَذْكُرُ اسْمَ اللَّهِ تَعَالَى»[5].

واتە: لە قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەسی جەنابەتدار زیکرو یادی خوا دەکات (ئاساییە و بۆی دروستە).

١٠٤٠ - «عَنْ أَبِي وَائِلٍ، قَالَ: كَانَ يُقَالُ: لاَ يَقْرَأُ الْجُنُبُ، وَلاَ الْحَائِضُ، وَلاَ يُقْرَأُ فِي الْحَمَّامِ، وَحَالاَنِ لاَ يَذْكُرُ الْعَبْدُ فِيهِمَا اللَّهَ: عِنْدَ الْخَلاَءِ وَعِنْدَ الْجِمَاعِ، إِلاَّ أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ، بَدَأَ فَسَمَّى اللَّهَ»[6].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

(٦) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئەبو وائیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وتراوە: کەسی جەنابەتدارو حەیزدار قورئان ناخوێنن، هەروەها لە حەمامیش ناخوێندرێت، وە لە دوو حاڵەتیشدا بەندەی مسوڵمان زیکری خوا ناکات و (دروست نیە): لە کاتی چوونە سەر ئاو و لە کاتی جیماع کردن، بەڵام پیاو (لە سەرەتا) کە کاتێک دەچێتە لای خێزانەکەی دەست پێدەکات ناوی خوا دەهێنێت (دەڵێت: (اللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان ما رزقتنا) تەنها ئەوەندە زیکرەی بۆ دروستە).

١٠٤١ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْمَرْأَةِ الْحَائِضِ تَقْرَأُ، قَالَ: لاَ، إِلاَّ طَرَفَ الآيَةِ»[١].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی حەیزدار (کە ئاخۆ) قورئان بخوێنێت؟ وتویەتی: نەخێر، تەنها بەشێکی ئایەت نەبێت (نابێت ئایەتێکی تەواو بخوێنێت، بەڵام بەشێکی ئایەت دروستە).

١٠٤٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: أَرْبَعٌ لاَ يَحْرُمْنَ عَلَى جُنُبٍ وَلاَ حَائِضٍ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چوار شت هەن لەسەر کەسی جەنابەتدار و حەیزدار حەرام نین: (کە بریتین لە): (سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله أكبر).

بابەت: دەربارەی ئافرەتی حەیزدار کە گوێی لە (ئایەتی) سەجدە بێت سەجدە نابات

١٠٤٣ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الْحَائِضِ تَسْمَعُ السَّجْدَةَ، قَالَ: لاَ تَسْجُدُ لِأَنَّهَا صَلاَةٌ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، گێڕدراوەتەوە کە پرسیاری لێکراوە دەربارەی (حوکمی) ئافرەتی حەیزدار کە گوێی لە (ئایەتی) سەجدە دەبێت (ئایا سەجدە دەبات یان نا)؟ وتویەتی: سەجدە نابات چونکە سەجدە نوێژە (واتە: لە هەموو شتێک وەک نوێژ حیسابە).

١٠٤٤ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، وَأَبِي الضُّحَى، قَالاَ: لاَ تَسْجُدُ»[٤].

واتە: لە ئیبراهیم و ئەبو ضوحاوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: سەجدە نابات.

١٠٤٥ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، وَسَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالاَ: لَيْسَ عَلَيْهَا ذَاكَ الصَّلاَةُ أَكْبَرُ مِنْ ذَلِكَ»[٥].

واتە: لە ئیبراهیم و سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: ئەوەی لەسەر نیە (واتە: لەسەری نیە سەجدە بەرێت)، (چونکە) نوێژ لەو گەورەترەو (لەگەڵ ئەوەشدا لەسەری نیە).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

١٠٤٦ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: مُنِعَتْ خَيْرًا مِنْ ذَلِكَ: الصَّلاَةَ الْمَكْتُوبَةَ»[١].

واتە: لە عەطائەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: لەوە چاکتری لێ قەدەغە کراوە کە نوێژی واجبە (کەواتە: چۆن دەبێت سەجدەی تیلاوە بەرێت!؟).

١٠٤٧ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: لاَ تَسْجُدُ»[٢].

واتە: لە حەسەن گێردراوەتەوە، وتویەتی: سەجدە نابات.

١٠٤٨ - «عَنِ الزُّهْرِيِّ، فِي الْمَرْأَةِ تَرَى الطُّهْرَ فَتَسْمَعُ السَّجْدَةَ، قَالَ: لاَ تَسْجُدُ حَتَّى تَغْتَسِلَ»[٣].

واتە: لە زوهری گێردراوەتەوە، دەربارەی (حوکمی) ئەو ئافرەتەی پاک بوونەوە دەبینێت (پاک بۆتەوە لە سوڕی مانگانە بەڵام خۆی نەشۆردووە) و گوێی لە (ئایەتی) سەجدە دەبێت، وتویەتی: سەجدە نابات تا خۆی دەشۆرێت.

١٠٤٩ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ لِلنِّسَاءِ: تَصَدَّقْنَ، فَإِنَّكُنَّ أَكْثَرُ أَهْلِ النَّارِ فَقَالَتِ امْرَأَةٌ لَيْسَتْ مِنْ عِلْيَةِ النِّسَاءِ: لِمَ، أَوْ بِمَ، أَوْ فِيمَ؟ قَالَ: إِنَّكُنَّ تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ، وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: مَا مِنْ نَاقِصِي الدِّينِ وَالْعَقْلِ أَغْلَبَ لِلرِّجَالِ ذَوِي الأَمْرِ عَلَى أَمْرِهِمْ مِنَ النِّسَاءِ، قَالَ رَجُلٌ: مَا نُقْصَانُ عَقْلِهَا؟ قَالَ: جُعِلَتْ شَهَادَةُ امْرَأَتَيْنِ بِشَهَادَةِ رَجُلٍ. قَالَ سُئِلَ: مَا نُقْصَانُ دِينِهَا؟ قَالَ: تَمْكُثُ كَذَا وَكَذَا مِنْ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ لاَ تُصَلِّي لِلَّهِ صَلاَةً»[٤].

واتە: لە عەبدوڵلا ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە کە بە ئافرەتانی فەرمووە: خێر و خێرات بکەت (شت ببەخشن)، چونکە ئێوە زۆرینەی ئەهلی ئاگرن (خۆتان ڕزگار بکەن)، ئافرەتێکیش کە پایەدار و بەناوبانگ نەبوو (بەڵکو ئافرەتێکی سادە بوو) وتی: بۆچی یان لەسەر چ شتێک؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ)، فەرمووی: ئێوە زۆر نەفرین و لەعنەت دەکەن و ئینکاری هەقی هاوسەر یان هەقی ئەو کەسانەی لەگەڵتان تێکەڵن دەکەن. عەبدوڵلا وتویەتی: هیچ لە نەقوستانی دین و دوور بینی نیە زاڵتر بێت بەسەر پیاوانی ژیر لە کارەکانیان وەک ئافرەتان، پیاوێک وتی: نەقوستانی عەقڵی ئافرەتان چیە؟ (عەبدوڵلا) وتی: شاهێدی دوو ئافرەت بە شەهادەی یەک پیاو دانراوە، وە پرسیاری لێ کرا: نەقوستانی دینەکەی چیە؟ وتی: ئەوەندە و ئەوەندە لە شەو و ڕۆژ دەمێنێتەوە یەک نوێژ بۆ خوا ئەنجام نادات.

---

(١)ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده حسن.

## بابەت: ئافرەتی حەیزدار دەتوانێت نوێژ بكات بە پۆشاكەكەی (كە تیایدا تووشی حەیز بووە) ئەو كاتەی پاك دەبێتەوە

١٠٥٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: إِذَا طَهُرَتِ الْمَرْأَةُ مِنَ الْحَيْضِ، فَلْتَتَّبِعْ ثَوْبَهَا الَّذِي يَلِي جِلْدَهَا، فَلْتَغْسِلْ مَا أَصَابَهُ مِنَ الْأَذَى، ثُمَّ تُصَلِّي فِيهِ»[١].

واتە: لە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ئافرەت پاک بوویەوە لە سوڕی مانگانە با موراقەبەی ئەو جلەی بكات كە بەر پێستی دەكەوێت (با سەیری بكات ئەگەر پیسیەكی پێوە بوو) با ئەوەی لە پیسی بەری كەوتووە بیشۆرێت، دواتر نوێژی پێوە بكات.

١٠٥١ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: كَانَ يَكُونُ، لِإِحْدَانَا الدِّرْعُ فِيهِ تَحِيضُ، وَفِيهِ تُجْنِبُ، ثُمَّ تَرَى فِيهِ الْقَطْرَةَ مِنْ دَمِ حَيْضَتِهَا، فَتَقْصَعُهُ بِرِيقِهَا»[٢].

واتە: لە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر یەک لە ئێمە جلێكی هەبوو تیایدا تووشی سوڕی مانگانە دەبوو، وە تیایدا تووشی جەنابەت دەبوو، جا دواتر (كە پاک دەبوویەوە سەیری دەكرد) دڵۆپە خوێنێكی حەیزی دەبینی و بە لیكی خۆی هەڵی دەپشاوت (دەپڕوكاند).

١٠٥٢ - «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، إِنَّ إِحْدَاكُنَّ تَسْبِقُهَا الْقَطْرَةُ مِنَ الدَّمِ، فَإِذَا أَصَابَتْ إِحْدَاكُنَّ ذَلِكَ، فَلْتَقْصَعْهُ بِرِيقِهَا»[٣].

واتە: لە ئوممی سەلەمەوە گێڕدراوەتەوە (وتویەتی): بە دڵنیایی (ئەی ئافرەتان) یەكێک لە ئێوە دڵۆپێک لە خوێنی هەر بەر دەكەوێت (ناتوانێت خۆی لێ بپارێزێت)، جا ئەگەر یەكێكتان ئەوەی بەسەر هات با بە لیكی خۆی هەڵی پشێوێت.

١٠٥٣ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: إِذَا غَسَلَتِ الْمَرْأَةُ الدَّمَ فَلَمْ يَذْهَبْ، فَلْتُغَيِّرْهُ بِصُفْرَةٍ، وَرْسٍ أَوْ زَعْفَرَانٍ»[٤].

واتە: لە دایكمان عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ئافرەت خوێنی (لەخۆی) شۆرد و (ڕەنگەكەی بە تەواوی) لانەچوو، ئەوە با (ڕەنگی خوێنەكە) بگۆڕێت بە زەردایی (ڕووەكی) وەرس یان (بە سورباوی) زەعفەڕان.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف جدا.

(٤) ـ إسناده صحيح.

١٠٥٤ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ لَهَا امْرَأَةٌ: الدَّمُ يَكُونُ فِي الثَّوْبِ فَأَغْسِلُهُ، فَلاَ يَذْهَبُ، فَأَقْطَعُهُ؟ قَالَتْ: الْمَاءُ طَهُورٌ»[١].

واتە: لە دایكمان عائیشە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، ئافرەتێک پێی وت: خوێن بە جلەوە دەلكێت و منیش دەیشۆرم (بەڵام شوێنەوارەكەی) ناڕوات، جا ئایا (شوێنەكە) ببڕم و لێی بكەمەوە؟ (عائیشە) وتی: ئاو پاككەرەوەیە (كە بە ئاو شۆردت پاک دەبێتەوە، با شوێنەوارەكەشی هەر مابێت، گرنگ ئەوەیە پیسیەكە لاچووە).

١٠٥٥ - «حَدَّثَنِي جَابِرُ بْنُ صُبْحٍ، قَالَ: سَمِعْتُ خِلاَسَ بْنَ عَمْرٍو، قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، تَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَبُو الْقَاسِمِ يَكُونُ مَعِي فِي الشِّعَارِ الْوَاحِدِ وَأَنَا حَائِضٌ طَامِثٌ: إِنْ أَصَابَهُ مِنِّي شَيْءٌ، غَسَلَ مَا أَصَابَهُ، لَمْ يَعْدُهُ إِلَى غَيْرِهِ، وَصَلَّى فِيهِ ثُمَّ يَعُودُ، وَإِنْ أَصَابَهُ مِنِّي شَيْءٌ، فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ: غَسَلَ مَكَانَهُ لَمْ يَعْدُهُ إِلَى غَيْرِهِ، وَصَلَّى فِيهِ»[٢].

واتە: لە جابیری كوڕی صوبحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە خیلاسی كوڕی عەمڕ بوو وتی: گوێم لە عائیشە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) بوو دەیوت: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ من دەبوو لەناو یەک پێچەر (یەک پەشتە ماڵ)، لە كاتێكدا من حەیزدار بووم، جا ئەگەر شتێک (دڵۆپە خوێنێكی) منی بەر كەوتبا، ئەو شوێنەی دەشۆرد كە پیسیەكەی بەر كەوتووە، بۆ جگە لەو شوێنە تێنەدەپەڕی (شوێنی تری نەدەشۆرد)، وە نوێژیشی پێوە دەكرد و دواتر دەگەڕایەوە (بۆ لام)، جا ئەگەر (دووبارە) لە منەوە شتێكی بەركەوتبایەوە ئاوای دەكردەوە: شوێنەكەی دەشۆرد، بۆ هیچ شوێنیتر تێپەڕ نەدەبوو (زیاتری نەدەشۆرد) و نوێژیشی پێوە دەكرد.

١٠٥٦ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِيمَا تَلْبَسُ الْمَرْأَةُ مِنَ الثِّيَابِ وَهِيَ حَائِضٌ إِنْ أَصَابَهُ دَمٌ، غَسَلَتْهُ، وَإِلاَّ فَلَيْسَ عَلَيْهَا غَسْلُهُ وَإِنْ عَرِقَتْ فِيهِ، فَإِنَّهُ يُجْزِئُهَا أَنْ تَنْضَحَهُ»[٣].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەوەی ئافرەت دەیپۆشێت لە جل و بەرگ لەكاتێكدا كە حەیزدارە، (وتویەتی): ئەگەر خوێنی بەر كەوتبوو دەیشۆرێت، ئەگەرنا شۆردنی لەسەر نیە هەر چەندە ئارەقەشی تیا كردبێت، ئەوەندەی بەسە ئاوێكی پیا بكات.

١٠٥٧- «عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: الْمَرْأَةُ الْحَائِضُ تُصَلِّي فِي ثِيَابِهَا الَّتِي تَحِيضُ فِيهَا، إِلاَّ أَنْ يُصِيبَ شَيْئًا مِنْهَا دَمٌ، فَتَغْسِلَ مَوْضِعَ الدَّمِ»[٤].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە موجاهیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی حەیزدار نوێژ لەو جلەیدا دەكات كە تیایدا تووشی حەیز بووە، تەنها ئەگەر شتێک لە خوێنی بەر كەوێت، ئەو كات شوێنی خوێنەكە دەشۆرێت (ئنجا نوێژی پێوە دەكات).

١٠٥٨- «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِي اللهُ عَنْهَما، قَالَتْ سَأَلْتُ: رَسُولَ اللَّهِ ﷺعَنْ دَمِ الْحَيْضِ يُصِيبُ الثَّوْبَ، قَالَ: حُتِّيهِ ثُمَّ رُشِّيهِ بِالْمَاءِ»[1].

واتە: لە ئەسمائی كچی (ئیمامی) ئەبوبەكر (رَضِي اللهُ عَنْهَما)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد دەربارەی خوێنی حەیز كە بەر جل و بەرگ دەكەوێت (ئایا حوكمی چۆنە)؟ فەرمووی: هەڵیكرێنە (ئەگەر وشک بوو) دواتر ئاو ڕشێنی بكە.

١٠٥٩ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: الْحَائِضُ لاَ تَغْسِلُ ثَوْبَهَا، إِذَا لَمْ يَكُنْ فِيهِ دَمٌ»[2].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی حەیزدار (كە پاک بوویەوە) جلەكەی ناشۆرێت ئەگەر هیچ خوێنێكی پێوە نەبێت.

١٠٦٠ - «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: سَمِعْتُ امْرَأَةً تَسْأَلُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ثَوْبِهَا إِذَا طَهُرَتْ مِنْ مَحِيضِهَا. كَيْفَ تَصْنَعُ بِهِ؟ قَالَ: إِنْ رَأَيْتِ فِيهِ دَمًا فَحُكِّيهِ، ثُمَّ اقْرُصِيهِ بِمَاءٍ، ثُمَّ انْضَحِي فِي سَائِرِهِ، فَصَلِّي فِيهِ»[3].

واتە: لە ئەسمائی كچی (ئیمامی) ئەبوبەكر (رَضِي اللهُ عَنْهَما)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئافرەتێک بوو پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد دەربارەی جلەكەی ئەو كاتەی پاک دەبێتەوە لە سوڕی مانگانەكەی كە ئاخۆ چی لێ بكات؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەگەر خوێنت پێوە بینی ئەوە هەڵیكرێنە، دواتر بە ئاو هەڵی پشێوە (بیگوشە)، دواتر ئەوەیتری ئاو ڕشێن بكە و نوێژی پێوە بكە.

١٠٦١ - «عَنْ أُمِّ قَيْسٍ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺعَنْ دَمِ الْحِيضَ يَكُونُ فِي الثَّوْبِ، قَالَ: اغْسِلِيهِ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَحُكِّيهِ بِضِلَعٍ»[4].

واتە: لە ئوممو قەیس (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ كرد دەربارەی خوێنی حەیز كە بە جل و بەرگەوە دەنوسێ، فەرمووی: بە ئاوو سیدر بیشۆرە (سیدر جۆرە گیایێک بوو لە جێگای صابوونی ئێستا بەكاریان دەهێنا بۆ شت پاک كردنەوە)، وە هەڵیكرێنە بە پارچە دارێک (پێش شۆردنەكە).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

١٠٦٢ - «عَنْ عَلِيِّ بْنِ الْمُبَارَكِ، قَالَ: سَمِعْتُ كَرِيمَةَ، قالَتْ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، وَسَأَلَتْهَا امْرَأَةٌ فَقَالَتِ الْمَرْأَةُ: يُصِيبُ ثَوْبَهَا مِنْ دَمِ حِيضَتِهَا؟ قَالَتْ: لِتَغْسِلْهُ بِالْمَاءِ قَالَتْ: فَإِنَّا نَغْسِلُهُ فَيَبْقَى أَثَرُهُ؟ قَالَتْ: إِنَّمَا الْمَاءَ طَهُورٌ»[١].

واته: لە عەلی کوڕی موبارەکەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە کەریمەوە بوو وتی: گوێم لە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) بوو ئافرەتێک پرسیاری لێ کرد، ئافرەتەکە وتی: کە جلەکەی خوێنی حەیزی بەرکەوتووە (چی بکەم)؟ (عائیشە) وتی: بە ئاو بیشۆرە، ئافرەتەکە وتی: ئێمە دەیشۆرین و شوێنەوارەکەی دەمێنێت (ئەو کات چی بکەین)؟ عائیشە وتی: بە دڵنیایی ئاو پاککەرەوەیە (مادەم بە ئاو دەیشۆری دڵ لە دڵ مەدە پاک بۆتەوە، با شوێنەواریشی بمێنێت).

١٠٦٣ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: كَانَتْ عَائِشَةُ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، تَرَى الشَّيْءَ مِنَ الْمَحِيضِ فِي ثَوْبِهَا فَتَحُتُّهُ بِالْحَجَرِ، أَوْ بِالْعُودِ، أَوْ بِالْقَرْنِ ثُمَّ تَرُشُّهُ»[٢].

واته: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) کە شتێکی حەیزی دەبینی بە جلەکەیەوە ئەوە بە بەرد یان بە پارچە دارێک یان بە قۆچی ئاژەڵ هەڵیدەکڕاند، دواتر ئاو ڕشێنی دەکرد.

## بابەت: دەربارەی (حوکمی) ئارەقەی کەسی جەنابەتدارو ئافرەتی حەیزدار

١٠٦٤ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُثْمَانَ بْنِ خُثَيْمٍ، قَالَ: سَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ، عَنِ الْجُنُبِ يَعْرَقُ فِي الثَّوْبِ ثُمَّ يَمْسَحُهُ بِهِ، قَالَ: لاَ بَأْسَ بِهِ»[٣].

واته: لە عەبدوڵڵای کوڕی عوسمانی کوڕی خوثەیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە سەعیدی کوڕی جوبەیر کرد دەربارەی (حوکمی) کەسی جەنابەتدار کە عەرەق دەکات لەناو جلێکدا، دواتریش هەر بە جلەکە دەیسڕێتەوە؟ وتی: هیچی تیا نیە (ئاساییە و پیس نیە).

١٠٦٥ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، أَنَّهُ كَانَ لاَ يَرَى بِعَرَقِ الْجُنُبِ فِي الثَّوْبِ بَأْسًا»[٤].

واته: لە سەعیدی کوڕی جوبەیر گێڕدراوەتەوە کە پێی وانەبووە عەرەق کردنی کەسی جەنابەتدار لە ناو جلێکدا هیچ کێشەیەکی هەبێت (پێی وانەبووە پیس بێت).

١٠٦٦ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، أَنَّهُ: كَانَ لاَ يَرَى بِهِ بَأْسًا»[٥].

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە شەعبی گێڕدراوەتەوە کە پێی وانەبووە (عەڕەق کردنی کەسی جەنابەتدار لە ناو جلێکدا) هیچ کێشەیەکی هەبێت.

١٠٦٧ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: مَا كُلُّ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ كَانُوا يَجِدُونَ ثَوْبَيْنِ. وقَالَ: إِذَا اغْتَسَلْتَ أَلَسْتَ تَلْبَسُهُ؟ فَذَاكَ بِذَاكَ»[1].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆ هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دوو جلیان نەبوو، هەروەها وتویەتی: ئەگەر (ئەو تاکە جلەی هەتە) شۆردت ئایا لەبەری ناکەیت؟! ئێ کەواتە کە بە عەڕەقیش تەڕ دەبێت وەک ئەوە وایە (ئەویش هەر خاوێن و بەنوێژە با تەڕ بێت).

١٠٦٨ - «عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، سُئِلَتْ عَنْ الرَّجُلِ يُصِيبُ الْمَرْأَةَ، ثُمَّ يَلْبَسُ الثَّوْبَ فَيَعْرَقُ فِيهِ، فَلَمْ تَرَ بِهِ بَأْسًا»[2].

واتە: لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە گێڕدراوەتەوە کە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) پرسیاری لێ کراوە دەربارەی (حوکمی) پیاوێک کە جیماع لەگەڵ ئافرەتەکەیدا بکات، دواتر جل لەبەر بکات و تیایدا ئارەقە (عەرەق) بکات؟ دایکمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، پێی وا نەبوو هیچ کێشەیەکی هەبێت.

١٠٦٩ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: لاَ بَأْسَ أَنْ يَعْرَقَ الْجُنُبُ وَالْحَائِضُ فِي الثَّوْبِ، يُصَلِّى فِيهِ»[3].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ کێشە نیە کە کەسی جەنابەتدارو ئافرەتی حەیزدار ئارەقە بکەن لەناو جل و بەرگێکدا کە نوێژی پێ بکرێت.

١٠٧٠ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي الْجُنُبِ يَعْرَقُ فِي ثَوْبِهِ، قَالَ: لاَ يَضُرُّهُ وَلاَ يَنْضَحُهُ بِالْمَاءِ»[4].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە دەربارەی کەسی جەنابەتدار کە ئارەقە بکات لەناو جلەکەیدا، وتویەتی: هیچ زیانی بۆی نیەو بە ئاویش نایرشێنێت.

١٠٧١ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، فِي الْحَائِضِ إِذَا عَرِقَتْ فِي ثِيَابِهَا. فَإِنَّهُ يُجْزِئُهَا أَنْ تَنْضَحَهُ بِالْمَاءِ»[5].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی حەیزدار کە ئارەقە بکات لەناو جلەکەیدا، (وتویەتی): ئەوەندەی بەسە کە بە ئاو بیرشێنێت.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤)ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح.

١٠٧٢ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنهَما، كَانَ يَعْرَقُ فِي الثَّوْبِ وَهُوَ جُنُبٌ، ثُمَّ يُصَلِّي فِيهِ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەر (رَضِي اللهُ عَنهَما)، گێڕدراوەتەوە، کە هەموو جار عەرەقی دەکرد لە ناو جل و بەرگدا لە کاتێکدا جەنابەتدار بوو، دواتر نوێژی پێوە دەکرد.

١٠٧٣ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما، أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يَرَى بَأْسًا بِعَرَقِ الْحَائِضِ وَالْجُنُبِ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِي اللهُ عَنهَما)، گێڕدراوەتەوە، کە پێی وانەبووە هیچ کێشەیەک هەبێت بە ئارەق کردنی ئافرەتی حەیزدار و کەسی جەنابەتدار.

بابەت: (حوکمی) نزیکبوونەوە لە ئافرەتی حەیزدار

١٠٧٤ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: مَا يَحِلُّ لِي مِنَ امْرَأَتِي وَهِيَ حَائِضٌ؟، قَالَ: لِتَشُدَّ عَلَيْهَا إِزَارَهَا، ثُمَّ شَأْنَكَ بِأَعْلَاهَا»[٣].

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردو وتی: چیم بۆ حەڵاڵە لە ئافرەتەکەم لە کاتێکدا کە لە سوڕی مانگانەدایە حەیزدارە؟ فەرمووی: با پۆشاکی خوارەوەی جەستەی چاک لەسەر خۆی قایم بکات (تا ئەو سنورە نەبەزێنن، چونکە حەڕامە)، دواتر کەیفی خۆتە بە لای سەرەوە (سەرەوەت بۆ حەڵاڵە).

١٠٧٥ - «عَنْ نَافِعٍ، قَالَ: أَرْسَلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ إِلَى عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، لِيَسْأَلَهَا: هَلْ يُبَاشِرُ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ؟ فَقَالَتْ: لِتَشُدَّ إِزَارَهَا عَلَى أَسْفَلِهَا، ثُمَّ يُبَاشِرُهَا»[٤].

واتە: لە نافیع گێڕدراوەتەوە، کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ناردی بۆ لای عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا)، تا پرسیاری لێ بکات: کە ئایا دەبێت پیاو لە ئافرەتەکەی نزیک بکەوێتەوە لە کاتێکدا کە حەیزدارە؟ عائیشە وتی: با ئافرەتەکە جلی خوارەوەی خۆی چاک توند بکات، دواتر پیاوەکە لێی نزیک بکەوێتەوە (بۆ دەربڕینی خۆشەویستی نێوانیان).

١٠٧٦ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: الْحَائِضُ يَأْتِيهَا زَوْجُهَا فِي مَرَاقِّهَا وَبَيْنَ فَخِذَيْهَا، فَإِذَا دَفَقَ، غَسَلَتْ مَا أَصَابَهَا وَاغْتَسَلَ هُوَ»[٥].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی حەیزدار پیاوەکەی دەچێتە لای لە شوێنە شەهوەت شکێنە حەڵاڵەکان و نێوان ڕانەکانی (جگە لە ئەندامی زاوزێی)، جا ئەگەر (پیاوەکە) ئاوی هات،

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكنه أثر صحيح لغيره .

(٣) ـ إسناده متصل.

(٤) ـ رجاله ثقات.

(٥) ـ إسناده صحيح.

ئافرەتەكە ئەوەی بەری كەوتووە (لە ئاوی پیاوەكەی) دەیشۆرێت و، پیاوەكەش خۆی دەشۆرێت (غوسلی جەنابەت دەكات).

١٠٧٧ - «قَالَ إِبْرَاهِيمُ، لَقَدْ عَلِمَتْ أُمُّ عِمْرَانَ أَنِّي أَطْعَنُ فِي أَلْيَتِهَا يَعْنِي: وَهِيَ حَائِضٌ»[1].

واتە: لە ئیبراهیم گێردراوەتەوە، وتویەتی: دایكی عیمران (واتە: خێزانم) دەزانێت كە من شەهوەتم بە ڕانەكانی دەشكێنم، واتە: لە كاتێكدا كە حەیزدارە.

١٠٧٨ - «حَدَّثَنَا مالَكُ بْنُ مِغْوَلٍ، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ عَطَاءً، عَنِ الْحَائِضِ، فَلَمْ يَرَ بِمَا دُونَ الدَّمِ بَأْسًا»[2].

واتە: مالیكی كوڕی میغوەل وتویەتی: پیاوێك پرسیاری لە عەطاء كرد دەربارەی ئافرەتی حەیزدار (كە ئاخۆ نزیك بوونەوە لێی دروستە)؟ (ئەویش لە وەڵامدا) پێی وانەبوو جگە لە شوێنی خوێنەكە (واتە: جگە لە ئەندامی زاوزێی) كێشەی هەبێت.

١٠٧٩ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُنْتُ إِذَا حِضْتُ أَمَرَنِي النَّبِيُّ ﷺ فَأَتَّزِرُ، وَكَانَ يُبَاشِرُنِي»[3].

واتە: لە دایكمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: من ئەو كاتەی تووشی حەیز دەبووم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ دەكردم كە خوارووی لاشەم دابپۆشم، پێغەمبەری خواش ﷺ لێم نزیك دەبوویەوە (هەقی یەكترمان دەدا).

١٠٨٠ - «حَدَّثَنِي مَيْمُونُ بْنُ مِهْرَانَ، قَالَ: سُئِلَتْ عَائِشَةُ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا: مَا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ مِنَ امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ قَالَتْ مَا فَوْقَ الْإِزَارِ»[4].

واتە: مەیمونی كوڕی میهران وتویەتی: پرسیار لە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) كرا: (وترا): چی حەڵاڵە بۆ پیاو لە ئافرەتەكەیدا (بۆ نزیكبوونەوە لێی) لە كاتێكدا كە حەیزدارە؟ وتی: سەرەوەی شەڕواڵ (یانی: لە ناوك بە سەرەوە).

١٠٨١ - «مَسْرُوقٍ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، مَا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ مِنَ امْرَأَتِهِ إِذَا كَانَتْ حَائِضًا؟ قَالَتْ: كُلُّ شَيْءٍ غَيْرُ الْجِمَاعِ. قَالَ: قَلْتُ: فَمَا يَحْرُمُ عَلَيْهِ مِنْهَا إِذَا كَانَا مُحْرِمَيْنِ؟ قَالَ: كُلُّ شَيْءٍ غَيْرُ كَلَامِهَا»[5].

واتە: لە مەسروق گێردراوەتەوە، وتویەتی: بە عائیشەم (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) وت: چی حەڵاڵە بۆ پیاو لە ئافرەتەكەیدا (بۆ نزیكبوونەوە لێی) لە كاتێكدا كە حەیزدارە؟ وتی: هەموو شتێك جگە لە جیماع،

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده منقطع.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.



دەڵێ وتم: ئەی چی لەسەر حەڕامە ئەگەر هەردووكیان لە ئیحرامدا بوون؟ وتی: هەموو شتێک جگە لە قسەی ئافرەتەكە.

١٠٨٢ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ لِإِنْسَانٍ: اجْتَنِبْ شِعَارَ الدَّمِ»[١].

واتە: لە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، كە بە كەسێكی وتووە: دوور بكەرەوە لە شوێنی خوێن (لە ئەندامی زاوزێی ئافرەتەكەت لە كاتی حەیزدا).

١٠٨٣ - «عَنِ الشَّعْبِيِّ، قَالَ: إِذَا كَفَّت الْأَذَى يَعْنِي الدَّمَ»[٢].

واتە: لە شەعبی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (نزیكبوونەوە حەڵاڵە) ئەگەر ئافرەتەكە شوێنی خوێنەكەی داپۆشت (واتە: عەورەتی).

١٠٨٤ - «عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: لاَ بَأْسَ أَنْ تُؤْتَى الْحَائِضُ بَيْنَ فَخِذَيْهَا وَفِي سُرَّتِهَا»[٣].

واتە: لە موجاهید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ كێشەی تیا نیە كە نزیک بوونەوە لە ئافرەتی حەیزدار ئەنجام بدرێت لە نێوان ڕانەكانی و ناوكی (سكی).

١٠٨٥ - «عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: يقْبِلُ وَيدْبِرُ إِلاَّ الدُّبُرَ وَالْمَحِيضَ»[٤].

واتە: لە موجاهید گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (پیاو بۆ یاری كردن و شەهوەت شكاندن) پێشەوە و پشتەوە دەكات جگە لە دواوە (كۆم) و شوێنی حەیز (واتە: ئەندامی زاوزێی، ئەم دووانە حەڕامن لێی).

١٠٨٦ - «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي لِحَافٍ، فَوَجَدْتُ مَا تَجِدُ النِّسَاءُ، فَقُمْتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا لَكِ، أَنَفِسْتِ؟ قُلْتُ: وَجَدْتُ مَا تَجِدُ النِّسَاءُ، قَالَ: ذَاكَ مَا كَتَبَ اللهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ قَالَتْ: فَقُمْتُ فَأَصْلَحْتُ مِنْ شَأْنِي، ثُمَّ رَجَعْتُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ادْخُلِي فِي اللِّحَافِ. فَدَخَلْتُ»[٥].

واتە: لە ئوممی سەلەمە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لە یەک پێخەفدا بووم، منیش ئەوەم بینی كە ئافرەتان دەیبینن، بۆیە هەڵسام، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا تووشی سوڕی مانگانە بووی؟ وتم: ئەوەم بینی كە ئافرەتان دەیبینن، فەرمووی: ئەوە شتێكە خوا لەسەر كچانی ئادەمی نوسیوە (دەبێ بەسەریان بێت)، دەڵێ: جا هەڵسام و كاروبارەكەی

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح.

خۆم ڕێک خست، دواتر گەڕامەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بچۆرە ژێر پێخەفەکە (وەرە بۆ لام بۆ ناو پێخەفەکە)، منیش چووم.

١٠٨٧- «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا، قَالَتْ: بَيْنَا أَنَا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ مُضْطَجِعَةٌ فِي الْخَمِيلَةِ إِذْ حِضْتُ، فَانْسَلَلْتُ. فَأَخَذْتُ ثِيَابَ حِيضَتِي، فَقَالَ: أَنَفِسْتِ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَتْ: فدَعَانِي فَاضْطَجَعْتُ مَعَهُ فِي الْخَمِيلَةِ، قالتْ: وكانتْ هِيَ ورسولُ اللّٰهِ ﷺ يغْتسلانِ مِنَ الإناءِ الواحدِ مِنَ الجنابةِ، وكانَ يُقبِّلها وهوَ صائمٌ»[١].

واتە: لە ئوممی سەلەمە (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە وتویەتی: لە کاتێکدا من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم پاڵ کەوتبووم بە جلێکی پەڕ پەڕ لەناکاو تووشی سوڕی مانگانە بووم، منیش بە ئەسپایی (بە نهێنی لە جێگاکە هاتمە دەرەوە) ڕۆیشتم جلی سوڕی مانگانەی خۆمم هێنا و (لەبەرم کرد)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا تووشی سوڕی مانگانە بووی: وتم: بەڵێ، دەڵێ: بانگی کردم منیش لەگەڵی پاڵکەوتم لە جلە پەڕ پەڕەکەدا، دەڵێ: ئەو و پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: ئوممی سەلەمە و پێغەمبەری خوا ﷺ)، خۆیان دەشۆرد لەناو یەک تەشت بەهۆی جەنابەتەوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی دەکرد لە کاتێکدا بە ڕۆژوو بوو.

١٠٨٨ - «عَنْ مَيْمُونَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ يُبَاشِرُ الْمَرْأَةَ مِنْ نِسَائِهِ فَوْقَ الْإِزَارِ وَهِيَ حَائِضٌ»[٢].

واتە: لە مەیمونە (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئافرەتێک لە ئافرەتەکانی نزیک دەکەوتەوە لە سەرەوەی ناو قەد لە کاتێکدا کە خێزانەکەی حەیزدار بوو.

١٠٨٩ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ يَأْمُرُ إِحْدَانَا إِذَا كَانَتْ حَائِضًا أَنْ تَشُدَّ عَلَيْهَا إِزَارَهَا، ثُمَّ يُبَاشِرُهَا»[٣].

واتە:لە دایکمان عائیشە (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە یەکێک لە ئێمە دەکرد ئەگەر حەیزدار بووایە کە جلی خوارەوەی چاک لەسەر خۆی قایم بکات، دواتر لێی نزیک دەکەوتەوە.

١٠٩٠ - «عَنْ أَبِي مَيْسَرَةَ قَالَ: قَالَتْ أُمُّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا، كُنْتُ أَتَّزِرُ وَأَنَا حَائِضٌ ثُمَّ أَدْخُلُ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ فِي لِحَافِهِ»[٤].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئەبو مەیسەرە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دایکی ئیمانداران (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) وتویەتی: من جلی خوارەوەم دەپۆشت لە کاتێکدا کە حەیزدار بووم، دواتر لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەچوومە ژێر پێخەفەکەی.

١٠٩١ - «عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي زِيَادٍ، قَالَ: سُئِلَ ابْنُ جُبَيْرٍ، مَا لِلرَّجُلِ مِنَ امْرَأَتِهِ إِذَا كَانَتْ حَائِضًا، قَالَ: مَا فَوْقَ الْإِزَارِ»[١].

واتە: لە یەزیدی کوڕی ئەبو زیاد گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو جوبەیر پرسیاری لێکرا کە چی بۆ پیاو هەیە (چی بۆ حەڵاڵە) لە ئافرەتەکەی ئەو کاتەی حەیزدارە؟ وتی: سەرەوەی شەڕواڵ.

١٠٩٢ - «عَنْ عَبِيدَةَ، فِي الْحَائِضِ، قَالَ: الْفِرَاشُ وَاحِدٌ، وَاللُّحُفُ شَتَّى، فَإِنْ كَانُوا لاَ يَجِدُونَ، رَدَّ عَلَيْهَا مِنْ لِحَافِهِ»[٢].

واتە: لە عەبیدەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی حەیزدار وتویەتی: جێگا و (ڕایەخ) یەک جێگا و ڕایەخە، (بەڵام) پێخەف جیاوازە، جا ئەگەر هاتوو دەستیان نەکەوت (نەیانبوو) ئەوە پیاوەکە (بەشێک) لە پێخەفی خۆی بەسەر دادەدا.

تێبینی: ئەو فەتوایەی عەبیدە شازە و کاری پێ ناکرێت، چونکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتوە کە پێخەفی جیا نەکردۆتەوە، ڕەنگە لەبەر ئەوە وای وتبێت تا ڕێگا بگرێت لە تێکەوتن لە حەڕام و تووشبوونی جیماع.

١٠٩٣ - «عَنْ شُرَيْحٍ، قَالَ: لَهُ مَا فَوْقَ السُّرَرِ أَوِ السُّرَّةِ»[٣].

واتە: لە شورەیحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە شەڕواڵ بەسەرەوە بۆ پیاوەکە هەیە.

١٠٩٤ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتوشحُنِي وَأَنَا حَائِضٌ، وَيُصِيبُ مِنْ رَأْسِي وَبَيْنِي وَبَيْنَهُ ثَوْبٌ»[٤].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لە مل دەکردم لەکاتێکدا من حەیزدار بووم، وە ماچی دەکردم لە نێوان من و ئەودا جلێک هەبوو.

١٠٩٥ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ الْيَهُودَ كَانُوا إِذَا حَاضَتِ الْمَرْأَةُ فِيهِمْ لَمْ يُؤَاكِلُوهَا، وَلَمْ يُشَارِبُوهَا، وَأَخْرَجُوهَا مِنَ الْبَيْتِ، وَلَمْ تَكُنْ مَعَهُمْ فِي الْبُيُوتِ. فَسُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ ذَلِكَ فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

ٱلْمَحِيضِۖ قُلْ هُوَ أَذًى ﴿٢٢٢﴾ البقرة، فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُؤَاكِلُوهُنَّ، وَأَنْ يُشَارِبُوهُنَّ، وَأَنْ يَكُنَّ مَعَهُمْ فِي الْبُيُوتِ، وَأَنْ يَفْعَلُوا كُلَّ شَيْءٍ مَا خَلاَ النِّكَاحَ. فَقَالَتِ الْيَهُودَ: مَا يُرِيدُ هَذَا أَنْ يَدَعَ شَيْئًا مِنْ أَمْرِنَا إِلاَ خَالَفَنَا فِيهِ. فَجَاءَ عَبَّادُ بْنُ بِشْرٍ، وَأُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، إِلَى رَسُولِ اللهُ ﷺ فَأَخْبَرَاهُ بِذَلِكَ وَقَالاَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلاَ نَنْكِحُهُنَّ فِي الْمَحِيضِ؟ فَتَمَعَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ تَمَعُّرًا شَدِيدًا حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ قد وَجَدَ عَلَيْهِمَا، فَقَامَا، فَخَرَجَا، فَاسْتَقْبَلَتْهُمَا هَدِيَّةُ لَبَنٍ، فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي آثَارِهِمَا فَرَدَّهُمَا فَسَقَاهُمَا، فَعَلِمْنَا أَنَّهُ لَمْ يَغْضَبْ عَلَيْهِمَا»[1].

واتە: لە ئەنەس ﷺ گێڕدراوەتەوە، (وتویەتی): جوولەکەکان هەموو جار (عادەتیان وابوو) ئەگەر ئافرەت تووشی حەیز ببووایە لە ناویاندا ئەوە خواردنیان لەگەڵ نەدەخواردن و (خواردنەوەشیان) لەگەڵ نەدەخواردنەوە و لە ماڵیش دەیانکردنە دەرەوە و لەگەڵیان نەدەبوون لە ماڵەوەدا، جا پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی ئەوە، خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِۖ قُلْ هُوَ أَذًى ﴿٢٢٢﴾ البقرة، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێ کردن کە لەگەڵیان بخۆن و بخۆنەوە و لەگەڵیان بن لە ماڵەوە و هەموو شتێک ئەنجام بدەن (لەگەڵ یەکتری) جگە لە جیماع، جا جوولەکەکان وتیان: ئەوە (واتە: موحەممەد) نایەوێت واز لە هیچ شتێکی ئێمە بێنێت حەتمەن دەیەوێت تیایدا پێچەوانەی ئێمە بکات، جا عەببادی کوڕی بیشرو ئوسەیدی کوڕی حوضەیر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیان پێ ڕاگەیاند و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لەکاتی حەیزیش نەچینە لایان (جیماعیان لەگەڵ نەکەین)؟ ڕوخساری پێغەمبەری خوا ﷺ گۆڕا بە گۆڕانێکی یەکجار زۆر تا گومانمان برد پێغەمبەری خوا ﷺ لێیان تورە بووبێ، ئەوانیش هەڵسان و چوونە دەرەوە (ڕۆیشتن)، لەدوای ئەوان هەندێک شیر بە دیاری هات، پێغەمبەری خواش ﷺ ناردی بەدوایاندا و گەڕاندنیەوە و شیرەکەی دەرخوارد دان، جا زانیمان کە لێیان زویر و توورە نەبووە.

١٠٩٦ - «حَدَّثَنِي شَيْبَةُ بْنُ هِشَامٍ الرَّاسِبِيُّ، قَالَ: سَأَلْتُ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ، عَنِ الرَّجُلِ يُضَاجِعُ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ فِي لِحَافٍ وَاحِدٍ. فَقَالَ: أَمَّا نَحْنُ آلَ عُمَرَ فَنَهْجُرُهُنَّ إِذَا كُنَّ حُيَّضًا»[2].

واتە:لە شەیبەی کوڕی هیشامی ڕاسیبی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە سالیمی کوڕی عەبدوڵلا کرد دەربارەی (حوکمی) ئەو پیاوەی کە لەگەڵ خێزانەکەی پاڵدەکەوێت لەناو یەک پێخەف لە کاتێکدا کە حەیزدارە؟ وتی: ئێمەی خانەوادەی عومەر لێیان دوور دەکەوینەوە ئەگەر حەیزداربن.

١٠٩٧ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لاَ بَأْسَ بِفَضْلِ وَضُوءِ الْمَرْأَةِ مَا لَمْ تَكُنْ جُنُباً أَوْ حَائِضًا»[3].

واتە: لە ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچ کێشەیەک نیە لە پاشماوەی دەستنوێژی ئافرەت مادەم جەنابەتدار یان حەیزدار نەبێت.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ رجاله ثقات.

١٠٩٨ - «عَنِ الْحَكَمِ، قَالَ: يضَعُهُ وَضْعًا يَعْنِي عَلَى الْفَرْجِ»[١].

واتە: لە حەكەم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاو (بۆی دروستە) شەهوەتی بە ئەندامی زاوزێی خێزانەكەی خاڵی بكاتەوە و هەقی خێزانەكەشی بدات (بەڵام نابێ لەگەڵی جووت بێت).

١٠٩٩ - «عَنْ مَيْمُونَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺكَانَ يُبَاشِرُ الْمَرْأَةَ مِنْ نِسَائِهِ وَهِيَ حَائِضٌ إِذَا كَانَ عَلَيْهَا إِزَارٌ يَبْلُغُ أَنْصَافَ الْفَخِذَيْنِ أَوِ الرُّكْبَتَيْنِ مُحْتَجِزَةً بِهِ»[٢].

واتە: لە مەیمونەی (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئافرەتێک لە ئافرەتەكانی نزیک دەبوویەوە لە كاتێكدا حەیزدار بوو، (بە مەرجێک) ئەگەر پارچە جلێكی لەبەر بووایە بگەیشتایەتە ناوەڕاستی ڕانەكانی یان ئەژنۆكانی تا خۆی پێ بپارێزێت (لە جووت بوون).

## بابەت: ئافرەتی حەیزدار سەری هاوسەرەكەی شانە دەكات

١١٠٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُنْتُ أُرَجِّلُ رَأْسَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺوَأَنَا حَائِضٌ»[٣].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار سەری پێغەمبەری خوام ﷺ شانە دەكرد، لە كاتێكدا حەیزداریش بووم.

١١٠١ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُنْتُ أُرَجِّلُ رَأْسَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا حَائِضٌ»[٤].

واتە: (لە ڕێگایێكی تریشەوە هاتوە) لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار سەری پێغەمبەری خوام ﷺ شانە دەكرد، لە كاتێكدا حەیزداریش بووم.

١١٠٢ - «عَنْ نَافِعٍ، قَالَ: كُنَّ جَوَارِي ابْنِ عُمَرَ يَغْسِلْنَ رِجْلَيْهِ وَهُنَّ حُيَّضٌ وَيُعْطِينَهُ الْخُمْرَةَ»[٥].

واتە: لە نافیعەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار خزمەتكارەكانی ئیبنو عومەر پێیەكانیان دەشۆرد لە كاتێكدا حەیزدار بوون، وە بەرماڵیشیان پێ دەدا.

١١٠٣ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُنْتُ أُوتَى بِالإِنَاءِ فَأَضَعُ فَمِي فَأَشْرَبُ وَأَنَا حَائِضٌ، فَيَضَعُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺفَمَهُ عَلَى الْمَكَانِ الَّذِي وَضَعْتُ فَيَشْرَبُ. وَأُوتَى بِالْعَرْقِ فَأَنْتَهِسُ، فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى الْمَكَانِ الَّذِي وَضَعْتُ فَيَنْتَهِسُ، ثُمَّ يَأْمُرُنِي فَأَتَّزِرُ وَأَنَا حَائِضٌ، وَكَانَ يُبَاشِرُنِي»[٦].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ أثره صحيح.

(٦) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: دۆڵكەیەكم بۆ دەهات (واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دەهێنام)، منیش دەمم دەخستە سەری و (ئاوەكەم) دەخواردەوە لە كاتێكدا كە حەیزدار بووم، پێغەمبەری خواش ﷺ دەمی خۆی دەخستە سەر ئەو شوێنەی من دەمی خۆمم لەسەر دانابوو دەیخواردەوە، هەروەها ئێسكە گۆشتم بۆ دەهات (كە كەمی گۆشت پێوە مابوو) منیش دەمپچكڕیەوە (بە ددانەكانم كەمە گۆشتەكەم لێدەكردەوە)، پێغەمبەری خواش ﷺ دەمی لەسەر ئەو شوێنە دادەنا كە من دەمی خۆمم لەسەر دانابوو بە ددانەكانی دەیپچكڕیەوە، دواتر خوارەوەی جەستەم دادەپۆشی لە كاتێكدا كە حەیزدار بووم، پێغەمبەری خواش لێم نزیك دەبوویەوە (هەقی خۆشەویستی یەكترمان دەدا).

١١٠٤ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: كَانَ يُقَالُ: الْحَائِضُ لَيْسَتِ الْحِيضَةُ فِي يَدِهَا، تَغْسِلُ يَدَهَا، وَتَعْجِنُ، وَتَنْبِذُ»[١].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی حەیزدار خۆ حەیزی لە دەستیدا نیە، دەستی خۆی دەشۆرێت و هەویر دەكات و خۆشاو دروست دەكات (هەموو كارێك ئاساییە جگە لە جووت بوون).

١١٠٥ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: كَانَ يَقُولُ إِنَّ الْحَائِضَ حِيضَتُهَا لَيْسَتْ فِي يَدِهَا، وَكَانَ يَقُولُ الْحَائِضُ حُبُّ الْحَيِّ»[٢].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە دڵنیایی ئافرەتی حەیزدار خۆ حەیزی لە دەستیدا نیە، هەروەها دەیوت: ئافرەتی حەیزدار بەشێكە لە زیندوو (كەواتە: پاكە و پیس نیە).

١١٠٦ - «عَنْ حَمَّادٍ، قَالَ: سَأَلْتُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ مُصَافَحَةِ الْيَهُودِيِّ، وَالنَّصْرَانِيِّ، وَالْمَجُوسِيِّ، وَالْحَائِضِ، فَلَمْ يَرَ فِيهِ وُضُوءًا»[٣].

واتە: لە حەمماد وتویەتی: پرسیارم لە ئیبراهیم كرد دەربارەی تەوقە كردن لەگەڵ كەسی جوولەكە و گاور و ئاگر پەرست و ئافرەتی حەیزدار، پێی وانەبوو دەستنوێژ شۆردنەوەی پێویست بێت (پێی وابوو دەستنوێژ ناشكێنێت).

١١٠٧ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ الْبَهِيِّ، قَالَ: حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ لِلْجَارِيَةِ: نَاوِلِينِي الْخُمْرَةَ قَالَتْ: أَرَادَ أَنْ يَبْسُطَهَا وَيُصَلِّيَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: إِنَّهَا حَائِضٌ، فَقَالَ: إِنَّ حِيضَهَا لَيْسَ فِي يَدِهَا»[٤].

واتە: لە عەبدوڵڵای بەهیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) بۆی گێڕامەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت بوو، بە ئافرەتێكی فەرموو: (واتە: بە منی فەرموو): بەرماڵم پێ بدە، وتی: پێغەمبەری

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده حسن.

خوا ﷺ دەیویست ڕایبخات و نوێژی لەسەر بکات، ئافرەتەکە وتی: حەیزدارم، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: خۆ حەیزەکەی لە دەستیدا نیە.

١١٠٨- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُخْرِجُ إِلَيَّ رَأْسَهُ مِنَ الْمَسْجِدِ فَأَغْسِلُهُ، يَعْنِي: وَهُوَ مُعْتَكِفٌ»[١].

واتە: لە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ سەری خۆی لە مزگەوتەکە دەردەهێنا و منیش دەمشۆرد (واتە: تەنها سەرم دەشۆرد)، واتە: لە کاتێکدا کە لە ئیعتیکاف دابوو.

١١٠٩ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، كَانَ لاَ يَرَى بَأْسًا أَنْ تُوَضِّئَ الْحَائِضُ الْمَرِيضَ»[٢].

واتە: لە ئیبراهیم گێردراوەتەوە، کە پێی وانەبووە هیچی تیابێت ئافرەتی حەیزدار دەستنوێژ بۆ کەسی نەخۆش بشۆرێت.

١١١٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُنْتُ أَغْسِلُ رَأْسَ النَّبِيِّ ﷺ وَأَنَا حَائِضٌ»[٣].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار سەری پێغەمبەری خوام ﷺ دەشۆرد لە کاتێکدا حەیزداریش بووم.

١١١١- «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لَقَدْ كُنْتُ أَغْسِلُ رَأْسَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا حَائِضٌ وَهُوَ عَاكِفٌ»[٤].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: بە دڵنیایی من هەموو جار سەری پێغەمبەری خوام ﷺ دەشۆرد لە کاتێکدا من حەیزدار بووم و ئەویش لە ئیعتیکاف دابوو.

١١١٢ - «حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: سَمِعْتُ مُغِيرَةَ، قَالَ: أَرْسَلَ أَبُو ظَبْيَانَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ، يَسْأَلُهُ عَنِ الْحَائِضِ تُوَضِّئُ الْمَرِيضَ؟ قَالَ: نَعم وَتُسْنِدُهُ قَالَ: لاَ، فَقُلْتُ لِلْمُغِيرَةِ: سَمِعْتَهُ مِنْ إِبْرَاهِيمَ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: وَتُسْنِدُهُ؟ يَعْنِي فِي الصَّلاَةِ»[٥].

واتە: لە شوعبەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە موغیرە بوو وتی: ئەبو ظەبیان ناردی بۆ لای ئیبراهیم تا پرسیاری لێ بکات دەربارەی ئەو ئافرەتە حەیزدارەی دەستنوێژ بە نەخۆش هەڵدەگرێت (کە ئایا دروستە یان نا)؟ وتی: بەڵێ (دروستە)، هەروەها خۆشی بداتە پاڵ (بۆ نوێژ)؟ وتی: نەخێر،

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

(شوعبە دەڵێ:) منیش بە موغیرەم وت: خۆت گوێت لە ئیبراهیم بوو؟ وتی: نەخێر، عەبدوڵلا وتویەتی: هەروەها خۆشی دەداتە پاڵ لە نوێژدا (واتە: بۆ ئافرەتی حەیزدار دروستە یارمەتی نەخۆش بدات بۆ نوێژ ئەنجام دانیش).

١١١٣ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَهَا: نَاوِلِينِي الْخُمْرَةَ. قَالَتْ إِنِّي حَائِضٌ قَالَ: إِنَّهَا لَيْسَتْ فِي يَدِكِ»[١].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: بەرماڵم پێ بدە، عائیشە وتویەتی: من حەیزدارم (چۆن دەبێت)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆ حەیزەکە لە دەستتدا نیە.

١١١٤ - «عَنِ الْحَسَنِ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ امْرَأَةٍ حَائِضٍ شَرِبَتْ مِنْ مَاءٍ أَيُتَوَضَّأُ بِهِ؟ فَضَحِكَ وَقَالَ: نَعم»[٢].

واتە: لە حەسەن گێردراوەتەوە، کە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی ئافرەتی حەیزدار کە لە ئاوێک بخواتەوە ئایا ئاوەکە دەستنوێژی پێ هەڵدەگیرێ؟ ئەویش پێکەنی و وتی: بەڵێ.

١١١٥ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ مُؤَاكَلَةِ الْحَائِضِ؟ قَالَ: وَاكِلْهَا»[٣].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی سەعدەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد دەربارەی بەشداری کردنی خواردن لەگەڵ ئافرەتی حەیزدار (کە ئایا دروستە لەگەڵی بخۆم)؟ وتی: لەگەڵی بخۆ.

١١١٦ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، أَنَّهُ كَانَ يَأْمُرُ جَارِيَتَهُ أَنْ تُنَاوِلَهُ الْخُمْرَةَ مِنَ الْمَسْجِدِ فَتَقُولُ: إِنِّي حَائِضٌ. فَيَقُولُ: إِنَّ حِيضَتَكِ لَيْسَتْ فِي كَفِّكِ، فَتُنَاوِلُهُ»[٤].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) گێردراوەتەوە کە فەرمانی بە خزمەتکارەکەی دەکرد کە بەرماڵی بۆ بهێنێت لە مزگەوتدا، خزمەتکارەکەش دەیوت: من حەیزدارم (چۆن دەبێت)؟ ئیبنو عومەریش دەیوت: خۆ حەیزەکەت لە دەستتدا نیە، خزمەتکارەکەش بەرماڵەکەی پێ دەدا.

١١١٧ - «عَنْ عبد الله بن سعد ﷺ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ مُؤَاكَلَةِ الْحَائِضِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ بَعْضَ أَهْلِي لَحَائِضٌ، وَإِنَّا لَمُتَعَشُّونَ إِنْ شَاءَ اللهُ جَمِيعًا»[٥].

واتە: لەعەبدوڵلای سەعد ﷺ گێردراوەتەوە وتویەتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی بەژداری کردنی خواردن لەگەڵ ئافرەتی حەیزدار (کە ئایا دروستە لەگەڵی بخۆم)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

فەرمووی: هەندێ لە خێزانەکانم حەیزدارن و ئێمەش نانی ئێواره بەیەکەوە دەخۆین إن شاء الله (واته: بەڵێ دروستە و منیش نانیان لەگەڵ دەخۆم).

١١١٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، أَنَّهَا كَانَتْ لاَ تَرَى بَأْسًا أَنْ تَمَسَّ الْحَائِضُ الْخُمْرَةَ»[١].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە کە پێی وانەبووە هیچی تیا بێت کە ئافرەتی حەیزدار دەست بدات لە بەرماڵ.

## بابەت: (دەربارەی حوکمی) جووت بوون لەگەڵ ئافرەتی حەیزدار کاتێ پاک دەبێتەوە پێش ئەوەی خۆی بشۆرێ

١١١٩ - «عَنْ مُجَاهِدٍ، فِي الْحَائِضِ إِذَا طَهُرَتْ مِنَ الدَّمِ لاَ يَقْرَبُهَا زَوْجُهَا حَتَّى تَغْتَسِلَ»[٢].

واتە: لە موجاهید گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئافرەتی حەیزدار کاتێ لە خوێن پاک دەبێتەوە (وتویەتی): هاوسەرەکەی لێی نزیک ناکەوێتەوە (جیماعی لەگەڵ ناکات) تا خۆی دەشۆرێت.

١١٢٠- «حَدَّثَنَا عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ مُوسَى، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ الأَسْوَدِ، عَنْ مُجَاهِدٍ مِثْلَهُ سَوَاءً»[٣].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە موجاهیدەوە هەمان شت گێڕدراوەتەوە.

١١٢١- «حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، قَالَ: سُئِلَ سُفْيَانُ، أَيُجَامِعُ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِذَا انْقَطَعَ عَنهَا الدَّمُ قَبْلَ أَنْ تَغْتَسِلَ؟ فَقَالَ: لاَ. فَقِيلَ: أَرَأَيْتَ إِنْ تَرَكَتِ الْغُسْلَ يَوْمَيْنِ أَوْ أَيَّامًا، قَالَ: تُسْتَتَابُ»[٤].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی یوسفەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیار لە سوفیان کرا کە ئاخۆ (دروستە) پیاو جیماع لەگەڵ ئافرەتی خۆی بکات ئەو کاتەی خوێنی دەپچڕێ (لە خوێن پاک دەبێتەوە) پێش ئەوەی خۆی بشۆرێت؟ وتی: نەخێر (دروست نیە)، پێی وترا: ئەی بۆچوونت چۆنە ئەگەر ئافرەتەکە خۆی نەشۆرد دوو ڕۆژ یان چەند ڕۆژێک؟ وتی: داوای تەوبەی لێ دەکرێت (خۆی زۆر تاوانبار کردوە، چونکە نوێژەکانی فەوتاندووە).

١١٢٢- «عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ﴿٢٢٢﴾﴾ البقرة، قَالَ: حَتَّى يَنْقَطِعَ الدَّمُ: ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ ﴿٢٢٢﴾﴾ البقرة، قَالَ: إِذَا اغْتَسَلْنَ»[٥].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە موجاهیدەوە گێڕدراوەتەوە (دەربارەی ئەو ئایەتەی خوا دەفەرموێ): ﴿وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، واتە: [وە لە ئافرەتەكانتان نزیک مەكەونەوە (جیماعیان لەگەڵ مەكەن) تا پاک دەبنەوە] وتویەتی: (مەبەستی لە ڕستەی (تا پاک دەبنەوە) ئەوەیە: تا خوێن دەپچڕێت، (وە دەربارەی بەشەكەی تری ئایەتەكە كە دەفەرمووێت): ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، واتە: [جا كاتێک باش پاک و خاوێن بوونەوە] وتویەتی: ئەو كاتەیە كە خۆیان دەشۆرن (واتە: جیماع كردن دەبێت دوای پاكبوونەوە و خۆشۆردن دروست دەبێت).

١١٢٣ - «عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، قَالَ: إِذَا انْقَطَعَ الدَّمُ: ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، قَالَ: اغْتَسَلْنَ»[١].

واتە: لە موجاهیدەوە گێڕدراوەتەوە (دەربارەی ئەو ئایەتەی خوا دەفەرموێ):﴿حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، واتە: [وە لە ئافرەتەكانتان نزیک مەكەونەوە (جیماعیان لەگەڵ مەكەن) تا پاک دەبنەوە] وتویەتی: (مەبەستی لە ڕستەی (تا پاک دەبنەوە) ئەوەیە: تا خوێن دەپچڕێت، (وە دەربارەی بەشەكەی تری ئایەتەكە كە دەفەرموێت):﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، واتە: [جا كاتێک باش پاک و خاوێن بوونەوە] وتویەتی: (واتە: كاتێک) خۆیان دەشۆرن.

١١٢٤ - «حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ الْأَسْوَدِ، قَالَ: سَأَلْتُ مُجَاهِدًا، عَنْ امْرَأَةٍ رَأَتِ الطُّهْرَ أَيَحِلُّ لِزَوْجِهَا أَنْ يَأْتِيَهَا قَبْلَ أَنْ تَغْتَسِلَ، قَالَ: لاَ حَتَّى تَحِلَّ لَهَا الصَّلاَةُ»[٢].

واتە: لە عوسمانی كوڕی ئەسوەدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە موجاهید كرد دەربارەی ئافرەت كە پاكبوونەوە دەبینێت ئایا بۆ هاوسەرەكەی حەڵاڵە كە بچێتە لای (جیماعی لەگەڵ بكات) پێش ئەوەی خۆی بشۆرێت؟ وتی: نەخێر (دروست نیە) تاوەكو ئافرەتەكە نوێژی بۆ حەڵاڵ دەبێت (واتە: تا خۆی دەشۆرێت).

١١٢٥ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: لاَ يَغْشَاهَا حَتَّى تَغْتَسِلَ»[٣].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (هاوسەرەكەی) ناچێتە لای (جیماعی لەگەڵ ناكات) تا خۆی دەشۆرێت.

١١٢٦- «عَنِ الْحَسَنِ، فِي الرَّجُلِ يَطَأُ امْرَأَتَهُ وَقَدْ رَأَتِ الطُّهْرَ قَبْلَ أَنْ تَغْتَسِلَ؟ قَالَ: هِيَ حَائِضٌ مَا لَمْ تَغْتَسِلْ، وَعَلَيْهِ الْكَفَّارَةُ، وَلَهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا مَا لَمْ تَغْتَسِلْ»[٤].

واتە: لە حەسەن گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو پیاوەی جیماع لەگەڵ ئافرەتەكەی دەكات پێش ئەوەی خۆی بشۆرێت لە كاتێكدا پاكیەتی بینیوە؟ وتویەتی: هەر حەیزدارە (هەر حەیزدار حیسابە) مادەم

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ أثر صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

خۆی نەشۆردووە، وە پیاوەکە (ئەگەر بچێتە لای و سەرجێیی لەگەڵ بکات) کەفارەتیشی لەسەرە، وە (ئەگەر تەڵاقێک یان دووانی دابێت) بۆی هەیە بیگەڕێنێتەوە مادەم هێشتا خۆی نەشۆردووە.

١١٢٧ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: لاَ يَغْشَاهَا زَوْجُهَا»[١].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هاوسەرەکەی جیماعی لەگەڵ ناکات (پێشی خۆشۆردن).

١١٢٨ - «قَالَ أَبُو الْخَيْرِ مَرْثَدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْيَزَنِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ الْجُهَنِيَّ ﷺ، يَقُولُ: وَاللَّهِ إِنِّي لاَ أُجَامِعُ امْرَأَتِي فِي الْيَوْمِ الَّذِي تَطْهُرُ فِيهِ حَتَّى يَمُرَّ يَوْمٌ»[٢].

واتە: لە مەرثەدی کوڕی عەبدوڵلای یەزەنی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی ﷺ بوو دەیوت: سوێند بە خوا لەگەڵ خێزانەکەم جووت نابم لەو ڕۆژەی تیایدا پاک دەبێتەوە تا ڕۆژێکی بەسەردا تێپەڕ نەبێت (واتە: تا بە تەواوی دڵنیا دەبم و خۆشی نەشۆرێت).

١١٢٩ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْمَرْأَةِ تَرَى الطُّهْرَ أَيَأْتِيهَا زَوْجُهَا، قَبْلَ أَنْ تَغْتَسِلَ، قَالَ: لاَ حَتَّى تَغْتَسِلَ»[٣].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو ئافرەتەی پاکبوونەوە دەبینێت (ئایا دروستە) پیاوەکەی بچێتە لای (جیماعی لەگەڵ بکات) پێش ئەوەی خۆی بشۆرێت؟ وتی: نەخێر (دروست نیە)، تا خۆی دەشۆرێت.

١١٣٠ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْمَرْأَةِ يَنْقَطِعُ عَنْهَا الدَّمُ، قَالَ إِنْ أَدْرَكَهُ الشَّبَقُ غَسَلَتْ فَرْجَهَا، ثُمَّ أَتَاهَا»[٤].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو ئافرەتەی خوێنی (حەیزی) لەسەر قەتع، دەبێ (بەڵام هێشتا خۆی نەشۆردووە)؟ وتویەتی: ئەگەر پیاوەکە تووشی شەهوەتێکی توند بوو خۆی پێ نەگیرا، ئەوە ئافرەتەکە دامێنی خۆی دەشۆرێت و دواتر پیاوەکە دەچێتە لای.

١١٣١ - «أَخْبَرَنَا فَرْوَةُ بْنُ أَبِي الْمَغْرَاءِ، قَالَ: سَمِعْتُ شَرِيكًا، وَسَأَلَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: الْمَرْأَةُ يَنْقَطِعُ عَنْهَا الدَّمُ، أَيَأْتِيهَا زَوْجُهَا قَبْلَ أَنْ تَغْتَسِلَ؟ فَقَالَ: قَالَ عَبْدُ الْمَلِكِ، عَنْ عَطَاءٍ، أَنَّهُ رَخَّصَ فِي ذَلِكَ لِلشَّبِقِ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: أَخَافُ أَنْ يَكُونَ أَخْطَأَ، وأَخَافُ أَنْ يَكُونَ مِنْ حَدِيثِ لَيْثٍ لاَ أَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ عَبْدِ الْمَلِكِ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: الشَّبِقُ: الَّذِي يَشْتَهِي»[٥].

واتە: لە فەڕوەی کوڕی ئەبو مەغرائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە شەریک بوو پیاوێک پرسیاری لێکردو وتی: ئافرەت کاتێک خوێنی دەپچڕێت (ئایا) پیاوەکەی دەچێتە لای پێش ئەوەی خۆی بشۆرێت؟ ئەویش وتی: عەبدولمەلیک لە عەطائەوە گێڕایەوە و وتی: ڕێگەی داوە لە حاڵەتی شەهوەتی زۆردا.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده حسن.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: دەترسم هەڵەی کردبێت، وە دەترسم قسەی لەیث بێت، نەمزانیوە قسەی عەبدوملەلیک بێت.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (الشَّبِقُ): واتە: ئەو کەسەی شەهوەتی دەجوڵا.

## بابەت: دەربارەی (حوکمی) ئافرەتی حەیزدار کە خەنە دەکات، هەروەها ئەو ئافرەتەی نوێژ بە خەنەوە دەکات

١١٣٢ - «عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: رَأَيْتُ نِسَاءً مِنْ نِسَاءِ الْمَدِينَةِ يُصَلِّينَ فِي الْخِضَابِ»[١].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتانێکم بینی لە ئافرەتەکانی مەدینە نوێژیان بە خەنەوە دەکرد.

١١٣٣ - «عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ، عَمَّنْ سَمِعَ عَائِشَةَ سُئِلَتْ عَنِ الْمَرْأَةِ تَمْسَحُ عَلَى الْخِضَابِ، فَقَالَتْ: لأَنْ تُقْطَعَ يَدِي بِالسَّكَاكِينِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ ذَلِكَ»[٢].

واتە: لە ئیبنو ئەبی نەجیحەوە گێڕدراوەتەوە ئەویش لە کەسێکەوە گێڕاویەتیەوە کە گوێی لە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) بووە دەربارەی (حوکمی) ئەو ئافرەتەی مەسحی سەری لەسەر خەنە دەکات؟ وتویەتی: ئەگەر دەستم بە چەقۆیان ببڕن پێم خۆشتر و باشترە لەوە.

١١٣٤ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: تُصَلِّي الْمَرْأَةُ فِي الْخِضَابِ قَالَتْ: اسْلُتِيهِ وَرَغْمًا»[٣].

واتە: لە ئەبو سەعدەوە گێڕدراوەتەوە، کە ئافرەتێک پرسیاری لە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) کردووە: (کە ئاخۆ) ئافرەت نوێژ بە خەنەوە دەکات (بۆی دروستە)؟ عائیشە وتی: بیهاوێژە بۆ ناو خۆڵ (واتە: لەخۆتی دوور بخەرەوە).

١١٣٥ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، قَالَ: كُنَّ نِسَاؤُنَا يَخْتَضِبْنَ بِاللَّيْلِ، فَإِذَا أَصْبَحْنَ، فَتَحْنَهُ فَتَوَضَّأْنَ وَصَلَّيْنَ، ثُمَّ يَخْتَضِبْنَ بَعْدَ الصَّلاَةِ، فَإِذَا كَانَ عِنْدَ الظُّهْرِ، فَتَحْنَهُ فَتَوَضَّأْنَ وَصَلَّيْنَ بِأَحْسَنِ خِضَابٍ، وَلاَ يَمْنَعُ مِنَ الصَّلاَةِ»[٤].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتەکانی ئێمە شەوان خەنەیان بەکاردەهێنا، جا کە بەیانیان دەکردەوە (کە بەیانی دادەهات) خەنەکەیان لێدەکردەوەو دەستنوێژیان دەشۆردو نوێژیان دەکرد، دواتر خەنەیان بەکاردەهێنایەوە پاشی نوێژ، جا کە دەبووە کاتی نیوەڕۆ

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده فيه جهالة.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

خەنەکەیان لادەبردو دەستنوێژیان دەشۆردو نوێژیان دەکرد بە باشترین خەنە کردن (ئەو جۆرە خەنە کردنە باشترین ڕێگایە) و ڕێگری لە نوێژ ناکات.

١١٣٦ - «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ نِسَاءَ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، كُنَّ يَخْتَضِبْنَ وَهُنَّ حُيَّضٌ»(١).

واتە: لە نافیعەوە گێردراوەتەوە، کە خێزانەکانی ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) خەنەیان دەکرد لە کاتێکدا کە حەیزدار بوون.

١١٣٧ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، قَالَ: كُنَّ نِسَاؤُنَا إِذَا صَلَّيْنَ الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ، اخْتَضَبْنَ، فَإِذَا أَصْبَحْنَ أَطْلَقْنَهُ وَتَوَضَّأْنَ وَصَلَّيْنَ، وَإِذَا صَلَّيْنَ الظُّهْرَ اخْتَضَبْنَ، فَإِذَا أَرَدْنَ أَنْ يُصَلِّينَ الْعَصْرَ، أَطْلَقْنَهُ، فَأَحْسَنَّ خِضَابَهُ وَلاَ يَحْبِسنَ عَنِ الصَّلاَةِ»(٢).

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار ئافرەتانی ئێمە کاتێ نوێژی عیشایان دەکرد خەنەیان بەکاردەهێنا، جا کە بەیانیان دەکردەوە (کە بەیانی دادەهات) لێیان دەکردەوەو دەستنوێژیان دەشۆردو نوێژیان دەکرد، وە کاتێ نوێژی نیوەڕۆیان دەکرد (دووبارە) خەنەیان دەکرد، جا کاتێ بیانویستایە نوێژی عەسر بکەن لێیان دەکردەوە، خەنەکردنەکەیان جوان دەکرد (ئا بەو شێوەیە) و خۆیان لە نوێژ مەنع نەدەکرد.

## بابەت: ئەگەر پیاو بچێتە لای خێزانەکەی (بۆ جیماع) لە کاتێکدا کە حەیزدارە (ئایە حوکمی چیە)؟ (ئەو زانایانەی پێیان وایە کەفارەتی لەسەر نیە)

١١٣٨ - «عَنْ إبراهيم وعن عَامِرٍ، فِيمَنْ أَتَى أَهْلَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالاَ: ذَنْبٌ أَتَاهُ، يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَيَتُوبُ إِلَيْهِ، وَلاَ يَعُودُ»(٣).

واتە: لە ئیبراهیم و عامیرەوە گێردراوەتەوە دەربارەی ئەو کەسەی دەچێتە لای خێزانەکەی و (لەگەڵی جووت دەبێت) لە کاتێکدا کە حەیزدارە، ووتویانە: تاوانێکی کردوە، داوای لێ خۆشبوون لە خوا دەکات و، پەشیمان دەبێتەوە، جارێکی تریش ناگەڕێتەوە سەر ئەو تاوانە.

١١٣٩ - «أخبرنا مُحَمَّدُ بْنُ عِيسَى، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ أَبِي زَائِدَةَ، عَنِ الْمُثَنَّى، عَنْ عَطَاءٍ مِثْلَهُ»(٤).

واتە: هەروەها هەمان شت لە عەطائەوە گێردراوەتەوە.

١١٤٠- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: ذَنْبٌ أَتَاهُ، وَلَيْسَ عَلَيْهِ كَفَّارَةٌ»(٥).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: تاوانێکی ئەنجام داوە و هیچ کەفارەتێکی لەسەر نیە.

١١٤١ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ: يَعْتَذِرُ إِلَى اللَّهِ، وَيَتُوبُ إِلَى اللَّهِ»[١].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی قاسمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێراویەتیەوە کە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی ئەو کەسەی دەچێتە لای ئافرەتەکەی و (جیماعی لەگەڵ دەکات) لە کاتێکدا کە حەیزدارە، وتویەتی: داوای لێبوردن لە خوا دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ لای و تەوبە دەکات.

١١٤٢ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: تَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَلَيْسَ عَلَيْكَ شَيْءٌ يَعْنِي إِذَا وَقَعَ عَلَى امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ»[٢].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: داوای لێخۆشبوون دەکەیت و هیچیشت لەسەر نیە (لە کەفارەت) یان ئەگەر کەسێک تووشی جیماع بوو لەگەڵ ئافرەتەکەی لە کاتێکدا کە حەیزدارە.

١١٤٣ - «عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، قَالَ: سُئِلَ وَأَنَا أَسْمَعُ عَنِ الرَّجُلِ يَأْتِي امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ: يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ»[٣].

واتە: لە ئیبنو ئەبی مولەیکەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیار کراوە منیش گوێم لێ بووە دەربارەی ئەو پیاوەی دەچێتە لای خێزانەکەی و (جیماعی لەگەڵ دەکات) لە کاتێکدا کە حەیزدارە، وتویەتی: داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکات (چونکە گوناهی ئەنجام داوە).

١١٤٤ - «عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى أبا بَكْرٍ ﷺ، فَقَالَ: رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنِّي أَبُولُ دَمًا. قَالَ: تَأْتِي امْرَأَتَكَ وَهِيَ حَائِضٌ قَالَ: نَعم، قَالَ: اتَّقِ اللَّهَ، وَلاَ تَعُدْ»[٤].

واتە: لە ئەبو قیلابەوە گێڕدراوەتەوە کە (وتویەتی): پیاوێک هاتە لای (ئیمامی) ئەبو بەکر ﷺ وتی: لە خەومدا بینیم لە جێگای میز خوێنم دادەنا؟ (ئیمامی ئەبوبەکریش) وتی: ئایا لە کاتی حەیز چویتە لای خێزانەکەت؟ لە کاتێکدا کە حەیزدارە؟ کابرا وتی: بەڵێ، (ئیمامی ئەبو بەکر) وتی: لە خوا بترسە و نەگەڕێیتەوە سەری.

١١٤٥ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، فِي الَّذِي يَقَعُ عَلَى امْرَأَتِهِ، وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ: يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ»[٥].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی (حوکمی) ئەو کەسەی تووشی ئافرەتەکەی دەبێت لە کاتێکدا کە حەیزدارە، وتویەتی: داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکات.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده منقطع.

(٥) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: ئەو (زانایانەی) وتویانە: كەفارەتی لەسەرە

١١٤٦ - «حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: سَمِعْتُ الْحَسَنَ، يَقُولُ فِي الَّذِي يُفْطِرُ يَوْمًا مِنْ رَمَضَانَ، قَالَ: عَلَيْهِ عِتْقُ رَقَبَةٍ، أَوْ بَدَنَةٌ، أَوْ عِشْرِينَ صَاعًا، لِأَرْبَعِينَ مِسْكِينًا وَفِي الَّذِي يَغْشَى امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ مِثْلُ ذَلِكَ»[١].

واتە: لە یەزیدی كوڕی ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە حەسەن بوو دەربارەی ئەو كەسەی ڕۆژێك لە ڕەمەزان دەشكێنێت، وتی: ئازاد كردنی بەندەیەكی لەسەرە یان (كردنە خێری) وشترێك، یان (كردنەخێری) صاعێك (لە دانەوێڵە) بۆ چل هەژار، وە دەربارەی ئەو كەسەی جیماع لەگەڵ خێزانەكەی دەكات لە كاتێكدا كە حەیزدارە بەهەمان شێوە (كەفارەتەكەی وەك پێشەوەیە).

١١٤٧ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ: يَتَصَدَّقُ بِنِصْفِ دِينَارٍ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە دەربارەی ئەو كەسەی دەچێتە لای ئافرەتەكەی و (جیماعی لەگەڵ دەكات) لە كاتێكدا كە حەیزدارە، فەرموویەتی: نیو دینار (نیو مسقاڵ زێڕ) دەكاتە خێر (ئا ئەوە كەفارەتەكەیەتی).

١١٤٨ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، فِي الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ: يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ أَوْ نِصْفِ دِينَارٍ شَكَّ الْحَكَمُ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو كەسەی دەچێتە لای خێزانەكەی و (جیماعی لەگەڵ دەكات) لە كاتێكدا كە حەیزدارە، وتویەتی: دینارێك (واتە: یەك مسقاڵ زێڕ) یانیش وتی: نیو دینار (واتە: نیو مسقاڵ زێڕ) دەكاتە خێر، حەكەم گومانی هەبووە (كە كامیانی وتوە).

١١٤٩ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، فِي الَّذِي يَغْشَى امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ أَوْ نِصْفِ دِينَارٍ قَالَ شُعْبَةُ: أَمَّا حِفْظِي فَهُوَ مَرْفُوعٌ، وَأَمَّا فُلَانٌ وَفُلَانٌ، فَقَالَا: غَيْرُ مَرْفُوعٍ. قَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: حَدِّثْنَا بِحِفْظِكَ وَدَعْ مَا قَالَ فُلَانٌ وَفُلَانٌ. فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا أُحِبُّ أَنِّي عُمِّرْتُ فِي الدُّنْيَا عُمُرَ نُوحٍ ﷺ وَأَنِّي حَدَّثْتُ بِهَذَا، أَوْ سَكَتُّ عَنْ هَذَا»[٤].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو كەسەی جیماع لەگەڵ خێزانەكەی دەكات لە كاتێكدا كە حەیزدارە، دینارێك (مسقاڵە زێڕێك) یان نیو دینار (نیو مسقاڵ

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

زێڕ) دەكات بە خێر، شوعبە وتویەتی: ئەوەی من لەبەرم كردوە (دەربارەی ئەم فەرموودەیە) ئەوە لە پێغەمبەری خواوەیە ﷺ (فەرموودەكە پاڵ دراوەتەوە لای ئەو)، هەرچی فلان و فلانیشن وتویانە: نەگەیشتۆتە پێغەمبەری خوا ﷺ (قسەی ئیبنو عەبباسە)، هەندێك لە خەڵكەكە وتیان: ئەوەمان بۆ باس بكە كە خۆت لەبەرت كردوە واز بێنە لە قسەی فلان و فلان ، ئەویش وتی: سوێند بە خوا حەز ناكەم تەمەنم درێژ بكرێتەوە لە دونیا بە تەمەنی نووح عليه السلامو ئەوەتان بۆ باس بكەم یان خۆم لەوە بێ دەنگ بكەم، (نەخێر دەبێ هەردووكیان باس بكەم و ڕوونی بكەمەوە).

١١٥٠ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، قَالَ: إِذَا أَتَاهَا فِي دَمٍ، فَدِينَارٌ، وَإِذَا أَتَاهَا وَقَدِ انْقَطَعَ الدَّمُ، فَنِصْفُ دِينَارٍ»[1].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر (پیاوەكە) چوو بۆ لای خێزانەكەی و (جیماعی لەگەڵ كرد) ئەو كاتەی خوێنی دەبینی ئەوە دینارێك (مسقاڵێك زێر) دەكاتە خێر، وە ئەگەر هاتوو چوو بۆ لای و (جیماعی لەگەڵ كرد) لە كاتێكدا كە خوێنەكەی وەستاوە (بەڵام خۆی نەشۆردووە) ئەوە نیو دینار (واتە: نیو مسقاڵ زێڕ) دەكاتە خێر.

١١٥١ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِي الَّذِي يَقَعُ عَلَى امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ: يَتَصَدَّقُ بِنِصْفِ دِينَارٍ»[2].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ: دەربارەی ئەو كەسەی تووشی خێزانەكەی دەبێ و (جیماعی لەگەڵ دەكات) لە كاتێكدا كە حەیزدارە فەرموویەتی: نیو دینار (نیو مسقاڵ زێڕ) دەكاتە خێر.

١١٥٢ - «عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ الْخَطَّابِ، قَالَ: كَانَ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه، امْرَأَةٌ تَكْرَهُ الْجِمَاعَ، وَكَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَهَا اعْتَلَّتْ عَلَيْهِ بِالْحَيْضِ، فَوَقَعَ عَلَيْهَا، فَإِذَا هِيَ صَادِقَةٌ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَأَمَرَهُ أَنْ يَتَصَدَّقَ بِخُمُسَيْ دِينَارٍ»[3].

واتە: لە عەبدولحەمیدی كوڕی زەیدی كوڕی خەتتاب گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عومەری كوڕی خەتتاب رضي الله عنه خێزانێكی هەبوو ڕقی لە جیماع بوو، وە (ئیمامی عومەر) هەر كاتێك بیویستایە بچێتە لای بەهانەی بۆ دەهێنایەوە بە هەبوونی حەیز، ئەویش (جارێكیان گوێی پێ نەدا) و تووشی بوو (جیماعی لەگەڵ كرد)و ئافرەتەكە ڕاستگۆ دەرچوو (حەیزی هەبوو)، ئیمامی عومەریش هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺو پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێكرد كە دوو بەش لە پێنج بەشی دینارێك (واتە: یەك بەش لە پێنج بەشی مسقاڵێكی زێڕ) بكاتە خێر.

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده معضل.

١١٥٣ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا أَتَى الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَإِنْ كَانَ الدَّمُ عبيطًا، فَلْيَتَصَدَّقْ بِدِينَارٍ، وَإِنْ كَانَتْ صُفْرَةً، فَلْيَتَصَدَّقْ بِنِصْفِ دِينَارٍ»[١].

واته: له ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُما)، گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: ئەگەر پیاو چوو بۆ لای خێزانەكەی و (جیماعی لەگەڵ كرد) لە كاتێكدا كە حەیزدارە، (فەرموویەتی): ئەگەر (لەو حاڵەتە بوو) كە خوێنەكە گەش و زۆر بوو با دینارێک (مسقاڵێک زێڕ) بكاتە خێر، وە ئەگەر هاتوو زەردایەتی بوو با نیو دینار (نیو مسقاڵ زێڕ) بكاتە خێر.

١١٥٤ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما، أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ: يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ أَوْ بِنِصْفِ دِينَارٍوقَالَ إِبْرَاهِيمُ: يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ»[٢].

واته: له ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) گێردراوەتەوە، كە پرسیاری لێ كراوە دەربارەی ئەو كەسەی دەچێتە لای ئافرەتەكەی و (جیماعی لەگەڵ دەكات) لە كاتێكدا كە حەیزدارە، وتویەتی: دینارێک (مسقاڵە زێڕێک) یان نیو دینار (نیو مسقاڵە زێڕ) بكاتە خێر، وە ئیبراهیم وتویەتی: داوای لێخۆشبوون لە خوا دەكات (چونكە تاوانی ئەنجام داوە).

١١٥٥ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما، قَالَ: إِذَا وَقَعَ عَلَى امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ، فَعَلَيْهِ أَنْ يَتَصَدَّقَ بِدِينَارٍ»[٣].

واته: له ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر پیاو تووشی خێزانەكەی بوو لە كاتێكدا كە حەیزدارە ئەوە لەسەریەتی دینارێک (مسقاڵە زێڕێک) بكاتە خێر.

١١٥٦ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي رَجُلٍ جَامَعَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ: يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ»[٤].

واته: لە عەطائەوە گێردراوەتەوە دەربارەی پیاوێک كە جیماعی لەگەڵ خێزانەكەی كردبێت لە كاتێكدا كە حەیزدارە، وتویەتی: دینارێک (واتە: مسقاڵە زێڕێک) دەكاتە خێر.

١١٥٧ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما، قَالَ: يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ أَوْ نِصْفِ دِينَارٍ»[٥].

واته: له ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) گێردراوەتەوە، وتویەتی: دینارێک (مسقاڵە زێڕێک) یان نیو دینار (نیو مسقاڵ زێڕ) دەكاتە خێر.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ موقوف صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ موقوف بسند ضعيف.

١١٥٨ - «عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ، فِي رَجُلٍ يَغْشَى امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ أَوْ رَأَتِ الطُّهْرَ، وَلَمْ تَغْتَسِلْ قَالَ: يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ، وَيَتَصَدَّقُ بِخُمُسِ دِينَارٍ»[١].

واتە: لە ئەوزاعیەوە گێردراوەتەوە دەربارەی پیاوێک کە جیماع لەگەڵ خێزانەکەی دەکات لە کاتێکدا کە حەیزدارە، یان پاک بۆتەوەو خۆی نەشۆردوە، وتویەتی: داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکات و پێنج یەکی دینارێک (واتە: پێنج یەکی مسقاڵێکی زێر) دەکات بە خێر.

١١٥٩ - «عَنْ عَطَاءٍ، قَالَ: إِذَا وَقَعَ الرَّجُلُ عَلَى امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ، يَتَصَدَّقُ بِنِصْفِ دِينَارٍ. فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: فَإِنَّ الْحَسَنَ يَقُولُ: يُعْتِقُ رَقَبَةً. قَالَ: مَا أَنْهَاكُمْ أَنْ تَقَرَّبُوا إِلَى اللَّهِ مَا اسْتَطَعْتُمْ»[٢].

واتە: لە عەطائەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر پیاو جیماعی لەگەڵ ئافرەتەکەی کرد لە کاتێکدا کە حەیزدارە، نیو دینار (نیو مسقاڵ زێڕ) دەکاتە خێر، پیاوێک لە خەڵکەکە پێی وت: حەسەن دەڵێت بەندەیەک ئازاد دەکرێت (واتە: ئەو دەڵێت دەبێ بەندەیەک ئازاد بکەن)؟! عەطاء وتی: من ڕێگریتان لێ ناکەم کە لە خوا نزیک بکەونەوە ئەوەندەی دەتوانن (واتە: چەندی زیاتر بکەنە خێر زیاتر لەخوا نزیک دەکەونەوە و کەفارەتەکە چاکترە، قسەی حەسەنیش ڕاستە و دەبێت).

١١٦٠ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما، فِي الَّذِي يَقَعُ عَلَى امْرَأَتِهِ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ: يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) گێردراوەتەوە، دەربارەی ئەو کەسەی کە جیماع لەگەڵ خێزانەکەیدا دەکات لە کاتێکدا کە حەیزدارە، وتویەتی: دینارێک (مسقاڵە زێڕێک) دەکاتە خێر.

### بابەت: (حوکمی) چوونە لای ئافرەتان لە دواوە (لە کۆم)

١١٦١- «عَنِ ابْنِ سَابِطٍ، قَالَ: سَأَلْتُ حَفْصَةَ بِنْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ هُوَ ابْنُ أَبِي بَكْرٍ، قُلْتُ لَهَا: إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكِ عَنْ شَيْءٍ وَأَنَا أَسْتَحْيِي أَنْ أَسْأَلَكِ عَنْهُ؟ قَالَتْ: سَلْ يَا ابْنَ أَخِي عَمَّا بَدَا لَكَ. قَالَ: أَسْأَلُكِ عَنْ إِتْيَانِ النِّسَاءِ فِي أَدْبَارِهِنَّ، فَقَالَتْ: حَدَّثَتْنِي أُمُّ سَلَمَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَتِ الْأَنْصَارُ لَا تُجَبِّي، وَكَانَتِ الْمُهَاجِرُونَ تُجَبِّي، فَتَزَوَّجَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ امْرَأَةً مِنَ الْأَنْصَارِ، فَجَبَّاهَا، فَأَبَتِ الْأَنْصَارِيَّةُ، فَأَتَتْ أُمَّ سَلَمَةَ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهَا، فَلَمَّا أَنْ جَاءَ النَّبِيُّ ﷺاسْتَحْيَتِ الْأَنْصَارِيَّةُ وَخَرَجَتْ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ أُمُّ سَلَمَةَ لِلنَّبِيِّ ﷺفَقَالَ: ادْعُوهَا لِي فَدُعِيَتْ لَهُ، فَقَالَ لَهَا: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾البقرة، صِمَامًا وَاحِدًا وَالصِّمَامُ: السَّبِيلُ الْوَاحِدُ»[٤].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە ئیبنو سابیطەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە حەفصەی کچی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر کرد، پێم وت: من دەمەوێ پرسیارت لێ بکەم دەربارەی شتێک، وە شەرمیش دەکەم کە پرسیارت دەربارەی لێ بکەم؟ حەفصە وتی: پرسیار بکە ئەی برازام ئەوەی دەتەوێ، (ئیبنو سابیط) وتی: پرسیارت لێدەکەم دەربارەی (حوکمی) چوونە لای ئافرەت لە دواوە (لە کۆم)، حەفصە وتی: ئوممی سەلەمە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) بۆی گێڕامەوە وتی: ئەنصاریەکان نەدەچوونە لای خێزانەکانیان لە دواوە وەک شێوازی سوجدە بردن لە لایەن ئافرەتەکەوە، موهاجیرەکانیش لە دواوە بە شێوازی سەجدە دەچوونە لای خێزانەکانیان (لە ئەندامی زاوزێوە)، جا پیاوێک لە موهاجیرەکان هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێک لە ئەنصاریەکان کرد، پیاوەکەش بە شێوازی سەجدە چوو بۆ لای خێزانەکەی (لە ڕێگای ئەندامی زاوزێ)، ئافرەتە ئەنصاریەکەش ڕازی نەبوو، بۆیە ئافرەتەکە (بۆ پرسیار کردن) هات بۆ لای ئوممی سەلەمەو ئەمەی بۆ باس کرد، جا کاتێک (پێغەمبەری خوا ﷺ)، هات ئافرەتە ئەنصاریەکە شەرمی کردو چووە دەرەوە، ئوممی سەلەمەش ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئافرەتەکەم بۆ بانگ بکەن، بۆیان بانگ کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ (ئەو ئایەتەی) پێ فەرموو: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾البقرة، واتە: [ژنانی هاوسەرتان کێڵگەن بۆتان و شوێنی چاندنی وەچەن، جا بڕۆنە لای کێڵگەکانتان (خێزانەکانتان) بە هەر شێوەیەک کە دەتانەوێت] یەک سیمام واتە: یەک ڕێگا.

تێبینی: ئایەتەکە باس لەوە دەکات کە پیاو دەتوانێ بە هەر شێوازێک هاوسەران پێیان خۆشە جووت بن، بەڵام جووت بوونەکە تەنها لە ڕێڕەوی زاوزێ دروستە، بە هیچ شێوەیەک لە ڕێڕەوی کۆم دروست نیە و تاوانێکی گەورەیە.

١١٦٢ - «عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: لَقَدْ عَرَضْتُ الْقُرْآنَ عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، ثَلَاثَ عَرَضَاتٍ أَقِفُ عِنْدَ كُلِّ آيَةٍ أَسْأَلُهُ فِيمَ أُنْزِلَتْ، وَفِيمَ كَانَتْ؟ فَقُلْتُ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ، أَرَأَيْتَ قَوْلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، قَالَ: مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمْ أَنْ تَعْتَزِلُوهُنَّ»[1].

واتە: لە موجاهیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە دڵنیایی سێ جار قوڕئانم لە خزمەت ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) خوێندۆتەوە، لە هەموو ئایەتێک دەوەستام و پرسیارم لێ دەکرد کە دەربارەی چی دابەزیوەو؟ دەربارەی چیە؟ جا وتم: ئەی ئیبنو عەبباس ئەو وتەی خوای بەرز چۆن دەبینی:﴿فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، واتە: [ئەگەر (ئافرەتەکانتان) پاک بوونەوەو خۆیان شۆرد ئەوە بڕۆنە لایان]، (ئیبنو عەبباس) وتی: بەو شێوەیەی فەرمانی پێ کردوون کە لێیان دووربکەونەوە (ئاواش فەرمانی پێ کردوون دوای پاکبوونەوە بچۆنە لایان).

١١٦٣ - «عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، قَالَ: أُمِرُوا أَنْ يَأْتُوا مِنْ حَيْثُ نُهُوا»[2].

---

(١) ـ إسناده صحيح، والحديث حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە موجاهیدەوە گێڕدراوەتەوە، (دەربارەی ئەو ئایەتە): ﴿ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ ﴾البقرة، واتە: [بچنە لایان بەو شێوەیەی خوا فەرمانی داوە] وتویەتی: فەرمانیان پێ کراوە بچن بۆ لای خێزانەکانیان بەو شێوەیەی نەهیان لێ کرا (واتە: چۆن نەهیان لێ کرا لەکاتی حەیز بچنە لای خێزانەکانیان و جیماعیان لەگەڵ بکەن ئاواش فەرمانیان پێ کرا دوای پاک بوونەوە بچن بۆ لایان لەو شوێنەی حەڵاڵە و خوا فەرمانی کردوە پێی).

١١٦٤ - «عَنْ أَبِي رَزِينٍ: ﴿ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ ﴾البقرة، قَالَ: مِنْ قِبَلِ الطُّهْرِ»[1].

واتە: لە ئەبو ڕەزینەوە گێڕدراوەتەوە (دەربارەی ئەو ئایەتەی): ﴿ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ ﴾البقرة، واتە: [بچنە لایان بەو شێوەیەی خوا فەرمانی داوە] وتویەتی: لە ڕێگای پاکیەوە (واتە: ئەوەی خوا فەرمانی داوە بریتیە لە شوێنی زاوزێ کە شوێنێکە پاکە و بۆ کاری شەرعی دەگونجێ، نەوەک دواوە چونکە حەڕامە).

١١٦٥ - «عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم ﴾الشعراء، قَالَ: هُوَ وَاللَّهِ الْقُبُلُ»[2].

واتە: لە موجاهیدەوە گێڕدراوەتەوە (دەربارەی ئەو ئایەتە): ﴿ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم ﴾الشعراء، واتە: [وازیش دەهێنن لەوەی خوای پەروەردگار بۆی دروست کردوون لە خێزانەکانتان] وتویەتی: سوێند بە خوا ئەندامی زاوزێیە (واتە: ئەوەی خوا لە ئافرەتان دروستی کردوە بۆ مەسەلەی هاوسەریەتی و گەلی لووط وازیان لێ هێنابوو ئەوە ئەندامی زاوزێ بوو لێی دوور کەوتبوونەوە و خویان بە نێربازیەوە گرتبوو).

١١٦٦ - «عَنْ عِكْرِمَةَ، ﴿ نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴾البقرة، قَالَ: إِنَّمَا هُوَ الْفَرْجُ»[3].

واتە: لە عیکریمەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو ئایەتەی): ﴿ نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴾البقرة، واتە: [ژنانی هاوسەرتان کێڵگەن بۆتان و شوێنی چاندنی وەچەن، جا بڕۆنە لای کێلگەکانتان (خێزانەکانتان) بە هەر شێوەیەک کە دەتانەوێت] وتویەتی: (کێڵگەکە) هەر ئەندامی زاوزێیە.

١١٦٧- «حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَلِيٍّ الرِّفَاعِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ الْحَسَنَ، يَقُولُ: كَانَتِ الْيَهُودُ لاَ تَأْلُو مَا شَدَّدَتْ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، كَانُوا يَقُولُونَ: يَا أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ، إِنَّهُ وَاللَّهِ مَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْتُوا نِسَاءَكُمْ إِلاَّ مِنْ وَجْهٍ وَاحِدٍ، قَالَ: فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴾البقرة، فَخَلَّى اللهُ بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَبَيْنَ حَاجَتِهِمْ»[4].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە عەلی كوڕی عەلی ڕیفاعیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە حەسەن بوو دەیوت: جوولەكەكان كەمتەرخەمیان نەدەكرد لە هەر شتێک كە لەسەر مسوڵمانان قورس و ناخۆش بووایە (پێیان دەوتن و بۆیان باس دەكردن)، دەیانووت: ئەی هاوەڵانی موحەممەد ﷺ سوێند بە خوا بۆتان حەڵاڵ نیە بچنە لای خێزانەكانتان تەنها لە یەک ڕوو بە یەک جۆر نەبێت، دەڵێ: خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ ﴿٢٢٣﴾﴾البقرة، واتە: [ژنانی هاوسەرتان كێڵگەن بۆتان و شوێنی چاندنی وەچەن، جا بڕۆنە لای كێلگەكانتان (خێزانەكانتان) بە هەر شێوەیەک كە دەتانەوێت]، خوا ڕێگەی كردەوە لە نێوان ئیمانداران و پێویستیەكەیان (بەوەی ئازاد بن و بە هەموو شێوازێک بۆیان حەڵاڵ بێت بچنە لای خێزانەكانیان).

١١٦٨- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: ﴿فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ ﴿٢٢٣﴾﴾البقرة، قَالَ: ائْتِهَا مِنْ بَيْنِ يَدَيْهَا وَمِنْ خَلْفِهَا بَعْدَ أَنْ يَكُونَ فِي الْمَأْتَى»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، گێردراوەتەوە (دەربارەی ئەو ئایەتەی):﴿فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ ﴿٢٢٣﴾﴾البقرة، واتە: [بڕۆنە لای كێلگەكانتان (خێزانەكانتان) بە هەر شێوەیەک كە دەتانەوێت]، وتویەتی: بڕۆ بۆ لای (جیماعی لەگەڵ بكە) لە پێشەوەو دواوە، (بەڵام) لە شوێنی خۆی (تەنها لە ئەندامی زاوزێ كە خوا حەڵاڵی كردوە).

١١٦٩ - «عَنْ عِكْرِمَةَ، قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يَصْنَعُونَ فِي الْحَائِضِ نَحْوًا مِنْ صَنِيعِ الْمَجُوسِ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَنَزَلَتْ: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِۖ قُلۡ هُوَ أَذٗى فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، فَلَمْ يَزْدَدِ الْأَمْرُ فِيهِنَّ إِلاَّ شِدَّةً»[٢].

واتە: لە عیكریمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێشتر خەڵكی سەردەمی جاهیلی مامەڵەیان لەگەڵ ئافرەتی حەیزداردا دەكرد وەک مامەڵەی ئاگر پەرستەكان (زۆر لێیان دوور دەكەوتنەوە، یان لە دواوە (لە كۆم) دەچوونە لایان)، جا ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باس كرد، ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِۖ قُلۡ هُوَ أَذٗى فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، واتە: [ئەی پێغەمبەر پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی عادەتی مانگانەی ئافرەتان (ئاخۆ بچن بۆ لایان بۆ جیماع كردن یان نا) پێیان بڵێ: ئەوە ئازار و زەرەرە، كەوابوو خۆتان بە دوور بگرن لە هاوسەرەكانتان كە لەو حاڵەتەدا بن و نزیكیان مەكەون تا پاک دەبنەوە، جا كاتێک پاک بوونەوە خۆیان شۆرد بچنە لایان بەو شێوەی خوا فەرمانی داوە] جا ئەمڕۆ فەرمانەكە هیچی بۆ ئافرەتەكان زیاد نەكرد توندی نەبێت.

١١٧٠ - «عَنْ مُجَاهِدٍ: ﴿قُلۡ هُوَ أَذٗى ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، قَالَ: هُوَ الدَّمُ»[٣].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە موجاهیدەوە گێڕدراوەتەوە، (دەربارەی ئەو ئایەتەی): ﴿قُلْ هُوَ أَذًى ﴿٢٢٢﴾﴾ واتە: (أذی): خوێنە.

١١٧١ - «عَنْ قَتَادَةَ، ﴿قُلْ هُوَ أَذًى ﴿٢٢٢﴾﴾ البقرة، قَالَ: قَذَرٌ»[١].

واتە: لە قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، (دەربارەی ئەو ئایەتەی): ﴿قُلْ هُوَ أَذًى ﴿٢٢٢﴾﴾ واتە: (أذی): شتی قێزەون و پیسە.

١١٧٢ - «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾ البقرة، قَالَ: إِنْ شِئْتَ فَاعْزِلْ، وَإِنْ شِئْتَ، فَلاَ تَعْزِلْ»[٢].

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە گێڕدراوەتەوە، (دەربارەی ئەو ئایەتەی): ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾ البقرة، واتە: [ژنانی هاوسەرتان کێڵگەن بۆتان و شوێنی چاندنی وەچەن، جا بڕۆنە لای کێڵگەکانتان (خێزانەکانتان) بە هەر شێوەیەک کە دەتانەوێت] وتویەتی: (واتە:) ئەگەر حەزتان کرد دوور بکەونەوە (مەچوونە لایان) وە ئەگەر حەزیشتان کرد بڕۆنە لایان (واتە: هەموو کاتێک سەر جێییتان بۆ حەڵاڵە لەگەڵ هاوسەرەکانتان، کەی حەزتان کرد بچن و نەچن هەر دروستە).

١١٧٣ - «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: كَيْفَ شِئْتَ يَعْنِي: ائتهَا فِي الْفَرْجِ»[٣].

واتە: لە حەسەنەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (كَيْفَ شِئْتَ) واتە: بڕۆ بۆ لای سەر جێیی لەگەڵ بکە لە ئەندامی زاوزێوە (هەرچۆنی دەتانەوێ).

١١٧٤ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، أَنَّ الْيَهُودَ قَالُوا لِلْمُسْلِمِينَ: مَنْ أَتَى امْرَأَتَهُ وَهِيَ مُدْبِرَةٌ، جَاءَ وَلَدُهُ أَحْوَلَ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾ البقرة»[٤].

واتە: لە جابیری کوڕی عەبدوڵلای ئەنصاریەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) گێڕدراوەتەوە کە جوولەکەکان بە مسوڵمانانیان وت: هەر کەسێک بچێتە لای ئافرەتەکەی لە کاتێکدا ئافرەتەکە پشتی لەو بێت (واتە: لە دواوە جیماعی لەگەڵ بکات لە ئەندامی زاوزێوە) ئەوە منداڵەکەی خێل دەبێت (بە خێلی لە دایک دەبێت)، خوای بەرز ئەو ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێ: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾ البقرة.

١١٧٥ - «عَنْ عِكْرِمَةَ: ﴿فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾ البقرة، قَالَ: يَأْتِي أَهْلَهُ كَيْفَ شَاءَ قَائِمًا، وَقَاعِدًا، وَبَيْنَ يَدَيْهَا، وَمِنْ خَلْفِهَا»[٥].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە عیکریمەوە گێڕدراوەتەوە، (دەربارەی ئەو ئایەتە): ﴿فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾البقرة، وتویەتی: (پیاو) دەچێتە لای خێزانەکەی (سەر جێیی لەگەڵ دەکات) هەر چۆنی بوویت بە وەستاوی و بە دانیشتن و لە پێش و دواوە، (بەڵام لە ڕێگای ئەندامی زاوزێوە کە خوا حەڵاڵی کردووە).

١١٧٦ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ: ﴿فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، قَالَ: فِي الْفَرْجِ»[1].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، (دەربارەی ئەو ئایەتە): ﴿فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، واتە: [بچنە لایان بەو شێوەیەی خوا فەرمانی داوە] وتویەتی: (ئەوەی خوا فەرمانی داوە جیماع کردنە) لە ئەندامی زاوزێوە.

## بابەت: (حوکمی) ئەو کەسەی بچێتە لای ئافرەتەکەی لە دواوە (لە کۆم)

١١٧٧- «عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: مَنْ أَتَى امْرَأَتَهُ فِي دُبُرِهَا، فَهُوَ مِنَ الْمَرْأَةِ مِثْلُهُ مِنَ الرَّجُلِ، ثُمَّ تَلَا: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللهُ أَنْ تَعْتَزِلُوهُنَّ: فِي الْمَحِيضِ: الْفَرْجِ، ثُمَّ تَلَا: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾البقرة، قَائِمَةً، وَقَاعِدَةً، وَمُقْبِلَةً، وَمُدْبِرَةً فِي الْفَرْجِ»[2].

واتە: لە موجاهیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەر کەسێک بچێتە لای خێزانەکەی (سەر جێیی لەگەڵ بکات) لە دواوە (لە کۆم) ئەوە (دەبێ بزانێت) لە ئافرەتدا وەک هی پیاوە (واتە: بە نێربازی حیسابە جیاوازی نیە)، دواتر ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرة، واتە: [ئەی پێغەمبەر پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی عادەتی مانگانەی ئافرەتان (ئاخۆ بچن بۆ لایان بۆ جیماع کردن یان نا) پێیان بڵێ: ئەوە ئازارو خوێن و پیسی و زەرەرە، کەوابوو خۆتان بە دوور بگرن لە هاوسەرەکانتان کە لەو حاڵەتەدا بن و نزیکیان مەکەون تا پاک دەبنەوە، جا کاتێک پاکبوونەوە خۆیان شۆرد بچنە لایان بەو شێوەی خوا فەرمانی داوە] جا کە دەفەرموێ لێیان دوور بکەونەوە لە (الْمَحِيضِ): (واتە) ئەندامی زاوزێ، دواتر ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾البقرة، واتە: [ژنانی هاوسەرتان کێڵگەن بۆتان و شوێنی چاندنی وەچەن، جا بڕۆنە لای کێڵگەکانتان (خێزانەکانتان) بە هەر شێوەیەک کە دەتانەوێت] واتە: بە وەستاوی و بە دانیشتن و لە پێش و دواوە لە ئەندامی زاوزێوە.

١١٧٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ أَتَى حَائِضًا أَوِ امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا، أَوْ كَاهِنًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ، فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزَلَ اللهُ عَلَى مُحَمَّدٍ»[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە، کە فەرموویەتی: هەر کەسێک بچێتە لای ئافرەتێکی حەیزدار (جیماعی لەگەڵ بکات)، یان جیماع لەگەڵ ئافرەتەکەی بکات

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح، و الحديث حسن.

لە دواوە (لە كۆم)، یان بچێتە لای ساحیرو فاڵچیەک و بەڕاست دابنێت ئەوەی دەیڵێ (دەربارەی غەیب)، ئەوە ئەو کەسە کافر بوە بەوەی کە دابەزیوەتە سەر موحەممەد ﷺ (ئەگەر بڕوای بە حوکمە ئیسلامیەکە نەبێت).

١١٧٩ - «عَنْ أَبِي الْقَعْقَاعِ الْجَرْمِيِّ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، فَقَالَ: يَا أَبا عَبْدِ الرَّحْمَنِ آتِي امْرَأَتِي حَيْثُ شِئْتُ؟ قَالَ: نَعم قَالَ: وَمِنْ أَيْنَ شِئْتُ؟ قَالَ: نَعم قَالَ: وَكَيْفَ شِئْتُ؟ قَالَ: نَعم. فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا أَبا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنَّ هَذَا يُرِيدُ السُّوءَ. قَالَ: لاَ مَحَاشُ النِّسَاءِ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ سُئِلَ عَبْدُ اللَّهِ: تَقُولُ بِهِ؟ قَالَ: نَعم»[١].

واتە: لە ئەبو قەعقاعی جەرمیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هاتە لای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ وتی: ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان ئایا بچم بۆ لای خێزانەکەم هەر کاتێک بمەوێت؟ وتی: بەڵێ، کابرا وتی: وە لە هەر شوێنێک کە بمەوێت؟ ئیبنو مەسعود وتی: بەڵێ، کابرا وتی: وە هەر چۆنی بمەوێت؟ وتی: بەڵێ، جا پیاوێک بە ئیبنو مەسعودی وت: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان ئەوە مەبەستی خراپە، ئیبنو مەسعود (کە زانی مەبەستی خراپە و باس لە دواوە دەکات) وتی: نەخێر، دواوەی ئافرەتان (کۆم) حەرامە لەسەرتان.

پرسیار لە عەبدوڵڵای کرا: ئایا ئەو قسەیە وەردەگری (تۆش لەگەڵ بۆچوونەکەیدای)؟ وتی: بەڵێ.

١١٨٠ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُ كَانَ يَكْرَهُ إِتْيَانَ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ فِي دُبُرِهَا، وَيَعِيبُهُ عَيْباً شَدِيدًا»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، کە پێی حەڕام بووە پیاو بچێتە لای خێزانەکەی (سەر جێیی لەگەڵ بکات) لە دواوە (لە کۆم)، بە عەیب و شورەییەکی زۆری دادەنا.

١١٨١ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ: ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُمْ بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِنَ الْعَالَمِينَ ﴿٢٨﴾﴾العنكبوت، قَالَ: مَا نَزَا ذَكَرٌ عَلَى ذَكَرٍ حَتَّى كَانَ قَوْمُ لُوطٍ»[٣].

واتە: لە عەمری کوڕی دینارەوە گێڕدراوەتەوە، (دەربارەی ئەو ئایەتەی کە خوا لەسەر زاری پێغەمبەر لووط ﷺ کە بە قەومەکەی فەرموو): ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الْفَاحِشَةَ مَا سَبَقَكُمْ بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِنَ الْعَالَمِينَ ﴿٢٨﴾﴾العنكبوت، واتە: [ئێوە بە ڕاستی تاوانێکی گەورە دەکەن، ئێوە گوناهێکی ناشیرین ئەنجام دەدەن، هیچ کەس بەر لە ئێوە بەکاری وا هەڵنەستاوە] وتویەتی: هیچ نێرێک نەپەڕیبووە سەر نێرێک تا گەلی لووط هاتن.

---

(١) ـ إسناده حسن.
(٢) ـ إسناده صحيح.
(٣) ـ إسناده صحيح.

١١٨٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ أَتَى امْرَأَتَهُ فِي دُبُرِهَا، لَمْ يَنْظُرِ اللهُ تَعَالَى إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، كە فەرموویەتی: هەر كەسێک بچێتە لای خێزانەكەی و (لە گەڵی جووت بێت) لە دواوە (لە كۆم)، ئەوە خوای بەرز (بە ڕەحمەت) سەیری ناكات لە ڕۆژی دواییدا.

١١٨٣ - «عَنْ عَلِيِّ بْنِ طَلْقٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَحْدَثَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ، فَلْيَنْصَرِفْ، وَلْيَتَوَضَّأْ، ثُمَّ يُصَلِّي. وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لاَ تَأْتُوا النِّسَاءَ فِي أَدْبَارِهِنَّ، فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ، سُئِلَ عَبْدُ اللَّهِ: عَلِيُّ بْنُ طَلْقٍ لَهُ صُحْبَةٌ؟ قَالَ: نَعم»[٢].

واتە: لە عەلی كوڕی طەڵقەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەكێک لە ئێوە بێ دەستنوێژ بوو (دەستنوێژی شكا) لە ناو نوێژدا، بابڕوات (واز لە نوێژەكە بهێنێت)و دەستنوێژ بشۆرێت، دواتر نوێژ بكات. وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مەچوونە لای ئافرەتان لە دواوەیان (لە كۆم)، چونكە خوا شەرم لە هەق ناكات (ئەو بابەتانەی شەرعین و بەندەكان پێویستیانە بۆیان ڕوون دەكاتەوە).

پرسیار لە عەبدوڵلا كرا: ئایا عەلی كوڕی طەڵق هاوەڵە (صەحابەیە)؟ وتی: بەڵێ.

١١٨٤- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَسَارٍ أَبِي الْحُبَابِ، قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: مَا تَقُولُ، فِي الْجَوَارِي حِينَ أُحَمِّضُ لَهِنَّ؟ قَالَ: وَمَا التَّحْمِيضُ؟ فَذَكَرْتُ الدُّبُرَ. فَقَالَ: هَلْ يَفْعَلُ ذَلِكَ أَحَدٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ؟»[٣].

واتە: لە سەعیدی كوڕی یەسار (ئەبو حوباب)ەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە ئیبنو عومەرم وت (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): چی دەڵێی دەربارەی ئافرەتان (ئەگەر) كاتێک ڕێڕەوی جیماع بگۆڕم؟ ئیبنو عومەریش وتی: ڕێڕەو گۆڕین چیە؟ دەڵێ منیش باسی دواوەم كرد (وتم: كۆم)، ئیبنو عومەر وتی: ئایا هیچ یەكێک لە مسوڵمانان شتی وا دەكات؟! (شتی وا خراپ و بەد كاری مسوڵمانە؟! هەر ئەوە مابوو!!!).

١١٨٥ - «حَدَّثَنِي هَرَمِيُّ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ تَذَاكَرْنَا شَأْنَ النِّسَاءِ فِي مَجْلِسِ بَنِي وَاقِفٍ وَمَا يُؤْتَى مِنْهُنَّ فَقَالَ خُزَيْمَةُ بْنُ ثَابِتٍ ﷺ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ، لاَ تَأْتُوا النِّسَاءَ فِي أَعْجَازِهِنَّ»[٤].

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح، و الحديث حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده حسن.

واتە: لە هەڕەمی کوڕی عەبدوڵڵاوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: باسی کاروباری ئافرەتانمان دەکرد و ئەوەی (لە ڕووی شەرعیەوە دروستە) لەگەڵیان بکرێت، لە دانیشتگای بەنی واقیفدا، خوزەیمەی کوڕی ثابیتیش ﷺ وتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە خوا شەرم لە هەق ناکات، مەچوونە لای ئافرەتان (سەر جێییان لەگەڵ مەکەن) لە دواوە (لە کۆم).

١١٨٦ - «عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: كَانُوا يَجْتَنِبوون النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَيَأْتُونَهُنَّ فِي أَدْبَارِهِنَّ. فَسَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ عَنْ ذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ﴿٢٢٢﴾ ﴾البقرة، فِي الْفَرْجِ وَلاَ تَعْدُوهُ»[1].

واتە: لە موجاهیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خەڵکی لە ئافرەتان دووردەکەوتنەوە لە ئەندامی زاوزێیان (لە کاتی جووت بوون)، وە دەچوونە لایان (لەگەڵیان جووت دەبوون) لە دواوە لە کۆم، جا پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی ئەوە، خوای بەرز ئەو ئایەتەی دابەزاند:﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ﴿٢٢٢﴾ ﴾البقرة، واتە: [ئەی پێغەمبەر ﷺ پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی عادەتی مانگانەی ئافرەتان (ئایا بچن بۆ لایان بۆ جیماع یان نا) پێیان بڵێ: ئەوە ئازار و زەرەرە، کەوابوو خۆتان بە دوور بگرن لە هاوسەرەکانتان کە لەو حاڵەتەدا بن و نزیکیان مەکەون تا پاک دەبنەوە، جا کاتێک پاک بوونەوەو خۆیان شۆرد بچنە لایان بەو شێوەی خوا فەرمانی داوە] لە ئەندامی زاوزێوە، لەو تێمەپەڕن (سنور مەبەزێنن).

١١٨٧ - «عَنْ طَاوُسٍ، وَسَعِيدٍ، وَمُجَاهِدٍ، وَعَطَاءٍ، أَنَّهُمْ، كَانُوا يُنْكِرُونَ إِتْيَانَ النِّسَاءِ فِي أَدْبَارِهِنَّ، وَيَقُولُونَ هُوَ الْكُفْرُ»[2].

واتە: لە طاووس و سەعیدو موجاهید و عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، کە هەموویان چوونە لای ئافرەتانیان لە دواوە (لە کۆم) پێ حەرام بووەو دەیانووت: کوفرە (واتە: مرۆڤ پێی کافر دەبێت ئەگەر پێی حەرام نەبێت، ئەگەر پێشی حەرام بێت و هەر بچێتە لای لە دواوە، ئەوە تاوانێکی گەورە و سیفەتێکی کافرانی لەخۆی هێناوەتەجێ).

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: خۆشۆردنی ئافرەتی حەیزدار ئەگەر خۆشۆردنی لەسەر واجب بوو (بە هۆی جیماع یان ئیحتیلام) پێش ئەوەی تووشی حەیز بێت

١١٨٨ - «عَنْ عَطَاءٍ، وَالزُّهْرِيِّ، قَالاَ: الْغُسْلُ مِنَ الْجَنَابَةِ، وَالْحَيْضِ وَاحِدٌ»(١).

واتە: لە عەطاء و زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: خۆشۆردن لە جەنابەت و حەیز یەک جارە (واتە: ئەگەر ئافرەتێک تووشی جەنابەت بوو دواتر ڕاستەوخۆ یان پاش کەمێک تووشی حەیزیش بوو، ئەوە یەک جار واجبە خۆی بشۆرێت، ئەو کاتەی کە لە حەیزەکەی پاک بوویەوە).

١١٨٩ - «عَنْ، حُذَيْفَةَ ﷺ، قَالَ لِامْرَأَتِهِ: خَلِّلِي شَعْرَكِ بِالْمَاءِ قَبْلَ أَنْ تَخَلَّلَهُ نَارٌ قَلِيلَةُ الْبُقْيَا عَلَيْهِ»(٢).

واتە: لە حوذەیفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە بە خێزانەکەی وتوە: قژت لێک بدە (هەڵی پشێوە) بە ئاو پێش ئەوەی ئاگرێک لێکی بدات کە کەم لەسەری دەمێنێتەوە (هەر زوو لە ناوی دەبات و دەیسوتێنێت).

١١٩٠ - «حَدَّثَنِي جُمَيْعُ بْنُ عُمَيْرٍ، أَحَدُ بَنِي تَيْمِ اللَّهِ بْنِ ثَعْلَبَةَ قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أُمِّي وَخَالَتِي عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، فَسَأَلَتْهَا إِحْدَاهُمَا: كَيْفَ تَصْنَعِينَ عِنْدَ الْغُسْلِ؟ فَقَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَطَهَّرُ طُهُورَهُ لِلصَّلاَةِ، وَيُفِيضُ عَلَى رَأْسِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، وَنَحْنُ نُفِيضُ عَلَى رُءُوسِنَا خَمْساً مِنْ أَجْلِ الضُّفْرِ»(٣).

واتە: لە جومەیعی کوڕی عومەیرەوە گێڕدراوەتەوە، کە یەکێکە لە هۆزی تەیمی الله کوڕی ثەعلەبە، وتویەتی: لەگەڵ دایکم و خارەتم (خوشکی دایکم) چووین بۆ لای عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) یەکێکیان پرسیاری لێ کرد (وتی): چی دەکەیت لە کاتی غوسل؟ عائیشە وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی هەڵدەگرت وەک دەستنوێژی نوێژ، دواتر سێ جار ئاوای دەڕشتە سەر سەری (ئاوی بەسەری دادەکرد)، ئێمەش پێنج جار ئاو بە سەرمان دادەکەین لەبەر کەزی.

١١٩١ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ، عَنِ الْمَرْأَةِ تَغْتَسِلُ: تَنْقُضُ شَعْرَهَا؟ فَقَالَتْ: بَخٍ. وَإِنْ أَنْفَقَتْ فِيهِ أُوقِيَّةً؟ إِنَّمَا يَكْفِيهَا أَنْ تُفْرِغَ عَلَى رَأْسِهَا ثَلاَثًا»(٤).

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پرسیاری لە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) کردوە دەربارەی ئافرەت کە غوسل دەکات ئایا قژی دەکاتەوە (کەزیەکانی هەڵدەوەشێنێتەوە)، عائیشە وتی: بەخ (واتە: بە سەرسوڕمانەوە وتی: هەڵلا هەڵلا) هەروەها ئەگەر ئۆقیەیێکیش پارەی لە کەزیەکەی دابێت؟! (چۆن شتی وا دەبێت)، هەر ئەوەندەی بەسە کە سێ جار ئاو بە سەری دابکات (بە تەواوی تەڕ دەبێت).

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ رجاله ثقات، إلّا أنّه منقطع.

(٣) ـ ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

١١٩٢ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: تُخَلِّلُهُ بِأَصَابِعِهَا»[١].

واتە: لە عەبدوڵلا ﷺ گێڕدراوەتەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، وتویەتی: بە پەنجەكانی لێكی دەدات (هەڵی دەپشێوێت).

١١٩٣ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، فِي الْحَائِضِ وَالْجُنُبِ يَصُبَّانِ الْمَاءَ صَبًّا، وَلاَ يَنْقُضَانِ شُعُورَهُمَا»[٢].

واتە: لە جابیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی حەیزدارو جەنابەتدار وتویەتی: ئاو بە خوڕ بەسەریاندا دەكەن و قژو كەزیان هەڵناوەشێننەوە.

١١٩٤- «حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا أَبُو خَالِدٍ، عَنْ حَجَّاجٍ، عَنْ عَطَاءٍ مِثْلَهُ»[٣].

واتە: لە عەطائەوە هەمان شت گێڕدراوەتەوە.

١١٩٥ - «عَنْ مَنْصُورٍ، قَالَ: قَالَ إِبْرَاهِيمُ: إِذَا بَلَّتْ أُصُولَهُ وَأَطْرَافَهُ، لَمْ تَنْقُضْهُ»[٤].

واتە: لە مەنصورەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبراهیم وتویەتی: ئەگەر ژێرەوەو چواردەوری قژی تەڕ بوو ئەوە قژو كەزیەكەی ناكاتەوە (پێویست ناكات).

١١٩٦ - «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ نِسَاءَ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهما وَأُمَّهَاتِ أَوْلاَدِهِ كُنَّ إِذَا اغْتَسَلْنَ لَمْ يَنْقُضْنَ عِقَصَهُنَّ مِنْ حَيْضٍ وَلاَ مِنْ جَنَابَةٍ»[٥].

واتە: لە نافیع گێڕدراوەتەوە، كە خێزان و دایكی منداڵەكانی ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهما)، كە خۆیان دەشۆرد كەزیەكانیان نەدەكردەوە نە بۆ (خۆشۆردن) لە حەیز و نە لە جەنابەت.

١١٩٧ - «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، أَنَّهَا قَالَتْ: لاَ تَنْقُضْنَ عِقَصَكُنَّ مِنْ حَيْضٍ وَلاَ مِنْ جَنَابَةٍ»[٦].

واتە: لە ئوممی سەلەمەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە كە وتویەتی: كەزیەكانتان مەكەنەوە (هەڵیمەوەشێننەوە) نە بۆ حەیز و نە بۆ جەنابەت.

١١٩٨ - «عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: إِنِّي أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي أَوْ عُقَدَهُ، قَالَ: احْفِنِي عَلَى رَأْسِكِ ثَلاَثَ حَفَنَاتٍ، ثُمَّ اغْمِزِي عَلَى إِثْرِ كُلِّ حَفْنَةٍ غَمْزَةً»[٧].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

(٦) ـ إسناده ضعيف.

(٧) ـ صحيح.

واتە: لە ئوممی سەلەمە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) خێزانی پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتێک هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وتی: من کەزی قژی سەرم توند دەبەستم (جا بۆ خۆشۆردن چی بکەم)؟ (پێغەمبەری خواﷺ) فەرمووی: سێ چەنگە ئاو بەسەرتدا بکە، دواتر لەدوای هەر چەنگە ئاوێک جارێک بیگوشە.

١١٩٩ - «عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ لِامْرَأَتِهِ: اسْتَأْصِلِي الشَّعْرَ لاَ تَخَلَّلُهُ نَارٌ قَلِيلٌ بُقْيَاهَا عَلَيْهِ قَالَ مَنْصُورٌ: يَعْنِي: الْجَنَابَةَ»[١].

واتە: لە حوذەیفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە بە خێزانەکەی وتوە: ناوەوەو ژێرەوەی قژ جوان لێک بدە (با تەڕ ببێت) با ئاگرێک لێکی نەدات کە کەم لەسەری دەمێنێتەوە (هەر زوو لەناوی دەبات و دەیسوتێنێت).

١٢٠٠ - «عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ: أَنَّهُ قَالَ لِإِمْرَأَتِهِ اسْتَأْصِلِي الشَّعْرَ بِالْمَاءِ لاَ تَخَلَّلُهُ نَارٌ قَلِيلٌ بُقْيَاهَا عَلَيْهِ»[٢].

واتە: لە ڕێگایێکی تریشەوە لە حوذەیفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە بە خێزانەکەی وتوە: ناوەوەو ژێرەوەی قژ جوان لێک بدە (با تەڕ ببێت) با ئاگرێک لێکی نەدات کە کەم لەسەری دەمێنێتەوە (هەر زوو لەناوی دەبات و دەیسوتێنێت).

١٢٠١ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: إِذَا اغْتَسَلَتِ الْمَرْأَةُ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَلاَ تَنْقُضْ شَعْرَهَا، وَلَكِنْ تَصُبُّ الْمَاءَ عَلَى أُصُولِهِ وَتَبُلُّهُ»[٣].

واتە: لە جابیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر ئافرەت خۆی شۆرد لە جەنابەت، ئەوە با قژی نەکاتەوە، بەڵکو ئاو بە ناوەوەی قژیدا دەکات و تەڕی دەکات.

١٢٠٢ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْمَرْأَةِ تُصِيبُهَا الْجَنَابَةُ وَرَأْسُهَا مَعْقُوصٌ تَحُلُّهُ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِنْ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا الْمَاءَ صَبًّا، حَتَّى تُرَوِّيَ أُصُولَ الشَّعْرِ»[٤].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئەو ئافرەتەی تووشی جەنابەت دەبێت و قژیی کەزی کراوە، ئایا دەیکاتەوە؟ وتویەتی: نەخێر، بەڵکو ئاو بە خوڕ بە سەریدا دەکات تاوەکو بنەوەی قژی ئاو دەدرێت (جوان تەڕ دەبێت).

١٢٠٣ - «حَدَّثَتْنِي عَمْرَةُ بِنْتُ حبَّانَ السَّهْمِيَّةُ، قَالَتْ: قَالَتْ لِي عَائِشَةُ أُمُّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، أَمَا تَسْتَطِيعُ إِحْدَاكُنَّ إِذَا تطَهُرَتْ مِنْ حَيْضِهَا أَنْ تتدَخَّنَ بشَيْءٍ مِنْ قُسْطٍ، فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فَشَيْئًا مِنْ آسٍ، فَإِنْ لَمْ تَجِدْ، فَشَيْئًا مِنْ نَوًى، فَإِنْ لَمْ تَجِدْ، فَشَيْئًا مِنْ مِلْحٍ»[٥].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده ضعيف.

واتە: عەمرەی کچی حەببانی سەهمی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عائیشەی دایکی ئیمانداران (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) پێی وتم: ئایا هەر یەکێک لە ئێوە ناتوانێت ئەگەر پاکبوویەوە لە حەیزەکەی هەندێک لە قوسط بخاتە سەر ئاگر و شوێنەکەی پێ بۆن خۆش بکات (قوسط) جۆرە دارێکە لە هیند هەیە، دەخرێتە سەر ئاگر و بۆنێکی زۆر خۆشی لێ دروست دەبێت)، ئەگەر دەستت نەکەوت ئەوە هەندێک لە ئاس (کە جۆرە بۆنێکە، بەکاری بهێنە)، ئەگەر دەستت نەکەوت ئەوە هەندێک لە نەوا بەکار بهێنە (کە ئەویش جۆرە بۆنێکە)، ئەگەر دەستت نەکەوت ئەوە هەندێک لە خوڵ بەکار بهێنە (شوێنەکە پاک دەکاتەوە).

١٢٠٤ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: إِذَا اغْتَسَلَتِ الْمَرْأَةُ مِنَ الْحَيْضِ، فَلْتُمِسَّ أَثَرَ الدَّمِ بِطِيبٍ»[1].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەت کاتێ خۆی شۆرد لە حەیز، با لە بۆن و گەڵاو بەکار بهێنێت بۆ شوێنی خوێنەکە.

١٢٠٥ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، أَنَّ نِسَاءَهُ وَأُمَّهَاتِ أَوْلَادِهِ كُنَّ يَغْتَسِلْنَ مِنَ الْحِيضَةِ وَالْجَنَابَةِ ثُمَّ لاَ يَنْقُضْنَ شُعُورَهُنَّ وَلَكِنْ يُبَالِغْنَ فِي بَلِّهَا»[2].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، گێڕدراوەتەوە، کە خێزان و دایکی منداڵەکانی خۆیان دەشۆرد لە حەیز و جەنابەت و، قژیشیان نەدەکردەوە بەڵکو باش تەڕیان دەکرد.

## بابەت: (حوکمی) چوونە ناو مزگەوت بۆ ئافرەتی حەیزدار

١٢٠٦ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: لاَ بَأْسَ أَنْ تَتَنَاوَلَ الْحَائِضُ مِنَ الْمَسْجِدِ الشَّيْءَ»[3].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هیچی تیا نیە ئافرەتی حەیزدار دەستی درێژ بکات و شتێک ببات بۆ مزگەوت یان لێی دەربهێنێت.

١٢٠٧ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: تَتَنَاوَلُ الْحَائِضُ الشَّيْءَ مِنَ الْمَسْجِدِ وَلاَ تَدْخُلُهُ»[4].

واتە: لە ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئافرەتی حەیزدار دەستی درێژ دەکات و شت دەبات بۆ ناو مزگەوت، بەڵام ناچێتە ناویەوە.

١٢٠٨ - «عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: الْجُنُبُ يَأْخُذُ مِنَ الْمَسْجِدِ وَلاَ يَضَعُ فِيهِ»[5].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده حسن.

(٥) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەسی جەنابەتدار شت هەڵدەگرێت و وەردەگرێت لە ناو مزگەوت، بەڵام نایباتە ناویەوە.

**١٢٠٩ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْحَائِضِ تَنَاوَلُ مِنَ الْمَسْجِدِ الشَّيْءَ قَالَ: نَعم إلاَّ الْمُصْحَفَ»[١].**

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی (حوکمی) ئافرەتی حەیزدار بە درێژ کردنی دەستی شت بهێنێت بۆ مزگەوت؟ وتویەتی: بەڵێ (دروستە) تەنها قورئان نەبێت (چونکە دروست نیە دەستی لێ بدات).

## بابەت: (حوکمی) تێپەڕ بوونی کەسی جەنابەتدار بەناو مزگەوت

**١٢١٠ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، فِي قَوْلِهِ: ﴿وَلَا جُنُبًا ﴿٤٣﴾﴾النساء، إلاَ عَابِرِي سَبِيلٍ قَالَ: هُوَ الْمُسَافِرُ»[٢].**

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) گێڕدراوەتەوە، دەربارەی وتەی: ﴿وَلَا جُنُبًا ﴿٤٣﴾﴾ واتە: [مەچنە مزگەوت و نوێژ مەکەن لە حاڵەتی بێ نوێژی تەنها عابیری سەبیل نەبێ] وتویەتی: (عابیری سەبیل) واتە: موسافیر (واتە: بە بۆچوونی ئیبنو عەبباس تەنها جەنابەتداری موسافیر بۆی هەیە بە مزگەوت ڕێ بکات و تێپەڕ ببێت).

**١٢١١ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ ﴿٤٣﴾﴾النساء، قَالَ: الْجُنُبُ يَجْتَازُ الْمَسْجِدَ وَلاَ يَجْلِسُ فِيهِ»[٣].**

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، (دەربارەی ئەم ڕستە قورئانە:) ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ ﴿٤٣﴾﴾ واتە: [مەچنە مزگەوت و نوێژ مەکەن لە حاڵەتی بێ نوێژی تەنها عابیری سەبیل نەبێت] وتویەتی: کەسی جەنابەتدار بە مزگەوتدا تێپەڕ دەبێت، بەڵام تیایدا دانانیشێت (نامێنێتەوە).

**١٢١٢ - «عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، قَالَ: الْجُنُبُ يَمُرُّ فِي الْمَسْجِدِ، وَلاَ يَقْعُدُ فِيهِ، ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ ﴿٤٣﴾﴾النساء»[٤].**

واتە: لە ئەبو عوبەیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەسی جەنابەتدار بە مزگەوتدا ڕێ دەکات و تێپەڕ دەبێت، بەڵام تیایدا دانانیشێت، دواتر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ ﴿٤٣﴾﴾ واتە: [مەچنە مزگەوت و نوێژ مەکەن لە حاڵەتی بێ نوێژی تەنها بە تێپەڕبوون نەبێت].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

(٤) ـ إسناده حسن.

**١٢١٣ - «عَنْ عكرمة وسَعِيدٍ، قَالاَ: يَمُرُّ وَلاَ يَقْعُدُ فِيهِ»[١].**

**واتە: لە عیکریمەو سەعیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: (کەسی جەنابەتدار بە مزگەوتدا) تێپەڕ دەبێت، بەڵام تیایدا دانانیشێت.**

**١٢١٤ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: كُنَّا نَمْشِي فِي الْمَسْجِدِ وَنَحْنُ جُنُبٌ لاَ نَرَى بِذَلِكَ بَأْسًا»[٢].**

**واتە: لە جابیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە بە مزگەوتدا دەڕۆیشتین لە کاتێکدا جەنابەتدار بووین، پێمان وانەبوو هیچی تیا بێت.**

## بابەت: نوشتەی کەسی حەیزدار

**١٢١٥ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْمَرْأَةِ الْحَائِضِ فِي عُنُقِهَا التَّعْوِيذُ أَوِ الْكِتَابُ؟ قَالَ: إِنْ كَانَ فِي أَدِيمٍ فَلْتَنْزِعْهُ وَإِنْ كَانَ فِي قَصَبَةٍ مُصَاغَةٍ مِنْ فِضَّةٍ، فَلاَ بَأْسَ إِنْ شَاءَتْ وَضَعَتْ، وَإِنْ شَاءَتْ لَمْ تَفْعَلْ. قِيلَ لِعَبْدِ اللَّهِ: تَقُولُ بِهَذَا قَالَ: نَعم»[٣].**

**واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئافرەتی حەیزدار کە نوشتە، یان ئایەتی قورئانی لە مل بێت؟ وتویەتی: ئەگەر لەناو پیستەبێ با لێی بکاتەوە، ئەگەریش لە لولەکێک بوو کە لە زیو دروست کرا بوو ئەوە هیچی تیا نیە، ئەگەر ویستی هەڵی دەگرێت، ئەگەریش حەزی کرد واناکات (هەڵی ناگرێت)، بە عەبدوڵڵا وترا: تۆش ئەو قسەیە دەکەی (بۆچوونت ئاوایە)؟ وتی: بەڵێ.**

## بابەت: (حوکمی) ئافرەتی حەیزدار ئەگەر پاکبوویەوەو ئاوی دەست نەکەوت

**١٢١٦ - «عَنْ مَطَرٍ، قَالَ: سَأَلْتُ الْحَسَنَ، وَعَطَاءً، عَنِ الرَّجُلِ تَكُونُ مَعَهُ امْرَأَتُهُ فِي سَفَرٍ فَتَحِيضُ، ثُمَّ تَطْهُرُ وَلاَ تَجِدُ الْمَاءَ. قَالاَ: تَتَيَمَّمُ وَتُصَلِّي، قَالَ: قُلْتُ لَهُمَا: يَطَؤُهَا زَوْجُهَا؟ قَالاَ: نَعم، الصَّلاَةُ أَعْظَمُ مِنْ ذَلِكَ»[٤].**

**واتە: لە مەطەڕەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە حەسەن و عەطاء کرد دەربارەی ئەو پیاوەی ئافرەتەکەی لەگەڵدایە لە سەفەرێکدا و ئافرەتەکەش تووشی حەیز دەبێت، دواتر پاک دەبێتەوە و ئاوی دەست ناکەوێت (چی دەکات)؟ وتیان: تەیەموم دەکات و نوێژ دەکات، دەڵێ بە هەردووکیانم وت: (ئایا) پیاوەکەی جیماعی لەگەڵ دەکات؟ وتیان: نەخێر، نوێژ لەوە گەورەترە (واتە: لەبەر گەورەیی نوێژ دەبێ تەیموم بکات و نوێژ بکات و نەیفەوتێنێت، بەڵام جیماع حەڵاڵ نابێتەوە تا خۆی دەشۆرێت).**

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ موقوف حسن.

١٢١٧ - «عَنْ عَطَاءٍ، فِي الْمَرْأَةِ تَطْهُرُ وَلاَ تَجِدُ الْمَاءَ. قَالَ: يُصِيبُهَا زَوْجُهَا إِذَا تَيَمَّمَتْ. سُئِلَ عَبْدُ اللَّهِ: تَقُولُ بِهَذَا؟ قَالَ: إِي وَاللَّهِ»[١].

واتە: لە عەطائەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ئەو ئافرەتەی پاک دەبێتەوە و ئاوی دەستناکەوێت (خۆی پێ بشۆرێت)، وتویەتی: پیاوەکەی جیماعی لەگەڵ دەکات ئەگەر تەیمومی کرد، پرسیار لە عەبدوڵلا کرا (وترا): تۆش وا دەڵێی؟ وتی: ئەرێ والله.

## بابەت: دەربارەی ڕوون بوونەوە و دڵنیابوونەوە لە ڕەحمی ئافرەتی کۆیلە

١٢١٨ - «عَنْ طَاوُسٍ، فِي اسْتِبْرَاءِ الْأَمَةِ إِنْ لَمْ تَكُنْ تَحِيضُ، قَالَ: خَمْسَةٌ وَأَرْبَعِينَ»[٢].

واتە: لە طاووسەوە گێڕدراوەتەوە، دەربارەی ڕوون بوونەوە و دڵنیابوونەوە لە ڕەحمی ئافرەتی کۆیلە ئەگەر حەیز نەبینێت، وتویەتی: چل و پێنج (٤٥) ڕۆژ.

١٢١٩ - «عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ، قَالَ: ثَلاَثَةُ أَشْهُرٍ»[٣].

واتە: لە ئەبو قیلابەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سێ مانگ.

١٢٢٠ - «عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ، قَالَ: سَأَلْتُ الزُّهْرِيَّ، عَنِ الرَّجُلِ يَبْتَاعُ الْجَارِيَةَ لَمْ تَبْلُغِ الْمَحِيضَ وَلاَ تَحْمِلُ مِثْلُهَا، كَمْ يَسْتَبْرِئُهَا؟ قَالَ: ثَلاَثَةَ أَشْهُرٍ»[٤].

واتە: لە ئەوزاعیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە زوهری کرد دەربارەی ئەو پیاوەی کەنیزەکێک دەکڕێت کە تەمەنی نەگەیشتۆتە حەیز بینین و هاوتەمەنی ئەویش حەملی پەیا نابێت، چەند چاوەڕێی دەکات وەک عیددەی ئافرەتان؟ وتی: سێ مانگ.

١٢٢١ - «وَقَالَ يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ، بِخمْسةٍ وَأَرْبَعِينَ يَوْمًا»[٥].

واتە: یەحیای کوڕی ئەبو کەثیریش وتویەتی: چل و پێنج ڕۆژ.

١٢٢٢ - «عَنْ عِكْرِمَةَ، قَالَ: بِشَهْرٍ، سُئِلَ عَبْدُ اللَّهِ: بِأَيِّهِمَا تَقُولُ؟ قَالَ: ثَلاَثَةُ أَشْهُرٍ أَوْثَقُ، وَشَهْرٌ يَكْفِي»[٦].

واتە: لە عیکریمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: مانگێک، وە پرسیار لە عەبدوڵلا کراوە بە فەتوای کامیان قسە دەکەی؟ گوتی: سێ مانگەکە باشترەو، مانگێکیش کافیەو بەسە.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢)ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ إسناده صحيح.

(٦) ـ رجاله ثقات.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی (پێنج) نوێژەکان

١٢٢٣ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَثَلُ الصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَاتِ، كَمَثَلِ نَهَرٍ جَارٍ عَذْبٍ عَلَى بَابِ أَحَدِكُمْ، يَغْتَسِلُ مِنْهُ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ»(١).

واتە: لە جابیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نمونەو وێنەی نوێژە واجبەکان وەک نمونەی ڕوبارێکی ڕۆیشتووی شیرینی بەچێژی ساف وایە لەبەر دەرگای هەر یەکێک لە ئێوە، کە خۆی تیادا بشۆرێت و پاک بکاتەوە هەموو ڕۆژێک پێنج جار.

١٢٢٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ، مَاذَا تَقُولُونَ ذَلِكَ مُبْقِيًا مِنْ دَرَنِهِ؟ قَالُوا: لاَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ. قَالَ: كَذَلِكَ مَثَلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ يَمْحُو اللهُ بِهِنَّ الْخَطَايَا»(٢).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیوت: پێتان چۆنە ئەگەر ڕووبارێک لەبەر دەرگای هەر یەکێکتان بێت، خۆی (تیادا) بشۆرێت هەموو ڕۆژێک پێنج جار، چی دەڵێن (ئایا) ئەوە هیچ پیسی و چڵک و چەورییەکی پێوە دەهێڵێت؟ وتیان: هیچ پیسی و چڵک و چەورییەکی پێوە ناهێڵێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەروەها نمونەی پێنج نوێژەکانیش ئاوایە، خوا بەهۆیانەوە تاوانە (بچوکەکان) دەسڕێتەوە و (مرۆڤەکە لەو تاوانانە پاک دەکاتەوە).

## بابەت: دەربارەی کاتەکانی نوێژ

١٢٢٥ - «عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ رِضْوَانُ اللَّهِ عَلَيْهِمَا، قَالَ: سَأَلْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، فِي زَمَنِ الْحَجَّاجِ وَكَانَ يُؤَخِّرُ الصَّلاَةَ عَنْ وَقْتِ الصَّلاَةِ، فَقَالَ جَابِرٌ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الظُّهْرَ حِينَ تَزُولُ الشَّمْسُ، وَالْعَصْرَ وَهِيَ حَيَّةٌ -أَوْ نَقِيَّةٌ- وَالْمَغْرِبَ حِينَ تَجِبُ الشَّمْسُ، وَالْعِشَاءَ رُبَّمَا عَجَّلَ وَرُبَّمَا أَخَّرَ: إِذَا اجْتَمَعَ النَّاسُ عَجَّلَ، وَإِذَا تَأَخَّرُوا، أَخَّرَ: وَالصُّبْحَ رُبَّمَا كَانُوا - أَوْ كَانَ - يُصَلِّيهَا بِغَلَسٍ»(٣).

واتە: لە سەعدی کوڕی ئیبراهیم گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە موحەممەدی کوڕی عەمڕی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی (رِضْوَانُ اللَّهِ عَلَيْهِمَا) بوو وتی: پرسیارمان لە جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ کرد لە سەردەمی حەجاجدا، عادەتی وا بوو نوێژی تاخیر دەکرد لە کاتی خۆیدا (جا پرسیارمان دەربارەی ئەوە لێ کرد، کە ئایا بۆ وا دەکات و شتی وا دروستە؟)، جابریش وتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

ئەنجام دەدا کاتێک ڕۆژ لای دەدا (بەلای ڕۆژئاواوە لە کاتی نیوەڕۆ)، وە نوێژی عەسریشی ئەنجام دەدا لە کاتێکدا ڕۆژ هێشتا ساف و بە تین بوو، وە نوێژی مەغریبیشی ئەنجام دەدا کاتێک کە ڕۆژ ئاوا دەبوو، وە بۆ ئەنجام دانی نوێژی عیشاش جاری وا هەبوو زوو ئەنجامی دەدا، وە جاری واش هەبوو تاخیری دەکرد: ئەگەر خەڵک (زوو) کۆببانەوە ئەوە زوو ئەنجامی دەدا، ئەگەریش تاخیربووانە ئەوە دوای دەخست، وە نوێژی بەیانیشی (لەگەڵ هاوەڵان) بە تاریکی ئەنجام دەدا (واتە: نوێژی بەیانی تەنها لە یەک کات ئەنجام دەدا، وەک عیشا پێش و پاشی پێ نەدەکرد).

١٢٣٦ - «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ، أَخَّرَ الصَّلاَةَ يَوْمًا فَدَخَلَ عَلَيْهِ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ، فَأَخْبَرَهُ: أَنَّ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ، أَخَّرَ الصَّلاَةَ يَوْمًا فَدَخَلَ عَلَيْهِ أَبُو مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيُّ، فَقَالَ: مَا هَذَا يَا مُغِيرَةُ؟ أَلَيْسَ قَدْ عَلِمْتَ أَنَّ جِبْرِيلَ نَزَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ صَلَّى فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ» ثُمَّ قَالَ: بِهَذَا أُمِرْتَ قَالَ: أَعْلَمْ مَا تُحَدِّثُ يَا عُرْوَةُ، أَوَ أَنَّ جِبْرِيلَ أَقَامَ وَقْتَ الصَّلاَةِ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: كَذَلِكَ كَانَ بَشِيرُ بْنُ أَبِي مَسْعُودٍ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ. قَالَ عُرْوَةُ، وَلَقَدْ حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ وَالشَّمْسُ فِي حُجْرَتِهَا قَبْلَ أَنْ تَظْهَرَ»[1].

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە گێڕدراوەتەوە، کە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ڕۆژێک نوێژی تاخیر کرد، عوڕوەی کوڕی زوبەیریش چوو بۆ لای و پێی ڕاگەیاند کە موغیرەی کوڕی شوعبە ڕۆژێک نوێژی دواخست و ئەبو مەسعودی ئەنصاریش چوو بۆ لای و وتی: ئەوە چیە ئەی موغیرە؟ ئایا نەتزانیوە کە جبریل ﷺ دابەزیوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و نوێژی کردوە پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کردوە، دواتر نوێژی کردوە پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کردوە، دواتر نوێژی کردوە پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کردوە، دواتر نوێژی کردوە پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کردوە، دواتر نوێژی کردوە پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی کردوە، دواتر (جبریل ﷺ) فەرمووی: بەوە فەرمانت پێ کراوە، (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) وتی: ئەوەی تۆ دەیگێڕیەوە دەیزانم ئەی عوڕوە، (بەڵام) ئایا جبریل ﷺ قامەتی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لە کاتی نوێژدا؟ (عوڕوە) وتی: (بەڵێ) بەشیری کوڕی ئەبو مەسعود لە باوکیەوە ئاوا دەگێڕێتەوە.

عوڕوە وتی: بە دڵنیایی عائیشەش (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عەسری دەکرد ڕووناکی خۆریش لە ژوورەکەی بوو (لە ژووری عائیشە بوو) پێش ئەوەی بەرزبێتەوە و لابچێت.

## بابەت: دەربارەی سەرەتای بانگدان

١٢٣٧ - «حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، قَالَ: وَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ قَدِمَهَا قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: يَعْنِي الْمَدِينَةَ إِنَّمَا يُجْتَمَعُ إِلَيْهِ بِالصَّلاَةِ لِحِينِ مَوَاقِيتِهَا بِغَيْرِ دَعْوَةٍ. فَهَمَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَجْعَلَ بُوقًا كَبُوقِ الْيَهُودِ الَّذِينَ يَدْعُونَ بِهِ لِصَلاَتِهِمْ، ثُمَّ كَرِهَهُ. ثُمَّ أَمَرَ بِالنَّاقُوسِ فَنُحِتَ لِيُضْرَبَ بِهِ لِلْمُسْلِمِينَ إِلَى الصَّلاَةِ،

---

(١) ـ صحيح.

فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ إِذْ رَأَى عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ رَبِّهِ أَخُو الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺفَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ طَافَ بِيَ اللَّيْلَةَ طَائِفٌ: مَرَّ بِي رَجُلٌ عَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَخْضَرَانِ يَحْمِلُ نَاقُوسًا فِي يَدِهِ، فَقُلْتُ: يَا عَبْدَ اللَّهِ، أَتَبِيعُ هَذَا النَّاقُوسَ؟ فَقَالَ: وَمَا تَصْنَعُ بِهِ؟ قُلْتُ: نَدْعُو بِهِ إِلَى الصَّلاَةِ. قَالَ: أَفَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى خَيْرٍ مِنْ ذَلِكَ؟ قُلْتُ: وَمَا هُوَ؟ قَالَ: تَقُولُ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. ثُمَّ اسْتَأْخَرَ غَيْرَ كَثِيرٍ، ثُمَّ قَالَ: مِثْلَ مَا قَالَ، وَجَعَلَهَا وِتْرًا، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. فَلَمَّا أَخْبَرَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّهَا لَرُؤْيَا حَقٌّ إِنْ شَاءَ اللهُ، فَقُمْ مَعَ بِلاَلٍ فَأَلْقِهَا عَلَيْهِ، فَإِنَّهُ أَنْدَى صَوْتًا مِنْكَ. فَلَمَّا أَذَّنَ بِلاَلٌ، سَمِعَهَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺوَهُوَ يَجُرُّ إِزَارَهُ وَهُوَ يَقُولُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَقَدْ رَأَيْتُ مِثْلَ مَا رَأَى. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَلِلَّهِ الْحَمْدُ، فَذَاكَ أَثْبَتُ»[1].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک چوو ـ بۆ مەدینە مسوڵمانان لەلای کۆ دەبوونەوە بۆ نوێژ کردن لەکاتەکانی نوێژدا بەبێ بانگ کردن و (هیچ دروشمێک)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی بوقێک بکات بە دروشم بۆ کاتی نوێژ (کە لە قۆچی حەیوان دروست دەکرێت) وەک ئەو بوقەی جوولەکەکان بانگیان پێ دەکرد بۆ نوێژەکەیان، دواتر پێی باش نەبوو، دواتر فەرمانی کرد بە دروست کردن و داتاشینی زەنگ و، داتاشرا و دروست کرا، تاوەکو لێ بدرێت بۆ مسوڵمانان بۆ نوێژ، جا لە کاتێکدا مسوڵمانان لەسەر ئەو شێوازە بوون لە ناکاو عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عەبدی ڕەببیهی برای حاریثی خەزرەج خەونی بینی و هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم شەو ونەوزێکم هاتێ (خەواڵو بووم و بینیم) پیاوێک بە لامدا تێپەڕی کە دوو جلی سەوزی لەبەردا بوو زەنگێکی بە دەستی هەڵگرتبوو، (دەڵێ) منیش وتم: ئەی بەندەی خوا ئایا ئەو زەنگە دەفرۆشی؟ ئەویش وتی: چی پێ دەکەیت؟ وتم: بانگی پێ ڕادێرین بۆ نوێژ، پیاوەکە وتی: ئایا شتێکی لەوە باشترت پێ نەڵێم؟ (دەڵێ) منیش وتم: ئەو شتە چیە؟ وتی: دەڵێی: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)، دواتر پیاوەکە هەندێک وەستا و خۆی تاخیر کرد کە ماوەکەی زۆر نەبوو (تاوەکو قامەتەکەش بڵێت)، دواتر وەک ئەوەی پێشەوەی وت و کردیە تاک تاک بەڵام ئەوەشی وت: (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)، جا کاتێک هەواڵی بەوە دایە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە خەونێکی هەق و ڕاستە إن شاء الله، دە هەڵسە لەگەڵ بیلال و بەسەریدا بخوێنەوە (با فێر بێت)، ئەو دەنگی لە تۆ زیاتر دەڕوات (دەنگی بەهێزترە) جا کاتێک بیلال (خۆی فێر کردو) بانگیدا، عومەری کوڕی خەتتابیش گوێی لێ بوو، دەڵێ:

---

(١) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

لەماڵەوە بوو، ڕاستەوخۆ دەرچوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و جلەکەی لە دوای خۆی ڕادەکێشا (ئەوەندە بە پەلە لەماڵ دەرچوو) و دەیووت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەوەی تۆی بە هەق ڕەوانە کردوە بە دڵنیایی منیش ئەوەم (لە خەودا) بینی وەک ئەو بینیویەتی، جا پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: گشت سوپاسێک بۆ خوا، ئەوە دڵنیایی زیاترە.

١٢٢٨ - «قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ حُمَيْدٍ، حَدَّثَنِيهِ سَلَمَةُ، قَالَ: حَدَّثَنِيهِ مُحَمَّدِ بْنُ إِسْحَاقَ، قَالَ: حَدَّثَنِي هَذَا الْحَدِيثَ مُحَمَّدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ الْحَارِثِ التَّيْمِيُّ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَبْدِ رَبِّهِ، عَنْ أَبِيهِ بِهَذَا الحديثِ.»[1].

واتە: لە ڕێگایێکی تریشەوە ئەم فەرموودەیە گێڕدراوەتەوە لە عەبدوڵلای کوڕی زەیدەوە.

١٢٢٩ - «حَدَّثَنِي أَبِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زَيْدٍ، قَالَ لَمَّا أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالنَّاقُوسِ فَذَكَرَ نَحْوَهُ»[2].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی زەیدەوە گێڕدراوەتەوە: وتویەتی کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە زەنگ کرد (بۆ کاتی نوێژ) هەمان شتی گێڕایەوە (کە بینی بووی).

## بابەت: دەربارەی کاتی بانگی بەیانی

١٢٣٠ - «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، - يَرْفَعُهُ - قَالَ: إِنَّ بِلاَلاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ»[3].

واتە: سالم لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە وتویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بیلال بە شەو بانگ دەدات (ماوەیەک پێش کاتی نوێژی بەیانی) کەواتە: بخۆن و بخۆنەوە (لە ڕەمەزان و ئەو کاتانەی دەتانەوێ ڕۆژوو بگرن و پارشێو بخۆن) تاوەکو ئیبنو ئوممی مەکتوم بانگ دەدات (بۆ نوێژی بەیانی).

١٢٣١ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ مُؤَذِّنَانِ: بِلاَلٌ، وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ بِلاَلاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى تَسْمَعُوا أَذَانَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ» فَقَالَ الْقَاسِمُ: وَمَا كَانَ بَيْنَهُمَا إِلاَّ أَنْ يَنْزِلَ هَذَا، وَيَرْقَى هَذَا»[4].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ دوو بانگبێژی هەبوون: بیلال و ئیبنو ئوممی مەکتوم، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بیلال بە شەو بانگ دەدات (ماوەیەک پێش کاتی نوێژی بەیانی) کەواتە: بخۆن و بخۆنەوە (لە ڕەمەزان و ئەو کاتانەی دەتانەوێت ڕۆژوو بگرن و پارشێو بخۆن) تاوەکو گوێبیستی بانگی ئیبنو ئوممی مەکتوم دەبن (بۆ نوێژی بەیانی).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

قاسم وتویەتی: کاتێکی زۆر لە نێوانیان نەبوو، تەنها ئەوە نەبێ ئەوە دەهاتە خوارەوە و ئەوەش سەردەکەوت.

## بابەت: ئاگادار کردنەوە لە بانگی بەیانیدا

١٢٣٢ - «عَنْ حَفْصِ بْنِ عُمَرَ بْنِ سَعْدٍ الْمُؤَذِّنِ، أَنَّ سَعْدًا كَانَ يُؤَذِّنُ فِي مَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ حَفْصٌ، حَدَّثَنِي أَهْلِي، أَنَّ بِلاَلاً أَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺيُؤْذِنُهُ لِصَلاَةِ الْفَجْرِ، فَقَالُوا: إِنَّهُ نَائِمٌ، فَنَادَى بِلاَلٌ بِأَعْلَى صَوْتِهِ: الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ فَأُقِرَّتْ فِي أَذَانِ الْفَجْرِ. قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: يُقَالُ: سَعْدٌ الْقَرَظُ»[١].

واتە: لە حەفصی کوڕی عومەری کوڕی سەعدی بانگبێژەوە گێڕدراوەتەوە کە سەعد لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی داوە، حەفص وتویەتی: ماڵەوە بۆیان گێڕامەوە کە بیلال چۆتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ تاوەکو پێی ڕابگەیەنێت کاتی نوێژی بەیانیە، ئەوانیش وتویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ خەوتووە، بیلالیش بەوپەڕی دەنگی هاواری کرد: (الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ) نوێژ لە خەو چاکترە، جا (ئەو ڕستە) جێگیر کرا لە نوێژی بەیانیدا (بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ).

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (بە سەعد) دەوترا: سەعدی قەرەظ.

## بابەت: بانگ (بێژەکانی) دوو دووە، قامەتیش جارێکە[٢]

١٢٣٣ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهُ قَالَ: كَانَ الأَذَانُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺمَثْنَى مَثْنَى، وَالإِقَامَةُ مَرَّةً غَيْرَ أَنَّهُ كَانَ إِذَا قَالَ: قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَالَهَا مَرَّتَيْنِ، فَإِذَا سَمِعْنَا الإِقَامَةَ، تَوَضَّأَ أَحَدُنَا وَخَرَجَ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَما)، گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی: بانگ لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ (بێژەکانی) دوو دوو بوو، قامەتیش جارێک بوو، تەنها ئەوەندە نەبێت کە بانگبێژ دەیوت: (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ) دوو جار دەیوت، جا کە گوێمان لە قامەت دەبوو هەر یەک لە ئێمە دەستنوێژی دەشۆرد و دەردەچوو (لە ماڵەوە بۆ نوێژ).

١٢٣٤ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ، وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ»[٤].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فەرمان بە بیلال کرا کە (بێژەکانی) بانگ بە دوو جار دوو جار بڵێت، قامەتیش جارێک بڵێت.

---

(١) ـ إسناده ضعيف فيه جهالة.

(٢) ـ بانگ جووتە، قامەت تاکە.

(٣) ـ حسن.

(٤) ـ صحيح.

١٢٣٥ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: أُمِرَ بِلاَلٌ أَنْ يَشْفَعَ الْأَذَانَ، وَيُوتِرَ الْإِقَامَةَ إِلاَّ الْإِقَامَةَ»[١].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فەرمان بە بیلال کرا کە (بڕگەکانی) بانگ دوو جار دوو جار بڵێت، (بڕگەکانی) قامەتیش جارێک بڵێت: تەنها (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ) نەبێت (دوو جار دەیڵێت).

## بابەت: دووبارە کردنەوەی شایەتومان لە بانگدا

١٢٣٦ - «عَنْ أَبِي مَحْذورةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ نَحْوًا مِنْ عِشْرِينَ رَجُلاً، فَأَذَّنُوا، فَأَعْجَبَهُ صَوْتُ أَبِي مَحْذورةَ، فَعَلَّمَهُ الْأَذَانَ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَالْإِقَامَةَ مَثْنَى مَثْنَى»[٢].

واتە: لە ئەبو مەحذوورەوە گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە نزیکەی بیست کەس کرد (کە بانگ بدەن) و بانگیاندا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگی ئەبو مەحذوورەی بە دڵ بوو (چونکە دەنگی زۆر خۆش بوو)، بۆیە فێری بانگی کرد (بەو شێوەیە): (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)، قامەتیش دوو جار دوو جار.

١٢٣٧ - «حَدَّثَنِي مَكْحُولٌ، أَنَّ ابْنَ مُحَيْرِيزٍ، حَدَّثَهُ: أَنَّ أَبا مَحْذورةَ، حَدَّثَهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَّمَهُ الْأَذَانَ تِسْعَ عَشْرَةَ كَلِمَةً، وَالْإِقَامَةَ سَبْعَ عَشْرَةَ كَلِمَةً»[٣].

واتە: لە مەکحولەوە گێڕدراوەتەوە، کە ئیبنو موحەیریز بۆی گێڕاوەتەوە، کە ئەبو مەحذوورە بۆی گێڕاوەتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فێری بانگی کردوە کە نۆزدە وشەیە، (وە فێری قامەتیشی کردووە) کە ئەویشیان نۆزدە وشەیە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: ڕوو وەرچەرخاندن[1] لە بانگداندا (لە كاتی وتنی: حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ)

١٢٣٨ - «عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ رَأَى بِلاَلاً أَذَّنَ، قَالَ: فَجَعَلْتُ أَتْبَعُ فَاهُ هَاهُنَا، وَهَاهُنَا بِالأَذَانِ»[2].

واتە: لە عەونی كوڕی ئەبو جوحەیفەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) كە بیلالی بینیوە بانگی داوە، وتویەتی: سەیری دەمیم دەكرد لێرە و لێرە لە بانگداندا (واتە: سەیری دەمیم دەكرد لەو كاتەی ڕووی دەسوڕاند بۆلای ڕاست و بۆ لای چەپ بۆ وتنی: حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ).

١٢٣٩ - «عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ بِلاَلاً رَكَزَ الْعَنَزَةَ، ثُمَّ أَذَّنَ، وَوَضَعَ أُصْبُعَيْهِ فِي أُذُنَيْهِ فَرَأَيْتُهُ يَدور فِي أَذَانِهِ»[3].

واتە: لە عەونی كوڕی ئەبو جوحەیفەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە كە (وتویەتی): بیلال قیسپەكەی خۆی چەقاند، دواتر بانگیدا و دوو پەنجەكانی (شەهادەی) خستە ناو گوێیەكانی و بینیم خۆی دەسوڕاند لە بانگدانەكەیدا.

## بابەت: دووعا و نزا كردن دوای بانگدان

١٢٤٠ - «أَخْبَرَنِي سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: ثِنْتَانِ لاَ تُرَدَّانِ - أَوْ قَلَّ: مَا تُرَدَّانِ - الدُّعَاءُ عِنْدَ النِّدَاءِ، وَعِنْدَ الْبَأْسِ حِينَ يُلْحِمُ بَعْضُهُ بَعْضًا»[4].

واتە: لە سەهلی كوڕی سەعدەوە گێڕدراوەتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو (نزا هەن) ڕەت ناكرێنەوە، یان دەگمەن وایە ڕەت بكرێنەوە (ئەوانیش): دووعاو نزایە لە دوای بانگ و، لە كاتی سەختی و جیهاددا لەو كاتەی (مسوڵمان و كافر) پرژاونەتە گیانی یەكتری.

## بابەت: ئەوەی دەوترێت لەكاتی بانگداندا

١٢٤١ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ»[5].

---

(١) ـ وەرگێڕانی ڕوو بە لای ڕاست و چەپدا.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

(٥) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ گوێبیستی بانگبێژ بوون ئەو چی دەڵێت وەک ئەو بڵێن.

١٢٤٢ - «عَنْ عِيسَى بْنِ طَلْحَةَ، قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى مُعَاوِيَةَ ﷺ فَنَادَى الْمُنَادِي، فَقَالَ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ. فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ. قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. قَالَ: وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. قَالَ: وَأَنَا أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، قَالَ يَحْيَى: وَأَخْبَرَنِي بَعْضُ أَصْحَابِنَا أَنَّهُ لَمَّا قَالَ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، ثُمَّ قَالَ مُعَاوِيَةُ: هكذا سَمِعْتُ نَبِيَّكُمْ يَقُولُ»[1].

واتە: لە عیسای کوڕی طەڵحەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چوینە لای موعاویە ﷺ، بانگبێژێک بانگیداو وتی: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ)، موعاویەش وتی: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ) (بانگ بێژەکە) وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)، موعاویە وتی: (وأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)، (بانگ بێژەکە) وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، موعاویە وتی: (وَأَنَا أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، یەحیی دەڵێ: هەندێک لە هاوەڵانمان بۆیان گێڕاومەتەوە کە کاتێک (بانگ بێژەکە) وتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ)، موعاویە وتی: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ)، دواتر موعاویە وتی: ئا بەو شێوەیە گوێم لە پێغەمبەرەکەتان ﷺ بووە فەرموویەتی.

١٢٤٣ - «حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ مُعَاوِيَةَ ﷺ، سَمِعَ الْمُؤَذِّنَ قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ: مُعَاوِيَةُ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، فَقَالَ الْمُؤَذِّنُ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، ثُمَّ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، فَقَالَ الْمُؤَذِّنُ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. فَقَالَ الْمُؤَذِّنُ: حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ. فَقَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. فَقَالَ الْمُؤَذِّنُ: حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ. فَقَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. فَقَالَ الْمُؤَذِّنُ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. فَقَالَ: اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[2].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی عەمرِ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە گێڕاویەتیەوە، کە موعاویە ﷺ گوێی لە بانگبێژ بووە وتی: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ)، موعاویەش وتی: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ)، بانگبێژەکە وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)، موعاویە وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)، بانگبێژەکە وتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، موعاویە وتی: (أَنَا أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ،أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ)، بانگبێژەکە وتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ)، موعاویە وتی: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ)، بانگبێژەکە وتی: (حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ)، موعاویە وتی: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ)، بانگبێژەکە وتی: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)، موعاویە وتی: (اللهُ أَكْبَرُ، اللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)، دواتر وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیەی کردووە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

## بابەت: شەیتان ڕادەکات کاتێ بانگ دەدرێت

١٢٤٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: إِذَا نُودِيَ بِالصَّلاَةِ، أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ لَهُ ضُرَاطٌ حَتَّى لاَ يَسْمَعَ الأَذَانَ، فَإِذَا قُضِيَ الأَذَانُ، أَقْبَلَ، وَإِذَا ثُوِّبَ، أَدْبَرَ، فَإِذَا قُضِيَ التَّثْوِيبُ، أَقْبَلَ حَتَّى يَخْطِرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ، فَيَقُولُ: اذْكُرْ كَذَا وَكَذَا، لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ قَبْلَ ذَلِكَ « قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: ثُوِّبَ: يَعْنِي: أُقِيمَ»[١].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، کە فەرموویەتی: کاتێ بانگ دەدرێت بۆ نوێژ شەیتان پشت هەڵدەکات و (ڕادەکات) و لە دواوەی (لە کۆمی) دەنگ دەردەکات تا گوێی لە بانگ نەبێت، جا کاتێ بانگ تەواو دەبێت دەگەڕێتەوە، کاتێکیش قامەت دەکرێت پشت هەڵدەکات و (هەڵدێت)، جا کاتێ قامەت تەواو دەبێت دەگەڕێتەوە تا وەسوەسە بخاتە نەفسی مرۆڤ و دەڵێت: ئەوە و ئەوە بیر خۆت بخەرەوە، کە پێشتر لە یادی نەبووە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (ثُوِّبَ) واتە: قامەت بکرێت.

## بابەت: خراپی چوونە دەرەوە لە مزگەوت دوای بانگ

١٢٤٥ - «عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ الْمُحَارِبِيِّ، أَنَّ أبا هُرَيْرَةَ ﷺ، رَأَى رَجُلاً خَرَجَ مِنَ الْمَسْجِدِ بَعْدَ مَا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ، فَقَالَ: أَمَّا هَذَا، فَقَدْ عَصَى أبا الْقَاسِمِ ﷺ »[٢].

واتە: لە ئەبو شەعسائی موحاریبی گێردراوەتەوە، کە ئەبو هوڕەیرە ﷺ پیاوێکی بینیوە لە مزگەوت دەرچووە دوای ئەوەی بانگبێژ بانگیدا، (ئەبو هوڕەیرە) وتی: ئاگاداربن ئەوە سەرپێچی ئەبو قاسمی کردوە (واتە: سەرپێچی پێغەمبەری خوای ﷺ کردووە).

## بابەت: دەربارەی کاتی (نوێژی) نیوەڕۆ

١٢٤٦ - «عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مالَكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ حِينَ زَاغَتِ الشَّمْسُ فَصَلَّى بِهِمْ صَلاَةَ الظُّهْرِ»[٣].

واتە: لە زوهریەوە گێردراوەتەوە (وتویەتی): ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەرچوو لەو کاتەی ڕۆژ لایداو نوێژی بۆ کردن نوێژی نیوەڕۆ.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: فێنک کردنەوەی نیوەڕۆ (واتە: تاخیر کردنی نوێژی نیوەڕۆ تا تۆزێک فێنک دادێت لەو کاتانەی زۆر گەرمایە، تا نوێژخوێنان ئەزیەت نەچێژن)

١٢٤٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلاَةِ، فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ قَالَ: أَبُو مُحَمَّدٍ: هَذَا عِنْدِي مِن التَّأْخِيرِ إِذَا تَأَذَّوْا بِالْحَرِّ»[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێ زۆر گەرما بوو، ئەوە ساردی بکەنەوە بە نوێژ، چونکە گەرمای زۆر بەشێکە لە بڕک و نەفەسی دۆزەخ.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەو فەرموودەیە لەلای من دەربارەی تاخیر کردنە ئەگەر ئەزیەتیان دەچێشت بە گەرماکە.

## بابەت: کاتی نوێژی عەسر

١٢٤٨ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ، ثُمَّ يَذْهَبُ الذَّاهِبُ إِلَى الْعَوَالِي فَيَأْتِيهَا وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ»[2].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار نوێژی عەسری دەکرد، دواتر کەسێک دەڕۆیشت بۆ گوند (گوندەکانی دەوروبەری مەدینە)، دەچوو بۆ ئەوێ لە کاتێکدا هێشتا خۆر بەرز بوو.

## بابەت: کاتی نوێژی مەغریب

١٢٤٩ - «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الْمَغْرِبَ سَاعَةَ تَغْرُبُ الشَّمْسُ إِذَا غَابَ حَاجِبُهَا»[3].

واتە: لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەر ﷺ نوێژی مەغریبی دەکرد ئەو کاتەی خۆر ئاوا دەبوو، ئەو کاتەی کەوانەکەی ئاوا دەبوو (ڕاستەوخۆ لەو کاتە نوێژی دەکرد).

## بابەت: کەڕاهەتی تاخیر کردنی نوێژی مەغریب

١٢٥٠ - «عَنِ الْعَبَّاسِ رَضِيَ اللهُ عَنْهما، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ تَزَالُ أُمَّتِي بِخَيْرٍ مَا لَمْ يَنْتَظِرُوا بِالْمَغْرِبِ اشْتِبَاكَ النُّجُومِ»[4].

---

(١) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث حسن.

واتە: لە عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهما)، گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: بە بەردەوامی گەل و ئوممەتەکەم لە چاکە و خێر دان مادەم نوێژی مەغریب تاخیر نەکەن تاوەکو ئەستێرە تێکەڵ دەبن (واتە: مادەم زوو نوێژەکە ئەنجام بدەن و تاخیری نەکەن).

## بابەت: کاتی نوێژی عیشا

١٢٥١ - «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ، قَالَ: وَاللَّهِ إِنِّي لأَعْلَمُ النَّاسِ بِوَقْتِ هَذِهِ الصَّلاَةِ - يَعْنِي: صَلاَةَ الْعِشَاءِ - كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّيهَا لِسُقُوطِ الْقَمَرِ لِثَالِثَةٍ قَالَ يَحْيَى: أَمَلاَهُ عَلَيْنَا مِنْ كِتَابِهِ عَنْ بَشِيرِ بْنِ ثَابِتٍ»[1].

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سوێند بە خوا من لە هەموو خەڵکی شارەزاترم بە کاتی ئەو نوێژە، واتە: نوێژی عیشا، هەموو جار (یان زۆربەی جار) پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای دەکرد لە کاتی ئاوابوونی مانگ لە شەوی سێیەمی مانگدا.

یەحیا وتویەتی: (ئەبو عەوانە) بەسەریدا خوێندینەوە لە پەرتوکەکەیدا لە بەشیری کوڕی سابیتەوە.

## بابەت: ئەوەی سوننەتە لە تاخیر کردنی نوێژی عیشا

١٢٥٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: أَخَّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺصَلاَةَ الْعِشَاءِ ذَاتَ لَيْلَةٍ حَتَّى كَادَ أَنْ يَذْهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ أَوْ قَرِيبُهُ، فَجَاءَ وَفِي النَّاسُ رُقودٌ، وَهُمْ عِزُونَ، وَهُمْ حِلَقٌ، فَغَضِبَ فَقَالَ: لَوْ أَنَّ رَجُلاً نَادَى النَّاسَ - وَقَالَ عَمْرٌو: نَدَبَ النَّاسَ - إِلَى عَرْقٍ أَوْ مِرْمَاتَيْنِ، لأَجَابُوا إِلَيْهِ، وَهُمْ يَتَخَلَّفُونَ عَنْ هَذِهِ الصَّلاَةِ لَهَمَمْتُ أَنْ آمُرَ رَجُلاً يُصَلِّي بِالنَّاسِ ثُمَّ أَتَخَلَّفَ عَلَى أَهْلِ هَذِهِ الدور الَّذِينَ يَتَخَلَّفُونَ عَنْ هَذِهِ الصَّلاَةِ، فَأُضْرِمَهَا عَلَيْهِمْ بِالنِّيرَانِ»[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێکیان نوێژی عیشای تاخیر کرد، تا نزیک بوو سێیەکی شەو (یەک لەسەر سێی شەو) بڕوا، یان نزیکی ئەو کاتە بوو، جا هات و لەناو خەڵکەکەش خەوتوی تیا بوو و پەرشو بڵاو و حەڵقە حەڵقە بوون، (پێغەمبەری خوا ﷺ) توڕە بوو و وتی: ئەگەر پیاوێک خەڵک بانگ بکات بۆ هێسکە گۆشت و دوو پێچکە حەیوانان (یان بەخشینی دوو تیری کەم بەها) ئەوە وەڵامی داواکەی دەدەنەوە و دەچن بۆ لای، لە کاتێکدا نایێن بۆ ئەو نوێژە، هاتۆتە سەرم و دەڵێم فەرمان بە کەسێک بکەم تا نوێژ بۆ خەڵکی بکات (لە شوێنی من ببێتە ئیمام)، دواتر بچمە پشتی ماڵی ئەو خەڵکانەی نایێن بۆ ئەو نوێژە و خانوەکان گڕ بدەم بە سەریاندا بە ئاگر.

١٢٥٣ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أَعْتَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْعِشَاءِ حَتَّى نَادَاهُ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: قَدْ نَامَ النِّسَاءُ وَالصِّبْيَانُ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ يُصَلِّي هَذِهِ الصَّلاَةَ غَيْرَكُمْ وَلَمْ يَكُنْ أَحَدٌ يُصَلِّي يَوْمَئِذٍ غَيْرَ أَهْلِ الْمَدِينَةِ»[3].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، ولكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (جارێکیان) پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای تاخیر کرد، تا عومەری کوڕی خەتتاب بانگی کرد (وتی): ئافرەت و منداڵەکان خەوتوون، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە و وتی: هیچ کەسێک لە خەڵکی زەوی ئەم نوێژە ناکات جگە لە ئێوە.

وە هیچ کەسێک لەو ڕۆژەدا نوێژی نەدەکرد (لەو کاتەدا) جگە لە خەڵکی مەدینە.

١٢٥٤ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أَعْتَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ حَتَّى ذَهَبَ عَامَّةُ اللَّيْلِ وَرَقَدَ أَهْلُ الْمَسْجِدِ فَخَرَجَ، فَصَلاَّهَا فَقَالَ: إِنَّهُ لَوَقْتُهَا، لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي»[١].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: شەوێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای تاخیر کرد، تا زۆربەی شەو ڕۆیشت، خەڵکی مزگەوتیش پاڵکەوتن و خەوتن، پێغەمبەری خواش ﷺ هاتە دەرەوە و نوێژەکەی کرد و فەرمووی: ئەوە کاتیەتی (کاتە پڕ خێرەکەیە) ئەگەر گران و زەحمەت نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم.

١٢٥٥ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺأَخَّرَ الصَّلاَةَ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ: الصَّلاَةَ نَامَ النِّسَاءُ وَالْوِلْدَانُ، فَخَرَجَ وَهُوَ يَمْسَحُ الْمَاءَ عَنْ شِقِّهِ، وَهُوَ يَقُولُ: هُوَ الْوَقْتُ لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنْهما)، گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێکیان نوێژی عیشای تاخیر کرد، جا وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەت و منداڵەکان خەوتوون، جا هاتە دەرەوە لە کاتێکدا ئاوی لەسەری دەکردەوە (یان لە باسکەکانی دەکردەوە بە دەستەکانی) و دەیفەرموو: ئەوە کاتیەتی (کاتە پڕ خێرەکە) ئەگەر گران و زەحمەت نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم.

## بابەت: ئەنجامدانی نوێژی بەیانی بە تاریکی (کۆتایی شەو)

١٢٥٦ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُنَّ نِسَاءُ النَّبِيِّ ﷺ يُصَلِّينَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْفَجْرَ ثُمَّ يَرْجِعْنَ مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ قَبْلَ أَنْ يُعْرَفْنَ»[٣].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ پێغەمبەری خوا نوێژی بەیانیان دەکرد، دواتر دەگەڕانەوە پێچراو بوون بە چارۆگەکانیان، پێش ئەوەی بناسرێنەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: ئەنجامدانی نوێژی بەیانی بە سەرەتای ڕووناکی

١٢٥٧ - «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أَسْفِرُوا بِصَلَاةِ الصُّبْحِ، فَإِنَّهُ أَعْظَمُ لِلْأَجْرِ»[١].

واتە: لە ڕافیعی كوڕی خەدیج ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: نوێژی بەیانی ڕووناك دابهێنن، (واتە: كە دونیا ڕووناك بوو ئەنجامی بدەن)، چونكە ئەوە پاداشتی گەورەترینە.

١٢٥٨ - «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ : نَوِّرُوا بِصَلَاةِ الْفَجْرِ فَإِنَّهُ أَعْظَمُ لِلْأَجْرِ»[٢].

واتە: لە ڕێگایێكی تریشەوە هاتوە لە ڕافیعی كوڕی خەدیج ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: نوێژی بەیانی ڕووناك دابهێنن، چونكە ئەوە پاداشتی گەورەترینە.

١٢٥٩ - «أَخْبرنا أَبُو نُعَيْمٍ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ ابْنِ عَجْلَانَ، نَحْوَهُ، أَوْأَسْفِرُوا»[٣].

واتە: لە ڕێگایێكی تریشەوە هەمان فەرموودە هاتوە.

## بابەت: هەر كەسێك بە یەك ڕەكعەتی نوێژێك ڕابگات ئەوە بە نوێژەكە ڕاگەیشتووە

١٢٦٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ أَدْرَكَ مِنْ صَلَاةٍ رَكْعَةً فَقَدْ أَدْرَكَهَا»[٤].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە كە فەرموویەتی: هەر كەسێك لە نوێژێكدا بە یەك ڕەكعەت ڕابگات ئەوە بە نوێژەكە ڕاگەیشتووە.

١٢٦١ - «أَخْبرنا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، حَدَّثَنِي الزُّهْرِيُّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ بِمِثْلِهِ»[٥].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە هاتوە.

١٢٦٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ أَدْرَكَ مِنَ الصُّبْحِ رَكْعَةً قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَهَا، وَمَنْ أَدْرَكَ مِنَ الْعَصْرِ رَكْعَةً قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ، فَقَدْ أَدْرَكَهَا»[٦].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف.

(٥) ـ صحيح.

(٦) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە ڕەکعەتێک ڕابگات لە نوێژی بەیانی پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت، ئەوە بە نوێژەکە ڕاگەیشتووە، وە هەر کەسێک بە ڕەکعەتێک ڕابگات لە نوێژی عەسر پێش ئەوەی خۆر ئاوابێت، ئەوە بە نوێژەکە ڕاگەیشتووە.

## بابەت: پارێزگاری کردن و بەردەوام بوون لەسەر نوێژەکان

١٢٦٣ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ يَعْتَادُ الْمَسْجِدَ، فَاشْهَدُوا لَهُ بالإِيمَانِ، فَإِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: ﴿إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ ﴿١٨﴾ ﴾التوبة»[1].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوا ﷺی گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئەگەر بینیتان پیاوێک خووی بە مزگەوتەوە گرتووە (دڵی بە ماڵی خواوە وابەستەیە)، ئەوە شاهێدی ئیمانی بۆ بدەن، چونکە خوا دەفەرموێ: [بەڕاستی تەنها ئەو کەسە (بە دڵ و بە گیان) مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان دەکاتەوە (بە خوا پەرستی و نۆژەن کردنەوە) کە باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هێناوە].

١٢٦٤ - «عَنْ عُثْمَانَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ، كَانَ كَقِيَامِ نِصْفِ لَيْلَةٍ، وَمَنْ صَلَّى الْفَجْرَ فِي جَمَاعَةٍ، كَانَ كَقِيَامِ لَيْلَةٍ»[2].

واتە: لە عوسمانەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نوێژی عیشا بە جەماعەت بکات، ئەوە وەک شەونوێژ کردنی نیو شەو وایە، وە هەرکەسێکیش نوێژی بەیانی بە جەماعەت بکات، ئەوە وەک شەونوێژ کردنی شەوێک وایە.

## بابەت: سوننەتیەتی نوێژ کردن لە سەرەتای کاتدا

١٢٦٥ - «أبو عَمْرٍو الشَّيْبَانِيِّ، يَقُولُ: حَدَّثَنِي صَاحِبُ هَذِهِ الدَّارِ وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى دَارِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ: أَيُّ الأَعْمَالَ أَفْضَلُ أَوْ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ قَالَ: الصَّلاَةُ عَلَى مِيقَاتِهَا»[3].

واتە: ئەبو عەمری شەیبانی دەیووت: خاوەنی ئەو ماڵە بۆی گێڕامەوە، بە دەستیشی ئاماژەی بۆ ماڵی عەبدوڵڵا کرد، (گێڕایەوە) کە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردوە کە ئایا چ کردەوەیەک باشترینە یان لای خوا خۆشەویسترینە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژ کردن لە کاتی خۆیدا.

١٢٦٦ - «عَنْ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ سَبْعَةٌ: مِنَّا ثَلاَثَةٌ مِنْ عَرَبِنَا، وَأَرْبَعَةٌ مِنْ مَوَالِينَا - أَوْ أَرْبَعَةٌ مِنْ عَرَبِنَا وَثَلاَثَةٌ مِنْ مَوَالِينَا قَالَ: فَخَرَجَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ مِنْ بَعْضِ حُجَرِهِ حَتَّى جَلَسَ إِلَيْنَا، فَقَالَ: مَا يُجْلِسُكُمْ هَاهُنَا؟ قُلْنَا: انْتِظَارُ الصَّلاَةِ، قَالَ: فَنَكَتَ بِإِصْبَعِهِ فِي الأَرْضِ، وَنَكَسَ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

سَاعَةً. ثُمَّ رَفَعَ إِلَيْنَا رَأْسَهُ فَقَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا يَقُولُ رَبُّكُمْ؟ قَالَ: قُلْنَا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: إِنَّهُ يَقُولُ: مَنْ صَلَّى الصَّلاَةَ لِوَقْتِهَا فَأَقَامَ حَدَّهَا، كَانَ لَهُ بِهِ عَلَيَّ عَهْدٌ أُدْخِلُهُ الْجَنَّةَ، وَمَنْ لَمْ يُصَلِّ الصَّلاَةَ لِوَقْتِهَا، وَلَمْ يُقِمْ حَدَّهَا لَمْ يَكُنْ لَهُ عِنْدِي عَهْدٌ، إِنْ شِئْتُ أَدْخَلْتُهُ النَّارَ، وَإِنْ شِئْتُ أَدْخَلْتُهُ الْجَنَّةَ»[١].

واتە: لە كەعبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ لامان، لە كاتێكدا ئێمە حەوت كەس لە مزگەوت بووین: سێ لە ئێمە لە عەرەبەكانمان بوون، چواریش لە بەندەكانمان بوون، یان چوار لە ئێمە لە عەرەبەكانمان بوون، سێش لە بەندەكانمان بوون، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە لە یەكێك لە ژوورەكانی خۆی بۆ لامان تا لەلامان دانیشت و فەرمووی: چی ئێوەی لێرە دانیشاندووە؟ وتمان: چاوەڕوان كردنی نوێژ، عەبدوڵڵا دەڵێ: پێغەمبەری خوا پەنجەی لە زەوی خشاند و ماوەیەک سەری نەوی كرد، دواتر سەری بەرز كردەوە بۆ لامان و فەرمووی: ئایا دەزانن پەروەردگارتان چی دەفەرموێت؟ دەڵێ: وتمان: خواو پێغەمبەرەكەی زاناترن (بەوە)، فەرمووی: ئەو دەفەرموێ: هەر كەسێک نوێژ لە كاتی خۆیدا ئەنجام بدات و هەموو ڕوانگەكانی جێبەجێ بكات (بە ڕوكن و ئاداب و سوننەتەكانیەوە)، ئەوە بە هۆی ئەو كارەوە لەمنەوە پەیمانێک و (گرێنتیەكی) بۆ هەیە كە بیخەمە بەهەشتەوە، وە هەر كەسێكیش نوێژ لە كاتی خۆیدا ئەنجام نەدات و هەموو ڕوانگەكانی جێبەجێ نەكات، ئەوە هیچ پەیمانێک و (گرێنتیەكی) لەمنەوە بۆ نیە، ئەگەر بمەوێت دەیخەمە ئاگرەوە، ئەگەر بشمەوێت دەیخەمە بەهەشتەوە.

## بابەت: نوێژ كردن لە دوای ئەو كەسەی نوێژ تاخیر دەكات لە كاتی خۆیدا

١٢٦٧ - «عَنْ أَبِي ذَرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: كَيْفَ أَنْتَ إِذَا بَقِيتَ فِي قَوْمٍ يُؤَخِّرُونَ الصَّلاَةَ عَنْ وَقْتِهَا؟ قَالَ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: صَلِّ الصَّلاَةَ لِوَقْتِهَا وَاخْرُجْ. فَإِنْ أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ وَأَنْتَ فِي الْمَسْجِدِ فَصَلِّ مَعَهُمْ»[٢].

واتە: لە ئەبو ذەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: چی دەكەیت ئەگەر لەناو خەڵكانێكدا مایتەوە كە نوێژ تاخیر دەكەن لە كاتی خۆیدا؟ (دەڵێ) وتم: خوا و پێغەمبەرەكەی زاناترن (بەوە)، فەرمووی: تۆ نوێژ بكە لە كاتی خۆیدا و دەربچۆ، جا ئەگەر قامەت كرا و تۆش لە ناو مزگەوتدا بوویت ئەوە نوێژیان لەگەڵ بكە (واتە: دووبارە لەگەڵ ئەوانیش بیكەرەوە).

١٢٦٨ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَا أَبا ذَرّ كَيْفَ تَصْنَعُ إِذَا أَدْرَكْتَ أُمَرَاءَ يُؤَخِّرُونَ الصَّلاَةَ عَنْ وَقْتِهَا؟» قُلْتُ: مَا تَأْمُرُنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: صَلِّ الصَّلاَةَ لِوَقْتِهَا. وَاجْعَلْ صَلاَتَكَ مَعَهُمْ نَافِلَةً قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: ابْنُ الصَّامِتِ هُوَ: ابْنُ أَخِي أَبِي ذَرّ»[٣].

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو زەڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ چی دەکەیت ئەگەر گەیشتی بە کاربەداستانێک کە نوێژ تاخیر دەکەن لە کاتی خۆیدا؟ (دەڵێ) وتم: چ فەرمانێکم پێ دەکەی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (چی بکەم)؟ فەرمووی: تۆ نوێژ بکە لە کاتی خۆیدا و نوێژ کردنیشت لەگەڵ ئەواندا بکە بە سوننەت (واتە: لەگەڵ ئەوان دووبارەی بکەرەوە بە سوننەت بۆت ئەژمار دەکرێت).

ئەبو موحەممەد دەڵێ: ئیبنو صامیت (کە یەکێکە لە گێڕەوانی ئەم فەرموودەیە): برازای ئەبو زەڕە.

## بابەت: (حوکمی) ئەو کەسەی دەخەوێت و نوێژێکی لێ دەفەوتێت یان لەبیری دەچێتەوە

١٢٦٩ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ نَسِيَ صَلاَةً أَوْ نَامَ عَنْهَا، فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا، إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾طه»[1].

واتە: لە ئەنەسەوە گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نوێژێکی بیر چویەوە یان خەوت و لێی فەوتا ئەوە دەبێ نوێژەکە بکات ئەو کاتەی بیری دەکەوێتەوە (یان کە لە خەوەکەی هەڵسا، بۆ ئەو کەسە ئەوە کاتی نوێژەکەیە ئەگەر کەمتەرخەم نەبووبێت، دەبێ تاخیرتریشی نەکات)، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾، واتە: [وە نوێژ بکە تا منت لە یاد بێت].

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی نوێژی عەسری لێ دەفەوتێت

١٢٧٠ - «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، يَرْفَعُهُ قَالَ: « إِنَّ الَّذِي تَفُوتُهُ الصَّلاَةُ: صَلاَةُ الْعَصْرِ، فَكَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمالَهُ»[2].

واتە: لە سالمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی ئەو کەسەی نوێژی لێ دەفەوتێت، نوێژی عەسر، ئەوە وەک ئەوە وایە ماڵ و منداڵی هەمووی فەوتابێت.

١٢٧١ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهما، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ فَاتَتْهُ صَلاَةُ الْعَصْرِ، فَكَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَوَلَدَهُ، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: أَوْ مالَهُ»[3].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهما)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نوێژی عەسری لێ دەفەوتێت وەک ئەوە وایە خێزان و منداڵی هەموو فەوتابێت.

ئەبو موحەممەد دەڵێ: یان ماڵی لێ بفەوتێت.

---

(١) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی نوێژی ناوەڕاست (عەسر)

١٢٧٢ - «عَنْ عَلِيّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْخَنْدَقِ «مَلأَ اللهُ قُبُورَهُمْ وَبُيُوتَهُمْ نَارًا كَمَا حَبَسُونَا عَنْ صَلاَةِ الْوُسْطَى حَتَّى غَابَتِ الشَّمْسُ»[1].

واتە: لە (ئیمامی) عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی خەندەق فەرمووی: خوا گۆڕ و ماڵەکانیان پڕی ئاگر بکات کە چۆن قەدەغەیان کردین (بە سەرقاڵ کردنمان بە جەنگ) لە ئەنجامدانی نوێژی (ناوەڕاست) (نوێژی عەسر) تا خۆر ئاوا بوو.

## بابەت: دەربارەی نوێژنەکەر

١٢٧٣ - «قَالَ جَابِرٌ ﷺ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ بَيْنَ الْعَبْدِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ أَوْ بَيْنَ الْكُفْرِ إِلاَّ تَرْكُ الصَّلاَةِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: الْعَبْدُ إِذَا تَرَكَهَا مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ وَعِلَّةٍ، لاَ بُدَّ مِنْ أَنْ يُقَالَ: بِهِ كُفْرٌ وَلَمْ يَصِفْ بِالْكُفْرِ»[2].

واتە: جابر ﷺ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە نێوان بەندە و لە نێوان شیرک یان کوفر بەربەستێک نیە تەنها نوێژ نەکردن نەبێت.

ئەبو موحەممەد دەڵێ: بەندە ئەگەر نوێژی واز لێ هێنا بەبێ عوزر و نەخۆشی، ئەوە هەر دەبێ بوترێت: خەسڵەت و صیفاتی کوفری تیایە، بەڵام بە کافر لە قەڵەم نادرێت.

## بابەت: دەربارەی گۆڕینی قیبلە (ڕوگە) لە بەیتول مەقدیسەوە بۆ کەعبە

١٢٧٤ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهما، قَالَ: بَيْنَمَا النَّاسُ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ فِي قُبَاءٍ إذ جَاءَهُمْ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺأُنْزِلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ، وَأُمِرَ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الْكَعْبَةَ، فَاسْتَقْبِلُوهَا وَكَانَ وُجهُ النَّاسِ إِلَى الشَّامِ، فَاسْتَدَارُوا، فَوَجَّهُوا إِلَى الْكَعْبَةِ»[3].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهما)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە کاتێکدا خەڵکی لەناو نوێژی بەیانی بوون لە مزگەوتی قوبا لە ناکاو پیاوێک هات بۆ لایان و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قوڕئانی بۆ دابەزێنراوەو فەرمانی پێکراوە کە ڕوو بکاتە کەعبە، ئەوانیش هەموویان ڕوویان کردە کەعبە، پێشتر ڕووی خەڵکی ڕوە و شام بوو، ڕوویان وەرچەرخاندو سوڕاندیان و ڕوویان کردە کەعبە.

١٢٧٥ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهما، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ الَّذِينَ مَاتُوا وَهُمْ يُصَلُّونَ إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ؟ فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ ١٤٣﴾»[4].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.




واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللهُ عَنهما)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ حوکمیان چیە ئەوانەی مردوون، لە کاتێکدا نوێژیان ڕووەو بەیتول مەقدیس کردووە؟ خوای بەرز ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ﴿١٤٣﴾﴾ [خوا ئیمان و نوێژتان زایە ناکات و نایفەوتێنێت].

## بابەت: دەربارەی دەست پێکردنی نوێژ

١٢٧٦ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَفْتَتِحُ الصَّلاَةَ بِالتَّكْبِيرِ، وَيَفْتَتِحُ الْقِرَاءَةَ بِـ ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾﴾ الفاتحة، وَيَخْتِمُهَا بِالتَّسْلِيمِ»[1].

واتە:لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەست پێ دەکرد بە (اللّٰه أكبر)، خوێندنەوەی قوڕئانیشی دەست پێ دەکرد (لە ناو نوێژدا) بە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾﴾، (واتە: سورەتی فاتیحە)، وە کۆتاییشی بە نوێژ دەهێنا بە سەلام دانەوە.

## بابەت: بەرز کردنەوەی دەستەکات لە سەرەتای دەست پێ کردنی نوێژدا

١٢٧٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: لَمْ يَكُنْ يَقُومُ إِلَى الصَّلاَةِ إِلاَّ رَفَعَ يَدَيْهِ مَدًّا»[2].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ جارێک هەڵنەدەستا بۆ نوێژ حەتمەت دەستەکانی بەرز دەکردەوە، بەرزکردنەوەکەشی درێژ دەکردەوە (تا دەگەیشتە ڕاستی شانەکانی).

## بابەت: ئەوەی دەوترێت دوای دەستپێکردنی نوێژ

١٢٧٨ - «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلاَةَ، كَبَّرَ ثُمَّ قَالَ: وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا، وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ. إِنَّ صَلاَتِي، وَنُسُكِي، وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ. اللهُمَّ أَنْتَ الْمَلِكُ لاَ إِلَهَ إِلاَ أَنْتَ، أَنْتَ رَبِّي وَأَنَا عَبْدُكَ، ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي جَمِيعًا، لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، وَاهْدِنِي لِأَحْسَنِ الأَخْلاَقِ لاَ يَهْدِي لِأَحْسَنِهَا إِلاَّ أَنْتَ، وَاصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَهَا لاَ يَصْرِفُ سَيِّئَهَا إِلاَّ أَنْتَ. لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ، وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ، أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ، تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ»[3].

واتە: لە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک دەستی بە نوێژ دەکرد (اللّٰه أكبر)ی دەکرد، دواتر دەیفەرموو: ڕووی پەرستشم کردە ئەو زاتەی لە نەبوونەوە

---

(١) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

ئاسمانەکان و زەوی هێناوەتە بوون، بە لادانم بۆ ئیسلام (یان لەسەر ڕێگای ڕاست، یان لەسەر ڕێگای ئیبراهیم (علیه السلام)، وە من لە هاوەڵ دانەران نیم، بە دڵنیایی نوێژ و پەرستش و ژیان و مردنم بۆ (اللّٰه)یە کە خوای جیهانیانە، هیچ هاوەڵێکی نیە، وە بەوە فەرمانم پێ کراوە و من یەکەمینی مسوڵمانانم، ئەی خودایە تۆ مەلیکی (موتڵەقی) هیچ خودایێکی بە هەق نیە جگە لە تۆ، تۆ خوای منی و منیش بەندەی تۆم، ستەمم لە نەفسی خۆم کردوە و دان دەنێم بە تاوانەکانم و لە هەموو تاوانەکانم خۆشبە، کەس لە تاوان خۆش نابێت جگە لە تۆ (حیساب تەنها لەدەستی تۆیە)، وە ڕێنموییشم بکە بۆ جوانترین خورەوشت، کەس ڕێنمویی نابەخشێت بۆ باشترین خورەوشت جگە لە تۆ، وە خورەوشتی خراپم لێ لابدە و دووری بخەرەوە، هیچ کەسێک لایندادات و دووری ناخاتەوە جگە لە تۆ، یەک لە دوای یەک و شوێنکەوتن دوای شوێنکەوتن وەڵامی فەرمانەکانت دەدەمەوە، وە گشت خێرو چاکەیەک لە دەستی تۆ دایە، خراپەش پاڵنادرێت بۆ لای تۆ و بەرز نابێتەوە بۆ لای تۆ، تەوفیقم تەنها بە تۆیەو ڕوتێکردن و لایەنگریشم تەنها بۆ لای تۆیە، شایستەی مەدح کردنی و (بەندەکانت موبارەک کردوە بە تەوحیدی خۆت)و بەرزی و بڵندی، داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات.

١٢٧٩ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺإِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَكَبَّرَ قَالَ: سُبْحَانَكَ اللهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ، أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ: مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْثِهِ وَنَفْخِهِ، ثُمَّ يَسْتَفْتِحُ صَلاَتَهُ قَالَ جَعْفَرٌ: وَفَسَّرَهُ مَطَرٌ: هَمْزُهُ: الْمُوتَةُ، وَنَفْثُهُ: الشِّعْرُ، وَنَفْخُهُ: الْكِبْرُ»[1].

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک بە شەو هەڵدەستا بۆ شەونوێژ (اللّٰه أكبر)ی دەکردو دەیفەرموو: خوایە پاکی و بێگەردی و ستایش هەر بۆ تۆیە، وە ناوت پیرۆزو بەرزە، گەورەییەکەت زۆر مەزن و بەرزە، وە هیچ خوایێکی بە هەق نیە جگە لە تۆ، پەنا دەگرم بە خوای بیسەر و زانا لە شەیتانی نەفرین لێ کراو: لە هەمز و نەفث و نەفخی، دواتر دەستی بە خوێندنی قورئان دەکرد لە نوێژەکەیدا.

جەعفەر وتویەتی: مەطەر ئەو وشانەی ئاوا لێکداونەتەوە: (هَمْزُهُ): واتە: موتە (موتەش واتە: شێت بوون)، (وَنَفْثُهُ): واتە: شیعر، (وَنَفْخُهُ): واتە: خۆ بە زلزانی.

## بابەت: مەکرۆهی بە دەنگ وتنی: بسم الله الرحمن الرحيم (لە ناو نوێژدا)

١٢٨٠ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، وَأَبا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ، كَانُوا يَفْتَتِحُونَ الْقِرَاءَةَ بِـ ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ۝٢﴾ الفاتحة، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: بِهَذَا نَقُولُ، وَلاَ أَرَى الْجَهْرَ بِبِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ»[2].

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ صحيح.

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ و ئیمامی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان قوڕئان خوێندنیان دەست پێ دەکرد (لەناو نوێژدا) بە ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئێمەش ئەوە دەڵێین و (ڕەفتار بەوە دەکەین) و پێمان وا نیە (بسم الله الرحمن الرحيم) بە دەنگ دەربېڕدرێت.

بابەت: گرتنی دەستی چەپ بە دەستی ڕاست لە نوێژدا

١٢٨١ - «عَنْ عَبْدِ الْجَبَّارِ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَضَعُ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى قَرِيباً مِنَ الرُّسْغِ»[١].

واتە: لە عەبدولجەباری کوڕی وائیل لە باوکیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە دەستی ڕاستی داناوە لەسەر دەستی چەپی لە نزیک مەچەک.

بابەت: نوێژ دروست نیە تەنها بە خوێندنی فاتیحە نەبێت

١٢٨٢ - «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِأُمِّ الْكِتَابِ فَلاَ صَلاَةَ لَهُ»[٢].

واتە: لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: هەر کەسێک فاتیحە نەخوێنێت ئەوە نوێژی بۆ نیە (نوێژەکەی دروست نەبووە).

بابەت: دەربارەی دوو سەکتەکە (دوو بێ دەنگ بوونەکەی
ئیمام، بێدەنگی دوای (اللّٰه أكبر)ی نوێژ دابەستن و بێ دەنگی دوای خوێندنی فاتیحە)

١٢٨٣ - «عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَسْكُتُ سَكْتَتَيْنِ، إِذَا دَخَلَ فِي الصَّلاَةِ، وَإِذَا فَرَغَ مِنَ الْقِرَاءَةِ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ فَكَتَبُوا إِلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ فَكَتَبَ إِلَيْهِمْ أَنْ قَدْ صَدَقَ سَمُرَةُ. قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: كَانَ قَتَادَةُ، يَقُولُ ثَلاَثُ سَكَتَاتٍ، وَفِي الْحَدِيثِ الْمَرْفُوعِ سَكْتَتَانِ»[٣].

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار دوو سەکتەی دەکرد (دوو جار بێ دەنگ دەبوو)، کاتێک کە دەچوە ناو نوێژ (دوای اللّٰه أكبر بێ دەنگ دەبوو)، هەروەها کاتێک کە لە خوێندنی فاتیحە دەبوویەوە، جا عیمڕانی کوڕی حوصەین ئینکاری ئەو قسەیەی کرد، بۆیە نامەیەکیان بۆ ئوبەی کوڕی کەعب نوسی و بۆیان نارد (کە ئایا هەڵەی نەکردووە؟)، (ئوبەی)ش بۆی نوسین: بە دڵنیایی ڕاست دەکات.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: قەتادە دەیووت: سێ سەکتە بووە، بەڵام لە فەرموودەدا دوو سەکتەیە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ ضعيف.

١٢٨٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْكُتُ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ إِسْكَاتَةً - حَسِبْتُهُ. قَالَ: هُنَيَّةً - فَقُلْتُ لَهُ: بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِسْكَاتَتَكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ، مَا تَقُولُ؟ قَالَ: أَقُولُ: اللهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ. اللهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ. اللهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالثَّلْجِ وَالْمَاءِ الْبَارِدِ»[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ دەبوو سەکتەیەکی دەکرد لە نێوان (اللّه أكبر)ی سەرەتا و خوێندنی فاتیحەدا، پێم وایە (ئەبو هورەیرە) وتی: سەکتەیەکی کورتی دەکرد، (ئەبو هورەیرە دەڵێ) وتم: بە باوک و دایکەوە بە فیدات بم (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) لە بێ دەنگبوونەکەت لە نێوان (اللّه أكبر)ی سەرەتا و خوێندنی فاتیحەدا چی دەڵێی؟ فەرمووی: دەڵێم: ((اللهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ. اللهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ. اللهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالثَّلْجِ وَالْمَاءِ الْبَارِدِ)) واتە: خوایە نێوانی من و تاوانەکانم دوور بخەرەوە، بەو شێوەیەی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوات دوور خستۆتەوە، خوایە پاکم بکەرەوە لە تاوانەکانم بەو شێوەیەی جلی سپی لە پیسی پاک دەکرێتەوە، خوایە بمشۆرە لە تاوانەکانم بە بەفر و ئاوی سارد.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی وتنی ئامین

١٢٨٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا قَالَ الْقَارِئُ: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، فَقَالَ مَنْ خَلْفَهُ: آمِينَ، فَوَافَقَ ذَلِكَ أَهْلَ السَّمَاءِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ ئیمام وتی: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾، ئەو کەسەی دوای ئەویش کە بریتیە لە مەئمومەکە بڵێت: ئامین، جا ئەو ئامینەی تێک بکاتەوە (لە یەک کاتدا بێت، یان تێککردنەوەکە لە ڕووی خشوع و ئیخلاسەوە) لەگەڵ ئامینی خەڵکی ئاسمان (کە فریشتەکانن) ئەوە لە هەموو تاوانەکانی پێشوی دەبوردرێت.

١٢٨٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا قَالَ الْإِمَامُ: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، فَقُولُوا: آمِينَ، فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ تَقُولُ: آمِينَ، وَإِنَّ الْإِمَامَ يَقُولُ: آمِينَ فَمَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ ئیمام وتی: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾، ئێوەش بڵێن: ئامین، چونکە فریشتە دەڵێن: ئامین، وە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، ولكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

ئیمامیش دەڵێت: ئامین، جا هەر كەسێك ئامینەكەی تێك بكاتەوە لەگەڵ ئامینی فریشتەكان ئەوە لە هەموو تاوانەكانی پێشوی دەبوردرێت.

## بابەت: ئامین كردن بە دەنگ

١٢٨٧ - «عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﵁، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَرَأَ: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، قَالَ: آمِينَ، وَيَرْفَعُ بِهَا صَوْتَهُ»[١].

واتە: لە وائیلی كوڕی حوجر ﵁ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ی دەخوێندەوە دەیفەرموو: ئامین، وە دەنگی پێ بەرز دەكردەوە.

## بابەت: اللّٰه أكبر كردن لە هەموو نزمبوونەوەیەك و بەرزبوونەوەیەكدا (لە نوێژدا)

١٢٨٨ - «عن أَبِي بكر بن عبد الرحمن وعن أَبِي سلمة عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّهُمَا صَلَّيَا خَلْفَ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَلَمَّا رَكَعَ، كَبَّرَ، فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ، قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ قَالَ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ. ثُمَّ سَجَدَ وَكَبَّرَ ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَكَبَّرَ، ثُمَّ كَبَّرَ حِينَ قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لَأَقْرَبُكُمْ شَبَهًا بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَا زَالَ هَذِهِ صَلَاتُهُ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا»[٢].

واتە: ئەبوبەكری كوڕی عەبدوڕڕەحمان و ئەبو سەلەمە لە ئەبو هورەیرەیان ﵁ گێڕاوەتەوە، كە هەردووكیان نوێژیان لە دوای ئەبو هورەیرە كردوە، (وتویانە: ئەبو هورەیرە لە نوێژەكەیدا) كاتێ ڕكوعی برد (اللّٰه أكبر)ی كرد، كاتێكیش سەری بەرز كردەوە (لە ڕكوع) و وتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) واتە: خوا وەڵامی ئەو كەسەی داوەتەوە كە ستایشی كردوە (بە قەبوڵ كردنی ستایشەكە و پاداشت دانەوەی)، دواتر كڕنووشی برد و (اللّٰه أكبر)ی كرد، دواتر سەری بەرز كردەوە (لە كڕنووش) و (اللّٰه أكبر)ی كرد، دواتر (اللّٰه أكبر)ی كرد كاتێ لە ڕەكعەتی دووەم هەڵسایەوە، دواتر وتی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە (نوێژی) من لە هەمووتان نزیكترە و زیاتر لە هی پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێت، جا ئەبو هورەیرە بەردەوام ئەوە شێوازی نوێژ كردنی بوو تا لە دونیا جیابوویەوە و (وەفاتی كرد).

١٢٨٩ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُكَبِّرُ فِي كُلِّ رَفْعٍ وَوَضْعٍ، وَقِيَامٍ، وَقُعُودٍ»[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﵁ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی (اللّٰه أكبر)ی دەكرد لە هەموو بەرزبوونەوە و نزمبوونەوە و هەڵسان و دانیشتنێكدا (لە نوێژدا).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی بەرزکردنەوەی دوو دەستەکان لە ڕکوع و سوجدەدا

١٢٩٠ - «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا دَخَلَ الصَّلاَةَ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ، كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَلاَ يَرْفَعُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ أَوْ فِي السُّجُودِ»[١].

واتە: لە سالمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، کە هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەچووە ناو نوێژ (اللّٰه أكبر)ی دەکردو دوو دەستەکانی بەرز دەکردەوە تا بەرامبەر شانەکانی، وە کاتێکیش کە ڕکوعی دەبرد (اللّٰه أكبر)ی دەکرد و دەستەکانی بەرز دەکردەوە، وە کاتێکیش سەری بەرز دەکردەوە لە ڕکوع هەمان شتی دەکرد، بەڵام (دەستەکانی) بەرز نەدەکردەوە لە نێوان دوو سەجدەکاندا یان لەناو سەجدەدا.

١٢٩١ - «عَنْ مالَكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺكَانَ إِذَا كَبَّرَ، رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ أُذُنَيْهِ، وَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ»[٢].

واتە: لە مالیکی کوڕی حوەیریثەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ هەموو جار (لە سەرەتای نوێژدا) کاتێ (اللّٰه أكبر)ی دەکرد دەستەکانی بەرز دەکردەوە تا بەرامبەر گوێچکەکانی، وە (هەمان شتی دەکرد) کاتێک بیویستایە ڕکوع بەرێت، وە کاتێکیش کە سەری بەرز دەکردەوە لە ڕکوع.

١٢٩٢ - «عَنْ وَائِلِ الْحَضْرَمِيِّ ﷺ، أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَكَانَ «يُكَبِّرُ إِذَا خَفَضَ، وَإِذَا رَفَعَ، وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ عِنْدَ التَّكْبِيرِ، وَيُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ يَسَارِهِ، قَالَ: قُلْتُ: حَتَّى يَبْدُوَ وَضَحُ وَجْهِهِ؟ قَالَ: نَعم»[٣].

واتە: لە وائیلی حەضرەمیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە نوێژی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (اللّٰه أكبر)ی دەکرد کاتێ خۆی نزم دەکرد، وە کاتێکیش کە بەرزدەبوویەوە، وە دەستەکانیشی بەرز دەکردەوە لەکاتی (اللّٰه أكبر) کردن، وە سەلامی بۆ لای ڕاست و چەپی دەدایەوە، (عەبدوڕەحمان دەڵێ) وتم: تا سپیایی ڕوخساری دەردەکەوت (ڕووی دەسوڕاند لە سەلامدانەوە)؟ (وائیل) وتی: بەڵێ.

## بابەت: کێ شایستەترە بۆ پێشنوێژی کردن

١٢٩٣ - «عَنْ مالَكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ ﷺ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺفِي نَفَرٍ مِنْ قَوْمِي وَنَحْنُ شَبَبَةٌ، فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ لَيْلَةً، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَفِيقًا، فَلَمَّا رَأَى شَوْقَنَا إِلَى أَهْلِينَا، قَالَ: ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيكُمْ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

فَكُونُوا فِيهِمْ، فَمُرُوهُمْ وَعَلِّمُوهُمْ، وَصَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ، ثُمَّ لِيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ»[١].

واتە: لە مالیكی كوڕی حوەیریثەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ كۆمەڵە كەسێكی قەومەكەم لە كاتێكدا ئێمە گەنج بووین، بیست شەو لەلای ماینەوە، جا كاتێك حەزی ئێمەی بینی بۆ گەڕانەوە بۆ لای كەسوكارمان، فەرمووی: بگەڕێنەوە بۆ لای خانەوادەكانتان و لەناویاندا بن، فەرمانیان پێ بكەن و فێریان بكەن و نوێژیش بكەن وەك ئەوەی منتان بینی نوێژم كرد، جا ئەگەر كاتی نوێژ هات، با یەكێك لە ئێوە بۆتان بانگ بدات، دواتر با گەورەترینتان پێشنوێژیتان بۆ بكات.

١٢٩٤ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا اجْتَمَعَ ثَلَاثَةٌ فَلْيَؤُمَّهُمْ أَحَدُهُمْ، وَأَحَقُّهُمْ بالإِمَامَةِ أَقْرَؤُهُمْ»[٢].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سێ كەس كۆبوونەوە با یەكێكیان پێشنوێژیان بۆ بكات، وە شایستەترینیان بە پێشنوێژی ئەوەیە كە قورئان خوێندنەوەی باشترە.

بابەت: شوێنی وەستانی ئەو كەسەی نوێژ لەگەڵ ئیمامدا دەكات، ئەگەر بە تەنیا بوو

١٢٩٥ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ بَعْدَ الْعِشَاءِ فَصَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ قَامَ فَقَالَ: أَنَامَ الْغُلَيِّمُ؟» - أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا - فَقَامَ فَصَلَّى، فَجِئْتُ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من لەلای خەرەتم (خوشكی دایكم) مەیمونە بووم، جا پێغەمبەر ﷺ پاشی عیشا هات و چوار ڕەكعەت نوێژی كرد، دواتر فەرمووی: ئایا كوڕیژگۆكەكە خەوتووە؟ ـ یان شتێكی لەو جۆرەی فەرموو ـ جا هەڵسا و نوێژی كرد، منیش هاتم و لە لای چەپیەوە وەستام، ئەویش دەستی گرتم و منی بردە لای ڕاستی خۆی (بۆ لای ڕاستەی خۆی سوڕاندمی).

بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی نوێژ لە دوای ئیمام دەكات، لە كاتێكدا ئیمام دانیشتووە

١٢٩٦ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَكِبَ فَرَسًا فَصُرِعَ عَنْهُ، فَجُحِشَ شِقُّهُ الْأَيْمَنُ، فَصَلَّى صَلَاةً مِنَ الصَّلَوَاتِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَصَلَّيْنَا مَعَهُ جُلُوسًا، فَلَمَّا انْصَرَفَ، قَالَ: إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَلاَ تَخْتَلِفُوا عَلَيْهِ، فَإِذَا صَلَّى قَائِمًا، فَصَلُّوا قِيَامًا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا رَفَعَ، فَارْفَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَإِنْ صَلَّى قَاعِدًا، فَصَلُّوا قُعُودًا أَجْمَعُونَ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ سواری ماینێک بوو لەسەری کەوتە خوارەوە و لای ڕاستی (موبارەکی) داماڵا، بۆیە یەکێک لە نوێژەکانی (بۆ خەڵکی) بەدانیشتنەوە کرد، ئێمەش نوێژمان لەگەڵ ئەو بە دانیشتنەوە کرد، جا کاتێک تەواو بوو (لە نوێژەکە) فەرمووی: بێگومان ئیمام بۆ ئەوە دانراوە تا بکرێتە پێشەنگ، بۆیە ئێوە لەگەڵی جیاواز مەبن، کاتێ ئیمام نوێژی بە دانیشتنەوە کرد، ئێوەش بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن، وە کاتێ ڕکوعی برد ئێوەش ڕکوع ببەن، وە کاتێ (لە ڕکوع) هەڵسایەوە ئێوەش هەڵسنەوە، وە کاتێ وتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئێوەش بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)، وە ئەگەر نوێژی بە دانیشتەوە کرد، ئێوەش نوێژ بە دانیشتنەوە بکەن هەمووتان.

١٢٩٧ - «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ فَقُلْتُ لَهَا: أَلاَ تُحَدِّثِينِي عَنْ مَرَضِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَتْ: بَلَى، ثَقُلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَصَلَّى النَّاسُ؟ قُلْنَا: لاَ، هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ. قَالَتْ: فَفَعَلْنَا، فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ، فَقَالَ: أَصَلَّى النَّاسُ؟. فَقُلْنَا: لاَ، هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: ضَعُوا لِي مَاءً فِي الْمِخْضَبِ، فَفَعَلْنَا، ثُمَّ ذَهَبَ لِيَنُوءَ فَأُغْمِيَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَفَاقَ فَقَالَ: أَصَلَّى النَّاسُ؟» فَقُلْنَا: لاَ، هُمْ يَنْتَظِرُونَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَتْ: وَالنَّاسُ عُكُوفٌ فِي الْمَسْجِدِ يَنْتَظِرُونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِصَلاَةِ الْعِشَاءِ الآخِرَةِ. قَالَتْ: فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى أَبِي بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ. قَالَتْ: فَأَتَاهُ الرَّسُولُ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُكَ بِأَنْ تُصَلِّيَ بِالنَّاسِ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ - وَكَانَ رَجُلاً رَقِيقًا - يَا عُمَرُ صَلِّ بِالنَّاسِ. فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: أَنْتَ أَحَقُّ بِذَلِكَ. قَالَتْ: فَصَلَّى بِهِمْ أَبُو بَكْرٍ تِلْكَ الأَيَّامَ. قَالَتْ: ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَجَدَ مِنْ نَفْسِهِ خِفَّةً فَخَرَجَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا الْعَبَّاسُ لِصَلاَةِ الظُّهْرِ، وَأَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ، فَلَمَّا رَآهُ أَبُو بَكْرٍ ذَهَبَ لِيَتَأَخَّرَ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ لاَ يَتَأَخَّرَ، وَقَالَ لَهُمَا: أَجْلِسَانِي إِلَى جَنْبِهِ، فَأَجْلَسَاهُ إِلَى جَنْبِ أَبِي بَكْرٍ. قَالَتْ: فَجَعَلَ أَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي وَهُوَ قَائِمٌ بِصَلاَةِ النَّبِيِّ ﷺ وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلاَةِ أَبِي بَكْرٍ وَالنَّبِيُّ ﷺ قَاعِدٌ.

قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: فَدَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْتُ لَهُ: أَلاَ أَعْرِضُ عَلَيْكَ مَا حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ عَنْ مَرَضِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ: هَاتِ، فَعَرَضْتُ حَدِيثَهَا عَلَيْهِ، فَمَا أَنْكَرَ مِنْهُ شَيْئًا غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ: أَسَمَّتْ لَكَ الرَّجُلَ الَّذِي كَانَ مَعَ الْعَبَّاسِ؟ قُلْتُ: لاَ. فَقَالَ: هُوَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ»[1].

واتە: لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵا گێڕراوتەوە، وتویەتی: چوومە لای عائیشە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)و پێم وت: بۆ دەربارەی نەخۆشی (وەفاتی) پێغەمبەری خوا ﷺ بۆم ناگێڕیتەوە؟ وتی: بەڵێ (بۆت دەگێڕمەوە)، پێغەمبەری خوا ﷺ (جوڵەی) قورس بوو (بەهۆی نەخۆشیەکەی) و فەرمووی: ئایا خەڵک نوێژیان کردووە؟ وتمان: نەخێر، ئەوان چاوەڕێی تۆن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: ئاوم بۆ لە تەشت بکەن، (عائیشە) دەڵێ: ئێمەش وامان کرد، خۆی شۆرد، دواتر ڕۆیشت تا بە حاڵە حاڵ بڕوات، لە هۆش خۆی چوو، دواتر بە هۆش خۆی هاتەوە و فەرمووی: ئایا خەڵک نوێژیان کردووە؟ ئێمەش وتمان: نەخێر، ئەوان چاوەڕێی تۆن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: ئاوم بۆ لە تەشت بکەن، (عائیشە) دەڵێ: ئێمەش وامان کرد، خۆی شۆرد، دواتر ڕۆیشت تا بە حاڵە حاڵ

---

(١) ـ صحيح.

بڕوات، لە هۆش خۆی چوو، دواتر بە هۆش خۆی هاتەوە و فەرمووی: ئایا خەڵک نوێژیان کردووە؟ ئێمەش وتمان: نەخێر، ئەوان چاوەڕێی تۆن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، عائیشە دەفەرموێت: خەڵکی لە مزگەوت مابوونەوە چاوەڕێی پێغەمبەری خوایان ﷺ دەکرد بۆ نوێژی عیشا، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوای ئەبوبەکر تا (بە ئیمامەتی) نوێژ بە خەڵکی بکات، دەڵێ: نێردراوەکە چوو بۆ لای و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانت پێ دەکات نوێژ بە خەڵکی بکەیت، ئەبوبەکریش کە پیاوێکی دڵ ناسک بوو وتی: ئەی عومەر تۆ نوێژ بە خەڵکی بکە، عومەریش پێی وت: تۆ شایستەتری بۆ ئەمە، (عائیشە) دەڵێت: ئەبوبەکر نوێژی بە خەڵکی کرد ئەو چەند ڕۆژانە، دەڵێ: دواتر (دوای چەند ڕۆژێک) پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی بە لەش سوکییێک کرد و لە نێوان دوو کەس کە یەکێکیان عەبباس بوو، دەرچوو (بۆ مزگەوت) بۆ نوێژی نیوەڕۆ، ئەبوبەکریش نوێژی بۆ خەڵکی دەکرد (لەناو نوێژدا بوون)، جا کاتێک ئەبوبەکر پێغەمبەری خوای ﷺ بینی، لاچوو تا بچێتە دواوەو (پێغەمبەری خوا ﷺ بچێتە شوێنی)، پێغەمبەری خواش ﷺ ئاماژەی بۆ کرد نەیەیتە دواوە، بە دوو کەسەکەشی فەرموو لە تەنیشت ئەبوبەکر دامنیشێنن، ئەوانیش لە تەنیشت ئەبوبەکر دایان نیشاند، عائیشە دەڵێت: وای لێهات ئەبوبەکر نوێژی بە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد بە وەستاوی، خەڵکیش نوێژیان بە نوێژی ئەبوبەکر دەکرد، پێغەمبەری خواش دانیشتبوو.

عوبەیدوڵلا وتی: چووم بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی عەبباس و پێم وت: ئایا بۆت باس نەکەم ئەوەی عائیشە بۆی گێڕامەوە دەربارەی نەخۆشی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ ئەویش وتی: بڵێ، (دەڵێ): منیش قسەکەیم بۆ گێڕایەوە، ئینکاری لەهیچ شتێک نەکرد، تەنها ئەوە نەبێت وتی: ئایا ناوی ئەو پیاوەشی هێنا کە لەگەڵ عەبباس بوو (خۆی دابووە بن باڵی پێغەمبەری خوا)؟ وتم: نەخێر، وتی: عەلی کوڕی ئەبو طالیب بوو.

## بابەت: ئیمام نوێژ بۆ خەڵکی دەکات، لە کاتێکدا شوێنی بەرزترە لە هاوەڵەکانی

**١٢٩٨** - «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَكَبَّرَ، فَكَبَّرَ النَّاسُ خَلْفَهُ، ثُمَّ رَكَعَ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَنَزَلَ الْقَهْقَرَى فَسَجَدَ فِي أَصْلِ الْمِنْبَرِ، ثُمَّ عَادَ حَتَّى فَرَغَ مِنْ آخِرِ صَلَاتِهِ. قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: فِي ذَلِكَ رُخْصَةٌ لِلْإِمَامِ أَنْ يَكُونَ أَرْفَعَ مِنْ أَصْحَابِهِ وَقَدْرُ هَذَا الْعَمَلِ فِي الصَّلَاةِ أَيْضًا»[١].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەسەر مینبەر دانیشتبوو (اللّٰه أكبر)ی کرد (بۆ دەست پێ کردنی نوێژ)، خەڵکیش لەدواوەی ئەو (اللّٰه أكبر) یان کرد، دواتر ڕکوعی برد لەکاتێکدا لەسەر مینبەر بوو، دواتر سەری بەرز کردەوە (لە ڕکوع) و هاتە خواوەرەوە پشتاوپشت (تا ڕووی لە قیبلە وەرنەگەڕێت)، وە کڕنووشی برد لەلای مینبەرەکە، دواتر گەڕایەوە (بۆ سەر مینبەر) تا لە نوێژەکەی بوویەوە.

---

(١) ـ صحيح.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: لەوەدا ڕێپێدان هەیە بۆ ئیمام لەوەی (شوێنی) لە هاوەڵەکانی بەرزتر بێ، ئەندازەی ئەو کارە لە نوێژیشدا دروستە.

تێبینی: لە فەرموودەیەکی تردا هاتوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆیە وام کرد تا منتان جوان لێ دیار بێت چۆن نوێژ دەکەم و فێری ببن.

## بابەت: ئەوەی ئیمام فەرمانی پێ کراوە لە تەخفیف کردنی نوێژدا

١٢٩٩ - «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ إِنِّي لأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلاَةِ الْغَدَاةِ مِمَّا يُطِيلُ بِنَا فِيهَا فُلاَنٌ، فَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَشَدَّ غَضَباً فِي مَوْعِظَةٍ مِنْهُ يَوْمَئِذٍ، فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَمَنْ صَلَّى بِالنَّاسِ فَلْيَتَجَوَّزْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الْكَبِيرَ وَالضَّعِيفَ وَذَا الْحَاجَةِ»[١].

واتە: لە ئەبو مەسعودی ئەنصاریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بە خوا ناچم بۆ نوێژی بەیانی لەبەر ئەوەی فڵان لەسەرمان درێژ دەکاتەوە، (ئەبو مەسعود دەڵێت): پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە زۆر توڕە بێت لە ئامۆژگاری کردندا وەک ئەو ڕۆژە و فەرمووی: ئەی خەڵکینە هەندێک لە ئێوە ڕەوێنەرەوەن (خەڵکی لە دینی خوا دوور دەخەنەوە)، هەر کەسێک نوێژی بۆ خەڵکی کرد با کورتی بکاتەوە، چونکە بە دڵنیایی لە نێو ئێوەدا بە تەمەن و لاواز و خاوەن کار هەیە.

تێبینی: بەڵام دەبێ ئەو سوکیە بە پێوەری نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بپێورێت، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکانی سێ چوار جار لە نوێژی ئێستای ئێمە درێژتر بووە، ئەو نوێژانەی ئێستا ئێمە بە ناوی تەخفیفەوە دەیکەین هی مسوڵمانی چاک نیە، مسوڵمانی چاک دەبێ چاو لە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بکات.

١٣٠٠ - «عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا، يَقُولُ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَخَفَّ النَّاسِ صَلاَةً فِي تَمَامٍ»[٢].

واتە: لە قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەنەس بوو دەیووت: پێغەمبەر ﷺ لە هەموو خەڵکی نوێژی خەفیفترو سوکتر بوو بە ڕێک و تەواویش (هەقی هەموو ڕوکنەکانی دەدا زۆر بە ڕێکی).

## بابەت: خەڵک کەی هەڵدەستێت کاتێ قامەت دەکرێت

١٣٠١ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا نُودِيَ لِلصَّلاَةِ، فَلاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ ئەوە هەڵمەستن تا من دەبینن (دێمە ناوتان بۆ ئیمامەتی).

١٣٠٢ - «حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي قَتَادَةَ، أَنَّ أَبَاهُ ﷺ، حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَلاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، کە باوکی ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ ئەوە هەڵمەستن تا من دەبینن (دێمە ناوتان بۆ ئیمامەتی).

## بابەت: دەربارەی ڕاست کردنی ڕیزەکانی نوێژ

١٣٠٣ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: سَوُّوا صُفُوفَكُمْ، فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ تَمَامِ الصَّلاَةِ»[٢].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕیزەکانتان ڕاست بکەن، چونکە ڕاست کردنی ڕیزەکان بەشێکە لە تەواوی نوێژ.

## بابەت: فەزڵ و گەورەیی ئەو کەسەی بگات بە ڕیزەکانی یەکەم لە نوێژدا

١٣٠٤ - «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَوُّوا صُفُوفَكُمْ لاَ تَخْتَلِفُ قُلُوبُكُمْ، قَالَ: وَكَانَ يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ الْأَوَّلِ أَوِ الصُّفُوفِ الْأُولَى»[٣].

واتە: لە بەڕرائی کوڕی عازیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕیزەکانتان ڕاست بکەن، دڵەکانتان لێک ناترازێ، (دەڵێ) هەروەها دەیفەرموو: خواو فریشتەکانی صەڵاوەت دەدەن لەسەر ڕیزی یەکەم یان ڕیزەکانی یەکەم (واتە: خوا ڕەحمەتیان بەسەر دەبارێنێت، فریشتەش دووعای باراندنی ڕەحمەتیان بۆ دەکەن لە خوا).

## بابەت: دەربارەی گەورەیی ڕیزی یەکەم (لە نوێژدا)

١٣٠٥ - «عَنْ عِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَسْتَغْفِرُ لِلصَّفِّ الْأَوَّلِ ثَلاَثًا، وَلِلثَّانِي مَرَّةً»[٤].

واتە: لە عیرباضی کوڕی ساریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام سێ جار داوای لێخۆشبوونی بۆ ڕیزی یەکەم دەکرد، بۆ ڕیزی دووەمیش جارێک.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف الانقطاعه، ولكن الحديث صحيح.

١٣٠٦ - «أخبرنا الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ، حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ مُوسَى الْأَشْيَبُ، عَنْ شَيْبَانَ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ، عَنْ عِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ»[١].

واتە: لە ڕێگایەکی تریشەوە هەمان فەرموودە لە عیرباضەوە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: ئەو کەسەی (ڕاستەوخۆ) لەدوای ئیمام دەبێت لە خەڵکی

١٣٠٧ - «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْسَحُ مَنَاكِبَنَا فِي الصَّلَاةِ وَيَقُولُ: لَا تَخْتَلِفُوا، فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، لِيَلِيَنِّي مِنْكُمْ أُولُو الْأَحْلَامِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ. قَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: فَأَنْتُمُ الْيَوْمَ أَشَدُّ اخْتِلَافًا»[٢].

واتە: لە ئەبو مەسعودی ئەنصاریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ شانەکانی بەیەکەوە دەلکاندین لە نوێژداو دەیفەرموو: لێک جیاواز مەبن (بەوەی یەکێک لە پێشتر بێ و یەکێک لە دواوەو یەکێک دوورو...) چونکە ئەو کات دڵەکانتان لێک جیاواز دەبێت و لێک دەترازێت، با باڵغ و عاقڵەکانی ئێوە (ڕاستەوخۆ) لە دواوەم بوەستن، دواتر ئەوانەی لە دوای ئەوانن (لە عەقڵ و باڵغی)، دواتر ئەوانەی لە دوای ئەوانیشەوەن (ئا بەو ڕیزبەندیە). ئەبو مەسعود دەڵێت: ئیمڕۆ ئێوە زۆرترین جیاوازیتان هەیە (لە نێوانی یەکتری).

١٣٠٨ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لِيَلِيَنِّي مِنْكُمْ أُولُو الْأَحْلَامِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ. وَلَا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ. وَإِيَّاكُمْ وَهَوْشَاتِ الْأَسْوَاقِ»[٣].

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با باڵغ و عاقڵەکانی ئێوە (ڕاستەوخۆ) لە دواوەم بوەستن، دواتر ئەوانەی لەدوای ئەوانن (لە عەقڵ و باڵغی)، دواتر ئەوانەی لە دوای ئەوانیشەوەن، وە لێک جیاواز مەبن (لە چۆنیەتی وەستان لە ڕیزی نوێژدا) چونکە ئەو کات دڵەکانتان لێک جیاواز دەبێت و لێک دەترازێت، وە خۆشتان بپارێزن لە کۆبوونەوەی بازاڕ.

## بابەت: کام ڕیزی ئافرەتان چاکترە (خێری زیاترە)؟

١٣٠٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا، وَشَرُّهَا آخِرُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا، وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا»[٤].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: چاکترین ڕیزی پیاوان (لە نوێژدا) یەکەمیانە، خراپترینیشی ئاخیریانە، وە چاکترین ڕیزی ئافرەتان ئاخیریانە، خراپترینیشی یەکەمیانە.

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

## بابەت: كام نوێژ لەسەر مونافیق و دوو ڕوەكان قورسترینه

١٣١٠ - «عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الصُّبْحِ ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: أَشَاهِدٌ فُلَانٌ؟ قَالُوا: لَا، فَقَالَ: أَشَاهِدٌ فُلَانٌ؟» فَقَالُوا: لَا، لِنَفَرٍ مِنَ الْمُنَافِقِينَ لَمْ يَشْهَدُوا الصَّلَاةَ، فَقَالَ: إِنَّ هَاتَيْنِ الصَّلَاتَيْنِ أَثْقَلُ الصَّلَاةِ عَلَى الْمُنَافِقِينَ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا»[١].

واتە: لە ئوبەی كوڕی كەعبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی بۆ كردین، دواتر ڕووی تێ كردین و فەرمووی: ئایا فڵان هاتوە؟ وتیان: نەخێر، فەرمووی: ئەی فڵان هاتوە؟ وتیان: نەخێر، یەک تاكە كەس لە دوو ڕوەكان لە نوێژەكە ئامادە نەبوون، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەو دوو نوێژانە (نوێژی عیشا و بەیانی) قورسترین نوێژن لەسەر دوو ڕوەكان، وە ئەگەر بزانن چ خێرێكی تیایە ئەوە بۆی دەهاتن ئەگەر بە گاگۆڕكێش بووایە.

١٣١١ - «قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَصِيرٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ أُبَيٍّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَسَمِعْتُهُ مِنْ أُبَيٍّ»[٢].

واتە: ئەبو موحەممەد وتویەتی: عەبدوڵلای كوڕی ئەبو بەصیر وتویەتی: باوكم بۆی گێڕامەوە لە ئوبەییەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ، (باوكم وتی): گوێم لە ئوبەی بوو (ئەو فەرموودەیەی گێڕایەوە).

١٣١٢ - «أَخْبَرنا أَبُو غَسَّانَ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَصِيرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَ ذلكَ»[٣].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە ئوبەی ﷺ هەمان فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

١٣١٣ - «أَخْبَرنا سَعِيدُ بْنُ عَامِرٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ خَالِدِ بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَصِيرٍ، عَنْ أَبِيهِ عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ»[٤].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە ئوبەی ﷺ هەمان فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

١٣١٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ صَلَاةٍ أَثْقَلُ عَلَى الْمُنَافِقِينَ مِنْ صَلَاةِ الْعِشَاءِ الآخِرَةِ، وَصَلَاةِ الْفَجْرِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا، لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا»[٥].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ نوێژێک نیە قورستر بێت لەسەر دوو ڕوەكان لە نوێژی عیشا و نوێژی بەیانی، وە ئەگەر بزانن چ خێرێكی تیایە ئەوە بۆی دەهاتن ئەگەر بە گاگۆڕكێش بووایە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٥) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی نایێت بۆ نوێژی جەماعەت

١٣١٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ فِتْيَانِي فَيَجْمَعُوا حَطَبًا، فَآمُرَ رَجُلاً يُصَلِّي بِالنَّاسِ ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى أَقْوَامٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنْ هَذِهِ الصَّلاَةِ، فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ، لَوْ كَانَ عَرْقًا سَمِينًا، أَوْ مُعَرَّقَيْنِ لَشَهِدُوهُمَا، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا، لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی هاتە سەرم فەرمان بە گەنجەکانم بکەم دار کۆبکەنەوەو، فەرمان بە کەسێکیش بکەم تا نوێژ بۆ خەڵکی بکات (لە شوێنی من ببێتە ئیمام)، دواتر بچمە پشتی ماڵی ئەو خەڵکانەی نایێن بۆ ئەم نوێژە و لێیان بسوڕێمەوە و خانوەکان گڕ بدەم بە سەریاندا، خۆ ئەگەر (دەعوەتی) ئێسقانێکی کەم گۆشت و کەمە شیرێک بووایە، ئەوە بۆی دەهاتن، وە ئەگەر بزانن ئەم دوو نوێژە چ خێرێکیان تیایە ئەوە بۆیان دەهاتن ئەگەر بە گاگۆڕکێش بووایە.

## بابەت: مۆڵەتدان بە نەکردنی جەماعەت ئەگەر باران بوو لە سەفەردا

١٣١٦ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهما، أَنَّهُ نَزَلَ بِضَجْنَانَ فِي لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ، فَأَمَرَ مُنَادِيًا فَنَادَى: الصَّلاَةُ فِي الرِّحَالِ، ثُمَّ أَخْبَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا كَانَ فِي سَفَرٍ فِي لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ أَوْ مَطِيرَةٍ أَمَرَ مُنَادِيًا فَنَادَى: الصَّلاَةُ فِي الرِّحَالِ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهما)، گێردراوەتەوە، کە (جارێکیان) لە شەوێکی سارددا لە ضەجنان گیرسایەوە (لەگەڵ هاوەڵەکانی)، جا فەرمانی بە بانگدەرێک کردو بانگی کرد (وتی): نوێژ لەناو خیمەکان دەکرێ (مەیەن بۆ جەماعەت)، دواتر هەواڵیدا کە پێغەمبەر ﷺ هەموو جار ئەگەر لە سەفەرێکدا بووایە لە شەوێکی ساردا، یان باراناویدا، ئەوە فەرمانی بە بانگدەرێک دەکرد بانگی دەکرد: نوێژ لەناو خیمەکان دەکرێ.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی نوێژی بە کۆمەڵ

١٣١٧ - «أَخْبَرَنَا دَاوُدُ بْنُ أَبِي هِنْدٍ، قَالَ: قُلْتُ لِسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، رَجُلٌ صَلَّى فِي بَيْتِهِ، ثُمَّ أَدْرَكَ الْإِمَامَ وَهُوَ يُصَلِّي، أَيُصَلِّي مَعَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ: بِأَيَّتِهِمَا يَحْتَسِبُ؟ قَالَ: بِالَّتِي صَلَّى مَعَ الْإِمَامِ فَإِنَّ أبا هُرَيْرَةَ ﷺ، حَدَّثَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: صَلاَةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمِيعِ تَزِيدُ عَلَى صَلاَتِهِ وَحْدَهُ بِضْعًا وَعِشْرِينَ جُزْءًا»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە داوودی کوڕی ئەبو هیندەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە سەعیدی کوڕی موسەییبم وت: پیاو نوێژ لە ماڵەوە بکات دواتر بە ئیمام ڕابگات لەکاتێکدا نوێژ دەکات، ئایا نوێژ لەگەڵ ئەو دەکاتەوە؟ وتی: بەڵێ، وتم: پاداشتی کامیان وەردەگرێت؟ وتی: بەو نوێژەی لەگەڵ ئیمامی کردوە، چونکە ئەبو هورەیرە ﷺ بۆی گێڕاوینەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی پیاو لەناو کۆمەڵێکدا (بە جەماعەت) ئەجری زیاترە لە نوێژێکی کە بە تەنیایە بە بیست و هەندێک بەش.

١٣١٨ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: صَلاَةُ الرَّجُلِ فِي جَمَاعَةٍ، تَزِيدُ عَلَى صَلاَتِهِ وَحْدَهُ سَبْعًا وَعِشْرِينَ دَرَجَةً»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی پیاو بە جەماعەت پاداشتی زیاترە لە نوێژێکی کە بە تەنیایە بە بیست و حەوت پلە.

## بابەت: نەهی کردن لە ڕێگری کردنی ئافرەتان لە چوونە مزگەوت، وە چۆنیەتی دەرچوونیان کاتێ دەردەچن (بۆ مزگەوت)

١٣١٩ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللهُ عَنْهما، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا اسْتَأْذَنَتْ أَحَدَكُمْ زَوْجَتُهُ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَلاَ يَمْنَعْهَا»[2].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللهُ عَنْهما)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ خێزانی یەکێکتان ئیزنتان لێ وەردەگرێت بۆ چوونە مزگەوت ئەوە با ڕێگری لێ نەکات (با ئیزنی بدات).

١٣٢٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لاَ تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللَّهِ مَسَاجِدَ اللَّهِ، وَلْيَخْرُجْنَ إِذَا خَرَجْنَ تَفِلاَتٍ»[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەتانی بەندەی خوا قەدەغە مەکەن لە مزگەوتەکانی خوا، وە کاتێ دەچنە دەرەوە (بۆ مزگەوت) با بچنە دەرەوە بەبێ بۆن (بێ گوڵاو لەخۆدان).

١٣٢١ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، بِإِسْنَادِ هَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: قَالَ سَعِيدُ بْنُ عَامِرٍ: التَّفِلَةُ: الَّتِي لاَ طِيبَ لَهَا»[4].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی عەمرەوە گێڕدراوەتەوە بە سەنەدی هەمان ئەو فەرموودەی پێشەوە، وتویەتی: سەعیدی کوڕی عامیر وتویەتی: (التَّفِلَةُ): واتە: ئەو ئافرەتەی گوڵاوی پێوە نیە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

(٤) ـ صحيح.

## بابەت: كاتێ خواردن ئامادە دەبێت و قامەتیش دەكرێت (بۆ نوێژ)

**١٣٢٢** - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا وُضِعَ الْعَشَاءُ وَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ»[١].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێ خواردن دانرا و كاتی نوێژیش هات، ئەوە دەست بە خواردنەكە بكەن.

**١٣٢٣** - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مالَكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا حَضَرَ الْعَشَاءُ وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ»[٢].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ گێردراوەتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێ خواردن ئامادە بوو و قامەت بۆ نوێژیش كرا، ئەوە دەست بە خواردنەكە بكەن.

## بابەت: ڕۆیشتن چۆن دەكرێت بۆ نوێژ (بۆ مزگەوت)

**١٣٢٤** - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ، فَلَا تَأْتُوهَا تَسْعَوْنَ وَأْتُوهَا تَمْشُونَ وَعَلَيْكُمُ السَّكِينَةُ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، وَمَا فَاتَكُمْ، فَأَتِمُّوا»[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: كاتێ هاتن بۆ نوێژ بە پەلەو غاردان مەیەن، بەڵكو بە ڕۆیشتنی ئاسایی وەرن و با ئارامیتان بەسەرەوە بێت، ئەوەندەی پێڕاگەیشتن نوێژ بكەن (لەگەڵ ئیمام)، ئەوەندەی لێشتان فەوتا و وێڕانەگەیشتن ئەوە تەواوی بكەن (دوای سەلامدانەوەی ئیمام).

**١٣٢٥** - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ، فَصَلُّوا، وَمَا سُبِقْتُمْ، فَأَتِمُّوا»[٤].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو قەتادەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێ هاتن بۆ نوێژ دەست بگرن بە ئارامی و لەسەرخۆیی (لە ڕۆیشتندا)، ئەوەندەی پێڕاگەیشتن نوێژ بكەن (لەگەڵ ئیمام)، ئەوەندەی دواشكەوتن تەواوی بكەن (دوای سەلامدانەوەی ئیمام).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.




## بابەت: پاداشت و گەورەیی هەنگاونان بۆ مزگەوت

**١٣٢٦** - «عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ بِالْمَدِينَةِ لاَ أَعْلَمُ بِالْمَدِينَةِ مِمَنْ يُصَلِّي إِلى الْقِبْلَةِ أَبْعَدَ مَنْزِلاً مِنَ الْمَسْجِدِ مِنْهُ، وَكَانَ يُصَلِّي الصَّلَوَاتِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقِيلَ لَهُ: لَوِ ابْتَعْتَ حِمَارًا تَرْكَبُهُ فِي الرَّمْضَاءِ وَالظَّلْمَاءِ؟ قَالَ: وَاللَّهِ مَا يَسُرُّنِي أَنَّ مَنْزِلِي بِلِزْقِ الْمَسْجِدِ. فَأُخْبِرَ النَّبِيُّ ﷺ بِذَلِكَ، فَسَأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْمَا يُكْتَبَ أَثَرِي وَخُطَايَ، وَرُجُوعِي إِلَى أَهْلِي، وَإِقْبَالِي وَإِدْبَارِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَنْطَاكَ اللهُ ذَلِكَ كُلَّهُ، وَأَعْطَاكَ مَا احْتَسَبْتَ أَجْمَعَ، أَوْ كَمَا قَالَ»[١].

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک لە مەدینە هەبوو نەمزانیوە کەسێک لەوانەی نوێژ ڕووە و قیبلە دەکەن ماڵی دوورتر بووبێت لە مزگەوت لەو پیاوە، وە هەموو نوێژەکانی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد (بە جەماعەت لە مزگەوت)، بۆیە پێی وترا: ئەگەر گوێدرێژێکت کڕیبووایە (باش دەبوو) بۆ سواربوونی لەبەر گەرما و تاریکی (بۆ واناکەی)؟ (پیاوەکە) وتی: سوێند بە خوا پێم خۆش نیە ماڵم بە مزگەوتەوە لکابێت و لە مزگەوت نزیک بێت، جا ئەم قسەیە بە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیەنرا و پێغەمبەری خواش ﷺ پرسیاری لە پیاوەکە کرد دەربارەی ئەوە (کە ئایا بۆ حەز دەکات ماڵی دوور بێت)، پیاوەکەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تاوەکو شوێنەوارو هەنگاو و گەڕانەوەم بۆ لای خانەوادەکەم و ڕوتێکردنم و پشت تێکردنم تۆمار بکرێن (لەلای خوا)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خوا ئەوانەت هەمووی پێ دەدات، وە ئەو پاداشتەی چاوەڕێی دەکەی هەموویت پێ دەدات.

## بابەت: دەربارەی (حوکمی) نوێژی پیاو لەدوای ڕیزی نوێژ بە تەنیایی

**١٣٢٧**- «عَنْ هِلاَلِ بْنِ يَسَافٍ، قَالَ: أَخَذَ بِيَدِي زِيَادُ بْنُ أَبِي الْجَعْدِ، فَأَقَامَنِي عَلَى شَيْخٍ مِنْ بَنِي أَسَدٍ يُقَالُ لَهُ: وَابِصَةُ بْنُ مَعْبَدٍ فَقَالَ: حَدَّثَنِي هَذَا - وَالرَّجُلُ يَسْمَعُ - أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَقَدْ صَلَّى خَلْفَهُ رَجُلٌ، وَلَمْ يَتَّصِلْ بِالصُّفُوفِ، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُعِيدَ الصَّلاَةَ»[٢].

واتە: لە هیلالی کوڕی یەسافەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زیادی کوڕی ئەبو جەعد دەستی گرتم و لای زانایێک دانیام پێی دەوترا وابیصەی کوڕی مەعبەد و وتی: ئەم پیاوە بۆی گێڕامەوە ـ پیاوەکەش گوێی لە قسەکان دەبوو ـ (ئەو پیاوە بۆی گێڕامەوە) کە پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە، پیاوێکیش نوێژی لەدوا دەکرد و بەڕیزەکانەوە نەلکابوو، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێ کرد کە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە.

**١٣٢٨** - «عَنْ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ، أَنَّ رَجُلاً صَلَّى خَلْفَ الصُّفُوفِ وَحْدَهُ، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُعِيدَ. قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: أَقُولُ بِهَذَا»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، ولكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە وابیصەی كوڕی مەعبەدەوە گێڕدراوەتەوە، كە پیاوێك نوێژی لەدوای ڕیزەكان كرد بە تەنیا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێ كرد كە دووبارەی بكاتەوە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: منیش كار بەو فەرموودەیە دەكەم.

١٣٢٩ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ ﷺ، أَنَّ جَدَّتَهُ مُلَيْكَةَ دَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِطَعَامٍ صَنَعَتْهُ، فَأَكَلَ، ثُمَّ قَالَ: قُومُوا فَلِأُصَلِّيَ بِكُمْ، قَالَ أَنَسٌ: فَقُمْتُ إِلَى حَصِيرٍ لَنَا قَدِ اسْوَدَّ مِنْ طُولِ مَا لُبِسَ، فَنَضَحْتُهُ بِمَاءٍ فَقَامَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ، وَصَفَفْتُ أَنَا وَالْيَتِيمُ وَرَاءَهُ، وَالْعَجُوزُ وَرَاءَنَا، فَصَلَّى لَنَا رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفَ»[١].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ گێڕدراوەتەوە، كە مولەیكەی داپیری، پێغەمبەری خوای ﷺ بانگ كرد بۆ خواردنێك كە دروستی كردبوو، (پێغەمبەری خواش ﷺ) خواردی، دواتر فەرمووی: هەڵسن با نوێژتان بۆ بكەم، ئەنەس دەڵێ: منیش هەڵسام بۆ لای حەسیرێكی خۆمان كە ڕەش بوو بوو لەبەر زۆر بەكارهێنان، جا بە ئاو ڕشاندم (تا نەرم و پاك بێتەوە) پێغەمبەری خواش ﷺ لەسەری وەستا (بۆ ئیمامەت)، من و یەتیمەكەش لە دواوەی وەستاین، داپیرەش لەدواوەی ئێمە وەستا، (جا پێغەمبەری خوا ﷺ) دوو ڕەكعەتی بۆ كردین، دواتر ڕۆیشت.

## بابەت: ئەندازەی خوێندنی قورئان لە نوێژی نیوەڕۆدا

١٣٣٠ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُومُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ قَدْرَ ثَلَاثِينَ آيَةً، وَفِي الْأُخْرَيَيْنِ عَلَى قَدْرِ النِّصْفِ مِنْ ذَلِكَ، وَفِي الْعَصْرِ عَلَى قَدْرِ الْأُخْرَيَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ، وَفِي الْأُخْرَيَيْنِ عَلَى قَدْرِ النِّصْفِ مِنْ ذَلِكَ»[٢].

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار لە دوو ڕەكعەتەكانی یەكەمی نیوەڕۆ بە ئەندازەی سی ئایەت دەوەستا، وە لە دوو ڕەكعەتەكانی كۆتایی بە ئەندازەی نیوەی ئەوە دەوەستا، وە لە (دوو ڕەكعەتەكانی یەكەمی) نوێژی عەسردا بە ئەندازەی دوو ڕەكعەتەكانی كۆتایی نوێژی نیوەڕۆ دەوەستا، وە لە دوو ڕەكعەتەكانی كۆتایی بە ئەندازەی نیوەی ئەوە دەوەستا.

١٣٣١ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، بِنَحْوِهِ وَزَادَ فِيهِ قَدْرَ قِرَاءَةِ: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ۝٢﴾ السجدة»[٣].

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە لە ڕێگایێكی تریشەوە، وەك فەرموودەكەی پێشوو، وە ئەوەندەشی زیاد كردوە (وتویەتی): بە ئەندازەی:﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ۝٢﴾، سوڕەتی سەجدە دەوەستا.

١٣٣٢ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِـ: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ۝١﴾ الطارق، ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ۝١﴾ البروج»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ لە نیوەڕۆ و عەسردا ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَٱلطَّارِقِ ۝١﴾، ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ۝١﴾ی دەخوێند.

## بابەت: چۆن کار دەکرێت بە خوێندنی قورئان لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر؟

١٣٣٣ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ بِأُمِّ الْقُرْآنِ وَبِسُورَتَيْنِ مَعَهَا فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ مِنْ صَلاَةِ الظُّهْرِ وَصَلاَةِ الْعَصْرِ، وَيُسْمِعُنَا الْآيَةَ أَحْيَانًا، وَكَانَ يُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێراویەتیەوە، کە پێغەمبەر ﷺ هەموو جار سورەتی فاتیحە و دوو سورەتیشی لەگەڵ دەخوێند لە دوو ڕەکعەتەکانی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسر، وە هەندێک جاریش ئایەتێکی گوێبیست دەکردین (تۆزێک بەرز دەیخوێند تا بزانین چی دەخوێنێ)، وە هەموو کات ڕەکعەتی یەکەمی درێژ دەکردەوە.

١٣٣٤ - «أخبرنا أَبُو عَاصِمٍ، عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ، عَنْ يَحْيَى بِإِسْنَادِهِ نَحْوَهُ»[2].

واتە: لەو ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده گێردراوەتەوە.

١٣٣٥ - «حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي قَتَادَةَ، أَنَّ أَبَاهُ ﷺ، حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الْأُولَيَيْنِ مِنْ صَلاَةِ الظُّهْرِ بِأُمِّ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ، وَفِي الْأُخْرَيَيْنِ بِأُمِّ الْكِتَابِ، وَكَانَ يُسْمِعُنَا الْآيَةَ، وَكَانَ يُطِيلُ الرَّكْعَةَ الْأُولَى مَا لاَ يُطِيلُ فِي الثَّانِيَةِ، وَهَكَذَا فِي صَلاَةِ الْعَصْرِ، وَهَكَذَا فِي صَلاَةِ الْغَدَاةِ»[3].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادەوە گێردراوەتەوە، کە باوکی ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ هەموو جار لە دوو ڕەکعەتەکانی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆدا فاتیحە و دوو سورەتی دەخوێند، وە لە دوو ڕەکعەتەکانی کۆتاییدا فاتیحەی دەخوێند، وە هەندێک جاریش ئایەتێکی گوێبیست دەکردین، وە ڕەکعەتی یەکەمی درێژ دەکردەوە بە جۆرێک هی دووەمی ئاوا بەو ئەندازەیە درێژ نەدەکردەوە، وە هەر بەو شێوەیە بوو لەنوێژی عەسردا، وە هەر بەو شێوەیەش بوو لە نوێژی بەیانیدا.

## بابەت: دەربارەی ئەندازەی خوێندنی قورئان لە نوێژی مەغریبدا

١٣٣٦ - «عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ، أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ ﷺ : يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالْمُرْسَلاَتِ»[4].

واتە: لە ئوممو فەضلەوە گێردراوەتەوە، کە گوێی لە پێغەمبەرﷺ بوو لە نوێژی مەغریبدا (المرسلات)ی دەخوێند.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

١٣٣٧ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ»[١].

واتە: لە موحەممەدی كوڕی جوبەیری كوڕی موطعیمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە  گێڕاویەتیەوە كە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو لە نوێژی مەغریبدا (الطور)ی دەخوێند.

## بابەت: ئەندازەی خوێندنی قوڕئان لە نوێژی عیشا

١٣٣٨ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ، أَنَّ مُعَاذًا  كَانَ يُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ يَأْتِي قَوْمَهُ فَيُصَلِّي بِهِمْ، فَجَاءَ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَصَلَّى الْعَتَمَةَ، وَقَرَأَ الْبَقَرَةَ، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَصَلَّى، ثُمَّ ذَهَبَ، فَبَلَغَهُ أَنَّ مُعَاذًا يَنَالُ مِنْهُ، فَشَكَا ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِمُعَاذٍ: فَاتِنًا، فَاتِنًا، فَاتِنًا،- أَوْ فَتَّانًا، فَتَّانًا، فَتَّانًا - ثُمَّ أَمَرَهُ بِسُورَتَيْنِ مِنْ وَسَطِ الْمُفَصَّلِ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: نَأْخُذُ بِهَذَا»[٢].

واتە: لە جابری كوڕی عەبدوڵڵا  گێڕدراوەتەوە، كە موعاذ  هەموو جار لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەكرد، دواتر دەچوو بۆ لای خزم و كەسەكانی و نوێژی بۆ دەكردن، جا شەوێكیان هات (بۆ لای خزم و كەسەكانی) و نوێژی عیشای كرد و سوڕەتی بەقەڕەی خوێند و پیاوێک لە ئەنصاریەكان هات و نوێژی دەست پێ كرد، دواتر (وازی هێنا) و ڕۆیشت، جا پێی گەیشتەوە كە موعاذ بە خراپی باسی كردوە (چونكە نوێژی پچڕاند بوو)، پیاوەكەش شكاتی ئەو بابەتەی برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ بە موعاذی فەرموو: بوویتە فیتنەچی فیتنەچی فیتنەچی ـ یان ـ بوویتە فیتنە فیتنە فیتنە، دواتر فەرمانی پێ كرد دوو سوڕەت لەو سوڕەتانە بخوێنێت كە زۆر فەصڵیان تێدایە (واتە: ئایەتەكانیان كورتن)، ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەو فەرموودەیە وەردەگرین و كاری پێ دەكەین.

## بابەت: ئەندازەی خوێندنی قوڕئان لە نوێژی بەیانیدا

١٣٣٩ - «عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ عَمِّي، يَقُولُ: إِنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَسَمِعَهُ يَقْرَأُ فِي إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ مِنَ الصُّبْحِ: ﴿ وَٱلنَّخْلَ بَاسِقَٰتٍ ﴾ ق، قَالَ شُعْبَةُ: وَسَأَلْتُهُ مَرَّةً أُخْرَى. قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقْرَأُ بِـ ق»[٣].

واتە: لە زیادی كوڕی عیلاقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە مامم بوو دەیووت: نوێژی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ كردوە و گوێی لێ بوو لە یەكێک لە ڕەكعەتەكانی نوێژی بەیانیدا:﴿ وَٱلنَّخْلَ بَاسِقَٰتٍ ﴾ی لە سوڕەتی قاف دەخوێند.

شوعبە وتویەتی: جارێكی تریان پرسیارم لێ كرد، وتی: گوێم لێ بوو (سوڕەتی قاف)ی دەخوێند.

١٣٤٠- «عَنْ قُطْبَةَ بْنِ مالِكٍ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ، يَقْرَأُ فِي الْفَجْرِ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى: ﴿ وَٱلنَّخْلَ بَاسِقَٰتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ﴾ ق»[٤].

---

١) ـ صحيح.

٢) ـ صحيح.

٣) ـ صحيح.

٤) ـ صحيح.

واتە: لە قوطبەی کوڕی مالیکەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە ڕەکعەتی یەکەمی نوێژی بەیانیدا:﴿ وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ ١٠ ﴾ی دەخوێند (کە بەشێکە لە سورەتی قاف).

١٣٤١ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ: ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ١﴾التكوير، فَلَمَّا انْتَهَى إِلَى هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ١٧ ﴾التكوير، جَعَلْتُ أَقُولُ فِي نَفْسِي: مَا اللَّيْلُ إِذَا عَسْعَسَ؟»[١].

واتە: لە عەمری کوڕی حورەیثەوە گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە نوێژی بەیانیدا:﴿ إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ١ ﴾ی دەخوێند، جا کاتێک گەیشتە ئەو ئایەتە: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ١٧ ﴾، من لە دڵی خۆم دەمووت: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ١٧ ﴾ واتا چی؟

تێبینی: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ١٧ ﴾ واتە: سوێند بەو شەوەی کە تاریک دادێت، یان ڕوون دەبێتەوەو، تاریکاییەکە پشت هەڵدەکات («عسعس» مانای هاتن و ڕۆیشت دەگەیەنێت).

١٣٤٢ - «أَخْبَرَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ، عَنِ الْوَلِيدِ عَنْ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ نَحْوِهِ»[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده لە عەمری کوڕی حورەیثەوە گێڕدراوەتەوە.

١٣٤٣ - «عَنْ سَيَّارِ بْنِ سَلَامَةَ، قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَبِي عَلَى أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﷺ وَهُوَ عَلَى عِلْوِيَةٍ مِنْ قَصَبٍ، فَسَأَلَهُ أَبِي عَنْ وَقْتِ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺفَقَالَ: كَانَ يُصَلِّي الْهَجِيرَ الَّتِي تَدْعُونَ الظُّهْرَةَ إِذَا دَحَضَتِ الشَّمْسُ، وَكَانَ يُصَلِّي الْعَصْرَ ثُمَّ يَنْطَلِقُ أَحَدُنَا إِلَى أَهْلِهِ فِي أَقْصَى الْمَدِينَةِ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ» قَالَ: وَنَسِيتُ مَا ذَكَرَ فِي الْمَغْرِبِ، وَكَانَ يَسْتَحِبُّ أَنْ يُؤَخِّرَ مِنْ صَلَاةِ الْعِشَاءِ الَّتِي تَدْعُونَ الْعَتَمَةَ، وَكَانَ يَنْصَرِفُ مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ وَالرَّجُلُ يَعْرِفُ جَلِيسَهُ، وَكَانَ يَقْرَأُ فِيهَا مِنَ السِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ»[٣].

واتە: لە یەساری کوڕی سەلامەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ باوکم چووم بۆ لای ئەبو بەرزەی ئەسلەمی ﷺ لە کاتێکدا لەسەر بەرزایی ئەستوندەیەک بوو، باوکم پرسیاری لێ کرد دەربارەی کاتی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش وتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناوەڕاستی ڕۆژدا نوێژی دەکرد ئەوەی پێی دەڵێن نیوەڕۆ، ئەو کاتەیە خۆر لایدەدا بۆ لای ڕۆژئاوا، وە نوێژی عەسریشی دەکرد، دواتر یەکێک لە ئێمە دەڕۆیشت بۆ لای خانەوادەکەی لەوپەڕی شاری مەدینە، هێشتاش خۆر هەر بەهێز بوو (واتە: نوێژی عەسری لەسەرەتای کاتی عەسر دەکرد)، (جا یەساری کوڕی سەلامە) وتویەتی: بیرم نەماوە ئەوەی باسی کرد دەربارەی نوێژی مەغریب، هەروەها پێی باش بوو نوێژی عیشا تاخیر بکات، ئەو نوێژەی ئێوە پێی دەڵێن: عەتەمە، هەروەها کۆتایی بە نوێژی بەیانی دەهێنا لە کاتێکدا پیاو

---

(١) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

کەسەکەی تەنیشتی خۆی دەناسیەوە (واتە: لە کاتی ڕووناکی لە نوێژی بەیانی دەبوویەوە)و شەست (٦٠) بۆ سەد (١٠٠) ئایەتی تیایدا دەخوێند.

## بابەت: خراپی سەیر کردنی ئاسمان و (شتی بەرز) لەناو نوێژدا

١٣٤٤ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَسْجِدَ وَقَدْ رَفَعُوا أَبْصَارَهُمْ فِي الصَّلاَةِ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: لَتَنْتَهُنَّ أَوْ لاَ تَرْجِعُ إِلَيْكُمْ أَبْصَارُكُمْ»[١].

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ مزگەوت لەکاتێکدا خەڵکی ناو مزگەوت چاوەکانیان بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوە لەناو نوێژدا، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: سوێند بە خوا یان واز دێنن لەو کارە یان بیناییتان بۆ ناگەڕێتەوە (خوا کوێرتان دەکات).

١٣٤٥ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فِي صَلاَتِهِمْ؟ فَاشْتَدَّ قَوْلُهُ فِي ذَلِكَ حَتَّى قَالَ: لَتَنْتَهُنَّ عَنْ ذَلِكَ أَوْ لَيَخْطَفَنَّ اللهُ أَبْصَارَكُمْ»[٢].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: خەڵکانێک بۆ کاری وا دەکەن چاویان بەرز دەکەنەوە بۆ ئاسمان لەناو نوێژدا؟ جا قسەی توند بوو دەربارەی ئەو بابەتە تا فەرمووی: سوێند بە خوا یان واز دەهێنن لەو کارە، یان خوا بیناییتان دەبات (کوێرتان دەکات).

## بابەت: جوڵەجوڵ لە ڕکوعدا

١٣٤٦ - «حَدَّثَنِي مُصْعَبُ بْنُ سَعْدٍ، قَالَ: كَانَ بَنُو عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ إِذَا رَكَعُوا، جَعَلُوا أَيْدِيَهُمْ بَيْنَ أَفْخَاذِهِمْ، فَصَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِ سَعْدٍ، فَصَنَعْتُهُ فَضَرَبَ يَدِي، فَلَمَّا انْصَرَفَ، قَالَ: يَا بُنَيَّ اضْرِبْ بِيَدَيْكَ رُكْبَتَيْكَ، ثُمَّ فَعَلْتُهُ مَرَّةً أُخْرَى بَعْدَ ذَلِكَ بِيَوْمٍ فَصَلَّيْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَضَرَبَ يَدِي، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: كُنَّا نَفْعَلُ هَذَا، وَأُمِرْنَا أَنْ نَضْرِبَ بالأَكُفِّ عَلَى الرُّكَبِ»[٣].

واتە: لە موصعەبی کوڕی سەعدەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: بنەماڵەی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ کاتێ ڕکوعیان دەبرد دەستەکانیان دەخستە نێوان ڕانەکانیان، جا نوێژم لە تەنیشت سەعد (باوکم) کردو ئاوام کرد (دەستم خستە نێوان ڕانەکانم لە ڕکوعدا)، ئەویش لە دەستی دام، جا کاتێک لە نوێژ تەواو بوو وتی: ئەی ڕۆڵەکەم دەستەکانت لەسەر ئەژنۆکانت دابنێ، دواتر پاش ڕۆژێک جارێکی تر وام کردەوە، نوێژم لە تەنیشت کرد، (هەمان شتم دووبارە کردەوە) ئەویش لە دەستی دام، جا کاتێک لە نوێژ تەواو بوو وتی: ئێمە ئاوا دەکەین و فەرمانمان پێ کراوە کە ناو لەپی دەست لەسەر ئەژنۆ دابنێین.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

١٣٤٧ - «حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ إِسْرَائِيلَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ مُصْعَبٍ، بِإِسْنَادِهِ نَحْوَهُ»(١).

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە لە موصعەبەوە گێڕدراوەتەوە.

١٣٤٨ - «عَنْ عَطَاء بن السَّائب عَنْ سَالِمٍ الْبَرَّادِ، قَالَ وَكَانَ عِنْدِي أَوْثَقَ مِنْ نَفْسِي قَالَ: قَالَ لَنَا أَبُو مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيُّ ﷺ: أَلاَ أُصَلِّي بِكُمْ صَلاَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَكَبَّرَ وَرَكَعَ، وَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، وَفَرَّجَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ حَتَّى اسْتَقَرَّ كُلُّ شَيْءٍ مِنْهُ»(٢).

واتە: عەطائی کوڕی سائیب لە سالمی بەڕرادەوە گێڕاویەتیەوە و وتویەتی: لەلای من سالم لەخۆم جێگای متمانەترە، (سالم) وتویەتی: ئەبو مەسعودی ئەنصاری ﷺ پێی وتین: ئایا نوێژی پێغەمبەری خواتان ﷺ بۆ نەکەم؟ (سالم) وتی: ئەبو مەسعود (اللّٰه أكبر)ی کرد و ڕکوعی برد و دوو دەستەکانی لەسەر دوو ئەژنۆکانی دانا و نێوانی خستە بەینی پەنجەکانی دەستی لە ڕکوعدا تاوەکو هەموو ئەندامێکی جێگیر بوو (بە ڕاستی و بێ جوڵە).

## بابەت: ئەوەی لە ڕکوعدا دەوترێت

١٣٤٩ - «ثنا موسى بن أيوب قال: حَدَّثَنِي عَمِّي إِيَاسُ بْنُ عَامِرٍ، قَالَ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ، يَقُولُ لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾الواقعة، قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ اجْعَلُوهَا فِي رُكُوعِكُمْ» فَلَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾ ﴾الأعلى، قَالَ: اجْعَلُوهَا فِي سُجُودِكُمْ»(٣).

واتە: موسای کوڕی ئەیوب وتویەتی: مامم ئیاسی کوڕی عامیر ﷺ بۆی گێڕامەوە، وتی: گوێم لە عوقبەی کوڕی عامیر بوو دەیووت: کاتێک ئایەتی: ﴿ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾، دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: بیخەنە ڕکوعەکانتان (لە ڕکوعدا بڵێن: سبحان ربي العظيم)، وە کاتێکیش ئایەتی: ﴿ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾، دابەزی، فەرمووی: بیخەنە کڕنووشەکانتان (لە کڕنووشدا بڵێن: سبحان ربي الأعلى).

١٣٥٠ - «عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَكَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ)، وَفِي سُجُودِهِ (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى) وَمَا أَتَى عَلَى آيَةِ رَحْمَةٍ إِلاَ وَقَفَ عِنْدَهَا فَسَأَلَ، وَمَا أَتَى عَلَى آيَةِ عَذَابٍ إِلاَ تَعَوَّذَ»(٤).

واتە: لە حوذەیفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە شەوێکیان نوێژی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد، لە ڕکوعەکەیدا دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ)، وە لە کڕنووشەکەشیدا دەیفەرموو: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى)، وە هیچ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٣) ـ ضعيف.

(٤) ـ صحيح.

ئایەتێكى ڕەحمەت نەبوو بەسەریدا تێپەڕێت حەتمەن لەسەرى دەوەستاو نزاى دەكرد (داواى دەكرد خوا پێى ببەخشێت)، وە هیچ ئایەتێكى سزا نەبوو بەسەریدا تێپەڕێت حەتمەن پەناى دەگرت.

## بابەت: دوورخستنەوەى باسكەكان (لە سك و سینگ و تەنیشتەكان) لەكاتى ڕكوعدا

**١٣٥١** - «عَنْ عَبَّاسِ بْنِ سَهْلٍ، قَالَ: اجْتَمَعَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ، وَأَبُو أُسَيْدٍ، وَأَبُو حُمَيْدٍ، وَسَهْلُ بْنُ سَعْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَ، فَذَكَرُوا صَلاَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَامَ فَكَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حِينَ كَبَّرَ لِلرُّكُوعِ، ثُمَّ رَكَعَ وَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ كَأَنَّهُ قَابِضٌ عَلَيْهِمَا، وَوَتَرَ يَدَيْهِ فَنَحَّاهُمَا عَنْ جَنْبَيْهِ، وَلَمْ يُصَوِّبْ رَأْسَهُ، وَلَمْ يُقْنِعْهُ»[1].

واتە: لە عەبباسى كوڕى سەهلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتى: موحەممەدى كوڕى مەسلەمەو ئەبو ئوسەیدو ئەبو حومەید و سەهلى كوڕى سەعد كۆبوونەوەو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَ)، وە باسى نوێژى پێغەمبەرى خوایان ﷺ كرد، ئەبو حومەید وتى: من لە هەمووتان زیاتر شارەزاى نوێژى پێغەمبەرى خوام ﷺ، (نوێژى پێغەمبەرى خوا ﷺ بەم جۆرە بوو) پێغەمبەرى خوا ﷺ هەڵسا و (اللّه أكبر)ى كردو دەستەكانى بەرز كردەوە، دواتر (جارێكى تر) دەستەكاتى بەرز كردەوە كاتێ (اللّه أكبر)ى كرد بۆ ڕكوع، دواتر ڕكوعى برد و دەستەكانى دانا لەسەر ئەژنۆكانى وەک ئەوەى ئەژنۆكانى گرتبێت، وە باسكەكانى وەک بەستەرى كەوان ڕاست كرد و لە تەنیشتەكانى دوورى خستەوە، هەروەها سەریشى نزم نەكرد و بەرزیشى نەكردەوە (بەڵكو ڕاست و ڕێک ڕایدەگرت و لەگەڵ پشتى ڕاستى دەكردەوە).

## بابەت: بێژەى دواى سەر بەرز كردنەوەى لە ڕكوعدا

**١٣٥٢** - «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلاَةَ، رَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، فَإِذَا رَكَعَ، فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، وَقَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، اللهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، وَلاَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السُّجُودِ»[2].

واتە: لە سالمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتى: هەموو جار پێغەمبەر ﷺ كاتێ دەستى بەنوێژ دەكرد، دەستەكانى بەرز دەكردەوە تا ڕاستى شانەكانى، وە كاتێ ڕكوعیشى دەبرد هەمان شتى دەكرد، وە كاتێ سەرى بەرز دەكردەوە لە ڕكوع هەمان شتى دەكرد و دەیووت: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، اللهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)، بەڵام لە كرنووشدا واى نەدەكرد (دەستى بەرز نەدەكردەوە).

**١٣٥٣** - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ. إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»[3].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەرى خواوە ﷺ هەمان فەرموودەى گێڕاوەتەوە، تەنها ئەوەندە نەبێ وتویەتى: (پێغەمبەرى خوا ﷺ دواى ئەوەى سەرى

---

(١) ـ صحيح.

(٢)ـ إسناده قوي، و الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

بەرز دەكردەوە لە ڕكوع دەيفەرموو): (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) (واتە: «اللهم»ی لەگەڵ باس نەكرد وەک فەرموودەكەی پێشەوە).

١٣٥٤ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: وَإِذَا قَالَ الْإِمَامُ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ»[1].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەويش لە پێغەمبەر ﷺ گێراوەتەوە، كە فەرموويەتی: ئەگەر هاتوو ئيمام وتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئێوەش بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ).

١٣٥٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ، فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ، فَارْكَعُوا، وَإِذَا سَجَدَ، فَاسْجُدُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، وَإِذَا صَلَّى قَائِمًا، فَصَلُّوا قِيَامًا، وَإِذَا صَلَّى جَالِسًا، فَصَلُّوا جُلُوسًا أَجْمَعُونَ»[2].

واتە: لە ئەبو هورەيرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتويەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتی: ئيمام تەنها بۆ ئەوە دانراوە تا بكرێتە پێشەنگ، بۆيە كاتێ (اللّٰه أكبر)ی كرد و (نوێژی دەست پێ كرد) ئێوەش ڕاستەوخۆ (اللّٰه أكبر) بكەن و (دەست بە نوێژ بكەن)، وە كاتێ ڕكوعی برد ئێوەش ڕكوع بەرن، وە كاتێ كڕنووشی برد ئێوەش كڕنووش بەرن، وەكاتێك وتی: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ئێوەش بڵێن: رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، وە ئەگەر نوێژی بە پێوە كرد ئێوەش بە پێوە نوێژ بكەن، وە ئەگەر نوێژی بە دانيشتەوە كرد، ئێوەش نوێژ بە دانيشتنەوە بكەن هەمووتان.

١٣٥٦ - «عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَطَبَنَا فَعَلَّمَنَا صَلاَتَنَا وَسَنَّ لَنَا سُنَّتَنَا - قَالَ: أَحْسَبُهُ قَالَ: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَلْيَؤُمَّكُمْ أَحَدُكُمْ، فَإِذَا كَبَّرَ، فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَالَ: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، فَقُولُوا: آمِينَ، يُجِبْكُمُ اللهُ. وَإِذَا كَبَّرَ وَرَكَعَ، فَكَبِّرُوا وَارْكَعُوا، فَإِنَّ الْإِمَامَ يَرْكَعُ قَبْلَكُمْ، وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ « قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: فَتِلْكَ بِتِلْكَ. وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ - أَوْ قَالَ: رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ»[3].

واتە: لە ئەبو موساوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتويەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داين و فێری نوێژی كردين و سوننەتی بۆ دامەزراندين، وتی: پێم وايە فەرمووی: كاتێ قامەت بۆ نوێژ كرا با يەكێک لە ئێوە پێشنوێژيتان بۆ بكات، جا كاتێ (اللّٰه أكبر)ی كرد و (نوێژی دەست پێ كرد) ئێوەش ڕاستەوخۆ (اللّٰه أكبر) بكەن و (دەست بە نوێژ بكەن)، وە كاتێ وتی: ﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾، ئێوەش بڵێن: ئامين، خوا قبوڵی دەكات، وە كاتێ (اللّٰه أكبر)ی كرد و ڕكوعی برد، ئێوەش (اللّٰه أكبر) بكەن و ڕكوع ببەن، چونكە ئيمام پێشی ئێوە ڕكوع دەبات و پێشی ئێوەش بەرز دەبێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

فەرمووی: ئەو تاخیربوونەتان بۆ چوونە ڕکوع بەو تاخیر هەڵسانەوەتان لە ڕکوع پڕ دەبێتەوە (واتە: ئەندازەی ڕکوعی ئێوە و ڕکوعی ئیمام وەکو یەکە، چونکە هەر چەندە ئێوە تاخیرتر بچن بۆ ڕکوع هەر بەو ئەندازەیەش تاخیرتر هەڵدەستنەوە)، وە کاتێ ئیمام وتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئێوەش بڵێن: (اللهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)، یاخود فەرمووی بڵێن: (رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)، خوای زاڵی پایەدار لەسەر زمانی پێغەمبەرەكەی ﷺ فەرموویەتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) واتە: خوا عیبادەت و حەمدو سەنای كەسێک قبوڵ دەكات كە ستاییشی بكات.

١٣٥٧ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، قَالَ: رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ، أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ، وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ، اللهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ»[١].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺگێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەری لە ڕكوع بەرز دەكردەوە دەیفەرموو: (رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ، أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ، وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ، اللهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ) واتە: ئەی پەروەردگارمان سوپاس و ستایش بۆ تۆ، پڕ بە ئاسمانەكان و پڕ بە زەوی و پر بە ئەندازەی هەر شتێكی تریش كە تۆ دەتەوێت جگە لە زەوی و ئاسمانەكان، ئەی خاوەن سوپاس و بەرزی، شیاوترین شت كە بەندە بیڵێ، (ئەوەیە كە بڵێت): ئەی خوایە هەموومان بەندەی تۆین، خوایە هیچ ڕێگرێک نیە لە بەردەم ئەو شتەی كە تۆ دەیبەخشی، وە هیچ بەخشەرێک نیە بۆ ئەو شتەی تۆ دەیگریتەوە و نایبەخشیت، وە هیچ دارایيەک سودی بۆ خاوەنەكەی نابێت لە سزای تۆ.

١٣٥٨ - «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ وَمِلْءَ مَا بَيْنَهُمَا، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ»[٢].

واتە: لە عەلی كوڕی ئەبو طالیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ سەری بەرز دەكردەوە لە ڕكوع دەیفەرموو: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ وَمِلْءَ مَا بَيْنَهُمَا، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ) واتە: خوا وەڵامی كەسێک دەداتەوە كە ستاییشی بكات، ئەی پەروەردگارمان سوپاس و ستایش بۆ تۆ، پڕ بە ئاسمانەكان و پڕ بە زەوی و پر بە نێوانی زەوی و ئاسمان و پر بە ئەندازەی هەر شتێكی تریش كە تۆ دەتەوێت جگە لە زەوی و ئاسمانەكان.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.




## بابەت: نەهی کردن لە پێشکەوتنەوەی ئیمام لە ڕکوع و سوجدەدا

**١٣٥٩** - «عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنِّي قَدْ بَدَّنْتُ فَلاَ تَسْبِقُونِي بِالرُّكُوعِ، وَلاَ بِالسُّجُودِ فَإِنِّي مَهْمَا أَسْبِقُكُمْ حِينَ أَرْكَعُ، تُدْرِكُونِي حِينَ أَرْفَعُ، وَمَهْمَا أَسْبِقُكُمْ حِينَ أَسْجُدُ، تُدْرِكُونِي حِينَ أَرْفَعُ»[1].

واتە: لە موعاویەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من تەمەنم گەورە بووە (تۆزێک بە هێواشی هەڵدەستم و دادەبەزم لە نوێژدا) پێشم مەکەون لە ڕکوع و کڕنووشدا، چونکە من هەر چەندێک لە پێشی ئێوەبم کاتێ ڕکوع دەبەم، ئێوە هەر پێم دەگەنەوە کاتێ بەرز دەبمەوە (لە ڕکوعدا)، وە هەر چەندێک لە پێشتان بم کاتێ کڕنووش دەبەم، ئێوە هەر پێم دەگەنەوە کاتێ بەرز دەبمەوە لە کڕنووشدا (کەواتە: پەلەی چیتانە پەلە مەکەن).

**١٣٦٠** - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَمَا يَخْشَى أَحَدُكُمْ أَوْ أَلاَ يَخْشَى أَحَدُكُمْ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ، أَنْ يَجْعَلَ اللهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ أَوْ صُورَتَهُ صُورَةَ حِمَارٍ؟»[2].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی زیادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیووت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا کەسێک لە ئێوە ناترسێت کاتێ سەری بەرز دەکاتەوە (لە ڕکوع و کڕنووشدا) پێشی ئیمام لەوەی خوا سەری بکات بە سەری گوێدرێژ یان وێنەی بکات بە وێنەی گوێدرێژ؟!

**١٣٦١** - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مالَكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حَثَّهُمْ عَلَى الصَّلاَةِ وَنَهَاهُمْ أَنْ يَسْبِقُوهُ إِذَا كَانَ يَؤُمُّهُمْ بِالرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ وَأَنْ يَنْصَرِفُوا قَبْلَ انْصِرَافِهِ مِنَ الصَّلاَةِ، وَقَالَ: إِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ خَلْفِي وَأَمَامِي»[3].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ هانی داون لەسەر نوێژ کردن و نەهی لێ کردوون لەوەی پێشی بکەون لە ڕکوع و کڕنووشدا کاتێ ئیمامەتیان بۆ دەکات، وە نەهیشی لێ کردوون لەوەی کۆتایی بە نوێژ بهێنن پێش کۆتایی پێ هێنانی (پێغەمبەری خوا ﷺ) لە نوێژدا (واتە: نەهی کردوە لەوەی پێشی بکەون لە سەلام دانەوە)، وە فەرمووی: من دەتان بینم لە دواوەم و لە پێشەوەم.

## بابەت: کڕنووش بردن لەسەر حەوت ئێسقان و چۆنیەتی جێبەجێ کردنی کڕنووش

**١٣٦٢** - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أُمِرَ نَبِيُّكُمْ أَنْ يَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ، وَأُمِرَ أَنْ لاَ يَكُفَّ شَعَرًا وَلاَ ثَوْبًا» قَالَ شُعْبَةُ: وَحَدَّثَنِيهِ مَرَّةً أُخْرَى قَالَ: أُمِرْتُ بِالسُّجُودِ وَلاَ أَكُفُّ شَعَرًا وَلاَ ثَوْبًا»[4].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەرەکەتان فەرمانی پێکراوە کە کڕنووش ببات لەسەر حەوت ئێسقان، هەروەها فەرمانی پێکراوە کە قژ و جل و بەرگ نەپێچێتەوە (لە ناو نوێژدا).

شوعبە دەڵێ: جارێکی تر بۆی گێرامەوە وتی: فەرمانم پێکراوە بە کڕنووش و بەوەی کە قژ و جل و بەرگ نەپێچمەوە.

١٣٦٣ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ: الْجَبْهَةِ - قَالَ وُهَيْبٌ: وَأَشَارَ بِيَدِهِ إِلَى أَنْفِهِ - وَالْيَدَيْنِ وَالرُّكْبَتَيْنِ، وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ، وَلاَ نَكُفُّ الثِّيَابَ وَلاَ الشَّعَرَ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: فەرمانم پێکراوە کە کڕنووش ببەم لەسەر حەوت ئێسقان: نەوچەوان و ـ وهەیب وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستیشی ئاماژەی بۆ لوتی کرد (واتە: لوتیش لەگەڵ نەوچەواندایە) ـ دوو دەستەکان و دوو ئەژنۆکان و سەرە پەنجەی دوو قاچەکان، هەروەها فەرمانم پێکراوە جل و بەرگ و قژ نەپێچینەوە.

## بابەت: یەکەم ئەندام لە مرۆڤدا کە دەکەوێتە سەر زەوی کاتێ دەیەوێت کڕنووش بەرێت

١٣٦٤ - «عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ ﷺ، قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: إِذَا سَجَدَ، يَضَعُ رُكْبَتَيْهِ قَبْلَ يَدَيْهِ، وَإِذَا نَهَضَ رَفَعَ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ»[٢].

واتە: لە وائیلی کوڕی حوجر ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کە کڕنووشی دەبرد ئەژنۆکانی پێشی دەستەکانی دادەنا، وە کاتێکیش هەڵدەستایەوە دەستەکانی بەرز دەکردەوە پێش ئەژنۆکانی.

١٣٦٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ، فَلاَ يَبْرُكْ كَمَا يَبْرُكُ الْبَعِيرُ، وَلْيَضَعْ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ» قِيلَ لِعَبْدِ اللَّهِ: مَا تَقُولُ؟ قَالَ: كُلُّهُ طَيِّبٌ. وَقَالَ: أَهْلُ الْكُوفَةِ يَخْتَارُونَ الْأَوَّلَ»[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێک لە ئێوە نوێژی کرد با دانەبەزێت چۆن وشتر دادەبەزێت، (بەڵکو) با دەستەکانی دابنێت پێشی ئەژنۆکانی.

بە عەبدوڵلا وترا: چی دەڵێی (دەربارەی ئەو فەرموودە)؟ وتی: هەمووی هەر چاکە، هەروەها وتی: خەڵکی کوفە فەرموودەی یەکەم هەڵدەبژێرن (کار بە فەرموودەی یەکەم دەکەن، کە فەرمان دەکات بەوەی ئەژنۆ پێشی دەست دابنرێت).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ حسن.

تێبینی: زۆرێک لە زانایان دەفەرموون ئەم فەرموودەیە مەقلوبە، واتە: ڕاویەکە لە جیاتی ئەوەی بڵێت: ((کاتێك یەکێک لە ئێوە نوێژی کرد با دانەبەزێت چۆن وشتر دادەبەزێت، (بەڵکو) با ئەژنۆکانی دابنێت پێشی دەستەکانی)) بەڵام ڕاویەک لە ڕاویەکان بە هەڵە جێگای دوو وشەی لێ گۆڕاوە. والله أعلم.

## بابەت: نەهی کردن لە ڕاخستنی ئانیشک و دەنوکدان لە زەوی وەک قەلە ڕەش (لە کاتی کڕنووشدا)

١٣٦٦ - «عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مالَكٍ ﷺ، يَقُولُ، قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: اعْتَدِلُوا فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ، وَلاَ يَبْسُطْ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيْهِ بِسَاطَ الْكَلْبِ»[١].

واتە: لە قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ بوو دەیووت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕاست و ڕێک بن لە ڕکوع و کڕنووشداو با هیچ کەسێکیش لە ئێوە باسکەکانی ڕانەخات (لەسەر زەوی) وەک ڕاخستنی (باسکی) سەگ (کە باسکەکانی دادەنێت).

١٣٦٧ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شِبْلٍ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ عَنِ افْتِرَاشِ السَّبُعِ، وَنَقْرَةِ الْغُرَابِ، وَأَنْ يُوطِنَ الرَّجُلُ الْمَكَانَ كَمَا يُوطِنُ الْبَعِيرُ»[٢].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی شیبلی ئەنصاریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە (ڕاخستنی باسکەکان) وەک ڕاخستنی دڕندەکان، هەروەها نەهی کردوە لە بە پەلە کڕنووش بردن وەک دەنوکدانی قەلەڕەش لە زەوی، هەروەها نەهی کردوە لەوەی مرۆڤ خوو بە شوێنیکەوە بگرێت (بۆ نوێژ کردن) وەک چۆن وشتر خوو بە شوێنێکەوە دەگرێت.

## بابەت: گۆتەی نێوان دوو سەجدەکان

١٣٦٨- «عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ: رَبِّ اغْفِرْ لِي» فَقِيلَ لِعَبْدِ اللّٰهِ: تَقُولُ هَذَا؟ قَالَ: رُبَّمَا قُلْتُ، وَرُبَّمَا سَكَتُّ»[٣].

واتە: لە حوذەیفەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەموو جار لە نێوان دوو سەجدەکاندا دەیفەرموو: (رَبِّ اغْفِرْ لِي) خوایە لێم خۆشبە، جا بە عەبدوڵلا وترا: تۆ ئەوە دەڵێی؟ وتی: هەندێ جار وتومەو هەندێ جاریش بێ دەنگ بووم و نەموتووە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ حسن.

## بابەت: نەهی كردن لە خوێندنی قورئان لە ڕكوع و كڕنووشدا

١٣٦٩ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَشَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ السِّتَارَةَ - وَالنَّاسُ صُفُوفٌ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ - فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ، يَرَاهَا الْمُسْلِمُ أَوْ تُرَى لَهُ، أَلاَ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا، فَأَمَّا الرُّكُوعُ، فَعَظِّمُوا رَبَّكُمْ، وَأَمَّا السُّجُودُ، فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ، فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پەردەكەی لادا (لە كاتی نەخۆشی وەفاتیدا)، خەڵكیش ڕیز ببوون لە دوای ئەبوبەكر (تا پێشنوێژیان بۆ بكات)، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەی خەڵكینە هیچ لە موژدەی پێغەمبەرایەتی نەماوە تەنها خەونی ڕاست و چاك نەبێت، كە كەسی مسوڵمان دەیبینێت، یان پێوەی دەبینرێت، بزانن من نەهیم لێ كراوە (لێم قەدەغە كراوە) كە قورئان لە حاڵەتی ڕكوع، یان لە حاڵەتی كڕنووش بخوێنم، هەرچی ڕكوعە ئەوە پەروەردگارتان تیایدا بە گەورە بگرن (بڵێن: سبحان ربي العظيم)، وە هەرچی كڕنووشیشە هەوڵبدەن زۆر دووعاو نزا بكەن، چونكە شایستەترین كاتە كە وەڵامی نزاكانتان بدرێتەوە.

١٣٧٠ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ وَأَنَا رَاكِعٌ أَوْ سَاجِدٌ، فَأَمَّا الرُّكُوعُ، فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ، وَأَمَّا السُّجُودُ، فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ، فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من نەهیم لێكراوە (لێم قەدەغە كراوە) كە قورئان بخوێنم لە كاتێكدا كە لە ڕكوعدام یان لە كڕنووشدام، هەرچی ڕكوعە ئەوە تیایدا پەروەردگار بە گەورە بگرن (بڵێن: سبحان ربي العظيم)، وە هەرچی كڕنووشیشە هەوڵ بدەن زۆر دووعا و نزا بكەن، چونكە شایستەترین كاتە كە وەڵامی نزاكانتان بدرێتەوە.

## بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی كە ڕكوع و كڕنووش بە تەواوی ئەنجام نادات

١٣٧١ - «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لاَ تُجْزِئُ صَلاَةٌ لاَ يُقِيمُ الرَّجُلُ فِيهَا صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ»[٣]

واتە: لە ئەبو مەسعودەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ نوێژێك دروست نابێت و بەرناكەوێت كە پیاو تیایدا پشتی ڕاست نەكاتەوە لە ڕكوع و كڕنووشدا.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ صحيح.

١٣٧٢ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَسْوَأُ النَّاسِ سَرِقَةً الَّذِي يَسْرِقُ صَلاَتَهُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَكَيْفَ يَسْرِقُ صَلاَتَهُ؟ قَالَ: لاَ يُتِمُّ رُكُوعَهَا وَلاَ سُجُودَهَا»[١].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی ئەبو قەتادەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خراپترینی خەڵكی لە ڕووی دزیەوە (دزترینی خەڵكی) ئەو كەسەیە كە نوێژەكەی دەدزێت، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن نوێژی دەدزرێت؟ فەرمووی: نە ڕكوع و نە كڕنووشی بە تەواوی ئەنجام نادات.

١٣٧٣ - «عن علي بن يحيى بن خلاد، عن أبيه، عَنْ عَمِّهِ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ، وَكَانَ رِفَاعَةُ وَمَالِكٌ ابْنَيْ رَافِعٍ أَخَوَيْنِ مِنْ أَهْلِ بَدْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهما قَالُوا: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ حَوْلَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ- أَوْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ وَنَحْنُ حَوْلَهُ، شَكَّ هَمَّامٌ- إِذْ دَخَلَ رَجُلٌ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَصَلَّى، فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ، جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَعَلَى الْقَوْمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: وَعَلَيْكَ، ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ» فَرَجَعَ الرَّجُلُ فَصَلَّى، وَجَعَلْنَا نَرْمُقُ صَلاَتَهُ، لاَ نَدْرِي مَا يَعِيبُ مِنْهَا، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَعَلَى الْقَوْمِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: وَعَلَيْكَ، ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ، قَالَ هَمَّامٌ: فَلاَ أَدْرِي أَمَرَهُ بِذَلِكَ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا. قَالَ الرَّجُلُ: مَا أَلَوْتُ، فَلاَ أَدْرِي مَا عِبْتَ عَلَيَّ مِنْ صَلاَتِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّهَا لاَ تَتِمُّ صَلاَةُ أَحَدِكُمْ حَتَّى يُسْبِغَ الْوُضُوءَ كَمَا أَمَرَهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ، فَيَغْسِلُ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، وَيَمْسَحُ بِرَأْسِهِ، وَرِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ اللَّهَ وَيَحْمَدُهُ ثُمَّ يَقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا أَذِنَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ لَهُ فِيهِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ فَيَرْكَعُ فَيَضَعُ كَفَّيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ وَتَسْتَرْخِيَ، وَيَقُولُ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَيَسْتَوِي قَائِمًا حَتَّى يُقِيمَ صُلْبَهُ فَيَأْخُذَ كُلُّ عَظْمٍ مَأْخَذَهُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ فَيَسْجُدُ فَيُمَكِّنُ وَجْهَهُ - قَالَ هَمَّامٌ: وَرُبَّمَا قَالَ: جَبْهَتَهُ - مِنَ الْأَرْضِ حَتَّى تَطْمَئِنَّ مَفَاصِلُهُ وَتَسْتَرْخِيَ، ثُمَّ يُكَبِّرُ، فَيَسْتَوِي قَاعِدًا عَلَى مَقْعَدِهِ وَيُقِيمُ صُلْبَهُ فَوَصَفَ الصَّلاَةَ هَكَذَا أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ حَتَّى فَرَغَ،لاَ تَتِمُّ صَلاَةُ أَحَدِكُمْ حَتَّى يَفْعَلَ ذَلِكَ»[٢].

واتە: عەلی كوڕی یەحیای كوڕی خەللاد لە باوكی و مامیەوە گێڕاویەتیەوە ـ ڕیفاعە و مالیک هەردووكیان كوڕی ڕافیع بوون، برابوون لە بەشداربوانی بەدریش بوون (رَضِيَ اللهُ عَنْهما)، ـ وتویانە: لە كاتێكدا ئێمە لەدەورەی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، یان (وتیان): (لە كاتێكدا) پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو ئێمەش لەدەورەی بووین (هەممام لە نێوان ئەو دوو ڕستەیە گومانی هەیە كامیانی وت)، لەناكاو پیاوێک هاتە ژوورەوە (بۆ مزگەوت) و ڕووی كردە قیبلە (ڕووگە) و نوێژی كرد، (دواتر) هات و سەلامی لە پێغەمبەری خوا ﷺو خەڵكەكە كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (سەلام) لەسەر تۆش بێت، بگەڕێوە و نوێژ بكە، چونكە تۆ نوێژت نەكرد، پیاوەكەش گەڕایەوەو نوێژی كرد، ئێمەش بەین بەینە بە تیكە چاوێک سەیری نوێژەكەیمان دەكردو نەمان دەزانی چ عەیبێک و خەلەلێكی تیایە، جا دوای ئەوەی نوێژەكەی تەواو كرد هات و سەلامی لە پێغەمبەری خوا ﷺو خەڵكەكە كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: (سەلام) لەسەر تۆش بێت، بگەڕێوە و نوێژ بكە، چونكە تۆ نوێژت نەكرد.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

هەممام دەڵێ: نازانم دوو جار یان سێ جار بوو فەرمانی بەوە پێ کرد.

پیاوەکە وتی: کەمتەرخەمیم نەکردوە، نازانم عەیبت لە چ شتێکی نوێژەکەم گرتووە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بە دڵنیایی نوێژی هیچ کامێک لە ئێوە تەواو نابێت (دانامەزرێت) تاوەکو دەستنوێژ بە جوانی نەشۆرێت، وەک خوا فەرمانی پێ کردوە، (بەوەی) ڕوخسارو دەست و باسکەکانی بشۆرێت تا ئانیشک، هەروەها سەری مەسح بکات و پێیەکانی تا گۆزینگەکانی (بشۆرێت)، دواتر (پاشی دەستنوێژ دەست بە نوێژ بکات) اللَّه أكبر بکات و ستاییشی بکات (بە سورەتی فاتیحە)، دواتر ئەوەندە لە قورئان بخوێنێت کە خوا ئیزنی پێ داوە، دواتر اللَّه أكبر بکات و ڕکوع ببات و ناو لەپی دەستەکانی لەسەر ئەژنۆکانی دابنێت و (بمێنێتەوە) تاوەکو جومگەکان دەوەستن و ئارام دەبنەوە (لە جوڵە دەکەون) و (لەو حاڵەتە) دەڵێت: سمع الله لمن حمده، دواتر هەڵدەستێتەوە تاوەکو پشتی ڕاست دەبێتەوە و هەر ئێسقانێک دەچێتەوە حاڵەت و شوێنی خۆی، دواتر اللَّه أكبر دەکات و کڕنووش دەبات و جوان ڕوخساری قایم دەکات ـ هەممام دەڵێ ڕەنگە وتبێتی: نێوچاوانی (قایم دەکات)، لە زەویەکە، تاوەکو هەموو جومگەکانی دەوەستن و ئارام دەبنەوە، دواتر اللَّه أكبر دەکات و ڕاست دەبێتەوە بە دانیشتنەوە، لە شوێنی دانیشتنەکەی و پشتی ڕاست دەکاتەوە.

جا چوار جار باسی نوێژی کرد بەو شێوەیە تا لێبوویەوە، واتر فەرمووی: نوێژی هیچ یەکێک لە ئێوە تەواو نابێت تا ئاوا نەکات.

تێبینی: لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ خەلەل و عەیبی نوێژەکەی پیاوەکەی باس نەکرد، بەڵکو باسی تەواوی نوێژی کرد، تاوەکو ئەو کەسانەی لەوێشن هەر عەیبێکی تریان هەبێت ئەوانیش چاکی بکەن و پیاوەکەش عەیبی خۆی دەدۆزێتەوە.

## بابەت: دوورخستنەوەی (باسکەکان) لە کڕنووشدا

**١٣٧٤ - «عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا سَجَدَ جَافَى، حَتَّى يَرَى مَنْ خَلْفَهُ، وَضَحَ إِبِطَيْهِ»**[١].

واتە: لە مەیمونەی کچی حاریثەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کڕنووشی دەبرد (باسکەکانی) دووردەخستەوە، تاوەکو ئەو کەسەی لە پشتی بووایە سپیایی بن هەنگڵەکانی دەبینی.

**١٣٧٥ - «عَنْ مَيْمُونَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا سَجَدَ، جَافَى حَتَّى لَوْ شَاءَتْ بَهْمَةٌ تَمُرُّ تَحْتَهُ لَمَرَّتْ»**[٢].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

واتە: لە مەیمونەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کڕنووشی دەبرد (باسکەکانی) دووردەخستەوە، تاوەکو ئەگەر بەرخۆڵەیەک بیویستایە بەژێریدا بڕوات ئەوە دەڕۆیشت (دەیتوانی بڕوات، ئەوەندە کەلێنەی دروست دەکرد).

تێبینی: ئەوە لەو حاڵەتەی ئەگەر بە تەنیا نوێژی کرد، یان مەجال هەبوو ئنجا ئاوا دەکات، بەڵام نابێت ئاوا بکات ئەگەر بزانێت جێگا لە خەڵکی تەنگ دەکات یان مەجالەکە زۆر نیە یان ئەزیەتی خەڵکی دەدات لە نوێژی بەکۆمەڵ بە هۆی ئەم کارەی.

١٣٧٦ - «عَنْ مَيْمُونَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺإِذَا سَجَدَ، خَوَّى بِيَدَيْهِ - يَعْنِي: جَنَّحَ - حَتَّى يُرَى وَضَحُ إِبْطَيْهِ مِنْ وَرَائِهِ، وَإِذَا قَعَدَ اطْمَأَنَّ عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى»[1].

واتە: لە مەیمونەی خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کڕنووشی دەبرد سکی لە زەویەکە دوور دەخستەوە و باسکەکانیشی لە تەنیشتەکانی دووردەخستەوە، تاوەکو سپیایی بن هەنگڵەکانی دەبینرا لە دواوە، هەروەها کاتێ دادەنیشت (بۆ تەحیات، یان لە نێوان دوو سەجدەکان) بێ جوڵەو ئارام دەبوو لەسەر ڕانی چەپی (دادەنیشت).

## بابەت: پێغەمبەر ﷺ ئەندازەی چەند دەمایەوە دوای ئەوەی سەری بەرز دەکردەوە؟

١٣٧٧ - «عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى، حَدَّثَنِي الْبَرَاءُ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺكَانَ رُكُوعُهُ إِذَا رَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، وَسُجُودُهُ، وَبَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، قَرِيباً مِنَ السَّوَاءِ»[2].

واتە: لە ئیبنو ئەبی لەیلاوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بەڕراء ﷺ بۆی گێڕامەوە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ ڕکوعی دەبرد، هەروەها کاتێ سەری بەرز دەکردەوە لە ڕکوع و، هەروەها کڕنووشەکانیشی، هەروەها نێوانی دوو کڕنووشەکانیشی وەکو یەکتری بوون و ئەندازەی مانەوەکەی لە یەکتریەوە نزیک بوو.

١٣٧٨ - «عَنِ الْبَرَاءِ ﷺ، قَالَ: رَمَقْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي صَلَاتِهِ فَوَجَدْتُ قِيَامَهُ، وَرَكْعَتَهُ، وَاعْتِدَالَهُ بَعْدَ الرَّكْعَةِ، فَسَجْدَتَهُ، فَجِلْسَتَهُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، فَسَجْدَتَهُ، وجِلْسَتَهُ بَيْنَ التَّسْلِيمِ وَالِانْصِرَافِ، قَرِيباً مِنَ السَّوَاءِ»[3].

واتە: لە بەڕرائەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: سەیری پێغەمبەری خوام ﷺ کرد لە نوێژەکەیدا، بینیم وەستانی (بۆ قورئان خوێندن لە نوێژدا)، هەروەها ڕەکعەتەکەی و ڕاست بوونەوەی دوای ڕەکعەت و کڕنووشی (یەکەمی) و دانیشتنی لە نێوان دوو کڕنووشەکاندا و کڕنووشی (دووەمی) و دانیشتنی لە نێوان (تەحیات) و سەلام دانەوە و تەواو بوونی، نزیک بوون لە یەکتری.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: چۆنیەتی (ئەنجامدانی نوێژ) دەربارەی کەسێک کە پێشی کەوتوون و (تاخیر بووە) لە بەشێک لە نوێژدا

١٣٧٩ - «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، وَحَمْزَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، أَنَّهُمَا: سَمِعَا الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ، يُخْبِرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَقْبَلَ وَأَقْبَلَ مَعَهُ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ حَتَّى وَجَدُوا النَّاسَ قَدْ أَقَامُوا الصَّلاَةَ - صَلاَةَ الْفَجْرِ - وَقَدَّمُوا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ يُصَلِّي بِهِمْ، فَصَلَّى بِهِمْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ رَكْعَةً مِنْ صَلاَةِ الْفَجْرِ قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَفَّ مَعَ النَّاسِ وَرَاءَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ، فَلَمَّا سَلَّمَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ، قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ صَلَّى، فَفَزِعَ النَّاسُ لِذَلِكَ، وَأَكْثَرُوا التَّسْبِيحَ، فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلاَتَهُ، قَالَ لِلنَّاسِ: قَدْ أَصَبْتُمْ أَوْ قَدْ أَحْسَنْتُمْ»[١].

واتە: لە عورِوەی کوڕی موغیرەو حەمزەی کوڕی موغیرەوە گێردراوەتەوە، کە هەردووکیان گوێیان لە موغیرەی کوڕی شوعبە بووە، هەواڵی داوە و وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات و ڕووی کردە مزگەوت (تاخیر ببوو)، موغیرەی کوڕی شوعبەش لەگەڵ ئەو هات و ڕووی کردە مزگەوت تا بینیان نوێژ دەست پێکراوە، نوێژی بەیانیە، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفیشیان پێش خستووە نوێژیان بۆ دەکات، جا عەبدوڕڕەحمان ڕەکعەتێکی لە نوێژی بەیانی بۆ کردبوون پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت و (ئامادە بێت)، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ هات و لەگەڵ خەڵکی ڕیز بوو لەدوای عەبدوڕڕەحمان لە ڕەکعەتی دووەمدا، جا کاتێک عەبدوڕڕەحمانی سەلامی دایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا و نوێژی تەواو کرد، خەڵکیش ترسان لەبەر ئەو کارە و (سبحان الله)یان زۆر کرد، جا کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژەکەی بوویەوەو تەواو بوو، بە خەڵکی فەرموو: پێکاتان یان باشتان کرد (لەوەی نوێژەکەتان دەست پێ کردووە).

١٣٨٠ - «عَنْ حَمْزَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ قَالَ: فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَوْمِ وَقَدْ قَامُوا إِلَى الصَّلاَةِ يُصَلِّي بِهِمْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ وَقَدْ رَكَعَ بِهِمْ، فَلَمَّا أَحَسَّ بِالنَّبِيِّ ﷺذَهَبَ يَتَأَخَّرُ، فَأَوْمأَ إِلَيْهِ بِيَدِهِ، يَصَلِّي بِهِمْ، فَلَمَّا سَلَّمَ، قَامَ النَّبِيُّ ﷺوَقُمْتُ، فَرَكَعْنَا الرَّكْعَةَ الَّتِي سُبِقْنَا، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: أَقُولُ فِي الْقَضَاءِ بِقَوْلِ أَهْلِ الْكُوفَةِ: أَنْ يَجْعَلَ مَا فَاتَهُ مِنَ الصَّلاَةِ قَضَاءً»[٢].

واتە: لە حەمزەی کوڕی موغیرەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە (موغیرەی کوڕی شوعبەوە) گێراویەتیەوە وتویەتی: گەیشتینە لای خەڵکەکە لە کاتێکدا نوێژیان دەست پێ کردبوو، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف نوێژی بۆ دەکردن و ڕەکعەتێکی پێ کردبوون، جا کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی پێ کرد (نوێژ دەست پێ کراوە) ڕۆیشت (بۆ مزگەوت) تاخیر ببوو، (جا کاتێک گەیشتە ناویان) بە دەستی ئاماژەی بۆ عەبدوڕڕەحمان کرد نوێژیان بۆ بکات و (بەردەوام بێت و بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نەیەتە

---

(١) ـ ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

دواوە)، جا کاتێک عەبدوڕڕەحمان سەلامی دایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا (بۆ ڕەکعەتی دووەم) و منیش هەڵسام و ئەو ڕەکعەتەمان کرد کە دوا کەوتبووین.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: دەربارەی قەزاکردنەوە قسەی ئەهلی کوفە دەکەم: کە (نوێژخوێن) ئەوەی لێی فەوتاوە لە نوێژدا بیکاتە قەزا و بیگێڕێتەوە.

## بابەت: ڕێگەدان بە کڕنووش بردن لەسەر جل و بەرگ لە گەرما و سەرمادا

**١٣٨١ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ كُنَّا نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي شِدَّةِ الْحَرِّ، فَإِذَا لَمْ يَسْتَطِعْ أَحَدُنَا أَنْ يُمَكِّنَ جَبْهَتَهُ مِنَ الْأَرْضِ، بَسَطَ ثَوْبَهُ فَصَلَّى عَلَيْهِ»(١).**

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە نوێژمان دەکرد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لەبەر گەرمای زۆر، جا ئەگەر یەکێک لە ئێمە نەیتوانیبووایە نەوچەوانی لە زەویەکە بچەقێنێت (دابنێت)، ئەوە جلەکەی ڕادەخست و نوێژی لەسەر دەکرد.

تێبینی: زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بۆ نوێژخوێن دروستە پارچەیەک لە و جلەی لەبەریەتی ڕایبخات و کڕنووشی لەسەر ببات، بەڵام مەزهەبی ئیمامی شافیعی دەفەرموێ ئەوە دروست نیە، ئەم فەرموودەیەش بەڵگە نیە بۆ دروستیەتی و باسی ئەوە ناکات بەشێک لە جلی خۆیان ڕاخستبێت، بەڵکو پارچە جلی تریان ڕاخستووە، چونکە نابێت ئەو جلەی نوێژخوێن کڕنووشی لەسەر دەبات بجوڵێت لەگەڵ ڕکوع و سەجدە و جوڵەکانی ئەو.

## بابەت: ئاماژە کردن (بە پەنجەی شاتومان) لە تەحیاتدا

**١٣٨٢ - «عَنْ عَامِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَدْعُو هَكَذَا فِي الصَّلَاةِ، وَأَشَارَ ابْنُ عُيَيْنَةَ بِأُصْبُعِهِ، وَأَشَارَ أَبُو الْوَلِيدِ بِالسَّبَّاحَةِ»(٢).**

واتە: لە عامیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە ئەویش لە باوکیەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەرم ﷺ بینی بەو شێوەیە دووعای دەکرد لە نوێژدا، ئیبنو عویەینە ئاماژەی بە پەنجەی کرد، ئەبو وەلیدیش ئاماژەی بە پەنجەی شاتومان کرد (واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجەی شاتومانی دەجوڵاندوەو دووعای پێکردوە).

تێبینی: هەندێک لە زانایان پێیان وایە پەنجەی شاتومان تەنها یەک جار دەجوڵێنرێت و ئاماژەی پێ دەکرێت، چونکە لە فەرموودەی تردا هاتوە: دەفەرموێ پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدەجوڵاند، جا تا لەگەڵ ئەم فەرموودەیە تێک نەگیرێت فەرمویانە مەبەستی هەردوو فەرموودەکە ئەوەیە: جارێک دەیجوڵاند و چیتر نەیدەجوڵاند.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ حسن.

١٣٨٣ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا قَعَدَ فِي آخِرِ الصَّلاَةِ وَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى، عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُسْرَى، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى، عَلَى رُكْبَتِهِ الْيُمْنَى وَنَصَبَ إِصْبَعَهُ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ كاتێ دادەنیشت لە كۆتایی نوێژدا (بۆ تەحیات)، دەستی چەپی دادەنا لەسەر ئەژنۆی چەپی، وە دەستی ڕاستیشی دادەنا لەسەر ئەژنۆی ڕاستی و پەنجەی بەرز دەكردەوە (واتە: پەنجەی شاتومانی).

## بابەت: دەربارەی تەحیات

١٣٨٤ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قُلْنَا: السَّلاَمُ عَلَى اللَّهِ قَبْلَ عِبَادِهِ، السَّلاَمُ عَلَى جِبْرِيلَ، السَّلاَمُ عَلَى مِيكَائِيلَ، السَّلاَمُ عَلَى إِسْرَافِيلَ، السَّلاَمُ عَلَى فُلاَنٍ وَفُلاَنٍ، قَالَ: فَأَقْبَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى هُوَ السَّلاَمُ، فَإِذَا جَلَسْتُمْ فِي الصَّلاَةِ فَقُولُوا: التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، فَإِنَّكُمْ إِذَا قُلْتُمُوهَا أَصَابَتْ كُلَّ عَبْدٍ صَالِحٍ فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ لِيَتَخَيَّرْ مَا شَاءَ»[٢].

واتە: لە عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێشتر ئێمە كاتێ نوێژمان لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ دەكرد دەمان وت: سەلام لەسەر خوا بێت پێش بەندەكانی، سەلام لەسەر جیبریل ﷺ بێت، سەلام لەسەر میكائیل ﷺ بێت، سەلام لەسەر ئیسرافیل ﷺ بێت، سەلام لەسەر فڵان و فڵان بێت، (عەبدوڵلا) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی تێكردین و فەرمووی: خوای بەرز خۆی سەلامە (سەلامی لەسەر لێ مەكەن)، ئەگەر لە نوێژدا دانیشتن (بۆ تەحیات) ئەوە بڵێن: (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ) واتە: هەموو گەورەییێك و پاڕانەوەكان و عیبادەتەكان و قسەو گوفتار و ڕەفتارە پاك و چاكەكان هەر هی خوایە و بۆ خوایە، سەلام و سەلامەت بوون لە هەموو ئافاتێكی دونیا و دواڕۆژ بڕژێت بەسەر تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، لەگەڵ ڕەحمەت و بەزەیی خوا و بەرەكەتەكەی، وە سەلام لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو بەندە چاكەكانی خوا بێت، ئەگەر ئێوە ئەوەتان وت ئەوە بەر هەموو بەندە چاكەكانی ئاسمان و زەوی دەكەوێت و (سەلامەكە دەیانگرێتەوە)، (وە دواتر بڵێن): (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) واتە: شاهێدی دەدەم كە هیچ خودایێكی بە هەق نیە تەنها الله نەبێت، وە شاهێدی دەدەم كە موحەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە، دواتر ئەوەی حەز دەكات (لە دووعا) با هەڵیبژێرێت و بیكات.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.




١٣٨٥ - «عَنِ الْحَسَنِ بْنِ حُرّ، حَدَّثَنِي الْقَاسِمُ بْنُ مُخَيْمِرَةَ، قَالَ: أَخَذَ عَلْقَمَةُ، بِيَدِي، فَحَدَّثَنِي: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ، أَخَذَ بِيَدِهِ وَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَخَذَ بِيَدِ عَبْدِ اللَّهِ، فَعَلَّمَهُ التَّشَهُّدَ فِي الصَّلاَةِ: التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ، وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ» قَالَ زُهَيْرٌ: أُرَاهُ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، أَيْضًا شَكَّ فِي هَاتَيْنِ الْكَلِمَتَيْنِ، إِذَا فَعَلْتَ هَذَا أَوْ قَضَيْتَ، فَقَدْ قَضَيْتَ صَلاَتَكَ، إِنْ شِئْتَ أَنْ تَقُومَ، فَقُمْ، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ تَقْعُدَ، فَاقْعُدْ»[1].

واتە: لە حەسەنی کوڕی حوڕ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: قاسمی کوڕی موخەیمیرە بۆی گێڕامەوەو وتی: عەلقەمە دەستی گرتم و بۆی گێڕامەوە کە عەبدوڵڵا دەستی گرتووە و پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی (عەبدوڵڵا)ی گرتووەو فێری تەحیاتی کردوە لە نوێژدا (بەو شێوەیە): (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ، وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ) واتە: هەموو گەورەییێک و نوێژەکان و پاڕانەوەکان و عیبادەتەکان و قسەو گوفتارو ڕەفتارە پاک و چاکەکان هەر هی خوایەو بۆ خوایە، سەلام و سەلامەت بوون لە هەموو ئافاتێکی دونیاو دواڕۆژ بڕژێت بەسەر تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، لەگەڵ ڕەحمەت و بەزەیی خواو بەرەکەتەکەی، وە سەلام لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو بەندە چاکەکانی خوا بێت.

زوهەیر وتویەتی: پێم وایە ئەوەندەشی وت (ئا بەو شێوەیە): (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) واتە: شاهێدی دەدەم کە هیچ خوداییێکی بە هەق نیە تەنها الله نەبێت، وە شاهێدی دەدەم کە موحەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە ـ زوهەیر لەو دوو ڕستەیە گومانی هەبووە، (بەڵام ڕاستە و لە ئەصلی بابەتەکەدا هەیە).

(جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی): ئەگەر وات کرد یان ئەوەت تەواو ئەنجامدا (کە باسکرا)، ئەوە نوێژەکەت تەواو کردوە، ئەگەر حەزت کرد هەڵسی و بڕۆی و کۆتایی پێ بهێنی ئەوە هەڵسە، وە ئەگەر حەزیشت کرد دابنیشیت و (زیاتر و زۆرتر دووعا بکەیت و درێژی بکەیتەوە) ئەوە دانیشە.

## بابەت: صەڵاوەتدان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ (لەناو نوێژدا)

١٣٨٦ - «عن ابْن أَبِي لَيْلَى، يَقُولُ: لَقِيَنِي كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ ﷺ، فَقَالَ: أَلاَ أُهْدِي إِلَيكَ هَدِيَّةً؟ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ عَلَيْنَا فَقُلْنَا: قَدْ عَلِمْنَا كَيْفَ السَّلاَمُ عَلَيْكَ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: قُولُوا: اللهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»[2].

واتە: لە ئیبنو ئەبی لەیلاوە گێڕدراوەتەوە کە دەیووت: کەعبی کوڕی عوجرە ﷺ پێم گەیشت و وتی: ئایا دیارییێکت پێ نەبەخشم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆلامان و ئێمەش وتمان: زانیومانە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

سەلامدان لەسەرت چۆنە، ئەی چۆن صەلاتت لەسەر لێبدەین؟ فەرمووی: بڵێن: (اللهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ) واتە: ئەی خوایە ڕەحمەت بڕژێنە بۆ سەر موحەممەد و شوێنکەوتوانی موحەممەد، هەروەکو چۆن ڕەحمەتت ڕژاندبوو بەسەر ئیبراهیم، بە دڵنیایی تۆ سوپاسکراو مەزنی، وە خێرو بەرەکەت بڕژێنی بەسەر موحەممەدو شوێنکەوتووانی موحەممەد، هەروەکو چۆن خێر و بەرەکەتت ڕژاندبوو بەسەر ئیبراهیم، بە دڵنیایی تۆ سوپاسکراو مەزنی.

١٣٨٧ - «عَنْ نُعَيْمٍ الْمُجْمِرِ، مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنَّ مُحَمَّدَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ الْأَنْصَارِيَّ ﷺ، الَّذِي كَانَ أُرِيَ النِّدَاءَ بِالصَّلَاةِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَا مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم، قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَجَلَسَ مَعَنَا فِي مَجْلِسِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، فَقَالَ لَهُ بَشِيرُ بْنُ سَعْدٍ وَهُوَ أَبُو النُّعْمَانِ بْنُ بَشِيرٍ: أَمَرَنَا اللهُ أَنْ نُصَلِّيَ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: فَصَمَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى تَمَنَّيْنَا أَنَّهُ لَمْ يَسْأَلْهُ، ثُمَّ قَالَ: قُولُوا: اللهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ فِي الْعَالَمِينَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَالسَّلَامُ كَمَا قَدْ عَلِمْتُمْ»[١].

واتە: لە نوعەیمی موجمیری خزمەتکاری عومەری کوڕی خەتتابەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی ئەنصاری ﷺ ئەو کەسەی لە خەو بانگی پێ نیشاندرا (لە خەو بانگیان فێر کرد) لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ پێی ڕاگەیاندووە کە ئەبو مەسعودی ئەنصاری (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم)، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لامان و دانیشت لەگەڵماندا لە دانیشتگا و مەجلیسی سەعدی کوڕی عوبادە، جا بەشیری کوڕی سەعد، کە ئەبو نوعمانی کوڕی بەشیری پێ دەوترا، پێی وت: خوا فەرمانی پێ کردووین کە صەلاوەتت لەسەر لێبدەین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا چۆن صەلاوەتت لەسەر لێبدەین؟ (ئەبو مەسعود) دەڵێ: پێغەمبەری خوا بێ دەنگ بوو تاوەکو ئاواتمان خواست بەوەی خۆزگە پرسیاری لێنەکردبا، (دواتر پێغەمبەری خوا) فەرمووی: بڵێن: واتە: ئەی خوایە ڕەحمەت بڕژێنە بۆ سەر موحەممەدو شوێنکەوتووانی موحەممەد، هەروەکو چۆن ڕەحمەتت ڕژاندبوو بەسەر ئیبراهیم، وە خێرو بەرەکەت بڕژێنی بەسەر موحەممەدو شوێنکەوتووانی موحەممەد، هەروەکو چۆن خێرو بەرەکەتت ڕژاندبوو بەسەر ئیبراهیم لەناو هەموو خەڵکیدا، بە دڵنیایی تۆ سوپاسکراو مەزنی.

## بابەت: دووعا و پاڕانەوەی دوای تەحیات

١٣٨٨ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِي عَائِشَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا فَرَغَ أَحَدُكُمْ مِنَ التَّشَهُّدِ، فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ أَرْبَعٍ: مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَفِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَشَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»[٢].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئەبو عائیشەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو هورەیرە ﷺ بوو دەیووت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێک یەکێک لە ئێوە لە تەحیات بوویەوە با (دووعا بکات) و پەنا بەخوا بگرێت لە چوار (شت): لە سزای دۆزەخ و، سزای ناو گۆڕ و، فیتنەی ژیان و مردن و، خراپەی مەسیحی دەججال.

١٣٨٩ - «حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ، عَنِ الْأَوْزَاعِيِّ نَحْوَهُ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە لە موحەممەدی کوڕی کەثیرو ئەویش لە ئەوزاعیەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: سەلامدانەوە لە نوێژدا

١٣٩٠ - «عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ، ثُمَّ يُسَلِّمُ عَنْ يَسَارِهِ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ»[٢].

واتە: لە عامیری کوڕی سەعدەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دەدایەوە بۆ لای ڕاستی تاوەکو سپیایی کوڵمەی ڕومەتی دەبینرا، دواتر سەلامی لای چەپی دەدایەوە تاوەکو سپیایی کوڵمەی ڕومەتی دەبینرا.

١٣٩١ - «عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ رَجُلٍ بِمَكَّةَ فَسَلَّمَ تَسْلِيمَتَيْنِ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَبْدِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: أَنَّى عَلِقَهَا؟ وَقَالَ الْحَكَمُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَفْعَلُ ذَلِكَ»[٣].

واتە: لە ئەبو مەعمەڕەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نوێژم لەدوای پیاوێک کرد لە مەککە و دوو سەلامی دایەوە، منیش ئەوەم بۆ عەبدوڵلا ﷺ باس کرد، ئەویش وتی: چۆن زانیویەتی؟ حەکەم وتی: پێغەمبەر ﷺ ئاوای دەکرد.

## بابەت: گۆتەی (بێژەی) دوای سەلامدانەوە

١٣٩٢ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَجْلِسُ بَعْدَ الصَّلَاةِ إِلَّا قَدْرَ مَا يَقُولُ: اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ، وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ»[٤].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ دانەدەنیشت (دوای سەلامدانەوە بەرامبەر بە قیبلە) تەنها بەو ئەندازەیە نەبێت کە دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ، وَمِنْكَ

---

(١) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ) واتە: خوایە تۆ سەلامی و سەلامیش هەر لەتۆوەیە، تۆ بەرزی ئەی خاوەن گەورەیی و ڕێز.

١٣٩٣ - «عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنْصَرِفَ مِنْ صَلَاتِهِ، اسْتَغْفَرَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قَالَ: اللهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ»[١].

واتە: لە ثەوبانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کاتێک بیویستایە لە نوێژەکەی ڕوو وەچەرخێنێت، سێ جار داوای لێخۆشبوون و (أستغفر الله)ی دەکرد، دواتر دەیفەرموو: خوایە تۆ سەلامی و سەلامیش هەر لەتۆوەیە، تۆ بەرزی ئەی خاوەن گەورەیی و ڕێز. (ئنجا ڕووی دەکردە خەڵکی).

١٣٩٤ - «عَنْ وَرَّادٍ، كَاتِبِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: أَمْلَى عَلَيَّ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ ﷺ فِي كِتَابٍ إِلَى مُعَاوِيَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ مَكْتُوبَةٍ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ»[٢].

واتە: لە وەڕرادی نوسەری موغیرەی کوڕی شوعبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ بۆی خوێندمەوە (تا بینوسم) لە پەڕاوێکدا بۆلای موعاویە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار لەدوای هەموو نوێژە فەڕزەکان دەیفەرموو: هیچ خودایێکی بە هەق نیە تەنها الله نەبێت، تاک و تەنیایە و هاوەڵی نیە، هەموو موڵکێک و ستاییشێک هەر هی ئەوەو بۆ ئەوە، ئەی خوایە هیچ ڕێگرێک نیە لە بەردەم ئەو شتەی کە تۆ دەیبەخشی، وە هیچ بەخشەرێک نیە بۆ ئەو شتەی تۆ دەیگریتەوەو نایبەخشیت، وە هیچ ماڵ و سامان و ڕەچەڵەکێک سودی بۆ خاوەنەکەی نابێت لە سزای تۆ.

## بابەت: (ئیمام یان نوێژخوێن) لەسەر کام لا ڕووی لە نوێژەکەی وەردەگێرێت

١٣٩٥ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: لَا يَجْعَلْ أَحَدُكُمْ لِلشَّيْطَانِ نَصِيباً مِنْ صَلَاتِهِ: يَرَى أَنَّ حَقًّا عَلَيْهِ أَنْ لَا يَنْصَرِفَ إِلَّا عَنْ يَمِينِهِ. لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَثِيراً يَنْصَرِفُ عَنْ يَسَارِهِ»[٣].

واتە: لە عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: با کەسێک لە ئێوە پشکێک و بەشێک لە نوێژەکەی بۆ شەیتان دانەنێت: بەوەی پێی وابێت لەسەری واجبە کە ڕوو لە نوێژ وەرنەچەرخێنێت تەنها بۆ لای ڕاست نەبێت، بە دڵنیایی من زۆر جار پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە ڕووی بۆلای چەپ وەرگێڕاوە.

تێبینی: واتە ڕاستە ڕوو وەرگێڕان دوای تەواو بوونی نوێژ زیاتر سوننەتە بۆ لای ڕاست بێت، بەڵام نابێ بە واجبی بزانین و بۆلای چەپ بە ڕەوای نەزانین، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر جاران بۆ لای چەپ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

سوڕاوە و زیاتریش بۆ لای ڕاست سوڕاوە، کەواتە هەردووکیان هەر دروستە، لای ڕاست سوننەتە نەک واجب، لای چەپیش دروستە.

١٣٩٦ - «عَنِ السُّدِّيِّ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ، يَقُولُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْصَرِفُ عَنْ يَمِينِهِ»[1].

واتە: لە سوددی گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەنەس ﷺ بوو دەیووت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە خۆی سوڕاندووە بە لای ڕاستدا (دوای تەواوبوونی نوێژ).

١٣٩٧ - «عَنِ السُّدِّيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: انْصَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ يَمِينِهِ يَعْنِي فِي الصَّلاَةِ»[2].

واتە: لە سوددی ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیک بوو ﷺ دەیووت: پێغەمبەر ﷺ ڕووی وەرگێڕا بە لای ڕاستدا، واتە لە نوێژدا (دوای تەواو بوونی نوێژ).

## بابەت: تەسبیحات کردن لەدوای نوێژ

١٣٩٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ أَبُو ذَرٍّ ﷺ، يَا رَسُولَ اللَّهِ، ذَهَبَ أَصْحَابُ الدُّثُورِ بِالأُجُورِ: يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ، وَلَهُمْ فُضُولُ أَمْوَالٍ يَتَصَدَّقُونَ بِهَا، وَلَيْسَ لَنَا مَا نَتَصَدَّقُ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَفَلاَ أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ إِذَا أَنْتَ قُلْتَهُنَّ، أَدْرَكْتَ مَنْ سَبَقَكَ، وَلَمْ يَلْحَقْكَ مَنْ خَلَفَكَ إِلاَ مَنْ عَمِلَ بِمِثْلِ عَمَلِكَ؟» قَالَ: قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: تُسَبِّحُ دُبُرَ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَتَحْمَدُهُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَتُكَبِّرُهُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَتَخْتِمُهَا بِـ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ»[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو زەڕ ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەوڵەمەند و خاوەن سەروەت و سامانەکان هەموو پاداشتێکیان برد، نوێژ دەکەن چۆن ئێمە نوێژ دەکەین، وە ڕۆژوو دەگرن چۆن ئێمە ڕۆژوو دەگرین، وە ئەوان ماڵی زیادەیان هەیە و خێری پێ دەکەن و دەیبەخشن، ئێمە شتێکمان نیە بیکەینە خێر و بیبەخشین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا چەند وشەیەکت فێر نەکەم کە ئەگەر تۆ بیانڵێیت ئەوە دەگەیتەوە ئەوانەی پێشت کەوتوون (لە ئەجر و پاداشت)، وە کەسیش لەوانەی لەدوای تۆدان پێت ناگەنەوە تەنها کەسێک نەبێت هەمان کاری تۆی ئەنجام دابێت؟ ئەبو زەڕ وتی: بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (دەمەوێ ئەو ڕستانەم فێر بکەی)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پاشی هەموو نوێژێک سی وسێ جار (سبحان الله) دەکەیت، وە سی وسێ جار (الحمد لله) دەکەیت، وە سی وسێ جار (اللّٰه أكبر) دەکەیت، وە کۆتایی پێ دەهێنی بە (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

١٣٩٩ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، قَالَ: أُمِرْنَا أَنْ نُسَبِّحَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَنَحْمَدَهُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَنُكَبِّرَ أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ، فَأُتِيَ رَجُلٌ، أَوْ أُرِيَ رَجُلٌ، مِنَ الأَنْصَارِ فِي الْمَنَامِ فَقِيلَ: أَمَرَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ تُسَبِّحُوا اللَّهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَتَحْمَدُوا ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَتُكَبِّرُوا أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ؟» قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَاجْعَلُوهَا خَمْسًا وَعِشْرِينَ، خَمْسًا وَعِشْرِينَ، وَاجْعَلُوا مَعَهَا التَّهْلِيلَ، فَأُخْبِرَ بِذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: افْعَلُوهَا»[١].

واتە: لە زەیدی كوڕی سابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فەرمانمان پێكراوە (هاندراوین) كە سی و سێ «سبحان الله» بكەین دوای هەموو نوێژێک، وە سی و سێ «الحمد لله» بكەین، وە سی و چوار «اللَّه أكبر» بكەین، جا پیاوێكی ئەنصاری لە خەودا بینی پێی وترا: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ كردوون كە لە دوای هەموو نوێژێكدا سی و سێ جار «سبحان الله» بكەن، وە سی وسێ جار «الحمد لله» بكەن، وە سی و چوار جار «اللَّه أكبر» بكەن؟ (پیاوە ئەنصاریەكە) وتی: بەڵێ، (جا كەسەكە لە خەوەكەدا) وتی: بیكەن بە بیست و پێنج، بیست و پێنج، وە (لا إله إلا الله)شی وەگەڵ بخەن (واتە: بیست و پێنج جاریش «لا إله إلا الله» بڵێن، جا ئەو هەواڵە بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاگەیەنرا، ئەویش فەرمووی: وابكەن.

## بابەت: یەكەم شت كە بەندە لێپرسینەوەی لەسەر دەكرێت لە ڕۆژی دواییدا

١٤٠٠ - «عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ الصَّلاَةُ، فَإِنْ وَجَدَ صَلاَتَهُ كَامِلَةً، كُتِبَتْ لَهُ كَامِلَةً، وَإِنْ كَانَ فِيهَا نُقْصَانٌ، قَالَ اللهُ تَعَالَى لِلمَلاَئِكِهِ: انْظُرُوا، هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ فَأَكْمِلُوا لَهُ مَا نَقَصَ مِنْ فَرِيضَتِهِ، ثُمَّ الزَّكَاةُ، ثُمَّ الأَعْمَالَ عَلَى حَسَبِ ذَلِكَ»[٢].

واتە: لە تەمیمی داریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: یەكەم شت كە بەندە لێپرسینەوەی لەسەر دەكرێت نوێژە، جا ئەگەر بگات بەنوێژەكەی بە تەواوی ئەوە بە تەواوی بۆی دەنوسرێت، وە ئەگەر هاتوو كەم وكوڕی تیابوو خوای بەرز بە فریشتەكان دەفەرموێ: سەیربكەن، بزانن بەندەی من نوێژی سوننەتی هەیە (ئەگەر هەیەتی) ئەوە بۆی تەواو و كامل بكەن ئەوەی كەم و كوڕی تێكەوتووە لە فەڕزەكانی، دواتر (حیسابی لەگەڵ دەكرێت لەسەر) زەكات، دواتر كردەوەكانی تر لەسەر ئەو بنچینەیە.

تێبینی: نوێژی سوننەت شوێنی نوێژی فەڕز ناگرێتەوە، لە ئەصڵدا واتە: ئەگەر كەسێک نوێژی فەڕزی فەوتاندبێت ئەوە سوننەتەكانی ڕەنگە بەكەڵكی نایەن، بۆیە دەبێ نوێژە فەڕزەكە حەتمەن بكات، یان قەزای بكاتەوە، بەڵكو مەبەستی ئەو فەرموودە زیاتر ئەوەیە: نوێژی سوننەت شوێنی ئەو كەم و كوڕیانە دەگرێتەوە كە لە نوێژە فەڕزەكان ڕووی داوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەری خوا

١٤٠١ - «حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أبا حُمَيْدٍ السَّاعِدِيَّ ﷺ، فِي عَشَرَةٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ أَحَدُهُمْ أَبُو قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: أَنَا أَعْلَمُكُمْ بِصَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا: لِمَ؟ فَمَا كُنْتَ أَكْثَرَنَا لَهُ تَبَعَةً، وَلاَ أَقْدَمَنَا لَهُ صُحْبَةً؟ قَالَ: بَلَى. قَالُوا: فَاعْرِضْ. قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ، رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ حَتَّى يَقَرَّ كُلُّ عَظْمٍ فِي مَوْضِعِهِ، ثُمَّ يَقْرَأُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ، ثُمَّ يَرْكَعُ وَيَضَعُ رَاحَتَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ إِلَى مَوْضِعِهِ، وَلاَ يُصَوِّبُ رَأْسَهُ وَلاَ يُقْنِعُ، ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ فَيَقُولُ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ثُمَّ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ - يَظُنُّ أَبُو عَاصِمٍ أَنَّهُ قَالَ: حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ إِلَى مَوْضِعِهِ مُعْتَدِلاً - ثُمَّ يَقُولُ: اللهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ يَهْوِي إِلَى الْأَرْضِ فَيُجَافِي يَدَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ، ثُمَّ يَسْجُدُ، ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ فَيَثْنِي رِجْلَهُ الْيُسْرَى فَيَقْعُدُ عَلَيْهَا، وَيَفْتَحُ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ إِذَا سَجَدَ، ثُمَّ يَعُودُ فَيَسْجُدُ، ثُمَّ يَرْفَعُ رَأْسَهُ فَيَقُولُ: اللهُ أَكْبَرُ وَيَثْنِي رِجْلَهُ الْيُسْرَى فَيَقْعُدُ عَلَيْهَا مُعْتَدِلاً حَتَّى يَرْجِعَ كُلُّ عَظْمٍ إِلَى مَوْضِعِهِ مُعْتَدِلاً، ثُمَّ يَقُومُ فَيَصْنَعُ فِي الرَّكْعَةِ الْأُخْرَى مِثْلَ ذَلِكَ. فَإِذَا قَامَ مِنَ السَّجْدَتَيْنِ، كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ بِهِمَا مَنْكِبَيْهِ كَمَا فَعَلَ عِنْدَ افْتِتَاحِ الصَّلاَةِ، ثُمَّ يَصْنَعُ مِثْلَ ذَلِكَ فِي بَقِيَّةِ صَلاَتِهِ حَتَّى إِذَا كَانَتِ السَّجْدَةُ أَوِ الْقَعْدَةُ الَّتِي يَكُونُ فِيهَا التَّسْلِيمُ، أَخَّرَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَجَلَسَ مُتَوَرِّكًا عَلَى شِقِّهِ الْأَيْسَرِ قَالَ: قَالُوا: صَدَقْتَ، هَكَذَا كَانَتْ صَلاَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[1].

واته: لە موحەممەدی كوڕی عەمری كوڕی عەطائەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ بوو لەناو دە هاوەڵی پێغەمبەری خوادا ﷺ ـ كە یەكێكیان ئەبو قەتادە بوو ﷺ ـ وتی: من لە هەمووتان زاناتر و شارەزاترم بە نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوانیش وتیان: لەبەرچی؟ خۆ تۆ لە ئێمە زیاتر شوێنی نەكەوتووی، وە پێشی ئێمەش هاوڕێیەتی و هاوەڵیەتیت نەكردووە؟ وتی: با، وتیان: كەواتە نیشانی بدە، وتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ بۆ نوێژ هەڵدەستا، دەستەكانی بەرز دەكردەوە تاوەكو بەرامبەری دەكردن لەگەڵ شانەكانی، دواتر (اللّٰه أكبر)ی دەكرد تاوەكو هەموو ئێسقانەكان لە شوێنی خۆیان جێگیر دەبوون، دواتر قورئانی دەخوێند، دواتر (اللّٰه أكبر)ی دەكردو دەستەكانیشی بەرز دەكردەوە تاوەكو بەرامبەری دەكردن لەگەڵ شانەكانی، دواتر ڕكوعی دەبرد و ناو لەپی دەستەكانی لەسەر ئەژنۆكانی دادەنا، تاوەكو هەموو ئێسقانەكانی دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان، هەروەها سەریشی نزم نەكردو بەرزیشی نەكردەوە، دواتر سەری بەرز دەكردەوەو دەیفەرموو: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، دواتر دەستەكانی بەرز دەكردەوە تاوەكو بەرامبەری دەكردن لەگەڵ شانەكانی، ئەبو عاصم پێی وایە (ئەو ڕستەشی لێرەدا) وت: تاوەكو هەموو ئێسقانەكان دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان بە ڕاست بوونەوە، دواتر دەیفەرموو: اللّٰه أكبر، دواتر (بۆ كڕنووش) دەكەوتە سەر زەویەكە و باسكەكانی لە تەنیشتەكانی دوور دەخستەوە، دواتر كڕنووشی دەبرد، دواتر سەری بەرز دەكردەوەو قاچی چەپی دەنوشتاندەوەو لەسەری دادەنیشت، وە پەنجەكانی پێی دەكردەوە كاتێ كڕنووشی دەبرد، دواتر

---

(١) ـ صحیح.

جارێکی تر دەگەڕایەوە و کڕنووشی دەبرد، دواتر سەری بەرز دەکردەوەو دەیفەرموو: اللّٰه أکبر، وەقاچی چەپی دەنوشتاندەوەو لەسەری دادەنیشت بە ڕاست بوونەوەیەکی تەواو تاوەکو هەموو ئێسقانەکان دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان بە ڕاست و ڕێکی، دواتر هەڵدەستایەوەو لە ڕەکعەتەکەی تر هەمان شتی ئەنجام دەدا، جا کاتێ لە دوو کڕنووشەکان بەرزدەبوویەوە (اللّٰه أکبر)ی دەکردو دەستەکانی بەرز دەکردەوە تاوەکو بەرامبەری دەکردن لەگەڵ شانەکانی وەک لە کاتی دەست پێکردنی سەرەتا ئەنجامیدا، دواتر بەو شێوەیە ئەنجامی دەدا تا کۆتایی نوێژەکەی، تاوەکو کاتی ئەو دانیشتنەی سەلامی تیایە (لەو دانیشتنەدا کە دانیشتنی کۆتاییە) قاچی چەپی جێ دەهێشت لە دواوەی و بە تەوەرِروک دادەنیشت لەسەر لای چەپی، وتیان: ڕاستەدەکەی، نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بوو.

١٤٠٢ - «حدثنا عاصم بن كليب قال: أَخْبَرَنِي أَبِي، أَنَّ وَائِلَ بْنَ حُجْرٍ ﷺ، أَخْبَرَهُ قَالَ: قُلْتُ لأَنْظُرَنَّ إِلَى صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَيْفَ يُصَلِّي؟ فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ فَقَامَ فَكَبَّرَ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى حَاذَتَا بِأُذُنَيْهِ، وَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى ظَهْرِ كَفِّهِ الْيُسْرَى. قَالَ: ثُمَّ لَمَّا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، رَفَعَ يَدَيْهِ مِثْلَهَا: فَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ مِثْلَهَا، ثُمَّ سَجَدَ فَجَعَلَ كَفَّيْهِ بِحِذَاءِ أُذُنَيْهِ، ثُمَّ قَعَدَ فَافْتَرَشَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى، وَوَضَعَ كَفَّهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ وَرُكْبَتِهِ الْيُسْرَى، وَجَعَلَ مِرْفَقَهُ الأَيْمَنَ عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى، ثُمَّ قَبَضَ ثِنْتَيْنِ. فَحَلَّقَ حَلْقَةً، ثُمَّ رَفَعَ أُصْبُعَهُ فَرَأَيْتُهُ يُحَرِّكُهَا: يَدْعُو بِهَا قَالَ: ثُمَّ جِئْتُ بَعْدَ ذَلِكَ فِي زَمَانٍ فِيهِ بَرْدٌ، فَرَأَيْتُ عَلَى النَّاسِ جُلَّ الثِّيَابِ يُحَرِّكُونَ أَيْدِيَهُمْ مِنْ تَحْتِ الثِّيَابِ»[1].

واتە: لە عاصمی کوڕی کولەیبەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: باوکم بۆی گێڕامەوە کە وائیلی کوڕی حوجر ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: وتم سوێند بە خوا سەیری نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەم کە چۆن نوێژ دەکات، جا سەیرم کرد، هەڵساو (اللّٰه أکبر)ی کردو دەستەکانی بەرز کردەوە تا ڕاستی گوێچکەکانی، وە دەستی ڕاستیشی لەسەر پشتە دەستی چەپی دانا، دەڵێ: دواتر کاتێک ویستی ڕکوع ببات دەستی بەرز کردەوە وەک جاری پێشوو دەستیشی لەسەر ئەژنۆکانی دانا، دواتر سەری بەرز کردەوە و دەستیشی بەرز کردەوە وەک جاری پێشو، دواتر کڕنووشی بردو دەستی لە بەرانبەر گوێچکەکانی دانا، دواتر دانیشت و قاچی چەپی (لە ژێرەوەی خۆی) ڕاخست و دەستی چەپی لەسەر ڕان و ئەژنۆی چەپی دانا، وە ئانیشکی ڕاستی لەسەر ڕانی ڕاستی دانا، دواتر دوو (لە پەنجەکانی دەستی ڕاستی) گرتن (کە بریتی بوون لە پەنجەی گەورە و پەنجەی ناوەڕاست) و کردی بە حەلقە و بازنەیەک، دواتر پەنجەی (شاتومانی) بەرز کردەوە بینیم دەیجوڵاند، نزاو دووعای پێ دەکرد، دەڵێ: دواتر پاشی ئەو جارە لە کاتێکی ساردا چووم بینیم خەڵکی جلی زۆریان بەسەرەوە بوو، (لەبەر سەرما)، پەنجەیان دەجوڵاند لەژێر جلەکانەوە.

١٤٠٣ - «عَنْ حِطَّانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الرَّقَاشِيِّ، قَالَ: صَلَّى بِنَا أَبُو مُوسَى ﷺ، إِحْدَى صَلاَتَيِ الْعَشِيِّ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أُقِرَّتِ الصَّلاَةُ بِالْبِرِّ وَالزَّكَاةِ، فَلَمَّا قَضَى أَبُو مُوسَى الصَّلاَةَ، قَالَ: أَيُّكُمُ الْقَائِلُ كَلِمَةَ كَذَا وَكَذَا، فَأَرَمَّ

---

(١) ـ صحيح.

الْقَوْمُ. فَقَالَ: لَعَلَّكَ يَا حِطَّانُ قُلْتَهَا؟ قَالَ: مَا أَنَا قُلْتُهَا وَقَدْ خِفْتُ أَنْ تَبْكَعَنِي بِهَا. فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَنَا قُلْتُهَا وَمَا أَرَدْتُ بِهَا إِلاَ الْخَيْرَ. فَقَالَ أَبُو مُوسَى: أَوَ مَا تَعْلَمُونَ مَا تَقُولُونَ فِي صَلاَتِكُمْ؟ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَطَبَنَا فَعَلَّمَنَا صَلاَتَنَا، وَبَيَّنَ لَنَا سُنَّتَنَا. قَالَ: أَحْسَبُهُ قَالَ: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَلْيَؤُمَّكُمْ أَحَدُكُمْ، فَإِذَا كَبَّرَ، فَكَبِّرُوا، وَإِذَا قَالَ: ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ۝٧﴾ الفاتحة، فَقُولُوا: آمِينَ، يُجِبْكُمُ اللهُ، فَإِذَا كَبَّرَ، وَرَكَعَ فَكَبِّرُوا، وَارْكَعُوا، فَإِنَّ الْإِمَامَ يَرْكَعُ قَبْلَكُمْ، وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ « قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ: فَتِلْكَ بِتِلْكَ. فَإِذَا قَالَ سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَقُولُوا: اللهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ - أَوْ قَالَ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ - فَإِنَّ اللَّهَ قَالَ: عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، فَإِذَا كَبَّرَ وَسَجَدَ، فَكَبِّرُوا وَاسْجُدُوا، فَإِنَّ الْإِمَامَ يَسْجُدُ قَبْلَكُمْ، وَيَرْفَعُ قَبْلَكُمْ، قَالَ نَبِيُّ اللهِ فَتِلْكَ بِتِلْكَ. فَإِذَا كَانَ عِنْدَ الْقَعْدَةِ فَلْيَكُنْ مِنْ أَوَّلِ قَوْلِ أَحَدِكُمْ: التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، السَّلاَمُ - أَوْ سَلاَمٌ - عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ - أَوْ سَلاَمٌ - عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ»[1].

واتە: لە حیتتانی کوڕی عەبدوڵڵای ڕەقفاشیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو مووسا ﷺ نوێژی بۆ کردین، یەک لە نوێژەکانی دانی ئێوارە (واتە یان نیوەڕۆ یان عەسر)، جا پیاوێک لەناو خەڵکەکە وتی: نوێژ لەگەڵ چاکە و زەکاتدا بە یەکەوە هاتوون و دانی پێدانراوە، جا کاتێ ئەبو موسا نوێژەکەی تەواو کرد وتی: کێ لە ئێوە ئە و ڕستە و و ئەو ڕستەیەی وت؟ خەڵکەکە ددانیان قرساند (لە ناڕەزایی)، (ئەبو موسی) وتی: حیتتانی ڕەنگە تۆ وتبێتت؟ حیتتانی وتی: من نەم وتووە، ترسام لەبەر ئەوە قسەی خراپم پێ بڵێ، پیاوێک لە خەڵکەکە وتی: من وتم، مەبەستیشم پێی تەنها چاکەبوو، ئەبو موسا وتی: ئایا نازانن چی دەڵێن لە نوێژەکانتان؟ بە دڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و نوێژی فێر کردین و سوننەتی بۆ ڕوون کردینەوە، وتی: پێم وایە فەرمووی: ئەگەر کاتی نوێژ هات و قامەت کرا ئەوە با یەکێک لە ئێوە پێشنوێژیتان بۆ بکات، جا کاتێ (اللّٰه أکبر)ی کرد (بۆ نوێژ دەست پێ کردن) ئێوەش (اللّٰه أکبر) بکەن، وە کاتێ وتی: ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ۝٧﴾، ئێوەش بڵێن: ئامین، خوا وەڵامتان دەداتەوە (دووعاکانتان گیرا دەکات)، جا کاتێ (اللّٰه أکبر)ی کرد و ڕکوعی برد، ئێوەش (اللّٰه أکبر) بکەن و ڕکوع ببەن، چونکە ئیمام پێشی ئێوە دەچێتە ڕکوع و پێشی ئێوەش بەرز دەبێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو تاخیربوونەتان بۆ چوونە ڕکوع بەو تاخیر هەڵسانەوەتان لە ڕکوع پڕ دەبێتەوە (واتە: ئەندازەی ڕکوعی ئێوە و ڕکوعی ئیمام وەکو یەکە، چونکە هەر چەندە ئێوە تاخیرتر بچن بۆ ڕکوع هەر بەو ئەندازەیەش تاخیرتر هەڵدەستنەوە)، جا کاتێ وتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئێوەش بڵێن: (اللهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ) یان ووتی بڵێن: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ) خوا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی فەرموویەتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، جا کاتێ (اللّٰه أکبر)ی کرد و کڕنووشی برد، ئێوەش (اللّٰه أکبر) بکەن و کڕنووش ببەن، چونکە ئیمام پێشی ئێوە کڕنووش دەبات و پێشی ئێوەش بەرز دەبێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە بەوە (واتە: ئەو تاخیربوونەتان بۆ چوونە کڕنووش بەو تاخیر هەڵسانەوەتان لە کڕنووش پڕ دەبێتەوە)، جا لە کاتی دانیشتن (بۆ تەحیات) با یەکەم قسەی ئێوە ئەوە

---

(١) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

بێت: (التَّحِيَّاتُ الطَّيِّبَاتُ الصَّلَوَاتُ لِلَّهِ، السَّلاَمُ -أَوْ سَلاَمٌ - عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ - أَوْ سَلاَمٌ - عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ).

## بابەت: جوڵەجوڵ كردن لە نوێژدا

١٤٠٤ - «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ يُصَلِّي وَقَدْ حَمَلَ عَلَى عُنُقِهِ - أَوْ عَاتِقِهِ - أُمَامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ فَإِذَا رَكَعَ، وَضَعَهَا، وَإِذَا قَامَ، حَمَلَهَا»[١].

واتە: لە ئەبو قەتادەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتويەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە نوێژی كرد لە كاتێكدا ئومامەی كچی زەینەبی لەسەر ملی خۆی هەڵگرتبوو، جا كاتێ ڕكوعی دەبرد دایدەنا، وە كاتێ هەڵدەستايەوە هەڵیدەگرتەوە.

١٤٠٥ - «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، قَالَ: حَمَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أُمَامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ، فَإِذَا سَجَدَ، وَضَعَهَا، وَإِذَا قَامَ حَمَلَهَا»[٢].

واتە: لە ئەبو قەتادەی ئەنصاريەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتويەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئومامەی كچی زەینەبی كچی پێغەمبەری خوای ﷺ هەڵگرتبوو، لە كاتێكدا لەناو نوێژدا بوو، جا كاتێ كڕنووشی دەبرد دایدەنا، وە كاتێ هەڵدەستايەوە هەڵیدەگرتەوە.

## بابەت: چۆن سەلام وەڵام دەدرێتەوە لە نوێژدا؟

١٤٠٦ - «عَنْ صُهَيْبٍ ﷺ، قَالَ: مَرَرْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ وَهُوَ يُصَلِّي، فَرَدَّ إِلَيَّ إِشَارَةً» قَالَ لَيْثٌ: أَحْسَبُهُ قَالَ: بِأُصْبُعِهِ»[٣].

واتە: لە صوهەیبەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتويەتی: بە لای پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕیم و سەلامم لێی كرد، لە كاتێكد نوێژی دەكرد، وەڵامی دامەوە بە ئاماژە، لەیس وتويەتی: پێم وابی وتی: (وەڵامی دامەوە بە ئاماژە) بە پەنجەی.

١٤٠٧ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَسْجِدَ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، فَدَخَلَ النَّاسُ يُسَلِّمُونَ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ، قَالَ: فَسَأَلْتُ صُهَيْبًا: كَيْفَ كَانَ يَرُدُّ عَلَيْهِمْ؟ قَالَ: هَكَذَا، وَأَشَارَ بِيَدِهِ»[٤].

واتە: لە ئيبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتويەتی: پێغەمبەر ﷺ هاتە مزگەوتی بەنی عەمری كوڕی عەوف، خەڵكيش هاتنە ژوورەوە و سەلاميان لێ دەكرد، لە كاتێكدا لە نوێژدا بوو، (ئيبنو

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

عومەر) وتی: پرسیارم لە صوهەیب کرد (پێغەمبەری خوا ﷺ) چۆن وەڵامی دەدانەوە؟ وتی: ئاوا، ئاماژەی بە دەستی کرد (واتە بە ئیشارەتی دەستی وەڵامی سەلامی خەڵکی دەدایەوە).

## بابەت: سبحان الله کردن بۆ پیاوانە، چەپڵەش بۆ ئافرەتانە (لە کاتی ئاگادارکردنەوە لە نوێژدا)

١٤٠٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە  گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (سبحان الله) کردن بۆ پیاوانە، چەپڵەش بۆ ئافرەتانە (بۆ ئاگادارکردنەوە لە ناو نوێژدا).

١٤٠٩ - «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا نَابَكُمْ شَيْءٌ فِي صَلاَتِكُمْ، فَلْيُسَبِّحِ الرِّجَالُ، وَلْتُصَفِّحِ النِّسَاءُ»[٢].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە  گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئاگادارکردنەوەتان بۆ شتێکدا لەناو نوێژەکەتاندا، ئەوە با پیاوەکان (سبحان الله) بکەن، ئافرەتەکانیش چەپڵە لێ بدەن (دەستی ڕاستان بدەن لە پشتە دەستی چەپیان).

١٤١٠ - «أَخْبرنا يَحْيَى بْنُ حَسَّانَ، حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْجُمَحِيُّ، وَعَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ مُحَمَّدٍ، وَعَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، وَسُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ»[٣].

واتە: لەو ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لە ڕێگای سەهلی کوڕی سەعدەوە  گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: نوێژی سوننەت لە چ شوێنێک خێری زیاترە؟

١٤١١ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: عَلَيْكُمْ بِالصَّلاَةِ فِي بُيُوتِكُمْ، فَإِنَّ خَيْرَ صَلاَةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلاَّ الْجَمَاعَةَ»[٤].

واتە: لە زەیدی کوڕی سابیتەوە  گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەست بگرن بە نوێژ لە ماڵەکانتان (واتە: نوێژ لە ماڵەوە بکەن)، چونکە باشترین و خێرترین نوێژی مرۆڤ، هی ماڵەکەیەتی تەنها نوێژی بە کۆمەڵ نەبێت (ئەویان لە مزگەوت خێرترە).

---

(١) - صحيح.
(٢) - صحيح.
(٣) - صحيح.
(٤) - صحيح.

## بابەت: دووبارە کردنەوەی نوێژ بە کۆمەڵ (بە جەماعەت) پاش ئەوەی لە ماڵەوە ئەنجامی دەدات

١٤١٢ - «عَنْ يَعْلَى بْنِ عَطَاءٍ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ يَزِيدَ بْنِ الْأَسْوَدِ السُّوَائِيَّ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ صَلَاةَ الصُّبْحِ، قَالَ: فَإِذَا رَجُلَانِ حِينَ صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ قَاعِدَانِ فِي نَاحِيَةٍ لَمْ يُصَلِّيَا. قَالَ: فَدَعَا بِهِمَا، فَجِيءَ بِهِمَا تُرْعَدُ فَرَائِصُهُمَا. قَالَ: مَا مَنَعَكُمَا أَنْ تُصَلِّيَا؟ قَالَا: صَلَّيْنَا فِي رِحَالِنَا، قَالَ: فَلَا تَفْعَلَا، إِذَا صَلَّيْتُمَا فِي رِحَالِكُمَا ثُمَّ أَدْرَكْتُمَا الْإِمَامَ، فَصَلِّيَا فَإِنَّهَا لَكُمَا نَافِلَةٌ قَالَ: فَقَامَ النَّاسُ يَأْخُذُونَ بِيَدِهِ يَمْسَحُونَ بِهَا وُجُوهَهُمْ. قَالَ: فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ فَمَسَحْتُ بِهَا وَجْهِي، فَإِذَا هِيَ أَبْرَدُ مِنَ الثَّلْجِ، وَأَطْيَبُ رِيحًا مِنَ الْمِسْكِ»[1].

واتە: لە یەعلای کوڕی عەتائەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە جابیری کوڕی یەزیدی کوڕی ئەسوەدی سوائی بوو لە باوکیەوە ﷺ، دەیگێڕایەوە، کە نوێژی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، نوێژی بەیانی ئەنجام دابوو، وتویەتی: لەوێ دوو پیاو دانیشتبوون ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد (بۆ خەڵکی)، دوو پیاوەکە نوێژیان نەکرد، دەڵێ: (پێغەمبەری خوا ﷺ) داوای هەردووکیانی کرد، هەردووکیان هێنا بۆ لای، لاقیان دەلەرزی (وایان زانی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکیان لێ دەکات)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چ شتێک ڕێگری لێ کردن کە نوێژ بکەن؟ وتیان: لەناو بارگەو شوێنی خۆمان نوێژمان کردوە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئاوا مەکەن، ئەگەر نوێژیشتان کرد لە بارگە و شوێنی خۆتان دواتر بە (نوێژی) ئیمام ڕاگەیشتن ئەوە نوێژ بکەن، ئەوە بۆتان دەبێتە سوننەت، دەڵێ: خەڵکیش هەڵسان و دەستی پێغەمبەری خوایان ﷺ دەگرت و بە ڕوخساری خۆیان دادەهێنا، دەڵێ: منیش دەستم گرت و هێنام بە ڕوخسارمدا، کە ساردتر بوو لە بەفر و بۆنی خۆشتر بوو لە میسک.

## بابەت: دەربارەی نوێژی جەماعەت لە مزگەوتێکدا کە جارێک نوێژی تیادا کرابێت

١٤١٣ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى رَجُلاً يُصَلِّي وَحْدَهُ فَقَالَ: أَلَا رَجُلٌ يَتَصَدَّقُ عَلَى هَذَا، فَيُصَلِّي مَعَهُ»[2].

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی بە تەنیا نوێژی دەکرد، فەرمووی: ئایا پیاوێک نیە خێر بەوە بکات، نوێژی لەگەڵ بکات؟ (تا ئەمیش خێری جەماعەتی پێ ببڕێت).

١٤١٤ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً دَخَلَ الْمَسْجِدَ وَقَدْ صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: أَلَا رَجُلٌ يَتَصَدَّقُ عَلَى هَذَا فَيُصَلِّي مَعَهُ؟»[3].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کردبوو (جەماعەت تەواو ببوو)، فەرمووی: ئایا پیاوێک نیە خێر بەوە بکات، نوێژی لەگەڵ بکات؟

## بابەت: نوێژکردن بە تاکە جلێکەوە

١٤١٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُصَلِّي الرَّجُلُ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ؟ قَالَ: أَوَ كُلُّكُمْ يَجِدُ ثَوْبَيْنِ، أَوْ لِكُلِّكُمْ ثَوْبَانِ؟»[١].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا پیاوێک نوێژ بە تاکە جلێکەوە دەکات (ئایا دروستە)؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: مەگەر هەمووتان دوو جلتان دەست دەکەوێت؟! یان هەمووتان دوو جلتان هەیە؟!

واتە: بەڵێ دروستە، چونکە خۆ هەموو کەسێک دوو جلی نیە، چونکە کاتی خۆی جل و بەرگ کەم بووە، بۆ هەموو کاتێکیش دروستە مرۆڤ لەناو یەک جلی وەک دشداشەو، مەکسی، یان هەر تاکە جلێک نوێژ بکات، بە مەرجێک جلەکە ئەوەندەی لە نوێژدا بە عەورەت حیسابە داپۆشێت.

١٤١٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ عَلَى عَاتِقِهِ مِنْهُ شَيْءٌ»[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (وا باشترە) کەس لە ئێوە نوێژ نەکات لە تاکە جلێکەوە بە جۆرێک هیچ شتێک و بەشێکی جلەکەی لەسەر شان و ملی نەبێت.

تێبینی: ئەوە لە کاتێک دایە کە کەسەکە لە پارچە جلێک زیاتری هەبێت، یان یەک تاکە جلی هەبێت، بەڵام جلەکە بگاتە سەر شانی و بتوانێت بیبەستێت، بەڵام بۆ کەسێک کە یەک تاکە جلی هەیە و جلەکەش ناگاتە سەر شانی ئاساییە.

## بابەت: نەهی کردن لە خۆ پێچانەوەی چەقبەستوو

١٤١٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لِبْسَتَيْنِ: أَنْ يَحْتَبِيَ أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ بَيْنَ فَرْجِهِ وَبَيْنَ السَّمَاءِ شَيْءٌ، وَعَنِ الصَّمَّاءِ اشْتِمالَ الْيَهُودِ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن، ولكن الحديث صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لە دوو جل پۆشین کردووە: (یەکیان ئەوەیە): یەکێک لە ئێوە لەسەر سمتی دابنیشێت و قاچەکانیشی بچەقێنێت بە تاکە جلێکەوە، بە شێوەیەک هیچ بەربەستێک لە نێوان عەورەتی و ئاسماندا نەبێت (بە شێوەیەک عەورەتی لە خەڵک دیار بێت)، وە (دووەمیان ئەوەیە): مرۆڤ جلێک بکاتە بەری کە چەقبەستوی بکات، لە هەموو لایێک لێی ئاڵابێت (بە شێوەیەک جوڵانەوەی زەحمەت بێت)، وەک خۆ پێچانەوەی جوولەکەکان.

## بابەت: نوێژ کردن لەسەر بەرماڵ

١٤١٨ - «عَنْ مَيْمُونَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي عَلَى الْخُمْرَةِ»[١].

واتە: لە مەیمونەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر بەرماڵ دەکرد.

١٤١٩ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى عَلَى حَصِيرٍ»[٢]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر حەسیر کرد.

## بابەت: نوێژ کردن لە جلی خێزانی (ئەو جلەی بۆ نوستن بەکاردێ)

١٤٢٠ - «عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا، أَنَّهُ سَأَلَ أُمَّ حَبِيبَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا، هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الَّذِي يُضَاجِعُكِ فِيهِ؟ قَالَتْ: نَعم، إِذَا لَمْ يَرَ فِيهِ أَذًى»[٣].

واتە: لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) گێردراوەتەوە، کە پرسیاری کە ئوممی حەبیبە (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا)، کردووە: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد بەو جلەی پێی لەگەڵ تۆ دەخەوت؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر هیچ شتێکی پیس و قێزەونی پێوە نەبینیایە.

١٤٢١ - «عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا، عَنْ أُخْتِهِ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ سَأَلَهَا: هَلْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الَّذِي يُجَامِعُهَا فِيهِ؟ قَالَتْ: نَعم إِذَا لَمْ يَرَ فِيهِ أَذًى»[٤].

واتە: لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە خوشکی خۆی ئوممی حەببەی (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) خێزانی پێغەمبەر ﷺ گێراوەتەوە، کە پرسیاری لێکردووە: ئایا پێغەمبەر ﷺ نوێژی دەکرد بەو جلەی پێی لەگەڵ تۆ دەخەوت؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر هیچ شتێکی پیس و قێزەونی پێوە نەبینیایە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.




## بابەت: نوێژ بە نەعلە و پێڵاوەوە

١٤٢٢ - «عَنْ أَبِي مَسْلَمَةَ هُوَ سَعِيدُ بْنُ يَزِيدَ الْأَزْدِيُّ، قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مالَكٍ ﷺ، أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي نَعْلَيْهِ، قَالَ: نَعم»[١].

واتە: لە ئەبو مەسلەمە کە سەعیدی کوڕی یەزیدی ئەزدیە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ کرد: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بە نەعلە و پێڵاوەکانی نوێژی دەکرد؟ وتی: بەڵێ.

١٤٢٣ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ ، قَالَ: بَيْنَمَا كان رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ إِذْ خَلَعَ نَعْلَيْهِ فَوَضَعَهُمَا عَنْ يَسَارِهِ، فَخَلَعُوا نِعَالَهُمْ، فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ، قَالَ: مَا حَمَلَكُمْ عَلَى إِلْقَائِكُمْ نِعَالَكُمْ؟ قَالُوا: رَأَيْنَاكَ خَلَعْتَ فَخَلَعْنَا، قَالَ: إِنَّ جِبْرِيلَ أَتَانِي - أَوْ أَتَى - فَأَخْبَرَنِي أَنَّ فِيهِمَا أَذًى - أَوْ قَذَرًا - فَإِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، فَلْيُقَلِّبْ نَعْلَيْهِ، فَإِنْ رَأَى فِيهِمَا أَذًى، فَلْيُمِطْ وَلْيُصَلِّ فِيهِمَا»[٢].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بە هاوەڵەکانی دەکرد لەناکاو پێڵاوەکانی داکەند و لەلای چەپی دانا، هاوەڵەکانیش هەموویان پێڵاوەکانیان داکەند، جا کاتێک نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: چی وای لێکردن لەوەی پێڵاوەکانتان لابدەن و دایبکەنن؟ وتیان: بینیمان تۆ داتکەند و ئێمەش دامانکەند، فەرمووی: جیبریل ﷺ هات بۆ لام و پێی ڕاگەیاندم کە پیسیەکیان پێوەیە، بۆیە هەر کاتێک یەکێک لە ئێوە هات بۆ مزگەوت با پێڵاوەکانی وەربگێڕێت (سەیری بنەوەیان بکات)، ئەگەر پیسیەکی پێوە بینی با لێی بکاتەوە و نوێژی پێوە بکات.

## بابەت: نەهی کردن لە بەردانەوەی جل و نەگرتنی

١٤٢٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ كَرِهَ السَّدْلَ وَرَفَعَ ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ»[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە بە باشی نەزانیوە جل بەر بدرێتەوەو نەگیرێ، ئەو کارەشی بەرزکردۆتەوە بۆ پێغەمبەری خواو ﷺ (وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی).

## بابەت: دەربارەی لولدان و کۆکردنەوەی قژ

١٤٢٥ - «عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ، قَالَ: رَآنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا سَاجِدٌ، وَقَدْ عَقَصْتُ شَعْرِي، أَوْ قَالَ: عَقَدْتُ فَأَطْلَقَهُ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ ضعيف.

(٤) ـ حسن.

واتە: لە ئەبو ڕافیعەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ منی بینی، لە کاتێکدا من کڕنووشم بردبوو، قژی خۆشم لول دابوو ـ یان وتی: گرێم دابوو ـ جا پێغەمبەری خوا ﷺ کردیەوە.

١٤٢٦ - «عَنْ بُكَيْرٍ، أَنَّ كُرَيْبًا، مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، حَدَّثَهُ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، رَأَى عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْحَارِثِ ﷺ، يُصَلِّي وَرَأْسُهُ مَعْقُوصٌ مِنْ وَرَائِهِ فَقَامَ وَرَاءَهُ، فَجَعَلَ يَحُلُّهُ، وَأَقَرَّ لَهُ الْآخَرُ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ: مَا لَكَ وَرَأْسِي؟ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّمَا مَثَلُ هَذَا كَمَثَلِ الَّذِي يُصَلِّي وَهُوَ مَكْتُوفٌ»[١].

واتە: لە بوکەیرەوە گێردراوەتەوە، کە کوڕەیبی خزمەتکاری ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) بۆی گێڕاوەتەوە، کە ئیبنو عەبباس عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی ﷺ بینی نوێژی دەکرد و قژی لول دابوو لە دواوە، ئیبنو عەبباسیش لە دواوەی وەستا و قژەکەی دەکردەوە، وە کەسێکی تریش دانی بەکارەکە داهێنا، دواتر (عەبدوڵڵای کوڕی حاریس کە لە نوێژەکەی بوویەوە) چوو بۆ لای ئیبنو عەبباس و وتی: چ کارت بە من و قژەکەمە؟ ئیبنو عەبباس وتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: نمونەی ئەو کەسە وەک نمونەی ئەو کەسە وایە کە نوێژ دەکات لە کاتێکدا بەسترابێتەوە (واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لەو جۆرە قژ توندکردنە کردووە).

## بابەت: باوێشکدان لە نوێژدا

١٤٢٧ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَشُدَّ يَدَهُ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: يَعْنِي عَلَى فِيهِ»[٢].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعیدەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئەگەر کەسێک لە ئێوە باوێشکی هات با دەستی توند بکات (لەسەر دەمی دایبنێت)، چونکە شەیتان دەچێتە ژوورەوە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (دەستی توند بکات دایبنێت) لەسەر دەمی.

## بابەت: مەکروهی نوێژ بۆ کەسی خەواڵو

١٤٢٨ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمُ النَّوْمَ وَهُوَ يُصَلِّي فَلْيَنَمْ، حَتَّى يَذْهَبَ نَوْمُهُ، فَإِنَّهُ عَسَى يُرِيدُ أَنْ يَسْتَغْفِرَ، فَيَسُبَّ نَفْسَهُ»[٣].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئەگەر کەسێک لە ئێوە هەستی بە خەو کرد، لە کاتێکدا نوێژی دەکرد، ئەوە با بخەوێت تا خەوەکەی

(١) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، ولكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

دەڕوا و (چوست دەبێتەوە)، چونكە ڕەنگە بیەوێت داوای لێخۆشبوون بكات كەچی جوێن بەخۆی بدات (یان قسەی ناڕەوا و هەڵیت و پەڵیت بڵێت).

تێبینی: ئەمە زیاتر بۆ ئەو كاتانەیە كە مرۆڤ خەریكی نوێژی زۆر بێت، وەک تەڕاویح و شەو نوێژ و قورئان خوێندن، یان بۆ ئەو نوێژانەی كە كاتیان فراوانەو دەگونجێت تۆزێک بخەوێت ئنجا نوێژەكەی بكات، بەڵام نابێت لەو كاتانەدا بخەوێت كە مەودایەكەی كەمە و ترسی هەیە خەبەری نەبێتەوە، هەروەها ناكرێت ئەگەر چووە ناو نوێژەكە و خەوی هات بیبڕێت، دەبێ پێش ئەوەی دەست بە نوێژەكە بكات بخەوێت ئنجا دواتر نوێژەكەی بكات، جا كە لەم فەرموودەیەدا هاتوە دەفەرموێ: ئەگەر لە نوێژدا بوویت و خەوت هات بڕۆ بخەوە، مەبەستی ئەو كەسانەیە كە نوێژی زۆر دەكەن و كە خەویان دێت لەناو نوێژەكە هەستی پێ دەكەن، بۆیە دوای تەواو بوونی ئەو نوێژەی تیایدا هەستی بە خەوەكە كرد با بچێت بخەوێت. والله أعلم.

## بابەت: نوێژی كەسی دانیشتوو نیوەی نوێژی كەسی وەستاوە (لە پاداشتدا)

١٤٢٩ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: صَلَاةُ الرَّجُلِ جَالِسًا نِصْفُ الصَّلَاةِ. قَالَ: فَدَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يُصَلِّي جَالِسًا فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ قُلْتَ: صَلَاةُ الرَّجُلِ جَالِسًا نِصْفُ الصَّلَاةِ وَأَنْتَ تُصَلِّي جَالِسًا؟ قَالَ: أَجَلْ، وَلَكِنِّي لَسْتُ كَأَحَدٍ مِنْكُمْ»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێم گەیشتبوو كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی مرۆڤ بە دانیشتنەوە (پاداشتەكەی) نیوەی نوێژی ئاسایی هەیە، دەڵێ: چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە كاتێكدا نوێژی دەكرد بە دانیشتنەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پێم گەیشتووە تۆ فەرمووتە: نوێژی مرۆڤ بە دانیشتنەوە (پاداشتی) نیوەی نوێژی هەیە، لە كاتێكدا تۆبە دانیشتنەوە نوێژ دەكەی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ وایە، بەڵام من وەک هیچ یەكێک لە ئێوە نیم، (چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتۆتە ئەوپەڕی ئەجر، ئیتر هەرگیز ئەم شتانە لە ئەجری كەم ناكەنەوەو خوای بەرزو مەزن كردوویەتی بە بەرێزترین و گەورەترین دروستكراو چڵەپۆپەی پاداشتی پێشكەش بەو كردووە).

## بابەت: نوێژی سوننەت بە دانیشتنەوە

١٤٣٠ - «أَنَّ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي سُبْحَتِهِ وَهُوَ جَالِسٌ حَتَّى كَانَ قَبْلَ أَنْ يُتَوَفَّى، بِعَامٍ وَاحِدٍ أَوْ عَامَيْنِ، فَرَأَيْتُهُ يُصَلِّي فِي سُبْحَتِهِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَيُرَتِّلُ السُّورَةَ حَتَّى تَكُونَ أَطْوَلَ مِنْ أَطْوَلَ مِنْهَا»[2].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

واتە: حەفصە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینی بوو نوێژە سوننەتەکانی بە دانیشتنەوە بکات تا پێشی وەفات کردنی بە ساڵێک یان دوو ساڵ، (لەو ماوەیەدا) بینیم نوێژە سوننەتەکانی دەکات، لە کاتێکدا دانیشتووە، سورەتێکی دەخوێند بە هێواشی و لەسەرەخۆیی تا سورەتەکە زۆر لە خۆی درێژتر دەبوویەوە (کاتی زیاتری دەخایەند).

تێبینی: واتە پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە هێزی کەمی کردبوو بەتەمەندا چووبوو شەو نوێژی زۆرو درێژیشی دەکرد، بۆیە بە دانیشتنەوە نوێژەکانی ئەنجام دەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تۆڵەی دانیشتنەکەی دەکردەوە بە درێژکردنەوەو لەسەرەخۆ خوێندنی قورئانەکە.

١٤٣١ - «أَخْبرنا عُثْمَانُ بْنُ عُمَرَ، أَنْبَأَنَا مالِكٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ أَبِي وَدَاعَةَ، عَنْ حَفْصَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِهَذَا الْحَدِيثِ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودەی پێشوو گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: نەهی کردن لە دەستوەردان لە وردە بەرد (لە نوێژدا)

١٤٣٢ - «حَدَّثَنِي مُعَيْقِيبٌ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قِيلَ لَهُ فِي الْمَسْحِ فِي الْمَسْجِدِ قَالَ: إِنْ كُنْتَ لاَ بُدَّ فَاعِلاً، فَوَاحِدَةً، قَالَ هِشَامٌ: أُرَاهُ قَالَ: يَعْنِي مَسْحَ الْحَصَا»[٢].

واتە: لە موعەیقیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا دەربارەی دەستوەردان (لە وردە بەرد) لە مزگەوتدا، فەرمووی: ئەگەر هەر دەبوو وا بکات (لەبەر خراپی و ڕشدی شوێنی کڕنووش بردنەکەی) ئەوە با جارێک بێت، هیشام وتویەتی: پێم وایە وتی: (مەبەست بە دەست وەردان) واتە: دەست وەردان لە وردە بەرد.

١٤٣٣ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ إِلَى الصَّلاَةِ، فَإِنَّ الرَّحْمَةَ تُوَاجِهُهُ، فَلاَ يَمْسَحِ الْحَصَا»[٣].

واتە: لە ئەبو زەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێ یەکێک لە ئێوە هەڵدەستێت بۆ نوێژ، ئەوە ڕەحمەت و بەزەیی خوا بەرەو ڕووی دێت، کەواتە: با دەست لە وردە بەرد و (شتی وا) وەرنەدات.

## بابەت: زەوی هەمووی پاکە (بۆ نوێژ کردن) جگە لە گۆڕستان و گەرما و

١٤٣٤ - «عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ نَبِيٌّ قَبْلِي: كَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ كَافَّةً، وَأُحِلَّتْ لِيَ الْمَغَانِمُ، وَحُرِّمَتْ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلِي، وَجُعِلَتْ لِيَ الْأَرْضُ طَيِّبَةً مَسْجِدًا وَطَهُورًا، وَيَرْعَبُ مِنَّا عَدُوُّنَا مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ»[١].

واتە: لە جابیری كوڕی عەبدوڵلاوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە كە دەیووت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج شتم پێدراوە كە بە هیچ پێغەمبەرێكی پێشی من نەدراوە، پێشتر هەر پێغەمبەرێك تەنها و تایبەت بۆ گەلەكەی ڕەوانە دەكرا، كەچی من بۆ گشت خەڵكی ڕەوانە كراوم، وە دەستكەوتی جەنگیم بۆ حەڵاڵ كراوە، كەچی حەڕام كرابوو لەسەر پێغەمبەرانی پێشتر، وە من هەموو زەوییەكی پاكم بۆ بە مزگەوت و (شوێنی نوێژكردن)و پاكیزە دانراوە، وە دوژمنەكانمان لێمان دەترسن بە ئەندازەی مانگە ڕێیەك، وە هەروەها شەفاعەتیشم پێدراوە (شەفاعەتی گەورە).

١٤٣٥ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ، إِلاَّ الْمَقْبَرَةَ وَالْحَمَّامَ» قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ: تُجْزِئُ الصَّلاَةُ فِي الْمَقْبَرَةِ؟ قَالَ: إِذَا لَمْ تَكُنْ عَلَى الْقَبْرِ فَنَعم، وَقَالَ: الْحَدِيثُ أَكْثَرُهُمْ أَرْسَلُوهُ»[٢].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەوی هەمووی شوێنی نوێژ كردنە، تەنها گۆڕستان و گەرماو (حەمام) نەبێت.

بە ئەبو موحەممەد وترا: ئایا نوێژ دروست دەبێت و بەردەكەوێت لە گۆڕستاندا؟ وتی: ئەگەر لەسەر خودی گۆڕەكە نەبێت بەڵێ، وە وتویەتی: زۆربەی زانایان ئەو فەرموودەیان بە موڕسەل داناوە.

## بابەت: (حوكمی) نوێژ لە مۆڵگەی مەڕوبزن و مۆڵگەی وشتر

١٤٣٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَلَمْ تَجِدُوا إِلاَّ مَرَابِضَ الْغَنَمِ، وَأَعْطَانَ الْإِبِلِ، فَصَلُّوا فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ، وَلاَ تُصَلُّوا فِي أَعْطَانِ الْإِبِلِ»[٣].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر كاتی نوێژ هات و هیچ شوێنێكیشتان دەست نەكەوت جگە لە مۆڵگەی مەڕو بزن و مۆڵگەی وشتر، ئەوە لە مۆڵگەی مەڕو بزن نوێژ بكەن، لە مۆڵگەی وشتر نوێژ مەكەن.

تێبینی: لەبەر ئەوە باش نیە نوێژ لە مۆڵگە و شوێنی وشتر بكرێت، چونكە وشتر گیاندارێكی بەهێز و زەبەلاحە ڕەنگە پەلاماری نوێژخوێنەكە بدات و جێگای ترسە، بەڵام هەرچی مەڕو بزنە گیانداری بچوكن و جێگای ترس نین و كارەسات جێناهێڵن ئەگەر هێرش بكەن.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: ئەو كەسەی مزگەوتێک لە پێناوی خوا دروست دەكات

١٤٣٧ - «عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ، أَنَّ عُثْمَانَ ﷺ لَمَّا أَرَادَ أَنْ يَبْنِيَ الْمَسْجِدَ كَرِهَ النَّاسُ ذَلِكَ فَقَالَ عُثْمَانُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ بَنَى لِلَّهِ مَسْجِدًا، بَنَى اللهُ لَهُ فِي الْجَنَّةِ مِثْلَهُ»[1].

واتە: لە مەحمودی كوڕی لەبیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عوسمان ﷺ كاتێ ویستی مزگەوت دروست بكات خەڵک ئەو كارەیان پێ چاک نەبوو، عوسمانیش وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر كەسێک مزگەوتێک لە پێناوی خوا دروست بكات، ئەوە خوا (ماڵێكی) وەكو ئەوی لە بەهەشت بۆ دروست دەكات.

تێبینی: واتە مزگەوتەكە چەند گرنگ و سودبەخش و ڕێک بێت، خواش ئەوەندە زیاتر ماڵێكی بۆ دروست دەكات كە گرنگتر و ڕێكتر و جوانتر بێت لە ماڵەكانیتری خەڵكی بەهەشت و لە ماڵەكانی تری خۆشی كە لە بەهەشت هەیەتی.

## بابەت: دوو ڕەكعەتەكان كاتێ كەسێک دەچێتە ناو مزگەوتەوە

١٤٣٨ - «عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ»[2].

واتە: لە ئەبو قەتادەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر كەسێک لە ئێوە هاتە مزگەوت با دوو ڕەكعەت نوێژ بكات پێش ئەوەی دابنیشێت.

## بابەت: گۆتەی (چی پێ دەگوترێت) كاتی چوونە مزگەوت

١٤٣٩ - «عَنْ عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ سَعِيدِ بْنِ سُوَيْدٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبا حُمَيْدٍ ﷺ، أَوْ أَبا أُسَيْدٍ الْأَنْصَارِيَّ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ، فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ، ثُمَّ لِيَقُلْ: اللهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ، فَلْيَقُلْ: اللهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ»[3].

واتە: لە عەبدولمەلیكی كوڕی سەعیدی كوڕی سوەیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو حومەید ﷺ و ئەبو ئوسەیدی ئەنصاری ﷺ بوو دەیان وت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر كەسێک لە ئێوە چووە مزگەوت، ئەوە با سەلام لە پێغەمبەری خوا ﷺ بكات (بڵێت: بسم الله والصلاة والسلام على رسول الله) دواتر بڵێت: (اللهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ) واتە: خوایە دەرگای ڕەحمەتی خۆتم لێ بكەیتەوە، وە كاتێک (لە مزگەوت) چووە دەرەوە با بڵێت: (اللهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ) واتە: خوایە من داوای بەخششت لێ دەكەم.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

تێبینی: لە کاتی چوونە دەرەوەش سوننەت وایە لەپێشدا بڵێت: (بسم الله والصلاة والسلام على رسول الله) دواتر بڵێت: (اللهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ).

## بابەت: مەکروهی تف ڕشتن لەناو مزگەوت

١٤٤٠ - «حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ: قُلْتُ لِقَتَادَةَ، أَسَمِعْتَ أَنَسًا ﷺ، يَقُولُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: الْبُزَاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ؟ قَالَ: نَعم، وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا»[١].

واتە: لە شوعبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە قەتادەم وت: ئایا گوێت لە ئەنەس بوو ﷺ کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕایەوە و دەیووت: تف ڕشتن لە مزگەوتدا گوناهە؟ (قەتادە) وتی: بەڵێ، وە ڕەشبوونەوە تاوانەکەش بریتیە لە شاردنەوە و پاک کردنەوەی تفەکە.

١٤٤١ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا صَلَّى، فَإِنَّمَا يُنَاجِي رَبَّهُ - أَوْ رَبُّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ - فَإِذَا بَزَقَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ، أَوْ يَقُولُ هَكَذَا وَبَزَقَ فِي ثَوْبِهِ وَدَلَكَ بَعْضَهُ بِبَعْضٍ»[٢].

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەندە کاتێ نوێژ دەکات، بە ئەسپایی قسە لەگەڵ خوای خۆی دەکات، یان ئەو نوێژەی ئەنجامی دەدات بۆ خواکەی لە نێوان خۆی و نێوان قیبلە دایە، جا ئەگەر کەسێک لە ئێوە ویستی تف بڕێژێت، ئەوە با تف بخاتە لای چەپی یان ژێر پێی، یانیش ئاوا دەکات: جا تفی کردە جلەکەی و بە بەشێک لە جلەکەی هەڵیگوشی.

تێبینی: جاری وا هەیە مرۆڤ ناچار دەبێت لەناو نوێژ تف بڕژێنێت بە هەر هۆکارێک بێت، وەک هاتنە دەرەوەی پاشماوەی خۆراک لەناو ددانەکانی بۆ ناو دەمی یان هاتنی بەڵغەم یان هەر هۆکارێکی تر، لەو کاتەدا ئەگەر مزگەوتەکە یان ئەو شوێنەی نوێژی لێ دەکرد ڕایەخی تیابوو ئەوە باشترین ڕێگا ئەوەیە تفەکە بخاتە بەشێکی جلەکەیەوە چونکە پیس نیە و نوێژی لێ دێت، تەنها قێزەونە دواتر با بیشۆرێت، بەڵام ئەگەر شوێنەکە ڕایەخی لێ نەبوو خۆڵ بوو ئەوە با بیڕژێنێتە بن قاچی یان لای چەپی، دواتریش کە لە نوێژەکەی تەواو بوو تفەکە بخاتە ژێرەوەی خۆڵەکە، بەڵام نابێ تفەکە لەبەر دەمی خۆی بڕژێنێت، چونکە ئەو عیبادەتە گەورەیەی ئەنجامی دەدات کە قسە کردنە لەگەڵ پەروەردگاری دەکەوێتە نێوان خۆی و قیبلە، کەواتە: نابێ بێ ڕێزی بەرامبەر بەو ئاراستەیە بکرێت. والله أعلم.

١٤٤٢ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: بَيْنَا النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ إِذْ رَأَى نُخَامَةً فِي قِبْلَةِ الْمَسْجِدِ فَتَغَيَّظَ عَلَى أَهْلِ الْمَسْجِدِ وَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ قِبَلَ أَحَدِكُمْ إِذَا كَانَ فِي صَلَاتِهِ، فَلَا يَبْزُقَنَّ - أَوْ قَالَ: لَا يَتَنَخَّعَنَّ - ثُمَّ أَمَرَ بِهَا فَحُكَّ مَكَانُهَا، وَأَمَرَ بِهَا فَلُطِخَتْ قَالَ حَمَّادٌ: وَلَا أَعْلَمُهُ إِلَّا قَالَ بِزَعْفَرَانٍ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا لەناکاو بەڵغەمێکی بینی لەناو قیبلەی مزگەوتەکەوە، بۆیە لە خەڵکی مزگەوت توڕە بوو فەرمووی: بێگومان خوا ڕوو لە هەر یەکێک لە ئێوە دەکات (بە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی) کاتێ لەناو نوێژ دایە، کەواتە با (کەس) تف نەڕێژێت ـ یان فەرمووی: با بەڵغەم نەڕێژێت ـ دواتر فەرمانی کرد شوێنەکەی ڕنرا و پاک کرایەوە، وە فەرمانی کرد بەوەی شتێک لە شوێنەکەی بدرێت، حەمماد وتویەتی: نەمزانیوە باسی هیچی کردبێت تەنها وتی: بە زەعفەران (واتە: زەعفەران لەگەڵ شوێنەکە تێکەڵ کراوە).

١٤٤٣ - «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبا سَعِيدٍ ﷺ، وَأَبا هُرَيْرَةَ ﷺ، أَخْبَرَاهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى نُخَامَةً فِي جِدَارِ الْمَسْجِدِ، فَتَنَاوَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَصَاةً وَحَتَّهَا ثُمَّ قَالَ: إِذَا تَنَخَّمَ أَحَدُكُمْ، فَلاَ يَتَنَخَّمَنَّ قِبَلَ وَجْهِهِ، وَلاَ عَنْ يَمِينِهِ، وَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ»[1].

واتە: لە حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو سەعید ﷺ و ئەبو هوڕەیرە ﷺ پێیان ڕاگەیاندووە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ (جارێکیان) بەڵغەمێکی بینی بە دیواری مزگەوتەکەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ بەردێکی هەڵگرت و بەڵغەمەکەی ڕنی (لە دیوارەکەی کردەوە)، دواتر فەرمووی: ئەگەر کەسێک لە ئێوە بەڵغەمی ڕشت با نەیڕژێنێتە بەرامبەری خۆی و لای ڕاستی، بەڵکو با بیڕژێنێتە لای چەپی یان ژێر پێی.

## بابەت: نوستن لە مزگەوتدا

١٤٤٤ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، قَالَ: أَتَانِي نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا نَائِمٌ فِي الْمَسْجِدِ فَضَرَبَنِي بِرِجْلِهِ، قَالَ: أَلاَ أَرَاكَ نَائِمًا فِيهِ؟ قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، غَلَبَتْنِي عَيْنِي»[2].

واتە: لە ئەبو زەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام، لە کاتێکدا من خەوتبووم لە مزگەوتدا، (پێغەمبەری خواش ﷺ) بە قاچی لێیدام، فەرمووی: ئەوە بۆ دەتبینم بە خەوتویی لە مزگەوتدا؟ دەڵێ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاوم بەسەرمدا زاڵ بوو (خەوم لێکەوت، ئەگەرنا هەوڵمدا بەرگە بگرم و نەخەوم).

١٤٤٥ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ فِي الْمَسْجِدِ وَلَمْ يَكُنْ لِي أَهْلٌ، فَرَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّمَا انْطُلِقَ بِي إِلَى بِئْرٍ فِيهَا رِجَالٌ مُعَلَّقُونَ فَقِيلَ: انْطَلِقُوا بِهِ إِلَى ذَاتِ الْيَمِينِ، فَذَكَرْتُ الرُّؤْيَا لِحَفْصَةَ فَقُلْتُ: قُصِّيهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَصَّتْهَا عَلَيْهِ فَقَالَ: مَنْ رَأَى هَذِهِ؟ قَالَتْ: ابْنُ عُمَرَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: نِعْمَ الْفَتَى - أَوْ قَالَ: نِعْمَ الرَّجُلُ -لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: وَكُنْتُ إِذَا نِمْتُ لَمْ أَقُمْ حَتَّى أُصْبِحَ. قَالَ: فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُصَلِّي اللَّيْلَ»[3].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عومەر (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: من شەوان لە مزگەوت دەخەوتم و خێزان و منداڵم نەبوو (سەڵت بووم)، لە خەومدا بینیم وەک بڵێی دەیانبردم بۆ ناو بیرێک کە زۆر پیاوی تیابوو، هەڵواسرابوون، جا وترا: بیبەن بۆ لای ڕاست، (دەڵێ) منیش خەونەکەم بۆ حەفصە گێڕایەوە و وتم: بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ بگێڕەوە، حەفصەش بۆ پێغەمبەری خوای گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ ئەم خەونەی بینیوە؟ حەفصە وتی: ئیبنو عومەر، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: چاکترین گەنجە ـ یان فەرمووی: چاکترین پیاوە ـ ئەگەر شەونوێژ بکات، (ئیبنو عومەر) دەڵێ: پێشتر (پێشی ئەو قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ) شەوان دەنوستم (لە مزگەوت) هەڵنەدەستام تا بەیانی، (جا نافیعی خزمەتکاری ئیبنو عومەر) دەڵێ: ئیبنو عومەر هەموو شەوێک شەونوێژی دەکرد (واتە دوای قسەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ).

تێبینی: کەواتە خەونە ناخۆشەکە واتای ئەوەیە ناکرێت کەسێک هەر لە مزگەوت بخەوێت و عیبادەتێکیشی تیا نەکات.

## بابەت: نەهی کردن لە بانگ ڕاهێشتن بۆ دۆزینەوەی شتی ون بوو کڕین و فرۆشتن (لە مزگەوتدا)

١٤٤٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبِيعُ، أَوْ يَبْتَاعُ فِي الْمَسْجِدِ، فَقُولُوا: لاَ أَرْبَحَ اللهُ تِجَارَتَكَ، وَإِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَنْشُدُ فِيهِ الضَّالَّةَ، فَقُولُوا: لاَ رَدَّهَا اللهُ عَلَيْكَ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بینیتان کەسێک شت دەفرۆشێت یان دەکڕێت لە مزگەوتدا، ئەوە بڵێن: یارەبی خوا قازانج نەخاتە بازرگانیەکەتەوە، وە ئەگەر بینیتان کەسێک داوای دۆزینەوەی شتێکی ونبووی دەکرد لە مزگەوتدا، بڵێن: یارەبی خوا بۆت نەگەڕێنێتەوە.

تێبینی: کەواتە هەر شتێک کە نەگونجێت لەگەڵ کاری سەرەکی مزگەوت، کە لە ئەصڵدا شوێنی عیبادەت و خزمەتی ئیسلام و کاری گشتی مسوڵمانانە، ئەوە ئەو شتە نارەوایە لە مزگەوت ئەنجام بدرێت، وەک کاروبار و مەسڵەحەتی تایبەتی و بازرگانی کردن و ڕێکلام و..هتد، چونکە ئەگەر وانەبێت ئەو کات مزگەوت قودسیەتی نامێنێت و، خەڵک بۆ بەرژەوەندی تایبەتی بەکاری دەهێنێت.

## بابەت: نەهی کردن لە بەدەرخستنی چەک لە مزگەوتدا

١٤٤٧ - «حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، قَالَ: قُلْتُ لِعَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، أَسَمِعْتَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، يَقُولُ: مَرَّ رَجُلٌ يَحْمِلُ نَبْلاً، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: أَمْسِكْ نُصُولَهَا؟. قَالَ: نَعم»[٢].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

واتە: لە سوفیانی کوڕی عویەینەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە عەمڕی کوڕی دینارم وت: ئایا گوێت لە جابیری کوڕی عەبدوڵلا بوو (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) دەیووت: پیاوێک تێپەڕی (بە مزگەوتدا) کە هەندێک تیری هەڵگرتبوون، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: سەری تیرەکان بگرە (بۆ ئاوا واڵات کردووە)؟ وتی: بەڵێ باشە.

تێبینی: چونکە مزگەوت جێگای ئاشتی و پێکەوە ژیانە، ناکرێت شتێکی تیا بکرێت کە خەڵک بەهۆیەوە بترسێت، یان تووشی زەرەر و زیان بێت، جا ئەم فەرموودەیە هەموو شوێنێکی گشتی دەگرێتەوە وەک زانایان فەرموویانە.

## بابەت: نەهی کردن لەوەی گۆڕ وەک مزگەوت عیبادەتی لە پاڵ بکرێت، یان لە شوێنی گۆڕ مزگەوت دروست بکرێت

١٤٤٨ - «أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، وَعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالاَ: لَمَّا نُزِلَ بِالنَّبِيِّ ﷺ، طَفِقَ يَطْرَحُ خَمِيصَةً لَهُ عَلَى وَجْهِهِ، فَإِذَا اغْتَمَّ، كَشَفَهَا عَنْ وَجْهِهِ، فَقَالَ وَهُوَ كَذَلِكَ: لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى؛ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ، يُحَذِّرُ مِثْلَ مَا صَنَعُوا»[1].

واتە: لە عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلا گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو عەبباس (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) و عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) وتویانە: کاتێک (ئەو نەخۆشیەی تیایدا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد) تووشی پێغەمبەر ﷺ بوو (پارچە قوماشێکی بەسەر ڕوخساری دادابوو)، پارچە قوماشەکەی لادا لەسەر ڕوخساری، چونکە کاتێک نەفەسی تەنگ دەبوو قسەی ڕوون نەدەبوو پارچە قوماشەکەی لادەدا (تا قسەکانی بە ڕوونی بکەن)، لەو حاڵەتەدا فەرمووی: نەفرەتی خوا لە جوولەکە و گاورەکان بێت، گۆڕی پێغەمبەرەکانیان دەکردن بە مزگەوت، (ئا بەو شێوەیە) ئاگاداری دەدا و (مسوڵمانانی دەترساند) لە هاوشێوەی ئەوەی ئەوان کردوویانە.

## بابەت: نەهی کردن لەوەی پەنجەکانی دەست بخرێنە نێو یەکتری کاتێ کەسێک دەردەچێت بۆ مزگەوت

١٤٤٩ - «عَنْ أَبِي ثُمَامَةَ الْحَنَّاطِ، قَالَ: أَدْرَكَنِي كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ ﷺ، بِالْبَلاَطِ، وَأَنَا مُشَبِّكٌ بَيْنَ أَصَابِعِي، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ ثُمَّ خَرَجَ عَامِدًا إِلَى الصَّلاَةِ، فَلاَ يُشَبِّكْ بَيْنَ أَصَابِعِهِ»[2].

واتە: لە ئەبو سومامەی حەننانەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کەعبی کوڕی عوجرە پێم گەیشت لە بەلات (کە شوێنێکە لەناو مەدینە لە نزیکی مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ)، لە کاتێکدا من پەنجەکانی دەستم خستبوونە نێو یەکتری، (کەعب) وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک یەکێک لە ئێوە دەستنوێژی شۆرد، دواتر دەرچوو مەبەستی نوێژ کردن بوو، ئەوە با پەنجەکانی نەخاتە نێو یەکتریەوە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ حسن.

١٤٥٠ - «عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا تَوَضَّأْتَ فَعَمَدْتَ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَلاَ تُشَبِّكَنَّ بَيْنَ أَصَابِعِكَ، فَإِنَّكَ فِي صَلاَةٍ»[1].

واتە: لە كەعبی كوڕی عوجرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێ دەستنوێژت شۆرد و ڕووت كردە مزگەوت، ئەوە پەنجەكانت مەخەرە نێو یەكتریەوە، چونكە تۆ لە نوێژدای.

تێبینی: حیكمەتی ئەو بابەتە ئەوەیە، مرۆڤ كاتێك بۆ نوێژ كردن دەچێتە مزگەوت، وەك ئەوە بۆی ئەژمار دەكرێت كە لە نێو نوێژدایە، ئە و جۆرە حاڵەتانەش لەگەڵ نوێژ ناگونجێن، كەواتە دەبێ زۆر بە ویقارو و بە ڕێز و بە ڕەوشت و بە گوفتار و كرداری جوان بە ڕێگادا بڕوات لەو كاتەدا.

١٤٥١ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ تَوَضَّأَ ثُمَّ خَرَجَ يُرِيدُ الصَّلاَةَ، فَهُوَ فِي صَلاَةٍ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى بَيْتِهِ، فَلاَ تَقُولُوا هَكَذَا يَعْنِي: يُشَبِّكُ بَيْنَ أَصَابِعِهِ»[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك دەستنوێژ بشۆرێت، ئەوە (لە پاداشتدا وا حیساب دەكرێت) لە نوێژ دایە تاوەكو دەگەڕێتەوە ماڵەوەی، كەواتە: ئاوا مەكەن: پەنجەكانی دەستی خستنە نێو یەكتری (واتە: پەنجەكانی دەستتان مەخەنە نێو یەكتریەوە).

## بابەت: پاداشت و گەورەیی ئەو كەسەی لە مزگەوتدا دادەنیشێت چاوەڕێی نوێژ دەكات

١٤٥٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لاَ تَزَالُ الْمَلاَئِكَةُ تُصَلِّي عَلَى الْعَبْدِ، مَا دَامَ فِي مُصَلاَّهُ الَّذِي يُصَلِّي فِيهِ مَا لَمْ يَقُمْ أَوْ يُحْدِثْ، تَقُولُ: اللهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللهُمَّ ارْحَمْهُ»[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەبەردەوامی فریشتە دووعای ڕەحمەت بۆ بەندە دەكەن، مادەم لەو شوێنە بێت كە نوێژی تیادا كردووە و، هەڵنەستابێت و دەستنوێژی نەشكابێت، فریشتەكان دەڵێن: خوایە لێی خۆشبە، خوایە ڕەحمی پێ بكە.

## بابەت: دەربارەی ڕازاندنەوەی مزگەوت

١٤٥٣ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مالَكٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَبَاهَى النَّاسُ فِي الْمَسَاجِدِ»[4].

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، فەرموویەتی: دونیا تێكناچێت تاوەكو خەڵك فیز بە مزگەوت لێدەدەن (واتە: دەیرازێننەوە بۆ ئەوەی

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن، ولكن الحديث صحيح.

(٤) ـ صحيح.

بڵێن ئەها من چ مزگەوتێکم دروست کردوە، مەبەستیان پێی خوا نیە، مەبەستیان ڕوپامایی و فیز و خۆ هەڵدانەوەیە).

تێبینی: من زۆر جار شێوازێ بە کار دەێنم لە نوسین بۆ نموونە: دونیا: کە لای ئێمە دنیایە، دێت: لای ئێمە دێ یە، مەبەستمە لە مەنهەجی ئەو لانەدەم، ئەگەر نا بۆ خۆمان وەک خۆیەتی.

### بابەت: (حوکمی) نوێژ ڕوەو سوترە (بەربەست)

١٤٥٤ - «عَنِ الْحَكَمِ بْنِ عُتَيْبَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أبا جُحَيْفَةَ ﷺ، يَقُولُ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْبَطْحَاءِ بِالْهَاجِرَةِ فَصَلَّى الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، وَالْعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ، وَبَيْنَ يَدَيْهِ عَنَزَةٌ، وَإِنَّ الظُّعُنَ لَتَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ»[1].

واتە: لە حەکەمی کوڕی عوتەیبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو جوحەیفە بوو ﷺ دەیووت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ بەتحا بە نیوەڕۆ، نوێژی نیوەڕۆی کرد بە دوو ڕەکعەت، وە عەسریشی کرد بە دوو ڕەکعەت (بە قەسرو جەمع)، ڕمێکی بچکۆڵەشی لە بەردەم بوو (واتە: ڕمەکەی کردبوو بەربەست، تاوەکو کەس بە شوێنی کڕنووشەکەیدا تێپەڕ نەبێت)، بارهەڵگرەکان و کاروانەکانیش بەبەردەمیدا تێپەڕ دەبوون (لە دواوەی سوترە و بەربەستەکە).

١٤٥٥ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَتْ تُرْكَزُ لَهُ الْعَنَزَةُ يُصَلِّي إِلَيْهَا»[2].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕمێکی بچکۆڵەی بۆ دەچەقێنرا، نوێژی بەرامبەر دەکرد (تا بۆی ببێتە بەربەست).

### بابەت: دەربارەی نزیکی نوێژخوێن لە سوترەوە

١٤٥٦ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي، فَلاَ يَدَعْ أَحَدًا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ»[3].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێک یەکێک لە ئێوە نوێژی کرد، ئەوە با نەهێڵێت کەس بە بەردەمیدا تێپەڕ بێت، ئەگەر کەسەکە ڕەتی کردەوە بگەڕێتەوە (هەر ویستی بەزۆرو زۆرداری بەپێشتدا تێپەڕبێت) ئەوە ململانێی لەگەڵ بکە، چونکە ئەوە شەیتانە (ئەگەر شەیتانی مرۆڤەکان نەبێت چۆن دەست درێژی دەکاتە سەر عیبادەتەکەت).

تێبینی: مرۆڤ هەر کاتێک دەست درێژی کرایە سەر ماڵ و سامانی، یان سەر ناموسی، یان سەر عیبادەتی، ئەوە بۆی هەیە بجەنگێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

### بابەت: نوێژ كردن ڕوە و ئاژەڵی بارهەڵگر و (سەیارە)

١٤٥٧ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي إِلَى رَاحِلَتِهِ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕووەو بارهەڵگرەكەی نوێژی دەكرد.

### بابەت: (حوكمی) ئافرەت كە دەكەوێتە بەرامبەری نوێژخوێن

١٤٥٨ - «حَدَّثَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ ﷺ، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺكَانَ يُصَلِّي وَهِيَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ عَلَى فِرَاشِ أَهْلِهِ، اعْتِرَاضَ الْجَنَازَةِ»[٢].

واتە: لە عوروەی كوڕی زوبەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، كە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) هەواڵی پێداوە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەكرد لە كاتێكدا عائیشە لە نێوان (پێغەمبەری خوا ﷺ) و قیبلە ڕاكشابوو لەسەر جێگا، وەک جەنازە.

### بابەت: ئەو شتانەی (خشوعی) نوێژ دەبڕن و ئەوانەی نایبڕن

١٤٥٩ - «عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: يَقْطَعُ صَلَاةَ الرَّجُلِ إِذَا لَمْ يَكُنْ بَيْنَ يَدَيْهِ كَآخِرَةِ الرَّحْلِ: الْحِمَارُ، وَالْكَلْبُ الْأَسْوَدُ، وَالْمَرْأَةُ. قَالَ: قُلْتُ: فَمَا بَالُ الْأَسْوَدِ مِنَ الْأَحْمَرِ، مِنَ الْأَصْفَرِ، فَقَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَمَا سَأَلْتَنِي فَقَالَ: الْأَسْوَدُ شَيْطَانٌ»[٣].

واتە: لە ئەبو زەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەگەر شتێكی وەک پشتیەكەی سواری (كە پارچەیەكی بچوكە كەسی سوارچاک پشتی پێوە دەدات) بوونی نەبێت (نەكرێتە سوترە)، ئەوە (ئەو شتانە خشوعی) نوێژەكەی دەبڕن (كە بریتین لە): گوێدرێژ، سەگی ڕەش، ئافرەت، (عەبدوڵلای كوڕی صامیت) دەڵێ: وتم: ڕەش جیاوازی چی هەیە لەگەڵ سوردا؟ ئەبو زەڕ وتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد وەک ئەوەی تۆ پرسیارت لێ كردم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هی ڕەش شەیتانە.

تێبینی: مەبەست بەم فەرموودەیە ئەوە نیە ئەو شتانە نوێژ دەبڕن و بەتاڵی دەكەنەوە، بەڵكو مەبەستی ئەوەیە ئەم شتانە كاتێک بەبەردەمی نوێژخوێندا تێپەڕ دەبن خشوعی نامێنێت و تەركیزی دەكەوێتە سەر ئەم شتانە، چونكە سەگ جێگای ترسە كە ئەوەندە لێت نزیک ببێتەوە تاوەكو شوێنی كڕنووش بردن، هەروەها ڕەنگە بیر لە گڵاویەكەی بكەیتەوەو بترسیت، خۆت لێ بدات، گوێدرێژیش لەبەر

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

(٣) ـ صحيح.

ئەوەی حەیوانێكی بەهێزە و ترسی ئەوە هەیە زەبرێک بوەشێنێت كاتێ زۆر نزیک دەكەوێتەوە، ئافرەتیش لەبەر ئەوەی سەرنج ڕاكێشە ئەویش تەركیزی نوێژ كەم دەكاتەوە، جا بە دڵنیایی هەر شتێكیتر كە مرۆڤ لێی بترسێت یان جێگای سەرنج بێت خشوع لە نوێژدا دەبڕن، بەڵام بۆیە تەنها ئەم سێ شتە باسكراوە، چونكە ئەم سێ شتانە لەنێو خەڵكیدا زۆر بوون و باو بوون، هەر یەكەشیان نمونەیە بۆ جنسە بابەتێک، كەواتە زۆر شت دەگرنەوە. والله أعلم.

بابەت: هیچ شتێک نوێژ بەتاڵ ناكاتەوەو نایبڕێت

١٤٦٠ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: جِئْتُ أَنَا وَالْفَضْلُ - يَعْنِي: عَلَى أَتَانٍ، وَالنَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي بِمِنًى أَوْ بِعَرَفَةَ، فَمَرَرْتُ عَلَى بَعْضِ الصَّفِّ فَنَزَلْتُ عَنْهَا وَتَرَكْتُهَا تَرْعَى، وَدَخَلْتُ فِي الصَّفِّ»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: من و فەزل هاتین بەسواری گوێدرێژێک، پێغەمبەر ﷺ لە مینا یان لە عەرەفە نوێژی دەكرد (بۆ خەڵكی)، منیش بە بەردەم هەندێک لە ڕیزەكاندا تێپەڕ بووم و هاتمە خوارەوە (لە یەكێک لە ڕیزەكان) و گوێدرێژێكەم بەردا تا بلەوەڕێت، خۆشم چوومە ناو ڕیزەكە.

بابەت: خراپی تێپەڕبوون بە بەردەم نوێژخوێن

١٤٦١ - «عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ، قَالَ: أَرْسَلَنِي أَبُو جُهَيْمٍ الْأَنْصَارِيُّ إِلَى زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﵁، أَسْأَلُهُ مَا سَمِعَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الَّذِي يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي فَقَالَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لَأَنْ يَقُومَ أَحَدُكُمْ أَرْبَعِينَ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي قَالَ: فَلاَ أَدْرِي سَنَةً أَوْ شَهْرًا أَوْ يَوْمًا»[٢].

واتە: لە بوسری كوڕی سەعیدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو جەهمی ئەنصاری ناردمی بۆ لای زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنی ﵁، تا پرسیاری لێ بكەم دەربارەی ئەوەی گوێبیست بووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی ئەو كەسەی بەبەردەم نوێژخوێندا تێپەڕ دەبێت، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر كەسێک لە ئێوە چل (ساڵ یان مانگ یان ڕۆژ) بوەستێت هێشتا بۆی باشترە لەوەی تێپەڕ بێت بەبەردەم نوێژخوێندا، دەڵێ: نازانم (چل)ەكە ساڵە یان مانگە یان ڕۆژە.

١٤٦٢ - «عَنْ أَبِي النَّضْرِ، مَوْلَى عُمَروَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ مَعْمَرٍ، أَنَّ بُسْرَ بْنَ سَعِيدٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ الْجُهَنِيَّ، أَرْسَلَهُ إِلَى أَبِي جُهَيْمٍ ﵁ ، يَسْأَلُهُ مَاذَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي الْمَارِّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي، فَقَالَ: أَبُو جُهَيْمٍ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي، مَاذَا عَلَيْهِ فِي ذَلِكَ، لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْر لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ قَالَ أَبُو النَّضْرِ: لاَ أَدْرِي أَرْبَعِينَ يَوْمًا أَوْ شَهْرًا أَوْ سَنَةً»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح لغيره.

(٣) ـ صحيح.

واته: له ئەبو نەزری خزمەتكاری عەمری كوڕی عوبەیدوڵڵای كوڕی مەعمەر گێردراوەتەوە، كە بوسری كوڕی سەعید پێی ڕاگەیاندووە كە زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنی ناردویەتی بۆ لای ئەبو جوهەیم ﷺ تا پرسیاری لێ بكات دەربارەی ئەوەی چی گوێ لێ بووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ كە وتبێتی، دەربارەی ئەو كەسەی بەبەردەم نوێژخوێندا تێپەڕ دەبێت، ئەبو جوهەیم وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئەو كەسەی كە تێپەڕ دەبێت بەبەردەم نوێژخوێندا بزانێت چ سزایێكی لەسەرە لەبەر ئەو كارەی، ئەوە چل بوەستا بووایە باشتر بوو بۆی لەوەی بەبەردەمیدا تێپەڕێت، ئەبو نەزر وتویەتی: نازانم چل ڕۆژ، یان مانگ، یان ساڵ.

تێبینی: تێپەڕبوون بەبەردەمی نوێژخوێندا تاوانێكی بچوك نیە، بۆیە ئەگەر مرۆڤ حەجمی تاوانەكە بزانێت لای ئاساییە چل ساڵ، یان چل مانگ، یان چل ڕۆژ، بوەستێت بە پێوە، كەواتە: دان بەخۆتدا بگرە و تاوێك بوەستە تا نوێژخوێنەكە لە نوێژەكەی دەبێتەوە، ئەگەر بوەستێت ئەوپەڕی چەند خولەكێكی پێدەچێت تا نوێژخوێنەكە تەواو دەبێت.

## بابەت: خێری نوێژ كردن لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا ﷺ

١٤٦٣ - «حَدَّثَنِي سَلْمَانُ الْأَغَرُّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبا هُرَيْرَةَ ﷺ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا، كَأَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِدِ، إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ»[1].

واته: له سەلمانی ئەغەڕڕەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو ﷺ دەیووت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژێك لەو مزگەوتەی مندا وەك هەزار نوێژ وایە لە مزگەوتەكانی تردا، تەنها مزگەوتی حەرام نەبێت (ئەویان خێری گەورەترە و نوێژێك تیایدا بە سەد هەزارە).

١٤٦٤ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا، أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ، إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ»[2].

واته: له ئیبنو عومەر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا خێری زیاترە لە هەزار نوێژ لە مزگەوتەكانی تردا، تەنها مزگەوتی حەرام نەبێت (ئەویان خێری گەورەترە و نوێژێك تیایدا بە سەد هەزارە).

١٤٦٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ، إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ»[3].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: نوێژێک لەم مزگەوتەی مندا خێری زیاترە لە هەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی تردا، تەنها مزگەوتی حەرام نەبێت.

## بابەت: بارگە ناپێچرێتەوە بۆ هیچ شوێنێک (بە مەبەست پاداشتی زۆر) تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت

١٤٦٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ، مَسْجِدِ الْكَعْبَةِ، وَمَسْجِدِي هَذَا وَمَسْجِدِ الأَقْصَى»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بارگە ناپێچرێتەوە بۆ هیچ شوێنێک (تیایدا مەبەست بەدەستهێنانی پاداشتی زۆر بێت) تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت، مزگەوتی کەعبە، وە ئەو مزگەوتەی من (مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ)، وە مزگەوتی ئەقسا.

## بابەت: گەورەیی ڕێکردن بۆ مزگەوت لە تاریکیدا

١٤٦٧ - «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ مَشَى فِي ظُلْمَةِ لَيْلٍ إِلَى صَلاَةٍ، آتَاهُ اللهُ نُورًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٢].

واتە: لە ئەبو دەرداءەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک ڕێبکات لە تاریکی شەودا بۆ نوێژ (بۆ مزگەوت)، ئەوە خوا نور و ڕووناکییەکی زۆری پێ دەدات لە ڕۆژی دواییدا.

## بابەت: مەکروهی ئاوڕدانەوە لە نوێژدا

١٤٦٨ - «أَنَّ أبا ذَرّ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لاَ يَزَالُ اللهُ مُقْبِلاً عَلَى الْعَبْدِ، مَا لَمْ يَلْتَفِتْ، فَإِذَا صَرَفَ وَجْهَهُ، انْصَرَفَ عَنْهُ»[٣].

واتە: لە ئەبو زەڕەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام خوا ڕووی (ڕەحمەتی) لەسەر بەندەیە مادەم ئاوڕ نەداتەوە، جا کاتێ (بەندە) ڕووی خۆی وەردەگێڕێت و ئاوڕ دەداتەوە، ئەوە خواش ڕووی (ڕەحمەتی) لێ وەردەگێڕێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن، و الحديث صحيح بشواهده.

(٣) ـ إسناده ضعيف، و الحديث صحيح بشواهده.

## بابەت: کام نوێژ خێرترین و چاکترینە؟

١٤٦٩ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُبْشِيٍّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ: أَيُّ الْأَعْمالَ أَفْضَلُ؟ قَالَ: إِيمَانٌ لاَ شَكَّ فِيهِ، وَجِهَادٌ لاَ غُلُولَ فِيهِ، وَحَجَّةٌ مَبْرُورَةٌ. قِيلَ: فَأَيُّ الصَّلاَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: طُولُ الْقِيَامِ» قِيلَ: فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: جُهْدُ مُقِلّ. قِيلَ: فَأَيُّ الْهِجْرَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: أَنْ تَهْجُرَ مَا حَرَّمَ اللهُ عَلَيْكَ. قِيلَ: فَأَيُّ الْجِهَادِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: مَنْ جَاهَدَ الْمُشْرِكِينَ بِمالِهِ وَنَفْسِهِ. قِيلَ: فَأَيُّ الْقَتْلِ أَشْرَفُ؟ قَالَ: مَنْ عُقِرَ جَوَادُهُ وَأُهْرِيقَ دَمُهُ»[١].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی حوبشیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکرا: کام کردەوە چاکترینە؟ فەرمووی: بڕوایەک کە گومانی تیا نەبێت، وە جیهادێک کە دزی تیا نەبێت، وە حەجێکی قەبوڵکراو، وترا: ئەی کام نوێژە چاکترینە؟ فەرمووی: نوێژێک کە درێژ بێت و وەستانی زۆری تیابێت، وترا: ئەی کام خێر و صەدەقە چاکترینە؟ فەرمووی: بەخشین سەرەڕای کەم دەرامەتی، وترا: ئەی کام هیجرەت و کۆچ گەورەترینە؟ فەرمووی: ئەوەی کە کۆچ بکەیت و واز بێنیت لەوەی خوا لەسەری حەڕام کردووی، وترا: ئەی کام جیهاد چاکترینە؟ فەرمووی: (جیهادی) ئەو کەسەی جیهاد لەگەڵ موشریکان دەکات بە ماڵ و بە گیانی، وترا: ئەی کام کوشتن (شەهید بوون) چاکترینە؟ فەرمووی: ئەو کەسەی ئەسپەکەی بپێکرێت و بکوژرێت خۆشی بکوژرێت و خوێنی لەبەر بڕوا.

## بابەت: گەورەیی نوێژی مەغریب و نوێژی عەسر

١٤٧٠ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ صَلَّى الْبَرْدَيْنِ، دَخَلَ الْجَنَّةَ» قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ: مَا الْبَرْدَيْنِ؟ قَالَ: الْغَدَاةُ وَالْعَصْرُ»[٢].

واتە: لە ئەبوبەکری کوڕی ئەبو مووسا گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دوو نوێژە فێنکەکان بکات (بە مەزبوتی و لەکاتی خۆیدا)، ئەوە دەچێتە بەهەشت.

بە ئەبو موحەممەد وترا: دوو نوێژە فێنکەکان چین؟ وتی: مەغریب و عەسر.

١٤٧١ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ صَلَّى الصُّبْحَ، فَهُوَ فِي جِوَارِ اللَّهِ، فَلاَ تُخْفِرُوا اللَّهَ فِي جَارِهِ، وَمَنْ صَلَّى الْعَصْرَ، فَهُوَ فِي جِوَارِ اللَّهِ، فَلاَ تُخْفِرُوا اللَّهَ فِي جَارِهِ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: إِذَا أُمِّنَ وَلَمْ يَفِ، فَقَدْ غَدَرَ وَأَخْفَرَ»[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نوێژی بەیانی بکات ئەوە لە ژێر پارێزگاری و ئەمانی خوا دایە، کەوایە پەیمانی خوا مەشکێنن دەربارەی

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

پارێزگاریەکەی، وە هەر کەسێکیش نوێژی عەسر بکات ئەوە لە ژێر پارێزگاری و ئەمانی خوا دایە، کەوایە پەیمانی خوا مەشکێنن دەربارەی پارێزگاریەکەی.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەگەر کەسێک پارێزگاری لێکرا و ئەمین کرا، ئەویش وەفای بە کارەکە نەکرد، ئەوە غەدر و پەیمانشکێنی کردووە.

## بابەت: نەهی کردن لەوەی میز و پیسایی ڕابگیرێت لەناو نوێژدا (بە تەنگاوی نوێژ ئەنجامدان)

١٤٧٢ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْأَرْقَمِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ وَأَرَادَ الرَّجُلُ الْخَلَاءَ فَلْيَبْدَأْ بِالْخَلَاءِ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ئەگەر کاتی نوێژ هات و کەسێک ویستی بچێتە سەرئاو (تەنگاو بوو) ئەوە با سەرەتا سەرئاوەکەی بکات (نەوەک بچێت نوێژ بە تەنگاوی بکات و ئاگای لە نوێژەکەی نەمێنێت).

## بابەت: نەهی کردن لەوەی دەست دابنرێت لەسەر کەلاکە و تەرۆک لە نوێژدا

١٤٧٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِرًا»[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەوەی کەسێک نوێژ بکات و دەستیشی لەسەر کەلەکەی (لەسەر دوو تەنیشتەکانی کەمەری) دانابێت.

## بابەت: نەهی کردن لە نوستن پێشی عیشا و قسە کردن و لە دوای عیشا

١٤٧٤ - «عَنْ أَبِي بَرْزَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَ الْعِشَاءِ، وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا»[٣].

واتە: لە ئەبو بەرزەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ نوستنی پێشی عیشاو قسەکردن و مەجلیس خۆشکردن لەدوای عیشای پێ ناخۆش بوو.

تێبینی: چونکە کە مرۆڤ پێشی عیشا دەخەوێت ڕەنگە نوێژی مەغریبی نەکردبێ و بڵێت با کەمێک بخەوم ئنجا دەیکەم، جا لەبەر ئەوەی کاتی مەغریب کەمە بۆیە خەبەری نابێتەوەو نوێژەکەی دەفەوتێت، یان ئەگەر نوێژی مەغریبیشی کردبێ کاتێک دەخەوێت ڕەنگە تا بەیانی هەڵنەستێت کەواتە: نوێژی عیشای دەفەوتێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

دەربارەی قسە نەكردنی زۆر و مەجلیس خۆش نەكردن دوای عیشا، لەبەر ئەوەیە تا مرۆڤ زوو بخەوێت و كۆتا شتی عیبادەت بێت و تاوەكو بەر لە نوێژی بەیانی خەبەری ببێتەوە تا تاوێک شەونوێژی پێ بكرێت و نوێژی بەیانیشی نەفەوتێت، جگە لەوەی هەموومان دەزانین زوو نوستن چ نیعمەتێكە و سودی زانستی و پزیشكی چەندە زۆرە، حیكمەت و سودە تەواوەكەشی هەر خوا و پێغەمبەرەكەی ﷺ دەیزانن.

## بابەت: نەهی كردن لە چوونە ژوورەوەی كەسی كافر و موشریک بۆ ناو مزگەوتی حەڕام (مزگەوتی كەعبە)

١٤٧٥ - «عَنِ الْمُحَرَّرِ بْنِ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، لَمَّا بَعَثَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَنَادَى بِأَرْبَعٍ حَتَّى صَحَلَ صَوْتُهُ: أَلاَ إِنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ نَفْسٌ مُؤْمِنَةٌ، وَلاَ يَحُجَّنَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ، وَمَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَهْدٌ، فَإِنَّ أَجَلَهُ إِلَى أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ، فَإِذَا مَضَتِ الأَرْبَعَةُ، فَإِنَّ اللَّهَ بَرِيءٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُ»[١].

واتە: لە موحەڕڕەری كوڕی ئەبو هورەیرەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: من لەگەڵ عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب بووم كاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی و بانگی ڕاهێشت بە چوار شت تا دەنگی كەم بوویەوە و گڕبوو (لەبەر زۆر هاوار كردن)، (چوار شتەكانیش ئەمانە بوون، دەیووت): ئاگاداربن هیچ كەسێک ناچێتە بەهەشت جگە لە كەسێک كە بڕوادار بێت، وە هیچ هاوبەش دانەرێک ناچێتە حەج و مزگەوتی كەعبە دوای ئەم ساڵ، وە هیچ كەسێكی ڕووت چیتر تەواف بە دەوری بەیتدا ناكات (چونكە هەندێک وایان دەكرد)، وە هەر كەسێک پەیمانێكی لە نێوان خۆی و پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە ئەوە ماوەكەی تا چوار مانگە، جا كاتێ چوار (مانگی) كە تەواو بوو، ئەوە خواو پێغەمبەرەكەی بەرین لە هاوبەش دانەرەكان (پەیمان نامێنێت).

## بابەت: كەی مناڵ فەرمانی پێ دەكرێت بە نوێژ؟

١٤٧٦ - «حَدَّثَنِي عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ الرَّبِيعِ بْنِ سَبْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَلِّمُوا الصَّبِيَّ الصَّلاَةَ ابْنَ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُ عَلَيْهَا ابْنَ عَشْرٍ»[٢].

واتە: لە عەبدولمەلیكی كوڕی ڕەبیعی كوڕی سەبرەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، ئەویش لە باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مناڵ فێری نوێژ بكەن كاتێ تەمەنی حەوت ساڵە، وە لێی بدەن و (تەمێ و چاوترسایی بكەن) لەسەر نوێژ (ئەگەر نەیكرد) كاتێ تەمەنی دە ساڵە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ حسن.

تێبینی: کەسانێکی نەزان ڕەخنە لەوە دەگرن و دەڵێن چۆن دەبێ منداڵ لێی بدرێت و بە زۆر شتێکی پێ ئەنجام بدرێت، لێرەدا دەڵێین: ئایا چەند جارێک لێی بدرێت و ئازار بچێژێت چاکترە، یان ژیانێکی هەمیشەیی لە کیس بچێت و ژانێکی زۆر لەوێ بچێژێت کە دواڕۆژە؟!

دەوترێت چۆن دەبێ شتێکی بە زۆر بەسەردا بسەپێنرێت؟ دەڵێین: ئەی بۆچی ئازار و ماندوبوونی قوتابخانە ئاساییە بسەپێنرێت بەسەر منداڵدا کە تەمەنی بچوکتریشە و هێشتا شەش ساڵە و بە کوڵ دەگری تا نەینێرن کەچی دەبێ دایک و باوکی زۆری لێ بکەن تا بڕوا؟ ئەگەر وتیان: لەبەر ئەوەی لە مەسڵەحەتی ئەودایە و خۆی مەسڵەحەتی خۆی نازانێت، بەڵکو دایک و باوک مەسڵەحەتەکەی دەزانن، ئەوە ئێمەش دەڵێین: دەی کەواتە مەسڵەحەتی قوتابخانە کە ژیانیشی لەسەر ماتەڵ نابێت گەورەترە،یان مەسڵەحەتی دواڕۆژ کە دونیاش لە پێناوی ئەوێ هاتۆتە بوون؟! یان بڕوایان بە مەسڵەحەتی دواڕۆژ نیە؟!!!

## بابەت: کام کات نوێژی تێدا حەرامە؟

١٤٧٧ - «حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ عَلِيٍّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي، قَالَ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: ثَلاَثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ أَوْ أَنْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا، حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ الشَّمْسُ، وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ»[1].

واتە: لە موسای کوڕی عەلیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە باوکم، عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ، بوو وتی: سێ کات هەن پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێکردووین کە نوێژی تێدا ئەنجام بدەین یان مردووەکانمان تیادا بنێژین: کاتێک خۆر هەڵدێت تا بەرز دەبێتەوە، وە کاتێک نیوەڕۆ دادێت کە خۆر لار دەبێتەوە (بۆ لای خۆر ئاوا)، وە کاتێک خۆر لار دەبێتەوە بۆ ئاوا بوون تاوەکو بە تەواوی ئاوا دەبێت.

١٤٧٨ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: حَدَّثَنِي رِجَالٌ مَرْضِيُّونَ، فِيهِمْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ، وَأَرْضَاهُمْ عِنْدِي عُمَرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: لاَ صَلاَةَ بَعْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَلاَ صَلاَةَ بَعْدَ صَلاَةِ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ»[2].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کۆمەڵە پیاوانێکی جێگای متمانە و ڕەزامەندی کە لە ناویاندا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هەیە، وە لە هەموویان خۆشەویست تر لەلام عومەرە، بۆیان گێڕاومەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژ لە پاشی نوێژی بەیانی نیە تا خۆر هەڵدێت و (بەرز دەبێتەوە)، وە نوێژ لە پاشی نوێژی عەسریشەوە نیە تا خۆر ئاوا دەبێ (بە تەواوی).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی دوو ڕەكعەتەكانی (دوای) عەسر

١٤٧٩ - «عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سَمِعْتُ الْأَسْوَدَ بْنَ يَزِيدَ، وَمَسْرُوقًا، يَشْهَدَانِ عَلَى عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّهَا شَهِدَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ عِنْدَهَا يَوْمًا، إِلاَ صَلَّى هَاتَيْنِ الرَّكْعَتَيْنِ قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: تَعْنِي: بَعْدَ الْعَصْرِ»(١).

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەسوەدی كوڕی یەزید و مەسڕوق بوو شاهێدیان لەسەر عائیشەدا (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا)، عائیشەش شاهێدی لەسەر پێغەمبەری خوادا ﷺ بەوەی هیچ ڕۆژێك نەبووە پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای نەبێت حەتمەن ئەو دوو ڕەكعەتەی ئەنجام داوە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: واتە: (دوو ڕەكعەتی) پاشی عەسر.

١٤٨٠ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ قَطُّ»(٢).

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕەكعەتەكانی دوای عەسری وازی لێ نەهێناوە.

١٤٨١ - «عن كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ، وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَزْهَرَ، وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ، أَرْسَلُوهُ إِلَى عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺفَقَالُوا: اقْرَأْ عَلَيْهَا السَّلاَمَ مِنَّا جَمِيعًا، وَسَلْهَا عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ، وَقُلْ: إِنَّا أُخْبِرْنَا أَنَّكِ تُصَلِّينَهُمَا، وَقَدْ بَلَغَنَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺنَهَى عَنْهُمَا. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ، وَكُنْتُ أَضْرِبُ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ النَّاسَ عَلَيْهِمَا قَالَ كُرَيْبٌ: فَدَخَلْتُ عَلَيْهَا وَبَلَّغْتُهَا مَا أَرْسَلُونِي بِهِ فَقَالَتْ سَلْ أُمَّ سَلَمَةَ، فَخَرَجْتُ إِلَيْهِمْ فَأَخْبَرْتُهُمْ بِقَوْلِهَا فَرَدُّونِي إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ بِمِثْلِ مَا أَرْسَلُونِي إِلَى عَائِشَةَ، فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَنْهَى عَنْهُمَا، ثُمَّ رَأَيْتُهُ يُصَلِّيهِمَا أَمَّا حِينَ صَلاَهُمَا فَإِنَّهُ صَلَّى الْعَصْرَ، ثُمَّ دَخَلَ وَعِنْدِي نِسْوَةٌ، مِنْ بَنِي حَرَامٍ مِنَ الأَنْصَارِ فَصَلاَهُمَا، فَأَرْسَلْتُ إِلَيْهِ الْجَارِيَةَ، فَقُلْتُ: قُومِي بِجَنْبِهِ فَقُولِي أُمُّ سَلَمَةَ تَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَمْ أَسْمَعْكَ تَنْهَى عَنْ هَاتَيْنِ الرَّكْعَتَيْنِ وَأَرَاكَ تُصَلِّيهِمَا؟ فَإِنْ أَشَارَ بِيَدِهِ فَاسْتَأْخِرِي عَنْهُ. قَالَتْ: فَفَعَلَتِ الْجَارِيَةُ، فَأَشَارَ بِيَدِهِ فَاسْتَأْخَرَتْ عَنْهُ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: يَا ابْنَةَ أَبِي أُمَيَّةَ، سَأَلْتِ عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعَصْرِ؟ إِنَّهُ أَتَانِي نَاسٌ مِنْ عَبْدِ الْقَيْسِ بالإِسْلاَمِ مِنْ قَوْمِهِمْ فَشَغَلُونِي عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ، فَهُمَا هَاتَانِ. سُئِلَ أَبُو مُحَمَّدٍ عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ فَقَالَ: أَنَا أَقُولُ بِحَدِيثِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ لاَ صَلاَةَ بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ، وَلاَ بَعْدَ الْفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ»(٣).

واتە: لە كوڕەیبی خزمەتكاری ئیبنو عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە، كە ئیبنو عەبباس و عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەزهەر و میسوەڕی كوڕی مەخڕەمە ناردویانە بۆ لای عائیشەی (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) خێزانی

---

(١) ـ صحیح.

(٢) ـ صحیح.

(٣) ـ صحیح.

پێغەمبەری خوا ﷺ و وتویانە: سەلامی ئێمەی لێ بکە بە تێکڕایی، وە پرسیاری لێ بکە دەربارەی دوو ڕەکعەتەکانی دوای عەسر و بڵێ: ئێمە پێمان ڕاگەیەنراوە تۆ دەیانکەیت، وە پێشمان گەیشتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لێ کردووە.

ئیبنو عەبباس دەڵێ: من و عومەری کوڕی خەتتاب لە خەڵکمان دەدا لەسەر ئەو دوو ڕەکعەتە (ئەگەر بیانکردایە).

کوڕەیب دەڵێ: منیش چووم بۆ لای و پێم ڕاگەیاند ئەوەی منیان بۆ ناردبوو، عائیشەش وتی: پرسیار لە ئوممو سەلەمە بکە، (دەڵێ): منیش چوومە دەرەوە و (گەڕامەوە) بۆ لایان و قسەکەی عائیشەم پێ ڕاگەیاندن، ئەوانیش گەڕاندمیانەوە بۆ لای ئوممو سەلەمە، بە هەمان شێوەی کە ناردمیان بۆ لای عائیشە، ئوممو سەلەمە وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو نەهی لە و دوو ڕەکعەتە دەکرد، دواتر بینیم ئەنجامی دەدان، جا (بابەتەکە ئاوا بوو): کاتێ دوو ڕەکعەتەکانی ئەنجامدا نوێژی عەسری کردبوو، دواتر هاتە ژوورەوە (بۆ ماڵەوە)، منیش چەند ئافرەتێکی بەنی حەڕامم لەلا بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕەکعەتەکانی کردن، منیش کیژۆڵەیەکم نارد بۆ لای و وتم: هەڵسە بچۆرە تەنیشتی و بڵێ: ئوممو سەلەمە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا مەگەر لە تۆم نەبیستووە کە نەهیت کردوە لەم دوو ڕەکعەتانە، لە کاتێکدا دەتبینم ئەنجامیان دەدەی؟ جا ئەگەر بە دەستی ئاماژەی بۆ کردی (لەناو نوێژەکەی) ئەوە لێی دوورکەرەوە و پرسیارەکە بخەرە دواتر (دوای نوێژ تەوا وبوونەکەی).

ئوممو سەلەمە دەڵێت: کیژۆڵەکە ئەنجامیدا، (پێغەمبەری خواش ﷺ) بە دەستی ئاماژەی بۆ کرد (کە جارێ بوەستێت و مەشغوڵی نەکات)، جا کاتێ تەواو بوو فەرمووی: ئەی کچی ئەبو ئومەییە پرسیارت کرد دەربارەی دوو ڕەکعەتەکانی دوای عەسر (وانیە)؟ ئەوە لەبەر ئەوەبوو خەڵکانێک لە هۆزی عەبدول قەیس هاتنە لام هەندێ مسوڵمانی (نوێی) ناو هۆزەکەیان هێنابوون و سەرقاڵیان کردم لە ئەنجامدانی دوو ڕەکعەتەکانی دوای نیوەڕۆ، ئەوە ئەو دووانەیە (واتە: سوننەتی نیوەڕۆ قەزا دەکەمەوە، ئەوە نوێژ و سوننەتی دوای عەسر نیە).

پرسیار لە ئەبو موحەممەد کرا دەربارەی ئەم فەرموودەیە: ئەویش وتی: من کار بە فەرموودەی عومەر دەکەم کە لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە (کە فەرموویەتی): هیچ نوێژێک دوای عەسر نیە تاوەکو خۆر ئاوا دەبێت، وە دوای (نوێژی) بەیانیش نیە تاوەکو خۆر هەڵدێت.

### بابەت: دەربارەی نوێژی سوننەت

١٤٨٢ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَ الظُّهْرِ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ، وَبَعْدَ الْعِشَاءِ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ»[1].

---

(١) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەموو جار دوو ڕەكعەت نوێژی پێشی نیوەڕۆی دەكرد، وە دوای نیوەڕۆش دوو ڕەكعەتی دەكرد، وە دوای مەغریبیش دوو ڕەكعەتی لە ماڵەوە دەكرد، وە دوای عیشاش دوو ڕەكعەتی دەكرد، وە دوای هەینیش دوو ڕەكعەتی دەكرد.

١٤٨٣ - «عَنْ عَنْبَسَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يُصَلِّي كُلَّ يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً تَطَوُّعًا، غَيْرَ الْفَرِيضَةِ، إِلاَّ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ -أَوْ بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ - قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ: فَمَا بَرِحْتُ أُصَلِّيهِنَّ بَعْدُ. وَقَالَ عَمْرٌو: مِثْلَهُ. وَقَالَ النُّعْمَانُ: مِثْلَهُ»[١].

واتە: لە عەنبەسەی كوڕی ئەبو سوفیانەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە ئوممو حەبیبەی (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) خێزانی پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە كە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە كە دەیفەرموو: هەر بەندەیەكی مسوڵمان هەموو ڕۆژێك دوازدە ڕەكعەت نوێژی سوننەت بكات جگە لە نوێژی واجب، حەتمەن ماڵێكی بۆ هەیە لە بەهەشتدا ـ یان ماڵێكی بۆ ساز دەكرێت لە بەهەشتدا ـ ئوممو حەبیبە وتویەتی: هەرگیز وازم لەم دوازدە ڕەكعەتە نەهێناوە دوای ئەو كاتە (كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای فەرموو)، عەمریش هەمان شتی وت، نوعمانیش هەمان شتی وت (واتە: هەموویان وتویانە بەردەوام جێبەجێمان كردووە).

١٤٨٤ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لاَ يَدَعُ أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ»[٢].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وازی نەدەهێنا لە چوار ڕەكعەتی پێشی نیوەڕۆ و دوو ڕەكعەتی پێشی بەیانی.

## بابەت: دوو ڕەكعەتەكانی پێشی مەغریب

١٤٨٥ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ، بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ، بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ لِمَنْ شَاءَ»[٣].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی موغەففەلەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە نێوان هەموو دوو بانگێكدا (واتە: لە نێوان بانگ و قامەتدا) نوێژی (سوننەت) هەیە، لە نێوان هەموو دوو بانگێكدا نوێژی (سوننەت) هەیە، لە نێوان هەموو دوو بانگێكدا نوێژی (سوننەت) هەیە بۆ كەسێك بیەوێت (پاداشتی زیاتری دەست بكەوێت).

١٤٨٦ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا ﷺ، قَالَ: كَانَ الْمُؤَذِّنُ يُؤَذِّنُ لِصَلاَةِ الْمَغْرِبِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَيَقُومُ لُبَابُ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَيَبْتَدِرُونَ السَّوَارِيَ حَتَّى يَخْرُجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُمْ كَذَلِكَ قَالَ: وَقَلَّ مَا كَانَ يَلْبَثُ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.
(٤) ـ صحيح.

واتە: لە عەمری كوڕی عامیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەنەس بوو ﷺ وتی: هەموو جار بانگبێژ بانگی دەدا بۆ نوێژی مەغریب لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ، باشترین هاوەڵەكانی پێغەمبەری خواش ﷺ هەڵدەستان و پێشبركێیان دەكرد بۆ گەیشتن بۆ لای دینگەكان (ئەستوندەكانی مزگەوت) تاوەكو پێغەمبەری خوا ﷺ (لەماڵەوە) دەردەچوو (بۆ مزگەوت) ئەوان هەر ئاوا بوون (ئاوا لەدوای دینگەكان دادەنیشتن)، (عامیر) دەڵێ: كەم جاریش وابوو پێغەمبەری خوا ﷺ تاخیر بێت.

## بابەت: قورئان خوێندن لە دوو ڕەكعەتەكانی (پێش نوێژی) بەیانیدا

١٤٨٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، يُخْفِي مَا يَقْرَأُ فِيهِمَا، وَذَكَرَتْ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾الكافرون، وَ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾الإخلاص، قَالَ سَعِيدٌ: فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ»[1].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار بە بێ دەنگی قورئانی لە دوو ڕەكعەتەكانی پێشی بەیانیدا دەخوێند، وە عائیشە باسی: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ی كرد.

سەعید وتویەتی: (واتە) لە دوو ڕەكعەتەكانی (پێشی) بەیانیدا.

١٤٨٨ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: حَدَّثَتْنِي حَفْصَةُ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺكَانَ يُصَلِّي سَجْدَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ بَعْدَمَا يَطْلُعُ الْفَجْرُ. وَكَانَتْ سَاعَةً لاَ أَدْخُلُ فِيهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ»[2].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: حەفصە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) بۆی گێڕامەوە، وتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕەكعەتی سوكی دەكرد دوای ئەوەی ڕووناكی بەیانی هەڵدەهات (دوای بانگی بەیانی)، وە ئەوە كاتێك بوو تیایدا نەدەچووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ (چونكە بۆ عیبادەت تەرخانی كردبوو گرنگی پێ دەدا).

١٤٨٩ - «عَنْ حَفْصَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُ مِنْ أَذَانِ الصُّبْحِ، وَبَدَا الصُّبْحُ، صَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ تُقَامَ الصَّلاَةُ»[3].

واتە: لە حەفصەی (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) خێزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار كاتێ بانگبێژ بێ دەنگ دەبوو لە بانگی بەیانیدا و (لێ دەبوویەوە) و بەیان دەردەكەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕەكعەتی سوك و (كورتی) دەكرد پێش ئەوەی نوێژ بكرێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.




١٤٩٠ - «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ وأخبرتْهُ حفْصةُ، أنّهُ كانَ يُصلِّي إِذَا أَضَاءَ الصُّبْحُ رَكْعَتَيْنِ»[1].

واتە: لە سالمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوكیەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای نوێژی هەینی دوو ڕەكعەتی دەكردن، وە حەفصەش بۆی گێڕاوەتەوە كە كاتێک بەیانیش دەردەكەوت دوو ڕەكعەتی دەكرد.

بابەت: قسەكردن دوای دوو ڕەكعەتە (سوننەتەكەی پێشی) بەیانی

١٤٩١ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ، فَإِنْ كَانَتْ لَهُ حَاجَةٌ، كَلَّمَنِي بِهَا، وَإِلاَّ، خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ»[2].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ دوو ڕەكعەتە (سوننەتەكانی) پێشی بەیانی دەكرد، ئەگەر پێویستیەكی هەبووایە ئەوە قسەی لەگەڵ دەكردم دەربارەی پێویستیەكە، ئەگەرنا (هیچ قسەی نەدەكرد) و دەچووە دەرەوە بۆ نوێژ.

بابەت: دەربارەی پاڵكەوتن دوای دوو ڕەكعەتە (سوننەتەكەی نوێژی) بەیانی

١٤٩٢ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي مَا بَيْنَ الْعِشَاءِ إِلَى الْفَجْرِ، إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يُسَلِّمُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ، يُوتِرُ بِوَاحِدَةٍ، فَإِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُ مِنَ الأَذَانِ رَكَعَ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمُؤَذِّنُ فَيَخْرُجُ مَعَهُ»[3].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان عیشا و نوێژی بەیانیدا یازدە ڕەكعەت نوێژی دەكرد، لە هەر دوو ڕەكعەتێكدا سەلامی دەدایەوە، یەكێكیشی بەتەنیا دەكرد (بە نیەتی ویتر)، جا كاتێ بانگبێژ بێ دەنگ دەبوو لە بانگ (بانگی بەیانی)، ئەوە دوو ڕەكعەتی سوک و كورتی دەكرد، دواتر پاڵ دەكەوت (بۆ ئەوەی پشوێک بدات) تاوەكو بانگبێژ دەهات بۆلای و لەگەڵی دەردەچوو (بۆ مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی).

بابەت: كاتێ قامەت بۆ نوێژی واجب كرا هیچ نوێژێک نیە جگە لە نوێژە واجبەكە

١٤٩٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَلاَ صَلاَةَ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةُ»[4].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێ قامەت بۆ نوێژی واجب كرا هیچ نوێژێک نیە جگە لە نوێژە واجبەكە.

---

(١) ـ صحيح.
(٢) ـ صحيح.
(٣) ـ صحيح.
(٤) ـ صحيح.

١٤٩٤ - «أخبرنا أَبُو حَفْصٍ عَمْرُو بْنُ عَلِيٍّ الْفَلاَسُ، حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ وَرْقَاءَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده لە ڕێگای ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە.

١٤٩٥ - «عَنِ ابْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ، قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَرَأَى النَّبِيُّ ﷺ رَجُلاً يُصَلِّي الرَّكْعَتَيْنِ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ ﷺ صَلاَتَهُ، لاَثَ بِهِ النَّاسُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ: ﷺ أَتُصَلِّي الصُّبْحَ أَرْبَعًا؟»[٢].

واتە: لە ئیبنو بوحەینەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: قامەت بۆ نوێژ کرا، پێغەمبەری خواش ﷺ پیاوێکی بینی دوو ڕەکعەت نوێژی سوننەتی کرد، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکەی تەواو کرد خەڵکی دەورەیان لێدا و لەدەوری کۆبوونەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ بە کابرای فەرموو: ئایا نوێژی بەیانی بە چوار ڕەکعەت دەکەیت؟! (واتە: کە قامەت کرا واز لە سوننەتان بێنە کاتی واجب دەست پێ دەکات).

١٤٩٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَلاَ صَلاَةَ إِلاَ الْمَكْتُوبَةُ» قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: إِذَا كَانَ فِي بَيْتِهِ، فَالْبَيْتُ أَهْوَنُ»[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: کاتێ قامەت بۆ نوێژی واجب کرا هیچ نوێژێک نیە جگە لە نوێژە واجبەکە.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەگەر لە ماڵ بێت، ئەوە هێشتا ماڵ باشترە (واتە: ئەگەر لە ماڵەوە خەریکی سوننەت بێت لە کاتێکدا قامەت کراوە دواتر بچێت بۆ مزگەوت، هێشتا ئەوە باشترە، چونکە لەبەر چاوی ئەو نوێژی واجب ئەنجام نادرێت کەچی ئەویش لە سوننەتدا بێت).

## بابەت: دەربارەی چوار ڕەکعەت لە سەرەتای ڕۆژدا

١٤٩٧ - «عَنْ نُعَيْمِ بْنِ هَمَّارٍ الْغَطَفَانِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ اللهُ تَعَالَى: ابْنَ آدَمَ، صَلِّ لِي أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ، أَكْفِكَ آخِرَهُ»[٤].

واتە: لە نوعەیمی کوڕی هەمماری غەتەفانیەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: خوای بەرز فەرموویەتی: ئەی نەوەی ئادەم چوار ڕەکعەت نوێژم بۆ بکە لە سەرەتای ڕۆژدا، منیش دەتپارێزم (لە هەموو شەڕ و خراپەیەک) لە کۆتایی ڕۆژەکەدا.

تێبینی: زۆرێک لە زانایان پێیان وایە مەبەست بەو چوار ڕەکعەتە نوێژی چێشتەنگاوە، هەندێکیش پێیان وایە مەبەستی سوننەت و نوێژی بەیانیە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

## بابەت: نوێژی چێشتەنگاو (ضحی)

١٤٩٨ - «حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، قَالَ عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ، أَنْبَأَنِي، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ أَبِي لَيْلَى ﷺ، يَقُولُ: مَا أَخْبَرَنَا أَحَدٌ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى غَيْرُ أُمِّ هَانِئٍ، فَإِنَّهَا ذَكَرَتْ أَنَّهُ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ اغْتَسَلَ فِي بَيْتِهَا، ثُمَّ صَلَّى ثَمَانَ رَكَعَاتٍ قَالَتْ: وَلَمْ أَرَهُ صَلَّى صَلاَةً أَخَفَّ مِنْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ يُتِمُّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ»[1].

واتە: لە شوعبەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: عەمری کوڕی موڕڕە پێی ڕاگەیاندم وتی: گوێم لە ئیبنو ئەبی لەیلا بوو ﷺ دەیووت: هیچ کەسێک بۆی نەگێڕاوینەتەوە کە پێغەمبەری خوای ﷺ بینی بێت نوێژی چێشتەنگاوی کردبێت جگە لە ئوممو هانیئ، ئەو باسی کردوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازاد کردنی مەککەدا خۆی شۆردووە لە ماڵەکەی ئەودا، دواتر هەشت ڕەکعەت نوێژی کردوە، ئوممو هانیئ دەڵێت: پێشتر نەمبینیوە کە نوێژێک بکات لەو هەشت ڕەکعەتە سوکتر و کورت تر بێت، بەڵام ڕکوع و کڕنووشی بە تەواوی دەبرد (هەقی خۆی پێ دەدا).

١٤٩٩ - «عَنْ أَبِي النَّضْرِ، أَنَّ، أبا مُرَّةَ، مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أُمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أَبِي طَالِبٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، تُحَدِّثُ أَنَّهَا ذَهَبَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ، فَوَجَدَتْهُ يَغْتَسِلُ، وَفَاطِمَةُ بِنْتُهُ تَسْتُرُهُ بِثَوْبٍ، قَالَتْ: فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ وَذَلِكَ ضُحًى، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ هَذِهِ؟ فَقُلْتُ: أَنَا أُمُّ هَانِئٍ. قَالَتْ: فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ غُسْلِهِ، قَامَ فَصَلَّى ثَمَانَ رَكَعَاتٍ مُلْتَحِفًا فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ انْصَرَفَ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، زَعَمَ ابْنُ أُمِّي أَنَّهُ قَاتِلٌ رَجُلاً أَجَرْتُهُ: فُلاَنَ بْنَ هُبَيْرَةَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ يَا أُمَّ هَانِئٍ»[2].

واتە: لە ئەبو نەزرەوە گێردراوەتەوە، کە ئەبو موڕڕەی خزمەتکاری عەقیلی کوڕی ئەبو تاڵیب (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) پێی ڕاگەیاندووە کە گوێی لە ئوممو هانیئی کچی ئەبو تاڵیب بووە، کە وتویەتی: چووە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ئازاد کردنی مەککەدا، کە چووم خۆی دەشۆرد، فاتیمەی کچیشی بە جلێک پەردەپۆشی لێ دەکرد، دەڵێ: منیش سەلامم لێ کرد، کاتەکەش چێشتەنگاو بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ (لە پشت پەردەکەی دەستی فاتیمە) فەرمووی: ئەوە کێیە؟ دەڵێ منیش وتم: من ئوممو هانیئم، دەڵێ: جا کاتێک لە خۆشۆردنەکەی بوویەوە هەڵسا و هەشت ڕەکعەت نوێژی کرد لە کاتێکدا تاکە جلێکی لەخۆی ئاڵاندبوو، دواتر تەواو بوو، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کوڕی دایکم (واتە: برای ڕاستیم، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب) وتویەتی: ئەو پیاوە دەکوژم، کە من داڵدەم داوە ـ کە فڵانی کوڕی هوبەیرەیە ـ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بە دڵنیایی ئێمە داڵدەی کەسێکمان داوە کە تۆ داڵدەت دابێت ئەی ئوممو هانیئ (عەلی نابێ شتی وا بکات).

---

(١) ـ صحیح.

(٢) ـ صحیح.

١٥٠٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلاَثٍ لاَ أَدَعُهُنَّ حَتَّى أَمُوتَ: الْوِتْرِ قَبْلَ أَنْ أَنَامَ، وَصَوْمِ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَمِنَ الضُّحَى رَكْعَتَيْنِ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆشەویستەکەم وەسیەتی بۆ کردووم بە سێ شت کە وازیان لێ نەهێنم تا دەمرم: (نوێژی) ویتر پێش ئەوەی بخەوم، وە ڕۆژوی سێ ڕۆژان لە هەموو مانگێکدا، وە دوو ڕەکعەت لە نوێژی چێشتەنگاو.

## بابەت: ئەو فەرمودانەی هاتوون دەربارەی مەکرِوهی نوێژی چێشتەنگاو

١٥٠١ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: مَا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سُبْحَةَ الضُّحَى فِي سَفَرٍ، وَلاَ حَضَرٍ»[٢].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی نەکردوە، نە لە سەفەر و نە لە ماڵەوە.

تێبینی: دایکمان عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) لێرەدا وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی نەکردوە، لە ڕیوایەتی موسلیمدا وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی نەکردوە و من دەیکەم، هەر لە دایکمان عائیشەوە گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها کاتێ لە سەفەر دەهاتەوە دەیکرد، جارێکیتر وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چوار ڕەکعەتی دەکردن.

جا وەک هەندێک لە زانایان فەرموویانە کە دەڵێت نەیکردووە: ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێت پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەردەوامی نەیکردوە، تا خەڵک وا تێنەگەن واجبە، کەواتە: چێشتەنگا و سوننەتە و کێشەی تیا نیە.

١٥٠٢ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، أَنَّ أَبَاهُ، رَأَى نَاسًا يُصَلُّونَ صَلاَةَ الضُّحَى، فَقَالَ: أَمَا إِنَّهُمْ لَيُصَلُّونَ صَلاَةً مَا صَلاَّهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلاَ عَامَّةُ أَصْحَابِهِ»[٣].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرەتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە باوکی ئەنەسی بینیوە (خەڵکانێکیش) نوێژی چێشتەنگاویان دەکرد، ئەنەس وتی: بزانن ئەمانە نوێژێک دەکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ و گشت هاوەڵان نەیان کردووە.

تێبینی: ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێت ئاوا بە کۆمەڵ و بە ئاشکرا نەیان کردوە، چونکە چەندین فەرموودە هەیە و چەندین هاوەڵ کردویانە، وەک لە پێشدا فەرموودەکان باس کران و لە باسی دواتریش فەرموودەی تری تیایە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی نوێژی ئەووابین (واتە بەردەوام بوون لەسەر نوێژی چێشتەنگاو)

**١٥٠٣ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ عَلَيْهِمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ بَعْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صَلاَةُ الْأَوَّابِينَ إِذَا رَمِضَتْ الْفِصَالُ»[١].**

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە بۆ لایان، لە کاتێکدا ئەوان نوێژیان دەکرد دوای هەڵاتنی ڕۆژ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: نوێژی ئەووابین (واتە: ئەم نوێژە) کاتێکە کە بەچکە وشتر سور دەبنەوە و (چۆک دادەدەن لەبەر گەرما، واتە کاتێ گەرمای خۆر بە تین دەبێت).

تێبینی: نوێژی ئەووابین بریتیە لە نوێژی چێشتەنگاوو بەردەوام بوون لەسەری لە کاتی گەرمای خۆردا، بۆیەش پێی دەوترێت: ئەووابین چونکە مرۆڤەکە هەموو ڕۆژێک بۆ ئەنجامدانی ئەو نوێژە دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا و نوێژی بۆ دەکات و کڕنووشی بۆ دەبات.

## بابەت: نوێژی (سوننەتی) شەوو ڕۆژ دوو دووە

**١٥٠٤ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صَلاَةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى وَقَالَ أَحَدُهُمَا: رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ»[٢].**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی (سوننەتی) شەو و ڕۆژ دوو دووە.

یەکێک لەم دووانە (واتە: غوندەر یان وەکیع) وتی: دوو ڕەکعەت دوو ڕەکعەت.

## بابەت: دەربارەی شەونوێژ

**١٥٠٥ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلاَةِ اللَّيْلِ، فَقَالَ: مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ، فَلْيُصَلِّ رَكْعَةً وَاحِدَةً تُوتِرُ مَا قَدْ صَلَّى»[٣].**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی شەونوێژ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: دوو دووە، جا کاتێ کەسێک لە ئێوە ترسا لەوەی بگات بە نوێژی بەیانی (بێ ئەوەی شەو نوێژ بکات و بزانێت تا بەیانی خەبەری نابێتەوە)، ئەوە با ڕەکعەتێک بکات تا ئەو نوێژانەی کردوویەتی بیکات بە تاک (پاشی عیشا و پێشی خەوتن).

---

(١) ـ صحیح.

(٢) ـ صحیح.

(٣) ـ صحیح.

## بابەت: گەورەیی شەونوێژ

١٥٠٦ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلاَمَ ﷺ قَالَ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ اسْتَشْرَفَهُ النَّاسُ فَقَالُوا: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ، قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ، قال: فَخَرَجْتُ فِيمَنْ خَرَجَ، فَلَمَّا رَأَيْتُ وَجْهَهُ، عَرَفْتُ أَنَّ وَجْهَهُ لَيْسَ بِوَجْهِ كَذَّابٍ، وَكَانَ أَوَّلُ مَا سَمِعْتُهُ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَفْشُوا السَّلاَمَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَصِلُوا الأَرْحَامَ، وَصَلُّوا وَالنَّاسُ نِيَامٌ، تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلاَمٍ[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە (بۆ یەکەم جار)، خەڵک دەرچوون بۆ لای و وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ هات، پێغەمبەری خوا ﷺ هات، دەڵێ: منیش دەرچووم (بۆ لای) لەگەڵ ئەوانەی دەرچوون، جا کاتێک ڕوخسارم بینی، زانیم ڕوخسارەکەی ڕوخساری کەسی درۆزن نیە، وە یەکەم شت کە لێوەی گوێم لێ بوو ئەوە بوو دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە سەلام کردن و ئاشتەوایی بڵاو بکەنەوە (لەناو یەکتریدا)، وە خواردن ببەخشن، وە پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بهێنن، وە شەونوێژ بکەن لەکاتێکدا کە خەڵک خەوتووە، (ئەگەر واتان کرد) دەچنە بەهەشت بە سەلامەتی.

## بابەت: پاداشت و گەورەیی کەسێک کە کڕنووشێک بۆ خوا ببات

١٥٠٧ - «عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: دَخَلْتُ مَسْجِدَ دِمَشْقَ، فَإِذَا رَجُلٌ يُكْثِرُ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ، قُلْتُ: لاَ أَخْرُجُ حَتَّى أَنْظُرَ أَيَدْرِي هَذَا عَلَى شَفْعٍ يَنْصَرِفُ، أَمْ عَلَى وِتْرٍ؟ فَلَمَّا فَرَغَ، قُلْتُ: يَا عَبْدَ اللَّهِ، أَعَلَى شَفْعٍ تَدْرِي انْصَرَفْتَ، أَمْ عَلَى وِتْرٍ؟ فَقَالَ: إِنْ أَكُ لاَ أَدْرِي، فَإِنَّ اللَّهَ يَدْرِي، ثُمَّ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ خَلِيلِي أبا الْقَاسِمِ ﷺ يَقُولُ: مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً إِلاَ رَفَعَهُ اللهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً، قُلْتُ: مَنْ أَنْتَ رَحِمَكَ اللهُ؟ قَالَ: أَنَا أَبُو ذَرٍّ، قَالَ: فَتَقَاصَرَتْ إِلَيَّ نَفْسِي»[2].

واتە: لە ئەحنەفی کوڕی قەیسەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: چووم بۆ مزگەوتی دیمەشق، پیاوێکی لێ بوو زۆر ڕکوع و کڕنووشی دەبرد (زۆر نوێژی دەکرد)، وتم: ناچمە دەرەوە تاوەکو سەیر نەکەم نەزانم ئەو پیاوە بە ڕەکعەتی جووت یان تاک کۆتایی پێ دەهێنێت؟ جا کە تەواو بوو وتم: ئەی بەندەی خوا ئایا دەزانی بە جووت یان بە تاک کۆتاییت پێ هێنا؟ ئەویش وتی: ئەگەر منیش نەیزانم ئەوە بە دڵنیایی خوا دەیزانێت، دواتر وتی: من گوێم لە خۆشەویستەکەم ئەبو قاسم (پێغەمبەری خوا ﷺ) بوو دەیفەرموو: هەر بەندەیەکی خوا کڕنووشێک بۆ خوا بەرێت، حەتمەن بەهۆیەوە خوا پلەیەکی بەرز دەکاتەوە، وە بە هۆیەوە تاوانێکی لەسەر لادەدات، وتم: تۆ کێی ڕەحمەتی خوات لێ بێت؟ وتی: من ئەبو ذەڕم، (ئەحنەف) دەڵێ: خۆم لەلا بچوک بوویەوە و (شەرم دایگرتم لە ئاستی ئەو).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث صحيح.

## بابەت: دەربارەی کڕنووشی سوپاسگوزاری (سوجدەی شوکر)

١٥٠٨ - «حَدَّثَتْنَا شَعْثَاءُ قَالَتْ: رَأَيْتُ ابْنَ أَبِي أَوْفَى ﷺ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَقَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الضُّحَى رَكْعَتَيْنِ حِينَ بُشِّرَ بِالْفَتْحِ، أَوْ بِرَأْسِ أَبِي جَهْلٍ»[١].

واتە: لە شەعثائەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئیبنو ئەبی ئەوفام ﷺ بینی دوو ڕەکعەتی کرد و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕەکعەت چێشتەنگاوی کرد کاتێ موژدەی ئازاد کردنی مەککەی پێدرا، یان ئەو کاتەی موژدەی پەڕینی سەری ئەبو جەهلی پێدرا.

## بابەت: حەڕامی کڕنووش بردن بۆ هەر کەسێک

١٥٠٩ - «عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ الْحِيرَةَ فَرَأَيْتُهُمْ يَسْجُدُونَ لِمَرْزُبَانَ لَهُمْ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلاَ نَسْجُدُ لَكَ؟ قَالَ: لَوْ أَمَرْتُ أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لِأَحَدٍ، لَأَمَرْتُ النِّسَاءَ أَنْ يَسْجُدْنَ لِأَزْوَاجِهِنَّ، لِمَا جَعَلَ اللهُ عَلَيْهِنَّ مِنْ حَقِّهِمْ»[٢].

واتە: لە قەیسی کوڕی سەعدەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: چووم بۆ حیرە (نەجەف) بینیم کڕنووشیان بۆ پاڵەوان و سوارچاکە ئازاکەیان دەبرد، منیش (کە هاتمەوە) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کڕنووشت بۆ نەبەین؟ فەرمووی: ئەگەر فەرمانم بە کەسێک بکردایە کە کڕنووش بۆ کەسێک بەرێت (جگە لە خوا)، ئەوە فەرمانم بە ئافرەتان دەکرد کە کڕنووش بۆ پیاوەکانیان بەرن، لەبەر ئەو هەقەی پیاوان کە خوا دایناوە لەسەر ئافرەتان.

تێبینی: واتە پیاوان پاڵەوانی ژیان و بژێو و بەڕێوەبردن و پاسەوانی ئەوانن، بۆیە ئەگەر دروستبووایە کڕنووش بۆ پاڵەوانان ببردرایە، ئەوە دەبوو ئەوان ئافرەتان کڕنووشیان بۆ پاڵەوانەکانیان (مێردەکانیان) بەرن، وەک چۆن خەڵکی حیرە کڕنووشیان بۆ پاڵەوانەکانیان دەبرد، بەڵام پاڵەوانی ڕاستی ژیان و خێزان پیاوانن، چونکە شانیان دەدەنە بەر هەموو نەهامەتییەک و بەربەرەکانێی ژیان دەکەن، تاوەکو چەترێکی فێنک بۆ خێزان و منداڵەکانیان دروست بکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت کڕنووش بۆ هیچ کەس و پاڵەوانێک ببردرێت، چونکە شیرک و هاوەڵ دانانە بۆ خوا (خوا بمان پارێزێت).

١٥١٠ - «عَنْ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ائْذَنْ لِي فَلِأَسْجُدَ لَكَ، قَالَ: لَوْ كُنْتُ آمِرًا أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ، لِأَحَدٍ لَأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا»[٣].

واتە: لە ئیبنو بورەیدەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێراویەتیەوە، وتویەتی: پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێم بدە تاوەکو کڕنووشت بۆ بەرم،

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح بشواهده.

(پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەگەر فەرمانم بکردایە بە کەسێک کڕنووش بەرێت بۆ کەسێک (جگە لە خوا)، ئەوە فەرمانم بە ئافرەت دەکرد کە کڕنووش بۆ هاوسەرەکەی بەرێت.

## بابەت: کڕنووش بردن لە سورەتی [النجم]

١٥١١ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ النَّجْمَ فَسَجَدَ فِيهَا، فَلَمْ يَبْقَ أَحَدٌ إِلاَّ سَجَدَ، إِلاَّ شَيْخٌ أَخَذَ كَفًّا مِنْ حَصًى فَرَفَعَهُ إِلَى جَبْهَتِهِ وَقَالَ: يَكْفِينِي هَذَا»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ﷺ، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سورەتی (النجم)ی خوێند و کڕنووشی تیادا برد (چونکە ئایەتی سەجدەی تیایە)، جا هیچ کەسێک نەما (لە ئامادەبووان) حەتمەن کڕنووشیان برد، تەنها بەساڵاچوێک نەبێت (نەیتوانی خۆی نەوی بکات بۆ کڕنووش)، (بۆیە) مشتە بەردێکی هەڵگرت و بۆ نەوچەوانی بەرزی کردەوە و (نای بە نەوچەوانیەوە) وتی: ئەوەندە بەسە بۆ من (چونکە لەوە زیاترم پێ ناکرێت).

## بابەت: کڕنووش بردن لە سورەتی [صاد]

١٥١٢ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا، فَقَرَأَ ص، فَلَمَّا مَرَّ بِالسَّجْدَةِ، نَزَلَ فَسَجَدَ وَسَجَدْنَا مَعَهُ، وَقَرَأَهَا مَرَّةً أُخْرَى، فَلَمَّا بَلَغَ السَّجْدَةَ تَيَسَّرْنَا لِلسُّجُودِ فَلَمَّا رَآنَا، قَالَ: إِنَّمَا هِيَ تَوْبَةُ نَبِيٍّ، وَلَكِنِّي أَرَاكُمْ قَدِ اسْتَعْدَدْتُمْ لِلسُّجُودِ، فَنَزَلَ فَسَجَدَ وَسَجَدْنَا»[٢].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و سورەتی (صاد)ی خوێندەوە، جا کاتێک بە ئایەتی سەجدەدا تێپەڕ بوو، دابەزی (لە مینبەرەکە) و کڕنووشی برد، ئێمەش لەگەڵ ئەودا کڕنووشمان برد، وە جارێکی تریش (لە وتارێکی تردا) خوێندیەوە، جا کاتێک گەیشت بە ئایەتی سەجدە خۆمان ئامادە کرد بۆ کڕنووش بردن، جا کاتێک ئێمەی بینی (ئاوا خۆمان ئامادە کرد بۆ کڕنووش بردن) فەرمووی: ئەم کڕنووشە تەنها تۆبە و گەڕانەوەی پێغەمبەرێک بوو (پێغەمبەر داود ﵇)، بەڵام من دەتان بینم خۆتان ئامادە کردوە بۆ کڕنووش، بۆیە دابەزی (لە مینبەرەکە) و کڕنووشی برد، ئێمەش کڕنووشمان برد.

١٥١٣ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ قَالَ فِي السُّجُودِ فِي ص: لَيْسَتْ مِنْ عَزَائِمِ السُّجُودِ، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَجَدَ فِيهَا»[٣].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە کە دەربارەی کڕنووش بردنی سورەتی (صاد) وتویەتی: (کڕنووشی سورەتی صاد) لە کڕنووشە زۆر خێرەکان نیە (زۆر پێداگری لەسەر نەکراوە)، وە بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ کڕنووشی تیادا بردووە (کەواتە هەر خێر و سوننەتیشە).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

## بابەت: کڕنووش بردن لە سورەتی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ الإنشقاق

١٥١٤ - «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: رَأَيْتُ أبا هُرَيْرَةَ ﷺ يَسْجُدُ فِي: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ الإنشقاق، فَقِيلَ لَهُ: تَسْجُدُ فِي سُورَةٍ مَا يُسْجَدُ فِيهَا؟، فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَسْجُدُ فِيهَا»[1].

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو هورەیرەم ﷺ بینی کڕنووشی برد لە سورەتی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ (کاتێ گەیشتە ئایەتی سوجدە)، جا پێی وترا: کڕنووش لە سورەتێکدا دەبەیت کە کڕنووشی تیا نەبردراوە؟ ئەویش وتی: من پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە کڕنووشی تیادا بردووە.

١٥١٥ - «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: رَأَيْتُ أبا هُرَيْرَةَ يَسْجُدُ فِي: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ الانشقاق، فَقُلْتُ: يَا أبا هُرَيْرَةَ، أَرَاكَ تَسْجُدُ فِي: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ الإنشقاق، ، فَقَالَ: لَوْ لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَجَدَ فِيهَا، لَمْ أَسْجُدْ»[2].

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو هورەیرەم بینی کڕنووشی برد لە سورەتی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ (کاتێ گەیشتە ئایەتی سەجدە)، منیش وتم: ئەی ئەبو هورەیرە دەتبینم کڕنووش دەبەیت لە سورەتی ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾؟! ئەویش وتی: ئەگەر نەمبینی بووایە پێغەمبەری خوا ﷺ کڕنووشی تێدا بردووە، ئەوە من کڕنووشم نەدەبرد.

١٥١٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، سَجَدَ فِي إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ»[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کڕنووشی بردووە لە سوورەتی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ الانشقاق.

## بابەت: کڕنووش بردن لە سورەتی: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١﴾ العلق

١٥١٧ - « عن أَبِي هرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَجَدْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾ الانشقاق، وَ : ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١﴾ العلق »[4].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: کڕنووشمان برد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە سوورەتی: ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ۝١﴾، وە سوورەتی: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١﴾.

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی گوێی لە ئایەتی سەجدە دەبێت و سەجدە نابات

١٥١٨ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: قَرَأْتُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَالنَّجْمِ، فَلَمْ يَسْجُدْ فِيهَا»(١).

واتە: لە زەیدی کوڕی سابیتەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ سوڕەتی [والنجم]م خوێند، کڕنووشی تیادا نەبرد.

## بابەت: چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەری خوا

١٥١٩ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مَا بَيْنَ الْعِشَاءِ إِلَى الْفَجْرِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُسَلِّمُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ وَيُوتِرُ بِوَاحِدَةٍ، وَيَسْجُدُ فِي سُبْحَتِهِ بِقَدْرِ مَا يَقْرَأُ أَحَدُكُمْ خَمْسِينَ آيَةً قَبْلَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، فَإِذَا سَكَتَ الْمُؤَذِّنُ مِنَ الْأَذَانِ الْأَوَّلِ رَكَعَ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمُؤَذِّنُ، فَيَخْرُجَ مَعَهُ»(٢).

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەر ﷺ یازدە ڕەکعەتی لە نێوان عیشا و بەیانیدا دەکرد، لە هەر دوو ڕەکعەتێکدا سەلامی دەدایەوە و، ڕەکعەتێکیشی بە تاک دەکرد، وە لە سوننەتەکەیدا کڕنووشی دەبرد بە ئەندازەی ئەوەی کەسێک لە ئێوە پەنجا ئایەت بخوێنێت، پێش ئەوەی سەری بەرز بکاتەوە، جا کاتێک بانگبێژ بێ دەنگ دەبوو لە بانگدانی یەکەم (واتە: بانگدان نەک قامەت، چونکە قامەت بانگدانی دووەمە)، دوو ڕەکعەتی خەفیف و کورتی دەکرد، دواتر پاڵ دەکەوت تاوەکو بانگبێژ دەهات بۆ لای و لەگەڵی دەردەچوو.

١٥٢٠ - «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِاللَّيْلِ، فَقَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً: يُصَلِّي ثَمَانَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ يُوتِرُ، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ، قَامَ فَرَكَعَ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ بَيْنَ النِّدَاءِ وَالْإِقَامَةِ مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ»(٣).

واتە: لە ئەبو سەلەمەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پرسیارم لە عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) کرد دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بە شەو (واتە: دەربارەی شەونوێژ)، ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سێزدە ڕەکعەت نوێژی دەکرد: هەشت ڕەکعەتی (جووتی) دەکرد، دواتر ویتری دەکرد، دوو ڕەکعەتی دەکرد بە دانیشتنەوە، جا کاتێ بیویستایە ڕکوع بەرێت ئەوە هەڵدەستایەوەو ڕکوعی دەبرد، وە دوو ڕەکعەتیشی لە نێوان بانگ و قامەت دەکرد لە نوێژی بەیانیدا.

تێبینی: ئەم فەرموودەیە تێکگیران دروست ناکات لەگەڵ فەرموودەی تر، کە دەفەرموێت یازدە ڕەکعەت شەونوێژی دەکرد، چونکە کە لەو فەرموودەیەدا هاتوە سێزدەی کردوە لەبەر ئەوەیە ڕەنگە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

دایكە عائیشە سوننەتی عیشاشی لەگەڵ ئەژمار كردبێت، ئەو كات دەبێتە سێزدە، یان هەندێک جار هەبووە سێزدە ڕەكعەتی كردوە و هەندێ جاریش یازدەی كردوە، ئاساییە.

١٥٢١ - «عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَأَتَى الْمَدِينَةَ لِبَيْعِ عَقَارِهِ، فَيَجْعَلَهُ فِي السِّلَاحِ وَالْكُرَاعِ، فَلَقِيَ رَهْطًا مِنَ الْأَنْصَارِ فَقَالُوا: أَرَادَ ذَلِكَ سِتَّةٌ مِنَّا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَمَنَعَهُمْ، وَقَالَ: أَمَا لَكُمْ فِيَّ أُسْوَةٌ؟ ثُمَّ إِنَّهُ قَدِمَ الْبَصْرَةَ، فَحَدَّثَنَا أَنَّهُ لَقِيَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ، فَسَأَلَهُ عَنِ الْوِتْرِ فَقَالَ: أَلاَ أُحَدِّثُكَ بِأَعْلَمِ النَّاسِ بِوِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: أُمُّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةُ، فَأْتِهَا فَاسْأَلْهَا، ثُمَّ ارْجِعْ إِلَيَّ فَحَدِّثْنِي بِمَا تُحَدِّثُكَ، فَأَتَيْتُ حَكِيمَ بْنَ أَفْلَحَ فَقُلْتُ لَهُ: انْطَلِقْ مَعِي إِلَى أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ، قَالَ: إِنِّي لاَ آتِيهَا، إِنِّي نَهَيْتُ عَنْ هَذِهِ الشِّيعَتَيْنِ، فَأَبَتْ إِلاَّ مُضِيًّا، قُلْتُ: أَقْسَمْتُ عَلَيْكَ لَمَا انْطَلَقْتَ، فَانْطَلَقْنَا، فَسَلَّمْنَا، فَعَرَفَتْ صَوْتَ حَكِيمٍ فَقَالَتْ: مَنْ هَذَا؟، قُلْتُ: سَعْدُ بْنُ هِشَامٍ، قَالَتْ: مَنْ هِشَامٌ؟، قُلْتُ هِشَامُ بْنُ عَامِرٍ، قَالَتْ: نِعْمَ الْمَرْءُ، قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ، قُلْتُ: أَخْبِرِينَا عَنْ خُلُقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَتْ: أَلَسْتَ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَتْ: فَإِنَّهُ خُلُقُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَرَدْتُ أَنْ أَقُومَ وَلاَ أَسْأَلَ أَحَدًا عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أَلْحَقَ بِاللَّهِ فَعَرَضَ لِي الْقِيَامُ، فَقُلْتُ: أَخْبِرِينَا عَنْ قِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَتْ: أَلَسْتَ تَقْرَأُ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ١﴾ المزمل؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَتْ: فَإِنَّهَا كَانَتْ قِيَامَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أُنْزِلَ أَوَّلُ السُّورَةِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَصْحَابُهُ حَتَّى انْتَفَخَتْ أَقْدَامُهُمْ، وَحُبِسَ آخِرُهَا فِي السَّمَاءِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا، ثُمَّ أُنْزِلَ، فَصَارَ قِيَامُ اللَّيْلِ تَطَوُّعًا بَعْدَ أَنْ كَانَ فَرِيضَةً، فَأَرَدْتُ أَنْ أَقُومَ وَلاَ أَسْأَلَ أَحَدًا عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أَلْحَقَ بِاللَّهِ. فَعَرَضَ لِي الْوِتْرُ، فَقُلْتُ: أَخْبِرِينَا عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا نَامَ، وَضَعَ سِوَاكَهُ عِنْدِي، فَيَبْعَثُهُ اللهُ لِمَا يَشَاءُ أَنْ يَبْعَثَهُ، فَيُصَلِّي تِسْعَ رَكَعَاتٍ لاَ يَجْلِسُ إِلاَّ فِي الثَّامِنَةِ، فَيَحْمَدُ اللَّهَ وَيَدْعُو رَبَّهُ، ثُمَّ يَقُومُ وَلاَ يُسَلِّمُ، حَتَّى يَجْلِسَ فِي التَّاسِعَةِ، فَيَحْمَدُ اللَّهَ وَيَدْعُو رَبَّهُ وَيُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً يُسْمِعُنَا، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَتِلْكَ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يَا بُنَيَّ، فَلَمَّا أَسَنَّ وَحَمَلَ اللَّحْمَ، صَلَّى سَبْعَ رَكَعَاتٍ لاَ يَجْلِسُ إِلاَّ فِي السَّادِسَةِ، فَيَحْمَدُ اللَّهَ وَيَدْعُو رَبَّهُ، ثُمَّ يَقُومُ وَلاَ يُسَلِّمُ، ثُمَّ يَجْلِسُ فِي السَّابِعَةِ، فَيَحْمَدُ اللَّهَ وَيَدْعُو رَبَّهُ، ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ فَتِلْكَ تِسْعٌ، يَا بُنَيَّ، وَكَانَ النَّبِيُّ إِذَا غَلَبَهُ نَوْمٌ أَوْ مَرَضٌ، صَلَّى مِنَ النَّهَارِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ إِذَا أَخَذَ خُلُقًا، أَحَبَّ أَنْ يُدَاوِمَ عَلَيْهِ، وَمَا قَامَ نَبِيُّ اللَّهِ لَيْلَةً حَتَّى يُصْبِحَ، وَلاَ قَرَأَ الْقُرْآنَ كُلَّهُ فِي لَيْلَةٍ، وَلاَ صَامَ شَهْرًا كَامِلاً غَيْرَ رَمَضَانَ، فَأَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ، فَحَدَّثْتُهُ، فَقَالَ: صَدَقَتْكَ أَمَا إِنِّي لَوْ كُنْتُ أَدْخُلُ عَلَيْهَا لَشَافَهْتُهَا مُشَافَهَةً» قَالَ: فَقُلْتُ: أَمَا إِنِّي لَوْ شَعَرْتُ أَنَّكَ لاَ تَدْخُلُ عَلَيْهَا مَا حَدَّثْتُكَ»[1].

واتە: لە سەعدی كوڕی هیشامەوە گێردراوەتەوە، كە (یەكێک لە تابعینە) ئافرەتەكەی تەڵاقدا (تا بچێتە جیهاد) و هاتە مەدینە بۆ فرۆشتنی زەویەكەی تا بیكاتە چەک و تفاق و سواری (بۆ جیهاد كردن)، جا گەیشت بە كۆمەڵێک لە ئەنصاریەكان، ئەوانیش وتیان: شەش كەس لە ئێمە ویستی ئاوا بكات (وەک تۆ بچێت هەموو شتێک جێ بهێڵێت و خێزانەكەی تەڵاق بدات بۆ جیهاد كردن) لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێ كردن و فەرمووی: مەگەر بۆ ئێوە لە مندا چاولێكەری نیە؟! (مەگەر نابێ چاو لە من بكەن، مەگەر جیهاد ناكەم و ژن و منداڵیشم هەیە)؟! دواتر (سەعد) چوو بۆ

---

(١) ـ صحيح.

بەصرە و بۆی گێڕاینەوە کە بە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس گەیشتووە و پرسیاری لێ کردوە دەربارەی ویتر، ئەویش وتویەتی: ئایا قسەت بۆ نەکەم دەربارەی زاناترینی خەڵکی بە ویتری پێغەمبەری خوا ﷺ؟ وتم: بەڵێ (قسەم بۆ بکە)، وتی: عائیشەی دایکی بڕوادارانە، بڕۆ بۆ لای و پرسیاری لێ بکە، دواتر بگەڕێوە بۆ لام و بۆم بگێڕەوە چی بۆ گێڕایتەوە، (سەعد دەڵێ): چووم بۆ لای حەکیمی کوڕی ئەفلەح و پێم وت: وەرە لەگەڵم بۆ لای دایکی بڕواداران (دایکە عائیشە)، ئەویش وتی: من نایێم بۆ لای، من ئەو دوو کۆمەڵەم پێ خۆش نیە (کۆمەڵەی دایکە عائیشە و کۆمەڵەی پێشەوا عەلی کاتێ کێشەیان هەبوو) چونکە هەموو شتێک ڕەت دەکەنەوە، تەنها ئەوە جێبەجێ دەکەن کە دەیانەوێت، وتم: سوێندم لەسەر خواردووی کە دەبی بێی، (بۆیە هات) و ڕۆیشتین، (کە گەیشتین) سەلاممان کرد و عائیشە دەنگی حەکیمی ناسیەوە و (بە حەکیمی) وت: ئەوە کێیە (لەگەڵتە)؟ (سەعد دەڵێ) وتم: سەعدی کوڕی هیشام، وتی هیشام کێیە؟ وتم: هیشامی کوڕی عامیر، عائیشە وتی: باشترین مرۆڤ بوو، لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا کوژرا، (سەعد دەڵێ) وتم: هەواڵمان پێ بدە دەربارەی خوڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ، عائیشە وتی: مەگەر تۆ قورئان ناخوێنی؟ وتم: بەڵێ (دەیخوێنم)، وتی: دەی ئەوە خوڕەوشتی پێغەمبەری خوایە ﷺ (پێغەمبەری خوا ﷺ خوڕەوشتی ڕێک وەک قورئان بوو)، (دەڵێ): ویستم هەڵسم و پرسیار لە کەس نەکەم دەربارەی هیچ شتێک تا دەگەمەوە بە خوا (تا دەمرم)، چونکە وەڵامەکەی دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەهێز و گشتگیر بوو)، لە ناکاو شەونوێژم بۆ هات و وتم: هەواڵمان پێ بدە دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: ئایا: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ١ ﴾، ناخوێنی؟ وتم: بەڵێ (دەیخوێنم)، وتی: ئەوە شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، یەکەم سوورەت بوو دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانیشی شەونوێژیان دەکرد تا ڕاددەیەک قاچەکانیان هەڵئاوسا بوو، وە کۆتایی سورەتەکە لە ئاسمان ڕاگیرا شەش مانگان، دواتر دابەزی (بە تەواوی) و شەونوێژیش بووە سوننەت پاش ئەوەی فەرز و واجب بوو، (دەڵێ): ویستم هەڵسم و پرسیار لە کەس نەکەم دەربارەی هیچ شتێک تا دەگەمەوە بە خوا (تا دەمرم)، لەناکاو (بابەتی) ویترم بۆ هات و وتم: هەواڵمان پێ بدە دەربارەی ویتری پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەخەوت سیواکەکەی لەلای من دادەنا و خەبەری دەبوویەوە هەر کاتێ خوا ویستی لەسەربووا خەبەری بکاتەوە، جا نۆ ڕەکعەتی دەکرد، لە هیچیان دانەدەنیشت تەنها لە هەشتەم نەبێت (دوای ڕەکعەتی هەشتەم هەندێک دادەنیشت)، جا حەمد و ستاییشی خوای دەکرد و دووعا و نزای لای پەروەردگاری دەکرد، دواتر هەڵدەستا (ڕەکعەتی تری دەکرد) سەلامیشی نەدەدایەوە، دواتر لە نۆیەم (ڕەکعەت) دادەنیشت و حەمد و ستاییشی خوای دەکرد و دووعا و نزای لای پەروەردگاری دەکرد و سەلامێکی دەدایەوە گوێبیستی دەکردین (بە دەنگ سەلامەکەی دەدایەوە و گوێمان لێ دەبوو)، دواتر دوو ڕەکعەتی دەکرد بە دانیشتویی، ئەوە یازدە ڕەکعەت ئەی ڕۆڵەکەم، جا کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەتەمەنداچوو و گۆشتی زیاتری گرت، حەوت ڕەکعەتی دەکرد، لە هیچیان دانەدەنیشت لە شەشەم نەبێت، حەمد و ستاییشی خوای دەکرد و دووعا و نزای لای پەروەردگاری دەکرد، دواتر هەڵدەستا (بۆ ڕەکعەتی حەوتەم) و سەلامی نەدەدایەوە، دواتر لە ڕەکعەتی حەوتەمدا

دادەنیشت، حەمد و ستاییشی خوای دەكرد و دووعا و نزای لای پەروەردگاری دەكرد، دواتر سەلامێكی دەدایەوە، دواتر دوو ڕەكعەتی دەكرد بە دانیشتویی، ئەوە نۆ ڕەكعەت ئەی ڕۆڵەكەم.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ (بە شەو) كاتێ خەو یان نەخۆشی بەسەریدا زاڵ دەبوو، ئەوە بە ڕۆژ دوازدە ڕەكعەتی دەكرد و (شەونوێژەكانی قەزا دەكردەوە)، وە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئاكارێكی بگرتایە حەزی دەكرد لەسەری بەردەوام بێت، وە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شەوێك شەونوێژی نەكردوە تا بەیانی، وە هەموو قورئانیشی لە یەك شەودا نەخوێندووە، وە هیچ مانگێكیش بە تەواوی بەڕۆژوو نەبووە جگە لە ڕەمەزان.

## بابەت: كام شەونوێژ باشترین و گەورەترینە؟

**١٥٢٢** - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أَفْضَلُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ، الصَّلاَةُ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: باشترین و گەورەترین نوێژ دوای نوێژە فەرزەكان، ئەو نوێژەیە كە لە سێیەكی كۆتایی شەودایە (واتە: شەونوێژ كردن سێیەكی كۆتایی شەو).

## بابەت: ئەگەر (كەسێك) خەوی لێكەوت نەیتوانی ئەو پەرستشەی كردوویەتی بە عادەت جێبەجێی بكات بە شەو

**١٥٢٣** - «أَنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَبْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ، أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ، فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الظُّهْرِ، كُتِبَ لَهُ لَكَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ»[٢].

واتە: لەعەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەبد گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ بوو دەیووت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك خەوی لێكەوت و نەیتوانی ئەو پەرستشەی كە كردوویەتی بە عادەت جێبەجێی بكات، یان هەندێكی مابوو (پێی جێبەجێ نەكرا)، ئەوە با بیخوێنێت و (ئەنجامی بدات) لە نێوان نوێژی بەیانی و نوێژی نیوەڕۆدا (واتە: دانی بەیانی قەزای بكاتەوە)، بۆی دەنوسرێت وەك ئەوەی بە شەوەكە خوێندبێتی و ئەنجامی دابێت.

## بابەت: خوای پەروەردگار دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا

**١٥٢٤** - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَنْزِلُ اللهُ تَعَالَى إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كُلَّ لَيْلَةٍ لِنِصْفِ اللَّيْلِ الآخِرِ، أَوْ لِثُلُثِ اللَّيْلِ الآخِرِ، فَيَقُولُ: مَنْ ذَا الَّذِي يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ مَنْ ذَا الَّذِي يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ ذَا الَّذِي يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟ حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ، أَوْ يَنْصَرِفَ الْقَارِئُ مِنْ صَلاَةِ الْفَجْرِ»[٣].

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، والحديث صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: خوای بەرز دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا هەموو شەوێک لە نیوەی کۆتایی شەو، یان لە سێیەکی کۆتایی شەو و دەفەرموێت: ئەو کەسە کێیە کە نزام لەلا دەکات تا بۆی گیرا بکەم؟ ئەو کەسە کێیە کە داوام لێ دەکات تا پێی ببەخشم؟ ئەو کەسە کێیە کە داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات تا لێی خۆش ببم؟ تا بەیان هەڵدێت یان نوێژخوێن لە نوێژی بەیانی دەگەڕێتەوە. (واتە: تا کاتی بەیان بەردەوام بانگی بەندەکانی دەکات و لە ڕەحمەتی خۆی داواکانیان پێ دەبەخشێت).

تێبینی: بە نسبەت دابەزینی خوای بەرز و مەزن هیچێک لە ئیمەی مرۆڤەکان نازانین چۆنە، بەڵام دەبێ بزانین بە واتای ئەو دابەزینە نایێت کە لە خەیاڵی مرۆڤەکاندا هەیە، وەک زانایانی پێشین گوتوویانە: (وكل ما جرى ببالك فالله بخلاف ذلك)، گرنگ ئەوەیە بزانین لەو کاتەدا ڕەحمەتەکەی لە بەندەکانی نزیکترە و ئەو بەڵێنانەیان بۆ دەهێنێتەجێ. والله أعلم.

١٥٢٥ - «حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَأَبُو عَبْدِ اللَّهِ الْأَغَرُّ، صَاحِباً أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ أَبا هُرَيْرَةَ ﷺأَخْبَرَهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ اسْمُهُ كُلَّ لَيْلَةٍ حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟ مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ حَتَّى الْفَجْرِ»[١].

واتە: لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان و ئەبو عەبدوڵڵای ئەغەڕی هاوەڵانی ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە ئەبو هورەیرە بۆی گێڕاونەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارمان کە ناوەکەی بەرز و بڵند و پاکە دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا هەموو شەوێک کاتێک سێیەکی کۆتایی شەو دەمێنێت، وە دەفەرموێت: کێ نزام لا دەکات تا بۆی گیرا بکەم؟ کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات تا لێی خۆش بم؟ کێ داوام لێ دەکات تا پێی ببەخشم؟ تا بەیانی.

١٥٢٦ - «عَنْ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: يَنْزِلُ اللهُ تَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيَقُولُ: هَلْ مِنْ سَائِلٍ فَأُعْطِيَهُ؟ هَلْ مِنْ مُسْتَغْفِرٍ فَأَغْفِرَ لَهُ؟»[٢].

واتە: لە نافیعی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای پەروەردگار ڕەحمەتەکەی دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا هەموو شەوێک و دەفەرموێت: ئایا داواکارێک هەیە تا پێی ببەخشم؟ ئایا داواکاری لێخۆشبوون هەیە تا لێی خۆشبم؟.

١٥٢٧ - «عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ عَرَابَةَ الْجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِذَا مَضَى مِنَ اللَّيْلِ نِصْفُهُ أَوْ ثُلُثَاهُ، هَبَطَ اللهُ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، ثُمَّ يَقُولُ: لاَ أَسْأَلُ عَنْ عِبَادِي غَيْرِي، مَنْ ذَا الَّذِي يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ ذَا الَّذِي يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟ مَنْ ذَا الَّذِي يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ»[٣].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە ڕیفاعەی کوڕی عەڕابەی جوهەنیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ نیوە یان دوو بەش لە سێ بەشی شەو دەڕوات، خوا بۆ ئاسمانی دونیا دادەبەزێت، دواتر دەفەرموێت: پرسیار لە بەندەکانم ناکەم دەربارەی خۆم نەبێت: ئەو کەسە کێیە کە داوام لێ دەکات تا پێی ببەخشم؟ ئەو کەسە کێیە کە داوای لێخۆشبوونم لێ دەکات تا لێی خۆش بم؟ ئەو کەسە کێیە کە نزام لا دەکات تا بۆی گیرا بکەم؟ تا بەیان هەڵدێت.

١٥٢٨ - «حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ جَرِيرٍ، حَدَّثَنَا هِشَامٌ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ هِلاَلِ بْنِ أَبِي مَيْمُونَةَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، أَنَّ رِفَاعَةَ أَخْبَرَهُ، عنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ»[1].

واتە: لەو ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

١٥٢٩ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا كَانَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، أَوْ نِصْفُ اللَّيْلِ، فَذَكَرَ النُّزُولَ»[2].

واتە: لە (پێشەوا) عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ دەبێتە سێیەکی شەو، یان نیوەی شەو، جا باسی دابەزینەکەی کرد...

١٥٣٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ، وَلأَخَّرْتُ الْعِشَاءَ الآخِرَةَ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ، فَإِنَّهُ إِذَا مَضَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الأَوَّلُ، هَبَطَ اللهُ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَلَمْ يَزَلْ هُنَالِكَ حَتَّى يَطْلُعَ الْفَجْرُ، يَقُولُ قَائِلٌ: أَلاَ سَائِلٌ يُعْطَى؟ أَلاَ دَاعٍ يُجَابُ؟ أَلاَ سَقِيمٌ يَسْتَشْفِي فَيُشْفَى؟ أَلاَ مُذْنِبٌ مُسْتَغْفِرٌ، فَيُغْفَرَ لَهُ؟»[3].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ئەگەر لەسەر ئوممەتەکەم زەحمەت و گران نەبووایە ئەوە (بە واجب بوون) فەرمانم پێ دەکردن سیواک بکەن، (دەم و ددانیان بشۆرن) لەکاتی هەموو نوێژێکدا، وە (ئەگەر زەحمەت نەبووایە) ئەوە نوێژی عیشاشم تاخیر دەکرد تا سێیەکی شەو، چونکە کاتێ سێیەکی یەکەمی شەو دەڕوات، خوا بۆ ئاسمانی دونیا دادەبەزێت، هەر لەوێیە تاوەکو بەیان هەڵدێت، کەسێک (بانگبێژێک لە فریشتەکان) دەڵێت: ئایا داواکارێک هەیە تا پێی ببەخشرێت؟ ئایا نزاکارێک هەیە تا وەڵام بدرێتەوە؟ ئایا نەخۆشێک هەیە داوای شیفا و چاکبوونەوە بکات تا شیفا بدرێت و چاک بکرێتەوە؟ ئایا تاوانبارێک هەیە داواکار بێت بۆ لێخۆش بوون تا لێی ببوردرێت؟

١٥٣١ - «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ مِثْلَ حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ»[4].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودەی پێشوو گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دووعای کاتی هەڵسانەوە بۆ شەونوێژ

١٥٣٢ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله ﷺ إِذَا قَامَ يَتَهَجَّدُ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: اللهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيِّوم السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ مَلِكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَقَوْلُكَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ الحَقُّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالْبَعْثُ حَقٌّ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ، وَمُحَمَّدٌ ﷺ حَقٌّ، اللهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَعْلَنْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لاَ إِلَهَ إِلاَ أَنْتَ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَ بِكَ»[(١)].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هەڵدەستا شەونوێژی دەکرد بە شەو، دەیفەرموو: ئەی خوایە ستایش هەر بۆ تۆیە، تۆ ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێویاندایە، وە ستایش هەر بۆ تۆیە، تۆ هەڵسوڕێنەری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی کە لە نێویاندایە، وە ستایش هەر بۆ تۆیە، تۆ پادشا و خاوەن و دەسەڵاتداری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی کە لە نێویاندایە، تۆ هەق و ڕاستی بەبێ گومان، گوفتاریشت هەق و ڕاستە، بەڵێنیشت هەق و ڕاستە، بەیەکگەیشتن و چاوپێکەوتنیشت هەق و ڕاستە، بەهەشتیش هەق و ڕاستە، دۆزەخیش هەق و ڕاستە، زیندووبوونەوەش هەق و ڕاستە، پێغەمبەرانیش هەق و ڕاستن، موحەممەدیش هەق و ڕاستە، خوایە خۆم تەنها تەسلیمی تۆ کرد، وە تەنها بڕوام بە تۆ هێنا، وە تەنها پشتم بە تۆ بەست، وە تەنها بۆ لای تۆ گەڕامەوە، وە لە پێناوی تۆ بەربەرەکانێم کرد (لەگەڵ ئەهلی باتڵدا)، وە داوای حوکمی تۆم کردوە (لە بەندەکان تا جێبەجێی بکەن)، دە کەواتە لێم خۆشبە لەوەی پێشی خۆم خستووە و لەوەی دوای خۆم جێم هێشتووە، وە لەوەی بە ئاشکرا کردومە و لەوەی بە پەنهان کردومە (لە کردەوەکانم کە کەمتەرخەمی تیا بووبێ)، تۆ سەرەتا و (یەکەمی)، وە تۆ کۆتایی (بێ کۆتایی)، هیچ خودایێکی بە هەق نیە جگە لە تۆ، وە هیچ لادان و دوورکەوتنەوەیەک نیە (لە تاوان) و هیچ هێز و قوەتێک نیە (بۆ ئەنجامدانی چاکە) تەنها بە تەوفیقی تۆیە. (واتە: دروستکردن و خەلقی لادان لە خراپە و خەلقی هێز بۆ عیبادەت و چاکە هەر خوا بۆ مرۆڤی دروست دەکات، کەسیتر ناتوانێت خەلقی بکات و تەوفیقی بدات).

## بابەت: (دەربارەی) ئەو کەسەی دوو ئایەتەکانی کۆتایی سوڕەتی بەقەڕە بخوێنێت

١٥٣٣ - «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: مَنْ قَرَأَ الأيَتَيْنِ الْآخِرَتَيْنِ مِنْ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ، كَفَتَاهُ»[(٢)].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو مەسعودەوە (رَضِي اللهُ عَنْهُ) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێراوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک دوو ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی بەقەرە بخوێنێت لە شەوێکدا، ئەوە بەسیەتی (لەو شەوەدا، چونکە پارێزراو دەبێت لە شەڕ و خراپە و پاداشتی باشیش بەدەست دەهێنێت کە بەسیەتی، ئەوەندە زۆرە).

## بابەت: دەنگ خۆش کردن بە قورئان (لە کاتی خوێندنی قورئاندا)

١٥٣٤ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا أَذِنَ اللهُ لِشَيْءٍ، كَأَذْنِهِ لِنَبِيّ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ يَجْهَرُ بِهِ»[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا گوێبیستی بۆ هیچ شتێک ناکات (یەکجار بە گرنگی) ئەوەندەی گوێبیستی بۆ پێغەمبەرێک دەکات کە دەنگی خۆش دەکات بە قورئان خوێندن و بە دەنگی خۆش و بە ئاشکرا دەیخوێنێت.

تێبینی: چونکە قورئان کەلامی خوایە و خۆی گەورەیە، پێغەمبەرێکیش دەیخوێنێت کارەکە گەورەتر دەبێت، بە دەنگی خۆشیش دەیخوێنێت، دیسان گەورەتر دەبێت، ئەو کەلامە هەقەش بە دەنگێکی هەقی ئاشکرا دەخوێندرێت، دیسان کارەکە گەورەتر دەبێت، کەواتە قورئان خۆی هەقە پێغەمبەری هەقیش دەیخوێنێت بە دەنگێکی بە هەقیقەت خۆش و بە ئاشکرا کردنی ئەو هەقە، کەواتە چۆن وەکو شتی ترە؟! چۆن خوای میهرەبان گرنگی زیاتر بە بیستنی ئەو نادات؟!.

١٥٣٥ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ أَبا مُوسَى وَهُوَ يَقْرَأُ، فَقَالَ: لَقَدْ أُوتِيَ هَذَا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ»[2].

واتە: لە عائیشەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ گوێی لە ئەبو مووسا بوو لە کاتێکدا قورئانی دەخوێند، (پێغەمبەری خوا) فەرمووی: بە دڵنیایی ئەوە لە دەنگە خۆشەکانی هاوشێوەی داوودی پێدراوە (عليه السلام).

تێبینی: پێغەمبەر داوود عليه السلام هێندە دەنگی خۆش بووە، کاتێ تەسبێحات و حەمد و سەنای خوای دەکرد و زەبوری دەخوێندەوە، هیچ کەسێک و هیچ باڵندەیەک و هیچ ئاژەڵێک و هیچ شتێک خۆیان پێ نەدەگیرا و دەهاتن بۆ لای و دەورەیان لێ دەدا و لەگەڵ ئەو دەستیان بە زیکر دەکرد (وەک لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتوە)، ئەو شتانەش کە نەدەبوو لە شوێنی خۆیان بجوڵێن وەک چیا و دۆڵ و درەخت، ئەوانیش لە شوێنی خۆیان دەستیان بە زیکر و تەهلیلە دەکرد، ئەو ناوە یەک پارچە دەبوو بە قاسپە قاسپ و، چریکە و، چرکە چرک و، جۆش و خرۆشان. اللّٰه اللّٰه دەبێ چۆن بووبێ ئیلاهی!!

---

(١) ـ إسناده حسن، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

١٥٣٦ - «عَنْ سَعْدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ»[1].

واتە: لە سەعدەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لەو سیفەتەدا) لە ئێمە نیە ئەو کەسەی دەنگی بە قورئان خۆش نەکات و (قورئان بە دەنگی خۆش نەخوێنێت و، هەوڵی دەنگ خۆشی نەدات لە قورئان خوێندندا).

١٥٣٧ - «أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَا أَذِنَ اللهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِنَبِيٍّ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: يُرِيدُ بِهِ الِاسْتِغْنَاءَ»[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: خوا گوێبیستی بۆ هیچ شتێک ناکات (یەکجار بە گرنگی) ئەوەندەی گوێبیستی بۆ پێغەمبەرێک دەکات کە دەنگی خۆش دەکات بە قورئان و بە دەنگێکی خۆش و بە ئاشکرا و بە دەنگ دەیخوێنێت.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: مەبەستی پێ ئاواز پێ دانە.

## بابەت: دایکی قورئان (السبع المثاني)یە (واتە: فاتیحەیە)

١٥٣٨ - «عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى ﷺ قَالَ: مَرَّ بِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ ﴿٢٤﴾ ﴾الأنفال، ثُمَّ قَالَ: أَلَا أُعَلِّمُكَ سُورَةً أَعْظَمَ سُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ أَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ؟، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ، قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، وَهِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي، وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُمْ»[3].

واتە: لە ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللاوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلامدا تێپەڕی و فەرمووی: مەگەر خوا نەیفەرمووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بەدەم بانگەوازی خوا و پێغەمبەرەوە ﷺ بچن کاتێک بانگتان دەکەن. دواتر فەرمووی: ئایا سوڕەتێکت فێر نەکەم، کە گەورەترین سوڕەتە لە قورئاندا پێش ئەوەی بچیتە دەرەوە لە مزگەوت؟ جا کاتێ ویستی دەربچێت فەرمووی (سوڕەتەکە): (الحمد لله رب العالمين)ە، کە (السَّبْعُ الْمَثَانِي) یە و، هەروەها قورئانی مەزنیش کە پێم دراوە.

تێبینی: (السَّبْعُ الْمَثَانِي) واتە: سوڕەتە حەوت ئایەتیەکەی هەر دووبارە دەکرێتەوە لە هەموو نوێژەکان، یان ئەوەی دوو جار دابەزیوە، جارێک لە مەککە، جارێکیش لە مەدینە، کە مەبەست پێی فاتیحەیە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: لە چەند قورئان ختم دەکرێت

١٥٣٩ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لاَ يَفْقَهُ مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلاَثٍ»[١].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: تێناگا (لە مانا و مەبەستی قورئان) هەر کەسێک قورئان بخوێنێتەوە لە کەمتر لە سێ ڕۆژ.

تێبینی: زۆر لە زانایان قورئانیان بە ماوەیەکی زۆر لەوە کەمتر خەتم کردوە، زۆربەیان بۆ ئەوەیان بووە بیریان نەچێتەوە، یان بابەتێکیان نەزانیوە بەدوایدا گەڕاون لە هەموو قورئاندا تا بیدۆزنەوە، یان بۆ هەر مەبەستێکی زانستیان بووە، یان بە تەواوی تێی گەیشتوون و پێویستیان بە تێگەیشتن نەماوە، بۆیە بەدوای ئەجری خوێندندا گەڕاون بە تەنها، ئەمانە فەرموودەکە نایانگرێتەوە، چونکە ئەوان بۆ تێگەیشتنی هەموویان نەبووە بۆ بابەتێکیان بووە، بۆیە بە خێرایی بەدوایدا گەڕاون، یان بۆ ئەجری خوێندنیان بووە، لەگەڵ ئەوەشدا خۆ خوێندنی لەو ماوەیە کەمتریش هەر دروستە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە حەڕامی دانەناوە، بەڵام بۆ کەسێک بیەوێت لە کەلامی خوا حاڵی ببێت لە کاتێکدا تەواو حاڵی نەبووبێت، یان بۆ ئەوەی تا کاری پێ بکات ئەوە باشتر وایە لە سێ ڕۆژ کەمتر نەخایەنێت، تا مەبەستەکەی بپێکێت، کە تێگەیشتن و بیرکردنەوەیە لە هەنگاونان بۆ جێبەجێ کردنی.

## بابەت: (حوکمی) ئەو پیاوەی نازانێت سێ ڕەکعەت نوێژی کردوە یان چوار؟

١٥٤٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا نُودِيَ بالأَذَانِ، أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ لَهُ ضُرَاطٌ حَتَّى لاَ يَسْمَعَ الأَذَانَ، فَإِذَا قُضِيَ الأَذَانُ، أَقْبَلَ، فَإِذَا ثُوِّبَ أَدْبَرَ، وَإِذَا قُضِيَ التَّثْوِيبُ، أَقْبَلَ حَتَّى يَخْطِرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ فَيَقُولُ: اذْكُرْ كَذَا، اذْكُرْ كَذَا لِمَا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ إِنْ يَدْرِي كَمْ صَلَّى، فَإِذَا لَمْ يَدْرِ أَحَدُكُمْ كَمْ صَلَّى ثَلاَثًا أَمْ أَرْبَعًا، فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ»[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە، وتویەتی: کاتێ بانگ دەدرێت شەیتان پشت هەڵدەکات و ڕادەکات، دەنگی زۆری هەیە لەدواوەی (هەوای زۆر بەر دەدات) تاوەکو گوێی لە بانگ نەبێت، جا کاتێ بانگ تەواو دەبێت دەگەڕێتەوە، جا کاتێ قامەت دەکرێت (دووبارە) پشت هەڵدەکات و ڕادەکات، وە کاتێ قامەت تەواو دەبێت (دووبارە) دەگەڕێتەوە تاوەکو خەیاڵ لە نێوان مرۆڤ و دڵی دروست بکات و (دڵی لەو جەستەیە دوور بخاتەوە کە خەریکی نوێژە و پێی) دەڵێت: ئەوەت بیر بێتەوە، ئەوەت بیر بێتەوە، هەر بەردەوام ئاوا شتی بۆ باس دەکات تاوەکو مرۆڤ وای لێدێت نازانێت چەند ڕەکعەت نوێژی کردوە، جا کاتێ یەکێک لە ئێوە نەیزانی

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

چەند ڕەکعەتی کردوە، سێ یان چوار، ئەوە با دوو کڕنووش بەرێت لە کاتێکدا کە دانیشتووە (لە کاتی تەحیاتدا، پێشی سەلام دانەوە).

١٥٤١ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا لَمْ يَدْرِ أَحَدُكُمْ أَثَلاَثًا صَلَّى أَمْ أَرْبَعًا، فَلْيَقُمْ، فَلْيُصَلِّ رَكْعَةً، ثُمَّ لِيَسْجُدْ بَعْدَ ذَلِكَ سَجْدَتَيْنِ، فَإِنْ كَانَ صَلَّى خَمْسًا شَفَعَتَا لَهُ صَلاَتَهُ، وَإِنْ كَانَ صَلَّى أَرْبَعًا، كَانَتَا تَرْغِيمًا لِلشَّيْطَانِ»[1].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێک لە ئێوە نەیزانی ئاخۆ سێ ڕەکعەت نوێژی کردوە یان چوار، ئەوە با هەڵسێت و ڕەکعەتێک بکات (چونکە لای کەمەکە هەڵدەبژێردرێت کە سێیە لەبەر ئەوەی یەقینە)، دواتر با پاش ئەوە دوو کڕنووش بەرێت، جا ئەگەر پێنج ڕەکعەتی کردبوو، ئەوە ئەو دوو سوجدانە نوێژەکەی بۆ دەکەنە جووت (چوار)، وە ئەگەر چواری کردبوو (هیچی زیاد و کەم نەبوو) ئەوە دوو سوجدەکان دەبنە زەلیلکەر و سوک کردنی شەیتان.

تێبینی: شەیتان گومان بۆ مرۆڤ دروست دەکات تاوەکو شتێک یان ڕەکعەتێک کەمتر بکات، چونکە کاتی خۆی حەسادەتی بە ئادەم برد کە کرا بە خەلیفە لەسەر زەوی بۆیە کڕنووشی بۆ نەبرد، ئێستاش حەسودی بە نەوەکانی ئادەم دەبات کە ئەو عیبادەت و کڕنووشە دەبەن کە ئەو نەیبرد، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو فێڵەی شەیتانی پوچەڵ کردۆتەوە، چونکە لای کەمەکە هەڵدەبژێرین و دوو سەجدەش دەبەین، جا ئەگەر بە قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکرێت نوێژ زیاد بێت کەم نابێت، شەیتانیش لە ماندوبوون و زەلیلی هیچی بۆ نامێنێتەوە.

## بابەت: دەربارەی دوو کڕنووشەکانی هەڵەکردن بەهۆی زیادە دروست بوون لە نوێژدا

١٥٤٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِحْدَى صَلاَتَيِ الْعَشِيِّ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ وَقَامَ إِلَى خَشَبَةٍ مُعْتَرِضَةٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهَا، قَالَ: يَزِيدُ وَأَرَانَا ابْنُ عَوْنٍ، وَوَضَعَ كَفَّيْهِ إِحْدَاهُمَا عَلَى ظَهْرِ الأُخْرَى، وَأَدْخَلَ أَصَابِعَهُ الْعُلْيَا فِي السُّفْلَى وَاضِعًا وَقَامَ كَأَنَّهُ غَضْبَانُ، قَالَ: فَخَرَجَ السَّرَعَانُ مِنَ النَّاسِ، وَجَعَلُوا يَقُولُونَ: قُصِرَتِ الصَّلاَةُ، قُصِرَتِ الصَّلاَةُ، وَفِي الْقَوْمِ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ فَلَمْ يَتَكَلَّمَا، وَفِي الْقَوْمِ رَجُلٌ طَوِيلُ الْيَدَيْنِ، يُسَمَّى ذُا الْيَدَيْنِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَسِيتَ الصَّلاَةَ أَمْ قُصِرَتْ؟ فَقَالَ: مَا نَسِيتُ وَلاَ قُصِرَتِ الصَّلاَةُ، فَقَالَ: أَوَ كَذَلِكَ؟، قَالُوا: نَعم، قَالَ: فَرَجَعَ فَأَتَمَّ مَا بَقِيَ ثُمَّ سَلَّمَ وَكَبَّرَ فَسَجَدَ طَوِيلاً، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَكَبَّرَ وَسَجَدَ مِثْلَ مَا سَجَدَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ وَانْصَرَفَ»[2].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێک لە نوێژەکانی (دانی) ئێوارەی کرد (نیوەڕۆ یان عەسر بووە)، دوو ڕەکعەتی کرد، دواتر سەلامی دایەوە و چوو لای

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

دارێکی درێژکراو و داندرا و لەناو مزگەوتدا و دەستی خستە سەری، یەزید وتویەتی: ئیبنو عەون پێی نیشاندائین (پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن وەستاوە)، یەکێک لە دەستەکانیشی لەسەر پشتە دەستەکەی تری دانا، وە پەنجەکانی دەستی سەرەوەی خستە ناو پەنجەکانی دەستی خوارەوە و وەستا وەک ئەوەی تورە بێت، دەڵێ: خەڵکە بێ ئارام و بە پەلەپەلەکەش (ئەوانەی بەردەوام خۆیان بۆ ناگیرێت و پەلە لە هەموو شتێکدا دەکەن) دەرچوون و دەیان وت: نوێژ کورت کراوەتەوە، نوێژ کورت کراوەتەوە، ئەبوبەکر و عومەریش لەناو خەڵکی (مزگەوتدا) بوون هیچ قسەیەکیان نەکرد (چونکە ئەوان حەکیم بوون)، وە لەناو خەڵکەکەدا پیاوێکی باسک درێژیش هەبوو، پێی دەوترا: (ذو اليدين) خاوەن دوو باسکەکە (واتە: هەر باسکێکی وەک ئەوە وایە دوو باسک بن، لەبەر ئەوەی باسکەکانی هەندێک لە باسکی ئاسایی درێژتر بوو، بۆیە وایان پێ دەوت) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا (دوو ڕەکعەتەکانی کۆتاییت) لەبیر چوو یان کورت کراوەتەوە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: نە لە بیرم چووە (تا هەڵەم کردبێت) وە نە نوێژیش کورت کراوەتەوە، (بە خەڵکەکەی فەرموو): ئاوایە وەکو ذول یەدەین دەڵێ؟ وتیان: بەڵێ، (ئەبو هورەیرە) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە (بۆ نوێژەکە) و ئەوەی مابوو تەواوی کرد (واتە: دوو ڕەکعەتی تری کرد)، دواتر سەلامی دایەوە و (اللّٰه أكبر)ی کرد و کڕنووشێکی درێژی برد، دواتر سەری بەرز کردەوە (هەڵسایەوە لە سەجدە) و (اللّٰه أكبر)ی کرد و کڕنووشی برد وەک کڕنووشەکەی پێشوو، دواتر سەری بەرز کردەوە (لە کڕنووشەکەی) و کۆتایی پێ هێنا.

١٥٤٣ - «أَنَّ أبا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الظُّهْرِ أَوِ الْعَصْرِ، فَسَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ مِنْ إِحْدَاهُمَا، فَقَالَ لَهُ ذُو الشِّمَالَيْنِ بْنُ عَبْدِ عَمْرِو بْنِ نَضْلَةَ الْخُزَاعِيُّ، وَهُوَ حَلِيفُ بَنِي زُهْرَةَ: أَقُصِرَتْ أَمْ نَسِيتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَمْ أَنْسَ وَلَمْ تُقْصَرْ، فَقَالَ ذُو الشِّمَالَيْنِ: قَدْ كَانَ بَعْضُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ؟، قَالُوا: نَعم، يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَتَمَّ الصَّلَاةَ، وَلَمْ يُحَدِّثْنِي أَحَدٌ مِنْهُمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ فِي تِلْكَ الصَّلَاةِ، وَذَلِكَ فِيمَا يُرَى وَاللهُ أَعْلَمُ مِنْ أَجْلِ أَنَّ النَّاسَ يَقَّنُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَتَّى اسْتَيْقَنَ»[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ یان عەسری کردو، سەلامی دایەوە لە دووەم ڕەکعەتی یەکێک لەو دوو نوێژانە (نیوەڕۆ یان عەسر)، جا (ذو الشماڵين) ـ واتە: خاوەن دوو دەستە چەپەکە (چونکە باسکی درێژ بوو چەپەشی وەکو ڕاستە ئیشی دەکرد، هەموو کارێکی پێ دەکرد وەکو ڕاستە هێزی تیا بوو، بۆیە پێیان دەوت « ذو الشماڵين») بە پێغەمبەری خوای ﷺ وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لەبیرت چوو یان کورت کراوەتەوە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: نە لەبیرم چووە (تا هەڵەم کردبێت) وە نە نوێژیش کورت کراوەتەوە، ذول شیماڵین وتی: بە دڵنیایی یەکێک لەوانە ڕووی داوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی: ذول یەدەین ڕاست دەکات (هەڵەی نەکردووە)؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ هەڵسا و نوێژەکەی تەواو کرد (دوو ڕەکعەتی تری کرد).

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

جا (زوهری) دەڵێت: كەس لەوان بۆی نەگێڕاومەتەوە (من بە دەستم نەگەیشتووە) پێغەمبەری خوا ﷺ دوو كڕنووشی بردبن لە كاتێكدا كە دانیشتبێت لەو نوێژەدا، وە ئەوەی ئێمە بیزانین ئەوەش لەبەر ئەوە بووە (لەبەر ئەوە كڕنووشی سەهوی نەبردووە) چونكە خەڵكەكە پێغەمبەری خوایان ﷺ دڵنیا كردۆتەوە (قسەیان لەگەڵ كردوە لەسەر بابەتەكە) تاوەكو یەقینی بۆ دروست بووە كە هەڵەی كردوە، (دیارە قسەكان زۆر بوون بۆیە بە كەڵكی سوجدەی سەهو نەهاتوە).

تێبینی: ڕاستە زوهری ئەو فەرموودەیەی لەلا نەبووە كە باسی كڕنووش بردنەكەی دەكات، بەڵام فەرموودەكە ڕاستە و هەیە و صەحیحە و كەسانیتر لەلایان بووە، وەک لە فەرموودەكەی پێشی ئەم فەرموودەیە باس كرا، كەواتە سەجدە بردراوە.

١٥٤٤ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ صَلَّى الظُّهْرَ خَمْسًا، فَقِيلَ لَهُ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ»[1].

واتە: لە عەبدوڵلا ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە، كە نوێژی نیوەڕۆی بە پێنج ڕەكعەت كرد، جا پێی وترا، ئەویش ڕاستەوخۆ دوو كڕنووشی برد.

## بابەت: ئەگەر كەم وكوڕیەک لە نوێژدا دروست بوو

١٥٤٥ - «عَنْ ابْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ قَامَ وَلَمْ يَجْلِسْ، وَقَامَ النَّاسُ، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ نَظَرْنَا تَسْلِيمَهُ فَكَبَّرَ، فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ، ثُمَّ سَلَّمَ»[2].

واتە: لە ئیبنو بوحەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕەكعات نوێژی پێ كردین، دواتر هەڵسایەوە و دانەنیشت (بۆ تەحیاتی ڕەكعەتی دووەم)، خەڵكیش هەڵسانەوە، جا كاتێ لە كۆتایی نوێژەكەی دابوو چاوەڕێی سەلام دانەوەیمان كرد، (اللّه أكبر)ی كرد و دوو كڕنووشی برد لە كاتێكدا كە دانیشتبوو، پێش ئەوەی سەلام بداتەوە، دواتر سەلامی دایەوە.

١٥٤٦ - «عَنْ مالِكِ ابْنِ بُحَيْنَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ أَوِ الْعَصْرِ، فَلَمْ يَرْجِعْ حَتَّى فَرَغَ مِنْ صَلَاتِهِ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيِ الْوَهْمِ، ثُمَّ سَلَّمَ»[3].

واتە: لە مالیكی كوڕی بوحەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساوەتەوە لە دووەم ڕەكعەتی نوێژی نیوەڕۆ یان عەسر، جا نەگەڕایەوە (بۆ دانیشتنەكە) تاوەكو لە نوێژەكەی بوویەوە (تەنها سەلام دانەوەی مابوو)، دواتر دوو كڕنووش و سەجدەی هەڵەكردن (سەهوو)ی برد، دواتر سەلامی دایەوە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

١٥٤٧ - «عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ قَالَ: صَلَّى بِنَا الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ ﷺ، فَلَمَّا صَلَّى رَكْعَتَيْنِ قَامَ وَلَمْ يَجْلِسْ، فَسَبَّحَ بِهِ مَنْ خَلْفَهُ، فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ: أَنْ قُومُوا، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ، سَلَّمَ وَسَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ وَسَلَّمَ، وَقَالَ: هَكَذَا صَنَعَ بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[١].

واتە: لە زیادی كوڕی عیلاقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: موغیرەی كوڕی شوعبە ﷺ نوێژی پێ كردین، جا كاتێ دوو ڕەكعەتی كرد هەڵسایەوە و دانەنیشت (بۆ تەحیات خوێندن)، ئەوانەی لە دواوەشی بوون (بە دانیشتنەوە) وتیان: سبحان الله، سبحان الله (تا شوعبە دابنیشێتەوە)، شوعبەش ئاماژەی بۆ كردن هەڵسنەوە، جا كاتێ لە نوێژەكەی بوویەوە (تەنها سەلامی مابوو)، دوو كڕنووشی هەڵەكردنی برد و سەلامی دایەوە و وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای بۆ كردین.

## بابەت: حەڕامیەتی قسە كردن لە ناو نوێژدا

١٥٤٨ - «عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ الْحَكَمِ السُّلَمِيِّ ﷺ قَالَ: بَيْنَا أَنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الصَّلاَةِ إِذْ عَطَسَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، فَقُلْتُ: يَرْحَمُكَ اللهُ، قَالَ: فَحَدَّقَنِي الْقَوْمُ بِأَبْصَارِهِمْ، فَقُلْتُ: وَا ثُكْلاَهُ، مَا لَكُمْ تَنْظُرُونَ إِلَيَّ؟ قَالَ: فَضَرَبَ الْقَوْمُ بِأَيْدِيهِمْ عَلَى أَفْخَاذِهِمْ، فَلَمَّا رَأَيْتُهُمْ يُسْكِتُونَنِي، قُلْتُ: مَا لَكُمْ تُسْكِتُونَنِي؟ لَكِنِّي سَكَتُّ، قَالَ: فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَبِأَبِي هُوَ وَأُمِّي، مَا رَأَيْتُ مُعَلِّمًا قَبْلَهُ وَلاَ بَعْدَهُ أَحْسَنَ تَعْلِيمًا مِنْهُ، وَاللَّهِ مَا ضَرَبَنِي، وَلاَ كَهَرَنِي، وَلاَ سَبَّنِي، وَلَكِنْ قَالَ: إِنَّ صَلاَتَنَا هَذِهِ لاَ يَصْلُحُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلاَمِ النَّاسِ، إِنَّمَا هِيَ التَّسْبِيحُ، وَالتَّكْبِيرُ، وَتِلاَوَةُ الْقُرْآنِ»[٢].

واتە: لە موعاویەی كوڕی حەكەمی سولەمیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە كاتێكدا من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژدا بووم، لەناكاو پیاوێک لە خەڵكەكە پشمی، منیش وتم: (يَرْحَمُكَ اللهُ)، دەڵێ: خەڵكەكە چاویان لێ دەسوڕاندم (بە توڕەیی و خراپی سەیریان دەكردم)، منیش وتم: ئەیش ڕۆڵەڕۆ و مرێ، ئەوە بۆچی ئاوا سەیرم دەكەن؟ دەڵێ: (ئەو جارەی) خەڵكی بە دەستەكانیان لە ڕانەكانیان دەدا (لە حەیفان)، جا كاتێک بینیم دەیانەوێت بێ دەنگم بكەن، وتم: بۆچی دەتانەوێت بێ دەنگم بكەن؟ بەڵام بێ دەنگ بووم (چیتر قسەم نەكرد)، دەڵێ: جا كاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژ بوویەوە بە دایک و باوكەوە بە قوربانی بم، هیچ مامۆستا و فێركارێكم نەدیوە پێشی ئەو و دوای ئەویش فێركاری و مامۆستایەتی جوانتر و چاكتر بێت لەو، سوێند بە خوا نە لێیدام، نە قسەی ڕەقی پێوتم و نە بە گرژی سەیری كردم و نە جوێنیشی پێدام، بەڵكو فەرمووی: ئەو نوێژەی ئێمە هیچێک لە قسەی خەڵكی تیادا ناگونجێت (نابێ قسەی مرۆیی تیا بكرێت)، تەنها تەسبیحات و اللّه أكبر كردن و قوڕئان خوێندنە (تەنها وتە و گوفتاری عیبادەتی تیا دەكرێت).

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

١٥٤٩ - «حَدَّثَنَا صَدَقَةُ، أَنْبَأَنَا، ابْنُ عُلَيَّةَ، وَيَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ حَجَّاجٍ الصَّوَّافِ، عَنْ يَحْيَى، عَنْ هِلَالٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بِنَحْوِهِ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێردراوەتەوە.

## بابەت: کوشتنی مار و دووپشک لەناو نوێژدا

١٥٥٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِقَتْلِ الْأَسْوَدَيْنِ فِي الصَّلَاةِ، قَالَ يَحْيَى: وَالْأَسْوَدَانِ: الْحَيَّةُ وَالْعَقْرَبُ»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە بە کوشتنی مار و دووپشک لەناو نوێژدا، یەحیا وتویەتی: (الْأَسْوَدَانِ) واتە: مار و دوپشک.

## بابەت: کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا

١٥٥١ - «عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ: قَالَ اللهُ تَعَالَى:﴿ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ ﴿١٠١﴾ ﴾النساء، فَقَدْ أَمِنَ النَّاسُ، قَالَ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللهُ بِهَا عَلَيْكُمْ، فَاقْبَلُوهَا»[٣].

واتە: لە یەعلای کوڕی ئومەییەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: بە عومەری کوڕی خەتتابم وت ﷺ: خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ ﴿١٠١﴾ ﴾ واتە: تاوانبار نابن بە کورت کردنەوەی نوێژ ئەگەر ترسان...، خۆ بە دڵنیایی (ئێستا) خەڵک ئەمین بووە (ناترسن، بۆچی نوێژ کورت بکەنەوە)!، (ئیمامی عومەر) وتی: منیش سەرسوڕمانی خۆم دەربڕی لەوەی تۆ سەرت تیادا سوڕماوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوە بەخششێکە خوا دەیبەخشێتەوە بەسەرتاندا، کەواتە وەریبگرن.

تێبینی: نوێژ کورت کردنەوە لە سەفەردا ڕێگەی پێدراوە و بەخششێکی خوایە، بەڵام لە کاتی شەڕ و ترسدا تایبەتتر و پێویستترە.

١٥٥٢ - «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى بِمِنًى رَكْعَتَيْنِ وَأَبُو بَكْرٍ رَكْعَتَيْنِ، وَعُمَرُ رَكْعَتَيْنِ، وَعُثْمَانُ رَكْعَتَيْنِ صَدْرًا مِنْ إِمَارَتِهِ، ثُمَّ أَتَمَّهَا بَعْدَ ذَلِكَ»[٤].

واتە: لە سالمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێراویەتیەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لە مینا کرد (شوێنێکە) بە دوو ڕەکعەت (چونکە لە سەفەردا بوون)، ئەبوبەکریش دووی کرد، عومەریش

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

دووی کرد، عوسمانیش سەرەتای کاربەدەستایەتیەکەی دووی کرد، دواتر لەپاشان تەواوی کرد (بە چوار ڕەکعەت).

١٥٥٣ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مالَكٍ ﷺ قَالَ: صَلَّيْنَا الظُّهْرَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ أَرْبَعًا، وَصَلَّيْنَا مَعَهُ بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ»[١].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نوێژی نیوەڕۆمان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە کرد بە چوار ڕەکعەت، وە لە ذول حولەیفەدا نوێژمان لەگەڵ کرد بە دوو ڕەکعەت.

١٥٥٤ - «عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ مَيْسَرَةَ، وَمُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، أَنَّهُمَا سَمِعَا أَنَسَ بْنَ مالَكٍ ﷺ يَقُولُ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ أَرْبَعًا، وَبِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ»[٢].

واتە: لە ئیبراهیمی کوڕی مەیسەڕە و موحەممەدی کوڕی مونکەدیرەوە گێڕدراوەتەوە کە هەردووکیان گوێیان لە ئەنەسی کوڕی مالیک بوو ﷺ دەیووت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەدا نوێژی کرد بە چوار ڕەکعەت، وە لە ذول حولەیفەشدا بە دوو ڕەکعەت کردی.

١٥٥٥ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: إِنَّ الصَّلاَةَ أَوَّلَ مَا فُرِضَتْ رَكْعَتَيْنِ فَأُقِرَّتْ صَلاَةُ السَّفَرِ، وَأُتِمَّتْ صَلاَةُ الْحَضَرِ» فَقُلْتُ: مَا لَهَا كَانَتْ تُتِمُّ الصَّلاَةَ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: إِنَّهَا تَأَوَّلَتْ كَمَا تَأَوَّلَ عُثْمَانُ»[٣]

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نوێژ سەرەتا کە واجب کرا دوو ڕەکعەت بوو، جا وازی لێ هێنرا و کرایە نوێژی سەفەر، وە نوێژی نیشتەجێ (واتە: کە لە سەفەردا نەبێ) زیاد کرا، (زوهری دەڵێ) وتم: ئەی بۆچی عائیشە نوێژی بە تەواوی دەکرد لە سەفەردا (بۆ کورتی نەدەکردەوە)؟ (عوروە) وتی: عائیشە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) تەئویلی کردبوو چۆن عوسمان تەئویلی کرد و (کورتی نەکردەوە).

## بابەت: دەربارەی کەسێک کە دەیەوێت لە شارێک شوێنێک بمێنێتەوە، چەند دەمێنێتەوە تاوەکو نوێژ کورت بکاتەوە؟

١٥٥٦ - «عَنْ أَنَسِ بْنِ مالَكٍ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَجَعَلَ يَقْصُرُ حَتَّى قَدِمْنَا مَكَّةَ، فَأَقَامَ بِهَا عَشَرَةَ أَيَّامٍ يَقْصُرُ حَتَّى رَجَعَ وَذَلِكَ فِي حَجَّتِهِ»[٤].

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچووین، بەردەوام نوێژەکانی کورت دەکردەوە تاوەکو چووینە مەککە، دە ڕۆژان لەوێ مایەوە نوێژەکانی کورت دەکردەوە تاوەکو گەڕایەوە، ئەوەش لە کاتی حەج کردنەکەیدا بوو.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

١٥٥٧ - «عَنِ الْعَلاَءِ بْنِ الْحَضْرَمِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُكْثُ الْمُهَاجِرِ بَعْدَ قَضَاءِ نُسُكِهِ ثَلاَثٌ»[١].

واتە: لە عەلائی کوڕی حەضرەمیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: مانەوەی کەسی موهاجیر و کۆچەر پاش تەواو کردنی عیبادەتەکانی حەج، یان عومرە تەنها سێ ڕۆژە (لە مەککە).

تێبینی: ئەم فەرموودەیە باسی پێشی فەتحی مەککەیە، واتە: پێشی ئازاد کردنی شاری مەککە واجب بوو لەسەر مسوڵمانان هیجرەت و کۆچ بکەن بۆ شاری مەدینە و حەرام بوو بمابانەوە لە شاری مەککە، تەنها دوو کات نەبێ بۆیان دروست بوو بمێننەوە: یەکەم: ئەگەر پێش ئەوەی کۆچ بکەن بیانویستایە حەج یان عومرە بکەن ئەوە بۆیان دروست بوو ئەو ماوەیە بمێننەوە لە مەککە تا عیبادەتەکانیان تەواو دەکەن، دووەم: بۆیان دروست بوو سێ ڕۆژی تریش بمێننەوە دوای تەواو کردنی عیبادەتەکانی حەج و عومرە، بەڵام لەوە زیاتریان بۆ دروست نەبوو، چونکە ئەگەر ببێتە چوار ڕۆژ دوای ئەوە دەبوون بە موقیم، موقیم بوونیش دروست نەبوو لە شوێنی کافران، بەڵام دوای ئەوەی مەککە ئازاد کرا، بوو بە شارێکی ئیسلامی و کێشەی نەما.

١٥٥٨ - «عَنِ الْعَلاَءِ بْنِ الْحَضْرَمِيِّ ﷺ قَالَ: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلْمُهَاجِرِينَ أَنْ يُقِيمُوا ثَلاَثًا بَعْدَ الصَّدَرِ بِمَكَّةَ»[٢].

واتە: لە عەلائی کوڕی حەضرەمیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتیدا بە کۆچکەران کە سێ ڕۆژان بمێننەوە دوای تەوافی ئیفاضە (واتە: دوای تەواو بوونی حەج و عومرە، ئەگەر بیانەوێت ئەنجامی بدەن ئنجا کۆچ بکەن).

## بابەت: نوێژ لەسەر سواری و بارهەڵگر (وەک ئەسپ و سەیارە و تەیارە و باخیرە)

١٥٥٩ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ الْمَكْتُوبَةَ، نَزَلَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ»[٣].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی (سوننەتی) لەسەر پشتی سواریەکەی کرد ڕووە و خۆرهەڵات (واتە: بە ئاراستەیەکی جگە لە قیبلە)، جا کاتێ بیویستایە نوێژی واجب بکات، دەهاتە خوارەوە و ڕووی دەکردە قیبلە.

١٥٦٠ - «أَنَّ عَامِرَ بْنَ رَبِيعَةَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُسَبِّحُ وَهُوَ عَلَى الرَّاحِلَةِ، وَيُومِئُ بِرَأْسِهِ قِبَلَ أَيِّ وَجْهٍ تَوَجَّهَ، وَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصْنَعُ ذَلِكَ فِي الصَّلاَةِ الْمَكْتُوبَةِ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە عامری کوڕی ڕەبیعەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی نوێژی سوننەتی دەکرد لە کاتێکدا لەسەر پشتی سواریەکەی بوو، (بۆ سوجدە و ڕکوع) سەری نەوی دەکرد ڕووە و هەر لایێک کە ڕووی تێکردبێ (واتە: لە ئاراستەی جگە لە قیبلەش بەردەوامی بە نوێژەکەی دەدا)، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای نەدەکرد لە نوێژی واجبدا (بەڵکو ڕووی دەکردە قیبلە).

## بابەت: کۆکردنەوەی دوو نوێژ (جەمع)

١٥٦١ - «أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَكَانَ يَجْمَعُ الصَّلَاةَ: يَصَلِّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ دَخَلَ، ثُمَّ خَرَجَ بَعْدَ ذَلِكَ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا»[١].

واتە: موعاذی کوڕی جەبەل ﷺ وتویەتی: لە ساڵی جیهادی تەبوکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین، نوێژەکانی کۆکردەوە: نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بەیەکەوە کرد، دواتر چووە ژوورەوە (بۆ ناو خێمەکەی)، دواتر لە پاشی ئەوە (لە کاتی مەغریب) هاتە دەرەوە و نوێژی مەغریب و عیشای بە یەکەوە کرد.

١٥٦٢ - «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِجَمْعٍ فَجَمَعَ بَيْنَهُمَا»[٢].

واتە: لە ئەبو ئەیوبی ئەنصاریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریب و عیشای بە کۆکردنەوە کرد، هەردووکی کۆکردەوە.

١٥٦٣ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَجْمَعُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ إِذَا جَدَّ بِهِ السَّيْرُ»[٣].

واتە: لە (عبد الله)ی کوڕی عومەرەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریب و عیشای کۆدەکردەوە کاتێ پەلەی بووایە لە ڕۆیشتن.

## بابەت: کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە موزدەلیفە

١٥٦٤ - «أَخْبَرَنِي الْحَكَمُ، وَسَلَمَةُ بْنُ كُهَيْلٍ قَالَا: صَلَّى بِنَا سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ بِجَمْعٍ بِإِقَامَةٍ الْمَغْرِبَ ثَلَاثًا، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ الْعِشَاءَ، ثُمَّ حَدَّثَ عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ صَنَعَ بِهِمْ فِي ذَلِكَ الْمَكَانِ مِثْلَ ذَلِكَ، وَحَدَّثَ ابْنُ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَنَعَ فِي ذَلِكَ الْمَكَانِ مِثْلَ ذَلِكَ»[٤].

واتە: لە حەکەم و سەلەمەی کوڕی کوهەیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویانە: سەعیدی کوڕی جوبەیر نوێژی بۆ کردین بە کۆکردنەوە و (کورت کردنەوە) بە یەک قامەت کردن، مەغریبی بە سێ ڕەکعەت کرد، جا

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

کاتێ سەلامی دایەوە هەڵسایەوە و دوو ڕەکعەتی عیشاشی کرد، دواتر گێڕایەوە لە ئیبنو عومەرەوە کە لەو شوێنە ئاوای بۆ کردوون، وە ئیبنو عومەریش (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا)، گێڕابوویەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو شوێنە ئاوای بۆ کردوون.

١٥٦٥ - «حَدَّثَنَا سَعِيدُ بْنُ الرَّبِيعِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ بِإِسْنَادِهِ نَحْوَهُ »[1].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: نوێژی پیاو کاتێ لە سەفەر دەگەڕێتەوە

١٥٦٦ - «عَنْ كَعْبِ بْنِ مالَكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ لاَ يَقْدَمُ مِنْ سَفَرٍ إِلاَّ بِالنَّهَارِ ضُحًى، ثُمَّ يَدْخُلُ الْمَسْجِدَ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ يَجْلِسُ لِلنَّاسِ»[2].

واتە: لە کەعبی کوڕی مالیکەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: زۆربەی جار پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەفەر نەدەگەڕایەوە تەنها بە ڕۆژ نەبووایە لە کاتی چێشتەنگا و (تەنها لە کاتی چێشتەنگاو دەگەڕایەوە)، دواتر (پێش ئەوەی بچێتەوە ماڵەوە) دەچوو بۆ مزگەوت و دوو ڕەکعەت نوێژی دەکرد، دواتر بۆ خەڵکی دادەنیشت.

## بابەت: دەربارەی نوێژی ترس

١٥٦٧ - «أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا، قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غَزْوَةً قِبَلَ نَجْدٍ، فَوَازَيْنَا الْعَدُوَّ وَصَافَفْنَاهُمْ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي لَنَا، فَقَامَ طَائِفَةٌ مِنَّا مَعَهُ، وَأَقْبَلَ طَائِفَةٌ عَلَى الْعَدُوِّ فَرَكَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمَنْ مَعَهُ رَكْعَةً، وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ انْصَرَفُوا، فَكَانُوا مَكَانَ الطَّائِفَةِ الَّتِي لَمْ تُصَلِّ، وَجَاءَتِ الطَّائِفَةُ الَّتِي لَمْ تُصَلِّ فَرَكَعَ بِهِمُ النَّبِيُّ ﷺ رَكْعَةً وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَ كُلُّ رَجُلٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَرَكَعَ لِنَفْسِهِ رَكْعَةً وَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ»[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداریم لە غەزا و جیهادێک کرد بەرامبەر نەجد (واتە: غەزای: ذات الرقاع ـ محارب)، جا بەرامبەر دوژمن وەستاین و بۆیان ڕیز بووین، پێغەمبەری خواش ﷺ وەستا نوێژی بۆ کردین، جا گروپێک لە ئێمە لەگەڵی وەستان، گروپێکیش ڕوویان کردە دوژمن، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەکعەتێکی بەوانە کرد کە لەگەڵی بوون، وە دوو سەجدەشی برد (واتە: ڕەکعەتی یەکەمی تەواو کرد بۆیان)، دواتر ئەو گروپە (ڕەکعەتێکیان بۆ خۆیان تەواو کرد و) ڕۆیشتن، چوونە شوێنی ئەو گروپەی نوێژیان نەکردوە، وە ئەو گروپە هات کە نوێژیان نەکردبوو (پێغەمبەری خواش ﷺ چاوەڕێیان بوو لە وەستانی ڕەکعەتی دووەم)، جا پێغەمبەر

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

ﷺ ڕەکعەتێکی پێ کردن و دوو سەجدەشی برد (واتە: ڕەکعەتەکەی کامل کرد)، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دایەوە (ئەوانیش هەڵسانەوە و ڕەکعەتی دووەمیان کرد)، کەواتە: هەموو پیاوێک لە مسوڵمانەکان ڕەکعەتێکی بە تەنها کرد و دوو کڕنووشیشی برد (واتە: هەر یەکەیان یەک ڕەکعەتی تەواوی بە تەنها کردوە).

١٥٦٨ - «عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، فِي صَلاَةِ الْخَوْفِ قَالَ: يُصَلِّي الإِمَامُ بِطَائِفَةٍ وَطَائِفَةٌ مُوَاجِهَةُ الْعَدُوِّ، فَيُصَلِّي بِالَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً، وَيَذْهَبُ هَؤُلاَءِ إِلَى مَصَافِّ أَصْحَابِهِمْ، وَيَجِيءُ أُولَئِكَ فَيُصَلِّي بِهِمْ رَكْعَةً، وَيَقْضُون رَكْعَةً لِأَنْفُسِهِمْ»[١].

واتە: لە سەهلی کوڕی ئەبو خەیثەمەوە گێڕدراوەتەوە دەربارەی نوێژی ترس وتویەتی: ئیمام نوێژ بە گروپێک دەکات و گروپێکیش ڕووەو دوژمن دەوەستن، جا ڕەکعەتێک نوێژ بەوانە دەکات کە لەگەڵی دان، دواتر ئەمانە (ڕەکعەتی دووەم بۆ خۆیان تەواو دەکەن و) دەچنە شوێنی هاوڕێکانیان، وە ئەمان دێن و ئیمام ڕەکعەتێک نوێژیان بۆ دەکات، ئەوانیش ڕەکعەتێک بۆ خۆیان دەگێڕنەوە.

١٥٦٩ - «حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ صَالِحِ بْنِ خَوَّاتٍ، عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِمِثْلِهِ»[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: ڕێگری دروست بوون لە ئەنجامدانی نوێژەکان

١٥٧٠ - «عن عبد الرحمن بن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه عنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: حُبِسْنَا يَوْمَ الْخَنْدَقِ، حَتَّى ذَهَبَ هَوِيٌّ مِنَ اللَّيْلِ حَتَّى كُفِينَا، وَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ تَعَالَى: ﴿ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾ ﴾الأحزاب، فَدَعَا النَّبِيُّ ﷺ بِلاَلاً فَأَمَرَهُ، فَأَقَامَ فَصَلَّى الظُّهْرَ فَأَحْسَنَ كَمَا كَانَ يُصَلِّيهَا فِي وَقْتِهَا، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الْعَصْرَ فَصَلاَهَا، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الْمَغْرِبَ فَصَلاَهَا، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ الْعِشَاءَ فَصَلاَهَا، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يَنْزِلَ: ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ﴿٢٣٩﴾ ﴾البقرة»[٣].

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعیدی خودریەوە رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: ڕێگریمان لێکرا (لە ئەنجامدانی نوێژ، بەهۆی سەرقاڵ بوون بەدوژمنەوە) لە ڕۆژی جەنگی خەندەق، تاوەکو کاتێکی باشی شەو تێپەڕی تا ئەو کاتەی لە کۆڵمان کرانەوە، لە کۆڵ کردنەوەکەش ئەو وتەی خوای بەرز:﴿ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾ ﴾، واتە: هەر خوا بڕوادارانی لە جەنگ پاراست (بە باو باران و بۆران و ترس دروست کردن لە دڵیاندا) جا هەمیشە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

خوا بەهێزی بە دەسەڵاتە. جا (دوای ئەوە) پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی بیلالی کرد و فەرمانی پێ کرد (قامەت بکات)، ئەویش قامەتی کرد و پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی نیوەڕۆی کرد (بۆمان) بە جوانترین شێوە، وەک جارانی پێشوو کە لە کاتی خۆی دەیکرد، دواتر فەرمانی پێ کرد قامەتی بۆ عەسر کرد و نوێژەکەی کرد، دواتر فەرمانی پێ کرد قامەتی بۆ نوێژی مەغریب کرد و نوێژەکەی کرد، دواتر فەرمانی پێ کرد قامەتی بۆ عیشا کرد و نوێژەکەی کرد، ئەوەش پێشی ئەو کاتە بوو ئەو ئایەتە دابەزێت (ئایەتی نوێژی ترس):﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا ﴿٢٣٩﴾ ﴾، واتە: جا ئەگەر ترسان دەتوانن بە ڕۆیشتنەوە یان بە سواری ئەنجامی بدەن.

## بابەت: نوێژ لە کاتی خۆر گیران یان مانگ گیران

١٥٧١ - «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيْسَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ مِنَ النَّاسِ، وَلَكِنَّهُمَا آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَا فَقُومُوا فَصَلُّوا»[(١)].

واتە: لە ئەبو مەسعودەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: خۆر و مانگ ناگیرێن بە هۆی مردنی هیچ یەکێک لە خەڵکی، بەڵکو دوو نیشانە و بەڵگەی دەسەڵاتی خوان، جا کاتێ بینیتان خۆر یان مانگ گیرا هەڵسن و نوێژ بکەن.

١٥٧٢ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِي كُسُوفٍ ثَمَانَ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ»[(٢)].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی خۆر و مانگ گیراندا (لە دوو ڕەکعەتدا) هەشت ڕکوعی بردووە لەگەڵ چوار کڕنووش.

تێبینی: ئەم فەرموودەیە لاوازە و شازە، فەرموودەی بەهێزتری بەرامبەر هەیە کە هەر لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چوار ڕکوع و چوار کڕنووشی بردووە لە نوێژی خۆر گیراندا (کەواتە کار بەم فەرموودەیە دەکرێت).

١٥٧٣ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ يَهُودِيَّةً دَخَلَتْ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: أَعَاذَكِ اللهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، فَلَمَّا جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ سَأَلَتْهُ: أَيُعَذَّبُ النَّاسُ فِي قُبُورِهِمْ؟ قَالَ: عَائِذًا بِاللَّهِ، قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَكِبَ يَوْمًا مَرْكَباً فَخَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ فَنَزَلَ، ثُمَّ عَمَدَ إِلَى مَقَامِهِ الَّذِي كَانَ يُصَلِّي فِيهِ قَامَ النَّاسُ خَلْفَهُ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ قَامَ فَفَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ فَدَخَلَ عَلَيَّ فَقَالَ: إِنِّي أُرَاكُمْ تُفْتَنُونَ فِي قُبُورِكُمْ كَفِتْنَةِ الدَّجَّالِ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «اللهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ النَّارِ»[(٣)].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، إلا أن الحديث شاذ.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە دایكە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، كە ئافرەتێكی جوولەكە هاتۆتە لای و وتویەتی: خوا بتپارێزێت لە سزای گۆڕ، جا كاتێ پێغەمبەر ﷺ هات، عائیشە پرسیاری لێ كرد وتی: ئایا خەڵكی سزا دەدرێن لەناو گۆڕەكانیان؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پەنا بەخوا (واتە: بەڵێ، خوا پارێزراومان بكات)، عائیشە دەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ سواری سوارییەك بو خۆر گیرا، جا پێغەمبەر ﷺ هات و دابەزی، دواتر چوو بۆ لای ئەو شوێنەی كە هەموو جار نوێژی تیا دەكرد بۆ خەڵكی (جا دەستی بە نوێژ كرد)، خەڵكیش لە دواوەی كۆبوونەوە (دەستیان بە نوێژ كرد)، وەستانی (دوای فاتیحەی) زۆر درێژ كردەوە، دواتر ڕكوعی برد و ڕكوعەكەشی زۆر درێژ كردەوە، دواتر سەری بەرز كردەوە و (فاتیحە و سورەتی تری خوێند و) وەستانی درێژ كردەوە كە كەمتر بوو لە وەستانی یەكەم، دواتر ڕكوعی برد و ڕكوعەكەشی درێژ كردەوە كە كەمتر بوو لە ڕكوعی یەكەم، دواتر دوو كڕنووشی برد، دواتر هەڵسایەوە (بۆ ڕەكعەتی دووەم) وەك ڕەكعەتی پێشوی كرد، دواتر خۆر ڕۆشن بوویەوە و دەركەوت، جا هات بۆ لام و فەرمووی: من دەتان بینم و دڵنیام (ئێوەی مرۆڤەكان) لە گۆڕەكانتان تاقی دەكرێنەوە و پرسیارتان لێ دەكرێت و سزا دەدرێن وەك تاقی كردنەوەی دەججال، (عائیشە دەڵێت): گوێم لێ بوو دەیفەرموو: خوایە من پەنا بەتۆ دەگرم لە سزای گۆڕ، وە پەناشت پێ دەگرم لە سزای دۆزەخ.

**١٥٧٤** - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَحَكَى ابْنُ عَبَّاسٍ: أَنَّ صَلاَتَهُ ﷺ رَكْعَتَيْنِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ خَطَبَهُمْ فَقَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ، وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ، فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ»[1].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆر گیرا، پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی (خۆر گیرانی) كرد، ئیبنو عەبباس دەگێڕێتەوە و دەڵێ: نوێژەكەی دوو ڕەكعەت بوو، لە هەر ڕەكعەتێك دوو ڕەكعەتی تیا بوو (چونكە لە هەر ڕەكعەتێكدا دوو ڕكوع و دوو وەستانی ئەنجام داوە)، دواتر وتاری بۆ دان و فەرمووی: خۆر و مانگ دوو نیشانە و بەڵگەی دەسەڵاتی خوان، ناگیرێن بە هۆی مردن و لە دایك بوونی هیچ كەسێك، جا كاتێ ئەوەتان بینی، پەنا ببەنە بەر زیكر و یادی خوا.

**١٥٧٥** - «قَالَ وَأَخْبَرَنَا مالِكٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا»[2].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده گێڕدراوەتەوە، بەڵام لە ڕێگای عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) (واتە: عائیشەش گێڕاویەتیەوە).

**١٥٧٦** - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَصَلَّى النَّبِيُّ ﷺ، فَحَكَتْ أَنَّهُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فِي كُلِّ رَكْعَةٍ رَكْعَتَيْنِ»[3].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: خۆر گیرا، پێغەمبەری خواش ﷺ نوێژی (خۆر گیرانی) کرد، جا عائیشە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: نوێژەکەی دوو ڕەکعەت بوو، لە هەر ڕەکعەتێکدا دوو ڕەکعەتی تیا بوو.

١٥٧٧ - «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِي اللهُ عَنْهَما أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ حِينَ كَسَفَتِ الشَّمْسُ بِعَتَاقَةٍ»[١].

واتە: لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکر (رَضِي اللهُ عَنْهَما) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە کۆیلە ئازاد کردن کرد کاتێ خۆر گیرا.

١٥٧٨ - «حَدَّثَنِي أَبُو حُذَيْفَةَ مُوسَى بْنُ مَسْعُودٍ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ فَاطِمَةَ، عَنْ أَسْمَاءَ، عَنِ النَّبِيِّ نَحْوَهُ»[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودەی پێشو گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی نوێژی داواکردنی باران

١٥٧٩ - «عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيْدٍ ﷺ يَذْكُرُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ بِالنَّاسِ إِلَى الْمُصَلَّى يَسْتَسْقِي، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ»[٣].

واتە: لە عەببادی کوڕی تەمیمەوە گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە عەبدوڵڵای کوڕی زەید بوو ﷺ باسی دەکرد و دەیووت: پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی بردە دەرەوە بۆ صەحرا (تا جێگایان ببێتەوە، یان تا زەلیلیان زیاتر پێوە دیار بێ) نوێژی باران بارینی کرد و ڕووی کردە قیبلە و جوببەکەی خۆی وەرگێڕا.

١٥٨٠ - «عَنْ الزُّهْرِيِّ، أَخْبَرَنِي عَبَّادُ بْنُ تَمِيمٍ، أَنَّ عَمَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ بِالنَّاسِ إِلَى الْمُصَلَّى يَسْتَسْقِي لَهُمْ، فَقَامَ فَدَعَا اللَّهَ قَائِمًا، ثُمَّ تَوَجَّهَ قِبَلَ الْقِبْلَةِ فَحَوَّلَ رِدَاءَهُ فَأُسْقُوا»[٤].

واتە: لە زوهریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەببادی کوڕی تەمیم بۆی گێڕامەوە کە مامی بۆی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی بردە دەرەوە تا داوای بارانیان بۆ بکات، جا وەستا و بە پێوە دووعا و نزای کرد، دواتر ڕووی کردە قیبلە و جوببەکەی خۆی وەرگێڕا، جا بارانیان بۆ باری.

## بابەت: دەست بڵند کردن لە کاتی داواکردنی باراندا

١٥٨١ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لاَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنَ الدُّعَاءِ إِلاَّ فِي الاِسْتِسْقَاءِ»[٥].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

(٥) ـ صحيح.

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی (ئەوەندە زۆر) بەرز نەدەکردەوە لە هیچ لە دووعایەکانی تەنها لە دووعای باران بارین نەبێت (ئەوەندە بەرزی دەکردەوە تا سپیایی ژێر باڵەکانی دەردەکەوت).

## بابەت: خۆشۆردن لە ڕۆژی هەینی

١٥٨٢ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ، فَلْيَغْتَسِلْ»[١].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ کەسێک لە ئێوە ویستی بێتە نوێژی هەینی با خۆی بشۆرێت.

١٥٨٣ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ»[٢].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی واجبە لەسەر هەموو کەسێکی بالغ و پێگەیشتوو.

١٥٨٤ - «أَخْبَرَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ »[٣].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

١٥٨٥ - «حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ﷺ يَخْطُبُ إِذْ دَخَلَ رَجُلٌ، فَعَرَّضَ بِهِ عُمَرُ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، مَا زِدْتُ أَنْ تَوَضَّأْتُ حِينَ سَمِعْتُ النِّدَاءَ، فَقَالَ: وَالْوُضُوءَ أَيْضًا؟ أَلَمْ تَسْمَعْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَلْيَغْتَسِلْ»[٤].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە کاتێکدا عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ وتاری دەدا، لە ناکاو پیاوێک هاتە ژوورەوە، (ئیمامی) عومەریش هەر لەناو وتارەکەی بە ناڕاستەوخۆ لۆمەی کرد، پیاوەکەش (تێگەیشت) و وتی: ئەی گەورەی بڕواداران لە دەستنوێژ زیاتر هیچم نەکردوە (خۆم زیاتر مەشغوڵ نەکردووە) کاتێ گوێم لە بانگ بوو (واتە: لە ئیش کردن بووم، کاتێ گوێم لە بانگ بوو گەڕامەوە ماڵەوە و دەستنوێژم شۆردوە و هاتووم)، (ئیمامی) عومەریش وتی: دەستنوێژیشت پێ زۆرە (ئیشت کردوە و تەنها دەستنوێژت شۆردووە)؟ گوێت لێ نەبووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: کاتێ یەکێک لە ئێوە هاتە نوێژی هەینی با خۆی بشۆرێت (واتە: خۆشت نەشۆردووە و تاخیریش بووی).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

١٥٨٦ - «عَنْ سَمُرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ تَوَضَّأَ لِلْجُمُعَةِ فَبِهَا وَنِعْمَتْ، وَمَنِ اغْتَسَلَ فَالْغُسْلُ أَفْضَلُ»[١].

واتە: لە سەمورەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک دەستنوێژ بشۆرێت بۆ نوێژی هەینی ئەوە کارێکی چاکە (کیفایەتە)، وە هەر کەسێکیش خۆی بشۆرێت ئەوە خۆشۆردن چاکترە.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی هەینی و خۆشۆردن و خۆبۆنخۆش کردن تیایدا

١٥٨٧ - «عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ ﷺ صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَتَطَهَّرَ بِمَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ، ثُمَّ ادَّهَنَ مِنْ دُهْنِهِ، أَوْ مَسَّ مِنْ طِيبِ بَيْتِهِ، ثُمَّ رَاحَ فَلَمْ يُفَرِّقْ بَيْنَ اثْنَيْنِ، وَصَلَّى مَا كُتِبَ لَهُ، فَإِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ أَنْصَتَ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى»[٢].

واتە: لە سەلمانی فارسی ﷺ هاوەڵی پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک خۆی بشۆرێت ڕۆژی هەینی و خۆی پاک بکاتەوە بەوەی لە توانایدا هەیە، دواتر (قژ و موی) بە زەیت چەور بکات، یان لە گوڵاوی ماڵەکەی لەخۆی بدات، دواتر زوو بڕوات و (لە مزگەوت) دوو کەس لێک نەکات (بەوەی بەسەر شانیاندا ڕێ بکات و ئازاریان بدات)، وە نوێژ بکات ئەوەی بوە قسمەتی (واتە: بە گوێرەی توانا نوێژی سوننەتی موتڵەقی کرد)، جا کاتێک ئیمام دەرچوو (بۆ ناو خەڵکی بۆ وتاردان و دەستی بە وتار کرد) بێدەنگ بێت، ئەوە لێی دەبوردرێت تا هەینی دواتر.

## بابەت: خوێندنی قورئان لە نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینیدا

١٥٨٨ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِي صَلَاةِ الْغَدَاةِ تَنْزِيلُ السَّجْدَةَ، وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ»[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی لە نوێژی بەیانیدا سورەتی سەجدە و سورەتی (الإنسان)ی دەخوێند.

## بابەت: ئەجر و گەورەیی زوو چوون بۆ مزگەوت لە ڕۆژی هەینیدا

١٥٨٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْمُتَعَجِّلُ إِلَى الْجُمُعَةِ كَالْمُهْدِي جَزُورًا، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ كَالْمُهْدِي بَقَرَةً، ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ كَالْمُهْدِي شَاةً، فَإِذَا جَلَسَ الْإِمَامُ عَلَى الْمِنْبَرِ، طُوِيَتِ الصُّحُفُ، وَجَلَسُوا يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ»[٤].

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی پەلە دەکات زوو دەچێت بۆ نوێژی هەینی (ئەجرەکەی) وەک ئەو کەسە وایە کە وشترێک سەر دەبڕێت لە مەککە لە کاتی حەجدا، دواتر ئەو کەسەی دواتر دەچێت (ئەجرەکەی) وەک ئەو کەسە وایە کە مانگایێک سەر دەبڕێت لە مەککە لە کاتی حەجدا، دواتر ئەو کەسەی دواتر دەچێت (ئەجرەکەی) وەک ئەو کەسە وایە کە مەڕێک یان بزنێک سەر دەبڕێت لە مەککە لە کاتی حەجدا، جا کاتێ ئیمام لەسەر مینبەر دادەنیشێت، پەڕاوەکان (واتە: پەڕاوی ئەجر تێدا نوسین) دەپێچرێنەوە و دادەخرێن، (فریشتەکانیش) دادەنیشن گوێ بۆ وتار دەگرن.

١٥٩٠ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ قَعَدَتِ الْمَلاَئِكَةُ عَلَى أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ فَكَتَبُوا مَنْ جَاءَ إِلَى الْجُمُعَةِ، فَإِذَا رَاحَ الإِمَامُ، طَوَتِ الْمَلاَئِكَةُ الصُّحُفَ، وَدَخَلَتْ تَسْتَمِعُ الذِّكْرَ، قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « الْمُتَهَجِّرُ إِلَى الْجُمُعَةِ، كَالْمُهْدِي بَدَنَةً، ثُمَّ كَالْمُهْدِي بَقَرَةً، ثُمَّ كَالْمُهْدِي شَاةً، ثُمَّ كَالْمُهْدِي بَطَّةً، ثُمَّ كَالْمُهْدِي دَجَاجَةً، ثُمَّ كَالْمُهْدِي بَيْضَةً فَإِذَا جَلَسَ الْإِمَامُ عَلَى الْمِنْبَرِ، طُوِيَتِ الصُّحُفُ وَجَلَسُوا يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ»[1].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ ڕۆژی هەینی دێت فریشتە دادەنیشن لەلای دەرگاکانی مزگەوت و ناوی ئەو کەسانە دەنوسن کە دێن بۆ نوێژی هەینی، جا کاتێ ئیمام دەردەچێت و دەچێتە سەر مینبەر فریشتەکان پەڕاوەکان (واتە: پەڕاوی ئەجر تێدا نوسین) دەپێچنەوە و دایدەخەن و دێنە ژوورەوە و گوێ بۆ وتار دەگرن.

وتویەتی: هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی پەلە دەکات زوو دەچێت بۆ نوێژی هەینی (ئەجرەکەی) وەک ئەو کەسە وایە کە وشترێک سەر دەبڕێت لە مەککە لە کاتی حەجدا، وە(لە کاتی) دواتر وەک ئەو کەسە وایە کە مانگایێک سەر دەبڕێت لە مەککە لە کاتی حەجدا، وە (لە کاتی) دواتر وەک ئەو کەسە وایە کە مەڕ یان بزنێک سەر دەبڕێت لە مەککە لە کاتی حەجدا، وە (لە کاتی) دواتر وەک ئەو کەسە وایە کە مراوییێک سەر ببڕێت لە مەککە لە کاتی حەجدا، وە(لە کاتی) دواتر وەک ئەو کەسە وایە کە هێلکەیەک بکاتە خێر لە مەککە لە کاتی حەجدا، جا کاتێ ئیمام لەسەر مینبەر دادەنیشێت، پەڕاوەکان (واتە: پەڕاوی ئەجر تێدا نوسین) دەپێچرێنەوە و دادەخرێن، (فریشتەکانیش) دادەنیشن گوێ بۆ وتار دەگرن.

## بابەت: دەربارەی کاتی هەینی

١٥٩١ - «عَنْ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْجُمُعَةَ، ثُمَّ نَرْجِعُ فَنُبَادِرُ الظِّلَّ فِي أُطُمِ بَنِي غَنْمٍ، فَمَا هُوَ إِلاَّ مَوَاضِعُ أَقْدَامِنَا»[2].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده صحيح.

واتە: لە زوبەيرى كوڕى عەوامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتويەتى: نوێژى هەينيمان لەگەڵ پێغەمبەرى خوا ﷺ دەكرد، دواتر دەگەڕاينەوە پێشبڕكێمان دەكرد بۆ بەر سێبەرى سواندەى بەنى غەنم، هيچيش نەبوو تەنها شوێنى پێيەكانمان بوو (واتە: سێبەرەكەش كەم بوو، بەڵام هەر سوودمان لێ دەبينى).

تێبينى: كەواتە دیارە لە سەرەتاى لادانى خۆر بۆ لاى خۆر ئاوا دەستيان بە جومعە كردووە.

١٥٩٢ - «حدثنا يعلى بن الحارث قال: سَمِعْتُ إِيَاسَ بْنَ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْجُمُعَةَ ثُمَّ نَنْصَرِفُ وَلَيْسَ لِلْحِيطَانِ فَيْءٌ نَسْتَظِلُّ بِهِ»[1].

واتە: لە يەعلاى كوڕى حاريثەوە گێڕدراوەتەوە، وتويەتى: گوێم لە ئياسى كوڕى سەلەمەى كوڕى ئەكوەع بوو لە باوكيەوە ﷺ دەيگێڕايەوە كە وتويەتى: لەگەڵ پێغەمبەرى خوا ﷺ نوێژى هەينيمان دەكرد، دواتر دەڕۆيشتين (دەگەڕاينەوە ماڵەوە) لە كاتێكدا خانوەكان سێبەرێكى وايان نەبوو بچينە ژێرى.

## بابەت: دەربارەى گوێگرتن لە وتارى ڕۆژى هەينى و بێ دەنگ بوون

١٥٩٣ - «عَنْ أَبِي الْأَشْعَثِ الصَّنْعَانِيِّ، يَرُدُّهُ إِلَى أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ، يَرُدُّهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ غَسَّلَ وَاغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، ثُمَّ غَدَا وَابْتَكَرَ، ثُمَّ جَلَسَ قَرِيباً مِنَ الْإِمَامِ وَأَنْصَتَ، وَلَمْ يَلْغُ حَتَّى يَنْصَرِفَ الْإِمَامُ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ يَخْطُوهَا كَعَمَلِ سَنَةٍ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا»[2].

واتە: لە ئەبو ئەشعەسى صەنعانيەوە گێڕدراوەتەوە، ئەويش فەرموودەكەى بۆ لاى ئەوسى كوڕى ئەوس ﷺ گێڕاوەتەوە، ئەويش بۆ لاى پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە، كە فەرموويەتى: هەر كەسێك سەر و جەستەى خۆى بشۆرێت لە ڕۆژى هەينيدا، دواتر زوو لە سەرەتاى ڕۆژەكەدا بچێتە مزگەوت، دواتر دابنيشێت لە نزيك ئيمام و بێ دەنگ بێت و هيچ قسەيەك نەكات تاوەكو ئيمام دەڕوات و كۆتايى پێ دەهێنێت، ئەوە بۆى هەيە بە هەر هەنگاوێك كە دەيهاوێژێت هاوشێوەى كاروكردەوەى ساڵێكى بەڕۆژوو بوون و شەونوێژ كردن.

١٥٩٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ: أَنْصِتْ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ»[3].

واتە: لە ئەبو هورەيرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتويەتى: پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموويەتى: ئەگەر بە هاوڕێكەت وت: بێ دەنگ بە، لە كاتێكدا ئيمام وتارى دەخوێندەوە ئەوە قسەيەكى باتڵت كردووە.

تێبينى: واتە لە ڕۆژى هەينيدا قسە كردن ئەگەر فەرمان كردن بە چاكەش بێت زۆر كات هەر لەغو و باتڵە، چونكە كە بە هاوڕێكەت دەڵێى بێ دەنگ بە، خودى فەرمان كردنەكە قسەيە و وەك قسەكانى

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

هاوڕێكەت ژاوەژاو دروست دەكات و وەک دەڵێن قسه قسەی ڕادەكێشێت و ڕەنگە ببێتە مناقەشە و موجادەلەش، جا ئەگەر ویسترا كەسێک بێ دەنگ بكرێت باشترین ڕێگا ئەوەیە ئاماژەی بۆ بكرێت و چیتر خۆی پێوە سەرقاڵ نەكرێت. والله أعلم.

١٥٩٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ: أَنْصِتْ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ»[١].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بە هاوڕێكەت وت: بێ دەنگ بە، لە كاتێكدا ئیمام وتاری دەخوێندەوە ئەوە قسەیەكی باتڵت كردووە.

١٥٩٦ - «أَخْبَرَنَا الْمُعَلَّى بْنُ أَسَدٍ، حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ الزُّهْرِيِّ عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ»[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی دەچێتە مزگەوت لە كاتێكدا ئیمام وتار دەدات

١٥٩٧ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يُحَدِّثُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ - أَوْ قَدْ خَرَجَ - فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ»[٣].

واتە: لە عەمری كوڕی دینارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە جابری كوڕی عەبدوڵڵا (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) بوو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕایەوە كە فەرموویەتی: كاتێ یەكێک لە ئێوە هات (بۆ مزگەوت لە ڕۆژی هەینی)، لە كاتێكدا ئیمام وتاری دەخوێندەوە ـ یان هاتبوە دەرەوە (لە ماڵەوە یان لە شوێنی تایبەتی خۆی، بۆ ئەوەی وتار بخوێنێتەوە)، ئەوە دوو ڕەكعەت نوێژ بكە.

تێبینی: زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی ئەم دوو ڕەكعەتە، هەندێكیان دەفەرموون: تەحیەی مزگەوتە، هەندێكیتر دەفەرموون: نەخێر سوننەتی پێشی جومعەیە، چونكە لە فەرموودەی تر هاتوە: پیاوێک لە كاتی وتاردان دێتە ژوورەوە و دادەنیشێت پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەفەرموێت: ئایا لە ماڵەوە نوێژت كردووە؟ كابراش دەڵێ: نەخێر، پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ دە هەڵسە دوو ڕەكعەت بكە ئنجا دانیشە، زانایان لێرەدا دەفەرموون: ئەگەر دوو ڕەكعەتەكە تەحیەی مزگەوت بێت خۆ تەحیەی مزگەوت لە ماڵ ئەنجام نادرێت تەنها لە مزگەوت ئەنجام دەدرێت؟! بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە ماڵەوە كردوتە؟! دیارە مەبەستی سوننەتی پێشی هەینیە.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

١٥٩٨ - «عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: جَاءَ أَبُو سَعِيدٍ ﷺ وَمَرْوَانُ يَخْطُبُ، فَقَامَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، فَأَتَاهُ الْحَرَسُ يَمْنَعُونَهُ فَقَالَ: مَا كُنْتُ أَتْرُكُهُمَا وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُ بِهِمَا»[1].

واتە: لە عیاضی کوڕی عەبدوڵڵا گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ هات لە کاتێکدا مەڕوان (کە خەلیفە بوو) وتاری دەدا، هەر بە پێوە بوو (دانەنیشت) ویستی دوو ڕەکعەت نوێژ بکات، حەڕەسەکان هاتن تا ڕێگری لێ بکەن، ئەبو سەعید وتی: من واز لەو دوو ڕەکعەتە ناهێنم لە کاتێکدا بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووە.

١٥٩٩ - «عَنْ الرَّبِيعِ هُوَ ابْنُ صَبِيحٍ الْبَصْرِيُّ قَالَ: رَأَيْتُ الْحَسَنَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ»[2].

وَقَالَ الْحَسَنُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ، فَلْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ يَتَجَوَّزُ فِيهِمَا، قَالَ أَبُو مُحَمَّد أَقُولُ بِهِ».

واتە: لە ڕەبیعی کوڕی صەبیحی بەصریەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: حەسەنم بینی دوو ڕکعەت نوێژی کرد، لە کاتێکدا ئیمام وتاری دەدا.

وە حەسەن وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ یەکێک لە ئێوە هات، لە کاتێکدا ئیمام وتاری دەخوێندەوە، با دوو ڕەکعەت نوێژی سوک و خەفیف بکات و کورتیان بکاتەوە، ئەبو موحەممەد وتویەتی: کار و فەرمان بەوە دەکەم.

## بابەت: دەربارەی خوێندنی قورئان لە وتاردا لە ڕۆژی هەینی

١٦٠٠ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا فَقَرَأَ ص، فَلَمَّا مَرَّ بِالسَّجْدَةِ نَزَلَ فَسَجَدَ»[3].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک وتاری بۆ داین و سوڕەتی (صاد)ی خوێندەوە، جا کاتێ بە ئایەتی سەجدەدا تێپەڕ بوو، هاتە خوارەوە (لە مینبەر) و کڕنووشی برد.

## بابەت: قسە کردن لەناو وتاردا

١٦٠١ - «عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) يَقُولُ: دَخَلَ رَجُلٌ الْمَسْجِدَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ، فَقَالَ: أَصَلَّيْتَ؟، قَالَ: لاَ، قَالَ: فَصَلِّ رَكْعَتَيْنِ»[4].

قَالَ أَبُو مُحَمَّد «أَقُولُ بِهِ».

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە عەمری کوڕی دینارەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا بوو (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) دەیووت: پیاوێک هاتە ژوورەوە بۆ مزگەوت لە ڕۆژی هەینیدا، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەخوێندەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئایا نوێژت کردووە؟ پیاوەکە وتی: نەخێر، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: کەواتە دوو ڕەکعەت نوێژ بکە، ئەبوو موحەممەد وتویەتی: کار بەوە دەکەم.

## بابەت: دەربارەی وتاری کورت

**١٦٠٢** - «عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: خَطَبَنَا عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ ﷺ، فَأَبْلَغَ وَأَوْجَزَ، فَقُلْنَا: يَا أَبا الْيَقْظَانِ، لَوْ كُنْتَ تَنَفَّسْتَ شَيْئًا؟ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ طُولَ صَلاَةِ الرَّجُلِ، وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ، فَأَطِيلُوا هَذِهِ الصَّلاَةَ، وَاقْصُرُوا هَذِهِ الْخُطَبَ، فَإِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لسِحْرًا»[1].

واتە: لە ئەبو وائیلەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عەممارى کوڕی یاسر ﷺ وتاری بۆ داین، جا بە ڕەوانی گەیاندی و کورتی کردەوە، ئێمەش پێمان وت: ئەی باوکی یەقزان (ئەی عەممار) خۆزگە هەندێکیتر درێژت دەکردەوە (تام و لەزەتمان لێ کرد)؟ عەممار وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: درێژی نوێژی پیاو و کورتی وتارەکەی نیشانەیەکە لە فیقە و تێگەیشتن و جوان حاڵی بوونی لە ئیسلام، کەواتە ئەو نوێژە درێژ بکەنەوە (واتە: لە وتار درێژتر بێت) و ئەو وتارانەش کورت بکەنەوە (با لە نوێژ کورت تر بێت)، چونکە لە ڕەوانبێژی جادوو هەیە (واتە: ئەگەر وتار کورت بوو دەبێتە ڕەوانبێژی، چونکە کورت و پوخت دەبێ و بیر ناچێتەوە و دەچێتە ناو دڵەوە و کاریگەری دەبێت، هەر وەک چۆن سیحر کاریگەری هەیە).

**١٦٠٣** - «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَكَانَتْ صَلاَتُهُ قَصْدًا وَخُطْبَتُهُ قَصْدًا»[2].

واتە: لە جابری کوڕی سەمورەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: نوێژم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کردوە، نوێژەکەی مامناوەندی بوو، هەروەها وتارەکەشی مامناوەندی بوو.

## بابەت: دانیشتن لە نێوان دوو وتارەکاندا

**١٥٦٠٤** - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَخْطُبُ خُطْبَتَيْنِ وَهُوَ قَائِمٌ، وَكَانَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمَا بِجُلُوسٍ»[3].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار دوو وتاری دەدان، لە کاتێکدا وەستا و بوو (بە وەستاوی وتارەکانی دەدا)، وە جیاوازی دەخستە نێوان دوو وتارەکان بە دانیشتنێکی کورت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

١٦٠٥ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا، قَالَ: كَانَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ خُطْبَتَانِ يَجْلِس بَيْنَهُمَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيُذَكِّرُ النَّاسَ»(١).

واتە: لە جابری كوڕی سەمورەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو وتاری هەبوو (لە ڕۆژی هەینیدا)، لە نێوانیاندا دادەنیشت، (لە وتارەكانیدا) قوڕئانی دەخوێند و خەڵكی ئامۆژگاری دەكرد.

## بابەت: ئیمام چۆن ئاماژە و جوڵە دەكات (لە وتارداندا)؟

١٦٠٦ - «حَدَّثَنَا حُصَيْنٌ قَالَ: رَأَى عُمَارَةُ بْنُ رُوَيْبَةَ بِشْرَ بْنَ مَرْوَانَ، عَلَى الْمِنْبَرِ رَافِعًا يَدَيْهِ، فَقَالَ: قَبَّحَ اللهُ هَاتَيْنِ الْيَدَيْنِ، لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَمَا يُشِيرُ إِلاَّ بِإِصْبُعِهِ»(٢).

واتە: لە حوصەینەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: عوممارەی كوڕی ڕووەیبە بیشری كوڕی مەڕوانی بینی لەسەر مینبەر (وتاری دەدا) و دەستەكانی بەرز كردبوویەوە، (عوممارە) وتی: دەک خوا ئەو دوو دەستانە ڕیسوا بكات، بە دڵنیایی من پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە لەسەر مینبەر (وتاری داوە) ئاماژەی بە هیچ نەكردوە تەنها پەنجەی نەبێت (تەنها پەنجەی دەجوڵاند).

١٦٠٧ - «عَنْ عُمَارَةَ بْنِ رُوَيْبَةَ قَالَ: رَأَى بِشْرَ بْنَ مَرْوَانَ رَافِعًا يَدَيْهِ يَدْعُو عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، قَالَ: فَسَبَّهُ وَقَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى الْمِنبَرِ وَمَا يَقُولُ بِأُصْبُعِهِ إِلاَ هَكَذَا، وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ عِنْدَ الْخَاصِرَةِ »(٣).

واتە: لە عوممارەی كوڕی ڕووەیبەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بیشری كوڕی مەڕوانی (كاربەدەستی عێراقی) بینیوە دەستەكانی بەرز كردبوویەوە، دووعای دەكرد لەسەر مینبەر لە ڕۆژی هەینیدا، دەڵێ: جوێنی پێدا و وتی: من پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە لەسەر مینبەر، هیچی بە پەنجەی نەدەكرد تەنها ئاوا نەبێت: جا ئاماژەی بە پەنجەی شاتومان كرد لەلای كەڵاكەی (واتە: پەنجەی دەجوڵاند، بەرزیشی نەدەكردەوە، بەڵكو لە بەرامبەر تەڕۆک و كەمەری دەیجوڵاند).

## بابەت: شوێنی وەستانی ئیمام كاتێ وتار دەدات

١٦٠٨ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُومُ إِلَى جِذْعٍ قَبْلَ أَنْ يُجْعَلَ الْمِنْبَرُ، فَلَمَّا جُعِلَ الْمِنْبَرُ حَنَّ ذَلِكَ الْجِذْعُ حَتَّى سَمِعْنَا حَنِينَهُ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ عَلَيْهِ فَسَكَنَ»(٤).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (پێشتر) هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای قەدە دارخورمایێک دەوەستا (بۆ وتاردان) پێش ئەوەی مینبەر دابنرێت، جا کاتێ مینبەر دانرا قەدە دارخورماکە نوزایەوە تاوەکو گوێمان لە نوزانەوەکەی بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی خستە سەری و بێ دەنگ و ئارام بوویەوە.

١٦٠٩ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَخْطُبُ إِلَى جِذْعٍ قَبْلَ أَنْ يَتَّخِذَ الْمِنْبَرَ، فَلَمَّا اتَّخَذَ الْمِنْبَرَ تَحَوَّلَ إِلَيْهِ حَنَّ الْجِذْعُ، فَاحْتَضَنَهُ، فَسَكَنَ، وَقَالَ: لَوْ لَمْ أَحْتَضِنْهُ لَحَنَّ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»[1].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا)، گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار لەلای قەدە دارخورمایێک وتاری دەدا پێش ئەوەی مینبەر دابنێت، جا کاتێ مینبەری دانا شوێنی وتاردانی گۆڕی بۆ لای مینبەرەکە قەدە دارخورماکەش نوزایەوە، (پێغەمبەری خواش ﷺ) باوەشی تێکرد، ئنجا بێ دەنگ و ئارام بوویەوە، وە (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەگەر باوەشم پێ نەکردایە تا ڕۆژی دوایی (یان تا ئەو کاتەی دەڕزی و لەناو دەچوو) هەر دەنوزایەوە.

١٦١٠ - «حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ، حَدَّثَنَا حَمَّادٌ، عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ »[2].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده گێڕدراوەتەوە.

١٦١١ - «سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا كَثُرَ النَّاسُ بِالْمَدِينَةِ، جَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ وَالْقَوْمُ يَجِيئُونَ، فَلاَ يَكَادُونَ يَسْمَعُون كَلاَمَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى يَرْجِعُوا مِنْ عِنْدِهِ، فَقَالَ لَهُ النَّاسُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ النَّاسَ قَدْ كَثُرُوا، وَإِنَّ الْجَائِيَ يَجِيءُ، فَلاَ يَكَادُ يَسْمَعُ كَلاَمَكَ، قَالَ: فَمَا شِئْتُمْ، فَأَرْسِلْ إِلَى غُلاَمٍ لِامْرَأَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، نَجَّارٍ، وَإِلَى طَرْفَاءِ الْغَابَةِ، فَجَعَلُوا لَهُ مِرْقَاتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجْلِسُ عَلَيْهِ وَيَخْطُبُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا فَعَلُوا ذَلِكَ حَنَّتِ الْخَشَبَةُ الَّتِي كَانَ يَقُومُ عِنْدَهَا، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَيْهَا، فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهَا فَسَكَنَتْ »[3].

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: کاتێ خەڵک لە مەدینە زۆر بوون، وای لێ هات پیاو دەهات و خەڵکی زۆر دەهاتن، بۆیە گوێیان لە قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەبوو تاوەکو دەگەڕانەوە لەلای، جا خەڵک پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا خەڵک زۆر بووە، وە کەسێک دێت و هەر خەریکە گوێی لە قسەکانت نەبێت، فەرمووی: جا بە دڵی ئێوە (چیتان پێ باشە دەیکەین)، بۆیە ناردی بەدوای گەنجێکی دارتاشی بەندەی ئافرەتێکی ئەنصاری، وە ناردی بۆ (طَرْفَاءِ الْغَابَةِ) ـ کە شوێنێک بوو وەک غابات داری زۆری تیا بوو ـ جا دوو یان سێ پایەیان بۆ دانا (لە مینبەرەکەی)، جا (لە مەودوا) پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری دادەنیشت و وتاری لەسەر دەدا، جا کاتێ ئاوایان کرد دارەکەی پێشو کە لەلای دەوەستا نوزایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ هەڵسا بۆ لای و دەستی خستە سەری و بێ دەنگ و ئارام بوویەوە.

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف لكن الحديث صحيح.

## بابەت: خوێندنی قورئان لە نوێژی هەینیدا

١٦١٢ - «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ الضَّحَّاكَ بْنَ قَيْسٍ، سَأَلَ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ الأَنْصَارِيَّ ﷺ مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي يَوْمَ الْجُمُعَةِ عَلَى إِثْرِ سُورَةِ الْجُمُعَةِ؟ قَالَ: هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ»(١).

واتە: لە عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عوتبەوە گێڕدراوەتەوە، کە ضەحاکی کوڕی قەیس پرسیاری لە نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری ﷺ کردَ وتی: پێغەمبەر ﷺ چی دەخوێند دوای سوورەتی (الجمعة)؟ وتی: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ ①﴾ الغاشية، (واتە: سوورەتی غاشیەی دەخوێند).

١٦١٣ - «عن الضحاك بن قيس الفهري، عنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: سَأَلْنَاهُ: مَا كَانَ يَقْرَأُ بِهِمُ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مَعَ السُّورَةِ الَّتِي ذُكِرَتْ فِيهَا الْجُمُعَةُ؟ قَالَ: كَانَ يَقْرَأُ مَعَهَا ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ ①﴾»(٢).

واتە: لە ضەحاکی کوڕی قەیسی فیهریەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری گێڕاوەتەوە و وتویەتی: پرسیارمان لە نوعمان کرد: پێغەمبەری خوا ﷺ چی بۆ دەخوێندن لەگەڵ ئەو سوڕەتەی کە باسی جوموعەی تیایە (واتە: جگە لە سووڕەتی (الجمعة) چی بۆ دەخوێندن)؟ وتی: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ ①﴾ الغاشية، (واتە: سووڕەتی غاشیەی دەخوێند).

١٦١٤ - «عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ وَالْجُمُعَةِ بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ①﴾ الأعلى، وَ: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ ①﴾ الغاشية، وَرُبَّمَا اجْتَمَعَا، فَقَرَأَ بِهِمَا»(٣).

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: (زۆر جاران) پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی جەژنەکان و هەینیدا: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ①﴾ و: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَـٰشِيَةِ ①﴾ ی دەخوێند، وە هەندێ جاریش هەردووکی بەیەکەوە دەخوێند.

## بابەت: ئەو کاتەی کە باس دەکرێت (بەوەی کاتێکی گەورەیە) لە ڕۆژی هەینیدا

١٦١٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: الْتَقَيْتُ أَنَا وَكَعْبٌ، فَجَعَلْتُ أُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَجَعَلَ يُحَدِّثُنِي عَنِ التَّوْرَاةِ، حَتَّى أَتَيْنَا عَلَى ذِكْرِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ، فَقُلْتُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ فِيهَا لَسَاعَةً لاَ يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا خَيْرًا إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ»(٤).

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، ولكن الحديث متفق عليه.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: من و کەعب بەیەک گەیشتین، من هەر باسی پێغەمبەری خوام ﷺ دەکرد، ئەویش هەر باسی تەوراتی بۆ دەکردم (زانستمان دەگۆڕیەوە)، تا گەیشتینە سەر باسی ڕۆژی هەینی، منیش وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (ڕۆژی هەینی) کاتێکی تیایە، هیچ بەندەیەکی مسوڵمان نیە هاوشانی ئەو کاتەبێت و نوێژ بکات و داوا و تکای چاکی تێدا بکات حەتمەن خوا پێی دەدات.

## بابەت: دەربارەی ئەو کەسەی نوێژی هەینی واز لێ دەهێنێت و دەیچوێنێت بەبێ پاساو

١٦١٦ - «حَدَّثَنِي الْحَكَمُ بْنُ مِينَا، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ، حَدَّثَهُ وَأَبَا هُرَيْرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُمَا سَمِعَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ وَهُوَ عَلَى أَعْوَادِ مِنْبَرِهِ: لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدَعِهِمُ الْجُمُعَاتِ، أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ، ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ»[1].

واتە: لە حەکەمی کوڕی میناوە گێردراوەتەوە، کە ئیبنو عومەر و ئەبو هورەیرە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا)، بۆیان گێڕاوەتەوە کە هەردووکیان گوێیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە ـ لە کاتێکدا لەسەر دارەکان و پایەکانی مینبەرەکەی بوو ـ دەیفەرموو: یان ئەوەتا خەڵکانێک واز دەهێنن و کۆڵ دەدەن لە وازهێنانیان لە چوونە جومعە، یان خوا مۆر دەدات لەسەر دڵەکانیان، دواتر لە غافڵان دەبن.

١٦١٧ - «عَنْ أَبِي الْجَعْدِ الضَّمْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ تَهَاوُنًا بِهَا طَبَعَ اللهُ عَلَى قَلْبِهِ»[2]

واتە: لە ئەبو جەعدی ضەمری ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک نوێژی هەینی واز لێ بهێنێت لەبەر ئەوەی پێی ئاسایی بێت (پێی شتێکی گەورە نەبێت)، ئەوە خوا مۆر دەنێت بە دڵیەوە.

تێبینی: ئەو مۆرە هەندێک لە زانایان دەڵێن: مانای ئەوەیە خوا چاکە و خێری بە قسمەت ناکات، هەندێکیتر دەفەرموون: ئەوە نیشانەیەکە فریشتەکان پێی دەزانن کێ لەلای خوای بەرز و مەزن جێگای ڕەزامەندیە و کێش زەم کراو و بێ ڕەزامەندی خوایە، هەندێکیتر دەفەرموون: ئەوە مۆری نیفاقە دەنرێت بە دڵیەوە، هەندێکیتر دەفەرموون: مۆری سیفاتی کافرانە، جا هەر کامێکیان بێت هەر خەتەرو ترسناکە، گرنگ ئەوەیە بزانین خوا لێی زویر و ناڕازیە.

## بابەت: دەربارەی گەورەیی ڕۆژی هەینی

١٦١٨ - «عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَفْضَلَ أَيَّامِكُمْ يَوْمُ الْجُمُعَةِ: فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الصَّعْقَةُ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ فِيهِ، فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ، قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

اللَّهِ كَيْفَ تُعْرَضُ صَلاَتُنَا عَلَيْكَ وَقَدْ أَرَمْتَ، يَعْنِي: بَلِيتَ؟ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَى الْأَرْضِ أَنْ تَأْكُلَ أَجْسَادَ الْأَنْبِيَاءِ»[1].

واتە: لە ئەوسی کوڕی ئەوسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان گەورەترین ڕۆژتان (لە هەفتە، یان لە ساڵ) ڕۆژی هەینیە، تیایدا ئادەم ﷺ دروست کراوە، وە تیایدا نوفخەی صوڕ لێ دەدرێت (فوو بە شەیپور دادەکرێت)، وە تیایدا مردنی سەرتاسەری گشتی ڕوودەدات (بە هۆی فوکردن بە صوڕدا)، کەواتە زۆر صەڵاوەتم لەسەر لێبدەن تیایدا، چونکە بە دڵنیایی صەڵاوەتەکانی ئێوەم بۆ دەخرێتە ڕوو و پێم دەگەیەنرێت.

پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن صەڵاوەتەکانی ئێمەت بۆ دەخرێتە ڕوو لە کاتێکدا ڕزی بووی؟ (پێغەمبەری خوا) فەرمووی: بێگومان خوا قەدەغەی کردوە لەسەر زەوی کە جەستەی پێغەمبەران بخوا و بیان ڕزێنێت.

تێبینی: پێغەمبەران گەورەترین و سافترین و بەهێزترین مەخلوقی خوان، زێڕیش مەعدەنێکی بەڕێز و گرنگە بۆیە ژەنگ ناهێنێت هەر چەند لە ناو جەرگەی زەویدا بمێنێتەوە، پێغەمبەرانیش هەر چەندە زۆر لە ناو باوەشی زەویدا بمێننەوە هەر ساف و ساغن، مرۆڤ بە قانونی خوا لە زەویدا دەڕزێت، پێغەمبەرانیش هەر بە قانونی خوا لە زەویدا ساغن.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی نوێژی (سوننەتی) دوای هەینی

١٦١٩ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ»[2].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، گێردراوەتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ دوو ڕەکعەت نوێژی سوننەتی دەکرد لە ماڵەوەی.

١٦٢٠ - «عَنْ سَالِمٍ ﷺ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ»[3].

واتە: لە سالمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێراویەتیەوە، کە پێغەمبەر ﷺ دوای هەینی دوو ڕەکعەت نوێژی سوننەتی دەکرد.

١٦٢١ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مُصَلِّيًا بَعْدَ الْجُمُعَةِ فَلْيُصَلِّ بَعْدَهَا أَرْبَعًا، قَالَ أَبُو مُحَمَّد أُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَيْنِ أَوْ أَرْبَعًا»[4].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوەی ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێک لە ئێوە نوێژ دەکات دوای هەینی ئەوە با چوار ڕەکعەتی لەدوا بکات، ئەبو موحەممەد وتویەتی: دوای هەینی دوو یان چوار ڕەکعەت نوێژی سوننەت دەکەم.

## بابەت: دەربارەی ویتر

١٦٢٢ - «عَنْ خَارِجَةَ بْنِ حُذَافَةَ الْعَدَوِيِّ ﷺ قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَمَدَّكُمْ بِصَلَاةٍ هِيَ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ، جَعَلَهُ لَكُمْ فِيمَا بَيْنَ صَلَاةِ الْعِشَاءِ إِلَى أَنْ يَطْلُعَ الْفَجْرُ»[1].

واتە: لە خاریجەی کوڕی حوذافەی عەدەویەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ لامان و فەرمووی: بێگومان خوا نوێژێکی بۆ زیاد کردوون کە چاکترە بۆ ئێوە لە وشتری سور (واتە: باشترە بۆتان لە گرانبەهاترین و بە نرخترین کاڵای دونیا بۆ نمونە وشتری سور)، بۆی داناون لە نێوان نوێژی عیشا تاوەکو بەیان هەڵدێت (کە نوێژی ویترە).

١٦٢٣ - « أَنَّ الْمُخْدَجِيَّ قال، أَنَّ رَجُلاً مِنْ الشَّامِ وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ يُكْنَى أبا مُحَمَّدٍ، أَخْبَرَهُ: أَنَّ الْوِتْرَ وَاجِبٌ، فَرَاحَ الْمُخْدَجِيُّ إِلَى عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﷺ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: عُبَادَةُ: كَذَبَ أَبُو مُحَمَّدٍ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: خَمْسُ صَلَوَاتٍ كَتَبَهُنَّ اللهُ عَلَى الْعِبَادِ، مَنْ أَتَى بِهِنَّ لَمْ يُضَيِّعْ مِنْ حَقِّهِنَّ شَيْئًا اسْتِخْفَافًا بِحَقِّهِنَّ، كَانَ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ عَهْدٌ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، وَمَنْ لَمْ يَأْتِ بِهِنَّ، جَاءَ وَلَيْسَ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ عَهْدٌ إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَاءَ، أَدْخَلَهُ الْجَنَّةَ»[2].

واتە: موخدەجی وتویەتی: پیاوێک لە شام کە هاوڕێیەتی لەگەڵ هەبووە کونیەکەی ئەبو موحەممەد بووە، پێی ڕاگەیاندووە کە نوێژی ویتر واجبە، موخدەجیش چوو بۆ لای عوبادەی کوڕی صامیت ﷺ و ئەوەی بۆ باس کرد، عوبادە وتی: ئەبو موحەممەد ڕاستی نەکردوە، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پێنج نوێژ هەن خوا لەسەر بەندەکانی نوسیوە و کردویەتی بە واجب، هەر کەسێک جێبەجێیان بکات و هیچ لە هەق و واجباتەکانیان نەفەوتێنێت بەوەی بە کارێکی ئاسایی بزانێت (بەڵکو بە گەورەی بزانێت و جێبەجێیان بکات) ئەوە لەلای خوا پەیمانێکی هەیە کە بیخاتە بەهەشتەوە، وە هەر کەسێکیش جێبەجێیان نەکات و بێت (بۆ لای خوا) ئەوە هیچ پەیمانێکی نیە لەلای خوا، ئەگەر بیەوێت سزای دەدات، وە ئەگەر بشیەوێت دەیخاتە بەهەشتەوە (بە مەرجێک بڕوای پێ هەبووبێت و لۆمەی خۆی کردبێت و پێی ناخۆش بووبێت).

١٦٢٤ - «عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَائِرَ الرَّأْسِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَاذَا فَرَضَ اللهُ عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ؟ قَالَ: الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ، وَالصِّيَامَ، فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَرَائِعِ الْإِسْلَامِ، فَقَالَ: وَالَّذِي أَكْرَمَكَ لاَ أَتَطَوَّعُ شَيْئًا، وَلاَ أَنْقُصُ مِمَّا فَرَضَ اللهُ عَلَيَّ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَفْلَحَ وَأَبِيهِ إِنْ صَدَقَ أَوْ دَخَلَ الْجَنَّةَ وَأَبِيهِ إِنْ صَدَقَ»[3].

---

(١) ـ حسن دون قوله: (هو خير لكم من حمر النعم).

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

واتە: لە طەڵحەی كوڕی عوبەیدوڵڵا گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێكی دەشتەكی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بە قژ ئاڵۆزی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوا چی واجب كردوە لەسەر من لە نوێژ؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: پێنج نوێژەكان و، ڕۆژوو گرتن و، ...جا پێغەمبەری خوا ﷺ (ئاوا بەو شێوەیە) هەواڵی پێدا بە شتە واجب و سەرەكیەكانی ئیسلام، دەشتەكیەكەش وتی: سوێند بەوەی ڕێزی لە تۆ ناوە (كردویی بە پێغەمبەر) هیچ سوننەتێك ناكەم، وە هیچیش كەم ناكەم و كەمتەرخەمی لەوە ناكەم كە خوا واجبی كردوە لەسەرم، جا (ڕۆیشت) پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: دە سوێند بە باوكی ڕزگاری بووە ئەگەر ڕاست بكات (قسەكەی جێبەجێ بكات)، یان فەرمووی: چۆتە بەهەشت سوێند بە باوكی ئەگەر ڕاست بكات.

تێبینی: لێرەدا كە پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی بە باوكی پیاوەكە خواردووە، جا زانایان چەند قسەیەكیان هەیە لەو بارەیەوە: هەندێكیان فەرموویانە: ئەوە سوێندی سەر زارەكیە و سوێندی سەر زارەكیش كێشەی نیە، چونكە تۆ سوێندەكە بە گەورە دانانێی وەك سوێند خواردن بە خوا. هەندێكیتر فەرموویانە: ئەوە لەو كاتە بووە كە هێشتا سوێند خواردن بە جگە لە خوا حەڕام نەكرابوو، دواتر حەڕام كراوە سوێند بە جگە لە خوا بخورێ، وە هەندێكیتر فەرموویانە: ڕەنگە وشەی (واللە) بووبێت نەك وشەی «باوك»، واتە ڕەنگە سوێندی بەخوا خواردبێت، بەڵام هەڵەی تێكەوتبێت، لە لایەن گێڕەرەوانی فەرمووده.

بەڵام گرنگ لێرەدا ئەوەیە مادەم بابەتەكە خیلافیە، ئەگەر كەسێك بە زارەكی سوێندی خوارد زوو كافر و موشریك نەكرێت، بەڵكو تێبگەیەنرێت كە كارێكی باش ناكات و با تەركی بكات.

١٦٢٥ - «عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ عَاصِمَ بْنَ ضَمْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا يَقُولُ: إِنَّ الْوِتْرَ لَيْسَ بِحَتْمٍ كَالصَّلاَةِ، وَلَكِنَّهُ سُنَّةٌ، فَلاَ تَدَعُوهُ»[١].

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عاصمی كوڕی ضەمرە بوو وتی: گوێم لە عەلی بوو دەیووت: ویتر وەك نوێژی (فەڕز) واجب نیە، بەڵكو سوننەتە، (بەڵام سوننەتیش مەزن و گەورەیە) كەواتە وازی لێ مەهێنن.

## بابەت: هاندان بۆ شتی تاك و نوێژی ویتر

١٦٢٦ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ»[٢].

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە، وتویەتی: بێگومان خوا تاكە و تاكیشی پێ خۆشە (لە كار و پەرستشەكاندا، بە تایبەتی نوێژی ویتر).

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: ویتر چەندە

١٦٢٧ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَتْ صَلاَتُهُ مِنَ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً يُوتِرُ مِنْهَا بِخَمْسٍ، لاَ يَجْلِسُ فِي شَيْءٍ مِنَ الْخَمْسِ حَتَّى يَجْلِسَ فِي الآخِرَةِ، فَيُسَلِّمَ»[١].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی شەوانی (شەونوێژی) سێزدە ڕەكعەت بوو، لەو سێزدە ڕەكعەتانە پێنجی دەكردن بە ویتر، لە هیچ لە پێنج ڕەكعەتەكان دانەدەنیشت تاوەكو لەوەی كۆتایی دادەنیشت و سەلامی دەدایەوە (واتە: هەر پێنج ڕەكعەتەكانی بەیەكەوە دەكرد).

١٦٢٨ - «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَوْتِرْ بِخَمْسٍ، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَبِثَلاَثٍ، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَبِوَاحِدَةٍ، فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَأَوْمِئْ إِيمَاءً»[٢].

واتە: لە ئەبو ئەییوبی ئەنصاریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وتم: ویتر بكە بە پێنج ڕەكعەت، ئەگەر نەتتوانی ئەوە بە سێ، ئەگەر نەتتوانی ئەوە بە یەك ڕەكعەت، ئەگەر نەتتوانی ئەوە بە ئاماژە بیكە (واتە: ئەگەر نەتتوانی بە وەستان بیكەی، ئەوە بە دانیشتن و ئاماژەش بێت هەر ئەنجامی بدە).

١٦٢٩ - «أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ الأَوْزَاعِيِّ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ »[٣].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

١٦٣٠ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلاَةِ اللَّيْلِ، فَقَالَ: مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ، فَلْيُصَلِّ رَكْعَةً وَاحِدَةً تُوتِرُ مَا قَدْ صَلَّى» قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ: تَأْخُذُ بِهِ؟ قَالَ: نَعم»[٤].

واتە: لە ئیبنو عومەر (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد دەربارەی (چۆنیەتی) شەونوێژ، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: دوو ڕەكعەت دوو ڕەكعەتە، جا كاتێ یەكێك لە ئێوە ترسا نوێژی بەیانی بەسەر دابێت و (واتە: ترسا بۆ شەونوێژی زیاتر كردن خەبەری نەبێتەوە پێشی نوێژی بەیانی)، ئەوە با ڕەكعەتێك بە تەنیا بكات، تا ئەوەی كردوویەتی ببێتە ویتر و تاك، بە ئەبو موحەممەد وترا: ئەو فەرموودەیە وەردەگری؟ وتی: بەڵێ.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده حسن، ولكن الحديث متفق عليه.

١٦٣١ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مَا بَيْنَ الْعِشَاءِ إِلَى الْفَجْرِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُسَلِّمُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ وَيُوتِرُ بِوَاحِدَةٍ»[١].

واتە: لە دایکمان عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ یازدە ڕەکعەتی لە نێوان عیشا تا نوێژی بەیانی دەکرد، لە هەر دوو ڕەکعەتێکدا سەلامی دەدایەوە، وە دانەیەکیشی بە تەنیا دەکرد.

١٦٣٢ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُوتِرُ بِثَلَاثٍ بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ الأعلى، وَ: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾ الكافرون، وَ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ الإخلاص»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار ویتری دەکرد بە خوێندنی سێ سووڕەت: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾، و: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾، و: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾.

## بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی کاتی ویتر

١٦٣٣ - «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا قَالَتْ: مِنْ كُلِّ اللَّيْلِ قَدْ أَوْتَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ»[٣].

واتە: لە عائیشەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: لە هەموو شەوێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ ویتری دەکرد، ویترەکەشی لە کاتی سەحەر کۆتایی دەهات.

١٦٣٤ - «حَدَّثَنِي أَبُو نَضْرَةَ، أَنَّ أَبا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ حَدَّثَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، سُئِلَ عَنِ الْوِتْرِ، فَقَالَ: أَوْتِرُوا قَبْلَ الْفَجْرِ»[٤].

واتە: لە ئەبو نەضرەوە گێردراوەتەوە، کە ئەبو سەعیدی خودریی ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکراوە دەربارەی ویتر، ئەویش فەرموویەتی: ویتر بکەن پێشی نوێژی بەیانی (چونکە ئەوکات خێری زیاترە).

## بابەت: خوێندنی قورئان لە ویتردا

١٦٣٥ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُوتِرُ بِثَلَاثٍ: يَقْرَأُ فِي الْأُولَى بِـ ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ الأعلى، وَفِي الثَّانِيَةِ بِـ ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾ الكافرون، وَفِي الثَّالِثَةِ بِـ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ الإخلاص»[٥].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

(٥) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار بە سێ (سوورەت) نوێژی ویتری دەكرد، لە ڕەكعەتی یەكەمدا بە: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ①﴾، و لە ڕەكعەتی دووەمدا بە: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ①﴾، و لە ڕەكعەتی سێیەمدا بە: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾.

## بابەت: ویتر لەسەر سواری (لەسەر پشتی سواری و كەشتی و، لەناو سەیارە و تەیارە)

١٦٣٦ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُوتِرُ عَلَى الْبَعِيرِ» قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ تَأْخُذُ بِهِ؟ قَالَ: نَعم»[1].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ ویتری لەسەر پشتی وشتر دەكرد.

بە ئەبو موحەممەد وترا: ئەم فەرموودەیە وەردەگری؟ وتی: بەڵێ.

## بابەت: دووعا لە قنوتدا

١٦٣٧ - «عَنْ أَبِي الْحَوْرَاءِ السَّعْدِيِّ قَالَ: قُلْتُ لِلْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، مَا تَذْكُرُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: حَمَلَنِي عَلَى عَاتِقِهِ، فَأَخَذْتُ تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ، فَأَدْخَلْتُهَا فِي فَمِي، فَقَالَ لِي: أَلْقِهَا، أَمَا شَعَرْتَ أَنَّا لاَ تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ»[2].

قَالَ: وَكَانَ يَدْعُو بِهَذَا الدُّعَاءِ: اللهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، إِنَّكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ، إِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ».

واتە: لە ئەبو حەوڕائی سەعدیەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: بە حەسەنی كوڕی عەلیم (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، وت: چیت لەبیرە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ؟ وتی (ئەوەم لەبیرە): منی لەسەر شان و ملی خۆی هەڵگرت، منیش دانە خورمایێكم لە خورمای زەكات هەڵگرت و خستە دەممەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرمووم: فڕێی بدە، ئایا نازانی ئێمە زەكاتمان بۆ حەڵاڵ نیە.

(هەروەها) حەسەن وتی: هەموو جار ئەم نزایەی دەكرد: ((اللهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، إِنَّكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ، إِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ)) واتە: خوایە ڕێنموییم بكە (بۆ هەق و ڕاستی و كردەوەی چاك) لەگەڵ ئەو كەسانەی ڕێنموییت كردوون، وە ساغ و سەلامەتم بكە (لە نەخۆشی، نەخۆشی جەستەیی و دڵ و دەروون) لەگەڵ ئەو كەسانەی ساغ و سەلامەتت كردوون، وە كاروبارم بگرە ئەستۆ لەگەڵ ئەو

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

کەسانەی کاروبارت گرتونەتە ئەستۆ، وە بەرەکەت و خێری زۆرم پێ ببەخشە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە (بەرەکەتت) پێ بەخشیون، وە بمپارێزە لە شەڕ و خراپە کە بێ ویست و بڕیاری تۆ ڕوو نادەن، بە دڵنیایی تۆ بڕیار و حوکم دەدەی و بڕیار و حوکمت بەسەر نادرێت، بە دڵنیایی زەلیل نیە و زەلیل نابێت کەسێک تۆ کاری بگریە ئەستۆ، خێر و فەڕت زۆرە و بەرز و باڵای.

١٦٣٨ - «عَنْ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي الْقُنُوتِ فَذَكَرَ مِثْلَهُ»[١].

واتە: لە حەسەنی کوڕی عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ڕستەیەکی فێر کردووم کە بیانڵێم لە قنوتدا، جا وەک فەرموودەکەی پێشەوەی باسی کرد.

١٦٣٩ - «عَنْ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ: اللهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ»[٢].

واتە: لە حەسەنی کوڕی عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ڕستەیەکی فێر کردووم کە بیانڵێم لە قنوتی ویتردا: ((اللهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، إِنَّكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ، إِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ)) واتە: پەروەردگارا ڕێنموییم بکە (بۆ هەق و ڕاستی و کردەوەی چاک) لەگەڵ ئەو کەسانەی ڕێنموییت کردوون، وە ساغ و سەلامەتم بکە (لە نەخۆشی، نەخۆشی جەستەیی و دڵ و دەروون) لەگەڵ ئەو کەسانەی ساغ و سەلامەتت کردوون، وە کاروبارم بگرە ئەستۆ لەگەڵ ئەو کەسانەی کاروبارت گرتونەتە ئەستۆ، وە بەرەکەت و خێری زۆرم پێ ببەخشە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە (بەرەکەتت) پێ بەخشیون، وە بمپارێزە لە شەڕ و خراپە کە بێ ویست و بڕیاری تۆ ڕوو نادەن، بە دڵنیایی تۆ بڕیار و حوکم دەدەی و بڕیار و حوکمت بەسەر نادرێ، بە دڵنیایی زەلیل نیە و زەلیل نابێت کەسێک تۆ کاری بگریە ئەستۆ، خێر و فەڕت زۆرە و بەرز و باڵای.

## بابەت: دەربارەی دوو ڕەکعەتەکانی دوای ویتر

١٦٤٠ - «عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ هَذَا السَّهَرَ جَهْدٌ وَثِقَلٌ، فَإِذَا أَوْتَرَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ، فَإِنْ قَامَ مِنَ اللَّيْلِ، وَإِلاَّ كَانَتَا لَهُ»[٣].

واتە: لە ثەوبانەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، وتویەتی: ئەو نەنوستن و کەم خەویە مەشەققەت و قورسایەتیە، جا کاتێ یەکێک لە ئێوە نوێژی ویتری کرد، با دوو ڕەکعەت بکات (لە دوای ویترەکە)، جا ئەگەر هەڵسا و خەبەری بوویەوە (ئەوە باشە، بۆ خۆی شەونوێژیتر

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده حسن.

دەكات)، وە ئەگەر هەڵنەستا و خەبەری نەبوویەوە (بۆ شەونوێژی زیاتر) ئەوە ئەو دوو ڕەكعەتەی بۆ بە شەونوێژەكە حیسابە.

## بابەت: قنوت دوای ڕكوع

١٦٤١ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ عَلَى أَحَدٍ أَوْ يَدْعُوَ لِأَحَدٍ، قَنَتَ بَعْدَ الرُّكُوعِ، فَرُبَّمَا قَالَ: إِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، اللهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ، وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ، وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، اللهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، وَاجْعَلْهَا سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ، وَيَجْهَرُ بِذَلِكَ، وَيَقُولُ فِي بَعْضِ صَلَاتِهِ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ: اللهُمَّ الْعَنْ فُلَانًا، وَفُلَانًا لِحَيَّيْنِ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾آل عمران»[1].

واتە: لە ئەبو هوڕەیڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ بیویستایە دووعا لە كەسێک بكات یان دووعا بۆ كەسێک بكات، ئەوە قنوتی دەخوێند دوای ڕكوع، جا جارێكیان فەرمووی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)، خوایە وەلیدی كوڕی وەلید و سەلەمەی كوڕی هیشام و عەییاشی كوڕی ئەبو ڕەبیعە و بڕواداره چەوساوە و ژێر دەستەكان ڕزگار بكەیت، خوایە گرتنەكەت و (سزایەكەت) توند بكەی لەسەر موضەڕ (واتە قوڕەیش)، وە بیكەیتە وشكەساڵی (بەسەریانەوە) وەک وشكەساڵیەكەی سەردەمی یوسف ﷺ، وە ئەمەی بە دەنگ دەفەرموو، وە جارێكیتر دەیفەرموو: خوایە نەفرەت بدەی لە فڵان و فڵان، كە خەڵكی دوو شار بوون لە شارەكانی عەڕەب، جا خوای بەرز ئەو ئایەتەی دابەزاند: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾، واتە: بێگومان تۆ هیچ شتێكت لە كاروباری بەندەكان بەدەست نیە ئەی موحەممەد، ئەگەر خوا تەوبە و پەیمانیان لێ وەربگرێت یان سزا و ئازاریان بدات، چونكە ئەوانە ستەمكارن.

١٦٤٢ - «حَدَّثَنَا عَاصِمٌ قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مالكٍ ﷺ عَنِ الْقُنُوتِ فَقَالَ: قَبْلَ الرُّكُوعِ. قَالَ: فَقُلْتُ: إِنَّ فُلَانًا يزعَمَ أَنَّكَ قُلْتَ بَعْدَ الرُّكُوعِ، قَالَ: كَذَبَ، ثُمَّ حَدَّثَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَنَتَ شَهْرًا بَعْدَ الرُّكُوعِ، ويَدْعُو عَلَى حَيٍّ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ»[2].

واتە: لە عاصمەوە گێڕدراوەتەوە وتویەتی: پرسیارم لە ئەنەسی كوڕی مالیک ﷺ كرد دەربارەی قنوت، ئەویش وتی: پێشی ڕكوعە، دەڵێ منیش وتم: فڵان دەڵێ تۆ وتوتە دوای ڕكوعە، وتی: ڕاست ناكات، دواتر گێڕایەوە كە پێغەمبەر ﷺ مانگێک قنوتی خوێندووە دوای ڕكوع و دووعای كردوە لە قەبیلەیەكی بەنی سولەیم.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

١٦٤٣ - «عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْنُتُ فِي الصُّبْحِ»[١].

واتە: لە بەڕرائی کوڕی عازیبەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ قنوتی دەخوێنت لە نوێژی بەیانیدا.

١٦٤٤ - «حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ، عَنْ شُعْبَةَ بِإِسْنَادِهِ نَحْوَهُ »[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمووده لە شوعبەوە گێڕدراوەتەوە.

١٦٤٥ - «عَنْ مُحَمَّدٍ، قَالَ: سُئِلَ أَنَسُ بْنُ مالَكٍ ﷺ أَقَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ؟ قَالَ: نَعم فَقِيلَ لَهُ - أَوَ قُلْتَ لَهُ - قَبْلَ الرُّكُوعِ أَوْ بَعْدَ الرُّكُوعِ؟ قَالَ: بَعْدَ الرُّكُوعِ يَسِيرًا، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: أَقُولُ بِهِ وَآخُذُ بِهِ وَلاَ أَرَى أَنْ آخُذَ بِهِ إِلاَ فِي الْحَرْبِ»[٣].

واتە: لە موحەممەدەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ پرسیاری لێکرا: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ قنوتی خوێندووە لە نوێژی بەیانیدا؟ وتی: بەڵێ، جا پێی وترا: پێشی ڕکوع یان دوای ڕکوع؟ وتی: دوای ڕکوع بە ماوەیەکی زۆر کەم (واتە: کە لە ڕکوع هەڵساوەتەوە ماوەیەکی زۆر کەمی پێ چووە دوایی دەستی بە قنوتەکە کردووە).

ئەبو موحەممەد وتویەتی: بڕیار بەوە دەدەم و وەری دەگرم و پێشم وانیە دەبێ وەری بگرم تەنها بۆ کاتی حەرب و شەڕ نەبێت.

تێبینی: دەربارەی قنوتی بەیانیان کۆی زانایان بۆ حاڵەتی شەڕ و کارەسات بۆ سەر مسوڵمانان بە سونەتی دەزانن، وە جمهوری زانایانیش واتە زۆربەی زانایان پێیان وایە بە بەردەوامیش سونەتە، ئەگەرچی شەڕ و کێشەش بەرۆکی مسوڵمانانی نەگرتبێت، ئەبو هورەیرەش بە صەحیحی لێی گێڕدراوەتەوە کە هەتا خۆی وەفاتی کردوە کردویەتی.

## بابەتەکانی: دوو جەژنەکان

### بابەت: دەربارەی خواردنی (خۆراکێک) پێش دەرچوون (لە ماڵ) لە ڕۆژی جەژندا

١٦٤٦ - «حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَطْعَمُ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ، وَكَانَ إِذَا كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ لَمْ يَطْعَمْ حَتَّى يَرْجِعَ، فَيَأْكُلَ مِنْ ذَبِيحَتِهِ»[٤].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی بوریدەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنێکی دەخوارد لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا پێش ئەوەی (لە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

ماڵەوە بۆ مزگەوت) دەربچێت، وە کاتێ جەژنی قوربانیش دەهات هیچی نەدەخوارد تاوەکو (لە مزگەوت بۆ ماڵەوە) دەگەڕایەوە، ئنجا لە قوربانیەکەی خۆی دەخوارد.

١٦٤٧ - «حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ عَوْنٍ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ إِسْحَاقَ، عَنْ حَفْصِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە لە ئەنەسەوە ﷺ گێردراوەتەوە.

## بابەت: نوێژی دوو جەژنەکان بەبێ بانگ و قامەتە، وە نوێژەکەش پێشی وتارەکەیە

١٦٤٨ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ الصَّلاَةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي يَوْمِ عِيدٍ، فَبَدَأَ بِالصَّلاَةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلاَ إِقَامَةٍ»[٢].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: لە نوێژ ئامادە بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژن، جا دەستی بە نوێژ کرد پێشی وتار، بەبێ بانگ و قامەت.

١٦٤٩ - «حَدَّثَنِي أَيُّوبُ السَّخْتِيَانِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ عَطَاءً يَقُولُ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) يَقُولُ: أَشْهَدُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ بَدَأَ بِالصَّلاَةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ يَوْمَ الْعِيدِ، ثُمَّ خَطَبَ فَرَأَى أَنَّهُ لَمْ يُسْمِعِ النِّسَاءَ فَأَتَاهُنَّ، فَذَكَّرَهُنَّ وَوَعَظَهُنَّ، وَأَمَرَهُنَّ أَنْ يَتَصَدَّقْنَ، وَبِلاَلٌ قَابِضٌ بِثَوْبِهِ، فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تَجِيءُ بِالْخُرْصِ وَالشَّيْءِ، ثُمَّ تُلْقِيهِ فِي ثَوْبِ بِلاَلٍ»[٣].

واتە: لە ئەیوبی سەختیانیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عەطاء بوو دەیووت: گوێم لە ئیبنو عەبباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) بوو دەیووت: شاهێدی دەدەم لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا دەستی بە نوێژ کرد پێشی وتاردان لە ڕۆژی جەژندا، دواتر وتاریدا، جا زانی کە ناتوانێت (وتارەکەی) گوێبیستی ئافرەتان بکات، بۆیە چوو بۆ لایان و (وتاری بۆ دان بە جیا) و ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێ کردن کە صەدەقەو خێرات بکەن، وە بیلالیش کۆشی خۆی کردبوویەوە (بۆ کۆکردنەوەی خێراتەکان کە دەیانبەخشی)، جا (شتی زۆر بەخشرا) هەتا ئافرەتی وا هەبوو دەهات گوارە یان شتێکی (هەر دەهێنا)، دواتر فڕێی دەدایە ناو جلەکەی بیلال (ناو کۆشی بیلال).

١٦٥٠ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: شَهِدْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَأَبا بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ يُصَلُّونَ قَبْلَ الْخُطْبَةِ فِي الْعِيدِ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: ئامادە بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺو ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان (هەموویان) نوێژیان دەکرد پێشی وتاردان لە جەژندا.

## بابەت: هیچ نوێژێک نیە لە پێشی نوێژی جەژن و لە دواوەی

١٦٥١ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ يَوْمَ الْفِطْرِ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَلَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلاَ بَعْدَهَا»[١].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەرچوو (بۆ مزگەوت) لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا و دوو ڕەکعەت نوێژی کرد (بۆ خەڵکی، واتە نوێژی جەژنی کرد)، وە هیچ نوێژێکی نە لە پێش و نە لە دواوەی نەکرد.

## بابەت: اللّه أكبر کردن لە دوو جەژنەکاندا

١٦٥٢ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمَّارٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُكَبِّرُ فِي الْعِيدَيْنِ فِي الْأُولَى سَبْعًا، وَفِي الْأُخْرَى خَمْسًا، وَكَانَ يَبْدَأُ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ»[٢].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەممارەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: هەموو جار پێغەمبەر ﷺ (اللّه أكبر)ی دەکرد لە (نوێژی) دوو جەژنەکاندا، لە ڕەکعەتی یەکەمدا (جگە لە تەکبیری نوێژ دەست پێ کردن) حەوت (اللّه أكبر)ی دەکرد (پێش فاتیحە خوێندن)، وە لە ڕەکعەتەکەی تردا پێنج (اللّه أكبر)ی دەکرد، وە سەرەتا بە نوێژ دەستی پێ دەکرد پێشی وتاردان.

## بابەت: خوێندنی قورئان لە (نوێژی) دوو جەژنەکاندا

١٦٥٣ - «عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ وَالْجُمُعَةِ بِـ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾ الأعلى، وَ ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾ الغاشية، وَرُبَّمَا اجْتَمَعَا فَقَرَأَ بِهِمَا»[٣].

واتە: لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە دوو جەژنەکان و هەینیدا: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ۝١﴾، و ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ۝١﴾ی دەخوێند، وە جاری واش هەبوو هەردووکیان (جەژن و هەینی) کۆدەبوونەوە (بەوەی جەژن دەکەوتە ڕۆژی هەینی) ئەو کات هەردووکیانی دەخوێند.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح لغيره.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: وتاردان لەسەر سواری

١٦٥٤ - «حَدَّثَنَا سَلَمَةُ يَعْنِي ابْنَ نُبَيْطٍ، حَدَّثَنِي أَبِي، أَوْ نُعَيْمُ بْنُ أَبِي هِنْدٍ، قَالَ: حَجَجْتُ مَعَ أَبِي وَعَمِّي فَقَالَ لِي أَبِي: تَرَى ذَاكَ صَاحِبَ الْجَمَلِ الْأَحْمَرِ الَّذِي يَخْطُبُ؟ ذَاكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[1].

واتە: لە سەلەمەی كوڕی نوبەیطەوە گێڕدراوەتەوە، یان وتی: باوكم یان وتی: نوعەیمی كوڕی ئەبو هیند بۆی گێڕامەوە، وتی: لەگەڵ باوكم و مامم چووم بۆ حەج، جا باوكم پێی وتم: ئەوێهێ دەبینی ئەوەی لەسەر وشترە سورەكەیە، ئەوەی وتار دەدات؟ ئا ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ .

## بابەت: چوونە دەرەوەی ئافرەتان (بۆ نوێژی جەژن) لە دوو جەژنەكان

١٦٥٥ - «عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أَمَرَنَا بِأَبِي هُوَ أَنْ نُخْرِجَ يَوْمَ الْفِطْرِ، وَيَوْمَ النَّحْرِ الْعَوَاتِقَ وَذَوَاتِ الْخُدورِ. فَأَمَّا الْحُيَّضُ، فَإِنَّهُنَّ يَعْتَزِلْنَ الصَّفَّ وَيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لِإِحْدَاهُنَّ الْجِلْبَابُ؟ قَالَ: تُلْبِسُهَا أُخْتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا»[2].

واتە: لە ئوممو عەطییەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (پێغەمبەری خوا ﷺ)، بە باوكەوە بە قوربانی بم، فەرمانی پێكردین هەرچی كیژۆڵەی تازە پێگەیشتوو و كچە بیان هێنینە دەرەوە (بۆ نوێژی جەژن) لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قورباندا، هەرچی ئافرەتە حەیزدارەكانیش بوو ئەوان لە ڕیزەكان دوور دەكەوتنەوە و ئامادەی خێر و نزای مسوڵمانان دەبوون (واتە: لەو خێر و دووعا بەشداریان دەكرد جگە لە نوێژ).

## بابەت: هاندان لەسەر خێر و بەخشین لە ڕۆژی جەژندا

١٦٥٦ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: شَهِدْتُ الصَّلَاةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي يَوْمِ عِيدٍ، فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ قَامَ مُتَوَكِّئًا عَلَى بِلَالٍ، حَتَّى أَتَى النِّسَاءَ فَوَعَظَهُنَّ، وَذَكَّرَهُنَّ، وَأَمَرَهُنَّ بِتَقْوَى اللَّهِ. قَالَ: تَصَدَّقْنَ. فَذَكَرَ شَيْئًا مِنْ أَمْرِ جَهَنَّمَ، فَقَامَتِ امْرَأَةٌ مِنْ سَفِلَةِ النِّسَاءِ سَفْعَاءُ الْخَدَّيْنِ فَقَالَتْ: لِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لِأَنَّكُنَّ تُفْشِينَ الشَّكَاةَ وَاللَّعْنَ، وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ. فَجَعَلْنَ يَأْخُذْنَ مِنْ حُلِيِّهِنَّ وَأَقْرَاطِهِنَّ وَخَوَاتِيمِهِنَّ يَطْرَحْنَهُ فِي ثَوْبِ بِلَالٍ، يَتَصَدَّقْنَ بِهِ»[3].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئامادەی نوێژ بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی جەژندا، جا دەستی بە نوێژ كرد پێشی وتار، دواتر وەستا بە خۆ گرتن بە بیلالەوە، (واتە: پاڕێزكاری پاڵی بە بیلالەوە دابوو)، تاوەكو هات بۆ لای ئافرەتان و ئامۆژگاری كردن و فەرمانی پێ كردن فەرمووی: خێر و خێرات

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

بکەن، جا باسی هەندێک لە بابەتی دۆزەخی کرد (یەکێک لەو شتانەش ئەوەبوو فەرمووی ئافرەتان زۆرینەی خەڵکی ئاگرن)، جا ئافرەتێک لە ئافرەتە ئاساییەکان کە کوڵمەی ڕوومەتەکانی داهێزرابوون وتی: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: لەبەر ئەوەی ناڕەزایی و نەفرین زۆر دەکەن و بڵاوی دەکەنەوە، وە ئینکاری چاکەی مێرد دەکەن (زۆرێک لەوانەی کە مێردیان هەیە)، جا ئافرەتان لە زێڕ و زیو و گوارە و گوستیلەکانیان هێنا و خستیانە ناو کۆشی بیلال، بەخشیانن.

تێبینی: هەندێک لە خەڵکی نەزان و ناحاڵی لە ئیسلام دەڵێن: ئیسلام مافی ئافرەتانی پێشێل کردوەو وتویەتی ئافرەتان زۆرینەی خەڵکی دۆزەخن؟!!!

لێرەدا دەڵێین: ئیسلام نەیفەرمووە دەبێ زۆربەی ئافرەتان بچن بۆ دۆزەخ و سزایان بدەین، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دۆزەخی نیشاندرا بینی زۆرینەی ئافرەت بوو، بەهۆی کردەوەکانیان تووشی ببوون، بۆیە لەبەر پەرۆشی بۆ ئەوان هات و پێی ڕاگەیاندن و ئامۆژگاری کردن و داوای خێری لێ کردن تا لە دۆزەخ ڕزگاریان ببێت، وە ئاگاداریشی کردنەوە لەو کردەوانەی کە هۆکار بوون، تاوەکو چیتر بەردەوام نەبن لەسەر ئەو سیفەتانە.

دواتر ژمارەی ئافرەتان لە زۆربەی سەردەمەکان زیاترە لە ژمارەی پیاوان، بۆیە ئاساییە زۆرینەی خەڵکی دۆزەخ لەوان بن، بەڵام ئاسایی نیە کەمینەی خەڵکی بەهەشت لەوان بن، چونکە ئیسلام چاکەی ئەوانی دەوێ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دڵسۆزی بۆ ئەوان نواندووە و نایەوێت ئافرەتان بچن بۆ دۆزەخ، بۆیە لەو سیفەتانە ئاگاداری کردوونەتەوە، مەگەر لەوە چاکتر و باشتر هەیە پێش تاقی کردنەوە ئەو پرسیارانەت بۆ کەشف بکرێن کە تیایدا دەکەوی و دەرناچی و خۆت بۆ ئامادە نەکردووە؟!!!

جا هەر چەندە ئافرەتانی دونیا کەمینەی خەڵکی بەهەشتن، بەڵام ئافرەتان بە شێوەیەکی گشتی زۆرینەی خەڵکی بەهەشتن، چونکە بۆ هەر پیاوێک دوو حۆری هەیە جگە لە ئافرەتانی دونیا.

١٦٥٧ - «أَخْبَرَنَا أَبُو الْوَلِيدِ، حَدَّثَنَا شُعْبَةُ، عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَ هَذَا»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە وەک ئەم فەرموودەیە لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: کاتێ دوو جەژن (واتە هەینی و جەژن) لە ڕۆژێکدا کۆدەبنەوە

١٦٥٨ - «عَنْ إِيَاسِ بْنِ أَبِي رَمْلَةَ قَالَ: شَهِدْتُ مُعَاوِيَةَ يَسْأَلُ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُم: أَشَهِدْتَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ عِيدَيْنِ اجْتَمَعَا فِي يَوْمٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَكَيْفَ صَنَعَ؟ قَالَ: صَلَّى الْعِيدَ، ثُمَّ رَخَّصَ فِي الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: مَنْ شَاءَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَلْيُصَلِّ»[٢].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ حسن.

واتە: لە ئیاسی كوڕی ئەبو ڕەملەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لەلای موعاویە بووم پرسیاری لە زەیدی كوڕی ئەرقەم (رَضِيَ اللهُ عَنهُم)، كرد وتی: ئایا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی دوو جەژن بوویت (واتە: جەژن و هەینی) كە لە یەک ڕۆژدا كۆبووبێتەوە؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئەی چی كرد؟ وتی: نوێژی جەژنی كرد، دواتر مۆڵەتیدا دەربارەی هەینی و فەرمووی: هەر كەسێک ویستی نوێژی هەینی بكات با بیكات (واتە: ئەوەی نەشیەوێت بۆ هەینی بێتەوە ئارەزووی خۆیەتی و بۆی دروستە).

تێبینی: هەندێک لە زانایان فەرموویانە ئەو مۆڵەتە تەنها بۆ ئەو كەسە ڕەشماڵ نشینانە بووە، كە لە دوورەوەو لە دەرەوەی مەدینە هاتوون بۆ نوێژی جەژن، وەک لە فەرموودەی تر باس كراوە.

## بابەت: گەڕانەوە لە شوێنی نوێژی جەژن لە ڕێگایێكی جگە لەو ڕێگایەی پێیدا هاتوە

**١٦٥٩ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ إِلَى الْعِيدِ رَجَعَ فِي طَرِيقٍ آخَرَ»[١].**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەموو جار كاتێ دەردەچوو (لە ماڵ) بۆ نوێژی جەژن، لە ڕێگایێكی ترەوە دەگەڕایەوە ماڵەوە.

---

(١) ـ صحيح.

## بابەت: دەربارەی واجبیەتی زەكات

١٦٦٠ - «عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ قَالَ: إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ، فَادْعُهُمْ إِلَى أَنْ يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. فَإِنْ أَطَاعُوا لَكَ فِي ذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ فِي ذَلِكَ، فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ اللَّهَ فَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً فِي أَمْوَالِهِمْ تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ وَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لَكَ فِي ذَلِكَ، فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَإِيَّاكَ وَدَعْوَةَ الْمَظْلُومِ، فَإِنَّهُ لَيْسَ لَهَا مِنْ دُونِ اللَّهِ حِجَابٌ»[1].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ كاتێ موعازی نارد بۆ یەمەن فەرمووی: تۆ دەچی بۆ لای قەومێک كە ئەهلی كیتابن، بانگیان بكە بۆ ئەوەی شاهێدی بدەن كە هیچ خوداییێكی بە هەق نیە جگە لە الله، وە موحەممەدیش نێردراوی خودایە، جا ئەگەر گوێڕایەڵیان كردی لەوە (وە بوون بە مسوڵمان) ئەوە پێیان ڕابگەیەنە كە خوا پێنج نوێژی لەسەر واجب كردوون لە هەموو شەوو ڕۆژێكدا، جا ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵیان كردی لەوە، ئەوە پێیان ڕابگەیەنە كە خوا بەخشینێكی لەسەر واجب كردوون لە سەروەت و سامانەكانیاندا كە وەربگیرێت لە دەوڵەمەندو زەنگینەكانیان و دابەش بكرێت بەسەر هەژارەكانیان (كە پێی دەوترێت زەكات)، جا ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵت بوون لەوە، ئەوە خۆت بپارێزە لە شتە گرنگ و بە نرخ و زێدە باشەكانیان (ئەوانەیان لێ مەسەنە لە زەكاتدا)، وە خۆت بپارێزە لە نزاو دووعای ستەملێكراو، چونكە دووعاو نزای ستەملێكراو هیچ بەربەستێكی بۆ نیە بۆ گەیشتن بە خوا.

## بابەت: ئەو هەژارەی خێری پێ دەكرێت (كە خێری پێ دەچێت)

١٦٦١ - «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبا هُرَيْرَةَ ﷺ يُحَدِّثُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِي تَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ، وَالْكِسْرَةُ وَالْكِسْرَتَانِ، وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ، وَلَكِنِ الْمِسْكِينُ الَّذِي لَيْسَ لَهُ غِنًى يُغْنِيهِ، يَسْتَحْيِي أَنْ يَسْأَلَ النَّاسَ إِلْحَافًا أَوْ لاَ يَسْأَلُ النَّاسَ إِلْحَافًا»[2].

واتە: لە موحەممەدی كوڕی زیادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو هوڕەیڕە بوو ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕایەوە كە فەرموویەتی: ئەوە هەژاری (ڕاستەقینە) نیە كەسێک پاروێک و دوو پاروو، پارچە نانێک و دوو پارچە و، خورماییێک و دوو خورما بەشی دەكات و پێی ڕازیە، بەڵكو هەژاری (ڕاستەقینە) ئەو كەسەیە كە هیچ شتێكی نیە بەشی بكات، شەرم دەكات زۆر داوا لە خەڵكی بكات، یان داوای زۆر لە خەڵكی ناكات.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: ئەو کەسەی زەکاتی وشتر و مانگا و مەڕو بزن نەدات

١٦٦٢ - «عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ وَلاَ بَقَرٍ وَلاَ غَنَمٍ لاَ يُؤَدِّي حَقَّهَا، إِلاَ أُقْعِدَ لَهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِقَاعٍ قَرْقَرٍ تَطَؤُهُ ذَاتُ الظِّلْفِ بِظِلْفِهَا، وَتَنْطَحُهُ ذَاتُ الْقَرْنِ بِقَرْنِهَا، لَيْسَ فِيهَا يَوْمَئِذٍ جَمَّاءُ وَلاَ مَكْسُورَةُ الْقَرْنِ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا حَقُّهَا؟ قَالَ: إِطْرَاقُ فَحْلِهَا، وَإِعَارَةُ دَلْوِهَا، وَمِنْحَتُهَا، وَحَلَبُهَا عَلَى الْمَاءِ، وَحَمْلٌ عَلَيْهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[١].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر خاوەنێکی وشترو مانگاو مەڕو بزن هەقەکانیان نەدات، حەتمەن دادەنیشێنرێ و (دەخرێتە سەر چۆک) بۆ ئاژەڵەکە لە ڕۆژی دواییدا لە زەوییەکی ڕاست و ڕێکدا، ئاژەڵە خاوەن سمەکان وەک (مانگا و مەڕ و بزن) بە سمەکانیان دەیکوتن و بەسەری دەکەون، وە خاوەن قۆچەکانیش لێی دەدەن بە قۆچەکانیان، لەو ڕۆژەدا هیچ بێ قۆچێک و قۆچ شکاوێک نیە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەقەکانیان چیە؟ فەرمووی: پەڕین و بەردانی نێرەکانیان بۆ زاوزێ، وە پێدانی دۆلچەی ئاوەکەیان، وە بەخشینیان بە کەسێک تا سودمەند بێت و لە شیر و بەرهەمەکەیان و دواتر بیگەڕێنێتەوە، وە دۆشنیان لەسەر ئاو، وە بارکردنیان لە پێناوی خوا (وەک پێدان بە موجاهیدان، یان بە هەژارن تا سواری پشتیان ببن و کارەکانیان پێ ڕاپەڕێنن).

١٦٥٣ - «أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ لاَ يَفْعَلُ فِيهَا حَقَّهَا، إِلاَ جَاءَت يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَكْثَرُ مَا كَانَتْ قَطُّ، وَأُقْعِدَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ تَسْتَنُّ عَلَيْهِ بِقَوَائِمِهَا وَأَخْفَافِهَا، وَلاَ صَاحِبِ بَقَرٍ لاَ يَفْعَلُ فِيهَا حَقَّهَا، إِلاَ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَكْثَرُ مَا كَانَتْ قَطُّ، وَأُقْعِدَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ، تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِقَوَائِمِهَا، وَلاَ صَاحِبِ غَنَمٍ لاَ يَفْعَلُ فِيهَا حَقَّهَا، إِلاَ جَاءَت يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَكْثَرُ مَا كَانَتْ وَأُقْعِدَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ، تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِأَظْلاَفِهَا، لَيْسَ فِيهَا جَمَّاءُ وَلاَ مَكْسُورَةٌ قَرْنُهَا، وَلاَ صَاحِبِ كَنْزٍ لاَ يَفْعَلُ فِيهِ حَقَّهُ إِلاَ جَاءَ كَنْزُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ يَتْبَعُهُ فَاتِحًا فَاهُ، فَإِذَا أَتَاهُ، فَرَّ مِنْهُ، فَيُنَادِيهِ: خُذْ كَنْزَكَ الَّذِي خَبَأْتَهُ. قَالَ: فَأَنَا عَنْهُ غَنِيٌّ، فَإِذَا رَأَى أَنَّهُ لاَ بُدَّ مِنْهُ، سَلَكَ يَدَهُ فِي فَمِهِ فَيَقْضِمُهَا قَضْمَ الْفَحْلِ، قَالَ: قَالَ أَبُو الزُّبَيْرِ: سَمِعْتُ عُبَيْدَ بْنَ عُمَيْرٍ يَقُولُ هَذَا الْقَوْلَ، ثُمَّ سَأَلْنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ فَقَالَ مِثْلَ قَوْلِ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، قَالَ: وَقَالَ أَبُو الزُّبَيْرِ: سَمِعْتُ عُبَيْدَ بْنَ عُمَيْرٍ يَقُولُ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا حَقُّ الإِبِلِ؟ قَالَ: حَلَبُهَا عَلَى الْمَاءِ، وَإِعَارَةُ دَلْوِهَا، وَإِعَارَةُ فَحْلِهَا، وَمَنْحُهَا، وَحَمْلٌ عَلَيْهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[٢].

واتە: لە ئەبو زوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە، کە گوێی لە جابری کوڕی عەبدوڵلا بووە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) کە دەیووت: هەر خاوەنێکی وشتر هەقەکەی تێدا جێبەجێ نەکات حەتمەن لە ڕۆژی دوایی وشترەکان دێن کە زۆر قەڵەوتر و بەهێزترن لە پێشان و خاوەنەکەشیان دادەنیشێنرێت و (دەخرێتە سەر چۆک) بۆیان لە زەوییەکی ڕاست و ڕێکدا بەسەریدا دەڕۆن بە پێچک و سمەکانیان، وە هیچ خاوەن مانگایێک

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

نیە کە هەقی مانگاکان نەدات حەتمەن لە ڕۆژی دوایی مانگاکان دێن کە زۆر قەڵەوترو بەهێزترن لە پێشان و خاوەنەکەشیان دادەنیشێنرێت و (دەخرێتە سەر چۆک) بۆیان لە زەوییەکی ڕاست و ڕێکداو بە قۆچەکانیان لێی دەدەن و بە قاچەکانیشیان بەسەری دەکەون، وە هیچ خاوەن مەڕ و بزنێک نیە کە هەقی مەڕو بزنەکانی نەدات حەتمەن لە ڕۆژی دواییدا مەڕو بزنەکان دێن کە زۆر قەڵەوترو بەهێزترن لە پێشان و خاوەنەکەشیان دادەنیشێنرێت و (دەخرێتە سەر چۆک) بۆیان لە زەوییەکی ڕاست و ڕێکداو بە قۆچەکانیان لێی دەدەن و بە سمەکانیشیان بەسەری دەکەون، (لەو ڕۆژەدا ئاژەڵەکان) هیچ بێ قۆچێک و قۆچ شکاوێکیان تیا نیە، وە هیچ خاوەن پوڵ و قاسە و خەزنەیەک نیە هەقی تیا نەدات حەتمەن قاسە و خەزنەکەی لە ڕۆژی دواییدا دێت بە شێوەی ئەژدیهاییەکی کەچەڵ و دوای دەکەوێت و ڕاوی دەنێت، جا کاتێ بۆی دێت لەبەری ڕا دەکات و ئەژدیهاکەش بانگی دەکات و (دەڵێت): دە بگرە ئەو خەزنەی حەشارت دابوو، خاوەنەکەشی دەڵێت: من پێویستم پێی نیە (نامەوێت نامەوێت)، جا کاتێ دەزانێت (ئەژدیهاکە لە کۆڵی نابێتەوە) هیچ چارەی نیەو هەر دەبێ پێوەی بدات، دەستی دەخاتە ناو دەمی و دەیشکێنێت و دەیهاڕێت وەک هاڕینی ئاژەڵێکی نێرینەی بەهێز.

دەڵێ: ئەبو زوبەیر وتویەتی: گوێم لە عوبەیدی کوڕی عومەیڕ بوو ئەو قسەیەی دەکرد، دواتر پرسیارمان لە جابری کوڕی عەبدوڵلا کرد هەمان قسەی عوبەیدی کوڕی عومەیری کرد.

١٦٦٤ - «أَخْبَرَنَا الْحَسَنُ بْنُ الرَّبِيعِ، حَدَّثَنَا أَبُو الأَحْوَصِ، عَنْ الأَعْمَشِ، عَنْ الْمَعْرُورِ بْنِ سُوَيْدٍ، عَنْ أَبِي ذَرّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِبَعْضِ هَذَا الْحَدِيثِ»[1].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە بەشێک لەم فەرموودەیە لە ئەبو زەڕەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی زەکاتی مەڕ و بزن

١٦٦٥ - «عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَتَبَ الصَّدَقَةَ، وَكَانَ فِي الْغَنَمِ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ سَائِمَةً شَاةٌ إِلَى الْعِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ، فَفِيهَا شَاتَانِ إِلَى مِائَتَيْنِ، فَإِذَا زَادَتْ، فَفِيهَا ثَلاَثُ شِيَاهٍ إِلَى ثَلاَثِ مِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ شَاةٌ لَمْ يَجِبْ فِيهَا إِلاَّ ثَلاَثُ شِيَاهٍ حَتَّى تَبْلُغَ أَرْبَعَ مِائَةٍ، فَإِذَا بَلَغَتْ أَرْبَعَ مِائَةِ شَاةٍ، فَفِي كُلِّ مِائَةٍ شَاةٌ، وَلاَ تُؤْخَذُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ، وَلاَ ذَاتُ عَوَارٍ، وَلاَ ذَاتُ عَيْبٍ»[2].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ زەکاتی نوسیەوە (واتە: فەرمانی کرد بنوسرێتەوە، بەم شێوەیە): لە مەڕو بزندا لە هەموو چل مەڕ و بزنێک کە لەسەر گیا و لەوەڕی سروشتی لەوەڕا بێت و بە عەلەف نەژیابێت تا دەگاتە سەد و بیست دانە تەنها بزنێک یان مەڕێک دەبێتە زەکات (دەبێ بە ئەهلی زەکاتی ببەخشێت)، جا ئەگەر زیاتر بوو (لە سەدو بیست) تا دەگاتە دوو سەد ئەوە دوو مەڕ یان بزن دەبێتە زەکات، جا ئەگەر زیاتر بوو (لە دوو سەد) تا دەگاتە

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

سێ سەد ئەوە سێ مەڕ یان بزن دەبێتە زەكات، جا ئەگەر زیاتر بوو (لە سێ سەد) ئەوە هیچی تێدا واجب نابێت تەنها سێ مەڕ یان بزن نەبێت تا دەگات بە چوار سەد، جا كە گەیشت بە چوار سەد مەڕ و بزن ئەوە (لەمەولا) لە هەر سەد مەڕ و بزنێك یەك مەڕ یان بزن دەبێتە زەكات، وە لە زەكاتدا ئاژەڵی پیر و پەككەوتە و كوێر و عەیبدار وەرناگیرێت و قەبوڵ نیە.

١٦٦٦ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَتَبَ إِلَى أَهْلِ الْيَمَنِ مَعَ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، مِنْ مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ إِلَى شُرَحْبِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ، وَالْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ، وَنُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ فِي أَرْبَعِينَ شَاةً شَاةٌ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ وَاحِدَةً، فَفِيهَا شَاتَانِ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ مِائَتَيْنِ، فَإِذَا زَادَتْ وَاحِدَةً، فَفِيهَا ثَلَاثَةٌ إِلَى أَنْ تَبْلُغَ ثَلَاثَ مِائَةٍ، فَمَا زَادَ، فَفِي كُلِّ مِائَةِ شَاةٍ شَاةٌ»[١].

واتە: لە ئەبوبەكری كوڕی موحەممەدی كوڕی عەمڕی كوڕی حەزمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوك و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەڵكی یەمەنی نوسی (واتە: فەرمانی كرد بنوسرێت) و (نوسراوەكەی) لەگەڵ عەمڕی كوڕی حەزم نارد، (نوسراوەكە ئاوا بوو): بسم الله الرحمن الرحيم، لە موحەممەدی پێغەمبەری خواوە بۆ شورەحبیلی كوڕی عەبدی كولال و حاریثی كوڕی عەبدی كولال و نوعەیمی كوڕی عەبدی كولالەوە، لە چل مەڕ و بزندا یەك مەڕ یان بزن (دەبێتە زەكات) تا دەگاتە سەد و بیست، جا كاتێ زیاتر بوون لە سەد و بیست و یەك، ئەوە دوو مەڕ یان دوو بزن (دەبێتە زەكات) تا دەگاتە دوو سەد، جا كاتێ یەكێك زیاد بوو ئەوە سێ مەڕ یان بزن (دەبێتە زەكات) تاوەكو دەگات بە سێ سەد، جا ئەوەی زیاتر بوو (لەمەولا) ئەوە لە هەر سەد مەڕ و بزنێك دانەیەك (دەبێتە زەكات).

١٦٦٧ - «حَدَّثَنَا بِشْرُ بْنُ الْحَكَمِ، حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَنْبَأَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَتَبَ لَهُمْ كِتَاباً فَذَكَرَ نَحْوَهُ»[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: زەكاتی مانگا

١٦٦٨ - «قَالَ مُعَاذٌ ﷺ بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ فَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ بَقَرَةً مُسِنَّةً، وَمِنْ كُلِّ ثَلَاثِينَ تَبِيعًا أَوْ تَبِيعَةً»[٣].

واتە: موعاذ ﷺ وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ یەمەن و فەرمانی پێ كردم كە لە هەر چل مانگایێك مانگایێك وەربگرم كە پێی نابێتە سێ ساڵیەوە، وە لە هەر سی مانگایێك گۆلكێك یان مانگایێك وەربگرم كە تەمەنی نەگەیشتبێتە ساڵێك.

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

١٦٦٩ - «عَنْ مُعَاذٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ، فَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنَ الْبَقَرِ مِنْ ثَلَاثِينَ تَبِيعًا حَوْلِيًّا، وَمِنْ أَرْبَعِينَ بَقَرَةً مُسِنَّةً»[١].

واتە: لە موعاذەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ یەمەن و، فەرمانی پێ كردم كە لە هەر سی (٣٠)، مانگایێک گۆلكێک یان مێنگینێک وەربگرم كە تەمەنی نەگەیشتبێتە ساڵێک، وە لە هەر چل مانگایێک، مانگایێک وەربگرم كە پێی نابێتە سێ ساڵیەوە.

١٦٧٠ - «حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ يُونُسَ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ بِنَحْوِهِ»[٢].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: زەكاتی وشتر

١٦٧١ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَتَبَ الصَّدَقَةَ، فَلَمْ تُخْرَجْ إِلَى عُمَالِهِ حَتَّى قُبِضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَلَمَّا قُبِضَ أَخَذَهَا أَبُو بَكْرٍ فَعَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ، فَلَمَّا قُبِضَ أَبُو بَكْرٍ، أَخَذَهَا عُمَرُ فَعَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِمَا وَلَقَدْ قُتِلَ عُمَرُ، وَإِنَّهَا لَمَقْرُونَةٌ بِسَيْفِهِ، أَوْ بِوَصِيَّتِهِ وَكَانَ فِي صَدَقَةِ الْإِبِلِ فِي كُلِّ خَمْسٍ شَاةٌ إِلَى خَمْسٍ وَعِشْرِينَ، فَإِذَا بَلَغَتْ خَمْسًا وَعِشْرِينَ، فَفِيهَا بِنْتُ مَخَاضٍ إِلَى خَمْسٍ وَثَلَاثِينَ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ بِنْتُ مَخَاضٍ، فَابْنُ لَبُونٍ ذَكَرٌ، فَإِذَا زَادَتْ، فَفِيهَا بِنْتُ لَبُونٍ إِلَى خَمْسٍ وَأَرْبَعِينَ، فَإِذَا زَادَتْ، فَفِيهَا حِقَّةٌ إِلَى سِتِّينَ، فَإِذَا زَادَتْ، فَفِيهَا جَذَعَةٌ إِلَى خَمْسٍ وَسَبْعِينَ، فَإِذَا زَادَتْ، فَفِيهَا بِنْتَا لَبُونٍ إِلَى تِسْعِينَ، فَإِذَا زَادَتْ، فَفِيهَا حِقَّتَانِ إِلَى عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، فَإِذَا زَادَتْ، فَفِيهَا فِي كُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، وَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ»[٣].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ بابەتی زەكاتی نوسیەوە و دەرنەهێنرا بۆ فەرمانبەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ، تاوەكو (پێغەمبەری خوا ﷺ) ڕۆحی لێ وەرگیرایەوە و وەفاتی كرد، جا كاتێ وەفاتی كرد ئەبوبەكر هێنای و كاری پێ كرد لە دوای ئەو، جا كاتێ ئەبوبەكر وەفاتی كرد، عومەر هێنای و كاری پێكرد لە دوای هەردووكیان، جا عومەر شەهید كرا و پەڕاوەكەش بە شمشێرەكەیەوە بەسترابوو یان بە وەسیەتەكەیەوە، (نوسراوەكە بەو شێوەیە بوو): لە زەكاتی وشتردا: لە هەر پێنج وشترێكدا تاوەكو بیست و پێنج یەک مەڕ یان بزن (دەبێتە زەكات)، جا كە گەیشتە بیست و پێنج تاوەكو سی و پێنج ئەوە وشترێكی مێ دەدرێت كە پێی نابێتە ناو دوو ساڵیەوە (واتە: بِنْتُ مَخَاضٍ)، جا ئەگەر ئەم جۆرە وشترە نەبوو ئەوە با وشترێكی نێر بدرێت كە دوو ساڵی تەواو كردبێت و پێی نابێتە سێ ساڵیەوە (واتە: ابْنُ لَبُونٍ)، جا كاتێ لەوە زیاتر بوون تاوەكو دەگاتە چل و پێنج ئەوە وشترێكی مێ دەدرێت كە دوو ساڵی تەواو كردبێت و پێی نابێتە سێ ساڵیەوە (واتە: بِنْتُ لَبُونٍ)، جا كاتێ زیاتر بوو تاوەكو دەگاتە شەست ئەوە وشترێكی چوار ساڵی دەدرێت (واتە: حِقَّة)، جا كاتێ زیاتر بوو تاوەكو دەگاتە حەفتاو پێنج ئەوە وشترێكی پێنج ساڵی دەدرێت (واتە: جَذَعَة)، جا كاتێ زیاتر

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

بوو تاوەکو دەگاتە نەوەد ئەوە دوو (بِنْتُ لَبون) دەدرێت، جا کاتێ زیاتر بوون تاوەکو دەگاتە سەد و بیست ئەوە دوو (حِقَّة) دەدرێت، جا کاتێ لەوە زیاتر بوو ئەوە لە هەموو پەنجا دانەیەک (حِقَّة)یێک دەدرێت، وە لە هەموو چلێکیش (بِنْتُ لَبون)ێک دەدرێت.

تێبینی: (بِنْتُ مَخَاض) واتە: وشترێکی مێ کە پێی نابێتە ناو دوو ساڵیەوە، وە (فَابْنُ لَبون) واتە: وشترێکی نێر کە دوو ساڵی تەواو کردبێت و پێی نابێتە سێ ساڵیەوە، وە (بِنْتُ لَبون) واتە: وشترێکی مێ کە دوو ساڵی تەواو کردبێت و پێی نابێتە سێ ساڵیەوە، وە (حِقَّة) واتە: وشترێکی چوار ساڵی، وە (جَذَعَة) واتە: وشترێکی پێنج ساڵی.

١٦٧٢ - «حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ الْفَزَارِيِّ، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ حُسَيْنٍ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ، عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ»[1].

واتە: واتە لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی زەکاتی زیو

١٦٧٣ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَتَبَ مَعَ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ إِلَى شُرَحْبِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ، وَالْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ، وَنُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ: إِنَّ فِي كُلِّ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الْوَرِقِ خَمْسَةَ دَرَاهِمَ، فَمَا زَادَ، فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا دِرْهَمٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ شَيْءٌ»[2].

واتە: لە ئەبوبەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (نامەیەکی) نوسی و لەگەڵ عەمری کوڕی حەزم (ناردی) بۆ شوڕەحبیلی کوڕی عەبدی کولال و حاریثی کوڕی عەبدی کولال و نوعەیمی کوڕی عەبدی کولال (لە نامەکە نوسرابوو): لە هەموو پێنج ئۆقیەیەک (واتە: لە ٢٠٠ مسقال زیو) پێنج درهەم (دەبێتە زەکات) جا ئەوەی زیاتر بێت، ئەوە لە هەموو چل درهەمێک یەک درهەم (دەبێتە زەکات)، وە لە کەمتر لە پێنج ئۆقیە (واتە لە کەمتر لە ٢٠٠ مسقال زیو) کەمتر هیچی تیا نیە (زەکاتی تیا نادرێت).

١٦٧٤ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: عَفَوْتُ عَنْ صَدَقَةِ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ هَاتُوا صَدَقَةَ الرِّقَةِ مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا دِرْهَمٌ، وَلَيْسَ فِي تِسْعِينَ وَمِائَةٍ شَيْءٌ حَتَّى تَبْلُغَ مِائَتَيْنِ»[3].

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە زەکاتی ئەسپ و بەندە لێتان خۆش بووم (زەکاتتان لەسەر نیە)، زەکاتی درهەمی زیو بدەن و بێنن، لە هەموو چل درهەمێک یەک درهەم، وە لە سەد و نەوەد درهەمی زیو هیچ زەکاتێکی تیا نیە تاوەکو دەگاتە ٢٠٠ درهەمی زیو.

---

(١) ـ إسناده ضعيف، والحديث صحيح لغيره.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: نەهی کردن لە جیاکردنەوەی شتی یەک پارچە و کۆکردنەوە لە نێوان شتی جیاواز

١٦٧٥ - «عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ، قَالَ: أَتَانَا مُصَدِّقُ النَّبِيِّ ﷺ فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ فَقَرَأْتُ فِي عَهْدِهِ: أَنْ لاَ يُجْمَعَ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ، وَلاَ يُفَرَّقَ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ خَشْيَةَ الصَّدَقَةِ»[١].

واتە: لە سوەیدی کوڕی غەفەلەتەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: فەرمانبەر و زەکات وەرگری پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان، منیش دەستم گرت و لە عەهدی ئەو خوێندمەوە (نوسرابوو): شتی جیا کۆناکرێتەوە و شتی یەک پارچەش بەش بەش ناکرێت، لە ترسی زەکات.

تێبینی: ئەم فەرموودەیە مەبەستی ئەوەیە حیلەو فێڵ لە شەرع نەکرێت (کە لە هەقیقەت فێڵ لە خۆی دەکات)، بۆ نمونە هەندێ کەس هەن ئاژەڵەکانیان یەک دەخەن تاوەکو زەکاتی کەمتریان لێ بکەوێت، یان کاتێک لە کاتەکان پێش ئەوەی ساڵی بەسەردا بسوڕێتەوە ژمارەی ئاژەڵەکان کەم دەکاتەوە تاوەکو نەیدات بە زەکات.

## بابەت: نەهی کردن لە وەرگرتنی زەکات لە شتە هەرە چاکەکانی خەڵکی

١٦٧٦ - «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ قَالَ: إِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عەبباسەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ موعاذی نارد بۆ یەمەن فەرمووی: خۆت بپارێزە لە ماڵ و سامانە هەرە باشەکانیان.

## بابەت: ئەوەی زەکاتی تیا نیە لە ئاژەڵ

١٦٧٧ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَيْسَ عَلَى فَرَسِ الْمُسْلِمِ، وَلاَ عَلَى غُلاَمِهِ صَدَقَةٌ»[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ئەسپی مرۆڤی مسوڵمان و خزمەتکارەکەی زەکاتی لەسەر نیە.

## بابەت: ئەوەی زەکاتی تیا نیە لە دانەوێڵە و زێڕ و زیو

١٦٧٨ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلاَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذُودٍ صَدَقَةٌ»[٤].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ صحيح.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە کە وتویەتی: لە کەمتر لە پێنج بار (واتە: لە کەمتر لە چل تەنەکە دانەوێڵە) زەکات نیە، وە لە کەمتر لە پێنج ئۆقیە (واتە: لە کەمتر لە ٢٠٠ مسقاڵ زیو) زەکات نیە، وە لە کەمتر لە پێنج ذود (واتە: لە کەمتر لە بیست و پێنج) وشتر، زەکات نیە.

١٦٧٩ - «عَنْ أَبِي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ مِنْ حَبٍّ وَلاَ تَمْرٍ، وَلاَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلاَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ»[(١)].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێردراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە کە وتویەتی: لە کەمتر لە پێنج بار (واتە: لە کەمتر لە چل تەنەکە) لە دانەوێڵە و خورما زەکات نیە، وە لە کەمتر لە پێنج ئۆقیە (واتە: لە کەمتر لە ٢٠٠ مسقاڵ زیو) زەکات نیە، وە لە کەمتر لە پێنج ذود (واتە: لە کەمتر لە بیست و پێنج) وشتر، زەکات نیە.

١٦٨٠ - «عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَتَبَ مَعَ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ إِلَى شُرَحْبِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلاَلٍ، وَالْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ كُلاَلٍ، وَنُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ كُلاَلٍ إِنَّ فِي كُلِّ خَمْسِ أَوَاقٍ مِنَ الْوَرِقِ خَمْسَةَ دَرَاهِمَ، فَمَا زَادَ، فَفِي كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا دِرْهَمٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ شَيْءٌ»[(٢)].

واتە: لە ئەبوبەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمڕی کوڕی حەزمەوە گێردراوەتەوە، ئەویش لە باوک و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (نامەیەکی) نوسی و لەگەڵ عەمڕی کوڕی حەزم (ناردی) بۆ شورەحبیلی کوڕی عەبدی کولال و حاریثی کوڕی عەبدی کولال و نوعەیمی کوڕی عەبدی کولال (لە نامەکە نوسرابوو): لە هەموو پێنج ئۆقیەیەک (واتە: لە ٢٠٠ مسقال) لە زیو پێنج درهەم (دەبێتە زەکات) جا ئەوەی زیاتر دەبێت ئەوە لە هەموو چل درهەمێک یەک درهەم (دەبێتە زەکات)، وە لە کەمتر لە پێنج ئۆقیە (واتە: لە ٢٠٠ مسقال زیو) کەمتر هیچی تیا نیە (زەکاتی تیا نادرێت).

## بابەت: دەربارەی پێش خستنی کاتی زەکاتدان

١٦٨١ - «عَنْ عَلِيٍّ ﷺ أَنَّ الْعَبَّاسَ ﷺ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ تَعْجِيلِ صَدَقَتِهِ قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ، فَرَخَّصَ لَه فِي ذَلِكَ، قَالَ أَبُو مُحَمَّد: آخُذُ بِهِ، وَلاَ أَرَى فِي تَعْجِيلِ الزَّكَاةِ بَأْسًا»[(٣)].

واتە: لە عەلیەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە عەبباس ﷺ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی پێش خستنی زەکاتەکەی پێش ئەوەی کاتی واجببوونی بێت، پێغەمبەری خواش ﷺ مۆڵەتیدا لەوەدا.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: ئەوە وەردەگرم و پێم وانیە پێش خستنی زەکات هیچ کێشەیەکی هەبێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده ضعيف.

(٣) ـ حسن.

## بابەت: ئەوەی واجبە ببەخشرێت لە سەروەت و ساماندا جگە لە زەكات

١٦٨٢ - «عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ حَقًّا سِوَى الزَّكَاةِ»[١].

واتە: لە فاتیمەی كچی قەیسەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بە دڵنیایی لە سەروەت و سامانەكانتاندا واجبی تر هەیە جگە لە زەكات (واتە: خێر و چاكە كردنیش مافێكە هی هەژارانە لەسەرتان).

## بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی خێر بە دەوڵەمەندێک دەكات

١٦٨٣- «حَدَّثَنَا أَبُو الْجُوَيْرِيَةِ الْجَرْمِيُّ، أَنَّ مَعْنَ بْنَ يَزِيدَ ﷺ، حَدَّثَهُ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ أَنَا، وَأَبِي، وَجَدِّي، وَخَطَبَ عَلَيَّ فَأَنْكَحَنِي وَخَاصَمْتُ إِلَيْهِ. وكَانَ أَبِي يَزِيدُ أَخْرَجَ دَنَانِيرَ يَتَصَدَّقُ بِهَا فَوَضَعَهَا عِنْدَ رَجُلٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَجِئْتُ فَأَخَذْتُهَا، فَأَتَيْتُهُ بِهَا، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا إِيَّاكَ أَرَدْتُ بِهَا، فَخَاصَمْتُهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: لَكَ مَا نَوَيْتَ يَا يَزِيدُ، وَلَكَ يَا مَعْنُ مَا أَخَذْتَ»[٢].

واتە: لە ئەبو جوەیریەی جەرمیەوە گێڕدراوەتەوە كە مەعنی كوڕی یەزید ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: من بەیعەت و پەیمانم بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا لەگەڵ باوكم و باپیرم، وە پێغەمبەری خوا ئافرەتێكی بۆ داخوازی كردم و لێی مارە كردم و كێشەی خۆشم برد بۆ لای، (كێشەكەش ئەوەبوو): باوكم یەزید چەند دینارێكی زێری دەرهێنا تا بیكات بە خێرو صەدەقەو لەلای پیاوێكی دانا لە مزگەوت، منیش هاتم و هەڵمگرت و بردم و، بە پارەو دینارەكانەوە چووم بۆ لای باوكم، (جا كە باوكم بینی من دینارەكانم هەڵگرتووە) وتی: سوێند بە خوا مەبەستم تۆ نەبوو بەو دینارانە، جا منیش كێشەكەم لەگەڵی بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: ئەوەت بۆ هەیە كە نیەتت بووە ئەی یەزید، وە ئەوەش بۆ تۆیە كە بردوتە و هەڵتگرتووە ئەی مەعن.

## بابەت: دەربارەی ئەو كەسەی زەكاتی بۆ حەڵاڵە و پێی دەچێت

١٦٨٤ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لاَ تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ، وَلاَ لِذِي مِرَّةٍ سَوِيٍّ»[٣].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عومرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زەكات حەڵاڵ نیە بۆ كەسی دەوڵەمەند و زەنگین، هەروەها (حەڵاڵ نیە) بۆ كەسی بەهێز و بە تاقەت و ساغ.

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

١٦٨٥ - «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ سَأَلَ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَفِي وَجْهِهِ خُمُوشٌ أَوْ كُدُوحٌ أَوْ خُدُوشٌ. قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا الْغِنَى؟ قَالَ: خَمْسُونَ دِرْهَمًا، أَوْ قِيمَتُهَا مِنَ الذَّهَبِ»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵا ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بە دەوڵەمەندیەوە (بێ ئەوەی موحتاج بێت) داوا بکات، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا دێت لە کاتێکدا لە ڕوخساریدا شوێنەواری برین و داماڵین و ڕنۆک هەیە، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەوڵەمەند و زەنگینی چیە؟ فەرمووی: پەنجا درهەمە یان قیمەتی پەنجا دەرهەم لە زێڕ.

١٦٨٦ - «أَخْبَرَنَا أَبُو عَاصِمٍ، وَمُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ حَكِيمِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِنَحْوِهِ»[2].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: زەکات بۆ پێغەمبەر ﷺ و خانەوادەکەی حەڵاڵ نیە

١٦٨٧ - «أَخْبَرَنِي مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أبا هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: أَخَذَ الْحَسَنُ تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ، فَجَعَلَهَا فِي فِيهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: كِخْ كِخْ أَلْقِهَا، أَمَا شَعَرْتَ أَنَّا لاَ نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ؟»[3].

واتە: لە موحەممەدی کوڕی زیادەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە ئەبو هوڕەیرە ﷺ بوو وتی: حەسەنی (نەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ)، دەنکە خۆرمایێک لە خورمای زەکاتی هەڵگرت و خستیە دەمیەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کخ کخ فڕێی بدە، ئایا نازانی ئێمە زەکات ناخۆین و (بۆمان حەڵاڵ نیە)؟

١٦٨٨ - «عَنْ أَبِي لَيْلَى ﷺ قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ وَعِنْدَهُ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَأَخَذَ تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ فَانْتَزَعَهَا مِنْهُ، وَقَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّهُ لاَ تَحِلُّ لَنَا الصَّدَقَةُ»[4].

واتە: لە ئەبو لەیلاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە وتویەتی: لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، هەروەها حەسەنی کوڕی عەلیشی (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) لەلا بوو، حەسەنیش دەنکە خورمایێک لە خورمای زەکاتی هەڵگرت، (پێغەمبەری خواش ﷺ) لێی سەند و فەرمووی: ئایا نەتزانیوە کە ئێمە زەکاتمان بۆ حەڵاڵ نیە.

## بابەت: (لۆمە کردنی) توند لە کەسێک کە داوا دەکات لە کاتێکدا زەنگینەو هەیەتی

١٦٨٩ - «عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لاَ تُلْحِفُوا بِي فِي الْمَسْأَلَةِ فَوَاللَّهِ لاَ يَسْأَلُنِي أَحَدٌ شَيْئًا فَأُعْطِيَهُ وَأَنَا كَارِهٌ، فَيُبَارَكَ لَهُ فِيهِ»[5].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ إسناده حسن.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده صحيح.

(٥) ـ صحيح.

واتە: لە موعاویەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زۆر پێ دامەگرن بەرامبەرم لە داواکردندا، سوێند بە خوا هیچ کەسێک نیە داوای شتێکم لێ بکات و پێی ببەخشم لە کاتێکدا پێم ناخۆش بێت، بەرەکەتیشی بۆ بکەوێتە شتەکە (واتە: بەرەکەتی تێ ناکەوێت).

١٦٩٠ - «عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ سَأَلَ النَّاسَ مَسْأَلَةً وَهُوَ عَنْهَا غَنِيٌّ كَانَتْ شَيْنًا فِي وَجْهِهِ»[1].

واتە: لە ثەوبانی ﷺ خزمەتکاری پێغەمبەری خواوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک داوای (شتێک) لە خەڵکی بکات لە کاتێکدا پێویستی پێ نەبێت، ئەوە دەبێتە شتێک (واتە: دەبێتە پەڵە و برینێک) لە ڕوخساری (لە ڕۆژی دواییدا).

## بابەت: دەربارەی دوورکەوتنەوە لە داوا کردن (دەربارەی داوا نەکردن)

١٦٩١ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ أَنَّ نَاسًا مِنَ الْأَنْصَارِ سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوا فَأَعْطَاهُمْ، حَتَّى إِذَا نَفِدَ ما عِنْدَهُ فَقَالَ: مَا يَكُونُ عِنْدِي مِنْ خَيْرٍ، فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ، وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللهُ، وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عَطَاءً هُوَ خَيْرٌ وَأَوْسَعُ مِنَ الصَّبْرِ»[2].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: خەڵکانێک لە ئەنصاریەکان داوای بەخشینیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش پێی بەخشین، دواتر داوایان لێ کردەوە، ئەویش پێی بەخشین، تاوەکو ئەوەی لەلای بوو نەما و کۆتایی هات و فەرمووی: ئەوەی لە ماڵ و سامانم لەلا بێت ئەوە لێتانی ناشارمەوە (پێتان دەبەخشم)، هەر کەسێکیش خۆی پاک بگرێت لە داوا کردن ئەوە خوا بە پاکی دەهێڵێتەوە و (یارمەتی دەدات بێ داوا کردن)، وە هەر کەسێکیش خۆی بێ نیاز بکات ئەوە خوا بێ نیازی دەکات و (دەوڵەمەندی دەکات)، وە هەر کەسێکیش تەحەممول و ئارامگری پەیا بکات (لەکاتی هەژاری و ناخۆشی و نەخۆشیدا) ئەوە خوا ئارامگری پێ دەبەخشێت، وە هیچ کەسێک بەخشینێکی پێ نەبەخشراوە چاکتر و فراوانتر بێت لە صەبر و ئارامگری.

## بابەت: نەهی کردن لە ڕەت کردنەوەو وەرنەگرتنی دیاری

١٦٩٢ - «عَنْ سَالِمٍ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعْطِينِي الْعَطَاءَ فَأَقُولُ: أَعْطِهِ مَنْ هُوَ أَفْقَرُ إِلَيْهِ مِنِّي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خُذْهُ، وَمَا آتَاكَ اللهُ مِنْ هَذَا الْمالَ وَأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ وَلاَ سَائِلٍ، فَخُذْهُ، وَمَا لاَ، فَلاَ تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ»[3].

---

(١) ـ إسناده صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ إسناده ضعيف.

واتە: لە سالمەوە ﷺ گێردراوەتەوە، وتویەتی: عبد الله وتویەتی: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بوو دەیووت: جاری وا هەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی پێ دەبەخشیم، منیش دەمووت: بیدە بە کەسێک کە زیاتر پێویستی بێت لە من، پێغەمبەری خواش ﷺ دەیفەرموو: وەریبگرە، (بزانە) ئەوەی خوا پێت دەبەخشێت لەو سەروەت و سامانە (بە دیاری) لە کاتێکدا تۆ خۆت بۆ دەرنەخستووە و خۆت کاندید نەکردوە و داوات نەکردوە، ئەوە وەریبگرە، وە ئەوەی (خوا) پێت نابەخشێت ئەوە دڵت لای نەبێت و چاوت لێی نەبێت.

١٦٩٣ - «أَخْبَرَنَا الْحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ، عَنْ شُعَيْبِ بْنِ أَبِي حَمْزَةَ، عَنْ الزُّهْرِيِّ، حَدَّثَنِي السَّائِبُ بْنُ يَزِيدَ، أَنَّ حُوَيْطِبَ بْنَ عَبْدِ الْعُزَّى، أَخْبَرَهُ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ السَّعْدِيِّ، أَخْبَرَهُ، عَنْ عُمَرَ ﷺ، بِنَحْوِهِ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە لە عومەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە.

١٦٩٤ - «عَنْ ابْنِ السَّعْدِيِّ قَالَ: اسْتَعْمَلَنِي عُمَرُ ﷺ فَذَكَرَ نَحْوًا مِنْهُ»[٢].

واتە: لە ئیبنو سەعدیەوە گێردراوەتەوە، وتویەتی: عومەر ﷺ کردمی بە فەرمانبەر، وە هەمان شتی عومەری گێڕایەوە (کە لە فەرموودەی پێشوو باس کرا).

## بابەت: نەهی کردن لە داوا کردن

١٦٩٥ - «أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَقَالَ: يَا حَكِيمُ، إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرٌ حُلْوٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِسَخَاوَةِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ»[٣].

واتە: حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ وتویەتی: داوای بەخشینم لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش پێی بەخشیم، دواتر داوام لێ کرد، پێی بەخشیم، دواتر داوام لێ کرد، پێی بەخشیم، دواتر داوام لێ کرد، فەرمووی: ئەی حەکیم ئەو ماڵ و سەروەت و سامانە تەڕ و سەوز و شیرینە (واتە: وەک میوە وایە، نەفس حەزی لێ دەکات)، جا هەر کەسێک بە سەخاوەتی دڵ وەری بگرێت ئەوە بەرەکەتی بۆ تیا دەخرێت، وە هەر کەسێکیش وەری بگرێت بە خۆ هەڵکوتان و تەماح و چاولێبوون، ئەوە بەرەکەتی بۆ تێناخرێت و وەک ئەو کەسە وایە کە هەر خۆراک دەخوات و تێر نابێت.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

## بابەت: كەی بەخشین بۆ مرۆڤ سوننەتە؟

**١٦٩٦** - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا تُصُدِّقَ بِهِ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَلْيَبْدَأْ أَحَدُكُمْ بِمَنْ يَعُولُ»(١).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: چاكترین و خێرترین بەخشین ئەوەیە ببەخشرێت بە هەبوونی و دەوڵەمەندییەكی ئاشكرا، وە با هەر یەک لە ئێوە لە خانەوادە و ئەو كەسانە دەست پێ بكات كە بژێویان لەسەریەتی (واتە: با سەرەتا پێویستی ئەو كەسانە جێبەجێ بكات كە نەفەقەیان لەسەر كابرا واجبە، ئنجا بە خەڵكی تر ببەخشێت).

## بابەت: دەربارەی ئەو دەستەی دەبەخشێت

**١٦٩٧** - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، قَالَ: وَالْيَدُ الْعُلْيَا يَدُ الْمُعْطِي، وَالْيَدُ السُّفْلَى يَدُ السَّائِلِ»(٢).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: دەستی بەرز زۆر چاكترە لە دەستی نزم، فەرمووی: دەستی بەرز دەستی كەسی بەخشەرە (ئەوەی دەبەخشێت)، وە دەستی نزم دەستی داواكارە (ئەو كەسەی بۆ پارە و پوول دەست پان دەكاتەوە).

**١٦٩٨** - «عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: خَيْرُ الصَّدَقَةِ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ»(٣).

واتە: لە حەكیمی كوڕی حیزامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاكترین و خێرترین بەخشین ئەوەیە ببەخشرێت بە هەبوونی و دەوڵەمەندییەكی ئاشكرا، وە دەستی بەرز (دەستی بەخشەر) زۆر چاكترە لە دەستی نزم (دەستی داواكار)، وە دەست پێ بكە (لە بەخشیندا) بەو كەسانەی خانەوادە و خزمتن و بژێویان لەسەرتە.

## بابەت: كام بەخشین چاكترین و خێرترینە؟

**١٦٩٩** - «عَنْ زَيْنَبَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، امْرَأَةِ عَبْدِ اللهِ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ وَلَوْ مِنْ حُلِيِّكُنَّ، وَكَانَ عَبْدُ اللهِ خَفِيفَ ذَاتِ الْيَدِ، فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ أَسْأَلُهُ، فَوَافَقَتْ زَيْنَبَ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ تَسْأَلُ عَمَّا أَسْأَلُ عَنْهُ، فَقُلْتُ لِبِلاَلٍ: سَلْ لِي رَسُولَ اللهِ ﷺ أَيْنَ أَضَعُ

---

(١) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

صَدَقَتِي؟ عَلَى عَبْدِ اللهِ، أَوْ فِي قَرَابَتِي؟ فَسَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: أَيُّ الزَّيَانِبِ؟ فَقَالَ: امْرَأَةُ عَبْدِ اللهِ، فَقَالَ: « لَهَا أَجْرَانِ: أَجْرُ الْقَرَابَةِ، وَأَجْرُ الصَّدَقَةِ»[١].

واتە: لە زەینەبی (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) خێزانی عەبدوڵڵاوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی كۆمەڵەی ئافرەتان ببەخشن (بەخشەربن) هەر چەندە بەو زێڕ و زیو و ئەو شتانەش بێت كە خۆتانی پێ دەڕازێننەوە (وەک: بازنە و گوارە و ملوانكەو گوستیلەو خرخاڵ و ...هتد).

زەینەب دەڵێت: جا عەبدوڵڵای مێردم دەست كورت و هەژار بوو، منیش چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ تا پرسیاری لێ بكەم (كە ئاخۆ ئەو مەسرەفەی من لە عەبدوڵڵای مێردم و مناڵەكانمی دەكەم بەبەر خێر و صەدەقە و بەخشین دەكەوێت)، جا (لەوێ) گەیشتم بە زەینەب كە ئافرەتێک بوو لە ئەنصاریەكان، پرسیاری دەكرد دەربارەی ئەوەی من پرسیاری تێدا دەكەم، منیش بە بیلالم وت: پرسیارم بۆ لە پێغەمبەری خوا ﷺ بكە كە ئاخۆ خێر و صەدەقە لە چیدا بكەم؟ خێر بە عەبدوڵڵا بكەم؟ یان بە خزمەكانم؟ ئەویش پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: كام زەینەب؟ بیلال وتی: زەینەبی عەبدوڵڵا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دوو پاداشتی بۆ هەیە: پاداشتی خزمایەتی و پاداشتی صەدەقە و بەخشین (واتە: بەڵێ خێر بە عەبدوڵڵا بكە، چونكە خزمە و خێرەكە دوو قاتە، خزمایەتیەكەشی نزیكترینە).

١٧٠٠ - «عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَكْثَرَ أَنْصَارِيٍّ بِالْمَدِينَةِ مالَ نَخْلاً، وَكَانَتْ أَحَبَّ أَمْوَالِهِ إِلَيْهِ بَيْرُحَاءُ، وَكَانَتْ مُسْتَقْبِلَةَ الْمَسْجِدِ، وَكَانَ يَدْخُلُهَا وَيَشْرَبُ مِنْ مَائِهَا طَيِّبٌ، فَقَالَ أَنَسٌ: فَلَمَّا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾﴾ آل عمران، قَالَ: إِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالِي إِلَيَّ بَيْرُحَاءُ، وَإِنَّهَا صَدَقَةٌ لِلَّهِ أَرْجُو بِرَّهَا، وَذُخْرَهَا عِنْدَ اللهِ، فَضَعْهَا يَا رَسُولَ اللهِ حَيْثُ شِئْتَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: بَخٍ ذَلِكَ مالَ رَابِحٌ أَوْ رَائِحٌ، وَقَدْ سَمِعْتُ مَا قُلْتَ فِيهِ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَجْعَلَهُ فِي الْأَقْرَبِينَ. فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ: أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَسَّمَهُ أَبُو طَلْحَةَ فِي قَرَابَةِ بَنِي عَمِّهِ»[٢]

واتە: لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئەبو تەڵحە لە مەدینەدا لە هەموو ئەنصاریەكان سەروەتی خورمای زیاتر بوو، وە خۆشەویست ترینیماڵەكەی لەلای ئەو (باغێک بوو بە ناوی) بەیرِوحا، لە بەرامبەر مزگەوت بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جار دەچووە ناویەوە و لە ئاوە خۆشەكەی ناوی دەخواردەوە، ئەنەس دەڵێ: جا كاتێ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾﴾، واتە: ناگەن بە پلەی چاكی و چاكەكاری تەواو (وە پاداشت و جەزای ڕاستەقینە و هەرە چاكتان دەست ناكەوێت) هەتا لەو شتەی كە خۆشتان دەوێت نەیبەخشن، هەر شتێكیش ببەخشن ئەوە خوا ئاگادار و زانایە پێی.

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

ئەبو تەڵحە وتی: خۆشەویست ترین موڵک و ماڵی من لای من بەیروحائە، جا ئەوە بوو بە صەدەقە و کردم بە خێر ئومێدەواری چاکترین پاداشت و زادی صەدەقەم لەلای خوا، کەواتە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنی دەتەوێت و پێت باشە بەکاری بهێنە (من کردم بە صەدەقە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەک پیرۆزت بێت، ئەوە ماڵیکی بە قازانجە (بۆ دوارۆژت) وە دەڕوات و نامێنێت (بۆ دونیات)، وە گوێم لێ بووە ئەوەی دەربارەی وتوتە (کە وتبووی خۆشەویست ترین ماڵە لەلام)، وە من پێم باشە بیدەی بە خزمان، ئەبو تەڵحەش وتی: وادەکەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا ئەبو تەڵحە باغەکەی دابەش کرد لە نێوان خزمەکانی، مناڵەکانی مامی.

١٧٠١ـ [١].

## بابەت: هاندان لەسەر بەخشین

١٧٠٢ - «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: مَا خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ إلاَّ أَمَرَنَا فِيهَا بِالصَّدَقَةِ، وَنَهَانَا عَنِ الْمُثْلَةِ»[٢].

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ نەدەداین حەتمەن فەرمانی پێ دەکردین بە بەخشین و نەهی لێ دەکردین لە هەتک کردن (هەتک کردنی جەستەی کافران لە شەڕدا، جا پێشی مردن بێ یان دوای مردن).

تێبینی: هەتک کردن: بریتیە لەوەی گوێ و، یان لوت، یان لێو، یان دەست و، قاچ و هەر ئەندامێک لێ بکرێتەوە و بشێوێنرێت، ئەو کارە لە ئیسلامدا حەڕامە.

١٧٠٣ - «عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ»[٣].

واتە: لە عەدی کوڕی حاتەمەوە ﷺ، گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: خۆتان لە ئاگر دوور بگرن و بپارێزن ئەگەرچی بە (بەخشینی) لەتە خورماییکیش بێت، جا ئەگەر دەستتان نەکەوت، ئەوە بە قسە و گوفتارێکی چاک و باش و خۆش (صەدەقەکە بکەن و خۆتان لە ئاگر بپارێزن).

## بابەت: نەهی کردن لە بەخشینی گشت ئەو سەروەتەی مرۆڤ هەیەتی

١٧٠٤ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لُبَابَةَ، أَنَّ أبا لُبَابَةَ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ لَمَّا رَضِيَ عَنْهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَهْجُرَ دَارَ قَوْمِي، وَأُسَاكِنَكَ، وَأَنْخَلِعَ مِنْ مالِي صَدَقَةً لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يُجْزِي عَنْكَ الثُّلُثُ»[٤].

---

(١) ـ وقع سقط في الترقيم.

(٢) ـ حسن.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده ضعيف، لكن الحديث صحيح.

واتە: لە عەبدورڕەحمانی کوڕی ئەبو لوبابەوە گێڕدراوەتەوە کە ئەبو لوبابە بۆی گێڕاوەتەوە کە کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لێی ڕازی بوو (دوای ئەوەی تەوبەی لە هەڵەیەکی گەورە کرد کە بەرامبەر ئیسلام کردبووی) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بەشێک لە تەوبەکەم ئەوەیە هیجرەت بکەم و بڕۆم لە ناو قەومەکەم و وە لەلای تۆ نیشتەجێ دەبم، وە خۆم لە هەموو ماڵ و سامانەکەم دادەڕنم و دەیکەم بە صەدەقە و خێر لە پێناوی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: سێیەکی بەخشین و صەدەقەکەت بۆ دروستە (واتە: نابێ گشتی ببەخشیت، دەبێ دوو بەش بۆ ماڵ و منالت بمێنێت و بەشێکیش بۆ خێر و صەدەقە).

١٧٠٥ - «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ بِمِثْلِ الْبَيْضَةِ مِنْ ذَهَبٍ أَصَابَهَا فِي بَعْضِ الْمَغَازِي - قَالَ أَحْمَدُ فِي بَعْضِ الْمَعَادِنِ وَهُوَ الصَّوَابُ - فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ خُذْهَا مِنِّي صَدَقَةً، فَوَاللهِ مَا لِي مالَ غَيْرَهَا، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ جَاءَهُ عَنْ رُكْنِهِ الأَيْسَرِ، فَقَالَ: مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ جَاءَهُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ، فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ قَالَ: هَاتِهَا مُغْضَبًا، فَحَذَفَهُ بِهَا حَذْفَةً لَوْ أَصَابَهُ لأَوْجَعَهُ - أَوْ عَقَرَهُ - ثُمَّ قَالَ: يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ إِلَى مالِهِ لاَ يَمْلِكُ غَيْرَهُ فَيَتَصَدَّقُ بِهِ، ثُمَّ يَقْعُدُ يَتَكَفَّفُ النَّاسَ، إِنَّمَا الصَّدَقَةُ عَنْ ظَهْرِ غِنًى، خُذِ الَّذِي لَكَ لاَ حَاجَةَ لَنَا بِهِ. فَأَخَذَ الرَّجُلُ مالَهُ وَذَهَبَ»[١].

واتە: لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: لە کاتێکدا ئێمە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لەناکاو پیاوێک هات پارچە زێڕێکی وەک هێلکەی پێ بوو کە ببوو بە بەش و پشکی خۆی لە جیهادێکدا ـ ئەحمەد وتویەتی: ئەوەی ڕاستتر بێت ببوو بە پشکی لە خەزێنەیەکی زەویدا ـ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بە خێر و صەدەقە لێم وەربگرە و قەبوڵی بکە، سوێند بە خوا هیچ ماڵ و سامانێکم نیە جگە لەوە، (پێغەمبەری خواش ﷺ) گوێی پێ نەدا و ڕووی وەرگێڕا، دواتر (دووبارە کابرا) لەلای چەپەی چوو بۆ لای و هەمان شتی وت، دواتر لە بەرامبەری بۆی چوو و هەمان شتی وت، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ بە توڕەییەوە فەرمووی: بیهێنە، (وەریگرت و) هاویشتی بە هاویشتنێک ئەگەر بەری کەوتایە ئازاری زۆری پێ دەگەیاند ـ یان بریندار ی دەکرد ـ دواتر فەرمووی: یەکێک لە ئێوە دەچێت ماڵ و سامانێکی کە هیچی تری نیە لەوە زیاتر دەیهێنێت تا بیکات بە خێر و صەدەقە و بەخشین، دواتر دەکەوێتە سەر چۆکی هەژاری و دەست لە خەڵک پان دەکاتەوە (خێرو صەدەقە ئاوا نابێت)، بەڵکو خێر و صەدەقە ئەوەیە لە هەبوونێکی ئاشکراوە بێت، ها بگرە ئەوە دەبێ بۆ تۆ بێت، ئێمە پێویستمان پێی نیە، جا پیاوەکە ماڵەکەی خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت.

## بابەت: پیاو گشت ئەوەی هەیەتی دەیبەخشێت

١٧٠٦ - «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ ﷺ قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ نَتَصَدَّقَ، فَوَافَقَ ذَلِكَ مالَ عِنْدِي، فَقُلْتُ: الْيَوْمَ أَسْبِقُ أبا بَكْرٍ إِنْ سَبَقْتُهُ يَوْمًا. قال: فَجِئْتُ بِنِصْفِ مالِي، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا أَبْقَيْتَ لِأَهْلِكَ؟ قُلْتُ: مِثْلَهُ، قَالَ: فَأَتَى أَبُو بَكْرٍ بِكُلِّ مَا عِنْدَهُ. فَقَالَ: يَا أبا بَكْرٍ مَا أَبْقَيْتَ لِأَهْلِكَ؟ فَقَالَ: أَبْقَيْتُ لَهُمُ اللهَ وَرَسُولَهُ. فَقُلْتُ: لاَ أُسَابِقُكَ إِلَى شَيْءٍ أَبَدًا»[٢].

---

(١) ـ ضعيف، إلا جملة: (إنما الصدقة على ظهر غنى) فصحيحة.

(٢) ـ حسن.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە وتویەتی: گوێم لە عومەر ﷛ بوو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردین کە ببەخشین، جا ئەو فەرمانەی لە کاتێکدا بوو پارە و سامانێکی زۆرم لەلابوو و وتم: ئەمڕۆ پێشی ئەبوبەکر دەکەوم ئەگەر ڕۆژێک پێشی کەوتبم، دەڵێ: بە نیوەی ماڵەکەمەوە چووم (بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: چیت هێشتۆتەوە بۆ خانەوادەکەت؟ وتم: وەک ئەوە (بە قەد ئەوە ماوەتەوە و نیوەم هێناوە)، دەڵێ: جا ئەبوبەکر هات بە گشت ئەو ماڵەی لەلای بوو و هەیبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چیت هێشتۆتەوە بۆ خانەوادەکەت؟ وتی: خوا و پێغەمبەرەکەیم ﷺ بۆیان هێشتۆتەوە، (عومەر دەڵێ:) وتم: هەرگیز پێشت ناکەوم ئەبوبەکر لە هیچ شتێکدا.

### بابەت: دەربارەی سەرفیترە، زەکاتی فیتر، سەر چاکردنەوە

١٧٠٧ - «عَنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ زَكَاةَ الْفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى كُلِّ حُرٍّ وَعَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى، مِنَ الْمُسْلِمِينَ. قِيلَ لِأَبِي مُحَمَّدٍ: تَقُولُ بِهِ؟ قَالَ: مَالِكٌ كَانَ يَقُولُ بِهِ»[١].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی فیتر (سەرفترەی) واجب کرد لە ڕەمەزاندا کە ساعێک (واتە: نزیکەی ٢٤٢٠ گرام) لە خورما یان لە جۆ، لەسەر هەموو ئازاد و بەندەیەک و نێر و مێیەک لە مسوڵمانان.

بە ئەبو موحەممەد وترا: تۆ کاری پێ دەکەی و فەتوای پێ دەدەی؟ وتی: ماڵیک هەموو جار فەتوای بەوە دەدا (واتە: بەڵێ وەری دەگرین).

١٧٠٨ - «عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ عَنْ كُلِّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ، حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَعَدَلَهُ النَّاسُ بِمُدَّيْنِ مِنْ بُرٍّ»[٢].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە زەکاتی فیتر کرد بۆ گشت بچوک و گەورە و ئازاد و بەندە صاعێک (واتە: نزیکەی ٢٤٢٠ گرام) لە جۆ یان خورما (ببەخشرێت).

ئیبنو عومەر وتویەتی: خەڵک بە دوو مشت لە گەنم حیسابیان دەکرد.

١٧٠٩ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷛ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ إِذْ كَانَ فِينَا رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ كُلِّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ، حُرٍّ وَمَمْلُوكٍ، صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ كَذَلِكَ حَتَّى قَدِمَ عَلَيْنَا مُعَاوِيَةُ الْمَدِينَةَ حَاجًّا أَوْ مُعْتَمِرًا، فَقَالَ: إِنِّي أَرَى

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ يَعْدِلُ صَاعًا مِنَ التَّمْرِ، فَأَخَذَ النَّاسُ بِذَلِكَ، قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: أَمَّا أَنَا فَلاَ أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: أَرَى صَاعًا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ»[١].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە زەکاتی فیترمان دەردەکرد و دەماندا کاتێ پێغەمبەری خوامان ﷺ لەناودا بوو (هێشتا وەفاتی نەکردبوو) بۆ گشت بچوک و گەورەو ئازادو بەندەیەک صاعێک (واتە: نزیکەی ٢٤٢٠ گرام) لە خۆراک یان لە خورما یان لە جۆ یان صاعێک لە کەشک یان لە مێوژ، جا کارەکە هەر ئاوا بەردەوام بوو تاوەکو موعاویە هات بۆ لامان بۆ مەدینە لە کاتێکدا حەج، یان عومرەی کردبوو، موعاویە وتی: من پێم وایە دوو مود لە موددی گەنمی شامی دەکاتە صاعێک لە خورما، خەڵکیش ئەوەیان وەرگرت و (زەکاتی فیتریان بە دوو موددی شامی دەردەکرد)، ئەبو سەعید وتویەتی: هەرچی منیشم بەردەوام زەکاتەکە دەردەکەم هەر وەکو چۆن جاران دەرم دەکرد (لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ).

ئەبو موحەممەد وتویەتی: پێم وایە صاعێک لە هەموو شتێک (دروستە و دەگونجێت).

١٧١٠ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ»[٢].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە زەکاتی فیترمان دەردەکرد لە ڕەمەزاندا صاعێک لە خۆراک، یان صاعێک لە خورما، یان صاعێک لە جۆ، یان صاعێک لە مێوژ، یان صاعێک لە کەشک.

١٧١١ - «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا نُعْطِي عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ فَذَكَرَ نَحْوَهُ»[٣].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: ئێمە (زەکاتی فیترمان) دەدا لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا هەمان فەرموودەی پێشەوەی گێڕایەوە.

١٧١٢ـ [٤].

## بابەت: حەڕامی ئەوەی پیاو ببێتە گومرگ وەرگر (بە ناهەق)

١٧١٣ - «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شِمَاسَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ صَاحِبُ مَكْسٍ، قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: يَعْنِي عَشَّارًا»[٥].

---

(١) ـ صحيح.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ سقط رقم (١٧٠٧) في الترقيم سهوا.

(٥) ـ ضعيف.

واتە: لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی شیماسەتەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: گوێم لە عوقبەی کوڕی عامیر ﷛ بوو دەیووت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: ناچێتە بەهەشت کەسی گومرگ وەرگر.

ئەبو موحەممەد وتویەتی: (صَاحِبُ مَكْسٍ) واتە: عَشَّار (عەششاریش واتە: ئەو کەسەی دە یەک، واتە: لە دە بەش یەک بەش لە خەڵک دەستێنێت بە گومرگ بە ناهەق).

## بابەت: دە یەک واتە (لە دە بەش یەک بەش زەکاتە) لەو بەروبومەی باران ئاوی دەدات، هەروەها حوکمی ئەو بەروبومەی بە جگە لە باران ئاو دەدرێ

١٧١٤ - «عَنْ مُعَاذٍ ﷛ قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ، فَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنَ الثِّمَارِ مَا يَسْقِي بَعْلاً الْعُشْرَ، وَمَا سُقِيَ بِالسَّانِيَةِ، فَنِصْفَ الْعُشْرِ»(١).

واتە: لە موعازەوە ﷛ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ یەمەن و فەرمانی پێ کردم لەو میوەجاتەی کە دێمین (واتە: بە ڕەگەکانیان ئاو لە زەویەوە دەخۆنەوە و پێویستیان بە ئاودان نیە) دەیەک (واتە: یەک بەش لە دە بەش) وەربگرم (لە زەکاتدا)، وە ئەوەیشی کە بە دۆلاب و (غەتتاس و ئامێری ئاودان و مەسرەفی زۆری ئاودان ئاو دەدرێت و بە باران ئاو نادرێت) ئەوە نیوەی دەیەک وەربگرم (لە زەکاتدا).

## بابەت: دەربارەی خەزێنە

١٧١٥ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: جُرْحُ الْعَجْمَاءِ جُبَارٌ، وَالْبِئْرُ جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ»(٢).

واتە: لە ئەبو هوڕەیرەوە ﷛ گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، وتویەتی: بریندار کردنی شتێک لەلایەن حەیوانێکی ماڵیەوە هیچی تیا نیە (واتە: تۆڵە و غەرامەی نادرێت ئەگەر هیچ کەمتەرخەمی لە خاوەنەکەیدا ڕووی نەدابێت)، وە بیر هیچی تیا نیە (ئەگەر کەسێک لە زەویەکەی خۆیدا هەڵی بکەنێت و کەسێک بکەوێتە ناوی، بێ کەمتەرخەمی خاوەنەکەی)، وە کانگاو مەعدەن هیچی تیا نیە (ئەگەر کەسێک بۆ دۆزینەوەی لە زەویەکەی خۆیدا هەڵی بکەنێت و کەسێک بکەوێتە ناوی، بێ کەمتەرخەمی خاوەنەکەی)، وە لە خەزێنە (واتە: لە دۆزینەوەی ئەو کەلوپەلە گرانبەهایانەی دەگەڕێتەوە بۆ پێشی ئیسلام) پێنج یەک (واتە: یەک لەسەر پێنج) زەکات هەیە.

---

(١) ـ إسناده حسن.

(٢) ـ صحيح.

## بابەت: ئەو شتەی دەکرێتە دیاری (لە کاتی کۆکردنەوەی زەکاتدا) بۆ فەرمانبەری زەکات کۆکردنەوە بۆ کێیە؟

١٧١٦ - «حدثني عروة بن الزبير عنْ أَبِي حُمَيْدٍ الأَنْصَارِيِّ ثُمَّ السَّاعِدِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَعْمَلَ عَامِلاً عَلَى الصَّدَقَةِ، فَجَاءَهُ الْعَامِلُ حِينَ فَرَغَ مِنْ عَمَلِهِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، هَذَا الَّذِي لَكُمْ، وَهَذَا أُهْدِيَ لِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: فَهَلاَ قَعَدْتَ فِي بَيْتِ أَبِيكَ وَأُمِّكَ، فَنَظَرْتَ أَيُهْدَى لَكَ أَمْ لاَ؟ ثُمَّ قَامَ النَّبِيُّ ﷺ عَشِيَّةً بَعْدَ الصَّلاَةِ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَتَشَهَّدَ وَأَثْنَى عَلَى اللهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ مَا بَالُ الْعَامِلِ نَسْتَعْمِلُهُ فَيَأْتِينَا فَيَقُولُ: هَذَا مِنْ عَمَلِكُمْ وَهَذَا أُهْدِيَ لِي؟ فَهَلاَ قَعَدَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَأُمِّهِ فَيَنْظُرَ هَلْ يُهْدَى لَهُ أَمْ لاَ؟ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ يَغُلُّ أَحَدُكُمْ مِنْهَا شَيْئًا، إلاَّ جَاء بهَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَحْمِلُهُ عَلَى عُنُقِهِ: إِنْ كَانَ بَعِيرًا، جَاءَ بِهِ لَهُ رُغَاءٌ، وَإِنْ كَانَتْ بَقَرَةً، جَاءَ بِهَا لَهَا خُوَارٌ، وَإِنْ كَانَتْ شَاةً، جَاءَ بِهَا تَيْعَرُ، فَقَدْ بَلَّغْتُ « قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: ثُمَّ رَفَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَيْهِ حَتَّى إِنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى عُفْرَةِ إِبْطَيْهِ. قَالَ أَبُو حُمَيْدٍ: وَقَدْ سَمِعَ ذَلِكَ مَعِي مِنَ النَّبِيِّ ﷺ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فَسَلُوهُ»[1].

واتە: لە عوڕوەی کوڕی زوبەیرەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش ئەبو حومەیدی ئەنصاری ساعدی (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم)، بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانبەرێکی دامەزراند لەسەر کۆکردنەوەی زەکات، جا فەرمانبەرەکە هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە کارەکەی تەواو بوو وتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بۆ ئێوەیە (زەکاتە کۆم کردۆتەوە)، ئەوەش کراوەتە دیاری بۆ من، پێغەمبەر ﷺ (توڕەبوو) و فەرمووی: جا بۆ لە ماڵی باوک و دایکت دانەدەنیشتی و چاوەڕێت نەدەکرد تا بزانی دیاریت بۆ دێت یان نا؟! دواتر دانی ئێوارەیەک پێغەمبەری خوا ﷺ دوای نوێژ لەسەر مینبەر وەستاو شایەتومانی هێنا و مەدح و سەنای خوای کرد بەوەی شایستەیەتی، دواتر فەرمووی: أما بعد، ئەوە چ کارێکی ئەو فەرمانبەرەیە کە کردوومانە بە فەرمانبەر (بۆ کۆکردنەوەی زەکات)و هاتۆتەوە لامان و دەڵێت: ئەوە هی کاری ئێوەیە (هی زەکاتە)، وە ئەوەش کراوەتە دیاری بۆم؟! جا بۆ لە ماڵی باوک و دایکی دانەدەنیشت و چاوەڕێ بکات تا بزانێت دیاری بۆ دێت یان نا؟! سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ کەسێک نیە لە ئێوە شتێک لە زەکاتدا بدزێت حەتمەن لە ڕۆژی دواییدا دێت و شتە دزراوەکەشی بەسەر شانیەوە هەڵگرتووە، ئەگەر وشتر بێت ئەوە دەیهێنێت و وشترەکە دەبۆڕێنێت، وە ئەگەر مانگا بێت ئەوە دەیهێنێ و دەقۆڕێنێت، وە ئەگەر مەڕ یان بزن بێت ئەوە دەیهێنێت و دەباڕێنێت، بزانن بە دڵنیایی ڕامگەیاند.

ئەبو حومەید وتویەتی: دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرز کردەوە تاوەکو ئێمە پەمبایەتی بن باڵەکانمان دەبینی.

---

(١) ـ صحيح.

## بابەت: با فەرمانبەری زەكات وەرگرتن لەلاتان بگەڕێتەوە لە كاتێكدا لێتان ڕازی بێت (واتە: زەكاتە واجبەكەی بە ئاسانی و بێ ئەزیەتدان پێ بدەن)

١٧١٧ - «عَنْ جَرِيرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا جَاءَكُمُ الْمُصَدِّقُ، فَلاَ يَصْدُرَنَّ عَنْكُمْ إِلاَّ وَهُوَ رَاضٍ»[1].

واتە: لە جابرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كاتێ فەرمانبەری زەكات كۆكردنەوە هات بۆ لاتان، با نەگەڕێتەوە لەلاتان حەتمەن با ڕازی بێت (لێتان، بەوەی كاری بۆ ئاسان بكەن و ئەزیەتی نەدەن).

١٧١٨ - «حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ الْفَزَارِيِّ، عَنْ دَاوُدَ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، عَنْ عَامِرٍ، عَنْ جَرِيرٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ»[2].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: مەكڕوهی و چاكنەبوونی گەڕاندنەوەی داواكار بەبێ هیچ شتێك

١٧١٩ - «عَنْ حَوَّاءَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا نِسَاءَ الْمُسْلِمَاتِ، لاَ تَحْقِرَنَّ إِحْدَاكُنَّ لِجَارَتِهَا، وَلَوْ كُرَاعُ شَاةٍ مُحَرَّقٌ»[3].

واتە: لە حەووائەوە (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی ئافرەتانی مسوڵمان، با هیچێك لە ئێوە شتی دراوسێكەی بە كەم نەزانێت ئەگەرچی پێچكێكی سوتاوی دواوەی قاچی ئاژەڵیش بێت (كە بە خێر، یان بە دیاری، بۆتان دێت).

## بابەت: ئەو كەسەی لەسەر شتێك مسوڵمان دەبێت

١٧٢٠ - «عَنْ صَخْرِ بْنِ الْعَيْلَةِ قَالَ: أُخِذَتْ عَمَّةُ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهما، فَقَدِمَتْ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَسَأَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَمَّتَهُ، فَقَالَ: يَا صَخْرُ إِنَّ الْقَوْمَ إِذَا أَسْلَمُوا أَحْرَزُوا أَمْوَالَهُمْ وَدِمَاءَهُمْ، فَادْفَعْهَا إِلَيْهِ، وَكَانَ مَاءٌ لِبَنِي سُلَيْمٍ، فَأَسْلَمُوا، فَسَأَلُوهُ ذَلِكَ فَدَعَانِي، فَقَالَ: يَا صَخْرُ، إِنَّ الْقَوْمَ إِذَا أَسْلَمُوا أَحْرَزُوا أَمْوَالَهُمْ وَدِمَاءَهُمْ، فَادْفَعْهَا إِلَيْهِمْ، فَدَفَعْتُهَا»[4].

واتە: لە صەخری كوڕی عەیلەتەوە گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: (لە شەڕدا) پلكی موغیرەی كوڕی شوعبەم (رَضِيَ اللهُ عَنهما)، دەستگیر كردبوو چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺو پێغەمبەری خواش ﷺ پرسیاری

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

(٤) ـ إسناده حسن.

پلكەكەی موغیرەی كردو وتی: ئەی صەخر كاتێ كۆمەڵێک دەبن بە مسوڵمان ئەوە ماڵ و خوێنیان بە دەست دەهێننەوە (پارێزراو دەبێت)، كەواتە پلكەكەی بۆ بگەڕێنەوە، منیش گەڕاندمەوە.

تێبینی: پلكی موغیرەو قەومەكەی سەرەتا مسوڵمان نەبوون و ڕایان كرد، دواتر صەخر ئەو پلكەی موغیرەی گرت و پلكەكەشی مسوڵمان بوو قەومەكەشی مسوڵمان بوو، مسوڵمانیش هەقی پارێزراوە، بۆیە فەرمان بە صەخر كرا ئازادی بكات.

١٧٢١ - «أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يُوسُفَ، حَدَّثَنَا أَبَانُ بْنُ عَبْدِ اللهِ، حَدَّثَنِي عُثْمَانُ بْنُ أَبِي حَازِمٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ صَخْرٍ أَطْوَلَ مِنْ حَدِيثِ أَبِي نُعَيْمٍ»[١].

واتە: لەم ڕێگایەشەوە هەمان فەرمودە بە درێژی گێڕدراوەتەوە.

## بابەت: دەربارەی چاكترین و گەورەترین خێر و صەدەقە

١٧٢٢ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا تَصَدَّقَ امْرُؤٌ بِصَدَقَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ، وَلاَ يَقْبَلُ اللهُ إِلاَّ طَيِّبًا، إِلاَّ وَضَعَهَا حِينَ يَضَعُهَا فِي كَفِّ الرَّحْمَنِ، وَإِنَّ اللهَ لَيُرَبِّي لِأَحَدِكُمُ التَّمْرَةَ كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ، أَوْ فَصِيلَهُ حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ أُحُدٍ»[٢].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێک هەر خێر و صەدەقەیەک بكات لە كەسابەت و ڕەنجی حەڵاڵ و پاكی خۆی، وە خوا هیچ شتێک وەرناگرێت و مەگەر حەڵاڵ و پاک بێت، (جا كەسێک كە صەدەقەیەكی بە كەسابەتی حەڵاڵی خۆی كرد) حەتمەن ئەو كاتەی خێرەكە دەكات دەیخاتە دەستی خوا (واتە: دەچێتە لای خوای مەزن و قبوڵ دەبێت)، وە خوا دەنكە خورماێک (كە بەخشیوتانە) زیادی دەكات بۆ هەر یەكێک لە ئێوە، هەروەک چۆن یەكێک لە ئێوە بەچكەی ئاژەڵێک گەورە دەكەن (بەرهەم و نرخی زیاد دەكات لەگەڵ گەورەكردن، ئاواش خوا بەرهەم و پاداشتی صەدەقەی دەنكە خورماكە زیاد دەكات) هەتا وەكو چیای ئوحودی لێ دێت.

١٧٢٣ - «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مالَ، وَمَا زَادَ اللهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إِلاَّ عِزًّا، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللهُ»[٣].

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ صەدەقە و خێرێک لە ماڵ و سامان كەم ناكات، وە خوا بە هۆی لێبوردنەوە هیچ زیاد ناكات بۆ هیچ بەندەیەک تەنها عیززەت و گەورەیی نەبێت، وە هەر كەسێک خۆبەكەمزانین و ملكەچی بنوێنێت (بۆ هەق و مسوڵمانان) لە پێناوی خوا، ئەوە حەتمەن خوا بەرزی دەكاتەوە.

---

(١) ـ ضعيف.

(٢) ـ صحيح.

(٣) ـ صحيح.

تێبینی: ئەم فەرموودەیە سێ گومانی عادەت و فیكری مرۆڤ ڕەت دەكاتەوە، یەكەم: مرۆڤەكان وادەزانن ئەگەر ببەخشن ماڵ كەم دەكات. دووەم: وادەزانن ئەگەر كەسێك لێبوردە بێت ئەوە بێ توانا و لاوازە. سێیەم: وادەزانن ئەگەر كەسێك خۆبەكەمزان و خاكی بێت نزمە و ناتوانێ بە بەرزی دەركەوێت.

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هەرسێ گومانی وەڵام داوەتەوە و جوانی و چاكی ئەو سێ سیفاتەی بەرز نرخاندووە و ڕوونی كردۆتەوە لای خوا چەندە گرنگن و بەخششەكانیان پێچەوانەی ئەوەیە كە خەڵك بیریان لێ دەكاتەوە.

## بابەت: ئەو وشترانەی كاریان پێدەكرێ، یان بۆ شیری ماڵەوە ڕاگیراون، زەكاتیان تیا نیە

١٧٢٤ - «حَدَّثَنَا بَهْزُ بْنُ حَكِيمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنْ جَدِّهِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: فِي كُلِّ إِبِلٍ سَائِمَةٍ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ، لاَ تُفَرَّقُ إِبِلٌ عَنْ حِسَابِهَا، مَنْ أَعْطَاهَا مُؤْتَجِرًا بِهَا، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَمَنْ مَنَعَهَا، فَإِنَّا آخِذُوهَا وَشَطْرَ مَالِهِ عَزْمَةٌ مِنْ عَزَمَاتِ اللهِ، لاَ يَحِلُّ لِآلِ مُحَمَّدٍ مِنْهَا شَيْءٌ»[١].

واتە: لە بەهزی كوڕی حەكیمەوە گێڕدراوەتەوە، ئەویش لە باوك و باپیریەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: لە هەموو وشترێكی لەوەڕاو لە خوارسك (زەكات هەیە)، لە هەر چلێك «بینتو لەبوون» هەیە (واتە: وشترێكی مێی دوو ساڵە)، هیچ وشترێك لە حیساب كردن و هەژماركردن جیاناكرێتەوە، هەر كەسێك وشترەكانی دا (بە زەكات) بە نیازی ئەجر و پاداشت، ئەوە پاداشتی بۆ هەیە، وە هەر كەسێكیش نەیدات، ئەوە ئێمە زەكاتەكەی لێ دەسەنین لەگەڵ نیوەی ماڵەكەی بە هەقێك لە هەقەكانی خوا، هیچ شتێكیش لە وەرگرتنی ئەم زەكاتە بۆ خانەوادەی موحەممەد دروست و حەڵاڵ نیە.

## بابەت: ئەو كەسانەی داواكردنیان بۆ دروستە

١٧٢٥ - «عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ الْهِلاَلِيِّ ﷺ قَالَ: تَحَمَّلْتُ بِحَمَالَةٍ فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَسْأَلُهُ فِيهَا، فَقَالَ: أَقِمْ يَا قَبِيصَةُ حَتَّى تَأْتِيَنَا الصَّدَقَةُ، فَنَأْمُرَ لَكَ بِهَا ثُمَّ قَالَ: يَا قَبِيصَةُ إِنَّ الْمَسْأَلَةَ لاَ تَحِلُّ إِلاَّ لِأَحَدِ ثَلاَثَةٍ: رَجُلٍ تَحَمَّلَ حَمَالَةً فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ، فَسَأَلَ حَتَّى يُصِيبَهَا، ثُمَّ يُمْسِكُ. وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ فَاجْتَاحَتْ مَالَهُ، فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ فَسَأَلَ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ - أَوْ قَالَ: سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ - وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ حَتَّى يَقُولَ ثَلاَثَةٌ مِنْ ذَوِي الْحِجَى مِنْ قَوْمِهِ قَدْ أَصَابَ فُلاَنًا الْفَاقَةُ، فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ فَسَأَلَ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ، أَوْ سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ، ثُمَّ يُمْسِكَ، وَمَا سِوَاهُنَّ مِنَ الْمَسْأَلَةِ سُحْتٌ يَا قَبِيصَةُ يَأْكُلُهَا صَاحِبُهَا سُحْتًا»[٢].

واتە: لە قەبیضەی كوڕی موخاریقی هیلالیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، وتویەتی: باڵێكی قورسم كەتە سەر شان (واتە: بەدەل خوێن یان غەڕامەی كەسێكم كەتە سەر شان، كە توانای دانیم نەبوو)، جا چووم

---

(١) ـ حسن.

(٢) ـ صحيح.

بۆ لای پێغەمبەری خوا، داوام لێ کرد دەربارەی (تا یارمەتیم بدات)، ئەویش فەرمووی: بوەستە ئەی قەبیصە تاوەکو زەکاتمان بۆ دێت و فەرمان دەکەین بە پێدانی زەکات بە تۆ، دواتر فەرمووی: ئەی قەبیصە داواکردن دروست و حەڵاڵ نیە تەنها بۆ سێ کەس نەبێت: کەسێک بارێکی قورسی کەوتۆتە سەر شان (وەک بەدەل خوێن)، ئەوە داواکردنی بۆ حەڵاڵە و داوادەکات تاوەکو پێی دەدرێت و کارەکەی جێبەجێ دەکات، دواتر واز دێنێت (لە داوا کردن)، وە کەسێک بەڵایێک بەسەر ماڵ و سەروەتی بێت و لەناوی ببات، ئەوە داواکردنی بۆ دروستە و داوا دەکات تاوەکو ژیانی پێ ڕاستەڕێ دەکات (واتە: شتە زەرورییەکانی ژیان دابین دەکاتەوە)، وە کەسێک زەحمەت و هەژارییەکی تووش ببێت تاوەکو سێ لە کەسانی ژیر لە قەومەکەی دەڵێن فڵان تووشی هەژارییەکی توند بووە (ئیعترافی پێ دەکەن)، ئەوە داواکردنی بۆ دروستە و داوا دەکات تاوەکو ژیانی ڕاستەڕێ دەکات (واتە: شتە زەرورییەکانی ژیان دابین دەکات)، دواتر واز دێنێت لە داوا کردن، جا جگە لەمانە داواکردن حەرامە ئەی قەبیصە، خاوەنەکەی حەرام دەخوات.

## بابەت: خێر کردن بە خزمان

١٧٢٦ - «عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الصَّدَقَاتِ أَيُّهَا أَفْضَلُ؟ قَالَ: عَلَى ذِي الرَّحِمِ الْكَاشِحِ»[١].

واتە: لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، کە پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی خێر و صەدەقە کە ئاخۆ کامیان زۆر گەورەو چاکترە؟ فەرمووی: خێرکردن بە خزمێکی دوژمن لە دڵەوە (واتە: ئەو خزمەی دەزانی لە دڵەوە ڕقی لێتە بەڵام دەری نابڕێت).

تێبینی: ئەوە بۆ ئەوەیە بە هۆی خێرەکەوە خۆشەویستی دەچێتە دڵ و دڵی ڕۆشن دەبێتەوە، چ خێرێکیش لەوە چاکتر هەیە شیفای دڵێکی نەخۆش بدەیت؟! ئەوەیە ڕەحمەتی ئیسلام.

١٧٢٧ - «عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ الضَّبِّيِّ ﷺ ذَكَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: إِنَّ الصَّدَقَةَ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَإِنَّهَا عَلَى ذِي الرَّحِمِ اثْنَتَانِ صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ»[٢].

واتە: لە سەلمانی کوڕی عامیری زەبیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، باسی کردوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خێر کردن بە هەژار (یەک پاداشتی هەیە، ئەویش پاداشتی) صەدەقەیە، وە خێر کردن بە خزمان دوو پاداشتی هەیە (ئەوانیش پاداشتی) صەدەقە و جێبەجێ کردن و گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتیە.

١٧٢٨ - «عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ الضَّبِّيِّ ﷺ يَرْفَعُهُ قَالَ: الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَهِيَ عَلَى ذِي الرَّحِمِ اثْنَتَانِ صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ»[٣].

---

(١) ـ إسناده ضعيف.

(٢) ـ ضعيف.

(٣) ـ ضعيف.

واتە: لە سەلمانی کوڕی عامیری زەبیەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە، باسی کردوە کە (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرموویەتی: خێر کردن بە هەژار (یەک پاداشتی هەیە، ئەویش پاداشتی) صەدەقەیە، وە خێرکردن بە خزمان دوو پاداشتی هەیە (ئەوانیش پاداشتی) صەدەقەو جێبەجێ کردن و گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتیە.

# نـــاوەڕۆك

## پەرتوكی٣ : نوێـژ ........................ ٣٨٥

## پەرتوكی ٤ : زەكـات ........ ٥٣٥